مجموعه مقالات

نخستین همایش بین المللی

(بخش فارسی و لاتین)

دانشگاه کردستان

پژوهشکدەی زبان و ادب کردی

# پێڕست

## وە ناو خوا کە دەهندە و دلۆڤانە

هەر وەک هەمووان ئاگادارن، ئەدەبی کوردی وەک ئەدەبی زۆرێک لە گەلانی خۆرهەلاتی ناڤین، کامڵ و دێرین و دەوڵەمەندە؛ بەڵام هێندێ هۆکار وەک زەنجیرێک دەست و پێی دابەستووە و نەیهێشتووە کە تا ئێستا بەو جۆرەی کە شیاوی ئەم ئەدەبە لەمێژینەیە، خۆی بنوێنێ. گەمارۆیی لە نێوان ئەدەبی گەلانی دراوسێدا کە هەر کام لە ڕۆژگارانی پاش ئیسلام، بە ماوەی چەندین سەدە دەسەڵاتیان لە پشتەوە بووە، نەبوونی دەسەڵاتێکی ئەوتۆ لە پشت ئەدەبی کوردی، دابڕانی کوردەکان لە یەکتری بە هۆی جوگرافیای جۆراوجۆری هەرێمەکەیان و لەم دواییانەشدا، دانانی سنووری ئیستیعماری، کەڵک لێوەرنەگرتنی هێندێ لە زانایان و بلیمەتانی کورد لە زمان و ئەدەبی خۆیان، نەختێکن لەو هۆکارانە کە نەیانهێشتووە ئەم ئەدەبە، بە ئاواتی دڵی خۆی، گەشە بکا و پەل بهاوێژێتە دەرەوەی کوردەواری.

سەرباقی تەواوی ئەم گرفتانە، لە ماوەی هەزار ساڵی پێشوودا ئەم ئەدەبە نەتەنیا هەر نەدۆڕاوە، بەڵکوو بە ئەو پەڕی هێزەوە شان بە شانی هەڵاتی کورد، خەڵاتی پێبەخشیوە و هەوراز و نشێوەکانی لەگەڵ بڕیوە و توانیویەتی زام و ئەڤین و سالاری و کۆیلەیی گەلەکەی بچڕێنێ و لە هەر چەشنێک لە چەشنەکانی ئەدەبیدا، شاکار بخوڵقێنێ.

بەڵام ئەو کارانەی بۆ ئەم ئەدەبە کراوە، وێڕای پڕبایەخییان -دانی پیانێین- ئەوتۆ نەبووە. ئێستایش بەشێکی هەرە زۆری دەستنووسەکان، تۆزی فەرامۆشییان لەسەر نیشتووە و ڕێگەی کتێبخانەی کوردییان پیشان نەدراوە؛ ئێستایش لێکۆڵینەوەیەکی بنەڕەتی و پڕبایەخ لەسەر شانامەی کوردی نەکراوە کە جێی خۆی بوو دامەزراوەیەک بە ڕەسمی ئەرکی بە ئەنجام گەیاندنی ئەو کارە گرینگەی بە ئەستۆ گرتبا؛ ئێستاش زۆرینەی توێژینەوەکان لەسەر مێژووی ئەدەبی کوردی و چەشنگەلی ئەدەبی کرچ و کاڵن؛ ئێستاش زۆرێک لە بەیت و مەتەڵ و چیرۆکەکان کۆ نەبوونەوە و لە بەر لافاوی تیاچووندان؛ ئەدەبی بەراوردکاری، پێویستی بە پێڕاگەیشتنی زیاتر هەیە؛ ئێستاش زۆرێک لە شاکارەکانی ئەدەبی کوردی بە گەلانی جیهان و تەنانەت بە دراوسێکانیشمان نەناسراون؛ هەروەها چەندین و چەندین بابەتی بنەڕەتی دیکە لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا کە پیشاندەری ڕێگایەکی دوور و درێژە و پێمانئەسەلمێنێ کە لە ڕۆژگاری بەجیهانیبووندا بەشێک لە ناسنامەی ئێمە، ئەدەبی ئێمەیە. ناسنامەکەمان بە تازەیی بسپێرینە دەستی چینی داهاتوو. پاراستن و پێڕاگەیشتنی ئەم ئەدەبە دێرینە و چاوەڕوانی گەل ناهێڵێ کە مامۆستایان و خوێندکارانی کورد هەروا دەستەوئەژنۆ دانیشن.

بەستنی کۆڕ و کۆبوونەوە بە شێوەی زانستی، یەکێکە لەو ڕێگایانەی کە ئەتوانێ توێژینەوەی ئەدەبی کوردی دەوڵەمەندتر و بەرۆژتر بکات. ئەم کۆڕە —کە ناوی یەکەمین کۆڕی زانستی لێنراوە- یەکەمین هەنگاوە کە ناوەندی توێژینەوەی زمان و ئەدەبی کوردی سەر بە زانستگای کوردستان لە ئاستی نێونەتەوەییدا هەڵیئەنێ بەو هیوایە کە هەر دوو ساڵ کۆڕێک لەم چەشنە بۆ خزمەت بە ئەدەبی کوردی ببەسترێ. ئەگەر تەوەرەکانی

## پێشەکی

هەنگاوی یەکەممان بە شێوازێکی گشتی دابین کراوە، بەرنامە ئەوەیە لە کۆڕەکانی دواتردا تەوەرەکان جوزئی (پاژی) بکرێتەوە هەتا زنجیرەی کۆڕبەستنی کوردستان‌ناسی ڕۆژبەڕۆژ زانستی‌تر و ڕێکوپێکتر دەربێت.

هەر وەک ئاماژەی پێکرا، ئەم کۆڕە تەنیا هەنگاوێکە بۆ گەشەپێدان بە توێژینەوەی ئەدەبی لەمێژینەی کوردی و گەیشتن بەو ئاستەی کە لە هەڵسوڕاندنی کۆڕێکی زانستیدا ئەبێ ببێ. بۆ گەیشتن بەم مەبەستە، ئەم ئازیزانە ئەرکی قورسی داوەری وتارەکانیان بە ئەستۆ گرت و لەگەڵ ئەوەشدا ناوبەناو ڕێنوێنییان کردین کە پڕ بە دڵ سپاسێکی گەرم و نەبڕاوەیان ئاڕاستە دەکەم: بەڕێزان دوکتۆر جەماڵ ئەحمەدی، دوکتۆر محەمەد ئێرانی، کاک عەدنان بەرزنجی، کاک مەنسوور ڕەحمانی، دوکتۆر هادی ڕیزوان، دوکتۆر عەبدوڵلا ڕەسوڵنەژاد، دوکتور بەختیار سەجادی، دوکتۆر حەسەن سەرباز، دوکتۆر ئەسعەد شێخ‌ئەحمەدی، دوکتۆر محەمەدخالد غەففاری، کاک ڕەحیم لوقمانی، کاک ماجد مەردوخ‌ڕۆحانی، دوکتۆر نەویدنەقشبەندی و دوکتۆر هادی یوسفی.

بۆ بە ئەنجام گەیشتنی ئەم کۆڕە زانستییە، کەسانێکی زۆر پێمانەوە ماندوو بوون و لە تەنیایی هەوڵدانماندا بە پیرمانەوە هاتن و لەگەڵمان بوون بە ڕێبواری ئەم ڕێگە: بەڕێزان دوکتۆر غولامحوسێن کەریمی‌دووستان (سەرۆکی پێشووی زانستگا)، دوکتۆر جەهانشیر ئەمینی (سەرۆکی ئێستای زانستگا) کە بۆ هیچ کارێک درێخیان لێنەکردین. بۆ زەحمەتەکانیان سەری کڕنۆش دائەنەوێنم.

پێویستە سپاسی نەبڕاوە ئاڕاستەی دوو مامۆستای خۆشەویست و دڵئاوەدانی گەل، کاک ئەحمەد قازی و کاک ماجد مەڕدوخ‌ڕوحانی بکەم کە باوکانە دڵگەرمیان ئەدایێ و لە دوو ڕۆژی بەڕێوەچوونی کۆڕەکەیشدا بۆ بەخێرهاتنی میوانەکان لەگەڵمان بوون. هەروەها ئەم بەڕێزانە لە هەوراز و نشێوەکاندا هاریکاریان کردین: لە سەرووی هەموو ناوەکاندا دوکتۆر عەبدوڵلا ڕەسوڵنەژاد، دەبیری ئیجراییـە کە بێ‌وچان ڕێگاکانی لەگەڵمان بڕی و لە هەموو هەنگاوەکاندا هاوڕێ بوو؛ بە هەمان شێوە دوکتۆر عەبدوڵلا سەلیمی (جێگری توێژینەوەی زانستگا)، دوکتۆر ڕەحمەت سادقی، دوکتۆر عادڵ سی‌وسێ‌مەردە، کاک هومایون فەرزامی، کاک مستەفا مەولانایی، کاک بارام نەسروڵلاییزادە، کاک نامیق هەورامی، کاک حەمید زەڕی، ئەندازیار حیشمەت سەعیدی، ئەندازیار سەلاحەدین بادمەستی، ئەندازیار کامیل ئەحمەدپوور و کاک فەیزوڵلا پیری دەستی یارمەتیان گرتین کە سپاس و پێزانینی گەرمیان پێشکەش ئەکەم. بەڕێزان کاک فەخرەدین ئامێدیان و کاک هەورامان بەهرامیش ئەرکی نڤیساری وتارەکانیان بە ئەستۆ بوو کە سەری ڕێزیان بۆ دائەنەوێنم. هەروەها سپاس بۆ حەراسەتی زانستگا و تەواوی ئەو خوێندکارە لاو و بەئەمەگانە کە بە دەممانەوە بوون.

دڵسۆزانێکی زۆریش لە دەرەوەی زانستگا بە هانامانەوە هاتن و هاریکاریان کردین: هاوڕێیان لە زانستگای پەیامی نووری کوردستان، ژووری بازرگانی سنە، هەروەها ئەندازیار محەمەدخالد ڕەحیم‌زادە، ئەندازیار مێعماری، ئەندازیار محەمەد عەلی میرەکی، ئەندازیار ئەیوب عەبباسی، ئەندازیار موختار موحەممەدی.

هیوادارم ئەم کۆڕە توانیبێتی پردێکی پەیوەندی لە نێوان زانایان و توێژەرانی ئەدەبی کوردی پێکهێنابێ و ئەم کۆمەڵە وتارەش مەشخەڵێکی لە سەر ڕێی ئەدەبی کوردی هەڵکردبێ و سوودبەخش بێ.

نەجمەدین جەباری

پاییزی ٢٠١٠ - زانستگای کوردستان - سنە

# بەراوردێ لە نێوان
# شێخی سەنعانی فەقێ تەیران و تێکستێکی عەرەبیدا

د.ئیبراهیم احمد شوان [*]

## کورتە

ئەم لێکۆڵینەوەیە کە بەناو و نیشانی «بەراوردێ لە نێوان شێخی سەنعانی فەقێ تەیران و تێکستێکی عەرەبیدا»یە بریتیە لە بەراوردکردنی شێخیسەنعانی فەقێتەیران و دەقێکی عەرەبی کە لەکتێبی «المستطرف فی کل فن مستظرف»ی شەهابوودین محەمەد کوڕی ئەحمەدی مەحەللییە.

ئەمە هەوڵدانێکە بۆ دۆزینەوەی لایەنی لێکچوون و جیاوازی لە هەردووکیاندا و هەروەها ئاماژەشە بۆ ئەوەی کە ئەمجۆرە حەکایەتانە یا ئەوەتا سەرچاوەکانیان یەکە و بەپێی سەرهەڵدانیان لە ناو گەلاندا، چەند جیاوازیەکیان تێکەوتووە، یاخود دەگەڕێتەوە سەر یەکێتی سروشت و ژیانی مرۆڤایەتی و یەکبیری (توارد الخواطر).

لێکۆڵینەوەکە لە پێشەکیەکی کورت و دوو تەوەرە پێکهاتووە:

تەوەرەی یەکەم: کورتەیەکی ئەدەبی بەراوردکاری و پێناسە و مەبەستە کە دیاری کراوە، دوای ئەوە ئاوڕدانەوەیەکە لەدەقئاوێزان و چەند پێناسەیەکی بۆکراوە و ئەوە ڕوونکراوەتەوە کە لێکۆلینەوەکە لەنێوان پرۆگرامی ئەدەبی بەراوردکاری و دەقئاوێزاندایە. ئەوجا لایەنە جیاوازیەکانی هەردوو دەقەکە دەستنیشان کراون و نمونەیان لێ وەرگیراوە.

تەوەرەی دووەم: بریتیە لە دەستنیشان کردنی لایەنە لێکچوەکانی هەردوو دەقەکە و بە نمونەی تێکستەکان، نمونەکان پشتئەستور کراون. لێکۆڵینەوەکە بە چەند خاڵێکی ئەنجام و سەرچاوەکان کۆتایی هاتووە.

---

[*] زانستگای سەلاحەدین ،هەولێر؛ کۆلێژی زمان، زمانی کوردی.

## پێشەکی:

ئەو حەکایەت و داستانانەی کە لەناو گەلانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا باون، هەندێکیان لە ڕەگ و ڕیشەیەکی لێکچووەوە سەریان هەڵداوە و لە هەرشوێنێک تۆمار کرابن، سروشتی ئەو شوێنەیان وەرگرتووە و بەپێی ئارەزووی نوسەرەکە یاخود حەکایەتخوانەکە شتیان بۆ زیادکردووە و لێیان قرتێنراوە.

یەکێک لەو داستانانەی یاخود لەو حەکایەتانەی کە لە ناو گەلانی عەرەب و فارس و کورددا باوە، حەکایەتی «شێخی سەنعان»ە. پاڵەوانی ئەم داستانە لای فارس و کورد "شێخی سەنعان"ە و بەڵام لە یەکێ لەتێکستە عەرەبیەکان ناوی بووەتە «ابوعبدلله الاندلسی». لە دەقە عەرەبیەکەدا ئەم حەکایەتە لە سەدەی سێهەمی کۆچی لەبەغدا سەری هەڵداوە و پاڵەوانەکەی سۆفیەکی قوتابخانەی سۆفیگەری بەغدا بووە و هاوچەرخی "جونێد" (٢٩٧ک) بووە.

بەگشتی ئەم جۆرە حەکایەتانە لە ئەدەبیاتی عەرەبیدا گرنگیان پێنەدراوە و وەک ئەدەبی سەرزاری ماونەتەوە؛ هەرچەندە لەبنەچەدا عەرەبی بوونە.

جگە لەم حەکایەتە، حەکایەتی «لەیل و مەجنوون» کە لە سەردەمی ئەمەویەکاندا لە دەوروبەرێکی عەرەبی سەری هەڵداوە، کەچی گەلە موسڵمانە ناعەرەبەکان بەتایبەتی فارسەکان وەریانگرتووە و بەرهەمێکی نایابیان لەسەر بنیات ناوە و دواییش کورد و تورک سوودیان لە فارسیەکە وەرگرتووە.

شێخی سەنعان بۆ یەکەمجار لەئەدەبیاتی فارسی وەکوو دەقێکی هونەری پەیدابوو و لە ئەدەبی سەرزاریەوە گەیشتە ئەدەبی نوسراو. هەندێ ڕایان وایە (لەوانەش «موجتەبا مینەوی») کەوا کتێبی «تحفه الملوک»ی غەزالی سەرچاوەی ئەو داستانەیە. بەڵام گەلێ لە لێکۆڵەرەوە تازەکان لەوانەش «مەنوچێهر مورتەزەوی» پێیان وایە کە «عەتتاری نەیشابووری» یەکەم شاعیر بووە کە بەمجۆرە شێخی سەنعانی هۆنیوەتەوە.

ئەم حەکایەتە تەنیا بەناوی "شێخیسەنعان"ەوە نەهاتووە، بەڵکوو یەکێکە لەکۆمەڵە ناوێک، وا هەندێک لەوانە دەخەینە بەرچاو:

١- لای «فەریدەددین عەتتار»، «شێخیسەنعان» بووە (عطار: ٩٠).

٢- لە کتێبی «غیاث اللغات» شێخی سەنعانە و موریدی عەبدولقادری گەیلانییە (محمّد، ١٣٦٣: ١٠٠).

٣- بەناوی «ابن سقا» هاتووە و چوەتە قوستەنتەنییە و لەوێ عاشقی کچە دیانەک بووە و بۆی لە ئایین وەرگەڕاوە. (شفیعی کدکنی، ١٣٨٨: ٥٧).

٤- محەمەدی سوودی بە «عەبدوڕەزاق یەمەنی» ناوی دەبات و پێی وایە بەیتە شیعری «دوش از مسجد سوی میخانه آمد پیرما» ئاماژەیە بەو شێخە (مشکور: ٥٧).

٥- لە لایەکی دیکە بە «عەبدوڕەزاق سەنعانی»یش هاتووە کە گوایە لە ١٢٦ی کۆچیدا لە دایکبووە و لە ٢١١ی کۆچی مردووە (سەرچاوەی پێشوو).

٦- لەکتێبی «المستطرف في كل فن مستظرف» بەناوی «ئەبوو عەبدوڵلا ئەندلسی»ـە (المحلي، ٧٩٠ە: ١٥٣). جگە لەمانەش بەکۆمەڵە ناوێکی دیکەش هاتووە و لێرەدا جێگەی ئەم درێژدارِیە نابێتەوە.

لە سەرنجدانی ئەم ناوانە دەردەکەوێ کە ئەم حەکایەتە لەزۆر شوێندا بڵاوبۆتەوە و کەوتۆتە سەر زاران و ناوەرۆکی بەگشتی یەکە و ناوی پاڵەوان و شوێنی ڕووداوەکان جودان. دوای ئەوەی ئەم حەکایەتە لەلایەن عەتتارەوە تۆمارکرا، بووە بەشێک لە ئەدەبیاتی فارسی؛ ئەوجا ئەو بەرهەمە وەکوو ئەوانی دیکە بڵاوەی لێکرد و کوردستانی گرتەوە و خوێندەوارانی کورد -کە لەو سەردەمەدا مەلا بوون و دەرچووی حوجرە و مزگەفتەکان بوون و ئاشنایەتیان دەگەڵ ئەدەبیاتی فارسی هەبوو کە لەحوجرەکان دەخوێندرا- ئەوانیش وەریانگرت و بە شیعر تۆماریان کرد.

فەقێ تەیران -کە ١٠٤١ک زیندوو بووە- چاوی بە شێخی سەنعانی عەتتار کەوتووە و پێی کاریگەر بووە و چاوی لێکردۆتەوە و لەشێوەی دووبەیتی ئەم داستانەی بەکرمانجی ژووروو هۆنیوەتەوە.

لەبەر ئەوەی ئەم نووسینە بەراوردە لە نێوان دەقەکەی فەقێ‌تەیرانی کورد و دەقێکی عەرەبی، بۆیە ئاماژە بەدەقە فارسیەکە ناکرێ؛ چونکە ئەم بەراوردە لە نامەیەکی دوکتۆرادا لە زانستگای سەلاحەدین (کۆلێژی زمان) بەشی زمانی کوردی لەلایەن قوتابی عێماد وەیسیەوە ئەنجام دراوە، هەرچەندە بێ کەم و کورتی نییە. ئەم کارە بە پێی هەموو قوتابخانەکانی ئەدەبی بەراوردکاری بەگشتی و فەرەنسی بەتایبەتی دەکەوێتە تای تەرازووی بەراوردی ئەدەبیەوە و بنەماکانی قوتابخانەی فەرەنسی لێدێتەدی کە ئەمانەن: هەبوونی پەیوەندی مێژوویی و جیاوازی زمان و کاریگەر بوون وکارتێکردنیان. لێکۆڵینەوەکەش لەدوو تەوەرە دەخولێتەوە:

١- جیاوازیەکانی هەردوو دەقەکە لەچەند خاڵێکدا.

٢- لێکچونەکانی هەردوو دەقەکە لەچەند خاڵێکدا. ئەوجا بەچەند خاڵێ ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە دیاریکراوە. بەهیوای ئەوەی کەلێنێ لە لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری کوردی گرتبێت.

### تەوەرەی یەکەم :

ئەم لێکۆڵینەوەیە کە بەناونیشانی «بەراوردێ لەنێوان شێخی سەنعانی فەقێ تەیران و تێکستێکی عەرەبیدا»یە، بریتیە لە کارێکی بەراوردکاری. لێکۆڵینەوەی بەراوردکاریش «لە پەیوەندی ئەدەبی نێوان دوو نەتەوە یان دوو نوسەر دەکۆڵێتەوە کە بەرهەمەکانیان لەیەک بچن و لەدوو نەتەوەی جیاواز بن». (طحان، ١٩٧٢: ٨)

ئەم دوو بەرهەمەش هەرچەندە لەڕووی سەردەمی بڵاوکردنەوەوە ماوەیەکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە، بەڵام ڕیشەیان دەچێتەوە سەر یەک و لەزۆربەی ڕووداوەکان هاوبەشن. نکووڵی لەوە ناکرێ کە شاعیرانی کۆنی کورد زیاتر کاریگەری شاعیرانی فارسیان لەسەرە و بەرهەمەکەی فەقێ تەیران لەوەی عەتتار نزیکترە نەک لەتێکستە عەرەبیەکە؛ چونکە هەردووکیان بەشیعرن و پاڵەوانی سەرەکییان شێخی‌سەنعانە. بەڵام لەبەر ئەوەی بەپێی زانیاری من تائێستا تێکستە عەرەبیەکە لەگەڵ «شێخی سەنعان»ی فەقێ تەیران بەراورد

نەکراوە، بۆیە هەوڵدرا ئەمکارە جێبەجێ بکرێ. ئەگەر فەقێ تەیران دەقە عەرەبیەکەشی نەدیبێ، ئەوا لە عەتتاری وەرگرتووە و عەتتاریش لەسەرچاوە عەرەبیەکانی وەرگرتووە.

دان و وەرگرتنی ئەدەبی لە نێوان گەلاندا بەردەوام بووە و هەر بەردەوام دەبێ؛ چونکە «ئەدەبی نەتەوایەتی بەرهەمی بەهرەی ئەدەبەکانی تر هەڵدەمژێ و سوودیان لێ دەبینێ. لە هەمان کاتیشدا ڕەسەنایەتی خۆی دەپارێزێ و شەقڵی نەتەوایەتی ناشکێنێ» (گەردی، ١٩٧٨: ١٧).

ئەم دوو تێکستە دەتوانرێ پرۆگرامی قوتابخای ئەدەبی بەراوردکاری فەرەنسی و بنەماکانی دەقئاوێزانی (التناص) لەسەر جێبەجێ بکرێت. زاراوەی دەقئاوێزان لەزمانی ئینگلیزی و فەڕنسی دانراوە (الزعبی، ١٩٩٥: ٩). لە عەرەبی وشەی (التناص)ی بۆ بەکار هاتووە کە بەواتای Intertextuality بۆ چەند دەقێک دێ کە یەکدی لەباوەش دەگرن (لولو، مجله الاقلام: ژ١٠: ٢٧).

ئەم زاراوەیە لە زمانی فارسیدا بەم شێوەیە هاتووە «آمیختن»؛ بەواتای تێکەڵ کردن، هەروەها «آمیختە کردن». بۆ نمونە «درحال آویختن»؛ واتە: لەدۆخی هەڵواسیندا. لە زمانی کوردیشدا زاراوەی «دەقئاوێزان»ی بۆ بەکارهێنراوە کە لە «تناص»ی عەرەبیەوە وەرگیراوە؛ دوای ئەم گوتە کورتە بەرەو لایەنی پراکتیکی لێکۆڵینەوەکە هەنگاو دەنرێ و بە نموونە تێکستەکان و بۆچونەکان دەسەلمێندرێن (معین: ٩٣).

## لایەنی پراکتیکی لێکۆڵینەوەکە

### جیاوازییەکان:

١ –دەستپێکردنی تێکستەکان: فەقێ تەیران وەکو شاعیرێکی موسڵمان بەناوی خودا دەستی پێکردووە؛ چونکە هەرکارێ بەناوی خودا دەستی پێنەکرێ، بێ خێرە: «کل أمر ذی بال صم یبدأ باسم الله فهو أبتر» (رازی، ٢٠٠٠: ١٦٣).

پاشان وەسفی خودا و سیفەتەکانی خودا دەکا و هەموو عەشقێک بۆ خودا دەگێڕێتەوە و لەهەمان کاتدا خودا دەکاتە دڵدار و دولبەر؛ چونکە لەسەرەتادا خودا عاشقی جوانی خۆی بووە:

فەقێ تەیران:

گوهـ دێرن نوتقا عاشقێ　　دا ئەز بخوونم ڤێ خەتێ
حەمد و سەنایا خالقێ　　سوبحان ژ شاهێ قودرەتێ
سوبحان ژ شاهێ زولجەلال　　فکریمە نەقشێ بێ زەوال
حال بێ مەجاز نائێتە بال　　کامل دبت د ئولفەتێ
عاشق تویی دولبەر تویی　　نازیر تویی مەنزوور تویی
ڕووحێ رووحان گەوهەر تویی　　میسباح و دوڕا قیمەتێ (فەقێ تەیران، ٢٠٠٦: ٣١٣)

بەڵام حەکایەتە عەرەبیەکە بێ پێشەکی بە شێوازی گێڕانەوە دەست پێدەکات بێوەسف و ڕازاندنەوە و هەڵبژاردنی وشەو خولقاندنی کەشێکی شیعری و ستایشکردنی خودا: «حکی انه کان بمدینه بغداد رجل یعرف بابی عبدلله الاندلسی ...» (المحلی: ١٥٣).

٢ - لای فەقێ تەیران شێخەکە شێخی سەنعانە و ٥٠٠ موریدی هەیە، بەڵام لە تێکستە عەرەبیەکە شێخەکە ناوی «ابو عبدلله اندلسی»یە و خاوەنی «١٢٠٠٠» موریدە، بۆ نمونە:

فەقێ تەیران:

شەیخەک هەبوو سەنعانیان سەرداری پانسەد سۆفیان (فەقێتەیران، ٢٠٠٩: ٣١٣).

تێکستە عەرەبیەکە:

«کان بمدینة بغداد رجل یعرف بأبی عبدالله الآندلسی وکان شیخاً لکل من العراق ... وعدد مریده اثناعشر ألفاً» (المحلی: ١٤٣). سەرەڕای ئەمە، لای فەقێتەیران سەردەمەکەی دیارنییە و شوێنەکەی «یەمەن»ە؛ بەڵام لە سەرچاوە عەرەبیەکە شوێنەکەی بەغدایە و شێخ لە سەردەمی «شبلی و جونێد»دا ژیاوە کە دەکاتە کۆتایی سەدەی سێهەمی کۆچی؛ چونکە جونێد لە ٢٩٧ کۆچیدا مردووە.

٣- لە سەرچاوە عەرەبیەکە، وەکوو حەکایەتێ ئەم داستانە دەگێردرێتەوە و لە توێی دوو لاپەڕەدایە و گرنگی بە لایەنی ئەدەبی نەدراوە و لەوەی فەقێ واقیعیترە؛ بەڵام لای فەقێ تەیران پۆشاکێکی سۆفیانەی بە بەردا براوە و باسی لایەنەکانی دەروونی سۆفی دەکات لە: جەزبە و حاڵ و مەقامی سۆفیانە. هەروەها بەدرێژی وەسفی شێخ دەکات لە هەموو لایەنێکی دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و ڕۆشنبیریەوە و پێوەنانێکی زۆری پێوە دیارە، بێگومان ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە شیعرە و شیعریش پێویستی بەم جۆرە ڕازاندنەوانە هەیە:

فەقێ تەیران:

جەزبە چ ڕەمزا چاڤییە مەبدە چ حاڵی خافییە

تێتن د دلدا تاڤییە مەوجەک ژ بەحرا حیکمەتێ (فەقێتەیران، ٢٠٠٩: ٣٢٤).

تێکستە عەرەبیەکە:

دەقەکە حەکایەتئامێزە و حەکایەتخوانی هەمووشتزان دەیگێڕێتەوە و دوورە لە ڕەوانبێژی و وەسفی شیعریانە «کان بمدینة بغداد رجل ...» (المحلی: ١٥٣).

لایەنێکی دیکەی سۆفیانە لەدەقەکەی فەقێ تەیراندا ئەوەیە کە شێخ جوانی خوایی لە دەم و چاوی کچەکە بینیوە بۆیە عاشقی بووە؛ چونکە سەرچاوەی جوانییە و جوانییەکەی هەمیشەییە و لەناو ناچێت؛ بۆ نمونە:

نارێ کچێ داگر هناڤ دێما کوتێدا نوورو تاڤ

عەکسا ئیلاهی هاتە ناڤ موزهیر دییە سەبر ژێ نەتێ (فەقێتەیران، ٢٠٠٩: ٣٤٩-٣٥٠).

٤- شێخی سەنعان و حەجکردن:

له تێکسته عەرەبیەکەدا باسی حەجکردنی تێدا نییه، بەڵام فەقێ‌تەیران لەچەند جێگایەک له داستانی شێخی سەنعانەکەیدا باسی ئەوە دەکات که شێخ حاجیه و پەنجا حەجی کردووە و خاوەن کەرامەته.

فەقێ تەیران:

شەیخێ مه شەیخەک حاجیه حەمیان کەرامەت ژێ دیه (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٥٦).

ئەو تاعەتێ تەی بێ حیساب پەنجه حەج و پەنجه سەواب (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٨١).

٥- تەمەنی شێخ: لای فەقێ‌تەیران تەمەنی ٧٧ ساڵه و له بەیته شیعرێکدا دەڵێ نزیکی هەشتا ساڵ بووە، بەڵام لەحەکایەته عەرەبیەکه باسی تەمەن نەکراوە:

فەقێ تەیران:

هەفتێ و هەفت ساڵی تەمام خالی نەبوو ژڤێ خدمەتێ (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٢٨)

ئەو پیرەمێری کال بوویی نێزیکی هەشتێ سال بوویی (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٥٣).

٦- چۆنیەتی دیتنی کچەکه لەلایەن شێخەوە: له حەکایەته عەرەبیەکه شێخ بۆ گەشت دەچێ و ڕێگەی دەکەوێته گوندێکی گاورەکان و لەوێ عەشقی کچەکه بووە؛ بەڵام لای فەقێ‌تەیران، شێخ خەون دەبینێ و له خەونیدا حۆریەکی بەهەشت لەسەربانی کەنیسەکەوە بۆی دەردەکەوێ و پێکی مەی دەداته شێخ و پێی مەست دەبێت، ئەوجا سۆفیەکان لەگەڵ شێخ تەکبیر دەکەن که بگەنه ئەو شوێنه و که دەچن دەست به زیکر کردن دەکەن و کچەکه لەپەنجەرەوە خۆی نیشان دەدا و شێخ، عاشق و گیرۆدەی داوی دەبێت:

فەقێ تەیران:

| | |
|---|---|
| با تینی کچ ڤه دخوینێ | پەردەیێ ژبەر خوە هلتینێ |
| شێخ دخەونیدا دبینێ | جام و تاسەک مەی ددەتێ (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٣٧). |
| سۆفی جەڤیابوون ب شەڤه | حەتتا ستێرا سەعادەتێ (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٥٧). |
| وێ ساعەتێ سوارکرن | زاد و زەوادە کارکرن |
| قەسدا کچا کوففار کرن | یا ڕەب تو خێر کەی نییەتی (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٥٩). |

تێکسته عەرەبیەکە:

«فخرج فی بعض السِنین الی الساحة و معه جَماعة من أصحابه مثل الجنید و الشبلی وغیرهما من مشایخ العراق ... الی أن وُصَلنا الی قریة من قری الکفار... وإذا نحن بکنائس... ثم انصرفنا الی بئر فی أخر القریة وإذا نحن بجوار یستقین الماء علی البئر و بینهن جاریة حسن الوجه... فلما رأها الشیخ تغیر وجهه ...ثم اقام ثلاثة أیام لاتأکل ولاتشرب ...». (المحلی: ١٥٣).

هەروەها لەتێکسته عەرەبیەکەدا که شێخ چاوی بەو کچه دەکەوێ که وا ئاو دەکێشێ، دەپرسێ: بۆچی باوکی نازی ڕاناگرێ و ئاوی پێدێنێ؟ گوتیان: باوکی بۆ ئەوەیەتی هەرکه مێردی کرد ڕێزی پیاوەکەی بگرێ و خزمەتی بکات، ئەم خاڵه جۆرە واقیعیەتێک بەحەکایەتەکه دەدات؛ بۆ نمونه: «فقال الشیخ: لم لایدللها أبوها

ویکرمها ولایدعها تستقی الماء؟ فقیل له أبوها یفعل ذلک بها حتی اذا تزوجها رجل أکرمته و خدمته ولا تعجبها نفسها ...». (المحلی: ١٥٣).

٧- هاوڕێیەکانی شێخ: لە حەکایەتە عەرەبییەکەدا شبلی و جونێد و شێخەکانی عێراق لەگەڵ شێخدان و شبلی حەکایەتەکە دەگێڕێتەوە؛ بەڵام لای فەقێ‌تەیران ناوی کەس نییە و تەنیا موریدەکان لە بەردەم کچەکە زیکریان دابەستووە بۆ ئەوەی کچەکە خۆی نیشا بدا و شێخ بەدی بکات:

فەقێ تەیران:

| | |
|---|---|
| عاشق لە مەعشووق فەڕ جی | بەحرا ئەڤینێ مەوجی |
| مورشید دخوونێ کە پچی | ژ تیرا کڤانێ جەبهەتێ (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٦٨). |

لەم بەیتەی سەرەوەدا شێخ خەڵتانی خوێنە و پێکاوی تیری ناوچەوانی کچەکەیە و دەریای ئەوینی شەپۆلی داوە.

| | |
|---|---|
| چەشمێ دوێ حووری پەچێ | سۆفی ژ عەشقا وێ کچێ |
| چەرخان ددەن ل دێرا نەچێ | زاهید بکەن بۆی حوججەتێ (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٦٦). |
| دەنگی موریدان چوو فەلەک | دێرا کو راهیب تێ گەلەک |
| واهاتە پێش پا چاڤبەلەک | هاتە شباکا قیبلەتێ (فەقێ‌تەیران، ٢٠٠٩: ٣٦٧). |

تێکستە عەرەبییەکە:

«قال الشبلی: فتقدمَت الیه فقلت یا سَیدی أن اصحابک و مریدیک یتعجبون من سکوتک ... قال: یاقوم! اعلموا ان الجاریة التی رأیتها أمس قد شغفت بها حباَ ...». (المحلی: ١٥٣).

٨- گەڕانەوەی هاوڕێیەکانی شێخ بۆ بەغدا: لەسەرچاوە عەرەبییەکە دوای ئەوەی شێخ گیرۆدەی کچەکە دەبێ، ئەوانیش بەناچاری دەگەڕێنەوە بۆ بەغدا و هەندێ لە شێخ و موریدەکان –کە گوێیان لەو خەبەرە دەبێ- لە داخاندا دەمرن و خانەقا و تەکیەکان دەرگایان دادەخرێن. بەڵام لە داستانەکەی فەقێ‌تەیران ئەمانە نین.

تێکستە عەرەبییەکە: «ثم انصرفنا عنه راجعین الی بغداد، فخرج الناس الی لقائه فلم یروه، فسألوا عنه، فعرفناهم بماجَری، فمات من مریده جماعة کثیرة حزناً علیه... وغلقت الرباطات والزوایا والخوانق». (المحلی: ١٥٣).

٩- باوکی کچەکە و مەرجی بەشوودانی کچەکەی: لە تێکستە عەرەبییەکە کچەکە کچی گەورەی گوندەکەیە و کچەکە باوکی ماوە و کە شێخ داوای کچەکەی لێدەکات، باوکی مەرجی بوونە مەسیحیەتی بۆ دادەنێ؛ بەڵام لای فەقێ‌تەیران باوکی کچەکە دیار نییە و کچەکە خۆی مەرجەکانی بەسەر شێخدا دەسەپێنێ.

فەقێ تەیران:

| | |
|---|---|
| دلبەر دبێ یا مێر مەزن | ئیرۆ ژتە تێتن کفن |

محەمەدی ناخۆن لمن — ئەز عیسایی تو سوننەتێ (فەقێتەیران، ۲۰۰۹: ۳۹۹).
ئەر قەبوول دکەی زنارەکێ — هەڕۆ هەڕۆ ئێڤارەکێ
ئەز تە ڤەخوینم جارەکێ — ب هەیجە تازیا فەتێ (فەقێتەیران، ۲۰۰۹: ٤٠١).
روونین ل سەر دینا شەڤێ — ئەر شەیخ دسوو ژی مسحەفێ
راستە جەمالا من دڤێ — حەق و یەقین من ب تەنێ (فەقێتەیران، ۲۰۰۹: ٤٠٢).

تێکستە عەرەبیەکە:

«فقیل له ابنة ملک هذه القریة… قالوا انه خطب الجاریة من ابیها فأبی أن یزوجها الا ممن هو علی دینها و یلبس العباءه ویشد الزنار …». (المحلی: ۱۵۳).

۱۰- برادەرانی شێخ، پێغەمبەر(د.خ) لەخەوندا دەبینن:

فەقێ تەیران لای وایە کە سۆفیەکانی برادەری شێخ، پێغەمبەریان لەخەوندا بینیوە و موژدەی داونەتێ کە حاڵەتەکەی شێخی سەنعان ڕەحمانییە و نەفسانی نییە؛ کەچی ئەم خەونە لەحەکایەتە عەرەبیەکەدا نییە:

ئەو سۆفییێ ئەوراد ددەڤ — وان مەجلیسەک دانی ب شەڤ
شێخ سەحەرێ چاڤ چوو نەخەڤ — زوو دێ شەفیعێ ئوممەتێ (فەقێتەیران، ۲۰۰۹: ٤٢١)
رووحی وی دی زاتی ڕەسوول — مزگێنیا شەیخ بوو قەبوول
ئیرۆ بدە خەلقێ مەلوول — دا سەح بکین کەرامەتێ (فەقێتەیران، ۲۰۰۹: ٤٢٢)
داهوون نەبێن شەیخ کافرە — زێڕ باتینە، زیڤ زاهیرە
ژ هەردوو وەجهان تاهیرە — عیشقی برە تو هوورەتێ (فەقێتەیران، ٤٢٢)
حالێ ل شەیخ رەحمانییە — داهوون نەبێن نەفسانییە
وی یەک دیە یەک زانییە — دین کرمە یا وەحدانەتێ (فەقێتەیران، ٤٢٢)

۱۱- شێخی سەنعان هاوڕێکانی سەری لێدەدەن:

لەحەکایەتە عەرەبیەکە شێخی سەنعان لە گوندەکە بووەتە بەرازەوان. شبلی دەڵێ: هەموو دڵمان شەقی برد و لە پرمەی گریانمان دا و چوینە لای شێخ و بینیمان لە بەردەم بەرازەکان وەستاوە و کە چاوی بەئێمە کەوت، سەری شۆڕ کرد و قولنسوەی دیانەکانی لەسەر بوو، خۆی خستبووە سەر گۆچانەکەی. ئەم چاوپێکەوتنە لای فەقێتەیران بەدی ناکرێ.

تێکستە عەرەبیەکە:

«قال الشبلی: فانصدعت قلوبنا وانهملت بالبکاء عیوننا وسرنا الیه و اذا به قدام الخنازیر، فلما رأنا نکس رأسه و اذا علیه قلنسوة النلآری» (المحلی: ۱۵۳).

۱۲- پەشیمان بوونەوە و پاڕانەوەی شێخیسەنعان لە خودا:

لە حەکایەتە عەرەبیەکە باسی پەشیمان بوونەوە و پاڕانەوەی شێخیسەنعان دەکات لەخودا و شێخ دەریدەخات کە ئەم حاڵەتەی ئەم، جۆرە قینێکی خوایی و دوور خستنەوەیەتی لە خۆی؛ ئەوجا ڕوو لە شبلی

دەکا و پێی دەڵێ پەند لەم ڕووداوە وەربگرە. شبلیش دەستی بە پاڕانەوە کرد و کە بەرازەکان گوێیان بە نوزانەوە و پاڕانەوەی شبلی و هاوڕێکانی بوو، ڕووی خۆیان لەزەوی خشاند و قیژەیەکی گەورەیان لێوە هات، هەر دەتگوت قیامەت داهاتووە؛ کەچی لە لای فەقێ‌تەیران سۆفیەکان داوا لە شێخی عەتتار دەکەن کە چارەیەکیان بۆ بکا و شێخی‌سەنعانیان بۆ بگێڕێتەوە. شێخی عەتتاریش داوا لە سۆفیەکان دەکا بچنەوە لای شێخ و دوعای بۆ بکەن. لێرەدا تەنیا گەڕانەوەی برادەرانی شێخی‌سەنعان بۆ لای شێخ دووبارە بۆتەوە. بەڵام ناوەکان گۆڕاوە و لە سەرچاو عەرەبیەکە شبلیە و لای فەقێ‌تەیران باسی شێخی عەتتار دەکات؛ کەچی عەتتار خۆی ناگەڕێتەوە و موریدەکانی شێخی سەنعان دەنێرێ:

فەقێ تەیران:

| | |
|---|---|
| ئەو مورشیدێ شیرین نەزەر | بەهەڤ کرن ساحێب کەمەر |
| حەمیان ژ مال هەودانەسەر | ژ زاکیران هنگامەتێ (فەقێ‌تەیران: ٤٢٠) |
| ئەووەل گهانە جا یەکێ | ئیشەق بکین سەمایەکێ |
| ڤێکرا بکین دوعایەکێ | کانی نابینن روئیەتێ (فەقێ‌تەیران: ٤٢١) |

تێکستە عەرەبیەکە:

«فقال یا أخوانی و احبابی لیس لی من الآمر شیئ، سیدی تصرف کیف شاء وحیث أراد أن أبعدنی عن بابه بعد أن، کنت من جملة احبابه، فالحذر الحذر یا أهل وداده من صده وابعاده، والحذر الحذر یا أهل المودة والصفاء من القطیعة والجفاء... و نادی یا شبلی اتعض بغیرک/فنادی الشبلی بأعلی صوته بک المستعان وأنت المستغاث أکشف عنا هذه الغمة ... فلما سمعت الخنازیر بکائهم اقبلت الیهم وجعلت تمرغ وجهها بین أیدیهم وزعقت زعقة واحدة دویت منها الجبال، قال الشبلی: فضننت أن القیامة قد قامت». (المحلی: ١٥۴).

١٣-گفتوگۆی شبلی و شێخی سەنعان:

دوای ئەوەی بەرازەکان قیژاندیان، شبلی بەشێخی‌سەنعان دەڵێ: لەگەڵمان ناگەڕێیتەوە بەغدا؟ شێخ گوتی: چۆن بگەڕێمەوە؟ پێشان دڵی موریدەکانم پەروەردە دەکرد و ئێستا بەراز پەروەردە دەکەم. شبلی گوتی: تۆ قورئانت هەموو لەبەر بوو، ئێستا چیت لەبەرماوە؟ شێخ گوتی تەنیا ئەم دوو ئایەتەم لەبەرماوە «ومن یهن الله فما له من مکرم إن الله یفعل مایشاء؛ ومن یتبدل الکفر بالإیمان فقد ظل سواء السبیل». ئەوجا شبلی پێی‌گوت: یا شێخ تۆ ٣٠٠٠٠ حەدیست لەبەر بوو، ئێستا چیت لەبەرماوە؟ شێخ گوتی: تەنیا ئەمەم لەبیر ماوە «من بدل دینه فاقتلوه». بەڵام ئەم گفتوگۆیە لای فەقێ‌تەیران دەس ناکەوێ.

تێکستە عەرەبیەکە:

«قال الشبلی: فقلنا له هل لک أن ترجع معنا الی بغداد؟ فقال: کیف لی بذلک و قد استرعیت الخنازیر بعد أن کنت ارعی القلوب. فقلت: کنت تحفض القرآن وتقرؤه بالسبع فهل بقیت تحفظ منه شیئاً؟ فقال: نسیت کله الآ أیتین "ومن یهن الله فما له من مکرم أن الله یفعل مایشاء / ومن یتبدل الکفر بالآیمان". فقلت یا شیخ کنت

تحفظ ثلاثین ألف حدیث فهل تحفظمنها شیئاً؟ فقال: حدیثاً واحداً و هو قوله(ص) "من بدّل دینه فاقتلوه"». (المحلی: ۱۵۴).

هەروەها لە حەکایەتەکەدا هاتووە: هەرکە شێخ بوویەوە موسڵمان، هەرچی قورئان و حەدیسی لەبەربوو هەمووی بە بیر هاتەوە و بەزێدەکیەوە: «وردَّ الله علیه ماکان نَسیه من القرأن والحدیث وزاده علی ذلک» (المحلی: ١٥٤).

١٤- هۆی وەرگەڕانی شێخیسەنعان لە ئایینەکەی:

لە سەرچاوە عەرەبیەکە دوای ئەوەی شێخیسەنعان لە گاوری دەگەڕێتەوە سەر موسڵمانی، هاوڕێیە سۆفیەکانی هۆی سەرەکی وەرگەڕان و گاوربوونی لێدەپرسن. ئەویش وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ: هەرکە سەرەتا هاتینە گوندەکە و بەلای هەندێ لەکەنیسەکاندا ڕەتبووین، لەدڵی خۆمدا گوتم: دەبێ ڕێزی ئەو ڕەبەن و قەشانە لای منێکی باوەڕدار و یەکتاپەرست چی بێت؟ لە ناخەوە بانگیان کردم و پێم گوترا ئەمە کاری تۆ نییە و گەر دەتەوێ تێتدەگەیەنین. ئیدی هەستم کرد باڵندەیێ لەدڵمەوە دەرچوو و فڕی، ئەو باڵندەیەش ئیمان بوو. بەڵام لای فەقێتەیران ئەم مۆنۆلۆگە نییە؛ هەرخەونەکەیە کە پێشتر باسکراوە.

تێکستە عەرەبیەکە:

«فقلنا له بالله نسألک هل کان لمحنتک من سبب؟ قال: نعم، لما وردنا القریة و جعلتم تدورون حول الکنائس، قلت فی نفسی ما قدر هؤلاء عندی وأنا مؤمن موحد، فنودیت فی سرّی لیس هذا منک و لو شئت عرفناک، ثم أحسست بطائر قد خرج من قلبی فکان ذلک الطائر هو الآیمان» (المحلی: 154).

لەم دەقەدا وادەردەکەوێ کە شێخیسەنعان تووشی کیبر بووە و خۆی بەپیاوچاک داناوە؛ چونکە هەر خودا بەدەروونی مرۆڤ ئاگادارە و ئەمەش بۆچونێکی سۆفیانەی فەلسەفیە کە بەچاوێکی یەکسان سەیری ئایینەکان دەکەن.

١٥- چۆنیەتی گەڕانەوەی شێخیسەنعان بۆ لای سۆفیەکان:

لەدەقە عەرەبیەکە وای نیشانداوە کە دوای ئەوەی سۆفیەکانی هاوڕێی شێخ لە گەڕانەوەی شێخ نائومێد دەبن، هەموویان دەگەڕێنەوە و دوای سێ ڕۆژان دەبینن وا لە بەردەمیانە و شایەتمان دێنێ و داوای جلوبەرگی پاکی لێکردن تا خۆی بگۆڕێ و نوێژ بکات. ئیدی هاوڕێکانی سوپاسی خوایان کرد و لێیان پرسی هۆکاری گەڕانەوەت چی بوو؟ شێخ گوتی: کە ئێوە ڕۆیشتن لە خوا پاڕامەوە و گوتم: بە خۆشەویستیە قەدیمەکەت بمبوورە و من تاوانبارم، ئیتر بە بەخشندەیی خۆی بووردمی و بە سەتری خۆی داپپۆشیم. ئەم جۆرە پرسیار و وەڵامانە لەداستانەکەی فەقێتەیراندا نییە و ئەو زیاتر بەچەند وێنەیەکی سۆفیانە و وەسفی سۆفیانە کۆتایی بەداستانەکە هێناوە.

فەقێتەیران:

گەر د شا وەقتێ وجوودێ      شەیخ برە عەینێ شهوودێ

سۆفییان بەردا سجوودێ      ژ حەق د خوازن مینەتێ

سەجدەیا شوکرێ تەمام کر　　　موعجیزا شەیخ دی وەتام کر
دلبەرێ ئەووەل سەلام کر　　　خۆە ژ شەرمان ڤێکەتێ (فەقێتەیران: ٤٤١)

شێخی‌سەنعان کەوتۆتە حاڵەتی شهوودەوە؛ واتە: لەڕێگای دڵبینییەوە ئەو ڕێگای نیشاندرا کە دووبارە بەرەو ئیسلام دێتەوە و سۆفیەکانیش کوڕنووشی سوپاسیان برد.

دەقە عەرەبیەکە:

«فصف لنا ما جرى لک وکیف کان أمرک؟ فقال: یا قوم لما ولیتم من عندی سألته بالوداد القدیم و قلت له یا مولای أنا المذنب الجانی فعفا عنی بجوده و بستره غطانی...». (المحلی: 154).

١٦- هاتنی کچە مەسیحیەکە بۆ لای شێخی‌سەنعان و موسڵمان بوونی:

لە دەقەکەدا باسی هاتنی کچەکە و موسڵمان بوونی دەکات، بەڵام چۆنیەتی هاتنەکەی بۆ لای شێخی-سەنعان جیاوازیان هەیە. لەتێکستە عەرەبیەکە بەمجۆرەیە: هەرکە سۆفیەکان دوای نوێژی بەیانی لای شێخی سەنعان دادەنیشن، یەکێکی ڕەشپۆش لە دەرگا دەدا ودەڵێ: بە شێخ بڵێن جاریە ڕۆمیەکەی گوندەکە هاتووە بۆ خزمەت کردنتان. شێخ زەرد هەڵگەڕا و وتی با بێتە ژوورەوە. کە هاتە ژوورەوە، لە پرمەی گریانی دا. شێخ گوتی «کێ تۆی گەیاندە ئێرە؟» کچەکە گوتی: «هەرکە لەگوندەکەمان ڕۆیشتی، یەکێ خەبەری پێدام و شەوێ ئارامم لێبڕا و لە خەونمدا پیاوێکم بینی و پێی گوتم: "گەر دەتەوێ ببیە ئیماندار واز لە ئایینەکەت بێنە و بەدوای شێخ بکەوە"؛ گوتم: "ئاینی شێخ چیە؟" گوتی: "ئیسلامە". گوتم: "چۆن بچمە سەر ئیسلام؟" گوتی: "شایەتمان بێنە". کە شایەتمانم هێنا و گوتم: "چۆن بگەمە شێخ؟" گوتی: "دەستت بدە من و چاوت بنووقێنە". چاوم نووقاند. گوتی" "چاوت بکەوە"، کە چاوم کردەوە بینیم لەسەر کەناری دیجلەم. گوتی: "بڕۆ ئەو خانەقایە و سەلامی من بەشێخ ڕا بگەیەنە و بڵێ خدری برات سەلامت لێ دەکات"».

لە داستانە کوردیەکە ئەم ڕووداوانە بە بەرچاو ناکەوێ و شێخی‌سەنعان بە شێخی‌عەتتار دەڵێ: کچە مەسیحیەکە وا بەڕێوەیە و بۆ لای من دێت، ئەمەش جۆرە کەرامەتێکی شێخە کە دڵی خەبەری پێداوە.

فەقێ تەیران:

شەیخ گۆتی یا شێخ عەتتارە　　　ناز کا من ئیختیارە
خالقێ ژ دێرێ هنارە　　　ڕێ گرتیە پێ پێ مەتێ
تێ ب لەز شوبهەتێ بایێ　　　ل فەرەسێ چەنگ ژ هەوایێ
د مەنزلا سانی گهایێ　　　ڕۆژ د پۆشت روکبێ کەتێ　(فەقێتەیران: ٤٤٠)

تێکستە عەرەبیەکە:

« فبینما نحن جلوس عنده فی بعض الأیام بعدصلاة الصبح واذا نحن بطارق یطرق باب الزاویة فنظرت من الباب فإذا شخص ملتف بکساء اسود فقلت له ما الذی ترید؟ فقال: قل لشیخکم ان الجاریة الرومیة التی ترکتها بالقریة الفلانیة قد جاءت لخدمتک. قال: قد خلت، فعرفت الشیخ فاصفر لونه وارتعد ثم امر بدخولها. فلما دخلت

علیه بکت بکاءاً شدیداً، فقال لها الشیخ: کیف کان مجیئکِ ومن أوصلک الی ههنا؟ قالت: یاسیدی لما ولیت من قریتنا جاءنی من اخبرنی بک فبت و لم یأخدنی قرار فرأیت فی منامی شخلاً و هو یقول: ان احببتِ ان تکونی من المؤمنات فاترکی ما أنت علیه من عبادة الاصنام واتبعی ذلک الشیخ و ادخلی فی دینه، فقلت: ومادینه؟ قال دین الاسلام. قلت: وماهو؟ قال: شهادة أن لااله الا الله و أن محمّد رسول الله، فقلت: کیف لی بالوصول الیه؟ قال:اغمضی عینیک و اعطینی یدیک، ففعلت فمشی قلیلاً ثم قال: افتحی عینیک ففتحتهما فأذا أنا بشاطئ الدجلة، فقال: إمضی الی تلک الزاویة و اقرأی الشیخ منی السلام و قولی له: أن أخاک الخضر یسصم علیک» (المحلی: 154).

بەگشتی ئەم خاڵانەی کە ئاماژەیان پێکرا خاڵی سەرەکی جیاوازیەکانن و گەر بە وردی هەمووی بەراورد بکرێت، ئەو هەویرەکە ئاوێکی زۆری دەوێ و جۆرە درێژداڕی و بێزاریەک دەنوێنێ.

### تەوەرەی دووەم

**لێکچوونەکان:**

١- هەڵگەڕانەوەی شێخێکی تەریقەت لەعەشقی حەقیقیەوە بەرەو عەشقی مەجازی: لە هەردوو دەقەکەدا شێخێکی بە ساڵاچووی خاوەن تەریقەت و خانەقا و موریدێکی زۆر، لە گەشتێکدا کە چاوی بە کچە مەسیحیەک دەکەوێ، عاشقی دەبێ:

فەقێ‌تەیران:

| | |
|---|---|
| شەیخ ل خوە ناکەت ستارە | ئاشکەرە خەون گۆتەیارە |
| ئاە ژ دەست دۆهتا کوففارە | برمە دینێ شیر کەتێ (فەقێ‌تەیران: ٢٤٦). |

تێکستە عەرەبیەکە:

«فلما رأها الشیخ تغیر وجهه ... وقال یاقوم اعلموا ان الجاریة التی رأیتها امس قدشغفت بها حبآ» (المحلی: 153)

٢- لە هەردووکیان شێخ بۆ کچەکە دەبێتە مەسیحی و زوننار دەبەستێ و بەرازەوانیشی بۆدەکات:

فەقێ تەیران:

| | |
|---|---|
| بێ مەزهەب و بێ دین کرم | بێ خووندن و یاسین کرم (فەقێ‌تەیران: ٢٤٦) |
| هەم نووکرم هەم بەد کرم | عیسایی بێ مورتەد کرم (فەقێ‌تەیران: ٢٤٧) |
| ژڤێ تەریقێ رەد کرم | کافر کرم بێ مروەتێ (فەقێ‌تەیران: ٢٤٨) |
| ئەر قەبوول دکەی زنارەکێ | هەرِۆ هەرِۆ ئێڤارەکێ |
| ئەز تە ڤەخوینم جارکێ | ب هەیجە تا زیافەتێ (فەقێ‌تەیران: ٤٠١) |

تیکستە عەربیەکە:

«أنه خطب الجارية من أبيها فأبى أن يزوجها الا ممن هو على دينها ويلبس العباءة ويشد الزنار... ويرعى الخنازير...» (المحلى: 153).

٣- شێخ خاوەنی موریدێکی زۆرە و بۆی بە پەرۆشەوەن: لەهەردوو تێکستەکەدا شێخ ڕابەری تەریقەتی سۆفیانەیە و ژمارەیەکی زۆر موریدی هەیە. لە حەکایەتە عەرەبیکە ١٢٠٠٠ه و لای فەقێ تەیران ٥٠٠ موریدە. هەروەها هەموو موریدەکان خەمی لێدەخون و بە بەردەامی لە هەوڵی ئەوەدان کە شێخی سەنعان پەشیمان بکەنەوە و بیبەنەوە شارەکەی خۆی.

فەقێ تەیران:

شەیخەک هەبوو سەنعانیان سەرداری پانسەد سۆفییان

چوو بوو مەقامی ئەولییان دائیم د زیکر و تاعەتێ (فەقێتەیران: ٣٢٣)

ئاه و فیغان دەربوون هەزار هنگی هەبوون دەروێش و یار

هەمیان ل شەیخ دکر پرسیار با ژار و ئەهلێ هیشەتێ (فەقێتەیران: ٣٣٩)

تێکستە عەرەبیەکە:

«قال الشبلي: فقلت يا سيدي انت شيخ أهل العراق و معروف بالزهد في سائر الأفاق و عدد مريديک أثناعشر الفاً ... فخرج الناس الى لقائه و مريده و في جملة الناس فلم يروه، فسألوا عنه فعرفناهم بما جرى فمات من مريده ... وجعل الناس يبكون و يتضرعون الى الله تعالى أن، يرده عليهم» (المحلى: 153).

٤- عەشقی شێخ و وەرگەڕانی لە ئایین بە ویست و قەدەری خوا بووە: هەردوو تێکستەکە بەگشتی لەسەر ئەو باوەڕەن و فەقێتەیران زیاتر لەسەری دەڕوا؛ ئەم ڕووداوە بەرەو ئەزەل دەباتەوە کە قەڵەمی قودرەتی خوایی نووسیویەتی و مەرەکەبەکەی وشک بووەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی دەقە عەرەبیەکە کورتە بەچەند وشەیەک هێمای بۆکردووە.

فەقێتەیران:

بێ مەشیەتا میر نابتن حەتتاکو تەقەدیر نابتن

قیسمەت بێ تەدبیر نابتن زێدە ژ میقدارێ نەتێ (فەقێتەیران: ٣٨٤)

هنگی قسە هنگی شوغل دەفتەر کرن رۆژا ئەول

با خۆی بخوە موهر کر سجل ئاڤێت بەرا تا حوجەتێ (فەقێتەیران: ٣٨٥)

حەمیان قەلەم هنگافت ژبوو هەم شاد و غەم هەم نیک و نوو

فیلحال قەلەم حشکبوو چوو هوور بوو ل سەر کیتابەتێ (فەقێتەیران: ٣٨٥).

تێکستە عەرەبیەکە:

« فقال: يا قوم جرى القلم بما حكم ... وقال يا قوم انصرفوا فلقد نفذ القضاء والقدر» (المحلى: 153).

٥- پێکنەگەیشتنی شێخ و کچەکە:

شێخی سەنعان و کچە مەسیحیەکە لە هەردوو تێکستەکەدا بەیەکدی ناگەن و بە هیوای ئەوەن کە لە ڕۆژی بەپابوونەوەدا بەیەک بگەن. ئەمە ئاماژەیە بە پاکی عەشقەکەیان و زاڵبوونی کەشی سۆفیانەیە بەسەر دەقەکاندا. هەروەک لە «لەیلا ومەجنون» و «مەم و زین»یشدا لەڕۆژی دوایی پێکدەگەن، بۆ نمونە:

فەقێ تەیران:

ل حەزرەتا هەڤ ناگرن ل بەر سورێ ناسەبرن
هەردوو ب هەڤرا دمرن ل وێ گهانە وەسڵەتێ (فەقێتەیران: ٤٤٣)
ژ وەسلەتا حالەک وەدی هەردووب لبسێ جەسەدی
چوونە حەیاتا ئەبەدی زاڤا و بوکێ ئاخیرەتێ (فەقێتەیران: ٤٤٤)

تێکستە عەرەبیەکە:

«فقال: لاتبکی فأن اجتماعنا غداً فی القیامة فی دار الکرامة» (المحلی: 154).

٦- پەشیمان بوونەوەی شێخ و گەڕانەوەی بۆ ئیسلام:

هەردوو سەرچاوە کوردی و عەرەبیەکە باسی گەڕانەوەی شێخ دەکا بۆ ئیسلام لەگەڵ هەندێ جیاوازی. لەعەرەبیەکەدا شێخ بە خۆی دەگەڕێتەوە و خۆی لە ڕووبارێ دەشوا و شایەتمان دێنێ و داوا لەسۆفیەکان دەکات جلوبەرگێکی پاکی بدەنێ، کەچی لای فەقێتەیران: شێخ عەتتار، شێخیسەنعان دێنێتەوە و بە ئاوی ڕەحمەت پاکی دەکاتەوە و زوننارى لە پشت دەکاتەوە. لە هەر دوو تێکستەکەدا هاوڕێیەکانی شێخ زۆر شاد و دڵخۆش دەبن بەگەڕانەوەی.

فەقێتەیران:

شەیخ بوویە دۆلاب ل دەشتێ مەلەکێ هادی گەهشتێ
وی زنار ئاڤێت ز پوشتێ شوشتی ب ئاڤا ڕەحمەتێ (فەقێتەیران: ٤٢٦)
مەلەکێ هادی بخار هات قیسەتا مورشید بکارهات
شەیخ بدەستی شێخ عەتتار هات هەروەکی ژ کەعبە ڤەتێ
دورِ ژ بەحرا نوون و کافێ شەیخ عەتتار ئینا کەشافێ
سۆفیان بەردا تەوافێ خاچ حەبینێ دل کەتێ
دل کەتە زیکر و سەمایێ گازیبا بانگا فەزایێ (فەقێتەیران: ٤٢٧)
دلبەری ل «دێرا کەلایێ» سەکنی گوە ددەتێ (فەقێتەیران: ٤٢٨)

تێکستە عەرەبیەکە:

« واذا نحن به أما منا قد تطهر من نهر وكلع وهو یشهد شهادة الحق و هو یجدد اسلامه، فلما رأیناه لم نملك أنفسنا من الفرح والسرور فنظر الینا وقال یاقوم أعطونی ثوباً طاهراً، فأعطیناه پوبا" اُ فالبسه ثم صلی» (المحلی: 154).

٧- هاتنی کچەکە بەدوای شێخی سەنعاندا:

لەهەردوو تێکستەکەدا دوای ئەوەی شێخی‌سەنعان دەبێتەوە موسڵمان و دەگەڕێتەوە شارەکەی خۆی، کچەکە ئارامی لێ دەبڕێ و بەدوای شێخدا دێت. بەڵام لە جۆر و شێوەی هاتنەوەکەیدا جیاوازی هەیە، گرنگ ئەوەیە سەرەتا شێخ چووە سەر ئایینی کچەکە و ئێستا کچەکە دەچێتە سەر ئایینی شێخ و موسڵمان دەبێت.

فەقێ‌تەیران:

| | |
|---|---|
| راهیبان عیللەت نەزانی | هەسپەکی چوون خۆش‌دەرانی |
| دلبەرا شەیخێ یەمانی | پێ بسەر پوشتێ کەتێ (فەقێ‌تەیران: ٤٣٨) |
| بێ‌حیساب لێ دلەزینێ | دەم دەمان وی دتەزینێ |
| ژ موحبەتا شەیخ دبەزینێ | با ببەر زولفان کەتێ (فەقێ‌تەیران: ٤٣٩) |
| سۆفییان شەرما کچێ کر | وان ژ دوور زیکرێ خودێ کر |
| هوون بنێ قۆجە ج چێکر | کچ گەهاندە تەوبەتێ (فەقێ‌تەیران: ٤٤٢) |

تێکستە عەرەبیەکە:

« و اذا نحن بطارق یطرق باب الزاویة فنظرت من الباب فأذا شخص ملتف بکساء اسود ... قل لشیخکم ان الجاریة الرومیة ... قد جاءت لخدمتک ... فقلت ومادینه؟ قال: دین الاسلام. قلت و ماهو؟ قال: شهادة أن لااله الا الله». (المحلی: 154).

## ئەنجام:

نووسەر لە لێکۆڵینەوەکەیدا گەیشتە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- فەقێ تەیران و حەکایەتە عەرەبیەکە لە خاڵە سەرەکیەکانی وەکوو سەرەتای داستانەکە و کۆتایی ڕووداوە سەرەکیەکان لێکچوون و لە خاڵە لاوەکیەکان جیاوازن.

٢- لە دەقە عەرەبیەکەدا شێخی‌سەنعان خەڵکی بەغدایە و تا کۆتایەکانی سەدەی سێهەمی کۆچی ژیاوە، چونکە هاوڕێی شبلی بووە کە لە٢٩٧ک. مردووە. بەڵام لای فەقێ تەیران شێخ خەڵکی یەمەنە.

٣- تێکستە عەرەبیەکە حەکایەت‌ئامێزە و لای فەقێ‌تەیران هونەری و سۆفیانەیە.

٤- لەدەقە عەرەبیەکە دیتنی کچەکە واقیعیە و لای فەقێ‌تەیران بەخەونە.

٥- لە تێکستە عەرەبیەکە شبلی لەگەڵ شێخ هەوڵدەدا کە بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام، بەڵام لای فەقێ تەیران شێخی عەتتار ئەمەی پێ سپێردراوە.

٦- لە دەقە عەرەبیەکەدا هۆی وەرگەڕانی شێخ خۆ بە زل زانین و کیبرە.

٧- لە هەر دوو سەرچاوەکەدا لە ئەنجامدا شێخ و کچەکە دەبنە موسڵمان.

٨- لە هەر دوو سەرچاوەکەدا بەپێی قەزا و قەدەری خوا، شێخی‌سەنعان لە ئایین وەرگەڕاوە.

٩- لە هەر دووکیاندا شێخ و کچەکە لەقیامەت بە یەک دەگەن.

**سەرچاوەکان:**

فارسیەکان

١- محمّد، غیاث الدین جلال (١٣٦٣) **غیاث اللغات**، به کوشش منصور ثروت، تهران، انتشارات امیر کبیر.

٢- العطار، فرید الدین، **منطق الطیر**.

٣- مینوی، مجتبی، **از خزینۀ ترکی**.

۴- جواد مشکور، محمّد (١٣۴٨) **منطق الطیر فرید الدین العطار**، تهران، چاپخانۀ پیام.

۵- شفیع کدکنی، محمّدرضا (١٣٨٨) **منطق الطیر عطار**، ج٢، تهران، چاپخانۀ مهارات.

۶- معین، محمّد، **فرهنگ فارسی**.

٧- مرتضوی، منوچهر (١٣٨۴) **مکتب حافظ یا مقدمه‌ای بر حافظ شناسی** ، تبریز، انتشارات ستوده، چاپ گلشن، چاپ۴.

عەرەبیەکان

8- الزغبی، أحمد (1995) **التناص نظریاً و تطبیقیاً**.

9- طحان، ریمون (1972) **الأدب المقارن والأدب العام**، بیروت، دارالکتاب اللبنانی.

10- المحلی، شهاب الدین محمّد بن احمد أبی الفتح الابشهی، **المستطرف فی کل فن مستظرف**.

11- لولوه، عبدالواحد، **التناص مع الشعر الغربی،** مجلة الأقلام، العدد 10.

12- الرازی، فخر الدین (2000) **التفسیر الکبیر** ، بیروت، دارالکتب العلمیة.

کوردی

١٣- دێرەشی، سەعید (٢٠٠٩) **دیوانا فەقێ تەیران**، دهوک، بنکەی سپیرێز.

١٤- گەردی، عەزیز (١٩٧٨) **ئەدەبی بەراوردکاری**، بەغدا ،چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد.

# ڕەنگدانەوەی قورئان لە هۆنراوەکانی نالیدا بە پێی زانستی جوانناسی

د. ڕەئوف عوسمان

**کورتە**

نالی مەزن ئەو کەڵە شاعیرە بوو کە جێ دەستی پیرۆزی بە سەر پانتاییەکی گەورەی شیعری کـوردی و قۆناغی دوای خۆیدا بە ڕوونی دیار بوو، یان بە واتەیەکی‌تر ڕەنگ‌ڕێژ و بونیاتنەری ڕێبازی کلاسیزم بـوو لە شیعری کوردیدا. دیارە دێتیە خۆی لە خۆیـدا گرنگـە و جێگـای لێکۆڵـینەوەیەکی تایبـەت، سـیما و ڕەنگ و بۆنی هۆنراوەکـانی نـالی لـە گوڵـزاری شـیعری کوردیـدا پەنجەرەیـەکی تایبەتـە و دەڕوانێتـە ئاسۆیەکی تا چاو برکەی فراوان ڕەنگاڵە. ئەگەر پێکهاتەی شاعیرێتی بریتی بێت لە چەپکێک ڕەهەنـد و توخمی جۆربەجۆر، دیارە بەهرە تایبەتەکەی نالی هەسوونی ڕەشماڵەکەیەتی و بەندە بە کۆ ئۆرگـانیزمی وزە جۆربەجۆرەکانی ئەو سیستمە پێچهەڵـپێچەی نـاوەوەی شـاعیرەوە. ئەمـە جگـە لـە ڕەهەنـدەکانی دەرەوەی شاعیرە، کە هەمیشە وەرگرتن و کارلێک و بەخشین بە وزە تایبەتیەکان ئەسپێرن. ئەوەی کـە پاڵی پێوە نام بۆ نووسینەوەی ئەم لێکۆڵینەوە ئـەدەبی و بەلاغیـە، فەرامۆشـکردنی نالیـە لـەم بـوارەدا و کەمتر پەنجەی بۆ براوە. جگە لە دیوانی نالی کە هێمـای بـۆ گـەلێک لـەم لایەنانـە کـردووە، بـەڵام لـە چوارچێوەی ڕاڤەکردنی بەیتەکاندا بە تەنیا واتە تا ئێستا و بـە تایبـەت لـە شـێوەی لێکۆڵـینەوەی سـەر بەخۆدا ئەم بابەتە دەسـی بۆ نـەبراو ـت. دیـارە پـرۆژەی ئـەم لێکۆڵـینەوەیە پێویستی بە ماندوو بوون و کاری فرە هەیە، بە تایبەتی سەبارەت بە ناساندنی هونەرەکانی جوانناسی کـە هەندێکیان باس نەکراون. یان شاعیرانی کـورد کـەمتر دەسـتیان بـۆ بـردوون، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە ئایەتەکانی قۆرئان گەرەکە بگەڕێنرێنەوە بۆ ئەو سوورەتانەی کە تیایایاندا هاتوون و ژمارەی ئایەتەکـەش لە نێو سوورەتەکەدا بزانرێـت و هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـەش بناسـرێ و هێمـا بـۆ گونجانـدنی ئایەتەکەش لەگەڵ بەیتەکەدا بکرێت. ئەو بەرنامەیە کە پەیڕەوی دەکەم بریتیە لە ڕاڤـە و شـیکردنەوە و وەرگێڕان، چۆنکە ئەم پڕۆگرامە گونجاوترین حاڵەتە بۆ ئەم بابەتە، هەرچەندە کـە هەنـدێک جـار پـەنام بردۆتە وەرگێڕانی چەند پێناسەیەکی هونەری جوانناسی لـە زمـانی عەرەبیـەوە بـۆ زمـانی کـوردی، بـە مەبەستی ڕوونکردنەوە و سەقامگیرکردنی دەقەکە بۆ ئەو بوارەی کە تیایدا هاتووە. لێکۆڵینەوەکە بریتیـە

لە یەک فەسڵ و فەسڵەکەش کراوە بە سێ هەنگاو یان سەرباس کە بریتین لە ١- هونەری ئێقتباس ٢- هونەری تەلمیح ٣- هونەری عەقد . وە لە کۆتایی لێکۆلینەوەکەدا کۆمەلیک ئەنجامگیریم دەسنیشان کردووە، دواجاریش ئەو سەرچاوانەی کە سوودم لێ بینیون هێمام بۆ کردوون و نووسیومەتەوە.

**وشە سەرەکییەکان**: نالی، شیعری کوردی قورئان، جوانناسی

**بەشی یەکەم- ئەدەبی بەراورد**

**فەسڵی یەکەم:**

لەبەر ئەوەی لە پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکەم پەیوەستە بە بابەتی ڕەنگدانەوەی قورئـان لـە هۆنراوەکـانی نالیدا و لە لواری زانستە جوانناسیەکانەوە«العلوم البدیعە» بە تەنیا، هەر بۆیە نەمویستووە پـەل بهـاوێژم بۆ زانستەکاتی «البیان» و «المعانی»، چوونکە نالی لەو بوارانەشەدا پەلی فـرەی هاوێشـتووە و گـەلێ لـە بوارەکانی ڕەوانبێژی نـالی لـە بـەکارهێنانی دەقـەکانی قورئانـدا دەچێتـەوە سـەر بابـەتی زانسـتەکانی جوانناسی«العلوم البدیعە».

نابێت ئەوەیش فەرامۆش بکەین کە نالی جگە لـە بـەهرە خـوڕ و دەوڵـەمەندەی توانایـیـەکی ئێجگـار گەوەرەی هەبووە لە سوودبینین لە ئاواز و مۆزیکای شیعردا؛ تەنانەت یەکێک بووە لەو شاعیرە کوردانەی کە بەو فراوانیە سووودی لـە کـێش و ئاوازەکـانی خـەلیلی فەراهیـدی وەرگـرت و تـوانی لەگـەڵ وشـە دەستەواژە کوردیدا ڕازاوەترین بابەت و بەرهەمی لێ دروست بکات. ئەوەتانێ دەڵێت:

وەرە سەیری خیابان و بەیازی دەفتەری نالی

کە سەف سەف مەسرەعی بەرجەستەڕێزی سەروی مەوزونە (نالی:٥٢٣)

دیارە بۆیـە ئـەم بتبەتـە لێـرەدا دەوردژێـنم چوونکـە بـەکارهێنانی کێشـەکانی خـەلیلی فەراهێـدی ڕێگاخۆشکردنە بۆ بەکارهێنانی دەقەکانی قورئـان هـەردوو لایەنەکـەش جەمسـەردا یەکدەگرنـەوە کـە ئەویش ئاوێزنبوونی هونەرەکانی «اقتباس، عقد تلمیح»ە لەگەڵ کێشەکانی خەلیلی فەراهیدیدا.

لە پێش هیچ شاعیرێک نەبووە لەو ئاستە جۆرە شـیعرە بنووسـێت، ئـا ئێسـتا مـن هـیچ بەڵـگەیەکی نووسراوەم کە ئەو جۆرە شیعرەی تیا نووسرابێت، جگە لە هێماکانی "سالم"ی سـاحێب قـران نـەبێت بـۆ ئەهمیەتی "مەولانا خالیدی نەقشبەندی" لەو بوارەدا.

لە ڕۆژی ئێمتەحانا دێم بەرابەر تالیب و مەعشووق

کەمەر بەستەی هونەر هاتین لە تیپی عیشقبازانا (مەحوی،١٩٧٧)

لەلایەک نالی و مەحوی، لەلایەک سالم و کوردی

لە هەنگامەی هونەر تکاجۆبوون لە مەولانا

دوای پیاچوونەوەی سەرجەم هونراوەکانی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، لەمجۆرە کێشەی نالی مەڕ بـە خەلیلی فەراهیدیم بەرچاو نەکەوتووە جگە لەچەند هۆنراوەیەک بە زمانی فارسی و عەرەبی و دیـالێکتی گۆرانی نەبێت و بەتەنیاش چواربەیتیش بە شێوەی کرمـانجی خـواروو لەسـەر کێشـی «مجـزوء الرجـز المذیل»ە (مودەڕێس،١٩٨٣: ٦٢١).

دیسان دیاری دلبەری وەک مەشعەلستانی دا دیار

نوور بوون لەسەر کێوی ئۆحود تۆمار بە تۆمار ئاشکرا

خۆش خۆش نەسیمی عەنبەرین بێن خۆش دەگاتە سەر زەمین

ئەمما بۆیە عەنبەرین یا نافەیی میسکی تەتار

بێ‌وادە ئێمشەو ڕۆژهەڵات یا نووری جانان سات بە سات
ڕۆشن دەگاتن سەربیسات «فی لیل یولج النهار»
پڕ بوو لەنووری دەشتی فەقا، گۆیا حەبیبی خۆش لێقا
لیلا علی السلع القاع استتار(نالی:٤٠١)

دیارە نالی لە دیوانەکەیدا یەک چامەی هەیە کە نیوەدێڕی یەکەم بە کوردیە و نیوەکەی‌تریش بە عەرەبیە. هەروەها بەم دواییە لە هۆنراوەیەکی ١١٦ بەیتی عەرەبیشی داناوە ئەو کاتەی لە حیجاز بووە (مجلە گولان العربیە،١٩٨٨: ١٦٥)، نابێت ئەوەش لەبیر بکرێت کە نالی مەلایەکی گەورە و زانایەکی بواری عیرفان‌ناسیش بووە. شارەزایی نالی لە بواری قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا (د.خ) و مێژووی ئیسلام و بوارەکانی «نەحو و سەرف و بەلاغە و زانستەکانی عیلمی کەلامدا» ئێجگار بەبڵاو بووە.

وەک لە سەرەتادا هێمام بۆ کرد، بابەتەکە کراوەتە بە سێ بەشەوە و لەو چوارچێوەشدا دەستنیشانی هونەرەکانی «اقتباس، عقد، تلمیح» دەکەم. دیارە هەریەک لەمانە پێودانگ و پێناسە و تیۆرسازی خۆی هەیە و مەرج نیە لای هەموو شاعیرێک وەکوو یەک مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.

**١-هونەری ئێقتباس**

ئێقتباس لە عەرەبیدا بریتیە لە سوود وەرگرتن لە وشەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(د.خ)، بەوەی کە بخرێتە چوارچێوەی هونراوە یان پەخشان بێ‌ئەوەی گۆڕانکاری بەسەر بهێنرێت و واش پیشان نەدرێت کە بابەتە وەرگیراوەکە قورئان یان حەدیس؛ هەروەها "مالیکیەکان" ئەمەیان بەلاوە حەرامە بەڵام شافعیەکان بە کۆن و تازەوە لەلایان ئاساییە و نموونە بە پێغەمبەر دەهێننەوە و کە لە نوێژدا وتوویەتی «وجهت وجهی...».

نالی دەڵێت:

ڕۆژی قیامەتی «فاذا هم قیام» و شەخس
قائیم چەقیوە، کێلە لەسەر خاکی مەحفەرە(نالی:٤٣٩)

نالی لەم بەیتە و سەرجەم چامەکەدا باسی ترس و لەرزی ڕۆژی قیامەت دەکات و دوو هونەری ڕەوانبێژی بەکارهێناوە. بە یەکێکیان ئێقتباسی ئایەتی «فاذا هم قیام»ە کە ئەویش بریتیە لە«ثم نفخ فی اخری فاذاهم قیام ینظرون» (الزمر:٦٨)، دووهەمیشیان هونەری تەلمیحە کە ئاماژە بۆ شەخس و کە ئەویش لە دوو ئایەتدا هاتووە «فاذا هی شةخصە ابصار الذین كفروا» (الانبیاء:٩٧)، ئەوی تریشیان:« انما یوخرهم لیوم تشخص فیه الابصار» (ابراهیم:٤٢)، واتە لەو ڕۆژەدا ئادەمی لەسەر گۆڕەکەی دەرهاتووە و

لە ترسانا وەک کێل چەقیون و چاوەکانی ئەبڵەقبوون، سەبارەت بە وشەی «شەخس» دوو بۆچوونم هەیە: یەکەمیان مەبەستی مرۆڤ بێت و نیوە دێڕی دووهەمیش تەواوکەر و سیفەتەکەی بێت.

دووهەمیان: پێدەچێت مەبەست لە شەخس، شەخسی بێت و تەواوکەرەکەشی فانیم بێت واتە «شەخسي قائيم چەقيوە»، کە من ئەمەیان بە ئاسایی و ڕەوانتر دەزانم. ئەوەی کە مەرجە بوترێت ئەوەیە کە ترس و بیمی ڕۆژەکە هەموو کەس دەگرێتەوە و کەس لێی ڕەها نابێت؛ هەروەها دەشێت بوترێ کەرەستە و دەستەواژەکانی دوای ئایەتی «فااذا هم قيامه» سەرجەمیان دەرەنجامی ئایەتەکەن و خودی «اذا» لێرەدا واتای کوتوپڕی«فجائيه» دەبەخشێت کە هێندیتر فەزای ترس و لەرزی کوتوپڕ دێنێتە گۆڕێ.

٢- نالی دەڵێت:

«برق البصر» لەبەر بەرق تەلەئلۆیی لە نالی

«خسف القمر» لە ئیشراق قیامەتی جەمالی (نالی:٦٥٧)

لەم بەیتەدا نالی ئێقتیباسێکی ورد و جوانی بەدەست هێناوە و بەهۆی ئایەتی «فاذا برق البصر و خسف القمر و جمع الشمس والقمر يقول الانسان يومئذاين المفر» (القيامه:7،8،9،10)، وەک لە بەیتەکە دەردەکەوێت «فاذا»ی لابردووە و هەردوو ئایەتەکەی دابەشکردووە بەسەر نیوەی دێڕی یەکەم و دووهەم و بۆ هەر ئایەتێک لەو دوانە واتای تایبەتی بۆ هەڵبژاردووە و دواجاریش هەردوو حاڵەتەکەی کۆکردووتەوە بۆ خزمەتی مەبەستی سەرەکی کە ئەویش پەیوەستە بە ستاتیکای خۆشەویستەکەیەوە، حاڵەتی یەکەم: باسکردنی ڕۆژی قیامەتەبە هەموو ترس و لەرزێکەوە و گواستنەوەی ئەو حاڵەتە ترسە بۆ حاڵەتی دلۆڤانی ئافرەت و پەردەلادان لە ڕووی؛ واتە بەتەنیا بریسکانەوەی ددانە مرواریەکانی وەک بروسکە، نالی دەخاتە فەزای ترس و لەرز و خۆچوون؛ هەروەک لە ڕۆژی قیامەت هەڵهاتبێت. حاڵەتی دووهەم: مانگ گیرانە بەهۆی هەڵهاتنی خۆری ڕوویەوە.

لە ئەنجامی ئەم دوو حاڵەتەدا نالی بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ هێمای بۆ کۆتایی هەردوو ئایەتەکە کردووە کە «جمع الشمس القمر» واتە ئتر هیچ بوارێک نەماوە گەرەکیە تەسلیمی جوانی و دلۆڤانی یار ببێت. لێرەدا هێز و واتای تابلۆکە بەوردی دەردەکەوێت، چونکە نالی لە سنووری ئایەتەکە کە تیا بۆ حاڵەتێکی پڕ لە ترس و ئەشکەنجەیە کە ڕۆژی قیامەتە دەردەچێت و دەگوێزێتەوە بۆ حاڵەتێکی ئێجگار جیاواز، کە ئەویش جوانی و دلۆڤانی دەم و چاوی یارە. واتە گۆڕانکاریەکی چۆنیەتی فەراهەم هێناوە.

٣- نالی دەڵێت:

یک نیم رخت «الست منکم ببعد وان نیم دگر «ان عذابی لشدید»

بر گرد رخت نوشته «یحی و یمیت» من مات من العشق فقد مات شهید

نالی لەم دوو بەیتەدا کە شێوەی چوارخشتەکی گرتووە چەند ڕستەیەکی عەرەبی لەگەڵ ڕستە فارسیەکاندا بەکارهێناوە. لە نیوەی دێڕی یەکەمدا «الست منکم ببعد»ی بەکارهێناوە کە قورئان نیە بەڵام باس لەوە دەکات کە لەگەڵ دەرخستنی نیوەی دەم و چاویا هەموو دووریەکان نزیک دەبنەوە چونکە ئەو هەمزەیەی سەر «لست» پرسیاری ئینکارانەیە و نەفی لەگەڵ نەفیدا دەبێتە ئێسپات. بەڵام لە دێڕی دووهەمدا دەڵێت هەر لەگەڵ دەرکەوتنی بەشەکەیتری ڕووی ئەشکەنجە و ئازاری زۆر دەبێتەوە. ئەمەیش هێمایە بۆ ئایەتی «ولئن کفرتم ان عذابی لشدید»، نالی لەم ئێقتێباسەدا واتایەکی ئێجگار ورد و جوانی بەکارهێناوە بە لۆژیکی دژ«منطق الضد»، لە ئایەتەکەدا دەڵێت: ئەگەر ڕاستی بشارنەوە ئەشکەنجەی قورستان دێتە بەردەم، چونکە لە بنەڕەتدا واتای فەرهەنگی «کفرتم» داپۆشینە؛ بەڵام نالی بە پێچەوانەوە دەڵێت: دەرخستنی نیوەی ڕووت، ئازارەکانم توندتر دەکات! لە دێڕی سێهەمیشدا دەڵێت لەسەر ڕووت نووسراوە: «یحی ویمیت» کە ئەمە ئیشارەتە بۆ ٥ ئایەن کە لە هەر پێنجیاندا ئەوەی کە مراندن و زیندووبوونەوەی بەدەستە بە تەنها و تەنها هەر خودایە. دیارە کرداری «یحی و یمیت»یش بەندە بە هەڵوێستی خۆشەویستەکەی نالیەوە. دەتوانم لێرەدا بڵێم: هەرچەندە نالی شاعیرێکی خواناس بووە بەڵام لێرەدا بە لێکچواندنی دوور، پێی لێهەڵبڕیوە و خۆشەویستەکەی گەیاندووتە سەر و پلەی ئادەمیەوە کە توانای خودایە.

٤- نالی دڵێت:

لایەک «زەبانیە» لە سەروکاری نارەنار

«هل من مزید» زوبانیە وەک ماری ئەژدەر (نالی:٤٥١)

نالی لەنێو دێڕی یەکەمدا هێمای بۆ دوو ئایەتی قورئان کردووە کە یەکەمیان «فلیدع نادیە سندع زبانیە» (العلق:١٨)، دووهەمیشیان ئایەتی «ولئک هم وقود النار» (یس:٨٢) کە دووجار هێمای بۆ کردووە. بەکارهێنانی وشەی «نارە،نار» کە دووهەمیان «تاکید الفظی»یە، واتە دڵنیاکردن و جەخدکردنە لەسەر ئەو ئاگرە و دیسانەوە هێمایشە بۆ چەند ئایەتێکیتری قورئان، گۆکردنی چوارجار پیتی «ر» کە سێهەم و چوارەم لە وشەی «نارە نار»دا هاتووە خۆی لە خۆیدا پڕە لە حاڵەتی ترس و بیم و خولقاندنی فەزایەکی دەروونی دڵەڕاوکێ و خەمی قووڵە کە ئەو تابلۆی جەهەننەمە وێنای دەکێشێت لە دەروونی مرۆڤدا. نالی لە نیوە دێڕی دووهەمدا ئایەتی «هل من مزید»ی ئێقتباسی کردووە، کە ئەمەیش بەشێکە لە ئایەتی «یوم یقول لجهنم هل امتلات و تقول هل من مزید»، هێزی سەنەتکاری نالی لەو جەنتاسەدا کە لە نێوان «زەبانیە» و «زوبانیە»دا، واتە ئەو ئاگرە زوبانە بڵێسەیەتی وەک ماری ئەژدەر یان بە شێوەیەکیتر بڵێین جێناسێکی موحەرەفە لە نێوان وشەیەکی کوردی و عەرەبیدا، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا داهێنانێکی نوێی دنیای شیعری نالیە. دەبێت لێرەدا ئاماژە بۆ حاڵەتێک بکرێت کە ئەویش جیاوازی نێوان سوودبینی شاعیری عەرەبە لە دەقە قورئان لە هەمان بواردا. لای ئەوان تەنیا و تەنیا دەوڵەمەندکردنی ناوەرۆکە و جەختکردنە لەسەر بەهێزبوونی مەبەستە سەرەکیەکە کە واتا

ویستراوەکەیە، بەڵام لای نالی حاڵەتەکە جیاوازترە لەوەی کە لەبەردەم ئەرکی بەهێزکردنی ناوەرۆک لە لایەک و دۆزینەوەی هونەرە جوانناسیەکانی سەر بەزمان لە لایەکیترەوە، بە حوکمی ئەوەی کە شاعیری کورد ئایەتەکە لە نێوان زمانی کوردیدا بەکار دەهێنێت ، نالی هەمیشە ویستوویەتی و هەوڵیشی بۆ داوە کە هونەرێکی جوانناسی«بدیع» لە نێوان وشە کوردی و عەرەبیە وەرگیراوەکاندا بدۆزێتەوە. دیارە ئەم حاڵەتە هەنگاوێکی جیاواز و لە پێشتری نالی هەروەک لەم بەیتەدا ویستوویەتی لە نێوان «زبانیە»ی عەرەبی و «زوبانیە»ی کوردیدا ئەو جێناسە مەحرەفە بدۆزێتەوە. هەر لەم بواری گەڕان بەدوای وشەی عەرەبی و کوردیە هاوئاهەنگ و چون یەکانەدا، نالی چەند بەیتێکیتری وتووە کە هەر بۆ نموونەش دیانهێنمەوە:

تەوای ئاهەنگی «قد قامت» تەریقی جەمعی زوهادە

قەد و قامەت بە لەهجەی ڕاستی گوبایی عوشاقە

یان:

"خاڵی" نیە "نالی" دڵەکەت ساتێ لە هێجران

تا تاری وجوودت نەپسێنێ مەلەکەولمەوت

دیارە نالی ویستوویەتی جێناسێکی موحرەف دروست بکا لە نێوان «ملك الموت» کە ئێزرائیلە و لە نێوان «ملەکەل موت» واتا ئەو ملەی کە وەک موو باریکە لە ئاست مردندا؛ ئەو «ک»یەش ئامرازی لێکچواندنە لە زمانی عەرەبیدا یان هەندێکجار نالی یاری بە وشەی کوردی کردووە و هەوڵیداوە یاسا گرامریەکانی زمانی عەرەبی بەسەردا پیادە بکات.

موساوی وەک یەک و لوولن لەهەردوو لاوە زوڵفەینی

نموونەی عەکسی حەرفی «میم» و «نون» و «واو»ە زوڵفەینی (نالی:٤٥٦)

وشەی «زوڵفی» کردووە بە دوو واتە موسەننا کە ئەمە لە زمانی کوردیدا نیە و یەکێکە لە داهێنانەکانی نالی لەم بوارەدا.

٥- نالی دەڵێت:

لە قورئاندا بە «ما اخفی لهم» مەکتووم و مەختوومە

بەیان نابێ بە تەفسیری دووسەد «کەششاف» بە زاوی

موبەیەن بوو لە قورئاندا بە نووری «قرة العین»ی

نە وازێح بوو بە «کەششاف» و نە ڕۆش بوو بە «بەیزاوی» (نالی:١٥٤)

نالی لەم دوو بەیتەدا ئایەتی « فلا تعلم نفس ما اخفی لهم من قره اعین، جزاء بما کانوا یعلمون» ئێقتباسی کردووە؛ لە ڕێگای «ما اخفی لهم»، نالی جەخت لە سەر ڕاڤەکردنی ئەو ئایەتەی سەرەوە دەکات. کە لە ڕاستیدا کۆمەڵێک هێرمۆنۆتیکا هەیە لە سەر ڕاڤەکەی، واتە نە بە تەفسیری کەشاف کە خاوەنەکەی زەمەخشەریە واتاکە ڕوون دەبێتەوە. دیارە ئەم تەفسیرە پێ لەسەر بۆچوونەکانی موعتەزیلە

دادەگرێت؛ لەمەڕ ئەهمیەتی ئیرادەگەری و بەستنەوەی ئەنجامەکان بە هۆکارەکانیانەوە و ئافرینکردنی عەقڵانیەت لەم بوارەدا. هەرچی تەفسیری «بەیزاوی»شە، بە پێچەوانەوە دیارە نالی زانا و شاعیری گەورە، ئاگای لە قووڵایی ڕاڤەکردنی قورئانیش هەیە و دەزانێت شوێنی کێشەکان لە کوێدایە و چۆن بە کاری دەبات «توظیف» بۆ مەبەستە شیعریە تایبەتیەکانی. جێی خۆیەتی کە هێما بۆ نهێنیەکی جوانناسی لەو دوو بوارەدا بکەم کە یەکێکیان، بەکارهێنانی وشەی «واضح»ە بۆ کەششاف؛ دیارە خودی «کەششاف» بە واتای دەرخستن و ڕوون کردنەوەیە. هەر وەها «ڕۆشن»یشی بۆ «بیضاوی» بەکارهێناوە کە واتا فەرهەنگێکەی خۆی ڕووناک کردنەوەیە و بەمشێوە چنیویەتی:

نە و ا ضیح بوو «کەششاف» و نە ڕۆشن بوو بە بیضاوی (نالی: ٦٧٤)

ئەویتریشیان هونەری «الجمع و التقسیم»ە کە لە نێو دێڕی یەکەمدا هێمای بۆ کردووە بە وشەی «مەکتووم و مەختووم»، واتە ئایەتەکە ڕاڤەکەی نادیارە. لە دوایشدا لە بەرامبەر «مەکتووم» ناوی کەشاف و بەیزاوی داناوە.

**٢- هونەری تەلمیح (فن التلمیح)**

تەلمیح هێماکردنە لە شیعرێ یان پەخشانێکدا بۆ ناوەرۆکی پەندێک یان شیعرێکی دەگمەن یان ئایەتێک یان چیرۆکێکی بەناوبانگ بێئەوەی کە ناوی بهێنێت. ڕازی دڵێت: «هێما تەنیا بۆ ناوەرۆکی بکرێت. "قەزوینی" «تەلمیح جۆرێک بە دزی ئەدەبی ئەداتە قەڵەم». لە هۆنراوەکانی نالیدا بڕێکی زۆر هێماکردن هەیە بۆ بوارە مێژوویی و جوگرافی و زانستەکانی نەحو، سەرف،کەلام و مەنتێق. دیارە پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکەی من پەیوەستە بە قورئانەوە بە تەنیا، بۆیە هەر لەو بوارەدا نموونە دەهێنمەوە (الحلبی،١٩٨٠: ٢٤٢).

١- نالی دەڵێت:

ئەی کە ساحێب سیڕڕە، سەرتاپا ئەمری «کن» کونە
باتێنی «قف قف علی سری» بە زاهێر قەف قەفە

نالی وشەی «کن»ی بەکاربردووە، تەوزیف لە چوارچێوەی هونەری تەلمیحدا، کە ئەمەش ئیشارەتە بۆ نەک ئایەتێکی قورئان بە تەنیا، بەڵکوو دوو ئایەتی پیرۆز کە یەکەمیان ئایەتی «خلقنا من تراب ثم قال لە کن فیکون» وە دووهەمینیان ئایەتی «ا نما امرە اذا ارادە شیئا ان یقول کن فیکون». دیارە هەردوو ئایەتەکەش هێز و توانای خودای دەردەبڕێ لە فەرمانی بەکاربردن و جێبەجێکردندا. ئەوەی کە واتای بەیتەکەی دەوڵەمەند کردووە بەستنەوەی کرداری ئەمری «کن»ی عەرەبیە بە «کونە» کە کوردیە و مەبەستی کون کون بوونی نەیەکەیە. ئەمە جگە لە هێما بۆ ئایەتە قورئانیەکان، با ئەوەش بزانرێت لەگەڵ ئەمانەشدا نالی هونەری ئەیهامی دروستکردووە. چونکە خوێنەر وادەزانێ کە «کونە« وەڵامی فەرمانی «کن»ی پێشووە و کوردێنراوە؛ چوونکە بەیتەکە واتایەکیتریش هەڵدەگرێت کە پیتی «ی» لە

«ئەمری»دا دەگەڕێتەوە بۆ خودا. با ئەوەیش نەبوێرم کە جیناسی ناتەواو لە نێوان «قیف قیـف» و «قـەف قەف»دا هەیە و لە هەمان کاتیشدا تباق لە نێوان «زاهێر» و «باتێن»دا هەیە.

٢- نالی دەڵێت:

دیدەم هەموو شۆراوە بە شۆڕاوی سروشکم

لەم لەوحە نیگارینە نە عین و نە ئەسەرما (نالی::٤٥١)

نالی هێمایەکی زۆر شاراوە بە لەم «لەوحە نیگارینە» دەکات بۆ ئایەتی: «بل هو قـران مجیـد فی لـوح محفوظ» (البروج:٢٢)، وە بەراوردێکی نێوان «لـوح محفـوظ» کـە هـەموو نهێنیـەکانی گـەردوونی تیـا نووسراوە و تیاپارێزراوە. وە لەوحەی چاوی کە لـەوە دەچێـت گریـان و فرمێسـکە سـوێرەکانی چـاوی، هەموو یادگارە کۆنەکانی شتبێتەوە. ئەوەی کە بەلامەوە گرنگە ئەو هێمـا شـاراوەوەیە کـە بـەراوردە لـە نێوان وێنەی "مەحبووبە" و نەخشی قورئان، لە سەر چاوە پڕفرمێسکەکانی نالی، کـە ئەمـە ئـاوێزانکردنی دوو شتی پیرۆزە لای نالی، واتە «لوح محفوظ» هەموو نهێنیەکان و تەنانەت ئیلـهامی نالیشـە. خاڵـێکی گرنگیتریش هەیە کە ئەویش نەمانی چاوی نالیە، واتـە چـاوگی فرمێسـکەکە کـە ئەگـەر بـە «مقابلـە» حیسابی بۆ بکرێت دەکاتە نەمانی «لوح محفوظ»یش! چوونکە ئەو لەوحەل مەحفووزە دەشێت هـەر بـە ئامێری چاو بخوێنرێتەوە و موتالا بکرێت.

لە وشەی «عەین»دا تووڕەیەک هەیە، «عەین» دوو واتای هەیە: نزیکەی چاوە بەڵام دوورەکەی واتای سەرچاوەیە و لەگەڵ سروشکا لێک نزیکە. چوونکە چـاو سـەرچاوەی سروشـکە. ئەوەنـدەی لـە سـیاقی بەیتەکەدا دەردەکەوێت نالی مەبەستی واتا دوورەکەیە.

٣- نالی دەڵێت:

ئەم فەرشە خاکیە دەتەکێنن لە تۆز و گەرد

ئەم عەرشە نۆ سەحیفەیە دەکەین بەیەک پەڕە

نالی لەم بەیتەدا باسی ڕۆژی قیامەت دەکات کە لـەو ڕۆژەدا ئـەم گـۆی زەویـە لـەم مـرۆڤ و هـەموو زیندەوەرێک دەتەکێنرێ و گیاندار بڕ دەبێت و دەکرێتە یەک پەڕە. لەم بەیتەدا نالی هێمـای بـۆ چەنـد ئایەتێک کردووە کە بە هەموویان نمایشی ڕۆژی سەختی قیامەت دەکەن. وشەی «فەرش» هێمـای بـۆ ئایەتی «والارض فرشناها فنعم الماهدون». هەروەها لە وشەی عەرشدا هێمای بۆ ئایەتی «ثم استوی علی العرش یعلم ما یلج فی الارض و ما یخرج منها» هەروەها لە وشەی «صحیفة»یدا هێمای بۆ ئایەتی «یـوم نطوی السماء کطی السجل للکتب» یان ئایەتی « والسماوات مطویات بیمینه» ئەوەی کە لەم بەیتەدا.

توانای لە ڕادەبەدەری نالی دەسەلمێنێ. کورداندنی «تکرید» وشە و دەستەواژەکانە بە شێوەیەک کـە ڕەسنایەتی و عەبقەریەتی نالی دەسەلمێنێ. بە تایبەت لە بوارێکا کە ئەم سـەرامەد و پێشـڕەوەکەیەتی. ئەوەی شیاوی وتنە، ئەم چوار ئایەتەی کە لە یەک بەیت و بۆ یەک مەبەست وتراوە، دەگەڕێتەوە بۆ چوار سوورەتی جیا جیا «الذاریات، الحدید، النکویر، الانبیا». لەوانەیە ئەمە بمانگەیەنێتـە ئـەوەی کـە بڵـێین

دوور نیە نالی زۆربەی قورئانی لەبەر بووبێت، نەک لەبەر بوونێکی سادە بەڵکوو بە تێگەیشتن و ئەزم کردنێکی ئەو تۆوە کە سوودی بۆ هەموو بوارێک لێ ببینێ.

٤- نالی دەڵێت:

«کهف الانام»ی هێجرەتی ئەسحابی بێڕقوود
بیکە بە خاکی خادیمی قیتمیری ئەو دەرە

نالی لەم بەیتەدا بە «تەلمیح» هێمای بۆ دوو حاڵەتی نزیک یەک کردووە، کە یەکێکیان تاقمی «اصحاب الکهف» بوون. وە ئەوەی‌تریشیان یاوەرانی پێغەمبەر بوون کە چوونە ئەشکەوتی «حراء» وە لە پێناوی بڵاوکردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا دوچاری ئەشکەنجە بوون. دیارە لێرەدا هێمایەکی‌تریش بۆ هەمان ڕووداو هەیە کە ئایەتی: «اذ هما فی الغار اذیقول لصحابە لا تحزن ان الله معنا» هێزی ئەم بەیتە لەوەدا ئەدرۆشێتەوە کە یاوەرانی پێغەمبەر و خوداناسانی ئەو سەردەمە دوچاری یەک ئازار و ئەشکەنجە بوون واتە کۆکردنەوەی هەردوو ڕێبازەکە لە ژێر دەواری تەوحیددا. ئەم شۆڕ بوونەوەی نالیە بە ناخی میتۆلۆژیا مێژوویەکاندا و بەستنەوەشیان بە قۆناغێکی دوای ئەو ڕووداوە لێکدانی ئەو دوو مێژووە خۆدۆزینەوەی نالیش لە نێوانیاندا دەچێتە خانەی ڕۆشنبیریەکی گەورەی ئەو دیوی دەق، واتە نالی هەر بە تەنیا شیعری بەدەر لە مێژوو و ئایین و میتۆلۆژیا و سوسولۆژیا نەنووسیەوەتەوە بەڵکوو برێکی زۆر لە شیعرەکانی شەتڵکراون بەم ڕەهەندانە. خاڵێکی گرنگی‌تر کە لە بەیتەکەدا ئەدرۆشێتەوە ئەویش ئەوەیە کە نالی داوای خزمەتکاری سەگەکانی ئەسحابی کەهف دەکات و هێند گۆشەگیر و بەرچاو تارکێش نیە کە بە نزمی بڕوانێتە جەماعەتی ئەسحابی کەهف؛ گوایە لەبەر ئەوەی کە موسڵمان نەبوون بەڵکوو بە ڕێزەوە بۆیان دەڕوانێ لەبەر هەڵوێستە موقاویم کارەکانیان. دیارە ئەم بیرە کراوەیەی نالی پێش سەردەمەکەی کەوتووە، بەتایبەت لای مەلا چاکێکی وەک نالی. با ئەوەشم لە یاد نەچێت کە قیتمیرەکەش هێمایە بۆ ئایەتی «والذین تدعون من دون ما یملکون من قطمیر». ئەگەر قێتمیرەکە لە واتای سەگەکەی ئەسحابی کەهف دەرچێت و واتا فەرهەنگیەکەی بۆ حیساب بکرێت کە بریتیە لە ئەو توێژاڵە تەنکەی کە دەکەوێتە نێوان خورما و ناوکەکەی واتا کە تێکدەچێت کە واتە جۆرە گونجانێک «تناسب» لە بەیتەکەدا هەیە لە نێوان « کهف الانام و القطمیر دا» هەرچەندە نالی مەبەستیشی بووە کە بۆ «کهف الانام» دو واتای جیاواز دروست بکات و بەمەش تۆزێک خوێنەر سەراسیمە بکات.

٥- نالی دەڵێت:

خارایی سەوز و شینی لەبەر کردووە جەبەل
دامێنی وەردی سوورە کە دەستم بە دامەنی
وادی بووە بە وادی پڕ نووری «طور»ی نار
«نعلین» لە پێ فڕێ بدە «نالی» بە ئەیمەنی

نالی لەم دوو بەیتەدا سەرسوورِهاتن و خۆشەویستی سروشتی بەهەشتێنی کوردستان نمایش دەکات و شێو و چیا و دامێن و قەدپاڵەکانی هێند بە پیرۆز دەنەخشێنێ هەتا دەیخاتە ئاستی ئەو شێوە پیرۆز و بەبەهایەی کە حەزرەتی مووسای بە پێ خاوسی پیا رۆیشتووە. دیارە لە لایەن خودای پەروەردگارەوە ئەو فەرمانی دراوەتێ کە بە پێخاوسی پیا بڕوا و پێڵاوەکانی داکەنێ. وشەی «نەعلەین» هێمایە بۆ ئایەتی «انی انا ربک فااخلع نعلیک انک بالواد مقدس طوی». وشەی «طور» مەبەستی ئەو شاخەیە کە لە سلێنادایە و لە دە ١٠ جێگادا لە قورئانی پیرۆزدا ناوی هاتووە. واتای «طور» لە زمانی سریانیدا بە شاخ هاتووە. هەروەها «الایمن»یش هێمایە بۆ دوو ئایەتی‌تر کە هەردووکیان هەر دەگەڕێنەوە بۆ لایەکی شاخی توور «و نادیناه من جانب الطور الایمن نجیا»وە «قد انجیناکم من عدوکم وعدناکم جانب الطور الایمن». نالی بەئاڕاستەیەکی ناڕاستەوخۆ خودی خۆی لێکچواندووە بە حەزرەتی مووسا و هێندەش شاخ و قەدپاڵی کوردستانی پێ پیرۆز و گرنگە دەیەوێت لەبەر ڕێز و بەهای شاخەکانی کوردستان بە پێخاوسی پیا بگەڕێت. ئەمە جگە لە دروستکردنی ئەو کەشەی «طقس» کە لە ئەنجامی سەسوڕهاتن و پابەندبوون بە جوانی و دلۆڤانی بەهاری کوردستانەوە فەراهەم هێنراوە. نالی لەم دوو بەیتەدا خوازشی «الاستعارە» بە کار هێناوە، چوونکە جەبەلی چواندووە بەو مرۆڤەی کە پۆشاکی سەوز و شین دەپۆشێ. هەروەها کورت بڕیەکی «الایجاز» گەورە لە ئەنجامی هێماکردنی خێرا بۆ ئەو هەموو ڕووداوە مێژوویە هاتووتە گۆڕێ. دەتوانین ئەوەش بڵێین کە نالی وەک هەستێکی نەتەوەیی و جوانناسی، کوردستانی لە ئاست شاخیتوور داناوە کە خودا سوێندی لە قورئاندا پێ خواردوە و خۆیشی لە ئاست مووسا پێغەمبەر. جارێکی‌تر ئەم ئایەتە ئەوە دەسەلمێنێ کە نالی وەک بیروباوەڕ و ئایدۆلۆژیا، موسڵمانێکی چاو کراوە و پێشکەوتووی سەردەمی خۆی بووە هەمیشە بەرهەڵستکاری دیارە خەرافی و بیر پواوە لادەرەکان بووە.

**٣- هونەری عقد:**

هونەری عقد بریتیە لە «سوود وەرگرتن لە قورئان یان فەرمایشتەکانی پێغەمبەر(د.خ) بەوەی کە بخرێتە چوارچێوەی هۆنراوە یان پەخشانەوە. شاعیر بۆی هەیە کە لێی زیاد یان کەم بکات، مەبەستی گونجاندنی لەگەڵ کێشی شیعریدا، بەڵام وەرگرتنی جگە لە قورئان بە هەر شێوەیەک بێت دەشێت». نالی ئەم هونەرەی بەکارهێناوە بە مەبەستی جوانکاری شێواز یان قووڵکردنەوەی واتا.

٢- نالی دەڵێت:

بەم کاسە لەسەر پەنجە دەڵێن نووری عەلا نوور

ڕەخشانە میشکاتی قەدەحدا وەکوو میسباح

لەم بەیتەدا نالی «نووری عەلا نوور» و «میشکاتی قەدەحدا وەکوو میسباح» بەکارهێناوە، وەک هونەری عقد. واتا بەکارهێنانی قورئان بەڵام بە گۆڕانکاریەوە چ لەڕووی شێوەی نووسین و چ لە ڕووی فونتیک و ڕێزمانەوە کە لە بەیتەکەدا کوردێنراوە. واتە ئایەتەکە بەمشێوەیە: «الله نور السماوات و الارض نور کمشکاە فیها مصباح فی زجاجە کانها کوکب دری یوقد من شجرە مبارکە زیتونە لا شرقیە و لا

غربیە یکاد زیتها یضی و لم تمسه نار، نور علی یهدی الله لنوره من یشاء یضـرب الله الامثـال والله علـی بکل شیء علیم». ئەوەی جێگای سەرنجە نالی ئایەتێکی پیرۆزی قورئانی بۆ مەبەستێکی تایبـەتی خـۆی بەکارهێناوە. «توظیف»ە کە لە بنەڕەتدا تۆزە سڵەمینەوەیەکی لێدەکەوێتەوە چونکـە خـودی ئایەتەکـە بـاس و وەسـفی خـودای پـەروەردگارە کـە ڕووناکیـەکی ئـەوتۆ پـەخش دەکـات کـە ئاسمـان و زەوی ئەدرۆشێتەوە. بەڵام نالی ئەم ڕووناکیە خوداییەی لێک چواندوە بە پیاڵەیەکی پڕ لە مەی لە نێو پەنجەی ناسک و پەمەییدا، واتە شتێکی قەدەغەکراوی لە لایەن ئیسلامەوە لێکچواندووە بە دیمەنێکی پطرۆز کـە باس لە خودا دەکات. کۆکردنەوەی دوو شتی لە گەوهەردا دژ لە یەک جۆرێکـە لـە توانـای گونجانـدنی حایڵەتە نەیارەکان کە ئەمە خـۆی لـە خۆیـدا بەڵـگەی وریـایی نالیـە. بەتایبـەت لـە ڕۆژگـارێکی وەک سەردەمی نالیدا کە دەست بۆبردنی ئەمجۆرە بابەتە بڤە بووە و وروژاندنی ئەم دیاردە و حاڵەتە، خۆی لـە خۆیدا ئەوە دەسەلمێنێ کە نالی پێش سەردەمەکەی کەوتووە، ئەگەینا چۆن نووری خودا کە لـە شـەو و ڕۆژدا بەو پیرۆزیە ئەبروسکێتەوە، لێکدەچوێنێ بە پیاڵەی پڕ لە مەی بە دەست و پەنجـەی یارەکەیـەوە. لەوانەیە ئەم تابلۆیە لای هەندێک خاوەن هزری تێژپەڕ «متطرف»نەگونجێ و بە لادان دابنرێت.

٢- نالی دەڵێت:

«فاتێحە» تەسخیرە شاری دڵ بە تابووری ئەلەم

مودەتێکی زۆرە پاتەختە لەبۆ خاڵانی غەم

لەم بەیتەدا نالی وشەی فاتێحە وەک هونەری عقد بە کارهێناوە. واتە سوورەتی الفاتحە کە یەکـەمین سوورەتی قورئانە و بە «الحمد لله رب العالمین...» دەست پێدەکات بـە شـێوەیەکی گشـتی سـوورەتی فاتێحە لە دوو بۆنەی جیاوازدا بە کار دەبرێت:

یەکەمیان: خوێندنیەتی لەبەر نوێژکردندا.

دووهەمیان: خوێندنی سوورەتەکەیە لە بۆنەی تازێدا بۆ گیانی مردوو.

دیارە بۆنەی بابەتی شیعرەکە بۆ دۆخی دووهەم دەسدەدات کـە پرسـە و نەخۆشـیەکەیە. لـە دیـوانی نالیدا وا ڕاڤەکراوە کە تازێگەریەکە بۆ ئەو کاتە بوو بێت کە «قاجاریەکان لە ساڵـی ١٢٦٤ی کـۆچی و لـە ١٨٣٠-١٨٣١ی زاینیدا بەناوی یارمەتیدانی "مەحموود پاشـای بابانـەوە" هاتنـە نـاو شـاری سـلێمانی و "سلێمان پاشا" کە ڕۆمەکان پشتگیری بوون شـاری بەجێهێشـتوو و ڕووی کـردە زنگابـاد». دیـارە مـن لەگەڵ ئەم بۆچوونەدا نیم و وای بۆ دەچم کە تازێ گەریو پرسەکە بۆ شاری دڵی خـودی نالیـە، چوونکـە تابووری خەم و خەفەت شاری دڵی داگیرکردووە و شەشدەری نەجاتی لێگرتووە و تازێ لەبارە. دەشێت بەشێک لە خەمەکەش بەند بێت بە داگیرکردنی شارەوە. هێـزی بـەکاربردنی ئـەم عقـدە واتـە وشـەی «فاتێحە» لەم دوو تەوەرەدا خۆی دەنوێنێ.

١-بڕێکی «الایجاز» بەرچاوە؛ واتە بەتەنیا وشەی «فاتێحە» خوێنەر دخاتـە دنیـاظی خـەم و پـەژارە و پرسەوە.

٢- تێکەڵکردنی ئەرکێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی بە خـەمێکی تەتەوەییـەوە بـە تـەمیا وشـەیەک کـە «فاتێحە»یە. دیارە ئەم وشەیە کە ناوی سـوورەتێکی قورئانـە بـەهۆی زۆر بەکارهێنانـەوە و لـە بـوارێکی تایبەتدا، بە تایبەتمەندیەکی زمانەوانی لە دەستداوە و دابەزیوە نێو ژیـانی ڕۆژانـەی کۆمەڵـگاوە کـە لـە بۆنەی شتە لەدەستداوەکاندا دەوترێت. ئەمە جگە لەوەش وشەی «فاتێحە» بۆتە سەرلەوحەی بەیتەکـە، مە هەر لە سەرەتاوە بەرگێکی ڕەشی پۆشیوە و هەواڵێکی ناخۆشی گەیاندووە. دیارە لە بەیتـەکانیتـردا نالی ڕەفزی هەموو بێگانەیەکی کردووە کە وڵات داگیر کەن بە ڕۆم و عەجەمەوە واتە حوکمی کـورد لـە "سلێمان پاشا"دا خۆی دەبینێتەوە و بە باشتر دەزانێ لە هەمووکەس کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بژپیرێکـی نەتەوەیی نالی بانگی بۆ دەکات. نالی لە بواری بەستنەوەی دیاردە دژوارەکان یان هێمای بروسـکە ئاسـا بۆ حاڵەتی جیاوازەکان توانای فرە و سنعەتکاری وردی بەکار هێناوە. هەر لەم بوارەدا دەڵێت:

قوربان مەحاڵە پێکەوە بن سەبر و ئیشتیاق

خاریج لە نەسسی ئایەتە تەکلیفی «لا یطاق»

نالی لەم بەیتەدا هونەرێکی ڕەوانبێژیتری بە کار هێناوە کە پێی دەڵێن: «ارداف». واتە « بەو وشـەیە هێما بۆ واتایەک یان دەقێک بکەیت کە لە واتادا یک بگرنەوە بەڵام لە شێوازدا جیاواز بن». واتە نالی بـە ڕستەی «لا یطاق» هێمای بۆ ئایظتی «لا یکلف الله نفسا الا وسعها». واتە بەم میتۆدە توانیـەتی خولیـا و سۆز و ئاواتەکانی ئاوێزان کات لەگەڵ دەقێکی قورئانـدا و تەنانـەت دەقەکـەش بـەکار بـەرێت لـە پێنـاو مەبەستە تایبەتەکەیدا ، واتـە سـەبر و ئیشـتیاق لـە پانتاییـەکی بـێلایەنـدا نەوەسـتان بەڵـکوو خـودی قورئانیش چوەتە هەمان کێشە و هەمان شێوە نەمایشی حاڵەتە دەروونیەکەی نالی دەکەن.

٣- نالی دەڵێت:

هەرچی مەحبووبەم دەبینی وا تەحەییور دەیگرێ

سوێن دەخوا بە خوا دەڵێ «بالله ما هاذا بشر»

نالی لەم بەیتەدا ئایەتی «بالله ما هاذا بشر» بە ڕێگای هونەری عقد وەرگرتووە. دیارە ئـەم هێمایـە بـۆ جوانی و دلۆڤانی مەحبووبە و ئاوێزانکردنی هەڵوێستی «نالی و زلێخا» لە ئاست جوانیدا بەڵام هەر یەکی بە ڕاستەیەک. هەر لەم بەیتـەدا هونـەرێکیتریشـی هەیـە کـە «التفـات»ە. واتـە گـۆڕینی هەڵوێسـتی سەرسووڕمانی «تعجب» ئافرەت بەرامبەر بە پیاو. بۆ گۆڕینی هەڵوێستی پیاو بەرامبەر بـە ئـافرەت واتـە دوو هەڵوێستی ئۆرگانی جیاواز لە یـەک بۆتـەی سەرسـووڕماندا. ئەمـە جگـە لـە تێپەڕانـدنی سـنووری میسۆلۆژیای سەربوردی «یوسف» بۆ خـۆی و «مـەحبووب»ە و هاوتـا کـردنی هـەردووکیان لـە بۆتـەی خۆشەویستیەکی یەک لایەندا. با ئەوەیشم لە یاد نەچێت کە نالی «ما هذا بشرا» کـردووە بـە «مـا هـذا بشر» لە بەر ڕیتمی قافیەکە کە مالکیەکان ئەمەیان پێ قەبووڵ نیە نەک هەر ئەمەیش بەڵکوو عقـدیان پێ حەرامە چوونکە ناکرێت –وەک دەڵێن- قسەی خودا و ئادەمی تێکەڵ بکرێت.

٤- نالی دەڵێت:

لە قوربی «قاب قوسین»ی دوو ئەبرۆت

منی «ادنی» چ دوور و دەربەدەر مام

نالی لەم بەیتەدا ئیشارەتی بۆ ئایەتی «ثم دنی فتدلی فکان قاب قوسین او ادنی» کردووە. بەکارهێنانی وشەی «ادنی»دەچێتە خانەی هونەری عقدەوە. لێرەدا بۆچوونێکیترم هەیە جیاواز لەوەی مامۆستای پایەدار "مەلا عەبولکەریمی مودەرڕیس" کە ئەویش لەمەڕ دوور کەوتنەوەی شێوەی نالیە لەبەر دیدی حەبیبەدا. دیارە هەتا برۆکانی مەحبووبە نزیکتر بن لە یەکەوە، واتە گرژتر بن لەبەر خەمی ڕۆژگار لەبەر دیدی نالی دوورتر دەکەوێتەوە. واتە پێکڕا لکانی سنوورەکای نێوان هەردوو ئەبرۆ هاوکێشەیەکی پێچەوانە «معکوس» دێنێتە گۆڕێ، ئەویش ونکردنی شێوەی نالیە.دوکتۆر "هادی الحمدانی" لە هەمان واتادا دەڵێت:

اری ما بین جفنیک ارتعاشا کان القلب بینهما یلوب

دیارە تێکستەکانی نالی لە زۆربەی جارەکادا ئامادەگیان هەیە بۆ هێرمۆنۆتیکای جۆربەجۆر چوونکە خودی نالی جەخت لەسەر ئەو حاڵەتە دەکات:

نەزمی نالی میسلی ئاو و ئاینە ڕەنگی نیە

دو ڕوە بۆ سەیری خاتر یەک خەفی و یەک ئاشکار

لە نێوان وشەی «ادنی» و «دوور»دا تێباق«طباق» هەیە. هەرچەند یەکێکیان بە عەرەبی و ئەویتریان بە کوردیە. دیارە وشەی «ادنی» چەند لێکدانەوەیەک هەڵدەگرێت، وەک ئایا نالی خۆی، خۆی بە «ادنی» دەزانێت و لای حەبیبە وانیە! یان بە پێچەوانەوە؟ دیارە لە هەردوو حاڵەتەکەدا ئەنجامەکە دوورکەوتنەوە و دەربەدەریە، ئەمە جگە لەوەی کە گۆکردنی پیتی «ق» سێ جار و یەک لەدوای یەک جۆرە مۆسیکایەکی بزوێنەر دەبەخشێتە دەقەکە.

نالی دەڵێت:

لە بۆستانی «ئیرەم»دا قەد نیە وەک

شەمامەی وەک شەمامەی وەک شەمامەی

نالی لەم بەیتەدا بە هۆی هونەری عقدەوە وشەی «ئیرەم»ی لە ڕووی فۆنەتیک و ڕێنووسەوە گۆڕانکاری تیا کردووە.دیارە مەبەستی ئایەتی: «ارم ذات العماد التی لم یخلق مثلها فی البلاد» دیارە ئەم باخی ئیرەمە زۆر بەناوبانگە و لە قورئاندا باسکراوە و بە دەگمەن لە قەڵەم دراوە. بەڵام نالی ئەم ئایەتەی بەکاربردووە کە «توظیف» بۆ یارەکەی و لەو ڕێگایەوە مەبەستی تایبەتی خۆی پێ فەراخەم هێناوە. لە باخی ئیرەمدا هەموو جۆرە میەوەیەکی دەگمەنی تێدایە، ئەمە جگە لەو شەمامەی خڕ و بۆنخۆشەی کە لێکچوێنراوە بە مەمکی یار. من وای بۆ دەچم کە سێ جار بەکارهێنانی وشەی «شەمامەی» بۆ جەختکردنە بە شێوازی «توکید لفظی» لە سەر خڕی و بۆن خۆسی بەروسنگی مەمکی یار. نالی لە هەر سێ جاردا «ی»ی نیسبەت لەگەڵ شەمامەدا بەکارهێناوە کە دەگەڕێتەوە بۆ یارەکەی. ئەوەی کە جێی

سەرنجە لای نالی واکەوتۆتەوە کە ئایەتی قورئان بەکار براوە بۆ مەبەستێکی ویژدانی تایبەتی شاعیر کە وەسفی مەمکی یارە.

نالی جگە لەم پانزە نموونەیەی کە خستمە پێش چاو، گەلێ نموونەی‌تری هەیە لەم بوارەدا کە سەرنجی خوێنەر بۆ ئەم لایەنانە ڕادەکێشم و ئەو نموونانەی کە هێنامنەوە بە ڕوونی ئەنجامەکان بە دەستەوە دەدەن و پێویست بە لێکۆڵینەوەی هەموو نموونەکان ناکات.

**ئەنجام:**

١- نالی زانایەکی ئیسلام ناسی گەورە بووە و لە هەموو بوارەکانی ئیسلام ناسیەکاندا ئەسپی تاو داوە و لە بەشێک لە هۆنراوەکانی ڕەنگی داوەتەوە.

٢- قورئان و فەرمایشتگەلێکی فرەی پێغەمبەری لەبەر بووە، بە ڕاڤە و واتا و تەنانەت بۆنەی هاتنە خوارەوەشیان.

٣- شیعرەکانی نەکردۆتە پابەندی ئایەتە وەرگیراوەکانەوە بەڵکوو بە پێچەوانەشەوە سەرجەم دەقەکان لە خزمەتی بیری نالیدا بوون

٤- لە هەندێ لەو شوێنانەی کە هێمای بۆ ئایەتێک کردوە، لە تایبەتمەندێتی ناوچەیی و نەتەوەییەوە بابەتەکەی بەکاربردووەو چۆتە بازنە ئاینیەکەوە کە گشتگیرترە، واتە لەناوچەێتیەوە بۆ بازنەی جیهانبینی ئیسلامی، نەک بەپێچەوانەی ئەوەوە لە ئایەتەکانەوە ڕووە و تایبەتمەندیە نەتەوەییەکە ببێتە و دیار ئەمە بەڵگەی گەورەیی نالی‌و پێش سەردەم کەوتنەکەیەتی.

٥- بە بەشێک لە هێما، بۆ ڕووداوە مێژوویی و میتۆلۆجیەکانی نێو قورئان، دەقەکانی فراوان و دەوڵەمەندترکردوە، واتە موتوربەکردنی ئەو زانیاریانە لەبێبەوی شیعرەکاندا دەنگ‌و ڕەنگ‌و بۆنێکی نوێی پێ بەخشیوە.

٦- دەوڵەمەندکردنی دەقە شیعریەکانی نالی تایبەتن بە «نۆخبە«ی سەردەمی خۆی و چینەکانی خوارەوەش نامۆن بەو دنیا پڕ مەعریفەیە.

٧- بەشێک لەو ئیقتباسانەی قورئان ڕەهەندێکی هیرمۆنتیکای «تاویل» پڕ وزەی بەخشیوە بە دنیای ڕاڤەکردنی دەقەکانی نالی.

٨-بەکاربردنی ئایەتە وەرگیراوەکان بۆ هەندیک مەبەستی لیرکی و دڵداری و شتە زۆر تایبەتەکان، وزە و توانای نالی نمایش دەکات، لە بواری گونجاندنی بۆنە جیاجیاکاندا.

٩- گۆبینی بەشێک لە شێوازی ایەتەکان‌و گونجاندنیان لەگەڵ ڕەوتی قافیە و ڕیتمدا، کە ئەمە بۆتە هۆی دەوڵەمەندکردنی زمانی نالی و یاریکردنی هەمیشەیی بە وشە و دەستواژەکان لە چوارچێوەی زمانی کوردیدا.

١٠-کوردادندنی هەندێک وشە و دەستواژەی عەرەبی لە چوار چێوەیەکی نوێدا، دیارە ئەم حالـەتـە لـە ئەنجامی زۆر بەکاربردندا «توظیف» بۆتە هۆی دەوڵەمەندکردنی فەرهەنگی شیعری نالی.

١١-نالی بە ڕێگای یاریکردن بەوشەو دەستەواژەکان، هەندێک دیاردەی ڕێزمانی عەرەبی خستوەتە نێو زمانی کوردیەوە، تەنانەت چامەیەکی سەرکەوتووی دابەش کردووە بە سەر زمانی کـوردی و عـەرەبیـدا، ئەمە جگە لەوەی کە چامەیەکی «١١٦» سەدو شانزە بەیتە شیعری بە زمانی عەرەبی داناوە.

١٢ – لەگەڵ ئەوەشدا کە نالی سنعەتکاریەکی فرەی کردوە لە بوارەکانی هونـەری جوانناسـیدا، بـەڵام ئەم لایەنە نەبۆتە باری قورس بە سەر شیعرەکانەوە، واتە سنعەتکاریەکە وەک خۆرسک و بارێکی ئاسـایی وەدەر دەکەوێت، دیارە ئەم لایەنەدان ئاڵبوونەوە و وەرسی لای خوێنەر دروست نەکردوە.

١٣ – نـالی لـە بـواری گـوێ پێـدانی فـرە بـەهونـەری جوانناسـی «علـم البـديع»، دەبێتـە ئاوێنـەی سەردەمەکەی ٦٥،«چونکە هۆنراوەی عەرەبی لەو سەردەمەدا نوقمی سنعەتکاریەکی بێ لەزەت بووە، لای زۆربەی شاعیرە عەرەبەکان».

١٤ – سنعەتکاری لای نالی بەتەنیـا ئارایشـتکردنی ڕووی دەرەوەی شـیعرەکـان نیـە، بـەمـەبـەسـتی ڕازاندنەوەی شێواز، بەڵکوو دەوڵەمەندکردنی ناوە بۆ کە لە چوار چێوەیەکی سەرکەوتوودا.

١٥ – گەنجینەی وشە بەکارهاتووەکانی نالی بڕێکی زۆر موفرەداتی عەرەبی و فارسی تێدایە، دیارە ئەم حاڵەتە یارەمەتی گەورەی نالی داوە بۆ فەراهەمهێنان و هۆنینەوی شیعرەکانی، واتە ببی وشەی عـەرەبی فرەترە لە وشەی فارسی هەرچەندە نالی هەر دوو زمانەکەی بەڕەوانی زانیوە.

**سەرچاوەکان:**

1) رشید، ناظم (1985) **قرآن فی ادب العصور متاخره،** طبع بمطابع جامعه موصل

2) هادی، شکر (1968) **انوار الربیع فی انواع البدیع،** تجف الاشرف

3) محمد، جلال الدین (1932) **التخلیص فی العلوم البلاغه،** مطبعه الرحمانیه

4) محمود الحلبی، (1980)، **حسن التوسل الی الصناعه الترسیل**، بغداد

5) الحمدانی، هادی (1965) **دیوان الحمدانی،** بغداد، طبعه الاول

٦) مەحوی (١٩٧٧) **دیوانی مەحوی،** لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدۆلکەریمی مودەڕیس و حەمەی مەلا کەریم، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیارانی کورد

٧) نالی (١٩٧٦) **دیوانی نالی،** لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدۆلکەریمی مودەڕیس و حەمەی مەلا کەریم، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیارانی کورد

٨) مودەڕیس، مەلا عەبدۆلکەریم (١٩٨٢) **یادی مەردان،** بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیارانی کورد

٩» نەقشبەندی، مەولانا خالید، **دیوان**

# دەنگدانەوەی چاکسازی ئایینی و کۆمەڵایەتی لە شعێری حاجی قادر کۆیی و مەلای گەورەدا

د. عەبدوڵلا ڕەسوڵنژاد [*]

**کورتە:**

پاش باڵ بەسەر داکێشانی ئیستیعمار و کۆنەپەرەستی بەسەر وڵاتانی ڕۆژهەڵات بە تایبەت وڵاتە ئیسلامیەکان و کارتێکردنی داب و نەریتی ڕۆژئاوایی لە نێو تان و پوی زەین و دڵی بەرەی تازە پێگەیشتوو، دوو کێشە هاتە ئاراوە. لە لایەکەوە سوننەت و مۆدیرنیتە بەشەڕ هاتن، لە لایەکیترەوە، ململانەی نێوان پاراستنی کەلتور و بیری کۆن و دەسکەوتەکانی شارستانیەتی نوێ بەدی هات. لەم گێژاوەدا، بنەماکانی شوناسی گەلەکان کەوتە مەترسیەوە. گێژەڵۆکەی ئیستعیمار و کۆنەپەرەستی، هەوری چڵکن و دزێوی نەزانی و خۆ دۆڕاندنی بەسەر ئاسمانی کوردستانیشدا کێشا و لە ئەو هەلە ئاستەمەدا -کە دونیا بەرەو پێش کەوتن هەنگاوی هەراوی هەڵ دێناوە- کوردستان بە هۆی هەلومەرجی داسەپێندراوی تایبەت بەسەر خۆیەوە، نە تەنیا لەم کاروانە جێ مابوو، بەڵکوو ڕۆچنەکانی پێشووشی لێ ئاخندرابوو و سەرچاوە ڕوونەکانی ڕابردووی خۆشی لێ لێڵ کرابوو. نەزانی خۆیی و زانای درۆزن، بە هەڵبەستنی درۆ و دەلەسە و بە هەڵواسینی قولفوقەرازە، هەر یەک بە لایەکدا لە تێکدانی عەقڵ و دینی خەڵک کاریان دەکرد. بەڵام لە گۆشە و کەناری ئەو عاسمانە تاریکەی کوردستاندا چەند ئەستێرەی پرشنگدار هەڵاتن و بانگی نەویدی بەرەبەیانیان هەڵدا.

یەکێ لەم ئەستێرانە «حاجی قادری کۆیی»ە کە بە شاعیری نیشتمانی ناسراوە و هەوڵیداوە دەردەکانی گەلەکەی دەسنیشان کا و دەرمانیان بۆ بدۆزیتەوە. ئەو بە شیعری پڕ حەماسەتی خۆی

---

[*] مامۆستای زانستگای کوردستان- سنە

**بەشی یەکەم- ئەدەبی بەراورد**

بە تەواوی هێزەوە تێکۆشاوە نـەک هـەر هەسـتی نەتەوایـەتی ببزوێنـێ، بەڵـکوو لـە گـژ نـەزانی و سسـتی و کۆنەپەرسـتیش ڕاچـووە و زۆر جـاران بـە پـاڵدان بـە بنـەما ڕەسـەنەکانی ئـایینی ئیسـلامەوە مەبەسـتی پێکاوە و هەموو نەیارانی گـەلی لـە دەلاقـەی بـیری خۆیـەوە وەبـەر پـلار داوە. یـەکێکی تـر لـەو ئەسـتێرە گەشـانە، زانـای چـاکخـواز و بیرۆمەنـد، «مـەلای گـەورە»ی کۆیـە بـووە کـە نەیهێشـتوە ڕچـەی چاکـەخوازی بـاوکی و حـاجی قـادر کـوێر ببێتـەوە و بـە حاڵـی بـوونی بـە وردی لـە بنـەماکان و بایەخـە ڕاسـتیەکانی ئـایینی ئیسـلام، هەوڵـیدا وەک چـاکخـوازانی تـری دونیـای ئیسـلام، ئـایین لـە بۆچـونی سـەردەم نزیـک کاتـەوە و لـە هـۆنراوە و نووسـراوەکانیدا لـە سـەر هانـدانی لاوان بـۆ زانسـت و پێشـکەوتن، دینـداری و خواپەرسـتن، کوتـانی ئیسـتیعمار و کۆنـە پەرسـتی، لەبـەرچاوگرتنی مـافی ژن و خوێنـدەوار کردنی و دەیان بابەتی چاکەخوازی تر، داکۆکی بکات.

ئـەم وتـارە دەیـەوێ بـە لێکۆڵـینەوە لەسـەر شـیعری ئـەم دوو کەسـایەتیە بـەرزەی کـورد، دەنـگ و بـیری چـاکخوازانـەیـان بناسـێتەوە و لایەنـە کـەمتر ناسـراوەکانیان وەدەر خـات. چـاوەڕوانی دەکـرێ کـە بڕێک لە دەسکەوتەکانی ئەم خالانەی خوارەوە بن:

- حاجی قـادر، وێـڕای هەوڵـی نەتەوایـەتی –کـە لـەوەدا بـە پێشـەنگ و سـوار چـاکی سـەردەمی خـۆی ناسراوە- لـە چاکسـازی بـیری ئـایینی و کۆمەڵایەتیشـدا، غـافڵ نـەبووە و لـە سـڕینەوەی خورافـاتی دیـنی بێدەنگ نەبووە.

- مـەلای گـەورە کـە زۆرتـر بـە ئاسـەوارە زانسـتیەکانی و پـەروەردە کـردنی شـاگردانی زۆر و گـەورە ناسراوە، بەڵام دەبێ پلەی بەرزی وی لە بواری نیشتمانپەروەری و چاکەخوازیەوە لە بیر نەکرێت.

**وشە سەرکییەکان:** حاجی قادر، مەلای گەورە، چاکەخوازی، نیشتمانپەروەری، کۆنەپەرستی.

**پێشەکی:**

ئەم وتارە -کە دەیەوێ باسێکی گرینگی وەک چاکسازی ئایینی و کۆمەڵایەتی لە شیعری دوو ئەستێرەی پرشنگداری وەک حاجی قادر و مەلای گەورە باس بکات- پێویستی بە لێکۆڵینەوەیەکی بەرفراوان لەسەر هەلومەرجی ژیانی سەردەمی ئەوان هەیە کە لەو سەردەمەدا گێژەڵووکەی ئێستێعمار و کۆنەپەرەستی، هەوری چڵکن و دزێوی نەزانی و هەزاران بەڵای تری بە سەر ئاسمانی مێشک و بیری کوردەواریدا کێشا بوو. لە لایەکی ترەوە دەبێ بنچوبناوانی ژیانی ئەو دوو کەڵەپیاوە وەدەر خات و شیکاریەکی شیاوی شیعرەکانیان بکات؛ بەڵام نە ئەم وتارە مەودای ئاوا کارێکی هەیە نە نووسەریش؛ بۆیە باسەکە بەپێی توانا و دەرفەت لە دوو بەشدا دەبەینە بەرەوە.

بەشی یەکەم سەبارەت بە حاجی قادرە؛ کە لەم بەشدا پێناسەیەکی کورتی ژیان و بەسەرهاتی دەکەین و دوای ئەوە لە شیعرەکان و ناوەرۆکیان ورد دەبینەوە و لە کۆتاییشدا گرنگترین مەبەستە چاکسازیە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکان لە شیعرەکانیدا دەخەینە بەر چاو و بەپێیتوانا سەرنجیان ئەدەینێ.

لە بەشی دووهەمدا مەرجی بابەتەکانی بەشی یەکەم لە بارەی مەلای گەورەوە دەخەینە بەر لێکۆڵینەوە. لە کۆتاییشدا بە کورتی ئاماژە بە دەسکەوتەکانی ئەم وتارە دەکەین و برێک لە لێکچوون و جیاوازیەکانی ئەو دوو کەسایەتیە مەزنە دەردەخەین.

هەڵبەت بۆ تێبینی پێویستە بڵێین جوێ کردنەوەی بابەتە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکان بە تایبەت لە شیعری ئەم دوو کەسایەتیەدا کارێکی ئاسان نییە؛ چوونکە هەموو ئایینێک بەتایبەت ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بۆ بەڕێوە بردنی کۆمەڵگان و بابەتە کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان تێکەڵ دەبن، لە لایەکی ترەوە حاجی و مەلا - هەرچەندە دوو کەسایەتی ئایینی و خواناسن- زانستە ئایینییەکانیشیان تا دوا پلە پێواوە، بەتایبەت "مەلای گەورە" کە بەڕاستی لە بواری زانستە ئایینییەکاندا گەورە بووە و لە زۆر بواردا خاوەنی بیر و بۆچوونێکی تایبەتە؛ بەڵام هەر وەک کوڕەکەی دەڵێ: «هەرچەند خۆیشی مەلا بووە، بابەتی خوێندنی مزگەوتی بۆ ئاڕایشت نەهێناوەتە ناو هەڵبەست، لەبەر غەڵەبەی لانی کۆمەڵایەتی بۆ ڕەخنە لێگرتن نەبێ ناوی نەهێناوە» (مەسعوود موحەممەد، ١٩٧٣: ٢٨٦). هەروەها سەبارەت بە حاجیش دەڵێ: «حاجیش وەک مەلای گەورە، بە غەڵەبە لێکردنی لانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و نیشتمانپەروەری، مەیلی کەم بووە یاخۆ هەر نەیبووە بۆ ئاڕایشتدانی شیعرەکانی بە واتای مەلایانە کە هانای بردبێتە بەر مەلایەتی و ئایین و بۆ سەپاندنی بیروباوڕ و خواهیشتە میللیەکانی بووە بۆ ئەوە خەڵک ئێقناع کا وەیا زمانی مێشک وشکان ببەستێ» (هەمان: ٢٨٨).

## چاکسازی ئایینی و کۆمەڵایەتی لە شیعری حاجی قادردا

### ١-پێناسەیەکی کورتی حاجی قادر:

ئەو کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ساڵحی کوڕی مەلا ئەحمەدی گەرویە، دایکی ناوی "فاتێ" (فاتمە) بووە. هەروەک خۆی دەڵێ:

باوکم ئەحمەد بوو ناوی فێکرم دێ        خەڵقی لادێ بوو، دایکی من فاتێ (حاجیقادر، ١٩٨٦: ٩).

حاجی بەپێی سەرچاوە جۆراوجۆرەکان، لە نێوان ساڵەکانی ١٢٣١ تا ١٢٤٠ک بەرامبەر١٨٢٥-١٨١٥ز لە دێی "گۆزە قەرەج" نزیکی شاری کۆیە هاتووەتە دونیاوە. هەر بە منداڵی باوکی مردووە و دایکی بە هەژاری هەڵیئەگرێ و ئەیهێنێ بۆ کۆیە و لەوێ بە پشتیوانی ئاغاکانی کۆیە ئەیخاتە بەر خوێندن (سەجادی، ١٣٦١: ٣١٠؛ موحەممەد، ١٩٧٣: ب١: ١٦٤). بڕێ سەرچاوەش دەڵێن: «دایکی لە لای «مەلا ئەحمەدی عومەر گونبەتی» کە خاڵۆزای حاجی بووە، لە مزگەوتی موفتی کۆیە لە بەر خوێندنی داناوە و پاش دوو ساڵ کە دایکیشی دەمرێ، ئیتر مەلا ئەحمەد هەموو مەسرەفێکی خوێندنی دەکێشێ (حاجیقادر: ١١).

دوای خوێندنی سەرەتایی لە کۆیە، بە فەقیەتی چووەتە خۆشاو، هەولێر، سەردەشت، سابلاخ، شنۆ و سلێمانی. لەگەڵ حاجیمەلاعەبدوڵلای جەلیزادە -باوکی مەلای گەورە- فەقیەتی ناوچەی باڵەکایەتیشیان کردووە. دوای تەواو کردنی فەقێیەتی، دەگەڕێتەوە کۆیە و لەگەڵ مەلا عەبدوڵلای ڕەفێقی لە پەنای ئاغاکانی کۆیەدا دەژیت. لە پاشان بەهۆی چەند هۆیەکی دیار و نادیارەوە، کۆیە بەجێ دێڵێ و دوای چوونە هەولێر و خۆشناو و ڕواندز، لە ساڵی ١٨٥٤ دەچێتە ئەستەنبۆڵ و لەوێ ژیان دەباتە سەر. سەبارەت بە چەندوچوونی ژیانی پڕ لە ڕووداوی ئەستەنبۆڵ، ئاگاداریەکان بەربڵاو و ناتەواون؛ بۆ وێنە: پەیوەندی حاجی بە بنەماڵەی بەدرخانیەکانەوە کاریگەریەکی زۆریان لەسەر ژیان  و بیروڕای ئەو هەبووە. هەڵبەت هەر ژیانی دوور وڵاتی حاجی نییە کە بیر و بڕواکان تێیدا جۆراوجۆرن، بەڵکوو زۆر کۆنج و قوژبنی ژیانی ئەو کەڵەپیاوە لە کۆیەشدا جێی سەرنج و باسە؛ بۆ وێنە پەیوەندی ئەو بە ئاغاکان و پیاوە ناوبەدەرەکانی ئەو سەردەمە و بە پێخۆشبوونی فیکر و بۆچوونی دەرەکی (وارداتی) خۆیان، نێوی جۆراوجۆری وەک دەرەبەگ و فێئۆداڵ و شتی وایان لێ دەنێن و دەیانکوژن و دەیانبڕن و بێخەبەر لە هەندەران، هەر لە خۆ تاراندنی برێکیش پێیان وایە کە لە پڕێک بوونە کوڕێک و بێ بیر کردنەوە لە هەڕەشەکانی حازر و دواڕۆژی کورد، دەتوانن و بۆیان هەیە دەیان و سەدانی وەک حاجیقادر بەبۆنەی ئەوەوە کە لە ڕابردوودا بۆنی فلان شتەکەیان لێهاتووە (هەڵبەت ئەویش هەر بە پێوانەی بیرە قەرز کراوەکانی خۆیان) تووڕیان بدەن و بیانفرۆشن. هەرچەند ئەم وتارە مەودای ئەو باسە گرینگانە و کوڵی نەکولاندنەوەی ئەو زامە ناسۆرانە نییە، بەڵام وردی وتەی بلیمەتێکی کورد بینەوە کە دەڵێ: «تا کاتی خوێندنەوەی ئەم دێڕانەت، حیسابی کورد لەوەدا نییە وەک خاوەن پەزی عادەتی لەگەڵ خۆیدا بڵێ: "مەڕگەلەکەم زاوە، داخۆ کەی بێچووەکانی بفرۆشم قازانجی زیاترە". کورد جارێ خەریکی ئەوەیە لێکدانەوەیەکی دیکە بکا و بڵێ: "گورگ لە پاریزی مەرگەلەکەم دایە... وا پێدەچێ کەوتبێتە ناو کۆزی بێچووەکانیشەوە، تۆ بڵێ چبکەم خۆم مەڕەکە لە ددان و چەنگاڵی گورگ ڕزگار بکەم"» (هەمان سەرچاوەی پێشوو: ٢٤). هەروەها ڕووداوەکانی سەفەری فەقیەتی کە نزیکەی شەش حەوت ساڵی خایاندوە، ئەو سەفەرەی کە سەدان ساڵ بوو هەزاران گەنج و لاوی بەبیر و هۆشی کورد بە نێوی «فەقێ» لەسەرانسەری

کوردستان وەک شادەمارێکی پەیوەندی گشتی، گەشتێکی پڕ خرۆش و پڕ تەئسیریان لە ژیانی گەلی کورددا پێکدەهێنا و بە واتەی مامۆستا «مەسعوود موحەممەد»، بە جۆرێکی واقعیش ئەم خوێندنە یەک موشکڵە و تێکەڵبوونی مەلایان لە گەڵ ژیانی ڕۆژانەی خەڵک تا ڕادەیەکی زۆر گرینگ و بەرچاو، هەستێکی کۆمەڵایەتی یەکڕەنگی بۆ گەلی کورد پەیدا کردووە؛ چونکە مەلاکان بەدواگەڕانی سەرانسەر وە یا زۆر شوێنی کوردستان و شارەزا بوون بە لەهجەو عادەت و ڕەوشت و گوزەرانی ئەو خەڵکە؛ وەک باڵوێزی گەڕەک (سفیر متجول) بوون بە نوێنەری ناوچەکانی لێیان خوێندەوە. کاتێک کە لە شار و یا لادێش خەریکی مەلایەتی بووم، هەر خوێندەواری ڕووت و ئاسایی نەبوون بەڵکوو بۆ زۆربەی خەڵک جێی پەروەردەکار و مامۆستا و دادگا و قازییان پڕ کردۆتەوە (هەمان: ٢٧٤).

ئاخۆ حاجی بەو مێشک و بیرە تیژەوە و بە خەیاڵی شاعیرانەیەوە، لەم گەشتەدا چی بەدەس هێناوە و دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیە لەگەڵ دەرد و نەخۆشیەکانی نەزانی و خەڵەتانی خەڵکی ئاسایی بۆ غێڵ و کەڵەکی برێ کولکەمەلا و گەندەڵەشێخان، چی کردووە و سەرەنجام لەبەر چی کۆیەی بەجێ هێشتووە؟ ئایا پەیوەندی بە باسی دۆستایەتی حاجی و «کەیفی جوانڕۆییەوە» هەیە کە بە کەیفی شێخ ڕەزا تاڵەبانی و برێ ئاغاکانی کۆیە نەبوو؟ ئەو شاری بەجێ هێشتووە (سەجادی، ١٣٦١: ٣١١) یا ترس لە ئەمساڵی شێخ نەبی بووەتە هۆی ڕاکردنی حاجی قادر؟ یان ڕاستیەکەی کە هاوشاریە بلیمەتەکەی دەیڵێ: «دەرچوونی حاجی لە کۆیە لە جووتە هۆی یەکجار کاریگەری: ١- دڵخوازی خۆی ٢- زەرفی مادی و کۆمەڵایەتی ئەوسای کوردستان و کۆیە و حاجی قادر بەرهەم هاتووە کە هەردووکیشیان لە پەنا بڕیاری نەفسە سەرکەشە لە خۆڕازییە بەخۆنازیەکەیەوە بوونە هێز و تەکانی ڕیشەهەڵکەنی خۆی» (موحەممەد، ١٩٧٦، ب٣:١٩٥).

حاجی وەکوو هەزاران مەلا و فەقێی کورد، هەر لە کوردستاندا خوێندن و پلەی زانیاری خۆی بەرز کردۆتەوە بە بیر و هۆشێکی پوختەوە بۆ مەبەستی دەرکەوتن و خۆ بە عالەم ناساندن چووتە ئەستەمبۆڵ. لەوێدا کە ئەو کاتە جێگەی پێکگەیشتنی بیروڕا جیاوازەکان و تێکەڵی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بوو، ئەزموونی خۆی بردە سەر؛ بەڵام وەکوو هەندەران ڕۆیشتووەکانی ئەو سەردەمە نەبوو کە بە بڕینی سنوور زۆر پەتان و بەدەرچوون لە وڵات لە خۆیان و زۆر شتیان دەردەچن، بەڵکوو هەر وەک مامۆستا مەسعوود موحەممەد دەڵێ: «کە گەیشتە پایتەختی خەلافەتێکی سەقافەتیش ئەوتۆی نەدیت لە ژووری هی خۆیەوە بێ کە سەقافەتی کوردستانی لە بیر بباتەوە. بۆیە لەوێش هەر مەدحی گەورەکان و زانایانی گەلەکەی خۆی دەکات» (موحەممەد: ٢٧٦). مامۆستا سەجادی پێی وایە کە حاجی قادر نەچوەتە حەج. تەنیا لەبەر ئەوەی لە مانگی حاجیان لە دایکبووە و بەپێی ڕەوشتی کۆنی کوردەواری پێیان گوتوە «حاجی». دواتر بووەتە ناسنامەی شیعریشی (سەجادی: ٣١٤). حاجی سەرەنجام لە ساڵی ١٨٩٧ دوای ژیانێکی پڕ لە ژان و خولیایی و شەیدایی بۆ وڵات و نیشتمانی، لە تەمەنی حەفتا هەشتا ساڵیدا لە ئاوارەیی و بێکەسیدا سەری ناوەتەوە و لە «ئۆسکودار» گۆڕستانی قەرەج نێژراوە.

### ٢- شیعرەکانی «حاجی قادر» و ناوەرۆکیان

شیعری حاجی لە ڕووی ڕەواڵەتەوە لە سەر کێشی عەرووزی قەدیم هۆنراوەتەوە و هەڵبەت زۆرینەیشی لە بەحری «هەزەج و ڕەمەڵ»دان. بەڵام لە قافیەدا بە دەرهێنانی قەسیدە و غەزەڵەکانی خۆی لە بەندی یەکێتی قافیە و هۆنینەوەی پتر لە سێیەکی شیعرەکانی خۆی لە جووت قافیە دا؛ مەسنەوی -کە پێشتر تەنیا بۆ هۆنینەوەی چیرۆک بەکار دەهێنرا- توانی نوێ کردنەوەیەک لە شیعرەکانیدا بەدی بهێنێت و ناوەرۆکە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکانی شیعری خۆی بەم جۆرە قافیە باشتر بەڕێیان بکات.

شیعری حاجی لەگەڵێ شوێندا بڵاو بووەتەوە و لە بەر ئەوە بە تەواوی کۆ نەکراونەتەوە بە تایبەتی شیعرەکانی ئەستەمبۆڵی بە کەمی گەیشتوونەتەوە کوردەواری. مامۆستا سەجادی دەڵێ: «دیوانێکی نایابی حاجی کە بۆ ئەوە لە چاپ بدرێ لە لای «عەبدۆڕەزا بەگی بەدرخانی»وە بووە. دوای لە سێدارەدرانی ئەو پیاوە، دیوانەکەی حاجیش سووتێنراوە» (سەجادی: ٢٢٧).

باس لەسەر شیعری بە حەماسەت و دڵخوێنی حاجی و ناوەرۆکە و کاکڵەکانی باسێکی قووڵ و بێ‌بنە و بە واتای مامۆستا خاڵ: «ئەگەر ڕاستت ئەوێ حاجی قادر ئەو ڕۆژە کەس نەیناسیوە، ئەمرۆ ئەناسرێ و شیعرەکانی پەسەند ئەکرێ و چەپڵەی بۆ لێئەدرێ. وەک "فیردەوسی" کە لە پاش هەزار ساڵ ناسراوە و پەسەندکراو کۆڕی بۆ گیرا» (خاڵ، ٢٠٠٧: ٢٥).

حاجی لە زۆر بوار و مەیداندا ئەسپی زەوقی تاو دەدا، شیعری زۆر جوانی لە بابەتەکانی جۆراوجۆر وەک وەسف و دڵداری، ستایش و پێداهەڵدان، پەند و ئامۆژگاری، یادی شاعیرانی کورد و... هەیە (خەزنەدار: ١٤٨-١٢٨). بەڵام مەیدانێک کە حاجی لەوەدا سوارچاک و پێشکەوتووە، مەیدانی شیعری نیشتمانپەروەریە کە چاکسازیە کۆمەڵایەتی و ئایینییەکانیشی زۆرتر هەر لەم بوارەدا دەردەکەون.

حاجی بە جۆرێک خولیا و شەیدای کوردایەتیە کە ئاگری دەروونی دەجۆشێ و سەبری لێدەستێنێ و دەیسووتێنێ و شیعری پێدەڵێ و یەخەی داروبەردی پێدەگرێ؛ بەڵام هەر ئۆقرەی نایە و لە سنووری موبالێغەی بەشەری کە تەنیا لە دنیای دێوانە و شەیدایاندا جێی ئەبێتەوە، دەردەچێ و دەچێتەوە دیوانی خوای خێوی هەست و نستیەوە و لەوێشدا کە دەپاڕێتەوە لە پەنای باسی گەورەیی خوای بێ‌وێنە عەشقی نەتەوەیی ناتوێتەوە و لە بیری ناچێتەوە و ئاوا دەڵێ:

مەعلوومە بۆچی حاجی مەدحت دەکا بە کوردی

تا کەس نەڵێ بە کوردی نەکراوە مەدحی باری (حاجی: ١٤٤)

مامۆستا مەسعوود محەممەد لەسەر ئەم بەیتەدا ئەڵێ: «پەروەردگارا بە کوردیت مەدح دەکەم تا نەڵێن بە کوردی مەدح نەکراوی. مەدحەکەت بۆ ئارایشی کوردییە و بەهەشتی پێناکرِم...» (موحەممەد، ب٢:٢٨٤). مامۆستا خاڵ سەبارەت بەم هەستە بەرزەی حاجی دەڵێت:

«تاقانە شاعیرێک لە کوردستانە کە بەڕاستی شاعیر و تێگەیشتوو بوونی و پێویستی خۆی بەرامبەر بە خودا و بە نیشتمان و بە کۆمەڵەی بەجێ هێنابێ، لە پاش ئەحمەدی خانی و مەلای جەزیری، حاجی قادری کۆییە

کە سەد ساڵ لەمەو پێش بووە. زۆر سەیرە شیعرەکانی لە ستایش و دڵداریشدا هەر دێتەوە سەر ئەو بیرە بەرزەی کە بوویەتی» (خاڵ: ٢٥).

مامۆستا سەجادیش هەر لەسەر ئەم بڕوایەیە کە سروشتی حاجی بە غەرامیات دانەڕێژرابێ؛ چوونکە هەرچەند ئەو لەم بوارەدا شیعری زۆر جوان و بەهەستی هەیە و لە نێو ئەوانیشدا زۆر قسەی نەستەق و واتای بەرزی شاردۆتەوە، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت ئەم بوارە جێدێڵێ و دەچێتە بواری کۆمەڵایەتی و نیشتمانپەروەریەوە (سەجادی: ٣٢٣).

بە بڕوای من حاجی بەم هەموو غەزەڵە جوانانەی غەرامیانەوەی ناکرێت لە دڵداری بەری بووبێت؛ تەنها دەتوانین بڵێین عەشقی حاجی بە نیشتمان و زێدی کوردەواری ئەوەندە بە بڵێسە و بە تین بووە کە تیشک و تینی عەشقی تری بڕیوە؛ یاخود حاجیی کورد زۆر لەبەر «مەحموود دەروێش» شاعیری فەلەستینی و بڕێک لە شاعیرانی سەردەم توانیویەتی بە غەزەڵی نیشتمانی، دڵدار و نیشتمان بە شێوەیەکی جیانەکراوە بکات بە یەکێ و زام و ئێشی تراژدیک و حەماسەتی نیشتمانی بە شێوەیەکی ڕۆمانتیک تێکهاڵێنێت.

**٢- چاکسازی ئایینی و کۆمەڵایەتی لە شیعری حاجیدا**

حاجی وەک زانایەکی ڕۆشنبیر و سیاسیەکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەر و کۆمەڵناسێکی دەرد ئاشنا، لە شیعرەکانی خۆیدا زۆرێک لە دەردەکانی کۆمەڵی کوردەواری دەسنیشان کردووە و هەوڵی داوە بە بیر و مێشکی تیژی خۆی و بە پاڵدان بە بنەما ڕەسەنەکانی دابونەریتی کوردەواری و ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە دەرمان و چارەیان بدۆزێتەوە.

حاجی لە باری کۆمەڵایەتیەوە: نەرانی و خۆ دۆڕاندن، ناتەبایی چینەکانی خەڵک، لەبیر بردنەوەی زمان و کەلتووری نەتەوەیی، پیلانی دوژمنان و... لەباری ئایینیشەوە: لە خۆرافات و پڕوپووچی باوەڕکراوی خەڵکی ئاسایی بەناوی دینەوە و درۆدەلەسەی کولکەمەلا و گەندەڵە شێخ بەناوی شەریعەت و تەریقەتەوە بە عینوانی دەردە ناسۆرەکانی کورد ناو لێدەبات و بە شێوازی جۆراوجۆر ڕیشە بڕیان دەکات.

لێرەدا چەند نموونەیەکی لەم بابەتەدا لە شیعرەکانی حاجیدا دەخەینە بەرچاو:

قسەیەکم هەیە دەیکەم مەڵێ بێتەجرۆبەیە　　باوجوودی ئەوەی نادانە لەلای وەک گەمەیە

(حاجی:١٤٠)

حاجی لەم پارچە هەڵبەستەدا لە ئاکار و کردەوەی خراپی ناو کۆمەڵ ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ: لەم وڵاتەدا فەرمانبەر ڕێگرە، قازی دزە، وەزیران و کاربەدەستان گورگن، شێخەکان لاڕێن و والی مەیلی بەلای زانی و شەرابخۆر و لۆتیەوەیە و لەسەریان بەجوابە. حاجی هۆی سەرەکی ئەم دەردانە لەم بەیتانەی خوارەوە دەردەخات:

هێندە بێگانە لە ئیسلامن ئەحبابی فەرەنگ　　مونتەفی دێو لەلایان موتەشەڕڕێع شەوەیە
زوڵمیان عامە لەسەر عاممە، ڕەعیەت فەوتا　　تۆ مەکە مەنعی عەوامێل، کە خەتای گای بنەیە

(حاجی:١٤٠)

حاجی بە ئاشکرا هۆی ئەم چەوتی و نالەباریانە، بێگانەیی لە ئیسلام و گیرۆدە و هۆگری فەرەنگ دەزانێ و بە ڕاشکاوی لە بنی کولەکەکە دەدا و تاوانی ئەسڵی وەئەستۆی گای بنە یانی حاکمی عوسمانی دەخات.
هەڵبەت لە کۆتایشدا هۆیەکی تر بەبیر دەخات کە ئەویش بێئەسڵ و فەسڵی و لە بیرکردنی پێشینەیە:

هەر لە شا تا بە گەدا، تووشی یەکێکی نابی     بێ بپرسێ و حەقیقەت بڵێ جەددم ئەمەیە

(حاجی: ١٤١)

**٢-١- ئەگەر کوردێک قسەی بابی نەزانێ**

حاجی لەم شیعرەدا لەسەر بیرنەبردنەوەی زمان و نەریتی نەتەوایەتی و پێشینەی پرشنگدار و پیاوانی گەورەی ڕابردوو داکۆکی دەکا و بیرهێناوەی بڕێک لە گەورە پیاوان بانگهێشتنی خەڵک دەکات بۆ فێربوونی زانست و فنوونێک

ئەگەر کوردێک قسەی بابی نەزانێ     موحەقەق دایکی حیزە و بابی زانی

وەرە با بۆت بکەم باسی نیهانی     تەفەننون خۆشە گەر چاکی بزانی

سەلاحەددین و نوورەددینی کوردی     عەزیزانی جزیر و مووش و وانی

ئەمانە پاکییان کوردن نیهایەت     لەبەر بێدەفتەری ونبوون و فانی (حاجی: ١٤٦)

لە پاشان دێتە سەر لۆمەی شێخەکان کە سەریان لە خەڵکی شێواندووە و بە بیری پڕوپووچ لە کەسب و کار و تەحسیلی مەعانی دووریان خستوونەتەوە:

کە دەیگوت شێخی من، من دەستگیرم     لەلام وابوو لەبەر جەهل و جەوانی

کە پیر بووم و تێگەیشتم دەستی گرتم     لە کەسب و کار و تەحسێلی مەعانی (حاجی: ١٤٧)

هەڵبەت دەبێ بزانین کە دژایەتی حاجی لەگەڵ عیرفان و تەریقەتی ڕاستەقینەدا نییە، بەڵکوو ڕقی لەو شێخە بێکەڵکانەیە کە عیرفانیان تەنیا هەر بۆ گیرفانە و بەس:

کە نەفعەت نەبێ بۆ دین و دەوڵەت     بەمن چی «نەقشبەند»ی یانە «مانی» (دیوانی: ١٤٧)

هەڵبەت حاجی وەنەبێ ڕقی لە ڕاستەقینەی شێخەتی هاتبێتەوە، ئەگەر وا بوایە پڕ بەدڵ بانگی قوتبایەتی بۆ «مەولانا خالێد» نەئەدا:

مەعدەنی عیلم و عالیمی عامیل     قوتبی دەوران و مورشیدی کامڵ

هەر لە ئەوەڵ جەنابی مەولانا     نەقشبەندی ڕەواقی ئیلەڵلا (حاجی: ٢٢٢)

باسی تانە و سەرکۆنەی دەروێش و شێخەکانی ڕیاباز لە لایان حاجیەوە یەکێکە لە گرنگترین مەبەستە چاک خوازیەکانی حاجی و لە زۆربەی غەزەڵ و قەسیدەکانی باسی لێکردووە.

بابەتی تەسەوف و عیرفان و پەیوەندی لەگەڵ ئیسلامدا و کێشەی نێوان شەریعەت و تەریقەت، بابەتێکی دوور و درێژە و سەدان کتێبی لەسەر نووسراوە؛ بەڵام پەرەسەندنی بەتایبەت لە سەدەکانی ١٣ و ١٤ی کۆچی لە کوردستاندا لە گێژاوی بێسوباتی و نەبوونی ئاسایشدا، پەیدابوونی جارجاری مەئموورانی ئێستێعمار لە لیباسی دەروێش و خەلیفەدا، ئەمساڵی «بەهائەڵلا» لە کوردستانا. قسەوباسی شێخانی شەدەڵە و حەققە و

ناحەققە و دەیان شتی تری ئاوا بەڕاستی ئەم باسەی لە كوردستانا كردۆتە باسێكی ئاڵۆز. لەلایەک برێ لە شێخەكان بوونەتە گزیكاران و بەربەیان بە نەزانی و پڕوپووچ ئەدا و لەلایەكی ترەوە برێ لە پیاوانی ڕاستەقینەی تەریقەت بوونە مەشغەڵداری بەربەرەكانێ لەگەڵ زاڵمان و دوژمنانی گەل و هەروەها مانی زانست. دیارە لە ئاوا كات و ساتێكدا ئەركی چاک خوازانێكی بەرعۆدەی وەک حاجی قادر و مەلای گەورە، زۆر گرینگ و بەرچاوە و دەنگداوەی ئەم بابەتە لە شیعرەكانیدا گەلێ پڕڕەنگە.

**٢-٢- ئۆدەبا چاكە:**

ئۆدەبا چاكە لێم نەبن دەرهەم        لەم قسانە و حیكایەتەی دەیكەم (حاجی: ١٨٥)

برێک لە مەبەستە چاک خوازیەكانی ئەم پارچە شیعرە بریتین لە: بانگێشتن بۆ بیر و هۆشی تەجرەبی و لە مەحەكدانی ڕاست و درۆ، دۆست و دوژمن، بەرابەر كردنی ئاكار و كرداری ئەورووپای ئەو سەردەمە لەگەڵ وڵاتی كوردەواری كە ئەوان سەنعەتیان گەیشتووتە ڕادەی ئێعجاز ساڵی سەدوپەنجا وشە بۆ ناوی فەن و سەنعەت زیاد دەكەن، كەچی لە كوردەواریدا تەكیە و خانەقا غەیری تەعلیمی تەنبەڵی و خەریكبوون بە ڕمووز و ڕاز و نیازەوە نەفعیان نییە. حاجی بە ڕاشكاوی دەڵێ تەنبەڵی و بەرگری لە زانا بوونی خەڵكی بەتایبەت ئافرەتان دژایەتی هەیە لەگەڵ دنیا:

بۆچی فەرموویەتی نەبیی ئەمین        «اطلبو العلم ولو فی الصین»

نێر و مێ لەم حەدیسە فەرقی نییە        گەر مەلا نەهی فەرموو دینی نییە

تۆ وەرە فەننێ فێر بە چیتە لەوە        گاورە، هێندووە وە یا خۆ جووە (حاجی: ١٨٥)

حاجی بۆ هاندانی گەلی كورد بۆ زانست و سەنعەت و ئێتیحاد، نموونەی ژاپۆنی چل ملوێنی و چینی چوارسەد ملوێنی دێنێتەوە و دەڵێ:

ئەهلی ژاپۆن بە فەن و سەنعەتی چاک        سەیری چۆن چینی گرت و كردیە خاک

ئێتیحادی بە ئێتیفاقی ئەنام        سوپەرە بۆ حەوادیسی ئەییام (حاجی: ١٨٨)

سەرەڕای ئەوە كە حاجی پێی وایە برێ خوێنەر هەر هۆگری پێداهەڵگوتنی بێكەڵک و شیعرە بێكەڵكەكانی ئەو لە غەریبی و بێكەسی دەمرن (حاجی: ١٩٠) بەڵام دەس لە دڵسۆزی بێچاوەنواڕی خۆی هەڵناگرێ و دەڵێ:

بە قسەی چاكە دەستیان دەگرم        تەركی ناكەم بە لۆمە تا دەمرم (حاجی: ١٩١)

## ٣- چاكسازی ئایینی و كۆمەڵایەتی لە شیعری مەلای گەورەدا

### ٣-١- پێناسەیەكی كورتی مەلای كۆیی (١٣٦٣-١٢٩٢)

ناوی ئەم بلیمەتە «موحەممەد» كوڕی مەلا عەبدۆڵلای كوڕی مەلا ئەسعەدە. دایكی «عایشە»ی كچی حاجی بەكرئاغای حەوێزیە. ئەم بنەماڵە زیاتر لە سێ سەدە خەریكی بڵاو كردنەوەی خوێندەواری لە

کوردستانا بوون. حاجی قادر لە پارچە شیعرێکدا کە لە ئەستەمبۆڵەوە بۆ باوکی مەلای گەورەی ناردووە دەڵێ:

بەغەیری جەددی ئێوە کێیە دانا          لە کوردستان بناغەی عیلمی دانا (حاجی: ٢٤٦)

ئەم زاتە لە ساڵی ١٢٩٢ لە شاری کۆیە لە دایکبووە و هەر لە حەوت ساڵیەوە چووەتە بەر خوێندن، لە هەژدە ساڵیشدا ئیجازەی زانستی لە باوکی وەرگرتووەو بەرلە بیست ساڵە ئیجازەی زانستی بە شاگردانی داوە و لە دوای کۆچی دوایی باوکی ناسناوی سەرۆکی زانایان (رئیس‌العلما) وەردەگرێ و لە هەموو کوردستانا بە «مەلای گەورە» دەناسرێت. گەلێک مەلای ناودار و زانای پایەبەرز لەبەر دەستی ئەودا پێگەیون و هەرکام لە شوێنێکی کوردستانا بوونەتە مەشخەڵدانی زانست و ڕۆشنبیری. نەتەنیا شاگردەکانی، بەڵکوو منداڵەکانیشی بوونەتە درێژەدەری ڕێگەکەی؛ بۆ وێنە مامۆستا مەسعوود محەممەدی کوڕی کە کەسایەتیەکی بەرزی فەلسەفی و فیکری و بیرمەندێکی توانای کورد بووە. هەروەها «نەجیبە خانم»ی کچیشی ئافرەتێکی ڕۆشنبیر بووە. مەلای گەورە جگە لە ڕێنوێنی دڵسۆزانەی گەل و دەرس گوتنەوە و پەروەردە کردنی گەلێ شاگرد، کارگەلێکی گرنگی تریشی وەک: مەنسەبی قەزاوەتی شاری کۆیە و ئەندامی ئەنجۆمەنی ویلایەت لە مووسڵ و ئەندامی ئەنجۆمەنی دامەزراندنی عێراقی بە ئەستۆگرتووە. بەڵام سەرەنجام هەموو ئەوانەی وێڵکردووە و شانی داوەتە بەر توێژینەوە و نووسین (ڕۆحانی، ١٣٨٢،ب١: ٢٧٣).

ئەم کەسایەتیە بەرزە کە درێژەدەری بیروڕای پێشکەوتنخوازانەی چاکسازی باوکی و شاعیری هێژا «حاجی قادر»ە و بە وتەی «فواد مەعسووم»، دەبوایە ناوبانگی لە محەممەد عەبدە و سەید ڕەشید ڕەزای میسری کەمتر نەبوایە (عبدالخالق، ٢٠٠٩: ٦). مەلای گەورە ئاسەوار و بەرهەمێکی زۆر و بەکەڵکی لە بواری زانستی، کۆمەڵایەتی و ئەدەبیەوە بە دیاری بۆ گەل و هۆزی بەشکراوی خۆی بەجێ هێشتووە کە لە دیوانی شیعرەکان و بڕێ لە ئاسەوارە کوردیەکانیدا چاپ کراون و ئەوانی تری تا ئێستە هەر دەسنووسن (میر بەسری، ١٩٩١،ب٢: ١٣٤).

«ئەمین‌زەکی‌بەگ» دەڵێ: «مەلای گەورە چواردە ئاسەواری زانستی بە زمانی عەرەبی هەیە، بۆ وێنە: "المصقول فی العلم الاصول، کلام الجدید، الاله و الطبیعه"، هەروەها شەش نووسراوەی بە زمانی کوردی هەیە کە بریتین لە: "تەفسیری قورئان، عەقیدەی ئیسلامی، نوێکەرەوە (المجد)، دیوانی شیعر، فڕی فڕی قەل فڕی» (زەکی‌بەگ، ١٩٤٧: ١٣٦). جگە لەمانە کە ئاماژەی پێکرا، بەرهەمی زانست و بیری ئەم زانای بلیمەتەی کورد لە کۆمەڵە فتوا و حوکمە قەزاییەکانیدا کە پڕن لە نوکتەگەلی بەنرخ و بیر و ڕای تازە وەدەر دەکەون (حیدری، ٢٠٠٦: ٢٥٨-٢٧٠).

یەکێ لە بەنرخترین ئاسەوارەکانی، تەفسیرەکەیەتی کە لە ماوەی دە ساڵدا (٤٣-١٩٣٣) لە سێ بەرگدا نووسیویەتی و تەنیا سێ جزمی لە ساڵەکانی ١٩٦٨ و ١٩٧٠ لە لایەن نەجیبە خانمی کچیەوە لە بەغدا لە چاپ دراوە و ئەوانی تری دەسنووسن و سەرۆک کۆماری ئێستای عێراق (مام جەلال) بەڵێنی داوە لەسەر ئەرکی خۆی لە چاپیان بدات (هەمان: ١٧٣). ئەم تەفسیرە لە بواری زانستی، ئایینی، کۆمەڵایەتی و

ئەدەبیەوە گەنجینەیەكی زۆر بەنرخە و پڕە لە بیروڕای تازە و چاكخوازانە كە بەشێوەیەكی تازە و بەدوور لە لاساییكاری لە گەل ڕەوایەتە خورافیە تەفسیریەكان بە دەلیل و بەڵگەوە موخالەفەت دەكات و بەهێنانەوەی قسە و شیعری ئەمسالی «سەید جەمال» و شاعیرانێكی وەك حاجی قادر و شێخ ڕەزا و سەعدی شیرازی و دابونەریتە خوارەكانی ناو كۆمەڵ شیدەكاتەوە و لە پەنای مانای ئایەتە پیرۆزەكاندا خەڵكی بۆ ڕوكردنە زانستە بەكەڵكەكان و دووری لە خۆرافە و پڕوپووچ، بانگهێشتن دەكات.

## ٣-٢- كورتەیەك لە خاسیەت و هەڵوێستە چاكخوازیەكانی «مەلای گەورە»

بەر لە لێكۆڵینەوەی ناوەرۆكە چاكسازیەكانی شیعری مەلا، ئاماژە بە برێ لەو لایەنانە لە ئاكار و هەڵوێستیدا دەكەین. «مەلای گەورە» خۆشمەشرەب و قسەخۆش بووە. دەڵێن تەنانەت هەندێك مامۆستای دیان (مەسیحی) و برێك ڕۆژوو نەگریش گوێیان لە وتارەكانی مانگی ڕەمەزانیان دەگرت. لە باری ئابووریەوە سەربەخۆ بووە. نە بەڕاتبە خوێندوویە و نە مەلایەتی بە بەرات و سەرفترەی خەڵكی كردووە، بەڵكوو خۆی لە مەزرا و باخدا كاری كردووە. ئەم سەربەخۆییە لە هەڵوێستە نەترسەكانیدا زۆر كاریگەر بووە و چاویشی لە خەڵات و مووچەی دەزگا حوكمیەكان نەبووە. جارێك لە كۆڕێكی گەورەدا پارێزگاری هەولێر دەیەوێ پێشی ئەو و مەلا ئەفەندی كەوێ، دەستی دەگرێ و پێی دەڵێ: جارێ نۆرەی ئێمەیە (عبدالخالق: ٣٦). هەروەها كاتێك بە بۆنەی وتاری زانایانە و پتەویەوە بەر دڵی "سولەیمان نەزیف پاشا" والی مووسڵ، دەكەوێت و والی دەیەوێ خەڵاتی بدات، مەلا دەڵێ من بۆ خۆم هیچ پێویستی و كاری تایبەتم نییە، بەڵام دەمانەوێ لە كۆیە قوتابخانەیەكمان بۆ دروست بكرێ. لەسەر خواستی ئەو لە ساڵی ١٩١٣دا یەكەم قوتابخانە بۆ كۆیە دروستكرا. دوای ئەوە مەلا نەك هەر بە وتار و شیعری بە هەستی خەڵكی بۆ خوێندن هان دەدا، بەڵكوو لە ساڵی ١٩٢٦دا كچی خۆیشی لەگەڵ كوڕان دەنێرێتە قوتابخانە. ئەوسا (بەڵكوو ئێستاش) كچ ناردن بۆ قوتابخانە لەگەڵ كوڕان ئەویش بۆ زانایەكی ئایینی هەنگاوێكی زۆر فیداكارانە بووە (هەمان سەرچاوە: ٥٦).

وەك سیاسیەكی ژیر و نەترس هەوڵی داوە كە كوردیش وەك باقی گەلانی سەر بە عوسمانی مافی چارەنووسی دەوڵەتی سەربەخۆی هەبێت. لە چەند بەڵگەنامەی مەحرەمانەدا كە بە پێی یاسای بریتانی دوای تێپەڕبوونی سی ساڵ بڵاوبووەتەوە بە ڕوونی هەوڵی بەردەوامی و ژیری مەلای گەورە بۆ ڕازی كردنی ئێنگلیزیەكان سەبارەت بە دانی مافی چارەنووس بە كوردان وەدەر دەكەوێت (هەمان سەرچاوە: ٦١-٥٩).

## ٣-٣- شیعركانی مەلای گەورە و ناوەڕۆكیان

كەسایەتی مەلای گەورە هەر وەك وتمان بە لایەنی زانستی و فیكریەكانی زیاتر ناسراوە كە لەو بوارەدا زانا هەرەبەرزەكانی ئایینی ئیسلام دەژمێردرێت و لە گەلێ بابەتدا خاوەنی ڕای تایبەتی خۆی بووە. هەر لە سەرەتای پێگەیشتنیەوە بەهرەی شاعیریەتی هەبووە، بەڵام بە هۆی خەریك بوون بە باری مەلایەتی و فیكریەوە، مەودای شیعردانانی لێ كورت بووەتەوە. سەرەنجام شیعرە نیشتمانپەروەری و كۆمەڵایەتیەكانی

حاجی قادر کە هەمیشە لە وەعز و دەرس و نووسراوەی مەلادا حازر بوون لە لایەک و کارەساتی دڵتەزێنی ڕاپەڕینی شێخ سەعید و لە سێدارەدانی سەرکردە نەمرەکانی ئەو شۆڕشە لەلایەکی ترەوە مەلای هاندا کە بێتە ناو دنیای شیعرەوە و هەستی خۆی بە هەڵبەست دەرببڕێت.

دیوانی شیعری مەلا یەکەمجار لە ساڵی ١٩٢٧ لە لایەن «حسەین حوزنی موکریانی»ەوە لە ڕواندز لە چاپ درا و تا ئێستا بە چەندین شێوە و چەندین جار لە چاپ دراوە.

ناوەرۆکی زۆربەی شیعرەکانی کۆمەڵایەتی و نیشتمانپەروەری و سکاڵان لە باری نالەباری فیکری، سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتی کورد. لە شیعرەکانیدا ئەم بابەتانە دەردەکەون:

١- هاندان بۆ دینداری و خواپەرەستی ڕاستەقینە و ئەخلاقی پەسەند؛

٢- هاندان بۆ فێربوونی عولوومی تەبیعی و سەنعەت و فەن؛

٣- داکۆکی لە سەر مافی ژن و عاملاندن و خوێندەوار کردنی و ڕەخنە لە تەڵاق و جیابوونەوە؛

٤- هاوار بۆ قەومی کورد و ئاوەدان کردنەوەی کوردستان و خەمخواردن بۆ بەرهەمە بەنرخەکانی وەکوو نەوت و ڕادیۆم و ... کە کەوتوونەتە دەستی بێگانە؛

٥- داوای چاوبڕین لەو گەلانەی کە بە هەوڵ و زانست پێشکەوتوون. وەک: ژاپۆن؛

٦- هاودەردی لەگەڵ گەلانی چەوساوەی ئەو کات، پەسنی پێشەواکانیان وەک: گاندی، سەعد زغلول و کۆتایی فەرەنگی داگیرکەر؛

٧- کوتانی شێخ و مەلا و پڕوپووچی بەناو دینەوە و تانە لە چینەکانی خەڵک بەتایبەت سەرۆک عەشیرەکان و ڕێبەرانی ئایینی.

کە لە دواییدا چەند بابەتێک بۆ نموونە دەخرێنە بەرچاو.

**٣-٣-١- سەرکۆنەی نەزانی و هاندان بۆ باری زانستی**

مەلای گەورە بە ئاگاداری لە گەلانی دواکەوتوو و پێشکەوتوو و زانستەکانی سەردەم، بە باشی زانیویەتی کە نەزانی هۆی سەرەکی هەموو دەردەکان و زانست تەنیا دەرمانە. بۆیە هەموو خەڵکی بە ژن و پیاو و لاو و منداڵەوە هاندەدا بۆ فێربوونی زانستەکان. ئەو لە کۆڕی مەلایاندا باسی ئەوە دەکا کە فێربوونی زانستەکانی سەردەم و زمانی ئینگلیزی و هەر زمانێکی تری پێویست، بە پێی شەرعی ئیسلام فەرزی کیفایەیە؛ واتە ئەگەر کەسانێک فێری نەبن، هەموو موسڵمانان گوناهبار دەبن (عبدالخالق: ٣٥). مەلا ئاوا لە نەزانی گەلەکەی دەناڵێنێ:

هەتا دەمرم بۆ کورد دەناڵم　　　عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەماڵم

بە زۆری جاهیل و نەخوێندەوارن　　　لەلای نەوعی بەشەر بێقەدر و خوارن (مەلای گەورە: ١٠٥)

دوای گلەیی لە نەزانی لە پڕوپووچ، ئاوا بەرەو زانست بانگیان دەکات:

وەرن ئەی ئۆمەتی خەیرۆلبەرییە　　　لەپاش تەقدیمی ئەخلاس و تەحییە

بە عیلم و عەقڵ و هۆش و فیکر و عیرفان　　　بە قەولی موستەفا و ئایەتی قورئان

به قەولی جاهیلان خۆتان مەگۆڕن          به چاوی دڵ له دونیایێ بنۆڕن (مەلای گەورە: ١١٩)

له شوێنێکی تر هۆی دووری خەڵک له زانسی بەکەڵک، دەخاتە ئەستۆی کوڵکە مەلایان و دەڵێ:

مەلای نادان بە عینوانی شەریعەت          حەرامی کرد لە تۆ عیلمی تەبیعەت

لەبۆیە هەرچی لە خاک بەدەرکەوت          لە ڕادیۆم و لە زێڕ و باقر و نەوت

هەمووی کەوتووتە ژێر دەستی فەرەنگان          چیا و چوڵان دەنۆڕن وە پڵینکان (مەلای گەورە: ١١١)

دوای دۆعا کردن لە مەلای نەزان، ئەوانیش بانگ دەکات بۆ سەر هێڵی ڕاستی زانست:

ئەی مەلای نەفام ئەتۆ بی و خودا          لەبۆچی ڕێگات لە کوردان تێکدا

ئەم باس و خواسە هیچ کەڵکی نییە          ئەمڕۆ بنوارە هەلی تۆ چیە؟

عیلمێ بخوێنە بۆ ئۆمەت چا بێ          ئۆمەت و مەفتەن بە عیلمت شاد بێ (مەلای گەورە: ١٥٢)

### ٣-٣-٢- مافی ژنان

مەلای گەورە کە لە دەردی کۆمەڵی کوردەواری، یانێ نەزانی دەدوێ، دەرمانی سەرەکی بە باسەواد بوون و زانیاری و ئازادی ئافرەت دەزانێ و باوەڕی وایە کە ئافرەت کاتێ دەبێتە ئەندامێکی پڕسوود لە ناو کۆمەڵدا کە خوو و خدەی باش فێری مناڵان بکات، کە مافی ڕاستەقینەی خۆی بدرێتێ و لە ترسی دیلیەتی ڕزگار بێت:

ژن ئەگەر بە حورمەت بێ          بێ زیللەت و زەحمەت

بە تەربیە و ڕەحەت بێ          دڵگوشاد و لێو خەندان

کوڕی دەبێ وەک شێر          عاقڵ و دانا و دلێر...

تەربیە لەلای داکە          دایک چا بێ، ئەولاد چاکە (مەلای گەورە: ١٤٤)

ژنیش وەک موزەککەر          عەینی ئەویش بەشەرە (مەلای گەورە: ١٤٥)

### ٣-٣-٣-کوتانی شێخ و مەلا و خورافاتی ناو دینەوە:

هەروەک لە باسی حاجی قادردا ئاماژەمان پێکرد، لە سەردەمی مەلای گەورەشدا برێک شێخی دوور لە زانست و شەریعەت مێشک و بیری خەڵکیان بە پڕ و پووچی دوور لە عەقڵ و دژ بە ئایینی ئیسلام، لە ڕێی ڕاستەقینە لا دەدا و دەستەیەکی‌تریش وەک و دارودەستەی «حەققە» بەناحەق ئابڕووی دینیان دەبرد و خەڵکیان بۆ تەمبەڵی و نەزانی و ئاکاری ناڕەوا هان دەدا. لە ئاوا بارودۆخێکدا مەلای ڕۆشنبیر و دڵسۆز بە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ کە بێدەنگ نەبێت. هەڵبەت مەلای گەورە بەو ئەندازە کە دژی شێخ و دەروێشان بووە، لەوە زیاتر دژ بە مەلایانی نەزان و دینفرۆش بووە.

هەروەک لە شیعرەکانی دەردەکەوێ و توێژەران ئاماژەیان پێکردووە، بەرەنگای و دژ بە شێخان بۆ ئارەزوو و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی یان لە ڕووی ڕقایەتی و ناحەزی نەهاتووە؛ چوونکە سەیری دەکەین دۆستایەتی لەگەڵ چەند شێخێکی بەڕێز و ناوداری سەردەمی خۆی هەبووە بە تایبەت لەگەڵ «شێخ تاهیری هەڵەبجە». هەروەها باوکێشی زۆر دۆستی «کاک ئەحمەدی شێخ» و «شێخ عەلی تاڵەبانی» بووە (عبدالخالق، ٢٠٠٩: ٧٢).

دیوانی مەلای گەورە پڕە لە سەرکۆنەی شێخ و مەلای نەزان، بە جۆرێک کە زیاتر لە بیست پارچە شیعر یەکسەر لەو مەسەلە دەدوێن و لە باقی تری شیعرەکانیدا جارجار ئەو باسە دێنێتە ئاراوە:

سوێندت بۆ دەخۆم بەو خودای بێچوون بەقسەی شێخۆلکان کورد لە دین دەرچوون
مەلا و شێخەکان بێدین و بەدخوون الا انهم هم المفسدون
ئەی شێخی جاهیل زۆر چاک بزانە خودا عالیمی سێڕڕ و عەیانە
ئەی مەلای نەفام ئەتۆ بی و خودا لەبۆچی ڕێگات لە کوردان تێکدا (مەلای گەورە: ١٥١)
هەتا شێخێ لە کوردستان بمێنێ ئۆمێدی زیندەگانیت پێ نەمێنێ
لە وان و ئەرزڕووم تا حەدی جافان تەوەللا بوون لە عەقڵ و عیرفان (مەلای گەورە: ١٠٧)

ئەم بابەتە نە تەنیا سەرانسەری شیعرەکانی مەلای گەورەی لە ئامێز گرتووە، بەڵکوو لە نووسراوەکانی تریشیدا وەک نامیلکەی «فڕی فڕی قەل فڕی» و تەفسیرە کوردیەکەشی بە فراوانی باسی کردووە. بۆ وێنە لە تەفسیری ئایەتەکانی ١٥٩ و ١٦٠ی سوورەتی «بەقەرە»دا کە خوداوەند بەتوندی هەڕەشە لە ئەو زانایانە دەکات کە دەستوورە ڕاستەکانی خوا دەگۆڕن و لەو کارەیان دەس هەڵناگرن؛ دەڵێ: «من ئەوانە باش دەناسم تا مەلاتر بن (عنوود) کەللە شەقتر ئەبن. بە قونکە بیور لە تەختەی ناوچاوانیان بدەی ناگەڕێنەوە. بۆ حێفزی مەقام و نفووزی خۆیان لە سەر ئۆمەت پێ لە حەق دەنێن. ئەگەرچی لازمە بڵێم «ئەلحەزەڕ، ئەلحەزەر» لەو نەوعە کەسانە، ئەمما چفایدە ئیشی خۆیان کرد و خورافاتیان لە دەماغی موسڵمانان ناوە و چەسپاند، ڕۆحی حەیاتیان برد«انا لله و انا الیه راجعون» (مەلای گەورە، ١٩٧٠، ب٢: ٢٢).

## ئەنجام:

لە کۆتاییدا بۆمان دەرکەوت کە حاجی قادر و مەلای گەورە هەردووکیان بابەتە چاکسازیە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکانیان بە فراوانی لە شیعر و هەڵبەستەکانیانا هێناوە و زۆر بابەتیان وەک یەک دەچیّ. هەڵبەت ئەم وتارە کاری بە لایەنەکانی تری شیعر و ئەدەبی ئەم دوو کەسایەتیە نییە. هۆی ئەم لێکچوونەش ڕوونە، چوونکە هەردوو کۆیین و حاجی لەگەڵ باوکی مەلای گەورە هاوڕێی خوێندن و بیروبۆچوون بوون و مەلای گەورە خۆیشی لە بیر و ڕا نیشتمانی و کۆمەڵایەتیەکانی حاجی قادر تەئسیری وەرگرتووە و زۆر خۆشی لە شیعرەکانی حاجی قادر هاتووە. برێک لە لێکچوونی شیعرەکانیان لە بابەتە چاکسازیە ئایینی و کۆمەڵایەتیەکان ئەمانەن:

١-کۆتایی خورافات و پڕوپووچی جێی گرتووە بە ناوی ئیسلام و عیرفانەوە و سەرکۆنەی شێخە لاڕێکان،

٢- ستایشی شیخانی بەڕاستی وەک مەولانا خالید، کاک ئەحمەدی شێخ،

٣- بەربەرەکانیّ لەگەڵ نەزانی و هاندان بۆ تێکۆشانی زانستی،

٤- خەم و پەژارە بۆ گەلی هەژاری کورد و لە دەسچوونی وڵات و دەسهاتی.

بەرچاوترین جیاوازیەکانیان ئەمانە خوارەوەن:

١-داکۆکی حاجی لەسەر زمان و ئەدەبی کوردی و هاندانی خەڵکی بۆ فێربوونی زمان و فۆلکلوری نەتەوەیی، زۆر لە مەلا زیاترە،

٢- جوانکاری و ڕەوانبێژی لە شیعرەکانی حاجیدا زۆر زیاترن. هەر بۆ ئەمە کاریگەرتریشن،

٣- باری زانستی و داکۆکی کردن لەسەر بیروڕای دروستی فیکری و ئایینی لە شیعری مەلادا زۆرترن،

٤- هاندان بۆ زانستەکانی سەردەم و فێربوونی سەناعەت و فەن لە شیعری مەلادا پڕ ڕەنگترە.

## سەرچاوەکان:

١ -قورئانی پیرۆز.

٢- بصری، میر (١٩٩١) **اعلام الكرد**، لندن، مكتبة الرياض الرئيس، چاپ اول.

٣- جرم حيدری، جواد فقی علی (٢٠٠٦) **محمّد بن عبداللهٔ الجلی و جهود العلميه**، اربيل، مكتبه التفسير، چاپ اول.

٤- خالّ، شێخ موحەممەد (٢٠٠٧) **نالەی دەروون**، هەولێر، ئاراس.

٥- خەزنەدار، مارف (٢٠٠٤) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، هەولێر، ئاراس.

٦- روحانی، بابا مردوخ (١٣٨٢) **تاريخ مشاهير كرد**، تهران، سروش، چاپ دوم.

٧- زكی‌بگ، محمّد امين (١٩٤٧) **مشاهير الكرد و الكوردستان فی العهد الاسلامی**، مصر، مطبعه السعاده.

٨- سەجادی، عەلائەدین (١٣٦١) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، سەردەشت، معارف.

٩- عبدالخالق، علاالدين (٢٠٠٩) **مەلای گەورە**، هەولێر، مناره، چاپی دووهەم.

١٠- کۆیی، حاجی قادر (١٩٨٦) **دیوانی شیعر**، لێکۆڵینەوەی سەردار حەمید میران، لاوانی کوردستانی عێراق.

١١- کۆیی، مەلا موحەممەد (١٩٧٠) **تەفسیری کوردی**، بەغداد، چاپخانەی سلێمان الاعزەمی.

١٢- مەسعوود موحەممەد (١٩٧٣) **حاجی قادر (بەشی یەکەم)** بەغداد، کۆڕی زانیاری کورد.

١٤- مەسعوود موحەممەد (١٩٧٤) **حاجی قادر (بەشی دووهەم)** بەغداد، کۆڕی زانیاری کورد.

١٥- مەسعوود موحەممەد (١٩٧٦) **حاجی قادر (بەشی سێهەم)** بەغداد، کۆڕی زانیاری کورد.

# بەراوردی شیعرەکانی «عەبدوڵڵا پەشێو» و «مێهدی ئەخەوان سالس»

## (دوو شاعیری هاوچەرخی کورد و فارس)

## «بەپێی پێوەرەکانی وێژەی بەراوردکاری»

گوڵاڵە درووديان -

**کورتە:**

ئەمڕۆکە «ئەدەبی بەراوەردکاری» وەکوو لقێکی وێژە و بەواتایەکی چاکتر، ڕەخنەی وێژە دێتە ئەژمار؛ کە دەرەنجامی لێکوڵینەوە و توێژینەوەکان لەم بوارەدا ئەتوانێ گەلێ دەسکەوت و دەرەنجامی لێ بکەوێتەوە.

«ئەدەبی بەراوەردکاری» -کە ئەڕواتە سەر کاریگەریەتی وێژەی دوو نەتەوە لەسەر یەکتر- مەرجە سەرەکیەکەی، جیاوازی زمانە لەو بەرهەمگەلەی ئەکەونە بەر توێژینەوە. ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەیەوێ تیشک بخاتە سەر کاریگەری دوولایەنە (بەڵام ناڕاستەوخو)ی دوو شاعیری کورد و فارس؛ یەعنی «عەبدوڵڵاپەشێو» و «مێهدی ئەخەوان سالس».

بەسەرەنجدان بەوەی کە دوو نەتەوەی کورد و فارس خاوەن پێشینەیەکی مێژوویی هاوبەشن و هەروەها نزیکایەتی لە ڕووی شوێنەوار و فەرهەنگەوە، ئەگەری هەر چەشنە ئاڵشتێکی فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی، وێژەیی و ... لەنێوان ئەم دوو نەتەوەیەدا ئاساییە.

حاشا هەڵنەگرە کە وێژەی ئەم دوو نەتەوەیە هەتا ڕادەیەکی زۆر لە سەر یەکتر کاریگەریان هەبووە، بۆیە لەم تۆیژینەوەیەدا هەوڵ ئەدرێت شیکاری شیعرەکانی ئەم دوو شاعیرە هاوچەرخە وەکوو نوێنەرەکانی سووچێکی بچووک لە دوو ئەدەب و لەئاکامدا هاوچەشنی و جیاوازییەکان بخرێتە بەر باس و مشت و مڕ.

**وشە سەرەکییەکان:** وێژەی بەراوردکاری، ڕەخنە، شیعر، شیعری هاوچەرخ

---

- ماستەری زمان و ئەدەبی فارسی.

## پێشەکی:

«وێژەی بەراوردکاری» -کە وشەی هاوتای لە زمانی ئینگلیسیدا Comparative literatureە- لقێ لە ئەدەب و بەواتایەکی‌تر، لقێ لە ڕەخنەی ئەدەبیە کە دەسکەوتەکانی توانیویە و دەتوانێ یارمەتی زۆری توێژینەوە ئەدەبیەکان بدات.

«دەستەواژەی "وێژەی بەراوردکاری"، بۆ یەکەمین جار لە لایەن ڕەخنەگری فەڕانسی "ویلمەن" و دواتر "سەنت‌بۆ"وە بەکار هێنرا و لێکۆڵینەوە لە مەڕ ئەم وێژەیە لە فەڕەنسەدا گەشەی سەند» (زرین کوب، ١٣٥٤: ١٢٥).

«وێژەی بەراوردکاری، بەکورتی بریتیە لە توێژینەوەی وێژەی نەتەوەیی و پیوەندی مێژوویی لە گەڵ نەتەوەکانی تر، لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی ئەم پێوەندییە و کاریگەری و کارتێکردنیان لە سەر یەکتر. هەروەها لێکۆڵینەوە لە سەر ئەوەی ئەم وێژەیە چ شتگەلێکی لە وێژەی نەتەوەکانی تر بە قەرز وەرگرتووە و چ شتگەلێکی پێ بەخشیون» (ندا، ١٣٨٠: ١٠).

تاقە سنوور و مەودای نێوان ئەدەب، ئەو زمانەیە وا بەرهەم تیایدا دێتە ئافراندن. ئەو شاعیر و نووسەرەی وا بە زمانی عەرەبی دەنووسێ، هەرچەند بەڕەگەز سەر بە زمانی عەرەبی نەبێ، بەرهەمەکەی ئەچێتە خانەی وێژەی عەرەبەوە» (غنیمی هلال، ١٣٧٣: ٣٢).

«مەودای نێوان دوو وێژە لە لێکۆڵینەوەی وێژەی بەراوردکاریدا، زمانە. جیاوازی زمان لە بەرهەمی ئەدەبیدا، مەرجی سەرەکی لێکۆڵینەوەی بەراوردکارانەیە سەبارەت بە بابەتی بەرباس. بەراوردی نێوان دوو وێژەر -کە سەربە زمانێکی هاوبەشن- ناچێتە خانەی لێکۆڵینەوەی وێژەی بەراوردکارییەوە، هەرچەندیش کەوتبێتنە ژێر کاریگەری یەکترەوە؛ بۆ وێنە هەرچەشنە بەراورد و هەڵسەنگاندنی وێژەی فەڕانسە لە گەڵ ئەدەبی کانادا -کە بۆ خۆیان فەڕەنسی زمانن- یان بەراوردی باڵادەستی "ئەبوتمام" و "بوحتوری" لە ئەدەبی عەرەبدا لەم چەشنەیە» (ندا، ١٣٨٠: ١٠ (بە دەستێوەردانەوە)).

ئەمە لە کاتێکدایە کە لێکۆڵینەوە لە مەڕ وێژەی بەراوردکاری، ئەڕواتە سەر ئەو کاریگەری و کارتێکردنانەی وا سنوورەکانی وێژەی نەتەوەیی ئەبەزێنن. بۆ وێنە کاریگەری "حافیز"ی ئێرانی لە سەر "گوتە"ی ئاڵمانی یان کاریگەری "جامی" لە سەر "لویی ئاراگون" شاعێری سووررپالیستی فەڕەنسی یان "موتەنەبی" عەرەب لە سەر "سەعدی" ئێرانی.

«لەوێژەی بەراوردکاریدا، زۆرتر لەهەرشتێ ئەکرێ خاڵی یەکگرتنی ئەندێشەی بەشەر بناسینەوە و ئەوەی کە چۆناوچۆن ئەندێشەیەک لە شوێنێکی جیهاندا لە ڕێگەی بیرمەند، وێژەر یان شاعیرێکەوە دێتە مەیدانی مشتومڕ و لە شوێنێکی تردا هەمان ئەندێشە بە شێوەیەکی تر هەوڵی دەرکەوتنی بۆ ئەڕەخسێ» (کفافی، ١٣٨٢: مقدمە). بۆ وێنە ئەم شیعرە لە پەشێو:

دەرگەکەتم لێ بکەوە!/ئەم شەو هاتووم /بۆ چنینی/ چەپکە نێرگزێکی چاوت،/ بۆ وچانێ، بۆ خەونێ، / تۆزە گریانێ / لە سەر هەوری قژی خاوت/ ئەم شەو هاتووم/ ترووسکایی شاری یادگار بانگی کردووم./.../

دەرگەکەتم لێ بکەوە!/ هەر دڵدارەکەی جارانم،/ هەر کێڵگەکەی بەردەرگەتم،/ هەر تینووەکەی بەر کرێوەو باو بارانم./ دەرگەکەتم لێ بکەوە!/ کفتوماندووی ڕێگەی دوورم/...

هەروەها ئەم شیعرەی مێهدی ئەخەوان سالس:

مسیحای جوانمرد من! ای ترسای پیرِ پیرهن چرکین! / هوا بس ناجوانمردانه سرد است ... آی ... / دمت گرم و سرت خوش باد!/ سلامم را تو پاسخ‌گوی، در بگشای! / منم من، میهمان هر شبت، لولی وش مغموم/ منم من، سنگ تیپاخوردەی رنجور/ منم دشنام پست آفرینش، نغمەی ناجور/ نه از رومم، نه از زنگم، همان بیرنگِ بیرنگم،/ بیا بگشای در، بگشای، دلتنگم/ حریفا! مهربانا! میهمان سال و ماهت پشت در چون موج می‌لرزد/ تگرگی نیست، مرگی نیست/ صدایی گر شنیدی، صحبت سرما و دندان است/ من امشب آمدستم وام بگذارم/ حسابت را کنار جام بگذارم.

به نەختێ وردبوونەوە لەم دوو شیعرەی ئەم شاعیرە کورد و فارسەدا، ڕەنگدانەوەی جۆرێ لە چوار چێوەی بەستراومان بەرچاو ئەکەوێ. ئاوڕدانەوە لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی تا ڕادەیەک هاوبەشی هەر دوو شاعیرەکە، ئەمانگەینێتە ئەو قەناعەتەی کە هەم "ئەخەوان" و هەم "پەشێو" لە ژێر کاریگەری کەش و هەوایەکی داخراو و ناخۆشدا دەکەونە پەلەقاژەی دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەک بۆ دەربازبوون. هەردووکیان بە پیشان دانی جۆرێ کەش‌وهەوای هاوچەشن لە شیعرەکانیاندا بە جۆرێ هەوڵ بۆ دۆزینەوەی پەناگەیەک ئەدەن هەتا لەم تەنگەژە و نەهامەتییە دەرباز بن. هەرچەند ڕەنگ و بۆنی ئەم پەنا و پەسیوە لە شیعری دوو شاعیردا جیاوازە. بۆ وێنە "ئەخەوان" بەڕەش دیتنی بارودۆخ و قەڵسبوون لێی و هەست بە کەوتنە تەنگایی، پەنا ئەباتە بەر مەی و مەیخانەو ئەو کەسەی وەک یاریدەر دەیناسێ و بەخاوەنی وەها توانایەکی دەزانێ کە بتوانێ خەڵکەکەی لەو کۆت و زنجیری کۆیلەتیە دەرباز بکات. هانا بردنە بەر ئەو شوێنە و ئەو کەسە بە ساڕێژکەری زام و برینی خۆی دەزانێ. لە شیعری پەشێودا ڕەنگدانەوەی هەمان داخراوی و لێڵبوونی بارودوخ هەست پێ ئەکەین؛ بەهەمان شێوەیەک وا "ئەخەوان" خۆی لە پشت دەرگایەکی داخراودا ئەبینێتەوە و ئەکەوێتە تکاو پاڕانەوە، هەر ئەم باسە لە شیعری پەشێویشدا پیشان دراوە، بەڵام پەشێو ئەم ڕجایە ئەباتە بەر دەمی خۆشەویستەکەی و ئەیهەوێ لە تەنگایی و تاریکایی و ناخۆشی ئەو دۆخەی تیایا گرفتارە، بۆ تاوێ خۆی بخاتە کۆشی دڵدارەکەی و لەوێدا دەرباز بوون و ئارامشی خۆی بدۆزێتەوە.

مێژوو دەورێکی بەر چاو ئەبینێ لە خوێندنەوە بەراوردکاریەکاندا. بە چەشنێ دەتوانێ بوونی پێوەندی لە نێوان ویژەران یا نەبوونی ئەم پێوەندییە بسەلمێنێ. کە بوونی ئەم پێوەندییە لە ڕووی مێژووییەوە سەلمێندرا، ئەوسا توێژەری ویژەی بەراوردکاری ئەتوانێ دەست بداتە لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی ئەو بابەتە. ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە ئەبێ پێوەندی تاکەکەسی لە نێوان ویژەراندا هەبێ، بەڵکوو هەر ئەوەی کە دەرکەوێ ئەندێشەیەک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر بڕوات و ویژەرانی ئەوێ لاساییان کردبێتەوە یان کەوتبێتنە ژێر کاریگەری، بەسە.

وەک پێشتر وتمان، ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵئەدا بۆ لێکدانەوەی بەراوردکارانەی نموونە شیعرییەکانی دوو شاعیری هاوچەرخی کورد و فارس: پەشێو و ئەخەوان سالس. پێوەندی و دان‌وستانە فەرهەنگییەکانی ئێران

**بەشی یەکەم- ئەدەبی بەراورد**

و کوردەکان، وەک دانیشتوانی ناوچەیەکی هاوبەش، پێشینەیەکی دوور و درێژی هەیە؛ هەم لەبەر نزیکایەتی شوێنەوار و هەم بەهۆی هاوبەشی ئایینی، جۆری ڕوانین و تێکەڵاوی و باوەڕە هاوبەشە دینی و نەتەوەییەکانەوە، ئاساییە کە ئەم نزیکایەتی و لێکچوونگەلە لە وێژەشدا ڕەنگ بداتەوە و هەر ئەمەش ویستە ناوی سەرەکی بێ بۆ ئەم ئەم توێژینەوەیە. ئەم کارە، توێژینەوەیەکە لە چوار چێوەی وێژەی بەراوردکاریدا و هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی نێوان شیعرەکانی ئەخەوان سالس و پەشێو، وەک دوو شاعیر و نوێنەری دوو فەرهەنگی نزیک لە یەکتر و لە سەر یەکتر کاریگەر.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە سەبارەت بە چوارچێوەی وێژەی بەراوردکارییە، لێکۆڵەر لە هەموو کەرەسە ئەدەبییەکان (وەکوو: جوانناسیAestheticism، شێوە، ناوەڕۆک، چەشنە ئەدەبییەکان، مێژووی وێژە و ...) کەڵک وەردەگرێ. ڕەخنەی بەراوردکارانە دەست ئەداتە بەراورد و هەڵسەنگاندنی هاوکاتی دوو بەرهەمی ئەدەبی لە دەڤەرێ یان دەڤەرگەلێکی تایبەت لەلایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەدەبدا.

لەم توێژەینەوە و تەریپگەریەدا لەوانەیە لە کاریگەری و کارتێکردنی دوو وێژەر لە سەر یەکتر یان خاڵە جیاواز و هاوچەشنەکانیان بخرێتە بەر باس. بۆ وێنە ئەم نموونەگەلەی خوارەوە کە بڕێ جار خاڵی هاوچەشنی و بڕێ جار خاڵی جیاوازی ئەو دوو شاعیرە ئاماژە پێکراوەی ئێمە "ئەخەوان" و "پەشێو"ن:

١- **هێنانی ناوە ئوستوورەیی و مێژووییەکان:** هەر دوو شاعیری ئاماژە پێدراو، لەژێر کاریگەری داب و نەریت و باوەڕەکان لە شیعرەکانیاندا ناوە ئوستوورەیی و مێژووییەکان ئەهێنن و وەک خاڵی هاوبەشی هەر دوو شاعیرەکە ئەکرێ باسی لێ بکەین و بە سەرەنج بە باوەڕە کۆن و دێرینەکانیان لەم بوارە و لەزۆر شوێندا پیرۆزایەتیان پێ بەخشراوە و ئەم ڕەنگدانەوەش سروشتیە. جێگەی ئاماژەپێدانە کە بڕێ لەم ناوگەلە بە تەواوەتی هاوبەشن؛ لەوانە زەردەشت، ئەهوورامەزدا، کاوەو ... بڕێ جاریش یەک لەم دوو شاعیرە ئەو ناوە ئوستوورەیی و مێژووییانەی -کە لەلای نەتەوەی خۆی پیرۆز و جێگەی ڕێزلێنانە- ئەهێنێت و لە بەرهەمەکانی ئەوی تردا بەر چاو ناکەوێ؛ لەوانە «سەلاحەدین» لە شیعری پەشێودا یان «ڕوستەم» و «کاووس» لە شیعری ئەخەواندا:

**ئە – ناوە هاوبەشەکان:**

١-١- **ئەهورامەزدا:** کە وەک خودای چاکە (نوێنەری چاکی)، لای نەتەوەی کورد و فارس پیرۆز و جێگەی ڕێزلێنانە و لە بەرامبەریدا «ئەهریمەن» دائەنێن، کە خودای دزێوی و نەگریسییە.

نموونە شیعرییەکان:

**پەشێو:** خەونێکم دی/ لەو خەوەدا، *ئاهوورەمەزدە* گەڕابووە/ نیشتمانی کەڤناری کورد

**ئەخەوان:** هم اُرمزد و هم ایزدانت پرستم/ هم آن فره و فروهر دوست دارم

١-٢- **زەردەشت:** بەهۆی نزیکایەتی شوێنەوار، فەرهەنگ، بڕوا و پێوەندییە هاوبەشە ئایینی و ئایینییەکان لە فەرهەنگ و دابونەریتدا، هەردوو شاعیر بە چاوی پیرۆزایەتییەوە سەیری دەکەن:

**پەشێو:** بۆ بێدەنگی،/ ئەی قەڵەمە دەنووک سوورە ئاتەشیەکەم؟/ ئامان! پەنام هێنا بەرت.../ قیژەیێ، تەکانێ، گوڕێ.../ با زەردەشتمان لە خەوڕابێ،/ ئاهوورامان سەر هەڵبڕێ.../ ئەمانە چین لە سەر ملمان هەڵتۆقیون؟

**ئەخەوان:** گران مایه زردشت را من فزونتر/ ز هر پیرو پیغامبر دوست دارم

**٣-١- کاوە:** کە لە کەسایەتییە هەرە پیرۆزەکانە لای ئێرانی و کوردەکان و لە زۆربەی ئوستوورە و ئەفسانەو باوەڕەکاندا لەبەرامبەر ئەم کەسێتییەدا، کەسێتی نگریس و دزێوی "زەحاک" دائەنێن. کاوە وەک کەسێکی شۆڕشگێڕ کە دژ بە ستەم و ستەمکارە کۆڵەوارەکەی دەورانی خۆی (زەحاک) ڕائەوەستێت و لە درێژایی مێژووی ئەم خەڵکەدا جێی ستایش بووگە و بەردەوام وەک سەمبوڵی ڕەهایی و ئازادی بینراوە:

**پەشێو:** پرسیم لە *کاوەی* باپیرم،/ گوتم: بابە! وا دەست بەستەم،/ دەپێم بڵێ، چۆن دەگەمە/ نەورۆزەکەی سەدەی بیستەم؟

**ئەخەوان:** باز می‌گویند: فردای دگر/ صبر کن تا دیگری پیدا شود./ *کاوه*ای پیدا نخواهد شد، امید!/ کاشکی اسکندری پیدا شود.

**٤-١- خەییام:** کە لە شاعیرە خاوەن جیهانبینییەکانی ئێرانە و لە بەر ئەوەی چوارینەکانی ئەم شاعیرە گەورەیەی فارس وەرگێڕدراوەتەوە سەر زمانی کوردی، خۆی و شیعرەکانی هەتا ڕادەیەکی زۆر لە لای خەڵکی کورد، تەنانەت ئەو کەسانەی هیچ ئاشنایەتیەکیان لە گەڵ زمانی فارسیدا نییە، ناسراوە:

**پەشێو:** بمزانیایە/ جارێکی تر/ سێبەرم، سێبەرت شانە ناکاتەوە،/ بمزانیایە/ جارێکی تر/ *خەییامی* دەروونی هەڵچووت/ پەیکی وشەی شیعرەکانم ناخواتەوە... .

**ئەخەوان:** ز *خیام*، ختم و خروشی که جاوید/ کند در دل و جان اپر دوست دارم

**٥-١- ئاوێستا:** لە وشە هاوبەشەکانە کە بە پێی باوەڕە نەتەوەیی، ئایینتراییە کۆنەکانی دوو نەتەوەیە کە ئەم دوو شاعیرە تیایدا ژیاون، لە شێوەکانیاندا هاتووە:

**پەشێو:** کە هاتە لام،/ پەیامێکی وای بۆ هێنام،/ وەک کانی، وەک پریشکی ئاگر وا بوون، / هی ڕۆژانی *ئاڤێستا*بوون/ خوێندمەوە و گەلێک گریام./ گریام بۆ خۆم،/ گریام بۆ تۆ،/ بۆ هەزاران/ زیندووی نێژراوی ناو گڵکۆ.

**ئەخەوان:** شعر قرآن و *اوستاست* کزین سان دم نزع/ خانه روشن کند از سوز من و سینه‌ی من

## ب: ناوە ناهاوبەشەکان:

**پەشێو:**

**٦-١- بابەگوڕگوڕ:** لە کەسێتییە پیرۆز و جێی ڕێزلێنانەکانی کوردە. گڵکۆی وەک پەرەستشگایەکی پیرۆز، چاوی لێئەکرێ و لە کەرکووکی عێراقدایە:

هاوڕێم!/ کە چوویتەوە سلێمانی/ لە ڕێگاتا، لە بیر نەکەی:/ لە قەلات و منارەوە،/ لەمۆغەکانی شارەوە/ چەپکە هەواڵێک بەرەوە/ بۆ خوا، بۆ بیرەکانی نەوت،/ بۆ مەزاری *بابەگوڕگوڕ*.

**٧-١ - سەلاحەدین**: لە کەسێتییە زۆر بوێر و جوامێر و شوڕشگێڕەکانە و لای کورد و فارسیش جێگەی ڕێز لێنانە.

چەند حەز دەکەم بژینمەوە/ داستانەکەی سە*لاحەدین*/ دیسان وەکوو بوومەلەرزە/ ڕاچڵەکێنم دڵی زەمین.

**ئەخەوان**:

**٨ – ١ – تامێنە، کاووس، شوغاد، جەمشید**: کە هەر چواریان لەناوە ئوستوورەییەکانن و لە ئەفسانە و ئوستوورەکان و لە نووسراوە پڕ بایەخەکانی فارس (لەوانە شانامەی فردوسییە) زۆر جار ناویان هاتووە:

پر شد از قهقه دیوانگیش چاه *شغاد*/ شکر *کاووس* شه این است ز *تهمینەی من* / با میِ ناب *مغان*، در خُم خیام، امید!/ خیز و جمشید شو از جام سفالینەی من.

**٩-١ - نەریمان، سام، زاڵ، ڕۆستەم، سوهراب**:

کە هەر هەموو ئەم ناوگەلە، لەناوە ئوستوورەییەکانن و زۆربەیان جێگەی ڕێزلێنانن و لە ئوستوورە و ئەفسانە و نووسراوە پڕبایەخەکانی وێژەی فارسی‌زمانانداندا ناویان هاتووە، بە تایبەت «ڕوستەم» و هەروەها «سوهراب»ی کوڕی کە بە درێژایی مێژووی ئەم خەڵکەدا وەک نوێنەر و هێما لەنێۆانیاندا ناسراوە. لای ئێرانییەکان ڕۆستەم، پاڵەوانی ئوستوورەیی، وەک هێمای جوامێری و بوێری وئازایەتی، زۆر جێگای ڕێزلێنانە:

و ای شمایان دوستدار پهلوانی‌ها،/ سام نیرم، زالِ زر مائیم،/ رستم *دستان* و *سهراب* دلاور نیز.

(ئەڵبەت هەر لەم شیعرەدا شاعیر ئەم ناوگەلەی وەک هێمای بوێری، ڕاوەستان، مێرخاسی و نیشتمانپەروەری هێناوەتەوە.)

**٣ – بارام**: وەک دوایین پەنادەر و هیوای ڕەهایی ناوی هاتووە و لەهەموو ئایینەکاندا شوێنی تایبەتی خۆی هەیە. هەر هەمان "مێهدی" مزگێنی‌دراوە لە ئاییترای تەشەییوع یان "سوشیانت" (سوشیانس) لە ئایینی زەردەشتیدا:

نشانی‌ها که می‌بینم در او *بهرام* را ماند/ همان *بهرام* ورجاوند/ که پیش از روز رستاخیز خواهد خاست/ هزاران کار خواهد کرد نام‌آور،/ هزاران گرفه خواهد زاد از او بشکوه.

بە سەرەنجدان بەم نموونە شیعرییانە دەرئەکەوێ ئەم دوو شاعیرە وەک نوێنەرەکانی دوو هۆز لە کۆنترین هۆزەکانی ڕۆژهەڵات (کورد و فارس) وەک زۆرینەی خەڵکی وڵاتەکەیان، هێشتاکە لە چوارچێوەی باوەڕە کۆنەکاندا نوقمن و ئەم چوارچێوە بیروباوەڕیە هەتا چەرخی ئێستاش هاتووە و پێچراوەتە تیشکی پیرۆزایەتی مێژووییەوە و ئەگەر لە جیهانی هەنووکەدا وەک دەنگ و ڕەنگە هاوارە نەتەوەییەکانیان خەریکی بانگدانیانن، پەنابردنە بەر ئەم ناوەئوستوورەیی و مێژووییگەلە وەک ڕیگای ڕەهایی و دەربازبوون بۆ وتنەوەی ناڕەزایەتی و سکاڵا و گازندە لە بارودۆخی هەنووکە هەڵبژێردراوە. وەک دیمان زۆرێ لەم ناوگەلە لای ئەم دوو

شاعیرە بە دوو زمانی جیاواز و ئەڵبەت بەنزیکایەتی فەرهەنگی و شوێنەواری و میژوویی و... هاوبەشە و لە برێ شوێنیشدا جیاوازیگەلێ بەرچاو ئەکەوێ کە ئەگەڕێتەوە بۆ گرێدراوییە نەتەوەیییەکان.

**٢ ــ پیاهەڵدان (بەروانینی سروشت خوازانە):**

ئەم دوو شاعیرە لە گەڵ ئەوەی هەتا ڕادەیەکی زۆر نوقمی کێشەی نیشتمان و خاک و کۆمەڵگان، ئەگەرچی پەشێویش زۆر چووەتە سەر خانی شیعری دڵدارانە، (بەپێچەوانەی ئەخەوان) و لە زۆر شوێندا خۆشەویستی و نیشتمانی ئاوێتە کردووە، بە چەشنێ کە جیاکردنەوەی ئەم دوانە لە یەکتر نامومکینە. لەزۆر شوێندا ئەگەڕێتەوە بۆ فاکتەر خۆزایی و سروشتییەکان و لەزۆر شوێنی شیعرەکانی ئەم دوو شاعیرەدا ئەو نموونە و هێمایانەمان بەرچاو ئەکەوێ وا شاعیر دەستی داوەتە وێناکردنیان. بە سەرنجدان بەوەی شیکردنەوەی زیاتر لە بەر بەرتەسک بوونی مەودای توێژینەوە لەم وتارەدا ناگونجێت، قەناعەت ئەکەین بەم نموونەگەلەی خوارەوە:

**پەشێو:** بەفر

وەک جوانی بێ ناوی گۆران،/ وەک ڕۆژانی ساڵی بەفەڕ،/ وەک سالانی تەمەنی تەڕ،/ وەک گەندە پەڕی باڵدارێ،/ وەک فرمێسکی زارۆی ساوا،/ وەک هەنگاوی بەرەبەیانی ڕێبوارێ،/ کلووکلوو، هێدی هێدی، بەفری زیوین دێتە خوارێ.

**ئەخەوان:** برف

پاسی از شب رفته بود و برف می‌بارید،/ چون پر افشان پری‌های هزار افسانه‌ی از یادها رفته./ .../ برف بود و برف ــ این آشفته پیغام ــ این پیغام سردِ پیری و پاکی؛/ و سکوتِ ساکتِ آرام،/ که غم‌آور بود و بی فرجام.

ئەڵبەت جێگەی تێڕامانە کەشیعری «بەفر»ی "پەشێو" بەس پیشاندانی ساتەوەختی دابارینی بەفر و سروشتی خەمڵاوی بەفرە؛ بەڵام لە شیعری "ئەخەوان"دا جگە لە پیشاندانی ساتەوەختی دابارینی بەفر، بە شێوەی تایبەت بە خۆی، بەهەڵخوازی یان هەڵگواستنەوە، هەنگاو ئەنێتە نێو مەیدانی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و تەنانەت ژیانی تاکەکەسی خۆی و هاوکات لەگەڵ باسکردن لە بەفر ئەڕواتە سەر پرسەکانی تریش.

**٣ ــ ئاگر:** مێژووی دەرکەوتنی ئاگر وەک دیاردەیەکی پیرۆز لە بڕوای دوو نەتەوەی فارس و کورددا ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی تیشکپەرەستی. دواتر لە سەردەمی دەرکەوتنی "زەردەشت"یشدا، ئەم باوەڕە وەک خۆی مایەوە، بە چەشنێ کە لە کاتی پەرەستشی "ئەهوورامزدا"دا ئاگر بەدەستی موبدەکان هەڵئەکرا. بە سەرەنجدان بەبیروباوەڕە کۆنە خێڵەکی و نەتەوەییەکانی هەردوو شاعیر، دەرئەکەوێ کە ئاگر، یەکێک لە هێما پیرۆزەکانە. هەر ئەم باسە بووەتە هۆی ڕنگدانەوەی ئەم دیاردەیە لە شیعری هەردوو شاعیردا. بۆ وێنە:

**ئەخەوان:**

شعر قرآن و اوستاست کزین سان دمِ نزع/ خانه روشن کند از سوزِ من و سینەی من/ سال دیگر که جهان تیره شد از مسخِ فرنگ/ یاد کن *زآتشِ* روشنگری پارینەی من

**پەشێو:**

پرسیم لە کاوەی باپیرم/ گوتم: بابە! وا دەست بەستەم،/ دەپێم بڵێ، چۆن دەگەمە/ نەورۆزەکەی سەدەی بیستەم؟/ گوتی: ڕۆڵە! گەر کوردستان/ بکەن بە پارچە *ئاگرێ*،/ نەک زوحاکێک، هەزار زوحاک/ مل کەچ دەکاو خۆی ناگرێ

٤ _ **نۆستالۆژی** (خەمی گەڕانەوە): یەک لەو چەمکانەیە کە لە شیعرەکانی هەردوو شاعیردا بەرچاو ئەکەوێ. "ئەخەوان" و "پەشێو" لە شوێنگەلێکی شیعرەکانیاندا ئەگەڕێنەوە بۆ یادەوەرییە دوورەکانیان؛ چ ئەم ڕابردوویە ڕابردووی شاعیر بێ، چ ڕابردووی زاڕۆیی بەشەر؛ ئەو بەشەرەی وا شاعیر سەربە جیلەکەیەتی؛ فارس و کورد و هەروەها ئەو زەمەنە لەدەس چووەی لە بەرابەریدا هەست بە نزیکی و بەرپرسایەتی ئەکا، بە زمانێکی ئایدۆلۆژیک، کێشەکانی دەوروبەر و ژیانیان خستۆتە بەر باس. لێرەدا وەک نموونە ئاماژە ئەدەینە دوو شیعر لەم شیعرانە. لەم دوو شیعرەدا هەرچەن هەردوو شاعیر لە گۆشەنیگایەکی ئایدۆلۆژیکەوە لە ڕابردوو و ڕووداوەکانی ئەڕوانن، بەڵام ئەم ڕوانینە ئایدۆلۆژیکە لە شیعری هەر کام لەم دوو شاعیرەدا جیاوازە. لە شیعری "پەشێو"دا ئەو ئایدۆلۆژیایەی کە خوێنەر بەرەو خۆی ڕائەکێشێ، سەر بە ئایدۆلۆژیای نەتەوەپەرەستییە و بەجۆرێ خەمی دابڕیان، دوور کەوتنەوە لە نیشتمان و وڵات و ئەوەی کە سەردەمانێکە چاوەڕوانی گەڕانەوەیە بۆ ئەو نیشتمانەی لێی دوور کەوتۆتەوە. غەوارەبوونێ کە لەگەڵ ئەوەی هەناوی داتەنیوە، کەچی گیان و ڕۆحی لەوێدا ئەژیت؛ بە چەشنێ کە لێی گۆڕاوە لە غوربەتدایە یان لە زێدەکەی، چۆن لەبەر ئازاری کوشەندەی غەوارەبوون و ئاوێتەبوونی ڕۆح و گیانی لە گەڵ نیشتماندا، زەوین و ڕۆحی لە گەڵ نیشتماندا شەتەک دراوە. بەڵام لە شیعری "ئەخەوان"دا وا ئەنوێنێ ئایدۆلۆژیا، جۆرێ ئایدۆلۆژیای ئاییتراییە و پیرۆزایەتی شوێنی لەدایکبوونی (شاری مەشهەد)، لە ڕوانگەی خەڵکی وڵاتەکەیەوە، وەک ڕاکێشەری شاعیر دەور ئەبینێ. ڕاکێشەرێ کە ڕەگی لە ڕابردووی شاعیردایە. گەرچی تروسکەیەک لە خۆشەویستی شاری لە دایکبوونیش ئەکرێ لە شیعرەکانی "ئەخەوان"دا بە دی بکەین. وەک ئەوانەی خوارەوە:

**ئەخەوان:**

بعد چل سال که ری داشت چو محبوس مرا/ می‌کشد خاک دگرباره سوی توس مرا / کاش زآغاز نمی‌آمدم از توس به ری/ که به آن جا نبود این همه افسوس مرا/ من که دست پدر خویش نمی‌بوسیدم/ مشهد توس فرا خواند به پابوس مرا... .

**پەشێو:**

.../ هەژدە ساڵە،/ هەژدە هاوین،/ هەژدە پاییز،/ هەژدە زستان،/ هەژدە عومری بێ کوردستان/ شەو دەمداتە دەست گزنگ و/ گزنگ دەڵێ:/ «پەلەی چیتە!/ ئارام بگرە هەتا شەوێ...»/ هەژدە ساڵە/ خۆشم سەرم لێ شێواوە.../ نازانم .../ لێرەم... یا لەوێ!

**٥– هێنانی ناوە مێژووییەکان وەکوو هێما:** «(هێماخوازی Symbolism) لە واتای گشتیدا بە مانای کەڵکوەرگرتن لە هێما و زناگە بە نوێنەربووەکانە. هێماخوازی لەم واتایە و لەوێژەدا، پێشینەیەکی کۆن، بەڵام پرش‌وبڵاوی هەیە» (داد، ١٣٧٨: ٢٩٥).

"ئەخەوان" و "پەشێو" لەبەر هەندێ هۆکاری کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئەدەبی و... لە شوێنگەلێکدا بە کەڵکوەرگرتن لە داهێنانی هێما و سەمبۆڵی تایبەتی، دەست ئەدەنە دەربڕینی مەبەستی تایبەت بەخۆیان. چ ئەم هێمایە، سیمایەکی گشتی و ناسراو بێ، یان شتێکی سازراوی زەینی شاعیرەکەی، بە سەرنجدان بە داخراوە بوونی کۆمەڵگا و تەنگای سەردەم و نەبوونی ئازادی و سەربەستی، شاعیر بۆ وتنی ئازادانە و ڕاستەوخۆی ئامانجەکانی و سەرپۆش خستنە سەر زەینی، هەوڵئەدا لە ڕێگەی هێماوە مەبەستی خۆی بپێکی. بۆ وێنە ئەم چوارینەیەی **ئەخەوان**:

خشکید و کویر لوت شد دریامان/ امروز بدو از آن بتر فردامان/ زین تیره دل دیو صفت، مشتی شمر/ چون آخرت یزید شد دنیامان.

کە لەم شیعرەدا زەریا هێمایەک لە نیشتمان و لەیلان ـ کە هەمیشە نیشانەی وشکایی و لە ناوچوون و فەوتانە، سەمبۆڵێ لە وێرانی و "شمر"ی وەک سمبۆڵی دوژمنان داناوە. چ ئەم دوژمنگەلە خۆیی بن و سەر بە نیشتمانی خۆی بن، چ بێگانە و لەدەرەوەی وڵات بن. بە وتنی ئەم شیعرە ئەیهەوێ ئەو فەوتان و لەناوچوونەی کە دوژمنان سەپاندوویانە بە سەر وڵاتەکەیدا، پیشانی بداو لە کوتلەی کۆتاییدا بە شوبهاندنێکی جوان، چوارینەکە تەواو ئەکا. ئەوە کە بەم دارمانەی هاتۆتە گۆڕێ، جیهانی ئێمە وەک دەرەنجامی یەزید ڕەش دەبێ. وەک نموونەیەکی شیعری تر: "خانی هەشتم و پیاو داوەڵ".

"پەشێو"یش لە کەش و هەوایەکی پڕ لە شەڕ و بێداد و ستەم وچەوسانەوەدا ژیاوە، بە چەشنی وڵاتە قەیراناوییەکەی. بەڵام سەرەڕای هەموو ئەو شتانەی وترا، شیعرەکانی ئەم شاعیرە پڕە لە بوێری و ئازایەتی. لەگەڵ ئەمەشا شاعیر لە هەندێ شوێندا بە شارەزاییەوە دەست ئەداتە هێماسازی و بە کەڵکوەرگرتن لە سەمبۆلەکان، مەبەستی خۆی دەرئەبڕێت. بۆ وێنە لەم شیعرەدا: "موفاوەزات"

.../ ئەی گوایە بۆ دڵخۆش نەبین؟ / ئەی گوایە بۆ هەڵنەپەڕین؟/ شوانی گورگزادە خۆش بن،/ ئازادترین ڕانە مەڕین!

«شوانی گورگزادە» بە هێمای سەرکردەکانی وڵاتەکەی ناوزەد ئەکات و لە شوێن بەشوێنی شیعرەکانیدا بەڕوانینێکی ڕەخنەئامێز و پڕ لە گازندە ئەڕواتە سەریان و «ڕانەمەڕ» ئەکاتە هێمای خەڵکەکەی. بەم دەربڕینەیەوە ئەیهەوێ کێشەکان دەرببڕێت کە ئەگەرچی شوان هەمیشە و لە هەموو جێگایەکدا پارێزەر و نیگابانی ڕانەمەڕە، بەڵام لای ئێمە شوانەکان بۆ خۆیان گورگزادەن و ڕانەمەڕ لە ناو ئەبەن. هەروەها "پەشێو" لە یەکێکی تر لە شیعرەکانیدا بە نێوی «هادی عەلەوی» کە شاعیرێکی عەرەبە و هەڵدەستێ بەلایەنگری کردن لەکوردەکان، بەرامبەر بە تاوانەکانی عەرەبی عێراق (سەدام و...) زۆر بەجوانی بەکەڵکوەرگرتن لە هێماسازی دەست ئەداتە دەربرینی پەیامی خۆی و جیهانی پڕ لە کاولکاری بەرهەم هاتووی دەستی عەرەبەکان و

عەرەبەکان بۆ خۆیان بەدەستەواژەی «کوتاه و قدها» ناوزەد ئەکات و ئەم کەسێتییە (هادی عەلەوی) وەک کەسێکی ئاوارە لە نێوانیاندا دژ بەوان ڕاست ئەکاتەوەو بە "بەرزە بالا" ناوبێژی ئەکا:

تۆ لە سەردەمی کورتە بالایان،/ بالای بەرزی خۆت لە کۆی هێناوە؟

پاشان بە لادانێ بەرە و مێژووی ئیسلام و موسڵمانەکانی سەردەمی ئیسلام ئەوان وەک هێما و سەمبۆڵی دەربرینی مەبەست دائەنێ؛ بەڵام شیکردنەوەی زیاتری ئەم تەوەرە لێرەدا نامومکینە (نمونەکانی تری لەم چەشنە لەشیعرەکانی پەشێودا بەرچاون).

**٦ ــ وێناکردن و پیاهەڵدان بە کەسێتییەکان:** فەرهەنگی خەڵکی ڕۆژهەلات، بە سەرەنجدان بە ڕاستی و ساکاری ئەم خەڵکە، پڕە لە پیاهەڵدان، کە بەداخەوە زیان لەکۆمەڵگای ئینسانی ئەدا. بە لەبەرچاو گرتنی ئەوەی کە ئەدەب ئاوێنەی فەرهەنگ و ژیانی هەموو نەتەوەیەکە، مێژووی ئەدەبی ڕۆژهەلات لە هەموو کاتێکدا پڕ بووە لە وێناکردن و پیا هەڵدان. چ ئەرێنی و چ نەرێنی. ئەڵبەت لە زۆر شوێندا پیاهەڵدان بە تایبەت لە ئەدەبی فارسیدا دەرەنجامێکی باشی لێ ناکەوێتەوە و پاڵ ئەداتە لای ماستاوچیەتییەوە.

بە سەرەنجدان بەم باسە، شیعرەکانی هەر دوو شاعیری ئاماژە پێکراو خاڵی لە ستایشی گەورە ئایینی، مێژوویی و فەرهەنگییەکان و ئەو کەسانەی خۆشەویستی شاعیرن نەبووە، بۆ وێنە ئاماژە ئەدرێتە ئەم شیعرانەی خوارەوە:

**ئەخەوان:** (به استاد حسین سمندری:) «آواز چگور»

وقتی که شب هنگام گامی چند دور از من/ نزدیک دیواری که بر آن تکیه می‌زد بیشتر شب‌ها/ با خاطر خود می‌نشست و ساز می‌زد مرد،/ و موج‌های زیر و اوج نغمه‌های او/ چون مشتی افسون در فضای شب رها می‌شد،/ من خوب می‌دیدم گروهی خسته از ارواح تبعیدی/ در تیرگی آرام از سویی به سویی راه می‌رفتند.

پێویستە ئاماژە بکەین کە "ئەخەوان" لە ئەم شیعرانەدا وەک زۆربەی شیعرەکانی ئاوڕ لەدیکەی کێشەکان، لەوانە کێشە کۆمەلایەتی و سیاسییەکانی دەوروبەری خۆی ئەداتەوە. بۆ وێنە لە شیعری «ئاوازی چگور» لەنیوەڕاستی شیعرەکەدا باسەکە بەرە و ئازاری نیشتمان و ڕەگەز و خەڵکەکەی ئەکاتەوە.

"**پەشێو**"، بۆ مارتینی مرۆڤ:

ئەی لوتەرکینگ،/ ڕەشی گزنگ!/ شوورەی ئاشتی و برایەتی،/ دەروون کانگای ئازایەتی،/ پەیامبەری پێست ڕەشەکان،/ پارێزەری بێبەشەکان:!/ تۆ کوژرای زوو/ تاوانیشت هەر ئەوە بوو،/ گوتت: دەبا.... دەبا لەژین/ بەیەکسانی هەموو بژین.

«مارتین لوتەرکینگ» ڕەش‌پێستی ئازادی‌خوازی ئەمریکی کە سالانێکی زۆر لە سەر بەرگری لەمافی ڕەشپێستەکاندا خەباتی کرد.

**٧. ڕەخنە و گازندە و سکالا لە سەرکردەکان:** (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ)

بە سەرەنجدان بە شیکردونەوەکانی پێشتر، لەمەڕ کەش‌وهەوای ژیان وکۆمەڵگای ئەم دوو شاعیرە و بە تایبەت "ئەخەوان" کە لە فەزایەکی پڕ لە ستەم و تۆقاندندا خەریکی ژیان و گرنگتر لەوەش، شیعر هۆنینەوە بووگن و هەروەها ئەو ڕاستیەی کە شیعرەکانی شاعیر وەک ئاوێنەیەک ڕەنگدانەوە و پیشاندەری خواست و

بیر و بڕوای شاعیرەکەیە و هەروەها وردبوونەوە لەوەی کە شاعیر لە هەر سەردەمێکدا و لە هەر کۆمەڵگایەکدا سەکۆی نەتەوە و جەماوەرەکەیەتی، سروشتییە بارودۆخی سەردەمیانەی خۆی بێت. بە تایبەت لە بەر ئەوەی شاعیر لە دەربڕی کەش‌وهەوایەکدا ئەژیت و شیعر ئەڵێ کە پڕە لە ستەم و ئەشکەنجەی کەس یا کەسانێ کە ڕکێفی دەسەڵاتیان لە دەستەو بۆیە لە ئازارەکانی خۆی و خەڵکەکەی ئازار ئەبینێ و ئەم باسە بۆ "ئەخەوان" و "پەشێو"یش ڕاست دەرئەچێ. ئەم دوو کەسە وەک دوو تاکێ کە لە ئازارە هاوبەشەکان ڕەنج ئەبینن، ئاساییە هاوارێکی هاوچەشن هەڵبدەن.

چونکە بەشێکی زۆر لە شیعرەکانی "ئەخەوان" تێکەڵاوە لەگەڵ خۆشەویستی نیشتمان، سروشتییە دەست بداتە ڕەخنە و گازندە و تەنانەت لە بڕێ شوێندا (هەرچەند لە پەناوە) بێزاری خۆی لە دوژمنە ناوخۆیی و دەرەکییەکان دەرببڕێت. بۆ وێنە لە چوارینەی «وشک بوو و...»دا:

خشکید و کویر لوت شد دریامان / امروز بدو از آن بتر فردامان/ زین تیره دل دیو صفت، مشتی شمر/ چون آخرت یزید شد دنیامان. یان لە شیعری «قەمچی هەشتەم و پیاو داوەڵ» کە بە هێماسازی و پەنا بردنە بەر سەمبۆڵەکان دەست ئەداتە دەربڕینی ئامانجەکان. "ئەخەوان" بە باسکردن لە ڕوستەم وەک هێمای قارەمانەتی و دادوەری و بوێری وڵاتەکەی، "شوغاد" وەک هێمای دوژمن دەسنیشان ئەکات و ئامانج و تەوەرەی خۆی ئەپێکێ. ئەم دوژمنە هەرچەن ناوەکییە، بەڵام شاعیر بە خۆیی نایناسێت و لە هەمبەر بۆچوونە سواو و کۆنەپەرستانەکان ڕادەوەستێت و ڕای وایە کە هەرچەند تووی زاڵی زەڕ بێ، کەچی بە بێ ڕەچەڵەک و بێ شوناسی دەزانێ.

یان "پەشێو" لە شیعرەکانیدا لەو پەڕی بوێری و هەروەها لە زۆربەی شیعرەکانیدا ڕاستەوخۆ ئەکەوێتە ڕەخنەگرتن لەسەرکردەکانی وڵاتەکەی و لە هەندێ شوێندا هەتا ڕادەی سووکایەتی پێ کردن و ناتۆرە لێ نانیش ئەڕوات.

"دیوانی براکوژی ١٨"

پێشمەرگە، / لە پێناو سەردارێکی/ گەواد و دەم بێ دەرپێ،/ ڕووە و سەنگەری برای/ چۆن چەک دەخاتە سەرپێ.

**٨. هیوا و ناهومێدی** (داڕمان):

وەک ئاماژەی پێدرا، شاعێرەکان لە سەردەمی خۆیاندا، هوشیارانە یان نەخوازراو، بەرهەمەکانیان ڕەنگدانەوەی ڕووداوە سەردەمیەکانیانە.

ئەخەوان وەک شاعیرێکی هاوچەرخی ئێران، هەتا ڕادەیەکی زۆر لە ژێر کاریگەری بارودۆخە سەردەمییەکان بووە. بۆ وێنە لە سەردەمی ئەودا ناهومێدیەکی زۆر باڵ بەسەر جەماوەردا دەکشێنێ و وەک شەپۆلێکی بەرچاو و حاشاهەڵنەگر لە شیعری شاعیرەکانی ئەو سەردەمەدا خۆی دەنوێنێ. یەکێ لە وێژەوانە هاوچەرخەکان سەبارەت بەم سەردەمە ئەڵێ: «لەم سەردەمەدا کێشەگەلێکی سەرەکی و هەوێنگەلێکی نوێ دێتە نێو ئەدەب و شیعرەوە، کێشەی مەرگ و دڵساردی و بێ‌هیوایی بەسەر شیعری شاعیرەکاندا زاڵ ئەبێ.

بیری مەرگ زۆربەی شاعیرەکان دائەگرێت و لەڕاستیدا یەک لە هەوێنە سەرەکییەکانی شیعری ئەم سەردەمە پرسی بیرکردنەوەی شاعیرەکان لە مەرگ و تەنانەت پیاهەڵدان بە مەرگ و ئەو بێ هیواییە سەیرو سەمەرەیە وا ڕەنگە باشترین پەیامی ئەو لە شیعرەکانی " ئەخەوان"دا بێ (شفیعی کدکنی، ۱۳۸۰: ٦٠ ٥٩).

به وردبوونەوە لە شیعرەکانی "ئەخەوان" ئەم ناهومێدی و تەنانەت دۆڕاویە لە سووچ بە سووچی شیعرەکانیدا ئەبینین. لە خوێندنەوەی شیعرەکانیدا دەرئەکەوێ، شاعیر خۆی لە چوارچێوەیەکی داخراودا ئەبینێتەوە کە ڕزگار بوون لێی نامومکینە و هیچ هیوایەکی بۆ کرانەوە نییە و هیچ کلاوڕۆژنەیەک لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بەدی ناکرێت و دایمە خەریکی سکاڵا و گازندەیە، هەتا ئەو ڕادەیەی کە ئەکرێ شیعرەکانی وەک نموونەیەکی تەواو لە شیعری دارمان و دۆڕان ناوزەد بکەین.

بۆ وێنە لە شیعری «چیرۆکی شاری بەردستان»دا بە کەڵکوەرگرتن لە بارودۆخێکی «فابل»ئاسا و خۆ ئاوێتنە نێو دۆخێکی چیرۆکئاسا، ئەکەوێتە دەربڕینی مەبەست و ئامانجەکەی. سەرەتا لە دوو کۆترەوە چیرۆکەکەی دەست پێئەکا کە لە سەر لقی درختێکەوە هەڵنیشتوون و لە ژێریدا پیاوێ ڕاکشاوە کە سیمای ئازار و ماڵوێرانی لێ دەبارێ. ئەو دووکۆترە کە هەوڵ بۆ ڕێنوێنی و نیجاتدانی ئەم پیاوە ئەدەن، بە شێوەیەکی ناڕوون و پڕ لەهێما، ڕێگای ڕزگاربوونی پێئەنوێنن و ڕێگایەکی لە بەردەمدا ئەنێن کە ئەو پاش پەڕینەوە لەم جادەیە دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە هیچ سەرکەوتنیکی بۆ دەستەبەر نەبووە و نابێ. شاعیر بە یارمەتی ئەم چێروکە، هەوڵ ئەدا ئەم پیاوە وەک نوێنەرێکی قارەمانئاسا و مەزن لە خەڵکی نیشتمانەکەی بنوێنێت کە تووشی تالان و دارمان بووە.

شاعیر لە زاری یەکێ لە کۆترەکانەوە سەبارەت بەم خەڵکە ئەڵێ:

به جای آوردم او را، هان/ همان شهزاده‌ی بیچاره است او/ که شبی دزدان دریایی/ به شهرش حمله آوردند/ بلی، دزدان دریایی و قوم جاودان و خیل غوغایی/به شهرش حمله آوردند... .

ئەم پیاوە پاش هەوڵدانی زۆر بۆ ڕزگارکردنی نیشتمانەکەی ناگاتە هیچ دەرەنجامێکی ئەرێنی. پیاوی قارەمانی چیرۆکی ئەم شیعرە پاش بە ئەنجام گەیاندنی پیشنیاری کۆترەکان بۆ ڕزگاری و دەربازکردنی خۆی دەگاتە ئەو باوەڕەی کە هیچ هیوایە بۆ کرانەوە و ڕزگاری لە بەردەمیدا نییە:

«... غم دل با تو گویم،/ بگو آیا مرا دیگر امید رستگاری نیست؟/ صدا نالنده پاسخ داد:/... آری نیست.» بەم چەشنە وەک دیکەی شیعرەکانی هەوڵ بۆ نواندنی ئەو بارۆدۆخی ناهومێدییە ئەدات. بەڵام لەشیعری "پەشێو"دا بەپێچەوانەی"ئەخەوان" لە زۆربەی شیعرەکاندا توخمی هیوا بالادەستە و خۆینەر بەرەو خۆی ڕادەکێشێ. "عەبدوڵلا پەشێو" وەک شاعیرێ کە هەتا ڕادەیەکی زۆر لە بواری شیعری نیشتمانپەروەرانەدا کاری کردووە، لە زۆربەی ئەو شوێنانەدا وا باس لە نیشتمان و خەبات و... ئەکات، تەنانەت لە شیعرە ڕەخنەگرانەکانیشیدا، هیوایەکی شاراوە یان ئاشکرا لە تۆی وشەکانیدا خۆ دەنوێنێ.

بۆ وێنە لە شیعرێکدا بە بەراوەردکردنێکی سروشتی بارودۆخی وڵات و خەڵکەکەی و هەروەها خەباتیان ئەخاتە بەر باس کە ئەگەر بۆران و زریان لە تەشق و بەرزاییەکاندا هەر هەموو سەوزایی و ئاسەوارەکانی ژیان

تەفروتوونا ئەکات و هاوکات نەمام و نەوخیزە و چووزەرەکان لە باوەش دەربەند و نشێوەکان ئەڕوێنەوە و ژیانی سەر لە نوێ دەست پێ ئەکەن، وەک ئەو ساتانەی شۆڕشگێرانی وڵاتەکەی بە جوامێری و بوێرییەوە خۆ دەخەنە بەر ڕەشەبای دوژمنان و گیانبەخت ئەکەن، هاوکات گیان دەکەوێتە بوونی ئەو کۆرپە ساوایانەی تازە پێ دەنێنە نێو هەبوون و لە کۆشی ئارامی دایکاندا ژیان دەست پێ ئەکەن. ئاماژەدان بۆ ئەم خاڵە خراپ نییە کە شاعیر لە ڕوانینی پیاوسالارانەوە لەم باسە ئەڕوانێت و بەپێی باوەڕی کۆن، توخمی نێر لە بەرزایی و باڵادەست دائەنێ و وا ئەڵێت جنسی مێ بە تایبەت دایک لە هەبووندا نزمترینە، بەمشێوە، بە دوای واتای خۆیدا ئەگەڕێت (لە کۆنەوە ئەو باوەڕە باو بووە کە زەوین وەک دایک و خاک وەک نزمترین قۆناغی هەبوون بە دایکی هەبوون ناوزەد ئەکرا).

**هیوا**

لە کاتێکدا/ لە سەرەوە، لە لووتکەکان،/ تۆف و زریان لەدەوەن و داران وەردێن،/ خەمت نەبێ/ لە بنەوە، لە دۆڵەکان،/ گیای نەوخێزە و گۆپکە دەردێن.

## ٩- زمان:

### ١٩ زمان؛ زمانی کۆن یان نوێ؟

بە ڕوانینێک لە شیعرەکانی "ئەخەوان سالس" ئەم باسە ڕوون ئەبێتەوە کە بارودۆخێکی ئارکائیک و کۆنخوازانە بە سەر شیعرەکانی ئەم شاعیرەدا زاڵە و زمان هەتا ڕادەیەکی زۆر مەیلە و دۆخی کۆن و باستانییە. لەدابەشکردنی شێوازەکانی وێژەی فارسیدا، یەکێ لە شێوازە هەرە بەناوبانگەکان، شێوازی خوراسانییە کە سەر بە وێژەی سەدەکانی سێ و چواری کۆچییە. ورد بوونەوە لە شیعرەکانی "ئەخەوان" دەمانگەیەنێتە ئەو قەناعەتەی کە شاعیر لە هۆنینەوەی شیعرەکاندا هەتا ڕادەیەکی زۆر سەر بە شێوازی خوراسانی بووە و کەوتوەتە ژێر کاریگەری ئەو شێوازە، هەتا ئەو ڕادەیەی کە لە زۆر شوێندا زمان، هەر هەمان زمانی کۆنی ئەو شێوازەیە:

بر به کشتی‌های خشم بادبان از خون،/ ما برای فتح سوی پایتخت قرن می‌آئیم.

یەک لەتایبەتمەندییەکانی شێوازی خوراسانی هێنانی دو زێدەپیت بۆ تەواوکەرێکە وەک: «بر به کشتی‌ها».

ئەکرێ بڵێین زۆربەی هەرەزۆری شیعرەکانی ئەم شاعیرە سەر بە زمانی کۆنن و لە چوارچێوەی زمانێکی کۆندا وتراون؛ ئەڵبەت پێویستە ئاماژە بەوەش بدرێت کە ئەم دۆخە زمانییە لەوێژەی ئەو سەردەمەدا گشتگیر و باو بووگە و لە بەرهەمی زۆربەی شاعیرەکاندا بەرچاو ئەکەوێ.

دەرکەوتنی ئاوەها دۆخێ لە زمانی شیعری ئەو سەردەمەدا، بێگومان هۆکارگەلێکی تایبەتی خۆی هەیە کە لێرەدا ئاماژە ئەدرێتە دوو هۆکار:

**ئـ:** وێژەی فارسی خاوەن ڕابردوویەکی مێژوویی دەوڵەمەندە و هەر ئەم خەزێنە مێژووییەی ئەدەبی فارسی ئەتوانێ یەک لە هۆکارە سروشتیەکانی دەرکەوتنی وەها بارودۆخێ لە زمانی شیعری ئەو سەردەمەی وێژەی فارسی بێ. واتە شاعیری ئەم چەرخە بە خۆلادان و پەنابردنە بەر ڕابردووی دەوڵەمەند و ڕەنگینی خۆی، پاشاگەردانێک بەرەو وێژەی کۆن ئەکا. (بارودۆخێ لە چەشنی شێوازی «وقوع» و قۆناغی گەڕانەوە).

**ب:** وا ئەنوێنێ کە شاعیران لەم قۆناغە لە مێژووی ئێراندا وەک زۆربەی خەڵک هەست بە جۆری بێشوناس بوون و لەخۆنامۆبوون ئەکەن. لەبەر ئەوەی ئەبینن وڵاتەکەیان لە ڕێگەی کۆمەڵێ کەسی خۆییەوە دراوەتە باوەشی تاڵانکەران و کاولکارانی دەرەوە و ئەمانیش هیچیان پێ ناکرێت؛ ئەم گرفتگەلە ئەبێتە هۆی سەرهەڵدانی هەستی بێشوناسی و خۆدۆڕاوی و شاعیری ئەم چەرخە ناهۆشیارانە ئەخزێتە نێو باوەشی ڕابردوو و ئەیکاتە داڵدەو پەنادەری خۆی.

به سەرنجدان بەم خاڵە ئاماژە پێدراوانە، سروشتیە "ئەخەوان"یش وەک شاعیرێکی ئەم چەرخە لە مێژووی ئێران، وەک دیکەی هاوقەتار و هاوچەرخەکانی، زمانێکی کۆن و لە هەمان حاڵدا بە شکۆ و مەزن هەڵبژێرێ. بۆ وێنە:

**خنظلی**

پی کرد فلک، مرکب آمالم و در دل/ خون، موج زد از بخت بد آوردەی خویشم.

("پی کردن"، "فلک" و "مرکب" لە وشەگەلی زۆر کۆنی ئەدەبی فارسییە)

یان: **زمستان**

من امشب آمدستم وام بگذارم

(آمدستم: بەکار هێنانی کردار (Verb) لە شێوەیکی زۆر کۆندا)

بەڵام لە لێکدانەوەی بارودۆخی زمانی شیعرەکانی پەشێودا لەم ڕوانگەیەوە دەگەینە ئەو قەناعەتەی کە بە پێچەوانەی "ئەخەوان" کە شیعرەکانی لە ڕووی زمانەوە زۆر کۆن و ئارکاییکن، شیعری ئەم هەتا ڕادەیەکی زۆر نوێ و هەنووکەییە و لە چوارچێوەیەکی نوێیە زمانیدا دارێژراون.

لە خوێندنەوەی شیعرەکانی "پەشێو"دا دەرئەکەوێ ئەم شاعیرە وەک کەسێ کە لە دایکبووی کەشوهەوایەکی گوندیانەیە و لەوێ پەروەردە بووە، لە گەڵ نیشتەجێ بوون لە هەولێردا، هەوڵئەدات کە تام و بۆی شاری ببەخشێتە شیعرەکانی و ڕەنگە هەر ئەم کەوتنە بەر بریق و باقی شارەش یەک لە هۆکارەکانی شاریانە بوونی زمانی "پەشێو" بێت. لە زۆربەی شیعرەکانی پەشێودا، نوێ بوونی زمان بەرچاوە؛ هەرچەن جاروبار لە گەڵ ئەم شیعرانەدا بە تایبەت لە کاتی نیشتەجێ بوون لەئوروپادا، دیسانەوە کەشوهەوای لادێیانەی پێشتر لە بەرهەمەکانیدا بەرچاو ئەکەوێ.

پەشێو: **چەند وشەیەک دەربارەی دڵی خۆم**

ئەم دڵەی من/ وەک واگۆنی قەتارێکە / هەزار و یەک وێستیگەی هەیە./ لە هەر یەکێک لەو وێستگانە ڕابوەستێ،/ ڕێبوارێک بەجێ دەهێڵێ،/ ڕێبوارێک خۆی تێدەبەستێ.

### ٢-٩- زمان، شێوەو پێکهاتەی بە هێزیان لاواز؟

لە دیکەی جیاوازییەکانی ئەم دوو شاعیرە لەڕووی زمان و بنەمای شیعرەوە، باسی شیعریێتی شیعر و بارودۆخی بنەمایی و زمانییە؛ لە ڕووی ئەوەی کە ئایا شاعیر لە بەستێنی بنەماو شێوەدا تا چ ڕادەیەک سەرکەوتوە.

"پەشێو" وەک شاعیرێ کە ٣٨٠ شیعری نووسیوە، بە ئاسانی ئەکرێ شیعرەکانی بە سەر سێ پلەی لاواز، ناوگین و بەهێز و هەروەها لە چەن تەوەرەی جیاواز پولێن‌بەندی بکەین. خاڵی گرنگ و جێگەی تێڕامان ئەوەیە کە ئەم شاعیرە لەو شوێنانەدا، وا باس لە نیشتمان، خەبات، سیاست و بابەتی لەو چەشنە ئەکا، لە ڕووی شیعرییەوە تووشی نزمایەتێکی بەرچاو ئەبێت.

ئەمەش لە بیر نەکەین کە کەسێکی وەک "پەشێو" کە لە ئاستی جیهانیشدا خاوەن پلەو شوێنە، بێ‌شک شیعری زۆر چاکیشی وتووە؛ بەڵام لێرەدا جەختمان لە سەر ئەو ڕاستیەیە کە لەو شوێنانەدا وا ئەبێ بە بڵێندگۆی ئازاری نەتەوە و نیشتمانەکەی ئاستی شیعرەکانی ئێجگار نزم ئەبێتەوە، بە چەشنێ کە لە نێو ئاوەها شیعرگەلێکدا بەدەگمەن شیعری باشمان بەرچاو ئەکەوێ و زۆرینەی ئەم شیعرانە لە ڕووی زمانییەوە ساکارن و هیچ ڕووداوێکی زمانی دەرناخەن و لە زۆرشوێندا پاڵ بە نەسری پەتییەوە ئەدەن:

**دەنگێک لە کوردستانەوە**

چەند حەز دەکەم/ منی کوردیش/ ئادەمزادێکی سەربەست بم/ بە چەلێن و کەوشی کوردی/ لە چیاکانی فەلەستیندا چەک بە دەست بم،/ هێرش بەرم/ بۆ سەر ئەو بووکە شووشانەی/ بۆ سەر ئەو داڵە تووشانەی/ گۆشتی کۆرپەی ساوا دەخۆن،/ مزگەوتەکان، کڵێسەکان/ بە خۆین دەشۆن.

هەرچەن شاعیر لێرەدا هەوڵئەدات خۆی لە فەزای نیشتمان و نەتەوەپەرەستی دەرباز بکات و بەرەو جیهان زێدی (ئینترناسیونالیسم) هەنگاو بنێ، بەڵام لە بەر دەستکرد بوونی هەوڵەکەی و دیار بوونی ملقی بەرپرسایەتی و خۆ بە خاوەن ئەرک زانین، دوور لە سەرکەوتوویی شیعری و لایەنی زمانی، وەک وتووێژێکی ساکار و وتارێکی ڕۆژانە و بێ‌بەش لە ڕەنگ و بۆی شیعر دەمێنێتەوە.

بەڵام سەبارەت بە "ئەخەوان" باس جیاوازە. "ئەخەوان" وەک شاعیرێکی ئێجگار نەتەوەپەرەست کە خاکپەرەستی لە شیعرەکانیدا شەپۆل ئەدات، لەزۆربەی هەرەزۆری ئەم چەشنە شیعرانەیدا باش دەرئەکەوێت و جیاوازیەکی وا لە نێوان ئەم چەشنە شیعرانەو دیکەی شیعرەکانیدا بەدی ناکرێت، بە واتایەکی تر زمان و بنەما لەم شیعرانەدا لە گەڵ دیکەی شیعرەکانیدا وەکوو یەکن؛ تەنانەت لە هەندێ شوێندا لە ڕووی شیعریێتیەوە –بنەما و شیوەوە- ئەگاتە ئەشقی جوانی و مەزنایەتی و ئەمەش یەکێ لە جیاوازییە دیار و بەرچاوەکانی نێوان ئەم دوو شاعیرەیە:

ئەخەوان **آخر شاهنامه**

بر به کشتی‌های خشم بادبان از خون،/ ما، برای فتح سوی پایتخت قرن می‌آئیم./ تا که هیچستان نه توی فراخ این غبارآلود بی غم را/ با چکاچک مهیب تیغ‌هامان، تیز/ غرش زهره دران کوس‌هامان، سهم/ برش خارا شکاف تیرهامان، تند؛ نیک بگشائیم.

که ئەگەرچی، زمان هەمان زمانی کۆن و دێرین و پڕ لە نەتەوە پەرەستییە، کەچی پتەو و زەنگینە؛ تا ڕادەیەک کە مۆسیقای شیعرەکە لە گەڵ ڕەزم و خەباتدا ئاوێتە بووە و بە گشتی نوشستی و دۆڕانێ لە زمانی شاعیردا بەدی ناکرێت.

## دەرەنجام:

وەک پیشتر ئاماژەی پێ درا، ئەدەبی بەراوردکاری یەکێ لە لقەکانی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبییە، کە لە شیکردنەوەو توێژینەوەی زۆرتر لەم بوارەدا کاریگەری و کارتێکردنی نەتەوەکان لە سەر یەکتر زیاتر دەرئەکەون و بەم چەشنە لێکدانەوەی باشتری وێژەی نەتەوەکانمان بۆ مسۆگر ئەبێت؛ بە تایبەت وێژەی ئەو نەتەوەگەلەی وا هۆشیارانە یان ناهوشیارانە بە درێژایی مێژوودا لەئاڵشت و پێوەندی چڕو پڕ لە گەڵ یەکتر بوونەو بەم پێیە بە ناچار کاریان کردۆتە سەر یەکتر؛ لە وانە ئەدەبی کورد و فارس.

ئەم توێژینەوەیە، هەوڵ ئەدات بە لێکدانەوەو لێکۆڵینەوە لە بواری وێژەی بەراوردکاریدا لایەنەکانی کاریگەری و کارتێکردنی ئەم دوو شاعیرە هاوچەرخەی کورد و فارس بخاتە بەرباس. هیوادارم ئەم هەوڵە توانیبێتی، تیشکێکی هەرچەند بچووک بێت بۆ توێژینەوەی پڕ بارتر و پر بایەختری داهاتوو.

**سەرچاوەکان:**


١ اخوان ثالث ، مهدی (١٣٧٠) **آخر شاهنامه**، تهران: مروارید.

٢ اخوان ثالث، مهدی (١٣٧٨) **آنگاه پس از تندر** (منتخب ٨ دفتر شعر ارغنون).

٣ اخوان ثالث، مهدی (١٣٨٠) **آواز چگور،** زندگی و شعر اخوان، تهران، نشر ثالث.

۴ اخوان ثالث، مهدی (١٣۶٣) **ارغنون**، تهران: مروارید.

۵ اخوان ثالث، مهدی (١٣۶٠) **از این اوستا**، تهران، مروارید.

۶ اخوان ثالث، مهدی (١٣٨۵) **تو را ای کهن بوم و بر دوست دارم**، تهران، مروارید.

٧ اخوان ثالث، مهدی (١٣٨٣) **در حیاط کوچک پائیز، در زندان ، زندگی**، تهران، زمستان.

٨ اخوان ثالث، مهدی (١٣٨٣) **زمستان**، تهران، مروارید.

٩ اخوان ثالث، مهدی (١٣٨۴) **عاشقانەها و کبود**، تهران، مؤسسەی انتشارات نگاه.

١٠ اخوان ثالث، مهدی (١٣٨۴) **گزینەی اشعار**، تهران، مروارید.

١١ پەشێو، عەبدوڵلا (٢٠٠٦) **پشت لە نەواو ڕوو لە کرێوە**، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

١٢ پەشێو، عەبدوڵلا (٢٠٠٦) **هەسپم هەورە و ڕکێفم چیا**، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

١٣ حقوقی، محمّد (١٣٨۶) **شعر زمان ما، مهدی اخوان ثالث**: **شعری مهدی اخوان ثالث از آغاز تا امروز**...، تهران، انتشارات نگاە.

١۴ داد، سیما (١٣٨٣) **فرهنگ اصطلاحات ادبی**، تهران، مروارید.

١۵ زرین کوب، عبدالحسین (١٣۵۴) **آشنایی با نقد ادبی**، تهران، سخن.

١۶ شفیعی کدکنی، محمّد رضا (١٣٨٠) **ادوار شعر فارسی**، نشر سخن، چاپ اول.

١٧ غنیمی هلال، محمّد (١٣٧٣) **ادبیات تطبیقی**(تاریخ و تطور، اثرپذیری و اثرگذاری فرهنگ و ادب اسلامی)، ترجمەی مرتضی آیت اللهزادەی شیرازی، تهران، امیرکبیر.

١٨ کاخی، مرتضی (١٣٧٠) **باغ بی‌برگی**، تهران، چاپ اول.

١٩ کفافی، محمّد عبدالسلام (١٣٨٢) **ادبیات تطبیقی** (پژوهشی در باب نظریەی ادبیات و شعر روایی).

٢٠ مدنی، نسرین (١٣٨۵) **درکوچەهای خاکی معصومیت** (نقد تطبیقی فروغ و غادەالسمان، شاعر معاصر عرب).

٢١ ندا، طه (١٣٨٠)**ادبیات تطبیقی**، ترجمه هادی نظری منظّم، تهران، نشر نی.

**وەرگێڕانی شیعرەکانی ئەخەوان _ کە لەم توێژینەوەیەدا هاتووە _ بە کوردی:**

خشکید و کویر لوت شد دریامان ... :

هەروەکوو کەویری لووت وشک بوو/ ئەمڕۆ خراپ و لەو خراپتر بەیانمان/ لەم مشتەومڕە دڵی دێوەزمە ڕەشە/ هەر وەکوو ئاخر و ئۆخری یەزیدە دنیامان.

وقتی که شب هنگام گامی چند دور از من ...:

ئەو کاتە شەوگار چەن هەنگاوێک دوور لە من/ نزیک دیوارێ کە پاڵی پێوە ئەدا نیوەشەو/ لەسەر بیرەوەری خۆی ئەنیشت پیاوێ و دەستی لەسازەکەی ئەدا/ و شەپۆلی بەرز و نزمی بەزمەکە و ئاوازەکەی / چما پەنجەیەک زیو لە فەزای شەو وێڵ ئەبوو/ من چاک ئەمزانی تاقمێ ڕۆحی ئاڵۆزی کۆچەر/ لە شەوی وێڵ هێدیانە لاوەلا هەر دەرئەچوون.

بجای آوردم او را، هان....:

کەوتە بیرم، ئەوم ناسی ئەرێ!/ ئەوشازادە با ورە بوو ئەو/ کەشەوێک چەتە ئاوییەکان/ هێرشیان کردە سەر شارەکەی! / ئەرێ ئا _ چەتە زەریاییەکان و هاڕە و هووشە/ بە شارەکەی هێرشیان هێنا!

باز می‌پویند فردای دگر...:

دیسانەوە ئەڵێن: ڕۆژێکی دی/ سەبرت ببێ کە تاکێکی دی سەر هەڵبات/ کاوەیەک نادۆزرێتەوە، هومێد!/ خۆزگە ئەسکەندەرێک پەیدا ئەبوو.

زخیام خشم و خروشی که...:

لە خەییام، جۆش و خرۆشێکی پایەدار/ لەدڵ و گیان هەڵ بێرێت ئەوەم خۆش دەوێ.

شعر قرآن اوستاست کزاین سان...:

مانای قورئان و ئەویستایە بەو جۆرە لە سەرە مەرگە/ لە تامینەی منە ئەم لەشکەری کاووس شا/ لە گەڵ شەرابی موغان، لە خومی خەییام، ئەی ئومێد/ هەستەو ببە بە جەمشید لەجامی گڵێنەی من.

وای شمایان دوست‌دار پهلوانی‌ها... :

ئاخ ئێوەکان، ئەویندارى پاڵەوانییەکان/ ئێمە سامی نەریمانین، زاڵی زەر ئێمەین/ ڕۆسەمی دەستان و زۆراوی دلاوەر هەروەها.

هم اورمزد و هم ایزدانت پرستم ... :

هەم ئورمەزد و هەم خوداکانتم خۆش ئەوێ ئیجگار!/ ئەم شان و شکۆیم خۆش ئەوێ ئیجگار!/ فراوانتر ئەو زەردەشتە گەورەیەم!/ لە هەر پیر و پێغەمبەرێک خۆش ئەوێ!

مسیحای جوانمرد من!... :

مەسیحای جوامێری من / ئەی گەورە پیرە پیاوی جل چڵکن/ هەوا زۆر ناجوامێرانە ساردە... وەرە!/ دەمت گەرم و سەرت نەیشێ/ تۆ وەڵامی سڵاوم بدەرەوە، درگا بکەرەوە!/ منم من، میوانی شەوەکانت، تەمرەژەنی خەمبار/ منم من، بەردی بەرپەڵی ڕۆژگار / منم دژوێنی تاڵی ڕۆژگار، دەنگێکی نابار/ نە لە ڕۆمم، نە لەزەنگم، هەر ئەو بێڕەنگە بێ ڕەنگەم/ درگا بکەرەوە، بکەرەوە، کەدڵتەنگم/ ئەی یاری من، میوانداری من،

میوانی ساڵ و مانگت وەکوو بی لێرە ئەلەرزێت/ تەوەریەک نییە، مەرگێک ناوارێت/ ئەر شتێ: ئەبیسی، تەنیا ناڵەی سەرما و ددانە/ ئەمشەو هاتووم (قەرەبوو کەمەوە)/ حەسێوەکانم لەکەناری جام دانێم.

نشانی‌ها که می‌بینم درو بهرام راماند...:

ئەو نیشانانەی لەو لە بەرچاومە لە بارام ئەچێ/ بارامی وەرجاوەند/ بەر لە قامی قیامەت هەلئەسێتەوە/ هەزاران کار لەدەستی دێ/ هەزاران کار ئەکا هەموو بە شکۆ.

پاسی از شب رفته بود و برف می‌بارید... :

نیوەشەو بوو بەفر ئەباری/ چما پەڕ بارانی پەریەکانی خولیاوی لە بیرەکانی ماندووە/ با وەکوو سەربازی کاردروست ون بوو،/ ئەوەندە پەرێشان حوکمی ئەڕانی دێوانەسا!/ لە سەرسۆپای ماندوو خەمباری وێڵ/ بەفر بوو و بەفر تەنیا، ئەم هەواڵە/ ئەم هەواڵە ساردەی پیری پاک/ و بێ دەنی، بە دەنگیەکی ئەهوەن/ کە خەمناک بوو و بێ ئاکام.

بعد چل سال که ری داشت چو محبوس مرا ...:

پاش چل ساڵ کە خاکی ڕەی منی دیل کردبوو/ خاک خەریکە بمکێشێتەوە بەرەو تووس/ خۆزگە لەتووس بەرەو ڕەی نەهاتبایەم سەرەتا/ کە لەوێ ئەم هەموو حەسرەتەم نەبوو/ من کە دەستی بابی خۆم ماچ نەدەکرد/ مەشهەدی تووس بانگی کردم/ بچمە پای خاکی بۆ ماچ و کڕنۆشی.

غم دل با تو گویم غار... :

خەمی دڵ بە تۆ ئەڵێم ئەی ئەشکەوت!/پێم بڵێ داخۆ ڕێگای ڕزگاریم هەیە؟/ دەنگ هاتە ناڵەو وەڵامی‌دا!/ «ئا، نییە».

# شیعری منداڵان له  غیابی منداڵدا

## (خوێندنەوەیەک لە سەر شیعری منداڵان، دۆخی کوردستانی ئێران)

ئەحمەد شەبانی [*]

**کورتە**

پێشینەی ئەدەبی منداڵان لە جیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠ساڵ لەمەوبەر؛ ئەوکاتەی کە «هانس کریستییەن ئەندەرسۆن» لە وڵاتی دانیمارک ژیاوە. ئەندەرسۆن -کە بە «باوکی ئەدەبی منداڵان» ناوی دەرکردووە- بە نووسینی «ئەفسانەی پەریلان»، جیهانێکی نوێی پێشکەش بە منداڵانی دنیا کرد (شەبانی، ١٣٨٤). مێژینەی ئەدەبی منداڵان لە وڵاتێکی وەک ئێران، ناگاتە حەفتا ساڵ. ئەم پێشینە بۆ ئێمەی کورد، ئەگەر کەمتر لەو ماوە نەبێت، زیاتر نییە. لەم بارەوە یەکەمین هەوڵ و تێکۆشان بۆ دانانی بەردی بناخەی ئەدەبی منداڵانی کورد (لە ئێراندا) ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی ١٣٢٠ی هەتاوی بەملاوە؛ کاتێک کە گۆڤاری کوردستان لە سەردەمی «کۆماری مەهاباد»دا دەرئەچوو. کەواتە دەکرێ بڵێین ئەم تێکۆشانە، هێشتا نوێباو و کاڵە و ڕەنگە وەک خودی ئەدەبەکە، ساوا بێت و پێویستی بە ناز و نەوازشی دایکانەی شاعیران و نووسەرانی ئەم بەستێنە هەیە. بۆیە پێویستە شێلگیرانە و بەرپرسیارانە ئاوڕی لێبدرێتەوە و سەرنجی بدرێت.

ئەم توێژینەوە کورتە، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەرئەخات کە زۆرینەی ئەو هەوڵانەی کە تا ئێستا لە بەستێنی شیعری منداڵان بە ئەنجام گەیشتووە، نەیتوانیوە بەدەر لە ئارێشە و کەموکووڕی بێت. بە چاوخشاندنێکی خێرا بەو بەرهەمانەی کە لەبەر دەستی نووسەردا بوون، ئەو شتەمان بۆ ڕوون ئەبێتەوە کە زۆرینەی شیعرەکان، نەک لە زمان و خولیاکانی منداڵەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵکوو لە ناخی حەز و ئاواتی گەورەکانەوە هەڵدەقوڵێت. لەم توێژینەوەدا نووسەر، نزیکەی پەنجا بەرهەمی بڵاوکراوەی (بە شێوەی کتێب و گۆڤار) لێکداوەتەوە، بەڵام بەداخەوە زۆربەی هەرەزۆریان بێبەهرە بوون لە ڕەگەزی خەیاڵ و فانتازیای تافی

---

[*] توێژەری ئەدەبی منداڵان.

منداڵی. کەچی بە پێچەوانەوە، بەزۆری یا پڕیەتی لە هێما و کینایە، یان لێوانلێو بوون لە ئامۆژگاری ڕاستەوخۆ و هەروا دوور بوون لە جیهانی منداڵان.

لێرەدا پێویستە ئاوڕێکی جیددی بدرێتەوە لەم ژانرە و بە نیسبەت مناڵانی ئەم ناوە بەرپرسیارانەتر هەنگاو هەڵبگیرێت، چوونکە بە هۆی نەبوونی ناوەندێک یاخود سەنتەرێکی لێکۆڵینەوە لەمەڕ ئەدەبی منداڵان، ڕەنگە جەستەی تازە لەدایکبووی تووشی نسکۆ و هەڵەنگوتن بکات و ئەزموونەکان بە کورت و کوێری و نەزۆکی بهێڵێتەوە. ئەم پەتایە وادەکات، هەر نووسەر-شاعیرێک لە ئاستی خۆیەوە و بێخەبەر لە کەسانی تر، بەرهەمەکەی بڵاو بکاتەوە و ئاگای لە بیروبۆچوونی ڕەخنەگرانەی خوێنەر نەبێت. هەربۆیە لێرەدا ئەم پێشنیارە دەهێنمە ئاراوە کە لایەنگران و نووسەرانی ئەم بەستێنە، هەستن بە دەرکردنی گۆڤارێکی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی منداڵان بە دیدێکی زانستییانە و ڕەخنەگرانەوە. چوونکە ئەگەر بێت و دەست لە منداڵان بەربدەین، کەسانی دیکە دەستیان دەگرن و بە هەوای خۆیان بەرەولای خۆیان دەیانبەن. ئەمەش داهاتووی منداڵانی نەتەوەکەمان مژاوی و نادیار و بێئاسۆ دەکات.

**وشە سەرەکییەکان:** قۆناغی منداڵی، شیعری منداڵان

## پێشەکی

«ئەدەبی منداڵان، منداڵ نایخوڵقێنێ». ئەم بیرۆکە، بنچینە و بونیادی هەر باسێکی تیۆری لە بەستێنی ئەدەبی منداڵاندایە. ئەدەبی منداڵان، لەگەڵ جۆرەکانی دیکەی ئەدەبدا مانایەکی جیاواز لەخۆ دەگرێ؛ بەڵام هەرچی بێت، ناتوانێ خۆی لە ژێر دەسەڵاتی گەورەکان دەرباز بکات. کەواتە، وا دەرئەکەوێت، چوونکا ئەم ئەدەبە لە لایەن گەورەکانەوە دێتە ئافراندن، دەسکرد و داتاشراو بێت (خسرو نژاد، ١٣٨٢).

ڕەنگە باسکردن لە ئەدەبی منداڵان، لای ئێمە گەورەکان، باسێکی لاکەوتە و پەراوێزی بێت و بەهەند نەگیرێت؛ یان بە چاویلکەی شتێکی هەرزان‌بایی سەیری بکرێت. ڕەنگە باسکردن لە ئەدەبی منداڵان، باس کردن بێت لە کۆتایی هاتنی ئەو شتەی کە هێشتا دەستی پێنەکردووە. ڕەنگە چالاکوانانی ئەم بەستێنە، هەر کاتێک لە ئەدەبی گەورەکان جێ مابێتن، ئینجا بە ژێستێکی بەرپرسیارانە و شاعیرانەوە داکۆکی لە منداڵ و مافەکانی و جیهانە ساکار و بێخەشەکەی بکەن. ڕەنگە نەکرانەوەی گرێ کوێرەکانی تافی منداڵیمان، وامان لێبکات بە ئاڵۆزاوی و شڕی و شپرزییەکی زیاتر لەو سەردەمە، خۆمان بهاوێژینە بەستێنی ئەم ژانرەوە و بە کەمترین توانست و شارەزاییەوە ببینە دەمڕاستی منداڵان و لەبری ئەوان بئاوزین و هەستمان دەربڕین و شیعر بهۆنین و چیرۆک و بەیت و باڵۆرە بێژین.

بە تێپەڕبوونی زەمان و بەرجەستەبوونەوەی منداڵ، وەک بوونەوەرێکی هەستیار و بابەتێکی تایبەت بۆ پەروەردە و خەملاندن و عاملاندن، هەروەها پاش لەدایکبوونی زانستی پەروەردەی نوا و سایکۆلۆژی منداڵ لە لایەن بیرمەندانێکی وەک رۆسۆ، فرۆبل، پستالۆتسی و پیاژە و ... ئینجا پێداویستییە دەروونی و عاتفییەکانی منداڵ بایەخی پێدرا و لە دەزگاکانی پەروەردە و بارهێناندا کەوتە بەر سەرنجی فێرکاران و راهێنەرانی منداڵ. بەم پێش‌وتارە کورتە، دەمهەوێت پێناسەی وتارەکە بکەم کە ئەویش دەخوازێت لە یەکێک لە ژانرەکانی ئەدەبی منداڵان (واتە شیعر) بکۆڵێتەوە. پرسیارە سەرەکییەکانی ئەم توێژینەوە بریتیە لە: ١- منداڵ کێیە و ئەو هۆکارانەی کە بۆ ناسینی توانستەکانی منداڵان گرینگن، چییە؟ ٢- شیعری منداڵان چییە و تایبەتمەندییەکانی ئەم جۆرە شیعرە کامانەن؟ ٣- ئەو ئەزموونە شیعرییانەی کە لە دەڤەری خۆمان بۆ منداڵانی ئێمە بە ئەنجام گەیشتووە لە چ ئاستێکدایە؟

بە مەبەستی خۆماڵی کردنی وتارەکە، هەوڵ ئەدەم لە دۆخی شیعری منداڵان و ئەو بەرهەمانەی کە لە ماوەی ئەم چەن ساڵەی دواییدا لە کوردستانی ئێران «بە ناوی شیعر بۆ منداڵان» بڵاو کراونەوە، بکۆڵمەوە و ئاوڕێکیان لێ بدەوەمە. لێرەدا بەرلەوەی دەروازەی باسەکە بکەینەوە باشتر وایە کە مەبەستی خۆمان لە «منداڵ» ڕوون بکەینەوە و ئاشکرای بکەین کە بە چ کەسێک دەگوترێ منداڵ و میانەی چ تەمەنێک بە منداڵ لە قەڵەم ئەدرێت. مەبەست لە وشەی «منداڵ» لەم وتارەدا بریتیە لەو مرۆڤانەی کە لە میانەی ساڵانی ٤ تا ١٦ دەژین و ئەم بڕگەش بە چەند قۆناغێک (گرووپی تەمەن) دابەش دەکەین کە بریتین لە:

گرووپی یەکەم: منداڵانی ٦ ساڵ لە خۆ دەگرێ.

گرووپی دووهەم: منداڵانی ٧ تا ٩ ساڵ کە پێکهاتووە لە منداڵانی پۆلی ٢ و٣ و ٤ی سەرەتایی.

گرووپی سێهەم: منداڵانی ١٠ تا ١٢ ساڵ کە بریتیە لە منداڵانی پۆلی پێنجەمی سەرەتایی و ١ و ٢ی ناوەندی.

گرووپی چوارەم: قۆناغی مێرمنداڵی ١٣ تا ١٦ساڵان کە پێکهاتووە لە پۆلی ٣ی ناوەندی و قۆناغی دواناوەندی.

## شیعری منداڵان:

ڕەنگە ئەگەر بڵێین: «شیعر چ کارێکی لە دەست دێت؟» باشتر بێت لەوەی کە بڵێین «شیعر چییە؟» (برنیک، کتاب ماه کودک و نوجوان: شماره 85). ئەگەر بمانەوێت پێناسەیەکی کورت لە شیعری منداڵان بەدەستەوە بدەین، دەکرێ بڵێین: وتارێکی کێشدار یا هۆنراوەیەکی خەیاڵاوییە کە سۆز و هەستوخوستی منداڵ دەبزوێنێ و لە ناخیدا مۆسیقایەکی هێمنیش بەدی دەکرێت. منداڵ لە شیعرێک کە تێیدا باس لە خەون و خەیاڵاتەکەی بکرێت، چێژ دەبات (علوی، ١٣٨٢). بەم بۆنەوە حەز دەکات ئەو شیعرانەی کە وەها جیهانێکی بۆ دەخولقێنێ، بیخوێنێت و لەبەرخۆیەوە ئەیڵێتەوە و دەبێتە مەلەکەی زەینی. شیعری منداڵان، وەک ئاوێنەیەک وایە لە بەرامبەر منداڵدا کە ئەگەر خۆی تیا ببینێت، ئەو شیعرە بە هی خۆی دەزانێ و ئەگەریش وا نەبوو، لە گەڵیا هەست بە نامۆیی دەکات. (ابراهیمی، روزنامەی ایران: شماره ٧٠٣). شیعر لە یاری کردنێکی بەتام و دڵخۆشکەر بە وشەوە دەست پێدەکات و شاعیر بە هەڵبژاردنێکی وردبینانەی وشەکان و داڕشتنێکی وشیارانەیان لە پاڵ یەکدا، سەرنجی خوێنەر بە لای شیعرەکە ڕادەکێشێ و ئێمە دەباتە ناخی ئەزموونێکی تازەی ژیانەوە (برنیک). کەواتە، ڕەنگە ئەو کاریگەرییەی کە شیعر لەسەر هەست و نستی ئێمە دایدەنێ، گرنگتر بێت لە پێناسە کردنەکەی.

شیعری منداڵان، دەبێ ڕەنگدانەوەی پێداویستییە دەروونی و مادییەکانی منداڵ بێت و بابەتەکانی شیعری منداڵ دەبێ پەیوەندی هەبێت بە جیهانی منداڵیەوە، تاکوو بە سانایی تێیبگات و لە ژیانی خۆیدا وەک ئەزموونێک بەکاری بهێنێت. «فارگۆن» پێناسەیەکی شاعیرانە لە شیعر بە دەستەوە دەدات: «شیعرچییە؟ کێ دەزانێ شیعر چییە؟/ شیعر گوڵی سوور نییە، بۆن و بەرامەی گوڵی سوورە/ ئاسمان نییە، رووناکایی ئاسمانە/ هەڵفڕین نییە، تامەزرۆیی هەڵفڕینە/ دەریاش نییە، ئاوازی دەریایە/ شیعر **"من"** نییە، بەڵکوو ئەوەیە کە منی هێناوەتە ئافراندن/ شیعر، دیتنە، بیستنە، هەست پێکردنە بەڵام/ ئەوەش نییە کە لە پەخشانێکدا دێتە ئاخاوتن/ کەواتە شیعر چییە؟ کێ دەزانێ شیعر چییە؟ شیعر هەستی مرۆ بە شێوەیەک دەرئەبڕێ کە لەمەوبەر تاقی نەکرابێتەوە. شیعر یارمەتی خوێنەرەکەی ئەدات کە خۆی و هەست و خوستی بفامێنێت (برنیک).

### تایبەتمەندییەکانی شیعری منداڵان:

ئەگەر بمانەوێت شیعری منداڵان لە شیعری گەورەکان جیا بکەینەوە، باشتر وایە لەو تایبەتمەندییانە بدوێین کە ئەم کارەمان بۆ ئاسان دەکاتەوە و یارمەتی ئێمە ئەدەن تاکوو لە پرۆسەی ئاسانکاری بۆ ڕاگواستنی منداڵان لە قۆناغی منداڵییەوە بەرەو ژیان و پرۆسەی پەروەردە و ڕاهێنان بە لاڕێدا نەمانبات. کەواتە، بە شیعرێک دەگوترێ «شیعری منداڵان» کە ئەم تایبەتمەندییانەی خوارەوەی لە خۆ گرتبێت:

١) زمانێکی سادە و ساکاری هەبێت.

٢) ڕەگەزی خەیاڵ تێیدا بەهێز بێت؛ واتە خەیالاوی بێت.

٣) ڕەمزی و هێماییین یا کینایی نەبێت.

٤) لە جیهانی منداڵانەوە هەڵقوڵابێت.

٥) ڕاستەوخۆ ئامۆژگاری ئەخلاقی لە خۆ نەگرێت.

ئێستا ئەم تایبەتمەندییانە شی ئەکەینەوە و سۆراخیان لەو شیعرانەدا ئەگرین کە لەم ساڵانەی دواییدا بە ناوی شیعری منداڵان لە قەبارەی کتێب یا گۆڤار و بلاڤۆکدا بلاو کراونەوە.

١) **دەبێ زمانێکی سادە و ساکاری هەبێت:** واتە منداڵ زوو لێی تێبگات و بۆ تێگەیشتنەکەی تووشی گیروگرفت و تەنگ و چەڵەمە نەبێت. واتە هەر کە لە زاری خوێنەر جاری بوو منداڵ حەزی پێبکا و دڵی بگرێت. بەڵام ئەم سانایی و ساکارییە بە واتای ئەوە نییە کە دانانی شیعر بۆ منداڵان کارێکی ئاسایی و سادە بێت و هەرکەس بتوانێت خۆی لە قەرەی بدات. دیارە بە پێی ئەو پۆلێنبەندیە کە لە قۆناغەکانی منداڵی بەدەستەوە درا، ئەم تایبەتمەندییە، پتر بۆ دوو گرووپی یەکەم و دووهەم و تا ڕادەیەکیش گرووپی سێهەم لە ئارادایە. منداڵێک کە تەمەنی لە میانەی ٤ تا ١١ ساڵان بێت، هێشتا «خەزانەی وشەکانی» نەگەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە بتوانێت وشەی دژوار و نامۆ بفامێت. بەم بۆنەوە پێویستە ئەو شیعرەی کە دەیبیسێ یان دەیخوێنێتەوە، لە قەدەر توانست و بەهرەی زمانەکەی بێت بۆ ئەوەی بتوانێ بە سانایی پێوەندی لەگەڵدا بگرێت و چێژی لێوەرگرێت.

ڕەنگە زۆرتر پێمان وابێت کە دانانی شیعر بۆ منداڵان، بە قەدەر سەرنجی نیوەناچڵی ئێمە بۆ ئەو تەمەنە، کارێکی سانا و ساکار بێت. کەچی لە واقیعدا بە پێچەوانەی ئەم بۆچوونە ڕوو ئەدا و باشترین شیعری منداڵان، شیعری ئەو شاعیرانە بوون کە لە سنووری بەرتەسکی ئەم دیدە کورت و کوێرە ڕزگار بووبێتن و جیهانێکی بەرفراوانیان بەرەوڕووی خۆیان، وەک داهێنەر و منداڵ، وەک ڕوودەم (مخاطب) کردۆتەوە.

لێرەدا کۆپلەیەک لە شیعری «ماسی خانم»ی عەلیڕەزا محەمەدیان دەهێنمەوە (محەمەدیان، ١٣٧٩). ئەم شیعرە ئەگەرچی بە بنزاراوەی ئەردەلانی (سنەیی) هۆنراوەتەوە، بەلام ئەمە نەبۆتە ڕێگر لەبەردەم منداڵانێک کە بەو بنزاراوە قسە ناکەن، هەر بۆیە منداڵانی ناوچەکانی تریش پێشوازی گەرمیان لێکرد. بەڵگەش بۆ ئەم

مەسەلە، تاکوو زستانی ٨٨، گەیشتن بە چاپی چواردەهەم و بڵاوکردنەوەی نزیکەی ٨٠ هەزار دانە لەم کتێبەیە.

ماسی خانم ناو دەریا / چارشێوی دا بەسەریا
کەفتە ڕێگە خرتە خرت / شیرین شیرین وردە ورد
ماسی خانم کەوشی نەو / ماڵەکەیان حەوشی نەو
وەختێ چوو بۆ سەر کووجی / چاوی کەفتەو بە جیجی
جیجی زەردەواڵە بوو / منالّ ئەو بەرماڵە بوو ....

لەم شیعرەدا، منداڵ بۆ ماسی دیدێکی مرۆڤانە و لێرەدا نیگایەکی ژنانە قایل دەبێت. چوونکا ماسی لە جیهانی واقیعدا بوونەوەرێکی ناوئاوە و بە بێئاو ناتوانێ بژی. بەڵام شاعیر دەیکات بە خانمێک و دەیهێنێتە سەر عەرز؛ واتە دنیای منداڵان و چارشێوێکیش ئەدا بە سەریا. ماسی خانم، هەستێکی بێغەش و دەروونپاکی هەیە کە لە کاتی تەنگانەدا لە خۆ دەبوورێ و بە هانای هاوڕێکەی دەچێت. کاتێک کە «سۆنەی کراس پووڵەکی» پێڵاوەکانی دڕاوە و لە چاوەکانی فرمێسکی گەش دەبارێ، دڵی بۆی نەرم ئەبێ و دەڵێ:

وتی قەزاو لە گیانم/ ڕێگەی هەس و ئەزانم
ماسی کەوشی لە پا کەند/ وتی ئیمڕۆ بۆ تۆم سەند
ئیتر بەسیە نەگیری/ با بێژن چەنێ ژیری

نموونەیەکی تر کە تێیدا ڕەگەزی زمان بە ستایلێکی سادە دێتە ئاخاوتن، ناساندنی لەیستۆکێکی کایەی منالانەیە بە ناوی «بەرزە حەوایلە»، واتە «کۆلێرە» لە لایەن کولسووم عوسمانپوورەوە:

حەزم لە ئاسمانە/ جێگای باڵندەکانە
ئەڕۆم بۆ لای هەورەکان/ هەورە گەورە گەورەکان
دەستی خۆش بێ ئەو «با»یە/ لەگەڵ من دەکا کایە
کۆترێکی کاغەزیم/ بە دەستی تۆ هەڵبەزیم (عوسمانپوور، ١٣٨٢)

لەم شیعرەدا زمان بە تەرزێکی ساکار و سادە، بەڵام بەتام و خەیاڵاوی بەکار براوە. بە تایبەت لە دێڕی دووهەمدا کاتێک دەڵێ: «ئەڕۆم بۆ لای هەورەکان/ هەورە گەورە گەورەکان». لە شیعری منداڵاندا دووپات بوونەوەی وشەکان و گرێبەستی ئاواز و دەنگی وشەکان، دەتوانێ چێژێکی تەواو بە خوێنەر و بیسەر ببەخشێت و بەرهەمەکەی لە لا خۆشەویست بکات. لێرەدا شاڕستەی «هەورە گەورە گەورەکان» وەها دەورێک دەگێڕێت.

یان بڕوانە بۆ ئەم شیعرەی «سەلام پارسا»:

دانوولە

دایکم دانوولەی لێناوە / هۆ منالانی ئەم ناوە
وەرن زوو کەن تا نەبڕاوە / هەتا بەشی ئێوە ماوە

"ئاسۆ" دیانی ڕوواون / سەرکوڵمەی سوور هەڵگەڕاون
بۆ ئەوەی ساغ و وریا بن / دایکم دانووی بۆ لێناون
هۆ دایە گیان مامی مامی / دڵم خۆشە تۆ لە لامی
ئەی دانوولەی دەستی دایە / چەندە خۆش و چەند بەتامی
خۆشە "ئاسکە" و "کوردە" و "کانی" / هەر سێکی بروا دیانی
دایکیان دانوویان بۆ لێنێ / منیش بیخۆم تامی تامی ...(پارسا، ٨٤)

لەم شیعرەدا شاعیر وێڕای ئەوە کە زەینی منداڵ ڕادەکێشێ بەرەو نەریتێکی کۆنی کوردەواری کە ئەویش سازکردن و بەخشینی دانوولەیە لە کاتێکدا کە منداڵێک یەکەم دیانی دەردێت، زمانی شیعرەکە بە تەرزێکی مۆسیقایی دێتە سەما و دیمەنی جوان و بەپێزیش دەخۆڵقێنێ. با کۆپلەیەکیش لە بەیتی«دایە مەمدە بەگورگێ» کە لە لایەن «عەبدولقادر قادری» کراوە بە شیعر و بە بنزاراوەی موکریانی (مەهابادی) هۆنراوەتەوە، بخوێنینەوە:

گورگ:
ئۆخەی گرتم بە ددان / زگم دڕی بە پەنجان
بە من دەڵێن دڕندە / ئەمنم گورگی بێ ئامان
دایک:
زاڵم ڕەبی مەرگت بێ / هۆی ڕزینی جەرگت بێ
تووت لە عەرزی ببڕێ / «دەبرۆ بە قوزەڵقۆرتت بێ» (قادری، ١٣٧٧)

لێرەدا ساکاریی زمانی شیعر، نەک بۆ منداڵ چێژ نایەنێتە بەرهەم، بەڵکوو ڕەنگە تووشی نسکۆیەکی بکات، چوونکە لە نێوە دێڕی کۆتاییدا کێشی شیعرەکەش، هەڵبەزیوە و لەوانی دی زێدەتر هاتووە. لە لایەکی ترەوە زمانێکی زبر و وشک و ڕەقی بەکار هێناوە کە ئەمە لە گەڵ رۆحی شیعردا ناخوێنێتەوە. شیعری منداڵ، بە هۆی هەستوخوستی ناسکی خوێنەرەکەی، پێویست دەکات لە قەبارەیەکی نەرم و نیاندا بێتە ئاخاوتن و تەلی سۆز و عاتیفەی ببزوێنێ.

**٢) ڕەگەزی خەیاڵ تێیدا بەهێز بێت:** یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی شیعری منداڵان ئەوەیە کە جیهان و پانتای شیعرەکە بە ڕەگەزی خەیاڵ و فانتازیا برازێنێتەوە.

لە لای زۆربەی شاعیران -ئەو شاعیرانەی کە بۆ گەورەکان شیعر دەهۆنن- «خەیاڵ» سەرچاوەی سرووش و ئافراندنی بەرهەمی ئەدەبی بووە. بە باوەڕی «ویلیەم بلیک» (١٧٥٧ ١٨٢٧)، شاعیری گەورەی ئینگلیزی، خەیاڵ بۆ شاعیر لەو خوایە کەمتر نییە کە ڕۆحی ئینسان ڕادەژەنێ و هەر داهێنانێک کە بەرهەمی خەیاڵ بێت، کارێکی خوداییە. لەم ڕووەوە شاعیرێک کە دەخوازێت ئەندێشە و خەیاڵی منداڵ بهارووژێنێت، کارەکەی ئەستەم و دژوارتر دەبێت لەو شاعیرانەی کە خەون بە جیهانی گەورەکانەوە دەبینن (خسرونژاد، ١٣٨٢) .

شیعرێک کە خەیاڵی منداڵ بەرەو خۆی ڕانەکێشێ، خێرا لە لای کۆن دەبێ و لەبەر چاوی دەکەوێت. خەیاڵی منداڵان بێ سنووره و کۆتایی پێنایەت، کەواتە شاعیری منداڵان دەبێ بە لەبەرچاوگرتنی ئەزموونە ڕاستەقینەکانی منداڵ، خەیاڵیان بۆ داڕێژێت؛ چوونکا ناکرێ لای منداڵان باس لەو خەیاڵانە بکرێت کە هیچ ئەزموونێکیان دەربارەی نەبووبێت (رحماندوست، ١٣٨٥).

بڕوانە ئەم شیعرەی" ئەمین گەردیگلانی" کە بە شێوەیەکی جوان «باران» دەکاتە دیمەنێکی خەیاڵی:

خرمە خرمی پێی باران/ ئەدا لەسەر بانی ماڵان
هەڵدەپەڕن دڵۆپە/ وەکوو کایەی مناڵان
چەترەکەم هەڵدەگرم و / ڕادەکەم بۆ بەر دەرکێ
لەگەڵ دەنکی بارانێ/ دەست ئەکەم بە هەڵپەڕکێ
...
بە لێزمە دێتە خوارێ/ چەند خۆشە خرمە خرمی
هەور ئەدا برووسکە / پێم خۆشە گرمە گرمی (گەردیگلانی، ١٣٨٤)

شاعیر لەم شیعرەدا "باران" وەک نیشانەیەک بۆ ڕووناکایی و ژیان لە بەر چاوی منداڵدا بەرجەستە دەکات و بە چەن دیمەنێکی مناڵانە و دڵڕفێن دەیهەوێت، خەیاڵی مناڵ بەرەو ئەم دیاردە بەنرخەی سروشت ڕابکێشێت. کاتێک کە دەڵێ «هەڵدەپەڕن دڵۆپە/ وەکوو کایەی مناڵان»، خوێنەر بەرەو دیمەنێکی شاد و ئەفسووناوی ڕێنموون دەکات. منداڵ، ئەم ئیماژانەی شیعرەکەی بەردڵ دەکەوێ و بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن لەگەڵ دەنکە دەنکەی بارانێ سەرچۆپی ڕاکێشێ و دەست بکات بە هەڵپەڕین و فەرحێنی بخاتە دڵییەوە.

نموونەیەکی دیکە لەم شێوازە، شیعری «ماسی خانم و ئابجی فێڵ»ە:

ماسی خانم ناو دەریا/ کراسێ کوردی ها بەریا
لەبەر ئاینە وێسیاگە / پەلکەکانی چنیاگە
ماسی خانم شیرینە/ ناوماڵەکەی بوینە
بڕوا بۆ یەغانەکەی / خرخاڵەکەی شانەکەی...(محەمەدیان، ١٣٨٠)

٣) **ڕەمزی و هێمایین یا کینایی نەبێت.** ئەگەر بێتو لە شیعرێکدا وشەی ڕەمزی و هێمایین بەکار ببرێت، منداڵ-خوێنەر تووشی سەختی و ئاڵۆزی لە فاماندنی چەمکەکان دەکات. بەداخەوە لە هەندێ لەو بەرهەمانەی -کە تا ئێستا بە ناوی شیعری منداڵان بڵاو کراوەتەوە- شاعیر (دانەر) زۆر بە هاسانی دەقی شیعرەکە لەم ڕەمز و هێمایانە دەئاخنێت کە لێرەدا چوونکە مانای ئەم وشەگەلە لە ئاستی فامی منداڵدا نییە، ناچاری دەکات بە دانانی ژێدەر یان فەرهەنگۆکێک؛ سەرنجی منداڵ لە ناوەندی دەقەکەوە ڕاکێشێتە پەراوێز و بەم جۆرە لە ئەتمسفۆری شیعرەکە دووری دەخەنەوە. ڕەنگە ئەم حاڵەتە ببێتە هۆی دروستبوونی ئارێشە و منداڵ-خوێنەر تووشی سەرلێشێواوی بکات.

بڕوانن بۆ هۆنراوەی «دایە مەمدە بەگورگێ»ی قادری:

وەک ڕۆستەمی داستان / یا حەیدەری بەئیمان
بە زولفەقار و گورز / هەڕاکەینە سەر شەیتان

لەم هۆنینەدا ڕۆستەمی دەستان (کە لێرەدا بە هەڵە، ڕۆستەمی داستان بەکارهاتووە) حەیدەر (کە ئاماژە ئەدات بە ئیمامی عەلی) ئیمان (کە بۆ منداڵ وەک چەمکێکی تا سەر ئێسقان مژاوی و نامۆیە) زولفەقار (شمشێری ئیمام عەلی) و شەیتان (بوونەوەرێکی ئەفسانەیی و ترسناک و ...) سەرجەم کۆمەڵێک ڕەمز و هێمایە کە منداڵ دەخاتە گێژاوێکی هێمایین و لە ڕاستیدا نازانێ کە ئەو خەریکە بەیتێکی فولکلۆری خۆماڵی بە شیعر دەخوێنێتەوە یان مێژووی ئێران و تووران و ئیسلام و ...؟

نموونەیەکی تر لەم جۆرە، شیعری «فایەق باتەش»ە کە لە وەسفی «کتێب»دا گوتوویە:

مامە پیری فرەزان / بۆمان بدوێ بە بێزوان
لە حەکایەت و داستان / کەس تێر نابێ لە باستان
با فێر ببین لە باستان / بۆ خەڵک گێڕینۆ داستان (باتەش،١٣٨٠)

لێرە، لە دێڕی دووهەمدا مەبەست لە وشەی«باستان»، «قسە و باسە». واتە دەنگ وباسی ئێوە. بەڵام هەر ئەم وشە لە دێڕی سێهەمدا واتای مێژووی کەونارا لە خۆ دەگرێ.

یان ئەم نموونە کە لە کتێبی«دەسەوپارە»ی «سەلام قادری»دا هاتووە:

پش، پش، پش، پشیلە/ ختەم کرد لە پشیلە
وتی: ئاخۆ دایەگیان! / مامە بۆ کرا زیندان؟
دایک وتی بە منداڵی/ پشیلە هاتە ماڵی
تێکی دا ماڵ و حاڵی/ کە پشیلەی ڕاماڵی
زیندان بوو بە ئەحواڵی/ قەبر بوو بە دواماڵی (قادری، ١٣٨٢)

لەم نموونەدا خوێنەری گەورەساڵیش تووشی گرفتی مانایی دەبێت و بە سەختی تێیدەگات، چ بگات بە منداڵان! لە دێڕی یەکەمدا پلاتی شیعرەکە ڕوونە کە دەیهەوێت باس لە پشیلە بکات، بەڵام لە دێڕی دووهەمدا خێرا دەلاقەیەکی تر دەکرێتەوە کە پێوەندی بە دێڕی یەکەم نامێنێ؛ تۆمەز پلاتێکی تر دێتە ئاراوە. ئینجا ڕووداوی ناو شیعرەکە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵگای شاعیردا ناگونجێ. نموونەیەکی تر لەم بەرێزە:

دەڵێ منداڵ دەزانێ/ بە سەرچاوە پیلانێ
دەبابەی دەوری دێیە/ تەیارەس لە ئاسمانێ
لەتیف هەڵمەتەجوانە/ شاعیری منداڵانە
قەڵەمی دەسی دڵیە/ دیوانی باخچەی گیانە

ئەم نموونە بەڕاستی هیچ لێکدانەوەیەک هەڵناگرێ!

نموونەیەکی دیکە لە وەسفی «مامۆستا» لە لایەن «ئەحمەد بەهرامی»:

قوتابخانەم پێ خۆشە/ جێگەی زانین و هۆشە
لەم سەرچاوە بەجۆشە/ شەربەتی ژین بنۆشە
مامۆستایە هەتاوم/ سۆما و گلێنەی چاوم

به قووڵایی هەناوم/ خۆشم دەوێن تا ماوم
ژیانتان باخی گوڵ بێ/ بەهەشتیشتان مەنزڵ بێ
ڕۆژ و شەوتان بەدڵ بێ/ دوور لە تاریکی و سڵ بێ

(بەهرامی، ١٣٧٩)

لەم شیعرەدا زاراوەگەلێکی وەک: سەرچاوەی بەجۆش، شەربەتی ژین، مامۆستایە هەتاوم، بەهەشتیشتان مەنزڵ بێ، منداڵ-خوێنەر تووشی گرفتی مانایی دەکات و فاماندنی شیعرەکە دژوار ئەکات. منداڵ دەربارەی «شەربەتی ژین» یاخود شاڕستەی «بەهەشتیشتان مەنزڵ بێ» چ دەزانێ؟ ئایا شەربەتی ژین، خۆشاوێکە وەک نۆشابە؟

هەروەها بڕوانە ئەم نموونە لە کتێبی «کەتان کەتان»، هۆنراوەی «عەفیفە مەحمودزادە»:

نوێژ کردارێکی بەرزە / نامان هێڵێ لەم ئەرزە
دەمانبا بەرەو ئاسمان / خزمەت خودای مێهرەبان ...

(مەحموودزادە، ١٣٨٥)

جیهانی منداڵ، جیهانی سەرزەمینی و ئەرزی و واقیعیە. خولیای نەمانەوە لە سەر ئەم ئەرزە، کوتومت خولیایەکی گەورەکانە. منداڵ گەلێک حەز ئەکات بە هەڵفڕین، بەڵام نازانێ چلۆن نوێژ دەیباتە ئاسمان. بە پێچەوانەوە، دوو باڵی خەیالاوی یا خود بە سواری فڕۆکەیەک دەتوانێ ئاسمان بپێوێ و لەوێوە بڕوانێتە دنیاوە. ئایا ئەم پانتایە شیعرییە دەتوانێ خولیا و حەز و ئاواتەکانی منداڵ بژەنێ و لە گەڵ خۆیدا بیبات؟

**٤) لە جیهانی منداڵانەوە هەڵقوڵابێت.** شیعری منداڵان دەبێ ئاوێنەی باڵانوێنی خولیا و خەیاڵ و بەگشتی جیهانی منداڵان بێت و هەر ئەو جیهانە بە دیمەن و نیگاری ڕەنگینی زمان بکێشێتەوە. یەکێک لەو پەتایانەی کە ئەدەبی منداڵان، بە تایبەت شیعری منداڵی تووشی نەخۆشی کردووە، ئەوەیە کە شاعیرانی منداڵ، ئەغڵەب، لە بری ئەوەی لە جیهانی بێغەش و خەیالاویی منالەکان بدوێن، ئارێشە و کێشەکانی خۆیان- وەک گەورەساڵ- بەسەریاندا دەسەپێنن و چاوەڕوانی ئەوە دەکەن کە ئەوانیش ئەم بابەت و گرفتانە بە هی خۆیان بزانن و هەست وخوستی خۆیان لەگەڵیدا ئاوێتە بکەن.

بڕوانە بۆ کۆپلەیەکی «خالد ئەحمەدی»:

لیپاولیپ لە ئاسەوارە / مەکۆی شێرانە کرماشان
لە یەکیەتی شیعە و سوننی / گوڵی تاقانە کرماشان
لە حاندی دوژمنی ناپاک / کێوی قەڵغانە کرماشان (ئەحمەدی، ١٣٨٤)

«دایە مەمدە بەگورگێ»ی قادری:

ئێمەی وڕ و نائاگا / لێمان ون بووە ڕێگا
بێخەبەر لە هەموو لا / کەس بە هاوارمان ناگا
هەموو لێکتر بڵاوین/ کڵاو لەسەر نراوین
هۆی بەدبەختی و ناکۆکی/ بێ سەر و بێ کڵاوین

عەبدوررەحمان فەهیمی:

باڵندەکان هێلانەی خۆیان هەیە/ هەموو جێ ژینی سەربەخۆیان هەیە
شادن بەو هێلانە کە هی خۆیانە/ سەربەست دەژین دوور لە زوڵمی بێگانە
چەن خۆشە ژین بە ئازادی و سەربەستی/ چەن ناخۆشە ژینی دیلی و ژێردەستی
(فەهیمی، ۱۳۷۹)

ئەم چەند نموونە بۆمان دەردەخەن کە بابەتی لەم جۆرە، لە خەون و خەیاڵ و خولیای منداڵان بەدەرە و ئەمە کێشەی نووسەرە وەک گەورەساڵێک نەک کێشەی منداڵ.

یان ئەم نموونە کە لە زمانی منداڵێکەوە دەیهەوێت بە چاکەی دایکدا هەڵبدات:

دایەگیان باخی گوڵمی/ هۆی شەوق و شایی دڵمی
بۆ پەروەردەم بەزۆری/ چەشتت تاڵی و ناسۆری
بۆ بارهێنانی ڕۆڵە/ باری ژانت لە کۆڵە ...
تێت گەیاندم لار و ڕاس/ ئاکامی خراپ و خاس
ئەم فەرموودە بەجێیە/ «بەهەشتت لە ژێر پێیە»
هەر دۆعای خێری تۆیە/ بۆ سەرفرازیم هۆیە (بەهرامی، ۱۳۷۹)

لەم شیعرەدا وا دەرئەکەوێت کە منداڵەکە وێنەی گەورەساڵێکی کامڵ بیر دەکاتەوە، چوونکا دەتوانێ «تاڵی و ناسۆری» ژیان دەرک بکات؛ دەزانێ کە «باری ژان» بە کۆڵی دایکییەوەیە، دەتوانێ چاک و خراپ و لار و ڕاستی ژیان لێک جیا بکاتەوە؛ دەتوانێ دەرکی حەدیسی «بەهەشت لە ژێر پێی دایکاندایە» بکات و ...

**٥) ڕاستەوخۆ ئامۆژگاری ئەخلاقی لەخۆ نەگرێت.** ئەگەرچی دەکرێ بڵێین یەکێک لە کارکردەکانی شیعر بۆ منداڵان لایەنی فێرکاری و پەروەردەیی هەیە و لەم ڕێگاوە دەکرێ هەندێ بابەتی زانستی و کۆمەڵایەتی و هونەری بە منداڵان فێر بکرێت، بەڵام بەکارهێنانی شیعر بۆ فێرکردنی ئامۆژگاری و نسحەتی ئەخلاقی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، ڕەنگە کاردانەوەیەکی پێچەوانەی هەبێت. بۆ نموونە بڕوانە ئەم شیعرانەی خوارەوە:

جوێن وتن چ بێجێیە / عەیبەیە لە گشت جێیە
عەیبە جوێن بە کەس ناڵێم / گەر ناحەقیش بدەن لێم
جوێن فرۆشی خراوە / جوێندەر بەڵقی سەرئاوە (بەهرامی، ۱۳۷۹)

یان ئەم نموونە:

فیز خراپە فیز مەکە / لە هەژاران قیز مەکە
خۆت بە گەورە مەزانە / هەرکەس وابێ نەزانە
خەڵکی وەک تۆ ئینسانە/ مافیان لای خوا یەکسانە (فەرهەنگیان، ۱۳۸۱)

یان ئەم نموونە:

منالّی زانا و ئازیز/ خۆی هەڵناکێشا هەرگیز
لاف و گەزاف لێ نادا / قسەی درۆ هەر ناکا

(پارسا، ئاڵەکۆک: ژمارە٤)

ئەم جۆرە کاردانەوە بە دیوەکەی تریشدا ڕەنگە لە سەر نەستی منداڵ کاریگەری نابەجێ و ناشیرین دابنێت، واتە ڕەنگە لە شیعرێکدا کۆمەڵێ دیمەنی واقیعی کە لە گەڵ حەزەکانی منداڵیشدا دەگونجێت، بکەوێتە بەر باس، بەڵام ببێتە هۆی بە لاڕێ بردنی منداڵ. وەک ئەم نموونەی موحەمەد ئینسافجویی:

قۆچەقانی دەکڕم/ لە پەنجەرانی دەگرم
لە دەرک و بانی دەگرم / لە زۆر کەسانی دەگرم
قۆچەقانی دەکڕم / لە داخی وانی دەکڕم
لە لووتی وانی دەگرم / لە گوێچکەیانی دەگرم.

(ئینسافجویی، ١٣٨٣)

یا ئەم نموونە:

من ناوم کیمیایە / دایە لێم دڵنیایە
چوونکوو پاک و تەمیسم/ هەمیشە نمرە بیسم
پەڵپی ناگرم لە دایە/ ئەزانم ناڕەوایە
قەت هاروهاجی ناکەم/ ئازاری دایکم نادەم
لیباس و کەوش و کڵاو/ ناهێڵم پرش و بڵاو...

(ئینسافجویی، ١٣٨٣)

یان ئەم نموونە کە تەنیا بە مەبەستی کایە کردن بە سەروا (قافیە بازی) هۆنراوەتەوە:

درین، درین، درارە/ ئەو کچەمانە چ هارە!
سەری ئەڵێی هەنارە / چاوی چرای شەوارە
قژی ئەڵێی بزمارە/ گوێچکەی ساجی ماهوارە
دیانی ئەڵێی مشارە/ لووتی ئەڵێی خەیارە
دەستی وەک کۆتە دارە/ قاچی ئەڵێی ...

(حەوتەنامەی سیروان، بەشی ڕەوڕەوە)

## ئەنجام:

پێشینەی ئەدەبی منداڵان لە جیهاندا دەگەڕێتەوە بۆ ٢٠٠ساڵ لەمەوبەر؛ ئەوکاتەی کە «هانس کریستییەن ئەندەرسۆن» لە وڵاتی دانیمارک ژیاوە. ئەندەرسۆن کە بە «باوکی ئەدەبی منداڵان» ناوی دەرکردووە، بە نووسینی «ئەفسانەی پەریلان»، جیهانێکی نوێی پێشکەش بە منداڵانی دنیا کرد (شەبانی، ١٣٨٤). مێژینەی ئەدەبی منداڵان لە وڵاتێکی وەک ئێران، ناگاتە حەفتا ساڵ. ئەم پێشینە بۆ ئێمەی کورد، ئەگەر کەمتر لەو ماوە نەبێت، زیاتر نییە. لەم بارەوە یەکەمین هەوڵ و تێکۆشان بۆ دانانی بەردی بناخەی ئەدەبی منداڵانی کورد (لە ئێران)، ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی١٣٢٠ی هەتاوی بەملاوە؛ کاتێک کە گۆڤاری کوردستان لە سەردەمی «کۆماری مەهاباد»ەوە دەرئەچوو. کەواتە دەکرێ بڵێین ئەم تێکۆشانە، هێشتا نوێباو و کاڵە و ڕەنگە وەک خودی ئەدەبەکە، ساوا بێت و پێویستی بە ناز و نەوازشی دایکانەی شاعیران و نووسەرانی ئەم بەستێنە هەیە. بۆیە پێویستە شێلگیرانە و بەرپرسیارانە ئاوڕی لێبدرێتەوە و سەرنجی بدرێت.

ئەم توێژینەوە کورتە، ئەو ڕاستییەمان بۆ دەرئەخات کە زۆرینەی ئەو هەوڵانەی کە تا ئێستا لە بەستێنی شیعری منداڵان بە ئەنجام گەیشتووە، نەیتوانیوە بەدەر لە ئارێشە و کەموکووڕی بێت. بە چاوخشاندنێکی خێرا بەو بەرهەمانەی کە لەبەر دەستی نووسەردا بوون، ئەو شتەمان بۆ روون ئەبێتەوە کە زۆرینەی شیعرەکان، نەک لە زمان و خولیاکانی منداڵەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵکوو لە ناخی حەز و ئاواتی گەورەکانەوە هەڵدەقوڵێت. لەم توێژینەوەدا نووسەر، نزیکەی پەنجا بەرهەمی بڵاوکراوەی (بە شێوەی کتێب و گۆڤار) لێکداوەتەوە؛ بەڵام بە داخەوە زۆربەی هەرە زۆریان بێبەهرە بوون لە ڕەگەزی خەیاڵ و فانتازیای تافی منداڵی. کەچی بە پێچەوانەوە بەزۆری یا پڕیەتی لە هێما و کینایە، یان لێوانلێو بوون لە ئامۆژگاری ڕاستەوخۆ و هەروا دوور بوون لە جیهانی منداڵان.

لێرەدا پێویستە ئاوڕێکی جیددی بدرێتەوە لەم ژانرە و بە نیسبەت منالانی ئەم ناوە بەرپرسیارانەتر هەنگاو هەڵبگیرێت؛ چوونکە بە هۆی نەبوونی ناوەندێک یاخود سەنتەرێکی لێکۆڵینەوە لەمەڕ ئەدەبی منداڵ، ڕەنگە جەستەی تازە لەدایکبووی تووشی نسکۆ و هەڵەنگوتن بکات و ئەزموونەکان بە کورت و کوێری و نەزۆکی بهێڵێتەوە. ئەم پەتایە وا دەکات، هەر نووسەر-شاعیرێک لە ئاستی خۆیەوە و بێخەبەر لە کەسانی تر، بەرهەمەکەی بڵاو بکاتەوە و ئاگای لە بیر و بۆچوونی ڕەخنەگرانەی خوێنەر نەبێت. هەر بۆیە لێرەدا ئەم پێشنیارە دەهێنمە ئاراوە کە لایەنگران و نووسەرانی ئەم بەستێنە، هەستن بە دەرکردنی گۆڤارێکی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی منداڵان بە دیدێکی زانستییانە و ڕەخنەگرانەوە.

چونکە ئەگەر بێت و دەست لە منداڵان بەربدەین، کەسانی دیکە دەستیان دەگرن و بە هەوای خۆیان بەرەولای خۆیان دەیانبەن. ئەمەش داهاتووی منداڵانی نەتەوەکەمان مژاوی و نادیار و بێئاسۆ دەکات.

# لەبارەی ئەدەبی منداڵانەوە

حەمەساڵح فەرهادی*

**کورتە:**

ئەدەبی منداڵان بەشێکی گرنگی ئەدەبی هەر نەتەوەیەکە و چەند لقی لێدەبێتەوە. ئەدەبی منداڵانی کورد زیاتر لە ٣٠٠ ساڵە هاتووەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، بەڵام تاکوو بیستەکانی سەدەی بیستەمی زایینی گەشەیەکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەبینیبوو.

چیرۆک وەک لقێکی ئەدەبی منالان، بەو چیرۆکە فۆلکلۆرییانە دەستی پێکردووە کە دەماودەم گێڕدراونەتەوەو مێژووی سەرهەڵدانیان بۆ سەردەمانێکی زوو دەگەڕێتەوە و نەوە لە دوای نەوە بەرەو زیادبوون چووەو لەوانەشە بەشێکی باشیشی لەناو چووبێت. چیرۆکەکانی منداڵان دابەشی سەر چەند جۆرێکی سەرەکی دەبن:

١- چیرۆکی فۆلکلۆری ٢- چیرۆکی ئاسایی ٣- چیرۆکی بەسیناریۆ کراو ٤- چیرۆکی شانۆیی

٥- زانستە چیرۆک ٦- چیرۆکە شیعر ٧- چیرۆکی وەرگێڕدراو.

چیرۆکی منالانیش لە کوردستاندا چ لە ڕووی فۆرم و چ لە باری ناوەرۆکەوەخاوەن هەندێ تابەتمەندیەکن.

لقێکی تری ئەدەبی منالان، شیعرە کە شیعرە فۆلکلۆرییەکانی تایبەت بە منداڵ، بنچینەی شیعری منداڵانن. هەروەها شیعری فێر کردن و ئاسایی، وەرگێڕدراو ... . شاعیرە کوردە پێشەنگەکانی بواری منداڵان، لە سەرەتاوە کاریگەری ئەدەبی منداڵانی تورکی، عەرەبییان پێوەدیار بوو و سوودیان لە ئەزموونی شاعیرە پێشەنگەکانی ئەوان وەرگرتووە. دەتوانین بڵێین ئێستای شیعری منداڵان، چ لە ڕووی چەندایەتی و چ لە ڕووی چۆنایەتییەوە، مایەی دڵخۆشییە. ئێستاکە دەیان شاعیری بواری منداڵانمان هەیە کە توانیویانە خۆیان بە منداڵان ئاشنا بکەن، بە گەرموگوڕییەوە شیعرەکانیان بڵاوبکەنەوە. کە قوتابخانە فەرمییەکانی دەوڵەت و گۆڤارە کوردییەکان ڕۆڵیان هەبووە لە هاندان، پێشخستنی ئەدەبی منداڵاندا.

**وشە سەرەکییەکان:** ئەدەبی منالان، چیرۆکی منداڵان، شیعری منداڵان

---

* سەرنووسەری گۆڤاری «هەنگ»ی منداڵان.

**دەستپێک:**

منداڵان توێژێکی کاریگەر و ناسکی کۆمەڵن. هوشیاری هەر نەتەوەیەک بەڕادەی گرنگیدانیان بە منداڵ دەردەکەوێت؛ چونکە ئایندەی هەر وڵاتێک بەندە بە چۆنیەتی گرنگیدانیان بە منداڵ. ئەدەبی منداڵانیش بەشێکی گرنگی ئەدەبی هەر نەتەوەیەکە و ڕێنیشاندەری منداڵە بۆ ڕێگای ڕاست، سەرفرازی، پێگەیاندنی کەسایەتی و هوشیاربوونی. ئەدەبی منداڵان، وەکوو هەر بەشێکی دیکەی ئەدەب، پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زانستی هەیە، بۆ ئەوەی ڕووە گەشە ڕاستەقینەکەی زیاتر ڕوون بێتەوەو کەموکورتییەکانیشی دەستنیشان بکرێ.

ئەم کورتە بابەتە، کە بە ناونیشانی «لەبارەی ئەدەبی منداڵانەوە»یە، هەوڵێکە بۆ تیشک خستنە سەر ئەم ئەدەبەو هەنگاوێکە بۆ ناساندنی بە خوێنەرو خەمخۆرانی بواری منداڵان. بەهیواین سوودێکی هەبێت و کەلێنێک پڕبکاتەوە.

**لەبارەی ئەدەبی منداڵانەوە:**

**سەرەتای دەستپێکردنی نووسینی کوردی بۆ منداڵ:**

ئەگەر بمانەوێت باسی سەرەتای دەستپێکردنی نووسینی کوردی بکەین بۆ منداڵ، دەبێ بگەڕێینەوە بۆ ٣٠٠ ساڵێک لەمەوبەر کە ئەحمەدی خانی (١٦٥٠-١٧٠٦) فەرهەنگێکی تایبەتی بۆ منداڵان داناوە، ئەویش فەرهەنگی «نەوبەهارا بچووکان»ە.

ئەم فەرهەنگە «عەرەبی - کوردی»یە و بە شیعر، بە زاراوەی کرمانجی ژووروو نووسراوە. خانی لە سەرەتای فەرهەنگەکەدا مەبەستی دانانی بەرهەمەکەی ڕوون کردووەتەوە کە منداڵی کورد پێی فێری زمانی عەرەبی ببێت، هەروەکوو خۆی دەڵێ:

ژ پاش حەمدو سەلاواتان
ئەڤ چەند کەلیمەنە ژ لوغاتان
ڤێک ئێخستن ئەحمەدی خانی
ناڤی «نەوبەهارا بچووکان» لێ دانی
نە ژ بۆ ساحیبێ ڕەواجان
بەڵکە ژ بۆ بچووکێت کرمانجان

(ئامێدی، ١٩٧٩: ١٠-١١)

دوای نزیکەی ١٠٠ ساڵ بەسەر دانانی ئەم فەرهەنگەدا، ئەمجارەیان «شێخ مارفی نۆدێیی» (١٧٥٢-١٨٣٧ز) دووهەمین فەرهەنگی تایبەت بە منداڵانی نووسی، کە ئەویش هەر فەرهەنگێکی «عەرەبی-کوردی»یە، بەڵام بەشێوازی کرمانجی خواروو.

**بەشی دووەم- ئەدەبی منداڵان**

شێخ مارف فەرهەنگەکەی بەناوی «ئەحمەدی»یەوە ناو نا و مەبەستیشی لەدانانی ئەم فەرهەنگە ئەوەبوو کە کاک ئەحمەدی کوڕی بەتایبەتی و منداڵانی کوردستان بەگشتی، بەهۆی ئەم فەرهەنگەوە فێری زمانی عەرەبی ببن.

شێخ مارف بەم جۆرە دەست بە ئەحمەدی دەکات:

«راس» سەرە، «عین» چاوە
«بدن» قاڵب، «اسم» ناوە
«انف» لووتە، «حاجب» برۆ
«فخذ» ڕانە، «رکبە» ئەژنۆ (دزەیی، ١٩٨٥: ٥٠)

ئێمە ئەم دوو فەرهەنگەمان بە سەرەتای دەست پێکردنی نووسین بۆ منداڵی کورد هەژمار کرد، لەبەر ئەوەی نیوەی وشە و زاراوەکان کوردین، لە بنەڕەتەوەش بۆ منداڵی کورد نووسراون؛ دەنا لە ڕووی زانستییەوە دەکرێ بڵێین هەردوو بەرهەم زیاتر دەچنە ڕیزی کتێبی عەرەبی، چونکە:

١- فەرهەنگەکان عەرەبی- کوردین، نەک کوردی- عەرەبی،
٢- مەبەست لە دانانیان فێرکردنی زمانی عەرەبییە.

**بەهاکان و شوێنیان لە ئەدەبی منداڵاندا:**

ئامانجی ئەدەبی منداڵان پێگەیاندنی منداڵە لە هەموو ڕوویەکەوە، بۆ ئەوەی لە ئایندەدا ببێتە ئەندامێکی سوودبەخشی کۆمەڵ؛ بتوانێت بەپێی توانا بەشداری لە پێش خستن، ئاوەدان کردنەوەی وڵاتەکەیدا بکات. بۆ ئەم مەبەستە کۆمەڵێک بەها هەن، لە بابەتەکانی ئەدەبی منداڵاندا بەزەقی هەستیان پێدەکرێت و بوونەتە بەشێکی گرنگی ناوەڕۆکی بابەتەکان.

دەتوانین ئەو بەهایانەی کە لە ئەدەب و ڕۆژنامەنووسی منداڵاندا گرنگییان پێدراوە و ڕۆڵیان لە پەروەردەکردنی منداڵدا بینیوە، دابەشی سەر چەند کۆمەڵەیەک بکەین، هەر کۆمەڵەیەکیش چەند لق، بەشی جیاجیا و هاوشێوەی لێ دەبێتەوە.

بەگشتی دەتوانین کۆمەڵە بەهاکان بەم شێوەیە پۆلین بکەین:

١- کۆمەڵەی بەها زانستییەکان.
٢- کۆمەڵەی بەها ئاکارییەکان.
٣- کۆمەڵە بەهای تەواوکەری کەسایەتی.
٤- کۆمەڵەی بەها کۆمەڵایەتییەکان.
٥- کۆمەڵەی بەها نیشتمانی، نەتەوەییەکان.
٦- کۆمەڵەی بەهای یاری، خۆخەریک‌کردن.
٧-کۆمەڵەی بەها جەستەییەکان.

٨-کۆمەڵەی بەهای کاری ئابووری (فەرهادی، ٢٠٠٢: ٣١-٣٧).

پێڕەو کردنی ئەو بەهایانە وا لە منداڵ دەکات کە لە ژیانی ڕۆژانەیدا بەپێی سیستەمێکی باش و دیاریکراو هەڵس‌وکەوت بکات، چونکە: «هەموو تاکێک پێویستی بە سیستەمێکی بەهادار هەیە، بۆ ئەوەی ببێتە ڕابەر بۆ ڕەفتارو چالاکییەکانی. بەپێچەوانەی ئەمە، نەبوونی سیستەمێکی بەهادار، مرۆڤ بەرەو سەر لێشێوان دەبات» (سلێمان، ١٩٧٥).

## چیرۆکی منداڵان:

ئەدەبی منداڵان بەشێوەیەکی گشتی، چیرۆک بەشێوەیەکی تایبەتی بە مێژووی دایکایەتییەوە بەندەو لە هەموو نەتەوەکانی جیهاندا بەڕێگای دایکانەوە دەماودەم هەزاران چیرۆک و سەربردەی خۆش گێڕدراوەتەوە. کە باسی چیرۆکی منداڵانیش بکەین بە زمانی کوردی، پێویستە ئاوڕێک لە چیرۆکی کوردی بە شێوەیەکی گشتی بدەینەوە، کە زۆربەی توێژەران چیرۆکی «لە خەوما»ی «جەمیل سائیب» بە سەرەتای چیرۆکی کوردی دادەنێن کە بەشی یەکەمی لە ڕۆژی ١٩٢٥/٧/١ لە ڕۆژنامەی «ژیانەوە» بڵاوکراوەتەوە[١].

چیرۆکی منداڵان بەو چیرۆکە فۆلکلۆرییانە دەستی پێکردووە کە دەماودەم گێڕدراونەتەوەو مێژووی سەرهەڵدانیان بۆ سەردەمانێکی زوو دەگەڕێتەوەو نەوە لە دوای نەوە بەرەو زیادبوون چووەو لەوانەشە بەشێکی باشیشی لەناو چووبێت.

بەشێوەیەکی گشتی ناوەڕۆکی چیرۆکە فۆلکلۆرییەکانی تایبەت بە منداڵان، یاخود چیرۆکی گوێ ئاگردان، زیاتر بەلای ئەم لایەنانەوە چووە:

١- ئەفسانەو خورافات،

٢- دێو و خێو و جنۆکە،

٣- ئازایەتی لەڕادەبەدەر،

٤- شتی سەیر و سەرسوڕ هێنەر.

بەڵام بۆ چیرۆکی نووسراوی منداڵان، دەتوانین بڵێین تەمەنێکی باشی هەیە، «فوئادی تەمۆ» لەساڵی ١٩١٣دا چیرۆکێکی منداڵانی بڵاوکردووەتەوە.[٢]

دوای ئەمە "حوسێن حوزنی موکریانی" چیرۆکی «مەڕۆکە و بزنۆکە»ی لەساڵی ١٩٢٦دا بڵاو کردوە و دواتریش «چیرۆکی کەڵەباب»ی بڵاوکردەوە.

لە سەردەمی گۆڤاری «گەلاوێژ»دا (١٩٣٩-١٩٤٩) چیرۆکی کوردی بەگشتی، بەپێی ئەو سەردەمە، پێشکەوتنێکی باشی بەخۆیەوە بینی، هەرچەندە بەشی چیرۆکی منداڵان لەو گۆڤارەدا وەکوو چیرۆکی دیکە

---

[١] - ئەم چیرۆکە ١٨ بەشی لەڕۆژنامەی ژیانەوەو ٥ بەشیشی لە ڕۆژنامەی ژیاندا بڵاوکراوەتەوە. لە بەشی دواییدا، کە لە ژمارە ٢٦ی ڕۆژی ١٩٢٦/٧/٢٩دا دەرچووە، نووسراوە «ماویەتی»، بەڵام دواتر هیچ بەشی دیکەی بەدوادا نەهاتووە.

[٢] - پرۆفیسۆر دوکتۆر شوکریە ڕەسووڵ ئەو زانیارییەی پێدام، بێ ئەوەی باسی ناوی چیرۆکەکە و شوێنی چاپکردنی بکات.

نەبوو، بەڵام ناوەبەناوە ژمارەکانی گۆڤاری گەلاوێژ ئاوڕیان لە چیرۆکی منداڵانیش داوەتەوە. چیرۆکەکانی منداڵان لە گۆڤاری گەلاوێژدا دوو جۆرن: چیرۆکی خۆماڵی، چیرۆکی وەرگێڕدراوە.

دوای حوسێن حوزنی موکریانی (١٨٩٠-١٩٤٧ز) دوو ناوی گەشی دیکەی چیرۆکی منداڵان خۆمان پێ ئاشنا دەکەن، ئەوانیش «شاکر فەتاح» و «نەجمەدین مەلا»ن.

یەکەمین گۆڤاری منداڵانیش -کە گۆڤاری «گرۆگاڵی منداڵانی کورد»ە و ساڵی ١٩٤٦ لە مەهاباد دەرچووە و ٣ ژمارەی لێ بلاوکراوەتەوە- چەند چیرۆکێکی خۆماڵی و وەرگێڕدراوی تێدا بلاوکراوەتەوە کە بەم جۆرەن:

ژمارە ١: ئازاد کێهەیە؟ ل. ب.

ژمارە ٢:

١- دادگای حەیوانات، چیرۆکی لاڤۆنتین. ق. م.

٢- ئازاد و حەپسی، چیرۆکی تاگوور. محەمەد عەتری گلۆلانی.

٣- کوڕە شوانی ڕەشید. م. ل. قزلجی.

ژمارە ٣: دزی ئەمین. حوسێن فەقێ زادە (هیمداد حوسەین، ٢٠٠٢).

دوای ئەمە کاروانی چیرۆکی منداڵان لە کوردستاندا، هەوراز و نشێوی دیوە، بەڵام دەتوانین بڵێین بە گشتی پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە و ئێستا کتێبخانەی منداڵان ژمارەیەکی باشی چیرۆکی منداڵانی بەخۆیەوە گرتووە.

**جۆرەکانی چیرۆکی منداڵان:**

دەتوانین چیرۆکەکانی منداڵان دابەشی سەر چەند جۆرێکی سەرەکی بکەین:

١- چیرۆکی فۆلکلۆری،

٢- چیرۆکی ئاسایی،

٣- چیرۆکی بەسیناریۆ کراو،

٤- چیرۆکی شانۆیی،

٥- زانستە چیرۆک،

٦- چیرۆکە شیعر،

٧- چیرۆکی وەرگێڕدراو.

**ناوەڕۆک و کەسایەتییەکانی چیرۆکی منداڵان:**

لەبارەی نووسین بۆ منداڵ بەشێوەیەکی گشتی، بە چیرۆکی منداڵانیشەوە، هەندێک خاڵ هەن، وا باشە نووسەر لە نزیکەوە ئاگاداریان بێت، لەمانە:

١- شارەزاییەکی تاڕادەیەک باش لە دەروونزانی منداڵ.

٢- زمانپاراوی، ئەمەش بە گشتی خۆی لە سێ خاڵی سەرەکیدا دەبینێتەوە:

٢-١- وشەکان لە فەرهەنگی منداڵەوە هەڵقولابن، نامۆنەبن بۆی.

٢-٢- ئەو ڕێنووسە بە کار بهێنێت کە لە قوتابخانەکاندا منداڵ پێی دەخوێنێت، چونکە پێچەوانەی ئەمە سەر لە منداڵ دەشێوێنێ.

٢-٣- ئەوەندەی بکرێ هەڵەی زمانەوانی، چاپەمەنیی کەم بێت.

٣- دەستنیشان کردنی قۆناغی تەمەنی ئەو منداڵەی کە نووسینەکەی بۆ دەنووسێت.

٤- ڕەچاو کردنی ئەو کۆمەڵە بەهایانەی کە پێشتر بە کورتی دەستنیشان کران.

٥- دوور کەوتنەوە لە ئامۆژگاری ڕاستەوخۆ و فەرمان، نەهی، بەڵکو پێویستە منداڵ کە دەیخوێنێتەوە، خۆی هەست بە مەبەستی نووسینەکە بکات، دەرسی لێ وەربگرێت.

٦- دوور کەوتنەوە لە سەپاندنی ئایدۆلۆژیایەکی دیاری کراوی سیاسی بەسەر منداڵدا.

٧- پاراستنی دابونەریتە ڕەسەنەکانی کۆمەڵگا.

٨- سووکایەتی نەکردن بە بەها پیرۆزەکانی کۆمەڵگا.

٩- شارەزاییەکی تا ڕادەیەک باش لە کەلتوور و مێژوو و فۆلکلۆری نەتەوەکەی، بۆ ئەوەی لەکاتی نووسیندا سوودیان لێ وەربگرێت.

سەبارەت بە ناوەڕۆکی چیرۆکە چاپکراوەکانی منداڵان لە کوردستاندا و جۆری کەسایەتییەکانیان، هەندێک خاڵ هەن بەزەقی هەستیان پێ دەکرێت، لەمانە:

١- زۆربەی چیرۆکەکان بۆ منداڵی تەمەن سەرووی ١٠ساڵ نووسراون.

٢- زۆربەی کتێبە چاپکراوەکانی تایبەت بە چیرۆکی منداڵان، کۆمەڵە چیرۆکی کورتن، چیرۆکی درێژ و نۆڤلێت و ڕۆمان کەمتر بەرچاو دەکەون.

٣- کتێبەکان، بەتایبەتی ئەوانەی نووسەر لەسەر ئەرکی خۆیان چاپی دەکەن، زیاتر بەرگیان ڕەنگاوڕەنگە، بەڵام وێنەکانی ناوەوەیان ڕەش-سپین، بەڵام ئەو کتێبانەی کە دەزگا ڕۆشنبیری و چاپەمەنییەکان چاپی دەکەن، زۆربەیان هەموو وێنەکانیان ڕەنگاوڕەنگن.

٤- چیرۆکە شیعری چاپکراو کەمە، چیرۆکە شیعری «شێری ساختە»ی «کاکەی فەللاح»، کە ساڵی ١٩٦٧ز لە سلێمانی چاپکراوەو هەندێک چیرۆکە شیعری ئاییینی کە لە ساڵانی نەوەدەکانی سەدەی ڕابردووەوە تاکوو ئێستا چاپکراون، چەند نموونەیەکی کەمن لە چیرۆکە شیعر.

٥- بەگشتی گرنگی بە بەهاکان دراوە.

٦- زمانی چیرۆکەکان بەگشتی تاڕادەیەک پاراون.

٧- چیرۆکەکان بەشێکیان خۆماڵی، بەشێکیشیان وەرگێڕدراون، چیرۆکە وەرگێڕدراوەکان زیاتر لە زمانی عەرەبی، فارسی، ئینگلیزییەوەن، هی زمانەکانی دیکە کەمترن.

٨- دیاردە سروشتییەکانی وەکوو: خۆر، مانگ، ئەستێرە، هەور، باران، پەلکەزێڕینە، کانی و ڕووبار بەزەقی هەستیان پێ دەکرێت.

٩- پیشە بەناوبانگەکانی کوردەواری، وەکوو: جووتیاری، کرێکاری، شوانی، مەڕو ماڵات بەخێوکردن... لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی منداڵاندا دیارن.

١٠- «زانستەچیرۆک» تەمەنی لە تەمەنی چیرۆکی ئاسایی کەمترە و زۆر لە مێژ نییە هاتووەتە ناو چیرۆکی منداڵانەوە. چیرۆکنووس «محەمەد ڕەحیم ڕەمەزان» لەم ڕووەوە جێ پەنجەی دیارە و یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی زانستی بەناوی «دە چڵە نێرگز» لە نەوەدەکانی سەدەی ڕابردوودا بڵاوکردەوە.

١١- کورد سامانێکی لەبن نەهاتووی فۆلکلۆری هەیە، زۆر جار چیرۆکنووسان سوودیان لە فۆلکلۆر وەرگرتووە و لە چیرۆکەکانیاندا بەرجەستەیان کردووە.

١٢- گیان لەبەران بە گشتی ڕۆڵی بەرچاویان لە چیرۆکی منداڵاندا هەیە، بەتایبەتی: ڕێوی، گورگ، شێر، کەروێشک، کەڵەشێر، بەرخ، کاریلە، چۆلەکە، پەپوولە، بولبول، مێرووله، هەنگ، تاووس و هی دیکەش.

لە زۆربەی چیرۆکەکانیشدا کە باسی گیانەوەرێک کراوە، سیفەتە باوەکەی ئەو گیانەوەرە نیشان دراوە، وەکوو:

گورگ: دڕندەیی

ڕێوی: فێڵبازی

سەگ: بەوەفایی

پشیلە: سپڵەیی

مێرووله: کۆڵنەدان

هەنگ: کارکردن

تاووس: لە خۆبایی بوون

لە خشتەی ژمارە ١دا ڕێژەی گیانەوەران لە چیرۆکە خۆماڵییەکانی منداڵان و لە خشتەی ژمارە ٢دا ڕێژەی گیانەوەران لە چیرۆکە وەرگێڕدراوەکانی منداڵاندا دیاریکراوە. بۆ ئەم مەبەستەش چیرۆکەکان بە شێوەیەکی هەڕەمەکی هەڵبژێردراون.

گەر بەوردی باسی چیرۆکەکانی منداڵان بکەین، ناوی دەیان چیرۆکنووسی بە توانامان بەرچاو دەکەوێت، بەڵام کەمی دەرفەت بواری ئەمە نادات تاکو ئاماژە بەناوی خۆیان، چیرۆکەکانیان بکەین، تیشکێک بخەینە سەر بەرهەمەکانیان.

پێویستە ئەوەش لە یاد نەکەین کە زۆربەی چیرۆکە چاپکراوەکان بە خامە و فڵچە و ڕەنگی هونەرمەندە نیگارکێشەکانەوە جوانتر و سەرنجڕاکێشتر بوون، هونەرمەندەکان بوونەتە بەشێک لە بەرهەمەکان.

خشتەی ژمارە ١:

ڕێژەی گیانەوەران لە چیرۆکە خۆماڵییەکانی منداڵاندا[1]

---

[1] بۆ ئەم مەبەستە بەشێوەیەکی هەڕەمەکی ٧ کتێبی چیرۆکی خۆماڵی و ٤ کتێبی چیرۆکی وەرگێڕدراومان هەڵبژارد.

| ناوی کتێب | ناوی نووسەر | ژمارەی چیرۆکەکانی | ئەوانەی باسی گیانەوەران دەکەن |
|---|---|---|---|
| پەپوولە | جەزا عەلی ئەمین | ١٣ | ٧ |
| گوڵ، هەنگ | نووری سەعید قادر | ٨ | ٧ |
| خۆشەویستیی نیشتمان | حەمەسەعید حەمەکەریم | ١٧ | ١٠ |
| زێڕین، کاڵێ | جەمال نووری | ٦ | ٥ |
| کراشم دڕاوچم پێ نەبڕا | عومەر پەتی | ٤ | ٤ |
| دڵ لەگوڵ ناسکترە | عومەر عەبدولڕەحیم | ٢ | ٢ |
| ڕەگ | ئازاد مەحموود مستەفا | ٥ | - |
| هەمووی | | ٥٥ | ٣٥ |

ڕێژەی گیانلەبەران ٦٣.٥%

خشتەی ژمارە ٢:

ڕێژەی گیانلەبەران لە چیرۆکە وەرگێڕدراوەکاندا

| ناوی کتێب | ناوی وەرگێڕەکەی | ژمارەی چیرۆکەکانی | ئەوانەی باسی گیانەوەران دەکەن |
|---|---|---|---|
| کۆمەڵەڕازێکی منداڵان | د. شوکریە ڕەسووڵ | ١٤ | ٥ |
| جەژنانە | د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ | ١٥ | ٧ |
| تۆپە زەردەکە | مەحموود زامدار | ٥ | ٢ |
| ڕێوی و قەلەڕەشکە | موحسین ئاوارە | ٢ | ٢ |
| هەمووی | | ٣٦ | ١٦ |

ڕێژەی گیانلەبەران ٤٤.٥%

**شیعری منداڵان:**

ئەگەر تەمەنی شیعری نووسراوی کوردی، کە تاکو ئێستا بەدەستمان کەوتووە، هەزار ساڵێک بێت، بەوەی کە «بابا تاهیری هەمەدانی» (٩٣٥-١٠١٠ز) شیعری بەشێوەی لوڕی گوتووە، ئەوا تەمەنی شیعری نووسراوی منداڵان، تەمەنێکی هێندە درێژ نییە. ئەمەش بەهیچ شێوەیەک نابێتە مایەی پرسیارو سەرسوڕمان؛ چونکە تەمەنی شیعری منداڵان لە نەتەوەکانی دراوسێی کوردیشدا، وەکوو شیعری ئاسایی ئەوان نییە.

## بەشی دووەم- ئەدەبی منداڵان

که باسی تەمەنی شیعری منداڵانیش بکەین، بمانەوێتساڵی بۆ دەستنیشان بکەین، ئەمە بۆ شیعری نووسراوە، دەنا شیعره فۆلکلۆرییەکانی تایبەت بەمنداڵ، تاڕادەیەکی باش تەمەنیان درێژە، بەڵام هەر دەماودەم ماونەتەوەو تاکوو ٥٠-٦٠ ساڵێک لەمەوبەر هەوڵی نووسینەوەیان بۆ نەدراوە.

### جۆرەکانی شیعری منداڵان:

هەر وەکوو پێشتریش ئاماژەمان پێدا، که شیعره فۆلکلۆرییەکانی تایبەت به منداڵ، بنچینەی شیعری منداڵانن، تەمەنیان له جۆرەکانی دیکەی شیعری منداڵان زیاترە، دوای ئەمیش شیعری فێر کردن (تعلیمی)، که مەبەست لەم جۆره شیعره، فێر کردنی زانستێکه بەهۆی شیعرەوە، ئینجا ئەو شیعرانەی که له زمانەکانی دیکەوە وەرگێڕدراونەته سەر زمانی کوردی، یان کاریگەری شیعریی زمانەکانی دیکەیان بەسەرەوە دیارە.

١- شیعری فۆلکلۆری:

ئەو شیعرو گۆرانی، لایلایه و لاواندنەوانه دەگرێتەوە که بۆ منداڵان گوتراون، یاخود منداڵ خۆیان بەکاریان هێناون. ئەم جۆره شیعره تەمەنی له جۆرەکانی دیکه درێژترە، خاوەنەکانیان دیار نین، دەماودەم ماونەتەوە و بوونەته بەشێکی گرنگی فۆلکلۆری کوردی.

ئەو شیعره فۆلکلۆرییانه هەندێکیان تەنیا بۆ «کوڕان» و هەندێکیان تەنیا بۆ «کچان» و هەندێکیشیان بۆ هەردوو ڕەگەز گوتراون، هەردوولا بەکاریان هێناوە.

ا- شیعری فۆلکلۆری تایبەت به کوڕان:

ئەو شیعرو گۆرانییانەن که تایبەتن به کوڕان، ئەوان لەیاری و دانیشتنەکانی خۆیاندا دەیڵێنەوە، وەکوو:

ئەمشەو شەوی بەراتێ
شەوی خێر و خەلاتێ
خوا دوو کوڕتان بداتێ
خاتوون سەر به زێڕێ
دەست له کەندووان بگێڕێ
بەشی منداڵان بنێرێ

ب- شیعری تایبەت به کچان:

ئەو شیعرو گۆرانییانەن که تایبەتن به کچان و ئەوان لەیاری و دانیشتنەکانی خۆیاندا دەیڵێنەوە، وەکوو:

هەی مشک، مشک، مشک
مشک هاته کولینێ
دەستی کرد به فنەفنێ

خواردی ماستی هەمینێ
هاجەر عەمرت نەمینێ
دەچمە گەڕیێ گۆرانی
دەکوژم نێری و بەرانی
سەرو پێچک لۆ کابانی
ڕیخەڵۆک لۆ شوانی
جەرگ و ناو لۆ مێوانی (کەریم شەریف، ١٩٧١: ١٠٤).

ج - شیعری هاوبەش:
ئەو شیعر و گۆرانییانەن کە کوڕ و کچ لەیاری و دانیشتنەکانی خۆیاندا دەیڵێنەوە، وەکوو:
هەلوور بەلوور تەکامە
زەرد و سۆر و شەمامە
عەیشێ ناوان
لە خۆشناوان
دەگری چاوان
چاوی بەگوو
پێم تێڕاچوو
هەڵگرە ئەتوو[١]

٢ - شیعری فێر کردن:
نووسەر و توێژەری بواری منداڵان، «مامۆستا حەمەکەریم هەورامی»، بەمجۆرە پێناسەی شیعری فێر کردن دەکات: «شیعری فێر کردن ئەو جۆرە هۆنراوەیە کە بۆ فێر کردنی شتێ بە کار هاتووە، نەک بۆ هەست و سۆز بزواندن و تاودانی ویژدان» (کەریم هەورامی، ٢٠٠٥: ١٥٨).

ئەم جۆرە شیعرە بە شێوەیەکی گشتی بۆ فێر کردنی بابەتێکی دیاریکراوی وەکوو زمان یان بیر و باوەڕ و پایەکانی ئایینی ئیسلام گوتراون؛ نموونەش لەم بارەیەوە کەم نییە، لەمانە «نەوبەهار»ی ئەحمەدی خانی (١٦٥٠-١٧٠٦)، «ئەحمەدی»ی شێخ مارفی نۆدێیی (١٧٥٢-١٨٣٦) بۆ فێرکردنی زمانی عەرەبی، «عەقیدەی کوردی»ی شێخ عەبدولسەمیع و «ڕۆڵە بزانی»ی مەلاخدری ڕواری (١٧٢١-١٧٨١) کە هەر دووکیان بۆ منداڵی کورد دانراون تاکوو پێی فێری بیر و باوەڕ و بنەماکانی ئایینی ئیسلام ببن.

---

[١] - ئەم گۆرانییە فۆلکلۆرییە لە جۆرە یارییەکی منداڵاندا دەگوترێ کە هەموویان قاچیان درێژدەکەن، ئینجا یەکێک دەیڵێ. ئەم شیعرو یارییە لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا باوە، بەڵام لە زۆر ناوچەدا جیاوازی لەنێوان بەیتەکاندا هەیە.

«ڕۆڵە بزانی»، واتە «ڕۆڵە بزانە» نامیلکەیەکە بەشێوەزاری هەورامی نووسراوە، سەرەتاکەی بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

ڕۆڵە بزانی، ڕۆڵە بزانی
فەرزەن وەرجەگشت مە بۆ بزانی
ئەسڵ و فەرع و دین چەنی ئەرکانی
چەنی ئەحکامان پەی موسڵمانی (کەریم هەورامی، ٢٠٠٥: ١٦٤)

٣- شیعری وەرگێڕدراو:

ئەم جۆرە شیعرە لە سەرەتای سەرهەڵدانی شیعری ئاسایی منداڵان لە کوردستاندا زیاتر باوی سەندبوو، چونکە نەتەوەکانی دراوسێی کورد، پێشی کورد شیعری منداڵانیان گوتبوو. شیعرەکانی ئەحمەد شەوقی، مارف ڕەسافی، محەمەد بەهجەت ئەسەری لە لایەن زێوەر و پیرەمێرد و شاعیرانی دیکەوە کراونەتە کوردی.

زێوەر (١٨٧٥-١٩٤٨) بەم جۆرە شیعری «الله»ی[1] کتێبی «القراءة العربیة»ی کوردووەتە کوردی:

خوا
وەرە بنوارە ئەو درەختە کەوا
لقی سەوزی سەمائەکا لە هەوا
هەر لە یەک دانە چۆن وەها زل بوو
چۆن بووە ئەم درەختە؟ چۆن بوو ڕوا (زێوەر، ٢٠٠٣: ٢٠٤)

٤- شیعری ئاسایی:

دەوڵەمەندترین جۆرەکانی شیعری منداڵانە و لەڕووی هونەریشەوە لە جۆرەکانی پێشوو پێشکەوتووترە و ئەم جۆرەیان بەشێوەیەکی گشتی بە شیعری منداڵان دادەنرێ. لە هەر بۆنەیەکدا کە باسی شیعری منداڵان بکرێ، مەبەست لەم جۆرە شیعرەیە، بۆیە لێرە بەدواوە کە ناوی شیعری منداڵان بێنین، مەبەستمان لەم جۆرە شیعرەیە.

---

[1] - شیعرەکە بە عەرەبی بەم جۆرە دەست پێدەکات:
انظر لتلک الشجرة
ذات الغصون النضرة
کیف نمت من حبة
و کیف لآرت شجرة؟

شیعری منداڵان بەم شێوە تازەیە، تەمەنی لە (٩٠) ساڵ تێپەڕیوە و تاکوو ئێستاش نەک هەر بەردەوامە، بەڵکوو لە پێشکەوتن دایەو بووەتە سامانێکی دەوڵەمەندی ئەدەبیمان؛ سەدان شیعری جوان و ناسکی بەخۆیەوە گرتووە، کە لەلایەن دەیان شاعیری کوردەوە نووسراون.

پێش ئەوەی زیاتر بچینە ناو شیعری منداڵان، باسی قۆناغەکانی بکەین، بە لەباری دەزانین کە بە کورتی باسی ناوەڕۆکی شیعری منداڵان بکەین.

دەتوانین ناوەڕۆکی شیعری منداڵان بەپێی ڕەگەز، بکەین بەسێ بەشی سەرەکی:

١- ئەو شیعرانەی تایبەتن بە کوڕان.

٢- ئەو شیعرانەی تایبەتن بە کچان.

٣- شیعری هاوبەش، کە بۆ هەردوو ڕەگەز گوتراون.

ئەگەر ئەو سێ بەشەش خورد بکەینەوە بۆ جۆرەکانی شیعر، دەتوانین بڵێین بەگشتی شیعری منداڵان زۆر جۆری لێ دەبێتەوە، کە ئێمە لێرەدا بۆ چەند جۆرێک پۆلینمان کردووە، وەکوو:

١- پەروەردەیی: وەکوو: قوتابخانە، مامۆستا، قوتابی، کتێب، پۆل، خوێندن، گۆڤار، وێنەکێشان، هی دیکەش.

٢- نەتەوەیی: وەکوو: کورد، کوردستان، نیشتمان، پێشمەرگە، شەهید، سەرکردە گەورەکان، ئازادی، شۆڕش... تاد.

٣- یاری کردن: تۆپانێ، بووکەشووشە، میکانۆ، کۆلارە، مۆزیک، شەڕە بەفر... تاد.

٤- گیان لەبەران: پشیلە، پەپوولە، بەرخ، کەڵەشێر، کاریلە، بولبول، پەڕەسێلکە، بۆق، سمۆرە، ماسی، هەنگ، کیسەڵ، کۆتر... تاد.

٥- دیاردە سروشتییەکان: باران، هەور، بروسکە، با، بەفربارین... تاد.

٦- دیمەنە دلڕفێنەکان: شاخ، تاڤگە، سەیرانگا، دارستان، باخچە، گوڵ، درەخت، بەهار، ڕووبارە... تاد.

٧- بۆنەکان: جەژن، نەورۆز، ڕۆژی جیهانیی منداڵان، مافەکانی منداڵ.

٨- کەس‌وکار: دایک، باوک، خوشک، برا، هاوڕێ، دراوسێ... تاد.

٩- زانست: داهێنانە زانستییەکان، تەکنۆلۆژیا بەهەموو بەشەکانییەوە... تاد.

بۆ گەڕان بەدوای یەکەمین شیعری تایبەت بە منداڵ، کە بەشێوەی نووسراو بۆ منداڵان نووسرابێت و تائێستا ساخ بووبێتەوە، شیعری «بنڤەلۆلۆ»ی شاعیر و ڕووناکبیری کورد «ئەمین عالی بەدرخان» (١٨٩٨-١٩٥١)ە.

ئەم پارچە شیعرە ساڵی ١٩١٩-١٩٢٠ لە ژمارە ٦ی گۆڤاری کوردستانی ئەستەنبۆڵدا بەناوێکی خواستراو بڵاو کراوەتەوە و بۆ جاری دوهەم بەناوی تەواوی شاعیر لە ژمارە ٥ی گۆڤاری «هاوار»دا لە ساڵی ١٩٣٠ بڵاوکراوەتەوە.

شیعرەکە لە چەند کۆپلەیەکی دوو بەیتی پێکهاتووە، کە بەم جۆرە دەست پێدەکات:

بنڤە خوەشییا دل و دوو چاڤان

دادێ ژتە هەر روو نەگەهبان

دازوو مەزن ببی بەدرخان

بنڤە کەزەبا من، بنڤەلۆلۆ (کەریم هەورامی، ٢٠٠٥: ١٦٧-١٦٨)

دوای ئەمە هەر لە ناوەڕاستی بیستەکانی سەدەی بیستەم، دەستەیەک شاعیری ڕووناکبیری وەکوو زێوەر و پیرەمێرد و شێخ نووری شێخسالح، گۆران، بێکەس، هی دیکەش بە بەرهەمە ناسک و سەرکەوتووەکانیان بناغەی شیعری منداڵانیان لە کوردستان دانا.

ئەو پێنج شاعیرە، بەڕاستی ڕابەری شیعری منداڵان بوون لە باشووری کوردستاندا و گەڕانەوە بۆ دیوانە چاپکراوەکانیان گەواهی ئەو ڕاستییە دەدەن، چەندین نموونەی سەرکەوتوومان بەرچاو دەکەوێت.

ئێستاش سرروودەکانی «زێوەر» گەرموگوڕی جارانیان هەر ماوە و بە بەردەوامی لەلایەن منداڵ و گەنجانی کوردستانەوە دەگوترێنەوە و هەر یەکەیان ئاوازی تایبەتی بۆ دانراوە. «وەتەنی من کوردستانە» و «ئەی کوردینە! ئەی مەردینە!» و «ئەی وەتەن! چەند خۆشەویستی» و «برایینە! لەخەو هەڵسن بەیانە» و «وا وەتەن خەملێوە وەک گوڵ» و «تا دەست لەمل هیوا نەکەم» و «چەند شیرینە لام دار و بەردی وەتەنم» نەمرییان بۆ خۆیان و زێوەری خاوەنیان تۆمار کردووە.

ئەمەو جگە لە چەندین هۆنراوەو گۆرانیی منداڵانەی وەکوو: «ئەی تۆپەکە فووتبۆڵەکە» و «بولبول بە نەغمەی دڵکێش، خۆشی» و «من منداڵی بچووکم» و «کیژۆڵەی کوردستانم» و «ئێمە منالین وەتەن ماڵمانە» و «ئەی بابە ئەی نووری نەزەر» و «یەک دوو سێ چوار ئاسانە» و چەندین شیعری دیکەش، شیعری کاریگەر و سەرکەوتووی منداڵانن (زێوەر، ٢٠٠٣: ٢٠٥-١٧١).

ئەگەر ئەو شاعیرانەی باسمان کردن، ڕابەری شیعری منداڵان بن لە کوردستاندا، ئەوا دوای ئەوان دەستەیەکی دیکەی شاعیری بە توانا، جڵەوی قافڵەیان گرتە دەست، سەردەمییانەتر خۆیان بە منداڵان ناساند، ئەوانیش "فەرەیدوون عەلی ئەمین" (١٩٣٣-١٩٩٢) و "ع. ع. شەونم"، "کاکەی فەللاح" (١٩٢٨-١٩٩٠)ن.

لێرەدا لەبەر کەمیی دەرفەت، ناتوانرێ وەکوو پێویست لە بەرهەمی شیعریی ئەم سێ شاعیرە بکۆڵینەوە، بەڵکوو تەنیا ئاماژە بە بەرهەمە چاپکراوەکانیان دەکەین، لەگەڵ خستنە بەرچاوی یەک لە بەرهەمەکانیان.

فەریدوون عەلی ئەمین (١٩٣٣-١٩٩٢) ئەم بەرهەمە چاپکراوانەی پێشکەش بە منداڵان کردووە[١]:

١- پاڵەوانی دواڕۆژ/ لەگەڵ "عومەر عەبدولڕەحیم" دایناوە، (١٩٥٨)

٢- پیاوە بچکۆلەکە (چیرۆک، شیعر) (١٩٧٢)

٣- کارژۆڵە (چیرۆک، شیعر) (١٩٧٢)

٤- سێو (چیرۆک) (١٩٧٢)

---

[١] - لێرەدا تەنیا ناوی ئەم بەرهەمانە دێنین کە تایبەتن بە منداڵ، دەنا هەر سێ شاعیر بەرهەمی دیکەشیان هەیە.

٥- پاکژی (چیرۆک) (١٩٧٢)
٦- جووجەڵەو بێچووە مراوی (چیرۆکی وەرگێڕدراو) (١٩٧٤)
٧- گەنمە شامی (چیرۆک) (١٩٧٥)
٨- لەژێر چەتری کارگێکدا (١٩٨١)
٩- پیرێکی ڕیش درێژ هەبوو (چیرۆک، شیعر) (١٩٨٥)

توێژەری بواری منداڵان "حەمەکەریم هەورامی"، لەبارەی شیعرەکانی "فەرەیدوون عەلی ئەمین"ەوە دەڵێ: «لە ڕوخسار و ناوەڕۆکدا، لە کورتبڕی، ساف و ڕەوانیدا، پوختە و لووسن؛ چونکە لەو شتانەوە دێن کە منداڵان حەزیان لێیە بیانزانن، ئەوەندە ڕەسەنن گەورەساڵان بەر لە زارۆکان ئارەزووی خوێندنەوە و بیستن و لەبەرکردنیان دەکەن؛ ئەوەندە ڕاست و ڕەوانن خۆیان دەخزانە ناو سنگی منداڵانەوە و جێی خۆیان دەکەنەوە» (کەریم هەورامی، ٢٠٠٥: ٢١٨).

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرەکانی فەرەیدوون، کە تێیدا پاکوخاوێنی لای منداڵ خۆشەویست دەکات، هانی دەدات هەمیشە پاکوخاوێن بێت:

ماڵەکەمان خاوێنە
پاکە وەکوو ئاوێنە
دایکم ئاوای ماڵیوە
ئەڵێی یەک پارچە زیوە
دیسان خۆشم خاوێنم
قاپ و شووشە ناشکێنم
من ژوور پیس ناکەمەوە
ناو ماڵ تێک نادەمەوە
ئەزانم کە میوان هات
حەز لەماڵی پاک ئەکات (گ: ئاوازی نەوبەهار، ٢٠٠١: ١٠٠)

"کاکەی فەللاح"یش (١٩٢٨-١٩٩٠) بەهۆی هەردوو کۆمەڵە شیعری «چرۆ» و «جگەر گۆشەکان» و چیرۆکە شیعری «شێری ساختە»وە، بووەتە یەکێک لە ئەستێرە بریقەدارەکانی شیعری منداڵان.

با لەم شیعرە کورت و ناسکەی کاکەی فەللاحدا ورد بینەوە کە بەناوی «حەفتانە»یە و بزانین چۆن شاعیر هانی منداڵانی داوە تاکو بخوێنن و کاتی زێڕینی خۆیان بە فیڕۆ نەدەن:

حەفتانە

شەممە: هەرچەن بخوێنم کەمە
یەکشەممە: خوێندن نادەم بەگەمە
دووشەممە: مەکتەب گوێ و چاو و دەمە

سێشەممە: خوێندەواری ڕێگەمە
چوارشەممە: ڕەوشتی جوان پیشەمە
پێنجشەممە: نەزانین هەور و تەمە
هەینی: تەمەڵ زۆر کوێرە زەینی (فەللاح، ١٩٧٨: ٨٣)

سەبارەت بە "مامۆستا عەلی عەبدوڵلا"ی ناسراو بە «ع. ع. شەونم»، کە ساڵی ١٩٢٥ لە هەڵەبجە لەدایک بووە و پاشان هاتووەتە سلێمانی، تا ئێستاش هەر لە سلێمانیدا دەژی، شیعرەکانی لە ناسکی، جوانی و ڕەوانیدا کەم وێنەن. ئەو بە وردی شارەزای دنیای منداڵان بووە و زانیویەتی منداڵ چی دەوێت. ئەوەتە خۆی لە دیدارێکدا کە زانیار سەردار فرگەیی لەگەڵیدا سازی کردووەو لە گۆڤاری «هەنگ»دا بڵاوکراوەتەوە، دەڵێ: «شیعری منداڵ لە هەموو حاڵەتێکدا گوزارشتە لە هەست و نەست؛ چوونکە لە هەست و نەست و بیری منداڵ دەدوێ. منداڵی ئەمڕۆ و دوێنێ هەریەکە» (گ: هەنگ، ٢٠٠٩: ١٥٧). هەروەها دەڵێ: «هەڵبەستی منداڵان بەپێی شێواز (اسلوب) پێویستە وشەکانی سادە بن، ڕستەکانی ڕەوان بن، تا منداڵ بتوانێت لەبەری بکات. پێویستە کێشەکەی کورت و ئاوازدار بێت، چونکە کێشی درێژ ئەبێتە هۆی هەناسە سواربوونی منداڵ، هەروەها ئەبێت هەر دێڕێ لە هەڵبەستەکە لەنگەری تایبەتی خۆی جیابێت، تا لە توانادا بێت ناوەڕۆک، مەبەستی هەڵبەست بەکەمترین دێڕ بدرێت بەدەستەوە» (ڕەشید فەتاح، ٢٠٠٩: ٢٢).

«ع. ع. شەونم» تاکو ئێستا ئەم بەرهەمانەی پێشکەش بە کتێبخانەی منداڵان کردووە:

١- جریوە (١) شیعر (١٩٦٦)
٢- جریوە (٢) شیعر (١٩٨٤)
٣- جریوە (٣) شیعر (١٩٩٨)
٤- سەلکە/ شیعر (٢٠٠١)
٥- مێرووڵەو مەل/ چیرۆک (٢٠٠٢)
٦- قەباڵەی ڕێوی/ چیرۆک (٢٠٠٣)
٧- سروودی نوێی قوتابیان/ شیعرو ئاواز (٢٠٠٣)
٨- سروودی کورد بۆ قوتابیان/ شیعر (٢٠٠٤)
٩- شاری خۆشەویست/ چیرۆکەشیعر (٢٠٠٨)

ئەمەش نموونەیەکە لە شیعرە ناسکەکانی ئەو شاعیرە، کە تێیدا سەرزەنشتی هاوڕێیەکی هاروهاج و لاساری خۆی دەکات، پێی دەڵێ هەتا بە خۆتدا نەچیتەوە و هەڵسوکەوتت ڕێک نەکەیت، من ئامادە نیم یاریت لەگەڵدا بکەم:

لاچۆ لاچۆ دەی برۆ
یاری ناکەم لەگەڵ تۆ
تۆ ئەڵێی شێت و هاری

نازانی چۆنە یاری
دار ئەکێشی بەسەرما
جل ئەدڕێنی لە بەرما
بە باز ئەچیتە سەر کۆڵ
فڕێ ئەدەی بەرد و خۆڵ
یا پاڵ ئەنێی لەناکاو
زامار ئەکەی دەموچاو
وەکوو من نیت بزێوی
فێری شەڕە جنێوی
هەتا وابی دەی بڕۆ
یاری ناکەم لەگەڵ تۆ (گ: ئاوازی نەوبەهار، ٢٠٠١: ٩٠)

کە باسی سەردەمی شیعریی ئەو سێ شاعیرەی پێشوو بکەین، دەبێ هەندێک شاعیری دیکەشمان لەیاد نەچێت کە درێژە پێدری سەردەمی ئەوانن و توانیویانە سەرکەوتووانە لە کارواندا بەردەوام بن. ئێمە لێرەدا ناتوانین بەدرێژی لەم ڕووەوە بدوێین، یەکەیەکەی ئەو شاعیرانە باس بکەین و بەرهەمەکانیان هەڵبسەنگێنین؛ بەڵکوو تەنیا بەکورتی باسی دوو لەم شاعیرانە دەکەین کە بەڕاستی شوێنی خۆیان لە ئەدەبی منداڵاندا کردووەتەوە، ئەوانیش هەردوو شاعیری دیار «لەتیف هەڵمەت»و «عوسمان هەورامی»ن.

لەتیف هەڵمەت تاکوو ئێستا، ئەوەی ئێمە لێی ئاگاداربین، ١٣ کتێب، نامیلکەی شیعر و چیرۆکی بۆ منداڵان چاپ کردووەو هەتا ئێستاش هەر بەردەوامە و ئێستا یەکێکە لەناوە هەرە دیارەکانی ئەدەبی منداڵان.

جێی خۆیەتی لێرەدا نموونەیەک لە شیعرەکانی لەتیف هەڵمەت بخەینە بەرچاو کە پیرەمێردێکی نەخوێندەواری لادێیی، چۆن داخی ئەوەی لە دڵە کاتی خۆی بواری بۆ نەڕەخساوە تاکوو فێری خوێندن و نووسین ببێت؛ بۆیە هانا بۆ مامۆستاکانی قوتابخانەی گوندەکەی دەبات، تاکوو فێری بکەن چۆن بنووسێ «کوردستان»:

پیرەمێردێ
چووە قوتابخانەی گوندێ
لە حەوشەکەدا ڕاوەستا
دەورەیان لێدا مامۆستا
ها خاڵەگیان
چیت گەرەکە.. ها خاڵەگیان
پیرەمێردی بەستەزمان
کە لاواز بووبوو وەک گۆچان

وتی توخوا مامۆستا گیان

فێرم ناکەی

چۆن بنووسم: **کوردستان** (هەڵمەت، ٢٠٠٥: ٥).

شایانی باسە تاکو ئێستا چەندین نووسەر لەبارەی لەتیف هەڵمەت و بەرهەمەکانییەوە شتیان نووسیوە و هەندێک لە شیعرەکانیشی بۆ چەند زمانێکی بیانی وەرگێڕدراون. نووسەری ئەم بابەتەش لە ٢٥لاپەڕەدا لێکۆڵینەوەیەکی لەبارەی ناوەڕۆکی شیعرەکانی ئەم شاعیرەوە بڵاو کردووەتەوە (فەرهادی، ٢٠٠٨: ٥٠-٢٩).

«عوسمان محەمەد هەورامی»ی شاعیریش، تاکوو ئێستا ٢٠ کتێبی بەچاپ گەیاندووە. لەمانە ١٣یان تایبەتن بە منداڵان. تاکوو ئێستاش لە چالاکییە ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەکانی بەردەوامە.

شیعرەکانی عوسمان هەورامی زۆربەیان بە نووسین کورتن، بەڵام بە ناوەڕۆک دەوڵەمەندن، وشەکانی مۆزیکی، لەسەر زار سووکن، شێوازێکی تایبەتیشی لە شیعری منداڵاندا هەیە.

عوسمان هەورامی لەم شیعرەدا وەک پەروەردەکارێک باسی قەڵەم دەکات، گرنگیی قەڵەم بۆ منداڵان ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ:

ئەم قەڵەمە

لابەری گشت دەردو خەمە

وشەی جوانم بۆ ئەنووسێ

پرسیاری باش

شتی پاکم لێ ئەپرسێ

هەموو ساتێ

وەڵامی ڕاستم ئەداتێ

وێنەی گەشم بۆ ئەکێشێ

بەم قەڵەمە

خۆشی، شادیم دێتە پێشێ

ئەم قەڵەمە

لوتکەی ڕووناکیی سەردەمە

چەندە بەدڵ هۆگری بم

هێشتاکەمە.. هێشتا کەمە (عوسمان هەورامی، ٢٠٠٩: ١٩).

**ئێستای شیعری منداڵان:**

دەتوانین بڵێین ئێستای شیعری منداڵان، چ لەڕووی چەندایەتییەوە و چ لەڕووی چۆنایەتییەوە، مایەی دڵخۆشییە، ئێستا کە دەیان شاعیری بواری منداڵانمان هەیە کە توانیویانە خۆیان بە منداڵان ئاشنا بکەن، بە گەرموگوڕییەوە شیعرەکانیان بڵاو بکەنەوە.

ئەوەی زیاتر ڕێگەی لەبەردەم شیعری منداڵاندا خۆش کردووە، ئەوەیە کە ژمارەیەکی بەرچاوی گۆڤاری منداڵان لە کوردستاندا هەیە و شاعیران دەتوانن بەرهەمەکانی خۆیانیان تێدا بڵاو بکەنەوە. سەرەڕای بوونی هەندێک دەزگا بۆ بڵاوکردنەوەی کتێبی منداڵان، هەروەها تا ڕادەیەک هوشیار بوونی کۆمەڵگا لە گرنگی پێدان بە منداڵ و بەهەند وەرگرتنی کێشەکانیان.

لێکۆڵینەوە لە ئێستای شیعری منداڵان، کارێکی هێندە ئاسان نییە و ڕەش‌کردنەوەی دەیان لاپەڕە و خۆ تەرخان کردنی پێ دەوێ، جگە لە نەبوونی ئەو پێوەندییە توندوتۆڵە لەنێوان بەشەکانی کوردستاندا و بە زەحمەت گەیشتنی چاپەمەنییەکانی هەر بەشێک بۆ بەشەکانی دیکە.

کە باسی ئێستای شیعری منداڵان بکەین، پێویستە ئاماژە بەمەش بدەین کە ئێستا لە کوردستانی ئێراندا دەستەیەکی باشی شاعیر و چیرۆکنووسی منداڵانمان هەیە، کە بە گوڕ و تینێکی زۆرەوە هەوڵی پێشخستنی ئەدەبی منداڵان دەدەن، بە بەردەوامی بابەتەکانیان بڵاودەکەنەوە.

کوردستانی ڕۆژهەڵات هەر لە کۆنەوە مەڵبەندی شیعر و ئەدەبیاتی ڕەسەنی کوردی بووە و تاکوو ئێستا چەندین کەڵە شاعیری پێگەیاندووە کە مێژووی ئەدەبی کوردی بە شانازییەوە ناویان دەهێنێ و بەرهەمەکانیان بڵاودەکاتەوە.

سەبارەت بە ئەدەبی منداڵانیش، کۆمەڵێک شاعیرو چیرۆکنووسی دەست ڕەنگین توانیویانە گەشە بە شیعرو چیرۆکی منداڵان بدەن، لەمانە تەنیا وەک نموونە: مستەفا ئێلخانی زادە و ئەمین گەردیگلانی، سەلاحی نەیساری، خالد ئەحمەدی، سیمینی چایچی، شیلان گەیلانی، لەیلا سیمایی، عەبدولڕەحمان فەهیمی و چەندی دیکەش.

پێویستە ئاماژە بەوەش بدەین کە ئێران یەکێکە لە وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکان، سەبارەت بەگرنگیدان بە ئەدەب، ڕۆشنبیری، ڕۆژنامەنووسیی منداڵان.

لێرەدا، کە زۆر بە کورتی باسی شیعری منداڵان دەکەین، جێی خۆیەتی نموونەیەک لە شیعری یەکێک لەو شاعیرانە بێنینەوە کە پێشتر ئاماژەمان پێ کردن، بۆ ئەم مەبەستەش شیعرێکی «خالد ئەحمەدی»ی ناسراو بە «هۆزان»مان هەڵبژارد.

هۆزان توانی بەناميلکە شیعری «هەلاوە مەلاوە» خۆی بە منداڵانی کوردستان، توێژەرانی ئەدەبی منداڵان بناسێنێ[١].

---

[١] - دوای دەرچوونی ئەم کۆمەڵە شیعرە بە ماوەیەک، نووسەری ئەم بابەتە لێکۆڵینەوەیەکی ١٣ لاپەڕەیی لەبارەی شیعرەکانی هۆزانەوە لە گۆڤاری نووسەری نوێ ژمارە ٤١ی نیسانی ٢٠٠٨دا بڵاوکردەوە.

**بەشی دووەم- ئەدەبی منداڵان**

هۆزان کە باسی کۆلارە دەکات بۆ منداڵ، دەزانێ منداڵ چەند حەزی لە دروست کردن و هەڵدانی کۆلارەیە، بۆیە زۆر ورد و جوان بەشیعرێکی بڕگە کورت باسی کۆلارە دەکات، دەڵێ:

بادێ، بادێ
کۆلارەکەم
بەهێزی با
وە حەواخەم
لە قاقەزەو
سووکە وەک کا
هەڵدەسووڕێ
بە ئەمری با

ئینجا بەردەوام دەبێت، دەڵێ:

تۆزێ بەنی
بۆشل دەکەم
ئەوانی دی
وەدوا دەخەم
کۆلارەکەم
دەڕواتە بان
تاکوو داگیر دەکا
ئاسمان (گ: هەنگ، ٢٠٠٧: ژ١٣٦).

## ئەنجام

١- ئەدەبی منداڵان بەشێکی گرنگی ئەدەبی هەر نەتەوەیەکەو چەند لقی لێ دەبێتەوە.

٢- ئەدەبی منداڵانی کورد زیاتر لە ٣٠٠ ساڵە هاتووەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە، بەڵام تاکو بیستەکانی سەدەی بیستەمی زایینی گەشەیەکی ئەوتۆی بەخۆیەوە نەبینیبوو.

٣- بەهاکان شوێنێکی دیاریان لە ئەدەبی منداڵاندا هەیە.

٤- شاعیرە پێشەنگەکانی بواری منداڵان، لە سەرەتاوە کاریگەری ئەدەبی منداڵانی تورکی، عەرەبییان پێوە دیار بوو و سوودیان لە ئەزموونی شاعیرە پێشەنگەکانی ئەوان وەرگرتووە.

٥- قوتابخانە فەرمییەکانی دەوڵەت ڕۆڵیان هەبووە لە هاندان و پێشخستنی ئەدەبی منداڵان.

٦- لایەنی پەروەردەیی، نەتەوەیی بەسەر شیعری منداڵاندا زاڵە، گیان لەبەرانیش شوێنێکی بەرچاویان لە ئەدەبی منداڵاندا هەیە، بەتایبەتی لە چیرۆکدا.

٧- گۆڤارە کوردییەکان تاڕادەیەک ڕۆڵیان لە بڵاو کردنەوەی ئەدەبی منداڵاندا هەبووە.

**پەراوێزو سەرچاوەکان:**


١- ئامێدی، سادق بەهائەدین (١٩٧٩) **نۆبەهارا سەیدایێ مەزن ئەحمەدێ خانی**، بەغدا، لە بڵاوکراوەکانی کۆڕی زانیاری کورد.

٢- دزەیی، عەلی فەتاح (١٩٨٥) **نەوبەهاری خانی، ئەحمەدی شێخ مارفی نۆدی**، هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری.

٣- فەرهادی، لەنجە حەمەساڵح (٢٠٠٢) **هەڵسەنگانی بەهاکانی ناو گۆڤارەکانی منداڵان دوای ڕاپەڕین،** باسی دەرچوون، بەسەرپەرشتی پرۆفیسۆری یاریدەدەر کەریم شەریف قەرەچەتانی (چاپ نەکراوە).

٤- سلێمان، میخائیل ودیع (١٩٧٥) **القیم والتطور الاجتماعی**، الکویت، المجلس الوطنی للثقافة والفنون والادب.

٥- حوسێن، هیمداد (٢٠٠٢) **گۆڤاری گڕوگاڵی منداڵانی کورد و سەرەتای ڕۆژنامەنووسیی پەروەردەیی،** هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.

٦- کەریم شەریف، محەمەد (١٩٧١) **فۆلکلۆری یارییەکانی کوردەواری**، کەرکووک، چاپخانەی شیمال.

٧- کەریم هەورامی، حەمە (٢٠٠٥) **ئەدەبی منداڵان-** بەشی یەکەم، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری کوردستان.

٨- زێوەر، مەحموود (٢٠٠٣) **دیوانی زەێوەر**، هەولێر ، لەبڵاوکراوەکانی دەزگای ئاراس.

٩- کاکەی فەللاح (١٩٧٨) **جگەرگۆشەکان**، بەغدا، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری، بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپخانەی (دار الحریە).

١٠- گۆڤاری هەنگ (٢٠٠٩) ژمارە ١٥٧، تشرینی یەکەم ل١١.

١١- فەتاح، محەمەدڕەشید (٢٠٠٩) **نموونەو لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی منداڵانی کورد**، هەولێر، چاپی دووەم، لە بڵاوکراوەکانی زنجیرە کتێبی منداڵان (٥٨)، چاپخانەی ڕۆشنبیری.

١٢- هەڵمەت، لەتیف (٢٠٠٥) **مناڵ، بووکەشووشە (شیعرو چیرۆک)** ، سلێمانی، چاپی دووەم.

١٣- فەرهادی، حەمەساڵح (٢٠٠٨) **لەتیف هەڵمەت، شیعری منداڵان**، گۆڤاری (نووسەری نوێ) ژمارە ٤٣، تشرینی یەکەمی.

١٤- عوسمان محەمەد هەورامی (٢٠٠٩) **ئاسۆی گەش**، سلێمانی، چاپخانەو ئۆفسێتی دیلان.

# ئاوڕدانەوەیەک لە پێکهاتەی «لایەلایە» کوردیەکان

عەلی مەحموودی [-]

**کورتە:**

لەوانەیە کۆنترین دیاردە لە وێژەی زارەکی منالاٌندا، «لایەلایە» بێ کە بە کەڵک وەرگرتن لە مووسیقای ناوەکی، خۆشەویستی دایک بە منالٌ گرێ دەدات. ئەم مووسیقا هاوبەشە ژنانەیە، دەنگی ئاشنای ژیان و ئەوینی مرۆڤە. جۆراوجۆری «لایەلایە»کانی کوردی، ئەم پرسیارە دێننە ئاراوە کە ئاخۆ پێکهاتە و ناوەڕۆکی لایەلایەکان، چ جیاوازیەکیان پێکەوە هەیە؟ لەم وتارەدا، هەوڵ دراوە تا پێکهاتە و کاردایی لایەلایەکانی زمانی کوردی، وێڕای پالپشتی بە زاراوەکانی کوردی سۆرانی بێنێتە بەر باس و لێکدانەوە. ڕەوتی توێژینەوە، ڕەوشتی ئیسنادی و کتێبخانەییە و لە سەر بنەمای شی کردنەوەی ناوەڕۆکە. سەرچاوەی ئەم کارەش، کتێبی«ژانەژین»ە؛ کە هۆیەکەی تێر و تەسەلی ئەم کتێبەیە لە چاو سەرچاوەکانی تر. تاوتوێ کردنەکان ئەمەمان بۆ دەردەخەن کە ڕیشەدار بوونی لایەلایەکان لە چەمکگەلی وەک سرووشت، ئایین و ڕێساکان، بۆتە هۆی مانەوە و گواستنەوەی ئەمان لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تر. کارداگەلێک وەک هێور بوونەوەی منالٌ و دایک، فێر کردنی زمان و وشەکان و گواستنەوەی زۆرێک لە مانا و چەمکەکان لە چوارچێوەی بایەخەکان، پێوەرە باوەڕ پێکراوەکان و ڕەوشتە باوەکانی کۆمەلاٌیەتی بە منالٌ، دەتوانن لە کاردایەکانی لایەلایەی کوردی بن. هەروەها لێکۆلینەوەکان بۆمان دەردەخەن کە هەلومەرجە مێژوویی، جوگرافیایی و کۆمەلاٌیەتیەکانی ژیانی کۆمەڵگەی کوردی بۆتە هۆی دابەش بوونی لایەلایەکان بە دوو بەشی سەرەکی لایەلایەی سرووشتی و دەسکرد، کە لە تەوەرەکانی حەماسی، کۆمەلاٌیەتی، ئایینی، سیاسی و بەرەنگاربوونەوە خۆیان دەبیننەوە.

**وشە سەرەکییەکان**: لایەلایە، کوردی، فۆلکلۆر، وێژەی منالاٌن، پێکهاتە، ناوەڕۆک.

---

[-] ماستەری زمان و ئەدەبی فارسی.

## پێشەکی

کەلتووری کوردی، وێرای مێژوویەکی بەربڵاو و جوگرافیایەکی چەن پارچە، چاندێکی دەوڵەمند و لە هەمان کاتیشدا دەست لێنەدراوە. ئەم وڵاتەی کوردان تێیدا نیشتەجێن بە هۆی دراوسێیەتی لەگەڵ گەلانی دیکە - کە هەرکامیان خاوەن کەلتووری تایبەتن- تێکەڵاویەکی یەکجار زۆری فەرهەنگی تێدا بەدی دەکرێ؛ هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوە کە دانانی سنوورێک لە نێوان ئەم فەرهەنگانەدا کارێکی ئەستەم و دژوار بێت.

فۆلکلۆر یان کەلەپوور، ڕوانگە، دەروونناسی و هزری خەڵکانە سەبارەت بە فەلسەفە، ئایین، زانست، ناوەند و بنکە کۆمەڵایەتیەکان و جێژن و بۆنەکان، هۆنراوەکان، ئاوازەکان، ئەفسانەکان و گشت هونەرە ڕەمەکیەکان لە خۆی دەگرێت (بیهقی، ١٣٥٦: ١٩؛ بە گوازتنەوە لە تاریخ ادبیات کودکان: ج١: ١٠).

فۆلکلۆری کوردی بە گشتی و لایەلایەکان بە تایبەتی، سامانێکی چڕوپڕ لە یادەوەری مێژوویی و نەستی بە کۆمەڵی گەلی کوردە. لە ناو وێژەی زارەکی و فەرهەنگی گەلدا، ئاوازەکان (ترانە) جێگە و پێگەیەکی گرینگیان هەیە. ئەم ئاوازانە -کە ناخی خەڵکی ئاسایی خوڵقاندوونی و پتەوی کردوون- هاوکات لەگەڵ فەرهەنگ، نەتەوە و زمانەکاندا خۆیان لەگەڵ بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکان و گۆڕانکاریەکان پەروەردە کردووە.

ڕەوانی و سادە و ساکاری ئاوازە ڕەمەکیەکان بە جۆرێکە کە پێویستی بە تێڕامانی قووڵ نییە و بە ئاسانی لێیان دەگەین. لەوانەشە کورتی ئاوازەکان، ئەم ڕاستییەمان بۆ شی بکەنەوە کە کۆمەڵگەی لادێیی، کاتی چەندە لەلا گرینگ بووە (ساداتاشکوری، ١٣٧٧: ٦٤). لە ناو ئاوازەکانیشدا، «لایەلایەکان» یەکێک لە سەرەتاییترین شێوازە ناسراوەکانی موسیقا و وێژەی منداڵان لە جیهاندان کە لەوانەیە تەمەنیان بە درێژایی مێژوو بێ؛ لەوکاتەوە کە یەکەمین دایک واتە حەوا بۆ منداڵەکانی خۆی هابیل و قابیل لایەلایەی چڕی.

## ڕەوتی لێکۆڵینەوە

ڕەوتی بەکارهاتوو لەم لێکۆڵینەوەدا ڕەوشتی ئیسنادی و کتێبخانەییە، کە لە فیشنووسی لە سەر لایەلایەکانی کوردی سۆرانی کەڵکوەرگیراوە. بە هۆی ئەمە کە تا ئێستا تەواوی لایلایەکانی کوردی کۆ نەکراوەتەوە و لە چاپ نەدراوە، بە ناچار بناغەی کارەکە لەسەر کتێبی «ژانەژین» دانراوە کە کۆی ٥٠ لای-لایەی کوردی لە خۆ دەگرێ. لەم لایلایانەدا، تەنانەت ٣٥ دانە بە زاراوەکانی سۆرانین. لەم ژمارانەشدا ٤ دانە دەسکردی شاعیرانی بە ناوبانگی کوردستانن. کەواتە ٣١ لایلایەی ئەم پەرتووکە هاتوونە بەر توێژینەوە و هەڵسەنگاندن. لەم لێکۆڵینەوەدا هەوڵ دراوە پێکهاتەی ئەدەبی و ناوەڕۆکی لایلایەکان هەروەها هێماکانی بنەڕەتی بەکارهاتوو لە ناو لایەلایەکان زەق بکرێتەوە پێوەندی ئەوان لەگەڵ ناوچەکان و شێوەی ژیان و بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکانی کوردی بە کورتی باسی لێوە بکرێ.

## لایلایە چییە؟

وشەی «لایلایە» لە زمانی کوردیدا بە واتای گۆرانی دەخەوکردنی زارۆک دەوترێ (هەژار، ١٣٦٩: ٧٥٦). ئەم وشەیە لە بنەڕەتدا وشەیەکی «ناودەنگە» کە خۆی لە خۆیدا مانایەکی نییە؛ بەڵام بەم ئاواز و دەنگە

تایبەتیانە دەوترێ کە دایک یان کەسانی تر وەک «دایە» بە شێوازێکی نەرم ونیان بۆ منالّی تەمەن ژێر پێنج ساڵ دەیچڕن تا کۆرپە لە ناو لانکە یان لە سەر لاقی دایکدا هێور بێتەوە، ئۆقرە بگرێ و خەوی لێبکەوێ. ڕەگ و ڕیشەی بنەڕەتی ئەم وشەیە زۆر ڕوون و ئاشکرا نییە. لە زمانی فارسیدا کە هاوڕەگەزی زمانی کوردییە، پێی دەوترێ «لالایی». لە نووسراوە فارسیەکانی پێش ئیسلامیشدا کە تەمەنیان لە نووسراوە کوردیەکان زۆرترە، هیچ نموونەیەک لەم وشەیە نابێنرێت. وێدەچێت ناوی دیکەی بووبێت و یاخود هەر بوونێکی نەبووبێت(؟) لە وشەنامەی «برهان قاطع»دا، وشەی«بنگرە» هاتووە کە بە واتای«لالایی» دێ. بنگرە بە ئاواز و لۆرەیەک دەوترێ کە ژنەکان لە کاتی نواندنی منالّەکاندا دەیچڕن. لە وشەنامەی «دهخدا»دا ئەم وشەیە لە ڕیشەی پەهلەوی «وەنگ»ە، بە واتای دەنگ و ئاواز. پێشبەندی ئەم وشەیە «بن»ە کە لە «فەرهەنگی بێهدینان»دا هاتووە، بە مانای بەند و حەبس. بەم جۆرە وشەی «بنگرە» بە واتای دامرکێنەری نووزەیە. «نانو»ش هەمان«ننو»ی فارسییە بە واتای جێگەی خەوی منالّ. بەڵام لە مانایەکی تردا، «لالا»ی فارسی، هاوسەنگی «لَلَه»یە بە واتای«دایە» و هەروەها دەکرێ بە جێگەی خەویش بگوترێ. دەکرێ دووپات بوونەوەی «لا»ی حاشاکەرەی عەرەبی بێت. لەوانەشە دووپات بوونەوەی نۆتەی «لا» لە مووسیقادا بێت کە دەبێتە هۆی دروست بوونی ئاوازێک (محمّدی و قایینی، ١٣٨٢: ٢٨-٢٦).

هەروەها لە زمانی ئینگلیزیدا بە لای‌لایە دەوترێ «Lullaby» کە هاودەنگییەکی فراوانی لە گەڵ وشە کوردی و فارسییەکە هەیە.

## شێوازی لای‌لایە چڕین

لایەلایە ئەم هۆنراوە ساکارەیە کە بە دەنگێکی ئارام و نزم بە دوو شێوە دەوترێ: یان بە خاوی دەخوێندرێ و لە نالاندن دەچێ و یان بەخێرایی دەوترێ و لە گۆرانی و پێهەڵگوتن ئەچێ. لە هەردوو حالەتدا دایک، وێڕای ئەمەکە بە ئەسپایی دەقی لایەلایەکە دەڵێ، منالّەکەی ناو بێشکە یان سەر قاچی ڕادەژێنێ. لە سەرەتادا بە دەنگێکی بەرزتر و وردە وردە دەنگی نزمتر دەکاتەوە و لەگەڵ خەوتنی منالّ، کۆتایی بە لای‌لایە دێ. ئاهەنگی لای‌لایە، میهرەبانی، هەستی دایکانە و هێور کەرەوە لە گەڵ خۆیدا بۆ منالّ بە دیاری دێنێ. دایک یەکەم نووچەکان بۆ منالّەکەی بەڕێ دەکا. دایک بە وتنی لای‌لایە، بوونی خۆی بۆ منالّ مسۆگەر دەکا و منالّ بە قووچاندنی چاوەکانی، متمانە بە دەنگی بلاوێنی دایکی دەکا و هەستی هێمنایەتی تەواوی جەستەی دادەگرێ و لە دنیای پڕ لە هەرا و هوریای بێداری دەچێتە ناو دنیای خەو و ئاسوودەیی.

## کورتە مێژوویەکی وێژەی منالاّن

کۆنترین نووسراوەی وێژەی منالاّن لە جیهاندا « داری ئاسۆریک» یان «نەخلی بزن و یادگاری زەریران»ە کە تەمەنی دەگاتە ٣ هەزار ساڵ پێش زایین. لە ئێرانی باستانیشدا بەشێک لە ئاویستا وەک بنەمایەک بۆ فێر کردن بەکارهاتووە (خدابندە، ١٣٨٨: ١). هەروەک هەموو بەشەکانی تری جیهان، وێدەچی لە کوردستانیشدا

وێژەی تایبەت بە منالانمان نەبووبێت. تەنانەت دەکرێ ئاماژە بە لای‌لایەکان بکەین کە ئەمیش وەک بەشێک لە وێژەی زارەکی مێژووی سەرهەڵدانی ڕوون و ئاشکرا نییە. ئەمەی ڕوونە ئەوەیە کە تا زەمانی شۆڕشی مەشرووتە لە ئێراندا بەیت‌خانی لە کوردستاندا باو بووە و پاشتریش تا ئەم کۆتاییانە هەر بەردەوام بووە. بەڵام لەگەڵ دابەزینی کەلتووری شارستانیەت وەپشتگوێ خراوە. «ئەحمەدی خانی» (١٦٥٠- ١٧٠٧ ز) یەکەمین شاعیر و نووسەری کوردە کە بۆ منالانی کورد ٣ سەدە پێشتر پەرتووکی «نەوبەهاری منالان»ی نووسیوە کە وشەنامەیەکی عەرەبی- کوردییە.

پاش خانی، تا ٢ سەدە هیچ کتێبێک بلاو نەکراوەتەوە. هەتا ساڵی ١٩٢٠ زایینی کە «پیرەمێرد»ی شاعیر دوای گەڕانەوە لە تورکیەی عوسمانی شیعرگەلی زۆری تایبەت بە منالان هۆنیوەتەوە. لە ساڵی ١٣٢٤ی هەتاویدا، پاش دامەزراندنی کۆماری مەهاباد، گۆڤاری «گرۆگاڵی منداڵانی کورد» بە سەرپەرشتی قادر مودەڕڕسی بە شێوەی مانگانە لە چاپ دراوە (محمّدی و قایینی، ١٣٨٢: ٦١٧و١٠٢٢). پاشان ڕەوتی بڵاوکراوەکانی تایبەت بە منالان لە پارچەکانی کوردستاندا لە قۆناغە مێژووییەکانی دواتردا تایبەتمەندی خۆیان هەیە کە دەکرێ هەوێنی توێژینەوەی چڕوپڕی دیکە بێت.

### تایبەتمەندیە گشتیەکانی لای‌لایە

لای‌لایەکان یەکەمین شیعرگەلێکن کە تەنانەت بە هۆی ئاهەنگ و مۆسیقایانەوە بۆ منالان بێژراون. لای‌لایە لە ڕێگای ئاهەنگەوە پێوەندێکی سۆزدارانە لە نێوان دایک و منالدا ساز دەکات. هەر ئەم مووسیقایەش یەکەمین هۆکاری پێوەندیەکەیە. منال لە سەرەتادا لە مانای وشەکانی لای‌لایە ناگات و لەوانەیە دواتر هەست بە ماناکان بکات. وشەکانی لای‌لایەکان سادە و ساکارن و لە زۆربەی کاتەکانیشدا بە دوورن لە چوارچێوەکانی عەرووز و لە بواری هەڵبەستوانیدا کرچ و کاڵن. هەر ئەمەش بەڵگەیە کە سرووشتین و لە ڕیزەی وێژەی زارەکی دادەنرێن؛ ئەدەبێک کە بەرهەمهێنەرەکانیان نەناسراون.

لایەلایەکان لە سەرانسەری جیهاندا، سێ ڕەهەندی هاوبەشیان هەیە: ڕەهەندی شاعیرانە (لە ناوەڕۆک، کێش و قافیەدا)، ڕەهەندی مووسیقایی (بەڕێ بردن بە مووسیقا) و ڕەهەندی شانۆکارانە (بە ڕێ بردن وێڕای جووڵە و ڕەوتی تایبەت) (حجازی، ١٣٨٥: ١٥١). هێڵکاری ژمارە ١ ئەم ڕەهەندانەمان نیشان دەدات:

هێڵکاری ژمارە ١

لایلایەکان لە جۆری وێژەی هەل و دەرفەتن؛ واتە لە سات و کاتی تایبەتدا دەوترێن و چونکە چێژ و کەیف و خۆشی دەدەن بە بیسەرانیان، نازناوی «دایکی ئاوازە ئاسمانی»یەکانیان پێدراوە (خدابنده، ١٣٨٨: ١).

## پێشینەی توێژینەوە

لێکۆلینەوەکان بۆمان دەردەخەن کە تاکوو ئێستا -تا ئەو جێیەی من ئاگادار بم- توێژینەوەیێکی تێر و تەسەل لە مەڕ پێکهاتەکانی لای‌لایەی کوردی ئەنجام نەدراوە. گرینگترینیان بەرهەمی «سەلیمی و کەهریزی»یە، کە وێڕای کۆ کردنەوەی ٥٠ لای‌لایەی ناوچە جۆراوجۆرەکانی کوردستان، کورتە باسێکیان بە زمانی فارسی لەسەر هەر کام کردوە و ئینجا لای‌لایەکانیان بە زمانی فارسی وەرگێڕاوەتەوە. گەورەترین ڕەخنە لەم کارە پڕ بایەخە ئەمەیە کە پشتی بە مێتودێکی زانستی ئەوتۆ نەبەستووە و زۆرتر لە کۆ کردنەوە دەچێ. بەرهەمەکانی تریش زۆرتر خۆیان بە کۆ کردنەوە سەرقاڵ کردووە تا لێکدانەوە. هەر بۆیە باسیان لێوەناکەین.[١]

## پۆلێن کردنی پێکهاتەی لای‌لایە کوردیەکان

لای‌لایە کوردیەکان لە ڕووی پێکهاتەوە دەکرێ دابەش کرێن بە دوو بەشەوە:

١. لای‌لایە سرووشتیەکان کە ساختەی هەست و نەستی دایکانی نەناسراوی کوردستانن کە بە درێژایی مێژووی گەلی کورد خولقاون.

٢. لای‌لایە دەسکردەکان کە هەستی ناسک و جوانی شاعیرانی ناوداری کوردستان ئافراندوونی.

لە درێژەی وتارەکەماندا هەوڵ دەدەین بە وردی و بە هێنانەوەی نموونە باسی ئەم دوو بەشە بکەین.

### ١) لای‌لایە سرووشتیەکان:

---

[١]- بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە لاپەرەی ١٩ی کتێبی ژانەژین.

تایبەتمەندی ئەم بەشە لە لای‌لایەکان ئەمەیە کە بە گشتی خاوەن چەمکگەلی سادە و ساکارن و زۆرتر هەوێنی خۆیان لە سرووشت و چوارچێوە ناوچەییەکانی کوردەواری وەردەگرن. چوارچێوەی سۆزداری و دەروونی و ناوەکی ئەم لایەلایانە ئەوەندە بە هێزە کە توانیویەتی لە درێژەدانی پێوەندی لە نێوان مناڵ و دایک و ئاقارە کۆمەڵایەتیەکاندا رۆڵی بەرچاوی هەبێت. هەر ئەمەش بۆتە هۆیەک بۆ ئەمە کە بە درێژایی مێژوو دووبارە ببنەوە. دەکرێ ئەم بەشە گرینگە بەم شێوازانەی خوارەوە پۆلێن بکرێت:

**١-١- دەستەیەک لە لایەلایەکان ئاوات و خۆزگە، خۆشی و هیوای دوارۆژی دایکانن بۆ منالان**

ئەو لای‌لایانەی لەم خانەیەدان، خۆشیان لە چەند تەوەرەی نزیک لە یەک پێکهاتوون کە ئاماژەیان پێدەکەین.

١-١-١- دایک ئاواتەخوازی گەورە بوون و بەرهەم هاتنی مناڵەکەیەتی و باشترین هەلومەرجی ژیان بۆ کۆرپەکەی دەخوازێ؛ بۆ نموونە:

لای‌لایەت بۆ دەکەم بە دڵی پڕ خەم/ بەڵکوو گەورە بیت بگەیتە بەرهەم (ژ ٤٣: ١٤١ )

یان:

ڕۆڵە خەنە گڵەبانت بێ / مەخمەر جلی تاژیانت بێ / دار سەندەڵ گۆچانت بێ/
سابڵاغ ئێسترخانت بێ/ تاران جێگای تاژیانت بێ / دایکت بەقوربانت بێ (ژ١١: ٦٤ )

لەم ئاوازە جوانەدا دایک گەرەکیەتی کە ماڵی مناڵەکەی کاتێک گەورە دەبێ، وەها پڕشکۆ و خۆش بێ کە سواخی بانی ماڵەکەی، لە خەنە بێ، وەک ئامرازێکی جوان و پڕبایەخ. تەنانەت بە ئەمەش ڕازی نابێت و ئاواتەخوازە تاژیەکەشی جلی مەخمەری لە بەردا بێت و... .

بە ورد بوونەوەیەکی تر دەتوانین مێژووی خولقاندنی ئەم لای‌لایە بۆ سەردەمێک بگێڕینەوە کە دوو شاری تاران و سابڵاغ دروست کراون، کەواتە مێژووی سازدانی ئەم لای‌لایە زۆر کۆن نییە.

١-١-٢- دایک ئاواتەخوازە مناڵەکەی گەورە بێ و ژیانی هاوبەش پێکبێنێ و ئەمیش بەشداری زەماوەندیان بێ. تەنانەت لە هێندێک شوێندا مەرجیش بۆ چۆنیەتی زەماوەندەکە دادەنێ. لەم بەشەدا، جاری وایە، حەز و ئاواتە پەنگ خواردوەکانی نەستی دایک سەر هەڵدەدا و دێتە بەرچاو.

بۆ نموونە:

نینای نینای نیناوێ / دەی نێم لە ناو کەژاوێ / بۆ کوڕی حاکمی ڕۆژئاوێ (ژ ٦: ٤٤ )

یان:

بە کەس کەسانی نادەم بە کەس کەسانی نادەم
لە کەس کەسانم کەسێ لە ناو پارچان ئەتڵەسێ

به پیاوی پیری نادەم به پیواز و سیری نادەم
به ڕێگای دووری نادەم به زێڕی سووری نادەم
نایدەم به کوڕە خەیاتێ دەیبا دوورە ولاتێ
نایدەم به خانی بەبا ماڵی زۆرە و زوو دەیبا
دەیدەم به حەمە خولێ بیکا به دەسکە گولێ
بینێتە بانی دڵێ (٩- ٦٠)

لێرەدا دایک بەوپەڕی ورد بینییەوە، ئاگاداری داهاتووی کچەکەیەتی کە بە هۆی نەریتە باوەکان، نەدرێ بە کەسانێک کە ژن وەک کالا و ئامرازێک چاو لێدەکەن و بە پێی ئەزموونی خۆی، «حەمەخولێ» وەک هێمای خۆشەویستی بۆ بەردەوام بوونی دڵخوازانەی ژیانی هاوبەشی کچەکەی دەست نیشان دەکات و بەم جۆرە پشت لە هەموو هێما ماددیە باوەکان دەکا.

ڕۆڵە ڕۆژێ بژیم و بمێنم / حەوت ژنانت بۆ دێنم (١٢- ٦٦)

یان:

لای‌لایەت بۆ دەکەم تا بێ خەیاڵ بیت / بۆ خۆت پەروەردەی کوڕی مناڵ بیت (ژ٤٣: ١٤١)

١-١-٣- دایک ئاواتەخوازە مناڵەکەی گەورەبێ و لە هەمان کاتیشدا ئەمەک ناس بێت و دایک و باوک لە ژێر سێبەریدا بحەسێنەوە. بۆ نموونە:

ڕەببی ڕۆڵە عومرت هەزارساڵ بێ/ و بۆ من ببیەوە بەردی بناغێ (ژ٧: ٤٨)

یان:

چەند چاک و پیرت بۆ دەخولێمەوە / لە بەر سێبەرت بحەسێمەوە (ژ٤: ٣٥)

١-١-٤- دایک هیواداره مناڵەکەی لەش ساخ و سلامەت بێ و دوعای خێری بۆ دەکات؛ تەنانەت بۆ ئەم کەسانەی مناڵیان نییە، دوعای بە ئاوات گەیشتن و مناڵبوونیان بۆ دەکات. بۆ نموونە:

دەبنوو ڕۆڵە خەوی خێرت بێ/ نوشتەی پیاوچاکان لە ژێر سە رت بێ (ژ٤: ٣٥)

یان:

هەی لای‌لایە، بۆ خەوت نایە/ دەردت لە بابم، قەزات لە دایە
خودا و پێغەمبەر ئاگادارت بێ/ ئەو دایکە پیرە بە قوربانت بێ (ژ ٤: ٣٦)

یان:

ڕاوەکەت هەڵگرت بۆ یاجی بلاغی / یا خولا بتبینم هەر بە لەش ساغی (ژ ٧: ٤٨)

یان:

لای‌لای ڕادەکەم لای‌لای دەروێشی / خوابکا کوڕەکەم هیچ کوورەی نەیشی (ژ ٢٢: ٨٩)

یان:

هەرکەس هەسی لەم وێنە/ خواگیان تۆ لێی مەسێنە

هەرکەس نیەسی لەم وێنە/ خواگیان تۆ پێی بنوێنە (ژ ٢٥: ٩٤ )

١-١-٥- دایک تووک و نزای ناحەزان و نەیارانی منالەکەی دەکا و کۆرپەکەی خۆی لە هەموو کەس جوانتر و ڕێکوپێکتر دەزانێ. بۆ نموونە:

هە رچی کوڕم بانگ نەکات/ خەلە لە خەرمان نەکات/ ساڵی جارێ نان نەکات

هەرچی کوڕم نەلاونێ / کەرەی بەهار نەتاونێ (ژ٤٤: ١٤٦)

یان:

لای لای ڕادەکەم وەگوڵ قرمزی/ خوابکە بەدگۆیان چرایان نەسوزی

لای لای دەکەم تا خۆر بنیشێ / خوابکەی دوژمنەکانو وەشادگ نەنیشێ (ژ٢٢: ٨٩)

یان:

کوڕی من زۆر ئازیزە/ لە ڕۆم و عەجەم بەڕێزە/ لە بەردەمیا کەنیزە/ بۆیە بە دەعیە و فیزە (ژ٤٤: ١٤٦)

یان:

لە بەرت مرم هەندیشی/تۆز لە بالآت نەنیشی/بۆ خۆی جوانە بابیشی/کەس ناگاتە خاریشی (ژ٤٢: ١٣٦)

١-١-٦- دایک لە خۆشەویستی زۆری منالەکەی، خۆی و ماڵ و حاڵ و داراییەکەی بە قوربان دەکات و بەم جۆرە ئەوپەڕی سۆز و ئەوینی خۆی ڕاشکاوانە دەردەخات. وەک ئەم نموونانە:

قەزات لە خۆم لە مامرم/ لە دەور و پشتی قەبرم / ڕۆژێک نەتبینم دەمرم (ژ١٩: ٨٥ )

یان:

ئی کوڕی کییە؟ کوڕ کوڕی کییە / ئییە کوڕی خۆمە / تەنیا نیەمی وەگەنج دونیا (ژ٢٤: ٩٣ )

یان:

ماڵم بۆچییە گەنجی بەکۆ بێ؟ / گەدایی دەکەم، چاوم لە تۆ بێ (ژ٨: ٥٧ )

یان:

قەزات کەفی لە گیانم/ دوربێ لە چاوەکانم

قەزات لە ماڵی مەڕێ/مەڕەکەت لە دەوری گەرێ

قەزات لە ماڵێ بزنێ / کۆلکە مۆکەی هەڵکزێ (ژ١٧: ٨١ )

١-١-٧- دایک شیر خواردن و هەڵسوکەوتە شیرینەکانی منال و دەنگی لانکەکەی بە چەمکە ناوچەییەکان دەشوبهێنی؛ تەنانەت بە شێوەیەکی پوخت و پاراو و شاعیرانە. بۆ وێنە:

خەپلە خەپانی کردگە/ دەم لە مەمانی کردگە

خەپلە خەپی خۆمانە/ نایدەینە دەس بێگانە (ژ٢٨: ١٠٠)

یان:

قوربانوو بم هەمیشە / گەردن گولاو و شیشە

خوا بمکا بە تووتی /قەپێ بگرم لە لووتی

هەتۆل هات و هەتۆل چوو / هەتۆل گوڵی عەمبەر بوو (ژ٢٥: ٩٤)

یان:

وەک بازی لە سەر چەنگێ / شەمامۆکەی هەفت ڕەنگێ /کوڕەکە چەندە چەلەنگێ (ژ٤٢: ١٣٦)

یان:

بەرخی خۆ ڕادەژێنم / ناوی خوای لە گەڵ دێنم

جا بەخێر و بە شایە/ لە لانکی دەردەهێنم (ژ١٥: ٧٤ )

یان:

لانکێکت بۆ دەکڕم، لەوانی دەخڕخاڵدار، ئەگەر وەگیرم بکەوێ

ئەوە لە کوێستانان دێتەوە، قاسپەقاسپی کەوێ / نازانم نە گرمەی دەڕاوچییانە /

نە هۆهۆی جووتیارانە لە سەر زەوێ/ وەرە ڕۆڵە خەوی خێرت بێ /

ئەوە مەڕی دەنیوەڕۆیە، دێتەوە سەر چێشتەنگەوێ /

نازانم نە خرمەی بازنە و خرخاڵی دەشەنگە بێریانە / وەقاپ و مەنجەڵان دەکەوێ (ژ٧: ٤٧ )

هەر وەک دەبینرێ، هۆنەری ئەم لای‌لایەی کۆتاییە بە کارامەیی و لێهاتوانە، لە پێشدا بێشکێکی دەگمەن لەوان -کە وەگیر ناکەوێ- بۆ منالەکەی دابین دەکا، پاشان بە شێوەیێکی شاعیرانە خۆی لە گێلی ئەدا، ئینجا دەنگی خڕخاڵەکانی منال و لانکە، تێکەڵ بە یەکدی ئەکاو جارێک بە قاسپەقاسپی کەو، جارێکیش بە گرمەی ڕاوچییان، دواتریش بە هۆهۆی جوتیارانی دەشوبهێنێ. بەڵام هەستی جوانبێژانەی دایک ئۆقرە ناگرێ و دیسان ئەم دەنگە هەستیارە زوڵاڵەی گرِوگاڵی منال و لانکە بە دەنگی بازنەی شەنگەبێریان دەشوبهێنێ کە وەقاپ و مەنجەڵان دەکەوێ. هەروەها دەتوانین ئاماژە بەم نموونەیە بکەین:

ئەی دارە دارە دارە / دارەکەم نەشکێ هەزارە / وەختی خەربزە و خەیارە /

جووجەڵە لە سەر غروورە / دا زەمین ویشکە پێ بگرە ( ژ٢٣: ٩١ )

١-٢- بەشێک لە لای‌لایەکانی کوردی ئاماژە بە چوارچێوەی فیکری، فەلسەفی و تایبەتمەندی جوگرافیایی و کۆمەڵایەتی کۆمەڵگەی کوردی دەکەن (ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ). لایەلایەکانی ئەم بەشە لە چەن تەوەرەی نزیک لە یەکدا دەبینینەوە کە بریتین لە:

١-٢-١- بەشێک لە لای‌لایەکان –بەبێ ئەمەکە پێشتر ویسترابێت- ئاماژە بە پێوەندییە بازرگانییەکانی نێوان شار و شارۆچکەکانی کوردستان و دەور و بەری دەکەن. بۆ نموونە:

دەیبەمەوە بن داری دەخورمایە / بە سەری هەڵدەکێشمەوە چل نمرەی بەغدایە/

دەیبەمەوە بن داری دە گوێزێ / بە سەری هەڵدەکێشمەوە چڵ نمرەی دە تەورێزێ (ژ٤: ٣٤ )

یان:

شەکری شاری حەڵەبێ / لە خودا دەکەم تەڵەبێ / ڕەببی ڕۆڵەم گەورە بێ (ژ٥: ٤٢ )

یان:

لانکێکت بۆ دروست دەکەم لە داری دەوێنێ / وەستایانت بۆ دێنمەوە لە کۆ و حەڵەبێ/

دەسرازەت بۆ دێنمەوە لە قەزوینێ / ئەمن لانکێکت بۆ دروست دەکەم لە داری دە قەزوانێ/

وەستایانت بۆ دێنم لە شنۆیە/ دەسرازەت بۆ دێنم لە کۆنەلاجانێ/

سەردەمەت بۆ دێنم لە گرشیلانێ (ژ٦: ٤٦ و ٤٧)

یان:

داری لانکێ داری گوڵێ / سەرچاوەکەی چیتی مووسڵێ (ژ١٥: ٧٤ )

یان:

خش خش خش پیلانە/ کچمان خەڵکی گیلانە/

وەی وەی وەی بەڕێزە/ کچمان خەڵکی تەورێزە (ژ٢٧: ٩٨ )

١-٢-٢- بەشێک لە لای‌لایەکان، لە ژێر تەوەرەی وەفاداری بە دابونەریتە کۆمەڵایەتیەکانن. بۆ نموونە:

لە بەرت مرم بەرینێ/ مەرهەمی سەر برینێ/ پیاوی مەسرەتی خینێ (ژ٤٢: ١٣٦ )

لەم نموونەیەدا، دایک بە کوڕەکەی هەڵدەڵێ و بیری دەخاتەوە کە دەبێ وەک باب و باپیرانی، ببێتە پیاوێکی لێهاتوو و لەکاتی پێویستدا، ڕیش سپیگەری و نێوبژیکەری خێڵەکەیان بێت.

یان:

وەرە ڕۆڵە، لای‌لایەت بۆ دەکەمەوە بە نادری/ دەتبەمەوە سەر چاکان، سەر پیران/

ناوەڵڵا سەر گومبەزی دە شێخ عەبدولقادری/

ئەمن تەمەننا دەکەم لە خودای، ڕۆڵە قەت لە من نەمری (ژ٧: ٤٦)

لەم نموونەیەشدا، دایک بە پێی نەریتەکانی ڕابردوو، بۆ پاراستنی مناڵ لە چاو و زار و نەخۆشی، منالەکەی دەباتە سەر مەرقەدی پیران و پیاوچاکانی تەریقەتە باوەکانی کوردستان کە قادری و نەقشبەندین.

یان:

لە کێ بوو لە خۆش خەتان/ دایکی خاتوونی خێوەتان/ باوکی گەورەی عەشیرەتان (٥- ٤٢ )

کە ئاماژە بە ژیانی دەرەبەگایەتی کوردی دەکا کە لە ناو وەها بارودۆخێکدا، لە بنەماڵەی گەورە عەشیرەت بوون و خاوەنی دایکی خاتوون بوون، پلە و پایەێکی مەزنە.

١-٢-٣- دەستەیەک لە لای‌لایەکان ئاماژە بە گیا و گژو دارو گوڵو بەرهەمە سروشتیە ناوچەییەکانی کوردستان دەکەن و مۆرکی خۆماڵی بوونی لای‌لایەکان مسۆگەرتر دەکەن. دەکرێ ئاماژە بەم نموونانە بکەین:

داری بێشکەت دار قەزوانە / بەنی دەسرازەت خوری کاوڕانە (ژ٤٣: ١٤٠)

یان:

نی نی نی نی نیگەڵە / کوڕەکە فێرە باخەڵە / هەنگوین و ڕۆن تێکەڵە (ژ ١٨: ٨٣)

یان:

گەزۆ لە دار لاوێنێ / شەکری شاری حەلەبێ/
لە خودا دەکەم تەڵەبێ/ ڕە ببی ڕۆڵەم گەورە بێ (ژ٥: ٤٢ )

یان:

لانکۆڵێ لای لە لایە / دەبنوو خەوت بۆ نایە
داری لانکێ دار هەنارە/ کەمەی لانکێ بە بزمارە /
داری لانکێ گوێ بەگوارە/ داری لانکی دارهەنجیرە
داری لانکێ داری گوڵێ/ سەرچاوەکەی چیتی مووسڵێ/
داری لانکێ داری بییە/ سەرچاوەکەی چیت هەورییە ( ژ١٥: ٧٤ )

**١-٣-** دەستەیەکی تر لە لای‌لایە کوردیەکان بریتین لە گلەیی و گازندەکانی دایکان لە کۆسپەکان، دووری و جیابوونەوەکان، تەنگ و چەڵەمەکانی ژیانی دژواری ژنان. ئەم تەوەرەش چەن ڕەهەندی نزیک لە یەک لە خۆی دەگرێ کە باسیان دەکەین:

١-٣-١- گلەیی و گازندە لەمە کە مناڵ خەوی نایە و دایک لە ڕاژندن و لای‌لایە گوتن ماندوو بووە:

ڕۆڵە لایە! ڕۆڵە لایە! بابی دایە! / ئەتۆ بۆچی خەوت نایە؟/
وەرە لایی، وەرە لایی، بۆ لە خەوت نەبانی (ژ ٤: ٣٥)

یان:

لانکۆلێ لای لە لایە / دەبنوو خەوت بۆ نایە (ژ١٥: ٧٤ )

یان:

لای‌لایە، ڕۆڵە لای‌لایە/ شەوگار درەنگە، لۆ خەوت نایە/
یا خوا کۆرپەی من دوور بێ/ لە دەردان، لە بەرای دنیایە/

ڕۆڵە لای‌لایە، لای‌لایە/ ئیشم زۆر زۆرن بۆ خەوت نایە (ژ٤١: ١٣٣ )

یان:

لای‌لایە کۆرپەم لای‌لایە/ ڕۆڵە بخەوە، بۆ خەوت نایە/

کۆرپەی شیرینم بۆ خەوت نایە (ژ٤٣: ١٤٠)

١-٣-٢- گلەیی و گازندە لە تەنیایی دایک و سەفەرکردنی کەسانی نزیک. بۆ نموونە:

کۆرپەی شیرینم بۆ خەوت نایە/ باوکت لێت دوورە دایکت لە لایە (ژ٤٣ : ١٤٢)

یان:

یاخولا خاڵ و مامی تۆم / بێمزەڕە ت بێنەوە، لەوێ سەفەرێ (ژ٧: ٤٦)

یان:

ڕۆڵەم لایەکە، کۆرپەم بخەوە/ دونیا بێ دەنگە، تاریکە شەوە/

بخەوە ڕۆڵە، ڕۆین لە بەرت بێ (١٦ - ٧٨ )

١-٣-٣- گلەیی و گازندە لە تانەی دۆست و بێگانە بە هۆی ئەمە کە کۆرپەکەی کیژە و کوڕ نییە، هەروەها بارودۆخی سەختی ژیان لە ماڵی مێرد و وتنی نهێنییەکان بە مناڵ:

لای‌لایە لای‌لایە/ ڕۆڵە لای‌لایە/ بە تانەی دۆست و بێگانە خۆم/

بە وێنەی مەجنوون وێڵی کێوان خۆم (ژ١٠: ٦٢ )

یان:

خۆزگەم بە مەلان هەر شەو لە شاخێ/ نەک بە دەستەی خۆم هەر ئاخ و داخێ/

بە تانەی دۆست و بێگانان خۆم/ بە وێنەی مەجنوون وێڵی کێوان خۆم/

ئازیز بە مەرگت گرانە دەردم/ کاتێ بژنەوی ئەوە من مردم (ژ٤: ٣٥و٣٦ )

١-٣-٤- گلەیی و گازندە لە نەخەوتنی مناڵ و پەنا بردنە بەر وشە ترسێنەرەکان، بۆ هێور کردنەوەی مناڵ. جێگەی باسە کە لە ڕوانگەی سایکۆلۆژیەوە، ترساندنی مناڵ لە قۆناغە هەستیارەکانی ژیانیدا یەکجار هەڵەیە و خەسارێکە کە لە داهاتوودا لەوانەیە کاریگەری زۆر خراپی لێبکەوێتەوە. دایکانی کورد بە هۆی نەخوێندەوارییەوە، گەلێکیان لەم بوارانەدا زانیاری ئەوتۆیان نەبووە و هەڵەی لەم چەشنەیان دووپات کردۆتەوە:

گورگانە شەوێ، گورگانە شەوێ/ بەرخە بچکۆلەکەم، خەوی لێ بکەوێ/

لوورەی تۆی ناوێ، لای‌لایەی ئەوێ/ ئەلێ لە ماڵی ئێمە دوور کەوێ/

پیاوخورەزڵە، پیاو خورەزڵە/ کۆرپەم لەگەل دایکیا دەست لەملە/

مڕەی تۆی ناوێ، هۆگری بلبلە/ هیچت بە لووتەی نایە لەم گەرد و خولە/

وەدوور کەوە تا نەیانداویتە بەر گوللە/ کەمتیاری سم پان، کەمتیاری سم پان/

ڕۆڵە شیرینەکەم نووستووە لە هەیوان/ با حەپەی تۆ ببڕێت لە گوێ مان (ژ١٤: ٧٠)

یان:

گورگە شەویێ، گورگە شەویێ/ لەماڵ خۆمان دورانە شەویێ/بچێ بۆ ماڵ هاوسامان/
کوڕەکەی بنێتە تاقەوە / چاو بچێتە زاقەوە (ژ٢٦: ٩٦)

**٤-١**- دەستەیەک لە لایلایەکان تایبەتمەندی بەرخۆدان و کێشەی سیاسی- نەتەویی کوردیان پێوە دیارە کە وێدەچێت لەم سەدانەی دواییدا لە گەڵ سەرهەڵدانی بزووتنەوە ڕزگاری خوازەکانی کوردی خولقابن. بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بەم لایەلایانە بکەین:

ڕۆڵەگیان بۆچی لە شای بووی یاغی/ ڕاوەکەت هەڵگرت بۆ یاجی بلاغی/
یاخولا بتبینم هەر بە لەش ساغی (٧- ٤٨ )

یان:

گەر ملت دێشێ بە پەتی زاڵم/ سەر کە سەر ڕانم، قەزات لە ماڵم/
لایلاییت بۆ دەکەم، بەرەشتەوە/ نەمێنی ڕۆڵە، شەو لە دەشتەوە /
لایلاییت بۆ دەکەم، بە دڵ و بە گیان/ خوا بتپارێزێ، لە بەڵای ڕەزاخان (٨- ٥٦ و٥٧ )

یان:

لایلایە ڕۆڵەم لایلایە/ خۆزگەم لایلایەی عالەم وا بوایە/
من لە شیری خۆم ئازادت ئەکەم / بۆ نەتەوەی کورد پەروەردەت ئەکەم/
دەس و قاچت ئەبەستم بە دەسرازەبەن / بەشکم نەترسی لە کۆت و پێوەن (٤٣- ١٤١و١٤٢)

### ٢- لایلایە دەسکردەکانی شاعیرانی کورد

هۆنراوەی شاعیران ناکرێ لە خانەی فۆلکلۆردا بژمێردرێن؛ بەڵام بە هۆی ئەمە کە ئەمان لە ناخی خۆیاندان هەڵگری گەلێک چەمک و ڕەهەندی کۆمەڵگەی کوردەوارین، لەم بەشەدا کورتە باسێکیان لێوە دەکرێ. تایبەتمەندیە سەرەکیەکانی ئەم بەشە بچووکە -کە تەنیا ٤ لایەلایەی شاعیرانی بە ناوبانگی کورد، هەژار، بێکەس، قانع و مەلائاوارە لە خۆی دەگرێ- دەتوانین لەم خالانەی خوارەوەدا بە کورتی باسیان بکەین:

**٢-١**- هەر چوار لایلایە، بۆ کوڕ هۆنراوەتەوە، ئەمە ئەو ڕاستییەمان بۆ ئاشکرا دەکا کە فیکری پیاوسالارانە بە سەر نەستی شاعیرەکاندا زاڵە و ئەمە واقیعێکی کۆمەڵی کوردەوارییە.

بۆ نموونە:

ڕۆڵەلای لایە، شێرکۆم لایلایە/ شەوگار درەنگە، بۆچ خەوت نایە؟ (ژ٤٧: ١٦٢)

یان:

هەی لایلایە کۆرپەی ساوایە/ دایەت ماندووە بۆچ خەوت نایە
هیوام زۆر پێتە وەک باب و کاکت/ هەی لایلایە، ڕۆڵە لایلایە/ کۆرپە دواڕۆژ لاوی ئازایە /
کوڕم تۆ کوردی، تۆ بێچۆ شێری/ نەتەوەی کاوەی ئازا و دلێری (ژ٤٩: ١٧٤ تا ١٧٦)

یان:

ڕۆڵە نیشتمان چاوی لە ڕێتە/ دایکمان هەویای دواڕۆژی پێتە/
بۆیە ئەندامت وەک مینای بێ گەرد/ خاوێن ڕادەگرم بە سەد ڕەنج و دەرد/
چاکەم دەیەوە بۆ وەتە ن وەک کوڕ/ تۆش بیگەوزێنی لە ناو خۆێن و قوڕ (٤٦- ١٥٩)

**٢-٢-** فۆرمی دانانیان بە شێوەیەکی پوخت و پاراوە و لە جوانترین وئەوڕۆییترین کەرەستە شیعرییەکان بۆ وەدەرخستنی هەستی جوانناسانە کەڵک وەرگیراوە؛ بەڵام ئاگایانە و زانستیانەن و ساکاریی لایەلایەکانی سرووشتیان کەمتر پێوە دیارە. شوبهاندنەکان ڕێکوپێکن و لە بواری کێش و قافییەدا کەم و کوورتی لایەلایەکانی دایکانی پێوە نابینرێت. بۆ نموونە دەتوانین ئاماژە بکەین بە:

ڕۆڵە ڕووناکی گلێنەی چاوم / بەندی جەرگ و دڵ، هێزی هەناوم/
ڕیحانەی بۆن خۆش سوورە گوڵەکەم/ ئاو پریشکێنی کوڵی دڵەکەم/
چۆڵەمەی ئەستۆم ڕەگی حەیاتم/ هەنگوین و قەند و نوقڵ و نەباتم/
خەوی خێرت بێ، بنوو درەنگە/ تا کەڵەبابەی بەیان بێ دەنگە/
کوڕم من بیرم لە تۆ زیاترە/ دەسرازە و لانک بتبێ چاترە/
هەی لای‌لایە، ڕۆڵە لای‌لایە/ گوێ بگرە بلێم لە بەرچی وایە (ژ٤٦: ١٥٢و ١٥٣ )

یان:

ڕۆڵە لای‌لایە، شێرکۆ لای‌لایە/ یا خوا شێرانە بێیتە ناو کایە (ژ٤٧: ١٦٥)

یان:

ڕۆڵەی خۆشەویست جگەرگۆشەکەم/ مەرهەمی زامی بە پەرۆشەکەم/
وەک تۆ پەروەردەی دامێنی منی/ بێچوو شێرەکەی خاوێنی منی/
منیش لە باوەش دایکی‌ترا بووم/ بە شیری ڕاستی بەخێو کرا بووم (ژ٤٨: ١٦٩ )

**٢-٣-** چەمکی سەرەکی لەم لایەلایانەدا، لاواندنەوەی هەستی نەتەوایەتی و بەرخۆدانە. ئەم لای‌لایانە هەمووهەوڵی خۆیان دێننە گەڕ، تا منالی کورد ئازا، زانا، دلێر و چاونەترس بێت و ئاواتەخوازە خۆی بۆ بەرەنگاربوونەوەی دووژمنان حازر کات.

هیوام زۆر پێتە وەک باب و کاکت/ ببی سەربازی نەتەوە و خاکت
بەخێوت دەکەم بە دڵ و بەگیان/ نەکەی بترسی و لە هیچ بکەی سڵ
زانا و خوێندەوار، چاو و دڵ تێر بی/ ڕۆژی تەنگانە پڵینگ و شێر بی/
لاوێکی گورج و خاوەن هۆش و بیر/ نەترسی لە بەند، لە کوت و زنجیر
هەی لای‌لایە، ڕۆڵەم لای‌لایە/ کۆرپەم دواڕۆژ لاوی ئازایە (ژ٤٩: ١٧٥)

یان:

ڕاستە تۆ نەوەی شێری ژیانی/نەتەوەی پاکی گەلی کوردانی
بەڵام چونکە کورد ئیمڕۆ بێ کەسە/بەشیان لە دونیا کۆت و مەحبەسە
بۆیە دەتپێچم تا خووی پێ بگری /نەک تا من ماوم لە بەندا بمری/
بۆ چارە ڕەشیت، نەماوە تینم /هەر پێم خۆش نیە مەرگت ببینم (ژ٤٦: ١٥٥)

پێداچوونەوەیکی ڕەگەزی لە سەر لای‌لایەکان لە کۆی ٣١ لای‌لایەی سرووشتی دایکانەی ئەم لێکۆڵینەوە ١٤ دانەیان تایبەت بە ڕەگەزی نێرن، واتە ٤٥/١٦% بۆ منالّی کوڕ وتراون. ئەمە کاتێک گرینگە کە بزانین لە کۆی ئەم بەرهەمانەدا تەنیا ٥ لای‌لایە بۆ ڕەگەزی مێ یان کچانی کورد وتراون، واتە ١٦/١٢% تایبەت بە کیژانن. هەروەها ١٢لای‌لایە، واتە ٣٨/٧٠% بێ جیاوازی ڕەگەزی وتراون و هەر دوو ڕەگەزی نێر و مێ (کوڕ و کچ) دەگرنەوە؛ گەر کۆی هەموو لایەلایەکان پێکەوە هەڵسەنگێنین ڕێژەکان هەمیسان بە قازانجی کۆڕ بەرز دەبنەوە. کە واتە دەکرێ ئاماژە بەوە بکەین کە بەپێی ڕێسا کوردیەکان، بە هۆگەلی جۆراوجۆرەوە ڕەگەزی نێر لە کۆمەڵگەدا لاینگری زۆرتری بووە. خشتەی ژمارە «١» ئەم دیاردەیەمان ئاشکراتر نیشان دەدا.

خشتەی ژمارە ١

| جۆری لای‌لایە | ژمارە | ڕەگەز | | | | بێ‌جیاوازی ڕەگەزی | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | نێر | % | مێ | % | ژمارە | % |
| لای‌لایەی‌سرووشتی دایکان | ٣١ | ١٤ | ٤٥.١٦ | ٥ | ١٦.١٢ | ١٢ | ٣٨.٧٠ |
| لای‌لایەی شاعیران | ٤ | ٤ | ١٠٠ | ٠ | ٠ | ٠ | ٠ |
| کۆی دوو جۆری لای‌لایە | ٣٥ | ١٨ | ٥١.٤٢ | ٥ | ١٤.٢٨ | ١٢ | ٣٤.٢٨ |

یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی لای‌لایە ژنانی کورد لە چوارچێوە دەسەڵاتەکانی زمانی زاڵی باوک سالاریدا، ئەمەیە کە ژنان کاتی پێهەڵگوتن و لاوندنەوەی منالّەکان، بە تایبەتی ئەم کاتانەی بە کوڕەکانیان هەڵدەڵێن و ئاواتی گەورەبوونیان بۆ دەخوازن، نائاگایانە و بێ ئەوە کە خۆیان بزانن، لە ژێر ڕکێفی زمانی دەسەڵات، واتە زمانی پیاوانەدان. بە پێی ئەم وتەی چامسکییە کە «زمان خانەی وجوودە»، دەتوانین بێژین کە ژنانی کورد لە دەربڕینی تاسەکانی خۆیاندا زۆرتر ئاواتەکانی پیاوانەی کۆمەڵگە دێننە دی. بۆ نموونە کاتێک دایک لە خەیاڵی خۆیدا، بۆ کوڕەکەی ژن دەخوازێت، جگە لەوە کە بە یەک ژن ڕازی نابێت، تایبەتمەندیەکانی ژنێک کە لە خەیاڵیدایە زۆرتر لە تایبەتمەندی ئەم ژنانە دەچێت کە پیاو حەزی لێیەتی.

واتە ژن بۆ نەریتێک کە ئەو بە ڕەگەزی دووهەم دەزانێ ملکەج دەکات و قوبووڵیەتی. چاوخشاندنێک بەم سێ لای‌لایەی خوارەوە، ئەم ڕاستیەمان ئاشکراتر بۆ ڕوون دەکاتەوە:

ڕۆڵە ڕۆژێ بژیم و بمێنم / حەوت ژنانت بۆ دێنم / یەکیان کچی پاشا بێ /
یەکیان سوری نان تەپێن بێ / یەکیان ڕەشی کادێن بێ/ یەکیان ماڵ هەڵوەژێر بێ/
یەکیان ناسکی بن نوێن بێ / یەکیان چێشت لێنەر بێ (ژ١٢: ٦٦)

یان:

ڕۆڵە بژیم و بمێنم / حەوت ژنانت بۆ دێنم / یەکیان تورکی تەماشا /
یەکیان دوختەری پاشا / یەکیان نەرمی نێو نوێنێ / یەکیان نانی بتەپێنێ /
یەکیان هەر ئاوت بۆ بێنێ/ یەک هەر مەشکەی بژێنێ (ژ١٣: ٦٨)

یان:

خودا بدەی نیازم/ حەوت ژنت بۆ بخوازم / یەکێ ڕەشی بەرکولێن /
یەکێ تیکە هەڵخلێن / یەکێ بۆ ماچ و موچێ/ یەکێ بۆ ڕێگەی کوچێ /
یەکێ بۆ بەر سەماوەر / یەکێ پشت لە میوان کەر / یەکێکیش هەرا و هۆکەر (ژ٤٥: ١٤٨)

هەروەها جاری وایە دایک لە کاتێکدا کە ئامۆژگارانە، لای‌لایە بۆ منالەکەی دەکا، حەزی وایە کە کوڕەکەی لە هەڵس‌وکەوتەکانیدا ئەو یاریانە بکات کە نیشاندەری هەستێکی کۆمەڵگەپەسەندانەیە، واتە دایک کاتێک لە خەیاڵیدا کایەی منال وەبەر چاو دێنێ، حەز لە شێوە کوڕانەکەی دەکات. نموونەی ئەم ڕاستییە، لایەلایەی خوارەوەیە:

کوڕەکەم دانە هەنارە / خوایە نیگای بدارە
کوڕەکەم بچێ بۆ کایە / فەرمان بکا بۆ دایە
کوڕەکەم بچێ بۆ دووکان / لەوی بکا هەلووکان
دایە بچێ بۆ شوێنێ / ڕاکاتە پشتی گوێنێ
دایە بکا لێی هاوار / ڕاکاتە شانی دیوار
کوڕەکەم بچێ بە پاپا / فەرمان بکا بۆ بابا (ژ٢٩: ١٠١ )

## ڕێژە و لەرەی (فرێکانس) بەکارهێنانی هێماکان لە لایەلایەکاندا:

ڕێژەی بەکارهێنانی هەر کام لە هێما ماددی و گوزارەییەکانی ناو لایەلایەکان، پلە و پایە و گرینگی ئەوان لە ناو کۆمەڵگەی کوردیدا نیشان دەدەن. جێی سەرنجە کە هەر کام لەم گرووپانە فرە ڕەهەندن و لە درێژایی باسەکەماندا ئاماژە بە هەرە گرینگەکانیان دەکەین.

هێما ماددیەکانی بەکارهاتوو لە لایەلایەکاندا، هەوێنی سەرەکی خۆیان لە ئاقارەکانی سرووشت، شێوازەکانی بەرهەمهێنان و چۆنیەتی و ستایلی ژیان وەردەگرن. هەروەها دەتوانین جەخت لەسەر ئەمە بکەینەوە کە هێما غەیرەماددیەکانی بەکارچوو لە ناو لایەلایەکاندا، نیشاندەری شێوە و ئاستی بیر و باوەرەکانن و بە گشتی شێوەنیگای کۆمەڵگە و هەلومەرجێک کە تیەدا خولقاون ئاشکرا دەکەن.

بە خوێندنەوێکی سادەی لایەلایەکان دەتوانین بێژین کە ئەم هێمایانەی خوارەوە بە ڕێژە و لەرەیەکی زۆرتر بەکار هاتوون:

ڕۆڵە، خوا، لانک، قەزا، چاکوپیر، دار (هەنجیر، گوێز، بی، لاوێن، خورما) دەسرازە، کوڕەکە، کۆرپە، دایک، وەرە، باخەڵ، ژن، بنوو، بخەوە، بەدڵ و بەگیان،کورد، قەزوان، لەبەرت مرم، هەنگوین و ڕۆن، پیاو، لای لایە، مەڕ، خڕخاڵ، بەرخ، وڵات، حەوت، بزن، گیان، کچ، فریشتە، شاخ و چیا، گورگ، دەرد وئازار، خەڵکی و... .

هەر وەک دەبینین دار و درەختەکان، ماڵاتە خۆماڵیەکان، هێما و کەرەستەکانی کشت وکاڵ و ئاژەڵداری و بیر و باوەڕە ئایینییەکان، لەرەیەکی فراوانیان هەیە. لە ناو ئەم هێمایانەدا بە گشتی چەند پات بوونەوەی بەکارهاتنی ناوی دار و درەختەکان و ماڵاتە خۆماڵیەکان، ئەم ڕاستیە حاشا هەڵنەگرەمان وەبیر دەخەنەوە کە ژیانی خەڵکی کورد تا چ ڕادەیەک بە ئاژەڵداری و کشت وکاڵەوە گرێدراو بووە. هەروەها هێما ئایینییەکان، نیشاندەری ئەمەن کە خەڵکی کورد بە گشتی، ئاستی پتەوی بیرو باوەریان بە دیاردە پیرۆزەکان، تا چ ڕادەیەکە. ڕێژەی ناوە پیرۆزەکان، بۆ هەڵسەنگاندنەکانی زیاتری خوێنەران، لە خشتەی ژمارە ٢ دا نیشان دەدەین.

خشتەی ژمارە ٢

| هێما | لەرە | هێما | لەرە |
| --- | --- | --- | --- |
| خودا (یەزدان) | ٢٩ | چاک و پیر (دەروێش) | ٦ |
| غەوسی گەیلانی، وەیسی نازدار، شێخی زەمبیل، سوڵتان وەقاس، ئەبداڵ، شێخی کەسنەزان | ١١ | پێغەمبەر، ئیمامان و ئایەتی قورئان | ٥ |

جێی سەرنجە کە خەڵکی کورد بە گشتی پەیڕەوی ئایینی ئیسلامی سوننەن و هەروەک دەزانین، لە گۆشەنیگای «کەلام»ی «قەدەر»ی یان«ئەشعەری»ن. چوارچێوەی فیکری ئەوانیش ڕازی بوون بە قەزا و قەدەرە و مەنیقێکی «تەسلیم»یان بە سەردا زاڵە. هەر بەم هۆیەش دایکی کورد، کاتێ لای‌لایە بۆ مناڵەکەی دەچڕێ و لە دەس خەم و نەهامەتیەکانی ژیان و خەولێنەکەوتنی کۆرپە، پەنا دەباتە بەر دوعا و نزا باوەکان و هێور بوونەوەی خۆی لە دەس کێشەکان بەم جۆرە «تەسلیم کارانە» ساڕێژ دەکاتەوە. بۆ نموونە:

بەرخی خۆ ڕادەژێنم / ناوی خوای لەگەڵ دێنم / جا بە خێر و بە شایە /

لە لانکی دەردەهێنم / بانگم وەبەر خوای گەورە / ئیدی غەوسی بەغدایە (ژ١٥: ٧٤و٧٥)

یان:

لای‌لایە کۆرپەم لای‌لایە / ڕۆڵە بخەوە، بۆ خەوت نایە
دوعات بۆ دەکەم لە پیردەرویشان / ئەوەندە پیر بیت دەست بکێشان
داری بێشکەکەت لە دار خورمایە / ڕۆڵەم سپردەی غەوسی بەغایە
داری بێشکەکەت لە دار چنارە / ڕۆڵەم سپردەی وەیسی نازارە (ژ٤٣: ١٤٠)

یان:

ئەمن لای‌لاییت بۆ دەکەم بە ئەبداڵی کۆ / هیچ کەسێک نەگرێ نەدامەتی تۆ (ژ٤: ٣٦ )

## کاردایەکانی لایەلایەکان:

مانەوە و بەردەوامی درێژخایەنی لایەلایەکان و گواستنەوەی بێ پسانەوەی ئەوان لە بەرەیەکەوە بۆ بەرەیەکی تر، پیشاندەری گرینگی و مەزنی کاردای ئەم بەشە لە کەلتووری گشتی لە کۆمەڵگەی ئێمەیە، کە هەڵبەتا پاش گۆڕانکاریە فەرەهەنگیەکانی سەردەمی هاوچەرخ، لە بەشێکی فراواندا، لە گرینگی و پێویستی کاردایی ئەمان کەم و نزم بۆتەوە. هەروەها بەشێکی بەرچاو لە ڕۆڵ و ئەرکگەلێ کە لایەلایە لە ڕابردوودا هەیبووە، کەوتۆتە سەر شان و ملی ڕێکخراوە نوێ و ئەمڕۆییەکان.

لە کاردایە بەرچاوەکانی لایەلایە لە ئێستا و ڕابردوودا دەتوانین بە وەدیهێنانی ئارامی و هێوری بۆ دایک و مناڵ ئاماژە بکەین. دووپات بوونەوەی بێ‌پسانەوەی ڕیتم و ئاهەنگە دڵخوازەکانی بەکارهاتوو لە لایەلایەکاندا، هەل‌ومەرجی گەشانەوەی زێدەتر و خەوێکی باشتر بۆ مناڵ پێکدێنێ؛ هەروەک چۆن چڕینی لای‌لایە، هەلێکی جیاواز بۆ دایکان دەڕەخسێنێ بۆ ئەوەی کە گەلێک لە دەرد و ئازار و مەینەتیەکان، ئاوات و ویستەکانیان بگێڕنەوە و تا ڕادەیەکی زۆر لە زەختە رووحی و دەروونییەکانیان کەم بکەنەوە.

یەکێکی تر لە کاردایەکانی لایەلایەکان، فێر کردنی زمان و وشە پێوەندیدارەکان بە لایەلایەکانەوەیە، کە وێڕای چەندپات بوونەوەی لایەلایەکان، هەل و مەرجێکی گونجاو بۆ فێربوونی زمان لە لایەن مناڵەوە پێکدێنێ.

سەرەڕای ئەمە بە گواستنەوەی زۆرێک لە مانا و چەمکەکان لە چوارچێوەی بایەخەکان، ڕەوتە باوەڕ پێکراوە کۆمەڵایەتیەکان بۆ مناڵەکان لە سەرەتاییترین ساڵەکانی ژیانیاندا، تەیار و پێکهاتەی بە کۆمەڵ بوونی هەرە باشتری ئەوان دەڕەخسێنێ. هەڵبەتا نابێ لە بیرمان بچێت کە ئێمڕۆ ئەم کارە بە داخەوە کەمتر بایەخی بۆ دادەنرێ و وەک ئەرکێکی بنەڕەتی بنەماڵەکانی کوردستان چاوی لێناکرێ و لە زۆربەی شوێنەکاندا، تەنانەت لە بەشێکی بەرچاو لە لادێیەکانیش ئەم ئەرکە خراوەتە سەر شانی باخچەی ساوایان و قوتابخانەی سەرەتایی و مێدیا گشتییەکانەوە. بە ئاشکرایی دیارە کە ئەمانیش لە بارودۆخی ئێستادا بە چ شێوازێک ئیدارە دەکرین و چ بەرنامەگەلێک پەیڕەو دەکەن وکام کەلتوورانە پەرە پێدەدەن!

یەکێکی تر لە کاردا گرینگەکانی لایەلایەکان، دەکرێ ئاماژە بە ڕەوتی پاراستن و چاوەدێری کەلتووری و هەروەها گواستنەوەی فەرهەنگ و چاند بە مانا گشتیەکەیەوە بکەین کە بە درێژایی چاخەکان لە کۆمەڵگەی

کوردیدا، هاودەنگ لە گەڵ بارودۆخە ڕامیاری، کەلتووری و فەرهەنگە جیاوازەکان، وەک ئامرازێکی کارامە و دەفرێکی هەلگر و گونجاو لە خزمەت پاراستن و ئاگادار کردن لە کەلتووری کۆمەڵگەدا بووە.

بەڵام وەک وتەی کۆتایی، ئێستە پرسیار ئەمەیە کە ئاخۆ بە کز بوونەوەی لایەلایەکان و تەنانەت ئەگەری فەوتانی یەکجارەکی ئەوان، ئیتر منداڵەکانمان بە کام ئاهەنگ و ڕیتمەوە هێور ببنەوە و خەویان لێبکەوێ؟ ئەدی دایکان چلۆن بیر و ئاواتەکانی خۆیان دەربڕن و دەرد و کوڵەکانیان هەڵڕێژن و سوکناییان پێدا بێتەوە؟

## سەرچاوەکان

پایانیانی، صلاح (١٣٨١) **کانی مرادان**، ارومیه، انتشارات ثلاح الدین ایوبی.

پولادی، کمال (١٣٨۴) **بنیادهای ادبیات کودک**، تهران، کانون پرورش فکری کودکان و نوجوانان، چاپ اول.

جمالی یوسفی، ابراهیم (١٣٨۶) **نگاهی به لالایی های کرمان**، فرهنگ مردم ایران.

حجازی، بنفشه (١٣٨۵) **ادبیات کودکان و نوجوانان (ویژگی ها و جنبه ها)**، تهران، انتشارات روشنگران و مطالعات زنان، چاپ نهم.

محەمەد حەمە باقی (٢٠٠٩.ز) **مێژووی موزیکی کوردی**، هەولێر، چاپخانەی هێڤی، چاپی سێیەم.

حەمە حەمە ساڵح تۆفیق (٢٠٠٠) **هۆنراوە و چیرۆکی فۆلکلۆری کوردەواری**، (بەرگی یەکەم)، سلێمانی، وەزارەتی رۆشنبیری، چاپی یەکەم.

خدابنده، حمیرا (١٣٨٨) **لالاییها (متن سخنرانی)** فیلمنامەی سیاسی، ادبی، فرهنگی گیلان ما، سال نهم، شمارەی١ پیاپی ٢٣، بهار ٨٨.

ذوالفقاری، حسن (١٣٨٤) **فرهنگ عامیانه**، قابل دسترس در:

www.persian_language.org/Group/Article- Archive. asp

سادات اشکوری،کاظم (١٣٧٧) **اشاره به مردم شناسی**، تهران، نامەی علوم اجتماعی، شماره ١١.

سلاجقه، پروین (١٣٨۵) **از این باغ شرقی (نظریه های نقد شعر کودک و نوجوان)**، تهران، کانون پرورش فکری کودکان و نوجوانان، چاپ اول.

سلیمی، هاشم و کهریزی، ثریا (١٣٨٧) **ژانەژین (لالاییهای مادران کرد)**، تهران، نشر آنا، چاپ اول.

گیدنز، آنتونی (١٣٨۶) **جامعه شناسی**، ترجمەی حسن چاوشیان، تهران، نشر نی، (ویراست چهارم)، چاپ اول.

محمّدی، محمّدهادی و قایینی، زهره. (١٣٨٢). **تاریخ ادبیات کودکان ایران** (٧جلد)، تهران، نشر چیستا.

محمّدی، محمّدهادی (١٣٧٨) **روش شناسی نقد ادبیات کودکان**، تهران، سروش (انتشارات ندا و سیما)، چاپ اول.

مەحموودزادە، ڕەهبەر (١٣٨١) **پێکهاتەی بەیتی کوردی**، ارومیه، انتشارات صلاح الدین ایوبی.

مردخ روحانی، ماجد (به سرپرستی)(١٣٨۶) **فرهنگ فارسی -کردی (دانشگاه کردستان)**، ٣جلدی، سنندج، دانشگاه کردستان، چاپ اول.

نعمت اللهی، فرامرز (١٣٨۶) **ادبیات کودکان و نوجوانان** (شناسایی، ارزشیابی، ارزشگذاری)، (ویژەی دورەی کاردانی تربیت معلم)، تهران، اداره ی کل چاپ و توزیع کتاب های درسی آموزش و پرورش، چاپ سوم.

نورتن، دونا و سارا (١٣٨٢) **شناخت ادبیات کودکان؛ گونەها و کاربردها از روزن چشم کودک**، ترجمەی منثوره راعی و دیگران، تهران، نشر قلمرو.

هەژار (عبدالرحمان شرفکندی) (١٣٦٩) **هەنبانەبۆرینە**، (فرهنگ کردی- فارسی یک جلدی). تهران، انتشارات سروش، چاپ اول.

یغمایی، پیرایه (١٣٧٨) **لالایی ها نخستین شعرهای نانوشته ی زنان ایرانی**، قابل دسترس در:

http:/aryaadib.blogfa.com/post.325.aspx

# ڕەنگدانەوەی ئافرەت لە پەندی پێشینان‌دا

د. عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی [-]

**کورتە:**

گەلی کورد لە ڕێگەی ئەدەبی فۆلکلۆریەوە، بەتایبەت «پەندی پێشینیان» خاوەنی سامانێکی دەوڵەمەند و ڕەسەنە؛ بۆیە پەند، سەرچاوەیەکی کارایە بۆ نەوەی نوێ. بۆ پێناسەی پەند، زانایان و ڕۆشنبیران ڕای زۆریان دەربڕیوە. پەندی کوردی لە هەر قۆناغێکدا سەری هەڵدابێ، گرینگی خۆی هەبووە و تا ئەو قۆناغ و سەردەمەی کە تێیدا بەکار هاتووە، تێیدا بەکار دێت و گرنگیەکەی لەوەدایە کە هەمیشە وا هەست دەکەی تازە لە دایک بووە و داڕێژراوە، بێ ئەوەی کە خاوەنەکەی لێت دیار بێت. ئافرەتی کوردەواری، بەشێوەیەکی گشتی بە ژیری و وریایی و دامێن‌پاکی و ئازایی ناسراوە. هەر لە بەربەیانەوە تا ڕۆژئاوابوون ڕاوەستانی نییە، گەرمی و تاڵی و تفتی و سەرما و سۆڵەی زستان و هاوین دەچێژێ.

ئەگەر سەیری فۆلکلۆری کوردی بکەین، دەبینین کە ئافرەت بە هەموو جۆرەکانیەوە لەناو پەندەکاندا ڕەنگی داوەتەوە. وەکوو: ژن، دایک، کچ، خۆشک، بووک و... . کە لەم وتارەدا ئاماژەمان بە نموونەگەلێک کردووە.

**وشە سەرەکییەکان:** پەند، ئافرەت، فۆلکلۆر، ئەدەبیات

---

[-] مامۆستای زانستگا.

**پێناسەی پەند:**

پەند ژانرێکی گرنگی ئەدەبی و فۆلکلۆریە، یەکێکە لە شاکارە هەرە بەسوودەکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و دەربڕی هەستی پاکی پێشینیانە.

پەندی پێشینیان سەرچاوەیەکی کارا و زیندووە و ڕەنگدانەوەی بیری کۆمەڵایەتی باو و باپیرانمانە؛ کە واتە پەندی پێشینیان بەتەواوی چوەتە قووڵایی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ و تاقی کردنەوەی بۆ بەجێ هیشتووین و هەروەها بووەتە جێگای سوود بەخشین بۆ سوود وەرگرتن لەو هەڵانەی کە مرۆڤ لە ڕۆژگاری خۆی و لە بوارە جیاجیاکاندا تووشی دەبێت.

دەتوانین بڵێین گەلی کورد لە ڕێگەی ئەدەبی فۆلکلۆریەوە، بە تایبەتی پەندی پێشینیان، خاوەنی سامانێکی دەوڵەمەند و ڕەسەنە، بۆیە پەند سەرچاوەیەکی کارایە  بۆ نەوەی نوێ. هەندێک لە پەندەکان لەبەر جوانیان لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە نەوە لە دوای نەوە دەگوازرێنەوە و کۆڕ و دانیشتنیان پێ گەرم ئەکرێ.

ئەگەر چاوێک بە گۆڤار و کتێب و هەندێک لە ڕۆژنامەکاندا بخشێنین، دەبینین زۆر لە نووسەران و ڕووناکبیران هەر یەکە لە گۆشەنیگای خۆیەوە پێناسەی پەندی پێشینیانی کردووە و بیر و ڕای خۆی لە بارەیەوە دەربڕیوە. هەموو پێناسەکانیش لەوەدا یەک دەگرنەوە کە پەندی پێشینیان چەند دەربڕینێکی کورت و پڕ مانایە و شێوازی ئامۆژگاری پێوە دیارە.

زانایان و ڕۆشنبیران بەم شێوەیە پێناسەی پەندی پێشینیانیان کردووە:

«مامۆستا کەریم شارەزا» لەبارەی پەندی پێشینیانەوە دەڵێ: «پەندی پێشینیان بەشێکی گرنگ و بەنرخی ئەدەبی فۆلکلۆری گەلە. لە ئەنجامی بەسەرهاتی کاریگەر و تاقی کردنەوەی پیر و پێشینانەوە گوتراون و کەوتوونەتە سەر زمانی گەورە و بچووک و تا ڕادەیەک بوون بە پەندی دەستووری ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی گەل و بە کارتێکی جودا نەکراوەی ژوورخانی ژیانی ماددی ڕۆڵەکانی کۆمەڵ» (شارەزا، ١٩٧٦: ٨).

لێرەوە دەردەکەوێ کە پەندی پێشینیان لە سەردەمێکی کۆندا گوتراون و بوون بە یاسا و پەند کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوازرێنەوە. پێش ڕوودانی هەر هەڵەیەک، مرۆڤ پەندێک بەشێوەی کارەکە دەڵێت و بەمەش دوور دەکەوێتەوە کارەکە و ئەزموونی لێوەردەگرێت. هەروەها د.عیزەددین مستەفا ڕەسووڵ دەڵێت: «پەندی پێشینیان بریتیە لە بەرهەمێکی زۆر کۆنی خەڵک، ئەم پەندە هەمیشە لای خەڵکانی سەرەتایی و سادە، فەلسەفەی ڕاستەقینە و لەکاری ڕەوشت و خووە، هەموو ڕاستییەک، هەموو ڕووداوێکی ژیانی ئادەمیزاد، هەموو کردارێک، چاک یان خراپ، هەموو گەیشتنە ئەنجامێک کە گەل گەیشتبێتێ، دەربارەی هەرچیەک بێت ئەچێتە تەرازووی پەندی پێشینیانەوە» (مستەفا ڕەسووڵ،١٩٧٠: ٨٧). لەو پێناسەوە دەردەکەوێت کەوا پەندی پێشینیان دەربڕینێکە کە جۆرە سادەییەکی پێوە دیارە بە

ئاسانی خەڵکی تێیدەگات و شارەزایی لێ‌پەیدا دەکات؛ هەروەها بەرهەمێکی کۆنی خەڵک بووە مانایەکی قووڵیان هەیە سادەیی ژیانی مرۆڤ دەردەخات لە بوارە جیاجیاکان.

مامۆستا شێخ‌محەمەدی خاڵ دەڵێ: «پەندی پێشینیان فەلسەفەی ژیان و دەنگی تاقی کردنەوەی جیهان و بەری ڕەوانبێژی ڕەوانبێژانە کە باو و باپیران لە هەزاران ساڵەوە بە کەلەپوورێکی ویژەیی، بۆیان بەجێ هێشتووین تا بیانکەین بەئاوێنەی بالا نەما بۆ خۆمان» (خاڵ، ١٩٧١: ٤).

بە پێی ئەو پێناسەیە بۆمان دەردەکەوێت کەوا پەند کار و کردەوەی ژیانی ئادەمیزاد بووە. لە دێر زەمانەوە باو و باپیرانمان لە سەردەمی خۆیاندا دەریان بڕیوە؛ بەڵام پەند دیاردەیەکی تایبەت نییە بە سەردەمێک، بەڵکوو هەر سەردەمە و جۆرێک لە پەند سەری هەڵداوە بە پێی بارودۆخی ژیانی ئەو سەردەمە. گەر بەپێی ئەو پێناسەیە بێت، پەندی پێشینیان تایبەتە بەو باو و باپیرانە کە پشت بە پشت و نەوە دوای نەوە گواستراوەتەوە. دەشبێت لە سەردەمی نوێشدا پەند سەر هەڵبدات و ببێت بە ئەزموون بۆ نەوەی داهاتوو.

هەروەها زانای کورد «محەممەد تۆفیق وردی» دەڵێت: «پەندی میللی بایەخێکی زۆری هەیە چونکە ئەو پەندانە بریتین لە قسەی نەستەق، ئامۆژگاری و تاقی کردنەوەی چەند نەوەیەکی خەڵکی. باب و باپیری پێشینیان لەگەڵ ئەو ڕووداوانەی کە بەسەر گەلێک لە گەلاندا تێپەڕ دەبن لە هەموو قۆناغێکی مێژووییدا لە پەندی میللیدا ڕەنگ دەداتەوە چونکە لە واقیعی جەماوەری میللی بەتاڵ و خۆشیەوە لە هەر قۆناغێکدا دەدوێت» (وردی، ١٩٧٥: ٥٣).

پەندی پێشینیان لە ئەنجامی ڕووداوی خۆشی و ناخۆشی، یاخود کردەوەی چاک و خراپ لە لایەن کەسانی شارەزا و لێزان و زیرەک سەری هەڵداوە کە بووەتە هۆی سوود لێوەرگرتنی بۆ نەوەی داهاتووش؛ لە ئەنجامی ئەو ئەزموون و چێژەی کە هەیەتی لە وتندا.

بە پێی ئەو پێناسە، بۆمان ڕوون ئەبێتەوە کە پەندی پێشینیان ئامۆژگاری و چاکەخوازی و ڕەسەنایەتیان لە ڕوخسار و شێوەدا پێوە دیارە و لە کاتی گفتوگۆ و ئاخاوتندا دەخرێتە ڕوو، کە ئامۆژگاری بەنرخمان دەداتێ و لە هەموو کات و هەڵوێستەکانی ژیاندا جێی خۆی دەکاتەوە.

پەندی پێشینیان دەبێ بە زمانی ڕەسەنی نەتەوە بنووسرێ و خاڵی لە وشە و زاراوەی بێگانە بێت. لە گرنگترین تایبەتمەندییەکانی پەندی پێشینیان، ئەوەیە کە بە وشەی ڕەسەنی کوردی ڕازێنراوەتەوە و لە کاتی بەکارهێنان و خوێندنەوەیدا هەم چێژی هەیە و هەم وەکوو ئەزموونێک ئامۆژگاری پێدەکرێ و سوودی لێ‌وەردەگیرێ.

«عومەر شێخوڵڵا دەشتەکی» بەم شێوە پێناسەی پەندی پێشینیانی کردووە، دەڵێ: «پەند گوتە و ئاخاوتنێکی وردی کورت‌کراوەی گشتی و هەمە لایەنە بە سەنگە و بە وەجە، ژیان و بەسەرهات و چۆنیەتی باری سەردەمە دێرینەکانمان دەهێنێتەوە یاد، دەربڕین و ناوەڕۆکەکەی هەردووکیان شایستە و لێوەشاوی یەکترن. ئەندازەی لە یەکتر گونجانیان پڕبەپڕی یەکترن» (دەشتەکی، ٢٠٠١: ٥).

لێرەوە دەردەکەوێ کە پەندی پێشینیان لەلایەک بەری تاقی کردنەوە و ئەزموونە و لەلایەکی ترەوە زانین و ناسینی ژیانی سادەی خەڵکە. بۆیە دەربڕین و ناوەرۆکی پەند، بە وشەیەکی جوان و شایستە دەربڕاون کە دەبێ بگونجێ لەگەڵ ئەو کار و کردەوەیەی کە پەندەکەی بە سەردا دەگوترێ؛ دەتوانین بڵێین بڵاوبوونەوەی کوردی ڕویەکی جوانکاری لە گەلی کورد نیشان دەدات.

هەروەها لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینیانی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتیشدا -کە لەلایەن «قەنات کوردۆ»وە گۆڕاوەتەوە سەر زمانی ڕووسی- بەم جۆرە باسی پەندی پێشینیانی کوردی دەکات و دەڵێت: «یەکێک لە هونەرەکانی خەڵکی بەبێ ئەوەی نووسرابێتەوە، وتەیەکی کورتە و بەزۆری کێش و قافیەی تێدایە» (حسێن، ١٩٩٨: ٦).

لە کۆتاییدا ئێمەش پێناسەی پەندی پێشینیان دەکەین و دەڵێین: پەندی پێشینیان دەربڕین و گوتەی بەنرخی کۆنن کە بەشێکی زیندوو و دەوڵەمەندی کەلتووری نەتەوە پێکدەهێنن؛ بەکارهێنانیان لە قسە و وتووێژدا پاراوی زمان زیاتر دەکات و سەرەنجی گوێگر ڕادەکێشێ، وێڕای زیاد کردنی چێژ و خۆشی لە وتن و بیستندا. یاخود دەگوترێ پەند سامانی گەلێک بەنرخی ئەدەبی فولکلۆری گەلی کوردە کە زیاتر چینی نەخوێندەوار بەکاری هێناوە؛ ئەویش لەبەر کەمی بڵاو بوونەوەی هۆکاری خوێندەواری فێر کردن پەندیان کردووە بە چەکی دەستیان و لە ڕووداو و کاروبارێکدا پەندێکیان گوتووە، نەوە دوای نەوە ماوەتەوە و کردوویانە بە پێشەنگی کارەکانیان.

### گرنگی پەند:

پەندی کوردی لە هەر قۆناغێکدا سەری هەڵدابێ، گرنگی خۆی هەبووە تا ئەو قۆناغ و سەردەمەی کە تێیدا بەکار بێت. گرنگیەکەیشی لەوەدایە کە هەمیشە وا هەست دەکەی تازە لە دایکبووە و داڕێژراوە، بێ ئەوەی خاوەنەکەی دیار بێت. دەتوانرێت لەهەر پەندێکدا «کتێب، نامیلکە» و «نووسین و داڕشتنێک» دروست بکەی؛ جگە لەوەش لە دراما و شانۆشدا سوودی لێدەبیندرێت. هەروەها هۆکارێکە بۆ گەرمو گوڕ کردنی مەجیلس و دیوەخانەکان. ئەو کەسەی لە پەندی کوردی شارەزا بێت و لەبەری کردبێ، هەمیشە دەوڵەمەندە لە قسە کردن و دەتوانێ بەرامبەری ڕازی بکات و بێتە کۆڕگێڕ و قسەزانی ناو مەجلیسەکە. شاعیرانی کلاسیک و نوێ سوودیان لە پەندی پێشینیان وەرگرتووە و زۆر جار لە شیعرەکانیاندا تێهەڵکێشیان کردووە. لەوانە «پیرەمێرد»ە کە زۆر پەندی کوردی لە فەوتاندن ڕزگار کردووە و بە فۆڕم لە شیعرەکانی بەکاری هێناوە و بووەتە تایبەتمەندیەکی دیاری شاعیر؛ بۆیە لە فولکلۆری میللیدا پەندی پێشینیان بە کۆنترین بەش دادەنرێت و گرنکی و بایەخێکی زۆری پێدراوە و بووە بە ئەدەبی نووسراو. گرنگی پەندی پێشینیان لەوەدایە کە ئەو پەندانە هەر یەکە و دوای ئەزموونێک دروست بووە و وەک باپیران خۆیان دەڵێن: «هەر ئەقڵە لە نەسارێ» (محەممەدیخاڵ، ١٩٧١: ٤٨٤): واتە لە هەر ژیانێ لە ئەنجامی گرتنە بەری کارەکانمان جا لەڕووی کۆمەلایەتی یا ئابووری یا سیاسی و هەر ڕوویەکی دی ژیان بێ، ئەوان ئەزموونێکیان بۆ دروست بووە و

زانیویانە دەبێ کارەکەیان بەو جۆرە نەکردبا و ئەگەر جارێکی دیکە بیریان لە ئەنجامدانی کارێکی وا کردووە، ئەوا دەبێ تەواو ئاوا و ئاوا بوو‌بێت؛ بۆ ئەوەی لە هەڵەی کۆن دوور کەونەوە و ئەنجامی ئەم جارەیان لەوەی پێشوو باشتر بێت و ڕێگەیان ئاسانتر و سەرکەوتووتر بێت. ئەو پەندانە ئەگەرچی ڕۆژگاری دروست بوونیشیان بۆ مێژوویەکی زوو بگەڕێننەوە، نە شوان و گاوان و سەپان و هتد، نە ژیانی سادە و کۆچەری پێشوو، نە خەڵکانیش لە ئاستی بیری و ڕۆشنبیری وەک ئەوەی ئەو دەم نەمابن و ژیان لە هەموو ڕوویەکەوە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ، بەڵام بەشێکی زۆر لە پەندەکان وەک بڵێی کۆن نابن و بە گۆڕانی سەردەم ئەوانیش سنوور دەبڕن و نوێ دەبنەوە. چونکە ئەگەر دەربڕینەکانیش بە حوکمی کۆنیان سادە بن و بە زمانی خەڵکانی ئاسایی بن، بەڵام چەمکەکانیان بەهێزن و لەو دیوی زمانە سادەکەوە بەهای گەورەیان هەیە و خزمەتی گەورەتر دەکەن. جا هەر لەبەر ئەمانەی سەرەوە باسی لێکرا، گرنگی پەند وایکردووە کە پەند گوزارشت لە بیر و بۆچوون بکات کە کۆکراوەی تێڕامان و ڕای خەڵکە بەرامبەر گەردوون، ژیان، مردن، چارەنووس، قەدەر، خۆشەویستی، شەڕ و بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و هتد. بەپێی تێپەڕ بوونی کات، پەند توانی خۆی بلکێنێ بە کۆمەڵگاوە لەگەڵ هەموو سەردەم و قۆناغەکانی بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگادا بڕواو هەنگاو بنێ، هەر لە کۆمەڵگای کشتوکاڵی و دەرەبەگیدا تا سەرەتاکانی شارستانییەت و تێپەڕبوون لە گەڵیدا.

## تەوەری دووهەم

## ڕۆڵی ئافرەت لە کۆمەڵگای کوردەواریدا:

لە سەرەتای دروستبوونی ئەم زەمینە پان و بەرینەدا، هەرکە پیاو هاتە دونیاوە، ئافرەتی لەگەڵدا بوو. بوونی ئافرەتیش بۆتە هۆکاری پشتگری و سەبووری ڕۆح و دەرباز بوون لە کاتە تەنیاییەکانی پیاودا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکی بەخێوکەر و ڕاپەڕاندنی ئیش و کار و پەروەردە کردنی منداڵی لە ئەستۆ بووە. ئافرەت لەسەر ئەو زەمینەدا لە ڕووی ژیانناسیەوە ڕەگەزێکی دڵگیرە و لەچاو بەگشتی چەند تایبەتییەکی لەشولاری و توانای تەنیا جیا کەرەوەی هەیە. لە سەردەمێکی زۆر کۆنی مێژوودا نەبێ کە ئافرەت یەکەی کۆمەڵێکی یەکجار سادە و ساکار بوو، ئێتر لەوەودوا ئافرەت هەر لە زەلیلی ماڵ و ژێردەستەیی ئاغایەتی پیاو بووە؛ بەتایبەت لە گوندەکاندا هێشتا ژن لە ژێر دەسەڵاتی داب‌ونەریتی دەرەبەگایەتیدا پشتی چەماوەتەوە؛ تەنانەت دەسەڵاتی هەڵبژاردنی ژیانی خۆی نییە.

بەشداری ژن لە کاروباری هەڵسووڕانی ژیانی ڕۆژانە و بەرهەمهێناندا بە واتای سەربەستی ئەو نییە و ناتوانێ وەک پیاو بە سەربەستی لە خەبات بۆ ئازادی و هەڵسووڕانی کاروباری کۆمەڵایەتی ئاڵوگۆڕ و هاتوچۆی شاراندا، وەک نیوەی کۆمەڵ چالاکی هەبێ؛ تەنیا لە میوانی و گەل ویستیدا دەوری هەیە و ئەویش بەتەواوی تیایدا سەربەست نەبووە و نییە.

ئافرەتی کوردەواری خۆمان بەشێوەیەکی گشتی بە ژیری و وریایی و داوێنپاکی و ئازایی ناسراوە. هەر لە بەربەیانەوە هەتا ڕۆژئاوابوون ڕاوەستانی نییە، گەرمی و تاڵی و تفتی و سەرما و سۆڵەی زستان و هاوین دەچێژێ» (کاکەیی، ١٩٨٩: ١٠).

ئافرەتی کورد بە دەستڕەنگینی و خانومانی ناسراوە؛ بۆ نموونە ڕۆڵی هەبووە لە دروست کردنی تەون و مافوور و بەرماڵ و ڕایەخ و پێڵاو و کلاش و هتددا. ئافرەت لە بواری ڕستن و چنیندا ئەو کارانەی کردووە، وەکوو تەشیڕەستن، جاجم، دەزرازە، تارا، چەمەدانی، هەمبانە، هەگبە و تێشوو و ... . جگە لە کاروباری ڕستن و چنین، ئافرەت ڕۆڵێکی یەکجار گرنگی هەبووە لە دروست کردنی خواردن و خواردنەوەی جۆراوجۆردا کە زۆر جاران دڵی بەرامبەرەکەی کەمەندکێش کردووە بە ڕازاندنەوە و دروست کردنی جۆراوجۆر. لە بواری خواردن و دروست کردندا، ئافرەتی کورد ئەو جۆرە خواردنانەی دروست کردووە، وەک: پیرخەنی، دۆینە، ساوار، داندۆک، سمایلۆکە، دۆغەوا، کفتە، هەڕشتە، ماش و قەلە خەرمان و هتد. هەروەها لە بەر و بوومی سپیاییشدا ئەمانەی دروست کردووە: پەنیر، لۆرک، کەشک، ژاژی، فرۆ، دۆ و هتد. سەرباری ئەمانەش کوڕی لەتەک بەڕێوەبردنی ماڵەکەی بەشێوەیەکی جوان بەخێو کردووە و پەروەدەی کردووە؛ لێنەگەڕاوە مناڵەکەی بەبێ هیچ هۆکارێک بگری؛ لەناو بێشکەدا بە لای‌لایە و دەنگە بەسۆزەکەی ڕایژەندووە و لاواندوویەتەوە تاکوو منداڵەکەی خەوی لێکەوتووە.

ئافرەتی کورد جگە لەوەی بە دەسڕەنگینی، بەخێوکەرێکی باش بووە، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکیان بوونەتە نموونەی قارەمانیەتی و سەرقافڵەی کاروانی شۆڕشگێڕیەتیان بەرکەوتووە؛ نموونەمان زۆرن وەک: «حەپسەخانی نەقیب، لەیلا قاسم و خانزادی میری سۆران» و هتد. ئافرەتی واش هەبووە بۆ تۆڵە سەندنەوەی باوک و براکەی بەرامبەر دوژمنی باوککوشتەی جەنگاوە و تۆڵەی خۆی و بنەماڵەکەی کردۆتەوە. هەروەها لە شەڕەکانیشدا ڕۆڵی هەبووە و برینی زامدارانی تیمار کردووە و بگرە زۆربەی جاریش نان و پێداویستی بۆ دەبردن.

لەبارەی قۆناغی ئاڵوگۆڕی کۆمەڵ و پلەی ئابووری وڵات و نەریتی کۆمەڵایەتیەوە ژن مافی کار کردن لە پرۆسەی بەرهەم هێنانی هەیە؛ بەڵام نابێ ئاڵ و وێر بکاو و خاوەنی بەرهەمەکەی نییە لە کاری بنەماڵەکەیدا. حەقدەستی پێنادرێ، ئاکامی کاری دەچێتە گیرفانی پیاو، بۆ دوارۆژی نادیاری ژیانیش پاشەکەوتی نییە» (کۆمەڵناسی کوردەواری، ١٩٩٣: ١٢٣). لێرەدا دەردەکەوێ کە ئافرەت لە سەردەمی کۆندا لە ڕووی پلەی ئابووریەوە زوڵم و زۆری بەرامبەر کراوە لە ناو کۆمەڵگادا بەتایبەتی ئافرەتی لادێنشین -کە زۆر کەم دەیتوانی لە کێڵگە و زەوی و باخ و خانووی کەڵکوەربگرێ- دەستحەقیشی پێ نەدەدرا؛ کەوابوو ئافرەت نەدەبووە خاوەنی ئامرازی بەرهەم هێنان.

هەروەها لە بواری خوێندن و فێر کردندا ئافرەتی زووی کورد لەبەر سەرقاڵیان بە کاروباری ناوماڵ و مانگا دۆشین و... نەیتوانیوە ڕێگای خوێندن بگرێتە بەر؛ هۆکاری تریشی لە پاڵ ئەوەدا هەیە: بۆ کورد بە گشتی و بۆ ئافرەت بەتایبەتی لە زۆربەی شوێنەکاندا هۆکاری خوێندن و فێر کردن نەبووە و بایەخی پێنەدراوە، وەکوو

نەبوونی قوتابخانە و گەریش هەبوایە بە سێ یا چوار گوند قوتابخانەیێکی تێدا دروست دەکرا و ئەمەش لە بەردەمیاندا کۆسپێک بوو. بۆیە ئافرەت لە زۆر ناوچەدا گیرۆدەی مەینەتی نەخوێندەواری و نەریتی ماڵە باوان و مێردەکەیەتی؛ بۆیە تا سەرەتای شەستەکان و بگرە زووتریش، زۆر کەم لە دایکان و باوکان، کچانیان دەنارده قوتابخانە بۆ فێربوون. لە لادێکاندا کچان لە جیاتی خوێندن و خوێندەواری، ئیشی دەر و دەشت و کێڵگەکانیان پێ دەسپاردن؛ وەکوو: بژار، پاچەکۆڵە، نان دروست کردن و چای لێنان و هتد (گۆڤاری گوڵان، ٢٠٠٣، ژ٤٣٧: ٥٦).

لە کۆمەڵگای کوردەواریدا ئافرەت وەکوو پیاو کار دەکات و تێکەڵ بە هەموو ئێش و ئازارە کۆمەڵایەتیەکان دەبێت، بەڵام وەکوو مرۆڤێک خاوەن بیروڕا مافی دیاری کردنی دەرەنجامی ژیانی خۆی لە دەستدا نییە. بەرەبەرە لەگەڵ گۆڕانکاری سەردەم و پێشکەوتنی ڕەوڕەوەی شارستانیەت، ئافرەتی کوردیش توانی خۆی بخزێنێتە بواری خوێندن و نووسین و ڕۆشنبیر کردن؛ بەڵام بەداخەوە گەلێ جار لەلای پیاوە باوکسالار و دواکەوتووەکان بە چاوێکی سووک سەیری ئەو ئافرەتانە کراوە کە دەچنە بەر خوێندن و دەوام کردنی ئاسایی خۆیان. دەبێ ئەوەش بزانین کە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەردا(د.خ) هاتووە کە ئافرەتیش وەکوو پیاو پێویستی بە زانست و زانیاری هەیە و هیچ کات و هیچ سەردەمێک بۆ بەدەست هێنانی زانست و زانین، جیاوازی لە نێوان دوو ڕەگەزدا دانەنراوە. هەروەکوو پێغەمبەر دەفەرموێ: «اطلبوا العلم من المهد الی اللحد».

بەهەرحاڵ ئافرەتی ئەمرۆی کورد شیاوی ڕێز لێنانە؛ هەر بۆ ئەوەی دایکە و دایکیش لە هەموو بوارو و دۆخێکدا بەکەڵکترین و گەورەترین قوتابخانەی سەردەمەکانە؛ هەر بۆ ئەوەی دایک ئافرەتە و ئافرەتی ئەمڕۆش ئەندامێکی بەسوودی ئەو گەلەیە و ڕۆڵێکی گرنگی هەیە لە بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستانی دیموکراتیک و ئازادا.

## تەوەری سێهەم

## ڕەنگدانەوەی ئافرەت لە پەندەکاندا:

ئافرەت جوانترین مەلی سەر ڕووی زەمینە؛ دەتوانێ بەهەموو ڕەنگ و ڕوویەک خۆی نیشان بدات. هەوێنی شیعری شاعیرانە. تەواوی هەموو شتەکانی سەر ڕووی زەمینە. هەر شوێنێ ئافرەتی لێ نەبێ، وەکوو چێشتی بێخوێ وایە؛ بۆیە بە گوڵی مەجلیس ناوی لێدەبرێ. گەلێ جار لێرەو لەوێ لەبەر نەرم و نیانی و ناسکی ئافرەت بەکەسێکی لاواز ناو براوە؛ بەڵام ئافرەتی کورد هەمیشە هەستی ناسک و سۆزدار و جەربەزە و دەست-ڕەنگین بووە، خەمخۆر و بڕبڕەی پشتی پیاو بووە. لە کۆشی ئەوا پێگەیشتووین؛ کە دەشمرین بەناوی دایکەوە تەڵقین دەدرێین؛ بۆ پێناسەی ئافرەت هەمیشە قەرزبار و داماو و زمانلاڵین.

ئەگەر سەیری فۆلکلۆری کوردی بکەین دەبینین ئافرەت بە هەموو جۆرەکانییەوە لە ناو پەندەکاندا ڕەنگی داوەتەوە، وەک ئەمانەی خوارەوە:

**١ - ژن:**

ژن ئەو ئادەمیزادە ناسک و نازدارەیە کە خوداوەند لە ئەزەلەوە بۆ هاوڕایی پیاوی هەڵبژاردووە. هەموو مرۆڤێ سەرچاوەکەی لە ژن بووە و لە کۆشی ئەو پەروەردە کراوە. ژن بوونەوەرێکی هەست ناسک و خودان کەسێتی هەست و نەستی خۆیەتی. جگە لەوەی هەموو ئیش و کارێک پاڵپشتی پیاو بووە و ئەرکی بەخێو کردنی ماڵ و منداڵ و تەنانەت مەڕ و ماڵاتیشی لە ئەستۆ بووە. هەروا کابانی نێوماڵ و شوشتنی قاپ و قاچاخ و ئاو هێنان لە کانی و هەژاندنی مەشکە و کوندەی بەپری بەشاندا داوە؛ جگە لەوەش لەکاتی پێگەیشتنی دەغڵودان لەتەک سەپان (کێشەگێڕ) بووە و مەلۆیەکانی کۆکردووتەوە؛ بەڵام لەو سەردەمە بە جۆرێکی تر کار و پیشەی ئافرەت گۆڕاوە و دیاری دەکرێت، بۆ نموونە ئافرەتی ئێستا جگە لە ڕاپەڕاندنی کاروباری ناو ماڵ، لە دامودەزگاکان و شوێنە گشتیەکاندا شوێن پەنجەی دیارە و خودانی دەنگ و ڕەنگی خۆیەتی. ئەو پەندانەی کە ژن تێیدا بەکارهاتووە وەک:

- *ژن کە نەتوانێ تۆڵە بسێنێ، وەک مناڵ ئەگری* (خاڵ، ١٩٧١: ٢٦٤).

واتە: لێرە ژن بەبێدەسەڵاتی ناوی هاتووە. ئەمەش بێهێزی ئافرەت دەردەخات لە کۆمەڵدا و ئافرەت دەخاتە ڕیزی مناڵ لە ڕووی بێتواناییەوە، بۆیە پێویستە ئەو پەندە بەکار نەیەن.

- *ژنەکەت بوو، دوژمنت بوو* (لۆبون، ١٩٣٣: ٥١).

لەو پەندەدا ژن وەکوو دوژمنێک سەیر کراوە، بەڵام لە ڕاستیدا ژن وەکوو چەمکێکە کە دەتوانێ زۆرجاریش دوژمن بکوژێ.

- *زۆر کەم ژن ئەوەستێ بیر بکاتەوە، مەگەر لەبەر ئاوێنەدا* (خاڵ، ١٩٧١: ٢٦٠).

واتە: ژن لە هیچ بیر ناکاتەوە، مەگەر لە جوان کردنی خۆی لەبەر ئاوێنە. سەیر کردنی ئافرەت بە چاوێکی نزم لە زۆر پەندەکاندا بەدی کراوە، بەڵام ئافرەت بەوە ناوەستێ، بەڵکوو لە دامودەزگاکان و سەنتەرەکاندا بەشداری دەکا و ڕۆڵ دەبینێ و ڕای وەردەگیرێ.

- *ژن پرچی درێژە، لە بیردا زۆر کورت و گێژە* (یەعقووبی، ٢٠٠٧: ٨).

واتە: سەیر مەکەن ژن قژی درێژە، بەڵکوو لە بیر کردنەوەدا زۆر لاوازە. ئەمەش بێتوانایی ئافرەت دەردەخات. ئەگەر سەرەنج بدەین دەبینین ئافرەت زۆر جار هەستی بریندار کراوە بەو پەندانە، بواری بیر کردنەوەیان تەسک کردووتەوە بۆیە پێویستە ئەو پەندانە لەناو ببرێن چونکە ئافرەت بەرامبەر بە پیاو بێتوانا و لاواز دەکات.

ئەمە هەندێک لەو پەندانە بوو کە دەتوانین بیخەینە قاڵبی ڕەخنە و ڕەخنەی لێبگرین، چونکە ئەو پەندانە لە کۆمەڵگای ڕۆشنبیر و تێگەیشتوودا بەکار نایەت، لەبەر ئەوە تێڕوانینی ئەو کۆمەڵگایانە بەرامبەر ئافرەت زۆر ژیرانەیە و ئەوان ئافرەت بە نیوەی کۆمەڵ و کۆمەڵگا دادەنێن و هەروەها بواری شیاو بۆ ئافرەت دەڕەخسێنن، تەنات لە دەرەوەی ماڵیش جێی پەنجەی دیار بێت. لە هەمان کاتدا نموونەی پەندی جوانیشمان هەیە کە لە بەرژەوەندی ئافرەت بەکار هاتووە، بواری بیر کردنەوە و ڕۆشنبیری ئافرەت پیشان دەدات وەک:

- *ماڵی بێژن، چۆڵەوانییە* (دەشتەکی، ۲۰۰۱: ۸٦)

واتە: ماڵ ئەگەر بێژن بێت وەک باخی بێباخەوان وایە؛ بێ ئەو ماڵ چۆڵە و شپرزە، چونکە ژن ماڵ ئاوەدان دەکاتەوە و بەڕێوەی دەبات، هەر وەکوو دەڵێن: «ژن و ماڵیان وتووە».

- *ژنی باش سەروەتە، موڵکی باش خانیە، ئیشی باش جووتیاریە، کاسبی چاک بازەرگانیە* (یەعقووبی، ۲۰۰۷: ۷).

واتە: ژنێکی چاک بۆ ماڵ و منداڵ باش بێت و بتوانێ خێزان بەچاکی بەڕێوە ببات و لەگەڵ هاوسەرەکەی چاک بێت، ئەوا بەرەکەت دەخاتە ئەو ماڵە و وەک سامانێک وایە کە لە دوارۆژدا نەوەیەکی باش پێگەیەنێت.

هەروەها ژن لەو پەندانەی خوارەوەشدا هاتووە، وەک:

- ژن *ئەگەر نەخشینە، ماڵی ڕەنگینە* (هەمان سەرچاوە)
- ژن *وەک هەناسەیە بۆ مێرد* (هەمان: ۸).
- ژن *بێنە ژنانە، پێستە بکاتە هەمبانە* (نوری، ۲۰۰٦: ۲٦).
- *ژنا ئابوور بەرچێترە ژ ژنا بەرِک کەر* (هەمان: ۲٦).
- ژن *ماڵە، بنیات خانی* (شێخەڵلا عەلی، ۱۹۸۰: ۱۰۰).
- ژن *بێنە ژماڵان ئاڤێ ڤەخۆ ژسەر کانیان* (ڕەسووڵ، ۱۹۸٤: ۱۰۱).
- *ژنی خراپ منداڵی خاسی لێناکەوێتەوە* (شارەزووری، ۱۹۸۱: ٥۹).

ئەو پەندەش زۆر پشتی پێ نابەسترێ، چونکە جاری وا هەیە ژنی خراپ منداڵی عاقڵ و ژیرانەی لێدەکەوێتەوە.

- *ماڵی بێژن، وەکی کاولە ئاشیە* (یەعقووبی، ۲۰۰۷: ١٤)
- *ژنا بینن ژمالادا خو هارزی بدن بخالا* (دێرشەوی، ۱۹۸۰: ١٦۲).
- *ژنا چاق لدەر مێرێ خۆلی سەر*
- *ژنێت جوان زەلدەمێت لاو دڤێن.*
- *ژن گیزە ژسەدا ئیما عەزیزە.*
- *ژن بەراسی خوارە.*

**۲- دایک**

کە بە نیشتمانی یەکەم ناسراوە و کۆشی ئەو قوتابخانەی گرنگ و مەزنە، ڕانی ئەو نەرمترین سەرینی منداڵەکەی بووە. لای‌لایە و سۆزی دایک خۆشترین سەمفۆنیای جیهانە و بەسۆزترین دەنگی هەیە؛ هەر دایکە ئەرک و ماندووبوون و شەونخوونی بۆ ڕۆڵەکەی دەکێشێت. دایک ڕۆڵی پەروەردە و بەخێو دەکات و هەموو ئێش و ئازارەکانی ڕۆژگار لە کۆڵ دەنێ و دەگرێتە ئەستۆی خۆی. تەنانەت پێغەمبەر(د.خ) دەفەرموێت: «الجنة تحت اقدام الامهات».

تێڕوانینی دایک لە پەندی پێشینیاندا لەمانەی خوارەوە ڕەنگی داوەتەوە، وەک:

- *دایکی خۆم کابانە تێر ئەخۆم کفتانە* (دەشتەکی، ١٩٧٢: ٤٥).
- *دایک ببینە و دۆتە بخوازە* (ڕەسووڵ/تەقی، ١٩٨٤: ١٠١).
- *دایکی دز یا سنگ دەخوات یا سنگ ئەکوتێ* (شارەزا، ١٩٧٦: ٨١).

(واتە یا سنگی مریشک و قەلی دزراو ئەخوا یا کوڕەکەی لە دزیدا ئەکوژرێ و سەنگی خۆی ئەدا).

- *دایکی مناڵان ئەخوا نان و چنگاڵان* (خاڵ، ١٩٧١: ٢١١).

(واتە دایک کە مناڵی زۆری بوو هەر یەکێکیان داوای جۆرە خواردەمەنییەک دەکات و بیانوو بۆ شتێ ئەگرێ، دایکەکەش بەناچاری بۆیان پەیدا دەکات و لەو کاتەشدا خۆشی تێری لێ‌دەخوا).

- *دایک ببینە و کچەی بخوازە* (گۆڤاری کاروان، ٢٠٠٠، ژ١٤٥: ٩٢).
- *دایک بە دەوڵەتە، نۆبەرەی عەورەتە* (دەشتەکی: ٤٥).

(واتە: گەر ئافرەت نۆبەرەی کچ بێت، چونکە لە ئیش و کاردا یارمەتی ئەدا، ئەو ئافرەتە دەوڵەمەندە).

- *دایک و باوک لە قازیە، مناڵ لەوازیە* (خاڵ، ١٩٧١: ٢١٠).
- *دایک مەدحی کچ بکات مەگەر خاڵۆوان بیخوازێ* (هەمان: ٢٠٩).
- هەرکەس *دایکی نانەوا بێ، لە برسان نامرێ* (یەعقووبی، ٢٠٠٦: ٢٠٩).
- بەختی *دایکان جیهازی کچانە* (هەمان سەرچاوەی پێشوو).
- *دایک لای ئەولاد قەد کۆن نابێ* (خاڵ،١٩٧١: ٢٠٩).
- *دایک و دۆت بەشەڕ هاتن، بێ عەقڵان باوەڕ هاتن* (یعقووبی:٢٠).

**٣-کچ، کیژ، دویتە:**

ئەو مرۆڤە ناسک و جوان و ڕەنگینە کە بووەتە جێی سەرسووڕمان و سەرنجڕاکێشانی بەرامبەرەکەی و مایەی خوشحاڵیەتی؛ وەکوو تاکێک لەناو خێزاندا ڕۆڵ و کاریگەری هەیە و هەر ئەویشە دەبێتە دایک و بووک و خەسوو و هتد. وەکوو ئافرەتێکی کارامە دەوری خۆی گێڕاوە لە کۆن و ئێستادا. لەکۆندا کاروباری ناوماڵی بەڕێوە بردووە، دەستڕەنگینی هەبووە لە زۆر کاردا. هەروەها ئێستاش لە دام و دەزگا ڕەسمی دەوڵەتیەکاندا دەتوانێ شانبەشانی کوڕەکان ئەرکی خۆی بەڕێوە ببات. ئەو پەندانەی لەسەر کچە لە پێشاندا گوتراون:

- *کچ قەڵایە ناگیرێ* (ڕەسووڵ، ١٩٨٤: ١٠٧).
- *کچ بەبێ باوک نرخی نییە، باخ بەبێ پەرژین جوانی نییە* (خاڵ، ١٩٧١: ٢٢١).
- *کیژ پردە، هەموو کەس بەسەریدا تێدەپەڕێ* (دەشتەکی، ٢٠٠١: ٧٥).
- *کیژ تەشی دایکی دەڕێسێ* (هەمان سەرچاوەی پێشوو).
- *کیژ هەستاوە بەیانی، فەرشەی هەرگرت لۆنانی* (دەشتەکی: ٧٥).
- *کچی جوان بەرای سەرە، زمان شیرن قوڕ بەسەرە* (هەمان سەرچاوە).
- *هاتە داخوازیم کە کچ میر بووم بە دەستگیران کرام وەزیر بووم، چوومە ماڵیان یەخسیر بووم* (هەمان سەرچاوە: ٨٧).

- *کچە تیمی گەراران*، *بووینە کابانی ماران* (هەمان سەرچاوە: ٧٣).
- *کوڕ لە مەیدانێ سەرکەوتن دێنێ*، *کیژ لە ماڵێ سیو دەنەخشێنێ*، *نامەرد بەینیان دەپسێنێ* (هەمان سەرچاوە: ٧٤).
- *کیژ بێ دایک*، *مەنجەری بێسەرپۆشە* (یەعقووبی، ٢٠٠٧: ٢٢).
- *کیژا میران*، *ناهێت بنەختێ فەقیران* (هەمان سەرچاوە).
- *کچ نیشانا ماڵییە* (هەمان سەرچاوە).
- هەرچی *بابێ کچێک نازاند*، *گوندێک بەزاند* (هەمان سەرچاوە).
- *کچ لەگەڵ تۆمە*، *بووکێ گوێت لێ بێ* (لۆبون، ١٩٣٣: ١٠٤).
- دوێتە *لە ماڵ تاقی بکەرەوە*، *ئینجا بینێرە بۆ گیای کەژ* (یەعقووبی، ٢٠٠٧: ٢٢).

**٤ -خوشک:**

یەکێکە لە ئەندامانی خێزان وەکوو ئافرەتێک کاریگەری هەبووە لە ژیاندا و ڕۆڵی خۆی لە هەموو کاروبارێکدا گێڕاوە. لە کۆمەڵگای ئێمەدا بە خوشکی برا یا خوشکی ژن یاخود خوشکی پیاو یا خوشکی دایک و باوک دەوترێ. ئێنجا بە بۆنەی تێکەڵاو بوون و ژن و ژنخوازیەوە ئەو ناوە دەگۆڕێت بە «پوور»؛ واتە بە خوشکی دایک و باوک ئەڵێن. خوشک لەو پەندانەدا بەکار هاتووە:

- *ئەوەی خوشکی جوانە ئەتۆو ئەو برانە* (هەمان سەرچاوە: ٢٤).
- *داری بێگەڵا قیمەتی نییە*، خوشکی *بێبرا زینەتی نییە* (هەمان سەرچاوەی پێشوو).
- *داری قەرەداغ پەلکی دەرمانە*، خوزگەم بەو خوشکە *برای میوانە* (هەمان سەرچاوەی پێشوو).
- *هاوارم لەبەر خوایێ*، یەک *لەبەر* خوشکێ یەک *لە برایێ* (هەمان سەرچاوەی پێشوو).
- *دەست برا بەتەمای دەستی* خوشک *بێ*، هەر *بێ ژنە* (هەمان سەرچاوەی پێشوو).
- ئەگەر *برا شوانە*، خوشک هەر *چاوەڕوانە* (خاڵ، ١٩٧١: ٢٠).
- *مارێ بە خوشکێ هێلانەی خوشکێ* (دەشتەکی، ٢٠٠١: ٨٦).

**٥ -بووک:**

بووک تاکێکی کۆمەڵە و بەو کچە دەوترێت کە لە کوڕێک مارە دەبڕدرێت. لە نێو نەتەوەی کورددا لە تەمەنی پانزە ساڵیەوە تا دەگاتە دوا پلەکانی تری تەمەن بە بووک دەچێت. لەکاتی خۆی کچێک مارە دەبڕدرا و دوایی دەست دەکرا بە شەکراو خواردنەوە و ڕۆژێک پێش گواستنەوە بۆ ئێوارەکەی دەستکرا بە خەنەبەندان و هەڵپەڕکێ. بۆ بەیانییەکەی بووک بە تارای سپی و سوور و ئاڕایشتکراو بە بووکی دەبرا.

# سترانا فولكلوری وخزمەتا دیرۆكا كوردان

د. سەلاح موحەممەد سەلیم مەحموود هرۆری

**كورتە:**

مللەتێن بیانی، ژ مێژەوە گرنگی ب تومارکرن و شرۆڤەکرنا سترانا خوەیا فولکلوری دایە؛ چونکە ستران بەرهەمێ پێدڤیێن ژیانا مرۆڤایەتیێ و دەنگێ دەربڕینا هەر مللەتەکییە ژ هزر و هیڤی و باوەریێن خوە. ستران دەنگڤەدانا بویەر و رویدانێن ل دەوروبەرێن مرۆڤایەتییێیە و ل دووی هەبوونا کارێن جوداییێن هەر مللەتەکی سترانێن جودا ژی هەنە، ئانکو هەر سترانەکێ مەرەما خوە هەیە. سترانا فولکلوری‌یا کوردی پەیوەندیەکا موحکم ب بارێ ژیانا جڤاکی و رەوشت و تیتالێن کوردان ڤە هەیە. مللەتێ کورد ژکەڤندا حەز ژ سترانێ کریە، لەورا دبینین سترانا کوردی گەنجینا فولکلورێ کوردی دەولەمەند کریە.

تایبەتمەند و خەمخۆرین فولکلۆرێ کوردی سترانا فولکلوری‌یا کوردی ل سەر چەند لق وتا بارڤە کریە، ئێک ژ ڤان لقا دبێژنێ «لاوک» و ل هندەک جهان ب رەنگێ سترانا «شەرا، مێرانی، سوارا» هاتیە؛ چونکە ڤێ سترانێ باسێ رویدانێن دیرۆکی کریە و دبیتە ژێدەرەک ژ ژێدەرێن دیرۆکا کوردی. لەوا ئەم دبینین ناڤێ ڤێ سترانێ ببیتە سترانا دیرۆکیا کوردی. ژبەر نەبوونا سەروبەرەکێ سیاسیێ ئارام ل کوردستانێ، کو هەردەم دەڤەرێن وێ ل ژێر دەستهەلاتداریا هێزێن بیانی ڤەبوو و هەر ژ بەر ڤی سەروبەری گرنگی ب خوێندەواریێ نەهاتیەدان. لەورا کورد بەرەڤ سترانێ چووینە بو تۆمار کرنا وان رویدانێن ل دەوروبەرێن وان پەیدابووین و گەلەک ژ ڤان رویدانا رویدانێن د دیرۆکی بوون، و مفا ژڤێ سترانێ دهێتە وەرگرتن وەک ژێدەرەک بۆ دیرۆکا کوردان.

گەروکێن بیانی ئەوێن هاتینە کوردستانێ و دگەل مللەتێ کورد ژیاین، ب ئاوایەکێ باش باسێ ڤێ سترانێ دکەن. هەروەسا ئەو کەسێن دیرۆکا کوردی خواندی، بابەتێ سترانا دیرۆکیا کوردی ب گرنگی وەرگرتیە. رۆژهەلاتناسا ژی گرنگیەکا پر مەزن دایە ڤی رەنگێ سترانێ و ژێریا مابنە حەیری، کو هژمارەکا مەزن ژ ڤان سترانا هەنە و هندەک ژ ڤان نڤیسەران ب ڤان سترانا داخبار بووینە. دیسان ڤەکۆلەرێن کورد ژی باوەری ب وێ چەندێ هەیە، کو پێدڤیە سترانا فولکلوریا کوردی بۆ نڤیسینا دیرۆکا کوردی بهێتە بکارئینان. هەتا

**بەشی سێیەم- فولکلۆر**

نڤیسەرەک گەهشتیە وێ چەندێ، کو دیرۆکا مللەتێ کورد هەمی ب رێکا سترانا هاتیە پاراستن (الخصباک،١٩٧٢: ٥٠٢) و نڤیسەرەکێ دی ژی دیار کریە، سترانا فولکلوری دبیتە سەرۆکانیا ژێدەرێن دیرۆکا کوردان.(مصطفي رسول،١٩٨٣: ٧)

ستران ب گەلەک بابەتێن دیرۆکی هاتیە گۆتن، وەکی ب میرو میرگەهێن کوردی یان ب بزاڤ و خەباتا میرێن کوردان، هەر دیسان د سترانا دیرۆکیا کوردیدا باسێ سیاسەتا ئوسمانیا بەرامبەری کوردان کریە. شۆرەش و سەرهلدانێن کوردی ژی بووینە بابەتێن سترانا کوردی و سەرکردێن ڤان شۆرەشا بووینە ناڤ و نیشانێن ڤان سترانا؛ مینا: سترانا شێخ مەحمودی، سمکویێ شکاک و شێخ سەعیدێ پیران. بزاڤ و کارێن سیاسییێن سەرۆک و ئێلێن کوردی د سترانا کوردی دا جهێ خوە کریە؛ مینا سترانا عەلیێ بەتێ و گەلەکێن دی. هەروەسا گەلەک رویدانێن دی د سترانا کوردی دا دەنگڤە دایە وەکی فەرمانا فەلا ل سێمێلێ ل سالا ١٩٣٣ و فەرمانێن ئێزدیا و گەلەک رویدانێن دی.

بەرێخودانەک بۆ ناڤەرۆکا ڤان سترانا چەند خالێن گرنگ دیار دبن وەکی:

١- رویێ ئایینی دایە خەبات وبزاڤا مللەتێ خوە.

٢- هەڤکاری و پشکدارییا دوو سەرکردان یان دوو ئێلا د سترانا دیرۆکییا کوردیدا گەلەک دیار و ئاشکرایە.

٣- ستران وەک پروپاگەندەک بۆ بلند کرنا هەستێ مللەتی بەرامبەر هێزا دوژمنی هاتیە بکارئینان.

٤- جهێ جوگرافییێ یێ شەری یان رویدانێ د دسترانێ دا دیاربوویە.

٥- ناڤێن کەسێن پشکدار و ئامیرە و چەکێ هاتیە بکارئینان د رویدانێدا د سترانێدا ددیارن.

٦- ئەنجامێن رویدان ل دویماهییێ هاتینە ئاشکرا کرن.

**پەیڤێن سەرەکی:** فولکلور، ستران، سترانا کوردی

## پێشگوتن

ڤەکۆلەر و نڤیسەران گەلەک پێناسە بۆ پەیڤا «فولکلور»[1] دانانە، بەلێ هەمی ل دۆر ئێک رامان کۆم دبن کو پەیڤا فولکلور رامان ژێ: زانستەکە گرنگیێ یان پویتەی ددەتە رەوشت و تیتال و تێگەهێن جڤاکی یێن هەر مللەتەکی و د هەر قوناغەکا دیرۆکیدا کو ئەو مللەت تێدا دەرباز بووی. ئەگەر ب رەنگەکێ دی بەرێ خوە بدەینە پەیڤا فولکلور و بابەتێن وێ، دێ بێژین فولکلور ژی ژ هەر ئەفراندنەکا کەڤنا هەر مللەتەکی پێکدهێت، چ ئەفراندنەکا دەسپێکی بیت، ئەو ئەفراندن ژی بکار ئینانا دەنگ و پەیڤ و هوزان و پەخشان ب جە دهێت، دیسان بیر و باوەر و جیڤانوک و سنج و داوەت و یاری و کریارێن مللەتان ب خوەڤە دگریت [2].

فولکلورێ کوردی ژی وەکی فولکلورێ هەر مللەتەکێ دی ژ گەلەک لقا پێک دهێت و تایبەتمەندییێن ڤی زانستی، فولکلورێ کوردی ژی دابەش‌کریە. بەلێ وەکی ئەو بخوە دبێژن، ستران (مەبەست سترانا فولکلوری) گرنگترین لقێ فولکلورییە (مستەفا ڕەسووڵ،١٩٧٠: ٩٥ و موکری، ١٩٨٤: ٣٨).

مللەتێن بیانی، ژ مێژەوەرە گرنگی دایە تومارکرن و شرۆڤەکرنا سترانا خوەیا فولکلوری؛ چونکە ستران بەرهەمێ پێدڤیێن ژیانا مرۆڤایەتیێ و دەنگێ دەربرینا هەر مللەتەکی یە ژ هزر و هیڤی و باوەرییێن خوە و ستران دەنگڤەدانا وان بویەر و رویدانە ئەوێن ل دەوروبەرێن مروڤایەتیێ پەیدابووین و سترانا فولکلوری ژی گەلەک سالوخەت و سیماییێن تایبەت هەنە، کو ل ڤێرێ بابەتێ مە نینە لەورا دێ بێژین سترانا فولکلوری ژی گەلەک تا ژێ دچن و ل دوی هەبوونا کارێن جوداییێن هەر مللەتەکی سترانێن جودا ژی هەنە، ئانکو هەر جورەکێ سترانێ مەرەما خوە هەیە (مرسی، ١٩٧٥: ١٣-٩).

سترانا فولکلوریا کوردی ژی پەیوەندیەکا موحکم ب بارێ ژیانا جڤاکی و رەوشت و تیتالێن کوردان ڤە هەیە و مللەتێ کورد ژکەڤندا حەز ژ سترانێ کریە، لەورا سترانێ گەنجینا فولکلورێ کوردی دەولەمەند کریە.

تایبەتمەند و خەمخۆرێن فولکلورێ کوردی، سترانا فولکلوریا کوردی ل سەر چەند جوران بارڤەکرینە (ڕەسووڵ ئیبراهیم، ١٩٨٤: ١١٦). ل ڤێرێ بتنێ دێ باسێ وی جورێ سترانێ کەین، ئەوێ دبێژنێ سترانا دیرۆکی و هندەک دبێژنێ «لاوک» و دیسان ب رەنگێ سترانا «شەرا، مێرانی، سوارا» هاتیە. بەلێ چونکە ڤێ سترانێ باسێ رویدانێن دیرۆکی کرینە، لەوا وەکە ژێدەرەک ژ ژێدەرێن دیرۆکا کوردی دهێتە هژمارتن (علی یحیی، ١٩٨٥، گ: کاروان: ١٥١-١٤٦).

ڤاڤاراتنا رەنگێن ژێدەرێن دیرۆکا کوردی هەتا نووکە ب رەنگەکێ زانستی نەهاتیە کرن و "شاکر الخصباک"ی دیار کریە کو جورێن ژێدەرێن دیرۆکا کوردی: نڤێسینێن گەروکا و نڤیسینێن زانستی و ڤەکولینێن ئەکادیمی‌نە (گ.کاروان، ١٩٨٥، ژ٢٨: ١٥١-١٤٦). بەلێ «ئەنوەر مایی» د پێشگوتنا پەرتووکا

---

[2] سەبارەت پێناسا فولکلوری بنێرە:

- (یونس،١٩٨٣: ١٧٣-١٧٢) و (مرسی،١٩٧٥: ١٧٣-١٧٢) و (ئەحمەد سمۆ،٢٠٠١: ١٤-٩).

خوەدا  یا کو بناڤێ «الاکراد فی بهدینان» سترانا کوردی ژی کریە ژێدەرەک ژ ژێدەرێن دیرۆکا کوردی، کو گەنجینەک پڕە ژ رووێدان و بویەرێن دیرۆکی (المایی،١٩٩٠: ١٣٧).

من دڤێت ل ڤێرێ بێژم، کو سترانبێژێن دەڤەرا مە (بادینان) سترانێن دیرۆکی د سینگێ خوەدا پاراستینە و پێدڤیەک فەرە بهێنە تۆمارکرن. بزاڤا تومارکرن و شرۆڤەکرنا ڤان سترانا هێشتا نە ل وی ئاستێ پێد ڤیەیە.

ژبەر نەبوونا سەروبەرەکێ سیاسیێ ئارام ل کوردستانێ، کو هەردەم دەڤەرێن وێ ل ژێر دەستهەلاتداریا هێزێن بیانی ڤە بوو و هەر ژ بەر ڤێ سەروبەری گرنگی ب خوێندەواریێ نە هاتیە دان، یان ئەو کەسێن خویندن دزانی رەوشنبیریا وان فارسی، یان عەرەبی یان تورکی بوو، ژ بەر ڤی سەروبەری، هندەک ژ کوردان بەرەڤ سترانێ چووینە بۆ تۆمارکرنا وان رویدانێن ل دەوروبەرێن وان پەیدابووین و گەلەک ژ ڤان رویدانا رویدانێن دیرۆکی بوون و مفا ژێ دهێتە وەرگرتن وەک ژێدەرەک بۆ نڤیسینا دیرۆکا کوردی.

گەروکێن بیانی ئەوێن هاتینە کوردستانێ و دگەل مللەتێ کورد ژیاین، باسێ سترانا دیرۆکی دکەن، هەروەسا ئەو دیرۆکڤان ونڤیسەرێن ڤەکۆلین ل سەر دیرۆکا کوردی ئەنجام داین، ل سەر بابەتێ سترانا دیرۆکیا کوردی راوەستیاینە، هەتا وێ یەکێ کو هندەک نڤیسەر ب ڤان سترانا داخبار بووینە. ڤەکۆلەرێن کورد ژی باوەری ب وێ چەندێ هەیە کو پێدڤیە سترانا فولکلوریا کوردی بۆ نڤیسینا دیرۆکا کوردی بهێتە بکار ئینان.

ئاشکرایە، رۆژهەلاتناسا ژی گرنگیەکا پر مەزن دایە سترانا کوردیا دیرۆکی و ژێرا ماینە حەیری، کو هژمارەکا مەزن ژ ڤان سترانا هەنە و باسێ رویدانێن گرنگێن دیرۆکا کوردی دکەن (جەلیل، ١٩٧٧: ٥-٤).

"باسیلی نیکتین" د پەرتووکا «الاکراد»دا، سەبارەت بابەتێن سترانا کوردی، دبێژیت: سترانێن کوردی یێن نە ئولی، باسێ بابەتێن دلینی (دلوڤان) و خوشمێریا کوردان دکەن. ل جهەکێ دی نیکتین دیار دکەت: بەهرا پتر سترانێن کوردان باسێ شەر و چەلەنگیا ئاغا و شێخێن کوردا دکەن (نیکتین، ١٩٧٦: ١٢٣).

ل دووڤ گۆتنا «فرانسبتوللافارک»ی، سترانا کوردی بهایەکێ دیرۆکییێ مەزن هەیە (جەلیل، ١٩٧٧: ٩). نڤیسەرێ ئەرمەنی و شەهرەزایێ ئەدەبێ کلاسیکیێ ئەرمەنی «رافی» نڤیسیە، سترانا مێرانییێ خودیکا روحا کوردێن مێرخاسە (جەلیل، ١٩٧٧: ٦).

رۆژهەلاتناسێ فرەنسی «تومابوا» ب ڤی رەنگی سترانا دیرۆکیا کوردی خوەیا دکەت:  شەرێن د ناڤبەرا هۆزێن کوردیدا بووینە ستران، بەلکو هەر شەرەکی سترانبێژێ خوە هەبوو و کەسێن خوە کرینە قۆربان بۆ کوردستانێ ستران پێ هاتینە گۆتن (شەریف عوسمان، ١٩٦٩: ٩٩).

«ئوردیخانێ جەلیل» پەرتووکەک ل سەر بابەتێ «سترانا دیرۆکی» نڤیسییە، دیار دکەت: دەولەمەندیا سترانا دیرۆکی د ناڤ سترانا کوردیدا بەرچاڤ و دیارە و د ناڤ کورداندا، ئەڤ رەنگێ سترانێ بەربەلاڤە، کوردێن باکووری و رۆژئاڤای دبێژنێ «سترانا مێرانییێ» یان «سترانا شەران»، کوردێن باکووری دبێژنێ «لاووک».جەلیل ل جهەکێ دی خوەیا دکەت: بنیاتێ سترانا کوردی ب گشتی خودیکا ژیان و دیرۆکا کوردایە (جەلیل، ١٩٧٧: ٧-٦).

«كامران بەدرخان»ى ژى ديار كريە: ديرۆكا بزاڤا مللەتێ كورد هەمى ب رێكا سترانا هاتيە تۆماركريە (الخصباك، ١٩٧٢: ٥٠٢).

«بەدرخان‌سندى» ژى دبێژيت: ئەز دشێم بێژم رێژەكا باش ژ سترانێن كرمانجان چيرۆك و رويدانێن ديرۆكينە (الخصباك، ١٩٧٦ : ١٩).

«عيزەددين مستەفا رەسووڵ» د وێ هزرێ دايە: ڤيانا وەلاتى گەلەک ب ئاشكرايى د سترانا ديرۆكى دا ديار دبيت و وێنێن رويدانێن ديرۆكى و خەباتا خوشمێر و چەلەنگيا وان د رويدانێن ديرۆكيدا ئاشكرا دبيت. ديسان د ڤان سترانانداندا باسێ داگيركرنا وەلاتى هاتيە، ئەڤە ژ لايەكى ڤە، وە ژ لايەكێ دى ڤە باسێ داخوازا ئازاديێ ژى كريە (مصطفى رسول، ١٩٦٦: ٥٢-٤٦).

وەكى ديارە سترانا ديرۆكيا كوردى، گەلەک شاشيێن ديرۆكنڤيسا ديار كرينە و هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ژى عيزەدين‌مستەفارەسوول جارەكا دى دبێژيت: ئەم د وێ باوەريێ داينە كو ژ بۆ نڤيسينا ديرۆكا كوردان فولكلورێ كوردى بكار بينين و فولكلورێ كوردى (مەبەست سترانا فولكلوريە) ژى دێ بيتە سەرۆكانيا ژێدەرێن ديرۆكا كوردان (مصطفى رسول، ١٩٨٣: ٧). عيزەددين ل جهەكێ دى ددەتە خوياكرن: سترانا كوردى يا ديرۆكى گەلەک شەرێن كەڤن دينێتە بيرا مرۆڤى، كو ڤان شەران هەڤبەنديەک ب رويدانێن ديرۆكێ ڤە هەيە (مصطفى رسول، ١٩٨٢: ١٢٨-١٢٧).

«محەمەدى مەلاكەريم» ژى ل دۆر سترانا فولكلوريا كوردى دبێژيت: د سترانا كورديدا باسێ خەباتا كوردان ل دژى ئوسمانييا هاتيە كرن، ديسان باسێ بزاڤا كوردان ژ بۆ بەرگرى و پاراستنا ئەردى هاتيە كرن (مصطفى رسول،١٩٧٠: ٧٩).

ل دويماهيێ «عەبدولفەتاح عەلى‌يەحيا» ديار دكەت: سترانا كوردى ژيان و خەباتا كوردان بەرچاڤ كريە، ئەڤ سترانە وەكى شيرەكێ دوو دەڤە، چونكە ستران ب كريارێن زالم وحاكمێن كوردستان داگيركرى هاتينە گۆتن ئەڤە ژ لايەكى ڤە؛ ژلايەكێ دى ڤە ستران ب كەسێن خەباتكەر و بزاڤا وان ژ بۆ قورتال‌كرنا مللەتى ژ زۆرداييێ هاتينە گۆتن؛ ئانكو ئەڤ ستران‌بێژە بناڤێ مللەتى د ئاخفتن و دەربرين ژ ئێش و ئازارێن مللەتى كريە (على يحيى، ١٩٨٥: ١٥٥).

وەسا ديار دبيت، كو ستران‌بێژێن كورد بتنێ بەحسێ كوردان و خەباتا وان نەكريە، بەلكو بەحسێ بزاڤا ئاسورى و ئەرمەن و عەرەبان ژى كرينە.

مللەتێ كورد وەكى مە دياركرى، بەهرا بتريا رويدانێن ديرۆكا خوە تومار نەكرينە، و ب رێكا سترانان گەلەک رويدان هاتينە تۆماركرن، بەلێ هندەک ژ وان كەسێن ئەڤان سترانان دبێژن يان يێن تۆمار كرين نەخويندەوار بوون، لەورا گەلەک جاران كێشا ڤان سترانا ل بەر چاڤ نەهاتيە وەرگرتن. ديسان پەيڤێن ڤان سترانا گەلەک جاران ستران‌بێژا گوهورينە و پەيڤێن نوى بكار ئانينە؛ بەلێ وەک ناڤەرۆک هاتيە پاراستن.

ناڤێن گەلەک ستران و سترانبێژان د ناڤ پەرتووکاندا هاتینە پاراستن؛ مینا عەلی‌بەردەشانی کو گەلەک لایەنێن ژیانا میرێن بابان ل دوماهیا چەرخێ هەژدێ و دەستپێکا چەرخێ نوزدێ دیارکرینە. هەروەسا باسێ بزاڤ و چەلەنگی و خوشمێریا وان کریە. مینا عەبدوڕەحمان پاشایی و گەلەکێن دی (مصطفی رسول: ٥٤-٥١).

ستران ب گەلەک بابەتێن دیرۆکی هاتینە گۆتن؛ وەکی ب میر و میرگەهێن کوردی و ب بزاڤێن وان؛ وەکی سترانا «میر سەیفەدینێ بۆتانی»، «میر بەدرخان بەگی». دیسان د سترانا دیرۆکیا کوردیدا باسێ سیاسەتا ئوسمانیا بەرامبەری کوردان هاتیە کرن. شۆرەش و سەرهلدانێن کوردی ژی بووینە بابەتێن سترانا دیرۆکیا کوردی. سەرکردێن بزاڤێن شۆرەشا بووینە ناڤەرۆکا سترانا دیرۆکی؛ مینا سترانا «شێخ مەحموودی»، «سمکویێ شکاک» و «شێخ سەعیدێ پیرانی». بزاڤ و کارێن سیاسیێن سەرۆک هۆزێن کوردی د سترانا کوردیدا هاتینە پاراستن؛ مینا سترانا عەلیێ بەتێ و گەلەکێن دی. هەروەسا گەلەک رویدانێن دی د سترانا کوردیدا دەنگ ڤەدایە؛ وەکی فەرمانا فەلا ل سێمێلێ ل سالا ١٩٣٣ و فەرمانێن دەولەتا ئۆسمانی ژ بۆ قرکرنا ئێزدیان و گەلەک رویدانێن دی.

بەرێ خوەدانەک د ناڤەرۆکا سترانا دیرۆکیا کوردیدا گەلەک خالێن گرنگ بەرچاڤ دبن وەکی:

١- سترانا دیرۆکی رویێ ئایینی دایە خەبات و بزاڤا مللەتێ خوە:

د گەلەک سترانانداندا نەخاسمە ئەو سترانێن باسێ شۆرەشا خەبات و بزاڤا سەرکردێن کوردا دکەن، رویێ ئایینی بەرچاڤ دبیت و مەرەم ژڤێ چەندێ ژی ئەوە، کو ئەڤ لایەنە (ئایینی) ل سەر جڤاکێ کوردیێ زالبوو؛ ئەڤە ژ لایەکی ڤە، ژلایێ دی ڤە سترانبێژی ڤیایە وێنەکێ پیرۆز بدەتە خەبات و بزاڤا مللەتێ خوە؛ بۆ نموونە د سترانا شەرێ گەلیێ مزیرکادا ئەڤ خالە دیار دبیت:

«روژێ چوارێ و ئەمێ بێنە باژێرێ ئامێدیێ
دەستێ خوە دەینە خیرەت و ناموسا بوسلمانا»[١]

٢- هەڤکاری و پشکداریا سەرکردە وسەرۆک هۆزان:

هەڤکاری و پشکداریا دوو سەرکردان یان دوو هۆزان د سترانا دیرۆکیا کوردیدا دیارە؛ نەخاسمە دەمێ سەرکردەک یان سەرۆک هۆزەک داخوازیا هەڤکاریێ دکەت، یان داخوازیا سەرۆکێ هۆزا دەردوور دکەت، کو پشتەڤانیا وی بکەت.

د سترانا (سترانا شەرێ تەنگا بانکێ)ی ئەڤ نموونە هەیە:

ئەزێ ناچمە کەلا شابانیێ بلندە
بلا خودێ ئاڤا بکەت وا ل هنداڤی ئاڤێ
شادە شویدێ سادقێ برو گەلەک هەنە
ب سێ دەنگا گازی دکەت سلێمانێ قوتی

---

[١] - ئەڤ سترانە ژ زاردەڤێ محەمەد پیرۆیی هاتیە وەرگرتن.

گەلی خورتێت کوردستانێ
گەلی لاوێت گولی یا دەست هلینن
منێ سویندەکا خوار و ب قەسەمێ ب ئایەتێ ب قورئانێ[1] .
و هەڤکاریا دوو هۆزان د سترانا شەرێ گەلیێ مزیرکا دا:
«حاج شەعبان ئاغا میرێ ئامێدی»ێ کاقەزەک نڤیسی و دابوو دەستێ خولامێ خوە.
گو کور و خولام گو بەلێ گو ڤێ کاقەزێ وانێ ببە مالا حەجی رەشید بەگێ میرێ بەرواری یا هاوارێ حەجی رەشید بەگێ میرێ بەرواریا ژ مەرا بینە[2].

دیسان هەڤکاری د ناڤبەرا دوو هۆزاندا و د ناڤ شەریدا دڤێ سترانێدا:
وەیلا عافەرەین سەد عافەرەین ژ بۆ تاهر پاشای دگەل سادقێ بروی
بقەفتا خەنجەرا هەودانە سەر چەپەرا وەیلا دەنانێ[3].

٣- ستران وەک پروپاگەندەک بۆ بلند کرنا هەستێ مللەتێ:
هەرچەندە هێزا بەرامبەری کوردان یا مەزن و گرانە، بەلێ د سترانێدا ئەڤێ چەندێ کارتێکرن ل سەر هەستێ هێزا کوردی نەکریە و د بیت ئەڤە رەنگەکێ پروپاگەندێ بیت بۆ بلندکرنا هەستێ لەشکەرێ کوردی بەرامبەر هێزا دوژمنی.
نموونەک ژ ڤێ چەندێ، د شەرێ سادق برویی دگەل ئنگلیزی ل شابانیێ دەما سترانبێژ دبێژیت:

شەرەکێ چێبو ل شابانیا میرا وا ب دارە
عەسکرێ ئنگلیزی ناهێتە حسابێ تا هەزارە
شادان و ناڤمشودا سادق ئاغا بابێ براهیم گەلەک هەنە
***
سێ قرارا خودا ل بابێ براهیم کەفتبی
ئیرو ئەزێ ناڤ ڤی عەسکەرێ دەولەتێ
ئەزێ ژێ بکوژم ب تەمامی ب هزاران[4].

نموونە ل سەر مێرخاسیا هۆزێن کوردان:
هاوار کەتە د ناڤ عەشیرێن کوردانە

---

[1] - ژ زاردەڤێ سترانبێژ «فەریق ئێکمالەیی» هاتیە وەرگرتن، ل جەم شڤان شکری هروری هاتیە پاراستن.
[2] - ئەڤ سترانە ژ زاردەڤێ محەمەد پیرۆیی هاتیە وەرگرتن.
[3] - ژ دەستنڤیسا (گاهر محمد دهوکی) هاتیە وەرگرتن، وئەڤ دەستنڤیسە ل پەرتوکخانا مەلبەندی ل زانکۆیا دهۆکێ پاراستیە.
[4] - ئەڤ سترانە ژ کاسێتەکا سترانبێژێ خودێ ژێ رازی (تاهر سەعید عەبویی) هاتیە وەرگرتن.

ئەو كەتنە سەرێ گەلیێ مزیركا ل پشتا باژێرێ ئامێدیێ
د ناڤ ڤێ عەسكەرێ ئنگلیزی دانینە قەسابخانە[1] .

٤-جهێ جوگرافییێ شەری یان جهێ رویدانێ د دسترانێدا دیاربوویە:
ناڤێن جهێن شەر لێرویددەت د ڤان ستراناندا هاتیە، بۆ نموونە:
دەنایێ ئەز گازی دكەم دەنگێ من دەرنائێ
دەنگێ توپان ل كینێ رەشاشا ل گوندێ قزل كەندێ[2].
عەرز و عەیال ب ئاگرێ خودێ بەردا ڤێ دونیایێ
نیڤا چیایێ شنگالێ خائینە ل هاوار و گازیا سالحێ محەما بابێ خدر و نائێ
ئەزێ ناچمە چیایێ شنگالێ
گوندێ قزل كەندێ وا ب دار وبییە[3].

نموونەكا دی:
ئەزێ ناچم گەلا شابانییێ
كەلا شابانییێ بلندە كەندالێ ئاسێ
رێكا لێ دەست بەروارە[4] .

٥-ناڤێن كەسێن پشكدار و ئامیرە وچەكێ هاتیە بكارئینان درویدانێن د سترانێدا ددیارن:
گەلەک ستران ب ناڤێن سەركردێن رویدان هاتینە بناڤكرن، ئانكو سەركردێ بزاڤێ بوویە ناڤو نیشانێ سترانێ، كەسێن دی یێن پشكدار د رویدانێ یان چەكێ هاتیە بكارئینان د سترانێدا هاتیە باسكرن.
نموونە ژ كەسێن پشكدار د رویدانێدا:
شادە شویدێ سادقێ برو گەلەک هەنە
ب سێ دەنگا گازی دكت خورتێت گولی یا
سلێمانێ قوتی برا تو مێری چێبە دەست هلینە
.......................................
.......................................
گەلی خورتێت كوردستانێ
گەلی لاوێت گولی یا دەست هلینن
منێ سویندەكا خوارو ب قەسەمێ ب ئایەتێ ب قورئانێ

---

[1] - پارڤەک ژسترانا شەرێ گەلیێ مزیركا زار دەڤێ (محەمەد پیروی) هاتیە وەرگرتن.
[2] - قزل كەندێ: دكەڤیتە رۆژئاڤا شنگالێ ب دویرییا ٧ كم.
[3] - ئەڤـ سترانە ژ زاردەڤێ خەلەفێ شنگالی ل دهوكێ ل ئیلونا سالا ١٩٩٨ێ هاتیە وەرگرتن.
[4] - ژ زاردەڤێ سترانبێژ (فەریق ئێكمالەیی) هاتیە وەرگرتن.

چ گافا ئەزێ دەستێ خوە ب دەمە دارێ ئەلەمانێ
من سوز وپەیمانێت داین
ئەز هجریمەکێ ب کێشم سەر عسکەرێ ئینگلیزی[١].

٦-ئەنجامێن رویدانان ل دویماهییێ هاتینە ئاشکرا کرن:
ئەنجامێن بزاڤێن کوردی ل دویماهیا سترانێ هاتینە دیارکرن، وەکی د سترانا شەرێ گەلیێ مزیرکادا دیار دبیت، کو ژمارەکا مەزن ژ لەشکرێ ئینگلیزی هاتنە کوشتن:
دلێ من دا هاییێ سەد جارا بهانە.
هەوار کەتە د ناڤ عەشیرا کوردانە.
ئەو کەتنە سەرێ گەلیێ مزیرکا ل پشتا باژێرێ ئامێدییێ
**د ناڤ عەسکەرێ ئینگلیزی دانینە قەسابخانە**[٢].
گرتنا کەسایەتیەکا کوردی و دویماهیا هێرشا کوردان ل سەر ئوردیا ئینگلیزی ل سوارەتوکا دڤێ سترانێدا:
وەیلێ تاهر پاشا ب سێ دەنگا دکەتە گازی
سادق برو دەستێت خوە هلینە
ئەڤرو رۆژا مێرانە
وەیلێ حەیف و سەد مخابن دەستێت شێخ بەهائەدینی بکەنە دارێ کەلامچێدا بنە مووسلا شـەوتی بکەنـە بەرعەمەلی
وەیلێ دەنائێ ئاغاوو دەنائێ.
کەسەک نینە جەوابەکێ ببتە خەلیل بەکێ بەژن زراڤ
وەیلێ قوماندارێ منێ غائن توپا مەزن ل پێ مە نائێ[٣].

ئەنجامێن هێرشێن هێزێن بیانی ل سەر دەڤەرێن کوردی د سترانا میر بەدرخانیدا دیار دبیت، دەمێ باژێرێ جزیرێ ژ ئەنجامێ هێرشا ئوسمانیان هاتیە تالان‌کرن:
ل مەتێ دەنگێ تۆپان و جەبلخان و ل پێ مەتێ.
حەیف و مخابن ددلێ مە دمینێ
کوچک قومسەرێ رۆمیا
کەتنە شارێ جزیرا بۆتا
هەیلۆ بابۆ لە من خراپ دکن جهێ سنجەقا عەشیرەتێ[٤].

---

[١] - ئەڤ سترانە ژ کاسێتەکا سترانبێژێ خودێ ژێ رازی «تاهر سەعید عەبویی» هاتیە وەرگرتن.
[٢] - ئەڤـ سترانە ژ زاردەڤێ محەمەد پیرویی ل ١٩٩٩/٦/١٥ ل باژێرێ دهوکێ هاتیە وەرگرتن.
[٣] - ژ دەستنڤیسا «تاهر محمد دهوکی» هاتیە وەرگرتن.
[٤] ستران ژ گوڤارا سروە، ژمارە ١٣ گەلاوێژی ١٣٦٦ هەتاوی، بپ ٢٥-٢٧. هاتیە وەرگرتن.

**بەشی سێیەم- فولکلۆر**

## ژێدەر:

ئێک: ژێدەرێن کوردی:

- ئەحمەد سمۆ، ئیبراهیم (٢٠٠١) **کاریگەریی کەلەپوری کوردی لەشانۆی کوردیدا**، هەولێر.
- ڕەسول ابراهیم، شوکریە (١٩٨٤) **ئەدەبی فولکلوری کوردی**، بەشی دووەم، بەغدا.
- مستەفا ڕەسوول، عیزەددین (١٩٧٠) **ئەدەبی فولکلوری کوردی**، لێکۆڵینەوە ، بەغدا.
- موکری، کامەران (١٩٨٤) **ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی**، بەشی یەکەم، بەغدا.

دوو: ژێدەرێن عەرەبی:

- مرسی، احمد (1975) **مقدمه فی الفولکلور**، القاهرة.
- مرسی، احمد (1975) **الاغنیه الفولکلوریه فی العراق**، بغداد.
- المایی، انور (1999) **الاکراد فی بهدینان**، دهوک.
- نیکتین، باسیل (1967) **الأکراد**، ترجمة دار الروایع، بیروت.
- السندی، بدرخان (1976) **طبیعة المجتمع الکوردی فی ادبه**، دراسة نفسیة، اجتماعیة، کرکوک.
- تومابوا (1969) **مع الأکراد**، ترجمة محمّد شریف عثمان، بغداد.
- الخصباک، شاکر (1972) **الأکراد**، دراسة جغرافیه أثونوغرافیه، بغداد.
- یونس، عبدالحمید (1983) **معجم الفولکلور**، مع مسرد انکلیزی- عربی، بیروت.
- مصطفی رسول، عزالدین (1966) **الواقعیة فی الأدب الکوردی**، بیروت.
- مصطفی رسول، عزالدین (1982) **دراسة فی ادب الفولکلور الکوردی**، بغداد.

**ڤەکۆلین:**

- جەلیل، ئوردیخانێ (١٩٧٧) **سترانا زارگوتنا تاریقی**، وەرگێران بو سەر ڕێنڤیسی کوردی، شوکر مستەفا و ئەنوەر قادر محەمەد، بەغدا.
- الخصباک، شاکر (١٩٨٥) **نظرة فی طبیعة الدراسات الکردیة**، گوڤارا کاروان، ژمارە (٢٨) هەولێر.
- علي یحیي، عبدالفتاح (١٩٨٥) **بوتان والبوتانیون والاغنیة الکوردیة التاریخیة**. گ: کاروان، ژمارە ٢٨، هەولێر.
- محمّد الملا کریم (١٩٧٠) **فی الغناء الکردی**، گ: (التراث الشعبي) ژمارە (٥)، بغداد.

# ئێران و سەرەتایەک بۆ مێژووی ئوستوورەی کورد

د. مەولود ئیبراهیم حەسەن*

ئێران جگە لەوەی مێژوویەکی کۆنی هەیە، هەروەها جوگرافیایەکی فراوانتر لەوەی ئێستای هەبووە و دیسان زیاتر لە گەلێکیش لەنێو ئەم جوگرافیایەدا ڕۆڵی مێژوویی خۆیان دیوە. دیارترین دوو میللەتی ئەم مێژوو و جوگرافیا گرنگە «ماد و پارس»ن (واتە: کورد و فارس). هەر بۆیە کورد ئەگەر بیەوێ مێژووی ڕابردووی خۆی بزانێ و بناسێ، بە هیچ شێوەیەک ناتوانێ بۆ ئەم کارە پشت لە ئێران بکات. «ئوستوورە» وەک بابەتێکی گرنگی مرۆڤایەتی، هەموو نەتەوەیەک «ئوستوورە و مێژووی ئوستوورە»ی خۆی هەیە. «کورد و فارس»یش مێژوویەکی کۆن و ئوستوورەیەکی دەوڵەمەندیان هەیە. ئەگەر گەلی فارس هەوڵی داوە کەم و زۆر مێژووی ئوستوورەی خۆی بنووسێتەوە، ئەوا کورد تا ئێستا لەم بارەوە کارێکی ئەوتۆی نەکردووە. ئەم لێکۆڵینەوەیە هەوڵێکی سەرەتاییە بۆ داگیرساندنی چرایەک کە ڕێگایەکی مێژوویی ئوستوورەی کوردمان بخاتە بەردەم لەسەر جوگرافیای ئێران؛ ئێرانی هەموو قۆناغەکان، بە تایبەت لە سەرەتاوە. لەم لێکۆڵینەوەشدا، پەنا بۆ مێژووی مرۆڤ براوە لە ئەشکەوتی «شانەدەر» و دواتر بەردەوامی ژیان لەو جوگرافیایەی کە ئەمڕۆ بە ئێران و کوردستان ناسراوە. ئەم جوگرافیایەی کە زۆر دەوڵەمەندە لە ئەشکەوت. ئەگەر ئەشکەوتی «شانەدەر» کۆنترین ئەشکەوتە لە کوردستان، ئەوا ئەشکەوتی «پڕ ئاو» گەورەترین ئەشکەوتە لە هەموو جیهاندا. جگە لە دەیان ئەشکەوتی تر لەم جوگرافیایە کە لە قۆناغەکانی پێگەیشتن و گەشەکردنی مرۆڤدا ماڵی هەرەکۆنی مرۆڤن. ئەشکەوتی شانەدەر کە زیاتر لەسەد هەزار ساڵ پێش زایین، مرۆڤی تێدا ژیاوە، ئێسکبەندی چەند مرۆڤێکی تێدا دۆزراوەتەوە کە بۆ «٦٠ هەزار ساڵ پ.ز» دەگەڕێتەوە. لە خوێندنەوەی ورد و زانستیانەی ئەم ئێسکبەندانەدا، زاناکان گەیشتوونەتە ئەو ڕایەی کە لە کاتی ناشتنی ئەم مردووانەدا مرۆڤەکانی ئەشکەوتی شانەدەر جۆرە باوەڕێکی ئاینییان هەبووە. زاناکان ئەوەش دەسەلمێنن کە لە سەرەتادا ئایین و ئوستوورە

---

* زانستگای سەلاحەدین، کۆلیجی زمان، بەشی زمانی کوردی.

پێکەوە سەریان هەڵداوە. جگە لەوەی کە سەردەمی ماد و پارس هەروەها سەردەمی پاشای ئوستوورەیی «جەم - جەمشید» دوو سەردەمی گرنگی سەرهەڵدانی ئوستوورەی گەلی کورد و فارسن.

جگە لەمە، باسی «ئیریەن ڤیج» و «بوهتان ڤیج» و «ڤیج»ی بەشێکی کێوەڕەش کراوە، کە هەر ئەم ئیریەن ڤیج و ڤیجانەی تر سەرچاوەی ناوی وڵاتی ئێران و «گەلی ئاری»ن، هەروەها لێکۆڵەر گەیشتووتە ئەو ڕایەی کە ئاری ئەو مرۆڤانەن کە لە ئیریەن ڤیج ژیاون و هەروەها هاتنی ئاری بەم شێوەیە نییە کە تا ئێستا هەندێک لە لێکۆڵەران باسی دەکەن. دواجار باسی زەردەشتی پێغەمبەر و وشەی «ئوستوورە» و «ئەفسانە» و «داستان» و «ستران» لە نێو زمانی سانسکریتی فارسی و کورددا کراوە. لە کۆتاییدا لێکۆڵەر چەند خاڵێکی وەکو ئەنجام دەستنیشان کردووە.

**وشە سەرەکییەکان:** ئوستوورە، ئێران، ماد، پارس، ئەفسانە.

## بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە

### پێشەکی:

ژیان لە جوگرافیایەکی هاوبەش، مێژوویەکی هاوبەش دروست دەکات. لە نێو ئەم مێژووەش هەموو پێکهاتەکانی ژیان کارلێکدەکەن و پێکەوە گەشە دەکەن. ئەگەر سەیری دوو گەلی «کورد و فارس» بکەین، هێندە لێک نزیک و تێکەڵن، کە ئەم لێکتریکی و تێکەڵیە بووەتە هۆی ئەوەی کە هەندێ لە ڕۆژهەڵاتناسان بەیەک گەل پێناسەیان بکەن. ئەمەش کارێکی سەیر نییە؛ دوو گەل لە ڕۆژگارێکی یەکجار کۆن، لە ڕۆژگاری کۆنەوە تا «ماد و پارس» وەک دوو گرووپی زۆرلێک نزیک، نزیک بە جوگرافیا و بە ڕەگەز و خوێن و کلتوورەوە، لەژێر یەک ئاو و هەوای مێژوویی و لەسەریەک بەرەی جوگرافیایی ساردی و گەرمی ڕۆژگاریان چێشتبێ، ئەوا بێ‌شک ئەنجامەکەی ئەو تێکەڵییەیە کە ئێستا بە ڕوونی بەرەگەز و زمان و هەموو پێکهاتەی ئەو دوو گەلەوە دیارە. ئەوەتا کورد بە هەموو پێکهاتەی مێژوویی و جوگرافییەوە بەشێکە لە «زانستی ئێراناسی». ئەم ڕابردووە هاوبەشە، ئیستایەکی هاوبەشی دروست کردووە و داهاتوویێکی هاوبەش و پێکەوەیش دروست دەکات؛ ئەمەش زەمینەیەکی بەهێزە بۆ ئەو دوو گەلە بۆ ئەوەی پێکەوە بە شێوەیەکی شارستانی و مرۆڤانە هاوبەشییەکی گرنگ و کاریگەر لە پێشکەوتنی ژیان دابکەین لەم ڕۆژهەڵاتە گەرم و لەم جیهانە تیژڕۆیە. ئەگەر لە ڕابردووی دووردا ئەم جوگرافیایە داهێنەری شارستانیەتە کۆنەکانە و خاوەنی ڕابردوویێکی گەشە، ئەوا ئەرکی کوڕانی ئەم دوو گەلەیە هەوڵبدەن، شانازییەکانی ڕابردوو بە شێوەیەکی هاوچەرخانە بهێننەوە نێو داهاتووی خۆیان و هەموو ڕۆژهەڵات و جارێکی تر ئەسپی ڕۆژهەلات بگەیەننە ڕیزی پێشەوەی ژیان.

### سەرەتایەک بۆ مێژووی ئوستوورەی کوردی:

مێژوو -هەر مێژوویێک بێت- سەرەتا هەر دەبێ لە مێژووی مرۆڤەوە دەست پێبکەین؛ هەروەها ئەو مرۆڤە خۆشی داهێنەری ئوستوورەیە؛ لەوەش کە دەمانەوێ باسی «ئوستوورەی کورد» بکەین، ئەوا دەبێ لەو جوگرافیایەی کە ئەمڕۆ بە «کوردستان» دەناسرێ، بەدوای مێژووی مرۆڤ، مێژووی مرۆڤی کورددا بگەڕێین. بۆ ئەو مێژوو و جوگرافیایەش لەمێژووی ئەشکەوتی شانەدەرمان چاکتر دەست ناکەوێ. بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەکەمان لە بابەتی سەرەکی خۆی زۆر دوور نەکەوێتەوە، لە ئەشکەوتی شانەدەریش لەمێژووی ئەو مرۆڤانەوە دەست پێدەکەین کە بە «مرۆڤی نیاندرتاڵ» ناسراون. لەمێژووی قۆناغەکانی پێگەیشتن و گەشەکردنی مرۆڤ، خۆش ئەوەیە! هەر لەو تەمەنی مرۆڤی نیاندرتاڵەش «زمان» وەک ئامرازی بیرکردنەوە و قسەکردن بەپێی ڕای زاناکان، زمانیش لە تەمەنی نیاندرتالەکان کە لەنێوان «٣٠.٠٠٠- ١٥٠.٠٠٠»پێش زایین سەری هەڵداوە و پێگەیشتووە (شریعتی،١٣٧٨: ٢٠٨). زمانیش دوای «بیر» (فکر) ئامرازی یەکەمی دەربڕین و شێوەگیری ئوستوورەیە. گوتمان بۆ دەستنیشان‌کردنی مێژوو و جوگرافیا پێویستە جوگرافیای ئێمەش بەگشتی کوردستان و بە تایبەتیش ئەشکەوتی شانەدەرە، شانەدەریش وەک «ڕالف سوالیکی» زانای شوێنەوارناس دەڵێ:

«هەموو شارستانییەت و پێشکەوتنێک لە دەرگای ئەم ئەشکەوتە هاتووەتە دەرەوە» (ئامێدی، ٢٠٠٧) لەم وتە بەنرخەدا ئەم زانایە مەبەستی لە «شارستانییەت و پێشکەوتن»، شارستانییەت و پێشکەوتنی هەموو مرۆڤایەتییە. ئەم زانایە ئەم قسەیە لەخۆڕا ناکات، چوونکە خۆی لە سالانی ١٩٥١- ١٩٦٠ چەند جارێک سەرپەرشتی پشکنین و هەڵکۆڵینی چینە زەوییەکانی نێو ئەشکەوتی شانەدەری کردووە و پاشماوە کۆنەکانی مرۆڤی نیاندرتالی ئەم ئەشکەوتەی بەدەست و پەنجەی خۆی دەرهێناوە. ئەم ئەشکەوتەی «ئەلیکساندەر ئەلفریدۆڤیج» لە بارەیەوە دەڵێ: « ئەشکەوتە بەناوبانگەکەی "شانەدەر" لە شاخەکانی کوردستان وەک ئارشیفێکی نایابی پاراستنی شوێنەواری شارستانی و مێژوویی مرۆڤایەتییە بەدرێژایی ١٠٠.٠٠٠ ساڵ ( ڕامان، ژمارە ٨: ٢٦). جا با بزانین گرنگی ئەم ئەشکەوتە و دەستنیشان کردنی ئەم مێژووە لەچی دایە؟ هەر لەبارەی شانەدەرەوە گوتراوە: « زاناکانی کۆنناسی لە ئەشکەوتی شانەدەردا (لە پارێزگای هەولێر) کۆنترین پاشماوەی نیشتەجێ بوونیان دۆزییەوە لە باکووری وڵات (کوردستان) کە بۆ نزیکەی ٦٠ یان ٥٠ هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە» (عبداواحد علی، ١٩٧٦). ئەمجارە زاناکان مێژووی ٦٠ تا ٥٠ هەزار ساڵ پێش زایین دەستنیشان دەکەن. ئەگەر ئەم جارە ئەم مێژووە دەنووسن، بەلام ئەی گرنگییەکە لە دۆزینەوەی چی دایە؟ ئەوەی گرنگە زانا شوێنەوارناسەکان لە پشکنیندا ئێسکبەندی چەند مرۆڤێکیان لە چینە جیاجیاکانی ئەشکەوتی شانەدەر دۆزیوەتەوە. لەگەڵ چەند کەرەستە و پاشماوەی ئەو مرۆڤانە کە هەموویان نیشانەی ژیان و شارستانییەتی مرۆڤەکانی ئەم ئەشکەوتەن. لەهەمووان گرنگتر خوێندنەوە ورد و گرنگەکانی زاناکانە بۆ زۆری و جۆری ناشتنی مرۆڤەکان. یەکێ لەو خوێندنەوانە، خوێندنەوەیەکی ئاینییە؛ واتە زاناکان بەڵگەی بوونی جۆرە ئایینێکی سەرەتاییان دەستکەوتووە، لە ئەنجامی پشکنین و لێ وردبوونەوەی ئێسکەبەندەکان و جۆری ناشتنیان، لەوەی کە دەڵێن: «بڕوایان بە زیندوو بوونەوە هەبووە». ئەمەش بۆ خۆی بڕوایەکی ئاینییە: زەمەنی ئەو ئایینەش بۆ ٦٠ تا ٥٠ هەزارساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە[1]. ئەم سەرەتا ئایینییەش هاوزەمانە لەگەڵ سەرەتای سەرهەڵدانی ئوستوورە. چوونکە زۆربەی زانایانی ئوستوورەناس لەسەر ئەو ڕایەن کە ئایین و ئوستوورە سەرەتا پێکەوە سەریان هەڵداوە و لە زەمەنی نیاندرتاڵەکاندا بووە. ئەوەی شایانی باسە مرۆڤی نیاندرتاڵ (نیاندرتاڵی شانەدەر) یەکەمین مرۆڤە کە لەپێش مێژووەوە مردووی خۆی شاردووتەوە، هەروەها یەکەمین مرۆڤە کە بە خاوەنی هەستی ڕۆحی و ئایینی ناسراوە، هەروەها باوەڕیشی بەژیانی پاش مردن هەبووە (گۆڤاری هەزارمێرد، ژ١٠: ١٩١). ئەگەر مرۆڤە نیاندرتاڵەکانی ئەشکەوتی شانەدەر ٦٠ هەزار ساڵ پێش زایین باوەڕێکی سەرەتایی ئاینییان هەبووە، ئەوا زۆربەی زاناکانیش لەسەر ئەوە کۆکن کە «ئایین و ئەفسانە»[2] پێکەوە سەریان هەڵداوە؛ ئەوا مێژووی سەرهەڵدانی ئەفسانەش بۆ سەردەمی سەرهەڵدانی ئایینی مرۆڤەکانی ئەشکەوتی شانەدەر دەگەڕێتەوە: دیارە ئەفسانەش وەک ئایین بەشێوە

---

[1] : ئەگەر زەمەنی مردنی ئەو مرۆڤانە لە ئەشکەوتی شانەدەر بۆ ٦٠ هەزار ساڵ پێش زایین بگەڕێنەوە، ئەوا دەبێ زۆر پێش ئەو زەمەنە بیری ئایینی سەری هەڵدابێ.

[2] : زاناکانی پسپۆڕ لە مێژووی ئەفسانە و ئایین زۆربەیان کۆکن لەسەر ئەوەی کە سەرەتای ئەفسانە و ئایین یەک سەرەتایە.

سەرەتاییەکەی. ئەگەر زاناکان بەڵگەی بوونی مرۆڤ لە ئەشکەوتی شانەدەر -بە ئـایین و ئوسـتوورەوە- بـۆ ٦٠ هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێننەوە، ئەوا هەر مێژووش ئەوەمان بـۆ دەسـەلمێنێ کـە ئەشـکەوتی شـانەدەر و ناوچەی «برادۆست» و زنجیرە چیاکانی «زاگرۆس» و خاکی کوردستان و وڵاتـی ئێـران لـەو مێـژووە بـەدواوە هیچ سەردەمێک لە مرۆڤ و ژیان خاڵی نەبوون (ئێبراهیم حەسەن: ٢٠٠٢) و مرۆڤ لەم جوگرافیایـە گەشـەی بە ژیانی خۆی داوە و لەنێو ژیانیشدا ئایین و ئوستوورەش هەر بـەردەوام بـووە (شـریعتی، ١٣٧٨: ٢٠٨). هـەر هۆی ئـەو بەردەوامیەشـە کـە زاناکـانی کوردسـتان ئـەم جوگرافیایـە بـە «لانکـەی مرۆڤـایەتی» و «لانکـەی شارسـتانییەت» نـاو دەبـەن. ئـەوەش بـە پشتبەسـتن بـەمێژووی ئەشـکەوتی شـانەدەرە کـە لـە هـەموو ئەشکەوتەکانی تری ناوچەکە کۆنترە، جگە لەم ئەشکەوتە زۆر ئەشکەوتی تر لـە کوردسـتان و ئێـران بەڵـگەی بەردەوامی ژیانمان دەدەنە دەست (ئەشکەوتی پڕ ئاو، گەورەترین ئەشـکەوتی جیهـان لـە دەوروبـەری کێـوی «بێستوون» و «تاق وەسان». لە بڵندایيەکانی کێوی پڕ ئاو، کە چاڵە بەفرە سروشتییەکانی ئەو کێـوە ناسـراون، دەرگای ئەشکەوتی پڕئاو لەوێیە، لەناو ئەم ئەشکەوتە سەر سـوڕهێنەرە دۆڵـێک بـە قووڵـی ٣٥٠م و لـە بەشـە قووڵەکانی ئەو دۆڵە چەندین گۆماوەیەک ئاوەڕۆشی تێدایـە. ئـەم ئەشـکەوتە کـە لـە ساڵـی ١٣٥٠ی هـەتاوی بەهۆی دەستەیەک ئەشکەوتناسی ئینگلیزی دۆزراوەتەوە، بەپێی پشتگیری ئەنجوومەنی ئەشکەوتناسـانی نێـو نەتەوەیی، گەورەترین و قووڵترین ئەشکەوتی جیهانـە) (ئێبراهیمـی، ١٣٧٨: ٢٨). ئەگـەر شـانەدەر کـۆنترین ئەشکەوتە، ئەوا ئەشکەوتی «پڕ ئاو»یش گەورەترین ئەشکەوتە لە جیهاندا.

ئەشکەوتیش ماوەیەکی دوور و درێژ بە سـەدان هـەزار سـاڵ ماڵـی گـەرم و گـوڕی مـرۆڤ بـووە، ئێـران و کوردستانیش دەوڵەمەندن لەم جۆرە ئەشکەوتانە[١].

لە کوردستان شوێنەوارناسان پەیکەر و ئێسکی ئەو مرۆڤانەیان لە ئەشـکەوتی شـانەدەر (پارێزگـای هـەولێر) ئەشکەوتی هەزارمێرد (پارێزگای سلێمانی) و ئەشکەوتی بێستوون (پارێزگای کرماشان) و ئەشـکەوتی کـونجی (پارێزگای لوڕستان) دۆزیوەتەوە (قادر موحەمەد: ٢٨). ئەم ئەشـکەوتانە و زۆر ئەشـکەوتی تـریش، زۆر نهـێنی ڕابردوومان بۆ ئاشکرا دەکەن و بۆیان ئاشکرا کردووین، بە کورتی: سـەرەتای هـەموو سـەرەتایەکانی ژیـان، لـە ئەشکەوت دەستی پێکردووە، هەر لـە قسـەکردن و هونـەری سـەر دیـواری ئەشـکەوت و سـەرەتای ئـایین و فەلسەفە و ئەفسانەو هەروەها دروست کردنی کەرەستەی سادە و سـەرەتاییەکانی ژیـان (ئێـبراهیم حەسـەن، ٢٠٠٢). ئەگەر ئەشکەوتەکان ئەو ئارشـیفە دەوڵـەمەندەن بـۆ مرۆڤـایەتی، ئـەوا دەبـێ دڵـنیابین، هێشـتا زۆر

---

[١] لە کوردستان و ئێران ئەشکەوتی زۆر و گرنگ هەن. کە هەنـدێکیان سروشـتین و هەندێکیشـیان سروشـتی و دەسـکاری کراون، هەندێکیشیان دەستکردن. بەشی زۆری ئەم ئەشکەوتانە بەپێی پێویست لێکۆڵینەوەیان تێدا نەکراوە. بـۆ نموونـە بـە زۆری ئەشکەوت لە دەوروبەری گوندی ڕۆست (لە پارێزگای هەولێر) زیاتر لە حـەوت ئەشـکەوت هەیـە، وەک: (مەمەنـدان، نەریسێ، شێخ برایم، تیشەلە، ڕەزی کەچەری، کۆزێ، وەستا خدر، کونە کۆتر، مەرێ) هەندێک لەم ئەشکەوتانە جێگەی زیاتر لە پێنج خێزان، واتە ٣٠ی کەسی تێدا دەبێتەوە، بەڵام تاکو ئەمڕۆ هیچ پشکنین و هەڵکۆڵینیان بۆ نەکراوە( مێـرگ: ژمـارە ٤٠).

نهێنیتر لەنێو ئەشکەوتەکاندا ماوە، چ ئەوانەی کە شوێنەوارناسەکان هەڵیانکۆڵیوە و بەشێک لە زانیارییەکانیان ئاشکرا کردووە و هەندێکیشیان پەناداوە، کەچی هێشتا نهێنی و زانیاری زۆرتر لەنێو ئەم ئەشکەوتانەدا ماوە. خۆ ئەم ئەشکەوتانەی هێشتا دەستی زاناکانی نەگەیشتووەتێ و پشکنینی تێدا نەکراوە، دەبێ لەم ئەشکەوتانە چاوەڕێی زانیاری زۆرتر و نهێنی گەورەتر بکەین.

## ئێران و کوردستان:

ئێران لەمێژووی دوور و درێژی خۆیدا وڵاتێکی زۆر لەوە فراوانتر بووە کە لەنێو جوگرافیای ئەمڕۆیدا جێگای ببێتەوە. لەنێو ئەم فراوانیەشدا جێگای کوردستان جوگرافیایەکی دیار و لەمێژینەیە. زاناکان زۆربەیان لەسەر ئەوە هاوڕان کە ناوی «ئێران» لەناوی «ئیریەن ڤیچ»ەوە هاتووە؛ ئەوەش ساخ بووەتەوە کە شوێنی ئیریەن ڤیچ ئەو جوگرافیایە کە «زەردەشتی پێغەمبەر» تێیدا لەدایک بووە، ئەو جوگرافیایەش دەوروبەری شاری «ورمێ»یە. وەک «پووورداود» دەنووسێ: بەکورتی دەتوانین بڵێین کە «زەردەشت» لە ڕۆژئاوای ئێران یان باکووری ڕۆژئاوای ئێرانە. بەهیچ شێوەیەک پەیوەندی بەخوارەوە نییە. هەروەها باوەڕی ڕۆژهەڵاتی ئێرانیش بەلانراوە ئەمڕۆ کەس باوەڕی پێ نییە (پورداود: ٢٦). ئەوەتا پووورداود دەیسەلمێنێ کە شوێنی لەدایک بوونی زەردەشت ڕۆژئاوای ئێرانە و ئەو شوێنەش زاناکان دەڵێن ئیریەن ڤیچە و هەروەها لێکۆڵەران دەڵێن: ناوی «ئێران» لەناوی «ئیریەن ڤیچ»ەوە هاتووە. وا چاکە ئەمەش بزانین کە لە کوردستاندا جێگای تریش هەن کە وەکو ئیریەن‌ڤیچ لەگەڵ وشەی «ڤیچ» ناوی لێکدراوی تریان پێکهێناوە و بە شوێنی تری کوردستان دەگوترێن. «بوهتان‌ڤیچ»[1] ناوێکی دیاری مێژووییە کە لە مێژوودا بە ناوچەی «بۆتان» (بوهتان - بوختان) گوتراوە، جگە لەمە «کێوەڕەش» کە شاخێکی سەر بە پارێزگای سلێمانیە: بەشێکی ئەو کێوە ڕەشە بە «ڤیچ» ناسراوە.

کە خەڵکی دەوروبەری کێوەڕەش لە پارێزگای سلێمانی ئەو بەشە بە «ڤێچ - وێچ» ناودەبەن (حازم پاشا، ڕۆژنامەی خەبات: ژ٩٨٦). کە بەڕای لێکۆڵەر ئەم «ڤێچ»ە پاشماوەی ناوێکی لێکدراوە کە پێشتر وەکوو «ئیریەن ڤیچ و بوهتان ڤیچ» بەم شوێنە گوتراوە. ئەم ڤیچەش چەند مانایەک دەدات؛ یەک لەو مانایانە مەبەست ناوی خاکی ئەو ناوچەیەیە کە لەگەڵ ناوێکی تر و بە هاوکاری ڤیچ، پێکیان هێناوە. لەوەوە دەردەکەوێ کە «ئیریەن ڤیچ و بوهتان ڤیچ و .... ڤیچ» ناوی ناوچەگەلی جیاجیابوونە لە وڵاتی ئێران و کوردستانی کۆندا. وەک چۆن هەر ئێستا لەنێو جوگرافیای ئێران ناوچەکانی «سیستان» و «خوزستان» و «بلوچستان» و «کوردستان» هەن و هەموویان بە «ستان» یەک دەگرنەوە و لە «ستان»یش مەبەست خاک و ناوچە و وڵاتە، ئاوا «ڤیچ»یش هەر ئەم مەبەستەی هەیە. ئێستا دەرکەوت ئەم وڵاتی ئیریەن‌ڤێچە چ وەک خۆی ئیریەن ڤیچ، چ هەر تەنیا بەهۆی ڤێچەوە، خاکێکی فراوان داگیر دەکات کە لە باکووری خۆرئاوای ئێرانەوە دەست پێدەکات و بەنێو کوردستاندا درێژ دەبێتەوە و هەتا دەگاتە ڕۆژئاوای باکووری کوردستان کە

---

[1] سەیری گەڕان بەدوای نەمرییدا بکە.

دەکاتە ڕۆژئاوای باشووری تورکیای ئەمڕۆ. ئەمەش ئەم پەیوەندییە جوگرافی و مێژووییەی نێوان وڵاتی ئێران و کوردستان ڕوون دەکاتەوە کە دەریدەخات ئەم دوانە پێشینە و مێژوویەکی هاوبەشیان هەیە. ئەمەش لەمێژووی جوگرافیاوە دەست پێدەکات و دواتر هەموو مێژووەکانی تر دەگرێتەوە، تا دەگاتە مێژووی ئوستوورەش.

### مێژووی هاوبەش:

هەرچەندە ڕای تازە هەیە کە مێژووی «ماد»ەکان زۆر لەوە بە کۆنتر دەزانێ کە لە مێژووی «هاتنی ئارییەکان» و دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی مادەکان باوە و زانراوە (٩٨٦ ژ: c.p.b، ٢٠٠٠)، بەڵام ئەوە هەیە کە ئەو مێژووە زۆری لەبارەوە نووسراوە و لێی کۆڵراوەتەوە. کە دەکرێ قۆناغی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی ماد بۆ ماد-کوردەکان و ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی بۆ فارسەکان بە قۆناغێکی نوێ و گرنگ بزانین کە لەم قۆناغەدا جگە لەوەی هەریەک لە ماد و فارس بەڕوونی تایبەتمەندی نەتەوەیی خۆیان بەدەردەخەن، هەردووکیشیان پێکەوە مێژوویەکی نوێ بۆ خۆیان و ناوچەکە و هەموو جیهان دروست دەکەن. ئەگەر سەیری مێژووی ئەو ڕۆژگاری هەموو جیهان بکەین، سەیر دەکەین ماد و فارس لەسایەی «دیاکۆ»ی دامەزرێنەری ئیمپراتۆریەتی ماد و کۆرشی دامەزرێنی ئیمپراتۆریەتی هەخامەنشی (فارس) زۆر بە بەژنی بڵندەوە چوونەتە نێو مێژووی ناوچەکەو هەموو جیهان.

لەوەی کە ماد و فارس لەو ڕۆژگارەش لێکجیابوون و هەریەکەیان شانازی بە وڵات و نەتەوەی خۆیەوە دەکرد، «هیرۆدۆتس» دەنووسێ پاشای میدیەکان  کە دەگیرێ، سەرزەنشتی «هارباکۆس» مادە خیانەت کردووەکە دەکات و دەڵێ: تۆ بەدکاری بەم کردەوەیەت؛ کوڕانی گەلەکەی خۆت (میدییە پیاو چاکەکان)ت لەسەرداریەوە کردە بەندە. چوونکە تۆ دەسەڵاتت دایە پیاوێکی تر لەجیاتی ئەوەی بەخۆت بیگریە دەست. زۆر چاک دەبوو ئەگەر بتدابایە گەلەکەت میدییەکان نەک بۆ پارسە غەریبەکان میدییەکانت کردە ژێر دەستە» (نوروزالعراق١٩٨٩: ٢٣).

هەروەها دیسان لەسەر قسەی هیرۆدۆتس «سیرۆس- کورش» سەرکردەی پارسەکان، لەوکاتە مادەکان لەسەر حوکم بوون، ئاوها پیاوانی خۆی هان دەدا: «... بەگوێی من بکەن و ئازادی خۆتان بەدەست بێنن. دژی میدییەکان بجەنگن. ڕاستیەکەم پێ گوتن و خۆتان دوا مەخەن، ڕاپەڕن بۆ لەنێو بردنی بەندایەتی» (نوروزالعراق١٩٨٩: ٢٣). ئەمە ئەگەر نیشانەی تایبەتمەندی نەتەوەیی «ماد و فارس»ە، ئەوا دەبێ ئەوەش بزانین مێژووی ئەم دوو گەلە هەر تەنیا بریتی نییە لەم جیایی و تایبەتمەندییە؛ بەڵکە پڕیەتی لە پێکەوە ژیان و هاوکاری و تەبایی. جا ئەم جۆرە مێژووە بۆ ئەم دوو گەلە کلتووری هاوبەشیشی دروست کردووە، ئەگەر سەردەمی میدیەکان قۆناغێکی گرنگی سەرهەڵدانی ئوستوورەی کوردییە، ئەوا سەردەمی هەخامەنشییەکان، قۆناغێکی گرنگ و دیاری سەرهەڵدان و گەشەکردنی ئوستوورەی فارسە. هەردوو قۆناغیش، قۆناغی هاوبەشی و بەردەوامی ئەم کەلتوور و ئوستوورەیە و ئەم ڕەوشە تا ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی «ساسانییەکان» و هاتنی

ئیسلام درێژە دەکێشێ. لەگەڵ هاتنی ئایینی ئیسلامیش، جارێکی تر و بە شێوەیەکی تر مێژووی هاوبەش بەتایبەت لەسەر ئاستی کۆمەڵانی خەڵک و مێژوو بەردەوام دەبێت و تا ئێستاش هەر ئەو مێژوو و بەردەوامیە بەشێوەی خۆی لەکارە. جا ئەو مێژووە هاوبەشە زەمینەیەکی دەوڵەمەندی کەلتووری هاوبەشە و چاوەڕێی توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی و دەستی کاری دڵسۆزانی هەردوولایە.

مێژووی هاوبەشی ئێران و کورد زۆر لەوە کۆنترە، کە سەرەتاکەی بۆ ماد و هەخامەنشییەکان بگەڕێنینەوە. ئەگەر بە شێوەیەکی دروست مێژووی «ئیلام» و «سۆمەر» بخوێنینەوە، ئەوا تێکەڵی و پەیوەندییەکی شەڕ و ئاشتی و بازرگانی و ئایینی لەنێوان ئەم دوو شارستانییەتەدا هەیە، کە بۆ سێ تا چوار هەزار ساڵ پێش زایین دەگەڕێتەوە. ئەگەر ئێرانیەتی ئیلامییەکان، گومان هەڵناگرێ، ئەوا پەیوەندی کورد و سۆمەریش، خەریکە تەواو گومان لەخۆی دادەبڕێ؛ بۆیە ئەم بابەتەش لەنێو مێژووی هاوبەش زەمەنێکی کۆنتر و دوور و درێژتر بۆ خۆی پەیدا دەکات. ئەوەش ئاشکرایە، کە ئەفسانەی سۆمەرییەکان کۆنترین مێژووی هەیە و خاوەنی ڕەنگ و ڕووی خۆیەتی. هەروەها ئەفسانەی ئیلامیەکان لە کۆنیەتیدا هاوزەمانە لەگەڵ سۆمەرییەکان و دیسان ئەویش خاوەنی تایبەتمەندییەتی خۆیەتی. لێکۆڵەر «محەمەد جەواد مەشکور» دەنووسێ: «گلگامش، یەکێ لەو خواوەندانەی کە لە لوڕستان زیاتر لە هەمووان پەرستوویانە گلگامشە، کە لە دەشتەکانی نێوان دوو ئاوان لەنیوە خوداوەندەکان دەژمێردرا، بەڵام لە "لوڕستان" و لەکن خەڵکەکەی پێشانی لای کاسیەکان گەیشتووتە پلەی خوداوەندی» (مشکور، ١٣٦٦: ٢). «گلگامش» کە یەکێ لە پاشاکانی سۆمەرییەکانە و مێژووی حوکم کردنەکەی دیارە، کەچی ئەوەتە لە ئێران و لە لوڕستان پەرستوویانە. ئەگەر سۆمەرییەکان گلگامیشیان بەمرۆڤی خوداوەند دەزانی، کەچی ئێرانییەکان لە لوڕستان، وەک خوداوەندێکی تەواو خوداوەندیان پەرست، ئەم گلگامش پەرستی و ئەم ئایینەش بە تەواوی لەگەڵ مانای «اساطیر الاولین»ی قورئاندا دەگونجێ. بەڵام ئەوەی لێرە بۆ ئێمە گرنگە ئەو پەیوەندییە بەهێزەیە کە لەنێوان ئەو دوو گەلەدا بووە، گەلی کورد و فارس بەهۆی سۆمەرییەکان و ئیلامییەکانەوە و لە لایەکی ترەوە بەهۆی ماد و پارسەوە. ئەو پەیوەندییەش سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی دروستبوونی ئوستوورەیە: ئوستوورەی هاوبەش، ئوستوورەی هەردوو گەل.

## کێ ئارییە؟

سەرەتا لە بارەی ناوی ئارییەوە «بەهرام فرەوشی» دەنووسێ: «وشەیەک کەوا پێویست دەکات کە زۆرتر ڕوون بکرێتەوە، وشەی "ئێران"ە. ئێران لە زمانی ئاوێستایی بەشێوەی ئەیریە AIRYA و لە فارسی کۆن ئەریە ARIYA و لە سانسکریتدا ئارییە هاتووە. لە ئاوێستادا هەم ناوی گەلی ئێرانە و هەم بە مانای نەجیبزادە و ڕەسەنە. ئەو ئارییەی کە لە مێژوودا تەنیا ناوی گەلی ئێرانە، لێکۆڵەر "برستید" لە کتێبی "سەردەمە کۆنەکان"دا دەنووسێ: "بەکارهێنانی وشەی ئاریا بۆ لقەکانی هیندۆئەوروپی کارێکی دروست نییە. پێویستە ئەم وشەیە کە لە وشەی ئێران و ئێرانی جیا بووەتەوە، بە تەنیا بۆ خەڵکی وڵاتی ئێران بەکارببرێ"» (فرەوشی، ١٣٧٤). دیارە دەبێ ئەوەش بزانین مەبەستی «برستید» لەخاک و گەلی ئێران هەر تەنیا جوگرافیای ئێرانی

ئەمڕۆ و گەلی فارس نییە؛ یەکێ لەو گەلانەی کە لەسەر خاکی ئێران و لەنێو گەلانی ئێران جێگـای تایبـەت و دیاری هەیە، گەلی کوردە. «فۆن لۆشان و سۆلاک» ڕایان وایـە و لەسـەر ئـەو ڕایـەش پێـدادەگرن و دەڵـێن: «ئەگەر کورد ئاریایی بن، پتر لە هەر هۆزێکی تر بە پاکی ماونەتەوە» (آورنگ: ١٣)٠ کەچی نووسەرێکی تـر پتـر لەوە پێدادەگرێ، نەک هەر ئەوە کە کورد بە ئاری دەزانێ، بەڵکە «ئار-ar»یش بە وشەیەکی کـوردی دەزانـێ، لە کتێبی «مختصر تاریخ کوردستان»دا لێکۆڵەر "c.p.b" دەنووسێ: « وشەی ئار - ar کوردییەکی ڕەسـەنە و بـە مانای "ئاگر"ەو "ئاری"ش واتـە ئـاگریی، کـە ئـایینی هـەموو ئارییـەکان و هـەموو نەتـەوە هینـدۆ ئۆرپییـەکان ئاگرپەرستی بوو» (نوروزالعراق١٩٨٩: ٢٣). هەروەها دەنووسێ وشەی «ئار» وشەیەکی کوردییە و ئـەم وشـەیە لەهیچ زمانێکی تردا نییە. جگە لە زمانی کوردی، بۆ پشتگیری رای لێکۆڵەر c.p.b ئێمە ڕیشـەیەکی کـۆن بـۆ ئاگرپەرستی لە مێژوودا دەبینین، ئەوەتا سۆمەرییەکان خوداوەندی «ئوتو»یان هەبوو؛ واتە خوداوەنـدی هـەتاو. هەروەها خوورییەکان «خۆر - ڕۆژ»یان دەپەرست و ئایینی «خۆرپەرستی - ڕۆژپەرسـتی» ئـایینێکی بـەربڵاو و تەمەن‌درێژ لە جیهان و ڕۆژهەڵات و کوردستاندا بوو. جگە لە ئایینی ئاگرپەرستی، ئـاگر پـیرۆزی زەردەشـتی، کە لەم مێـژووە دوور و درێـژەدا ئـاگر و هـەتاو و ڕۆژ لـەنێوان خوداوەنـدی و پیرۆزیـدا پەرسـتراون و ڕێزیـان لێگیراوە، جوگرافیای ئەم مێژووەش بەردەوام بەشێکی گرنگ لە کوردستاندا بووە. هەر بۆیە سـەیر نییـە هـەتاو و تاوی ئەمڕۆی کوردی لەگەڵ «ئوتو»ی سۆمەری یەک بن و ئاری کۆنی ئاری لەگەڵ ئاگری ئەمـڕۆی کـورددا یەک بـن. (جنیـدی، ١٣٥٨: ١٢٦). کەواتـە ئـاری هـەر بـە تـەنیا ئێرانییـەکان دەگرێتـەوە و لـەنێو ئێرانییـە ئارییەکانیشدا کوردەکان. ئەو هۆزە ئاریەن کە لە هەمووان پتـر بـەپاکی ئاریـەتی ماونەتـەوە. «دکتـۆر فـەوزی ڕەشید» وەک زۆر لێکۆڵەری تر لەسەر ئەو ڕایەیە، کە لە کوردستان و زنجـیرە چیاکـانی زاگرۆسـەوە، خەڵـک بەرەو هێند کۆچیان کردووە؛ ئەم ڕایە بـەم دواییـە لەسـەر ئاسـتی جیهـانی پشـتگیری کـراوە؛ بۆیـە دواجـار دەگەینە ئەوەی کە بڵێین: ئەوانەی کە هاتوونەتە کوردستان و ئێران، ئەگەر وای دابنێین ئەوانـەی کـە هـاتوون، ئاری نین، بەڵکە ئاری ئەوانـەن کـە لێـرەوە کۆچیـان کـردووە، جـا ئەگـەر ئـەو کـۆچ‌کردووانـە گەیشـتبنەتە هیندوستان و ئەوروپا، ئەوا ئەو هیندی و ئەوروپیانە، ئەگەر بتوانن پێیان بڵێین «ئاری»، ئەوا نـەوەی ئارییـەکانی دانیشتووی «ئیریەن ڤیچ»ن، نەوەی ئێران و کوردستانن.

### ئایا ئارییەکان هاتوون؟

ئەگەر ساڵانێکی زۆر قسە لەسەر هاتنی ئاریەکان بۆ ئێرانی ئەمڕۆ گـەرم و تونـد بـوو، ئێسـتا ئـەم ڕایـە ئـەو گەرمییەی جارانی نەماوە. پێشتر لە مێژووی ئەشکەوتی شانەدەر بەدەرکەوت کە لای کەم لە ٦٠ هـەزار سـاڵ پێش زایین تاوەکو ئەمڕۆ ئەم ناوچەیە بێ مرۆڤ و بێ ژیان نەبووە؛ هـەروەها ئـەوەش ڕوون بـووەوە کـە ئـاری تەنیا ئێرانییەکانن بە هەموو پێکهاتەکانی ئێرانەوە. کەواتە ئەم وڵاتە لەگـەڵ هـاتنی ئـەوەی پێیـان دەگـوترێ هاتنی ئاریەکان -کە زەمەنەکەی بۆ هەزار ساڵ پێش زایین دەگێڕنەوە- ئاوەدان نەبووەتەوە، بەڵـکە زۆر پـێش ئەو مێژووە ئەم وڵاتە ئاوەدان بـووە و خـاوەنی چەنـدین شارسـتانییەتی خۆیـەتی. «فەرەیـدوون جونەیـدی»

دەنووسێ: «لە دەوروبەری بیشەهر (بێهشەهر)دا پاشماوەی ژیانی حەفتاو پێنج هەزار ساڵەی نێو ئەشکەوت دەرکەوتووە» (جنیدی، ١٣٥٨). لێرەش لەسەر ڕای فەرەیدوونجونەیدی، پێش حەفتا و پێنج هەزار ساڵ ژیانی نێو ئەشکەوت هەبووە. هەروەها «عەباس قەدیانی» دەنووسێ: «کۆنترین بەڵگەیەک کە لەناوچە جیاجیاکانی ئێرانی ئەمڕۆ لەبەر دەستە، بەڵگەو مێژووی عیلامە» (قدیانی، ١٣٧٤). ئەو عیلامیانەی کە لەگەڵ سۆمەریەکان هاوزەمەن بوون. ئەمانە هەمووی دەریدەخەن کە ناوچەکە (ئێران و کوردستان) زۆر پێش ئەو مێژووەی بۆ ئاریە هاتووەکان دیاریکراوە، ئاوەدان بووینە. ئێمە لە هێنانەوەی ئەم بەڵگانە نامانەوێ کۆچکردن بۆ ئێران و بۆ کوردستان ڕەت بکەینەوە، بەڵام بە پشتبەستن بە بەڵگە مێژووییەکان، ئەوە دەسەلمێندرێت کە هاتووەکان لەهەر زەمەنێک و هەر نەتەوەیەک بووبن، ڕەنگ و ڕووی ناوچەکەیان نەگۆڕیوە؛ بەڵکە دواجار هاتووەکان لەنێو دانیشتوانی ناوچەکە تواونەتەوە. کەواتە مێژووی ئێران و ئێرانییەکان بە کوردەکانیشەوە لەو مێژووە دەست پێناکات کە بە هەڵە بۆ هاتنی ئارییەکان دیاریکراوە، چوونکە زۆر پێش ئەو هاتنە ژیان لەناوچەکەدا دامەزراو و گەرم بووە. هەرچەندە ڕای دکتۆر «ژاڵە ئاموزگار» لەسەر ئەوەیە کە «ئەوەی کە بە هاتنی ئاریەکان ناو دەبرێت، لە ڕاستیدا گەڕانەوەی ئاریەکانە بۆ خاکی پێشوو، خاکی باپیرانیان» (آموزگار، ١٣٧٤). ئەفسانەیەکی برائیزەدیە کوردەکانیش هەیە و هەر ئەم ڕایە دەسەلمێنێ کە باس لە کۆچکردنی بەشێک لە مەڕدارە ئیزدییە کوردەکان دەکات پێش ڕوودانی لافاو بۆ وڵاتی هیندوستان و دواجار گەڕانەوەیان بۆ خاکی خۆیان[1].

تا ئێستا چەند خاڵێکمان بۆ ڕوون بووەوە:

**یەکەم**: لە سەد هەزار ساڵ پێش زایین ئەشکەوتی شانەدەر ماڵی نیشتەجێ و ژیانی مرۆڤ بووە و لە دەوروبەری ٦٠ هەزار ساڵیش پێش زایین، شانەدەرییەکان مردووی خۆیان ناشتووە و ئەم مردوو ناشتنەش نیشانەی هەبوونی جۆرە ئایینێکە کە هەر لەگەڵ ئەم ئایینە سەرەتاییە بەپێی گریمانەی پێکەوەیی سەرهەڵدانی ئایین و ئوستوورە هەر لەو زەمەنە ئوستوورەش سەری هەڵداوە.

**دووەم**: کۆنترین و گەورەترین ئەشکەوت لە کوردستان و لە ئێراندا هەن و ئەویش ئەشکەوتی «شانەدەر» و ئەشکەوتی «پڕ ئاوە».

**سێیەم**: ئەوەی پێی دەگوترێت کۆچی ئاریەکان، بەم شێوەیە نییە کە تا ئێستا باس کراوە؛ واتە گەلێک نییە بەناوی ئاری هاتبنە ناوچەکە و ئەم ناوچەیەیان ئاوەدان کردبێتەوە؛ بەڵکوو زۆر پێش ئەو مێژووەی بۆ هاتنی ئارییەکان دەستنیشان کراوە، ناوچەکە ئاوەدان بووە. دواجار ئەگەر ئاری هەبێ ئەوا ئێرانییەکان بە هەموو پێکهاتەکانییانەوە لەوانە کوردیش ئاری ڕەسەنن. ئاریەکەشیان لەوەوە هاتووە کە بەدانیشتوانی وڵاتی «ئیریەن ڤیچ - ئاریەنڤیچ» دەگوترێ ئاری و ناوی «ئێران»یش هەر لەو ئیریەوە و ئاریەنەوە هاتووە.

### زەردەشتی پێغەمبەر:

---

[1] بیستوومە لە ئێران ئەم بابەتی هاتن و نەهاتنی ئاریەکان گفتوگۆی لەسەر کراوە، بەداخەوە من ئاگاداری ئەو گفتوگۆیە نیم.

زەردەشت وەک پێغەمبەرێک و کەسایەتییەکی ناوداری مێژوویی زۆری لە بارەوە نووسراوە و ئەوە ساخ بووەتەوە کە نەوەی «ماد»ەکانە. «برۆسۆس» (BEROSSUS ) کە لە سەدەی سێهەمی پێش زاییندا ژیاوە لای وایە زەردەشت یەکێکە لە بنەماڵەی شاهانی ماد (اورنگ، ١٣٤٦: ١٣). ماد و کوردیش وەک کوڕ و باوک ناسراون. «هەمارتۆن» و «نۆلدکە» و «وایسباخ» دەڵێن: «گەلی کورد -کە مێژوونووسانی یۆنانی کۆن لەگەڵ هۆزەکانی ماد و پارس ناویان بردوون - ڕاست ئەو کوردانەی ئەمڕۆکەن» (اورنگ، ١٣٤٦). ئەگەر کورد نەوەی مادەکان بن و زەردەشتیش لەبنەماڵەی شاهانی مادبێ، ئەوا زەردەشتیش سەر بەو نەتەوەی «کورد»ە. ئەوەش زانراوە کە زەردەشت لە «ئیریەن ڤیچ» لەدایک بووە. پورداود دەنووسێ: «بەکورتی دەتوانین بڵێین کە "زەردەشت" لە ڕۆژئاوای ئێران یان باکووری ڕۆژئاوای ئێرانە. بەهیچ شێوەیەک پەیوەندی بە خوارەوە نییە؛ هەروەها باوەڕی ڕۆژهەڵاتی ئێرانیش بەلانراوە، ئەمڕۆ کەس باوەڕی پێ نییە» (پورداود: ٢٧). ئەگەر پورداود بە دڵنیاییەوە ئەم ڕایەی دەسەلمێنێ، ئەوا خەڵکی ناوچەکەش پشتگیری لەو ڕایە دەکات. ئێستا لەکوردستان و نێوان مەهاباد و سەردەشت و ورمێ خەڵکەکە باس لە گۆڕی «دایکی زەردەشت» و گۆڕی «کچەکەی زەردەشت» دەکەن. جگە لەوەی «عیمادەدین دەولەتشاهی» کە زیاتر لە سی ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوەی ئاوێستا بووە، لە کتێبێکدا بەناوی «جغرافیای غرب ایران یا کوەهای ناشناختە اوستا» لەم کتێبەدا شوێن پێی زەردەشتی پێغەمبەری هەڵگرتووە، کە زەردەشت لە ناوچەکەیەوە لە دەوروبەری ورمێ کۆچ دەکات و پێبەپێ و شوێنبەشوێن ناوی ئەو جێگایانە لە ئاوێستادا هاتووە کە زەردەشت پێیاندا تێپەڕیوە و لێیان ماوەتەوە و ئێستا ئەو شوێنانە بە هەمان ناو یان کەمێک گۆڕانەوە لە کوردستان و ناوچەکەدا ماون. دیسان هەر خودی ناوی شاری «سەردەشت» ڕای ئەوە هەیە، کە لە ڕاستیدا «شاری زەردەشت»ە، نەک «سەردەشت». وەک دەبینین زەردەشت بەناو و بە جوگرافیا زۆر توند بەو خەڵک و خاکەوە نووساوە کە لەهیچ خاک و ناوچەیەکی تر بەم شێوەیە نییە. ئەمەش بۆ ئەوە ڕوون دەکەینەوە، چونکە بەشێکی مەزنی ئەوەی کە پێی دەگوترێ «اساطیر ایرانی» ئەو ئەساتیرە لە دەوروبەری زەردەشت و ئایینەکەیدا دەسووڕێتەوە. بۆ ئەوەی بەشی کورد واتە بەشێک لە «اساطیرکُرد» دەستنیشان بکەین، وا چاکە بگەڕێینەوە بۆ مێژوو و جوگرافیای کورد. پێشتر لە لێکۆڵینەوەیەکدا گەیشتینە ئەو ڕایەی کە «ئەوەی لێکۆڵەرانی ئێرانی بۆ مێژووی ئوستوورەی ئێرانی دەستنیشانی دەکەن، بەشێکی گرنگی ئەو مێژووە، مێژووی ئەفسانەی گەلی کوردە»[1]. ئەمەش ئەم هاوبەشی و یەک مێژووەی گەلی ئێران و گەلی کورد دەسەلمێنێ و ڕێگای ئەوە بۆ لێکۆڵەرانی هەردوو لا خۆش دەکات کە پێکەوە کار لەسەر ئەم مێژوو و کەلتوورە بکەن کە زەردەشتی پێغەمبەر بەدوای خۆیدا هێناوە. ئەگەر زەردەشتی ساڵی ٦٦٠ی پێش زایین قۆناغێکی گرنگی سەرهەڵدانی ئوستوورەیە، ئەوا ئەو ڕایەی کە هەندێ کەس بڕوایان پێی هەیە، کە دەڵێن زیاتر لە یەک زەردەشت لە مێژوودا هەبووە، هەندێک مەزەندەی شەش زەردەشت دەکەن. c.p.b دەنووسێ: «بەڵام زەردەشتی یەکەم لە شاری بەلخ هاتووتە دنیا. زاناکان لەسەر ئەو ڕایەن کە لە ٣٠٠٠ی پێش زایین بووە؛ کەچی زەردەشتی دووەم، ئەوە

---

[1] بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنی "کوردسات " کە باسی کتێبی مێژووی سەردەشتی دەکرد.

فەرەیدون پاشایە و لەساڵی ٢٠٤٠ی پێش زایین بووە. ئەم سێ زەردەشتە لە کوردە مادەکانن و ئامانجیان ئاشتی و تەبایی و بەختەوەری مرۆڤ بووە»[١]. لێرە "c.p.b" باس لە زەردەشت دەکات و زەمەنی زەردەشتی یەکەم دەباتەوە سێ هەزار ساڵ پێش زایین و هەر خۆشی ئەوە دووبارە دەکاتەوە کە زەردەشت لە کوردە مادەکانە. ئەگەر ڕاستیەک لەم ڕایەدا هەبێ، ئەوا ئەوەیە کە مێژووی زەردەشت و مادە کوردەکان دەباتەوە هەزارەی سێیەمی پێش زایین و دوو هەزار ساڵ پێش ئەو زەمەنەی کە بۆ کۆچی ماد و پارس دەستنیشانکراوە. ئەمە ئەگەر بڕوامان بەسێ زەردەشت هەبێ، ئەگەر ڕاستییەکیش لە شەش زەردەشتەکەدا هەبێ، ئەمجارە مێژووەکە زۆرتر دەگەڕێتە دواوە و ئەم زەمەنەش لەگەڵ ڕای چوار هەزار ساڵەی مێژووی مادەکان دەگونجێ کە هەندێک بەڕاستی دەزانن. لە کتێبی «مختصر تاریخ کردستان» C.P.B لێکۆڵەر دەنووسێ: میدەکان واتە کوردە کورتییەکان لەو ڕۆژگارە لە ماوەی ٤٠٠٠ پ.ز نیوەی جوگرافیای کوردستانیان بەدەستەوە بوو. وڵاتی میدییەکان بەسەر زەمینێکی فراواندا بڵاوبووەوە. لە سنووری هیندوستانەوە هەڵدەکشا تا دەگەیشتە ڕۆژهەڵاتی چیاکانی زاگرۆس و لە دەریاچەی ورمێوە تا کەنارەکانی عومانی دەگرتەوە».

ئەمەش ڕای هاتنی ئاریەکان و ماد و پارس لە سەرەتای هەزارەی یەکەمی پێش زایین کاڵ دەکاتەوە و بوونی مادەکان. لەگەڵ مادەکانیش، پارس بۆ مێژوویەکی زۆر دوورتر دەگێڕێتەوە، بەمەش مێژووی ئوستوورەش ئوستوورەی «زەردەشت و ماد و پارس»ەکانیش دوورتر دەکەوێتەوە. دیارە کە لە مێژوودا لەنێو باسی کۆچ و ئارییەکاندا ماد و پارس هەمیشە پێکەوە ناویان هاتووە. ئەگەر ئەم ڕا و بەڵگانەی پێشوو مێژووی مادەکانە بە زەردەشتیشەوە دەگەڕێنێتەوە هەزارەی چوارەمی پێش زایین. ئەو مێژوو گەڕانەوەیە پارسەکانیش دەگرێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا مێژووی ماد و پارس و زەردەشت و مێژووی ئوستوورەکانیشیان بۆ ئەو ڕۆژگارە دەگەڕێتەوە.

### وشەی ئوستوورە:

لەبارەی وشەی «اسطورە» نووسەری ئێرانی «عەلی مەحمود بەختیاری» دەنووسێ: «وشەی ئوستوورە بەپێچەوانەی ئەوەی کە فەرهەنگنووسان نووسیویانە، عەرەبی نییە» (بختیاری). هەر ئەو لێکۆڵەرە دەنووسێ: «لە سانسکریتی SUTRA بەمانای داستان و زۆرتر بۆ نووسینەکانی بودایی بەکاردێ». ئەو نووسەرە وشەی ئوستوورە بۆ وشەی SUTRA (سوترا)ی سانسکریتی دەگەڕێنێتەوە و دەشنووسێ بە مانای «داستان» لە نووسینەکانی بۆدایی بەکار دێ کە لێرە پەیوەندییەک بۆ وشەی ئوستوورە لەنێوان زمانی سانسکریت و زمانی کوردی پەیدا دەبێ. ئەگەر ئوستوورە بەمانای «داستان» لە نووسینەکانی بودایی و زمانی سانسکریتی بەکار دێ، ئەوا ئێستاش لەزمانی کوردی وشەی «ستران» بۆ بەدەنگ و ئاواز گوتنی داستان بەکار دێت کە هەمان «سوترا»ی سانسکریتییە کە سووک کراوە و گۆڕاوە بۆ «سوتر - ستر» (SITR- SUTR). کە ئەگەر

---

١ سەیری گەڕان بەدوای نەمرییدا بکە.

لـە «سـتران»ی (SITRAN) کـوردی «ان» (AN) (حـاڵ و کـۆ) لابـەرین، ئـەوا وشـەی سـتر (SITR) دەمێنێتەوە کە هەمان «ستر»ی سانسکریتییە کە لە «سوترا»وە گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بەم شێوەیە: «سـوترا SUTRA سوتر SUTR ستر - SITR» کە هەر ئەو «ستر - SITR»ە لەزمانی کـوردی ماوەتـەوە و مانـا سەرەکییەکەی ئەوەیە کە داستان بەدەنگ و ئاواز دەگوترێ، پێی دەڵێن «ستران». بە گۆیندەکـەش دەڵـێن: «سترانبێژ». هـەر وشـەی ئوسـتوورە، هاوڕیشـەیە لەگـەڵ وشـەی «سـتۆری - STORY» و «هیسـتۆری - HISTORY» و جگە لە «ستران»ی کوردی.

نابێ ئەوەش لەبیر بکەین لەنێو مانای هەموو ئەم وشانەدا (ئوسـتوورە، سـتۆری، هیسـتۆری، سـتران) مانـای «چیرۆک» (واتە بەسەرهاتی کەس و گـەلان، بەسـەرهاتی خوداوەنـدان، بەسـەرهاتی پاڵـەوانان، بەسـەرهاتی عاشقان) دەست دەکەوێ.

### مانای ئوستوورە و ستران:

لە فەرهەنگ و لێکۆڵینەوەکانی تایبەت بە «ئوستوورە»، ماناکـەیان بـەم شـێوەیە لێکداوەتـەوە کـە دەکاتـە «چیرۆکی خواوەندەکان» (مالوان، ١٣٧٤: ٩٩). لەم چیرۆکەش مەبەست چیرۆکی ئایینی خواوەندەکانـە، کـە ئەمەش هەمان مانای هەیە کە لە قورئاندا هێمای بۆ دەکات؛ ئەویش ئەوەیە کـە ئـەو عەرەبانـەی کـە سـەرەتا باوەڕیان بە ئایینی ئیسلام نەدەهێنا، ئایەتەکانی قورئانیان بـە «اسـاطیر الاولـین» نـاودەبرد کـە لـە «اسـاطیر الاولین» مەبەستیان باس و چیرۆکی ئایین و خواوەندەکانی کۆن بوو؛ واتە «اساطیر» کە کـۆی «اسـطورە»یـە، دەکاتە باسی خواوەندەکانی ئایینە کۆنەکان کە دەکاتە پاڵەوانی داستانە کۆنەکان؛ هەروەها داستانیش دەکاتـە چیرۆکی پاڵەوانە ئازاکانی بەسەرهاتە کۆنەکان. کە ئەو پاڵەوانانەی داستانەکان بەردەوام خاوەنی ئازایەتییـەکی لەڕادەبەدەر و پیرۆزییەکی بێوێنەن. لێرەیـە ئوسـتوورە و داسـتان یـەک دەگرنـەوە. هێنـدە هەیـە داسـتان دەتوانین بڵێین زۆربەی ئوستوورە بەپێی زەمەن و گۆڕانە کۆمەڵایەتی و ئایینییەکان گۆڕانیان بەسەردا هـاتووە؛ ئەمەش بـە ئاشـکرا لـە تایبەتمەنـدی کەسـایەتی و جـۆری ڕووداوەکـان بـەدەر دەکـەوێ[١]. سـەیر دەکـەین بەسەرهاتی «گلگامش» بە «داستانی گلگامش - ملحمە گلگامش» باس دەکرێ نـەک ئوسـتوورەی گلگـامش کە هەموو لایەک دەزانن گلگامش وەک پاشایەکی سۆمەرییەکان بەشێکی خوداوەنـد بـوو، جگـە لـەوەی کـە ئیلامیەکان گلگامیشـیان وەک خوداوەنـدێکی تـەواو دەپەرسـت؛ کـەچی لـەجیاتی «ئەفسـانەی گلگـامش»، داستانی گلگامش دەنووسرێ کە لێرە داستان پێناسەیەکە زیاتر بۆ بەسەرهات و پاڵەوانییەتی گلگـامش؛ نـەک

[١] سەیری گەڕان بەدوای نەمرییدا بکە.

خودی خوداوەندییەکەی. دواجار ئەم شێوازە ئەدەبە (واتە داستان) بووە بە شێوازێک بابەتی تازە و هاوچەرخیشی گرتۆتە خۆ و بۆیە بەهۆی بابەتە تازەکان کەمێک لەڕیشەی خۆی -کە ئوستوورەیە- دوور کەوتووەتەوە. بەڵام، وەک پێشتر گوترا، داستان لە کوردیدا کە بە دەنگ و ئاواز دەگوترێ، پێی دەڵێن «ستران». لێرە جارێکی تر وشەی ئوستوورە و ستران هەم لە ڕیشەی پێکهاتەیی و شەیدا و هەم لە مانادا تێکدەکەنەوە.

## ئوستوورە و ئەفسانە:

ئەگەر ئەوەمان بۆ ساخ بووەوە کە ئوستوورە ڕیشەکەی لە زمانی سانسکریتییەوە هاتووە و ماناکەی دەکاتە چیرۆکی خوداوەندان، ئەوا ئەفسانەش باس لەو چیرۆکانە دەکات کە پاڵەوان و ڕووداوەکانی لە سەرەوەی توانای کەس و ژیانی ئاسایین. دیسان ئەفسانەش ئەوەی کە لە لێکۆڵینەوەی لێکۆڵەرە فارسەکاندا بە «افسانەی عامیانە» ناو دەبرێ، هەمان «افسانەی خوداوندان»ە. ئەمیش وەک داستان بەپێی زەمەن گۆڕانەکان، گۆڕانی بەسەردا هاتووە و لەگەڵ ڕۆژگار و باوەڕی تازە -بەتایبەت پاش هاتنی ئایینە ئاسمانییەکان- خۆی گونجاندووە، دەنا لێرەش ڕیشەی چیرۆک و کەسایەتییەکانی ئەفسانە، هەمان ڕیشەی چیرۆک و کەسایەتییەکانی چیرۆکی خواوەندەکانی ئوستوورەیە (مفرد، ١٩٩٥: ١١٤). ئەوەش لەبیر نەکەین «ج. مفرد» ڕیشەی وشەی ئەفسانە دەباتەوە سەر «ئاڤێستا»ی پیرۆز[١]. ئێستا وشەی ئەفسانە لە زمانی کوردی زیاتر لە مانایەکی بۆ خۆی پەیدا کردووە (مفرد، ١٩٩٥: ١١٤). هەروەها ئەفسانەی کوردی وەکوو ئەفسانە بە تایبەتمەندییەکانی خۆی زۆر لەمێژە خۆی ناساندووە. «گەزنەفۆن» لەساڵی ٤٠١ پێش زایین لە کاتێ سەرکردایەتی دە هەزار یۆنانییەکە دەکات بۆ گەڕانەوەیان بۆ یۆنان، پاش ئەوەی کە بە هونەری هەڵاتن، لەدەست کوردەکان ڕزگار دەبێ، دەنووسێ: «دواجار ئێوارەیەکی ڕۆژە پاییزییەکان لە خوارەوەی خۆمان و لە قەراغ ڕووباری "سان تری تس- خابوور" خۆمان بینی، هەناسەیەکی خۆشیمان هەڵکێشا و چونکە خواردنێکی زۆرمان هەبوو. شەو بەچاکی و خۆشی و گوتن و بیستنی ئەفسانە لەبارەی کوردەکانەوە ڕۆژمان کردەوە» (هاوس هولد: ٢٨). گەزنەفۆن کە لێرە باس لە ئەفسانە لە بارەی کوردەکان دەکات، مانای وایە لەم هاتن و گەڕانەوەیە، گەزنەفۆن و سەربازەکانی ئەفسانەی ناوچەکە و کوردەکانیان لەگەڵ خۆیان بردۆتەوە بۆ یۆنان[٢].

## ئوستوورەی هاوبەش:

«جەمشید» پاشای ئوستوورەیی و کەسایەتی قۆناغی مێژووی ئوستوورەی جوگرافیای ئێرانی مێژووییە. ئەو مێژووە ئوستوورەییە، زۆر بەهێز چووەتە نێو مێژووی ئوستوورەی هەردوو گەلی فارس و کورد؛ چ وەک کەسایەتییەکی ئوستووری، چ وەک پاڵەوانی ڕووداو و زەمەنێکی دیاریکراوی جوگرافیایەکی دیاریکراوی

---

[١] سەیری گەڕان بەدوای نەمرییدا بکە.
[٢] شەڕەکانی ئێران و یۆنان هۆیەکی گرنگن بۆ تێکەڵبوونی کەلتووری هەردوولا.

## بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە

ئوستوورەیی هەردوولا و سەرەتایەکی مێژووی ئوستوورەیشە نەک هەر بۆ ناوچەکە و ماد و فارس، بەڵکە بۆ هەموو مرۆڤایەتی.

لە جەمشید بە دواوە، هەموو کەسایەتییە ئوستوورەییەکان، نموونەی: ڕۆستەم و زۆراب و سیاوش و زاڵ و هەروەها گیاندارە ئوستوورەییەکان وەکوو: ئەسپی باڵدار و زماندار و باڵندەی سیمرخ و ئەژدیهای سێ سەر و حەوت سەر و دێوی ڕەش و سپی و پیرەژنی جادوکار و کێوی قاف و ئەلبورز و سەردنیاو بن دنیاو هەموو کار و کەرستە و شوێنە ئوستوورەییەکانی تر کە لە ئوستوورەی هەر دوو لا بەردەوام دووبارە دەبنەوە. بابەتی لێکۆڵینەوە و کەرەستەی بە دوادا چوونن کە بەشێکی گرنگ لەمانە ڕاستی و پیرۆزی ئایینە جیاجیاکانی ناو جمەکەن و هەندێکیشیان ڕووداوی مێژوویی ڕاستەقینەن کە بەهۆی لێکۆڵینەوەی زانستی دەتوانین زۆر گۆشەی تاریکی ڕابردوومان بۆ ڕووناک بکەنەوە و وەڵامی زۆر پرسیاری بێ وەڵام بن.

ئەگەرچی «فیردەوسی» لە شاهنامەدا لە سەردەمە جیاجیاکانی ئوستوورە و پاڵەوانی و مێژووی هاوبەشدا زۆری لەم کەلتوورە بۆ تۆمار کردووین، بەڵام هێشتا وەکوو پێویست کار لەسەر ئەم کەلتوورە هاوبەشە نەکراوە و ئەم ڕیشە هاوبەشە مێژووییە لە سوودی ئێستا و داهاتوو بەکار نەهاتووە.

### ئەنجام:

- دەرکەوت و ئاشکراشە کە دوو گەلی کورد و فارسی جوگرافیا و مێژوو و کەلتوورێکی هاوبەش و دەوڵەمەندیان پێکەوە هەیە.

- لە نێو ئەم کەلتوورەشدا مێژوویەکی کۆنی ئوستوورەی دەوڵەمەند ڕیشەی ئەم دوو گەلەی تێکئاڵاندووە و ناکرێ مێژووی ئوستوورەی یەکێکیان جیا لەوەی تر و دوور لەم جوگرافیایە بنووسرێ.

- پشت بەم دوو خاڵەی سەرەوە، زانست وا دەخوازێ لێکۆڵەرانی ئەم دوو گەلە، چ پێکەوە و بە هاوبەشی زانستگاکان و پسپۆڕان کار لە سەر هاوبەشی ئەم کلتوورە بەتایبەت ئوستوورەیەدا بکەن، چ بە تەنیا و یەک یەکە لێکۆڵینەوە لەسەر بابەتە هاوبەشەکاندا بکەن.

- ئەم کلتوورە هاوبەشە، بریتییە لە بابەت و پسپۆڕی جیا جیا. هەر بۆیە ژیان وادەخوازێ کە لەزۆر ڕووەوە پسپۆڕانی جیاجیا لێکۆڵینەوەی مێژوویی و ئایینی و ئوستوورەیی و زمان و ... هتد بکەن. بەمەش گرنگی و دەوڵەمەندی ئەم کەلتوورە هاوبەشە جوانتر دەردەکەوێ. ئەمەش دەبێتە هۆیەکی ڕۆشنبیری گرنگ بۆ چاکتر تێگەیشتن و پتر لێکتر نزیک بوونەوەی ئەم دوو گەلە.

- بەشێکی گرنگی سەرچاوە کۆنەکان لەنێو کلتووری ئێراندان و بە زمانەکانی ئاڤێستا و پەهلەوی و فارسی و کوردی نووسراون و لەنێو کتێبخانەکانی ئێران و ناوەندە ڕۆشنبیری و کلتووری و ئەکادیمییەکانی ئێراندا پارێزراون و بۆ کورد تەنیا لەو شوێنانە دەست دەکەون. دوور لەم سەرچاوە کۆنانە نووسینی مێژوو (مێژووی هەر بەشێکی ڕابردووی کورد) بەتایبەت مێژووی ئوستوورەی کورد، کارێکی ناتەواو دەبێت.

## سەرچاوەکان:

* عەرەبی:

- قران الكريم

- جمال رشيد احمد و فوزی رشيد (1990) **تاريخ الكرد القديم**، جامعة صلاح‌الدين، اربيل.

- فاضل ،عبدالواحد على (1986) **عشتار وماساة تموز**، افاق عربية، ج2 عراق - بغداد.

* ايهان محمّد قادر ئاميدی (2007) **انسان كهف شاندر فی كردستان** - العراق وعلاقته بالنياندرتال، رسالة الماجستير - جامعة صلاح الدين. كلية الاداب، قسم الاپار.

* فارسی:

- بهرام ،فروشی (۱۳۷۴) **ایرانویج**، تهران، انتشارات دانشگاه.

- پرویز، شريعتي (۱۳۷۸) **داستان افرینش و تاریخ پشدادی کیانی**. چاپ دانشگاه تهران.

- پورداود، **گاتها سرودهای مقدس پیغمبر ایران حضرت سپنتمان زردشت، اوستا**، بمبئی و ایران، از سلسل وانتشارات انجمن زردشتیان ایران.

- ج. مفرد (۱۹۹۵) **نیاکان باستان کرد در تاریخ واسطوره‌ها**، سوئد، کتاب ارزان.

- هاوس هولد، چغري (۱۳۳۹) **گزنفون، بازگشت ده هزار یوناني**، ترجمۀ منوچهر امیری، تهران، انتشارات نیل، چاپ امیر کبیر.

- تاباني کردستاني ، حبیب الله (۱۳۵۸) **بررسی اوضاع طبیعي و اقتصادي انساني** (در نمونۀ کردستان مکري) انتشارات سیدیان، چاپ رجائی.

- آموزگار، ژاله (۱۳۷۴) **تاریخ اساطیر ایران**، تهران، سازمان مطالعۀ وتدوین کتب علوم انساني دانشگاها (سمت).

- قدياني، عباس (۱۳۷۴) **تاریخ ادیان ومذاهب درایران**، تهران، انتشارات انیس.

- فردوسی،ابوالقاسم (۱۳۷۸) **شاهنامه**، ایران، انتشارات قنوس.

- جنیدي، فریدون (۱۳۵۸) **زندگي ومهاجرت نژاد آریا براساس رویات ایراني**، ایران، انتشارات بلخ.

- مالوان، م.ا (۱۳۷۴) **بین النهرین و ایران باستان**، ترجمۀ مستوفی، تهران، انتشارات دانشگاه.

- اورنگ. م (۱۳۴۶) **رستاخیز فریدون**، تهران، چاپ رنگین.

- اورنگ. م (۱۳۴۶) **کردشناسی**، تهران، چاپخانۀ رنگین.

- مشکور، محمّد جواد (۱۳۶۶) **تاریخ ایران زمین**، تهران، انتشارات اشرفی.

* کوردی:

- ئیبراهیمی، محەمەد ساڵح (شەپۆڵ) ( ۱۳۷۸) **باوی کوردەواری**، تاران، چاپ اندیشه.

- ئیبراهیم حەسەن، مەولود (۲۰۰۲) **گەڕان بەدوای نەمریدا**، هەولێر، دەزگای ئاراس.

- ئیبراهیم حەسەن، مەولود (٢٠٠٧) **پێکهاتەی ئەفسانەی کوردی**، سلێمانی، دەزگای رەنج.

* گۆڤارەکان:

عەرەبی:

- نوروز العراق - الجزء العاشر - بغداد - ١٩٨٩

* کوردی

- رامان - ژ -٨

- هەزارمێرد - ژ -١٠

- لالش - ژ - ١٧، ل ٨٢

- ڕۆژنامە:

- خەبات: ڕۆژی ٢١/٧/٢٠٠٠، ژمارە ٩٨٦ –مختصر تاريخ كردستان: تـاليف: c.p.b، ترجمـة: حـازم پاشـا. قسـم الاول

# دەستخەتەکانی شانامەی کوردی لە کتێبخانەکەمدا

محەممەد عەلی قەرەداغی [*]

**کورتە:**

شانامەی کوردی کە باسی ئەوەی هەبێت، شانبەشانی شانامەی شانامەی فارسی –بگرە پێش ئەویش- ئەدیبان و شاعیرانی کورد کاریان تێدا کردبێت و شاکاریان تێدا بهێنابێت. ئێمە ئێمڕۆ هەواڵی چییان دەزانین؟ من گومانم لەوەدا نییە کە هەواڵی زۆر کەمیان دەرانین. تا ئێستا چ هەوڵێک بۆ شانامەی کوردی کراوە؟ دەقەکان لای کێن؟ من لەم وتارەدا تێدەکۆشم ئاماژە بە هەندێ دەسنووس و دەقی شانامە بکەم کە بە زاراوەی گۆرانین و خاوەنی بڕێکیان دیار و هەندێکیشیان نادیارە.

**وشە سەرەکییەکان:** شانامەی کوردی، دەستخەت، زاراوەی گۆرانی.

---

[*] ئەندامی کارای ئەکادیمیای کوردی.

### سەرەتا

چەند جار باسی ئەوەم کردووە ئێمەی کورد هەواڵی دروستی سامانی نەتەوەیی خۆمان نازانین و نازانین دەستخەت و شوێنەواری زانایانمان چەند بوون و چییان بەسەر هاتووە و دوای ئەو هەموو کارەساتانەی کە بە سەر دەستخەتی کوردی و شوێنەواری زانایانی کوردا هاتوون، وێستی چیمان ماوە و ئەوانەی کە ماون لە کوێن؟ چونکە وەک نووسیومە تا ئێستەش کۆڕپەی ئاواتی ڕۆشنبیرانی کورد لە سکی دایکی مێژووی کەلەپووری و کەلتووری کورددا نەرسکاوە، چ جای ئەوە بەرەژانی پێوە بگرێ![1]

تا ئێستە نە خۆمان نە دڵسۆزێکی بیانی –من بزانم- ئەوەیان نەکردووە بە کتێبخانەیەک؛ لە کتێبخانەکانی جیهاندا بگەڕێن و بزانن چەند دەستخەتی کوردییان تێدایە و یەکیان بخەن و بەناوی «دستخەتە کوردیەکانی کتێبخانەی فلان»ەوە لە چاپیان بدەن و لێکۆڵەری کورد بزانێ چیمان هەیە، یان ئەو بۆ ئەو باسەی دەیەوێ بینووسێ چەند سەرچاوەوە و زانیاری لەو کتێبخانانە دەست دەکەوێت. ڕۆشنبیری کورد تا ئەو ئاواتەی نەیەتە دی، هەر چی بڵێ و هەر چی لە بارەی باسێکی مێژوویی یان ئەدەبی کۆنەوە بنووسێ، هەر دەمبرە و ڕەنگە زۆری پێنەچێ ڕا و بۆچوونەکانی تەک دۆزینەوەی نوێدا نەگونجێن و بابەتی تازەی وەها سەر هەڵبدات ئەو ناچار بێت ئەو بۆچوونانەی بگۆڕێت و سەر لە نوێ بە خۆی و بابەتەکەیدا بچێتەوە.

### شانامەی کوردی

شانامەی کوردی کە باسی ئەوەی هەبێت شان بە شانی شانامەی فارسی –بگرە پێش ئەویش- ئەدیبان و شاعیرانی کورد کاریان تێدا کردبێت و شاکاریان تێدا بەدی هێنابێت (بهرامی، ١٣٨٣: ٣٠) ئێمە ئەمڕۆ هەواڵی چییان ئەزانین؟ من گومانم لەوەدا نییە هەواڵی زۆر کەمیان دەزانین. منێک بە تەنیاباڵ کە بە شوێن دەستخەت و شانامەی زانایانی کوردەوەم و دەمەوێ شتێکیان لە سەر بزانم و دۆزینەوەی دەستخەتی شانامە تەنیا مەبەستم نەبووە، توانیبێتم چەند دەستخەتی نایابی کوردی جۆراوجۆری شانامە بە دەس بهێنم، دەبێ ئەگەر کەسانی تر شارەزا و بەتوانا لە مەودای قووڵ و بەریندا بە بەرنامەی کاری ڕێکوپێکەوە بۆی بگەڕێن، چی بدۆزنەوە؟

تا ئەندازەیەک بە پشت ئەستوریەوە دەڵێم: وەها کارێک لەوانەیە ڕووی مێژووی گەلێ بابەت بگۆڕێت و ئاسۆی باس و خواست و لێکۆڵینەوەی نوێ بخاتە بەردەستی پسپۆڕ و لێکۆڵەرانی بواری ئەدەبی کوردی. کە بانگهێشت کرام بۆ «یەکەمین کۆڕی نێونەتەوەیی وێژەی کوردی» لە سنە، وتم: لاقە کولەی خۆم –هەرچەند ناشیاو و بێئەرزشیش بێ- تەک خۆم ببەم و داوای ئەوە بکەم لە دامێنی سفرەی بەپێز و بەفەڕی مامۆستایان و ئەدیبانی بەرزی کوردەوە ڕێگە و جێگەی ئەوەی ببێ وەک دیاری دۆستێکی ئەدەبی کوردی لە قوشبنێکدا

---

[1] ئەم بابەتە بە ناونیشانی «العنوان المفقود او المولود المرتقب» بە زمانی عەرەبی لە کۆڕی زانیارانی کورد لە بەغدا خوێندەوە، دواییش لە «مجلة التراث العلمي العربي، العدد ٢/سالی ١٤٢٢»دا بلاوبووەتەوە.

ئارام بگرێ و ئەگەر ئەرزشی ئەوەی بوو سوودێک ببەخشێ ئەوە باشە ئەگەر نا «ماڵی قەڵب سەرەو خێوە» و منیش «کردە پەشیمان» بم باشترە لەوەی نەکردە بم.

بۆ ئەم بابەتە لە کتێبخانە بچکۆلەکەی خۆمدا چەند لایەنێکم بینی کە دەکرێ لێیان بدوێم و سەری دۆستان و ڕێخەرانی کۆڕەکەیان پێ قاڵ بکەم. ئەنجام بینیم چەند دەستخەتی شانامەی کوردی جۆراوجۆرم لە لایە بە پێی ئاگاداری خۆم و گەڕان و پشکنینم لە سەرچاوەکاندا تا ئێستە دەست عەودالانی بواری شانامە نەکەوتوون. ئەگەر بخرێنە بەرباس و لێکۆڵینەوە، ڕەنگە لەم قۆناغەی کاری لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی بەگشتی و شانامە بە تایبەتیدا چەند هەنگاوێک کاروانەکەی بەرەو پێش بەرن و گوڕ و تینێک بە هەوڵ و کۆششی ئەو کەسانەیش بدەن کە لەم بوارەدا سەرگەرمی کارن، ئەم باسە هاتە دی.

دەبێ لە سەرەتادا ئەوە بڵێم جوولاندنی زەنگی ئەم باسە گەلێ پرسیار سەرهەڵدەدەن زۆر شت هەیە دەبێ بیانڵێم، بەلام ئەم کۆڕە مەودای ئەوەی نییە و ناگونجێ ئەو باس‌وخواستانە بخرێنە سەرمێزی گفتگۆی ئێرە، چوونکە باسەکە لەق‌وپۆپی زۆری لێدەبێتەوە و پەل بۆ دور و نزیک دەهاوێژێ. بۆیە ئەوەندەی بۆ ئێرە بشێ بە کورتی دەیخەمە بەردەستی بەڕێزان؛ بەهیوای ئەوەی بە دەوری خۆم شتێکم پێشکەش کردبێ. سەرەتا ئەوە دەڵێم کە لە چەند دەستخەتدا، چوار دەقی کورت و درێژی شانامەم بە زاراوەی گۆرانی لەلایە، بۆ ئەوەی بزانم ئەم دەقانە لای کەسانی دیکە هەن یان نا؟ کەس کاری لە سەر کردوون یان نا؟ بەکورتی بزانم تا ئێستە چە هەوڵێ بۆ شانامەی کوردی دراوە؟ ئەم باسە هاتە دی.

دوای گەڕان و پشکنین دەرکەوت، یەکەم: لە سلێمانی و دەوروبەری سەردەمێک لە چایخانەکاندا شەوانە شانامەخوێندنەوە باو بووە و شەوانی درێژی پاییز و ساردی زستان وابووە دوای نوێژی خەوتنان، نوێژکەرانی مزگەوتەکان ڕوویان لە قاوەخانەکان کردووە و کەسانی شانامەخوێن بە دەنگ و ئاواز و بەزمێکی تایبەتیوە کۆڕەکەیان ڕازاندوەتەوە و ئەو خەڵکەیان سەرگەرم کردووە، تا شەوگار زرنگاوەتەوە و بگرە تا دەمەو بەیان ئەو کۆڕە بەگەرمی ماوەتەوە.

دەبێ لێرەدا بەسەر ئەوەدا نەڕۆم: کەم نەبوون ئەوانەی لەو شەوگارە درێژ و ساردانەدا لە قاوەخانەکاندا بەو دەنگ و ئاوازانەوە بە خوێندنەوەی شانامە خەڵکیان سەرگەم کردووە و گەلێ شتیان لەبیر بردوونەتەوە؛ بەلام بەداخەوە کەم بوون ئەوانەی لایان لەو شانامەخوێنانە کردبێتەوە و بە چەند دێڕک یادیان لە پەنای کتێبێکدا پاراستبێ[1]. لەسلێمانیدا لە پەنای ئەو شانامەخوێنانەدا کەسانێک بوون شانامەیان لە زاراوەی گۆرانییەوە، یان لە لە زمانی فارسیەوە بۆ کردوون بەکوردی زاراوەی سلێمانی و شانامەخوێنەکانیش بۆ خەڵکیان خوێندووەتەوە. ئەمانەیش بەرهەمەکانیان پەرتەوازەیە و ڕەنگە بەشێکیشیان هەر بە یەکجاری تێدا چووبن. چەند بەشێکیشیان کەم تا زۆر ڕێگەی چاپخانەیان گرتووەتە بەر و لە لەناوچوون ڕزگار بوون. لەوانەی کە چاپ کراون و لە دەستدان:

[1] لەو هەمموو حەکایەتخوانە و شانامەخوێنانە ناوی «مەلا سمایلی حاجی حەسەن» و کەمێک لە چۆنیەتی ژیانی پارێزراوە. (بڕوانە: گۆڤاری سلێمانی،٢٠٠٠ ژ٢؛ ٢٠٠٣،ژ٤١).

**بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە**

١- «خورشیدی خاوەر»ی عەلی باپیرئاغا.

٢- «شیرین و فەرهاد»ی عەلی باپیرئاغا.

٣- «شیرین و خوسرەو» ی عەلی باپیرئاغا.

٤- «ڕوستەم و جەهانگیر» ی عەلی باپیرئاغا.

٥- «ئەمیر ئەرسەلان» ی عەلی باپیرئاغا.

٦- «مەنیجە و بیژەن» فاتێح فەتاح دۆلانی.

٧- «ڕۆستەم و برزوو»ی کوردیی فاتێح فەتاح دۆلانی.

بەگوێرەی نووسینی ئەم شێخفاتێحە، دەبێ دانەری «ڕۆستەم و برزوو» میرزا موستەفای کوردستانی، دانەری مەنزوومەی«جەواهێرپۆش» بێت[1]. «شێخفاتێح» دەڵێت: ئەم دەقەی لە هەورامیەوە (گۆرانییەوە) کردووە بە سۆرانی. واتە دەبێ دەقی کۆنی «ڕۆستەم و برزوو»ش بە گۆرانی هەبێت و ئێستە لە دەستدا نییە.

دووهەم: ئەوەی من زانیومە و لە دەستمدایە چەند دەقی شانامەی کوردی بە زاراوەی گۆرانی هەن. بەشێک لەو دەقانە خاوەن زانراوەن و دانەرەکانیان دیارە وەک:

١- «مەنیجە و بیژەن» دانراوەی مستەفای کوڕی مەحموودی کوردستانی (دلیدلی). دەقێکی ئەم دانراوە ماموستا ئیرەجی بەهرامی چاپی کردووە.

٢- «هەفت لەشکەر یان داستانی تەیموور». نوسخەی ئەم داستانە لە کتێبخانەکەی خۆمدایە و لە شوێنیدی باسیم نەدیوە. بەگوێرەی کۆتاییەکەی ئەم داستانە، دانراوەی شاعێرێکە کە نازناوی «دەقیقی» بووە. وەک لە باسی دەستخەتەکەدا نووسیمە شاعیر خۆی ئاوا باسی دانراوەکەی دەکات:

| | |
|---|---|
| بە تەوفێق حەرف پادشای غەفوور | تەمام بی داستان شۆخەکەمان تەیموور |
| بەڵێ ئەی یاران لێتان بۆ عەیان | ئیدش فەرماوان فەردەوسی زەمان |

---

[1] "شێخ فاتێح بەکێک بوو لەوانەی کاری لەسەر وەرگێڕانی شانامە بۆ کوردی کردووە. وە شێخ فاتێح جگە لە «ڕۆستەم و زۆراب» و «مەنیجە و بێژەن» کە چاپکراون، دانراوی دیکەشی لەم بوارەدا هەبووە. لەوانە:

یەکەم: «زاڵنامەو ڕۆستەم»

ئەم داستانەی بە ٢٨٨ لاپەڕە کە تێکڕای بەیتەکانی دەکاتە ٥٨٥٦ بەیت کردووە بە کوردی، بەڵام چاپ نەکراوە لای نەوەکانیەتی.

دووهەم: «کاوە و فەرەیدوون»

ئەم داستانەیشی بە ١١٨٦بەیت وەرگێڕاوە بە زمانی کوردی، دەستنووسەکەی ١٠٧لاپەڕە و چاپ نەکراوە، نوسخەی لای نەوەکانیەتی.هەروەها بێجگە لە دیوانی شیعریشی، کە چەند هەزار بەیتە:

شیرین و فەرهاد، یوسف و زلێخا، فەتحی قەڵای خەیبەر، گەنجینەی سەعادەتی هەیە.

«فەتحی» کە نازناوی شیعری شێخ فاتێحە و ساڵی ١٩١٨ لە گوندی دۆڵانی ناوچەی قەرەداخ لە دایک بووە. ساڵی ١٩٦٢ لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گردی شێخ فەتاح کە بەناوی باوکیەوە بە خاک سپێردراوە.

(بەشێ لەم زانیاریانەم لە کاک عەبدۆلباسێتی کوڕی فەتحی وەرگرتوو، لە ژمارە٢٦/١/١٩٨٤ ی هاوکاریشدا وتارێکی لە سەر نووسراوە).

یە کەلام شیرین فیردەوسی نییەن        وەر جە فیردەوسی دەقیقی بیەن
داستان تەیموور ڕەزم هەفت لەشکەر        کەلام دەقیقەن ئەوەڵ تا ئاخر

بەڵام دەقیقی کە دەبێ دانەری ئەم داستانە بێت و داستانەکەی وا دادەنێ پێش فیردەوسی کەوتووە و لە ئەوی وەرنەگرتووە. دیار نییە کێیە و لە سەرچاوەکاندا باسیم نەبینی.[1]

داستانەکانی دی لە خوارەوە ناویان دەنووسم خاوەنیان دیار نییە:

١- جەنگنامەی فەرامەرز و برزوو.
٢- داستانی سەقلابی دێو و ڕۆستەم.
٣- داستانی ڕۆستەمی زاڵ.
٤- هەفت لەشکەر.
٥- بەهرام و گوڵئەندام.
٦- داستانێکی نەناسراو.
٧- داستانێکی ناتەواو، لەوە دەچێت بەشێک بێت لە داستانی ڕۆستەمی زاڵ.
٨- هەفت خوان.

دەبێ ئەوەمان لەبیر نەچێت کە «ڕەشیدهەمەوەندی»[2] دەورێکی باشی بووە لە کۆ کردنەوە و پاراستنی ئەم دەقانەدا. ئەوەتا وەک دەیبینین بەشی زۆریان بە خەتی ئەو نووسەرە بەڕێزەن؛ بەوەیشەوە نەوەستاوە داوای

---

[1] - مەبەستی شاعیر لە «دەقیقی»، هەمان دەقیقی تووسی، هاووڵاتی فیردەوسیە (ابو منصور محمد بن احمد). کە بەر لە فیردەوسی ژیاوە. دەقیقی شاعیری زەرتەشتی سەدەی چوارەمی کۆچییە (لە ٩٧٨زاینیدا مردووە). دووەمین دانەری شانامە و یەکێک لە گەورەترین مامۆستایانی غەزەڵ و قەسیدەیە. لە سەردەمی لاوەتیدا کە خەریکی دانانی شانامە بوو، بە دەست یەکێک لە خوڵامەکانی کوژرا و کارەکەی ناتەواو مایەوە. بەر لە دەقیقی مەسعوودی مەروەزی خەریکی دانانی شانامە بوو و پاش مردنی مەسعوودی، دەقیقی درێژەی بە کارەکەیدا. پاش دەقیقی، فیردەوسی کاری شانامە دوایی پێ دێنێ (فەخرەدین ئامێدیان).

[2] "ڕەشید هەمەوەندی" کوڕی عەزیزی کوڕی موحەمەدی هەمەوەندیە. کەس‌وکاری لەگەڵ ئەو هەمەوەندانەدا لە کوردستان دوور خراونەتەوە لە وڵاتی لیبیا بووە. ڕەشید ساڵی ١٨٨٥ لە تاراوگە و لە ئاوارەیدا لە لیبیا لەدایک بووە، پاش ماوەطەک کەس‌وکاری لە لیبیا هەڵدێن و بە شەوڕەوی و لە ڕێگەی ئەستێرە ناسی و شوێن و جێگەی ئەستێرەوە، بەتایبەتی ئەستێرەی (جد) دەگەڕێنەوە بەرەو کوردستان. بەڵام بە ڕێگەی تۆرکیاوە و جارێکی دیکە دەسەڵاتی عوسمانی دەسگیریان دەکاتەوە. ئەمجارە دەیاننێرێتە دوورگەی (ڕۆدۆس) و ئەمەی بۆ بووە بە خێر چوونکە لەوێ دەستی کردووە بە خوێندن و تا پۆلی شەشی سەرەتایی خوێندووە و بووە بە خوێندەوار. پاش ماوەیەک بنەماڵەی ڕەشید هەوڵ دەدەن بە بەلەم لەو دوورگەیە دەپەڕنەوە و دەربازبوون و گەیشتوونەتەوە چەمچەماڵ.

دوای گەڕانەوەیان لە حکوومەتی عێراق بووە بە پۆلیس و چەند شوێن بە پۆلیسی گەڕاوە و یەکێک لەو شوێنانە وەک لە دەسنووسەکانیەوە دەردەکەوێ، گوندی نەودێ بووە. بەداخەوە خۆی بەسەرهاتی ژیانی خۆی بە دروستی و درێژی نەنووسیوەتەوە یان نووسیەتی و دەستی ئێمە نەکەوتووە. دوای تەمەنێکی درێژ، پتر لە هەشتاد ساڵ ڕۆژی ١٩٧٥/٥/٢٩ لە شاری سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لەگردی شێخ مەحیەدین بە خاک سپێردراوە. (هەندێک لەم زانیارانەم لە کاک "جەهانگیر عەزیزی" کوڕەزای وەرگرت).

**بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە**

لە هاوڕێ و دۆستانی کردووە، لەم کارەدا کۆمەکی بکەن و «عەبدولمەجیدی باینچۆیی» داستانی ڕۆستەم و زاڵی بۆ نووسیوەتەوە. دەبێ ئەوەیش لەبیر نەکەین کە لەوانەیە ئەوەی بەردەستمان هەموو بەرهەمی هەوڵی ڕەشیدهەمەوەند بۆ کۆ کردنەوەی شانامەی کوردی نەبن و دوور نییە گەلێ بەرهەمی دیکەیشی بووبێت، ئەگەر مابن لەمەودوا سەر هەڵبدەن و بزانرێن.

### دەقی یەکەم

### داستانی ڕۆستەمی زاڵ:

ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەکەمدا بە ژمارەی ٣٨٧، ٤٤ لاپەڕەی ١٢ دێڕی تێدایەو پارێزراوە. ئەوەی کە ماوە ١٧٤ لاپەڕەیە. پێوانەکەی ٢٠×١٣ە، لاپەڕەی ١٢دێڕی تێدایە. بە خەتێکی نزیک بە نەستەعلیق نووسراوە؛ بەرگی پێوە نییە و شیرازەکەی پساوە و لە کۆتایەکەیەوە ناوی نووسەرەکە و مێژووی نووسینەکەی پێوەیە.

ئەمەش سەرباسەکانی داستانەکە:



لە لاپەڕەی ١٦٣دا ئەم داستانە بەشێوەی خوارەوە تەواو دەبێت:

کەردش دنیا پەی تەور شانا نەرد     بروش ئاوەرد سەرنگوونش کەرد

من مەندم پەرێ زەمانەی قانی     هانەتۆی جەرگم زەخم نیهانی

مەگەر خوداوەند بدۆ ئیمانم     وە ئیمان سەلیم بەر بشۆ گیانم

| | |
|---|---|
| وەرنە بە کردار عسیان بار وێم | مەبوون وە توعمەی ئەفعا نە جەحیم |
| بە ئەندازەی خەت قەڵەم و دەفتەر | سەڵوات بۆ پەرێ ڕەسووڵ سەروەر |

لە دوای ئەمەوە نووسیویە:

«تمام شد از دست فقیر غریب "سید عبدالحمید باینچویی" برای برادر "رشید افندی"، در سنه ١٣٥٤»[١].

لە دوای ئەمەوە لە لاپەڕەی ١٦٤دا ئەم ناونیشانە نووسراوە:

| | | |
|---|---|---|
| ١٥ | جنگ کردن رستم با پیلسم و کشتن پیلسم به دست رستم | ١٦٤ |

بەڵام دوای دوو لاپەڕە بێئەوەی کۆتایی دیار بێت، دەستخەتەکە دەبڕێتەوە.

### دەقی دووهەم

### بەهرام و گوڵەندام:

ئەم دەستخەتە کە لە کتێبخانەکەمدا بە ژمارەی ٤٤/٣٨٥ پارێزراوە، لە کاغەزێکی تەنکدا بە مەرەکەبێکی مەیلەو شین نووسراوە. سەرەتا و کۆتایی نەماوە. جگە لەوە لە کۆتایی و سەرەتایەوە ناتەواوە، لە ناویشیەوە تا کۆتایی لە سێ جێگە داکەوتن هەیە. بەڵام دیار نییە کە داکەوتن و لەناو چووەکەی چەندە. پێوانەکەی ١٣×٢٠یە . ماوەیەک کەمترخەمی زۆر لە عاستیدا کراوە و بایەخی پێنەدراوە تا وای لێهاتووە منداڵ یاری و خەتخەتێنی تێدا کردووە. تێکڕا لاپەڕەی ١٨ دێڕی تێدایە و ئەویشی کە ماوە، ٨٤ لاپەڕەیە. بە خەتێکی ئێرەتی نووسراوەتەوە و بە زاراوەی گۆرانییە. سەرەتاکەی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| جەو دما کیشوەر وات وە عەیاران | پەرێم پەیدا کەن بەهرام جە شاران |
| واتش وە شەبرەنگ شای بۆڵەند ئەختەر | ئەورۆکە بەهرام بریان جە لەشکەر |
| هەرکەس باوەرۆ خەبەر جە بەهرام | وڵات ڕۆمش مەکەروون ئینعام |
| قەسەم بەداوەر دارای جیهاندار | عوزر و بەهانە نمازوون وەکار |
| عەییار چوون شنەفت ئیقرار کیشوەر | ڕووش نیا وە ڕا چوون باد سەر سەڕ |

کۆتاییەکەیشی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| ..........................کافر | ئاما ڕووبەڕووی بەهرام کیشوەر |
| ...بە هیممەت ئەو شووم بەدکار | تۆ چەو کارەنی جە زۆڵمات تار |
| بەهرام وات مەلعوون ئادەمی زادەم | قابیز وە ئەجەل ڕۆح بەهزادم |
| من بیم کە بەهزاد کەردم سەرنگوون | غەڵتانش کەردم من بە مەوج خوون |
| ئەو..... بەهرام بە وێنەی ئەژدەها | بە وێنەی شێرێ جە بەند بۆ ڕەها |

[١] واتە تەواو بوو بە دەستی هەژاری ئاوارە سەید عەبدۆلحەمیدی باینچۆیی لە بەر خاتری برام ڕەشید ئەفەندی لە ساڵی ١٣٥٤. گۆمانم بۆ ئەوە دەچێت ئەم ڕەشید ئەفەندییە ڕەشید هەمەوەندی بێت.

**بەشی چوارەم - مێژوویی وێژە**

ئەمەش سەرباسەکانی داستانەکە:



**دەقی سێهەم**

دەستخەتی ژمارە ٤٤/٣٩٢یش بەشێکە لە شانامە کە سەرەتای نەماوە. شڕ و پەڕپووت و دڵۆپە لێیداوە. لە سەرەتاوە تا لاپەڕەی ١٥ دیار نییە. پێش لاپەڕەی ١٥ سێ بنەپەڕە شڕە هەیە. ئەوەی کە ماوە ٨٦ لاپەڕەیە کە هەر لاپەڕەی ٢٠ دێڕی تێدایە. پێوانەکەی ١٠×١٧یە. سەرەتای لاپەڕەی ١٥ی ئاوایە:

مەمانووم بێکەس نە مەیدان جەنگ — بیارە بە داو شیران سەرهەنگ

نەوەدەم جیهان بین ئەسپش بی هیلاک — هەناسەی سەردش یاوە وە ئەفلاک

سا کە ئێد شنەفت گێلا نە ڕۆی زین — چەم نیا بەهەم دلیر غەڕین

سوپا تەمامی ئاوردەن خرۆش — بەڵکە جیهان بین بکەران بێهۆش

جیهاندار واتش: یا دانای داوەر بەدەرەم فرسەت نەوەردم زەرەر

ئەمەیش سەرباسەکەی داستانەکە:

| ١ | مناجات کردن جهاندار برای جهان بین | ١۶ |
|---|---|---|
| ٢ | خواب دیدن زال زر جیهاندار و جهانگیر در خواب | ١٧ |
| ٣ | مناجات کردن زال برای فرزندان | ۴٢ |
| ٤ | رسیدن قاصد و نامه بردن برای کیخسرو | ۴٧ |
| ٥ | نامه فرستادن کیخسرو برای طوس نوذر شاه | ۴٨ |

کۆتایی ئەوەش کە ماوە، ئاوایە:

ئارۆ من کارێ بکەروون پێتان بگرەوان پەی حاڵ زگاری ویتان

سەمسام ئید شنەفت دەروونش جۆشا کوورەی نار نە فەوق فەرقش خرۆشا

سەنگ ئاسیا بی گورز و مەلعوون بی دایم ئەو سەنگە نە چەند «چن» بی

بەفەڕ کۆهێ بێ سەنگ پڕ خەتەر بەردش وە باڵا شووم بەد گەوهەر

مێژووی نووسینی و ناوی نووسەرەکەی دیار نییە.

## دەقی چوارەم

### هەفت خوان:

ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەکەمدا بە ژمارەی ٤٤/٣٨٨ پارێزراوە و لە هەردوو سەرەوە ناتەواوە. لە سەرەتاوە ژمارەی بۆ داناوە. لەسەر چەند لاپەڕەیەکی شڕ و پەڕپووت ژمارە هەیە. سەرەتاکەی بە لاپەڕەی ١٦ دەست پێدەکات؛ بەڵام ئەو لاپەڕانە کەوتوونەتە ئاو و قەراخەکانیان خوراو و ناخوێنرێتەوە. پێوانەکەی ١٩×١١یە. لاپەڕەیەک ١٧ دێڕی تێدایە؛ بە مەرکەبێکی ڕەشی کاڵ نووسراوەتەوە. تا لاپەڕەی ٣١ ناونیشانی تێدا نییە کە ئەمەیە سەرباسەکەی:

| ١ | مناجات کردن رستم به درگاه رب العالمین | ٣١ |
|---|---|---|
| ٢ | داخل شدن سپاهان و جنگ با هم کردن و شکست خوردن لعل پوش | ٤٠ |
| ٣ | رفتن رستم به میدان بهرام شاه و مرخص نمودن پهلوانان | ٤٤ |
| ٤ | خبر آوردن برای افراسیاب از گرفتن شاه نو یعنی کیخسرو | ٥٩ |
| ٥ | خبر آوردن برای زال و رفتن تیمور از برای خسرو | ٦٤ |
| ٦ | داخل شدن تیمور به سفید حصار | ٦٨ |
| ٧ | طلب نمودن شاه افراسیاب شیر دم رفتن | ٧٦ |

| ٨ | شبیه خون زدن کوهکش از سپاه توران | ٨٣ |
|---|---|---|
| ٩ | مناجات کردن سمن ناز به درگاه قادر بیچون و چگونگی حال او | ٩٠ |
| ١٠ | رفتن افراسیاب برای آوردن خود به جا گذاشتن خیمەی خود در دشت ری | ١٠٤٧ |
| ١١ | آمدن کیخسرو در میان سپاه خود به دشت ری | ١٠٥ |
| ١٢ | شکسته شدن افراسیاب و بیرون ز کیخسرو ... فرستادن پیران | ١١٢ |
| ١٣ | رفتن کوهکن و پلنگ پوش و نقابدار سام از پی جهانبخش | ١١٦ |
| ١٤ | رزم نمودن جهانبخش با ظطبارەی لعین | ١٣٠ |
| ١٥ | رفتن جهانبخش و گستهم از برای هفت خوان | ١٣٤ |
| ١٦ | رسیدن جهانبخش به خوان دوم | ١٣٦ |
| ١٧ | رسیدن جهانبخش به خوان سوم | ١٣٨ |
| ١٨ | رسیدن جهانبخش به خوان چهارم | ١٤١ |
| ١٩ | رسیدن جهانبخش به خوان پنجم و گم کردن گستهم | ١٤٤ |
| ٢٠ | رسیدن جهانبخش به خوان ششم | ١٤٩ |

لە لاپەڕەی ١٦٣دا بێئەوەی کۆتایی بێت دەستخەتەکە دەبڕێتەوە؛ ئەمە کۆتایی لاپەڕەکەیە:

به لەفز کابل واتش ئەری ڕەخش پەریٚ تۆ وێم کەرد وە تەیر پڕ نەخش

شکەستم تەلیسم جاودان یەکسەر تا کە من بەرووت وەڵای زاڵ زەڕ

ببوون بە قوربان ساحیب هەی ڕەخش ران ڕیکابت وە بەندە ببەخش

تا بەرووت وەڵای جیهان پەهلەوان بدۆ وەهەمدا تەمام کوان

چەند....

ئەم نوسخە لە ناوەوەش ناتەواوە و وەک ئەوە وایە کاتی خۆی لەبەر نوسخەی خراپ نووسرابێتەوە و نووسەرەکە هەندێ جێگەی هێشتووەتەوە بە چاوەڕێیی نوسخەی باشتر.

### دەقی پێنجەم

### هەفت لەشکەر:

ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەکەمدا بە ژمارەی ٤٤/٨٠ پارێزراوە. ٣٥٢ لاپەڕەیە و لاپەڕەی ١٧ دێڕی تێدایە. پێوانەکەشی ٢٣×١٦یە. ئەم دەستخەتە ساڵی ١٣٤٧ بە خەتی ڕەشید هەمەوەند نووسراوەتەوە. دەستخەتەکە بەرگێکی قاوەیی هەیە و جزوبەند کراوە و سەرەتا و کۆتایی ماوە و باش هەڵگیراوە.

ئەمەش بابەت و سەرباسەکانی ئەم دەستخەتە:

| ١ | به شکار رفتن شاه کیخسرو و گرفتاری او به دست تیمور و جنگ ایران و توران درحصن سفید و واقعات ایشان گوید | ١ |
|---|---|---|

سەرەتای ئەم داستانە ئاوایە:

ڕەر هەی بوڵند ماڵ.......... ئەرهەی یانە بەرز بینای بوڵند ماڵ

ئەر هەی مایەی شەو نوور  شەمس زەڕین باڵ ئەر هەی ئاگادار هەم حاڵزان حاڵ

ئەر هەی «لا لە الا هو الحق» ئەر هەی لامەکان قەدیم موتڵەق

ئەر هەی ساعەت ساز بەستەی ماه و ساڵ «واقف الاسرار علی کل الحال»

کۆتایەکەی ئاوایە:

یاران چیش کەرین؟ تەمامان چیشەن؟ دنیا ئێنەی گورگ بەندە چوون مێشەن

هەرکاتێ زانای چوون باد باران مەند نە جاگەی وێش کۆنە هەواران

وەختێ کۆچت کەرد پەی «دارالعقبی» مەواچی هەرگیز نامای وە دنیا

ئاگات جەی بۆ «موستەفا» سەرشێت ئەی دنیا هیچەن بواچوون پەرێت

تۆشە بسازە  پەرێ قیامەت تا ڕۆی مەحشەر نەبی خەجاڵەت

یاران یاوەران دنیا فانییە تەسنیف "موستەفای کوردستانییە"

هەزاران دروود هەزاران سلام «زما بر محمّد علیه السلام»

«تمام شد در یوم جمعه پنج ماه محرم جهت برادران از دست حقیر سراپا تقصیر رشید هموند پلیس ناعلاجی در قریه نودی تاریخ سنه ١٩٢٧ تمت شد آه من الموت و حالاته رشید».

**دەقی شەشەم**

لە بارەی ئەم داستانەوە:

لەبارەی ئەم نوسخەیانەوە -وەک لە کۆتایی دەستخەتەکە دیارە- ئەوەندە دەزانین ئەم داستانە دانراوی موستەفا کوردستانییە. هەروەها ئەوەندەش دەزانرێت «ڕەشید هەمەوەند» کە ئەو کاتە پۆلیس بووە. ساڵی ۱۹۲۷ لە گوندی «نۆدێ» نووسیویەتەوە. ئیتر نازانم موستەفا کوردستانی کێیە؟ کەی لە ژیاندا بووە؟ کتێبەکەی لە کوێ داناوە؟ هەروەک لە بارەی ڕەشید هەمەوەندیشەوە جگە لەوەی کە خۆی نووسیویە و پۆلیسی ناعیلاجی بووە، شتێکی دیم لەسەر ژیان و بەسەرهاتی کۆچی دووایی دەست نەکەوت.

ئەم داستانە وەک داستانی «جواهر پۆش» وایە کە مامۆستا ئیرەج بەهرامی بڵاوی کردووتەوە؛ بەڵام جیاوازی زۆر کەم و زیاد لە نێوانیاندا هەیە. هەندێ جار زۆر لەیەک دەچن و هەندێ جاریش زۆر لەیەک دوورن. هەروەها بەپێی نووسینی مامۆستا ئیرەج، باوکی مستەفا ناوی مەحموودە؛ وەک بە پێی نووسینی «شێخ فاتێحی شێخ فەتاحی دۆڵانی»، «میرزا مستەفا دڵی دڵی» بووە.

### دەقی حەوتەم

**مەنیجە و بیژەن:**

دەستخەتی ژمارە ١٤/٤٤ چەند بابەتی تێدایە بەم شێوەی خوارەوە:

سەرەتاکەی ئاوایە:

پادشای شاهان، پادشای شاهان ... بەنام بێچوون پادشای شاهان
ئاگادار جە قەعر جەمع دەریاهان ... بە دەلیل خەیر گۆمکەردە ڕاهان
پادشای بێچوون دانای «لم یزال» ... یا شەرافەت بەخش ئەنبیای مورسەل
یا واقیف جە ڕاز پەردەی نیهانی ... یا حەی یا قەیوم ڕۆژی ڕسانی

ئەمەش سەرباسەکانی:

| ١١ | نامه نوشتن شاه کیخسرو نزد رستم و آمدن رستم به ایران گوید | ٣٧ |
|---|---|---|
| ١٢ | رفتن منیژه نزد رستم بیان کردن حالات خود گوید | ٤٧ |
| ١٣ | سنگ کندن رستم در سر چاه ارژنگ و کشتن برقاس پسر اکوان دیو | ٥٤ |

کۆتایی داستانەکە:

خێرا هەی بنۆش ساقی بادەی مەی    نۆشانۆش جام کیانان کەی

گورجی زادەگان سوراحی گەردەن    پیالان لەبرێز جە مەی مەکەردەن

سدای سەمتووران کزەی سۆز و ساز    ڕەقس و ڕەقاسان ئامان پەرواز

دلێران سەرمەست جە بادەی قەرقەف    مەست و بێهۆش بین یەکایەک سەف سەف

بە تەوفێق حەق زات «ذاالمنن»    تەمام بی داستان مەنیژە و بیژەن

«هزاران درود هزاران سلام    زما برمحمّد علیه السلام»

دوای ئەمە ٢٢بەیتیەدی نووسراوە کە دیارە دانراوی ڕەشیدهەمەوەندی نووسەرەوەی دەستخەتەکەیە.
دوای ئەوە نووسەرەوەکە نووسیویە:

«تمت شد کتاب در روز جمعه ٢٩ ذالقعده تاریخ ١٢٥٧ سنه هجری. ١٩٣٨ سنه میلادی از دست حقیر سراپا تقصیر رشید هموند در قریه نودی شیخان. اگر سهوی داشته باشد، باید قصور عفو فرمایید چونکه نسخه کتاب خیلی بد بود».

**دەقی هەشتەم**

**کتاب جنگنامه رامرز و برزو و واقعات ایشان گوید:**

ئیبتەدا بە نام دەهەندەی داوەر    ئاگادار جە غەیب سەحرا و دەشت و دەر

کەریم بێچوون قەهار قەدیم    فضل بسم الله الرحمن الرحیم

هەر ئەوەن قادر بینای کول شەی    کارساز کاران «لایموت حی»

بەڵێ ئەی سەرڕاف ساحیب عەقڵ و فام    گۆش دەن وە داستان گوزەشتەی ئەییام

روێ کەیخسرو نەوەی سیاوەش    چەنی پیلتەن شێر تاج بەخش

ئەوەی سەرەوە سەرەتای داستانی «فرامرز و برزو»وە لێرەش بەدواوە سەرباسەکانی ئەنووسم:

| ١ | کشتی گرفتن فرامرز و برزو گوید | ٢ |
|---|---|---|
| ٢ | وقتی برزو با سپای شارخشا برای جنگ اژدها در بند تنگ حلیم | ١٥ |
| ٣ | کشته شدن اژدهای در بند حلیم در ملک خوارزم به دست برزو گوید | ١٨ |
| ٤ | مغلوبه کردن تورانیان بر سر برزو گوید | ٢٧ |
| ٥ | زخمدار کردن برزو شیده پسر افراسیاب گوید | ٣٠ |
| ٦ | مناجات کردن برزو به درگاه ایزد و رسیدن فرامرز به امداد گوید | ٣٦ |

| ٧ | رسیدن فرامرز به امداد برزو گوید | ٤٠ |
|---|---|---|
| ٨ | جنگ کردن فرامرز با افراسیاب گوید | ٤١ |
| ٩ | آمدن گرشیوز به جنگ ایرانیان | ٤٤ |
| ١٠ | جنگ کردن فرامرز با شیده پسر افراسیاب | ٤٦ |
| ١١ | فرار کردن افراسیاب و گذر کردن از آب جیحون | ٤٣ |

کۆتایی ئەم داستانە:

کۆتایی ئەم داستانە بە ڕوونی دیار نییە، چوونکە نووسەرەکەی (ڕەشید هەمەوەند) لە کۆتاییەوە شیعری خۆی تێکەڵ کردووە. ئەوەی کە دیارە ئەوەیە ئەم چەند بەیتە پێش‌بەیتەکانی ڕەشید هەمەوەند:

ئەرەستوو فامان حەکیمان یەکسەر — بە گوفتەی تەئریخ شنەفتەن خەبەر

پەی تەور ویەردەن مەردان ئێران — مەعرەکەو مەساف جەنگ دلێران

ئیستیدعام ئیدەن پادشای غەففار — ببەخشی گونای ئی بەندەی هەژار

چونکە هەم غەریب هەم کوفتەکارەن — یەم یۆڵ نەعەشرەت هەم گونەهکارەن

جورمش سەنگینتەر جە کۆی دالاهۆ — ئۆمیدش نییەن غەیر جە لوتفی تۆ

دوای ئەمە ١٦ بەیت نووسراوە کە دیارە دانراوی ڕەشید هەمەوەندن. دوای ئەوانە نووسیویە: «تمام شد کتاب بعنوان ملک الوهاب از دست حقیر فقیر مذنب العاصی رشید احمد هموند در قریەی نودی در وقت هم و غم اگر سهوی باشد باید قصور عفو فرمایید»١٩٨٣/٢/١.

دوای ئەمە چوار لاپەڕە شیعری خانای قوبادی نووسراوە کە لەم شوێنەدا جێگەی مەبەستی من نییە. ئەم دانراوە وەک بینیتان ڕەشید هی هەمەوەندییە، بەڵام ناوی دانەری پێوە نییە و دیار نییە کە دانەری کێیە.

### دەقی نۆهەم

ئەم داستانە ٥٤ لاپەڕەیە کە ١٦ دێڕی تێدایە. بە خەتی نەستەعلیق نووسراوە. پێوانەکەی (×١٥)یە کە ناونیشان و سەرباسەمانی بە مەرکەبی سوور نووسراوە.

ئەم داستانە سێ ناونیشانی بۆ دانراوە. لە سەر لاپەڕەی یەکەم نووسراوە: «داستان رفتن تیمور نزد خاقان چین و بخشیدن خان ... زریف تاج به تیمور و واقعات ایشان گوید» دوای ئەمە لە سەرەتای لاپەڕەکەوە دوای بسم الله الرحمن الرحیم نووسراوە:

«تولد تیمور اول رزم آتشکده جنگ سفید حصار و واقعات ایشان گوید»

دوای ئەمەش لە پێشەکی داستانەکە هاتووە:

مەشهوور بی عام دلیران کەیجەنگ هەفت لەشکەر نە ڕووی دەشت ڕەی

سەرەتای داستانەکەیش ئاوایە:

دانای لم یزال! دانای لم یزال — یاحەی یاقەییوم دانای لم یزال

**بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە**

بێماوا و مەکان بێمیسل و بەدەل      ڕەواج دادەی دین موستەفای مورسەل
ئۆستاد نەققاش نەقش ڕووی زەمین      کان کۆی کەرەم «رب العالمین»
قادر قەهار «حی لایموت»      ڕازیق و ڕەززاق موور و عەنکەبووت
دمای وەسف زات «حی لا ینام»      بە موحەممەد بۆ سەلات و سەلام

سەرباسەکانی ئەم داستانە:

کۆتایی ئەم داستانە ئاوایە:

به تەوفیق حەق پادشای غەفوور　　　تەمام بی داستان شۆخ کەمان تەیموور

بەڵێ ئەی یاران لێتان بۆ عەیان　　　ئیدش فەرماوان فیردەوسی زەمان

یە کەلام شیرین فیردەوسی نیەن　　　وەر جە فیردەوسی دەقیقی بیەن

داستان تەیموور ڕەزم هەفت لەشکەر　　　کەلام دەقیقەن ئەوەڵ تا ئاخر

دەقیقی شاعیر فرە مەشهوورەن　　　یادگارش داستان ڕەزم تەیموورەن

«هەزاران درود هەزاران سلام　　　بر محمّد علیه السلام»

«...تمت الکتاب بعون الملک الوهاب. تاریخ السنه الهجری ١٣٥٩ تاریخ السنه میلادی ١٩٣٩ تمت شد. کتاب از دست سراپا تقصیر رشید احمد هموند».

این نوشتم از برای روزگار　　　من نمانم خط بماند یادگار

«رش ی دال» کەن حیساب　　　مەعلووم مەبۆ نام خەتات کیتاب

ئەم داستانە لە کاغەزێکی زەردی کۆندا نووسراوەتەئە، قەراخەکەی بە کاغەزێکی سپی گیراوە. پێوانەکەی ١٥×٢٠یە و لاپەڕەیەکی ١٦ تا ٢٠ دێڕ و زیاتریشی تێدایە. تێکڕای ئەم چەند داستانە:

مەنیجە و بیژەن، فەرامەرز و برزوو، ڕەزمی تەیموور بەیەکەوە تەجلید کراون و بەرگێکی سەوزی کاڵ و بە قوماش بنگیراوی تێگیراوە.

**دقی دەیەم:**

**کتاب جنگنامه ایران و توران مشهور به صقلاب دیو و رستم زال**:

ئەم داستانە بە ژمارەی (٤٤/٤٦)٢ لە کتێبخانەکەمدا پارێزاوە. ئەم داستانە ١٤٥ لاپەڕەیە و ئەو کاغەزەی تێیدا نووسراوە دوو دۆجۆرە: واتە دوو قیاسە –گەورە و بچووک- بەڵام ژمارەی بەیتەکانی لاپەڕەکان وەک یەک وایە و زۆری لاپەڕەیەک ١٥ بەیتی تێدایە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

یا ڕازق ڕەزاق دانای مۆعەززەم — خالیق مەخلووق پادشای ئەکرەم

ڕەسوولش موحەممەد شاە ئینس و جان — ئامان وەشانش سی جزمەی قورئان

بەڵێ هەی یاران ساحیب عەقڵ و فام — گۆش دەن وە داستان گۆزەشتەی ئەیام

نەکان گەوهەر بکەرین بەیان — قەوڵ فیردەوسی ئێران و تووران

ڕۆژێ شای خوسرەو گرتەبی قەرار — چەنی دلێران شاهزادەی نامدار

ئەمەش سەرباسەکانی:

کۆتایی ئەم داستانەش ئاوایە:

| | |
|---|---|
| یاوا وە تەبرێز سازنا گومەت | سپەردەن وەخاک شاه بێسفەت |
| بەڵێ ئەی یاران ساحیب عەقڵ و فام | بزانن وەکار دنیای ناتەمام |
| شاهێ وەی تەور ساحیب تەخت و تاج | جە ڕووی زەمین حوکمش بی ڕەواج |
| جە تۆر فانی بی نە دنیای بێپۆ | شنەفتەن جە نەوع کریا ڕەنجەڕۆ |
| هیچ مەبن وەتەنگ ئەی دونیای فانی | نە شاه مەمانۆ نە هەم کەیانی |
| ئەگەر فەیسەر بی ئاخر مەبی فەوت | پەی چێش قابیزەن ئەو «ملک الموت» |

## دەقی یانزەهەم

## تولد جهانگیر و جنگنامەی ایران و تورانیان گوید

ئەم دەستخەتە کە بە ژمارەی ٤٤/٤٦ لە کتێبخانەکەمدا پارێزراوە کە تێکڕا ٨٤و١٤٥ لاپەڕەیە. قەوارەی کاغەزەکەی و ڕەنگ و شێوەی مەرکەبەکەی وەک یەک نییە. بە گوێرەی ئەو بەشکراوە و جیاکراوەتەوەی دوو داستانی تێدایە.

**یەکەم**: تولد جهانگیر دوم. جنگنامەی ایران و توران، مشهور بە: «صقلات دیو رستم زال».

داستانی یەکەمیان لە سەرەتای دەستخەتەکەوە تا لاپەڕەی ٨٤ی گرتووە. داستانی دووهەم لە لاپەڕەی یەکەوە –بە ژمارەیەکی نوێ- تا لاپەڕەی ١٤٥ی گرتووە.

سەرەتای داستانی یەکەم ئاوا دەست پێدەکات:

| | |
|---|---|
| عەلیم دانا! عەلیم دانا | کەریم کارساز عەلیم دانا |
| خەببار قودرەت ساحیب تەوانا | سەبەبساز کار دانا و نەدانا |
| بەسیر بێعەین سەمیع بێگۆش | ڕەحیم و ڕەحمان سەتتار سێرپۆش |
| مەعبوود بێعەیب، فەرد لامەکان | بێنەقس و خەلەل کەرەم فەراوان |

سەرباسەکانی ئەم داستانە:

| ٦ | تولد شدن جهانگیر از مادر و رفتن او به ایران و جنگ کردن و آشکار شدن او | ٢٠ |
|---|---|---|
| ٧ | لشکر کشیدن افراسیاب بر سر ایرانیان برای انتقام | ٢٥ |
| ٨ | آمدن جهانگیر به میدان و گرفتن پهلوانان ایران را | ٣٧ |
| ٩ | خویش آشکار کردن جهانگیر از زال زر | ٥٤ |
| ١٠ | خواب دیدن رستم در ملک بلغار به شکست ایرانیان و کشته شدن فرامرز را دیدن و سیاه پوش شدن کیکاوس و ایرانیان | ٦٥ |
| ١١ | مناجات کردن زال بدرگاه ذولجلال | ٧٠ |
| ١٢ | وارد شدن رستم با سپای بلغار به دشت ری و جنگ ایرانیان و تورانیان و شکست خوردن تورانیان | ٧٠ |

لە کۆتایی دەستخەتەکەوە ئەم چەند بەیتە نووسراون، بەڵام ئەمانە بە بەیتی «ڕەشیدی هەمەوەندی» نووسەرەوەی کتێبەکە دەزانم:

یا ڕەب من بەدخۆ هەم بەدکردارم — باری عسیانم جەمەن جە شانم
گونام سەنگینتەر جە کۆی دالاهۆ — ئۆمیدم نییەن غەیر جە لوتف تۆ
ببەخشیم بە نوور سەیدی سەروەر — جە ڕۆژ دیوان زلزلەی مەحشەر
بەنا بە خاتر هەفتاو دوو مەعسووم — دوور وزی لێمان شەرارەی سمووم

«تمام شد کتاب تولد جهانگیر از دست حقیر سراپا تقصیر در روز دوشنبه ٢٧ ماه صفر ١٣٧١. در وقت هم غم اگر سهوی باشد باید قصور عفو فرمائید که نسحەی کتاب بسیار بد بود.

«ر ش ی د ال» کەران بە حیساب — مەعلووم مەبۆ لێت خەتات کێتاب
تاریخ هیجرەت ڕەسوولی سبحان — هەزار و سیسەد هەفتاو یەک عەیان
مەلیک عێراق "عەبد ئیلاه" بێ — شاپوور ڕەزا، شاه ئێران بێ
سەردار عەرەب هم چەنی عەجەم — نام هەردووشان کەردەنم ڕەقەم

بەم پێیە دانراوی —یان وەرگێڕاوی- ئەم داستانە نەزانراوە.

## دەقی دوانزەهەم

### ڕوستەم و سۆهراب:

ئەم ناونیشانە بۆ داستانێکی شڕ و پەڕپووتی شیرازەپساوی ناتەواو دانراوە؛ سەرەتاکەی ماوە بەڵام دوای سەرەتاکەی لە چەند جێگەیەکدا کەوتن هەیە و دوای ئەویش کۆتاییەکەی نییە.

ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەکەمدا بە ژمارەی (٤٤/١٠١)٢ پارێزراوە. پێوانەکەی ١٥×١٠یە کە هەرلاپەڕەیەک ١٥ دێڕی تێدایە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| بەنام دانای بزرگی بێچوون | جیهانئافەرین، کار «کن فیکون» |
| بەی کۆنە داستان خاتر شاد کەریم | داستان ڕۆستەم و سۆهراب یاد کەریم |
| ڕۆوێ نیشتەبێ ڕوستەم وە غەمناک | هۆرێزا وە پا بەور سەهمناک |
| کەمەند و کەمان چەنی دیرە جەنگ | پۆشا بە ئەندام کەمەربەست بە تەنگ |
| پا نیا بە ڕەخش پارەی ڕەهنەوەرد | فەرشی جە ئەیوان دەروون پڕ جە دەرد |

ئەم بەشەی ئەم داستانە کە لە دەستدایە، سەرباس و ناونیشانی بۆ دانەنراوە و ئەوەی کە ماوە ٢٨ لاپەڕەیە. بابەتی پێش ئەمە لەم دەستخەتەدا «شەعرا و گوڵەندام»ە. لە کۆتایی ئەم بابەتەوە نووسراوە کە «ع ش مان» ساڵی ١٢٥٢ نووسیویەتەوە. خەتی ئەمەش هەر هەمان خەتە؛ واتە هەردووکیان بە خەتی ئەو «عوشمان» یان «عوسمان»ە نووسراوەتەوە و مێژووکەیشی هەمان مێژووە. بەو پێیە ئەم دەستخەتە لە هەموو دەستخەتەکانی ئەم داستانانە (ئەوانەیان مێژوویان زانرابێت) کۆنترە.

کۆتایەکەشی ئاوایە:

| | |
|---|---|
| ستوون وە سەیوان زنجیر و کەمەند | چەند فەرش «بێخەوش» کورسی دانەبەند |
| ئاهرێ نەو دەشت سەحرا و فرۆزا | چەند هێزم ئاوەرد بەیەکجا سۆزا |
| جەو دما لاشەی فەرزەند دڵبەر | شستەن بە کافوور بۆی میسک و عەنبەر |
| نیانە تابووت ئاڵای دڵپەزێر | جای زامش پەڕ کرد ج میسک و عەنبەر |
| هۆرگرتەن جە خاک سیا ناتەمام | بەردەن وە زابۆل بەلای زاڵ سام |

**دەقی سێزدەهەم**

**داستانی «ڕۆستەم و کک کهزاد» یان «ڕمووز ڕۆستەم»:**

ئەم داستانەش یەکێکە لەو داستانانەی شاعیران و ئەدیبانی کورد لە شانامە کردوویانە بە کوردی بە زاراوەی گۆرانی. بەداخەوە ئەم نوسخەیەی بەردەستی من سەرەتا و پێشەکیەکەی نەماوە و وادیارە شەش لاپەڕە لە سەرەتاکەی کەوتووە؛ چونکە لە لاپەڕەی حەوتەوە ژمارەی بۆ دانراوە. لەو سەرەتایشیەوە پەڕەیەکی بە خەتیکی نوێ و جیاواز لە خەتی تەواوی داستانەکە نووسراوەتەوە. داستانەکە بە مەرەکەبی ڕەش و بە خەتێکی نەستەعلیق لە دەفتەرێکی گەورەدا نووسراوەتەوە. دەفتەرەکە ٣٨٠ لاپەڕەیە و پێوانەکەی ٣٠×١٨ە و هەروەها لاپەڕەیەکی ٢٤ بەیتی تێدایە.

ساڵی ١٣٦١ی کۆچی و ١٩٤٢ زایینی بەدەستی «میرزا فەرەجی کوڕی کەریم» نووسراوەتەوە. هەندێ شوێنی دەفتەرەکە دڕاوە و پینە کراوەتەوە و هەندێ شوێنیشی تێداچووە.

دانەری یان وەرگێڕی داستانەکە لە کۆتاییەوە ئاوا باسی کارەکەی کردووە:

| | |
|---|---|
| تەئریخ کیتاب باوەریم وەیاد | سەڵوات وە ڕەسوول هەم ئالی ئەمجاد |
| نەیوەر کەیخسرەو شوراتیی سواری | ئەهل قەراولس مەرد وە دیاری |
| لەفز فارسی گفتەی حیکایەت | «سرو ازاد»نام کەردەن ڕیوایەت |
| ئیمجا کەیخسرەو بە لەفز گۆران | کەردن تەرجومە وە کوردی نویسان |
| تەئریخ هیجری ساڵ شەست و یەک | هەزار و سێسەد داستان «کک» |
| وە «حسب الخواهش» موحەممەد قەساب | «ابن انور محمّد»ئەو فەرەخ مەئاب |
| کەردم ڕوونویس نویسام پەرێش | یەک مانگ شەب و ڕۆز، بێغەم و تەشویش |
| محەممەد هەم چەنی من کەردش ئێحسان | نماناش ئەدا ئەجر زەحمەتان |
| بەو تەور کەرەم کەرد من لێش بێم ڕازی | خوداوەند کارش بە نیک بسازی |

دوای ئەمە موناجاتێکی درێژ و پەند و ئامۆژگاریەکی زۆری نووسیوە کە سێ لاپەڕە و نیوی کۆتایی دەستخەتەکەی گرتوەتەوە. داستانەکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی ناونیشان و فیهرستی بۆ دانراوە.

سەرەتای ئەوەشی کە ماوە ئاوادەسپێدەکات:

| | |
|---|---|
| مەرد و بێئەرواح هات وەلای ڕۆستەم | خوشک بیشان زبان هەردووشان نەدەم |
| فیلەتەن توند واتش جەوانان | ڕاستی بواچۆن هەرچەند واتشان |
| شنفتم نامم ئێوە بەردتان | جەو دما تەعریف «کەکی» کردتان |

ئەم پەڕەی سەرەتا بە خەتێکی ناوبۆش نووسراوەتەوە و مەرکەبی پێدا ڕژاوە و باش ناخوێندرێتەوە. ئەم دەستختەیشم لە لای «کاک جەهانگیر»ی کوڕەزای «ڕەشید هەمەوەند»ەوە دەستکەوتووە.

## دەقی چواردەهەم

### داستانی شیرین و فەرهاد:

داستانی شیرین و فەرهاد یان شیرین و خوسرەو یەکێکە لەو داستانانەی لە کوردەوارییدا بایەخێکی تایبەتی پێدراوە و لە کۆنەوە ئەدیبان و شاعیرانی کورد ئەو داستانەیان بە زاراوەی گۆرانی گێڕاوەتەوە. هەروەها بایەخی زیاتریشی لەوەدا پێدراوە کە چەندین جار چاپکراوە.

لێرەدا ماوەی ئەوە نییە بە قووڵی لەو باسە بدوێین، ئەوەندە هەیە -وەک ناونیشانی بابەتەکەم دەخوازێ- ئاماژە بە بوونی سێ نوسخەی ناتەواوی دەستخەتی ئەم داستانە دەکەم کە لە کتێبخانە بچکۆلەکەمدا پارێزراون:

### نوسخەی یەکەم:

ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەکەمدا بە ژمارەی ٢٧/٤٤ پارێزراوە، سەرەتا و کۆتایی نەماوە. نوسخەیەکی کۆنە و دلۆپە و دووکەڵکاریان تێدا کردووە. بەرگی نەماوە، شیرازەی پساوە. نەمزانی دانەری کێیە، ئەمە لەتەک دانراوی خانای قوبادیدا جیاوازە. ئەوەی لە لای من ١٨٨ لاپەڕەیە و لاپەڕەیەک ١٢ بەیت و کەمتر و زیاتری تێدایە و لەوە دەچێ بە دوو سێ کەس نووسیبێتیانەوە.

سەرەتاکەی ئاوایە:

«نملا مسکن ممالو ملوک　　پادشا...نە پار بلوک

سپای چون سپای سان سکندر　　غزانش غنی جە گنج گوهر

جمشید جم جمشید دارا　　سانش جە هووشنگ نسنگ دیارا

سان سیا سنگ کیا مرز کی　کیکاوس کیقباد کی کی»

کۆتاییەکەشی ئاوایە:

شیرین شیدا فکر خیال کرد　　فرهاد کرد و یار خسرو بتال کرد

تا وقتی مدار دانکی شی نشو　　بریزە رازان خسرو کرد نخو

پرویزش ژ خاو سرخوش نبادە　　بێ خبر جە کار مدهوش فتادە

نوبدار بیدنگ کیشکچی خاموش　　سرداران سرمست مهتران مدهوش

کرمە کفت نکشت سروشت سیوان　　سدای ها خریاش بریا ژ ایوان[١]

## نوسخەی دووهەم:

دەستخەتی ئەم نوسخەیەش لە کتێبخانەکەمدا بە ژمارەی (٤٤/١٠١)١ پارێزراوە. ئەم نوسخەیە پاشماوەی نوسخەی یەکەمە بە خەتی نووسەرەکەی دی؛ ئەم نوسخە لە شێوی بەیازدا نووسراوەتەوە، شڕ و پەرپووت بووە. سەر و بن و شیرازەی نەماوە، ئەوەی کە ماوە ١٧ لاپەڕەیە. پێوانەکەی ١٧×١٠یە و لاپەڕەیەکی ٢٥ بەیت و کەمتر و زیاتری تێدایە. لە چەند جێگەدا مۆرانە خواردوویەتی و کونی تێکردووە. ئەم نوسخە و نوسخەی پێشوو زیاتر بە «شیرین و فەرهاد» ناوزەد دەکرێن، نەک «شیرین و خوسرەو».

## نوسخەی سێهەم:

ئەم دەستخەتە لە کتێبخانەکەمدا بە ژمارەی (٤٤/٢٧)٢ پارێزراوە. پاشماوەی نوسخەیەکی نایابی ئەو شیرین و خوسرەوە کە مامۆستا موحەممەدی مەلا کەریم لە ساڵی ١٩٩٥ لە کۆڕی زانیاری کورد لە بەغداد بڵاوی کردەوە. دیارە کاتی خۆی نوسخەیەکی نایاب بووە بە خەتێکی نەستەعلیقی خۆش لە کاغەزێکی شین و ڕەنگاوڕەنگدا نووسراوەتەوە. بەڵام شپرزە و بێسەرەتا و کۆتاییە. ئەوەی لە دەستی مندایە ٣٦ لاپەڕەیە،

---

[١] هەندێک بە درێژی لە ژمارەی ١١٧ی گۆڤاری «ڕۆشنبیری نوێ»دا لەبارەی ئەم نۆسخەوە نووسیومە. ئەمەیشم بە ڕێنووسەکەی خۆی نووسی ، چوونکە باش بۆم نەخوێنرایەو.

بەڵام پاشماوەی دەستخەتێکە لە ٢٠٠ لاپەڕە زیاتر بووە؛ چوونکە سەرەتاکەی لە لاپەڕەی ١٧ دەسپێدەکات و بە لاپەڕە ٢٠٦ کۆتایی پێدێت. لاپەڕەیەکی ١٥ بەیت و زیاتر و کەمتری تێدایە و سەرباسەکانی بە مەرکەبی سوور نووسراونەتەوە.

**تێبینی:**

وەک لە ناونیشانی ئەم هەوڵەوە ئاشکرایە، تەنیا باسی ئەو دەستخەتانەی شانامەم کردووە کە لە کتێبخانەکەی خۆمدان؛ چوونکە گومان لەوەدا نییە دەستخەتی دیکەی شانامەی کوردی هەیە کە لە دەستی مندا نییە و ئێستە دەستم نایگاتێ. هەر بۆ نموونە:

١- دەستخەتی ژمارەی ٢٤١ی کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدا کە ئێستە لە «المركز الوطني المخطوطات»دا پارێزراوە؛ داستانی «بەور و بەیان»ە کە بە زاراوەی گۆرانی ٣١٩ لاپەڕەیە و ساڵی ١٣٧١ نووسراوەتەوە.

٢- هەروەها دەستخەتی ژمارەی ٢١٧ی هەمان کتێبخانە داستانی «بەهرام و گوڵەندام»ە کە ناتەواوە. ساڵی ١٩٥١ز «مەلا فەرەجی کوڕی مەلا کەریم» تەواوی کردوتەوە و ١٣٨ لاپەڕیە.

## سەرچاوەکان:

١ - فردوسی، حکیم ابولقاسم، **شاهنامه فردوسی**، بر اساس نسخەی مسکو و مقدمه الهی قمشەای، نشر محمّد.

٢ - نوورەدینی، بوار (٢٠٠٤) **بیبلۆگرافیای کتێبی فۆلکلۆری کوردی،** سلێمانی، چاپی یەکەم.

٣- بهرامی، ایرج (١٣٨٣) **شاهنامەی کردی،** تهران، انتشارات هیرمند.

٤ - **گۆڤاری سلێمانی** (٢٠٠٠) ژمارەی ٢ و ژمارەی ٤١ ساڵی (٢٠٠٣).

٥ - **گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ،** ژمارەی ١٧٧، بەغدا.

٦- **مجلهٔ التراث العربی**، (٢٠٠١)، العدد ٣.

# دەسنووسناسی و پێناسەی چەند دەسنووسێکی ئەدەبی کوردی

محەممەد ڕەشید ئەمینی پاوە

**کورتە:**

ئەوەی کە لێرەدا ئەمەوێت لەسەری بدوێم، باسی چەند دەسنووسی ئەسڵی و کۆپی کۆنن؛ بە مەجمووعە شیعری شاعیرانێکی ناسراو و نەناسراوە کە ئەوانەیش لەو چەن ساڵەیەدا دەستم کەوتوون.

**دەسنووسی یەکەم:**

ئەم دەسنووسە لەقەوارەی درێژایی و پانتایی ١١ لە سەر ١٨ سانتیمتر و بەرگی چەرمی ڕەش، کاغەزی زەرد لە١٧٠ لاپەڕەدایە. بە تێکرا نزیک بە ١٧٢٠ دێڕە، هەمویشی شیعرەو بە شیوەی هەورامییە.

**دەس نووسی دووهەم:**

ئەم دەسنووسە بە قەوارەی ١٢ لە سەر ١٩ سانتمیتر و بە بەرگی چەرمی ڕەش کە چوار دەورەکەی بە دەرزیو دەزوو حاشیە دۆزی کراوە و بە تێکڕا ٤٠ لاپەڕەیە. لە چەن لایشەوە مێژووی نووسین و ناوی نوسەرەکەی لەسەر نووسراوە.

**دەسنووسی سێهەم:**

دەسنووسی سێهەم بەرگی نەماوە لە قەوارەی ١٧ لە سەر ٢١ سانتیمتر دایە و لە سەر کاغەزی زەرد نووسراوە و بە تێکڕا ١٦٠ لاپەڕەی ماوە. بۆ ئەوەی ئەڵێم ١٦٠ لاپەڕەی ماوە هەم لە سەرەتاو ناوەراست و کۆتاییدا چەند لاپەڕەیەکی نەماوە؛ بەو حاڵەیش شتێکی بەنرخەو ئەبێ ئەوەیشی کە ماوە پارێزگاری لێوە بکرێت.

**وشە سەرەکییەکان:** دەسنووس، ناوی شاعیر، پارچەی شیعری، زمانی شیعری، دێڕ.

## بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە

### سەرەتا:

ئەگەرچی لە ماوەی سی ساڵی ڕابردوودا تابە ئەمڕۆ لە شار و شارۆچکەی ناوچەکانی کوردەواریدا دڵسۆزانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی و ناوەندی ڕوناکبیر و فەرهەنگی، کۆڕ و کۆبونەوی زۆریان لە سەر کەسایەتی و بوارە ئەدەبییەکان گرتووە و هەنگاوی باشیش لەو بوارانەدا هەڵگیراوە، کەچی پاش کۆتایی بەرنامەکان زۆربەیان وەک یادێ بۆ ماوەیەکی کورت لە نێو بیرمەندانا مابێ و دواتر وەک بیرەوەریەک، ئەویش ئەگەر ئەو بەرنامە و کۆبونەوەیە لە ئاستێکی باشدا گیرابێ.

سەردەمێکە لایەنگرانی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی، چاوەڕوانی ئەوەی ئەکەن کە ناوەند یان مەرکەزێ ڕوناکبیری و فەرهەنگی بەشێوەیەکی تایبەتی و «جیددی» تیشک باوێژێتە سەر ئەدەبی کوردی و لە ڕوانگایەکی زانستی سەردەمەوە، هەنگاوێکی بۆ هەڵبگرێت و لە لایەن بەرپرسانیشەوە پشتگری و یارمەتی بدرێت. دەستکەوتەکانیشی وەک بەڵگەیەک بکەونە بەردەستی هەموان و وێنەیشیان لە «ئەرشیڤێکی» تایبەتیدا پارێزگاری بکرێن.

### پێشنیار:

ئەمڕۆ زانستگای کوردستان وەک مەڵبەندێکی ڕووناکبیری و ناوەندێکی فەرهەنگی، ئەتوانێ بەشێ لەم ئەرکە بە ئەستۆ بگرێ و ئەوەی کە هەمانە لە بەڵگەنامە و دەسنووس و کتێبی کەموێنە و بەقیمەت جەماوەری بکات و لە ئەرشیڤێکی تایبەتیدا پارێزگاریان لێبکات و کەڵکیان لێوەربگیرێ. هەتا ئەتوانێ وەک ناوەندێکی فەرهەنگی و ڕووناکبیری لە دەسنیشانکردن و گەڕاندنەوەی ئەو ئەسەرە مێژوویی و دەسنووسانەی کە بە دەستی تالانکەران و جەردەکانی ناوخۆیی و دەرەوە ئاودیو کراون و ساڵەهایە لە مۆزە و کتێبخانەکانی دەرەوەی ولاتانی دوور و نزیکدان، لە ڕێگای پەیوەندیەکانی نێو دەوڵەتیەوە هەڵیانگەڕێننەوە ئامێزی ئەم ولاتە. وێنەیشیان وەک ئەو دەسنووسەی لە کتێبخانەی بریتانیا بە دەست کەوتە و هی ٣٩شاعیری ناوچەی هەورامان و لە لایەن مامۆستا «عەبدولمومنی مەردوخی»ەوە لە ساڵی ١١٩٨ی کۆچیدا نووسراوە، یان ئەوەی کە «مامۆستا هەورامانی» لەپێشەکی کتێبی لەیلی و مەجنونەکەیدا باسی هەندێ دەسنووسمان بۆ ئەکات کە لە کتێبخانەکانەی دەرەوەی ولاتدان؛ بۆ وێنە ناوی ٥ دەسنووسی لەیلێ ومەجنوون لە پێنج شاعیری جیاواز بە شێوەی «هەورامی» بردووە و هەروەها بە ئاماژە کردنی شوێنی پارێزراویشیان.

ئەوانەیش دەکرێن پاش هەڵگەڕانەوە لەگەڵ ئەوانەی لەناو خۆدا جەماوەری ئەکرێن، لەو ئارشیڤەدا کە ئاماژەمان پێکرد پارێزگاری بکرێن و هەنگاویش بۆ دووبارە نووسی و چاپیشیان هەڵگیرێت. ئەوەش لە توانای زانستگای کوردستاندا هەیە بەو مەرجەی بەرپرسان بیانەوێ و لە لایەن دەسەڵاتی سەرەوەیش پشتگیری و یارمەتیان بدرێت.

لە لایەکی تریشەوە -نە ئەوەی کە خۆمان بڵێین- بەرپرسانی ئاستی باڵای ولاتیش دانیان بەوەدا ناوە کە دانیشتوانی کوردستان لە ڕوانگەی فەرهەنگیدا لە ئاستێکی بەرزەوە دەژین، یان پارێزگای کوردستان، بە پارێزگایەکی فەرهەنگی دەستنیشان کراوە، کەچی هەر ئەم پارێزگایە کە ئاوا ناوی لێبراوە، لە زۆر بابەتی سەرەتایی فەرهەنگی بێبەشە.

ئەم هەنگاوەی کە ئەمڕۆ زانستگای کوردستان هەڵیگرتووە و هەروا کە خۆیشیان فەرموویانە چاوەڕێی ئەوەی ئەکرێ سەرەتای کۆڕ و بەرنامەکانی داهاتووی بێ، جێگای دڵخۆشیە و ئەو کەسانەیش لە هەر بوارێکا توانایان هەیە و بەدەسەڵاتن، خۆیان بە بێ‌لایەن نەزانن. ئێمە هەردەم چینی ڕابردووی خۆمان دەخەینە بەر تانە و توانج و پرسیار کە لە بواری فەرهەنگی و مێژوویيدا بەو شێوەیە کە شایانی گەلی کورد بێت، هەنگاویان هەڵنەگرتووە؛ دەبا سبێنێ ئێمەش نەکەوینە بەر تانە و توانجی چینی داهاتوو. ئەوەیش کاتێک کە هەرکام بەگوێرەی خۆمان لەو بابەتانە بێ‌لایەن نەبین.

### لەسەر هەندێ لەو دەسنووسانەی لای خۆمن:

وەک لایەنگرێکی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی، ماوەیەکە خۆم خەریک کردووە بەجەماوەری و دووبارە-نووسی بابەتانی ئەدەبی ڕابردووو. زۆر شتیشمان لەو ماوەیا دەسکەوتوە؛ بۆ وێنە: نزیک بە ٥٠ کتێبی دەسنووس (ئەسڵی و کۆپی) بە دەستم کەوتوون و ئەو دەسکەوتانەیش هەروا نەخراونەتە نێو دۆڵاب و سنوقچەکانیماڵەوە؛ بەڵکوو بە شێوەیەکی «جیددی» خەریکی دووبارە نووسی و ڕێکخستنیانم بۆ چاپ، کە لەو ماوەیشەدا زۆر شتمان لێ چاپ کردوون و زۆریشیان لە ژێر چاپدایە. چاپکراوەکان وەک: **گوڵزاری هەورامان** لەدوو بەرگدا، **دیوانی میرزا ئەولقادری پاوەیی**، چەند پارچە شیعرێک لە ویراستار و دووبارەنووسی دیوانی **سەیدی هەورامی**. ئەوانەی لە ژێر چاپدان: **شاهنامەی هەورامی** ١١ چیرۆکم جەماوەری و دووبارەنووسیم کردوون، کە تێکرا نزیک بە ١٣٧٠٠ دێڕن و چاوەڕوانم چاپیان بکەم. هەروەها چیرۆکە شیعری «**سوڵتان ئیبراهیم و نۆشئافرین**» کە هی «خانای قوبادی» و بەشیوەی هەورامی و نزیک ٣٧٠٠ دێڕ شیعرە و ئەویشم ڕەوانەی چاپخانە کردووە؛ یان کتێبی «**کەشکۆڵی هەورامان**» بەرگی یەکەمیم تەواو کردوەو کە ١١ شاعیر و لە ٢٩٤ لاپەڕەدایە و لە ئەنستیتۆی کورد لە تاراندا و ئامادەی چاپە، بڕواشم پێبکەن ئەگەر ناوەندێ ببایا کە یارمەتی بدایام بەتایبەت بۆ چاپ، ئیستا چەند کتێبی ترم لەو دەسنووسانەدا کە زۆربەیان چیرۆکە شیعری ئاینی و سروشت و دیلانە یان «حەبسیات» و ئەویندارین، دووبارە نووسیم ئەکردنەوەو ئەکەوتنە بەر دەستی هەمووان.

### باسی چەند دەسنووسی بەشێوەی تایبەتی:

ئەوەیش کەلێرەدا ئەمەوێت لەسەریان بدوێم باسی چەند دەسنووسی ئەسڵی و کۆپی کۆنن بە مەجموعە شیعری شاعیرانێکی ناسراو و نەناسراوە، کە ئەوانەیش لەو چەن ساڵیەدا دەستم کەوتوون.

**دەسنووسی یەکەم:**

ئەم دەسنووسە کە دەمەوێت پێناسەی بکەم بە گوێرەی ئەم داڕشتەی خوارەوەیە:

| ناوی شاعیر | پارچەی شیعر | دێڕ |
|---|---|---|
| میرزا شەفیع | ١٣ | ٢٢٣ |
| بێسارانی | ٢٨ | ١٨٢ |
| ئافرەتێ، نەناسراو (جەهان ئاراخانمی پاوەیی(؟)) | ٦ | ١١٢ |
| مەولەوی | = | ١٠ |

| | | |
|---|---|---|
| میرزاناویێ، نەناسراو | ١٤ | ٢١٩ |
| ئەحمەدبەگی کۆماسی(؟) | ٢ | ١٩٩ |
| شاعیرێ بێ ناونیشان | ٢١ | ٤٠٧ |
| شیخ حەسەنی سازانی ناسراو بە بولبوڵ | ٣ | ٤٧ |
| میرزاعەبدولای پاوەیی | ٩ | ٢٠٦ |
| خانای قوبادی | ١ حەوت بەند | ٩٦ |
| شیخ شەهاب | ١ | ١١ پینج خشتەکی |
| کۆی هەموان | ٩٨ پارچە | ١٧٢٠ دێڕ |

ئەم دەسنووسە لە قەوارەی درێژایی و پانتایی ١١ لەسەر ١٨ سانتیمتر و بەرگی چەرمی ڕەش، کاغەزێ زەرد لە ١٧٠ لاپەڕەدایە. بە تێکرا نزیک بە ١٧٢٠ دێڕە. هەموویشی شیعرە و بە شێوەی هەورامییە، لە لاپەڕەی ١٤٩دا بۆمێژووی دانانی ئاوا نووسراوە: «بتاریخ غرۀ شهر١٢٨٢روزجمعۀ لطف الله» بە خەتێکی زۆر جوانیش نووسراوە؛ وا دیارە هەر ئەو لوتفولایە نووسیویەتەوە کە بە جوانی بۆم ڕوون نەبوویەوە کێیە.

دیارە لە سەرەتا و کۆتاییشدا چەند لاپەڕەیەکی نەماوە، لە سەر دارژاوی خەتی چلیپایی نووسراوەتەوە، کە هەر لاپەڕەیە ٩ تا ١٢ دێڕی تێدا نووسراوە تا ئەوەی بۆم ڕوون بوەتەوە هی ١٠ شاعیرن و چەند پارچەیەکی نەناسراو لە نێوی ئەو شاعیرانەیشدا. ئافرەتێکیان تێدایە ناوەکەی نەنووسراوە، تەنها لە ناوەرۆکی شیعرەکانیدا بۆمان دەرئەکەوێت کە هی ئافرەتن، بۆ وێنە:

| | |
|---|---|
| من جە ئەمر تۆ نیەنم تەخسیر | میرزام تۆ ناهەق لێم مەبی دڵگیر |
| ئەگەر من جارێ تۆم کەردەن ڕەنجە | دەستوورەن، ئانە پێش ماچان لەنجە |
| من نازم کەردەن تۆ ماچی جەنگەن | جەنگ نییەن میرزام ئانە گشت ڕەنگەن |

به بۆچوونی خۆم زۆر لە شیعرەکانی «جەهانئارا خانمی پاوەیی»یەوە نزیکن، بۆ وێنە با سەیری ئەم چەند دێڕەی «جەهانئارا» لە پارچەی «قیبلەم دەماخم»دا بکەین .

| | |
|---|---|
| غەیر جەتۆ کەسم وەکەس نەوانان | وەیادت قەسەم شای نۆ جوانان |
| تۆنی ئازیزم تۆنی غەمخوارم | هەرتۆنی یاگەی گشت قەوموکارم |
| هەر با جە عالەم واچان بێ کەسەن | مەیل تۆم تەنخوای گشت عالەم وەسەن |

ئەگەر ئەم سێ دێڕە لەگەڵ ئەوە سێ دێڕەی دەسنووسەکەدا تێکەڵ بکەین کەسێ ناتوانی جیایان بکاتەوە، تا ئەو شوێنەش بۆم دەرکەوت ٦ پارچەی ئەو ئافرەتەی تێدایە، یەکێتر لەو بابەتانەی کە جێگای ئاماژەیە، ئەم کەشکۆڵە شیعری «بێسارانی» زۆری تێدایە لەنێوی ئەوانەدا ١٣ پارچەم دەست کەوتوون کە ٦ پارچەیان تا ئەو شوێنەی ئاگادار بم لە هیچ سەرچاوەیەکا چاپ نەکراوەن. ئەو ٧ پارچەکەی تر بە ئاڵوگۆڕێکی زۆرەوە لە چاپ دراون. کە من ئەوانەم لەو کتێبەی بە ناوی «کەشکۆڵی هەورامان» لە بەرگی یەکا هێناون. ئەوەیش بڵێم کە شێوەی نووسینی شیعری ئەو شاعیرانە لەپشت سەری یەکدا نین؛ هەیانە چەند پارچەیەکی لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتائیدا نووسراون، ئەوانەی پشت سەری یەکن، هیچ نیشانەیەکیان بۆ دەسنیشان

نەکراون؛ هەندێکیان لە ڕووی ناو یان نازناوەکەیان -کە لەو شیعرانەدا هاتوون- دەرئەکەوێت هی کام شاعیرن. لەو ۹۸ پارچەیەش ۱ حەوت بەند و ۱ پێنچ خشتەکی تێدایە و هەموویشیان بە شێوەی هەورامی نووسراوەن.

**دەسنووسی دووهەم :**

| ناوی شاعیر | پارچەی شیعر | دێڕ |
|---|---|---|
| غەمین (؟)<br>سەبووری | ٥<br>٢ | ٩٥<br>٢٧ |
| سەیدی هەورامی | ١ | ١١ |
| میرزا شەفیع کولیایی | ٩ | ٢١١ |
| خانای قوبادی | ١ | ٦٦ |
| سابر(؟) یان سابری | ١ | ٧١ |
| شیخ شەهابی کاکۆزەکەریایی | ١ | ١٠ |
| عیسمەت بوخاری(؟) | ١ | ٥٢ |
| شەمس تەبریزی | ٢ | ٦٣ |
| مەولانا جامی | ١ | ٣٢ |
| مەولانا بەڵخی | ١ | ٤٠ |
| سەرجەم یان کۆی هەمووان | ٢٥ | ٦٨٨ |

ئەم دەسنووسە بە قەوارەی ١٢ لە سەر ١٩ سانتمیتر و بە بەرگی چەرمی ڕەش کە چوار دەورەکەی بە دەرزی و دەزوو حاشیەدۆزی کراوە و بە تێکڕا ٤٠ لاپەڕەیە لە چەن لایشەوە مێژوی نووسین و ناوی نوسەرەکەی لەسەر نووسراوە کە زیاتر لە ساڵی ١٢٨٢ تا ١٢٨٥ هـ.ق دا دەسنیشان کراوە؛ وەک لە لاپەڕی ٣٨دا ئاوا هاتووە: «تمد شد آه من الموت، آه از دست مرکب بد وکاغذ بد، آه ازبی تالع فی شهر شوال تحریر پذیرفت از دەست محمّد امین ١٢٨٣).

هەروا کە وتمان ئەم دەسنووسە ٤٠ لاپەڕەیە و نزیک بە ٦٨٨ دێڕشیعری تێدایە. لە لاپەڕەی١ تا ١٣ شیعری فارسیە و مەولانا و شەمس تەبریزی، جامی و عیسمەت بوخاری کە ئەم بەشەی ١٨٧ دێڕە. لە لاپەڕەی ١٤ تا٤٠ سەرجەم شیعری هەورامیە و نزیک بە ٤٨١ دێڕە. لێرەدا پێویستە ئەوەیش بڵێم ئەو پارچە شیعرەی خانای قوبادی بەناوی «میعراجنامە»یە و جیا لەو میعراجنامەیەی لە پێشەکی «خەسرەو و شیرین»ەکەی مامۆستا حەمەی مەلا کەریمدا هاتووە، ئەم دەسنووسەش بەشێوەی ئەسڵی و لای خۆم بە ئەمانەت پارێزراوە، بەداخەوە ئەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەم دەسنووسە هەم لە سەرەتا و هەم لە ناوەڕاست و کۆتاییدا زۆرێکی لە ناو چووە.

### دەسنووسی سێهەم:

دەسنووسی سێهەم بەرگی نەماوە. لە قەوارەی ١٧ لە سەر ٢١ سانتیمتر دایە و لەسەر کاغەزی زەرد نووسراوە و تێکڕا ١٦٠ لاپەڕەی ماوە. بۆ ئەوەی ئەڵێم ١٦٠ لاپەڕەی ماوە، هەم لە سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتاییدا چەند لاپەڕەیەکی نەماوە. بەو حاڵەیش شتێکی بەنرخە و ئەبێ ئەوەیشی کە ماوە پارێزگاری لێوە بکرێت .

با سەرتا سەیری داڕشتەی ئەم دەسنووسەیش بکەین کەبەم شێوەی خوارەوەیە:

| ناوی شاعیر | پارچە شیعری | دێڕ |
|---|---|---|
| نەناسراو (ڕوستەم و زۆراب) | ١ | ١١٢٠ |
| فەقێ قادری هەمەوەندی | ١ | ٤١ |
| نەناسراو (مەنزوومەی ئیمام عەلی و ئەبووجەهل) | ١ | ١٤٧٠ |
| سەرجەم | ٣ | ٢٦٣١ |

بەداخەوە هیچ نووسراوەیەکی ئەوتۆی لەسەری نەنووسراوە کە بزانین دانەر یان دانەرانی کێ بوون؛ تەنها لە ناوەڕاستدا پێش پارچە شیعرێکی دیلانە یان حەبسیاتی «فەقێ قادری هەمەوەندی» شتێکی نووسیوە کە مێژووی ئەو نووسراوەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە؛ ئەویش ئەوەیە «مولف کتاب فقی عبدالقادربن رسول از روسای هموندی ازتاب تنهایی وتعذیب قیودش بااین نسخه افکار بعجز حال خود روزگار را در توقیف خانه کرکوک و موصل و بغداد درگذرانیده رحمت الله علیه١٢٩۴ هـق». ئەم نووسراوەیە لە لاپەڕەی ٦٠دا نووسراوە کە سەرتای ئەو شیعرەی «فەقێ قادر»ە و پاش ئەوەی چیرۆکە شیعری «شەڕی ئیمام عەلی و ئەبووجەهل» لێرە بەدوایش بەیەک ڕێنووس نووسراوە و بە گوێرەی ئەو نووسینەیش ئەکرێت بڵێین هی فەقی قادری هەمەوەنی بێ کە ڕوونووس کراوەتەوە.

سەرەتای ئەم دەسنووسە تا لاپەڕەی ٥٩ چیرۆکە شیعری «ڕوستەم و زۆراب»ە لە شاهنامەی هەورامی. هەر ئەم بەشەی تا لاپەڕی ٣٢ دیارە کاتی خۆی نەماوە و بە جەوهەری سوور دووبارە نووسی کراوەتەوە. زۆریشی بەری باران و ئاو کەوتووە و بەدەردیسەر ئەخوینرێتەوە. ئەمەیش هەڵئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئێمە شوێنێکی تایبەتیمان نەبووە تا لەم جۆرە ئەسەرانە پارێزگاری بکات. هەروا ئاماژەم پێکرد ئەم دەسنووسە ئەکرێت بە سێ بەشەوە بەشی سەرەتایی کە ئەبێ بەو چیرۆکە شیعرەی ڕۆستەم و زۆراب. بە تێکڕا ئەوەی کە ماوە١١٢٠ دێڕە. بەشی ناوەڕاستی ئەو شیعرەی فەقی قادەرە و دیارە زۆریشی لێ فەوتاوە. ئەوەی کە ماوە ٤١ دێڕە. بەشی کۆتاییشی کە ئەبێتە چیرۆکە شیعر یان جەنگنامەی ئیمامی عەلی و ئەبووجەهەل، ئەگەرچی ئەویش هەر ناتەواوە، تێکڕا نزیک بە١٤٧٠ دێڕە کە سەرجەمی ئەم دەسنووسە ٢٦٣١ دێڕە و هەمویشی بە شێوەی هەورامی نووسراوە.

### دەسنووسی چوارەم:

ئەم دەسنووسە کە بە شێوەی کۆپی دەستم کەوتوە، سەرجەم ۲۲۸ لاپەڕەیە. ئەتوانین بە یەکێ لە باشترین کەشکۆڵەکانی ئەدەبی کوردی ناوی لێ بەرین، لەبەر ئەوەی لە هەمو جۆرە شیعریکی تێدایە؛ چ لە ڕووی قاڵبی شیعری چ لەڕووی زمان و شیوە زمانییەوە. لەسەرەتای دەس پێکردنی کە بە نووسینی شیعرەکانی مەولەوی دەس پێئەکا، نووسەری ئەم دەسنووسە ئاوا خۆی و دەستنووسەکە ئەناسێنێت: «کلیات مولوی علیه الرحمه به خط سید نجم‌الدین خانقایی از کلیات حضرت شیخ به اتمام رسید». یانێ ئەم کەشکۆڵە کەبە سەرجەمی مەولەوەی دەست پێئەکات لە ڕووی کەشکوڵ یان دەسنووسی شێخانی بیارە نووسراوەتەوە کە لە ناوەڕاستی ئەم نووسراوەیەشدا ئاماژەیەک بەوەش کراوە. بۆ وێنە: لە کۆتایی شیعرەکانی مەولەویدا ئاوای نووسیوە: «تمت شدکلیات مولوی من تاریخ ارتحال حضرت شیخ عبدالرحمن قدس العزیز» کە «شێخ عەبدڕەحمان»یش لە سالی ۱۲۸۵ هـ.ق دا کۆچی دوایی کردووە. واش دەرئەکەوی کە زۆربەی ئەو دەسنووسەی بنەماڵەی شێخانی بیارەیش خودی شیخ عەبدڕەحمان ناسراو بە «ئەبولوەفا» نووسیویەتەوە.

ئەم دەسنووسە بەسێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی نووسراوەتەوە کە زیاتری بە زمانی کوردیی هەورامیە. سەرەتایش هەروا کە وتمان بە شیعری "مەولەوی" دەستی پێکردووە کەسەرجەمی "مەولەوی" لەو سەردەمەدا نووسیوەتەوە و لاپەڕەی ۱ تا ۹۸یە و بە تێکڕا ۱۲٤ پارچەیە. سەرتای دەسپێکردنی تا کۆتایی سەرجەم لە هەر لاپەڕەیەکا چوارێنێکی خەیامیشی نووسیوە.

با سەرتا بە شێوەی ئەم داڕشتەیە سەیرێکی ناواخنی ئەم دەسنووسە هەروەک خۆی بکەین:

| ناوی شاعیر | پارچەی شیعری | زمانی شیعری | دێڕ |
| --- | --- | --- | --- |
| مەولەوی ناسراو بە مەعدوومی | ۱۲٤ | کوردی-هەورامی | ۱۵۸٤ |
| شێخ موحەممەدی فەخرولعولەما | ۱ | === | ٤٤ |
| بیدل(؟) | ۲ | فارسی | ۱۳ |
| هلالی (؟) | ٦ | == | ٦۳ |
| عەتار | ۱ | فارسی | ٤۱ |
| شێخ عەبدۆڕەحمانی ئەبولوەفا | ۲۸ | = = | ۲۰۳ |
| شێخ موحەممەدی بەهائەدین (ابوالبها) | ۲ | == | ۲۱ |
| ئیمام ڕەبانی (؟) | ۱ | == و عربی | ۱۸ |
| مەلاحامد کاتیب | ۱ | = = | ۷ |
| خاجە ئەکرەمەدین بوخاری (ئەختەر) | ۱۰ | = = | ۷۲ |
| سەعدی شیرازی | ۲ | == | ۲۰ |
| مەلا عبدولای دشەیی | ۲ | = = | ۱٦ |
| موستەفابەگی کوردی | ۷ | فارسی وکوردی(س) | ۱۵۲ |
| مەولانا جامی (؟) | ٦ | فارسی | ٤۳ |
| شەمس تەبریزی | ۱ | = = | ٦ |
| مەلا ئەحمەدی شیخولئیسلامی | ۱ | = = | ۹ |

| شیخ سەبغەتوڵای تاڵشی(؟) | ١ | == | ٨ |
|---|---|---|---|
| ناسرەدین شاه | ١ | == | ٨ |
| غەیاسی (؟) | ١ | = = | ٢٣ |
| مەنسوور (؟) | ١ | == | ٧ |
| سائێب تبریزی | ١ | == | ١٤ |
| فەیزی (؟) | ٦ | = == | ٥٠ |
| کەمالا(؟) | ١ | = = | ٢٠ |
| شێخ ئیبراهیم (خاکی) | ١ | = = | ٢٥ |
| حەیدەر (؟) | ١ | = = | ١٠ |
| موخلێس (؟) | ٤ | = = | ٩٧ |
| حەسرەتی | ٢ | کوردییسۆرانی | ١٤ |
| فکری | ٢ | == | ١٥ |
| سالم | ٧ | = = | ٥٢ |
| نالی | ١١ | = = | ١١٣ |
| حاجی قادری کۆیی | ١ | کوردییسۆرانی | ٦ |
| شیخ ڕەزا تاڵەبانی | ٢ | = = | ٣٦ |
| تاهێر بەگی جاف | ٣ | کوردی و فارسی | ٢٢ |
| شیخ عومەری زیائەدین | ٢ | کوردییسۆرانی | ٣٣ |

ئەڵبەت نزیک بە ٢٢ پارچەیشی تێدایە کە بێ ناونیشانن کە بە تێکڕا ئەوانیش ٢١٨ دێڕ کوردی و فارسی و عەرەبین. هەروا لە سەرەتادا باسمان کرد لە هەر لاپەڕەیەکی ئەم دەسنووسەدا چوارێنەکی خەییام نووسراوە کە ئەوەیش لە لاپەڕەی ٤ دەسپێئەکا تا لاپەڕەی ٢٣٣ کەبە تێکڕا ٢٣٠ چوارینەن. لە کۆتایی چوارینەکانیشدا ئاوا نووسراوە: «پایان رباعیات خیام علیه الرحمه بدست محمّد امین قاضی شافعی کرمانشاه». ئەم دەستنووسە ئەتوانین بە تێکڕا ٢٤ شاعیرە ٢٦٥ پارچە شیعر و ٢٣٠ چوارینە، دەسنیشان کەین کە هەروا لە نیو داڕژاوە (جەدول)ەکەیشا دیارە بە سێ زمانی «کوردی، فارسی، عەرەبی» تێدایە کە کوردیەکەیشی هەم بە شێوەی هەورامی هەم بە سۆرانی نووسراون.

ئەوە بوو کورتەباسێک لەسەر ئەو چوار دەستنووسە کە لە لای خۆم پارێزراون، بە هیوای ئەوەی بتوانم ڕۆژێ هەموویان دووبارەنووسی بکەمەوە و بکەونە بەردەستی هەمووان.

# کاکەییەکان و زمانی نەتەوەیی و ئایینی و نووسراوە ئایینییەکان

د. سەلام ناوخۆش بەکر [*]

**کورتە:**

هەر دەقێکی ئایینی-نەتەوەیی فاکتەری پاراستنی ناسنامە و زمانی نەتەوەیە. ئایین سەرچاوەیەکی سەرەکی پژاندن و گەشە کردنی زمانی دایک و زگماک و نەتەوەی کۆمەڵە ئەتنیکی-ئایینییەکەیە.

کاکەییەکان، وەک ئێزیدییەکان، کۆمەڵێکی ئەتنیکی-ئایینین و خاوەن کەلتور و زمان و ئەدەبیاتی ڕۆحانییەتی خۆیانن. هەورامان یەکێ لەو ناوچانەی کوردستانە کە بایەخێکی گرنگی لەو ڕووەوە هەیە؛ چونکە جگە لە کاکەیی، ئەوە پێشتر ژینگەی گەشەکردنی زەردشتیەتیش بووە. هەتا سەردەمانێک خەڵکی ئەو ناوچانە لە پاش مووسڵمان بوونیش دەستبەرداری هەندێ داب و نەریتی زەردەشتیش نەبوو بوون.

دیالێکتی گۆران کە زمانی سەرەکی نووسراوە ئاییینییەکانی کاکەییەکانە، لە هەموو زارێکی دی کوردی لە زمانی ئاوێستا نزیکترە. لەم توێژینەوەیەدا، بەشێوەیەکی سەرەکی جەخت لەسەر کاکەییەکانی کوردستان کراوە ئەگەرنا پەیڕەوکەرانی ئەو جۆرە ئایینە لە «شوێنی تر» و لە ناو «نەتەوەی تر»دا هەیە، ئەوەندە هەیە ئەوانە بەناوی کاکەیی نەناسراون؛ بەڵکوو زیاتر بەناوی «ئەهلی هەق»، «عەلیوڵلاهی» و «عەلەوی» و «قزڵباش» و «دەروەز» و هتد ناسراون. ڕاستە ئەوانە سەد لە سەد کورد نین، بەڵام کاکەییەکانی خوارووی کوردستان سەد لە سەد کوردن و خاوەن زمان و کەلتوری خۆیانن.

جگە لە پێشەکی، ئەم توێژینەوە لەچەند سەرباسێک پێکدێ: «کاکەییەکان کێن؟» سەرباسی یەکەمی ئەم توێژینەوەیە. هەروەها لە پاشان لە ناسنامەی نەتەوەیی و ئایینی کاکەییەکانی خوارووی کوردستان دواوین. نووسراوە ئایینییەکانی کاکەیی کە خۆی لە «سەرەنجامدا» و «تەزکرەی ئەعلا» و «زوڵاڵ و زوڵاڵ» و «یارسان» دەگرێتەوە، بەشێکی زۆری توێژینەوەکە دادەپۆشێت .

---

[*] پرۆفیسۆری یاریدەدەر-زانستگای سەلاحەدین.

## بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە

لە لێکۆڵینەوە لەو دەقانە، توێژەر توانیویەتی هەندێ ڕۆناهی بخاتە سەر زمانی ئەو دەقانە و ساخ کردنەوەی ناسنامەی نەتەوەییمان کە کوردییە و بە زاری گۆرانی نووسراون؛ هەروەها کز بوونی ڕۆڵی زاری هەورامی (گۆران) لە دوای ڕووخانی میرنشینی ئەردەڵان و دروست بوونی میرنشینی بابان بە سەرەتایەک لە هەرەسی زمانی کاکەییەکان و ئەدەبی ئیسلامی هەورامیدا ئاماژەی بۆ کراوە.

لە کۆتایی توێژینەوەکەدا، ئەنجامە سەرەکییەکانی ئەو توێژینەوە خراونەتە ڕوو.

**وشە سەرەکییەکان:** کاکەیی، ئایین، هەورامان، گۆران، ئەهلی هەق، عەلیوڵلاهی.

## ناسنامەی کاکەییەکان

کاکەییەکان کۆمەڵێکی ئەتنۆ-ئاینین. زۆر لە تـوێژەران بـەهۆی لەیـەک نزیکـی کاکـەیی دەگـەڵ عـەلی ئیلاهی، قزلباش، دەروەز و کۆمەڵەی دی ئـەتنیکی و ئـایینیی تێکەڵـیان دەکـەن. ئـەم گرووپـە بـە زۆر نـاو ناسراون: کاکەیی، ئەهلی حەق، یارسان، کُردبچە (بەچەی کـورد)، خـروس کـوش (کەڵەشـێر کـوژ). دۆگمـا بنەڕەتیەکانی ئەم کۆمەڵەیە خۆی لە سێ کوچکەی «یەکێتی بـوون» و «تەجسـیدی ئیلاهـی» و «دۆنـادۆن» دەنوێنێ. بوونی ئەم دیاردەیەش، لەوانەیە زیاتر پێویست بێ بە سروشتی خـودی ئایینەکـە کـە وەک هەنـدێ توێژەر وای بۆ دەچن کەرەگێکی کۆنی هەبێ. هەروەها جیهانبینی هەنـدێ سـۆفی پـەرگر ئەمـەی دروسـت کردبێ. سەبارەت بە بنەچەی ئەم کۆمەڵەوە، سەدیق بۆرەکەیی وای بۆ دەچێ کە ئەم گرووپە تێکەڵەیەک بـن لـە ڕەگـی هەنـدێ ئـایینی کـۆنی ئـاری و هـەروەها موتروبـەکردنی هەنـدێ لـە ئـەدگارەکانی کتێبـە ئاسمانییەکانیان؛ هـەروەک دەنووسـێ: بـەپێی بەڵـگەکان و پەرتووکـە دەستنووسـەکانی یـاری (کاکـایی)، وا دەردەکەوێ کە داهێنەری ئەم ڕێ و ڕچە «بالوولی ماهی» بووە کە لـە سـەدەی دووهـەمی کۆچیـدا ژیـاوە و لەگەڵ هەندێ لە یارانی لۆرستان بەهۆی کەڵک وەرگرتن لە بیر و ڕای کۆنی ئایینییەکانی کوردستان، وەکـوو ئاینی زەردەشتی و «مانەوی» و «مەزدەکی» و «فەلە»، «جوولەکە» و «ئیسلام»، گەلێ کاریـان کردۆتـە سـەر ڕێ و ڕچەی یاری (کاکەیی) (بۆرەکەیی،٢٠٠١: ٥). هەروەها بەهۆی بەهرە وەرگرتن لە ئایینـەکـانی ئیسـلام، فەلە و جوولەکەوە، ئەمین‌زەکی بە ئەهلی‌حەق و عەلی‌ئیلاهی ناویان دەبات. هەبوونی ئەوانە دەکاتە بەڵـگە لـە سەر کاریگەری مەزهەبی جەعفەری لە ناو کورداندا (زەکی،٢٠٠٠: ٢٠١). هەروەها شیمانەی ئەوە دەکرێ کـە بیروڕای پـەرگرەکان ئـەم ڕێ و ڕچەیـەی بـەدی هێنابێـت (نـاوخۆش، ٢٠٠٦: ١٠٢). ئەمـەو دەگـوترێ کـە «سان‌سەهاک» یاخود «سوڵتان سەهاک» یان «سوڵتان ئیسـحاق» کـە لـە ساڵـی ٥٧٨ی کۆچیـدا لـە دێـی دەودان لە هەورامانی لهۆن لە دایکبووە، تازەکـەرەوەی ئـەم ئاینـە بێـت (بۆرەکـەیی، ٢٠٠١: ١٠٢). لێـرەدا لێکچوونێکی ئاشکرا لە نێوان ڕۆڵی «شێخ ئادی» بـۆ ئێزیـدیاتی و «سوڵـتان سـەهاک» بـۆ کاکـەیی بـەر چـاو دەکەوێ؛ بەڵام بەپێچەوانەی ئێزیدیاتیەوە، ئەم ئایینـە سـەد لـە سـەد کـوردی نییـە، بەڵـکووو وەک «ڕەشـاد میران» دەنووسێ: «پەیڕەوکەرانی ئایینی ئەهلی‌هەق تـەنیا کـورد نـین، بەڵـکوو لەناویانـدا فـارس و تـورک و ئازەری و هی تریش هەن» (خەزنەدار، ٢٠٠١: ٢٢٩). بەڕای من ژێدەری دەرکـەوتنی ئـەم کۆمەڵـەیە ڕەنگـە پێویست بێ بە خودی ململانێی دەسەلاتیەوە: دەسەڵاتی عەرەب و دەسـەڵاتی فارسـی. عەرەبـەکان بـەر لـە ئیسلام یەکێ لەکۆمەڵە هەرە دواکەوتوەکان بوون؛ کەچی فارسەکان خاوەن شارستانیەت بوون. بەڵام لە ڕێـی ئیسلامەوە عەرەبەکان بوونە یەکێ لە نەتەوە سەردەستە و خـاوەن شارسـتانییەکان؛ فارسـەکانیش ئـەو ڕۆڵـە گرنگەیان نەما. هەر ئەمە وای کردبێ فارسـەکان و بەشـێ لـە کوردەکـانی هـەورامان هـەر لـەژێر کاریگـەری زەردەشتایەتی، ئاینییکی کۆن زیندوو بکەنەوە. ئەمە و بۆ ئـەوەی عەرەبـەکان تۆمـەتی زنـدەق و هەرتەقـەیان نەدەنە پاڵ، تەواو لە ئیسلام هەڵنەگەڕانەوە؛ لەپاشانیش ململانێی مەزهەبی مەسـەلەکەی قووڵـتر کردبێتـەوە.

عەلی کوڕی ئەبوتالێب هێندە بەرز و پیرۆز کراوە بەجۆرێ نەک لە پێشەوەی پێغەمبەریش تەماشا کراوە، بەڵکوو لەلای هەندێ پەرگرەوە نەک عەلی هەر تەجسیدی خودای کردووە، بەڵکوو هەر خۆی بۆتە خودا (زەکی، ٢٠٠٠: ٢٠١). بوونی سێ کوچکەی باوەڕی یەکێتی بوون و تەجسید و دۆنادۆن، وای لە هەندێ نووسەری کوردناس وەک «ماکدۆڵ» و «کرێینبرۆک» کردووە کە وەک ئێزیدیەکان، کاکەییەکانیش بە «هەرتەقە Heterodox » ناوزەد بکەن (ماکدۆڵ، ٢٠٠٣: ٢٩).

### ناسنامەی نەتەوەیی کاکەییەکان:

ئەم توێژینەوەیە جەخت تەنیا لە سەر کوردەکانی خوارووی کوردستان دەکات. زاراوەی کاکەیی لە ژێدەرێکی کوردییەوە سەرچاوەی گرتووە. سەبارەت بەو زاراوە دینییەوە چەند ڕایەک هەن، هەموو ڕەسەنە کوردیەکە دوپات دەکەنەوە هەرچەندە «ئەدمۆنس» لە کتێبەکەیدا سیفەت و ناسنامەی کاکەیی لە خەڵکی عەوام و ڕەشۆکی دەستێنێتەوە و تەنها تایبەتی دەکات بە «سەید»ی کاکەییەوە، بەڵام ئەم توێژینەوە ئەم ڕایە ڕەت دەکاتەوە و سەید و «نا»سەید ناسنامەی کاکەییان هەیە. دوکتۆر جەمال نەبەز دەربارەی ناوی کاکەیی دەنووسێ: «گوایە ڕۆژێکیان کە دارەڕای مزگەوتەکەیان کردووە لە بەرزنجە و دیویانە دارەکان کورترن لە ماوەی نێوانی دیوارەکان. "سەهاک" گوتوویەتی: کاکە بیکێشە و لەوەوە دارەکە بە فەرمانی خوا کشاوە و هەر لەوەشەوە نێوی "کاکەیی"یان بە سەردا بڕاوە (نەبەز، ١٩٧٦: ٩٩). هەروەها دەگوترێ کە شیمانەی ئەوە دەکرێ کە زاراوەکە پەیوەست بێ بە ناوی ڕابەری ڕۆحی ئەو تایەفەوە (بۆرەکەیی، ٢٠٠٠: ٧٤). ئەو شرۆڤەکردنە، ئەوە ساخ دەکاتەوە کە کاکەییەکانی خوارووی کوردستان، کوردن. هەروەها بە حوکمی ئەوەی زمانێکی تایبەت بە خۆیشیان هەیە کە ناوی «ماچۆ»یە، بۆیە کەلتووریشیان لەگەڵ کەلتووری عەلیئیلاهی و عەلەوی و قزڵباش و دەروەز جودایە. لە هەموو ئەوانەش گرنگتر ئەوەیە، ناویان کوردی بوو و حەوت وێنە کردگارەکانیان هەموویان کوردی کوردستان و لوڕستان بوون، جگە لە ئیمامی عەلی. وێڕای ئەمەش، دەرکەوتنی ئەدەبی یارسانی (کاکەیی) لە سەدەی دەیەمەوە دەسپێکێک بووە بۆ نووسینی دەقی ئایینی بە زمانی نەتەوەیی کوردی. ئەو ئەدگار و خەسڵەتە کوردییە لە قۆناغی دووهەمی ئەدەبی کاکەییدا (سەدەی ١٣ و١٥) زۆر ڕۆشنتر کوردییەکەی دەردەکەوێ.

### نووسراوە ئایینییەکانی کاکەییان و زمانناسی کوردی:

دیالێکتی گۆران -کە بە یەکێ لە زارە سەرەکیەکانی زمانی کوردی دادەنرێ- ڕۆژێ لە ڕۆژان لە مێژوودا بە تایبەتی لەسەردەمی زێڕینی میرنشینی ئەردەڵاندا، پەلی بۆ ئەوە هاویشتووە کە ببێ بە زمانی یەکگرتووی کوردی. «لە بارەی گرنگی ئەم زمانە وەک زمانێکی پیرۆزی ئایینی چەندەها هۆکار لە ئارا دان؛ بەر لە هەمووان نزیکی ئەم شێوە زارە لە زمانی ئاوێستا، دووهەم: زۆربەی نووسراوە ئاینییەکانی وەک نووسراوی «سەرئەنجام»، «تەزکەرەی ئەعلا)، «زوڵاڵ زوڵاڵ»، «یارسان»، «ماریفەتو پیرشالیاری» و هتد، بەو شێوەزارە نووسراون» (نیکیتین، ٢٠٠٤: ٢٨٦). وێڕای ئەمانە چەندەها هۆزانڤانی کورد وەک مەولەوی و مەولانا خالیدی

میکـایلی جـاف و خانـای قوبـادی هۆزانیـان بـەم شـێوەزارە دارشـتووە» (نـاوخۆش، ٢٠٠٦: ١٠٣). لـەنێو کاکەییەکاندا چەند نووسراوێک هەن کە بە نووسراوی دینیی وەک بەرنامەی ژیـانی کاکـەیی ناسـراون؛ وەک: سەرئەنجام، زولاڵ زولاڵ، یارسان. ژێدەرەکانی کاکەیی جەخت لەسەر ئەوە دەکـەن کـە «سـەرئەنجام» لـە هەموویان گرنگتر و بەرچاوترە. سدیق بۆرەکەیی ئاوا لە بارەی سەرئەنجامەوە دەنووسێ: «"سـەرئەنجام" نـاوی یەکێ لە پەرتووکەکانی پیرۆزی یارسانە کە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا لە لایەن "سانسـەهاک" و یـاران و هاوەڵانییەوە بە زاراوەی گۆران هۆنراوەتەوە؛ سەرئەنجام داگری شەش بەش یا شەش جزمـە و هـەر بەشـێکی ناوێکی تایبەتی بۆ خۆی هەیە کـە بـریتیین لـە: دەورەی حەوتەوانـە، بارگـە بارگـە، گڵـیم وەکـۆڵ، دەورەی چلتەن، دەورەی عابدین، وردە سەرئەنجام و ئەم شەش جزمە لـەباری مەبەسـت و ناوەرۆکـەوە لەگـەڵ یـەک تۆفیریان هەیە» (بۆرەکەیی، ٢٠٠٠: ٧٤).

«ڕەشاد میران» باوەڕی وایە کە دەقی سەرنجام بەناوبانگترین و ڕەنگە پیرۆزترین دەقی ئاینی ئـەهلیهـەق (کاکەیی) بێ. هەروەها دەنووسێ «دەقی سەرئەنجامیش پەخشانە، بە زمـانی فارسـی نووسـراوە. شـیعری بـە دیالێکتی گۆرانیش تیایە و ساڵی ١٨٤٣ نووسراوە. "مینۆرسکی" کورتی کردۆتەوە وەریگێڕاوەتە سـەر زمـانی ڕووسی و ساڵی ١٩١١ بەچاپی گەیاندووە. بەڵام دەقەکانی کەم و کوڕییان هەیە» (نەبەز، ٢٠٠٥: ١١٠-١١١). ئەمەو «محەمەدئـەمینهـەورامانی» و «ڕەشـاد مـیران» و «سـدیق بۆرەکـەیی» و «مینۆرسـکی» و «باسـیلی نیکتین» باوەڕیان وایە کە دەقـەکانی سـەرنجام لەگـەڵ یـەک جیـاوازن. وێـڕای ئەمـەش هەنـدێ کتـێبی «تەزکەرەی تەعلا» هەر بە سەرئەنجام دەبینین وەک بڵێی دوو ناو بن بۆ یەک ناوەرۆک. «ڤ.ئیڤـانۆڤ» کـە «تەزکەرەی ئەعلا»ی لە فارسییەوە کردووە بە ئینگلیـزی، دەڵـێ ئـەمـەش هـەمان نـاوەرۆکی سـەرئەنجامە؛ کەچی لە ئەمەی دوایی گەلێ ڕێکوپێک و تەواوترە. هەروەها یاسا و پرنسیپەکانی ئـایینی ئـەهلیهـەقی تیایـە بایەخێکی زۆری بە مەسەلەی ئاشکرا بوونی «حەقیقەت» داوە. لە دیدی بۆرەکەییـدا هـەر شـەش بەشـەکەی سەرئەنجام زیاتر بەشێوەی شیعر نووسراون و زمانی نووسـینەکانیش شـێوەزاری گۆرانـە (بۆرەکـەیی، ٢٠٠٠: ٨١). ئەمە و هەر بەشـە و کۆمەڵـە پیرێـک نووسـیویانە و «سـانسـەهاک» (سوڵـتان ئیسـحاق) لـە زۆربـەی بەشـەکاندا بەشـدارە. ئەمـەش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە سـەرەنجام کتبێکـی ئاسمـانیی نییـە و بەڵـکوو زادەی خوێندنەوە و مەعریفەی چەند مرۆڤێکە. کەسێکی تر وەک «پیر بنیامین» کە لە نەزەری «د. جـەمال نەبـەز» هاوشانی «مەلیکتاووسی» ئیزیدیانە بۆ کاکەییەکان، ئەویش لەنووسینی چەند بەشێکدا بەشـدارە» (نـاوخۆش، ٢٠٠٦: ١٠٠). ئەمەی جێی سەرنجە، بەشداری چەندان کەسە لە نووسینی ئـەم دەقانـەدا کـە لـە مـاوەی زۆر جیاواز لە یەکتردا ژیاون. ڕەنگە ئەمەش هۆکارێ بێ بۆ ئەوەی دەقەکان لەیەکتر جـودا بـن. هـەروەک لـەدوو ڕاکەی پێشووش ئاشکرا دەبێ، مێژووی نووسینی دەقەکان وەک یەک نییە. بۆرەکـەیی سـەدەی هەشـتەمی کۆچی (پازدەی زایینی) بۆ دەقی سەرنجام دادەنێ و سوڵتان سەهاک بە یەکێ لـە دانـەرانی دادەنـێ؛ کـەچی ڕەشاد میران سەدەی نۆزدەهەم دادەنێ. هەبوونی چوار سەدە لە نێوان مێـژووی نووسـینی دەقێکـی ئـایینی گرنگ، گومان دەخاتە سـەر خـودی دەقـەش. ئـەو کتێبـە ئایینییـەی کـە کاکەییـەکان لەساڵـی ١٩١٤ بـە

«مینۆرسکی»ی کوردناسیان داوە، بەڕای محەمەد ئـەمین هـەورامانی «سـەرەنجام» بـووە، ئـەویش سـەدەی نۆزدەهەم نووسراوە. بەم واتایە ڕێی تێناچێ سوڵتان‌سەهاک هیچ ڕۆڵی هـەبووبێ لـە نووسـینی ئـەم دەقـەدا؛ چوونکە ئەو خۆی لە سەدەی سێزدەهەم و چواردەهەمدا (١٢٧٢-١٣٨٨) ژیاوە. ئەوەندە هەیە دەکرێ ئـەو لـە سەدەی چواردە نووسیبێتی لەپاشان سەدە دوای سەدە یاران و هاوەڵانی دووبارەیان کردبێتەوە و هەر یەکـە و بەپێی ڕەوشی سەردەم گۆڕانی تێدا کردبێ؛ هەروەک ئەوەی لـە «جیلـوە» و «مەسـحەفی ڕەش» و «مژدەهـا ڕۆژ» و «قەولی ئێزیدیان» کراوە. سەبارەت بەوەش کە دەقەکە بە فارسـی بـووە یـان بـە کـوردیەهـەورامانی، ئەمەش جێی مشتومڕە؛ چوونکە خودی دینەکە وەک وتمان سەد لە سەدی کوردی نییـە، بەڵـکوو فارسـیش تێیدا بەشدارە؛ هەروەها زمانی فارسی و هەورامیش لە یەک نزیکن. زۆربەی کوردەکانی هەورامان فارسـیزانن؛ دەکرێ بە هەردوو زمان نووسرابێ یان دەکرێ سەرەتا بە فارسی بووبێ لەپاشان لـە ڕوانگەیـەکی نەتەوەییـەوە کرابێ بە کوردی؛ بەڵام لە ڕێگای شیعرێکی شێخی سەعدییەوە دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین کە لـە سـەردەمی ئەودا «کوردی هەورامانی» تاکە زمانی کوردی بووە لە ناو کورداندا. ئەو زمانە زمانی نووسین و دەسەڵات بـووە هەروەک شێخ سەعدی دەنووسێ:

که به‌تازی استینی برمن زند گوید تعال گه به کوردی گویرم

ئەمە و بەشە شیعریەکەی سـەرئەنجام -کـە سـرودەکانن- لەسـەر کێشـی خۆماڵـی کـوردی داڕێـژراون؛ هەروەها بەشێ لە «وردە سـەرەنجام» پەخشـانەکانی بـە فارسـی نووسـراون. سوڵـتان‌سـەهاک لـەم بەشـەدا کۆڵەکەی دینەکەی بۆ کاکەییەکان لە چوار شت دەربڕیوە ئەویش: «پاکی و ڕاستی و لە ناو بردنی فیز و هـەوا و بەخشش»ن. بەڵام شیعرەکانی لەسەر شێوەی مەسنەوی نووسراون؛ ئەگەر تاک‌تاک وشەی فارسیشی تێـدا بێ، ئەوا بەکوردییەکی ڕەوان بۆ سەردەمی خۆی نووسراوە:

باوەری وەجا، باوەری وەجا یاری چوار چشتەن باوەری وەجا

چاکی و ڕاستی ونیستی و ڕدا مەبۆ بار وێت سووک کەی جە دنیا

چونکە ئی دنیا جاگەی بوارەن گا سەرەو بان و گا سەرەو خوارەن

مەبۆ وەپاکی و ڕاستی و ڕدا گرد وات وێتان نیست کەن پەی مودا

(بۆرەکەیی، ٢٠٠١: ٨٥)

ئەم شێوە مەسنەوییە کـە لـە ئینگیلزیـدا پێـی دەڵـێن: «هیرۆیـک کـەپلێت» لەگـەڵ جـۆری فارسـی و ئینگلیزیدا جودایە. چوونکە لەوەی فارس و ئینگلیزیدا هەر دوو دێڕ لە شتێک دەدۆین؛ بـە واتایـەکی تـر، گـەر جووتێک لە دەقە شیعرییەکە دەربهێنی، زۆر کار لە ڕامانی دەقە شـیعرەکە ناکـات، بـەڵام شـێوازی داڕشـتنی دەقە شیعرییەکەی سـەرئەنجام، چوونکـە دەقێکـی ئایینییـە، دەرهێنـانی جووتـە دێـڕێک تـەواوی دەقەکـە تێکدەدات. کتێبی «زوڵاڵ زوڵاڵ» لە چەند بەندێک پێکهاتووە. هەر بەنـدێکی لەسـەر باسـێکی خواناسـی بـە هۆی «بابە یادگاری سـەرانەیی» و «شـائێبراهیمی ئیوەتـەوە» هـۆنراوەتـەوە. ئـەم دوو هۆنیـارە لـە سـەدەی

پازدەهەمدا ژیاون؛ هەردووک بەخواناسی ناسراو بوون. دەبێ هەردووک لە سەردەمی سوڵتان سەهاک ژیابن. ئەم پەرتووکەیان کە لە سەر کێشی دە هیجایی خۆماڵی هۆنیوەتەوە لە ١٥٦ بەند و ١٠٠١ هۆنراوە پێکهاتووە. سدیق بۆرەکەیی دەنووسێ «پەرتووکی *زوڵاڵ‌زوڵاڵ* یەکێ لە پەرتووکە پایەدار وگرنگەکانی سەدەی هەشتەمی کۆچیە کە بە زاراوەی گۆرانی هۆنراوەتەوە. لەو دەقەدا گەلێ وشەی کوردی هاتووە و ئەگەر ئەم دوو هۆنەرە ئەم وشانەیان بەکار نەبردایە، بێگومان ئیمە ئیستا هیچ چەشنە ئاگایەکمان لەوانە نەدەبوو» (بۆرەکەیی، ٢٠٠١: ٨٥). لەپاڵ سەرەنجامدا، زوڵاڵ زوڵاڵ، ئەوا کتێبی یارسان -کە کتێبێکی ئایینی کاکەییەکانە- باس لە ئەرکی ئایینی ڕۆژانەی کاکەییەکان دەکا. لە نەزەری موحەمەد ئەمین هەورامانی، یارسان وەک کتێبێکی پیرۆزی دینی کاکەییەکان وتنی دەگێڕنەوە بۆ شێخسەهاک؛ واتە سوڵتانسەهاک. یاخود ئەو سەردەمەی ئەو سەدەی هەشتەمی کۆچی بوو» (بۆرەکەیی، ٢٠٠١: ٨٥). ئەم کتێبیەش وەک دووەکەی تر بەشێوەی پەخشان و هۆنراوە نوسراووە. لەم کتێبانەدا بەزۆری هۆنراوەکان لەشێوەی «سروود» دان بۆ ئەوەی بەئاسانی لەبەر بکرێن. سرودەکانی یارسانیش «دە» بڕگەیین لە کێشدا و لە سەرواش مەسنەوین. زمانی دەقەکە هەورامانییەکی زۆر کۆنە لە ژێر کاریگەری دینی و هاوسێیدا. دەقەکان وشەی عەرەبی و فارسی و تورکیشیان تێدایە. زۆربەی هەرە زۆری نووسراوە ئایینییەکانی کاکەییەکان بە شێوەزاری گۆران نووسراوون. ئەم شێوەزارە هەر لە سەدەی نۆیەمەوە لە دەڤەری خۆیدا گرینگییەکی زۆری هەبووە، بەجۆرێ بەرەبەرە بۆتە زمانی ئەدەب و دەسەڵات. ئەمەو وەنەبێ هەورامانییەکان هەر هەموو کاکەیی بوون، بەڵکوو موسڵمانیش لەوێ هەبوونە؛ ئەمەش وای کردووە سەبارەت بە هەورامانییەکان گرنگیدان بە زمانی هەورامانی هەر تەنیا مۆتیڤێکی کاکەییانە نەبێت، بەڵکوو فاکتەری نەتەوەیش ڕۆڵی خۆی هەبووە. پەسەند کردن و بە شیرینتر زانی کوردی لە ئاست فارسدا بێجگە لە مۆتیڤی نەتەوەیی، چی تر ناگەیەنێت. ئەوەتا «خانای قوبادی» لەو تێڕوانینەی سەرەوە لە دوو مەسنەویدا دەنووسێ:

جەلای عاقڵان ساحێب عەقڵ و دین ... دانا بوزرگان کوردستان زەمین

ڕاستەن مەواچان فارسی شەکەرەن ... کوردی جە فارسی بەل شیرینتەرەن

(سەجادی، ١٩٥٢: ٢٤٨).

دوور نییە هەمان مۆتێڤ و ڕەوشی هەرێمەکە سروشتی زمانی گۆران، وای لە مەولەویش کردبێ شیعر بەو زمانە دابنێ. لەو بارەیەوە دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ باوەڕی وایە: «مەولەوی لووتکەی شیعری هەورامی و نوقتەی هاتنە خوارەوەیەتی» (مستەفا ڕەسووڵ، ١٩٧١: ٢٥). هەرچی گرنگی کوردناسەکانە بە شێوەی هەورامی، زیاتر موتیڤێکی دینی بووە. بوونی کۆمەڵەیەکی ئەتنیکی دینی لەکۆمەڵگای ئیسلامیدا دەرفەتێکی لەبارە بۆ نزیک بوونەوە لەم کۆمەڵە و بە پیرۆز زانی کتێب و داب و نەریتیان. «ژوگوڤسکی» مۆتیڤی خۆی ناشارێتەوە لەبارەی گرنگیدانی وی بە گۆران؛ هەروەک دەنووسێ: «گرنگیدانی من دەگەڕێتەوە بۆ، یەکەم: چوونکە گۆران خاوەن دیالێکتێکی تایبەتی خۆیانن و دووهەم: گۆران جەماوەری سەرەکی ئەهلی حەق پێکدێنن» (ژوگوڤسکی، ٢٠٠٨: ٦٣). ئەمەو بە هەڵە حاڵی بوونی هەندێ لە کوردناسەکان سەبارەت بە

شێوەزاری گۆران و حسێب نەکردنی بە کوردی، کوردەکانی هان داوە گرنگی بە شێوەزاری گۆران بدەن و ئەو ڕایانە ڕەت بکەنەوە کە بانگەشەی ئەوە دەکەن کە نەک هەر گۆران، بەڵکوو خودی زمانی کوردی بەشێکە لە زمانی فارسی. ئەمەو ڕەوشی دینی و کۆمەلایەتی و سایکۆلۆژی کاکەییەکانیش، فاکتەرێکی دی بووە لەسەر پاراستنی کوردیەتی ئەم شێوەزارە. کاکەییەکان وەک ئیزەدیەکان کۆمەڵەیەکی داخراوی دینی پێکدێنن. ئەم شێوە ژیانە وای کردووە زمانەکەیان وەک دەقەکانیان بە پاراوی بمێنێتەوە. سەبارەت بەکاکەییەکان ئەم خاڵە پۆزەتیف بووە، بەڵام لە دیدی کوردییەوە، زۆر لایەنی نێگەتیڤی لە خۆ گرتووە؛ لەوانە دروست بوونی دوو کۆمەڵی دینی جودا، هەروەها پەیڤە کوردییەکانی دەقەکان حاڵەتێکی دی پەرت بوونیماڵی کوردی لێکەوتەوە. لە ئاکامی ئەو وابەستە بوونە دینییە، وشە کوردییەکانی دەقەکانی سەرئەنجام و ئەوانیتر چوارچێوەیەک و مەدلولێکی کاکەییان وەرگرت. لەمەش زیاتر ڕۆشنبیران و پیاوانی ئایینی کاکەیی لۆمە دەکرێن، چوونکە ئەوان وەک پیاوانی ئێزەدی ئەو دەقانەیان هەر تایبەت کرد بە کاکەییەکان، بە دەگمەن دەقێکیان بە غەیرە کاکەیی دەدا. ئەمەش وای کردووە زمانی هەورامی پەیتاپەیتا لە لووتکەوە بەرەو هەرەس بچێ، بێگومان ململانێی میرانی کوردیش فاکتەرێکی دی بووە هەورامی بەرە بەرە ڕۆڵی نەمێنێ. ئەمەو ئەگەر پاش ڕووخانی میرنشینی ئەردەلان، دەسەلاتدارانی فارس گۆرانیان قەدەغەکرد و فارسیان پەرە پێدا، ئەوا «عەبدولرەحمان بابان»یش گرنگی بەکرمانجی ناوەڕاست داوە و داوای لە ڕۆشنبیرانی سەردەم کردووە واز لەگۆران بێنن و بەکرمانجی ناوەڕاست شیعر بنووسن. دوورخستنەوەی گۆران لە سیاسەت و بواری زمانەوانی، کاری لە کەسایەتی تاکی گۆرانیش کردووە نەک هەر زمانەکەی. «ک.ج.ریچ»، گۆرانەکان بە ڕەگەزێکی ترسنۆک و خێلەتی و نارێزدار وەسف دەکات. ئەم تێڕوانینەی ریچ لە روانگەی «ئی.ڤاسیلیەڤای» کوردناسەوە دەگەڕێتەوە بۆ عەسەبیەی خێلەکی و عەقیدەی ئیدۆلۆگی بابانەکان، هەروەک لەو بارەیەوە دەنووسێ: «عەسەبیەی خێلەتی کە لە میرنشینی باباندا ببوو بە عەقیدەیەکی ئیدۆلۆگی، باوەڕ بە نایەکسانی ئێتێنیکی بەخۆوە گرتبوو و بە ئاشکرا لەوەدا ڕەنگی دابووەوە کە هەستی بەرزکردنەوەی خەڵکی خێڵەتی و نزم کردنەوەی کوردی ناخێڵەتی تێدا دەچێندرا. لە کوردستانی خوارووداا بە مانەی دوایی دەگوترا "گۆران". لە ئەنجامدا ئێنۆنیمی گۆران بوو بە تیتۆڵێک بۆ گاڵتەپێکردن» (ڤاسیلڤا، ١٩٩٧: ٢٦٨).

### ئەنجامەکان:

لەم توێژینەوەیەدا توێژەر گەیشتۆتە چەند ئەنجامێک، کە دەکرێ لەم خالانەی خوارەوە کورتی بکەینەوە:

١- ڕاستە ئایینی "یارسان" ئایینێکی سەد لە سەد کوردی نییە، بەڵکوو فارس و تورکیش بە زمان و دەق بەشدارن لەم دینە، بەلام ئایین و زمان و کەلتووری کاکەییەکانی خوارووی کوردستان سەد لە سەد کوردییە. ئەم ڕاستییەش لە مێژووی سەرهەڵدان و سروشتی دەقەکان و زمانی دەقەکان و ناسنامەی نەتەوەیی کوردی پێشەوایانی ئەو ئایینە دەردەکەوێ.

٢- زمانی نەتەوە لە ئایینی کۆمەڵە ئەتنیکییەکاندا وەک ناسنامەیەک خۆی دەسەپێنێ. هەر ئایینێک چ بتپەرستی بێ، چ ئایینێکی نەتەوەیی بێ، ژێدەر و هاندەری ڕۆحی پاراستنی زمانی دایک و نەتەوەیە. لە قورئانیشدا لە چەند ئایەتێک ئاماژە بەوە کراوە، کە هەر نەتەوەیەک زمانی نەتەوەیی خۆی هەبووە و هەروەها پێغەمبەرەکەیان بە زمانی ئەوان پەیامی ئاسمانی پێڕاگەیاندوون. لەم ڕوانگەوە، هەرچەندە ئایینی یارسان نە بتپەرستییە نە یەکتاپەرستییە بە چەمکی ئیسلامی، بەڵام کارەکتەرە سەرەکییەکانی ئەم دینە لە چوار چێوەی ڕۆحانییەتی دینی ئاسمانی دەرنەچوون. بە شێوازێکی تر، کاکەییەکان فاکتەری «نەتەوە» و «زمانی نەتەوە»یان لە چوارچێوەی هەندێ کەسایەتی دینی وەک عەلی کوڕی ئەبووتالێب و سوڵتان سەهاک بەرجەستە کردووە. بەمەش ئایینێکی «نەتەوەیی-ئایینی»یان بۆ خۆیان دامەزراندووە.

٣- لە قۆناغی یەکەم (سەدەی دە و دوانزە) و قۆناغی دووەمی (سەدەی سێزدە و چواردە و پازدە) ئەدەبیاتی یارساندا زمانی «ئایین» و زمانی «نەتەوە» گەشەی کردووە. ئەو دوو قۆناغە تەواو چییەتی ئەو کۆمەڵە ئەتنیکییە-ئایینییە دەنوێنن.

٤- زمانی دەقەکان و هەروەها ناوی زۆربەی هەرە زۆری پێشەوا ئایینییەکان، جگە لە "عەلی کوڕی ئەبووتالیب"، بەڵگەن لەسەر کوردێتی کاکەییەکانی خوارووی کوردستان.

٥- لەم توێژینەوە ئەو ئەنجامەش قسەی لەسەر کراوە کە لاوازی ئایینی نەتەوەیی لەناو پێگەی دەسەڵات دەبێتە هۆی لاوازی زمانی نەتەوەیی لە دەسەڵات و ئەدەبیاتدا. زمانی دەقەکانی نووسراوە ئایینییەکانی کاکەیش بە ڕووخانی دەسەڵاتی ئەردەڵان و دروستبوونی دەسەڵاتی بابان لە سلێمانی بە تەواوی کز بووە و کرمانجی ناوەڕاست، کوردی هەتا شاعیرەکانی ناو هەورامانیشی ناچار کردووە بە هەورامی نەنووسن، بەڵکوو بە کرمانجی ناوەڕاست بنووسن.

**سەرچاوەکان:**

**١.** بۆرەکەیی، سەدیق (٢٠٠١) **کاکەییەکان و ڕێ و ڕچەکانیان**، سلێمانی.
**٢.** زەکی، ئەمین (٢٠٠٠) **خولاسەیەکی تاریخی کورد و کوردستان**، سلێمانی.
**٣.** ناوخۆش، سەلام (٢٠٠٦) **ئایین و زمانناسی**، هەولێر.
**٤.** خەزنەدار، مارف (٢٠٠١) **مێژووی ئەدەبی کوردی**-ب-١، هەولێر.
**٥.** ماکدۆل، دەیڤد (٢٠٠٣) **مێژووی هاوچەرخی کورد**، و.ئەبوبەکر خۆشناو.
**٦.** نەبەز، جەمال (١٩٧٦) **زمانی یەکگرتووی کوردی**، بامبێرگ.
**٧.** نیکیتین، باسیل ( ٢٠٠٤) **الکرد**، ت.نوری تالبانی، اربیل.
**٨.** نەبەز، جەمال (٢٠٠٥) **کوردانی سەرگەردان و برا موسڵمانەکانیان**، و.سوارە قەڵادزەیی، سلێمانی.
**٩.** سەجادی، عەلائەدین (١٩٥٢) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بەغدا.
**١٠.** مستەفاڕەسووڵ، عیزەدین (١٩٧١) **زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی**، بەغدا.
**١١.** شڤیلیع، ا.م.مینتیشا (٢٠٠٨) **کورد**، و.یزەدی مستەفا، هەولێر.
**١٢.** ڤاسیلیەڤا، ی.ئی (١٩٩٧) **کوردستانی خوارووی ڕۆژهەلات**، و.ڕەشاد میران، هەولێر.

# گوڵبژێرێک لە سروودە پیرۆزەکانی یارسان

ئەیوب ڕۆستەم کەریم*

**کورتە:**

یارسان، ڕێ و ڕچەیەکی دینی کوردییە و ڕەگەکانی لە نێو دینە ئارییەکانی وەک: میترائیزم و زەردەشتی جێگیر بوون. لەگەڵ یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی دینی هێندۆییش یەک دەگرێتەوە کە گوێزانەوەی ڕۆحە لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر و خۆیان بە «دۆناودۆن» ناوی دەبەن. هەروەها بە گەلێک قەناعەتی دینی پیرۆزی ئیسلام موتوربە کراوە. بەش بە حاڵی خۆم، لە نووسینەکانمدا وەک دینێکی سەربەخۆ باسی لێوە ناکەم، چوونکە لە ڕووی بابەتی «فقهی»یەوە لاوازە. گرنگترین بنەما و وردەکارییەکانی لە ناو کتێبە پیرۆزەکانیاندا بە شیعر و پەخشان خراونەتە ڕوو. لە دوو توێی ئەو کتێبانەدا سامانێکی گەورەی ئەدەبی و عیرفانی کوردی پارێزراون و شتگەلێکیش خراونەتە ڕوو کە بایەخی مێژوویی و کۆمەڵایەتییان هەیە. سروودەکانیان هەم لە ڕووی زمانی هۆنینەوەیان و هەم وەک ئەو کێشانەی کە لە سەریان هۆنراونەتەوە، هەر تەواو خۆماڵین و هیچ بۆن و بەرامەیەکی بێگانەیان پێوە دیار نییە. دەکرێت تێکستەکانی یارسان بکرێنە سەرچاوە بۆ ئەوداڵبوون بە دوای پێشینەی ئەدەبیو عیرفانی کوردیماندا و بە دڵنیاییەوە کەڵک و بایەخی خۆیان هەیە؛ چوونکە هەر هیچ نەبێت پێشینەیەکی ١٢٠٠ ساڵەیی و بگرە زیاتریشمان لەم بوارەدا بەدەستەوە دەدەن. دیارە ئێمەی کورد لەبەر ئەو بارودۆخە نالەبارانەی لە سایەی داگیرکاری و جەنگ و لەشکرکێشی بەردەوام بەسەرماندا سەپێنراون، تێکستی هاوسەردەمی تێکستەکانی یارسانمان نیین؛ ئەگەر هەشبن تا ئێستا نەکەوتوونەتە ڕوو. پێدەچێت زۆربەیان فەوتابن، یان لە پەنا و پەستۆی کەلاوە ڕووخاوەکانماندا بووبن بە ژێر تەپوتۆزی زەمانەوە و تا ئێستا دەرنەهێنراون و ئەو تەپوتۆزەیان نەتەکێنراوە. ئەم بابەتە هەوڵێکی دڵسۆزانەیە بۆ گەڕانەوە بۆ تێکستی خۆماڵی لە پێناو باشتر ناسینی خۆمان وەک گەلێکی خاوەن تایبەتمەندی کولتووری.

**وشەسەرەکییەکان:** یارسان، شیعری کوردی، سروود، سەرسپاردن، جەمبەستن.

---

* نووسەر و لێکۆڵەر.

## بەشی چوارەم - مێژوویی وێژە

### دەسپێک:

ڕێ و ڕچەی یارسان، ڕێ و ڕچەیەکی دینی کوردییە و پەیڕەوکارانی لە کوردستاندا زۆرن؛ بەڵام تا ئێستاش بەد حاڵی بوون و تێنەگەیشتنێکی زۆر لە لایەن خەڵکان بەگشتی و تەنانەت لای ژمارەیەکی زۆر لە نووسەران و ڕۆشنبیرانی کوردەوە سەبارەت بەم ڕێ و ڕچەیە هەیە. من لەم بابەتەدا نامەوێ داکۆکی ناڕەوا لە شوێنکەوتوانی ڕێ و ڕچەکە و ئەدەبەکەیان بکەم؛ بەڵکوو مەبەستمە بڵێم لە دوو توێی تێکستەکانیاندا سامانێکی گەورەی ئەدەبی و عیرفانیمان پارێزراوە؛ هەروەها چەندین بابەتی مێژوویی و هونەریش بە شێوەیەک لە شێوەکان قسەیان لێوە کراوە. ئەو بابەتانە لە ئەوداڵ بوون بە دوای پێشینەی کولتووریماندا سەنگ و قورسایی خۆیان هەیە. بە بڤە زانینیان زیانێکی زۆرمان پێدەگەیەنێت و نامۆ بوونێکی گەورە لەو پێشینەیە بەرهەم دەهێنێت. بەپێچەوانەشەوە، بایەخ پێدانیان بەرچاو و ڕوونی دەهێنێتە گۆڕێ و کاریگەری زۆری لە ناساندنی ناسنامەی نەتەوەییماندا دەبێت. بۆیە ئومێدەوارم ئەم هەوڵە وەک نیەتپاکی ئێمە بەرامبەر بە کولتووری کوردی وەربگیرێت، نە وەک شتێکی تر.

### سروود، یان شیعر:

سرووده پیرۆزەکانی یارسان هەموویان بە زمانی شیعر و بە کێشی خۆماڵی نووسراون. لە بەر ئەوەشە بە سروود ناو دەهێنرێن، چوونکە لە «جەم»[1]ە پیرۆزەکانیاندا لە لایەن جەمنشینانەوە لە سەر ئاوازی تەمبوور و بە شێوەی سروود و گۆرانی دەیانچڕن، دیارە هەر شیعرێکیش لە سەر ئاوازی مۆزێک و بە ڕیتمێکی مۆزیکی خوێندرایەوە، ئیتر وەک سروود، یان گۆرانی سەیر دەکرێت. هاوکات چەندین پەخشانی دینیشیان هەن کە بەلایانەوە پیرۆزی گەورەیان هەیە. من لەم بابەتەدا مەبەستم قسەکردنە سەبارەت بە هەندێک لە سروودەکان، هەروەک وتیشم بە زمانی شیعر نووسراون، بۆیە باشتر وایە لە پێناسەی شیعرەوە دەست پێبکەم.

### پێناسەی شیعر:

شتێکی ئاشکرایە ژمارەیەکی زۆر لە «بیریاران، شاعیران، فەیلەسووفان، ڕەخنەگران» لە سەردەمە جیاجیاکاندا هەریەکەیان لە دیدی خۆیانەوە پێناسەی شیعریان کردووە. من لە پێناسەکەی «ئیفلاتوون»ەوە دەست پێدەکەم. هەڵوێستی ناوبراو دەرهەق بە شیعر لەسەر بناغەی «تیۆری نموونەکان» (نظریە المثل) دامەزراوە، لەسەر ڕۆشنایی ئەم تیۆرەش سێ جیهان بۆ زانیاری ئادەمیزاد بەم شێوەیە دیاری کراون:

---

[1] - جەم: هەندێک کەس تا ئێستاش پێیانوایە جەم لە بنەڕەتدا وشەیەکی عەرەبییە و لە «جمع»ەوە هاتووە. لە ڕاستیدا جەم وشەیەکی ئاوێستاییە بە واتای کۆبوونەوە هاتووە. لە شارەزوور و هەورامانیشدا بە هەمان واتا بەکاردێت؛ بۆ وێنە دەوترێ هەموویان جەمن؛ یان دەوترێ ئەو ئەقڵی تەواو جەمە. جەم وەک ناوی کەسێ لە زۆربەی ئەو بەرهامانەدا کە باسی مێژووی ژیانی «بێشدادی و کیانی»یەکان دەکەن، لە جیاتی ناوی «جەمشید» هاتووە و هەروەها «جەم» لای هیندییە کۆنەکان یەکێکە لە خواوەندەکانی خواردنەوە.

١- جیهانی ئایدیا: بارەگای نموونەی بەرزی ڕاستی هەموو شتەکانە.

٢- جیهانی هەستپێکراو: شانۆی هەموو شتێکی مادییە و ئادەمیزاد بەیەکێک، یان زیاتر لە پێنج هەستەکەی هەستی پێدەکات و لێی تێدەگات.

٣-جیهانی سێبەر: ئەم جیهانە هونەرمەندەکان و هەستیارەکان بەهۆی هونەرە جوانەکانیانەوە دروستیدەکەن.

لەبەر تیشکی ئەم سێ جیهانە، ئیفلاتوون پێناسەی شیعری بەم شێوەیە کردووە:

شیعر، بریتییە لە لاسای کردنەوەی شتەکانی جیهانی هەستپێکراو. هەستیار لە هۆنینەوەیدا تەنها لاسایی ئەو شتانە دەکاتەوە (حەسەن عەزیز، ١٩٨٣).

ئەرستۆش لەپێناسەی شیعردا بە ڕواڵەت شوێن پێی ئیفلاتوونی مامۆستای هەڵگرتووە و لە کتێبی بیوتیکادا (هونەری شیعر) وتوویەتی: شیعر لاسایی کردنەوەی سروشتە[١].

لە قورئانی پیرۆزدا ناوی شیعر و شاعیران هاتووە، لەسەر ڕۆشنایی سوورەتی «الشعراء» شاعیرەکان کراون بە دوو دەستەوە وەک دەفەرمێت:

«والشعراء يتبعهم الغاوون الم تر انهم فی کل واد يهيمون، وانهم يقولون مالا يفعلون، الا الذين امنوا وعملوا الصالحات وذكروا الله كثيرا وانتصروا من بعدما ضلموا وسيعلم الذين ضلموا ای منقلب ينقلبون» (قرآن، الشعرا: 22).

ژمارەیەک لە زانایان و ڕەخنەگرانی دنیای ئیسلام دەربارەی شیعر و شاعیران کتێبیان نووسیوە، لەوانە:

کوڕی سەلامی ئەلجەمحی- کتێبێکی نووسیوە بە ناوی (طبقات الشعراء).

کوڕی قوتەیبەی ئەلدینەوەری[٢]- کتێبێکی نووسیوە بە ناوی (الشعر والشعراء).

---

[١] - لێرەدا پێویستە بڵێین کە کتێبی بیوتیکا لە ڕەخنەسازی جیهانیدا ڕۆڵێکی گرنگی گێڕاوە و ئەوروپییەکان لەسەدەی یانزەمی زایینییەوە لەرێی کورتکردنەوەکەی فەیلەسووفی عەرەبی «ابن الرشد»ەوەئەم کتێبەیان ناسیوە، «پرۆفیسۆر هەرمن» کتێبی (بیوتیکا)ی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی ئەڵمانی. هەروەها ساڵی ١٤٩٨ز لە شاری ڤینیسیا بەزمانی لاتینی لەلایەن «جۆرجیو بلا»وە بڵاوکراوەتەوە. ساڵی ١٥٠٨ز بەیارمەتی «جیۆڤانی سکاریس» بەزمانی یۆنانی لە چاپدراوە.

[٢]- کوڕی قوتەیبەی ئەلدینەوەری، ناوی عەبدولا کوڕی موسلمی دینەوەری ساڵی ٢١٣ک (٨٢٨ز) بە پێی هەندێک سەرچاوە لە بەغداد و بە پێی هەندێک سەرچاوەیتر لە کووفە لە دایکبووە. هەر لە منداڵییەوە خراوەتە بەر خوێندن. لە دینەوەر، بەغداد، کووفە و بەسرا خوێندوویەتی. یەکێک بووە لە زانا هەرە پایە بەرزەکانی سەردەمی خۆی و لە دەریای زانست و ئەدەبدا مەلەوانێکی کەم هاوتابووە. لەبەر ئەوەی کورد بووە و زۆر جار بە کوردی قسەی کردووە، ناحەزانی وتوویانە کەسێکی زەندیقە و بڕوای بە ئاوێستا هەیە. لە ماوەی ژیانیدا چەند کتێبێکی داناون و ناودارەکانیان ئەمانەن:
١- المعانی- لە دوانزە بەرگدایە ٢- التقضية- لە دوو بەرگدایە.٣- عيون الاخبار- لە دە بەرگدایە ٤- الشعر والشعراء- لە دووبەرگدایە. ٥- مشکل القران- شیکردنەوە و راڤەکردنی قورئانی پیرۆزە. ٦- تاويل مختلف الحديث ٧- المعارف ٨-ادب الکاتب ٩- عيون الاخبار ١٠- غريب الحديث. هەروەها چەند کتێبێکیتریش. ساڵی ٢٧١ ک (٨٨٤ز) لە بەغداد کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە کتێبی: «گەنجینەی فەرهەنگ و زانست»، لاپەڕە ٢٧٦-٢٧٩ نووسینی: محەممەد ساڵح ئیبراهیم محەممەدی. چاپخانەی «مهارت-تهران».

قودامە کوڕی جەعفەر؛ کتێبێکی نووسیوە بە ناوی «نقد الشعر» (حەسەن عەزیز، ١٩٨٣: ٩٩).

لەم بوارەدا «قودامە کـوڕی جەعفـەر» کـە یـەکێک بـووە لـە بیریـاران و ڕەخنـەگرانی ناسـراوی عـەرەب لەسەردەمی خۆیدا و ساڵی ٣٣٧ ک (٩٤٨ ز) کۆچی دوایی کـردووە، لـە کتێبەکەیـدا بـەم شـێوەی خـوارەوە پێناسەی شیعری کردووە: شیعر قسەکردنێکی کێش و سەرواداری و مانایەک دەبەخشێت.

«ڕامبۆ»ش کە هەر لەساڵی ١٨٣٧ز بە مەبەستی داهێنان و چەسپاندنی ڕێبازێکی نوێ لە شـیعردا، دەسـتی داوەتە بڵاو کردنەوەی بۆچوونەکانی، وتوویـوتی: جیهـانی شـیعر جیهـانێکی نوێیـە؛ هـیچ پەیوەندییـەکی بـە جیهانی بینراو و بیستراوەوە نییە. هەر لەدرێژەی دەربڕینەکەیدا هاتووە: هەرچەندە بوون و واقیـع سـەرچاوەن بـۆ هەسـتیار، بـەڵام هەسـتیار لەسـەری پێویسـتە شـتێک لـەو سـەرچاوەیە هەڵـبژێرێت کـە کەسـی تـر هەڵینەبژاردبێت.

«عەلائەدینی سەجادی» نووسیویەتی: «بەڵێ هۆنراو دەزگایەکە بۆ ئەوەی پیاو مانای لـە خەیاڵـێکی ناسـک پێبداتەوە و سۆزی خوێنەر وەکو کارەبا ڕاکێشێ». هۆنراوەش چەند جۆرێکە، لای فەڕەنسییەکان سـێ جـۆرن بەم ناوانە: «هۆنراوەی شەڕ و شۆڕ= ملحمە، شیعری گۆرانی= غنـائی، شـیعری لاسـایی کردنـەوە= تمثیلـی» و هەر جۆرێکیان چەند لق و پۆپێکیان لێدەبێتەوە (سەجادی، ١٩٥٢: ١٥٥).

### کۆنترین تێکستی شیعری کوردی:

سەبارەت بە مێژووی کۆنترین تێکستی شیعری کوردی د.سدێقی بۆرەکـەیی نووسـیویەتی: ئـەوەی ڕوون و ئاشکرایە پێش سەرهەڵدانی ئیسلام هۆنراوە بەزمانی کوردی هۆنراوەتـەوە و هـۆنراوەی کـوردیش سـەری بـە گەلێک دەرگادا کردووە. کتێبی «گاتاکان» -کە بەشێکە لە کتێبی ئاوێستا- هەمووی هۆنراوەیـە (بۆرەکـەیی: ٣٨-٣٩).

«ئـەنوەر مـایی» نووسـیویەتی: «د. بلـەج شـێرکۆ لـە یاداشـتەکانیدا باسـی ئـەوەی کـردووە، یـەکێک لـە خۆرهەڵاتناسان بە ناوی "فلیامینۆف" لە باکووری ئێراندا بەردێکی دەستکەوتووە دوو دێڕ شـیعری لەسـەر بـووە و مێژووی نووسینیان بۆ ساڵی ٣٣٠پ.ز گەڕاوەتەوە» (مایی: ١٩٦).

بە پێی نووسینەکانی ڕەشید یاسمی و د.سەعید خانی کوردستانیش، شیعری «هۆرمزگـان ڕمـان ...» کـە لە سـەر پارچـە چـەرمێک نووسـراوە و لـە «ئەشـکەوتی جێشـانە»ی نزیـک شـاری سـلێمانی دۆزراوەتـەوە، مێژووەکەی بۆ زیاتر لە١٤٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە، کۆنترین تێکستی شیعری کوردییە.

من وەک خۆم لە گوندی «سەرگەت» دێڕەشیعرێکم بەسەر کێلێکەوە خوێندوەتەوە و وێنەشیم گرتووە کە مێژووەکەی بۆ ١٢٩٦ سال لەمەو بەر دەگەڕێتەوە و نووسراوە:

ئەگەر مەزانی ئینە چی مەردەن      نازە ناخوونەش ئاودزش کەردەن

کەواتە لە هەموو حاڵەتێکدا دەتوانین مێژووی شیعری کوردی بۆ سەردەمێکی زۆر دێرینتر لەوەی تا ئێستا قسەی لێوەکراوە، دیاری بکەین.

**سەرچاوەکانی شیعری یارسان:**

یەکەم: سەرەنجام (سەرئەنجام)؛ ئەم کتێبە، کتێبی پیرۆزی یارسانەکانە. خۆیان بە «کەلام - کەلامی خەزانە»ش ناوی دەهێنن و بریتیە لە شەش بەش؛ یاخود دەتوانین بڵێین شەش کتێب بەم ناوانە:

١ **-بارگە بارگە:** دانەرانی ئەم بەشەی کتێبی پیرۆزی «سەرەنجام» سەرای «سانسەهاکی بەرزنجی، پیر بنیامین، سەیمیر ئەحمەد، سەیمستەفا، سەیئەبولوەفا، سەیشەهابەددین، سەیحەبیبشا، حاجی باوەیسی»، هەریەک لەگەورە ڕابەران و عاریفان و پەیڕەوەکارانی سەدەی هەشتەمی کۆچی (ڕێ و ڕەچەی یارسان»ن کە زۆربەیان خەڵکی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان و ژمارەیەکیشیان لە دەرەوەی کوردستانەوە هاتوونە هەورامان و بوون بە شوێنکەوتووی ڕێ و ڕەچەکە هەتا بە پلەی «پیر» گەیشتوون و چوونەتە ناو بازنەی ٧٢ پیرەوە. لەوانە: «پیر مکایەڵی دەودانی، پیر نالی مۆردێنی، پیر شەمسی عەلەمدار، پیر ڕوکەنەددین، پیر سمایەلی سیستانی، پیر قابیلی سەمەرقەندی، پیرتایەری ئەسفەهانی، پیر کەماڵی مامۆلانی، پیر ڕاستگۆی قەرەداخی، پیر تەقی شاهۆیی، پیر حەیدەری لوڕستانی، پیر نەڕە بالامۆیی، پیر ئەحمەدی لوڕستانی، پیر تاجەدینی فارس، پیر حوسێنی کاشانی، پیر مەحموودی بەغدایی، پیر ئەولعەزیزی بەسرایی، پیر ئیبراهیمی جاف، پیر سلێمانی ئەردەلانی، پیر خالق ئەردەبیلی، پیر مەنسووری شۆشتەری، پیر عیسای شقاقی، پیر حەیدەر کەڵ مەیدانی، پیر مالیکی گۆران، پیر ناسری بەختیاری، پیر عیسای پساکانی، پیر خەلیلی موسڵی، پیر جەعفەری کوردستانی، پیر هەمزەی بیری شایی، پیر حوسێنی ئەسەموڵی، پیر ئەلیاسی مۆریاسی، پیر فەیرۆزی هیندی، پیر ئەیازی مەغریبی، پیر نگا دارتانی، پیر قەمەرسەراو قوماشی، پیر تاماسپی کرمانی، پیر تەیمووری هەورامانی، پیر ڕەحمەتی بەمبەیی، پیر قوبادی دێوانە، پیر کازمی کەنگاوەری، پیر دانیاڵی داڵەهۆیی، پیر سەفەری قەلاجەیی، پیر مووسای میانەیی، پیر سووره هیندۆڵەیی، پیر سادقی مازیندەرانی، پیر نەعمەتی تەوەردار، پیر دلاوەری دەرەشیشی، پیر حەیاتی ماچینی، پیر قانوونی شامی، پیر حاتەمی هەمەدانی، پیر محەمەدی شارەزووری، پیر ناری هەورامی، پیر ئیسماعیلی کۆلانی، پیر نازداری شیرازی، پیر نەریمانی شاهۆیی، پیر تەیاری خۆراسانی، پیر عینوانی کەعبەیی، پیر ئەحمەدی گەنجەیی، پیر ئەحمەد بەرسایی، پیر نادر قەرەپاپاقی، پیر مامڵی مایدەشتی، پیرشالیاری هەورامی، پیر مەحموودی لوڕستانی، پیر نەجمەدینی فارسی، پیر نەقی تووکانی، پیر هاشمی ڕەژەوی، پیر مێردی هۆردینی، پیر بابا غەیبی هاواری، پیر فەتالی سەحنەیی، پیر عەزیزی هوانە، پیر ڕۆستەمی سو» (سەرەنجام: ٣١-٣٢).

٢ **-دەورەی هەفتەوانە** (=حەوتەوانە): ئەم بەشەی سەرەنجام بریتیە لە سروودی دە بڕگەیی، لە لایەن ژمارەیەک لە ڕابەران و پیرانی یارسانەوە؛ لەوانە: «سانسەهاکی بەرزنجی، پیر بنیامین، خەلیفە عەزیزی سلێمانی، خەلیفەمحەممەد، خەلیفە شاشا، خەلیفە شەهابەددین، خەلیفە باپیر، خەلیفە ئەمیر، خەلیفە جەبار، داودی کۆسوار، پیر مووسای دەفتەردار، خاتوو ڕەمزبار، شا ئیبراهیمی ئێوەت= مەلەک گەیار، یار زەردەبام=

باوا یادگار، سەی‌میر ئەحمەد، سەی باوەیسی، سەی‌حەبیب شا، سەی مستەفا، سەی ئەبولوەفا» و لە سەدەکانی حەوتەم و هەشتەمی کۆچیدا هۆنراونەتەوە (سەرەنجام: ۱۸۸).

۳-**گلێم و کۆڵ**: یەکێکە لە مەتنە مەعریفییەکانی سەدەی هەشتەمی کۆچی لە لایەن هەریەک لە «سان سەهاکی بەرزنجی، پیر بنیامین، داودی کۆسوار، سەی‌میر ئەحمەد، سەی‌مستەفا، سەی محەممەدی شارەزووری، سەی ئەبولوەفا، سەی شەهابەددین، سەی حەبیب شا، حاجی باوەیسی»یەوە هۆنراوەتەوە (سەرەنجام: ۳۱۰).

٤-**دەورەی چلتەن**: سرووده‌کانی ئەم بەشەش لە لایەن بازنەی چلتەن و ژمارەیەک لە گەورە عاریفانی یارسانی سەدەی هەشتەمی کۆچییەوە هۆنراونەتەوە؛ لەوانە: «سان‌سەهاکی بەرزنجی، پیر بنیامین، داودی کۆسوار، پیر مووسای دەفتەردار، ڕەمزبار، مستەفا دەودانی، یار زەردەبان= باوا یادگار، ڕۆجیار= شائیبراهیمی ئێوەت) (دەورەی چلتەن: ۳۹۱).

٥-**دەورەی عابدینی‌جاف** (عابدینی باشچاوەش): ئەم بەشە بریتییە لە ۳۱ بەند و بێجگە لە بابەتی دینی چەندین باس‌وخواسی سەبارەت بە کشتیاری و شێوازی بەرهەمهێنانی ئەو سەردەمە، سەبارەت بە پیکهاتەی کۆمەڵایەتی تیرەکان و ناوەکانیان لەوانە: «لوڕ، لەک، لۆلۆ، جاف، گۆران» بە شیعر قسەوباس کراون. هەروەها باسی گیای پیرۆزی «هوم» (hauma)[1] -کە لە ناو کوردەواریدا «سووم»ی پێدەوترێت- کراوە، هەروەها ناوی شاری «هۆرمزگان»[2]ی تێدا هاتووە (هەمان سەرچاوە: ٤۹۳).

٦-**وردە سەرەنجام** (کورتەی سەرەنجام): لەم بەشەدا باسی هەندێک بنەما و باو و بڕەوی دینی کراوە؛ لەوانە: «سەرسپاردن، جەم و جەمخانە، ڕۆژوو، قوربانی‌کردن، بەهاوسەر بوون، ناونانی منداڵ، باو و بڕەوی خۆشتن، مردوو شتن، نزای مردوو شتن و هتد» بە شێوەی شیعر و سروودی دینی کراون (هەمان: ٥٥۸-٥٥۲).

لێرەدا پێویستە بڵێین، **یەکەم**: هەموو بەشەکانی سەرەنجام بە شێوەزمانی «ماچۆ» نووسراون. تەنها «دەورەی عابدینی جاف» نەبێت کە بە شێوازی قسەکردنی جافەکانی دەشت و بناری ناوچەی شارەزوور هۆنراوەتەوە. ئەم شێوە قسەکردنەش زۆرجار لە سەرچاوەکاندا بە «هەورامی جافی» ناوی هاتووە. خوێندنەوەی سەرەنجام ئەرکی ڕابەرە دینییەکانی یارسانە و بەو کەسەش دەوترێت «کەلامخوێن».

---

[1] سەبارەت بە گیای (هوم) بە پێی سەرچاوەکان کاری خوڵقاندنی تەنی «زەردەشت» بە دوو «یەزد» سپێردراوە بەناوەکانی «ئەمرداد»(یەزدی ئاو) و «خورداد»(یەزدی گیاکان). ئەم دوو یەزدە پاش ئەوەی کاری خۆیان لە ئاسماندا تەواوکردووە باریونەتە سەرزەوی. تەنی زەردەشتیان لەناو ڕەگی گیادا چەقاندووە، پاش ئەوەی ئەو گیایە ڕواوە «پوروشەسپ»ی باوکی زەردەشت بەڕێنمایی «ئەمرداد و خورداد» شەش مانگای خۆی بردۆتە دەشت بەمەبەستی لەوەڕاندنیان. کاتێک مانگاکان لەو گیایەیان خواردووە گوانەکانیان پڕبوون لە شیر. «دەغدۆ»ی هاوسەری پورشەسپ مانگاکانی دۆشیون و هاوسەرەکەشی لە گیای «هوم»(Hauma) کە پێشتر بردوویەتییە ماڵەوە و ڕۆحی زەردەشتی تێداجێگیرکراوە و شیکردۆتەوە، وەراندویەتیە ناو شیرەکەوە و لەگەڵ دەغدۆ لێیانخواردۆتەوە، پاش ماوەیەک زەردەشت لە دایکبووە. بڕوانە کتێبی «تاریخ دەهزار سالە ایران، جلد اول» لاپەڕە ۷۰ نووسینی «عەبدولعەزیمی ڕەزائی».

[2] - شاری هۆرمزگان، یەکێک بووە لە شارە گەورە و قەرەباڵغەکانی شارەزوور و چەند ئاتەشگەیەکی تێدابووە. لە کاتی لەشکرکێشی ئیسلامدا بە تەواوی وێرانکراوە. بە پێی کتێبی سەرەنجام لە نزیک «موان»ی ئێستادا بووە.

**دووەم**: ئەو کتێبانەی بە دەورە ناو دەهێنرێن، وەک:
١-دەورەی بالوولی مایی (بالوولی ماهی).
٢-دەورەی باوا سەرهەنگی دەودانی.
٣-دەورەی شاخۆشێن (موبارەک شای لۆڕستانی).
٤-دەورەی باوا ناووسی جاف.
٥-دەورەی باوا جەلیل.
٦-دەورەی دامیار.
٧-دەورەی شاوەیقولی قرمزی.
٨-دەورەی پیر عالی.
**سێهەم**- ئەو کتێبانەی بە ناوی کەلامی نووسەرەکانیانەوە ناودەبرێن وەک:
١-کەلامی سەی خامۆش.
٢-کەلامی پەردیوەری[1].
٣-کەلامی شاتەیمووری بانیارانی.
٤-کەلامی زولفەقار (زولفەقاری گۆران[2]).
٥-کەلامی جەناب.
٦-کەلامی قالێد.
٧-کەلامی موجرم[3].
٨-کەلامی خان ئەڵماس.
٩-کەلامی ئێلبەگی جاف.
١٠-کەلامی حەیدەری.
١١-کەلامی نەورۆز (دەروێش نەورۆزی سۆرانی).
١١-کەلامی دەروێش ئاجاق.
ئەم کەلامانە هەموویان بە شێوەزمانی «ماچۆ» نووسراون و شیوازی نووسینی زۆربەشیان شـێوەی ئاخـاوتنی کۆنی خەڵکی هەورامانە. تەنها کەلامی دەروێش ئاجاق نەبێت کە بە زمانی تورکی نووسراوە.
**چوارەم**- ئەو کتێبانەی لای یارسانەکان بە «دەفتەر» ناو دەبرێن؛ وەک:

---

[1]- ئەم کتێبە بە «دەفتەری دەورەی زولاڵ»یش ناوی هاتووە.
[2]- لە گوندی «چناری کۆکۆیی» سەر بە قەزای هەڵەبجەی شەهید ئەشکەوتێک هەیە پێیدەوترێت ئەشکەوتی زولفەقار. ئەم ئەشکەوتە لە کانی ناو دێکەوە و بەشێوەیەکی نهێنی ئاوی بۆ ڕاکێشراوە. دەوترێت شوێنی کۆبوونەوە دینییەکانی ئەم زولفەقارە بووە.
[3]- موجرم، نازناوی شیعری "حاجی نیعمەتولای جەیحوون ئاوایی"یە.

١- دەفتەری شندرویَ.
٢- دەفتەری ساوا.
٣- دەفتەری دیوانە گەورەی پەردیوەری.
٤- دەفتەری ڕمووزی یارسان[١].
٥- دەفتەری گەواهی غولاَمان.

**پێنجەم**- ئەو کتێبانەی لە لایەن ژمارەیەک لە نووسەران و ڕۆشنبیرانی یارسانەوە نووسراون وەک:

١- سروودی دینی یارسان- خاوەنی ئەم کتێبە (ماشەڵا سووری) خۆی وەک نووسەر و وەرگێڕی کتێبەکە ناودەبات.
٢- شاهنامەی حەقیقەت (حق الحقایق): ئەم کتێبە بریتییە لە ١١١١٧ (یانزە هەزار و سەدو حەڤدە) دێڕە شیعر بە زمانی فارسی. نووسەرەکەی «حاجی نیعمەتوڵای جەیحوون ئاوایی»یە. ناوبراو یەکێک بووە لە ناودارانی گەورەی یارسان و بەرێبەرێکی دینی لەقەڵەم دەدرێت (مکری، ١٣٦٦). هەروەها چەندین کتێبی تریش.

## کاریگەری شیعری یارسان لە ئەدەبی کوردیدا:

ئەگەرچی لێرە و لەوێ ناوی چەند شاعرێک دەهێنرێت (وەک: عەلی تەرمۆکی، عەلی حەریری) کە گوایا لە سەدەی دەیەم و یانزەیەمی زاینیدا ژیاون، بەڵام ئەم زاتانە هیچ سامانێکی شیعری لە شوێنیان بەجێ نەماوە. ئەوەی تا ئێستا کەوتبێتە بەردەست، شیعرەکانی یارسانن کە مێژووەکەیان بۆ ناوەڕاستی سەدەی دووەمی کۆچی دەگەڕێتەوە و یەکەم کەسیش لەم بوارەدا «بالوولی ماهی»یە. بەڵگەکانیش دڵنیایی دەدەن کە شاعیرانی کورد، هەر لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە هەتا سەدەی پێنجەمی کۆچی، زۆربەیان لەسەر ڕێ و ڕەچەی یارسان بوون. بەشێوەیەکی سەرەکیش بەدوو دەستەوە بەم شێوەیە دابەش بوون:

دەستەی یەکەم: ڕابەران و پیرانی یارسان.

دەستەی دووهەم : شوێنکەوتوانی ڕابەران و پیرانی یارسان.

ئەمانەش ژمارەیان تەواو زۆرە، بەرهەمە شیعریەکانیان لە کتێبی پیرۆزی «سەرەنجام» و لە کتێبە دینییەکانی تری هەڵگرانی ڕێ و ڕچەی یارساندا بڵاو کراونەتەوە، من لێرەدا تەنها ناویان دەهێنم، ئەمەش ناوی ژمارەیەک لە عاریف و شاعیرەکانی هەڵگرانی ڕێ و ڕەچەی یارسانە:

بالوولی ماهی، باوا لوڕەی لوڕستانی، باوا ڕەجەبی لوڕستانی، باوا حاتەمی لوڕستانی، باوا نجوومی لوڕستانی، باوا سەرهەنگی دەودانی، باوا قەیسەری هەورامی، باوا سرنجی کەلاتی، باوا گەرچکی هەورامی، دایە تەورێزی هەورامی، موبارەکشا (شاخۆشێنی لوڕستانی)، جەلالە خانمی لوڕستانی، بابا تایەری هەمەدانی، فاتمە لوڕەی

---

[١] - لەشوێنێکی تری ئەم کتێبە و لە بابەتی «ئایا یارسانەکان نوڵەیرین» سەبارەت بە دامەزرێنەری ئەم ڕێبازە "محەممەدی کوڕی نوڵەیر" قەسەوباسمان هەیە.

گۆران[1]، لزا خانمی جاف، کاکە ڕەدائی لوڕستانی، سوڵتان چەلەبی، باوا بوزورگی لوڕستانی، باوا هندۆی هەورامی، باوا ناوسی جاف، دایە خەزانی سەرگەتی، قازی نەبی سەرگەتی، سان‌سەهاکی بەرزنجی، خاتوو دایراکی ڕەزبار، شائیبراهیمی ئێوەت، باوا یادگار، عابدینی جاف، نەرگز خانمی شارەزووری، شاوەیس‌قولی، خاتوون ڕەزبانووی دەرزیانی، کاکە عەرەبی هەورامی، کاکە ڕەحمانی دەرزیانی، کاکە پیرەی دەرزیانی، عالی قەڵەندەر، هەروەها ٧٢ پیر و خەلیفەکانی یارسان وەک: خەلیفە ئەمیر، خەلیفە جەبار، خەلیفە محەممەد، خەلیفە شەهابوددین، خەلیفە عەزیزی سلێمانی، خەلیفە باپیر، خەلیفە شاشا.

گرنگترین کاریگەریەکانی شیعری یارسان لە ئەدەبی کوردیدا دەتوانرێت لەم خاڵانەدا ڕیزبەند بکرێن:

١- دیاری کردنی مێژووی شیعری دێرین و بەجێ ماوی کوردی بە نیوەی یەکەمی سەدەی دووهەمی کۆچی.

٢- پاراستنی ناو و نازناو و بەرهەمی ژمارەیەکی زۆر لە شاعیرانی کورد بۆ ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵ.

٣- بەرهەم هێنانی سامانێکی گەورەی عیرفانی کوردی کە بەداخەوە ئێستاشی لە گەڵدا بێت زۆربەی ڕۆشنبیرانی کورد پێی نامۆن، هەر بۆ نموونە باس‌وخواس سەبارەت بە «وحدة الوجود».

٤- گێڕانەوەی کۆمەڵێک بابەتی مێژوویی لە ڕێی شیعرەوە؛ وەک باس‌وخواس سەبارەت بە «هوشەنگ و جەمشید و فەرەیدوونی پێشدادی، کەیقوباد و کەیکاوس و کێخوسرەوی کەیانی، تۆفانەکەی حەزرەتی نووح، حەزرەتی مەسیح، حەزرەتی محەممەد» (دروودی خودایان لەسەربێت). هەروەها باسی شاری هورمزگان و شاری شارەزوور و هتد (بەشی بارگە بارگە: ٤٨-٣٨). ئەم بابەتانەش توانای شاعیرانی کوردی یارسان لە خستنەڕووی بابەتە مێژووییەکاندا دەسەلمێنن.

## سروود و پەخشانە پیرۆزەکانی یارسان:

سەرچاوە و تێکستە پیرۆزەکانی یارسان زۆرن. پێشتر ئاماژەم بە ناوەکانیان داوە و ناچمەوە سەر ئەو باسە. بەڵام لێرەدا بە پێویستی دەزانم باس لەوە بکەم، ئەگەر کەسێک بیەوێت هەرچی زانیاری ناو ئەو هەموو تێکستانە هەیە بخاتە ڕوو، بە دڵنیاییەوە هەموو تەمەنی بەشی ئەو کارە ناکات و ناتوانێت ئەنجامی بدات؛ چوونکە لە لایەکەوە «وەدەست خستنی گشت سەرچاوە و تێکستەکان، لێکدانەوە و شیکردنەوە و ڕاڤەکردنیان» ئەرکێکی تەواو گرانە، لە لایەکی تریشەوە، ئەو کەسە پێویستە دەزگایەکی چاپ کردنی لە بەر دەستدا بێت؛ چوونکە سەرەڕای ئەوەی سەرچاوە و تێکستەکان زۆرن، هاوکات دووبارە بوونەوەیەکی زۆریان تێدایە کە سەبارەت بە هەندێک بابەت دەگاتە ڕادەی جوینەوە. زانیاری وا هەیە بە شێوەیەکی تەواو جیاواز لە یەکتر لە چەندین تێکستدا دووبارە بووەتەوە.

---

[1]- «سیسل جۆن ئێدمۆندز» پێی‌وایە ئەم خانمە هەمان «بیبی فاتمە»یە کە دایکی «بابا تایەری هەمەدانی» بووە (ئێدمۆندز: ١٧٠).

دێمەوە سەر ئەوەی ئەو سەرچاوە و تێکستانەی لای منن، ئەگەرچی زۆر شتیان سەبارەت بە ڕێ و ڕچەی یارسان تێدان، بەڵام لە ڕووی بابەتی «فقهی»یەوە لاوازن و شتێکی وەهایان تێدا نییە کە تینوویەتی بشکێنێت. هەر ئەوەش وای کردووە کە من لە نووسینەکانمدا وەک ڕێ و ڕچەیەکی دینی ناوی یارسان دەهێنم، نەک وەک دین. چوونکە کە باس لە دین دەکرێت پێویستە ئەو دینە خاوەنی بابەتی «فقهی» بێت، بە تایبەت ئەو بابەتانەی کە  بە ژیانی کۆمەڵ لە هەموو ڕووەکانیەوە و پەیوەندی لە ناو تاکەکانیدا پەیوەستن؛ نەوەک تەنها بریتی بێت لە خستنەڕووی «پەرجووی دینی، بابەتی مێژوویی، سروودی دینی، نزا و پاڕانەوە، ستایشی ڕابەران و گەورەپیاوانی دینەکە، شوێنی پیرۆز و هتد».

**ئەو سروودانەی مەبەستمە لەم بابەتەدا قسەیان لێوەو بکەم:**

**١- سروودی چۆنییەتی درووست بوونی دونیا:**

ئەم سرووده لە لایەن «خان ئەڵماسی لوڕستانی»یەوە هۆنراوەتەوە. ناوبراو کوڕی محەممەدبەگی لوڕستانییە و ساڵی ١٠٧٢ک لە لوڕستان لە دایک بووە و دانەری یەکێک لە کەلامەکانی یارسانە بە ناوی «کەلامی خانئەڵماس».

خانئەڵماسی لوڕستانی پایەیەکی گەورەی لای یارسانەکان هەیە، هەر بۆنموونە «زولفەقاری گۆران» لە دێڕە شیعرێکدا وتوویەتی:

| | |
|---|---|
| جە سەنەی هەزار سەد و سی و هەشت | خان ئەڵماس لوا ئۆ دلێ بە هەشت |

لەم سروودەدا تێڕوانینی یارسانەکان بۆ درووست بوونی دونیا خراوەتە ڕوو: یارسانەکان دەڵێن لە سەرەتاوە هیچ شتێک نەبووە. «مەولا» (خودا) دوڕ بووە لە ناو دەریا. لە گێژاوی دەریاوە هاتۆتە دەرەوە و دونیای هێناوەتە دی و ناوی خۆی ناوە «خاوەنگار». عەرش و کورسی درووست کردووە و ٧٢ هەزار ساڵ لە کەناری دەریا بەتەنها بووە. پاشان «جوبرەئیل»ی درووست کردووە بۆ هامڕازی خۆی. ئینجا فریشتەکانی تری درووست کردووە وەک: ئیزرائیل، میکایل، ئیسرافیل. کاتێک کە ویستوویەتی مرۆڤ درووست بکات فەرمانی داوە بە فریشتەکان خۆڵی کێوی «سەرەندیل»ی بۆ بهێنن؛ ئیزرائیل خۆڵەکەی هێناوە و شێلاویانە تا بووە بە هەویر؛ ئینجا لە شێوەی مەولا عەلیدا قاڵب داڕێژراوە و خاوەندگار (خوا) لە تەنی مەولا عەلیدا خۆی ئاشکرا کردووە. فریشتەکان هەموویان کڕنووشیان بۆبردووە. سروودەکە بریتیە لە ٣١ دێڕ. ئەمانەی خوارەوە چەند دێڕێکن لێی:

| | |
|---|---|
| حەفت دوونەن بەیان بۆڤاچان پێتان | تەحقیق بزانان مەعلووم بۆ لێتان |
| ئەوسا نەلەو بی، نە ئاریا بی | نەئەرش بی نە فەرش، جیهان دەریا بی |
| مەولا ڤە دوڕ بی دوڕ ڤە تەی دەریا | ڤە دوڕ بەر ئاما، جیهان کەرد مەهیا |
| ناو ڤێش نیا، ڤە خاڤەنگار | عەرش و قورش و فەرش، ئەوسا دا قەرار |
| هەفتاد هەزار ساڵ تاک و تەنیاو فەرد | نەڕووی دەلیاڤە چۆگان بازی کەرد |

| | |
|---|---|
| نە خاکی بیسات سازا جیبرائیل | تا بی ڤە هامراز خالقی جەلیل |
| ئەڤەڵ ئیجادکەرد چوار مەلەک هەر چوار | ئاسمان و زەمین ئەوسا دا قەرار |

**٢- سروودی سەر سپاردن:**

سەر سپاردن یەکێکە لە بنەما دینییە سەرەکییەکانی ڕێ و ڕچەی یارسان و بریتییە لە پەیوەندی بەستنی نێوان کەسێکی یارسان و دوو پێشەوای دینی. ئەو پەیوەندییە دوو لقە، لقێکی بە «پیر» و ئەویان بە «دەلیل»ەوە. بۆنموونە خودی سانسەهاک پیرەکەی بنیامین (پیرخدری شاهۆ) و دەلیلەکەشی «داود» بووە. لە ڕێ و ڕەسمی سەر سپاردندا ئەم شتانە ئامادە دەکرێن:

کەڵەشێرێک بەو مەرجەی تەمەنی لەشەش مانگ کەمتر نەبێت، لەگەڵ نیو مەن برنج و چارەکێک ڕۆنی ئاژەڵ بەنییەتی «سانسەهاک»؛ یەک گوێز بە نییەتی «پیر بنیامین»؛ دوو جامی گەورە ئاو بە نییەتی ئاوی کەوسەر؛ یەک چرا بە نییەتی داوود؛ چەقۆ بەنییەتی «مستەفا دەودانی»؛ شیرینی بە نییەتی شائیبراهیم؛ سکە بە نییەتی سەی محەممەدی گەورەسوار.

کەڵەشێر و برنجەکە لێدەنرێن لە جەمخانە پیر و دەلیلیش ئامادە دەبن و سەر سپاردنەکە بە جێ دەهێنرێت. پاش ئەوە ئیتر ژن و ژنخوازی لە نێوان سەرسپێرەکە و پیر و دەلیلەکەدا نامێنێت. چوونکە وەکو کوڕی خۆیان سەیری دەکەن. سروودەکە بریتییە لە ١٥دێڕ لەخوارەوە چەند دێڕێکیان دەنووسینەوە:

| | |
|---|---|
| گاڤێ بێ گاڤان بێ گاڤان گاڤێ | تاسەر نەسپارین کەردە ڤەلاڤێ |
| هەر سەرێ نەلەو ئەو حوزوری جەم | نەسوجدە ڤە دەست خەلیفە و خادم |
| بێ شک ئەو سەرە ڤە تۆمار نییەن | نە ڕۆژی حیساب ڤە شومار نییەن |
| تومار پیر موسا قەڵەم باقییەن | جەم چلانە بنیام ساقییەن |
| رەهبەر داڤدەن دەسی دامانگیر | تەگبیرچی باطن بنیامینی پیر |
| جۆز نە کەژنیژ نە عەرەق بنیام | ئاڤەرد ئەو جەم پەرێ سەرئەنجام |
| جەم نەدلی جەوز جەوز نە دلی جەم | نیازش زات بێ چهار کەس دەرهەم (سروودی: ٤). |

لەم سروودەدا گەورەیی سەر سپاردن لای یارسانەکان دەر دەکەوێت؛ سروودەکە باس لەوە دەکات چۆن «گا» بە بێگاوان بلاو و پەرتەوازە دەبنەوە، یارسانەکانیش ئەگەر سەر نەسپێرن، بە هەمان شێوەیان لێدێت. هەر سەرێک (کەسێک) لە ناو جەم ئامادە نەبێت و کڕنووش بۆ خەلیفە و خادەم نەبات، بێگومان ئەو سەرە (کەسە) لە ناو یارساندا تۆمار نییە و لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا بە یارسان ناژمێردرێت. لەم سروودەدا ناوی فریشتەکانی سانسەهاک هێنراوە و ئەرکەکانیان بەم شێوەیە خراونەتە ڕوو: پیر موسا: دەفتەردار؛ داود: ڕابەر؛ بنیامینیش پیری خاوەن تەدبیری «باطنی»یە.

**٣- سروودی ستایشی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبیتالیب:**

**بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە**

سەرەتا پێویستە کەمێک لە سەر کەسێتی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبیتالیب بوەستین. ئاشکرایە کەسێتی ئەم زاتە دوو لایەنی هەیە: یەکەمیان لایەنی مێژوویی و دووهەمیشیان لایەنی ڕۆحی. ئەوەی پەیوەستە بە لایەنە مێژووییەکەوە، کەم تا زۆر لە سەرچاوە و کتێبە مێژوویی و دینییەکانی دونیای ئیسلامدا باسی لێوەکراوە و تا ئاستێکی باش بۆ خەڵک ئاشکرایە. بەڵام ئەوەیان پەیوەستە بە لایەنە ڕۆحیەکەوە، چەندین شتی تێکەڵ کراوە و هەندێک جار ئەو شتانە لێکدانەوەیەکی ئەفسانەییان بۆ کراوە. هەر لێرەوە دەتوانین لایەنی یەکەمی کەسێتی ئەم زاتە بە لایەنی گشتی و لایەنی دووهەمیشی بە لایەنی تایبەت ناو ببەین. سەبارەت بە لایەنە گشتییەکەی مێژووی ژیانی ڕوون و ئاشکرایە و کورتەکەی بەم شێوەیە:

١- ساڵی ٦٠١ ز، واتە سی ساڵ پاش لە دایکبوونی حەزرەتی پێغەمبەری ئیسلام(د.خ) لە دایک بووە.

٢- ڕۆژی دووهەمی هاتنی سرووش بۆ حەزرەتیپێغەمبەر(د.خ) و لە تەمەنی دە ساڵیدا، پاش حەزرەتی خەدیجەی هاوسەری پێغەمبەر چووەتە سەر دینی پیرۆزی ئیسلام و پێشتریش هەرگیز بتپەرستی نەکردووە.

٣- نزیکترین کەس بووە بە حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) لە لایەکەوە کوڕی مامی و لە لایەکی ترەوە زاوای بووە، هاوکات پێغەمبەر پەروەردەی کردووە.

٤- وەچەی حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) لەسەر ڕووی زەوی لە ڕێی حەزرەتیعەلییە ماوەتەوە.

٥- لە سەردەمی ژیانی حەزرەتی پێغەمبەردا(د.خ) ئاڵای ئیسلام لە جەنگ و غەزەواتەکاندا حەزرەتی عەلی هەڵیگرتووە و لەو کاتانەشدا حەزرەتی پێغەمبەر(د.خ) ئامادە نەبووبێت، لەناو خانەوادەکەیاندا عەلی جێگرتووەتەوە.

٦- نزیکی حەزرەتی عەلی لە حەزرەتی پێغەمبەرەوە(د.خ) هاوشێوەی نزیکی هاروون بووە بۆ حەزرەتی مووسا.

٧-بەدەر لە پەیوەندی خزمایەتی، چەندین بەڵگە سەبارەت بە نزیکی ئەم دوو زاتە هەن، وەک ئەوەی کە پێغەمبەری گەورەی موسڵمانان فەرموویەتی: «انا مدینة العلم وعلی بابها: من شاری زانستم و عەلیش قاپییەکەیەتی». هەروەها لە شوێنێکی تردا فەرموویەتی: «من کنت مولاه فعلیا مولاه: ئەوەی من سەرۆکیم عەلیش سەرۆکیەتی».

٨- حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبیتالیب لە خوداپەرستی، دادوەری، ئازایەتی و بێفیزیدا کەم نموونە بووە و پاش خۆی بێجگە لە حەوت درهەم، هیچ سامانێکی لە شوێن بەجێ نەماوە (شبیبی،١٣٥٣: ٧٠-٦٩).

تا ئێرە سەبارەت بە لایەنی گشتی کەسێتی حەزرەتی عەلی شتێکمان ڕوون کردەوە، بەڵام سەبارەت بە لایەنی تایبەت، پێویستی بە زیاتر قسە کردن هەیە. شتێکی ئاشکرایە بە درێژایی مێژووی کۆن، ئەو کەسانەی کە پەیوەندی پتەو و ڕاستەوخۆیان بە خەڵکەوە هەبووە و تا ڕادەیەکیش سەرچاوەی بڕیار و دەسەڵات بوون، ئیتر ئەو دەسەڵاتە ئەگەر دینی، یا خود دەسەڵاتێکی زەمەنی بووبێت کەم تا زۆر، ڕاز و سەرگوزەشتەی ئەفسانەیی دراوەتە پاڵیان. لەم بوارەشدا حەزرەتیعەلی کوڕی ئەبیتالیب یەکێک بووە لەو کەسانە لە دونیای

ئیسلامدا چەندین ئەفسانەی جۆراوجۆر و لە دەیان قەبیلە و قوماش دراونەتە پاڵی. پێش ئەوەی بچینە سەر چەند ڕازێک لەوانە پێویستە قسە لەوە بکەین «سۆفیگەری ئیسلامی» سێ زنجیرەی هەیە و هەر سێ زنجیرەکەش دەست بەدەست دەگەنەوە سەر پێغەمبەری گەورەی ئیسلام. زنجیرەی یەکەمی «زنجیرەی ئاڵتوون (زنجیرەی ئالیبەیت) بە واتە زنجیرەی نەوەکانی حەزرەتی عەلییە.

پەیوەندی دونیای سۆفیگەری، پەیوەندییەکی ڕاستەقینەیە سەبارەت بە خۆشەویستی خودای گەورە و دوا قۆناغیشی توانەوەیە لە ناو ئەو خۆشەویستییە و گەیشتنە بە پایەی «بەقای دوای فەنا». حەزرەتی عەلی سەرقافڵەی ئەوانەیە لە ڕووی ڕۆحییەوە بەم قۆناغە گەیشتوون، هەر بۆیە لە ناو زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانەکاندا خۆشەویستییەکی لە ڕادەبەدەر بۆ ئەم زاتە هەیە. بەڵام بێئەوەی گەیشتبێتە ڕادەی بە خودا لە قەڵەمدانی، بەڵام ئەوانەی زیادەڕۆیی لە ڕادەبەدەریان سەبارەت بە پایەی ڕۆحی ئەم زاتە کردووە، سەدان ئەفسانە و ڕازیان داوەتە پاڵی. ڕازەکان هەندێکیان لە ڕووی ڕۆحییەوە لێوان لێون لە زیادەڕۆیی و گەیشتوونەتە ڕادەی ئەوەی ئەم زاتە بە خودا لە قەڵەم دراوە. خودی حەزرەتیعەلی لە ژیانی خۆیدا بە توندی بەرەنگاری ئەو کەسانە بووەتەوە بەم ئاکارەدا ڕۆیشتوون. یەکێک لەوانە «عەبدوڵای کوڕی سەبەء» بووە. زیادەڕۆیی بە پایەی ڕۆحی حەزرەتی عەلی و بە خوا زانینی لە لایەن ئەو کەسانەی بەم ئاکارەدا ڕۆیشتوون، بە پێی زۆربەی سەرچاوەکان لە سەردەمی ژیانی خۆیدا تیورێزە نەکراوە و تەنها لە چوارچێوەی دەربڕینەدا بووە. پاش کۆچی دوایی حەزرەتی عەلی چەندین گرووپی توندڕەو سەریان هەڵداوە کە هەموویان عەلییان بە خودا ناسیوە؛ لەوانە «شیعەی نوڵەیری[1]، شیعەی عەلەوی، قورمتییەکان و هتد».

هەر لە بواری ئەفسانەکاندا مینۆرسکی نووسیویەتی: عەلەوییە کوردەکانی ناوچەی دەرسیم کە لە زۆر شوێندا بە قزڵباش ناویاندەبرێت، پێیان وایە عەلی کە وەک خودا هاتووەتە سەر زەوی، بەو مەبەستە بووە کاری چاکە بکات، شێرە گەورەکەی خۆی داوە بە ڕووسەکان و نیشانەیەکی سەوزیشی داوە بە ئینگلیزەکان بۆ ئەوەی پێکەوە تورک لەناوبەرن.

هەر لەم بوارەدا باس لەوە دەکەین گوایا حەزرەتیعەلی لای مەسیحییەکان کەسێکی پیرۆزە و دەڵێن: خەڵکی ئیسپانیا بە «سان یاگۆ»[2] ناوی دەبەن و هەموو خەڵکانی تری مەسیحیش پێیدەڵێن «سان جۆرجیۆ»[3]. پەیڕەوکارانی سان یاگۆ ئەو خاچەی دەیکەنە ملیان لە شێوەی شمشێرە دوو فاقەکەی حەزرەتی-عەلی دایە؛ هەروەها پەیڕەوەکارانی سان جۆرجیۆش پەیکەری حەزرەتیعەلی لە شێوەی جەنگاوەرێکی دلێری شێر و ڕم بەدەست درووست دەکەن.

---

[1] - لەشوێنێکیتری ئەم کتێبە و لە بابەتی «ئایا یارسانەکان نوڵەیرین»، سەبارەت بە دامەزرێنەری ئەم ڕێبازە "محەممەدی کوڕی نوڵەیر" قسەوباسمان هەیە.

[2] -سانیاگۆ یەکێک بووە لە هاوڕێیانی حەزرەتیعیسا وساڵی ٤٤ز کوژراوە. فەڕەنسییەکان پێی دەڵێن «سانجاک».

[3] -سان جۆرجیۆ یەکێک بووە لە نەجیبزادەکانی ڕۆمی کۆن، چووەتە سەر دینی مەسیحی و ساڵی ۳۰۳ز کوژراوە.

پاش ئەم چەند دێڕەی سەرەوە کە سەبارەت بە کەسێتی گشتی و تایبەتی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبی تالیب نووسران، دێینە سەر ئەوەی زۆربەی بۆچوونەکانی ئەوانەی زیادەڕۆییان لە پایەی ڕۆحی حەزرەتی عەلیدا کردووە (وەک شیعەکانی نوڵەیری، عەلەوی، ئیسماعیلی، قورمتییەکان و هتد) لە سەر ئەوە کۆکن کە:

١-حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبیتالیب کەسێکی پیرۆزە و بە مورتەزا عەلی ناوی دەبەن.

٢-خودا سرووشی (وەحی) بە حەزرەتی جوبرائیل داوە بۆ حەزرەتی عەلی بهێنێت، گوایا ئەو لێی تێکچووە و داویە بە حەزرەتی محەممەد(د.خ).

٣-خەلافەت پاش پێغەمبەری گەورەی ئیسلام(د.خ) مافێکی هەقی حەزرەتی عەلی بووە، بەڵام لێی زەوت کراوە.

٤-هەریەک لە حەزرەتی ئەبووبەکری سدیق، حەزرەتی عومەری کوڕی خەتاب، حەزرەتی عایشەی کچی ئەبووبەکر و هاوسەری پێغەمبەر(د.خ)، لە پاش لە دونیا دەرچوونی پێغەمبەرەوە هەمیشە بۆ حەزرەتی عەلی لە بۆسەدا بوون و نەیانهێشتووە هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵبکێشێت.

٥-هەندێک لە دەسەڵاتدارانی قوڕەیش کە هەر لە سەرەتای بانگهێشتی پێغەمبەرەوە(د.خ) هەتاکوو ئازاد کردنی مەکە بە توندترین شێوە دژایەتی پێغەمبەر و دینەکەیان کردووە و پاشان بە ناچاری ئیسلامی بوون. پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(د.خ) ویستوویانە لە ناو ئیسلامدا دەسەڵاتی کۆنەیان زیندوو بکەنەوە و هەمیشە بۆ پاراستنی بەرژەوەندییەکانی خۆیان هەوڵیان داوە، حەزرەتی عەلی دژی ویستی ئەوانە بووە و هەمیشە پشت و پەنای هەژاران و نەدارانی ئیسلام بووە و ویستوویەتی باری ژیان و گوزەرانیان باش بکات. لە بواری پشتیوانی هەژاراندا چەندین فەرموودەی بەناوبانگی هەیە، وەک ئەوەی فەرموویەتی: «لو کان الفقر رجلا لقاتلتة بسیفی: ئەگەر هەژاری پیاوێک بوایە بە شمشێرەکەم لە گەڵیدا دەجەنگام»؛ ئەمەش خۆی لە خۆیدا هاندانی هەژارانی دونیای ئیسلام بووە بۆ ئەوەی دژی سەردەستەکانیان ڕاپەڕن، هاوکات هەڕەشەیەکی جیدی بووە بۆ سەر دەسەڵاتی بەرژەوەندی پارێزەکان، هەر بۆیە بە هەموو شێوەیەک دژایەتییان کردووە.

یارسانەکان پێیان وایە یەکەم مرۆڤ کە خودای گەورە لە خۆڵی کێوی سەرەندیل ئافەریدەی کردووە، عەلی کوڕی ئەبیتالیبە، بەڵام لە جەستەی «ئادەم»دا. ئالێرەدا ڕۆحانییەت و جیسمانیەت پێکەوە موتوربە کراون. کاتێکیش لە دونیا دەرچووە ڕۆحی چووەتە ناو خۆر و خۆر هیچ جووڵەیەک ناکات هەتا فەرمان لەم زاتەوە وەرنەگرێت؛ وەک چۆن میترائییەکان پێیان‌وایە خۆر خودی خودا نییە، بەڵکوو خودایەک هەیە لە ناو خۆردایە، یارسانەکانیش بە هەمان ئاکاداردا دەڕۆن، لەم بارەشەوە دێڕە سروودێکیان هەیە کە سەلمێنەری ئەم بۆچوونەیە و دەڵێ:

نامێما میهر، نامێما میهر　　　نە قولەی ئەلەست نامێما میهر

ئەمانەی خوارەوەش چەند دێڕێکن لە سروودی ستایشی حەزرەتی عەلی:

ئەوەڵ ئاخر یار ئەوەڵ ئاخر یار　　　بوانەم پەنای ئەوەڵ ئاخر یار

یار یەعنی مەولام ساحیب زولفەقار ئۆستادی ئەزەڵ جە بەڕ تا بە بار
میعماری کەونێن سەما سێ و چوار سەمای چوار مەلەک پەیکی پەیخام ئار
یەک لۆمە نووری وەرا نام خۆوەر قەراردا نەڕووی سەما چون گۆهەر

**٤ - سروودی جەم و جەمبەستن:**

جەم لای یارسانەکان زۆر پیرۆزە و بۆ هەر مەبەستێک ببەسترێت، باو و بڕەوی خۆی هەیە. بۆ هەر ئەرکێکی دینییان کە پێویستی بە کۆبوونەوە بێت (وەک: جەژن، نیازکردن، سەرسپاردن) جەم دەبەستن. جەمیش چ وەک ئەو جێگایەی تێیدا دەبەسترێت، چ وەک کۆبوونەوە کە لە هەموو تێکستە پیرۆزەکانیاندا بایەخی دراوەتێ و قسەی لێوەکراوە، بۆ نموونە: لە سروودی تەڵقینی مردوودا «جەم» بە پەناگە و جێگەی چاکان لە قەڵەم دراوە. وەک لەم دێڕانەی سروودی جەمدا هاتووە:

قیبلەی یارانەن، قیبلەی یارانەن جەم کەعبەی شەریف قیبلەی یارانەن
جەم غەزەب بەخشان ڕەحمەت ڤارانەن جەم یۆرت کردار نیاز دارانەن
جەم یەعنی مەسجید یاری یارانەن جەم حەلی موشکیل مەتڵەب دارانەن (سووری: ١٥٦).

لە سروودی تەڵقینی مردووشدا پیرۆزی جەم لای یارسانەکان بەم شێوەیە خراوەتەڕوو:

پەناگەش هەیبەت جەم ڕاسانەن جەم مەکانی هەق ڕاگەی خاسانەن (سووری: ٢٠٤).

خودی سان‌سەهاکی بەرزنجی بە شێوەیەک باسی جەمی کردووە گوایا کڕنۆشگەی یارانە و شوێنی یارانی چاکەکارە. هەر کەسێکیش لەوێدا دەستەو داوێنی ئەو بێتەوە ئەوە لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا دیارە؛ چونکە یەکێکە لە یارانی ڕاست.

ئەمەش دەربڕینەکەی سان سەهاکی بەرزنجییە:

هەر کەس نە جەمدا نە بیرۆ ئەرکان وە راست بگێرۆ دامان سوڵتان
ئانە حەقیقەت مێرد یاریەن جە رۆژ حساو وە دیاریەن.

یەکەم جەمیش لای یارسانەکان ئەو جەمە بووە سان سەهاک لە پەردیوەردا بەستوویەتی. هەموو یارسەکانیش لە سەر ئەو ڕایەن هەموو جەمێک نموونەی هەمان جەمی سان سەهاکە.

**٥ - سروودی ستایشی «باوا یادگار» و پاڕانەوە لێی:**

سەبارەت بە لە دایک بوونی باوا یادگار ڕازێک هەیە کە یارسانەکان بە یەکێک لە پەرجووە دینییەکانی خۆیانی دەزانن، کورتەی ڕازەکە بەم شێوەیە:

پیر مکایەڵی دەودانی پاش ئەوەی دەبێت بە موریدی سان سەهاکی بەرزنجی و سەری پێدەسپێرێت، کچێکی خۆی بە ناوی «شارا» دێنێ بۆ خزمەت کردنی سان سەهاک. ڕۆژێک «شا ئیبراهیمی ئێوەت» کە هێشتا منداڵ بووە، دارێکی بە دەستەوە بووە. سان سەهاکی بەرزنجیش دارەکەی لێوەرگرتووە و داویەتە دەستی «پیر ئیسماعیلی گولان». ئەویش لە باخی تازەدا ناشتوویەتی. دارەکە سەوزبووە و بووە بە دار هەنار و

هەنارێکی گرتووە. بەری هەنارەکەیان بردووە بۆ «سان سەهاک» و ئەویش فەرمانی داوە کە جەم ببەستن و ئەوەش یەکەم جەم بووە کە لە «پەردیوەر» بەستراوە. لەو جەمەدا بەری هەنارەکەیان هێناوە بۆ بەردەم سان سەهاک بەمەبەستی «نیاز». پاش خوێندنەوەی «نزا» لە لایەن «سەی محەممەدی گەورەسوار»ەوە، هەنارەکە لە لایەن داودەوە بەسەر جەمنشیناندا دابەش کراوە. پاش تەواو بوونی جەمەکە، شارا هاتووە بۆ جەمخانە بە مەبستی گسک دانی؛ دەنکێک هەنار -کە لە جەمخانەدا بووە- خواردوویەتی و پاش ماوەیەک سکی پڕبووە. پاشان دەنگوباسی سکپڕیەکەی لە ناو خەڵکدا بڵاو بووەتەوە و زۆر بە خراپی باسی لێوە کراوە. شارا لە ڕێی دەمیەوە کوڕێکی بووە. سان سەهاکی بەرزنجی بە داودی وتووە کە ئەو منداڵە بخاتە ناو تەنوورێکی ئاگرەوە و سەری بنێتەوە. پاش سێ ڕۆژ خۆی چووە بۆ لادانی سەری تەنوورەکە و دەستبەجێ منداڵەکە هاتووەتە زمان و سڵاوی لێکردووە. ئەم دێڕانەی خوارەوە بەشێکن لە سروودێکی دینی کە باسی ئەو سەرگوزەشتەیە دەکات:

یادگار یار ئەوسا بیش ڤهور          پەرێ نیشانە نیاش نەتەنوور
نیاش نە تەنوور نە شەرارەی نار          فەرما وە داود سەر تەنوور بنیار
سێ رۆژ سەبرش کەرد داود رەهبەر          نیازش وەرگرد ئاما ئەو نەزەر
فەرما وە داود نە عەینم باوەڕ          دیش ئاما وە سەر پادشای پەردیوەر
یادگار جە تەنوور هۆرێزا ئەو پاە          وە لەفزی شیرین سەڵام دا وە شاە
بەرگی خودڕەنگی کەرد وە خەڵاتش          تەمام کوردستان کەرد وە بەراتش

من کارم بەوەوە نییە ئەم ڕازە تا چ ڕادەیەک جێی باوەڕە، بەڵام ئەوە دووپات دەکەمەوە کە یارسانەکان بە یەکێک لە پەرجووە (موعجیزە) دینییەکانی خۆیانی دەزانن.

«باوا یادگار» بە پێی باوەڕی یارسانەکان، یەکێکە لە بازنەی «حەوتتەن» (حەوتتەنی جاویدان) کە لە سەرانسەری تەمەنی دونیا ڕۆحیان لە گەڕاندایە و لە چەند دوونێکدا دەردەکەون، وەک لە شیعرەکانی خۆشیدا دەردەکەوێت ڕۆحی ناوبراو لە ئەنجامی دوناودوندا چەندین جەستەی دیوە. لە دونێکدا حەزرەتی یووسف بووە وەک لەم دێڕانەدا دەردەکەوێت:

نوور ئیمان بیم نوور ئیمان بیم          یادگارەنان نوور ئیمان بیم
یوسف فەرزەند پیری کەنعان بیم          حوسنی کە داشتم مەولا میهمان بیم
کاکام ئیبراهیم مالک بی ئاما          تاجر باشی بی دەرم کەرد نەجا

هەروەها لە چەند دۆنێکی تردا جەمشیدی جەم و سیاوەشی کیانی و لە سەردەمی ژیانی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبیتالیبدا، حەزرەتی حوسێنی کوڕی عەلی بووە؛ وەک لە سروودەکەدا دەردەکەوێت:

یادگاری یار، یادگاری یار          دەخیلەن ئامان یادگاری یار
یا زاتی زاتپاک سەرداری سەرکار          نازی ناز رەواج ژە پەروەردگار
چلانەی چل تەن سەبز پۆش نوورپۆش          سەرانەی باقی تێژ هۆشی تێژ گۆش

| | |
|---|---|
| ڕەواجی هەر دین سەر هەڵقەی شاهان | جەمشید جەم بەن شۆن بەری راهان |
| ئێرجی یەحیا سیاڤەحشی کەی | حوسێنی شەهید نە کەربەلا تەی |
| عالی قەلەندەر تاهیر قەلەندەر | هەنی چێش واچوم پوری ئەسکەندەر |
| یادگار دەخیل تۆ تاجی شاهی | تۆ تاجی تاجبەخش جیهان نمایی |
| یادگار وەهەق سوڵتانی سەرجەم | وە ئیسمی سوڵتان سەد هەزاران کەم |
| وەهەق داود ڕەهبەرەن وە نوور | وە هەقی عیسا، مووسا کۆهی توور |
| وە شای بەزەمل پیری ڕەنگینەن | پیر ئەو شاهەن ئیسمش سەنگینەن |
| مەتڵەبی حاجەت فارغ ڕەوا کەر | وە ساحیب کەرەم سوڵتانی سەروەر |

شایانی وتنە لای شاعرێکی وەک شێخ ڕەزای تاڵەبانی، جۆرە بەدحاڵی بوونێک سەبارەت بەم زاتە هەیە، بەڵام مەولەوی تاوەگۆزی کە دەچێتە سەر مەزارەکەی لە گوندی سەرانە، بەمشێوە دەیلاوێنێتەوە:

| | |
|---|---|
| سەرشار سەهبای بەزم مناجات | مەلجەء ئیلتیجای ئەرباب حاجات |
| جای ڕجای جەرگەی پادشا و دەروێش | بارەگا و پەنا پەی بیگانەو خوێش |
| شکۆفەی وەشبۆی رەیحانەی رەسوول | نەوباوەی نەمام تەیبەی بەتوول |
| تۆ چون جە ئەولاد ئەمجاد مەولای | پەی رەجا وەجا, پەی هیمەت ئەولای |

# میژوونووسیی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا:
کێشە میتۆدۆلۆژیکەکان و بەرەو مۆدێلێکی پۆلێنکراو

د. بەختیار سەجادی [-]

**کورتە:**

میژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا لە بەر چەندین هۆکاری جیاجیا (وەک جۆراوجۆری ئەو زاراوانەی دەقە ئەدەبییەکانی پێ نووسراون و دابڕانی ناوچەکان لە یەکتر چ لە سەردەمی میرنشینەکان و چ لە سەردەمی مۆدێرندا و بەرهەمهاتنی هاوکاتی چەندین شێوازی ئەدەبی بە زاراوە جیاجیاکانی زمانی کوردی) رووبەڕووی چەندین کێشە بۆتەوە. گرنگترین کێشەی میژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا بریتییە لە: نەبوونی مۆدێلێکی گشتگیر و پۆلێنکراو و بە بێ‌کێشەی میتۆدۆلۆژیک بە مەبەستی لە خۆ گرتن و خوێندنەوەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی سەرجەم زاراوە و قۆناغە جیاجیاکانی ڕەوتی گەشە کردنی ئەدەبی کوردی. جگە لەمەش، ڕەچاو نەگرتنی میتۆدۆلۆژییەکی زانستیانە و شێوازێکی بابەتیانە لە میژوونووسی ئەدەبی کوردیدا، بۆتە هۆی سەرهەڵدانی چەند خاڵێکی لاوازی تر لەو بەرهەمانەدا وەک بە کارهێنانی زمانێکی زەینی و نابابەتیانە و بایەخدانی لە ڕادەبەدەر بە لایەنی ئەخلاقی ــ ژیاننامەیی، بە شێوەیەک کە لە مۆرکە زانستییەکان دووری خستوونەتەوە. ئەم وتارە سەرەتا هەوڵ دەدات گرنگترین کێشە میتۆدۆلۆژیکەکانی ئەو بەرهەمانە بخاتە ڕوو کە هەوڵی میژوونووسی ئەدەبی کوردییان داوە؛ هەر بۆیە ڕوانگەکانی سێ کتێبی «میژووی ئەدەبی کوردی»، بەرهەمی «مامۆستا عەلائەدین سەجادی»، «ئانتۆلۆژیا ئەدەبیاتا کوردی» بەرهەمی نووسەری ناوداری کورد «محەمەد ئوزون» و«میژووی ئەدەبی کوردی»، بەرهەمی «مارف خەزنەدار»، بۆ میژوونووسی ئەدەبی دەخرێنە بەر هەڵسەنگاندن. هەروەهاش، خوێندنەوەیەکی ڕەخنەگرانە بۆ بەرهەمی «الواقعیە فی الادب الكردیە»، نووسینی «عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ» ئاڕاستە دەکرێ کە ناڕاستەوخۆ پێوەندی هەیە بە لێکۆڵینەوە لە میژووی ئەدەبی کوردییەوە. پاشان، وتارەکە تیشک دەخاتە سەر ئاڕاستە کردنی مۆدێلێک بۆ میژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا بە شێوەیەک کە نەک هەر دەورە و قۆناغ و شێوازە

---

[-] مامۆستای زانستگای کوردستان.

**کۆمەڵە وتاری ئەدەبی کوردی**

جیاجیاکانی ئەدەبی کوردی لە خۆ بگری، بەڵکوو جیاوازییە زاراوەناسانەکانیش لە ڕێگەی گرێدانیان بە شیوازە ئەدەبییەکانەوە ڕەچاو بکات و گرنگیش بداتە ژانرە ئەدەبییە نوێکان لە ئەدەبی کوردیدا. ئەم مۆدێلەی کە وتارەکە ئاڕاستەی دەکا، لە لایەکەوە ئەدەبی کوردی دابەش دەکات بە سەر چەندین قۆناغ و دەورە و شێوازدا و لە لایەکی تریشەوە لە شیکاری هەر شێوازێکدا پشت دەبەستێتە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی فۆرم و ناوەرۆکی بەرهەمە بەرچاوەکانی ئەو قۆناغە.

**وشە سەرەکییەکان**: مێژوونووسیی ئەدەبی، دەورە و قۆناغ و نەریتی ئەدەبی، شێوازناسی، ژانری ئەدەبی، فۆرم و ناوەڕۆک، میتۆدۆلۆژی مێژوونووسی ئەدەبی، مۆدێلەکانی مێژوونووسی ئەدەبی، زاراوەکانی زمانی کوردی، مێژوویی‌خوازی نوێ.

## بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە

### پێشەکی:

ئەم وتارە لە دوو بەشی سەرەکی پێکهاتووە: لە بەشی یەکەمدا هەوڵ دەدرێ ئەو کتێبانەی کە سەبارەت بە مێژووی ئەدەبی کوردی یان ڕەهەندێکی پێوەندیدار بە مێژووی ئەدەبی کوردییەوە بەرهەم هاتوون، بخرێنە بەر هەڵسەنگاندنێکی ڕەخنەگرانەوە. ئەم بەرهەمانەش بریتین لە: «مێژووی ئەدەبی کوردی» نووسینی مامۆستا عەلائەدین‌سەجادی؛ «ئانتۆلۆژیا ئەدەبیاتا کوردی» بەرهەمی نووسەری ناوداری کورد محەمەدئوزون و «مێژووی ئەدەبی کوردی» نووسینی پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار. هەروەهاش ئاماژە بۆ چەند بەرهەمێکی تری پێوەندیدار بە مێژووی ئەدەبی کوردییەوە دەکرێ کە بریتین لە: «الواقعیه فی الادب الکردیه (ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا)» بەهەرمی پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ و «لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە» نووسینی پ.مارف خەزنەدار. ئەگەرچی هەندێ بەرهەمی تر لە سەر مێژووی ئەدەبی کوردی نووسراون، بەڵام لەوێوە کە زۆر کۆنن و یاخود دەوری سەرچاوەیان گێڕاوە بۆ ئەو بەرهەمانەی سەرەوە و یان هەندێکیان بە تەواوی لە مۆرکە زانستییەکان بەدوورن، هەر بۆیەش لەم وتارەی بەردەستدا هەر تەنیا لەو بەرهەمانەی سەرەوە دەکۆڵدرێتەوە.[1]

پاشان، لە بەشی دووهەمدا هەوڵ دراوە تایبەتمەندییەکانی مۆدێلێک بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا ئاراستە بکرێ کە لە لایەکەوە هەڵگری ئەو کێشە مێتۆدۆلۆژیکانە نەبێ کە لەو بەرهەمانەی سەرەوەدا بەدی دەکرێن و لە لایەکی تریشەوە، قامک دەخاتە سەر جۆرێک لە ڕوانگەی تیۆریک بۆ خوێندنەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی کە بەو پێیە خاڵە نادیارەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی پێ بخوێندرێتەوە. ئەم مۆدێلە لە لایەک سەرجەم لایەن و قۆناغەکانی پەرەسەندنی ئەدەبی کوردی لەخۆ دەگرێ و لە لایەکی تریشەوە، هەوڵی پۆلێنکاری بەرهەمە جیاجیاکانی مێژووی ئەدەبی کوردی دەدات بە شێوەیەک کە مۆرکە شێوەیی و تایبەتمەندییە شێوازناسانەکانی هەر قۆناغێک دەخاتە بەرچاو.

بەشێکی زۆر لە گرنگایەتی گرتنەبەری وەها لێکۆڵینەوەیەک دەگەڕێتەوە بۆ ئەو واقیعەی کە تەنانەت لە قۆناغی هەنووکەییشدا، ژمارەی لەو بەرهەمانەی لە سەر مێژووی ئەدەبی کوردی دانراون، هەم زۆر کەمن و هەم بۆ ئاستە جیاوازەکان نەنووسراون. گەر سووکە ئاوڕێک لە پەڕتووکخانەی بەشەکانی ئەدەبی ئینگلیزی لە زانستگاکاندا بدەینەوە، تێدەگەین کە گەلێک زۆرن ئەو کتێبانەی دەربارەی مێژووی ئەدەبی ئینگلیزی و بۆ ئاستە جیاجیاکان لە سەرەتاییەوە تا دوا ئاستی ئاکادیمیک نووسراون. بەڵام لە ئەدەبی کوردیدا سەرجەم ئەو

---

١. چوار بەرهەمی کلاسیک و پێوەندیدار بە مێژوی ئەدەبی کوردییەوە کە بۆخۆیان دەوری سەرچاوەیان گێڕاوە بۆ بەرهەمە دواییەکان و لەم وتارەدا ناخرێنە بەر هەڵسەنگاندنەوە بریتین لە:

- ئەمین فەیزی بەگ،(١٩٢٠)، ئەنجومەنی ئەدیبانی کورد، ئەستەنبۆڵ، چاپی ترجمان حقیقت.
- عەبدولکەریم هەکزی،(١٩٣٨)، کۆمەڵە شعری شاعرانی کورد، سلێمانی.
- عەلی کەمال باپیر،(١٩٣٩)، گوڵدەستەی شوعەرای هاوعەسرم، سلێمانی.
- ڕەفیق حیلمی،(١٩٤١ )، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی یەکەم، بەغداد.

کتێبانەی لە سەر مێژووی ئەدەبی کوردی نووسراون لە ژمارەی قامکەکانی هەر دوو دەست تێپەڕ نابن و لە ئەدەبی کوردیدا، هێشتا بۆ قۆناغە جیاجیا فێرکارانەکان و تەمەنە جیاجیاکان مێژووی ئەدەبی کوردی بەرهەم نەهاتووە.

### ئا. خوێندنەوەی ڕەخنەگرانەی بەرهەمە ناوبراوەکان:

#### ١ - مێژووی ئەدەبی کوردی، نووسینی م. عەلائەدین سەجادی

یەکێک لە گرنگترین سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەدەبی کوردی، کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی بەرهەمی «مامۆستا عەلائەدین سەجادی»یە کە یەکەم جار لە ساڵی ١٩٥٢ و لە دوو توێی ٦٣٢ لاپەڕە لە چاپ درا و پاشان لە ساڵی ١٩٧١دا بە خستنەسەری زیادەیەکەوە دووبارە لە چاپ درایەوە. ئەم کتێبە هەر لە سەرەتای دەرچوونیەوە تاکوو ئێستا بەردەوام وەکوو یەکێک لە سەرچاوە جێ‌متمانەکانی لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەدەبی کوردی چاوی لێکراوە. ئەگەر یەکەم خوێنەرانی ئەم کتێبە لە سەرەتای دەرچوونیەوە بریتی بوون لە ئۆگرانی ئەدەبی کوردی و بە تایبەت توێژەرانی ئایینی لە حوجرە و ناوەندە ئاینییەکانی کوردستاندا، ئەوەتا ئەم کتێبە لە سێ دەیەی ڕابردوودا بۆتە یەکێ لە سەرچاوە سەرەکییەکانی وانەی مێژووی ئەدەبی کوردی لە ناوەندە زانستی و زانکۆییەکاندا.

کتێبی ناوبراو لەم وتارەی بەردەستدا لە دو ڕوانگەی جیاوازەوە دەخرێتە بەر هەڵسەنگاندن: یەکەم، خاڵی هەرە گرنگ سەبارەت بەم کتێبە و زۆربەی سەرچاوەکانی تری مێژووی ئەدەبی کوردی ئەوەیە کە ئەم کتێبانە پشتیان بەستۆتە هەندێ دەستنووس و سەرچاوەی تر کە ئەوانیش بۆ خۆیان لە لایەکەوە هەڵگری زانیاری تەواو دروست دەربارەی ژیاننامەی ئەدیبەکان نین و لە لایەکی تریشەوە، هەر کامەیان بە شێوەیەک دەقە ئەدەبییەکانیان تۆمار کردووە. هەربۆیەش زانیاری ژیاننامەیی دەربارەی شاعیرانی کورد لەم کتێبەدا چەندین جار لە لایەن ڕەخنەگرانەوە خراوەتە بەر هەڵسەنگاندن و باشترین نموونەش ئەو زانیارییە تازانە بوو کە لەم ساڵانەی دواییدا لەسەر ژیانی «نالی» خرانە ڕوو؛ بە شێوەیەک کە تەواو جیاوازن لەوەی لە کتێبی ناوبراودا ئاماژەیان بۆ کراوە.[1]

بە هەڵەدا نەڕۆیشتین گەر بڵێین تەنانەت تاکوو ئەمڕۆش ئێمە خاوەنی پێڕستێکی کامڵ لە سەر ئەدیبانی کورد و بەرهەمەکانیان نین کە هەڵگری ئەو زانیاریانە بێ کە هەموو ڕەخنەگران لە سەری کۆک بن و هەر ڕۆژەو بە دۆزینەوەی دەستنووسە تازەکان هەندێ زانیاری دروستترمان بۆ دەستەبەر دەبێ کە دەخرێنە پاڵ زانیارییە کۆنەکان. خستنە بەرباسی چۆنیەتی گەڕان بە دوای شێوەی ئەسڵی بەرهەمە ئەدەبییەکاندا و وڵامدانەوەی ئەم پرسیارە کە ئاخۆ کام دەق زیاتر لە شێوە و ناوەڕۆکی دەقە ئەسڵییەکەوە نزیکە، پێوەندی

---

[1] بۆ نموونە، لە کاتێکدا لە کتێبی ناوبراودا ساڵی لە دنیاچوونی "نالی" بە ١٨٥٥ دانراوە، لە کتێبە تازەکاندا ئەم ڕێکەوتە بە جیاوازی نزیکەی بیست ساڵ ئاماژەی بۆ کراوە. بڕوانە بۆ جیاوازیی زانیارییەکان لە "عەلائەدین سەجادی"، مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپی دووەم. بەغداد: چاپخانەی مەعاریف، ١٩٧١، ل. ٢٤٠ و، مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی سێیەم، هەولێر: دەزگای ئاراس، ٢٠٠٣: ٤٤.

هەیە بە ئاقاری زانستی «ڕەخنەی ژێنێتیک» (genetic criticism) و ڕەخنەی دەقاودەق و لێکۆڵینەوەی بەراوردکارانەی دەقە ئامادەکانەوە (textual criticism). ئەم دوو بۆچوونە ڕەخنەییە دەتوانن گەلێک سوودبەخش بن لە پێناو دەستەبەر کردنی شێوە و ناوەڕۆکی ڕەسەنی دەقە ئەدەبییە جیاجیاکانی مێژووی ئەدەبی کوردی کە بە داخەوە لای ئێمە نەک هەر گەشەیان نەکردووە، بەڵکوو تەنانەت گرنگیشیان پێ نەدراوە.

گرنگترین خاڵ لە هەڵسەنگاندنی کتێبی ناوبراودا بریتیە لە کێشە مێتۆدۆلۆژیکەکانی ئەم کتێبە. ئەم بەرهەمە مێتۆدۆلۆژییەکی سونەتی لەمەڕ مێژوونووسی ئەدەبی ڕەچاو کردووە. جگە لە بەشە سەرەتاییەکانی ئەم کتێبە کە هەڵگری زانیارین لە سەر کورد و کوردستان و زمانی کوردی، بەشەکانی تری ئەم کتێبە، جگە لە دواهەمین بەشی، تەنها باسی ژیاننامەی نووسەرانی کردووە. نووسەر ژیاننامەی هەر شاعیرێکی سەرەتا بە زمانێکی سەرواداری هونەری و شاعیرانە دەست پێکردووە و ئەمەش بەرهەمی ناوبراوی لە بابەتێتی (objectivity) دوور خستۆتەوە. زمانی دەقێکی زانستی دەبێ بابەتیانە و زانستی بێ و شیعر هۆنینەوە سەبارەت بە بابەتی بەرباس یان بەکارهێنانی زمانێکی شاعیرانە لە لێکۆڵینەوە زانستییەکاندا مۆرکی وردبینی و بابەتێتی لەو بەرهەمە دەسێنێتەوە. بۆ نموونە، لە پێشەکیی ژیاننامەی «سالمی سنە» (١٩٠٩-١٨٤٥)دا دەنوسێ: «هاوڕازی ئاواز سۆزی بەربەیان، بە یادی پیری دەستەی عەودالان، جارجار تریفەی مانگ و مانگەشەو، لە سای سەهەنا پیاو ئەکاتە خەو. ئەویان بە رایەڵ شێخانی دانا، ئەمیان لە بێنی کیژی سەربانا. لە باغچەی سەرای شیعردا نەمامی بنەماڵەی مەردۆخی، لە دەریای بێ بنی ئەدەبدا مەلەوانی سەر ڕۆخی. گاهێ مەفتوون بووە بە چاوی چاوکاڵا[ن]، پاشان گەڕاوەتەوە لای شێخی بەرماڵان...» (سەجادی، ١٩٧١: ٣٩٨).

هەر وەک دەبینرێ، نووسەر زمانێکی زەینی و نابابەتیانە و هونەری و سەرواداری بۆ وەسف کردنی ئەم شاعیرە بە کار هێناوە و تێیدا ناچار بووە لە هەندێ دەستەواژەی گشتی و باو وەک «دەریای بێ بنی ئەدەب» و «تریفەی مانگ و مانگەشەو» کەڵک وەربگرێ. جگە لەمەش، نوسەر گرنگییەکی زۆری داوەتە هەندێ لایەنی شەخسی شاعیران؛ بۆ نموونە، لە باس کردن لە ژیانی «مەلای جەباری»دا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە ئەو شاعیرە زۆری حەز لە جگەرەکێشان بووە و پاشان لە وەسفی سەر و سیمایدا دەنووسێ: «سەید فتاح پیاوێکی باڵابەرزی باریکەلەی سەرزل بووە، دەم و چاوی درێژکار و چاو و برۆی ڕەش بووە. برژانگ کورت و چاو زۆر گەورە نەبووە، گەنم ڕەنگ و گۆناکانی قوپا بوون، ڕیشە تەنکە سپیەکەی قەڵەم ئەکرد، سمێڵ و چەناگەی درێژ بوون، کەوا و سەڵتە و لبادەی لەبەر ئەکرد و جامەدانەی ئەبەست بە سەرەوە. عەباشی هەبوو، لە قسە کردندا خێرا بووە، تووڕە تەبێعەت و زوویش هێمن ئەبووەوە» (سەجادی، ١٩٧١: ٣٠٩).

ئەگەرچی ئەم زانیاریانە دەتوانن سوودبەخش بن لە پێناو وێنا کردنەوەی سیمای مەلای جەباری، بەڵام کێشەکە لەوەدایە کە لە سەرتاسەری ئەم کتێبەدا هێندە بایەخ دراوەتە ئەم جۆرە زانیاریانە کە ئیدی گرنگایەتی لێکۆڵینەوە فۆرمالیستییەکان لە سەر بەرهەمەکان خراوەتە پشت گوێ. بە واتایەکی تر، بایەخ دانانی زۆر بە لایەنی ئەخلاقی-ژیاننامەیی لەم بەرهەمەدا باسەکانی لە مۆرکە زانستییەکان دوور خستۆتەوە.

ئەم جۆرە مێژوونووسییە بۆ خۆی جۆریک لە پارادایمی بیر کردنەوە و لێکۆڵینەوەی دروست کردووە کە بەو پێیە لێکۆڵینەوە ڕەخنەگرانەکان و بەکارهێنانی بۆچوونە ڕەخنەییەکان لەسەر بەرهەمەکان بە تەواوی فەرامۆش دەکرێن و لەجیاتیان بایەخ دەدرێتە کەسایەتی و سەر و سیما و شێوە ژیانی شاعیرەکان و گەر پەلیش بۆ لێکۆڵینەوەی بەرهەمەکان بهاوێژرێ، ئەوەتانێ تەنها گرنگی دەدەنەوە مانا کردنەوەی شیعرەکە و لێکدانەوەی مەبەستی شاعیر لە دانانی ئەو بەرهەمە.[1] هەر بەو پێیەش، کەمتر بایەخ دراوەتە لێکۆڵینەوەی شێوازناسانەی ئەو بەرهەمانە و تەنها بە هێنانەوەی چەند نموونە شیعرییەک و شەرح کردنیان (واتە: مانا کردنەوەی کۆپلەکان) بابەتی بەرباس ڕوو لە کۆتایی دەکات. گرنگترین کێشەی مێتۆدۆلۆژیکی کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی نووسینی عەلائەدین سەجادی بریتیە لەوەی کە لەم کتێبەدا سەرجەم شاعیر و نووسەرە کوردە سەردەم و شوێنە جیاجیاکان هەر هەرهەموویان وەکوو گشتێتییەک و بە بێ ڕەچاو کردنی جیاوازییە زاراوەناسانە و شێوازناسانەکان  بە دوای یەکدا ڕیزکراون. بۆ نموونە، ئەگەر سێ شاعیری یەکەمی بەرباسی ئەم کتێبە، واتە، «باباتاهیری هەمەدانی، مەلای جزیری و بێسارانی» لە بەر چاو بگرین، تێدەگەین کە گەلێک جیاوازی جیاجیا لە نێوان ئەم سێ شاعیرە لە ئارادیە و جگە لەمەش پێشینە و پێشزەمینە مێژوویی و جوگرافیایی و تەنانەت ئەدەبی و فەلسەفییەکانیشیان بە تەواوی لێک جیاوازن؛ کەچی لە کتێبی ناوبراودا هەموویان بە دوای یەکدا و بە بێ سەرنجدان بەو جیاوازیانە بەدوای یەکدا ڕیز کراون. لەم خشتەیەی خوارەوەدا بە کورتی ئاماژە بۆ ئەم جیاوازیانە دەکەم:

| ناوی شاعیر | شوێن | کات | شێوەزار | قالبی ئەدەبی | حوکمداری |
|---|---|---|---|---|---|
| **باباتاهیر** | هەمەدان | سەدەی پێنجەم | لوڕی | دووبەیتی | سەلجووقیەکان |
| **مەلای جزیری** | جزیر | سەدەی دەیەم؟ | کرمانجی ژووروو | غەزەل | خالدییەکان |
| **بێسارانی** | بێساران | سەدەی یانزەهەم | گۆرانی | جووت سەروا | ئەردەڵانەکان |

کەواتە، وەک دەبینرێ، سێ شاعیری جیاواز لە سێ سەردەم و شوێنی جیاوازدا و لە ژێر دەسەڵاتداریێتی سێ حوکمداریێتی جیاوازدا و ئاخێوەری سێ زاراوەی جیاواز و سێ جۆر بەرهەمی ئەدەبیی جیاواز هەر هەموویان وەکوو کۆیەکی یەکگرتوو و یەکدەست بە دوای یەکدا باس کراون.  ئەم جۆرە ڕوانینە کە لە ڕوانگەیەکی نەتەوەخوازی پەتییەوە سەرچاوەی گرتووە، باوەڕی بە مێژووی یەکدەست و یەکگرتووی ئەدەبی کوردی هەیە. هەر ئێستاکەش زۆرن ئەو بەرهەمانەی کە قایل بە هیچ جۆرە جیاوازییەک لە نێوان پاژە

[1] یەکێکی تر لە گرنگترین خاڵە لاوازەکانی لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکان لەم کتێبە و لە زۆربەی بەرهەمە کوردییەکاندا بریتیە لە گرنگیدان بە مەبەستی نووسەر لە دانانی شیعری بەر باس. بۆ ئاگاداری لەم جۆرە خاڵە لاوازە  لە توێژینەوە ئەدەبییەکاندا بڕوانە بۆ:

Wimsatt, William K. and Monroe C. Beardsley. “The Intentional Fallacy.” *Sewanee Review*, vol. 54, 1946, pp. 468-488. Revised and republished in *The Verbal Icon: Studies in the Meaning of Poetry*, University of Kentucky Press, 1954, pp. 3-18

جیاجیاکانی کۆی مێژووی ئەدەبی کوردیدا نین. ئـەم جـۆرە روانینـە، لـە لایـەکـی تریشـەوە، دەرئـەنجـام و دەرکەوتەی ئەو تایبەتمەندییە فەرهەنگییەیە کە تێیدا بەردەوام مۆرک و جیاوازییە تاکەکەسییەکـان لـە پێنـاو بەرژەوەندی کۆییدا دەخرێنە پەراوێزەوە. جگە لەمەش، بڕوا هەبوون و گرنگیدان بە سووژەیەکـی یـەکپارچـەی کوردی، لە بیر کردن و فەرامۆش کردنی جیاوازییە بنەڕەتییەکانی زەینیـەتی سـووژەی کـوردی بـە دواوەیـە. ئەمەش ئەو زەینیەتەیە کە لەم جۆرە بەرهەمانەدا هەوڵ دەدرێ لە ڕێگـەی هێژێمـۆنی ئـەدەبی و هونـەری و بەردەوامەوە ڕەواڵەتێکی یەکپارچە بگرێتە خۆی. هەر لەم پێناوەشدایە کە دوابەشی کتێبی ناوبراو تەرخـانکراوە بۆ بەراوردکارییەکی گشتی و رووکەشیانە لە نێوان ئەدەبی کوردی لە لایەکـەوە و ئـەدەبی نـەتـەوەکـانی تـر وەک: چینی و هندی و ڕۆمانی و یۆنانی و میسری و هتد لە لایەکـی تـرەوە. مـەبـەسـتی سـەرەکـیش لـەم هەوڵانە ساز کردنی جۆرە شوناس و ناسنامەیەکی نەتەوەیـی یـەکـدەسـتە کـە تێیـدا سـەرجـەم بـەرهـەمـە ئەدەبییەکان پەیڕەوی لە یەک جۆر جیهانبینی دەکەن و هەر هەموویان بـە دوای یـەک ئایدیالـدا دەگـەڕێـن. ڕەنگە نموونەی هەرە زەقی ئەم بەرهەمانە مێژووی ئەدەبی کوردی عەلائەدین سەجادی بێ کە تێیـدا شـاعیرە جیاوازەکان بە بێ ئاماژە کردن بۆ ئەو پێشزەمینە جیاوازانەی تێیدا گەشەیان کردووە، خراونەتە بەر بـاس و بـە داوی یەکدا و وەک ئەندامانی یەک جەستەی یەکگرتوو ڕیز کـراون. لـەم کتێبـەدا شـاعیرانی کـورد، کـە بـە باباتاهیرەوە دەست پێدەکەن و بە فایەق بێکەسەوە کۆتاییان پێ دێ، بە بێ ڕەچاو کـردنی جیاوازییـە جیاجیـا زەقەکان، بە دوای یەکدا ڕیز کراون و تەنها بایەخ دراوەتە چۆنیەتی کەسایەتی و لایەنی کەسانیی ئەو شـاعیرانە و چەند نموونەیەک لە بەرهەمەکانیشیان شەرح و مانا کراونەتەوە. بەداخەوە، سەرەڕای تێپـەڕبـوونی زیـاتر لـە نیوسەدە بە سەر چاپ بوونی ئەم کتێبەدا نەک هەر قامک نەخـراوەتـە سـەر کێشـە مێتۆدۆلۆژیکـەکـانی ئـەم بەرهەمە، بەڵکوو تەنانەت هەر ئێستاکەش لە زانستگاکانی کوردستانی عێراقدا وەکوو سـەرچـاوەی سـەرەکـی وانەی مێژووی ئەدەبی کوردی چاوی لێدەکرێ و مامۆستایان وەکوو وانە دەیڵێنەوە.

## ٢- ئانتۆلۆژیا ئەدەبیاتا کوردی، بەرهەمی محەمەد ئۆزون

کتێبی ئانتۆلۆژیا ئەدەبیاتا کوردی، بەرهەمی نووسەری ناوداری کورد، محەمەد ئۆزون، یەکەم جار لە ساڵی ١٩٩٠دا و لە دوو توێی دوو بەرگدا لە تورکیا هاتە وەشاندن. پاشان لە ساڵی ٢٠٠٣دا و لە یەک بەرگدا بۆ جاری دووەم چاپ کرایەوە. لەم کتێبەدا ئاماژە بۆ ١٠٤ نووسەر و شاعیری کورد کراوە و چەند نموونە بەرهەمێک لە هەرکامەیان بڵاو کراوەتەوە. لێرەدا هەوڵ دەدرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا گرنگترین کێشە مێتۆدۆلۆژیکەکانی ئەم کتێبە بخرێتە بەر دەست:

١- لەم کتێبەدا هیچ جۆرە نەزم و تەکووزییەک لە بابەتەکاندا ڕەچاو نەکراوە. ئەگەر لە کتێبەکەی عەلائەدین سەجادی‌دا لانیکەم ناوی شاعیران بە پێی بەرودوای زەمانی ڕیزکراوە، لە کتێبەکەی محەمەد ئۆزوندا نەک هەر ئەمە ڕەچاو نەکراوە، بەڵکوو لە پێڕستی کتێبەکەدا ناوی نووسەران و شاعیرانی هەموو پارچەکانی کوردستان بەبێ هیچ جۆرە پۆلێنکارییەک بە دوای یەکدا ڕیزبەندیکراوە. ئەمەش بە شێوەیەک کە لە ناوەڕۆکی ئەم کتێبەدا لە پڕێکدا لە شاعیرەوە بۆ نووسەر و لە شاعیرێکی کۆنەوە بۆ نووسەرێکی نوێ و بە

پێچەوانەشەوە و پاشان لەم پارچەی کوردستانەوە بۆ ئەو پارچەکەی تر بابەتەکان دەگۆڕدرێن. بە گشتی هیچ جۆرە نەزمێک لەم کتێبەدا بەدی ناکرێ، نە نەزمی زەمانی، نە نەزمی ژانری و نە نەزمی جوگرافیایی.

٢- هەندێ لە ژیاننامەکان، محەمەد ئۆزون نووسیونی و هەندێکی تریشیان چەند نووسەرێکی گەنجی کورد نووسیویانە. ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەمەیە کە نە لەوانەی نووسەردا و نە لەوانەی هاوکارانی نووسەردا هیچ جۆرە قاڵبێکی یەکدەست ڕەچاو نەکراوە؛ بە شێوەیەک کە هەندێ لە ژیاننامەکان کورتن و هەندێکیان درێژ، هەندێکیان لە ڕواڵەتی چاوپێکەوتندان لەگەڵ نووسەر یان شاعیری بەرباس و هەندێک لە بەشەکانیش بە بێ ژیاننامەن. لەسەرجەم ژیاننامەکاندا تەنها بە شێوەیەکی دووبارەیی باسی ئەوە کراوە کە نووسەر لە کوێ لە دایک بووە و لە کوێ خویندوویەتی. ئەمەش بە بێ بچوکترین ئاماژە بۆ جیهانبینی و کاریگەرییە فیکری و ئەدەبییەکان لە سەر شاعیر و نووسەری بەرباس یان بە بێ بچوکترین ئاماژەیەک بۆ شێوازناسی بەرهەمەکان.

٣- لە سەرتاسەری ئەم کتێبەدا، جگە لەو پێشەکییە گشتییەی نووسەر بۆ کتێبەکەی نووسیوە، بچووکترین ئاماژەیەک بۆ پێشینیە سیاسی و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتیەکانی ئامادە لە ڕەوتی بەرهەمهێنانی دەقەکاندا و یان گەشە کردنی شاعیراندا نەکراوە.

خاڵێکی تری جێگەی سەرنج و تێڕامان سەبارەت بەم کتێبە ئەوەیە کە نەک هەر بەرهەمەکان پۆلێن نەکراون و باس لە جیاوازییە جیاجیاکان نەکراوە، بەڵکوو تەنانەت بە پێچەوانەشەوە، نووسەر هەوڵیداوە هەموویان لە پێناو یەک مەبەستدا و لە ژێر یەک وتەزای دیاریکراودا ڕێکبخات؛ وێڕای ئەمەش، وەک چۆن لە پێشەکی کتێبەکەیدا دەڵێ، سەرجەم بەرهەمە ئەدەبییەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی سەر بە یەک ڕێباز و یەک ئامانجن:

«پێشکێش‌کرنا یەکەتیا زمان و ئەدەبیاتا کوردی، نیشاندانا ئەدەبیاتا نۆژەنا کورد، مرۆڤ دکارە ببێژە کە هەدەفا یەکەمینا ڤێ یانتۆلۆژیێ بوو. ژبەر ڤێیە کێ مە فەرق نەخست ناڤبەرا جەلەبێن ئەدەبیاتێ و شیعر، سەرپێهاتی، چیرۆک، پارچەنە ژ ڕۆمانان، شانۆ، جەرباندن هەموو بە هەڤرە، دە ئانتۆلۆژیێ دە جێە گرتن». (ئۆزون، ٢٠٠٣: ١٠).

ئەو قسانەی سەرەوە و بەتایبەت دەستەواژەی «یەکەتیا زمان و ئەدەبیاتا کوردی» دەربڕی ئەو ڕاستییەن کە نووسەر پێی وایە سەرجەم لقوپۆوە جیاجیاکانی ئەدەبی کوردی لە جۆریک لە هاویەکێتیدان و مەبەست و ئامانجی هەمووشیان هەر یەکێک بووە. لەم ڕووەوە، هاوشێوەییەکی سەرنجڕاکێش هەیە لە نێوان ئەم کتێبە و بەرهەمەکەی عەلائەدین سەجادی؛ چوونکە لە هەردووکیاندا هەوڵدراوە جۆرە یەکێتییەک لە کۆی ژانر و قۆناغە جیاجیاکانی ئەدەبی کوردیدا سازبکرێ. ئەگەرچی لە درێژەی ئەم قسانەدا ئاماژەش بۆ ئەوە دەکات کە ئیدی کاتی ئەوە هاتووە ئەم بەرهەمانە لێکدی جیا بکرێنەوە و هەر کامەیان بە پێی وتەزایەکی دیاریکراو و تایبەتمەند پۆلێن بکرێن؛ بەڵام لە درێژەی هەمان پێشەکیدا و دیسانەوە بە هۆی ڕوانگەی نەتەوەخوازی پەتییەوە و هەوڵدان بۆ یەکدەست کردنەوەی سەرجەم میراتی ئەدەبی کوردی، پێشنیاری ئەوە دەکات کە پێویستە بەرهەمی ئەو نووسەرە کوردانەی بە کوردی نانووسن بێنە وەرگێڕان و لەم ئانتۆلۆژیەدا بڵاو بکرێنەوە.

بە گشتی، دەتوانین بڵێین کە ئەم کتێبە گەرچی سامانێکی بەنرخی لە بەرهەمە ئەدەبییەکان لەخۆ گرتووە، بەڵام تەنها و تەنها لە ڕەواڵەتی خەزێنەیەکدا دەمێنێتەوە و ئەمە ئەرکی لێکۆڵەرانی ئەمڕۆیە کە ئەو سامانە پۆلێنکاری بکەن. لەم لیکۆڵینەوەی بەردەستیشدا کتێبەکەی محەمەد ئوزون دەوری سەرەکی لە پێناو ئەو ئامانجەدا دەگێڕێ.

**۳- «مێژووی ئەدەبی کوردی» ، نووسینی پ.مارف خەزنەدار**

مێژووی ئەدەبی کوردی نووسینی پ.مارف خەزنەدار لە حەوت بەرگدا لە هەموو بەرهەمە هاوشێوەکان گشتگیرترە و دەشکرێ بە تاقە ئەنسایکلۆپێدیای مێژووی ئەدەبی کوردی دابندرێ. ئەم کتێبە بەرهەمی چەندین ساڵ لێکۆڵینەوەی مارف خەزنەدارە و سەرجەم ئەو زانیاریانەی لە سەر مێژووی ئەدەبی کوردی لە خۆگرتووە کە پێشتر لە چەند بەرهەمێکی تریدا وەک لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە (١٩٨٤) و مێژووی ئەدەبی کوردی نوێ (١٩٦٧) کە تێزی دوکتۆراکەیەتی و بە ڕووسی نووسراوە و بۆ عەرەبیش وەرگێڕدراوە ئاراستەی کردووە. دابەشکاری سەرەکی لەم کتێبەدا بە پێی ئولگوویەکی زەمانییە؛ واتە نووسەر سەدە بە سەدە مێژووی ئەدەبی کوردی باسکردووە و هەر بۆیەش کەمتر گرنگی داوەتە قۆناغ و نەریتە ئەدەبییە دووررودرێژەکانی ئەدەبی کوردی. تایبەتمەندییە سەرنجڕاکێش و ئیجابییەکانی ئەم بەرهەمە بریتین لە:

١- وەک لە پێشەکی بەرگی یەکەمدا ئاماژەی بۆ کردووە، نووسەر ئاگاداری کێشەکان و شێوەکانی مێژوونووسی ئەدەبییە و قامک دەخاتە سەر هەندێ خاڵ کە پێشتر نەکەوتوونەتە بەر سەرنجی ئەو نووسەرانەی هەوڵی نووسینەوەی مێژووی ئەدەبی کوردییان داوە.

٢- ئەم بەرهەمە گشتگیرترین بەرهەمێکە لە سەر مێژووی ئەدەبی کوردی نووسرابێ و تەنانەت دەشکری بە تاقە ئەنسایکلۆپێدیای ئەدەبی کوردی ناوبردە بکرێ.

٣- بەرگی یەکەمی ئەم پرۆژەیە زانیاری وردی لە سەر جوگرافیا و مێژوو و زمان و ئایین لە کوردستاندا لە خۆگرتووە.

٤- لە لێکدانەوەی ژیانی شاعیراندا لە بۆچوونی ئەخلاقی-ژیاننامەییەوە کە بۆچوونی زاڵی بەرهەمە پێشووەکان بوو هەنگاو هەڵگیراوە بەرەو بۆچوونی سونەتی- فەلسەفی کە بۆخۆی بە نموونەیەکی دەگمەن دەژمێردرێ؛ بە تایبەت لە ڕووی بەستنەوەی بەرهەمی شاعیرانەوە بە بارودۆخی هزری-ئایینی ئەو سەردەمەی تێدا ژیاون. گەرچی ئەم بۆچوونەش دیسانەوە دەچێتە خانەی بۆچوونە سوونەتییەکانی ڕەخنەی ئەدەبی و مێژوونووسی ئەدەبییەوە، بەڵام بۆخۆی بە یەکەم نموونە دادەنرێ کە بارودۆخی فیکری و فەلسەفی پەیوەندیدار بە ژیان و بەرهەمی شاعیر و نووسەرانەوە دەخاتە بەر باس.

هەروەهاش، ئەم کتێبە هەڵگری چەند کەموکۆڕییەکە وەک:

١- ئەم بەرهەمە هەڵگری لێکدانەوە و پۆلێنکاری ئەدەبی هاوچەرخی کوردی، واتە ئەدەبی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، نییە.

٢- لەم کتێبەدا گرنگی نەدراوەتە پەخشانی کوردی سەدەی بیستەم و کاریگەری وەرگێڕان لە سەر ئەدەبی کوردی و گۆڕانکاری زمانی کوردی لە ڕووی وشە و دەستەواژە تازەکانی ئەو سەردەمەوە شیەنەکراوەتەوە.

٣- بەشێکی سەربەخۆی بۆ ڕەخنە وتیۆری ئەدەبی تەرخان نەکرودوە و بە گشتی، جگە لە چەند نموونەیەک، وەک بەشی شێخ نووری شێخ ساڵح و گۆران، ئەم وتەزایە وەپشت گوێ خراوە.

٤- گرنگترین ڕەخنە لە سەر ئەم کتێبە ئەوەیە کە گەلاڵەی سەرەکی کتێبە و دابەشکاری بەرهەمەکانی سامانی مێژووی ئەدەبی کوردی لە سەر هێڵی زەمانی پەتی دامەزراوە و ئەمەش زۆر جار دوو یان چەند نەریت و قوتابخانەی ئەدەبی تێکەڵ بەیەک کردووە، یان خستوونیەتە یەک خانەوە و یان بە پێچەوانەوە لێکتری دابڕاندوون.

ئەم تایبەتمەندییەی دوایی پێوەندیی ڕاستەوخۆی هەیە بە مژاری ئەم وتارەی ئێستاوە. بۆ نموونە، لە بەرگی سێهەمدا، کە دەربارەی ئەدەبی کوردی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمە، پاش لێکۆڵینەوە لە بەرهەمی سێ شاعیری گەورەی میرنشینی بابان (واتە: نالی، سالم و کوردی) لە پڕێکدا و خێرا دێتە سەر باس کردنی شاعیرانی کوردی گۆرانی ئاخێوەر؛ وەک: ئەرکەوازی، سەیدی و مەولەوی (خەزنەدار، ٢٠٠٣: ب٣، بەشی چوارەم). پاشان، لە درێژەی هەمان باسدا دێتە سەر خوێندنەوەی ئەدەبی کوردی لە باکوور لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا (هەمان سەرچاوە: بەشی بیست و سێهەم). د.خەزنەدار هەر ئەم مێتۆدەشی لە لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی سەدەی هەژدە لە بەرگی دووهەمی بەرهەمەکەیدا ئەنجامداوە؛ واتە، لێرەشدا پاش ئاراستە کردنی ژیان و بەرهەمی شاعیرانێک وەک: بێسارانی، خانای قوبادی، وەلی دێوانە و ڕەنجووری، خێرا دێتەوە سەر لێکۆڵینەوە لە سەر ئەدەبی کوردی کرمانجی باکوور لە هەمان سەدە و بەرهەمی شاعیرانێک وەک: عەلی هەریری، فەقێ تەیران، مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی دەخاتە بەر توێژینەوە (خەزنەدار، ٢٠٠٣: ب٣، بەشی نۆیەم).

لە لایەکی ترەوە، گەر بە وردی سەرنج بدەین، تێدەگەین کە لە کاتێکدا بەرهەمی مەولەوی لە بەرگی سێهەمدا و بە جیا و لە هەمبەر نالیدا و لە کاتی باس کردنی دوو دیالێکتی گۆران و سۆرانی باس کراوە، بێسارانی و قوبادی کە سەر بە هەمان ڕێباز و قوتابخانە و نەریتی ئەدەبین کە مەولەویش تێیدایە، کەوتوونەتە بەرگی دووەم و بەشیکی تایبەتیان بۆ تەرخانکراوە. ئەم دابڕانە ڕەنگە لە سەرەتاوە ساکار و ئاسایی یان کەم بایەخ بێتە بەرچاو، بەڵام کاتێ مەولەوی لەدرێژەی ئەو نەریت و قوتابخانە ئەدەبییەدا ڕەچاو بکەین کە بێسارانی و قوبادی دایانمەزراندووە، ئینجا تێدەگەین کە ئەم نەریتە ئەدەبییە کە لەم کتێبەدا کراوە بە دوو یان سێ بەشی لێکدابڕاوە، لە بنەڕەتدا و بە ڕاستی هەر یەک نەریتە. د.خەزنەدار هەر ئەم ڕوانینەشی بۆ لێکۆڵینەوە لە بەرهەمی شاعیرانی کرمانجی ئاخێوەر بە کار هێناوە و بەرهەمە کرمانجییەکانی سەرەتای سەدەی نۆزدە لە نەریتی ئەدەبی کرمانجی باکوور، کە لانی لەم زیاتر لە چوار سەدە درێژەی هەبووە، جیا کردۆتەوە و لە هەر کامەیان لە بەرگێکی جیاوازدا دەکۆڵێتەوە.

هۆکاری سەرەکی بەکارهێنانی ئەم مێتۆدە لەم بەرهەمەدا، کە بۆخۆی بۆتە هۆی بەدیهاتنی جۆرە ئاڵۆزییەک لە پۆلێن کردنی قۆناغەکاندا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە نووسەر دابەشکارییەکەی بە پێی سەدەکان داناوە و هەر بۆیەش لە جیاتی گرتنەبەری یەک نەریت و خوێندنەوەی ئەو نەریت و قۆناغە لەبەر ڕەچاو کردنی ئولگووە زەمانییەکەی ئەم کتێبە بەشە یەکگرتووەکانی ئەو نەریتەی دابڕاندووە. بە واتایەکی تر، ئەگەر جۆرە یەکگرتووییەک لە کۆی سامانی ئەدەبی کوردی لە بەرهەمەکانی سەجادی و ئوزوندا بە گوشار و بە زۆر سازکراوە، ئەوا لێرەدا بە پێچەوانەوە، یەکگرتوویی یەک نەریت و قوتابخانەی ئەدەبی تێک دراوە و کراوەتە دوو یان سی بەشی جیا لەیەک و هەر کامەیان لە بەرگێکدا باسکراوە. د.خەزنەدار لە وتووێژێکدا دەڵێ:

بە لای منەوە دەکرێ مێژووی ئەدەبی کوردی بە گشتی لە تاکە کەسێک زیاتر بنووسێتەوە. بە هەموو حاڵێک ئەوەی مێژووی ئەدەب دەنووسێتەوە پێویستە سێ لایەنی ئەو بەرهەمە ساخ بکاتەوە:

١- مێژووی ژیانی خاوەنی بەرهەمەکە (شاعیر و نووسەر)،

٢- تۆمار کردنی بەرهەمەکە (شیعر و پەخشان) بە پێی مێتۆدێکی ئەکادیمی سەر بە زانستی تێکستۆلۆجی بۆ ئەوەی ڕووی ڕاستی بەرهەمەکە وەکوو شاعیر و نووسەر نووسیویەتی بخاتە بەرچاوی خوێنەر و خویندەوار،

٣- وەسف کردنی بەرهەمەکە بە شێوەیەک کە خوێنەر لە حەقیقەتی مەبەسی خاوەنەکەی بگات [1].

وەک دەبینرێ، لەم وتووێژەدا و لە جێگاکانی تریشدا، خاڵی هەرەگرنگ بۆ نووسەر و زۆربەی نووسەرانی تر دانانەوەی دەقی بەرهەمەکانە بە شێوەی ڕەسەنی خۆیان. ئەمە هەرچەندە بەشێکە لە کەڵکەڵە گرنگەکانی مێژووی ئەدەب و دەخرێتە خانەی ڕەخنەی دەقاودەقەوە، بەڵام دەبیبین کە هیچ کات دارشتنی مێژووی ئەدەبی کوردی لە سەر بنەمایەکی تیۆریک کە بایەخی دابێتە قۆناغ و قوتابخانە و نەریتە ئەدەبییەکان لە میرنشینە جیاجیاکاندا و ئاوڕدانەوە لە پێشینە مێژوویی و فەرهەنگییەکانی ئەو میرنشینانە، نەبۆتە گەلاڵەی سەرەکی هیچ لێکۆڵینەوەیەک لەسەر مێژووی ئەدەبی کوردی و هەر ئەمەش بۆتە هۆی بەدیهاتنی چەند ئاڵۆزییەک لە ڕوانینەکان بۆ بەرهەمەکانی مێژووی ئەدەبی کوردی.

### ٤- الواقعیه فی الادب الکردیه (ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا)

یەکێک لەو کتێبانەی لە ڕەواڵەتدا سەبارەت بە مێژووی ئەدەبی کوردی نەنووسراوە و کەچی پێوەندی ڕاستەوخۆی هەیە بەم بابەتەوە، تێزی دوکتۆراکەی «پ.عیزەدینمستەفاڕەسووڵ»ە بەناونیشانی: «الواقعیه فی الادب الکردیه». ئەم کتێبە گەرچی لە زمانی ڕووسییەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر عەرەبی و هێشتا وەرگێڕانە کوردی و فارسییەکانی نەکەوتوونەتە بەردەستی خوێنەران، بەڵام بە هۆی دانانەوەی لە گەلێک کتێبی قوتابخانەیی و زانکۆییدا و هەروەها بەهۆی ڕەچاو کردنی هەمان ڕوانگە لە وتارەکانی تری نووسەری ناوبراودا توانیویەتی جۆرێک لە ڕوانگەی تیۆریک سەبارەت بە مێژووی ئەدەبی کوردی دەستەبەر بکات. ئەم ڕوانگەیە،

---

[1] وتوویژ لەگەڵ د. مارف خەزنەدار، سازدانی کامەران سوبحانی و دانا فایەق؛ بڕوانە
http://www.dengekan.info/dengekan/11/6327.txt

کە هەر زوو توانی ببێتە ڕوانگەیەکی زاڵ و سەرنجڕاکێش بۆ توێژەرانی ئەو سەردەمە و تەنانەت هەندێ لە لێکۆڵەرانی ئێستاش، سەرجەم میراتی ئەدەبی کوردی دابەش دەکاتە سەر سێ ڕێبازی گەورەی کلاسیزم، ڕۆمانتیسیزم، و ڕیالیزم[1].

لەم بەرهەمەدا هەر دوو نەریتی ئەدەبیی «بابانی و خالدی» (واتە: کرمانجی ناوەڕاست و ژووروو) بە یەک نەریت و بە ناوی ئەدەبی کلاسیستی کوردییەوە ئاراستەکراوە. هەربۆیە بۆ نموونە، دوو شاعیری گەورەی کورد وەک: نالی و خانی، سەرەڕای جیاوازییە بەرچاوەکانیان، خراونەتە یەک خانەوە کە خانەی ئەدەبی کلاسیستی کوردییە. هەر بەهەمان شێوەش، بەرهەمە ئەدەبییە جیاجیاکانی شێوەزاری گۆرانی تێکڕا خراونەتە خانەی ئەدەبی ڕۆمانسییەوە. پاش دەستەبەر کردنی پێناسەیەکی گشتی لەم دوو ڕێبازە، نووسەر تیشکی خستۆتە سەر ئەدەبی ڕیالیستی کوردی.

جێگەی سەرنجە کە پێناسەی نووسەر بۆ ئەدەبی ڕیالیستی و پۆلێنکاری بەرهەمە ئەدەبییە ڕیالیستیەکان بە تەواوی لە ژێر کاریگەری پێناسەی نووسەر بۆ دوو ڕێبازی کلاسیزم و ڕۆمانتیسیزم دایە؛ واتە، بە بڕوای نووسەر، گەر لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا بایەخ دراوەتە ڕوخسار و وشەکاری و گەر لە ئەدەبی ڕۆمانتیکی کوردیدا بە پێچەوانەوە بایەخ دراوەتە ناوەرۆک و ڕەوانی گوتەی شیعری، ئەوا لە ئەدەبی ڕیالیستی کوردیدا هەر دوو ڕوخسار و ناوەرۆک یەکیان گرتۆتەوە و زمانی ئەو جۆرە ئەدەبەش زیاتر روی لە پەتی بوون کردووە.

باسی ئاماژەپێکراو گەرچی توانیویەتی جۆرێک لە ڕوانگەی تیۆریک دەربارەی ڕێبازەکانی ئەدەبی کوردی ئاراستە بکات و بەشێک بێ لە یەکەم هەوڵەکان لەم بەستێنەدا، بەڵام لە چەند لایەنەوە جێگەی ڕەخنەکارییە[2]؛ یەکەم، تایبەتمەندییەکانی هەر سێ ڕێبازەکە، بە تایبەت دو ڕێبازی یەکەم، بە شێوەیەکی زۆر گشتی و ساکار خراونەتە ڕوو؛ دووهەم، کۆ کردنەوەی سەرجەم میرات و سامانی ئەدەبی کوردی لە سەرەتاوە تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بۆ سێ ڕێبازی کلاسیزم، ڕۆمانتیسیزم و ڕیالیزم، مۆرکێکی تەواو گشتیکارانە و کۆکارانەی پێوە دیارە و هەر بۆیەش لەم بەرهەمەدا چاوپۆشی لە تایبەتمەندی و قاڵب و نەریت و ڕێبازەکانی تری ئەدەبی کوردی کراوە. سێهەم، ئەو تێزەی ئەم بەرهەمە بە دوای سەپاندنیدا دەگەڕێ، تێزێکی سەر بە پارادایمی بیری لێکۆڵینەوە ئەدەبییەکانی سۆڤیەتی جارانە کە تێیدا گرنگایەتی لە ڕادەبەدەر دەدرایە بەرجەستە کردنەوەی ناوەرۆک و ئامانجەکانی ئەدەبی ڕیالیستی لە خزمەت چینی هەژار و پرۆلتاریادا. با لەبیرمان نەچێتەوە کە بۆ ساڵانێکی زۆر زاڵترین قوتابخانەی ئەدەبی لە سۆڤیەت و لە ژێر دەسەڵاتداریێتی ستالیندا ڕیالیزمی سۆشیالیستی بوو. کاریگەری ئەم قوتابخانەیە نەک هەر بە سەر ئەم بەرهەمەوە بەڵکوو بە

---

[1]. لێرەدا جیاوازی هەیە لە نێوان دوو زاراوەی کلاسیک و کلاسیزم؛ هەربۆیەش، گەلەک بەرهەمی رۆمانتیکی و ریالیستیش دەکرێن بە بەرهەمی کلاسیک ناوبردە بکرێن.

[2]. ئەم روانگەیە لە چەندین کتێبی پەروەردەئییشدا رەنگی دایەوە. بۆ نموونە چەندین وانەی کتێبی *زمان و ئەدەبی کوردی* بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی بە تەواوەی بە گوێرەی ئەم روانگە تیۆریکە نووسراون؛ عیزەدین مستەفا رەسووڵ و چەند نووسەری تر. زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی. چاپی دووەم. بەغداد: چاپخانەی ئەلعراق، ١٩٧٨، ل. ١٧٢-١٤٨.

سەر زۆربەی هەرە زۆری ئەو لێکۆڵینەوە کوردییانەی لە سۆڤیەتدا ئەنجام دەدران بە ڕوونی و بە ئاشکرایی دیارە. جگە لەمەش و هەر بە هۆی دووری لە لێکۆڵینەوە ڕۆژئاواییەکان و تەنانەت ڕەت کردنەوەشیان لە لایەن دەسەلاتی سیاسی و ئەدەبی ئەوسای سۆڤیەتەوە، ئەم بەرهەمە بە هێچ جۆریک پشتی نەبەستۆتە ڕوانگە تیۆریکە ڕۆژئاواییەکان لە سەر ڕیالیزم و ئاوڕی لێ نەداونەتەوە.

### ب) بەرەو مۆدێلێکی پۆلێنکراو بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەدەبی کوردی

#### ١- چەند وتەیەکی سەرەتایی

مێژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا لە بەر چەندین هۆکاری جیاجیای تایبەت بە زمان و ئەدەبی کوردی، وەک جۆراوجۆری ئەو زاراوانەی دەقە ئەدەبییەکانی پێ نووسراون و دابڕانی ناوچەکان لە یەکتر چ لە سەردەمی میرنشینەکان و چ لە سەردەمی مۆدێرندا و بەرهەمهاتنی هاوکاتی چەندین شێوازی ئەدەبی بە زاراوە جیاجیاکانی زمانی کوردی، ڕووبەڕووی چەندین کێشە بۆتەوە؛ گرنگترین کێشەی مێژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا بریتیە لە نەبوونی مۆدێلێکی گشتگیر و پۆلێنکراو و مێتۆدۆلۆژیک بۆ لەخۆگرتن و خوێندنەوەی بەرهەمە ئەدەبیەکانی سەرجەم زاراوە و قۆناغە جیاجیاکانی ڕەوتی گەشە کردنی ئەدەبی کوردی. جگە لەمەش، ڕەچاو نەکردنی مێتۆدۆلۆژییەکی زانستیانە و شێوازێکی بابەتیانە لە مێژوونووسی ئەدەبی کوردیدا بۆتە هۆی سەرهەڵدانی چەند خاڵێکی لاوازی تر لەو بەرهەمانەدا وەک بەکارهێنانی زمانێکی زەینی و نابابەتیانە و بایەخدانی لە ڕادەبەدەر بە لایەنی ئەخلاقی-ژیاننامەیی، بە شێوەیەک کە لە مۆرکە زانستییەکان دووری خستوونەتەوە.

لێرەدا وتاری بەردەست تیشک دەخاتە سەر ئاراستە کردنی مۆدێلێک بۆ مێژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا بە شێوەیەک کە نەک هەر دەورە و قۆناغ و شێوازە جیاجیاکانی ئەدەبی کوردی لە خۆگرتبێ، بەڵکوو جیاوازییە زاراوەناسانەکانیش لە ڕێگەی گرێدانیان بە شیوازە ئەدەبییەکانەوە ڕەچاو بکات و گرنگیش بداتە ژانرە ئەدەبیە نوێکان لە ئەدەبی کوردیدا. ئەم مۆدێلەی کە وتارەکە ئاراستەی دەکا لە لایەکەوە ئەدەبی کوردی دابەش دەکات بە سەر چەندین قۆناغ و دەورە و نەریت و شێوازدا و لە لایەکی تریشەوە لە شیکاری هەر شێوازێکدا پشت دەبەستێتە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی فۆرم و ناوەرۆکی بەرهەمە بەرچاوەکانی ئەو قۆناغە. بەشێک لەم مۆدێلە (ئەو بەشەی لە سەرەتاوە تا شەڕی یەکەمی جیهانی دەگرێتەوە) پێشتر وەکوو گەلاڵەیەکی لێکۆڵینەوەیی لە لایەن ئەم قەڵەمەوە بۆ زانستگای کوردستان بە ئەنجام گەیشتووە و هەوڵ دەدرێ لە داهاتوودا کامڵ بکرێت (سجادی، ١٣٨٥).

مۆدێلی بەردەست، پاش دابەش کردنی سەرجەم سامانی ئەدەبی کوردی بە سەر دوو بەشی گەورەی سەرزارەکی و نووسراو دەست دەکاتە پۆلێنکاری ئەدەبی سەرزارەکی بۆ سەر پەندی پێشینان، گاڵتە و گەپ، مەتەڵ، شیعرە فۆلکلۆریکەکان، چیرۆک و حەقایەتەکان، بەیتەکان و شیعری گۆرانی لە لاوک و حەیران و سیاچەمانەوە بگرە تا بەستە فۆلکلۆریکەکان. پاشان ئەمە ڕەچاو کردنی ئولگوویەکی دابەشکارانەیە کە دەبێتە گرنگترین خاڵی لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەدەبی کوردی. ئەدەبی کوردی، بە هۆی ئەوەی کورد خاوەنی یەک

حوکمداری یەکگرتوو و سەرتاسەری نەبووە، بە سەر چەندین نەریت و قوتابخانە و قۆناغی جیاجیادا دابەش دەکرێ و لە باس کردن لە سەر ئەدەبی کوردی پێویستە لە مێژینە و پێشینە و تایبەتمەندییەکان و مۆرکەکانی یەک نەریت بکۆڵینەوە و پاشان بچینە سەر لێکۆڵینەوە لە قۆناغ و نەریتێکی تری ئەدەبی؛ کەواتە، نابێ بە هۆی تێپەڕبوونی زەمان و بەدوای یەکدا هاتنی سەدەکانەوە مۆرکەکان و ئەندامانی یەک قوتابخانە و نەریتی ئەدەبی تووشی دابڕان بکەین. ڕەچاو کردنی وەها مێتۆدیک تا سەرەتای شەڕی یەکەمی جیهانی و سەرهەڵدانی دەوڵەت-نەتەوە مۆدیرنەکان لەو وڵاتانەی کوردیان تێدا نیشتەجێیە پێویستە. واتە هەر ئەو جیاوازی و دابڕانەی پاش شەڕ لە نێو پارچەکانی کوردستاندا هاتە ئاراوە، لە سەردەمی میرنشینەکانیشدا خۆی لە ڕواڵەتی هاوشێوازی و هاوقاڵبی و هاوهزری سەرسووڕهێنەری بەرهەمە ئەدەبییەکانی سەر بە یەک میرنشین دەرخستووە. وەک دواتر ڕوونی دەکەینەوە، ئەم هاوشێوەییە شێوازناسانەیە دەتوانێ دەوری سوودبەخش ببینێ لە پۆلینکاری بەرهەمی ئەدەبی بەرهەمهاتوو لە یەک میرنشیندا.

**٢- تایبەتمەندییەکانی مۆدێلێکی پۆلێنکراو:**

یەکەم: دابەش کردنی سەرجەم سامانی ئەدەبی کوردی بە گوێرەی ئەو ناوچە و زاراوە و حوکمدارییەی تێدا بەرهەمە ئەدەبیەکان بەرهەم هاتوون. دیارە کە ئەمە بۆ خۆی چەندین جۆر نەریتی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا سازکردووە. ئەم نەریتانە چوار دانەیان جێگەی سەرنجن و لەوانی تر کاریگەرتر و درێژخایەنتر بوون. لە خوارەوەدا ئەم نەریتانە و شاعیرە گرنگەکانیان ناو دەبەین. لە سەرجەم ئەم دابەشکاریانەی خوارەوەدا شێوەیەکی گشتی ڕەچاوکراوە و تەنها مەبەست ئاگاداربوونە لە دەنگە هەڵکەوتووەکانی هەر قۆناغێکە:

**ئ. نەریتی ئەدەبی یارسان (سەدەی پێنجەم تا دەهەمی کۆچی):**

بابا تاهیر، مەلا پرێشانی لوڕ. عێل بەگی جاف، سەیدی هەورامی یەکەم.

**ب. نەریتی ئەدەبی ئەردەڵانەکان (سەدەی یازدەهەم تا ناوەڕاستی نۆزدەهەم):**

بێسارانی (١٦٤٣-١٧٠١)، خانای قوبادی (١٧٠٤-١٧٧٨)، وەلی دێوانە (١٧٤٥-١٨٠١)، ئەحمەد بەگی کۆماسی (١٧٩٣-١٨٧٦)، مەستوورەی کوردستانی (١٨٠٣-١٨٤٧)، مەولەوی (١٨٠٤-١٨٨٢) و فەخرولعولەما (١٨٣٠-١٨٨٥).

**ج. نەریتی ئەدەبی بابانەکان (کۆتایی سەدەی هەژدە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم):**

بەرەی یەکەم: نالی (١٨٠٠-١٨٦٧)، سالم (١٨٠٥-١٨٦٩)، کوردی (١٨١٢-١٨٥٠)؛ بەرەی دووەم: حاجی قادری کۆیی (١٨١٥-١٨٩٢)، مەحوی (١٨٢٥-١٩٠٤)، شێخ ڕەزا تاڵەبانی (١٨٣٣-١٩٠٨)

**د. نەریتی ئەدەبی خالدییەکان (سەدەی پانزدەهەم تا هەژدەهەم):**

مەلای جزیری (١٥٦٧-١٦٤٠)، عەلی هەریری (١٦٠٠-١٥٣٠)، فەقێ تەیران (١٦٤١- ١٥٦٣)، ئەحمەد خانی (١٦٥٠-١٧٠٧).

**بەشی چوارەم- مێژوویی وێژە**

پاش نەمانی میرنشینەکان و پێش سەرهەڵدانی شەڕی یەکەمی جیهانیو دەوڵەت-نەتەوە مۆدێرنەکان لەو وڵاتانەی کوردیان تیدا نیشتەجێیە، واتە قۆناغی کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم، نەریتی ئەدەبی قۆناغی گواستنەوە لە ئارادایە. لەم قۆناغەدا، لە لایەکەوە، کۆتایی بە دەسەڵاتی میرنشینەکان هاتووەو لە لایەکی تریشەوە، هێشتا دەوڵەت-نەتەوەکان لە ئێران و تورکیا و عیراق و سوریا سەریان هەڵنەداوە. پێنج شاعیری گرنگی ئەم قۆناغە بریتین لە:

میرزا عەبدولقادری پاوەیی (١٨٣٥-١٩٠٧)، سالمی سنە (١٨٤٥-١٩٠٨)، وەفایی (١٨٤٧- ١٩١٦)، حەریق (١٨٥١-١٩٠٦) و ئەدەب (١٨٦٠-١٩١٢).

پاش ئەم قۆناغە، پێویستە ئەدەبی کوردی لە سەدەی بیستەمدا بخریتە بەر هەڵسەنگاندن و دابەش کردنەوە. لێرەدا ئەدەبی کوردی بە سەر بەرهەمە ئەدەبیە کوردییەکانی بەرهەمهاتوو لە چوار وڵاتی ئێران، تورکیا، عێراق و سوریادا دابەش بکرێ و هەرکام لەمانەش بۆخۆیان، بەو چەشنەی لێرەدا باس دەکرێت، بە سەر چەندین قۆناغی جیاجیادا دابەش دەکرێن:

ئەدەبی کوردی لە کوردستانی ئێران لە سەدەی بیستەمدا بە سەر سێ قۆناغدا دابەش دەکرێ بەم شێوەیە:

**ئ- قۆناغی یەکەم:** لە شەڕی یەکەمی جیهانی و دامەزارندنی دەوڵەت_ نەتەوەی ئیرانەوە تا کۆماری کوردستان (١٩٤٥-١٩١٩). ناری (١٩٤٤-١٨٧٤)، سەیفولقوزات (١٩٤٣-١٨٧٥) ، قانع ( ١٩٦٥-١٨٩٨).

**ب- قۆناغی دووهەم:** لە کۆمارەوە تا شۆڕشی ئیران (١٩٧٨-١٩٤٦): هێمن (١٩٨٥-١٩٢٠)، هەژار (١٩٨٩-١٩٢٠)، حەسەن قزڵجی (١٩٨٤-١٩١٤)، عەبدوڕەحمان زەبیحی (١٩٧٩-١٩١٩)، مەلا ئاوارە (١٩٦٩-١٩٣٤)، حەقیقی (١٩٩٧-١٩٠١)، سەیدتاهیر هاشمی (١٩٩٠-١٩١٠)، مەلا غەفوور (١٩٨٩-١٩٢٦) و سوارە ئیلخانیزادە (١٩٧٥-١٩٣٧).

**ج. لە شۆرشەوە تا ئەمرۆ ( -١٩٧٨)**

شاعیر و نووسەرە گرنگەکانی ئەم سەردەمە، سەرهەڵدانی ڕەخنە و تیۆریی ئەدەبی، پەرەسەندنی پەخشانی ڕۆژنامەیی، هونەری و زانستی.

هەر بە هەمان شێوەش، دەکرێ ئەدەبی کوردی لە کوردستانی عیراق لە سەدەی بیستەم بە سەر چوار قۆناغدا پۆلێن بکرێ کە ئەمانەی خوارەوەن:

**ئ- قۆناغی یەکەم:** لە شەڕی یەکەمی جیهانی و دامەزارندنی دەوڵەت_ نەتەوەی ئیرانەوە تا کۆماری کوردستان (١٩٤٥-١٩١٩): پیرەمێرد (١٩٥٠-١٨٦٧)، ئەحمەدبەگی حەمدی (١٩٣٦-١٨٦٧)، تاهیربەگی جاف (١٩١٧-١٨٧٥)، عەبدوڵا زێوەر (١٩٤٨-١٨٧٥)، بێخود (١٩٥٦-١٨٧٦)، کەمالی، ئەسیری (١٩٦٢-١٨٩٠)، ئەمین فەیزی بەگ.

**ب - قۆناغی دووەم:** لە کۆمارەوە تا بەیاننامەی١١ی ئادار (١٩٧١-١٩٤٦) : شێخ نووری شێخ ساڵح (١٩٥٨-١٨٩٦)، ئەحمەد موختاربەگی جاف (١٩٣٤-١٨٩٦)، گۆران (١٩٦٢-١٩٠٤)، فایەق بێکەس (١٩٤٨-١٩٠٥)، دڵدار (١٩٤٨-١٩١٨)، ئەحمەد هەردی (٢٠٠٥-١٩٢٢)، ڕەفیق حیلمی.

**ج - قۆناغی سێیەم:** لە بەیاننامەی١١ی ئادارەوە تا راپەڕین (١٩٩١-١٩٧١): شێرکۆ بێکەس (١٩٤٠)، عەبدوڵا پەشێو (١٩٤٦)، لەتیف هەڵمەت (١٩٤٧)، ڕەفیق سابیر (١٩٥٠)، عەباس عەبدوڵا یوسف (١٩٥١).

**د - قۆناغی چوارەم:** لە راپەڕینەوە تا ئەمڕۆ (-١٩٩١): شاعیران و نووسەرانی ئەم سەردەمە لەگەڵ نووسەرە گرنگەکانی هەر چوار قۆناغی ڕەخنە و تیۆری ئەدەبی، پەخشانی ڕۆژنامەیی، هونەری و زانستی لە هەر چوار قۆناغەکە لە لێرەدا بە هۆی کورتی وتارەکە ناوەکانیان ناهێنین.

دیسانەوە هەر بە هەمان شێوە، دەشکرێ ئەدەبی کوردی لە سەدەی بیستەمدا لە تورکیا بە سەر سێ قۆناغدا پۆلێنکاریی بکرێت:

**ئ - قۆناغی یەکەم (قۆناغی سەرهەڵدان):** لە شەڕی یەکەمەوە تا دامرکاندنەوەی شۆڕشەکەی شیخ سەعیدی پیران (١٩٢٨-١٩١٨).

**ب - قۆناغی دووەم (قۆناغی بێدەنگی):** لە شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیرانەوە تا سەرهەڵدانەوەی ئەدەبی کوردی لە باکوور (١٩٨٨-١٩٢٨).

**ج - قۆناغی سێیەم (قۆناغی گەشە کردن):** لە سەرهەڵدانەوەی ئەدەبی کوردی لە باکوور تا ئەمڕۆ (-١٩٨٨)

پاشان پێویستە ئەدەبی کوردی لە سەدەی بیستەمدا لە سوریا، لە سۆڤیەتی جاران و پاشان، لە تاراوگەدا بە هەموو لقوپۆپەکانیەوە ڕووبەڕووی دابەشکاری و پۆلێنبەندی بکرێتەوە.

**دووهەم:** لە دەستپێکی هەر بەشێکدا سەرەتا پێویستە پێشزەمینە و پێشینە کۆمەڵایەتی، فەرهەنگی و سیاسییەکان بخرێنە ڕوو. دیارە گرنگترین گرفت لەم بەشەدایە و ئەویش نەبوونی سەرچاوەی گشتگیرە. هەربۆیە، بەردەوام بەشێکی هەرەگرنگ لە مێژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا بەشێوەی نادیارو گوماناوی ماوەتەوە کە بریتیە لە ئاوڕنەدانەوە لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی کوردستان و بەتایبەت ناوەندە مەزنە ئایینی و فەرهەنگییەکان لە سەدەرمی میرنشینە کوردییەکاندا. لێرەدا پێویستە باسی دەور و کاریگەریی ئەو میرنشینانە لە پەرەپێدانی نەریتی ئەدەبی ناوبراودا و بەکارهێنانی زمانی ئەدەبی تایبەت و گرنگیدانیان بە بیناسازی و فەرهەنگسازی لە شارە گەورەکان و پێوەندی سیاسییەکانی نێوان ئەم میرنشینانە و ناوەندەکان و کاریگەری لایەنگری سیاسی ئەو میرنشینانە بە سەر نەریتی ئەدەبی ناوبراوەوە بخریتە بەر باس.

**سێیەم:** جگە لە کەڵکوەرگرتن لەسەرجەم سەرچاوەکان، لەبەر ئەوەی کە سەرچاوەکان کەمن یان لەلایەن وتاری باڵادەستەوە کە ناکوردی بووە نووسراونەتەوە، پێویستە بنەمایەکی تیۆریک بۆ خویندنەوەی بارودۆخی سەردەمی ناوبراو دەستنیشان بکەین. لێرەدا هەوڵدراوە پشت ببەسترێتە تیۆری «مێژوویی‌خوازی نوێ» (New Historicism) لە پێناو دۆزینەوە و دەستەبەر کردنی دیدگاکان لە سەر بارودۆخی ژیان لەو سەردەمە

لە بوارە جیاجیاکاندا (Branniga ،١٩٩٨). پێویستە بوترێ زۆربەی ئەو بەرهەمانەی لە سەر مێژووی کورد بە گشتی و مێژووی ئەدەبی کوردی بەتایبەتی نووسراون لە مێتۆدێک پەیرەوی دەکەن کە دەتوانرێ بە «مێژوویی‌خوازیی کۆن» (Old Historicism) ناوبردە بکرێ. لە مێتۆدی مێژووویی‌خوازیی کۆندا، لە بارودۆخی مێژوویی و زەمینەی فەرهەنگی و ئایینی کەڵک وەردەگیردرێت بۆ خوێندنەوەی ئەدەب و واقیعی کۆمەڵگا. ئەم مێتۆدە جگە لەوەی هەڵگری چەند خاڵیکی لاوازە، وەک پشت‌بەستن بەو سەرچاوە مێژووییانەی کە ڕاستییەکەیان لە ژێر نیشانەی پرسیاردایە، لە خوێندنەوەی مێژووی ئەدەبی کوردیدا بەکەڵک نییە؛ چوونکە ئەو سەرچاوانەی دەربارەی مێژووی سەردەمە جیاجیاکان دانراون یان زۆر کەمن یان لە لایەن وتاری بالادەستەوە نووسراون. هەربۆیە، باشترین بنەمای تیۆریک بۆ خوێندنەوەی مێژووی ئەدەبی کوردی و گەیشتن بەشێوەی ڕەسەنی ڕووداو و واقیعەکان بریتیە لە ڕەچاو کردنی بنەواشەکانی تیۆریی «مێژوویی خوازیی نوێ». بە واتایەکی تر، ئەم تیۆرییە لە جیاتی ئەوەی لە کتێبە مێژووییەکان کەڵک وەربگرێت بۆ خوێندنەوەی ئەدەب یان تێگەیشتن لە مێژوو، بە پێچەوانەوە، لە ئەدەب کەڵک وەردەگرێ بۆ تێگەیشن لە مێژوو. واتە، ئەم تیۆرییە بە جۆرێک هەوڵی زیندوو کردنەوەی مێژوو دەدات سەبارەت بەو ڕووداوە مێژووییانەی کە یان لە کتێبە مێژووییەکاندا پشتگوێ خراون و یان خراونەتە پەراوێزەوە و یاخود تەنانەت پێچەوانە و پڕ لەهەڵە تۆمار کراون.

لێرەدا نموونەیەک دەخەمە بەر باس: ئەو سەرچاوە مێژووییانەی باسی داگیر کردنی شاری سلێمانی لە لایەن سوپای عوسمانییەوە دەکەن زۆربەیان لە لایەن وتاری بالادەستەوە، واتە لە لایەن خودی تورکەکانەوە نووسراون؛ هەربۆیە لە ڕوانگەی ئەوانەی ئەم ڕووداوە بە داگیرکاری ناو نەبراوە و بە پێچەوانەوە، ئەوان سلێمانی بە بەشێک لە ئیمپراتۆری عوسمانی دەزانن؛ کەواتە، بۆ تێگەیشتن لە دروستی ئەم ڕووداوە مێژووییە دەبێ ئاوڕ لەو بەرهەمە ئەدەبی و هونەرییانە بدرێتەوە کە لەو سەردەمە و دەربارەی ئەو رووەداوە بەرهەمهێنراون. بۆ نموونە، ئەگەر دوو چامەکەی نالی و سالم، لە ڕوانگەی تیۆری مێژوویی‌خوازیی نوێوە بخوێنینەوە، ئەوا گەلەک دەرئەنجامی ڕاستمان دەربارەی ڕاستی ئەو ڕووداوە بۆ دەردەکەوێ. سالم لە وڵامی نالیدا دەنووسێ:

| | |
|---|---|
| لەو ساوە حاکمێ بەبە گشت دەربەدەر کران | نەیدیوە کەس لە چێهرەی کەس جەوهەری هونەر |
| تا بوو بە جای مەتلەعی خورشیدی بەختی ڕۆم | سووتا گیاە و تەشنە و خوشکیدە بوو شەجەر |

...

| | |
|---|---|
| سەیوان پڕە لە شەخسی ستەم دیدە خوار و ژوور | هەر قەبرێ پڕ غەمانە لە هەر لا دەکەم نەزەر |
| جێی تورکانی ڕۆمە دەر و ژووری خانەقا | غافڵ هەموو لە جای موریدانی باخەبەر |
| ئەو حەوزە پڕ دەبوو کە وەکوو چاوەکانی تۆ | تەغیرە ئاوی وەک دڵی مەردانی پڕ کەدەر |

(سالم، ١٣٧٢: ٦٧).

وەک دەبینرێ، سالم لێرەدا باسی کاریگەرییە سەلبییەکانی ئەم ڕووداوە دەکات لە سەر ژیان و ئاکاری خەڵکی شاری سلێمانی و ئاڵۆزی و پشێوییەکانی دوای ئەم رووداوە و وشکبوونی کانی هونەر و داهێنان لە ناو

بەهرەمەنداندا و بێئومێدی و بێزارییان لەو بارودۆخە. لە درێژەی شیعرەکەدا سالم ئاماژە بۆ چەندین شوێنی جوگرافیایی سلێمانی دەکات وەک سەرچنار، شیوی ئاودار، کانی ئاسکان، پیرمەسوور. کەواتە، ئەگەر بە بۆچوونی تیۆریکی مێژوویی‌خوازیی نوێ ئەم شیعرە بخەینە بەر هەڵسەنگاندن، ئەوا ڕاستی و حەقیقەتی ڕووداوی داگیر کردنی سلێمانی لە لایەن عوسمانییەکانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە؛ ئەمەش ئەو ڕاستییەیە کە لەو بەرهەمە مێژووییانەی لە لایەن خودی تورکەکانەوە نووسراون، گەلێک جیاوازەوە و لەوانەشە لە هەندێ سەرچاوەی هاوشێوەی تردا یان فەرامۆش کرابێ یان خرابێتە پەراوێزەوە و یان بە شێوەیەکی ناڕاستەقینە تۆمار کرابێ.

**چوارەم:** لە ئاماژە کردن بۆ شاعیر و نووسەرە دیار و بەرچاوەکانی هەر دەورەیەک پێویستە یەک مێتۆدۆلۆژی ڕەچاو بکرێت و هەر بەشێک لە دوو بەشی سەرەکی پێک بێت: سەرەتا، زانیاری کورتی ژیاننامەیی و پاشان ئاراستە کردنی شێوازناسی ئەدەبی بەرهەمەکانی شاعیری ناوبراو لە لایەکەوە و باس کردن لە سەر هزر و جیهان‌بینی شاعیری ناوبراو لە لایەکی ترەوە. گرنگیدان بە دوو بۆچونی ڕەخنەیی ئەخلاقی-ژیاننامەیی و سونەتی-فەلسەفی لە مێژووە ئەدەبییەکانی کوردیدا بۆتە هۆی پشتگوێ خستنی ڕەخنەکاری فۆرمالیستی لە سەر شیعرەکان لە لایەکەوە و دیاری نەکردنی قوتابخانە ئەدەبی و ڕێبازی فیکری شاعیرەکان لە لایەکی ترەوە. لێرەدا، وەک نموونەیەک، چەند جیاوازییەکی شێوازناسانەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی دوو نەریتی ئەدەبی بابان و ئەردەڵان دەخەینە ڕوو:

| تایبەتمەندیی شێوازناسانە | نەریتی ئەدەبی بابان | نەریتی ئەدەبیی ئەردەڵان |
|---|---|---|
| **قاڵبی ئەدەبی** | غەزەڵ و قەسیدە | جووت‌سەروا |
| **شێوەزار** | کرمانجی ناوەڕاست | گۆرانی |
| **فرەپاتی وشەی بیانی** | عەرەبی | فارسی |
| **ڕوخسار و ناوەڕۆک** | روخسار | ناوەڕۆک |
| **کێش و عەرووز** | عەرووزی عەرەبی | کێشی بڕگەیی |
| **فرەپاتی شوێنی جوگرافی** | شار | سروشت |

**پێنجەم:** لە هێنانەوەی نموونە شیعرییەکاندا پێویستە لە جیاتی بایەخدان بە شەرح و مانا کردنەوەیان گرنگی بدرێتە ئەو بەرهەمانەی کە بە باشترین شێوە مۆرکی شێوازناسی و جۆری بیر و هزری ئەو شاعیرە دەردەخەن. لە پاڵ ئەمەشدا، خاڵێکی تر هەرە گرنگی پێوەندیدار بە هەڵبژاردنی بەرهەمە ئەدەبییەکانەوە، چ لە مێژووی ئەدەبیدا و چ لە دیوانە شیعرییەکاندا، ئەوەیە کە دەبێ خۆمان لە دانانی ئەو بەرهەمانە بە پێی ئەلفوبێ دوور بخەینەوە؛ چونکە ئەم کارە، لە لایەکەوە نامەنتێقیە لەبەر ئەوەی کە هیچ شاعیر و نووسەرێک دیوانەکەی بە پێی ئەلفوبێ نەهۆنیوەتەوە و لە لایەکی تریشەوە، بەر بە تێگەیشتن لە ڕەوتی گەشە کردنی زمان و شێواز و ئەندێشەی شاعیری بەرباس دەگرێت. کەواتە، باشترین شێوە بۆ دانانی بەرهەمەکان ڕیز

کردنیانە بە پێی ڕێکەوتی هۆنینەویان؛ هەڵبەت ڕەچاو کردنی ئەم مێتۆدە کە ستاندارد و فرەپاتە، لە ئەدەبی کوردیدا گەلێک دژوارە و پێویستی بە لێکۆڵینەوەی قووڵە. چوونکە وەک دەزانرێ، لە زۆربەی کاتەکاندا ڕێکەوتی دانانی بەرهەمەکان دیار نییە.

**شەشەم:** وەک دەبینرێ، ئەم مۆدێلە لەخۆگری چەندین نەریتی ئەدەبی جیاجیایە و هەر کام لەم نەریتانە وەکوو پاژێک وان لە کۆی ئەدەبی کوردیدا. ئەو کۆیەی کە مەرج نییە یەکگرتوو و یەکدەست بێ یان یەک ئایدیای تێدا بەرجەستە بکرێتەوە و لە خزمەت بیر و ئامانجدا بێت. لە هەندێ لە مێژووە ئەدەبیە کوردیەکاندا تەنها یەک ئایدیا وەک هەژاری، سۆفیگەری و یان دڵداری (وەک کتێبەکەی سەجادی) یان یەک ئامانج، وەک ڕزگاری لە ژێردەستەیی، بەرجەستە کراوەتەوە (وەک کتێبەکەی ئۆزون). بە پێچەوانەوە، مێژووی ئەدەبی کوردی ئاقاری جیاوازییە فیکری و شێوازناسانەکانە و ئەبێ ئەم مۆدێلەش نیشاندەری ئەو جیاوازیانە بێت.

**ئەنجام:**

هەوڵەکانی مێژوونووسی ئەدەبی لە ئەدەبی کوردیدا ڕووبەڕووی چەندین کێشەی مێتۆدۆلۆژیک دەبنەوە کە گرنگترینیان نەبوونی ئولگوویەکە بۆ دابەشکاری و پۆلێنکاری قۆناغ و نەریت و بەرهەمە ئەدەبییەکان. دیارە ئەم گرفتە بە هۆی بوونی چەندین میرنشینی سەر بە چەندین ئیمپراتۆری گەورە و دوور لە یەک لە بواری فەرهەنگیو تەنانەت ئایینیشەوە هاتۆتەئاراوە. هەربۆیەش، پاش دەرخستنی کێشە مێتۆدۆلۆژیکەکانی هەوڵە مێژوونووسیە ئەدەبیەکان لە ئەدەبی کوردیدا، مۆدێلێکی پۆلێنکراو خراوەتە ڕوو کە لەلایەکەوە، پشتی بەستۆتە بەردەوامی لە یەک نەریتی ئەدەبی دیاریکراوەوە و لە لایەکی تریشە، لە پێناو گرنگیدان بە پێشینە فەرهەنگی و مێژووییەکان پشتی بەستۆتە ئەو بنەما تیۆریکەی کە بۆچوونی ڕەخنەیی «مێژوویی‌خوازیی نوێ» دەستەبەری دەکات. ئەم مۆدێلە نەک هەر بۆ لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئەدەبی کوردی دەوری سوودبەخش دەبینێت، بەڵکوو دەشتوانرێت لە باس کردن لە سەر مێژووی کورد بە گشتی بە کار ببرێت.

**سەرچاوەکان:**


ئۆزون، محەمەد (٢٠٠٣) **ئانتۆلۆژیا ئەدەبیاتا کوردی**، ئیستانبۆل، وەشانێن ئارام.

خەزنەدار، مارف (٢٠٠١) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بەرگی یەکەم، هەولێر، دەزگای ئاراس.

خەزنەدار، مارف (٢٠٠٢) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بەرگی دووەم، هەولێر، دەزگای ئاراس.

خەزنەدار، مارف (٢٠٠٣) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بەرگی سێیەم، هەولێر، دەزگای ئاراس.

خەزنەدار، مارف (٢٠٠٤) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بەرگی چوارەم، هەولێر، دەزگای ئاراس.

سەجادی، عەلائەدین (١٩٧١) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، چاپی دووەم، بەغداد، چاپخانەی مەعاریف.

سجادی، بختیار (١٣٨٥) **کلیات تاریخ ادبیات کُردی (تا اوایل جنگ جهانی اول)**، دانشگاه کُردستان و سازمان مدیریت و برنامەریزی استان کُردستان.

مستەفا، عیزەدین و چەند نووسەری تر (١٩٧٨) **زمان و ئەدەبی کوردی (بۆ پۆلی شەشەمی ئامادیی)** چاپی دوەم، بەغداد، چاپخانەی ئەلعراق.

Brannigan، John, (1998) , *New Historicism and Cultural Materialism*, London, MacMillan Press Ltd.,.

Wimsatt, William K. and Monroe C. Beardsley (1954), *The Verbal Icon: Studies in the Meaning of Poetry*, University of Kentucky Press.

# مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی

## (کێشەی سەرەتا و سەرهەڵدان تا سالی ١٩٧٠)

د. فوئاد ڕەشید محەمەد [*]

**کورتە:**

لەنێو بزاڤی ڕەخنەی ئەدەبی کوردیدا چەندین گرفت و کێشە بەدی دەکرێت، وەکو کێشەی زاراوەی ڕەخنەیی و بوون و نەبوونی میتۆد و نەبوونی وتارێکی ڕەخنەیی سەربەخۆ و چەندین کێشەی دیکە. لەمانەیش دیاریکردنی مێژووی سەرەتای سەرهەڵدانی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی، بابەتێکی کێشەداری نێو ئەم بزاڤەیە؛ چونکە ئەم دیاریکردنە تەنها هەر ئەوەندە نییە مێژوویەک یان قۆناغێک دیاری بکەیت، بەڵکوو بەندە بەجۆری ئەو کەرەستەیەشەوە کە دەکرێتە نموونەی کاری ڕەخنەیی.

لێرەوە ئەم لێکۆڵینەوە هەوڵدانێکە بۆ خستنەڕوو و هەڵسەنگاندنی بیروبۆچوونە جیاوازەکانی ئەم بوارە؛ واتە تەنها سنووری دیاریکردنی سەرەتای ڕەخنەی کوردی دەگرێتەوە.

لێکۆڵینەوەکەمان لەدوو تەوەر و ئەنجام پێک هاتووە:

**تەوەری یەکەم:** تەرخانکراوە بۆ ئەو بیروڕایانەی کە سەرەتای ڕەخنەی ئەدەبی کوردی دەبەنەوە نێو شیعری کلاسیکی کوردی.

**تەوەری دووەم:** تەرخانکراوە بۆ ئەو بیروبۆچوونانەی کە سەرەتای ڕەخنەی ئەدەبی کوردی گرێ دەدەنە بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردییەوە.

لەمیانی ئەم دوو تەوەرەدا زۆربەی بیروڕاکانی سەر بە بابەتەکە تاوتوێ کراون و توێژەر هەوڵیداوە پوختەی بیروڕاکان هەڵبسەنگێنێت.

لەکۆتاییشدا و لەژێر ناونیشانی «ئەنجام»دا گرنگترینی ئەو خاڵانە دیاریکراوە کە دەکرا وەکوو ئەنجامێکی لێکۆڵینەوەکە دیاری بکرێن.

**وشە سەرەکییەکان:** ئەدەبی کوردی، ڕەخنە، ڕەخنەی ئەدەبی، ڕۆژنامەگەری.

---

[*] بەشی زمانی کوردی ـ کۆلێژی پەروەردەی بنات، زانکۆی سەلاحەدین ـ هەولێر.

## مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی (کێشەی سەرەتا و سەرهەڵدان)

دیاریکردنی سەرەتای مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی بابەتێکی کێشەداری نێو بزاڤی ڕۆشنبیری و ڕەخنەی ئەدەبی کوردییە، بەو مانایەی لەم لایەنەشدا بیروبۆچوونی نەک هەر جیاواز، بەڵکوو تەواو دژ بەیەک هەیە کە پێویستیان بە توێژینەوە و پێداچوونەوەیە. هێندەی من ئاگاداربم، تێکڕای ئەم بیروبۆچوونە جیاوازانە لە دوو توێی توێژینەوەیەکی سەربەخۆدا تاوتوێ نەکراون. ئەمەش بۆ خۆی لەخۆیدا لە لایەک لێڵییەکی خستۆتە نێو بابەتی مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردییەوە، لەلایەکی دیکەشەوە لەڕووی دیاریکردنی تەمەنی ڕەخنەی ئەدەبی کوردییەوە، نووسەرانی تووشی بیروڕای جیاواز و نەساز کردووە، بۆ نموونە:

- «ئازاد عەبدولواحید» لە دەستپێکی وتارێکیدا قسە لەسەر «ڕەخنەی شیکردنەوە» (النقد التفسیری) دەکات و دەڵێت: «ئێمەی کوردیش لەڕێی کولتووری عەرەبییەوە توانیمان لەو تەمەنە کورتیلەیەی ڕەخنەی کوردی سوودی لێوەربگرین» (عەبدولواحێد، ١٩٧٨: ٩٩).

- «ڕەووف بێگەرد» پێیوایە «ڕەخنەی ئێمە وەک کارە ئەدەبی و هونەرییەکانی ترمان ڕەخنەی کوردن و تەمەنی نووسینی ڕەخنەییمان کورتە»(گ.نووسەری کورد، ١٩٨٣، ژ١١: ١٠٨).

- «عەبدوڵلا یاسین ئامێدی» لەو ڕوانگەیەوە کە «ڕەخنەی ئەدەبیمان لەگەڵ یەکەمین شاعیری کوردا هەڵقوڵاوە» (ئامێدی، ١٩٨٩: ١٩) بۆیە پێیوایە کە «ڕەخنەی کوردیش تەمەنی نزیکەی ١٠٠٠ساڵ بێت» (هەمان سەرچاوە).

- «موحسین ئەحمەد عومەر» لەئاماژەیەکی زۆر کورتدا بۆ چەندێتی تەمەنی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی نووسیویەتی: «بێگومان ڕەخنەمان هەیە و مێژوویەکی دوورودرێژیشی هەیە» (گ.کاروان، ١٩٩٤، ژ١٠: ٤٠).

تێبینی دەکرێت تەمەنی ڕەخنەی کوردی لەلایەن نووسەرانی کوردەوە بە دەربڕینە جیاوازەکانی «کورت» و «کورتیلە» و «دوورودرێژ» دیاریکراوە. هەڵبەتە هۆی ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی جیاوازی لەسەر جۆری ئەو بەرهەم و نووسینانەی کە دەکرێنە دەستپێک و سەرەتای مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لەم میانەدا توێژەر و نووسەرانی کورد و بیانیش بیروڕای جیاوازیان خستووەتە ڕوو. لە پێداچوونەوەیەکی کرۆنۆلۆژیانەدا دیارترینی ئەم بیروبۆچوونانە لەدوو تەوەردا دەخەینەڕوو:

### تەوەری یەکەم: ڕەخنەی ئەدەبی لەنێو شیعری کلاسیکی کوردیدا:

بەبۆچوونی هەندێک لە نووسەر و توێژەرانی کورد، دەکرێت سەرەتاکانی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لەشیعری کوردیدا بەدی بکەین. لەم لایەنەوە عەلائەدین سەجادی و د.عیزەدین مستەفا ڕەسوول داڕێژەری ئەم جۆرە بۆچوونانەن، بەڵام هەر یەکەیان بەشێوەیەک:

- عەئەلادین سەجادی لە کتێبی «نرخشناسی»دا لە باسکردنی لێکۆڵینەوەی نرخشناسیدا، ئاماژە بە مێژووی سەرهەڵدانی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە دەکات و دەڵێت «لەناو ئەدەبی کوردیدا پیاو زات ئەکا کە بڵێ ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەدەی پانزەهەمەوە داهاتووە، لەو سەردەمەوە کە بەڵگەی ئەدەبی کوردی بەپێی

پلەکانی بەڕیز هاتۆتە خوارەوە، ئەوەندە هەیە ئەم داهاتنە کە داهاتووە لەناویا وە نەبێ بەشێوازێکی پوختی ڕێک و پێک بووبێت...» (سەجادی، ١٩٦٩: ١٠). هەڵبەتە سەجادی هەر زوو دەرکی بەوە کردووە کە ئەم سەرهەڵدانە بەواتای نوێی چەمکی لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی نەبووە، بۆیە ڕاستەوخۆ دوای بۆچوونەکەی خۆی یەکسەر دەڵێت: «ئەتوانین بڵێین بەجۆرێکی یاسای زانیاری ناوی لێکۆڵینەوەی نەبووە...» (سەجادی، ١٩٦٩: ١٠).

دواتر سەجادی بەکورتی ئاماژە بە بەرهەمی شاعیرانی وەک جزیری و نالی دەکات و دەنگدانەوەی شیعرەکانیان لەنێو خەڵکیدا و چێژ وەرگرتنی خەڵکانێک لەشیعرەکانیان، بەشێوەیەکی سادەی لێکۆڵینەوەی نرخشناسی لە قەڵەم دەدات و دەڵێت «ئەمە ئەوە ئەدات بەدەستەوە کە بناغەی لێکۆڵینەوە و نرخشناسی بە تەرحێکی سەرەتایی و دوور لەبیرکردنەوە و زانیاری، لەچەشەی کوردو ئەدیب و هۆنەرانی کورددا هەبووە، جا با نەکەوتبێتە شێوازێکی زانیاریشەوە» (سەجادی، ١٩٦٩: ١١).

ئەگەر بەوردی لەم بۆچوونانەی سەجادی وردبینەوە، تێبینی ئەوە دەکەین کە ناوبراو شیعرەکانی جزیری و نالی دەکاتە بەڵگەی هەبوونی هەست و چەشەی ڕەخنەیی لای خوێنەر و خودی شاعیری کوردیش، بەڵام دەکرێت هەبوونی هەست و چەشەیەکی ڕەخنەیی لای خوێنەر و شاعیر نیشانەی هەبوونی هۆشمەندی و تێڕوانینێکی ڕەخنەییانە بێت، نەک تەرحێکی سەرەتایی لێکۆڵینەوە؛ هەر وەکوو سەجادی بۆی چووە، چونکە هەست و چێژ شتێکە زۆر جیاوازە لە لێکۆڵینەوە، جا سادە بێت یا قووڵ، کورت بێت یان درێژ.

جێگای ئاماژە پێدانیشە کە سەجادی هیچ نموونەیەکی شیعری لەشیعرەکانی جزیری یا نالی نەهێناوەتەوە، تا بیکاتە پاڵپشتی بۆچوونەکەی؛ یاخود زیاتر ڕوون کردنەوەی مەبەستەکەی خۆی، بەڵکوو بەشێوەیەکی گشتی بۆچوونەکەی خستووەتەڕوو.

- د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ بەمەبەستی دۆزینەوەی چەند بۆچوون و بنەمایەکی ڕەخنەی ئەدەبی لەنێو شیعری کلاسیکی کوردیدا، ڕوونتر لە عەلائەدین سەجادی کاری لەسەر چەند شیعرێکی «ئەحمەدی خانی» (١٦٥٠- ١٧٠٧ز) کردووە.

د. عیزەدین لە وتارێکیدا بەناونیشانی «خانی و ڕەخنەی ئەدەبی کوردی»، قسە لەسەر مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی دەکات و دەڵێت «ئەگەر بمانەوێ دەست بدەینە نووسینەوەی مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی، ئەوا دەبێ سەرەتای ئەم زانستە لەکوردیدا دەست نیشان بکەین، بۆ ئەمەش سەرەتای زۆر زانستی تر لە کوردیدا بەلای منەوە هەر دەبێ بچینەوە سەر ئەحمەدی خانی و لەوەوە دەست پێبکەین» (گ.نووسەری کورد، ١٩٧٢، ژ٥: ٤٥).

ئەم جەختکردن و پێویستییەی د.عیزەدین لەو قەناعەتەوە سەرچاوەی گرتووە خۆی گوتەنی «بیری ڕەخنەگری خانی لەوە چۆتە دەرەوە کە لە هەندێ بەرهەم و داستانی ڕۆژهەڵاتدا دەیبینین، یا هەندێ شاعیر بە گیانێکی پڕ لەتەوازوعکارییەوە ڕوو ئەکاتە خوێنەران...» (هەمان: ٤٦).

د. عیزەدین دەڵێت: «... ئەگەر ئەو بیرەی خانی نەختێ فراوانتر بکەینەوە و تۆزێک بەرەو قووڵایی بەرین، ئەوا هەر ئەو چوارچێوە گشتییە ڕاگرێتەوە کە ئەمڕۆ ئێمە چەشنی ڕەخنەو ڕەخنەگرانی تیادا جێ دەکەینەوە» (هەمان سەرچاوە).

ئینجا د.عیزەدین چەند کۆپلە شیعرێکی خانی دەهێنێتەوە، وەک نموونەیەکی بیری ڕەخنەیی لای خانی. بۆ نموونە لەشرۆڤەی ئەم کۆپلە شیعرەدا:

ئومێد ئەوە ژ ئەهلی عیرفان ئەو دی نەگرن لمن چوو حەرفان

تەشنیع نەکەن وەکی غەیوران ئیسلام بکەن لمن قسووران

ئەسحابی کەمال پەردە پۆشن، ئەربابی غەرەز دەپڕ خرۆشن

مەئموول ئەوە ژ ئەهلی ڕازان ئەودی نەگرن لمن تەنازان

د.عیزەدین نووسیوێتی خانی: «لێرەدا ڕەخنەگران دەکات بەدوو بەشەوە:

ئەوانەی ڕق و کینە دڵی پڕ کردوون و ڕەخنەیان بۆ ئەوەیە کە نووسەر سارد بکەنەوە و وای لێ بکەن کە ئیتر نەنووسێ. ئەوانەش کە ڕەخنە دەکەن بەهۆی پێشخستنی ئەدەبیات و کەم و کووڕی نووسەر بەچەشنێک دەستنیشان دەکەن کە چارەسەریان بکات و...» (هەمان: ٤٨). لەدرێژەدان بەم جۆرە ئاماژە پێدانە د. عیزەدین لەبڕگەیەکی دیکەدا دەنووسێت: «... لەچەند شوێنی «مەم و زین»دا دێڕی وا دەبینین کە خانی بکات بەڕەخنەگر، واتە بەشێوەیەکی سادە بڕیار بەسەر هەندێ دیمەنی بەرهەمی ئەدەبیدا بدات. نموونەی ئەمەش دوا بەشی مەم و زینە کە خانی لەگەڵ خامەدا دەکەوێتە قسە» (هەمان: ٤٩).

لێرەدا ئەم بۆچوونەی د.عیزەدین ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبێتەوە، ئایا کار و ئەدگاری ڕەخنەگر، بڕیاردانی سادەیە بەسەر دەقی ئەدەبیدا، تاوەکوو ڕەخنەگربوونی خانی گرێ بدرێتە هەبوونی بڕیاری سادەوە؟ لێرەدا چەمکی ڕەخنەگر لای د.عیزەدین دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە، ئایا مەبەستە ئەدەبیەکەی بەکاری هێناوە یاخود بەمانا گشتیەکەی؟ دیارە بەسەرنجدان لەناونیشانی وتارەکەی «خانی و ڕەخنەی ئەدەبی کوردی»، پێدەچێت مەبەستی مانا ئەدەبیەکەی بێت، جا بەم مانایەش ئەرکی ڕەخنەگری ئەدەبی دوورە لە سادەییەوە و پێتڤییە بابەتیانەو وردەکارانە دەقی ئەدەبی هەڵبسەنگێنێت. لەکۆتایی وتارەکەیدا د.عیزەدین دەگاتە ئەم ئەنجامەو دەڵێت: «بەمجۆرە دەتوانین خانی بەسەرئامەدی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی دابنێین...» (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

لەڕاستیدا د.عیزەدین لەم بۆچوونانەیدا، بە ڕەهایی و گشتگیرانە قسەی کردووە، بەمەش ڕایەکانی ڕووبەڕووی چەندین سەرنجی ڕەخنەیی دەبێتەوە؛ وەک ئەوەی بەشێوەیەکی زانستیانە مامەڵەی لەگەڵ چەمکی ڕەخنەی ئەدەبیدا نەکردووە، هەر ئەمەیشە وای لێکردووە خانی بە یەکەم ڕەخنەگری کورد دابنێت.

لەلایەک دەڵێت: ڕەخنە زانستە و کەچی دەچێت لەنێو چەند دێڕە شیعرێکدا نموونەی بۆ دەهێنێتەوە. ئاخر زمان و دنیای زانست و شیعر زۆر لەیەکدی جودان. ڕەخنەگر توێژەرە و توێژینەوە ئەنجام دەدات بەپشت بەستن بەچەند بنەماو بەهاو میتۆدێکی ڕەخنەیی. «خانی» شاعیر بووە و مەبەستی شیعر نووسین

بووە، نەک توێژینەوە. بوونی چەند ئاماژەیەکی نزیک لـەبۆچوونی ڕەخنـەیی، خـانی ناکاتـە ڕەخنـەگر؛ بـەڵام دەکرێ بڵێین خانی تا ڕادەیەک خاوەنی هۆشمەندیەکی ڕەخنەیی بووە. ئەمەش هـەرگیز نـە خـانی دەکاتـە ڕەخنەگر و نە «مەم و زین» دەکاتە بەرهەمێکی سەر بەڕەخنەی ئـەدەبی. دەبـێ ئـەو ڕاسـتیەش بڵـێین کـە بۆچوونەکانی عەلائەدین سەجادی و د.عیزەدین مستەفا دەربارەی گرێدانی بوونی ڕەخنـەی ئـەدەبی کـوردی بەشیعری کلاسیکی کوردیەوە لەکاتی خۆی و دواتریشـدا کاریگـەری خـۆی هـەبووە لـە نێوەنـدی ئـەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا.

دەکرێ ڕواڵەتەکانی ئەم کاریگەرییە لەدوو ڕووەوە ببینین: لەلایـەک سـەرنجی هەنـدێک لـە نووسـەران و ڕەخنەگرانی کوردی بۆ ئەوە ڕاکێشێ کە سەرەتایەکی کەڤنتر بۆ ڕەخنـەی ئـەدەبی کـوردی دیـاری بکـەن و ئاوڕێکی زیاتر لەشیعری کلاسیکی کوردی بدرێتەوە و وەکو بەرهەمێکی ڕەخنـەیش تەماشـا بکرێـت و لەسـەر ئەم بنەمایە کاری زیاتری لەسەر بکرێت[1]. لەلایەکی دیکەشەوە لەنێو خودی بیروڕاکانی عەلائـەدین سـەجادی و د.عیزەدیندا بۆچوونی جیاواز بێتە ئاراوە و لەم چوارچێوەیەدا «د.کامیل بەسیر» بەر لەهەر کەسێک بـیروڕای دیکەی کەمێک جیاوازی لە بیروڕاکانی د.عیزەدین دەربڕیوە.

د.کامیل بەسیر لەتوێژینەوەیەکەیدا بەناونیشانی «بنەڕەتەکانی ڕەخنەسازی و هۆنراوەی دێرینی کوردی» لە هەوڵدانیدا بۆ سەلماندنی هەبوونی سەرچاوەی ڕەخنەسازی دێرینی کوردی، ئاماژەی بە شیعری کلاسیکی کردووەو نووسیوێتی: «...بەڵگەیەکمان بەدەستەوە هەیە بۆ سەلماندنی بیروڕاکانمان، ئەم بەڵگەیەشمان هۆنراوەی دێرینی کوردیە کە لە دوو توێی دیوانە بەدەست گەیشتووەکانماندا دێڕە هۆنراوەگەلی بەرچاو کە دەنگدانەوەیەکی ڕەخنەسازی دەوروبەری هۆنەرەکانیانە» (گ.کۆڕی زانیاری،١٩٧٠، ژ٧: ٥٠).

جێگای سەرنجە د.کامیل دوای ئەم بۆچوونانەی هاتووە ڕەخنەی لە لیژنەی دانانی کتێبی «زمان و ئـەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی»[2] گرتووە، کـە ئـەمان ناڕاسـتەوخۆ پێیـان وابـووە «... ئـەو دێڕگەلانـەی هۆنراوەی کوردی ڕەخنەسازی کوردین و بەسەرچاوەی ڕەخنەسازیی دەژمێردرێن» (بەسیر، ١٩٩٠: ٥١).

د.کامیل بەسیر ئەم بۆچوونـە ڕەتدەکاتـەوە و ڕاسـتەوخۆ دەڵـێت: «بێگومـان بیروڕایـەکی زانسـتی نییـە» (هەمان سەرچاوە)، ئەمەش لەو سۆنگەیەوە کە «مەفهومی ڕەخنەسازیی لەسەر ئـەوە یـەک دەگـرێ کـە ئـەم کارە ئاکامێکی زانستی و هونەریە و ئەنجامدەرەکەی پشت دەبەستێ بەشێوازەکانی توێژینەوە و شـیکردنەوە و بەراوردکاری لە هەڵسەنگاندنی تێکستی وێژەیی و ئەم شێوازانەش هەڵبەت تەنیا بە پەخشان ئـەنجام دەدرێـن نەک بەدێڕە هۆنراوە...» (هەمان سەرچاوە).

کەچی هەر خۆشی چەند دێڕە شیعرێکی کلاسیکی دەکاتە بەڵگەی بوونی، ڕەخنەی کوردی.

---

[1]- دەتوانین بڵێین ماستەرنامەی «پەیدابوونی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا» کە ساڵی ١٩٨٩ لەلایەن «یاسین عەبدوڵلا ئامێدی»یەوە، پێشکەشی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدین کراوە، لەژێر کاریگەری ئەم بۆچوونانەو وەک درێژە پێدەری ڕایەکانی عەلائەدین سەجادی و د.عیزەدین مستەفا نووسراوە.

[2]- د.کامیل ئاماژەی بەساڵی چاپی کتێبەکە نەکردووە، هێندە نەبێ ناوی لیژنەی دانانی کتێبەکەی نووسیوە کە بریتین لە عەبدوڵلا شاڵی، د.عیزەدین مستەفا، عەلائەدین سەجادی، د.ئەمین عەلی سەعید و چەند کەسێکی تر.

لەم ڕووەوە دەڵێت: «بیروڕامان وایە کە ئەو دێڕە هۆنراوانە لە بابەتی شانازی کردن و ستایش دەدوێن و سنووری ئەو بابەتەش چەند بنەڕەتێکی ڕەخنەسازی دەگرێتەوە» (هەمان).

جا ئەگەر وایە ئیدی بۆچی ڕەخنە لە دانەرانی «زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی دەگرێت؟» کە هەندێ دێڕە شیعری خانی یا حاجی قادر یان بەهەبوونی ئاماژەی ڕەخنەیی تێدا لەقەڵەم دابێت، بۆیە ئەم پرسیارە دەکەین، چونکە د. کامیل خۆشی دواتر هاتووە چەندین دێڕە شیعرێکی نالی و سالم و حاجی قادری هێناوەتەوە و کردوونی بە بەڵگەی بوونی چەند بنەڕەتێکی ڕەخنەیی و لەم ڕێگایەوە چەند ئەنجامێک بۆ توێژینەوەکەی دیاری دەکات، وەک «لە هۆنراوەی دێرینی کوردیدا دێڕگەلێک بەرچاو دەکەون، هەرچەندە لەبەر چەند هۆیەکی زمانی و شێوازی و بابەتی و دەرفەتی نەتوانرێ بەلێکۆڵینەوەی ڕەخنەسازی بژمێردرێن، بەڵام ئاوێنەیەکن بۆ ڕەنگدانەوەی چەشەو چێژی هونەری» (هەمان: ٧٨). لێرەدا د.کامیل ڕووبەڕووی ئەو پرسیارە دەبێتەوە، ئایا تەنها چەشە دەبێتە «سەرچاوەی بنەڕەتی ڕەخنەسازی دێرینی کوردی؟» ئاخر باس لە «ڕەخنەسازیی دێرینی کوردی» دەکرێت، کەچی چەند دێڕە شیعرێک دەکرێتە بەڵگە! لەکاتێکدا د.کامیل زیاد لەجارێک ئەو ڕاستییەش دووپات دەکاتەوە کە «ڕەخنەسازی بەپەخشان دەنووسرێتەوە و ڕێبازە زانستیەکەی لەسەر بناغەی شیکردنەوە و بەراوردکاری و هۆو خستنەڕوو دامەزراوە» (هەمان: ١١٥). دیارە ئەم ڕاستیەش بۆچوونی پێشووی دەکاتە بە ڕێز پرسیارێکی گوماناویە و نەسازیی بۆچوونەکانی بەرجەستە دەکات.

«کەمال غەمبار» لە لێکۆڵینەوەیەکیدا بەناونیشانی «سەرەتایەک لەمێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی» کە مەبەستی لەم کارەش خۆی گوتەنی «مێژووی ڕەخنەی شیعری کوردیە» ئیدی لێرەوە ڕاستەوخۆ لە بیرو بۆچوونەکانی د.عیزەدین مستەفا دەستپێکردووە و هەوڵی دەستپێشخەریانەی عەلائەدین سەجادی فەرامۆش کردووە.

کەمال غەمبار ڕەخنەی لەبیروڕاکانی د.عیزەدین گرتووە دەربارەی ئەوەی کە خانی بەرابەری ڕەخنەی کوردی داناوە و دەڵێت: «ڕەنگە هەندێ خاسیەت و ڕووخساری ڕەخنەسازی لەپێشەکیەکەی "مەم و زین"دا بەدی بکەین، بەڵام من لەو باوەڕەدام کە ئەمانە نابنە بنەگە و بنچینەی ڕەخنەیەکی "مەنهەجی" و زانستی» (گ. ڕامان، ١٩٩٦، ژ٣: ١٦).

دواتر کەمال غەمبار چەند کۆپلە شیعرێکی ئەحمەدی خانی شرۆڤە دەکات.

وەک: لێ هیڤی دکەم ژ موستەعیران مەزنان نەگرن ل موستەفیدان

ئەڤ نامە ئەگەر خراپە ئەگەر قنج کێشایە دگەل وێ مە دوسەد ڕەنج

لەئاست ئەم دێرانەو هاوشێوەکانیدا غەمبار دەڵێت: «دێڕە شیعری تر هەن کە سەرجەمیان لەچوارچێوەی ئەوە دەرناچن کە شاعیر داوا لەخوێنەران دەکات کە چاو لەکەم و کووڕی شیعرەکانی بپۆشن؛ ئەگەر دەکرا لایەنی چاکەی باس بکەن» (هەمان سەرچاوەی پێشوو).

دواتر دەڵێت «هەندێ ڕەنگ و ڕوخساری ڕەخنە لەچەند دێڕێکیدا بەدی دەکرێن، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بکرێ بە ڕابەر» (هەمان:٢٠).

لێرەدا غەمبار بەهانەی ئەوە دەهێنێتەوە کە بۆیە ناکرێ خانی بەڕابەر دابنرێت، چونکە «دەبێ بەدوای لەو کۆنتر بگەڕێین و لە شیعرەکانیاندا بکۆڵینەوە».

کەمال غەمبار ئەگەرچی ڕەخنەی لە بۆچوونەکانی د.عیزەدین گرتووە سەبارەت بە ڕەخنەگرکردنی خانی، بەڵام ڕەخنەی لە د.کامیل بەسیریش گرتووە کە بەیەکجاری ئەم بۆچوونەی د.عیزەدینی ڕەتکردۆتەوە، بەو بەهانەوە کە ئەو جۆرە دێڕە هۆنراوانەی خانی «بەپێوانەی پێناسەی کۆن و تازەی ڕەخنەسازی، بەکاری ڕەخنەسازیی ناژمێررێن» (بەسیر، ١٩٩٠: ١١٥).

لێرەدا غەمبار پێیوایە «ئەم بۆچوونەی دکتۆر کامل بەسیر بەپێی پێناسەی کۆنی ڕەخنەسازی لەجێگەی خۆی نییە، چونکە ئەگەر بە قووڵی لەو دێڕە شیعرانە وردبینەوە، بەتەواوەتی بۆمان دەردەکەوێت کە شاعیرانی کۆن ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ، دوور و نزیک هەندێک خاڵیان دەستنیشان کردووە کە دەچنە خانەی ڕەخنەسازییەوە» (ڕامان: ١٧).

هەروەها غەمبار ڕەخنە لەهەردوو لێکۆڵەران (د. عیزەدین و د. کامیل بەسیر) دەگرێت کە گرنگیان بە جزیری و فەقێ تەیران نەداوە و ئاماژە بەوە دەکات ئەگەر ڕەخنە شانازی کردن و ستایش کردن بێ «دەتوانم جزیری بە ڕابەری ڕەخنەسازی ئەدەبی کوردی لەقەڵەم بدەم» (ڕامان: ١٧) ئینجا لەم تێڕوانینە غەمبار هەندێ دێڕە شیعری جزیری و فەقێ تەیرانی شرۆڤە کردووە و کردوویەتییە بەڵگەی بۆچوونەکانی خۆی.

کەمال غەمبار لەبەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەیدا، ڕەخنەی ئەوە لە د.کامیل بەسیر دەگرێ کە ئەگەرچی بایەخی بەشیعرەکانی داوە لەڕووی هەبوونی ئاماژە و بۆچوونی ڕەخنەییەوە، «بەڵام دان بەوەدا نانێ کە حاجی قادری کۆیی ڕابەری ڕەخنەیەکی سەرەتاییە، با بەشیعریش وتبێتی. مەرج نییە ڕەخنەگرتن هەر دەبێ بە پەخشان بێ» (هەمان:٢٠).

دوای دیاریکردنی چەند بۆچوون و بەهایەکی ڕەخنەیی، لەنێو چەند کۆپلەو دێڕە شیعرێکی حاجی قادردا، کەمال غەمبار دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە «حاجی قادر بەڕابەری ڕەخنەی سەرەتایی ئەدەبی کوردی دەژمیررێت» (هەمان). لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەیدا غەمبار چەند هۆکارێکی مێژوویی و بابەتیانەی دیاری کردووە وەکوو بەڵگەو بەهانەیەک بۆ پشتیوانی کردنی ئەنجامەکەی.

پێم وایە لێرەدا کێشەکە ئەوە نییە کە ئایا خانی یەکەم ڕابەڕی ڕەخنەی ئەدەبی کوردییە؟ هەر وەکوو د.عیزەدین ڕایگەیاندووە، یان نالی کە د.کامیل بەسیر وای نیشان داوە، یاخود حاجی قادری کۆیی هەروەکوو کەمال غەمبار کاری بۆ کردووە. لەڕاستیدا ئەم سا تێڕوانینە لەوەدایە کە لەلایەک تێگەیشتنێکی زانستیانەیان نیشان نەداوە بەرامبەر چەمکی «ڕەخنەی ئەدەبی» تا وەکو لەڕوانگەی ئەم تێگەیشتنەوە مامەڵەیان لەگەڵ شیعری کلاسیکی کوردی بکردایەو ئەو دێڕە شیعرانەش بۆچوون و ئاماژەیەکی ڕەخنەیی لەخۆ گرتووە، لەبەر ڕۆشنایی ئەم تێگەیشتنە پۆلین بکرانایە.

هەر ئەم هۆکارەشە وایکردووە ناوبراوان بۆچوونەکانیان جارێک لەگەڵ مانـاو مەبەسـتی زانسـتیانەی خـودی چەمکی «ڕەخنەی ئەدەبی» نەسازو ناتەبا بێت. جارێکیش هەر لەنێو قسەکانی خۆیانـدا نەسـازی بکەوێتـەوە. هەر بۆ نموونە کەمال غەمبار لە ڕەتکردنەوەی بۆچوونی د.عیزەدین لەمەڕ دانانی خـانی بـە ڕابـەری ڕەخنـەی کوردی، دەربارەی نموونە شیعرەکانی خانی لەم بوارەدا دەڵێت «من لەو بـاوەڕەدام کـە ئەمانـە نابنـە بنەگـەو بنچینەی ڕەخنەیێکی "مەنهەجی" و زانستی» (هەمان: ١٦). جا ئێستا بەم پێوەرەی غەمبار دێڕە شـیعرەکانی حاجی قادریش نابنە بنچینەی ڕەخنەیەکی مەنهەجی، واتە ئەو ڕەخنەیەی ئاڕاسـتەی د. عیـزەدینی کـردووە، دەکرێ ئاڕاستەی بۆچوونەکەی خۆشی بکرێتەوە.

## تەوەری دووەم: دیاری کردنی سەرەتای ڕەخنەی ئەدەبی لەنێو ڕۆژنامەگەری کوردیدا:

هەندێک لە نووسەرانی کورد و غەیرە کوردیش، بۆ دیـاری کـردنی سـەرەتای ڕەخنـەی ئـەدەبی کـوردی، ڕاسـتەوخۆ دەگەڕێنـەوە بـۆ ئـەو نووسـینانەی کـە لـە گۆڤـارو ڕۆژنامـە کوردییەکانـدا بڵاوکراونەتـەوە، ئـەم هەڵوێستەشیان لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە کاری ڕەخنـەیی کـارێکی بەپەخشـان نووسـراوە. بۆیـە لێـرەوە دەست پێدەکەن و ئاوڕ لەدەقی شیعری یان وردتر بڵێین، بۆچـوونی ڕەخنـەیی بـە شـیعر نووسـراو نادەنـەوە. دەکرێ لەم سەروبەندەدا ئاماژە بە بیروڕای چەند نووسەرێک بکەن.

- ڕۆژهەڵاتناس «تۆمابوا» لەکتێبەکەی خۆیدا (لەگەڵ کوردەکاندا) قسەی لەزۆر لایەنی ژیانی گەلی کورد کردووە؛ لەمانەش بابەتی زمان و ئەدەبی کوردی. لەم چوارچێوەیەشدا جیا لەزۆربەی ڕۆژهەڵاتناسەکانی دی، لەپاڵ باس کردنی ئەدەبی کوردیدا، ئاماژەیەکی کورتیشی بۆ سەرەتاکانی ڕەخنە لە ئەدەبی کوردیدا کردووە و نووسیوێتی: «بەزۆری چەند وتارێکی سادە و کورتە ئاماژەیەک بەدی دەکەین، بەڵام لەگەڵ ئەمەش بایەخی ئەدەبیانەی خۆی هەیە» (تومابوا، ١٩٧٥: ١٥٣). ئینجا تۆمابوا ئاماژە بە نووسینەکانی «جەلادەت بەدرخان» و «دلدار» و «مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی» دەکات.

هەڵبەتە ئەم نووسینانە دەگەڕێنەوە بۆ سالانی سـییەکان و چلـەکانی سـەدەی بیسـتەم. هـەروەها تۆمـابوا ناڕاستەوخۆ ئەو پێشەکییانەی مارف خەزنەداریش کە بۆ چەنـد دیـوانێکی شـیعری نووسـیوە، بـە بەرهـەمێکی ڕەخنەیی لەقەڵەمداوە.

لێرەدا سەرنج دەدەین:

تۆمابوا بەهیچ شێوەیەک سەرەتای بوونی ڕەخنەی لە ئەدەبی کوردیدا نەگەڕاندۆتەوە بۆ نێو شیعری کلاسیکی کوردی، وەکو هەندێک لە نووسەرانی کورد وایانکردووە.

تۆمابوا دەرکی بەوە کردووە کە ئەو نووسینانەی ئاماژەیان پێدەکات تەواو ناچنە ناو چوارچێوەی زانستیانەی ڕەخنەی ئەدەبییەوە؛ بۆیە بە «وتاری سادە و کورتە ئاماژە» یان لەقەڵەم دەدات. هەڵبەتە ئەمەش بۆخۆی لە خۆیدا نیشانەی هەبوونی تێگەیشتنێکی بابەتیانەیە بەلای تۆمابواوە بۆ چەمکی ڕەخنەی ئەدەبی.

«کەمال مەمەند میراودەلی» لەنووسینێکیدا بەناونیشانی «دەربارەی ڕەخنە و ڕەخنەی ئەدەبی کوردی» قسەی لەسەر ڕەوشی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی کردووە و هەر لەسەرەتای نووسینەکەیشیدا ئەوە ڕادەگەیەنێت کە مەبەستی لەچەمکی ڕەخنە «مانا زانستییەکەی ڕەخنەیە» (مەمەند، ١٩٨١: ٥٠). هەر بۆیەشە دەڵێت: «بوونی بیرێکی زانستی مەرجی سەرەکی ڕەخنەگرتنە» (هەمان: ٥١).

لەگەڵ ئەمەشدا ئاماژەیش بەوە دەکات کە «ڕەخنە دوا بەدوای شیعرو ئەدەب لەدایک دەبێ، بەتایبەتی لەکاتێکا کە نووسینی پەخشان دەبێتە باو» (هەمان: ٥٣). لەسەر ئەم بنەمایانە کەمال مەمەند سەرەتای سەرهەڵدانی ڕەخنەی کوردی دەگەڕێنێتەوە بۆ سەرهەڵدانی ڕۆژنامەگەری کوردی و دەڵێت: «... بۆیەش لە ئەدەبی کوردیدا ڕەخنەی ئەدەبی لەساڵەکانی چل و پەنجادا، لەگەڵ لەدایک بوونی گۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا لەدایک بووە، وەکوو گۆڤاری گەلاوێژ، هەتاو، شەفەق و ...» (هەمان: ٥٤).

ئەم بۆچوونەی کەمال مەمەند لەگەڵ ڕوانینی زانستیانەی بۆ چەمکی ڕەخنە هەروەکوو خۆی ڕایگەیاندووە، ڕووبەڕووی چەند سەرنجێک دەبێتەوە:

بەر لەهەموو شتێک «شیعر»ی بەسەرچاوە و بەرهەمی ڕەخنەیی نەزانیوە، کە ئەمەش تەبایە لەگەڵ مەبەستی زانستیانەی چەمکی ڕەخنەدا، کە لانیکەم کاری ڕەخنەیی توێژینەوەیە و بەزمانی پەخشانە نەک شیعر.

کە سەرەتای لەدایکبوونی ڕەخنەی کوردی گرێ دەداتە لەدایک بوونی ڕۆژنامەگەری کوردییەوە، لێرەدا ئەو پرسیارە خۆی دەسەپێنێت کە ئایا بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردی لە عێراقدا لەچلەکان و پەنجاکان لەدایک بووە؟ دیارە نەخێر، بەڵکوو سەرەتاکانی ئەم بزاڤە بۆ دەیەی دووەمی سەدەی بیستەم دەگەڕێتەوە. لەلایەکی دیکەشەوە زۆربەی ئەو نووسینانەی نێو گۆڤار و ڕۆژنامە کوردیەکان کە کەمال مەمەند ئاماژەی بۆ کردوون، پڕ بە پێستی مانای زانستیانەی چەمکی ڕەخنەی ئەدەبی نین، تەنانەت کەمال مەمەند هەستی بەم لایەنە کردووە، بۆیە دەڵێت: «ئەو شتانەی دەربارەی ئەدەبی کوردی نووسراون و هەر چۆنێ بێ بەپێی بەهانەی زەرفەکانیان دەتوانین لەژێر ناوی ڕەخنەدا کۆیان بکەینەوە بریتین لەچەند وتارو بیروڕا و هەڵوێستێک» (هەمان: ٥٤). جا ئەم بۆچوونە جۆرە دوورکەوتنەوەیەکە لەو مەبەستە زانستییەی چەمکی ڕەخنە کە خۆی لە سەرەتای نووسینەکەیدا ڕایگەیاندووە.

- «سەباحی غالب» لەنووسینێکیدا بەناونیشانی «بەشێک لەمێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی» کە زیاتر تەرخانی کردووە بۆ ژیان و بەرهەمەکانی «شێخ نووری شێخ ساڵح» (١٨٩٦ ١٩٥٨).

هەڵبەتە بەسەرکردنەوەی ڕۆڵی بەرهەمی شێخ نووری لەژێر ناونیشانێکی وەک «بەشێک لەمێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی»، نیشانەی ئەوەیە کە سەباحی غالب لێرەدا پتر وەکوو ڕەخنەگرێک تەماشای شێخ نووری کردووە.

ئاشکرایە شێخ نووری زنجیرە وتارێکی بەناونیشانی «ئەدەبیاتی کوردی» لە بیست و پێنج ژمارەی ڕۆژنامەی ژیاندا ساڵی ١٩٢٦ و ١٩٢٧ بڵاو کردۆتەوە (بەسیر: ٥٠). سەباحی غالب ئاماژە بە بایەخ و گرنگی

ئەم وتارانەی شێخ نووری دەکات، بەشێوەیەک بەسەرەتای دەستپێکردنی ڕەخنەی ئـەدەبی کـوردی دانـاوە و لەژێر ناونیشانی «م. نووری ڕەخنەگر»دا دەڵێت «شارستانییەتی کورد لەڕوانگەی کارە ڕەخنەییـە پوختەکـەی "م. نوری"یەوە هەنگاوێکی گەورەی بۆ قۆناغێکی پێش کەوتوو هەڵگرتووە، لەبەر ئەوە دەستکردن بە ڕەخنـەی ئەدەبی بەزمانی پەخشان خۆی لەخۆیدا دیاردەیەکی شارستانییە» (گ.هیـوا، ١٩٨٦، ژ٥: ١٩٥)[٣٨]. زێـدەباری ئەمەش سەباحی غالب «شێخ نووری» بە ڕەخنەگرێکی ڕابەر لەقەڵەمداوە، جارێک کاتێک دەڵێت «لەکوردیـدا پێش چەرخی بیستەم ڕەخنەمان هەبووە، ڕەخنەگرمان نەبووە. دەتوانین وردتـر بڵـێین کـورد لـەپێش ١٩٢٦ تەنیا ڕەگی ڕەخنەمان لەشیعردا هەبووە، دوای ئەو ڕۆژگارە شانازی بەڕەخنەگران (م. نوری، ڕەفیـق حیلمـی و گۆرانەوە دەکەین» (هەمان).

لەم نووسینەی سەباحی غالبدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە تەنها لەسەر بنەمای پەخشان بوونی وتارەکانی شێخ نووری بڕیاری ڕەخنەگربوونی داوە، ئیدی هیچ ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر وتارەکانی شێخ نووری دەرنەبڕیوە، لەڕووی ناوەڕۆک و جۆری وتارەکانەوە، کە چ جۆرە ڕەخنەیەکن؟

بیروبۆچوونەکانی شێخ نووری لەکوێوە سـەرچاوەیان گرتـووە؟ تێکـڕا وەرگـرتن و وەرگێـڕان بـووە، یـاخود هەندێکی سەرنج و خوێندنەوەی تایبەتی خۆی بوو.

ئاشـکرایە د.کامیـل بەسـیر لـەکتێبی «شـێخ نـووری شـێخ ساڵـح لـەکۆڕی لێکۆڵـینەوەی وێـژەیی و ڕەخنەسازیدا» کە بەر لەنووسینەکەی سەباحی غالـب (واتـە لەساڵـی ١٩٨٠) بڵاویکردۆتـەوە، بـەوردی لـەزۆر لایەنی وتارەکانی شێخ نووری دواوە؛ بەڵام سەباحی غالب خۆی لەقەرەی ئەم جۆرە باسانە نەداوە.

هەڵبەتە وتارەکانی شێخ نووری هەروەکوو د.کامیل بەسیریش ئامـاژەی بـۆکردووە، زیـاتر نزیکـە لـەتیۆری ئەدەب و ڕەخنەیەکی تیۆرییە، بۆیە ئەم وتارانەش بەتەواوی ناچنە نێو چوارچێوەی پێناسەی چـەمکی ڕەخنـەو ئەدەبییەوە کە جەخت لەوە دەکاتەوە کـاری ڕەخنـە شرۆڤـەکردن و شـیکردنەوە و هەڵسـەنگاندنی دەقێکـی ئەدەبیە. ئەم خاڵەش نە سەباحی غالب و نـە د.کامیـل بەسـیر بـەڕوونی و ئاشـکرایی ئاماژەیـان پێنـەکردووە. بەشێوەیەکی گشتی دەکـرێ بڵـێین نووسـین و وتـاری ڕەخنـەیی یـان نزیـک لەڕەخنـە کـە بـە پەخشـان نووسرابێت، وەکوو نووسینی بە شیعر نووسراو ڕووبەڕووی ڕەخنەیـەکی سـتراتیژی نابێتـەوە، چونکـە بەلایـەنی کەمەوە، بنەمایەکی سەرەکی کاری ڕەخنەیی تێدایە کە بەپەخشان نووسراوە، نەک شیعر.

## ئەنجام

دوای وردبوونەوە لە تەوەرەکانی ئەم لێکۆڵینەوە دەتوانین ئەم خاڵانەی خـوارەوە وەکـوو ئاکـام و ئـەنجامی کارەکەمان دیاری بکەین.

١- نووسەرانی کورد و غەیرە کوردیش هەموویان هاوڕانین لە دیاریکردنی سەرەتای مێژووی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی؛ واتە بیروڕای جیاوازیان هەیە.

ئەم جیاوازیە ڕۆڵی لەمەشدا هەبووە کە تەمەنی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی بە دەربڕینی زۆر جیاواز و دژ بەیەک دیاری بکرێت. ئەم تەمەنە بەلای هەندێکەوە «کورتیلە» و بەلای هەندێکی دیکەوە «١٠٠٠» ساڵ دەبێت.

٢- هەبوونی بیروڕای جیاواز لەوێوە سەرچاوەی گرتووە کە هەندێک لە نووسەران چەند کۆپلە و دێڕێکی شیعری کلاسیکی کوردیان کردووەتە نموونەی کەرەستەی ڕەخنەی ئەدەبی و هەندێکی دیش وتارو نووسینی بە پەخشان نووسراو.

٣- ئەو بیروڕایانەی کە سەرەتاکانی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی دەباتەوە نێو شیعری کلاسیکی کوردی لەناوەوە و لە دەرەوەی خۆیاندا ڕووبەڕووی نەسازی و گرفتی بابەتی بوونەتەوە.

پێمان وایە هۆکاری ئەم نەسازی و گرفتەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەلایەک بەوردی و زانستیانە مامەڵەیان لەگەڵ چەمکی ڕەخنەی ئەدەبی نەکردووە. بۆ نموونە چەمک و کاری ڕەخنەیان بەمانا گشتییەکەی جودا نەکردۆتەوە نە چەمک و کاری ڕەخنەی ئەدەبی بەمانا زانستییەکەی کە نووسین و توێژینەوەیەکە کە دەقێکی ئەدەبی شیدەکاتەوە و هەڵدەسەنگێنێت. هەروەها نەیانتوانیوە بەزمانێکی بابەتیانەی ورد جۆرو ئاستی نموونە شیعریەکان لەبەرامبەر چەمک و بەهاکانی ڕەخنەی ئەدەبیدا پۆلین بکەن. لەلایەکی دیکەشەوە ئەوانەی هەوڵی بەڕەخنەگرکردنی شاعیرانی کلاسیکیان داوە هاوڕای یەکتر نین، یەکێک پێی وایە خانی و یەکێکی دی پێی وایە نالی و یەکێکی دی حاجی قادر وەک ڕەخنەگرێک بە ڕابەری ڕەخنەی ئەدەبی کوردی دادەنێت.

لەڕاستیدا بە لەبەرچاوگرتنی ماناو مەبەستی زانستیانەی چەمکی ڕەخنەی ئەدەبی، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە نە کۆپلەو دێڕە شیعری کلاسیکی، بە بەرهەمێکی ڕەخنەیی دادەنرێت و نە شاعیرانی وەک خانی و نالی و حاجی قادر ڕەخنەگرن. لەئاست ئەم بابەتەدا دەڵێین، هەبوونی چەند دێرو کۆپلە شیعرێک کە ئاماژە و بۆچوونێکی نزیک لەڕەخنەی لەخۆ گرتبێت، ئەمانە نیشانەی هەبوونی هەستێکی یان تێڕوانینێکی ڕەخنەیین لای خاوەنەکانیان؛ بەلام ئەمە لەڕووی زانستیەوە مانای ئەوە نییە ئێمە بەو شیعرانە بڵێین ڕەخنەو بەشاعیرەکانیش بڵێین ڕەخنەگر.

٤- هەندێک لەنووسەرانی تر، سەرەتاکانی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی گرێ دەدەنە بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردیەوە ئەگەرچی لێرەشدا بیروڕای جیاواز هەیە؛ یەکێک ساڵی ١٩٢٦ و یەکێکیدی ساڵانی سییەکان و چلەکان و کەسێکیدی چلەکان و پەنجاکان دیاری دەکات، بەلام لەگەڵ ئەم جیاوازیە چەندێتیەدا، لەڕووی

کەرەستەوە ئەم بۆچوونە ڕووبەڕووی ڕەخنەیەکی ستراتیژی نەبووەتەوە و بەو مانایەی چەند وتار و نووسینێکی بە پەخشان نووسراو بەسەرەتای ڕەخنە داناوە. دیارە بەلای کەمەوە بنەمایەکی سەرەکی کاری ڕەخنەیی لەخۆگرتووە.

٥ - دەکرێ بڵێین بەرهەمە سەرەتایەکانی ڕەخنەی کوردی بەچاوپۆشین لەئاستی زانستیانە لەنێو ئەو وتارو نووسینانەی نێو گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکان بەدی دەکرێن کە یا بەشێوەیەکی گشتی باسی بنەماکان و ڕەگەزەکانی ژانرێکی ئەدەبییان کردووە یاخود قسەیان لەفۆرم و ناوەرۆکی دەقێکی ئەدەبی کردووە. لەم ڕوانگەیەوە دەکرێ ئاماژە بە وتارەکانی «شێخ نووری شێخ ساڵح» بکرێت وەکوو سەرئامەدی ئەمجۆرە ڕەخنانە دادەنرێت و دواتریش وتارەکانی نێو گۆڤار و ڕۆژنامەکانی تر، لەپێش لە هەموویانیشەوە گۆڤاری «گەلاوێژ».

## سەرچاوەکان

### کتێب:

### ا بەزمانی کوردی:

* ئامێدی، عەبدوڵلا یاسین (٢٠٠٣) **پەیدابوونی ڕەخنەی ئەدەبی لە شیعری کلاسیکی کوردیدا، تا جەنگی گێتی یەکەم**، هەولێر، دەزگای ئاراس.

* سەجادی، عەلائەدین (١٩٦٩) **نرخ شناسی**، بەغدا، چاپخانەی مەعارف.

* بەسیر، کامل حەسەن (١٩٨٠) **شێخ نووری شێخ ساڵح لەکۆڕی لێکۆڵینەوەی وێژەیی ڕەخنەسازیدا**، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق.

* بەسیر ،کامل حەسەن (١٩٩٠) **وێژەی کوردی و ڕەخنەسازیی**، بەغدا، چاپخانەی (دار الجاحض).

* مەمەند، کەمال (١٩٨١) **چەند وتارێک دەربارەی ئەدەب و ڕەخنەی کوردی**، بەغدا، چاپخانەی (الحواد).

### ب بەزمانی عەرەبی:

* تومابوا (1975) **مع الأكراد**، ترجمة أواز زەنگنە، بغداد، مديرية الثقافة الكردية العامه، مطبعة (دار الجاحض).

### گۆڤارەکان:

* گۆڤاری (**ڕامان**) ژ (٣) ١٩٩٦.
* گۆڤاری (**ڕامان**) ژ (٤) ١٩٩٦.
* گۆڤاری (**نووسەری کورد**) ژ (٥) ١٩٧٢.
* گۆڤاری (**هیوا**) ژ (٥) ١٩٨٦.

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

ڕەبی پیریژن بە ڕۆژێک مریٚ/ بەفر و باران بیٚ قەبر هەڵکەنت/ کەری گاڕان بیٚ یاسین خوێنەکەت/ بەردی ئەڵحەدت تەپاڵەی تەڕ بیٚ/ لە ڕۆژی قیامەت ئاخرت شەڕ بیٚ.

ئاوی ئاوەنیا کانی بەردینە بۆچی نامخوازی کوڕی بیٚ دینە

ئەوەی زەوقی لە ئەم گۆرانی کوردیدا تاقی کردبێتەوە، جێگای ئیمپراتۆری هونەری حەسەن زیرەک دەزانێ. وەک «عەبدوڵلا جەمال سەگرمە» وتوویەتی: «حەسەن زیرەک گەورەترین گۆرانیبێژی سەدەی بیستەمی کوردە». با ئەوەش لێرەدا بڵێین کە گۆرانی حەسەن زیرەک زیاتر لەوەی جنسی بیٚ، جوانیناسانەیە. بۆ وێنە: ئەوانەی کە گوێیان لە مادۆنا گرتبی دەزانن گۆرانی جنسی کامەیە. جگە لەمانە خەڵک لەو کاتەدا زۆر بە ئەخلاقتر بوون لە ئێستە لە باری جنسیەوە. (بۆ زانیاری ڕێژەی Oral Sex لە دونیادا ،بڕوانە کاستلز،١٣٨٤: ٢٨٤).

ئیستە با سەرەنج بەینە ئەم چەن بەیتەی زیرەک:

ڕۆژی جومعە خەتمم دەکرد/ یەک لەنا کاو بانگیان کرد/ قوڕت وەسەر لێو ئاڵیان برد.

ڕۆژی جومعە پاش سەلایە/ دوو چت خۆشن لەم دونیایە/ ئیمان و ماچی لەیلایە.

ئێوە بڕوانن دەڵیٚ: قورئانم دەخویند و خەبەریان پێدام کە یارەکەتیان برد. یانێ قورئان خوێندنی، بۆ کۆچی یار بەجیٚهێشتووە و دواتر دەڵیٚ: لە پاش نوێژی بەیانیان دوو چت خۆشن: ئیمان و ماچ. سەیر ئەمەیە ئەو قسەیە نە خۆی و نە خەڵکی تر بە کفری نازانن؛ کەچی خۆی داوا کردنی ماچێک کە بووەتە هاشاربوونی دایکی کچە بە کفر لە قەڵەم دەدات. جا ئێوە بێن ئەمە بەراورد بکەن لە گەڵ ئەو پێش نوێژەی کە لە بڵندگۆی مزگەوتە ناوی بنەماڵەیەکی دەهێنا کە لە حەوشەی خۆیاندا هەڵپەڕیون.

**ئەنجام:**

دین سازەیەکی کۆمەڵایەتیە. ئەم سازەیە خاوەنی دامەزراوە و دابونەریت و کەسی خۆیەتی . دین لە لای دینداران سێ بەشی فکر و هەست و کردەوەی هەیە. هیچکام لەم بە شانە لەڕەوتی دڵداریدا غایب نین. لە بەشی بیروڕای ئیسلامی تەنیا «جهاد» غایبە. ئەویش تەنیا بۆ شەری بەکۆمەڵ لە گەڵ کافرانە. بە ڕوونی دڵداری لە گەڵ کافر حەرام نەکراوە و بە پێچەوانە هەڕەشە کراوە کە بۆ ئەوین یا دین لە دەست ئەدەم یان ئەیگۆرم. لەم کۆمەڵگایەدا هەم بیروڕا و هەم دامەزراوەی دینی وەک مزگەوت بەستینی گەشەی بیری دڵداری و پەناگەی عاشقان بوونە. مزگەوت کە ماڵی خوایە و جێگەی ڕاز و نیاز و عیبادەتە پەناگەی خۆشخوانی دڵتەڕی دڵداریە. ئەم خۆشخوانان کە گۆرانبێژانی گەڕۆکی ناو کوردەواری بوون بە هاتنی هەندێ تکنۆلۆژی جێگەیان پیٚ لێژ دەبیٚ و تەنیا پەناگەیان مزگەوت دەمێنێتەوە. بڕوانە مامۆستا هێمن چی دەڵێت: «پەیدا بوونی گرامافۆن لە قاوەخانەی شار و دیوەخانی ئاغا جێگە بە خۆشخوانان لێژ کرد، گۆشەی مزگەوتی دێ و زەماوەند و شایی دێهات چیان بە دەستەوە نەما» (هێمن،١٣٦٤: ١٢). لە مزگەوتی گوندیش شەوانی

زستان پاش نوێژی خەوتنان ئەو شایەرانەی کە هەر بۆ دڵی خۆیان دەگوت، بۆ کـوڕ و کـاڵان و پیرانـی دڵـتەر دەیانگوت (هەمان: ٩). کۆمەڵی کوردەواری جگە لەوەی کە دینی بووە بەڵام ئەم دینە بۆ ژیان ئاسـانگیر بـووە. « لە کوردستان کەلەویشکی دینی لە ناو خەڵکدا، تەنانەت لای ئەوانەش کە بە شـێوەی سـوننەتی مەزهـەبین، زۆر کەمڕەنگە» (جلایی پوور، ٨٩:١٣٧٢). مرۆڤ جاری وایـە وای بـە بیردادێـت کـە ڕەنگـە بـە پێشـکەوتنی کۆمەڵ لە هەندێ شتدا پاشەکشەی کردبێ. بە تایبەت لەبەشی دڵداریدا. لە بەر ئەوەی کچان و ژنانیش جگـە لەوەی لەم ئەدەبیاتەدا دەوریـان هـەبووە، ئـەم دەورە هەمیشـە نەپـنـدی و شـاراوە نـەبووە (پاپانیـانی، ١٣٨١). دیسان هێمن دەڵێت: «"مەنیج حەیران" و "زلێخا چوختیش" دوو ژنـی بێبـاک بـوون کـە دەفـەیان لێـدەدا و گۆرانی داوەتیان دەوت و شایەری شایی بوون و هیچ لە پیاوانی ئاواڵیان نەدەمانەوە» (هێمن، ١١:١٣٦٤).

وەک دیتمان ئەدەبیاتی فولکلۆری لێوالێوە لە دەوری کەسایەتی دینی و بیرو ڕای دینـی کـە لایـەنی هـەرە زۆریان لە خزمەتی دڵـداریدان. نـاوی کەسـانێک وەک "حـەزرەتی موحەممـەد"(د.خ) "حـەزرەتی مووسـا" و "عیسا"، مەلایەکی وەک "عیزرائیل" و شیخی وەک: "شیخ عبدالقادر" و "شیخی زەنبیل" و "بورهـان" و "کاکـە ئەحمەدی سولەیمانی" نیشانەی ئەوەیە کە دین لە بایەخە گەورەکان ئەم کۆمەڵـگایە بـووە، پیـاونی ئـایینی و ئایین، ڕێزی زۆریان بووە. مرۆڤەکان زۆر دەستە وەستان بوونە و بێ هێز، بۆیە کە گڕی دڵداری لـە تـاودا بـووە تەنیا هێزێک کە هاندەرو پەنا بەخشی خەڵک بووە دین و پیاوانی دینی بوونە. لەم ئەدەبیاتـە پیـاوان و پیـاوانی ئایینی دەوریان بەرچاوە، بەڵام هەم خۆیان بەشداری پرۆسەی خۆشەویسـتین و هـەم ڕێگـە خۆشـکەری ئـەم کارەن. بۆیە هەم کچانیان بەر باسی دڵدارین و هەم خۆیان بەر ڕەخنەش کەوتوون. ئێوە بینیتان کـە دیـن بـە شێوەی دڵخواز لە بەشی گشتی، لە خزمەتی دڵداریەکی تەڕ دایە. کەوابوو دین بە پێـی ڕیشـەی کۆمەڵناسـی خۆی بۆ خزمەتی ژیان هاتووە. دین لە جەوهەردا لە دژی شادی و خۆشەویستی نییە بەڵکوو ئەمە بەسراوە بـەو تەفسیرەی کە لێی دەکرێ. دیسان ئەم ئەدەبیاتە ئەوەی نیشاندا کە فەرهـەنگی ژیـان لـە فەرهـەنگی مـردن بەهێزترە.

ئەدەبیاتی فولکلۆر ئەتوانێ یەکێک لە سەرچاوە باشەکان بۆ لێکۆڵینەوەی مێـژووی گۆڕانکـاری کۆمەڵایـەتی بێت. بۆ ئەم مەبەستە یەکەم هەنگاو ئەوەیە کە هەرچی زووتر ئەم ئەدەبیاتە لە فەوتان ڕزگار بکرێت.

با بە شیعرێکی پاراو ئەم باسەش ببەستین:

بەو قورئانە لێم خویندووە/ بۆ خۆم لە مەلام بیستووە/ خێری ماچێک سەد ڕۆژووە.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

**سپاسنامە:**

زۆر سپاسی شاعیر و وەرگێڕ کاک «مەهدی خوونـدڵ» ئەکـەم لەبـەر یارمەتیـەکانی بـۆ بەشـی گـۆرانی هەورامی.

## سەرچاوەکان:


- سەرچاوەی کوردی و فارسی:

- آرون ریمون (۱۳۷۵) **مراحل اساسی اندیشه در جامعه شناسی**، ترجمه باقر پرهام، تهران، انتشارات انقلاب اسلامی.

- احمدزاده، هاشم (۱۳۸۶) **از رمان تا ملت**، ترجمه بختیار سجادی، سنندج، دانشگاه کردستان.

- ئەحمەد، محەممەد حەسەن (۱۹۸۳) **بازی بێریان؛ژیان و گۆرانییەکانی ماملێ،** بەغدا، الحوادث.

- ئیبراهیم عەزیز، عومەر (۱۹۹۸) **هەندێ داب و نەریتی کوردەواری،** بەغدا.

- پایانیانی ،سەلاح (۱۳۸۱) **کانی مرادان**، انتشارات صلاح الدین ایوبی، ارومیە.

- تیلور، چارلز (۱۳۸۷) **تنوع دین در روزگار ما**، ترجمه مصطفی ملکیان، تهران، نشر شور.

-جلایی پور، حمید رضا (۱۳۷۲) **کُردستان،علل تداوم بحران آن پس از انقـلاب اسـلامی،** تهـران، وزارت امور خارجه.

- جلیلی، هادی (۱۳۸۳) **تأملاتی جامعه شناسانه درباره سکولارشدن**، تهران، طرح نو.

- دورکیم،امیل (۱۳۸۳) **صور بنیادی حیات دینی**، ترجمه باقر پرهام، تهران، نشر مرکز.

-سالومون، روبرت (۲۰۰۶) **فضیلت عشق (اروتیک)** ترجمه آرش نراقی.

- سجادی، علاءالدین (۱۳٦۱) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، سردشت ، معارف.

- شریعتی، علی (۱۳۵۶) **تاریخ و شناخت ادیان**

- صدیق بورکەیی (صفی زاده)(۱۳۷۷) **مێژووی وێژەی کوردی** (۱و۲) بانە، انتشارات ناجی.

- علاقبند، علی (۱۳۷۴) **جامعه شناسی آموزش و پرورش**، تهران، چاپ دهم.

- عباس، وریج کاظمی (۱۳۸۲) **عرفی شدن و زندگی روزمره،** نامه علوم اجتماعی، شماره پیـاپی ۲۱، مجلـه ۱۱، شماره ۱، مهر .

- کاستلز، مانوئل (۱۳۸۴) **عصر اطلاعات**، جلد دوم، تهران، طرح نو.

- لیسکو، روژه (۱۳۶۰) **داستان‌های کهن کُردی**، ترجمه محمّد ریانی، تهران، رودکی.

- مان، ئوسکار (۱۳۶۴) **تحفه مظفریه**، مقدمه هیمن، مهاباد، سیدیان.

- محمّد رضا، شفیعی کدکنی (۱۳۸۶) **زمینه اجتماعی شعر فارسی**، تهران، نشر اختران، نشر زمانه.

-مرنیسی، فاطمه (۱۳۸۱) **زنان پرده نشین و مردان جوشن پوش**، تهران.

- میشل، مالرب (۱۳۸۳) **انسان وادیان**، ترجمه مهران توکلی، تهران، نشر نی.

- واسیلی، نیکتین (١٣٦٣) **کرد و کردستان بررسی جامع از دیدگاه سیاسی، جامعه شناسی و تاریخی**، ترجمه محمّد قاضی، تهران، کانون فرهنگی انتشاراتی درایت.
- ویل، دورانت (١٣٥٠) **لذات فلسفه**، ترجمه عباس زریاب حق یی، تهران، نشر اندیشه.
- همیلتون، پیتر (١٣٧٧) **جامعه شناسی دین**، ترجمه محسن ثلاثی، تهران، تبیان.
--UZUN, Mehmed (2005), **Antolojia Edebiyata Kurdi** , aram, Istanbul .

-سەرچاوەی زارەکی:
- بەشێک لە گۆرانییەکانی مامۆستایان:
- **حەسەن زیرەک**
- **عوسمان کێمنەیی (هەورامی)**
- **حەبیب ملەیی**
- **کازم باشماخی**
- **مەڵێ**
- **سەید محەممەد سەفایی**
- **محەممەدی مامڵێ.**
- سەرچاوەی لاتین:

- Van Bruinessen,M. (2005), **Kurdish Paths to nation**. "The Kurds, SAQE,London.

# ئاستەکانی گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزان

## لە ڕۆمانی «هەرەس»ی موحەممەد موکریدا

نەجم خالید نەجمەددین ئەڵوەنی *

**کورتە:**

بەگشتی ئاستەکانی گۆشەنیگا لە ڕۆمانی هەرەسی محەمەد موکریدا دەکرێن بەسێ جۆرەوە: ئاستی کات، ئاستی شوێن و ئاستی دەربڕین. ئەم سێ ئاستە پێکەوە بەستراون لێک جیا ناکرێنەوە و کار لە یەکتر دەکەن و هەمووشیان بۆ خزمەتی گۆشەنیگای نووسەر و پیشاندانی ئەو گۆشە نیگایە بەکارهاتوون.

١ - گۆشەنیگای بەکارهاتوو لەم ڕۆمانە، گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزانە و لە دەرەوە دەروانێتە ڕووداو و کارەکتەرەکان و هەڵیان دەسەنگێنێ و وەسفیان دەکات.

٢ - حەکایەتخوانی ئەم ڕۆمانە، گوزارشت لە گۆشەنیگای ڕۆماننووس دەکات و لێی جیا نابێتەوە.

٣ - زۆربەی کارەکتەرەکانی ئەم ڕۆمانە، سەرەکی و لاوەکییەکان (وەکوو: حەمە، خەجێ، نەسرین، هیام، مامۆستا ڕەشید، مامۆستا سەرکەوت، هاوڕێکانی حەمە و ... هتد) بە هەڵگری گۆشەنیگای نووسەر -حەکایەتخوان دادەنرێن.

٤ - ڕۆماننووس سوودی لە زەمەنی ڕووداو و ژینگەی کارەکتەرەکان و دەربڕینی ئەوان وەرگرتووە بۆ ئەوەی گوزارشت لە گۆشەنیگای خۆی بکات.

٥ - ئەم ڕۆمانە، بە ڕۆمانێکی مۆنۆفۆنی یان مۆنۆلۆگی (یەک دەنگ) دادەنرێت، بۆیە لەسەرەتاوە تا کۆتایی گۆشەنیگای نووسەر و کارەکتەرەکان وەکوو خۆیان ماون و گۆڕانێکی گرنگ بەسەریاندا نەهاتووە.

ڕۆماننووس پەی بەوە نەبردووە کە دەبێ زمانی نووسەر و کارەکتەرەکان لەیەک نەچن و هەر یەکە خاسیەتی خۆی هەبێ. لەبەر ئەوە خوێنەر هەست بەوە ناکات کە ئاستی دەربڕینی کارەکتەرەکان جودان و گوزارشت لە گۆشەنیگای ئەوان دەکات: «کارەساتی ڕووخانی کۆماری مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٦ز» و «کارەساتی نسکۆی ئەیلوول لە ساڵی ١٩٧٥ز» و دەستپێکردنەوەی شۆڕش لە کوردستانی عێراق دوای چەند مانگێ لە نسکۆی ئەیلوول. هەموو ئەو بەسەر هاتانەش لە گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزانەوە پێشکەش کراون.

**وشە سەرەکییەکان:** گۆشەنیگا، جۆرەکانی گۆشەنیگا

---

* مامۆستای بەشی زمانی کوردی زانکۆی سەلاحەدین.

## پێشەکی:

ئەم لێکۆڵینەوەیە، باسی بابەتێک دەکات کە لەکۆنەوە ئەفلاتوون و ئەرستۆ بایەخیان پێداوە و پۆلینیان کردووە؛ بەڵام دوایی تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم پشتگوێ خراوە. لەم سەدەیەدا «هێنری جیمس»ی چیرۆکنووس و ڕۆماننووسی ئەمریکی لە پێشەکی هەندێ لە چیرۆکەکانی خۆیدا ئاوری لێداوەتەوە و باسی بایەخی ئەم بابەتەی کردووە. دوای ئەو چەندین نووسەر و ڕەخنەگری ئەوروپی وەکوو پێرسی لەبووک و باختین و جان بیۆن و تۆدۆرۆف و...هتد، کۆمەڵێ لێکۆڵینەوەی گرنگیان لەسەر نووسیووە. لەژێر کاریگەری باسەکانی ئەواندا، هەندێ نووسەری ڕۆژهەڵاتی (عەرەب و فارس) وەکووو د.سیزا ئەحمەد قاسم و د.شوجاع موسلێم ئەلعانی و موریس ئەبو ناچر و جەمال میرسادیقی و ئیراهیم یوونسیو ...هتد، لەبواری ڕەخنەی چیرۆک و ڕۆماندا بایەخیان پێداوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر نووسیووە.

لە ڕەخنەی کوردیشدا، ئەوەندە بایەخ بەم بابەتە نەدراوە و جگە لە هەندێ وتار و لێکۆڵینەوە کە لە شوێنی خۆیدا ئاماژەیان پێ دەکەین، شتێکی گرنگی لەسەر نەنووسراوە. ئەم باسەی ئێمەش هەوڵێکە و دەخرێتە پاڵ ئەو هەولانە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە تەنیا تەرخانکراوە بۆ باسکردنی ئاستەکانی کات و شوێن و دەربڕین لە گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزان لە ڕۆمانی "هەرەس"ی محەمەد موکری (موکری ، ١٩٩٨). ئەم جۆرە باسەش، بایەخی خۆی هەیە، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی کە ئەم جۆرە گۆشەنیگایە تا ئێستا لە ڕۆمان و هەروەها لە چیرۆکی کوردیدا باوە. جگە لەوەی کە ڕۆمانی «هەرەس» بایەخی تایبەتی خۆی لەمێژووی سەرهەڵدان و گەشەکردنی ڕۆمانی کوردیدا هەیە، هەروەها ڕۆمانێکە تایبەتە بەباسکردنی سێ ڕووداوی واقیعی لە ژیانی سیاسی نەتەوەی کورددا، کە ئەوانیش:

١- ڕووخانی کۆماری مەهاباد لەساڵی ١٩٤٦ز.

٢- نسکۆی شۆڕشی ئەیلول لەساڵی ١٩٧٥ز.

٣- دەست پێکردنەوەی شۆڕش پاش چەند مانگێ لە نسکۆی ١٩٧٥ لەباشووری کوردستان.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا پەنامان بردۆتە بەر کۆمەڵێ سەرچاوەی گرنگی ئۆروپی و فارسی و کوردی لە پەراوێزدا ئاماژەمان پێیان کردووە. بەڵام لەکاتی وەرگرتنی نموونە لەدەقی ڕۆمانی هەرەس، سەرەتا پێش برگە و پەرەگرافە وەرگێڕاوەکان، ئاماژەمان بە ژمارەی ئەو لاپەرەیە داوە کە ئەو نموونانەمان لێی وەرگرتووە.

لە ڕووی ناوەرۆکەوە باسەکەمان کردووە بە دوو بەشەوە، لەهەر بەشێکدا سێ تەوەرمان تەرخان کردووە بۆ باسکردنی چەمک و پێناسەی گۆشەنیگا و گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەموو شتزان و ئاستەکانی گۆشەنیگا وەکوو ئاستی کات و شوێن و دەربڕین. دوای ئەوە گرنگترین ئەنجام و سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەکەمان دەست نیشان کردووە.

### تەوەری یەکەم: چەمک و پێناسەی گۆشەنیگا

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

باسکردنی گۆشەنیگا و دیاریکردنی ئەو گۆشەنیگایەی کە لە گێڕانەوەی ڕۆمانێکدا بەکارهاتووە، بە بابەتێکی نوێ لە ڕەخنەی ئۆرووپی و هەروەها لە ڕەخنەی کوردی دادەنرێ.

ئەفلاتوون یەکەم کەسە کە لە باسی داستاندا، جیاوازی لەنێوان گێڕانەوەی سادە و لاسایی کردنەوەدا کردووە و ئەوەی پیشانداوە کە کاتێ شاعیر بە دەنگی ئەوی تر دەدوێ، لە شێوازدا چۆنیەتی قسەکردنی ئەو دەنوێنێ. لە ڕێی دەنگ، یان ئیشارەتەوە، لاسایی ئەو کارەکتەرە دەکات کە ئەرکی نواندنی ئەوی لە ئەستۆ گرتووە. بەڵام ئەگەر شاعیر لە هەموو شوێنێکدا دەر بکەوێ و خۆی نەشارێتەوە، ئەو کاتە لاسایی کردنەوەکە هەڵدەوەشێتەوە و شیعرەکەش دەبێتە گێڕانەوەیەکی سادە (مسلم‌العانی،١٩٩٤: ١٧٢). لەم بۆچوونەدا، بەئاشکرا دەردەکەوێ کە ئەو فەیلەسووفە جیاوازی لەنێوان گێڕانەوەی خودی و گێڕانەوەی بابەتی لەداستانە شیعردا کردووە و ئەوەشی پیشانداوە. لە گێڕانەوەی بابەتێ کە ئەو ناوی لێناوە «گێڕانەوەی سادە» بەهۆی دیار بوونی شاعیر لە هەموو شوێنێکی داستانەکە، گۆشەنیگای خۆی بەسەر گۆشەنیگای کارەکتەرەکاندا زاڵ دەکات و شێوازی لاسایی کردنەوەی ئەوی دیکە لەناو دەچێت.

لەو سەدەکەش ئەرستۆ لە شیکردنەوەی بنیاتی گێڕانەوە لەداستانەکانی هۆمێرۆسدا باسی ئەوەی کردووە کە ئەو شاعیرە ئەوەندە دەستی نەخستۆتە کاروباری کارەکتەرەکان و ڕووداوەکانی، بەشێوەی «درام» پیشانداوە (بورونف، ١٣٧٨: ٩٧و٩٨).

هەرچی پەیوەندی بەم بابەتەوە هەبێ لەسەدەی بیستەمدا، ئەوا دەکرێ وەکوو بابەتێکی نوێ دەستکراوەتەوە بە لێکۆڵینەوە و دیاریکردنی گرنگترین بنەما و ئەرک و خاسیەتەکانی لە بنیاتی گێڕانەوەی چیرۆک و ڕۆماندا و ڕەخنەی «ئەنگلۆ»ی ئەمریکی بایەخێکی زۆری پێداوە؛ بەتایبەتی لەلایەن «هێنری جێمس» و «پێرسی لەبووک» و «والاس مارتن» و «فریدمان» و پاشان لە نووسینەکانی« جان بیۆن»ی فەڕەنسی و «جیرار جینیت» و «تزڤیتان تۆدۆرۆف» و ئەوسا ڕەخنەگرانی ڕووس وەکووو «باختین و تۆماشیفیسکی و بۆریس ئۆسبنسکی» چەندین لێکۆڵینەوەیان لەسەر نووسی، یان لە دووتوێی باسکردنی هونەری گێڕانەوەدا بە قووڵی لە خاسیەت و ئەرکەکانی دواون.

دیارە پێش ئەو قۆناغە گۆشەنیگا پشتگوێ خراوە. لەبەر ئەوە لەساڵی ١٩٣٢ جۆزێف وارین دەربارەی بایەخ نەدان بە گۆشەنیگا دەربڕیوە (مارتن، ١٩٩٨: ١٧٥و١٧٦).

گۆشەنیگا وەکووو زاراوەیەک، پەیوەندی بە هونەری شێوەکاریەوە هەیە و لەوەوە وەرگیراوەو هێنراوەتە بواری ڕەخنەی ڕۆمانەوەو بۆ ئەوە بەکارهێنراوە کە گوزارشت لە تێڕوانین و بۆچوونی حەکایەتخوان و کارەکتەرەکان بکات.

گۆشەنیگا وەک جیرار جینیت دەڵێ: «لە دەنگ جیاوازە. گۆشەنیگا بە چاو و دەروونەوە هەیە و لە ڕێی ئەوانەوە پەی بە جیهانە خەیاڵییەکەی دەبرێت؛ کەچی دەنگ لەئاستی دەربڕینی زمانیدا، بەخۆی دارشتنە. لەوانەیە حەکایەتخوان بەچاوی کارەکتەر تەماشا بکات، بەڵام پرۆسەی گێڕانەوە و گواستنەوەی ناوەرۆکی چیرۆکەکە جێبەجێ دەکات، بەمەش گێڕانەوەی خودی، بەرهەم دەهێنرێ» (احمدقاسم، ١٩٨٤: ١٣٣).

لەبەر ئەوەی ڕۆمان کۆمەڵێ ڕووداو و بەسەرهاتی چەند کارەکتەرێک دەگێڕێتەوە، بۆیە دەبێ بایەخ بە گۆشەنیگای ئەو حەکایەتخوان و کارەکتەرانە بدرێت کە لە ڕوانگەی ئەوانەوە پرۆسەی ئەو گێڕانەوەیە جێبەجێ دەکرێت.

لەبارەی گرنگی زاراوەی گۆشەنیگا لەپرۆسەی گێڕانەوە و گواستنەوە لە حەکایەتەوە بۆ وتار، «تزڤیتان تۆدۆرف» دەڵێ: «سێهەمین زاراوەی گرنگ کە ڕێ دەدات بە وەسفی گواستنەوە لە حەکایەتەوە بۆ وتار، زاراوەی گۆشەنیگایە. ئەو بەسەرهاتانەی کە جیهانی حەکایەتی لێ پێکدێت خۆ لەخۆدا پێشکەش ناکرێن، بەڵکوو لە گۆشەنیگایەکی دیاری کراوەوە ئەنجام دەدرێت ... گۆشەنیگا بەتەواوی شوێنی پەیبردن دەگرێتەوە، بەڵام خواستنێکی گونجاوە، چونکە خاسیەتە جۆراوجۆرەکانی تێڕوانین لە وتاردا هاوتایان نییە» (تودرودف، ١٩٩٠: ٥٠).

بەگەلێ شێوە پێناسەی گۆشەنیگا کراوە. لەوانە پێناسەکەی «بۆریس ئۆسبنسکی» کە دەڵێ: «گۆشەنیگا – بە شێوەیەکی گشتی- بریتییە لە سێستەمێک بۆ نواندنی شوێنی سێ، یان چوار ڕەهەندی، بە یارمەتی هەندێ ئامرازی هونەری تایبەت بە شێوەیەکی هونەری دیاریکراو. خاڵی ناردنیش لە سیستەمی گۆشەنیگای هێڵی، بریتییە لە: پێگەی ئەو کەسەی کاری وەسف کردنەکە جێبەجێ دەکات» (اوسبنسکی، ١٩٩١: ٦٩).

ئەم پێناسەیە وەکوو دەردەکەوێ زیاتر تایبەتە بە هونەری شێوەکاری و کەمتر پەیوەندی بە ڕۆمانەوە هەیە. هەروەها ئەوەندەشی کە پەیوەندی بە ڕۆمانەوە هەیە تایبەتکراوە بە گۆشە نیگای بابەتی. لەکاتێکدا چەندین جۆری گۆشەنیگا لە ڕۆماندا بەکارهێنراوە وەکوو:

١- خودی – ناوەکی.
٢- بابەتی – دەرەکی.
٣- گۆشەنیگای ئاوێتە.

لە کتێبی «توخمەکانی داستان»یش ئەم پێناسەیەمان بەرچاو دەکەوێ:

«گۆشەنیگا، یان گۆشەنیگای گێڕانەوە، پیشاندەری شێوەیەکە کە نووسەر لەڕێی ئەوەوە بۆچوونی خۆی و ناوەرۆکی ڕۆمانەکە پێشکەش خوێنەر دەکات و لە واقیعدا پەیوەندی نووسەر لەگەڵ ڕۆمانەکەیدا پیشان دەدات» (میرصادقی، ١٣٧٦: ٣٨٥).

ئەم پێناسەیە تەنیا وەسفی پەیوەندی نێوان ڕۆماننووس و گێڕانەوەی ڕۆمان دەکات، بێ ئەوەی ئاماژە بەوە بکات کە لەهەندێ ڕۆماندا کارەکتەرەکانیش خاوەنی گۆشەنیگای خۆیانن و مەرج نییە لەگەڵ گۆشەنیگای نووسەردا یەک بگرنەوە، بۆیە ئێمە ئەو پێناسەیەی خوارەوە پێشنیاز دەکەین و دەڵێین:

گۆشەنیگا بریتییە لە چۆنیەتی گوزارشتکردنی ڕۆماننووس و حەکایەتخوان و کارەکتەرەکانی ناو ڕۆمان، لە بیر و بۆچوونی خۆیان. ئەمەش پەیوەندی بە جۆری گێڕانەوەی ڕۆماننووسەوە هەیە کە کار دەکاتە سەر سەرجەم شێوازی گێڕانەوەی ڕۆمانەکە.

## تەوەری دووهەم: جۆرەکانی گۆشەنیگا

گۆشەنیگا، یەکێکە لە بنیاتە گرنگەکانی گێڕانەوە لە ڕۆمان دا و پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بە شێوازی بەرهەم هێنانی ڕۆمانەوە هەیە، بەڵکوو بگرە هەڵبژاردنی جۆری گۆشەنیگا کاردەکاتە سەر چۆنیەتی شێوازی نووسینی هەموو ڕۆمانێک. لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو ڕەخنەگرانەی باسی گۆشەنیگایان کردووە جەختیان لەسەر گرنگی و دەوری گۆشەنیگا لە بنیاتی هونەری ڕۆماندا کردۆتەوە و بە توخمێکی هونەری بنەڕەتییان داناوە. ئەمەش وایکردووە بەگەلێ شێوە، جۆرەکانی پۆلێن بکەن.

لە باسی شێوازەکانی گێڕانەوە لە ڕۆمانی «مەدام بۆڤاری» فلۆپیردا پێرسی لەبووک ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەو ڕۆماننووسە بە دوو شێواز،کاری گێڕانەوەکەی ئەنجام داوە. لەم بارەیەوە لەبووک دەڵێ:

«هەندێ جار، نووسەر بەدەنگی خۆی قسە دەکات و هەندێ جاریش لەڕێی یەکێک لە کارەکتەرەکانەوە. لەم ڕۆمانەشدا زۆرجار لەڕێی "ئیما"وە قسەی کردووە» (لوبوک، ۱۹۸۱: ۷۰).

بەگوێرەی ئەم دوو شێوازەش، جۆرەکانی گێڕانەوەی لای« فلۆپیر» کردووە بە دوو جۆرەوە. یەکەمیانی ناو ناوە «پەنۆرامی» و دووهەمی ناو ناوە «درامی». سەبارەت بە یەکەم دەڵێ: «لە پێشکەشکردنی پەنۆرامیدا، دەبینین حەکایەتخوان هەمووشتزانە، بابەتەکەی تێدەپەڕێنێ و بۆ خوێنەری کورت دەکاتەوە» (یقطین، ۱۹۹۷: ۲۸۶). کەچی لە بارەی دووهەمەوە وتوویەتی:

«لە پێشکەشکردنی درامیدا حەکایەتخوان نادیارە، ڕووداوەکانیش ڕاستەوخۆ پێشکەشی خوێنەر دەکرێن» (یقطین، ۱۹۹۷: ۲۸۶)

لەباسی ڕۆمان و گۆشەنیگادا، «جان بیۆن» جەختی لەسەر پەیوەندی نێوان گۆشەنیگاو دەروونناسی کردۆتەوە و پاشان سێ جۆرە ڕوانینی دەستنیشان کردووە:

١- ڕوانین لە دواوە.

٢- ڕوانین لەگەڵ.

٣- ڕوانین لەدەرەوە (العانی، ١٩٩٤: ١٧٣و١٧٤).

ئەم سێ جۆرە ڕوانینە، پەیوەندییان بەسێ جۆرە گۆشەنیگاوە هەیە:

یەکەمیان: بە گۆشەنیگای حەکایەتخوانی **هەمووشتزان** ناسراوە کە زانیاری لە کارەکتەرەکان زۆرترە.

دووهەمیان: بە گۆشەنیگای **هاوشان** ناسراوە. چونکە زانیاری ئەو و کارەکتەرەکان لەیەک ئاستدایە.

سێهەمیان: گۆشەنیگای حەکایەتخوانی کەمشتزان دەگرێتەوە و ئەم حیکایەتخوانە تەنیا لەدەرەوە لەڕێی هەستەکانی بیستن و دیتنەوە، زانیاری سەبارەت بە کارەکتەرەکان دەست دەکەوێ.

دوای ئەوە، هەریەکە لە «تۆماشیفسیکی» و «تزڤیتان تۆدۆرۆف»، جۆرەکانی گۆشەنیگایان دابەش کردووە بەسەر دوو جۆر دا:

١- گۆشەنیگای دەرەکی.

٢- گۆشەنیگای ناوەکی (شیفیسکی، ١٩٨٢: ١٨٩).

لێرەدا، ئەو دوو ڕەخنەگرە، ئەو زانیاریانە دووبارە دەکەنەوە کە جان بیۆن سەبارەت بـە «ڕوانـین لـە دواوە» و «ڕوانینی لەگەڵ» باسی کردووە.

نووسەرانی کوردیش هەندێ بایەخیان بە گۆشەنیگا داوە و ئەو پۆلین کردنانەیان لەبەرچاو گرتووە کـە جـان بیۆن و تۆماشیفیسکی و تۆدۆرف پێشنیازیان کردووە. بۆ نموونە: حسێن عارف لـە گۆڤـاری بلێسـە، وتـارێکی دەربارەی شێوەکانی گێڕانەوە بڵاوکردۆتەوە. لەوێدا سێ جۆرە گۆشەنیگای پۆلین کردووە:

١- گۆشەنیگای هەمووشتزان.

٢- گۆشەنیگای کەمشتزان.

٣- نامە گۆشەنیگا (عارف، ٢٠٠٢: ١٣تا١٥).

ئەم پۆلینە و ئەوەی «پەرێز سابیر» کە لە ماستەرنامە چاپکراوەکەی دیـاری کـردووە (سـابیر، ٢٠٠١: ٢١١). تایبەت کراون بە چیرۆکی کوردی. بەڵام نەجم خالید ئەڵوەنی لە دوکتۆرانامە چاپکراوەکەیدا تایبەتی کـردووە بە سێ نموونەی ڕۆمانی کوردی کە ئەوانیش« ژانی گەل»ی ئیبراهیم ئەحمـەد و« شـار»ی حسـێن عـارف و «ڕاز»ی خەسرە و جافن (نەجمئەڵوەنی، ٢٠٠٤: ٧٥).

### تەوەری سێیەم: خاسیەتەکانی گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزان

هەموو ڕۆمانێک حەکایەتخوانێکی هەیە. ئەو حەکایەتخوانە و پەیوەندی بە ڕۆمـاننووس و کارەکتەرەکانـەوە، جۆری گۆشەنیگای بەکارهاتوو لە پێشکەشکردنی کارەکتەر و وەسفی ڕووداوەکان دیاری دەکات.

سەبارەت پەیوەندی ڕۆماننووس و حەکایەتخوان دوو بۆچوونی سەرەکی لە ئارادایە. یەکەمیان: بروای بـەوە هەیە کە حەکایەتخوان کەسی دووهەمی ڕۆماننووسەو لەباتی ئەو کاری گێڕانـەوەکـە ئـەنجام دەدات. کـەچی دووهەمیان: لەو بڕوایە دایە کە حەکایەتخوان خودی نووسەر نییـە و ئـەو کەسـە خەیاڵـیەیە کـە وتارێـک بـۆ خوێنەرێکی خەیاڵی ڕەوانە دەکات. تەنیا بە گوتنی یان نووسینی یەکـەم وشـە بەمەبەسـتی داهێنـانی دەقـی ڕۆمانێک، ئەو دوانە پێکەوە تەخـەیول دەکـرێن (اوسبنسـکی، ١٩٩١: ٣). لـەم بارەیـەوە بـۆریس ئۆسبنسـکی دەڵێ: «کەسیەتی ڕۆماننووس لە حەکایەتخوان جیاوازە؛ لەبەر ئەوەی ڕۆماننووس مرۆڤـێکی ڕاسـتەقینەیە لـە گۆشت و خوێن دروست بووە؛ کەچی حەکایەتخوان کەسیەتییەکی خەیاڵییە یان وەکوو "ڕۆلان بارت" دەڵـێ: کاغەزیە و ڕۆماننووس دایناوە بۆ ئەوەی لەباتی ئـەو کـاری گێڕانـەوەکـە ئـەنجام بـدات» (اعـزام، ١٩٩٦: ٧٧). ئەگەرچی ئەم دوو نووسەرە، حەکایەتخوان لە ڕۆماننووس جیا دەکەنەوە لەسەر بناغـەی خەیاڵـێتی کەسـێتی ئەو و خاسیەتی بایلۆجی ڕۆماننووس، بەڵام من بڕوام بەوەیە بەتایبەتی لـە ڕۆمـانی ئایدۆلۆژیـدا، حەکایـەتخوان نەک هەر لەباتی ڕۆماننووس کاری گێڕانەوەی ڕووداو و وەسفی دیمەن و کارەکتـەرەکان دەگێـرێ، بەڵـکو لـە هەمان کاتدا دەتوانێت ببێتە هەڵگری گۆشەنیگای نووسەر و لەدەقی ڕۆمانەکەدا گوزارشت لـە بـیر و بۆچـوونی ئەو بکـات. پەیوەنـدی نێـوان حەکایـەتخوان و گێڕانـەوەش ئـەوە دەگەیـەنێ کـە «بـەهۆی گۆشـەنیگاوە بـە حەکایەتخوان دەوترێ گێڕەرەوەی ڕووداو، بۆیە ئەو دوو زاراوەیە پێکەوە بەستراون و ئاوێتەی یەکتر بوونـە: بـێ

حەکایەتخوان گۆشەنیگا دانامەزرێ و بێ گۆشەنیگاش حەکایەتخوان لەناو دەچێ» (احمدقاسم، ١٩٨٤: ١٣٥).

لەلایەکی دیکەوە دەبێ پێ لەسەر ئەوە دابگرین کە هەرگیز ڕۆمان بێ گۆشەنیگا دانامەزرێ و کارەکتەرەکان ناتوانن بەبێ ئەو وەسفی ڕووداو، و دیمەنەکان بکەن و پەیوەندی خۆیان لەچوارچێوەی بەسەرهاتەکاندا دیاری بکەن. یاخود باسی ژینگە و شوێن و ڕابردوو و ئێستا و ئایندەی خۆیان بکەن.

ڕۆمان و جۆرەکانی ڕۆمان ئەوە دەخوازێت کە جۆری گۆشەنیگا دیاری بکەین. لەبەر ئەوە لەسەر بناغەی جۆری گۆشەنیگا دەتوانرێت ڕۆمان بکرێت بە دوو جۆری سەرەکییەوە:

١- ڕۆمانی مۆنۆفۆنی (واتا ڕۆمانی تاکەدەنگ).

٢- ڕۆمانی پۆلیفۆنی (واتا ڕۆمانی فرەدەنگ).

لە چوارچێوەی گشتی جیاوازی نێوان ڕۆمانی مۆنۆفۆنی و ڕۆمانی پۆلۆفۆنیدا، ئۆسبنسکی تێبینی ئەوەی کردووە کە: «لە ڕۆمانی مۆنۆفۆنیدا یەک گۆشەنیگای ئایدۆلۆجی بالادەست دەبێ و ئەو گۆشەنیگایە لەسەرجەم کارە ئەدەبییەکەدا باو دەبێ و هەموو بەهاکان ملکەچی ئەو تاکە گۆشەنیگایە دەبن. بەجۆرێ ئەگەر گۆشەنیگایەکی پێچەوانە لەسەر زاری کارەکتەرێک سەر هەڵبدات، ئەوا ئەو گۆشەنیگایە جارێکی تر لە گۆشەنیگا باوەکەوە هەڵدەسەنگێندرێتەوە؛ ئەم هەڵسەنگاندنە بۆچوون و سەرچاوەکەی دەگرێتەوە، کەچی لە ڕۆمانی "پۆلیفۆنی"دا کۆمەڵێ گۆڕانی دیار لە گۆشەنیگای ئایدۆلۆجییە بالا دەستەکەدا بەدی دێت. هۆی ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەرهەمەکە مەیلی دامەزراندنی زیاتر لە سێستەمێکی بالای گشتی هەیە. لەم حاڵەتەشدا ئەو سیستەمانە سەربەخۆ دەبن و نووسەر نایەوێ ملکەچی سێستەمی بالا دەست بێ ؛ هەڵسەنگاندنی خودی و گەیشتن بە بڕیارە تایبەتیەکان بۆ خوێنەر بەجێدەهێڵێ» (نەجمئەڵوەنی، ٢٠٠٤: ٧٦).

لە ڕۆمانی مۆنۆفۆنیدا، گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزان لە گێڕانەوە و باس و پیشاندانی ڕووداو و کارەکتەرەکاندا باوە. ئەم جۆرە گۆشەنیگایەش ئەرک و خاسیەتی تایبەتی خۆی هەیە و بەمانەش لە جۆرەکانی دیکەی گۆشەنیگا جیا دەکرێتەوە.

گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزان، پەیوەندی بە ڕوانینی دەرەکییەوە هەیە. «بەپێی ئەم تەکنیکە، گێڕەرەوە لەدەرەوەی ڕووداوەکانەوە، کاری گێڕانەوەکە ئەنجام دەدات و هەواڵی کەسیەتیەکان و باری دەروونی ئەوانمان بۆ باس دەکات» (جینیت، ٢٠٠٠: ٢٦). هەروەها لەڕێی گۆشەنیگای هەموو شتزانەوە وەسفی ڕووخسار و ژینگە و هەڵسوکەوت و ڕەوشت و هەڵوێستی سیاسی و کۆمەلایەتی کارەکتەرەکان دەکرێ.

لەباسی جیاوازی نێوان گۆشەنیگای دەرەکی (هەمووشتزان) و گۆشەنیگای ناوەکی (کەمشتزان) جیرار جینێت ئاماژەی بەوە کردووە کە لە یەکەمدا، حەکایەت لەڕێی هۆشی کارەکتەرێکەوە دەگێڕدرێتەوە، کەچی لە دووهەمدا، گێڕانەوەکە سەبارەت بە کارەکتەرێکە، نەک لەڕێی ئەوەوە پێشکەش بکرێ (بارت، ١٩٧٠: ٣٧).

گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزان بەوە دەناسرێتەوە کە ڕێ نادات کارەکتەرەکان بەخۆیان بێنە سەرشانۆی ڕووداوەکان و گۆشەنیگای خۆیان ڕاستەوخۆ دەرببڕن، بەڵکوو لەباتی ئەوان قسە دەکات و گۆشە نیگاکانیان پیشان دەدات و باری دەروونیان شی دەکاتەوە و لە ڕووی کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە باسیان دەکات و ئاگای لە هەموو شتێکی ئەوانە و تەنانەت دەزانێ لە پشتی دەرگا داخراوەکانەوە ئەوان چی دەکەن و لەچی دەدوێن.

## بەشی دووهەم: ئاستەکانی گۆشەنیگای هەمووشتزان لە ڕۆمانی «هەرەس»دا

لەم ڕۆمانەدا گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزان باڵادەستە و لەڕێی ئەمەوە، گۆشەنیگای کارەکتەر کە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی ٥٠ کارەکتەر، پیشان دراوە. بەڵکوو بگرە بەشێک لەو کارەکتەرانە بەتایبەتی «حەمە و خەجێ و سمایل و ئەحمەد و هیام و سەرکەت و مامۆستا ڕەشید و نەسرینی ژنی ئەحمەد»، بەدرێژایی ڕۆمانەکە گوزارشت لە ئایدۆلۆژیای ڕۆماننووس دەکەن، گەلێ جار لە ڕووی زمانی و ئاستی ڕۆشنبیرییەوە دەبنە شێوەیەکی فۆتۆکراوی خودی ئەو و خۆیان لە بیر دەکەن یاخود ڕۆماننووس ئەوە لە بیر دەکات کە ئەوان کۆمەڵە کارەکتەرێکن و دەبێ خاوەنی دەنگ و پێگە و گۆشە نیگایەکی تایبەتی بن.

بەگشتی ئاستەکانی حەکایەتخوانی هەمووشتزان لەم ڕۆمانەدا دەکەین بە سێ بەشەوە:

١- ئاستی کات.

٢- ئاستی شوێن.

٣- ئاستی دەربڕین.

ئەو دابەشکردنەش مانای ئەوە نییە کە ئەو ئاستانە لێکدابڕاون و پەیوەندییان بەیەکەوە نییە، بە پێچەوانەوە ئێمە لەسەرەتاوە جەخت لەسەر ئەوە دەکەین کە ئەو سێ ئاستە پەیوەندیەکی ئۆرگانی پێکەوەیان دەبەستێت، چونکە بەقەد ئەوەی کە کاتوشوێن پێکەوە بەستراون و کار دەکەنە سەر شێوەی زمان و دەربڕینی کارەکتەرەکان لە ڕووی کەلتوری و دەروونی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە، ئەوەندەش دەربڕین دەوری خۆی دەبینێ لە پیشاندانی خاسیەتی شوێن و کات و هەروەها توانای ئەوەی هەیە کە مەوداکانیان بخاتە چوارچێوەی چەند مەودایەکی زمانییەوە. جگە لەوەی کە دەتوانێ ڕەهەندێکی ئایدۆلۆجی بەوان ببەخشێ.

لەم لێکۆڵینەوەدا، بە سێ تەوەری جیا باسی هەریەک لەو ئاستانە دەکەین و خاسیەتەکانیان ڕوون دەکەینەوە.

### تەوەری یەکەم: ئاستی کات

لەبەر ئەوەی ئەم ڕۆمانە لەڕێی حەکایەتخوانی هەمووشتزانەوە گێڕانەوەکەی ئەنجامدراوە، بۆیە ئاساییە کە کاتی ڕابردوو بەسەر زۆربەی گێڕانەوەکەدا زاڵ ببێ و حەکایەتخوان لە هەموو کات و ساتێکدا پێش

**بەشی پێنجم- رەخنە**

کارەکتەرەکان بزانێ چ ڕوو دەدات و لە ڕابردوودا ئەوان چۆن بوون و لە ئێستادا چۆن بیر دەکەنەوە و بە چ شێوەیەک دەڕواننە ئاینده.

بە کار هێنانی فرمانی ڕابردوو، ئەوە دەگەیەنێ کە لە پشتی ئەو فرمانەوە هەمیشە دروستکەرێ، خواوەندێ یان حەکایەتخوانێک، خۆی شاردۆتەوە و جیهانە باسکراوەکە، ڕاڤە دەکات و دەیەوێ بە زووترین کات و بە گونجاوترین شێوە هۆ و مەبەست پێکەوە ببەستێت (اوسبنسکی، ١٩٩١: ٧٧).

حەکایەتخوانی ڕۆمانی هەرەسیش لەسەرەتاوە خۆی وا پیشان دەدات کە ئاگای لە هەموو شتێکی کارەکتەرەکانە و دەزانێ هۆی ئازار و نەهامەتی و ئاوارەیی و برسێتی و مردن و تێکۆشانی ئەوان چییە. هەروەها تەفسیری هەموو ڕووداو و بەسەرهاتەکانی لایە، وەکوو جیهانێکی ئامادە کە سەرجەم بنەماکانی لەوە و پێش خراوەتە ڕوو، تەماشای جیهانی کارەکتەرەکان دەکات.

سەرەتای ڕووداوەکانی هەرەس بە ڕووخانی کۆماری مەهاباد لە ساڵی ١٩٦٤ دەست پێ دەکات و درێژە دەکێشێت هەتا نسکۆی ئەیلول لەساڵی ١٩٧٥ و لە مانگی پێنجی ئەو ساڵە کە بەسەرەتای دەست پێکردنەوەی شۆڕشێکی دیکە دادەنرێ، ڕۆمانەکە کۆتایی پێدێت.

ئەم ڕۆمانە سەرەتا و ناوەند و کۆتایی هەیە، بەڵام کۆتاییەکەی کراوەیە بە گوێرەی ئەو دابەشکردنەش کۆمەڵێ کارەکتەر لە ڕووداوەکاندا بەشداری دەکەن. گرنگترینیان ئەمانەن:

١- حەمە.
٢- خەجێی ژنی حەمە.
٣- سمایل برای حەمە.
٤- ئەحمەد کوری حەمە.
٥- نەسرین ژنی ئەحمەد.

بەهۆی کارەساتی ڕووخانی کۆماری مەهاباد، حەمە و خەجێ و سمایل لە گوندی «هەنجیرە»ی سەر بە شاری سەقز لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەڵدێن و ئاوارەی شاری کەرکووک و بەغدا دەبن. سەرەتا پەنا دەبەنە بەر نیمچە ئەشکەوتێک لە بناری چیای «بەیان». لەوێوە حەکایەتخوان ساتبەسات ڕووداوەکانی ژیانیان لە پاشو پێشی ئەو کارەساتە دەگێڕێتەوە و لە لاپەرە ٨دا دەڵێ:

« ئەم نیمچەئەشکەوتە لە دەمەو ئێوارەی ساڵی ١٩٤٦دا هەناسەی ماندوویەتی ئەم سێ کەنەفت و ڕەنگبوواردووەی هەڵدەمژی. کزەبایەکی ساردیش دوا تیشکی هەتاوە نیوە ئاوابووەکەی نێوان ترۆپەکانی ڕاودەنا و تاریکی بە دوای خۆیدا پەلی کێش دەکرد و بەسەر زەویدا ڕایدەخست. ئەو سێ شەکەتە ورتەیان لە دەم نەدەهاتە دەر، بێ مەبەست سەیری ئاسمانیان دەکرد،...».

گەڕانەوە بۆ ئەو بەسەرهاتە، کە پەیوەندی بە ڕووداوێکی واقیعی ژیانی گەلی کوردەوە هەیە، تەنیا بۆ ئەوەیە لەڕێی پیشاندانی هۆ و هۆکارەکانی ئەوەوە باسی نسکۆی شۆڕشی ئەیلول بکات و ئەو نسکۆیەش بۆ ئەو هۆیانە بگێڕێتەوە کە ڕووداوی یەکەمی لێوە بەدیهاتووە، بۆیە لەکاتی نسکۆی ئەیلولدا حەکایەتخوان زەینی خوێنەر بۆ

زەمەنی بەسەرهاتی ڕووخانی کۆماری مەهاباد دەگێڕێتەوە و باسی هۆ و هۆکارەکانی ئەو ڕووداوە لـە ل١٩٣ دا دەکا و دەڵێ:

«بیست و نۆ ساڵی ڕەبەقی بەر لە ئێستا «قازی» و «سەیف»، سەربەرزانە چوونـە پـای قـەنارە، پێڵاوەکانیـان کەوتە ژوور سەری ئینسانی کورد. بیست و نۆ ساڵ لەمەوبەر، کۆماریٚ ڕووخا، پـاش ئـەوەی بـۆ ساڵـێ دنیـای ڕۆشنی بینی، سەرنگون کرا، فرۆشـرا، بەرژەوەنـدی دەوڵـەتان، بـیرە نـەوت، سیاسـەتبازان، کۆمـار و خـوێنی کوردیان پێچایەوە ... ئیدی پەناهەندەیی و دەربەدەری، هەزاران تفەنگی سەرخوار لـە کـاروانێکی نەسـرەوتدا خاک و وڵاتیان سپاردە نەوەی دوای خۆیـان... ملـی ڕێیـان گرتـە بـەر... مـەهاباد، مـەهابادی قورقوشمیـان بەسەری «شا»دا توانەوە، وێنەی قازی دەرکەوت... شا ترسی نەما».

لە زەمەنی ئەو بەسەرهاتەدا، حەکایەتخوانی هەمووشتزان بەئاشکرا دیارە و لەدەرەوەی هۆیـەکانی ڕووخـانی کۆماری مەهاباد بۆ خیانەت و گەمەی سیاسەتبـازان و بەرژەوەنـدی دەوڵـەتان و پاراسـتنی بـیرە نەوتـەکان دەگێڕێتەوە. دوای ئەوە باسی چەکی سەربەرەو خواری پێشمەرگە بێئومێدەکان دەکات. لە زەمەنی نسـکۆی ئەیلولیشدا هەمان حەکایەتخوان، لەزەمەنی کارەکتەرەکانـدا ئامادەیـە و لـەڕێی ئەوانـەوە باسـی هـەمان ئـەو هۆکارانە لە لاپەڕەی ٢٢٦ دا دەکات کە ڕێخۆشکەر بوون بۆ هاتنە پێشەوەی ئەو بەسەرهاتەو بەم جۆرە لە ڕێـی دایەلۆگی ڕاستەوخۆی خەجێ و مارفەوە دەیانخاتە ڕوو:

«- ئەریٚ چۆن وا .. ؟ چی بوو؟

- ئیتر

- یانی تەواو .. هیچ نەما .. هەر هیچ نەما؟

- بەڵێ تەواو .. چۆلەکەکوژیش نەما ...

- چۆن؟

- فرۆشراین .. هەرزان فرۆشیان کردین، ئێمە و وڵاتیان نایە ناو جانتایەکی دەبلۆماسی، وێستگا بـە وێسـتگا، لەنگەر بەلەنگەر هەڕاجیان کردین.

- ئەو هەموو پێشمەرگەیە، ئەو هەموو چەکە، بەجاریٚ ..؟

- بەڵێ تەنانەت ئـەو تفەنگانـەی زمـانی حـەقگۆمان بـوون، لـەو ڕۆژەدا لاڵ بـوون، مـەیین، بێزیـان لـەخۆ دەکردەوە کە بەشانی ئێمەوەن».

گەمەکردن بـە ڕووداوەکـان و گواسـتنەوەی گێڕانـەوە لـە ئێسـتاوە بـۆ ڕابـردوو، لـە ڕۆمـانی کـۆنی نوێـدا، دیاردەیەکی ئاساییە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە چەند گۆشەنیگایەکی زەمەنی لەیـەک زەمەنـدا بخرێتـە ناو گێڕانەوەکە. ئەم شێوە ئاڵـۆزترین شـێوەکانی پیشـاندانی گۆشـەنیگایە. لـە ڕووی فۆرمـەوە: «ئـەم جـۆرە کۆکردنەوەی نێوان گۆشەنیگا زەمەنییەکان لەوانەیە لە تەعلیقاتی نووسەردا بەدەر بکەویٚ کە هاوشـانی یـاخود پێش گێڕانەوەی قسەیەک، یان ڕووداوێکی دیاریکراو ئەنجام دەدریٚ. ئەم شـێوەیەش ئـەرکی جـۆرە باگراونـێ

دەگێڕێ کە لەڕێی ئەوەوە یەک لە دوای یەک هـاتنی ڕووداوەکـانی ڕۆمانەکـە دەرکـی پێـدەکرێ» (الـراوی، ١٩٨٦: ٦٠).

محەمەد موکری لە ڕۆمانی هەرەسیشدا، بۆ هەمان مەبەست گەمەی بـە زەمـەنی ڕووداوەکـان کـردووە، بـۆ ئەوەی بتوانێ چەند گۆشەنیگایە لە یەک زەمەندا بخاتە گێڕانەوەکەوە. بۆ نموونە حەکایـەتخوان، هەلپەرسـتی و ترسنۆکی و خودپەرستی ئاغای گوندی هەنجیرە، پاش ڕووخانی کۆماری مەهاباد لـە لاپـەڕەی٥٣دا دەخاتـە بەرچاو و دەڵێ:

«ئاغا لە پێشوازی سەرکردە ژاندرمەکان ڕووی لە پیاوەکانی کرد و بە کوردی پێیدەوتن:

ــ ئا ... ڕۆڵە چەند جارم پێوتن حکومەت بە عارەبانە کەروێشک دەگرێ؟

ڕووی لەسەرکردەی ژاندرمەکان کرد و لەسەر یەک دەیووت:

یا خوابەخێر بێنەوە، پێ و قدومتان خێری پێوە بوو، بەخێر بێنەوە، یاخوا بەخێر بێنەوە. خـۆ ئەگـەر فریامـان نەکەوتبان، ئەوا هەرچی و ڕووتەڵە بە فەتارەتیان دەبردین و زەوی و زاریان داگیر دەکرد، حەیا و ناموسیشـمان دەکەوتە ژێر دەستیان، یاخوا بـەخێر بێنـەوە! سـەد جـار بـەخێر بێنـەوە! ماڵـی خۆتانـە، سـەر، مـاڵ، منـاڵ هەرچییەکی ئێوە بفەرموون لە ئۆغردایە، هەزار جار بەخێر بێنەوە!»

ئەم گۆشەنیگایە، بە پێچەوانەی گۆشەنیگای لەوەوپێشی هەمکان ئاغایە، کە ساڵێ پـێش ڕووخـانی کۆمـاری مەهاباد دەریبڕیبوو. حەکایەتخوان لەڕێی کرداری بیرهاتنەوەی «خەجێ»وە دەقی قسەکانی ئەو سەبارەت بـە شۆڕش لە لاپەڕەی ٥٤دا دەخاتە ڕوو:

«- کوڕینە گوێ بگرن!

ئەمڕۆ ڕۆژی لەخۆبوردن و تێکۆشان و هەڵمەتە! ئەگەر ئەمڕۆ شتێ بـە شـت نەکـەین، ئـەوا مێـژوو هـەرگیز لێمان نابوورێ. ئەگەر تا ئێستا لە ڕووی نەفامییـەوە کەمتەرخـەمیمان بەرانبـەر نەتەوەکـەمان کردبـێ، دەبـێ ئەمڕۆ هەمووومان بەیەک دەنگ، بەیەک دڵ، بە یەک بیرو باوەڕەوە بێینە مەیدان. سـەرو مـاڵ، هەرچییـەکمان هەیە، بۆ سەربەستی و سەربەرزی ئەم نەتەوەیە، بۆ ئازادی گەلەکەمان بێ، دەبێ خۆ بەخت کەین ....».

لێرەدا دەبینین دوو گۆشەنیگای جیاواز بەرانبەر یەک دیاردە (شۆڕش) لە دوو زەمـەنی جیـاوازدا پێشـکەش کراوە. هەردوو گۆشەنیگایەکەش تایبەتن بە یەک کارەکتەر. کرداری پیشـاندانەکەش لـەڕێی حەکایـەتخوانی هەمووشتزانەوە جێبـەجێ کـراوە. لـە یەکەمیانـدا حەکایـەتخوان گۆشـەنیگای کارەکتـەر دەگوازێتـەوە. واتـا کارەکتەر لەزەمەنی حەکایەتخواندا دەدوێ و حەکایەتخوان لەکاتی ئێستادا قسەکانی ئەو دەگێڕێتـەوە، بـەڵام لە دووهەمدا خەجێ بیری دەکەوێتەوە و حەکایەتخوان لە زەینی ئەوەوە دەقـی گۆشـەنیگایەکە دەگێڕێتـەوە. بەم بیر هاتنەوەیە زەمەنی گێڕانەوەکە تێکشکاوە. لە یـەک کاتـدا بـەڕووی دوو زەمـەنی خۆییـدا کراوەتـەوە. یەکەمیان پەیوەندی بە ئاغاوە هەیە لە دوو هەڵوێستی جیاوازدا. دووهەمیان پەیوەندی بە خـەجێوە هەیـە کـە ڕۆڵی شایەت دەگێڕێت سەبارەت بە هەڵوێستە درەکانی «ئاغا». بێجگە لە زەمەنی بابـەتی حەکایـەتخوان کـە لە ڕێی بەکارهێنانی ڕاناوی «ئەو»وە هەردوو گۆشەنیگایەکانی هێناوەتە ناو دەقەکەوە.

بۆ بەستنەوەی ئەو دوو هەڵوێستە جیاوازە بە جیاوازی و ناکۆکی هەڵوێستی هەندێ لەبەرپرسـانی شۆڕشـی ئەیلوول لەکاتی شۆڕش و پاش نسکۆ بە مەبەستی تەفسیرکردنی هۆیەکانی ئەو ڕووداوە، ڕۆمـاننووس دووبـارە لە ڕێی دیدی خەجێوە هەمان هەلپەرستی و خۆپەرستی و بێهەڵوێستی ئەو هەنـدە بەرپرسـانە دەخاتـە بـەر چاو و لە لاپەڕەی ٢٢٤دا دەڵێ:

«خەجێ، قەد باوەری نەدەکرد تا بە چاوانی خۆی لە تەلەفزیۆنـدا بـینی ئـەوا بـە کۆمـەڵ، دەسـتە دەسـتە پێشمەرگە چەکی قورس و سووک دادەنێن و تەسلیم دەبنەوە.

ئەوە فلانە کۆنە مەسئوولیش لە تەلەفزیۆندا دەڵێ:

- خەڵکینە! بە هەڵەدا چوو بووین. مـیری نیشـتمانی بەڕەحمـە. ئێمـە خـراوێ بـووین، مـیری لێـی بوردووین. ئیدی ئێوەش بچنە دووی کەسوکارتان بیانهێننەوە. بەسە ئیتر، ئێمە سەر بە ئیسـتعمار و زایۆنیـەت و ...».

ئەم گۆشەنیگایە، هەلپەرستی ئاغای گوندەکەی هەنجیرەی وەبیر دەهێنایەوە، چونکـە ئـەو بـەر پرسـانەشساڵێک پێش نسکۆی ئەیلوول وەکوو لە لاپەڕەی ٢٢٤ی دەقەکەدا ئاماژەی پێکراوە، دەیانوت:

«- هەڤاڵان! خەڵکی بە شەرەفی کوردستان! گەر میری دەست لە تـەرحیل و تـەعریب هەڵـنەگرێ، ئـەوا دەبێ دەرسێکی ئەوتۆی بدەین کە هەرگیز لەبیری نەکات. دەبێ چۆکی پێ دابدەین، ئـاڵای سـپی پـێ بـەرز بکەینەوە، بەڵێ خەڵکی بەشەرەفی کوردستان! دەبێ تـا دوا دڵـۆپە خـوێن شـەڕی لەگەڵـدا بکـەین و مـافی ڕەوای خۆمانی پێبسەلمێنین و...».

دیاریکردنی زەمەنی ئەو گۆشەنیگایانەی کە پەیوەندیان بە ڕووخانی کۆماری مەهاباد و نسـکۆی ئەیلوولـەوە هەیـە، وەکـوو ئێمـە بـۆی دەچـین تـەنیا بـۆ جـەخت کردنەوەیـە لەسـەر هـاوجۆری فاکتـەرە نـاوخۆیی و دەرەکییەکانی ئەو دوو بەسەرهاتە لە گۆشەنیگای ڕۆماننووسەوە.

ئەم شێوازە وای کـردووە گۆشـەنیگای ڕۆمـاننووس لـە گۆشـەنیگای کارەکتـەرەکان بـە دەسـەڵاتتر بـێ و زۆربەیان بە تایبەتی گۆشەنیگای کارەکتەرە سەرەکییەکان ملکەچی گۆشەنیگای ڕۆماننووس بـن. ئـەم جـۆرە دەربڕینە وای کردووە کە پێگەی ئایدۆلۆجی کارەکتەرەکان لە خزمـەتی پێگـەی ئایـدۆلۆجی نووسـەردا بـن و خاسیەتی خۆیان لەدەسـت بـدەن. ئـەم جـۆرە تەسـکبینییـە، ئەگـەر هـەر ڕۆماننووسـێک بـەکاری بێنێـت «دەکەوێتە وەعزدانێکی ڕاستەوخۆوە، لە واقیعی ژیـان دوور دەکەوێتـەوە کـە بـەخۆی واقیعێکـی لێکـئـاڵاو و تێکچڕاوە لە نێوان پێگە جیاواز و درەکاندا ...» (یونسی، ١٣٧٩: ٧١) و نـاکرێ لـە چوارچێـوەی یـەک پێگـەو یەک گۆشەنیگای زەمەنیدا باڵبەست بکرێ.

بە گوێرەی ئەو نموونانەی لێـرە شـیکرانەوە، دەبیـنین حەکایـەتخوان لـە ڕۆمـانی هەرەسـدا لـە دەرەوەی کارەکتەرەکان و لەناو زەمەنی خۆیدا وەستاوە، بۆیە لەئێسـتای خۆیـەوە، واتـە لـە زەمـەنی فیزیکـی خۆیـەوە، دەروانێتـە زەمـەنی کارەکتـەرەکان و لـە گۆشـەنیگایەکی تایبەتییـەوە ئـەوان هەڵدەسـەنگێنێ و تەماشـایان دەکات. لەبەر ئەوە سنووری زانینی لەوان فراوانترە و گۆشەنیگایەکەشی کەوتۆتە دەرەوەی گێڕانـەوەکـە. واتـە

## بەشی پێنجەم- رەخنە

خاوەنی گۆشەنیگایەکی دەرەکییە و ڕێ نادات کارەکتەرەکان لە گۆشەنیگای خودی خۆیانەوە بێ دەستتێوەردانی ئەم، لە زەمەنی خۆیاندا گوزارشت لە خۆیان بکەن.

تەوەری دووهەم: **ئاستی شوێن**

شوێن لەم ڕۆمانەدا، توخمێکی هونەری گرنگ پێکدەهێنێت و لە ڕێی ئەوەوە ئاشنای گۆشەنیگای حەکایەتخوان و زۆربەی کارەکتەرەکان دەبین، بەڵکوو بگرە شوێن دەورێکی بەرچاوی گێڕاوە، تەنانەت لە پێکهاتنی کەسیەتی ئەوان و گۆڕانی باری دەروونی و گۆشەنیگای سیاسی و ڕەوشت و ڕەفتارپان.

گەلێ جار لەڕێی شوێنەوە ململانێی ناو دەروونیان و هەروەها دروستکردنی پەیوەندیەکانیان لە ئاستی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و پیشەییدا بەدەردەکەوێت.

لە ڕۆمانی هەرەسدا ناوی زیاتر لە هەژدە شوێن هاتووە کە گرنگترینیان ئەمانەن:

١- گوندی هەنجیرە
٢- نیمچە ئەشکەوت
٣- مەهاباد
٤- کەرکووک
٥- بەغدا
٦- خەستەخانەی عەزل لە بەغدا
٧- ئوتێلی شەلماشی لە مەهاباد
٨- ئۆردوگای زێوە لە ئێران
٩- هەیئەی تەحقیقی کرکووک
١٠- چیای قەندیل

لەم شوێنانەو هەندێ شوێنی دیکەدا ڕووداو دروست دەبێ، مەشهەدەکان دادەمەزێن، کارەکتەرەکان یەکتر دەناسن و ئاشنای یەکتر دەبن و یەکیان خۆش دەوێ و دژایەتی یەکتر دەکەن. بەگشتی مێژووی ژیانی مرۆڤ دەخرێتە ناو وتارێکی ئەدەبییەوە.

ڕووداوی یەکەم: لە گوندی هەنجیرەوە دەست پێدەکات. حەمە و سمایل و خەجێ پاش ڕووخانی کۆماری مەهاباد، هەڵدێن و پەنا دەبەنە «ئاسیاوەکەی میرزا قولی». لەوێ نزیکەی مانگێ خۆ حەشار دەدەن. «هەیەرەکەچەڵ» کە پوورزای خەجێیەو بەتەمای دەبێ، بەڵام لەبەر هەژاری و دەستکورتی نایدەنێ و دەیدەن بە حەمەی کوڕە کوێخا. بۆ تۆڵەسەندنەوە دەچێتە پادگانێکی ژەندرمە و هەواڵیان لێدەدات. ژەندرمە دەرژێنە ناو گوند. حەمە و سمایل و خەجێ هەڵدێن و پەنا دەبەنە نیمچە ئەشکەوتێ. ژەندرمە، حاجی فەرەجی خزمی حەمە دەکوژن. حەمە و سمایل لە تۆڵەی حاجی فەرەجدا چەند ژەندرمەیە دەکوژن. ئەوانیش دوایی گوندەکە دەسوتێنن و هەیەر و هەموو خەڵکی گوندەکە دەکوژن. بەم ڕووداوانە هێڵە سەرکییەکانی ڕۆمانەکە دادەمەزرێت و ژیانی کارەکتەرەکان دەگۆڕێت و گێڕانەوەی بەسەرهات لە ئاستی حیکایەتەوە بۆ ئاستی وتار دەگوازرێتەوە. ترس و ژان و برسێتی و ئاوارەیی و گۆڕانی باری دەروونی و ڕەفتار و ڕەوشتی کارەکتەرەکان دەست پێدەکات، بەڵام گۆشەنیگای حەکایەتخوان وەک خۆی دەمێنێ.

حەکایەتخوانی هەمووشتزان لە لاپەڕەی ٧ بەم جۆرە باسی نائارامی و شڵەژانی باری دەروونی و چارەنووسی نادیاری حەمە و خەجێ و سمایل لەناو نیمچە ئەشکەوتەکەدا دەکات و دەڵێ:

«ئەم سێ جووتە چاوە نیمچە خامۆش و شەکەتە پڕ بوون لە دیمەنی بێتەمەنی سبەینێی ترسناک، شەرمیان لە یەکدی دەکرد، وەک ئەوەی هەرگیز لە یەکتر نامۆبن، ئاوها بە جۆرە تروکاندنێکی پەلە، بە شەرمەوە یەکدییان هەڵدەلووشی. هەر جووتە چاوەش خۆی بە پەناهەندەی سەری خاوەنەکەی خۆی دەزانی. هەر سەرەیش یاد و وێنە و وشەی تێکچڕاوی کەڵەک کردبوو، چجێ و توانای وەرگرتنی شتی دی نەبوو...».

بە لێکدانەوەی دەروون و چارەنووسی ئەو سێ ئەکتەرە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە حەکایەتخوانی هەمووشتزان هەوڵی ئەوە دەدات لەڕێی شوێنەوە وردترین و شاراوەترین هەستی کارەکتەرەکان ئاشکرا بکات و ئەوە پیشان بدات کە «شارەزاییەکی تەواوی هەیە، هەموو شتێک دەزانێ و دەبینێ، هیچ شتێکی لێ شاراوە نییە، ڕاستە ئەو گشت زانیارییەکانی خۆی یەکسەر بۆ خوێنەر ناگوازێتەوە و زۆربەیان دەهێڵێتەوە تا بە لووتکەی ڕۆمانەکە دەگات، بەڵام بەهەر حاڵ حەکایەتخوانی هەمووشتزانە» (احمدقاسم، ١٩٨٤: ١٣٢).

هەروەها لە لاپەڕەی (٧)دا، حەکایەتخوان وەسفی نیمچە ئەشکەوتەکە دەکات و دەڵێت:

«نیمچە ئەشکەوتەکە، لە ڕووی چەند گا بەردێکی لە یەکتر نزیکی بناری زنجیرە چیایەک دەمی داچەقاندبوو، تەنها بۆ شەوێک هەناسەی ماندوویەتی ڕێبوار و کۆچەر و قاچاغچی و ڕاوکەر و فیراری دەکردە خۆراک و تێکەڵ بەشێ و بێدەنگی دیوارە ڕزیوەکانی دەبوو، ڕۆژی دواییش بەهەمان بێدەنگییەوە بە ڕێیانی دەخست...».

لەم وەسفە بابەتییە سادەدا، کە بەکۆمەڵە وشەیەکی ڕوون و واتا دیار ئەنجامدراوە، حەکایەتخوان، خاسیەتە جوگرافییەکانی شوێنەکە دەردەخات و جۆری ئەو کەسانەش دیاری دەکات کە تەنیا بۆ شەوێک پەنا دەبەنە بەر ئەو جۆرە شوێنانە وەکوو ڕێبوار، کۆچەر، قاچاغچی، ڕاوکەر، فیرار. لێرەدا ڕۆماننووس مۆنتاجی شوێنی دروستکردووە. شوێنی کردۆتە باگراونی ڕووداو. یان شانۆیەک بۆ ناساندنی کارەکتەرەکان. وەسفەکە زۆر تەقلیدیە بۆ ئەوە کراوە کارەکتەر و شوێن لە گۆشەنیگایەکی دەرەکییەوە -کە تایبەتە بە حەکایەتخوانی هەمووشتزان- پێشکەش بە خوێنەران بکات و ئەو جۆرە گۆشەنیگایەش «لە گێڕانەوەی ڕۆمانی کلاسیکیدا باوە و لەسەر بنەمای چەمکی حەکایەتخوانی هەمووشتزان دادەمەزرێت کە ئاگای لە دەرەوە و ناوەوەیە و بابەتەکە پێشکەش دەکات، بێ ئەوەی ئاماژە بە سەرچاوەی زانیارییەکانی بکات. "بەلزاک" لە ڕۆمانی ڕیالیزمیدا بە باشترین شێوە ئەم ڕەوتەی نواندووە» (کنی،١٣٨٠: ٩٣و٩٤).

حەکایەتخوانی ئەم ڕۆمانە، سوود لە شوێن وەردەگرێ نەک تەنیا بۆ شیکردنەوەی باری دەروونی و وەسفی ڕوخساری کارەکتەرەکان، بەڵکوو لەهەمان کاتدا باری چینایەتی ئەوانیش بۆ خوێنەر دەستنیشان دەکات. ئەم دیاردەیەش لە باسکردنی باری چینایەتی حەمە لە لاپەڕەی ١٣-١٤ ڕۆمانەکەدا دەردەکەوێ کاتێ کە ئەو و خەجێی ژنی و سمایلی برا بچووکی لەناو نیمچە ئەشکەوتەدا دەبن.

حەکایەتخوان دەڵێ:

«حەمە بێ ئێشتیها نانە وشکەکە دەجاوێ، بۆی قوت نەدەدرا. ناحەقی نەبوو:

کوڕە کوێخاو دەست و پێ سپیە، ڕاهاتووی ناز و نیعمەتە، دنیا نەدیدەیە، بۆ قیتە قیت و پف بـەخۆدا کـردن، بۆ شەشە حەوت مانگێ دوو ڕیز فیشەکدانی ڕاست و چەپی لەسەر ستارخانیەکەیدا دەبەست، ڕیـزێ فیشـەکی دەمانچەی دە تیر و خەنجەرێکی دەبانی مشت و سێی، بەبەر پشتوێنەکەیەوە بوو، بـە ڕۆنی مریشـک قونـاغی تفەنگەکە (نهایەت جاندارەکەی) چەور دەکرد، دەبریسکانەوە، دەستە سرێکی مەخمەڵ و تەسبیحێکی کارەبـا هەمیشە بەبەر پشتوێنەکەیەوە ئاوێزان بوو... جگە لـە کەڵـە کێـوی و کەروێشـک و کـەو، گوللـەی بـە هـیچ شتێکی دییەوە نەنابوو کەچی بەناویش کوڕێکی عەگید و سەگڤان بوو».

لەم کۆپلەدا بە ئاشکرا دەست تێوەردانی ڕۆماننووس لەڕێی حەکایەتخوانەوە لەو تەعلیقانـە بـەدەر دەکـەوێ کە حەکایەتخوان سەبارەت بە حەمە دەری بڕیوە؛ بەتایبـەتی کـە ئامـاژە بـەوە دەکـات کـە حەمـە تـەنیا لـە ڕاوکردندا تەقەی کردووە، ئەگینا هیچ جۆرە ئازایەتییەکی تری نەنواندووە. ئەم جۆرە گۆشەنیگایە گوزارشت لـە گۆشەنیگای نووسەر دەکات و حەکایەتخوانی هەمووشتزان پێشکەشی خوێنەری کـردووە. ئـەو ڕۆماننووسـەی دەیەوێ خاوەنی زانیارییەکی فراوان بـێ سـەبارەت بـە ڕووداو و کارەکتـەر و کەرەسـتەکانی دیکـەی بابـەتی ڕۆمانەکەی، حەکایەتخوانی هەمووشتزان بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکان هەڵدەبژێرێ چونکە «ئـەو دەتوانـێ خـۆی بخاتە ناو ژیانی هەر کەسێکەوە و بە خوێنەر بڵێ کارەکتەری دەستنیشـان کـراو بـیر لـەچی دەکاتـەوە. ئـەو دەتوانێ لەیەک ساتدا لە شارێک بێ و لە ساتێکی تردا لە هەر شوێنێکی وڵات. ئـەو دەتوانـێ (حەکایـەتخوانی هەمووشتزان) لەیەک ڕستەدا لەگەڵ ئێمە حازر بـێ و لـە ڕسـتەی دوای ئـەودا ئێمـە بـۆ ڕابـردوو بەرێتـەوە» (اوسبنسکی، ١٩٩١: ٦٩).

ڕووداوەکانی ناو شوێن کار دەکاتە سەر هەڵوێستی کارەکتەرەکان، یا بەرەو پاشـیان دەبـات، یـاخود بـەرە و بارێکی دژیو دەیانگۆڕێت. لەو ڕۆمانەشدا شوێن هەمان دەوری گێڕاوە. بۆ نموونە کاتـێ خـەجێ لـەناو نیمچـە ئەشکەوتەکەدا، منداڵی دەبێ، ئەم ڕووداوە کاریگەرییەکی تەواو دەکاتە سەر هەست و هەڵوێستی حەمە و لـەو پەڕی بێئومێدی و بێزاری و ترس و ورە بەردانەوە دەیگۆڕێ و ڕۆحێکی نـوێی پـێ دەبەخشـێ. لـەم بارەیـەوە حەکایەتخوانی هەمووشتزان کە لە نزیکی ئەو وەستاوەو چاودێری دەکـات و ئاگـای لـە ڕەفتارەکـانی دەبـێ و باری دەروونی شیدەکاتەوە لە لاپەڕەی ٣٢دا دەڵێ:

«ئەم دەنگە نوێیە- واتا دەنگی منداڵەکە- هێزێکی یەزدانی بەخشی بـە حەمـە دەدا، هەسـتی دەکـرد کـە نەک تنها دەتوانێ بەرگری لە چەرمەسەریەکانی ژیان بکات، بەڵکوو لە مردن نەترسێ و ژیانی خۆشـبووێ، بـە ئەو پەڕی دڵنیاییەوە ڕووی تێبکات. حەمە، سیامەست ئاسا بەدەوری خەجێدا دەسووڕایەوە، لە خۆشـیا لـەتری دەدا و ئەم شان و ئـەو شـانی دەکـرد، هیچـی پـێ نـەدەوترا، هـیچ وشـەیەکی پـێ نـەبوو لـە قـەوارەی ئـەم دڵخۆشییەدا بێ و دەری بڕێ».

کاتێ کە حەمە و خـەجێ و ئەحمـەد و سمایـل ئـاوارە دەبـن و دەچنـە شـاری کـەرکووک لـە باشـووری کوردستان، لەوێ حەمە و سمایل دەسـت بـە حەماڵـی دەکـەن. برسـێتی و ژینگـەی دەوروبـەر و ئـاوارەیی، گەلێک کار دەکەنە سەر ڕەفتاری حەمە و سمایل و سەر لە نوێ کەسایەتی ئەمان دادەڕێژنـەوە. لـە لاپـەڕەی ٦٢ی ئەم ڕۆمانەدا حەکایەتخوان دەڵێ: «ئەگەر لەوە بەر لەجێ و شوێنی خۆیاندا، لە گـەورە پیـاوان و مـەلای دێ زۆر قسەی خۆش و شیعری جوان و چیرۆکی جوامێرییان بیستبوو، کەچی بایی پولێـک نـەیانیگۆڕی بـوو،

بەڵام لێرەدا برسێتی و غەریبی بەکەڵکترین وانەبوو، نەک تەنیا فێری خۆشەویستی و وەفای کردن، بەڵکوو لە دڵسۆزیا قاڵ بوون و تێکەڵی خوێنیان بوو. هەر کە ئێواران دەگەڕانەوە هەر یەکە دەسماڵێکی پڕ دەکرد، هەر ڕۆژە و شتێکیان بۆ ماڵ دەکڕی، بە ماوەیەکی کەم ناوماڵێکی هەندێ ڕێکوپێکیان پێک هێنا. ئیدی دەستهاتیان پاشەکەوت دەکرد».

لەم گۆشەنیگا بابەتییەوە کە حەکایەتخوانی هەمووشتزان پێشکەشی خوێنەری کردووە، ئەوە دەردەکەوێ کە چۆن ڕووداوەکانی شوێن، کارەکتەرەکانی لە ڕووی پێگەی چینایەتی گۆڕیوە، لە کورەکوێخاوە بۆ بار هەڵگری ڕەنجدەر. لە چینێکی دەستڕۆوە بۆ چینێکی بندەست. لە مشەخۆرییەوە بۆ دڵسۆزی وەفاداری و خۆشەویستی کار و ژیان.

کە گۆشەنیگای حەکایەتخوان، لەگەڵ یەکێک، یان زیاتر لە کارەکتەرەکان، بە شێوەیەکی کاتی یاخود بە درێژایی ڕۆمانەکە، یەک دەگرێتەوە، وا دەکات کە ئەو شوێنە بگێڕێتەوە کە کارەکتەرەکان لەوێن. بۆ نموونە کاتێک یەکێک لە کارەکتەرەکان دەچێتە ژوورێکەوە حەکایەتخوان وەسفی ئەو ژوورە دەکات، کاتێکیش کارەکتەر دەڕواتە سەر جادە، حەکایەتخوانەکەش وەسفی جادەکە دەکات (کریستیفا، ١٩٩١: ٤٠). واتە وەکوو کامێرا لە نزیکەوە وێنەی جووڵانەوە و ڕەفتار و جۆری ژیان و شێوەکانی ژینگە و شوێنی گوزەرانی ئەومان بۆ دەگرێت. لە ڕۆمانی هەرەسیشدا، حەکایەتخوان هەمان ئەو ڕۆڵەی گێڕاوە لە گواستنەوەی دیمەن و وێنەکانی ژیانی کارەکتەرەکان لە چوارچێوەی شوێندا. بۆ نموونە حەکایەتخوانی هەمووشتزان لە لاپەڕەی ٦١، ١١٣، ١١٨، ١٧٥، ١٧٦، ٢٣٥، ... هتد، چەندین دیمەنی ناوەوەی ئەو حەوشە دەخاتە ڕوو کە حەمە و خەجێ و ئەحمەد و سمایل لە کەرکووک بە کرێیان گرتبوو، یاخود لەڕێی پیشاندانی دیمەنەکانی ناوەوەی ئەو ژوورە کە خەجێ لە بەغدا بەکرێی گرتبوو. دیمەنی ناوەوەی دەروونی پڕ ئازار و نەهامەتی خەجێ وێنە دەکێشێ. هەروەها لەڕێی شوێنەوە بە تایبەتی لە گێڕانەوەی باسی هەراکەی کەرکووک و کوشتنی تورکمانەکان و بڕین و دزینی دووکان و ماڵەکانیان، ڕەفتاری دڕندەئاسای ئەو کەسانە وێنە دەگرێ کە ئەو تاوانەیان ئەنجام داوە. شان بەشانی ئەوانەش حەکایەتخوان باسی ململانێی نێوان نوێنەرانی ڕژێمی بەعس و پیاوانی ساواکی ئێران لە ئۆردووگای ئاوارەکانی پاش نسکۆی ئەیلوول دەکات و لە لاپەڕەی ٢٥٤-٢٥٥ دا حەکایەتخوان دەڵێ:

«نوێنەرانی عێراق دەیانووت:

میری نشتیمانی بە ڕەحمە، عەفوو عامی دەرکردووە، ئێوە هەر ڕۆڵەی عێراقی خۆشەویستن، بگەڕێنەوە بۆ باوەشی عێراقی سەربەرز، بگەڕێنەوە سەر وەزع و حاڵ و وەزیفە و جێ و شوێنی پێشووی خۆتان؛ حکومەتی نیشمانیش یارمەتیتان دەدات.

بە فیتی ساواک دەکرایە هەرا و هۆریا:

- درۆ دەکەن.
- ئێوە پیاو کوژن، فاشیستن.
- فێڵمان لێدەکەن.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

پاش ئەوەی، بەچەند قسەیەکی لووس و لێبووردن خوازی (خواهیش دەکەین.. ببەخشن... مەعزەرتمان هەیە...) نوێنەرانی عیراقیان بە ڕێ دەخستەوە، ئەوجا لە «مەیدانی چۆڵی بێ ساحێبدا» بە ڕۆژی ڕۆشن، داوی خۆیان دادەنا، هەر ئەوەندە بڵێی یەک و دوو لەنێو خەڵکەکەدا بڵاو یان دەکردەوە:

- بێ عەقڵە ئەو کەسەی باوەر بە عێراق دەکات.
- ئەوەی بگەڕێتەوە ئیعدامی دەکەن.
- لەسەر سنوور دەرزی (لە پیاو خستن) لە پیاوان دەدەن.
- زەرنیخ تێکەڵ بە خواردن دەکەن.
- کچانی جوان لەسەر سنوور گل دەدەنەوە، دابەشیان دەکەنە سەر عەسکەرەکان...».

حەکایەتخوان، کە دەوری هەمووشتزان بگێڕێ گۆشەنیگای خۆی بەسەر کارەکتەرەکاندا دەسەپێنێ، یان وایان لێ دەکات ببن بە هەڵگری گۆشەنیگای ئەو. لەو ڕۆمانەدا، شوێنیش هەمان دیاردەی تێدا بەدەر دەکەوێ بە تایبەتی لەکاتی سەرەتاکانی دەست پێکردنەوەی شۆڕش پاش نسکۆی ئەیلوول. دیارە دەسپێکردنەوەی ئەم شۆڕشە لەگەڵ گۆشەنیگای ڕۆماننووس -حەکایەتخوان گونجاو بووە، بۆیە ئەمە بووە بە پاڵنەرێک بۆ ئەوەی لەڕێی شوێنەوە بەتایبەتی لە لاپەڕەی ٢٥٩دا بەم چشنە حیکایەتخوان گوزارشت لە گۆشەنیگای خۆی بکات و بڵێ:

«ئەمرۆش بەهەمان سۆز، دۆڵ بە دۆڵ، گرد بەگرد، لوتکە بە لوتکەی ڕادەگەیەنێ، کە زمانیان هەبا ئەوا بێشک دەیانووت:

گەڕانەوە! یاری هەمیشە بە وەفای چیا و بەفر و ئەشکەوت! گەڕانەوە؟ پیرۆزە ئێمە، گەڕانەوە، خۆشبەحاڵی ئەو شوێنەی پێی ئەمانی بەسەر دەکەوێ! دەبێتە مرەکەبی سووری بریقەداری داستان! گەڕانەوە، گەر ئاسمان شانازی بە هەتاو و مانگ و ئەستێرەکانیەوە بکات ئێمەش شانازی بە مانەوە دەکەین».

لێرەدا شوێن، هەڵگری گۆشەنیگای ڕۆماننووسە. لەباتی ئەو، لە ڕێگای حەکایەتخوانی هەمووشتزانەوە کە تەنانەت دەتوانێ پەی بە هەستە پیرۆزەکانی خاک و چیا و دۆڵ و لووتکە بەرێ، ئەو گۆشە نیگایە خراوەتە ناو ڕۆمانەکەوە.

### تەوەری سێیەم: ئاستی دەربڕین

دەربڕین، یەکێکە لە و ئاستە گرنگانەی لە ڕێی ئەوەوە وتاری ڕۆمان دروست دەبێ و لە حەکایەت جیا دەکرێتەوە. «جولیا کریستیڤا» دەربارەی ئەو جیاکردنەوەیە دەڵێ: «حەکایەت وەکوو بەسەرهاتە، کەچی ڕۆمان وەکوو وتار خۆیان پێشکەش دەکەن» (الراوی، ١٩٨٦: ٢٣). واتا شێواز خاڵی سەرەکییە لە ناسینەوەی بەرهەمی ڕۆماندا.

کارەکتەرەکانی ڕۆمان، دەبنە هۆی ئەوەی ڕۆمان بە جیاوازی زمانی دەربڕین بناسرێتەوە. ئەو زمانەش بنەڕەتە بۆ ئەوەی دەنگی ئەوان لەگەڵ دەنگی ڕۆماننووس لە یەک ئاستی دەربڕیندا نەبن و لەڕێی شێوەکانی دەربڕینەوە گۆشەنیگاکان دیاری بکرێن و ڕوانگەی کۆمەڵایەتی و ئایدۆلۆژیان پێناسە بکرێت. واتە دەکرێت

لەڕێی خاسیەتەکانی دەربڕینەوە ئاماژە بە گۆشەنیگای ئایدۆلۆژی کارەکتەرەکان بدرێ و تێڕوانینی ئەوان بۆ جیهان دەستنیشان بکرێت. لە هەر ڕۆمانێکدا ئەگەر «چالاکی دەربڕین بمرێت، یا دینامیکیەتی خۆی لە دەست بدات، قسە کردن، شڵەژان یاخود لێپرسینەوە بەرهەم ناهێنێ. بەمەش ڕوانگەکان لەبار دەچن. لە یەکبووندا سەرکوت دەکرێن. دەنگەکان دەبن بە یەک دەنگی گشتی سادە کە گەوهەری لە خۆ نواندا دەردەکەوێ. دەنگەکان لە دەنگی وتاردا فەنا دەبن، بازنەی قسەکردن بەرەو ناوەندی خۆی پاشەکشە دەکات، چوارچێوەکەی تەسک دەبێتەوە، قسە دەڕووخێ، لە پێناوی باڵادەستی یەک زماندا لەناو دەچێ» (احمدقاسم، ١٩٨٤: ١٥٨).

ئاستی دەربڕین، لە ڕۆمانی «هەرەس»دا، لە چوارچێوەی باڵادەستی زمانی نووسەردا بنیات نراوە. لەبەر ئەوە شوێنی دەربڕینی زۆربەی کارەکتەرەکان لەیەک دەچن و لەگەڵ شوێندا تەنیا هێزی دەربڕینی قسەی نووسەر دەنوێنن و گۆشەنیگای ئەو سەبارەت بە ڕووداوەکان دەردەبڕن. ئەو دیاریدەیەش بە درێژایی ڕۆمانەکە جەخت لە خۆی دەکاتەوە و لە دایەلۆگ و خۆ دواندنی کارەکتەرەکانیشدا دووبارە دەبێتەوە. بۆ نموونە لە لاپەڕەی ٢٣دا دەربارەی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری حەمە پاش ئەوەی ئەحمەد لە دایک دەبێ، حەکایەتخوان ئەڵێ: «حەمە لە بەرەبەیاندا، مناڵەکەی دەباتە دەرەوەی ئەشکەوتەکە و سێ جار تف ڕوو دەکاتە سەر زەوی و هەندێ وشە لە شێوەی منگە منگ لە دەمی دەردەچێ و پاشان بەجۆرە نزایەکی سەیر چەشنی نوێژی "چاکان" سەیرێکی ئاسمان دەکا و مناڵەکەی بەرز دەکاتەوە و دەڵێ:

خوای گەورە! ببینە ئەمیش ئێستا وەکوو تۆ بێگەردە و لە مەزنی تۆدایە، بیپارێزە تا پیرۆزیت بپارێزێ».

بە گوێرەی ئەوەی کە حەکایەتخوان ئاگای لە هەموو جووڵە و چرکەیەکی کارەکتەرەکەیە و وەسفی ڕەفتار و باری دەروونی ئەو دەکات و قسەکانی وەکوو خۆی دەبیسێ و دەگوازێتەوە، گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزانی وەرگرتووە. جۆری قسەکانی حەمەش لەوە دوورترە کە ئەو بتوانێ دژیان ببرێ. لەبەر ئەوە زمانی نووسەر خۆی سەپاندووە بەسەر زمانی ئەودا و ناچار کراوە گوزارشت لە گۆشەنیگای نووسەر بکات. هەروەها کاتێک حەمە لە لاپەڕەی ٤٤ باسی شەهیدبوونی میرزا دەکات، بە هەمان شێوەی پێشووی زمانی دەربڕینی نووسەر و گۆشەنیگای ئەو بەکار دەهێنێ و دەڵێ:

«ئێمە ترسنۆک و بێفەڕ بووین، لە هۆڵی ڕۆحی خۆماندا بووین بە تەنها جێمانهێشتی. ئای سەد ڕەحمەت لە قەبرەکەت میرزا! تا دوا فیشەک هەر بەرگریت کرد، بە لەززەتەوە تێر تێر، خوێنەکەت خاکی ماچ کرد و بە خوێن تیشکی هەتاویشت هەڵمژی...».

لەم خۆ دواندنەدا، حەمە، گوزارشت لە گۆشەنیگای بابەتی نووسەر دەکات و لەباتی ئەو سەرکۆنەی خۆی و ئەوانە دەکات کە لەکاتی ڕووخانی کۆماری مەهاباد لە ترسان هەڵاتن و ئامادە نەبوون بەرگری لە خاک و گەل بکەن. شێوەی دەربڕینەکانیش تایبەتن بە نووسەر و لە ئاستی دەربڕینی کارەکتەرێکی نەخوێندەواری وەکوو حەمەدا نین.

هەڵبژاردنی کارەکتەر و بنیاتکردنی کەسایەتی ئەو بۆ ئەوەی ڕۆڵی خۆی لە گێڕانەوەدا بگێڕێت ئەوە دەخوازێت ڕۆماننووس بە وریاییەوە سەودا لەگەڵ ئەم لایەنە هونەریەدا بکات بۆ ئەوەی لەکاتی پێویست دەرفەتی گونجاوی هەبێ لە ڕێی ئەو جۆرە کارەکتەرەوە گۆشەنیگای خۆی بخاتە ناو دەقەکەوە. نەک بەم

شێوەیە کە ڕۆماننووس پەیڕەوی کـردووە و هەنـدێ کارەکتـەری نەخوێنـدەوار، یـان نیمچـە خوێنـەواری بـۆ جێبەجێ‌کردنی ئەم ئەرکە هەڵبژاردووە، چونکە «ئەگەر گۆشەنیگای ئایدیۆلۆژی سیسـتەمی ئـەو بەهایانـە بـێ کە لەڕێی ئەوەوە کارەکتەر جیهانی دەورووبەری هەڵسەنگێنێ و گۆشەنیگای دەروونی ئـەو، ئـەو گۆشـەنیگایە بێ کە لە ڕێی ئەوەوە جیهانە خەیاڵییەکە پێشکەش بکرێ ئەوا گۆشەنیگای دەربڕین ئەو شێوازەیە کـە لـەڕێی ئەوەوە کارەکتەر گوزارشت لە خۆی دەکات» (ابوناضر، ١٩٧٩: ١٠٨).

هەرچەند ئاستی دەربـڕینی ڕۆمـاننووس لـە ئاسـتی دەربـڕینی کارەکتـەر دوور بـێ، ئەوەنـدە کەسـایەتی کارەکتەر سەربەخۆ دەبێ و دەتوانێ سەربەخۆ بـێ دەسـت تێـوەردانی نووسـەر گۆشـەنیگای خـۆی دەبـڕێ. هەرچەندیش ئاستی دەربڕینی ئەو دوانە لەیەک نزیک ببنـەوە، ئەوەنـدە شـوێنی ڕۆمـاننووس لـەناو دەقەکـە دەردەکەوێ و سەرجەم گۆشەنیگاکان بەکار دەهێنێ بۆ خزمەتی فیکر و ئایدیۆلۆجیای خۆی.

دایەلۆگ وەکوو شێوازێک لە شێوازەکانی دەربڕین لە ڕۆماندا، کۆمەڵێ ئـەرک و خاسـیەتی هەیـە. یـەکێک لەوانە دیاری کـردنی ناسـنامەی قسـەکەر و ناسـنامەی ڕووداوەکانـە (اوسبنسـکی، ١٩٩١: ٤٣). کـەچی لـەم ڕۆمانەدا، دایەلۆگی نێوان کارەکتەرەکان لە ئاستی دەربڕیندا، نەبووە بەهۆی ئەوەی لەڕووی زمانـەوە ناسـنامەی کۆمەڵایەتی کارەکتەرەکان دەربکەون و ببنە نیشانە بۆ جیاکردنەوەی ئاسـتی ڕۆشـنبیری و پلـەی هۆشـیاری ئەوان. چونکە لە ڕۆمانەکـەدا، ئاسـتی زمـانی ڕۆمـاننووس ڕێگـەی نـەداوە خاسـیەتی زمـانی کارەکتـەرەکان بناسرێنەوە. بۆ نموونە شێوازی قسەکردنی محمـەد ئەفـەنی بـاوکی «هیـام» و شـێوازی قسـەکردنی هیـام و فەرەیـدون و حەمـە و ئەحمـەد و سـەرکەوت و مامۆسـتا ڕەشـید و نەسـرینی ژنی ئەحمـەد هـیچ جـۆرە جیاوازییەکیان لەگەڵ شێوازی قسەکردنی ڕۆماننووسدا نییە کە لە ڕێی حەکایەتخوانەوە گێڕانـەوەی ڕۆمانەکـە ئەنجام دەدات. ئەم دیاردەیەش ڕێگەی گرتووە لە گۆڕینی گۆشەنیگای نووسەر و کارەکتەرەکان. لەبـەر ئـەوە لەسەرەتاوە هەتا کۆتایی ڕۆمانەکە زۆربەی کارەکتەرەکان و ڕۆماننووسیش لەگەڵ ئەوانـدا، یـەک گۆشـەنیگای جێگیریان هەیـە و گـۆڕانێکی ئـەوتۆیان بەسـەردا نایـەت کـە ببێتـە مایـەی گـۆڕانی ڕەوتـی گێڕانـەوەکـە و پەرەسەندنی ڕووداوەکان بە ئاراستەیەکی جیاواز لەو ئاراستەیەی لەسەرەتاوە ڕۆماننووس بـڕیاری لەسـەر داوە. ئەو کاتەش گۆڕانی گۆشەنیگای نووسەر ڕوون دەبێتەوە کە «هەندێ توخمی قسەی کەسێکی دیکە دێتـە نـاو تێکستی نووسەرەوە؛ واتا چەند توخمێ لە ئاخاوتن کە کارەکتـەرێک یـان یـەکێکی‌تـری پـێ دەناسـرێتەوە- چونکە تێهەڵکێشی توخمەکانی ئاخاوتنی کەسێکی دی یەکێکە لەو ئامـڕازە سـەرەکیانەی کـە گوزارشـت لـە گۆڕانی گۆشەنیگا دەکات لەسەر ئاستی درەبڕین. ئەمەش هەرگیز تایبەت نییـە تـەنیا بـە بـەکارهێنانی نـاوی کارەکتەرەوە» (دراج، ١٩٨٦: ٧٢).

ڕاستە لە ڕۆمانی «هەرەس» ناوی زۆر کارەکتەر هاتووە، بەڵام هەموویان لە یەک گۆشەنیگاوە بنیـات نـراون کە ئەویش گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشـتزانە و ئـەم گۆشـەنیگایەش هەڵـگری گۆشـەنیگای نـەگۆڕی نووسەرە و تەعبیر لە ئایدیۆلۆژیای ئەو دەکات. بۆ نموونە باوکی هیام، واتە محەمەد ئەفەنی کـە لەگۆشـەنیگای ڕۆماننووسەوە وەکوو مرۆڤێکی کینە لە دڵ و پارەپەرست و بێ ڕەوشـت و دڕنـدە تەماشـا کـراوە، لەبـەر ئـەوە هەتا کۆتایی بە هەمان شێوە ماوەتەوە و نەگۆڕاوە؛ تەنانەت هەمان وێنەی بۆ کێشراوە لـە گۆشـەنیگای هیـامی

کچیەوە کە لەم ڕۆمانەدا دیمەنێکی بەرچاوی گۆشەنیگای ڕۆماننووسە. هیام لە لاپەڕەی ٢٩٣ سەبارەت بە باوکی بەم جۆرە بۆ ئەحمەد و نەسرین دەدوێ و دەڵێ:

«- باوکم لە باوک نەدەچوو، هەر ئینسانیەتی نەبوو، درندەیەکی جانەوەر بوو، پارەپەرست، کینە لە دڵ، نەفامی بەرچاو لێڵ، بەناوە تورکمان پەرست، کەچی بەدیناریێ نەک تورکمان، بەڵکو هەموو ئینسان و ئینسانیەتی دەفرۆشت، خۆی دەفرۆشت، ئەو باوکە کۆنە پەرستەم، بێ باوەر و کەللە رەق بوو، هەر بۆ ئەوەی بڵێین خاوەن قسەی خۆیەتی و کەسێکە یەک قسە دەکات تووشی ئەم دەردەی کردین».

ئەم قسانەی هیام ئەوەندە بە کوردیەکی روون و رەوان وتراون، ئەگەر ڕۆمانووس لەوە و پێش نەیگووتبا بە نەژاد تورکمانە، هەرگیز لە کەسێکی کورد جیا نەدەکرایەوە. کەواتە شێوازی دەربڕینەکە، خاسیەتی زمانی نەتەوەیی ئەوی تێدا سڕاوەتەوە. خۆ دەکرا ڕۆمانووس شێوە کوردیەکەی ئەوی بەجۆرێ دارشتبایە، خوێنەر لەڕێی وشە و دەربڕینەکانەوە پەی بەوە بردبا کە ئەم کارەکتەرە ئەگەرچی کوردی خۆش دەوێ و پاش نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول لەگەڵ «مچە» هاتووە بۆ پێشمەرگایەتی، بەڵام لە ڕەسەندا تورکمانە.

وتاری ناو ڕۆمان، لە وشەی ڕۆمانووس و کارەکتەرەکان پێکدێت (باختین، ١٩٨٦: ٧٣). ئەو وشانەش دەبێت لە ئاستی ئایدۆلۆژی و ڕۆشنبیریدا، لەگەڵ ئاستی دەربڕینی کارەکتەرەکاندا بگونجێ و بەوەش ئەوان لە ڕۆمانووس جیا بکرێنەوە. جیاکردنەوە و ناسینەوەی گۆشەنیگای خودی ئەوانیش لە گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزان ئەرکێکی زۆر گەورەی نووسەرە و سەرکەوتنی ڕۆمانیش تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەستە بەم جیاکردنەوەیە. کەچی لە ڕۆمانی «هەرەس»دا ئەم دەستوورە گرنگە بایەخی پێنەدراوە و دەکرێ بڵێین لە پێناوی سەپاندنی گۆشەنیگای حەکایەتخواندا قوربانی بەو دەستوورە دراوە. ئەمەش خاڵێکی لاوازی بنیاتی هونەری ڕۆمانەکەیە. ئەم دیاردەیەش لە زۆر شوێنی ئەم ڕۆمانە بە ئاشکرا دیارە، بە تایبەتی لەو دایەلۆگەی نێوان «نەسرین» و خەجێ لاپەڕەی ٢١٣-٢١٤ سەبارەت بە کوشتنی ئەو منداڵەی کە ئەمنەکانی هەیئەی کەرکووک لە زگی نەسرینیان چاندبوو:

- دەبووایە بیکوژم.
- تۆ بێ گوناه و گەورە بوویت، نەیانکوشتی؛ کەچی تۆ بێ گوناهێکی ساوات کوشت.
- بریا دەیانکوشتم. وا دەزانم لەم ڕەفتارەمدا لەگەڵ ئەوانم جیا ناکەیتەوە.
- لەسەر ئەنجامی کار، نە؛ بەڵام لە جۆری کار گەلێ جیاوازن، تۆ ئینسانی و ئەوان ئینسان نەبوون بەڵام ئێستا تۆ کاری نا ئینسانیت کردووە.

لە درێژەی ئەم دایەلۆگەدا، نەسرین دەڵێ:

- نەمدەویست ببم بە دایکی.

(خەجێ دەڵێ)- بەڵام هەر دایکیت. بەر لە ئێستا دایکی ساوایەکی باوک نادیار بوویت، بەڵام ئێستا دایکێکی خوێنڕێژی. لە دوا قسەدا نەسرین بە خەجێ دەڵێ:

- هەرگیز ئەم قسانەت بە قسەی نیمچە خوێنەوار ناچێ».

بە وردبوونەوە، لە ئاستی دەربڕین و گۆشەنیگای خەجێ لەو دایەلۆگە بۆمان دەردەکەوێ کە ڕۆمانووس بایەخی بە جیاوازی ئاستی ڕۆشنبیری و هۆشیاری خۆی و خەجێ نەداوە و تەنیا بیری لەوە کردۆتەوە چۆن

**بەشی پێنجم- رەخنە**

لە ڕێی ئەوەوە گۆشەنیگای ئایدۆلۆژی خۆی دەربڕێ. بەم جۆرە خەجێ بووە بە ئامرازێک بۆ گەیاندنی گۆشەنیگای ڕۆماننووس لەبەر ئەوەی لە ڕووی زمانیشەوە جیاوازی نێوان زمانی خەجێ و ڕۆماننووس نەماوە و هەردووکیان لەیەک ئاستی دەربڕیندان. کەواتە لەم ڕۆمانەدا ڕۆماننووس و حەکایەتخوان و گەلێک لە کارەکتەرەکان یەکیان گرتووە و دەیانەوێ تەنیا گۆشەنیگای ڕۆماننووس پێشکەشی خوێنەر بکەن. لە زۆر شوێنیشدا کارەکتەرەکان بوون بە هەڵگری گۆشەنیکای ڕۆمانووس، بۆ نموونە:

١- خەجێ: لە لاپەڕەی ٥٠، ٥١، ٢٢٢، ٢٢٣، ٢٢٤، ٢٢٥، و ...هتد.

٢- حەمە و هاوڕێکانی: لاپەڕەی ٥١

٣- مارف: ٢٢٦، ٢٢٧

٤- مامۆستا سەرکەوت: ٣١١، ٣١٢، ٣١٣، ٣١٤.

هەروەها لە زنجیرەی شەشەمدا بەگشتی ئەحمەد، خەجێ، نەسرین تەعبیر لە گۆشەنیگای ڕۆماننووس دەکەن. تەنانەت دەکرێ بڵێین سەرجەم کارەکتەرەکان، ئەوانەش کە گۆشەنیگای جیاوازیان لەگەڵ ڕۆماننووس و حەکایەتخوانەکەیدا هەیە ئەوانیش بە جۆرێکی دیکە گۆشەنیگای هەمووشتزانی نووسەر - حەکایەتخوان سەبارەت بە ڕووداو و بەسەرهاتەکان لە ئاستی زمانی و شێوازی دەربڕین و ئایدۆلۆژیادا پیشان دەدەن. ئەم خاسیەتەش بووە بە هۆە ئەوەی کە ڕۆمانی «هەرەس» ببێ بە ڕۆمانێکی مۆنۆلۆجی (یەک دەنگ). لە ڕۆمانی مۆنۆلۆجیش دا «کارەکتەر بە داخراو دادەنرێ، سنووورە واتاییەکەی ڕوونە: دەکا، ئازار دەچێژێ، لە سنووری بوونە بەدیهاتووەکەی تێدەگا، توانای ئەوەی نییە لە شێوەی خۆی دەست هەڵگرێ؛ واتا ناتوانێ لە سنووری کەسیەتی خۆی دەربچێ، بێ ئەوەی مەترسی نەبێ لەو پلانە مۆنۆلۆجییە دەربچێ کە نووسەر بۆ ئەوی داناوە. ئەم جۆرە وێنە هونەریە لە ڕووی پەیوەستی بە هۆشی کارەکتەرەوە لەناو جیهانی بابەتی نووسەردا بنیات دەنرێت». کارەکتەرەکانی ڕۆمانی «هەرەس»یش، سەرکی و لاوەکییەکانی (حەمە، خەجێ، سمایل، ئەحمەد، نەسرین، مارف، حسین، ... هتد) هەموویان لە پلانی مۆنۆلۆجی ڕۆماننووس لایان نەداوە و لەو چوارچێوە هونەرەیەی ماونەتەوە کە ئەو بیناسازی کەسیەتی ئەوان لەڕووی زمانی دەربڕین و گۆشەنیگای (بابەتی - دەرەکی) حەکایەتخوانی هەمووشتزان بەکاری هێناوە.

## ئەنجام

١- بەگشتی ئاستەکانی گۆشەنیگا لەم ڕۆمانەدا دەکرێن بەسێ جۆرەوە:

ا- ئاستی کات.

ب- ئاستی شوێن.

ت- ئاستی دەربڕین.

ئەم سێ ئاستە پێکەوە بەستراون لێک جیا ناکرێنەوە و کار لە یەکتر دەکەن و هەمووشیان بۆ خزمەتی گۆشەنیگای نووسەر و پیشاندانی ئەو گۆشە نیگایە بەکارهاتوون.

٢- گۆشەنیگای بەکارهاتوو لەم ڕۆمانە، گۆشەنیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزانەو لە دەرەوە دەڕوانێتە ڕووداو و کارەکتەرەکان و هەڵیان دەسەنگێنێ و وەسفیان دەکات.

٣- حەکایەتخوانی ئەم ڕۆمانە، گوزارشت لە گۆشەنیگای ڕۆماننووس دەکات و لێی جیا نابێتەوە.

٤- زۆربەی کارەکتەرەکانی ئەم ڕۆمانە، (سەرەکی و لاوەکییەکان؛ وەکوو: حەمە، خەجێ، نەسرین، هیام، مامۆستا ڕەشید، مامۆستا سەرکەوت، هاوڕێکانی حەمە و ... هتد) بە هەڵگری گۆشەنیگای نووسەر - حەکایەتخوان دادەنرێن.

٥- ڕۆماننووس سوودی لە زەمەنی ڕووداو و ژینگەی کارەکتەرەکان و دەربڕینی ئەوان وەرگرتووە بۆ ئەوەی گوزارشت لە گۆشەنیگای خۆی بکات.

٦- ئەم ڕۆمانە، بە ڕۆمانێکی مۆنۆفۆنی یان مۆنۆلۆجی (یەک دەنگ) دادەنرێت، بۆیە لەسەرەتاوە تا کۆتایی گۆشەنیگای نووسەر و کارەکتەرەکان وەکوو خۆیان ماون و گۆڕانێکی گرنگ بەسەریاندا نەهاتووە.

٧- ڕۆماننووس پەی بەوە نەبردووە کە دەبێ زمانی نووسەر و کارەکتەرەکان لەیەک نەچن و هەر یەکە خاسیەتی خۆی هەبێ، لەبەر ئەوە خوێنەر هەست بەوە ناکات کە ئاستی دەربڕینی کارەکتەرەکان جودان و گوزارشت لە گۆشەنیگای ئەوان دەکات:

أ- کارەساتی ڕووخانی کۆماری مەهاباد لە ساڵی ١٩٤٦ز.

ب- کارەساتی نسکۆی ئەیلوول لە ساڵی ١٩٧٥ز.

ت- دەست پێکردنەوەی شۆڕش لە کوردستانی عێراق دوای چەند مانگێ لە نسکۆی ئەیلوول.

هەموو ئەو بەسەر هاتانەش لە گۆشە نیگای حەکایەتخوانی هەمووشتزانەوە پێشکەش کراون.

## سەرچاوەکان

ا- سەرچاوە کوردییەکان:

١- سابیر، پەرێز (٢٠٠١) **بینای هونەری چیرۆکی کوردی لە سەرەتاوە تا کۆتایی جەنگی دووهەمی جیهانی**، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٢- عارف، حسێن (٢٠٠٢) **نووسینەکانم لە بواری ڕەخنە و لێکۆڵینەوەدا، (سالانی ١٩٩٥ بۆ ١٩٨٨)**، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چاپی یەکەم.

٣- موکری، محمەد (١٩٩٨) **هەرەس**، سلێمانی، چاپخانەی بێسارانی، چاپی سێهەم.

٤- نەجمەددین ئەڵوەنی، نەجم خالید (٢٠٠٤) **بینای کات لەسێ نموونەی ڕۆمانی کوردیدا**، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

ب- سەرچاوە عەرەبیەکان:

1- آمنه ، یوسف (1997) **تقنیات السرد فی النضریة والتطبیق**، سوریه – لارقیه، دار الحوار للنشر والتوزیع، الطبعة الاولی.

2- لوبوک، بیرسی (1981) **صنعه الروایه**، ترجمه عبدالستار جواد، بغداد، دار الرشید للنشر، الجمهوریه العراقیه.

3- اوسبنسکی، بوریس (1999) **شاعریه التألیف**، ترجمه سعید الغانمی و ناصر حلاوی، المجلس الاعلی للثقافه.

4- طودوروف، تزفیطان (1990) **الشعریه**، ترجمه شکریه المخبوت و رجاء بن سلامه، المغرب_ دار البیضاء، دار توبقال للنشر، الطبعه الثانیه.

5- شیفیسکی، توما (1982) **نظریه الاغراض**، نظریه المنهج الشکلی- نصوص الشکلانیین الروس، ترجمه ابراهیم الخطیب، بیروت-لبنان، الشرکه المغربیه للناشرین المنتحدین ومؤسسه الابحاث العربیه، الطبعه الاولی.

6- کریسطیفا، جولیا (1991) **علم النص**، ترجمه فرید الزاهی، الدار البیضاء –المغرب، دار توبقال للنشر، الطبعه الاولی.

7- جینیت، جیرار (2000) **خطاب الحکایه**، بحث فی المنهج، تصدیر جوناثان کالر، ترجمه محمّد معتصم، المجلس الاعلی للثقافه، سوریا- دمشق، الهیئه العامه للمطابع الامیریه، الطبعه الثانیه.

8- بارت، رولان (1970) **الکتابه فی درجه الصفر**، ترجمه نعیم الحمصی، دمشق، مطبعه وزاره الثقافه.

9- يقطين، سعيد (1997) **تحليل الخطاب الروائی**، المركز العربی للطباعه والنشر والتوزيع، الطبعه الثالثه، بيروت.

10- احمد قاسم، سيزا (1984) **بناء الروايه**، دراسه مقارنه لثلاثيه نجيب محفوظ، الهيئـه المصـريه العلمـه للكتاب.

11- مسلم العانی، شجاع(1994) **البناء الفنی فی الروايه العربيه فی العراق**، بغداد، دار الشؤون الثقافيه العامه، الجزء الاول.

12- دراج، فيصل (1986) **نظريه الروايه والروايه العربيه**، بغداد، المركز الثقافی العربی، الطبعه الاولی.

13- سويرتی، محمّد (1991) **النقد البنيوی والنص الروائی، افريقيا الشرق.**

14- عزام، محمّد (1996) **فضاء النص الروائی، مقاربه بنيويه تكوينيه فی أدب نبيل سليمان**، سـوريه-لارقيه، دار الحوار للنشر والتوزيع، الطبعه الاولی.

15- د. موريس ابو ناظر (1979) **الالسنيه والنقد الادبی فی النظريه والممارسه**، بيروت دار النهار.

16- باختين، ميخائيل (1986) **قضايا الفن الابداعی عند دوستويفسكی**، ترجمه الدكتور جميـل نصـيف التكريتی، بغداد، دار الشؤون الثقافيه العامه، الطبعه الاولی.

17- مارتن، والاس (1998) **نظريات السرد الحديهه**، ترجمه حياه جاسم محمّد، سوريه- دمشـق، الهيئـه العامه لشئون المطابع الاميريه.

18- الراوی، يمنی العيد (1986) **الموقع والشكل**، بيروت- لبنان، مؤسسه الابحاث العربيه، الطبعه الاولی.

ث- سەرچاوە فارسیەكان:

١- يونسي، ابراهيم (١٣٧٩) **هنر داستان نويسی**، تهران، چاپخانۀ نوبهار، چاپ ششم.

٢- مير صادقی، جمال (١٣٧٦) **عناصر داستان**، تهران، چاپخانۀ بهمن، چاپ سوم.

٣- كني، دبيلو. پ (١٣٨٠) **چگونۀ ادبيات داستاني را تحليل كنيم**، ترجمۀ دكتر مهرداد ترابي نراد و محمّد حنيف، تهران، انتشارات زيبا، چاپ اول.

٤- رولان بورونوف و رئال اوئله (١٣٧٨) **جهان رمان**، ترجمۀ نازيلا خلخالي، تهران، نشر مركز، چاپ اول.

# پارامێتری بینین لە بەرهەمهێنانی ماناکانی دەقی شیعریدا

عەلی قاسمی

«ژیانی بچووکی من ئەوەندە مەند و ئارامە کە لـەودا، وشـە و دێـڕ و
فۆرمە شیعرییەکان هەرکامەیان کارەسـاتێکن و لایـەی شـاعیرانەی
دەقێک ڕوونکەرەوەی ماکە نەدیتراوەکانییەتی». ناتالی سارۆت

**کورتە:**

شیعری وێنەیی و شیعری دیداری، دوو جۆری ئەدەبی هاوچەرخن، بە سیلە چاوێک لە هونـەری گرافیـک و بە کەڵکـوەرگرتن لە شکاندنی ڕێسا و یاساکانی نووسین، دەستیان داوەتە نووسـینی شـێوەکارانە (نقاشـانە)ی شیعر. گرنگترین جیاوازی شیعری وێنەیی لەگەڵ شیعری دیداری ئەمەیە کە شـیعری وێنـەیـی «بیسـیاری - دیداری»یە؛ بەو مانـا کـە لـەگـەڵ گـوێی مـرۆڤ پەیوەنـدی هەیـە و دەبـێ ببیسـرێ تـا بتـوانرێ مانایـەکی لێوەربگیرێ. بەڵام جۆرێکی تری شیعری دیداری «نویسیاری -دیداری»یە. بەو مانایە کە بۆ فـامی ئـەم جـۆرە شیعرانە، دەبێ ببینرێ و چاوی لێبکرێت و بەچاو پیت وشەکانی، هەروەها پێکهاتەکەی تەتەڵە بکرێن. وێنـەی شیعری لە سەر بناغەی خەیاڵ هەمووکات لە ئەدەبیاتدا سەرنجی دراوەتێ، بەڵام ئێمڕۆ بە هۆی خۆشەویسـتی و پەرە ئەستاندن و بایخ پەیدا کردنی وێنە (عکس) و فیلم لـە نـاو کۆمـەڵانی خەڵـکدا بووەتـە هۆکارێـک کـە شاعیران سەرنجی خوێنەران بۆ لای وێنەکانی بەرهەسـتی پیـت و وشـەکان ڕابکێشـن و کارێـک بکـەن کـە خوێنەرانی شیعر بۆ لای چێژ بینین پەلکێش بکەن. هەرچەندە کە دەتوانین وێکچوونێـک لـە نێـوان شـیعری وێنەیی لەگەڵ تەکنیک و سەنعەتی «توشیح» ببینینەوە، بەڵام شیعری وێنەیی، بەتایبەتی شیعری دیداری بـە زۆری لە ژێر کارکردی شیعری ڕۆژئاواییـەکان و هـاوڕێ لەگـەڵ سەرهەڵـدانی ئیماژیسـم و هـاتنی شـێوازی کوبیسم بۆ ناو ئەدەبیات پەرەی ستاندووە. شاعیرانی ئەم شـێوە شـیعرانە بـۆ بەرهـەمهێنـانی وێنـە و فـۆرمی جێگەی دڵخوازی خۆیان، لە شێوەی جۆراوجۆر کەڵکیان وەرگرتووە. کە گرینگترینیـان بـریتین لـە: بـە جیـا نووسـییەکەکانی شـیعری، بـە شـێوەی جۆراوجـۆر نووسـینی دێڕەشـیعریەکان و کـەم و زۆر کـردنی ڕادەی، کەڵکـوەرگرتن لە هونەری جوان نووسین و فەننی ڕازاندنەوە، کەڵکـوەرگرتن لە هونەری شێوەکاری (نقاشـی) لە تەنیشت نووسین، دووپات کردنەوە و .. هتد.

**وشە سەرەکییەکان:** دال، مەدلوول، شیعری وینەیی، شیعری بیسیاری، شیعری دیداری

**دال و مەدلوول و نیشانە:**

کاتێک لە زمانی ئاخاوتندا باسی وشەی ئەسپ، دار یان گوڵێک بێنینە ئاراوە، ئەگەر شارەزای زمانی کوردی بین، یانێ گرێبەستەکانی زمانی کوردی بزانین، بە بیستنی ئەم وشانە نەک بە دیتنیان وێنەیەک لەم وشانە، واتە ئەسپ، دار یان گوڵ لە زەینماندا هەڵدەواسرێ، هەرچەند نازانین بۆ وێنە ئەسپ چ ڕەنگە، دار چ جۆرە دارێکە و جۆری گوڵ چ گوڵێکە. ئەم وشانەی من بە کاریان دەبەم دال و وێنە زەینییەکە مەدلوولە. حەڵقەی پێوەندی نێوان دال و مەدلوول واتە واژە و مانا شتێکە بە ناوی نیشانە. کە وابوو نیشانە ئامرازێکە کە دال و مەدلوول بەیەکەوە دەبەستێتەوە. بە واتایەکی تر، لێکدانەوەی سیستماتیکی دال و مەدلوول نیشانەناسی پێ دەوترێ:

دال هەمیشە وشە نییە، بۆ وێنەهەبوونی دووکەڵ لە ئاسماندا نیشانەی هەبوونی ئاگرە، شوێنی ڕۆیشتنی ماشین، نیشانەی ڕابردنی ماشینە، شوێن پێی ئاژەڵ لە شوێنێکدا نیشانەی ڕابردنی ئاژەڵە و ... . بەڵام لە زمانی ئەدەبیدا ئەم گرێبەستانە هەڵدەوەشێنەوە، چونکە زمان دەزگایەکە لە نیشانەکان و دال دەبێتە کاکەشانێک لە مەدلوولەکان. «سارتر» وتەنی لەئەدەبیاتدا وشە دانەڕێژرێ مانا بەرهەم ناهێنێ. بۆ وێنە«شاری مۆسیقارە سپیەکان»ی بەختیار عەلی بە هیچ شێوەیەک نە سەردێڕ و نە ناوەڕۆکی لە مانای قامووسی وشەدا بە کار نەبراون، یان سەیری ئەم کۆپلە شیعرەی مارف ئاغایی بکەین:

«کۆچ»

خاک

توانای کۆچی نییە

ئەوەیە ڕازی مانەوەی هەمیشەیی من

لەم وڵاتەدا.

یان بەبەیەکەوە ئەم شیعرەی محەممەدی ئەحمەدی (ساماڵ) بخوێنینەوە:

بخوێنەوە کە بنووسم

تۆ جیهانتر

بۆ هەموو تەمەنێک نەمری

بە بیری تازەوە................پیر

بە بیری کۆنەوە..............لاو

تەنانەت

به بیری هیچەوە

دەڕۆم

ئەی تەنیاتر کورتەی بزەیەک!

لە تۆڕا

زۆر غەریبم..........زۆر. (ساماڵ: ٧٢)

دەبینین هیچکام لەم وشانەلە مانای قامووسیدا بە کار نەبراون. کە وابوو زمانی شیعر وەک ڕەنگە بە دەست نیگارکێشەوە، تا دانەڕێژرێ، دەلالەت بەرهەم ناهێنێ.

کەوابوو وشە بەم جۆرەی کە دادەڕێژرێ، دەبێتە خاوەن دەلالەت و لە زمانناسی مۆدێرنیشدا کۆی ئەو شتانە دەتوانن مانا بەرهەم بێنن و دەلالەت بخولقێنن لە چوارچێوەی زماندا باس‌وخواس هەڵدەگرن. هەر بەم پێیەش، بە پێی مانا بەخشی و دەلالەتی مانایی، شیعری وێنەیی و دیداریش هەڵگری باس و خواسن.

## شیعری وێنەیی (بیسیاری-دیداری)

شیعری وێنەیی -کە شیعری نوسیاریشی پێدەوترێ- جۆرێکی شیعرییە کە لە بواری نووسینەوە جۆرێ بنووسرێ کە هاوخوانی هەبێ و مانا و ئیحساسی تایبەت بە خوێنەر ببەخشێ. لەم جۆرە شیعرانەدا ماکەکانی ئاوایی و وشەکانی شیعری و چۆنیەتی لەتەنیشت یەکتر ڕۆنیشتنی دێڕە شیعریەکانی وێنەیەکی شیعری ساز دەکەن کە لەگەڵ ناوەرۆک و ماناکانی شیعر پێوەندی هەبێ.

وەک ئەم شیعرەی «ڕەسووڵ سۆفی سوڵتان» کەبە شێوەی گوڵدانێک کێشراوەتەوە، بەڵام وەرین و بارینی کردوەتە ئەو چڵە گوڵەی کە مەبەستمانە، ئەمەش شێوەیەکی تری تکنیکی ئەدەبییە کە بە دژوار هەتا ئێستا ناسراوە:

یادداشت (٦)

کلوو

کلوو

دادەبارێ

بەفر

تاڵ

تاڵ

دادەوەرێ

مووی سەرم

تۆ بیر لە دزێوی شەوێ دەکەیتەوە
ژوورە خەیاڵییەکەت جێ ناهێڵێ
من بیر لە پیرۆزی گوڵدانێ دەکەمەوە
یەکەم ماچی ئێمەی
تیا دەگورێ (سۆفیسوڵتانی:٤٤).

### شیعری دیداری (نوسیاری-دیداری):

شیعری دیداری یا عەینی شێوەی تازە و پوختەی شیعری وێنەییە شاعیری شیعری دیداری، دەروونمایەی شیعری بەکەڵکوەرگرتن لەهونەری گرافیک و لە ڕێگەی کایە بە پیت و وشەکانەوە، بە جۆری شیعرەکەی دادەڕێژێ کە تەرحێک لە پێش چاوی خوێنەر یا بینەر دابنێ. فام و تێگەیشتن و پەیامی شاعیر بەستراوەتەوە بە بینینی ڕواڵەتی گرافیکی، وەک شیعری «لە بازنەی باوک سالاریدا»ی مەهاباد قادر. مەهاباد لەم شیعرەدا ئافرەت دەخاتە ناو بازنەی باوک سالاری و بە کۆمەڵێک وشەی وەک «تیرۆر»، «گۆشەگیری»، «پەشیمانی»، «گوناح»، «دیوار»، «چاوەڕوانی»، «خۆ سووتاندن»، «ترس»، «سەراب» و ... هتد. تا دێ بازنەی گەمارۆی ئافرەت تەسکتر دەکاتەوە، کە خۆی لە خۆیدا نابەرابەری ژن و پیاو لە کۆمەڵگادا نیشان دەدا. با بەیەکەوە شیعرەکە بخوێنینەوە:

زۆر بەرلە مەهاباد قادر، لە هێرێمی شیعردا تاهیرە سەفارزادە ئەزموونی ئەمجۆرە شیعرەی هەبووە، وەک

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

شیعری «میزگرد مروت»کە بە شـێوەی دانیشـتنێکی بازنـەیی گەڵاڵـە کـراوە، لـەم دانیشـتنەدا لـە جێگـەی خاوەنڕایان، وشەی "من" بە کار دەبات. بابـەتی جێگـەی بـاس لـە دانیشـتنەکەدا لـە ناوەڕاسـتی شـیعرەکەدا گەڵاڵە کراوە کە دیسان هەر «من»ە کە بە کەڵکوەرگرتن لە پیتی «م» و «ن» و بە شێوەی خاچی شـکاو لـە پێش چاوی بینەران دانراوە. بینای ئەم شیعرە بە دووپات کردنەوەی وشـەی مـن، وێنـەی فاشـیزم لـە پـێش چاومان دادەنێ. شیعری دیداری هەم بە شێوەی "مەهاباد قادر" و هەم بـە شـێوەی "تـاهیرە سـەفارزادە" ئـەم مەجالە بە خوێنەر دەدا کە بۆ خۆی تەولیدی مانا بکا. تەولیدی مانا بەم مانایەکە بە شێوەی مۆدێڕن کەڵک لـە زمان وەرگیراوە، هەر بۆیەش دەبێبە شێوەی مۆدێڕن هەڵسووکەوتیان دەگەڵ بکرێ:

هەر بەم شێوەیە "نەوزاد ڕەفعەت"یش لە شیعری «نـەگونجان»دا بـە شـیرەم گازنـدە لـە ژیـان و ڕەنگەلـە مێژووی کورد بکات کە نەیتوانیوە باش لەگەڵ هەلومەرجەکان ڕابێت و خۆی بگونجێنێ بەبەشێک لـە شـیعری نەگونجان:

«تا ئەو خۆشبێژە لاڵ نەبوو

تا تووک و پەڕی ئەو کۆترە پەریانە پەڕە نەکراوە

هەتا دیڵە ورچ ژێر پێی کاهێنی نەلستۆتەوە

هەتا دۆعای بارانبڕە زاوای پەردەی

بارانی نەبەستۆتەوە

تا لافاوی کانیاوی چاو هەڵنەساوە

تا بەرانی پیت و فەڕیش نەخەساوە

تەلیسمی ڕێ دەشکێنم و
لە سنووری تووک و نەفرەت دەپەڕمەوە
ژێرزەمین هەڵنابژێرمەوە
سبەینان شەقام بەشەقام
بە کووڕە کووڕ
لاشەی کوژراوی تەقەی شەو
هەڵناگرمەوە
دەپەڕمەوە لەتەلبەندی کەڵبە و برین
ئەو هەموو گوڵە گریاوە
ئەو هەموو لێوە بەبارە
ئەو هەموو لێوە خەمبارە
ئەو هەموو کەوە هەتیوەم
پێ ناهێنرێتە پێکەنین
چیتر ماڵی تێکچووم بۆ ناگوێزرێتەوە
لە جیاتی کاسەسەر، کووپەی لیرەم بۆ نادۆزرێتەوە
چیتر پووشم بۆ ناخورێ
تەنەکە زبڵی دیرۆکی دزێوم بۆ فڕێ نادرێ

م
هەرەم
هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم
هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم هەرەم

(ڕەفعەت:١٢٧)

**بەشی پێنجەم- رەخنە**

ڕەنگە کەم کەس توانیبێتی شیعری وێنـەیی لەگـەڵ شـیعری سـپی (ئـازاد)دا تێکـەڵ بکـا. بـەڵام «تریفـە دۆسکی» لە شیعری«ئەز و بازن»دا بە جوانترین شێوە ئەم کارەی کردووە. ڕاسـت وەک شـیعرەکەی بـە ڕێـی "نەوزاد ڕەفعەت" بەڵام بە شێوەیەکی تر. ئەو وێڕای بانگەشەی وێنەی جوانی شیعری لە غیابـەوە بـە کێشـانی وێنەی «بازنە» توانیویە سەرنجی خوێنەر بە دوو شێوە بۆ شیعرەکەی ڕابکێشێ. مانا و نـاوەرۆکی شـیعرەکە لـە لایەک و هەبوونی «بازنە» بە شێوەی وێنە لە لایەکی تر دەیهەوێ پێمان بڵێ کە کات بە کـات بازنـەی ژیـانی کچان لە لایەن پیاوانەوە –جا باوک، برا یان هەرکەس بێ- تەسکتر دەبێتەوە و ژیانی لێکردوون بە زیندان، بـە تایبەت بەسەردێڕی شیعرەکەی کە دەڵێ«ئەز و بازن» و «ئەز کچم» و بەرەبەرە بچووک بوونـەوەی حەڵـقەی بازنەکە. با بەیەکەوە شیعرەکە بخوێنینەوە:

«ئەز و بازن»
من دەکەیە بووک
و هەناسا من دوورپێچ دەکەی
دکە ڤلۆژانکێ پووسیدەدا هزار خەون دڕزن
حەزێت من د سینگێ بارانێدا دنڤن
ژێی چاڤێت من دوو ڕۆژ بوون
کەتەلیەک نیشا من دا
ئاوری و گول هۆزانێن من
تەلی د هێنە درێکێدا
تەلییەک
٢ تەلی
٣ تەلی
٢٠ تەلی
١٠٠٠ تەلی
من دکەیە باران، بیابانا خوە پێسەرخۆش دکەی
من دکەیە ئاوێنە، کەلەخی خوە پێ ئەفیوون کرێ دخەملێنی
ئەو هۆزانێن گولگولی تەهەمی سپێدە هیبا
د هێلانە هلیڤری
پشتی تۆ تێر دبووی
پەریزادەکا بریندارم
خالخالێک هەر من د ئالیسن
هەر دەچڕن

هەر بازنەکی دشدێنن
بازنەکێ ئەزەلییە
ئەو ڕۆژا من ڕەنگ نیاسین
وەک پشیکۆ کە کا هار بەربوو ناڤ چاڤێت من
شەرمە تۆ نهێنییەکا شوویشەی
خوە لبەر بای ناگریتن،
تۆ دەفتەرەکارویس
هەمی پەیڤ لسەر ناهێنەڕاکرن
چاڤێن خوە د سینگێ بوهارەکا ئێتیمداڤە شێرە
دەستێن خۆ لسەر پرسیارا ڕاکە
د گومانێن کچێنا خوەدا هاربە
ببە ژان
بئێشە
ئەز ڕوندکەکا خەمگینم د چاڤێن ئەو ژنا لبەر ئەشکەنجە دانێ
بوو بەهەلم
ئەو گاڤا عشق ژ دایکبووی
هزارەها نارین د بازنێدا دخەندقین
و دزڤڕین

ژ ترسا
ستێرێن من هەمی دلاوزن
خوێن د دمارێن هەیڤا مندا هشک بوویە
باوەڕیا من ب ئاهەنگ و کەرنەڤال و سەما تە ناهێت
باوەڕیا من ب ئاسمان و هەور و ستێرێن تە ناهێت
باوەڕیا من ب لێڤ و ماچ و سینگ و شەڕێن تە ناهێت
باوەڕیا من ب سۆز و ڤین و لەزەت و شەهوەتا تە ناهێت
باوەڕیا من ب پێنووس و نامە و کاسێت و سترانێن تە ناهێت
باوەڕیا من ب نیشتمان و ئالا تە ناهێت

باوەڕیا من ب عەشقا تە ناهێت

گازییەکێ د گوهێڕێکێ دا ڤەدەم

من بدەستێن ئاڤەکا شین بشۆن

دا پاکیزەی گولێن من پاڤژ بێت

من بدەنە دەستێن هەورا، دا دەنگێ وی شەڕی دوبر ژ گوهێن من دەرکەتن

من بدەنە دەستێن بای، دا سترانەکا نەرم بۆ من بێژتن

من بدەنە پێش و یێ کچا بێشەرم ئەوا ڕویس دلەیزت

دا خوە بنیاسم

دشدین

دەمار دبز دین

بازن تەنگ بوو

بازن تەنگتر لێهات

بتنێ دەنگێ مای گونەها من نینە

ئەز کچم!

گرینگترین جیاوازی شیعری وێنەیی لەگەڵ دیداری ئەمەیەکە شیعری وێنەیی «بیسیاری-دیداری»یەلە کاتێکدا شیعری دیداری «نووسیاری-دیداری»یە. یانێ شیعری وێنەیی لەگەڵ گوێی مرۆڤەکانیش پێوەندی هەیە. بە واتایەکی تر ڕەنگە شیعرێکی وێنەیی درێژ بخوێندرێتەوە و هەروا لەڕێگەی وێنەی جوانی شیعرییەوە مانا و شیعر بوونی خۆی بسەلمێنێ، وەکوو قەسیدە بڵیندەکان، چجا کلاسیک بن یان نوێ، وەکوو قەسیدەی درێژی «هەورامانی ئەحمەد موختار جاف»، یان قەسیدە درێژ و نوێیەکانی یەسنای "فەرەیدوون ئەڕشەدی". بەڵام لە شیعری دیداریدا ئەوە بینینەکە قسەی یەکەم دەکا و لە بناغەڕا دەبێ لە سەر لاپەڕە کاغەزەکان بنووسرێنەوە. هەر بەم پێیە ناتوانرێ بۆ بەرهەمهێنانی مانا شیعری دیداری بە دەنگی بەرز بخوێندرێتەوە، بەڵکوو تەنیا دەبێ ببینرێ.

### لادان لە یاسا و ڕێساکانی نووسیاری لە شیعری وێنەیی و دیداریدا

شیعری وێنەیی و دیداری شێوەیەکە لە دارشتنی شێوەکارانە (نقاشانە)ی شیعر؛ کەبە لادان لەڕێسا و یاساکانی نووسینی باوی شیعری لە ناو شیعری شاعیراندا دادەڕێژرێ. لادان لەڕێسایەک کە زەق کردنەوە

دەبێتە هۆکارێک بۆ ئەوەی زیاترین سەرنجی پێبدرێ. زەق کردنەوە مۆدیلێکە کە لەودا زمان لەهێڵی باو لادەدا و ڕۆڵی ئەدەبی دەگێڕێ، ڕۆڵی ئەدەبی زمان ڕیشەی لە بۆچوونەکانی «شکلۆلفسکی» ڕووس و فۆرم خوازەکانی چیک بەتایبەتی مزکارۆفسکی و هاوڕانک دایە. بە باوەڕی هاوڕانک، زمانی خودکاری لە بناغەڕا بە کارگرتنی ماکەکانی زمانییە. بە شێوەیەک کە بە مەبەستی ڕاگەیاندنی بابەتێک بەکار دەبرێ. بەبێئەوەی کە شێوەی بەیان سەرنج ڕاکێش بێ، بەڵام زەق کردنەوە بە کار بردنی زمانە بەشێوەیەک کە سەرنجڕاکێش بێت.

شاعیران بۆ زەق کردنەوەی زمانی لە دوو شێوە کەڵک وەردەگرن:

١- ڕێسا زیاد کردن.

٢- لادان لەڕێساکانی باو.

لە لادان لەڕێسا و یاساکانی باودا، شاعیر لە شێوەیەکی نووسین کەڵکوەردەگرێ کە گۆڕانێک لە بێژ کردن و گوتنی وشەدا پێک نایە، بەڵکوو مانایەکی تر دەخەنە سەر مانای یەکەم. وەک ئەم شیعرەی "دیاکۆ مورادی" کە دو «دوعا»ی نووسیوە کەهەر «هیچ» و «پچڕانی»مان لە پێش چاو زەق دەکاتەوە. هەروەها دانانی ئەم نیشانانە «؟؟؟!!!» کە پرسیار و سەرسووڕمان لە پێش چاوی خوێنەر دا زەق دەکاتەوە. هەروەها «نازانم»ی کۆتایی شیعرەکە پێمان دەڵێ بە توندی و بەهاوار بێژ بکرێ و بەهێدی و هێمنی کۆتایی پێ بێ:

من و جگەرە و شەراب

شەرابی تەمین و

ئاوسی

بوونێکی بێ کۆتایی

دیلی ئەبەدی و تا سەر باری فڕینێکی هیچ

هیچ

ە...

ی...

چ... ... ...؟؟؟!!!

دوعا ئاخۆ بلێی...

ئاخۆ بلێی

تامی بەرد چەند بە ئێشە...؟؟؟!!!

ژانی بلووک...؟؟؟!!!

ئازاری پێلەقە...؟؟؟!!!

ئاخۆ بلێی...؟؟؟!!!

-ئای

**بەشی پێنجم- رەخنە**

فیتووی دڵداری-

تا ئەبەد

تامەزرۆت دەمێنم...

یان بەیەکەم چرپینت

پەتی

دڵداریمان

د...

ە...

پ...

چ...

ڕ...

ێ...

ن...

م...؟؟؟!!!

نازانم...؟؟؟!!!

نازانم...؟؟؟!!!

نازانم...؟؟؟!!!

نازانم...؟؟؟!!!

نازانم... ؟؟؟!!![1]

به پێی بۆچوونی "لیچ"، ئەو ناسیاوی سرپینەوانەی کە دەبنەهۆی زەق کردنەوەی ئەدەبی هەشت جۆرن کە یەکێک لەوان ناسیاوی سرپینەوەی نووسیارییە، لە ناسیاوی سرپینەوەی نووسیاریدا، شاعیر لە شێوەیەک نووسین کەڵکوەردەگرێ کە گۆڕانکاری لە بێژ کردنیدا پێک نایە، بەڵکوو مانایەکی دووهەم دەخاتەسەر مانا ئەسڵی و سەرەکییەکە، وەک شێوەی نووسینی «وەرە خواریّ» لەڕەسووڵی سۆفی سوڵتانی، ڕامان و «نەگونجان»ی نەوزاد ڕەفعەت کەلە وشەی «گلۆر بۆوە»دا زەق کراوەتەوە کەلە شیعری یەکەمدا «وەرە خواریّ» و لە شیعری دووهەمدا «گلۆر بۆوە»بە شێوەی وێنەی ڕاستی خۆیان وێنا کراون:

و

ە

[1] - وێبلاگی بڵێسەی زریان، دیاکۆ موڕادی (grkan).

ر
ە
خ
و
ا
ر
ێسەیرکە!
چ بەستەزمانە خیلقەت
لەرکەی تەنگی کاتدا لە دایک دەبێ
بێنیشانە
بێپێناسە
لەرکەی تەنگی کاتدا
هەڵدەوەرێ
بێئەنوا، بێ بینەر. (سۆفیسوڵتانی:٢٦)

یان:

...
بۆ ئێسقانێلە ژێر گڵی خەمدا ڕزی
بۆ چیا و چۆڵی پڕتەم
بۆ سالارێکی دڵنەرم
بەهاواری ساویلکانە لەگەڵ منداڵی کۆڵاندا:
"ئەستێرە پەنگرەستێرە
ئاگرێ باوێ ئێرە"
گ
ل
ۆ
ر
ب
ۆ

و

ە

(ڕەفعەت:١٢٦)

شیعری نوێ هەر لە سەرەتاوە بە ناسیاوی سرِینەوەی نووسیاری لە دایک بـوو، لـە جیاوازییـەکانی شـیعری نوێ لە گەڵ شیعری کلاسیک دەتوانین ئاماژە بە شـێوەی نووسـینیان بکـەین. شـاعیرانی شـیعری نـوێ بـە پێچەوانەی پێشینیان، لابەیتەکان و بەیتەکانیان لـە بـن و تەنیشـت یـەکتردا نەدەنووسـی، ئـەوان هـەر دێـڕە شیعرییەکیان بەسەربەستی دەنووسی و ئیتر پێویست نەبوو پێکهاتەی شـیعرەکە بـە جـوانترین شـێوە و وەک تای تەرازوو بەرابەر بن، بەڵکوو بە گوێرەی پێویست، لەحن و مانـا و بەسـەرنجدان بـە شـێوەی خوێندنـەوەی شیعرەکە جێگەی وشەیان لە دێڕە شیعرەکەدا دیاری دەکرد.

ئەم جۆرە نووسین و دارِشتنە هۆکاری زۆری هەبوو کـە یـەکێک لـەوان زەق کردنـەوەی هێنـدێک وشـە و تێکەڵ کردنیان بوو بۆ ساز کردنی وێنەی جوانی شـیعری، ئـەم چەنـد شـیعرەی خـوارەوە شـێوەی شـیعری «کوبیسم»مان پێ نیشان دەدەن کە دەگەڵ شێوەکاری (نقاشی) تێکەڵ بە پۆستێرە شیعر کراون:

شێتێکی پرچ و ڕدێن چڵکنی کراس دادرِ دادرِۆسەری بردە زارکی[1] ئەشکەوتەکە و گۆرانی بۆ ڤان چرِی:[2]

(١)

ئیمە بە ئاشکرا پیاو دەکوژین

و

بە دزیەوە ماچ دەکەین.

(٢)

بە منداڵی...

خودا و ژنیان لا ناشیرین کردین

خودا و شمشێر و

ژن و عەورەت!

(٣)

خودا بە شەش شەو

ڤانی درووست کرد و

دەستی بەسەر جوانیا گرت و

پاشان پشووی دا.

(جەلیزادە، ٢٠٠٧: ٢٦-٢٨)

---

١مەبەست ئەشکەوتی شاندەرە.

٢ئەم شیعرانە هەریەکە و وێنەی خۆی دەگەڵەکە لێرەدا وێنەکان قرتاون.

بەم شێوەیە دەبینین کە چۆنیەتی داڕشتنی شیعر لە نێو شاعیرانی وێنەیی و دیداریدا زۆر سەرنجی دراوەتێ. شاعیرانی ئەم شێوە شیعرانە بە پێداگری و بەهێند گرتنی ناسیاوی سڕینەوەی نووسیاری هەوڵی نەداوە کەلە کاتێکدا کە وێنە (عکس) و فیلم بوونەتە خاوەن ئیعتبارێکی تایبەتی لە ناو خەڵکدا، تێڕوانین و بە چاو دیتنی خوێنەرانی شیعر بکەنە ماکی یەکەی چێژی شیعری. ئەو خوێنەرانەی لە پێشوودا تەنیا لەڕێگەی گوێ و بیستنەوە (واتە: ڕیتم، کێش، سەروا و ...) لە شیعر تێدەگەیشتن، بێنەسەر ئەم باوەڕەی کە شیعر چاو لێبکەن و ببینن. هەر ئەم باوەڕەی کە «یەدوڵلا ڕۆئیایی» ئاوای دەدرکێنێ: «شیعر لە پێشوودا دەبیسترا بەڵام ئیستا دەبێ ببینرێ». شاعیرانی شیعری وێنەیی و دیداری بە یاری وەرگرتن لە وێنە و شکڵی بەدەست هاتوو، لەڕێگەی چنین و داڕشتنی وشەکانەوە، هەوڵیانداوە تا شێوەیەکی جیا بۆ بزواندنی هەست و ئەندێشەی خوێنەر بەکار بەرن. وێنەگەلێک کە زۆرجار بە شکڵی هەندەسی و غەیری هەندەسی وەک خاچ و بورکان و هێلکە و دارو کەشتی و گۆزە و... دادەڕێژرێن. وەک ئەم شیعرەی "ڕەسووڵ سۆفیسوڵتانی"کەبە شێوەی دوو گۆزەیە کە لای بنەوەیان بەیەکەوە نووسابێ، بەڵام ئەگەر بە شێوەی لۆژیکی بنووسرابایە دەبوو لای بنەوە لەسەرەوە و لای سەرەوەی لە بنەوە بوایە، ڕەسووڵ لەم شیعرەدا جگە لە داڕشتنی شیعری وێنەیی، ناسیاوی سڕینەوەیەکی تریشی کردووە، یانێ لە ڕاستیدا ئەم شیعرە هەم «بیسیاری-دیداری»یە و هەم «نووسیاری-دیداری»:

تا هەڵچوونی زام... تا مانگەشەو

ئینطلیز

ڕێگە دەرناکەی تا

کەمێ خوارتر گەماری چڕی سەردەم و

بادە وەی دووکەڵە

[illegible]

[illegible]

[illegible]

(سۆفیسوڵتانی:٧٧)

**پێشینەی شیعری وێنەیی و دیداری**

شیعری وێنەیی هاوچەرخ تا ڕادەیەکی زۆر لە تکنیکی «توشیح»ی پێشینیان نزیکە و دەکرێ دەگەڵ

یەکتر بەراورد بکرێن. تەوشیح ئەو تکنیکەیە کە پیت یان وشـەگەلێکی ڕێـک و پێـک بەیەکـەوە دابـڕێژرێن و هەرکات بەیەکەوە کۆیان کەینەوە بەیتێک یان ڕستەیەک یان وشەیەک هەڵقوڵێ کە ڕەمزی تێدایە و ناو یـان ناسناو یان مانایەکی ڕەمزی دەگەیەنێ.

به باوەڕی لێکۆڵەران کۆنترین نموونەکانی شیعری وێنـەیی وێـدەچێ لـە نـاو شـیعری شـاعیرانی چـینی و ژاپۆنیدا بووبێ، کە شاعیرانی ئەوان بەکەڵکوەرگرتن لەهێڵی وێنەیی، نەقشیان لـە گـەڵ کەلامـدا دەنووسـی. ئەم شێوە دارشتنە ئێستاش لە ناو زمان و شـیعری ئەوانـدا بـوونی هەیـە. لەئـەدەبیاتی ئینگلیسـیدا داڕشـتنی شیعری وێنەیی لەسەدەی شـانزدەهەمی زایینیـدا بـە کتـێبی هونـەری "پاتنـهام"ی شـاعیر (١٥٨٩) دەسـت پێدەکا. لەسەردەمی ڕێنیسانسیشدا هێندێک شاعیر بەم شێوەیە شیعریان هۆنیوەتەوە کەلەم نێوەدا دەتـوانین ئاماژە بە "وتیر"، "کـوراس"، "بـن لـووس"، "هێـرک" و "هێربێـرت" بکـەین. لەسـەدەی نۆزدەهـەمی زایـینی، "ئێستیفان مالارمە" شاعیری فەڕانسەوی لە "پرتاب تاس" (١٨٩٧) هێندێک شیعری وێنەیی هەیە. "ئـاپۆلینێر" لە کالیگرامەکان (١٩١٨) بە ئیلـهام لـە قوتابخانـەی کوبیسـم چەنـد شـیعری وێنـەیی نووسـیوە. ویلادیمـیر مایاکۆفسکی، ئەی ئەی کەمینگیز، یان هەمیلتۆن فینلی، ویلیام کارلۆس، ویلیامز و دایلـن تامسـیش هێنـدێک شیعری وێنەییان هەیە.

لەم نێوەدا ئـاپولینێر بـە کـالیگرام هایشـەکانی کـە خـاوەنی ناوبـانگێکی تایبەتییـە، زۆر کـەس نـاوبراو بـە پایەدانەری شیعری هاوچەرخی وێنەیی دەناسن. بەڵام خاتوو "تاهیرە سەفارزادە" کە شـەش شـیعری وێنـەیی لە کتێبی "طنین در دلتای"دا بـلاو کردووەتـەوە لەسـەر ئـەم باوەڕەیـە کـە "ئـۆژۆن گورمـانژە"ی بولیویـایی بەڕەچەڵەک سوئیسی، بنیاتنەری ئەم جۆرە شیعرانەیە لە ئەدەبیاتی هاوچەرخدا. "تاهیرە" دەڵێ: ئەگەر بـاوەڕ وابێ کە کالیگرامی ئاپۆلینێر یەکەم شیعری وێنەیی بێ، خۆشنووس و دۆعانووسەکانی ئێمە زووتر ئەم کارەیـان کردووە.

ئەگەرچی دەتوانین وێکچوون لە نێو شیعری وێنەیی و سەنعەتی «تەوشیح» لەبەرهەمی شاعیرانی پێشـوودا ببینین، بەڵام شیعری وێنەیی هاوچەرخ بە تایبـەتی شـیعری دیـداری زیـاتر لـە ژێـر کـار تێکـردنی شـیعری ڕۆژئاواییەکاندایە. کە لە لەدایک بوونی ئیماژیسم (imagism) و پەلکێش کـردنی کوبیسـم (kubism) بـۆ نـاو ئەدەبیات، پەرەی ستاندوە.

لە ساڵی ١٩١٢ تا ١٩١٧ی زایینی لە شیعری ئینگلستان و ئامریکادا جووڵانەوەیەک هاتە ئاراوە کە پێـداگری زۆری لەسەر وێنەگەرایی لەشیعردا دەکرد. ئەم جووڵانەوەیە کە بە ئیماژیسم ناوی دەرکـرد، پێـداگری لەسـەر ئەوە بوو کە وێنە ئافراندن لە ماکە پێکهێنەرە جوانەکانی شـیعر نییـە، بەڵـکوو بـەردی بناغـەی پێـک دێنـێ. پێداگری ئیماژیستەکان لەسەر وێنەسازی و سەرنجی ئەوان بۆ چڕ کردنەوەی شیعر، کاری کردە سەر لـەدایک بوون و پەرەستاندنی شیعری وێنەیی و دیداری.

کوبیسمیش کەهاوکات بوو لەگەڵ پەیدا بوونی قوتابخانەی ئیماژیسم، دوای ئەوەی کە ئیماژیسـم کێشـرایە ناو گۆڕەپانی ئەدەبیاتەوە، ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا لەپەرەستاندنی شیعری وێنـەیی و دیداریـدا. لـە شـێوەکاری

(نقاشی) کوبیسمدا شێوەکار هەوڵ دەدا جۆگەی دووبارە بونیات نانەوە یان تەقلیـدی لایەنـە پرسـپکتیوەکانی ناو سروشت سەرەتا ئەو ماکە وێنەیانەی کە گەرەکییەتی ڕەسمیان بکات و وردیان کاتەوە (تجزیە کنـد) و بـە شێوەی قەتعەی جیاجیا دەریان بڕێ. دواتر بە شێوەیەکی نوێ و تێکەڵاو سازیان بکاتەوە، لەڕاسـتیدا شـاعیری شیعری وێنەییش هەر ئەم کارە دەکا. شاعیر بە لێک هەڵوەشاندنی ڕستەیەکی سادە، ماکـەکانی بـە شـێوەی دڵخوازی خۆی دەچنێ کە ئەم شێوە ڕازاندنەوەیە ئاکامەکەی دەبێتە شکڵ و وێنەی دڵخوازی شاعیر.

"ئاپولینێر"لە کتێبی "نقاشان کوبیست"دا کاری شاعیر و شێوەکاری کوبیسـتی پێکـەوە هـەڵسـەنگانـدووە و باوەڕی وایەکە هەردووکیان تێدەکۆشن لە سرووشت تەرحێکی نوێ وێنا بکەن و لـەم ڕێگـە هەسـتی دەروونی ڕاستییەکان، بێ سنوور خەیاڵی مرۆڤەکان پەرە پێ بدەن.

هێنـدێک خـاوەن ڕا، بۆچوونـەکانی "ویتگنشـتاین" (١٨٨٩-١٩٥١ ز) فیلسـووفی ئوتریشـییان لـە بـواری پێوەندی زمان و جوانی ناسیان بە تایبەتی نەزەرییەی "یارییە زمانییەکانیان" پێ گرینگ بووە بۆ کـار تێکـردن بەسەر شاعیرانی شـیعری وێنەییـەوە. ویتگنشـتاین بـاوەڕی وابـوو کـە: «ئێمـە وشـەکان لـە کایـەی زمـانی متافیزیکییەوە ڕادەگوێزین بۆ ناو کایەی زمانی خودکاری».

### هۆکار و ماکەکانی پێکهێنانی شیعری وێنەیی و شکڵەکانی

شـاعیران بـۆ پێکهێنـانی وێنـە و شکڵـەکانی شـیعری لـە شـێوەی جۆراوجـۆر کەڵـکیان وەرگرتـووە کـە گرینگترینیان ئەمانەن:

١) جیا نووسی یەکەکانی شیعری.

٢) بە شێوەی جۆراوجۆر نووسینی دێڕە شیعرییەکان.

٣) کەم و زیا کردنی ڕادەی بڕگەکانی هەر دێڕە شیعرێک.

٤) کەڵکوەرگرتن لەهونەری خۆشنووسی و فەنی ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان.

٥) کەڵکوەرگرتن لە شێوەکاری لەتەنیشت نووسین.

٦) دووپات کردنەوەی وشەکان.

ئێستا دێینە سەر لێکدانەوە و نموونە هێنانەوە بۆ ئەم شەش خاڵەی کەلەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد.

١) جیا نووسی: یەکێک لەو شێوانەی کەهەموو شاعیران لە داڕشتنی ئەمجۆرە شـیعرانە کەڵـکیان لـێ وەردەگرن. جیا نووسن و بە شێوەی پیت داڕشتن و تا ڕادەی بچووک کردنەوەی پیتەکانی شیعرە:

«ڕاچەنین»

نیوەشەوێک بەگەرمی قاقات ڕاچەنیم

ژوورێکی بێپەنجەرە

دەرگام کردەوە

ک

ل
و
و
ک
ل
و
و
بەفر
د ە
ب ا
ر ی

یان:
بە
چا وان
نوێژ دادەبەستم
تاتی دڵم
بارتەقای بەرماڵی
هەموو مزگەوتێ
لە
چا
وا
نت
دە
چێ. (عەلی قاسمی)

٢) بە شێوەی جۆراوجۆر نووسی دێڕە شیعرییەکان: جیا نووسین بە شێوەی گشتی بە نووسینی جیا و دوور لە دێڕە شیعرەکانی دیکە دەوترێ. بەڵام لە شیعری دیداریدا، شاعیر بۆ ڕێکخستنی فۆرم و شکڵی دڵخوازی خۆی، زۆرجار شیعرەکەی لە خوارێڕا بۆسەرێ یان بە شێوەی نموودار یان خوار و ... هتد دەنووسێ. وەک شیعرەکەی مەهاباد قادر و تاهیرە سەفارزادە و تا هەڵچوونی زام تا... مانگەشەو؛ هەر لەم

وتارەدا.

٣) کەم و زیا کردنی ڕادەی بڕگەکانی هەر دێڕە شیعرێک: ئەم شێوەیەهەر لەسەرەتای پەیدا بوونی شیعری نوێوە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی بووە. وەک ئەم نموونەیە:

ئاژاوە
لە شارێکی مات و کڕا
ئاسمان شەق بوو
سێ نوورانی
بە سێ گوریسی ئاگردا
هاتنە خوارێ
سێ سروودی سووریان چڕی
شار بوو بە سێ
سێ گەڕەکی چەقۆهەڵکر...
لەو ساوە هاواری هەلاج
ئەسپێکی بێسەروشوێنە
لەو ساتەوە نەک هەر گورگ
مەلیش دەنووکی بە خوێنە. (جەلیزادە، ١٩٨٨: ٢٧)

٤) کەڵکوەرگرتن لەهونەری خۆشنووسی و فەنی ڕازاندنەوەی لاپەڕەکان: زۆرجار شاعیر بە بچووک کردن و گەورە کردنی وشەکان یان لە چوارچێوەی قابدا، دانانی شیعر دەیهەوێ مەبەستی خۆی بگەیەنێ، وەک شیعری "دیاکۆ مورادی"بە وشەی «نازانم»هەر لەم وتارەدا و شیعری «خەون»ی "هاشم سەراج":

| |
|---|
| میسک و سونبول و سانحەر و سوپەند و سوها و سەمەن و سەرو و سەحەر و سورمە و سەدەف و سیلسیلە و سەما و سۆزان و شەهلا و شەهین و شیلان و شووشە و وشە و چراغ و شانە و شەوە و شەوبۆ و شەرزە و ڕام و ڕاکی و ڕازیانە و هەرمێ و هۆزاو و هۆبەو فەنەر و لەب و لەبلەب و لەبالەب و بادە و بادام و بادی و لیمۆ و شمشاد و سرووش و عەشق و حەشیش و خشڵ و خاشخاش و خولیا و خەلات و خەتا و خەزاڵ و خێڵ و خەیلان و خەرمان و خەزێم و خواز و خاڵ و خەڵووز و خەون و خەندان و خاوەر و خومار و خارا و خەنە و خەندە و<br>خەندەران و خاو و خەمان! |

هەر تۆی

٥) کەڵکوەرگرتن لە شێوەکاری (نقاشی) لەتەنیشت نووسین و شیعر: وەک ڤان ئیرۆتیکی "قوبای جەلیزادە"، کەهەموو بەم شێوەیە داڕێژراوە.

٦) دووپات کردنەوەی پیت و وشەکان: وەک «دارستانی ئۆرگازمووز و» ی "زانا خەلیل".

دارستانی ئۆرگازموزو
باران... باران... باران
باران... باران
باران (خەلیل:١٧٢-١٧١)

چەند نموونەیەکی تر هەر بەم شێوەیە:

نم
نم
نم نم نم نم نم
نم
نم
نم

ئاە و ئاە و ئاە
ئاە و ئاە
ئاە

هەروەها:

نم

نم نم نم
نم نم نم نم
نم نم نم نم نم نم
نم نم نم نم نم نم نم نم نم

ئاه
ئاه و ئاه
ئاه

***

- ئەم باسە، واتە باسی دال و مەدلوول و نیشانەبە پێی بۆچوونی فردینان دوسۆرسۆر (١٨٥٧-١٩١٣)ە کەبە بنیاتنەری زمانناسی مۆدێڕن ناسراوە و زمانناسی لە چوارچێوەی سوننەتییەکەی ڕەها کردووە و دواتر پێرس، موریس و ... کارەکەی ئەویان درێژە پێداوە.

## سەرچاوەکان:


١) سۆفی سوڵتانی، ڕەسووڵ، **کۆچەریانە**، گۆڤاری ڕامان، تاران ، ئینتشاراتی عابیر، چاپی یەکەم.
٢) قادر، مەهاباد (٢٠٠١) ڕامان، ژمارەی ٥٥، ساڵی پێنجەم، کانوونی دووهەم.
٣) صفار زاده، طاهره (١٣۶۵) **طنین در دلتا**، شیراز، انتشارات نوید.
٤) ڕەفعەت، نەوزاد، ڕامان، ژمارە ٢٤.
٥) دۆسکی، تریفە، **ئەز و باران**، ڕامان، ژمارە ٧٢.
٦) وێبلاگی بڵێسەی زریان، دیاکۆ مورادی (grkan).
٧) جەلی زادە، قوباد (٢٠٠٧) **ڤان ئیرۆتیک**، دەزگای چاپ و بڵاو کردنەوەی ئاراس، چاپی یەکەم.
٨) جەلی زادە، قوباد (١٩٨٨) **دیوانی**، چاپی یەکەم.
٩) سەراج، هاشم، ڕامان، ژمارە ٦١.
١٠) خەلیل، زانا، ڕامان، ژمارە ٦٥.
١١) احمدی، بابک (١٣٨٠) **ساختار و تاویل مت** ، نشر مرکز، چاپ پنجم.
١٢) لنگرودی، شمس (١٣٧٧) **تاریخ تحلیلی شعر نو**، نشر مرکز، دورەی چهار جلدی.
١٣) باباچاهی ، علی (١٣٨٠) **گزارەهای منفرد، مسایل شعر و بررسی انتقادی شعر جدید و جوان امروز**، جلد ٢-١ و ٢-٢، موسسەی انتشاراتی سپنتا.

# پانتای وشە لە دیوانی مەولەویدا و ڕۆڵی لە گەشە پێدانی شیعری کوردی

کولسووم عوسمانپوور*

**کورتە:**

"مەعدوومی"، شاعیری بلیمەتی کورد، بە هۆی ژیانی فەقیەتی و شارەزایەتی بە سەر زمانەکانی عەرەبی و فارسی و کوردیدا و هەروەها دانانی بەرهەم بەم سێ زمانە، زۆرتر لە شاعیرانی دیکەی کورد ناوبانگی دەرکردووە، بەڵام ئەم وتارە بە تۆژینەوەیەکی سیستماتیک دەیەوێ ئەم ڕاستیە بسەلمێنێ کە دەسەڵاتی شیعری "مەعدوومی" لەم بوارانەدا بە ئاشکرایی خۆی نیشانداوە، شارەزایی لەسەر وشە، وەکوو بە کارهێنانی مانای جۆراوجۆر، داتاشینی وشەی نوێ، بە شیعرکردنی ئەو وشانە کە هەرگیز لە بازنەی شیعردا نەبوون، تێکئاڵانی وشەی سۆرانی و هەورامی بۆ دروستکردنی وشەی نوێ (وەکوو: «کیاستێنین، ئاستێنین» مەولەوی: ٢٩١) داهێنانی وێنەی تازەی بێوێنە، چ لە شیعری کوردی و چ لە فارسیدا، بە کارهێنانی بەرفراوانی وشەی ڕەنگامە لە بوارە جۆراوجۆرەکاندا وەکوو: دین، عیرفان، سروشت، هەست و عاتیفە و مۆسیقا، لە بواری زانستدا وەکوو ئەستێرەناسی، کەلام، فەلسەفە و ...، کار و پیشەی خەڵک وەکوو ئاسنگەری، جۆلایی، خەیاتی و... . بۆ وێنە لە بەستێنی جۆغرافیادا، تەنیا بۆ وشەی «با» یازدە وشەی جۆراوجۆری هێناوە وەکوو: سەبوون، وەیشوومە، ڕەشەبا و هتد.

ئەمانە هەمووی بوونەتە هۆی جوانی و دەوڵەمەندی دیوانە هەورامیەکەی مەولەوی و لەسەر شاعیرانی دیکە تەئسیری داناوە. هەروەها خۆشەویستی شیعری مەولەوی لەلایەن عام و خاسەوە زۆرتر کردووە.

**وشە سەرەکییەکان:** شیعر، مەولەوی، وشە.

---

* ماستەری زمان و ئەدەبی فارسی

**بەشی پێنجەم- رەخنە**

## ١- پێشەکی

ڕەخنەگران و شیعرناسان لە هەر دەورەیەکدا شیعریان داوەتە بەر سەرنجی هەڵسەنگاندن و لێکۆڵینەوە. ئەگەر شیعر بە خاڵی هاوبەشی سۆز و خەیاڵ بزانین کە بە زمانێکی موسیقایی سەری هەڵداوە (شفیعی کدکنی، ١٣٨٠: ٨٦) ئەوا سێ گۆشەی سەرەکی شیعر دەبێتە خەیاڵ و سۆز و زمان.

شێوەکانی وێنەسازی لە شیعردا کە بە لێکچواندن، خوازە، کنایە و مەجاز دەناسرێن، بە پێی هێزی خەیاڵ ساز دەبن. زمان، کاراترین خزمەتکاری خەیاڵە؛ چونکە خەیاڵ و خولیا بە پێی پێداویستیەکان دروستی دەکەن (دیچز، ١٣٦٦: ١٨٩). کەرستەی هونەری شاعیر وشەیە، چونکە لە جیهانی ئافراندنا سەروکاری شاعیر لەگەڵ وشەیە؛ وشەگەلی هەر زمانێک جێگە و پێناسەی تایبەتی خۆیان هەیە. هەندێ جار بە تەنیایی موسیقا و واتای تایبەتیان تێدایە و هەندێ جاریش لە پاڵ وشەی تردا پێگەی تازە وەخۆ دەگرن. ڕیزبەندی و دارشتنی وشە لە پەیامی شاعیردا پێگە و شیوازی شاعیر دیاری دەکەن.

نیزامی عەرووزی سەمەرقەندی دەڵێ: شاعیر دەبێ بیست هەزار بەیت لە شیعری پێشینیان فێر بێ و دە هەزار وشەی بەرهەمی ڕابردووان هەڵگرێ و بەردەوامیش دیوانی شاعیران بخوێنێتەوە و فێریان بێ» (معین‌الدّینی، ١٣٧٤: ٧٤). وشە و بە کارهێنانی وشەگەل و دروستکردنی پێوەندی عاتفی بەینی واژەکان، کاری هەمان کارگەی نادیاری خەیاڵە. بە بەکارهێنانی زمانی وێنە، موسیقا، ڕەنگ و دەور، هەم دەروونی خۆی هێمن دەکاتەوە هەم دیترانیش. دیاریکردنی ئەوەی کە هەر شاعیرێک بەستێنی دەکارکردنی وشەی چەند بەرینە، یا چەند کەم و کورتە، دەبێتە یەکێک لە تەوەرەکانی لاوازی و بە هێزی هەر شاعیرێک.

«بێشک شاعیرێکی بە توانا بە پێی ئەو پێداویستانەی کە لە ڕێگەی سۆز و خەیاڵەوە، دەری دەبڕێ، هەروەها بە هەبوونی سامانی فەرهەنگی، وشەگەلی فراوان و بەرینی لەبەر دەستدایە؛ کەچی شاعیرێکی لاواز جەغزی (دایرە) وشەکانی بەرتەسک و بچووکە» (شفیعی کدکنی، ١٣٨٠: ٩٢).

شاعیرانی گەورە هەندێ جار خودی واژەکانی زمان بۆ بەیانکردنی عاتیفەی ئینسانی بە کەم و کورت دەزانن. بە دەسەڵاتیان لە زماندا وشەی تازە دروست دەکەن و بە سۆزی ناسکی شاعیرانە بە پێی بابەت و ناوەرۆکی شیعر بە کاریان دەبەن. ئەم دەسەڵاتە زمانییە، ئەبەدییەت و هەرمان دەبەخشێتە شیعریان.

ئەم وتارە، لێکۆڵینەوەیەکە لە سەربەستێن و پانتایی وشە لە دیوانی مەولەوی کورددا وە هەروەها دەسەڵاتی هونەری شاعیر لە بە کارهێنانی وشەکانیدا.

مەولەوی لە ڕۆژگارێکی پەرێش و لە ژیان و ڕووداوی پڕ لە ئێشی خۆی، بە جوانی زانستەکانی قورئانی و ئیسلامی فێر بوو. بە خوێندنەوەی بەربڵاوی شیعر و ئەدەبی عەرەبی و فارسی و کوردی و هەروەها وەرگرتنی تەجروبەی شاعیرانی پێش خۆی بە زمانی شیعر و ئەدەب ڕاهات و گەلێ بەرهەمی بە نرخی بە هەر سێ زمانی کوردی و فارسی و عەرەبی نووسی. مەولەوی کە زمانی سەرەکی خۆی کوردیسۆرانییە، زمانی کوردیهەورامی وەک زمانی عەشق و عاتفەی دەروونی بە کار هێنا و گەورەترین و نەمرترین بەرهەمی وەک دیوانی شیعرەکەی لێکەوتەوە. دەسەڵات و تەجروبەی لەسەر زمانی فارسی و عەرەبی توانی دنیایەک جوانی

و هونەری شاعیرانەی بێوێنە لە شیعردا بخولقێنێ. لە دەوڵەمەندی هونەری و بەربڵاوی وشە لە دیوانی مەولەویدا، لێرەدا تەنیا سەرنجێک و تێڕامانێکم هەیە بۆ زانایی و توانایی شاعیرانەی.

### ٢- دەقی سەرەکی

دیوانی مەولەوی کورد پڕە لە وێنەی جوان و واتای پڕ مەغز؛ گوڵستانێکە کە هەر گۆشەیەکی بە شێوازێکی تازە و ڕەنگاوڕەنگ و بۆن خۆش، ڕازاوەتەوە. موسیقای خەم‌لاوێنی شیعری، چێژی دیتن و بیستنی تێکەڵ کردووە. بۆ دەرک و تێگەیشتنی باشتر، وشەکان، لە چوار بەستێنی جیاجیا دابەش کراون.

١. بەستێنی سروشت          ٢. بەستێنی زانست
٣. فەرهەنگی گشتی          ٤. وشەسازی

**٢-١- بەستێنی سروشت** (گیانەوەر، گژ و گیا، ئاگر، ئاو، با، ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ، دەنگە ناوەکان، خواردەمەنییەکان).

مەولەوی شەیدای سروشتە و وشەیەکی زۆر لە دیوانەکەیدا هی ئەم بەشەیە. شاعیر بە ماکەکانی سروشت و بەکارهێنانیان بە شێوەیەکی جوان، تایبەتمەندیەکی جیاوازی بە شیعرەکانی بەخشیوە. ژیان لە سروشتی نابی کوردستان بووەتە هۆی ئەوە کە ئەزموونێکی ڕاستەوخۆی لە سروشت بێت. وێنە سروشتیەکان، دڵڕفێنی و میهرەبانی و سۆزداری شیعرەکانی زۆرتر کردووە.

#### ٢-١-١- گیانەوەر

ناوی ٢٩ گیانەوەر لەم دیوانەدا هاتووە لە شێرەو بگرە هەتا شەماڵەی نوور (گوڵ ئەستێرە) و مێش و باڵندەکان. لەم ٢٩ گیانەوەرە ١٥ەیان باڵندەن. ئەڵێی شاعیر، ڕوانینێکی تایبەتی بۆ ڕوانین بۆ ئاسمان و هەڵفرین و باڵندە هەیە و سەرەنجێکی تایبەتی بۆ ئەمانە بووە. بەڵام ناوی مار زۆرتر لە هەموو گیانلەبەران دووپات بووەتەوە. مەرگی یەکێ لە دۆستانی بە هۆی گەستنی مار و هەروەها شوبهاندنی دونیا و هەموو ڕەنجەکانی بە مار، یەکێ لەو خاڵانەیە کە سەرنجی شاعری بۆ وشەی مار زۆرتر ڕاکێشاوە. ناوی ئەو گیانەوەرانە بریتین لە: مار، سەگ، وەرە (بەرخ) کەڵ، کومەیت (اسب)، ماساو (ماسی)، غەزاڵان، سەمەندەر، ئاهوو (ئاسک)، شێر، پەروانە (پەپوولە)، مەگەس (مێش)، جەیرانان، کۆتر، شاباز، بایەقوش، کەبک (کەو)، بولبوڵ، قومری، تووتی، شاهین، تەزەرو، تاووس، ژەرەژ (کەو)، هەڵۆ، کرم شەبتاب و هەروەها باڵندە ئەفسانەیەکان وەکوو: قەقنەس و هوما.

#### ٢-١-٢- «گژ و گیا»

مەولەوی لە هەموو شیعرەکانیدا ڕەگەزی سرووشتی بۆ دروستکردنی وێنە شیعریەکان بە کارهێناوە، ناوی سەوزە و گوڵ و ئەنواعی درەختەکان. وەکوو: شمشاد، بادام، عەرعەر، سەرو، نەمام، سنۆبەر. بەڵام لە وێنە دروستکردندا «نەمام»ی زۆرتر بە کار هێناوە، شاعیر لەو ناوە تەقلیدیانەی دیوانی شاعیرانی دیکە پارێزی

کردووە، نـاوی چـەن گوڵیشـی هێنـاوە، نـەرگس، گوڵاڵـە، وەنەوشـە، گـوڵ سووسـەن، چنـوور، وەرکەمـەر، نەوروزگۆڵ، غونچە، لالە، وەرزاخان، وەلگ، سەوزە، بەڕەزا و شەمامە لە دیاردەکانی دیکەی سروشـتە کـە لـەم بازنەدا جێ ئەبێتەوە. بەڵام ناوی «گۆڵ»ی زۆرتر هێناوە و ٨١ جار دووپـاتی کـردووە (قـادر محەمـەد، ٢٠٠٧: ١٣٨). وەرزاخان، چنوور، بـەڕەزا و وەرکەمـەر، ڕەنـگ و بـۆی کوردسـتان و بـە تایبـەت هـەورامانمان وەبـیر دەخاتەوە. بۆ هەڵبژاردنی وشەیەک، زۆر شتی دیکە لەبەرچاو دەگرێت؛ بۆ وێنە لە تـەواوی دیـوانی مەولەویـدا تەنیا یەک جاریش وشەی دڕک یان (دڕەی= هەورامی) بە کار نەچووە. بۆ ئەم ڕەگەزە ناوی «خـار»ی هـانیوە کە فارسیە. ڕەنگە مەبەستی ئەوە بووبێ کە خار لەگەڵ خاتر و خەم لـە بـاری موسـیقاوە ڕێکیـان بخـات، لـە حاڵێکدا، دڕک و دڕەی ئەم موسیقایە نییە. بۆ وێنە:

ئاخ، چراخ! چ ئاخ؟ ئاخ پەی ئاخداریێ چون من خاتر خار، خەمبار، داخداریێ

(مەولەوی: ٥٥، ب ٢)

#### ٢-١-٣- ئاگر

مەولەوی شەش ناوی بۆ ئاگر هێناوە (ئار، ئایر، ئاهیر، ئاتەش، نار، نائیرە). ٦٠ وشەی جۆراوجۆر لە دیوانەکـدا هەن کە دیاردەی ئاگر و سووتان، دەخاتە زەینی خوێنـەرەوە. ئـەم وشـانە زۆرتـر لـە دووسـەد جـار دووپـات بوونەتەوە کە بە تەرتیبی فەراوانی، ئەمانەن[1]: گەرمی، کوورە، بلێسە، شەرارە، سـفتە، شۆڵـە، دوو، بـووڵ، نـار، ئایرین، ئایر، زوخاڵ، دووکەڵ، قەقنەس، پزیسکە، نائیرە، بۆ پرووز، سوچیا، سۆچنو، چزە، ئاتەش خان، نـەفتین. وشەکانی شیعر لەگەڵ کەش و هەوای دەروونی شاعیر موناسـبەتی هەیـە، بـە وتـەی عالیمـەکانی بەلاغـەت، لوغەت و قسەی بە پێی پیویستی بارودۆخی خۆی هێناوە (فرشیدورد، ١٣٦٣: ٣٥٠). بۆ وێنە ئەو شیعرەی کـە بۆ سووتانی کتێبخانەکەی وتووە (مەولەوی: ١٩٢) پڕە لە وێنەی سووتان و ڕەنگـی ڕەش و وشـەی بەسـتێنی ئاگر کە ڕەنج و ئازار و نامورادی وەبیر دەخاتەوە، وێنەی سووتان لە دیوانی مەولەویدا زۆرە.

#### ٢-١-٤- ئاو

ئاو، کاراترین ڕەگەزی سروشتە کە لە ڕوانگەی دیتن و بیستنەوە، جموجوول دەخاتە گیانی بـەردەنگ. ئـەو وشانە کە وێنەی ئاو، لە زەینی خوێنەردا دێنێتە بەرچاو ئەمانەن: ئاو، شـەتاو، سـەرکاو، سـەراو، شـەتاو، وەرواو، وەفراو، لافاو، سەیلاو، گێجاو، دەریا، دەریاچە، چەم، قەڵوەز، تاڤ، تاڤگە، چەشمـە، عـەین، جـۆ، مـەوج، بـەحر،

---

[1] - وشەکانی بەستێنی ئاگر ٦٠ جۆر و ١٩٢ جار دووپات بوونەتەوە: کوورە- گەرمی- بڵێسـە- شـەرارە- ئـایر- سـفتە- دوو- ئایرین- بووڵ- نار- زوخاڵ- قەقنەس- سوچیا- شوڵە- پزیسکە- چەخماخـە- سـوچنو- نـائیرە- سـوچنا- قرچـە- برێشتە- ساج- سوزیام- دووکەڵ- سوچنان- بۆ پرووز- سەبوون- تەنوور- نەفت- ئاهیر- گرمە- بەرق- بریسـکە- گرپـە- توون، قەقنەس- حەرارەت- ئایرین- مەسوچیا- گر- جۆشدا- ئار- چزە- گرە- کزەی کەباب- جوش سـەماوەر- بوریـان- ئاتەشخان- دوود- خورشید- ئاهیر- کلێنمی- کلپە- نەفتینت- گرمە (کورە)- جوش ئاوەردە- ئاهیرین- نوور ئەفشـانی- ئاهینگەری.

پلووسک، قەڵوەز، پـرژە، شـەونم، وەرو، زریێـار، سـیروان، دەجلـە، تانجـەرۆ، عـەمان، هـەرەس و کڵێڵـە. لـە سەردەمی ژیانی مەولەویدا سی ئاش، لە چەمی زەڵمدا کاریان کردووە. ئەمە بەڵگەیەکە بـۆ ئـەوە کـە ئـاو، بـە فراوانی لەبەر چاوی شاعیردا بووە، ئەویش وێنەیەکی ڕاستەقینەی لە سروشتی جوغرافیای خۆی کێشاوە.

### ٢-١-٥- با

«با» لە ژیان و گوزەرانی مرۆڤی کوردی شاخنشیندا هوکارێکی گرنگ بووە؛ بۆیە، چەنـدین نـاوی جیاجیـای هەیە (قادر محەمەد، ٢٠٠٧: ١٣٦). مەولەوی بە سەلیقەی شاعیرانەی خۆی ١١ نـاوی جۆراوجـۆری بـۆ «بـا» هێناوە، ئەم کارە هەمەڕەنگیەکی جوانی بەخشیوە بە شیعرەکانی. با، سەبوون، وەیشوومە، ڕەشەبا، سەبا، شـنۆ، نەسیم، سەمووم، گەردەلوول، گێجەلوول، باد سوبح، باد خەزان (هەمان، ٢٠٠٧: ١٣٦).

### ٢-١-٦- ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ

مرۆڤ بەشێک لە سرۆشتە، مەولەوی، مرۆڤ لە هـەموو دیاردەکـانی سروشـت جـوانتر دەزانێـت. نـاوی ٣٠ ئەندام لە ئەندامەکانی مرۆڤ لە دیوانەکەیدا هاتووە، بۆ برێک لە ئەندامەکان جگە لە ناوە هەورامیەکـەیان نـاوی فارسی و عەرەبی یا سۆرانیشی هێناوە. وەکوو بەدەن، جیسـم، جەسـتە؛ دان، دنـدان؛ جـەرگ، جگـەر؛ چـەم، دیدە، عەین؛ بالا، بەژن، قامەت؛ پێشە، استخوان؛ لەب، لێـو؛ دەس، پـا، سـەر، پەنجـە، سـینە، مـەردم، کولـم، خەت، خاڵ، مەغز، توڕڕە، ئەبرو، ناخوون، گۆش، زوان، گەردەن، مۆژە، پۆس، دڵ، گۆنـا، زانـو، دەروون. لـە نێـو ئەم سی ئەندامەدا ناوی دڵ و دیدە و دەروون زۆرتر هاتووە.

قورسایی ڕەنج و پەژارەی شاعیرانەی مەولەوی کەوتۆتە سەر شانی دڵ کە ٤٠٠ جار دووپات بووەتـەوە. دڵ لە ڕوانگەی سۆفیەکانەوە جێگای تایبەتی هەیە و لە کتێبە عیرفانییەکاندا بەشێکی جیـاوازی بـۆ تـەرخانکراوە. بینایی و دیتن و دیدە ٢٦٠ جار و دەروون ٦٧ جار هاتووە.

### ٢-١-٧- دەنگە ناو

دەنگە ناو لە سروشتەوە گیراوە و بە جوانی  لە شیعری مەولەویدا هاتووە. لە نێو شاعیرانی ئـەدەبی فارسـیدا مەولانا جەلالەدین محەممدی بەڵخی بە جوانی «دەنگە ناو»ی لە شیعردا هانیوە. بەکارهێنانی دەنگـە نـاو لـە شیعردا کارێکی ئاسان نییە. ناوی ٢١ دەنگە ناو هاتووە و ٤٥ جار دووپات بوونەتەوە وەکوو: گڕپە، قرچە، هـاژە، وەلوەلە، چۆڕە، لرفە، زرنگە، تریکە، خشپە، چریکە، ترپە، خشە، شەقە، تەقە، کـزە، گرمـە، هـەو هـەو، بەوبـەو، شرێخە، زیلە، فڕە.

### ٢-١-٨- خواردەمەنی

کەمترین ڕێژە لە بەستێنی وشەکانی سروشتدا خواردەمەنییـە. تـەنیا ٥ نـاو هـاتووە. هـەنار، هەڵـوا، بـەی، شەکەر، سکەنجەبین. وا دێتە بەرچاو کە مەولەوی بە بۆنەی شێوازی هەژارانە و سـادە و سـاکار کـە بـۆ ژیـانی هەڵبژاردووە، کەمتر بیری لە خواردن و خواردنەوە کردووە.

### ٢-٢- زانست

٢-٢-١- مووسیقا: ئەگەرچی مووسیقای وشەکان یەکێک لە کارامەترین خاسیەتە هونەرییەکانە کە لە هەموو جێگای دیوانەکەی مەولەویدا ڕەنگی داوەتەوە و بە تێکئالاوی بێژە و واتا گەیشتۆتە نەزمی ئامانجی خۆی، بەڵام مەبەست لە مووسیقا لەم وتارەدا مووسیقای وشە نییە، بە مانایەکی بەرینتر، ناسینی سەدای زیل و بەم، زاراوەکانی دنیای مووسیقا و ناوی سازەکانە. لێکۆڵینەوە لەسەر دیوانی مەولەوی دەمانگەیەنێتە ئەنجامێکی زۆر گرینگ و پڕبایەخ، ئەویش ئەوەیە کە مەولەوی زۆر حەزی لە مووسیقا بووە. ناو و دەنگی سازەکانی ناسیوە، سازەکانی دیوە. ئاشنایی لەگەڵ زاراوەکانی مووسیقا هەیە. لە بواری ڕۆحی و دەروونیەوە، ئوخژن و ئارامش لە دونیای مووسیقادا ئەدوزێتەوە:

جەلای هەر گەردێ وە سەداییۆەن　　　　دەوای هەر دەردێ وە نەواییۆەن

(مەولەوی: ٢٢، ب ٦)

مەولەوی دەوای هەموو دەردێ لە مووسیقادا دەزانێ. لە دیوانەکەیدا ناوی ١٧ ئامێری مووسیقای هێناوە کە بە تەرتیب دەف و نەی و سەمتوور و تاری زۆرتر ناو بردووە. دەنگی ئەم سازانە زۆرتر مەستی دەکەن، دەف ١٩ جار و نەی ١٧ جار و سەمتوور ٧ جار، تار ٤ جار هاتووە. ئامێرەکانی دیکە بریتین لە: کەمانچە، زەنگ، نەقارە، سورنا، کەمان، تەموورە، لوولە، کووس، تاس، چەنگ، ڕوباب، دائیرە، ساز. بۆ نەیژەن سێ ناوی هێناوە. نەیچی، نایی، ساحیبنەی. بۆ دەف تەنیا ناوی دەرویشی هێناوە، لە شیعرەکاندا وا دەرئەکەوێ کە مەولەوی موغەننی لە کاری مووسیقادا زاناتر دەزانێت و موترێب چەند پلەیەک لە موغەننی خوارترە. لە لاپەڕەکانی ١٢٨ ب ٧ و ٨ و ٩ و ٢٢٧ ب ٧ و ٨ و ٩ بابەتی شیعرەکان ئائینییە و مەولەوی لە موغەننی داوا دەکات کە هاودەنگی شیعرەکانی بێت:

دامنەکەی ئاییر دەروونم تۆنی　　　　وەی دوو فەردەوە موغەننی کۆنی

یاڕەبی ئەو شەو تاریکەی فانی　　　　هەر تۆ وە کەردەی بەدیم مزانی

یای سوبح مەحشەر سەرئەفکەندە وێم　　　　شەرمەندەی حوزوور خوا و بەندەوێم

(مەولەوی: ١٢٨، ب ٧ و ٨ و ٩)

لە شیعرەکانی دیکەدا پەنا بۆ موترێب دەبات. ناوی بڕێک لە دەسگا مووسیقیە ئیرانییەکان دەبات وەکوو نەغمەی شانازی، پەردەی حیجازی، ناوی بەزمەکان وەکوو سەحەری، چەمەری، دیلان، لاو هەی لاو. وشەکانی دیکەی ئەم بەستێنە وەکوو: کۆک کردن، زیڵ و بەم، مەقام، سەما، ئاهەنگ، لێدەر، باوەر وە دەنگ، تالیمدەر.

لە شوبهاندنەکاندا، دەنگی ساز و شێوازی ڕواڵەتیانی لەبەر چاو گرتووە. وەکوو: سەمتوور بە سینە، تاس بە سەر، لوولە بە ئیسقان، گوێ بە تەپڵ. بە دۆستان و ئەهلی مەعریفەتی ڕادەسپێرێ کە وەکوو: دەف بن ڕوویان لە یاران بێت.

دەف ئاسا بەو سۆز ناڵە و سەداوە　　　　ڕوو ئەو یاران بۆ، پشت ئەو دماوە

(مەولەوی: ٣١٩، ب ٧)

لە هەر شیعرێکدا پەژارە و ماتەمی شاعیر زۆرتر بووبێت، سازەکان بە دەنگی دڵڕفێن هاودەنگی لەگەڵ دەکەن. بە موغەننی و موتریب ڕادەسپێرێ کە ئۆرکیسترێک ساز کەن تا یەکێ دوو شیعری ئەو بخوێننەوە وەکوو شیعری «مەولەوی: ٢٣، ب ١٢ تا ١٣» و «مەولەوی: ١٢٨، ب ٧ و ٨ و ٩».

لە ڕاستیدا مەولەوی خۆی هەموو سازەکانە، قامەتی کەمانە، ناڵەی نەیە، ئێسقانی لوولە. ئاواتی ئەوەیە کە سەفەری ئاخرەتیشی لە سایەی دەف و نەیەوە بێت.

### ٢-٢-٢- زانستە ئائینییەکان

زانستە ئائینییەکان پانتاییێکی بەربڵاوە دەگرێتەوە؛ وەکوو: کەلام، فێقە و عیرفان. مەولەوی کەسایەتیەکی ئائینییە و بابەتی سەرەکی شیعرەکانی عیشق و عیرفانە. هەموو جیهان لە دەلاقەی عیشق و عیرفانەوە لە لای ئەو جوانترە. لە باسی خواناسی و هەندێ زاراوەی عیرفانی وەکوو فەنا، بەقا و سەحو، تا دەسنوێژگرتن و تەلاق و نییەت کردن و فتوادانی مامۆستاکان دەگرێتە بەر. عیرفانی مەولەوی لەگەڵ سروشتدا تێکەڵە، بۆیە بە باشی لێی تێئەگەین. سەروەری شیعر بە سەر سروشتدا ئەمەیە کە ئەگەر سروشت، شتێک بە هەست و بەردەستە، ڕاستەقینەیە و دوور لە هەست نییە. شیعر ئەڵێی هەم بەرهەست و بەردەستە و هەم نییە هەم ڕاستەقینەیە و هەم دوور لە هەست، هەم مەلەکووتیە و هەم نییە (براهنی، ١٣٧١: ٦٢).

عیرفانی مەولەوی تیکەڵ بووە لەگەڵ سروشتی کوردەواریدا، بویە وەکوو سروشت دیار و بەرچاوە. سۆفیگەریەکەی نە ئەوەندە لە زەوی دوورمان دەخاتەوە کە لێی تێنەگەین، عەشقەکەشی ئەوەندە تێکەڵ بە ژیانی خاکی و زەوینمان ناکات. بە تەرتیبی فەراوانی وشەکان، کەلیمەکانی ئەم بەستینە ئەمانەن[١]:

---

[١] - **وشەکانی بەستێنی ئائینی ٧٢ جۆر و ١٢٥ جار دووپات بووەتەوە:**

قیامەت- دوزەخ- خودا- مەحشەر- قەزا- دوعا- دین- بەهەشت- میحراو- مزگی- حوران- گونا- وزو- تەکبیر- نما- ئیفتار- ڕەمەزان- نەزروفتو- جەماعەت- مرحبا- فتوا- قەدەر- بەقا- فەنا- عەید- تەواف- قیبلە- تەراوێح- قەزا- ڕەحمەت- کەعبە- خوف و ڕەجا- هیدایەت- سفات- مەلا- ئەلست- ڕەحمەت- های هیلال- دەرگای قەبوول- نییەت- ئیمامەت- مەندیل (عمامە)- قد قامەت- قیام- ڕەزا- تەلاق- عەتا- شەهید- فەرز- تەزبێح- نمازخانە- زیکر- ئیستیغنا- الله الکبر- شەهادت- مەعسیەت- نەفس- زات- حەق پرستی- بەندە- تەعویز- جینان- سوبحان- ڕەسوول- موناجات- ڕیحانە ڕەسوول- بەتوول- مورتەزای علی- ڕۆچە- فەیز- تەجەلی- زاتی- عیلم- مەلەکووتی- جەبەرووت- غەفوور- عاشوورا- کربلا- یزید- حسین- محرم- سجود- کەریم- جەژن- کافر- جمال- جەلال- بسم‌الله- ڕەببانی- قەسەم- والسلام- والله شەفیع- یا خەلیل-

قیامەت، دوزەخ، خودا، مەحشەر، دین، قەزا، بەهەشت، مزگی، میحراو، نما، وزوو ... .

یەکێک لە جوانکاریەکانی کاری مەولەوی کەش‌وهەوای یەک‌دەس و ڕێک‌وپێکی شیعرەکانیەتی. لە زۆربەی شیعرەکانیدا تەناسوبێکی زانایانە لە خولگەی ستوونی شیعرەکەدا لەبەر چاو گیراوە. ئەم خاڵە بووەتە هۆی سامانی زۆرتری شیعرەکانی.

بۆ وێنە لە شیعری «مەولەوی: ٤١١» شاعیر زەماوەندێکی کوردەواریمان بۆ وەسف دەکات لە بەیتی یەکەم تا ئاخری شیعرەکە هیچ وشەیەک لە بەستێنی وشەکانی ئائینی و ئاگر کە خەم وە بیر دەخاتەوە نابینین. کەش و هەوای شیعرەکە شاد و دنیایی و نزیک بە هەستە؛ بە وردبینییەکی مەولەویانەوە. یان لە شیعری «مەولەوی: ٣٢٠، ب: ٢ تا ٦» شیعر بە وشەی «عاشوورا» دەست پێدەکات و بە سەربڕینی "ئیمام حسەین" تەواو دەبێت. وشەکانی موحەڕڕەم، کەربەلا، یەزید، زیاد، حسەین، سەر، لاشە، ڕۆ، پەیوەند و تەناسوبێکی ستوونی لە نێوان هەموو بەیتەکانا خولقاندووە.

### ٢-٢-٣- پزیشکی و دەوا و دەرمان

شاعیر لەم دیوانەدا ناوی ١٥ نەخۆشی دەهێنێت و دەرمانی هەندێکیشان دیاری دەکات. نەخۆشیگەلێ وەک: هەلامات، ماخۆلیا، گلاراو، ئێسقان‌شکاو، زەردوویی، لوولی، شەیدایی، سەودایی، ئاوڵە، کەسیفی، تەبخاڵ، زام، مارگەزین. بەلام خۆی بە دەس نەخۆشینگەلێ وەک ژانەسەر، ئێشی ئێسقان، هەناسە تەنگ بوون و ماندوو بوونی لە ڕادەبەدەر و لە ژوور هەموویانەوە بە دەست نەخۆشینگەلی چاوەوە ئەناڵێنێت.

کوێربوونی مەولەوی کە بە هۆی نەخۆشینەوە وردە وردە لە ئاوکردنی چاوەوە دەستی پێکردووە و پاشان چاوەکانی چلکی کردووە و بەرە بەرە لێلایی داهاتووە و لە بینین کەوتووە. شایانی باسەکە لە ڕووی نیشانەگەلی نەخۆشینی چاوی مەولەوی کەوا لە شیعردا دیارە، ئەتوانین بەرودوا کەوتنی مێژووی هەندێ لە شیعرەکانی ڕاست بکەینەوە.

شاعیر بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی زەردوویی، ماسی و بۆ هەلامات، بخووری هەناری پیشاو و بۆ یەک گرتنەوە و جۆش خواردنی شکانی ئێسقان، جۆرە مۆمێک دیاری دەکات و «مەرهەم سێڵ» و «فتێڵە»ش بۆ چارەسەرکردنی برینەکان دەسنیشان دەکات. ئەم نموونانەش ئەو ڕاستیە دەردەخات کە مەولەوی تا ڕادەیەک سەری لە پزیشکی دەرچووە و ئاگاداریی باشی لەم بوارەدا هەبووە.

مەولەوی هەموو ناشیرینییەکانیشی بە جوانی بینیوە. تەنانەت بلۆقە پڕ لە کیم و زووخە ناشیرینەکانی دەم‌وچاوی هاوڕێکەی (شێخ عەزیزی جانەوەرە) کە بە هۆی نەخۆشی ئاوڵەوە پەیدا بووبوون بە ئاوی ژیان دەچوێنێت (مەولەوی: ٤٩٦: ب ١٥).

---

کەریمان- حەجەردا- پێغەمبەر- حەرەج- منارە- پرهیزگاران- ڕووزەداران- تەقدیر- حەرام- هوو- ئەزەڵ- ئیمان- قەدیمەن- واجب- شەریعەت- ماشەلله- حەنەفی- زاهید- تەقوا- زەواری- غیلمان- سبحان‌الله- عەزرائیل- دەسودیم

### ٢-٢-٤- فەلسەفە و لۆژیک و سەرف و نەحو و ئەستێرەناسی

ئاماژەکردن بە ناوی زۆر کتێبی سەر بەم زانستانە لەو شیعرانەدا کە بۆ هاوەڵانی زانا و خوێنەواری خۆی هۆنیوەتەوە، ئەم ڕاستیە دەخاتە ڕوو کە مەولەوی بەشی هەرەزۆری کتێبگەلی ئەم بوارەی بە باشی خوێندووەتەوە. وەک کتێبی: متۆل، «مختصر»، ئاداب، «کشف‌الغطاء»، عەتای دولتین، زانستی چەقمینی، هەروەها وردەکاری زمانەوانی شیعری بە بابەتگەلی زانستی سەرف و نەحوەوە ئەنجام داوە، بۆ نموونە دەڵێت:

ئازیز جە دووریت تەن بی کەلافە　　　ڕۆح بی وە تەنوین، حاڵ ئیزافە

کە ئاماژەیە بە تیاچوونی تەنوینی وشەی عەرەبی لە کاتی درانە پاڵ وشەیەکی تر و کینایەیە لە مردن.

لە زانستی ئەستێرەناسیشدا وشەگەلێکی بە کار هێناوە. وەکوو بورجی شەرەف، ستارەی تاڵە، ئەوج بورج، قەلبولئەسەد، هەفت تار، خورشید، مانگ، ئاسمان.

### ٢-٢-٥- چیرۆک و بەسەرهاتە بەناوبانگەکان

مەولەوی لە دیوانەکەیدا بە شێوەی «تەلمیح» ئاماژەی بە ١٧ چیرۆک کردووە. لە سەرەڕای داستانە قورئانییەکان گرنگی‌دانی شاعیر بە کەسێتی‌یەکانی داستانگەلی ئێرانی وەک: «جەمشید، کیخسرو، سەلەم و توور، دارا، بارام گوور، مەحموود ئەیاز، شیرین و فەرهاد» شایانی تێڕامان و بیر لێکردنەوەیە. داستانە ئایینییەکان وەک داستانی حەزرەتی ئیبراهیم، یوونس، یووسف، یەعقووب، سلەیمان و خزر وە کەسانی تری وەک ئەسکەندەر و حاتەمی تایی و داستانگەلی عاشقانەی دڵداری وەک لەیلێ و مەجنوون و وامێق و عوزرا، شەم و وەلی دێوانە. شاعیر لە ڕێگەی وشەگەلێکی کەمەوە زیاد لە ١٧ چیرۆکی بە ناوبانگمان وەبیر دێنێتەوە و لەم ڕێگەیەوە جۆراوجۆر بوون و هەمەڕەنگ بوونێکی جوان لە بەرهەمە شیعریەکانیدا بەدی دەهێنێت. شایانی باسە کە شاعیر داستانی لەیلێ و مەجنوون زیاتر لە هەر داستانێکی تر لەگەڵ بارودۆخی خۆیدا بە کۆک و تەبا دەزانێت.

### ٢-٣- فەرهەنگی گشتی

مەولەوی جگە لە زانستە تایبەتیەکان، ئاگاداریەکی تەواو و پڕاوپڕی لە کولتووری گشتی هەیە و ئەم ئاگاداری و تێژبینییە لە شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. بەو پەڕی وردبینییەوە بە چاوی ڕێز و حورمەتەوە دەڕوانێتە هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵگاکەی و ئەوان لەگەڵ شیعرەکانیدا و شیعرەکانی لەگەڵ کار و پیشەی خەڵکیدا تێهەڵکێش دەکات.

### ٢-٣-١- کار و پیشە

مەولەوی لە دیوانەکەیدا ئاماژە بە زیاتر لە ٣٠ کار و پیشەی جۆراوجۆر دەکات و ناوی ئامـرازی هەنـدێ لـەو پیشانەش دەبات و بەم شێوەیە هاوچەشن خوازی و جـۆرە تەناسـوبێکی بـێوێنـە دەخولقێنێـت. پیشـەگەلێ وەک[١]: بەرگ دوورین، بەنایی، جۆلایی، دارتاشی ناو دەبات و ئامرازگەلی پێویسـتی ئـەو پیشـانە (وەک: نـەی، مقراز، شاقوول، چەرخ، تەختە و گیرە) بە جوانی لەگەڵ شیعرەکانیدا تێهەڵکێش دەکات.

شاعێر لە لایەکەوە ئاماژە بە پیشە دزێو و سووکەکانی وەک کەللەبڕ (جەللاد) دەکات و لە لایەکی تریشـەوە پیشە و پلەی چین و توێژە بەرزەکانی کۆمەڵگا دەخاتە بەر باس کە هەندێک لەم پیشانە بـریتین لـە: قـازی، حەکیم، عالم، شاعێر و... .

### ٢-٣-٢- ژیانی کۆچەریانە و زاراوەگەلی سەر بە جوگرافی و کشتوکاڵ و ڕاو

هەروا کە ئاو و هەوای کوێستان و گەرمیان شوێنەواری تایبەتیان لەسەر دەروونی شـاعیر دانـاوە، دیمـەنێک لە ئاو و هەوای سازگاری کوێستان لە شـیعری مەولەویـدا بـە ڕووی خوێنـەر دەکرێتـەوە. وشـەکان لـە هـەر زەمانێکدا شێوازی واتای تایبەتی خۆیان هەیە و خـاوەنی پێناسـەی عـاتیفی تایبـەتن. زاراوە جوگرافیـەکانیش واتاگەلێکیان هەیە کە تایبەتە بە ناوچەیەکی دیاری کـراوەوە و لـە فەرهـەنگ و نـەریتی خەڵـکەوە سـەرچاوە دەگرن. چەند نموونەیەک لەم بوارەدا دەخەینە ڕوو: سەنگی بار، پێش‌بار، چێخ، کۆچ، هـەوار، ئـێلاخ، لـەیلاخ، تەڵمیت، خێڵ‌خانە، عێڵ، خەیمەکـەن، هەوارگـە، گـەرد و غوبـار، مەجمـەڵ، سـەرخێڵ، گـەرمیان، کـەژاوە، سیاماڵ، بارەبەر، مالات و حەشام، قەتارەی خێڵ، گەرمەسێر، ئیلات، ئیل‌بەیگی، قەبیلـە، قافڵـەچی، بنـەکدار، فەرسەنگ، مەنزڵگە، یاتاخگە، گەرمیان، کۆز، باربـەنی، بـەرپێچ. هـەروەها زاراوەگـەلێ وەک: پووشـانە، دانـاو، سیاساڵ، قڕان و... .

ئەم وشەگەلە ڕەنگی خۆماڵی بوون لە شـیعری مەولەویـدا تـۆختر دەکـەن و ئەمـەش یـەکێک لـە هۆکـارە جیاکەرەوەکانی شیعری مەولەوی لە شاعیرانی دیکەیە. ڕەنگ و بۆی خۆماڵی لە شیعردا دیاردەیـەکی نوێیـە. لە ئەدەب و وێژەی فارسیدا لە قۆناغی «نیما»وە دەستی پێکرد. بەڵام مەولـەوی چەنـدین سـاڵ پـێش "نیمـا" ئەم کارەی لە شیعردا ئەنجام داوە. وێنە و دیمەنە بەدیهێنراوەکانی ئەم بەشـە لـە بینراوگـەل و بیسـراوگەل و

---

[١] - **ناوی پیشەکان و ئامرازە پێویستیەکانیان ٣٠ جۆر هاتووە:**
گولاوگیری:(گۆل- قازان)، خەیاتی- (میقراز- دروومان- نەی)، پارچەبافی:(چەرخ- تای تانتە- دار- لەتـەرە- تـای کـرژ- دووباد کەردە- بوورازو)، بنایی:(خشت- هوسای- تای شاوڵ- بنچینە- عمـارەت)، جـۆلایی:(پـۆی خەیاتـە- دەس ڕێسـە- تەندە بێت- تاڵ- مەکۆگە)، نجاری:(تەختە- تاش- نەجار) گیر، ئاسیاوچی:(گەرد- ئارد- صەدای ئاسیاو- نەوبەت- دانـە- کەشت)، میعمار:(ئەساس- پایە)، مەسقەڵچی: (سەواد- ئاینە- مەشحەل، غەواض:(دانـە- دەریاچـە)، مـیراو: (سـەرجۆ)، جڵەوکێش، ڕەهنموما :(بەیدانی هیجران)، فەقی: تەلەبە:(تەدریس)، ئیمام:(مزگی)، شاعیر، عالم، موغەننی، ساقی، نـەیچی، کێشکچی، کەللەبڕ:(جلاد)، سەرکار پاشا، سەر کۆمار، نەدیم، حەکیم، تەبیب، شێخ، قازی، سوفی، عابید، ئاهینگـەر، عەلامـە، تیجارباشی، ئوسای بلووربەند، پارچەفرۆش، مەلا.

ئەزموونە ڕاستەوخۆکانی ژیانی مەولەویەوە سەرچاوە دەگرێت و یەکێکە لە بوارگەلی داهێنان و جوانخوازی لـە شیعری ئەودا.

### ٢-٣-٣- ڕاو

ڕاو، کە بریتیە لە بەرەنگاربوونەوەی مرۆڤ و سروشت، بەشێک لە ژیانی پێشنیان بـووە، هەنـدێ جـار لەبـەر ناچاری یا بۆ دابینکردنی خواردەمەنی و هەندێ جار بۆ ڕابواردن. وشەگەلێک کە کەش و هەوایەکی *حەماسـی* دەخولقێنن، لەگـەڵ وشـەگەلی ئـەم بـوارەدا دیمەنگـەلێکی سـەرنجڕاکێش دەبیـنین کـە کـەش و هـەوای شیعرەکان بە تەواوی دەکەنە *حەماسی* و کارامەیی شاعیر لەم بوارەدا دەخاتە ڕوو. وشـەگەلێکی وەک: پێکیـا، تەقیا، پارێزگا، نەچیرگا، سەیاد ، تورڕداو، جاسووسـگەی مـەلان، دووهاچـەی چـەتاڵ، ماشـە، پـێڵ، ئەساسـەی نەچیر، ڕەزن مادەنیی کانی، دام دوو بادە، کەڵ ڕەمان، زاراوەی: هـەزارە کـەردە، مووسـەوی سـەرتەڵ، نـاوی جۆرەکانی تفەنگ وەک: ماردۆمان، شەستتیر، شەش خان، تفەنگ، خارای خانـان تـاق، قـووڵ لـوول وەردە. دواپین زاراوە لە ناوگەلی تفەنگدا، لایەنێک لە وردبینی و زانایی مەولەویمان لـە بـواری زمانناسـیدا بـۆ ئاشـکرا دەکات. تەبایی و کۆک بوونی «*واج*»ەکان لە پاڵ یەکدا دەنگێک بەدیدەهێنێت کە ئەوپـەڕی تـەبایی لەگـەڵ ناوەرۆکی وشەکەدا هەیە و یەکێکە لە بە نرخترین جۆری مۆسیقا لە شیعردا. «تاق» دەنگی تـەقینی گوللـەمان بـیر دەخاتـەوە و مەبەسـتی شـاعیریش هـەر هـەمان تفەنگـە. تـەبا بـوونی دەنـگ و واتـا (*صـدا معنـایی* - Onomatopoeia) لە زۆربەی دەستەواژەکانی دیوانی مەولەویدا بەرچاو دەکەوێت و یـەک بـوونی شـێواز و ناوەرۆک دەخاتە ڕوو. ئەم کارە پێویستی بە لێهـاتوویی و بلیمەتیـەکی لـە ڕادەبـەدەر لـە زمانناسـیدا هەیـە و مەولەوی پسپۆڕی خۆی لەم بوارەدا سەلماندووە.

### ٢-٣-٤- لەشکری بوون

هەرچەندە بابەتی سەرەکی دیوانی مەولـەوی ئـەوین و عیرفـان (خواناسـین)ە بـەڵام وا دیـارە توخمگـەلی لەشکری بوون بەشێکی دانەبڕاوە لە شیعری لیریکی. وشەگەلێ وەک: تیر، خـەدەنگ، تیرئەنـدازی، لەشـکەر، سوپایی، تاس کڵاو، مەودای نەی، فەوج لەشکەر، دلێران، چل چەنگ، کەمان، پەیکان، پێکـان (کـار)، نەشـتەر، کێشکچی، زەنجیر.

### ٢-٣-٥- مامەڵە و بازرگانی و توخمگەلی

شاعیر زۆربەی واتاگەلی زەینی خۆی چواندووە بە وشە و زاراوەگەلی جیهانی بازرگانی و دونیـا بـە بازاڕێـک دەزانێت کە سەودا و مامەڵـەی مەولـەوی تیایـدا کەسـاد بـووە و لـە بـرەو کـەوتووە؛ بـۆ نموونـە وشـەگەلی دووکانچەی بەدەن، کاڵای گیان. زۆر جاریش ئاماژە دەکاتە دەنگ و بانگی وردەواڵەفرۆشەکان. ئـەم وشـەگەلە

لە دیوانەکەدا دەبینین: بازاڕ، سەرمایە، دووکانچە، نرخ، کالا، پوول، توجار، ڕاستە بازاڕ، های دیبا، ڕەواج، ناڕەواج، تجارەت، قوماش، کەساس، کارخانە.

### ٢-٣-٦- شتەکان

مەولەوی لە ڕوانگەیەکی شاعیرانە و بە هەستێکی ناسکەوە دەڕوانێتە شتەکان، بە جوانی لە شیعردا بە کاریان دەهێنێت. لە کاتێکدا کە زۆربەی ئەو وشەگەلە زووتر لە زمانی ئەدەبیدا بە کار نەدەهێنران.

هەموو شتەکانی دەورووبەری مەولەوی زیندوو و لە جموجوولدان، بە زیندوو زانینی شتەکان لە لایەنی مەولەویەوە سەرنجڕاکێشە. شاعیر چیرۆکی ژیانی مرۆڤ بە بابەتێکی عارفانە لە زمانی شووشەیەکەوە دەگێڕێتەوە (مەولەوی: ٤٢٢، ب ٣ تا ١٨). عەبدوللا پەشێو لە شیعری «کۆنگرەی شووشان»دا (پەشێو، ٢٠٠٦: ١٢١) بتلی شووشە دەهێنێتە قسەکردن هەتا دەرد و ژانێکی مرۆڤ بخاتە ڕوو. زۆر کەم ڕێ دەکەوێت شاعیرێکی ناوداری کورد بدۆزینەوە کە ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، خۆویست یا خۆنەویست لە ژێر کاریگەری مەولەویدا نەبێت. شتە ناوبراوەکان وەک: لەتەرە، کارد، مقراز، ئەڕڕە، شانە، دووربین، سەماوەر، قەلماسک، گاز، سووزن، شاقول، قەلەم، بادرەوشە، دیگ، قازان، فوارە، کەوش و... .

«شاعیر کەسێکە کە هەستی واتایی خۆی لە شتەکاندا جێگیر دەکات و لەم ڕێگەیەوە ژینگە دەورووبەری خۆی لادەدات و وەک مرۆڤ گیان دەکرێتە بەر شتەکان و لە ئاکامدا مرۆڤئاسا دێنە زمان و دەبنە خاوەن بیر و هەست» (براهنی، ١٣٧١: ٤٧).

### ٢-٣-٦-١- خشل و زیوەری ژنان

یەکێک لەم دەستە شتانەیە کە شاعیر بە وردبینییەوە شێوە و ناویان لە شیعرەکانیدا تۆمار دەکات، خشلگەلێ وەک: خرخال، پاموورە، لاگیرە، گۆشوارە، زەڕ زنجیر، سلسلە و بانیسەر، بەندەرزی و لاگیر، زەڕکلاو، خشلی نیوە ڕەنگ، موورە، شیشە (کە هەمان مووروووە). مەولەوی ئاگای لە هەموو سووچ و قوژبینێکی کەلەپووری گەلەکەی خۆیەتی؛ تەنانەت لە خشل و زیوەری ژنان، کە لەوانەیە لە ڕوانگەی پیاوانی ئایینییەوە تێڕامان و لێوردبوونەوەیان ڕەوا نەبێت، ئاگادارە. ئەم وردبینییە دەمانخاتە یادی شیعری «گەشتی هەورامان»ی مامۆستا گۆران و وەسفکردی ژنانی هەورامان، کە شوێنەواری زەوقی مەولەوی و وردبینییەکانی بە شیعری گۆرانەوە دیارە.

### ٢-٣-٦-٢- ناوی جلوبەرگە جۆراوجۆرەکان

وەک: زەرکلاو، شەدە، عەرەقچین، شەروالان، فۆتەی شۆڕ، جووراب، قەبای پشت ناتەواو، پاژنۆی گولەنگ چەنگ. بە شێوەیەکی گشتی ٥٥ وشە لەم کۆمەلەیەدا دەبینرێت و هەستیاری و وردبینی شاعیر لە بینین و بیستندا دەخاتە ڕوو.

### ٢-٣-٧- توخمگەلی دونیای پیاوماقووڵان (ئەریستۆکراتان)

هەرچەندە مەولەوی بە هیچ جۆرێک حەز لە کەش و هەوای پیاو ماقووڵان ناکات، بەڵام وا دیارە پەیوەندی لەگەڵ پیاو گەورانی ئەردەڵان و بابان و جاف یا خوێندنەوەی شیعری شاعیرانی تر وشەگەلی سەر بەم جیهانەی لە هۆنراوەکانیدا گونجاندووە.

ژمارەی ئەم وشەگەلە زۆر نین، وەک: کاخ، سیم قاڵ، زوڵف عەنبەر (عەترێکی تایبەتی چینی سەرەوەی کۆمەڵگایە) و چەوگان (یاریەکی پیاوماقووڵان بووە)، خەزانە، دانەی شەوچراغ. شایانی باسە کە زۆربەی ئەم وشەگەلە هەرچەندە لە سەرەتادا سەر بە هەرێمی پیاو ماقووڵانن، بەڵام بە درێژایی مێژووی شیعر بار و بنەیان بەرەو هەرێمی عیرفان و خواناسی پێچاوەتەوە و لەوێ نیشتەجێ بوون. وەکوو: جام جەم، پیاڵە، شەراب، بەزم. ئێمەش ئەم وشانە بە هاوڵاتی ئەو دەڤەرە لە قەڵەم دەدەین کە مەولەویش هەڵگری پێناسەی هەمان دەڤەرە.

### ٢-٣-٨- بەستێنی عاتیفە و ئیحساس

شیعرەکانی مەولەوی پڕن لە خۆشەویستی و سۆزی شاعیرانە، بەڵام مەرگی ئازیزان و ڕەنجی ژیان و هەستی ئاگرینی شاعیرانە، تەم و مژێکی ئەبەدی خستۆتە سەر زۆربەی شیعرەکانی مەولەی جگە لە «٢٨ شیعری لاواندنەوە» (قادر محەمەد، ٢٠٠٧: ١٤٧). خەمێکی فەلسەفی و عیرفانیش دەبینین، چۆنایەتی هەست و عاتیفەی مرۆڤەکان پێکەوە جیاوازە، هەروا کە کەسایەتیان جیاوازە (پورنامداریان، ١٣٧٤: ١٥٧). ئەو وشانە کە باری خەم لە سەر شان دەکێشن، زۆرن و هەرچێ ئازارەکە قووڵتر بووبێت وشەی زامدار زۆرتر بووە.؛ وەکوو دووری و هیجران کە ١٢٢ جار هاتووە یان خەم کە زۆرتر لە ٣٠ جار هاتووە. زۆرتر لە ٧٠ وشەی تەماوی و خەمبار لە شیعرەکاندا هەن کە هەڵمی خەم و پەژارە دەگەیننە گیانی خوێنەر؛ وەکوو: دووری، هیجر، جیایی، فیراق، خەم، مەینەت، خەفەت، زەحمەت، ماتەم، زام، ناکام، ناسوور، زگاری، زویری، ستەم، تاڵی، جەفا، ڕەنجوور، بێقەرار، ناڵە، زاری، ئاە، ئاخ، داخ، زووخاو، حەزین، دەرد، سەبووری، زەلیل، هوون، پەشێو، خەجڵ، سۆز، ئێش، نێش، پەژارە، فەقیری، حەسرەت، ڕیش، ناسۆر، شەرت و وەفا، تاقەت، ناز، جەور، گلەیی، خەیاڵ، بێدەماخ، کۆس، سزا، ڕەنگ زەردی، نەدامەت، مەرگ، مەردەن، دڵتەنگی، زەهر، خەستە، موشکڵ، قین، غەریب، وەی ڕۆ،، چەمەر، بەڵا، مەرگ، ئەجەل، پیری.

### ٢-٣-٩- ناوە تایبەتیەکان و ناوی کەسایەتیەکان

لە دیوانی مەولەویدا ناوی چەند شار و کێو و ڕووبار و کەسایەتیە ئائینی و زانستیەکان هاتووە. ڕەنگە ئەمە ڕێژەیەکی سەرنجڕاکێش بێت کە لە ٣٦ ناوی تایبەتی ٢٢ یان ناوی ئەو شار و گوند و ڕووبارانەن کە لە

ئێراندان. وەکوو شارەکانی: زەهاو، بانە، مەریوان، ئەردەڵان (بۆ شاری سنە) گوندەکانی، خانەگا، نەجاڕ، بێساران، مەولاناوا، ڕێژاو، زەردە، یاران، پیران، هەزارکانیان و ناوچەی سارالّ.

کێوەکانی: ئاتەشگا، بیستوون، ئاربابا، ئاویدەر، دەماوەند، ڕووباری سیروان و ناوی حافێز. ئەوانی دیکە ئەمانەن: مووسڵ، مەدینە، بەغدا، تانجەڕۆ، زەڵم، قولەی قەزاڵە، کۆی دوجەیل، ئەفلاتوون، مانی، دەجلە، ناوی کەسایەتیە ئائینییەکان وەکوو غوث‌الاعظم، عەبباس و عەلی.

**٢-٤- وشەسازی**

مەولەوی پێداگری لەسەر ئەوە ناکات کە هەموو وشەکانی دیوانەکەی هەورامی بن. ژیانی فەقیەتی و سەردانی زۆربەی شار و گوندەکانی کوردەواری و هەروەها، دەرس خوێندن لە مزگەوتەکانی سنە و سلێمانی و هاودەنگی لەگەڵ فەقیەکانی دیکە بە زاراوگەلی جۆراوجۆر، وای لە مەولەی کردووە کە ئاگاداری زاراوەکانی دیکەی زمانی کوردی بێت.

خۆی هەورامی نەبووە، زۆر حەزیشی لە زمانی فارسی کردووە و عەرەبیش وەکوو زمانەکانی دیکە مومێک بووە لەبەر دەستیدا بۆ دەوڵەمەندکردنی بەرهەمەکەی. جگە لە وشەی هەورامی، عەرەبی و فارسی و سۆرانیشی بە کار هێناوە. بڕێ جار لە نێوە دێڕێکدا (یەک میسرەع) تەنیا یەک وشەی هەورامی هانیوە ئەوانی دیکە فارسین.

کاو جە دوری من چ تەورەن حاڵش　　　　کێ بەرمەکەرۆ خەم نە خەیاڵش

(مەولەوی: ١٤٥، ب ٥)

کاو= کورت کراوی «کە او» کە فارسیە. تەنیا. جە= بە مانای لە و ـَن کاری هەورامی هاتووە.

چ تەورەن حاڵش = حاڵی چۆنە.

بڕێ جار لە پاشگرێکی باو لە زمانی فارسیدا وەکوو «ئەنگیز» و «خێز»، وشەیەکی تازەی دروست کردووە کە ئەو وشە نە لە زمانی فارسیدا بووە نە لە زمانی سۆرانی و هەورامی؛ بەڵکوو دەسکردێکی زانایانەی مەولەویە و بەس. وەکوو پاشگری «ئەنگێز» لە وشەکانی: مهرانگیز و شگفت‌انگیز.

مەولەوی، خیلاف ئەنگیز (دیوان: ٤٥، ب ٣)، گەرمی ئەنگێزت (مەولەوی: ١٢٥، ب ٣) و تەم ئەنگیز و دەردینان‌خێز، دروست دەکات.

نامەی ئاییرین گەرمی ئەنگێزت　　　　دووی پووشەی جەستەی دەردینان خێزت

(مەولەوی: ١٢٥، ب ٣)

یان پاشگری «زدە» لە وشەگەلێ وەکوو «آفتاب‌زدە و آفت‌زدە» کە مەولەوی، خەمزەدە (مەولەوی: ١٣٥، ی ٢ و ٢٤٠، ب ٩) و هەڵۆزەدە و زامزەدە دێنی.

خەم زەدەی، خەم‌کێش ، خەفەت‌بارەنان　　　　بەری جە یاوەر، دوور جە یارەنان

(مەولەوی: ١٣٥، ب ٢)

کورت کردنەوەی ڕستەیەکی کینایی لەیەک وشەدا. پاشگری «انداز» بە مانای «لەبەر چاو کەوتن» لە زمانی فارسیدا بە کار هاتووە. وەکوو کنایەی «از چشم کسی افتادن»: لەبەر چاو کەسێ کەوتن. مەولەوی ئەندازەی هێناوە کە انداز پاشگرێکی فارسیە. شاعێر لەم پاشگرە ئاوەڵناوێک تازە دروست دەکا کە پێشتر نەبووە. وەکوو:

الف - «نەوای کەژاوەی لەیلێ ئەندازان» (مەولەوی: ٤١٦، ب ٢) دەنگی کەژاوەی ئەو خۆشەویستانە کە ئەوەندە جوانن، جوانی لەیلێ لەبەر چاو دەخەن.

ب - «گاهێ ڕووو وە ڕووی لەیلێ ئەندازان» (مەولەوی: ٤٢٢، ب ١١) .

- برێ جار شاعیر بە پێی پێویستی قافیە، وشەیەکی تازە دروست دەکا کەوا پیشتر لە زمانی هەورامیدا نەبووە؛ وەکوو «مفامیاوە» کە لە زمانی هەورامیدا نییە.

مدیای گا پێچ وەرد گا منامیاوە جارجار جە ناڵەش مفامیاوە

(مەولەوی: ٤٩٨، ب ٣)

یان پاشگری «بێز» لە کاری بێزیا (لەبەر چاو کەوتن و بێزاری) لە بێز وشەگەلێک وەکوو «سۆمابێز، بەیزابێز، ڕێحانبێز و هەواربێز، ئیستیفابێز»ی دروست کردووە. بە تەرتیب بە مانای ترووکایی لێ بێزراو، ڕەنگی سپی لێ بێزراو، خەتی ڕێحان لێ بێزراو.

ئەو تانەی دیدەی سۆمابێزمەن ئید دانەی ئەسرین وەتاو ڕێزمەن

(مەولەوی: ٥٣٥، ب ٤)

یان لە شیعری:

ساقی ئاوەردە و گرد کیاستێنین وریا بەردێن و کردە ئاستێنین

(مەولەوی: ٢٩١، ب ٢)

«کیاستێنین» بە مانای «ڕەوانە کراو» ئاستێنین بە مانای «بە جێ ئەمێنێ».

کیاست —َن هەورامیە و برکەی ناوەڕاستیش سۆرانییە. لە «ئاستێنین»یش هەروەها.

برێ جار بە پێی ڕێزمانی عەرەبی کە، ناو و ئاوەڵناو پێکەو تەناسوبیان هەیە ئەم ڕێزمانە لە هەورامیشدا ئەباتە ڕێوە. وەکوو چێهرە ئیلاخان.

بۆی بێوەفاییت چون بۆی وەرزاخان مدۆ نە دەماخ بەختان ئیلاخان

(مەولەوی: ٣٨، ب ٦)

ژمارەی ئەو وشە تازانە لە دیوانی مەولەویدا کەم نین، هەروەها شێوەی سازکردنیشیان جۆراوجۆرە. لەم وتارەدا تەنیا ئاماژەیەک کورت بۆ برێک لەو وشانە کراوە.

### ٣- پوختە

خوێندنەوەی وردی دیوانی مەولەوی و شەنوکەوکردنی (جیا کردنەوەی، دەرهێنانی) وشەکانی لە بوارە جیاوازەکاندا بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە:

١- شاعیر لە بواری ئامرازی قسە و وتەدا زۆر لێهاتووە و کارامەیی و سەلیقەیەکی بەربڵاوی لە بە کارهێنانی زماندا هەیە.

سەرچاوەی وشەگەلی شیعری ناوبراو زۆر فراوان و بەربڵاوە و لە سروشتەوە بگرە -کە یەکێکە لە فراوانترین بوارەکان- تا دەگاتە زانستە جۆراوجۆرەکان و دابونەریتی گشتی و زاراوەسازی لە خۆ دەگرێت.

ئەم وردەکاری و کارامەییە لە بە کارهێنانی وشەکاندا، زیاد لە داهێنان لە کەش و هەوای شیعردا، نیشانەی ناسکی خەیاڵ و لێهاتوویی شیعری مەولەویە. ئاگادار بوونی لە ڕادەبەدەر لە ڕووداوگەلی ژینگەی دوور و نزیکی، بووەتە هۆی ئەوەی، لە بابەتە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکانەوە بگرە تا زانیاری لە بواری ئایین و ئوستوورە و فەلسەفە کەڵک وەربگرێت. وشەدانی شیعری مەولەوی گۆڕەپانێکی بەربڵاوە کە ئەزموونە تایبەتیەکانی هەموو قۆناغەکانی ژیانی تێیدا ڕەنگی داوەتەوە و هەموو ئەمانە شیعری ئەوی لەم پێناسە جوانە نزیک کردووەتەوە کە: «شیعر ئاشکراکەری باشترین و بەختیارترین ساتەکانی بەختەوەرترین و باشترین هزرەکانە».

شاعێر سەرەڕای تێڕامان و خوێندنەوەی قووڵ، زۆر جار پەنا دەباتە بەر زاراوەسازی و لەم بوارەشدا زۆر سەرکەوتووە.

## سەرچاوەکان


1. براهنی، رضا (1371) **طلا در مس**، تهران، ناشر (نویسنده).
2. پورنامداریان، تقی (1374) **سفر در مه**، تهران، انتشارات چشم و چراغ.
٣. پەشێو عەبدوڵلا (٢٠٠٦) **هەسپم هەورە و رکێفم چیا**، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە.
٤. تاوەگۆزی، سیّد عبدالرّحیم (١٣٨٦) **دیوانی شـیعر**، کۆکردنـەوە و لێکۆڵـینەوەی مـەلا عەبدولکـەریم مودەڕڕس، سنە، ئینتشاراتی کوردستان، چاپی پینجەم.
5. دیچز، دیوید (1366) **شیوەهای نقد ادبـی**، ترجمـەی غـلام‌حسـین یوسـفی و محمّـدتقی صـدقیانی، تهـران، انتشارات علمی.
6. شفیعی کدکنی، محمّدرضا (1380) **ادوار شعر فارسی از مشروطیّت تا سقوط سـلطنت**، تهـران، انتشـارات سخن.
7. ......................، **صور خیال در شعر فارسی** (1375) تهران.
8. فرشیدورد، خسرو (1363) **دربارەی ادبیّات و نقد ادبی**، تهران، جلد اوّل، انتشارات امیرکبیر.
٩. قادر محمّد، انور (٢٠٠٧) **لیریکای شاعێری گەورەی کورد مەولەوی**، سلێمانی چاپی سێهەم.
10. معین‌الدّینی، فاطمه (1374) **گزیده چهار مقاله نظامی عروضی**، نشر قطره، انتشارات قطره، تهران.

گرافی ڕێژەیی فراوانی وشەکان لە بەستێنی زانستدا

**گرافی ڕێژەیی ماکەکانی سروشت لە بەستێنی وشەکانی دیوانی مەولەویدا**

**گرافی ڕێژەیی لە بەستێنی فەرهەنگی گشتی لە دیوانی مەولەویدا**

گرافی ڕێژەیی موسیقاژەنەکان لە دیوانی مەولەویدا

گرافی ڕێژەیی گیانەوەران لە دیوانی مەولەویدا (٢٩ جۆر)

گرافی ڕێژەیی وشەکان لە بەستێنی ئائیندا (٧٢ وشە و ١٢٥ جار دووپات بووەتەوە)

## گرافی ڕێژەیی فراوانی ئامێرەکانی موسیقا لە دیوانی مەولەویدا (١٧ ساز)

# تەکنیکە هونەرییەکانی دیالۆگ
# لە کورتە چیرۆکە کوردییەکانی نێوان ساڵانی ١٩٢٥ — ١٩٥٠

د . مەریوانی عومەر دەوڵەت[١]

**کورتە:**

ئەم وتارە ئەیەوێ کە ئەم بابەتانەی خوارەوە وەک دەرەنجام بسەلمێنێ:

١) یەکێک لەو دەرئەنجامە ڕۆشنانەی توێژینەوەکەمان، پەیبردنە بەو بەکارهێنانە نوێیەکە چیرۆکنووسانی ئەودەم، وەک تەکنیکێکی هونەری لە نێو ئەزموونی چیرۆکنووسیدا بەکاریان هێنابێ (دیالۆگ) بەگشتی و جۆری «دیالۆگی دەرەکی»یە بە تایبەت؛ هەروەها یەکەم گاڤێک لەم بوارەدا دەگەڕێتەوە بۆ چیرۆکەکەی «هاوارهەبە گازی ل دوویە»یە، کە لەلایەن« قەدریجان»ەوە نوسراوە و لە ژمارە ١ی گۆڤاری هاوار لە ١٥/ ٥ / ١٩٣٢دا بڵاوکراوەتەوە. خودی ئەو تەکنیکەش گوزارشت لە دوو لایەنی ژیان و دوو کارەکتەری ڕۆشنبیری و جڤاکی دەکرد.

٢) لە دیالۆگی ئەزموونی کورتە چیرۆکی ئەو سەردەمەدا، یەکەم تەکنیکێکی نوێ کە بەکارهاتبێ ئەو جۆرەیە کە پێی دەوترێت «مۆنۆلۆگ». کە ئەمیش یەکێکە لەو دوو جۆرەی کە تایبەتن بە تەکنیکی دیالۆگ و بە دیالۆگی ناوەکی ناودەبرێت. تا ڕادەیەک بواری بەکارهێنانی ئەم جۆرەی دیالۆگ، زێترە لەچاو دیالۆگە دەرەکییەکە، چونکە لە هەردوو ڕێگاکانی ئەزموونی چیرۆکنووسینی ئەو دەمدا بەکاردەبرا؛ واتە چ ئەوەی بە ڕێگا شیکارییەکە نووسرابێت، یان چ ئەوانەی کە بە ڕێگا نواندنییەکە نووسرابن. لەو چیرۆکنووسانەش کە پەنایان بۆ بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە بردبێ بریتین لە : د.کامران عالی بدرخان، قەدری جان، د. نورەدین زازا، پیرەمێرد، عوسمان سەبری و هتد.

٣) سەبارەت بە پاژی دووهەم، کە زمانی چیرۆکە و بە گشتی چیرۆکنووسانی ئەو دەم زمانێکی کوردی پاراو و پەتییان بەکارهێناوە کە هەموویان بەو دوو شێوە زمانە ئەدەبییە سەرەکییەی کە بە دیالێکتی کرمانجی ژووروو و خواروو دەناسرێت، نووسراون. لەپاڵ ئەو جۆرە بەکارهێنانەدا دەبینین زمانی چیرۆکەکان لە ڕووی شێوازەوە، هەروەکوو ئاماژەمان پێکردبوو، شەش شێواز یان زێتر دەگرنە خۆیان کە ئەمەش نیشانەی دەوڵەمەندی زمانی چیرۆکە لەو دەمەدا.

---

[١] زانستگای سلێمانی / کۆلێجی زمان /بەشی کوردی

٤) لە پاڵ هەموو ئەو تەکنیکە  نوێ و بەکارهاتووانەی کە ئاماژەمان پێکرد، لەزۆرینەی چیرۆکەکاندا چیرۆکنووسان  ئەدای کارەکتەرەکانیان تا ڕادەیەک وەک خۆی خستۆتە ڕوو؛ بەڵام ئەمەش بەمانای ئەوە نییە کە لەهەندێک لەو چیرۆکانە چیرۆکنووسانیان نەکەوتبنە نێو هەڵە و سەرلێشێوانەوە. هەڵبەت ئەو چیرۆکانەش کەمن و ژمارەیان سێ چیرۆکە کە ئەوانەش: بەرتەڤنا مەهفورا، ئەرخەوانی گردی سەیوان، لانەی ئەبدیمەندی ئینسان و نەسرینن. لەبەرامبەردا زۆرینەی چیرۆکەکان لەو بوارەدا  تاڕادەیەک بێ خەوش و هەڵە بوون.

**وشە سەرەکییەکان:** چیرۆک، چیرۆکنووس، ئەدەبی کوردی، دیالۆگ، شێواز

## پێشەکی:

یەکێک لەو بنەما سەرەکییانەی، کە بینای هونەری چیرۆکیان لەسەر ڕادەوەستێت، «دیالۆگ»ە بەهەردوو شێوەکانی: «دیالۆگی دەرەکی» و «دیالۆگی ناوەکی». دیالۆگ بە گشتی ئەو ئاخاوتنەیە لە نێوان کارەکتەرە مرۆییەکانی نێو دەقێکی چیرۆک یاخود شانۆنامەیە یان فیلمنامەیەکدا دەکرێت؛ واتە ئەو پرۆسەی بە یەک گەیشتنەیە کە لە نێوان دوو مرۆڤ یان زێتری کارەکتەرەکانی نێو چیرۆکێکدا بە گشتی ئەنجام دەدرێت، بە شێوەیەکی دی ئەو جۆرە دارێژراوە گوزارشت لێکردنەیە کە چیرۆکنووس لە داڕشتنی دەقەکەیدا پشتی پێدەبەستێت؛ لە کاتێکدا ئەم بنەمایە بە درێژایی ئەزموونی کورتە چیرۆکی ئەو دەممان بە بەراورد لە گەڵ زۆربەی ئەو چیرۆکانەی گێڕانەوە «سرد»ن .. کەمترە[1] بەواتە خودی ئەم بنەمایە یان ئەم ڕەگەزە سەرەکییەی چیرۆکی هونەری، شوینێکی کەمتری لە نێو ژمارەی ئەو کورتە چیرۆکانەدا گرتووە، کە لەو ماوەیەدا[2] نووسراون، ئەگەرچی دیالۆگ ئەو یەکەم ڕەگەزەبوو کە هەر زوو لە تەکنیکی نوێی چیرۆکی کوردی کاری بۆکرا و نموونەی ئەو نۆبەرەی چیرۆکەشمان چیرۆکەکەی «بەرتەڤنا مەهفووری»ی جەلادەت بەدرخان بوو (١٩٣٢) کە مێژووی نووسینەکەی لەلایەن نووسەر خۆیەوە دیاریکراوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٢٧؛ بەڵام لە بەر نەبوونی بڵاوکراوە، بڵاوبوونەوەکەی تا پێنج ساڵ دوا دەکەوێت، واتە بۆ ساڵی ١٩٣٢ بڵاوکرایەوە.

ئەو ساتانەش کە لە سیناریۆیەکدا یان چیرۆکێکدا، بە دیالۆگ دەخرێنە ڕوو، زۆر گرنگن. خودی دیالۆگ، ڕێکخەر و بەڕێوەبەری ڕێرەوی ڕووداوی چیرۆکە و سات بە سات بازنەکانی زنجیرەی ڕووداوی چیرۆک بەیەکەوە گرێ دەدات و بەشێوەکی نیمچە زیندوو و لە وێنەی نەوارێکی سینەمایی سیما و خەسڵەتی کارەکتەکان و دەوروبەری دەخاتەڕوو؛ بەپێچەوانەی «سرد» کە چیرۆکنووس توانایەکی سنوورداری هەیە لە خستنە ڕووی تەواوی سیفاتە دەرەکی و ناوەکییەکانی کارەکتەر، هەر لەم ڕووەوە «ئیبراهیمی یونسی» دەڵێت: «لە ڕاستیدا کە ورد دەبینەوە و دەبینین، هەموو ئەو قسەو باس و وتراوانەی کە هەن، ئاماژە بەوە دەکەن کە گفتوگۆ نیشاندەری بیرو تایبەتمەندی کەسە. ئاشکرایە کاتێک کە قسەکەر، لێزان و شارەزای شتگەلێکە، لەگەڵ شێوەی بیرکردنەوە و جۆری کارەکتەرەکەیدا ناگونجێ، بەڵام ئەمە خودی بابەتەکە نەرا ناکات؛ لە بارێکدا ئەگەر نووسەر بخوازێت چیرۆکەکەی زیندوو بێت، پێویستە کەسی زیندوو بخولقێنێ، لەگەڵ یەکدیدا بئاخفن و بجووڵێن. بۆ نموونە ئەگەر کارەکتەری داستانەکە، کارەکتەرەکی دەم بە هاوار و ئاژاوەگێڕ بوو، نەتەوێت هەروەک خۆی خستنە ڕوویەکی سادە و ڕەفتار و تایبەتمەندییەکانی کەسەکە هەر وەکوو خۆی بۆخوێنەران بخەیتە ڕوو، ئەوا بۆ ئەمە ناچاریت چەندین دێڕ تەنانەت چەندین لاپەڕە بنووسیتەوە و تا خوێنەرانت بە کارەکتەرەکە ئاشنا دەکەیت و ئەگەر سەرکەوتووش بیت لەم کارە، ئەوا مەیلێکی ئەوتۆ

[1] مەبەست ماوە یان مێژووی ئەو چیرۆکانەیە، کە کاری توێژینەوەی نامەکەی بۆ کراوە، واتە ١٩٢٥ – ١٩٥٠.

[2] مەبەست ( دیالۆگی دەرەکی )یە نەک ( ناوەکی – مۆنۆلۆگی ).

نادەیتە خوێنەر. ئەی کەوا بێت بۆ ئەم کارە دەبێ چی بکـەیت؟ ئایـا چـاکتر وانییـە هـەر خـۆی بخەیتـە نێـو چیرۆکەکە و بهێڵێت هاتوو هاواری خۆی بکات و بەو زمانە قەبەیەی خۆی بئاخفێـت و لـە قاڵـبی دەسـتەواژە تایبەتەکانی خۆی وتـەکانی ببێـژێ؟» (یونسـی، ١٣٨٤: ٣٤٩). کەواتـە ئـەرکی ئـەم ڕەگـەزە سـەرەکییەی چیرۆک بە گشتی ئەوەیە، کەواقعی کارەکتەری زیندوو بخاتە ڕوو و بازنەکانی پەیوەنـدی کۆکبـوون و نـاکۆک بوونی کارەکتەرەکانی چیرۆک بۆ بەرجەستەکردنی ڕووداو بخاتە ڕوو هەستکردنێکی ئاسـایی و واقیعییانـە لای وەرگر یا خود، خوێنەر دروست بکات، خودی ئەم ڕەگـەزە نەخشـێکی سـەرەکی هەیـە لـە بەرجەسـتەکردنی خەسڵەت و سیمای کارەکتەرەکانی چیرۆک. لەم ڕووەشەوە سـەبارەت بـە وێنـای کارەکتـەرانی چـیرۆک و دەرکەوتنیان، هەر دوو جۆرەکەی دیالۆگ لـە دەرخسـتی ڕوو و پێناسـی ڕاسـتەقینەی کارەکتـەرەکان، دەور دەبینێ و بۆ شرۆڤەکردنی ئەم ڕۆڵـەش، هـەردوو جـۆری بـەکارهێنراو (واتـە: دیـالۆگی دەرەکـی و دیـالۆگی لاوەکی) پەیوەندار بە ئەزموونی کورتە چیرۆکی ئەم قۆناغە دیـاری دەکـەین و تایبەتمەندییـەکانی دەخەینـە ڕوو.

### ١- دیالۆگی دەرەکی

ئەو ئاخاوتنەیە کە لە نێوان دوو کارەکتەر یان زێتـر دەکرێـت، بـە مەبەسـتی تـەواوکردنی ئـەو بازنەیـە کـە زنجیرەی ڕووداوی چیرۆک یان بابەتی چیرۆک پێکەوە گرێدەدات و هەر لە ژێـر بـەردەوامی ئـەم ڕەگـەزەدا، دەتوانین بیر و بۆچـوون و ئاراسـتەی هـزری و نـاخی دەروونی کەسـەکانمان بـۆ ئاشـکرا بێـت. لـە دیـالۆگی دەرەکیدا کارەکتەرەکان لە بەکارهێنانیاندا ڕاستگۆ نین و زۆر جار دەرگای درۆ و فێڵ و ڕیـا و و دوو ڕوویـی لـە کەسێتیدا کراوەیە و هەر لەم ڕێگەیەشەوە هەمیشە مرۆڤەکان لە بریتی کەسانی دی یان بەناوی ئەوانەوە قسـە دەکەن، واتە خۆیان لە بەرامبەرەکانیان دەگۆڕن و هەوڵی چەواشەکاری دەدەن .

لە ڕووی مێژووییەوە، دیالۆگ بە گشتی و دەرەکی بە تایبەت وەک ڕەگەزێکی هونەری لە ڕۆنـانی چیرۆکـی هونەریی کوردیدا تا ڕادەیەکی نزیک لەگەڵ ئەو مێژوویەی، کە چیرۆکی هونەریی کوردی تێدا لە دایـک بـوو، سەرهەڵـدەدات. دیـالۆگی دەرەکـیش وردە وردە لـە نێـو گاڤـە سـەرەتاییەکانی ئەزموونەکـەدا جێـی خـۆی وەردەگرێت، بەواتا ئەم ڕەگەزە ئیـدی ڕۆل و قورسـایی خـۆی دەبینێـت، بـەوەی چەنـد ڕەنـگ یـان چەنـد کارەکتەرێکی جیاواز دێنە نێو سەحنەی چیرۆک ئیدی بەمە تا کارەکتەری چـیرۆک لـە ڕووی ژمـارەوە زیـاد بکات، ئەوا دیالۆگە دەرەکییەکەش تێیدا ڕووەو بەهێز بوون چووە و خەسڵەت و سـیماکانیش لەوێـدا ڕووی لـە زیاد بوونکردووە. بەمەش تا ڕادەیەک ڕێ بۆ کزکردنی (دیـالۆگی نـاوەکی –مۆنۆلـۆگ )یـان شـەپۆلی هـۆش خۆش دەکات، ئەگەرچی مەرج نییە دیالۆگی دەرەکی ڕێگە لە دیالۆگی ناوەکی بگرێت، کەئەمـەش پەیوەنـدی بە توانای چیرۆکنووسەوە هەیە.

یەکێک لە ئەرکە سەرەکییەکانی دیالۆگی دەرەکی پەردە لادانە لەسەر باگراونـدی تێکسـت یـاخود جـۆری ڕەهەندی چیرۆکەکە بە گشتی و خودی دیالۆگی کەسەکانیش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ گوزارشـت لەسـیما

و تەنانـەت ئاسـت و هێڵـی هزرییـان دەکـەن و هـەروەها خەسڵـەت و شـێوە و پلـە و پایـەی کۆمەڵایـەتی قسەکەرەکان ئاشکرا دەکات.

«میر جەلادەت بەدرخان» لە چیرۆکی «بەرتەڤنا مەهفوورا»دا و لە دابەشـکردنی دیـالۆگی کارەکتـەرەکانی نێو دەقەکەی لایەک لە دیالۆگێکی ڕۆشنبیرانە دەخاتە ڕوو:

« -ما زیزێ تو نزانی کۆ خەباتا مە ژ بۆنا گەفۆیە، ژ بۆنا خوەندنا گەفۆیە.

- بەلێ ڕندێ چاوان نزانم، وەرنەبوو کەنگێ دێیامە ئەم ددان خەباتێ.

- نە خوە چرە دگری؟

- تۆ نابینی ئێدن ناگریم لێ تشتەکی، ما دنیا نە زڤستانە، بوهار و هاڤینا وا ژی هەیە. بـلا گـەفۆ ل هاڤـینێ بخوینە و ل زڤستانا تەڤدا ل مالێ ڕوونن، مانابە؟

- دبە زیزێ، لێ باڤا مە وەساندییە بلا گەفۆ زانا ببە، بزانە ڕێز کا دنیایـێ بگەرینـە، ژ بۆنـا وی ژی خوەنـدنا هاڤینێ تێر ناکە، دڤێت ل زڤستانا ژی بخوینە. دا کۆ زانا ببە.

- ما چرە ڕندێ ، ئەوەندە بخوینە، بلا قاسێ کەکێ مە زنار بخوینە نەبەسە؟

زانا بوون ژی، ژ بۆنێ چی؟

- ژ بۆنا وەلێت زیزێ...» (بدرخان، ١٩٣٢: ٣و٢).

بابەتی دیالۆگی کارەکتەرەکانی چیرۆکەکە لە دەوری پێداویستی خوێندن وخوێندەواربوون دەکـات، لەوێـدا دیالۆگ دراوەتە دوو منداڵ یـان دوو خوشـکی تەمـەن منـداڵ، بەواتـە چیرۆکنـووس هیـوا و ئـاواتی خـۆی و گەلەکەی داوەتە دەست نەوەی نوێ و لەوان دەگەیەنێت، کـە ڕێـی سـەختی خـەباتی ڕزگـاریخوازی گـەل و وڵات بە چرای ڕووناکی خوێندن ڕۆشن دەبێتەوە. لە نێو دیالۆگی هەر دوو کەسێتییەکە و لـە ڕێـی ئاخـافتنی هەر یەکێکیان کە کارەکتەرە ڕۆشنبیرەکەیە، خەسڵەتێکی دوو جـۆر کارەکتـەر دەردەکـەون، کـە یـەکێکیان خۆڕاگرانە و ڕێنوێنکەرانە دەنوێنێت و ئەویش «ڕندێ»[1]ی خوشکە گەورەکەیە و ئەوی دییـان کـە «زیـزێ»یـە منداڵترە و دەبینین بێتوانا و کەمحەوسەڵە و کەمزانە. ئاڕاسـتەی خـەباتی ئـەم دوو کارەکتـەرە لـە پێنـاو بـە خوێندەوارکردنی برا بچووکەکەیانە بەناوی «گەفۆ» کە نووسەر دەیەوێت لە ڕێی کارەکتەرەکانی چیرۆکەکـەوە ئەو وەک نەوەیەکی نوێی ئایندەی خوێندەوار بسازێنێ؛ کەواتە ئاواتی ڕۆشنی گەلەکەی داواتە دەسـت نـەوەی دواڕۆژ. لە چیرۆکی «خورشید»دا «نـورەدین زازا» بـەهۆی دیـالۆگی دەرەکـی تێکسـتەکەوە سـیما و جـۆری کارەکتەرەکانی خستۆتە ڕوو؛ جگە لە دەرکەوتنی کارەکتەری ڕۆشنبیری چیرۆکەکە کە لـە پـاژی دووهـەمی بەشی دووهەمی نامەکەدا ئاماژەمـان پێـدابوو، لەوێـدا لـە لایـەن کارەکتـەرەکی چیرۆکەکـەوە، کـە مـەلای گوندەکەیە، گوزارشت لە جوانی و گەنجبوونەوەی هەر ڕۆژەی خورشـید دەکـات، کـە کارەکتـەری سـەرەکی چیرۆکەکەیە:

---

[1] ئەگەرچی نووسەر لە خواروی چیرۆکەکەدا، سەری لێ تێکچووە و لە جێی ناوی خوشکە گەورەکە -کە زیزێ یـە- نـاوی ڕندێی داناوە بۆ زێتر ڕوون کردنەوە بڕوانە: دوا پاژی بەشی سێهەمی نامەکە.

«-تۆ هەر ڕۆژ خورتتر دبی: د ڕوویا ته ده نیشانێن خۆرتانیێ و ژینێ دخوەیین. ئەڤ ژ چیی؟
- بێ دەردم سەیدا، چما پیر ببم؟
- من دڤێ تۆ هەر وەبی. لێ بێژە، دیسا چیە؟
-من ژ کورێ خوه ره که چێ جامێرەکی خوەستیە، دەولەمەندە، پر پەرە خوەست، لیێ کورێ مـن یەکـە و ل بەر دلێ من بهایه ژ کەرەما خوە مەهرا وان ببرە..» (زازا،١٩٤١).

له دیالۆگی «مەلای گوند»ەکەدا له پاڵ وەسفدانی کارەکتەری بەرامبەر، هـەر لـە سەرسـووڕمانی خـۆی بـۆ جوانی خورشید بەو جـۆرە زمانـە کـە گوزارشـت لـە «کارەکتـەرەکی چـاوپیس» دەکـات و بەواتـە وەک لـە کارەکتەرەکی جڤاکی دەردەکەوێ، خەڵکیش لەو کەسـانە دەترسـن، هـەر بـەر جـۆرە کۆتـایی چیرۆکەکـە سەبارەت بە خورشید و تراژدیای خنکانی کوڕەکەی لێدەکەوێتەوە. بەواتە مەلا لەو ئاخافتنـەی یەکەمیـدا دوو جۆر ناساندن دەدا بەدەستەوە، یەکێکیان وەسفی گەنجێتی و جوانی خورشیدی کارەکتەری بەرامبەرە، ئـەوی دیش ئاشکرابوونی ناڕاستەوخۆی خۆیەتی بۆ خەسڵەتی کارەکتەرەکەی، که کارەکتەرێکی چاوپیسه.

له چیرۆکی «مـام پیـاو»دا، «حـوزنیموکریـانی» دیـالۆگی چیرۆکەکـەی، کـە لـە نێـوان بـراو خوشـکێک بەناوەکانی «پیرۆت»و «پەریزاد»و «گەوهەر»ی منداڵا که کچی پیرۆته ئەنجام دەدرێت. لەوێـدا چیرۆکنـووس له ژێـر سـێبەری دیـالۆگی کارەکتـەرەکانی وەسـفێکی جـوانی هەمـە چەشـنەی کارەکتـەرێکی ڕابـردووی کوردەواری نێو گوندەکەیان بـەناوی «مـام پیـاو» لەسـەر زاری هـەردوو بـراو خوشـکەکە، بەتایبـەت پـیرۆت دەخرێته ڕوو (حوزنیموکریانی، ١٩٤٤: ٢٦٣) که لەوێدا وەک چیرۆکێک بۆ کچەکەی دەگێڕێتەوە:

«پیروت: ڕۆڵه گیان! مام پیـاو بەشـەو پاسـەوێ، بـە ڕۆژ حـەمباڵ بـوو؛ جاروبـاریش ئـاوی کانیـاوی پـاک دەکردەوە. بەو هۆیەوە سەرمایەیەکی پیکەوە نابوو، بۆ خۆی دێهاتی بوو له گونـدان دادەنیشـت؛ لـە کێوەکـان ڕای دەبوارد، بو کرێکاری هاتبووە نێو شارەوە، زستانان بانگوشی دەکا.

چڵپاو دەڕیژێ، جاروبار کولەدار دەباته بازاڕ، له بەهاراندا گیاوگوڵ کۆ دەکاتەوە، هاوینان بەفرکێشی دەکـا و میوەی دارستانەکان کۆ دەکاتەوە. دوای نیوەڕۆیان خەنجەرەکه به بەرپشتیندا دەکا و دەچێته چایخانـەکان لا کورسیک دەگریت، هەتا ئێوارە بەخێویدا دەخوڕێ و قسـەی زل دەکـات؛ بـەڵام لەبـەر ئـەوە کـە هـەرچیکی بیفروشتبێ بەقەرزی دەدا، مشتریەکانی پارەکەیان نەدەداوە. دووکانەکەی نابود بوو گـڕی دا، ناچـار ئـەم جـار لەبــەردەمی دووکانــەکان بەســتەیکی دادەنــا وردەواڵــە فروشــی دەکــرد، شــەو پاســەوان و ڕۆژ حــەوزی کانیاوەکانیشی پاک دەکردەوە، بەو جورە نانی نەمرو نەژی دەستدەکەوت و گوزرانی پێدەکرد.

گەوهەر: لەوە پاش چی بەسەر مام پیاودا هات ؟» (حوزنیموکریانی، ١٩٤٤: ٢٦٦).

ئەوەی جێی سەرنجە، ئەم جۆرە لە دیالۆگ جیاترە له چاو ئـەو دیالۆگانـەیدی کـە کـورتتر و بواربـەخش بەواتە لێرەدا چیرۆکنووسی دیالۆگی کارەکتەرەکانی درێژ کردۆتەوە. ئەمجۆرە دیالۆگانەش زێتـر لـە دیـالۆگی ڕۆماندا دەردەکەون؛ واتە دیالۆگی کارەکتەر لە کورتە چیرۆکدا بەپێی مەودای چیرۆک کورت و بوار بەخشن .

لە چیرۆکی «جوتیار»دا چیرۆکنووس لەڕێی دیالۆگی دەرەکی کارەکتەرەکانیەوە پەیامی جوتیارێکی چەوساوە دەدات بە گوێی خوێنەردا و لە بەرامبەر بەگ یان ئاغای خاوەن گوندەکەی:

«-کاکی جاندرمە باوەڕ مەکە، لێمگەڕێ با بۆ خۆم لێرە بمرم.

ئەوە ڕەحمانی برام بە سواری گوێدرێژ لە مالی بەگەوە هیناوی بۆ ئێرە، بەگ خوی ئەزانێ ئیتر چۆن ئەڵێ پارەی دزیوم.

- ماڵم خەرابێ وەکوو خەرابووە! پارەی چی؟ من هیشتا کرێ شەش مانگم لەسەر بەگە.

- چۆن ؟

- ئەی هەمووتان نازانن ئێمرۆ شەش مانگە من جوتی بۆ ئەگێرم؟» (پشدەری، ١٩٤٧: ٥٧).

## ٢- دیالۆگی ناوەکی (مۆنۆلۆگ )

ئەمجۆرەی دووهەم لە دیالۆگی کارەکتەر گوزارشتە لە خواستی ڕاستەقینەی مرۆڤ یان کارەکتەری چیرۆک و لەناخی دەروونیدا دێتەدەر و بەواتە قسەکەر لەگەڵ خودی خۆیدا دەئاخفێت. نووسەر لەپێدانی ئەمجۆرە دیالۆگە بە کارەکتەرەکانی چیرۆک، دەخوازێت ناخی کەسەکە و بیرە تایبەتییەکانی بخاتە بەردەم خوێنەر. زۆر جار کرۆکی مۆنۆلۆگی کارەکتەری چیرۆک پەیوەندارەبێت بە سەرتاپای ڕووداوەکە؛ یاخود بە پێچەوانەوە زۆر جار دەبێتە هۆی دەرکەوتنی ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو کە بێ ئەوەی هیچ کاریگەرییەکی بۆ سەر ئاقاری ڕووداوە گشتییەکە هەبێت.

یەکێک لە خاڵە دیارەکانی ئەم جۆرە لە دیالۆگ، ئەوەیە، کە ڕاستگۆیانەیەو هەردەم، کەسی خاوەن مۆنۆلۆگەکە بەبێ‌هیچ بەربەست و پەردەیەک پا لە خواستەکانی خۆی دەنێ و گوزارشت لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتوویەک دەکات کە لەوەو پێش کردوویەتی یان دەخوازێت بیکات یاخود لێی پەشیمانە و دان بەهەل و کەم و کورتییەکانی ژیانی ڕابووردوودا ئەنێ. لە نێو هەر بەرەوڕوو بوونەوەیەک لەگەڵ خۆیدا دێتە گۆو بۆ نموونە، گەر ڕۆڵی لە ڕووداوێکدا هەبێت یان نەبێت، یان لە تاوانێکدا تاوانبار بێت یان نەبێت، ناخی خودی خۆی لە بەرامبەر «منی باڵا»دا ئاشکرا دەکات. لەم ڕووەوە «حەسەن جاف» لە کتێبی «چیرۆکی نوێی کوردی»دا دەڵێت:

«مەنۆلۆگ لە هەموو جۆرەکانی‌تری تەکنیک زیاتر لە چیرۆکی نوێماندا بەکارهاتووە.

ئەم هونەرەش بەمەبەستی خستنە ڕووی دیوی ناوەوەی کەسانی چیرۆکەکە، واتە دیوی نەستی-لاشعوری کەسەکە بەکار دێت کە لە ئەنجامی تیۆرەکانی فرۆیدەوە دەربارەی شیکردنەوەی دەروون هاتە کایەوە» (حەسەن‌جاف، ١٩٨٥: ٨٧). کەواتە خواست و نەستەکانی مرۆڤ، کەوتۆتە قووڵایی ناوەوەی مرۆڤ و لە هەمبەر«منی باڵا» و دابونەریتدا دژیەک ڕاوەستاون و هەر بەو جۆرە بۆ دەربڕینی ئەو خواستە شاراوانە، کارەکتەری مرۆڤ دەخاتە نێو ڕەوشی خواستە کپکراوەکانی. بۆ ئەمە پەنا دەبات بۆ خۆ دواندنێکی بێدەنگانە.

واتە، خاوەن مۆنۆلۆگەکە دوانێکی ڕاستەوخۆی نائاشکرای لەگەڵ ناخی خۆیدا دەکات، هەر سەبارەت بە مۆنۆلۆگ. «ڕۆبرت همفری» دەڵێت:

«بێگومان دانەرانی شەپۆلی هۆش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ئاگادار و شارەزاییان لەسەر تیۆرە_شیکاری دەروونی و تیۆرە کەسێتییەکان هەیە. دەتوانین جەخت لەسەر ئەو ڕاستیە بکەین، کە ئەو نووسەرانە بە شێوەیەکی فراوان کارتێکرابوون بە چەمکە گشتییەکانی دەروونناسی نوێ و فەلسەفەی نوێیەوە» (همفری، ١٩٧٥: ٢٩).

لەم ڕووەوە مۆنۆلۆگ بە پێی تیۆرەکەی ڕۆبرت هەمفری دەکرێت بە دوو بەشەوە:

یەکەم مۆنۆلۆگی ڕاستەوخۆ و دووهەمییان مۆنۆلۆگی ناڕاستەوخۆیە. سەبارەت بەوەی یەکەمیان نووسەر دەستێوەردانی تێدا ناکات و کارەکتەرەکەش خۆی بۆ خوێنەریش ئاشکرا ناکات، سەبارەت بەم جۆرەی یەکەم حەسەن جاف دەڵێ:

«بۆ چەشنی یەکەم -مەنۆلۆگی ڕاستەخۆ- ڕوبرت همفری تەنها سێ چیرۆکنووسی هێناوەتەوە وەک نموونە کە ئەو جۆرە تەکنیکەیان بەکارهێناوە و سەرکەوتنیشیان تێدا وەدەست هێناوە کە "جێمس جۆیس" و "فرجینیا وولف" و "ولیەم فۆلکنەر"ن. لەبەر ئەوە بە پێویستی نازانم خۆمان ماندوو بکەین بە هەوڵی بێ سوودی دۆزینەوەی ئەم ڕێبازە لە چیرۆکی کوردیدا؛ بەڵام بۆ چەشنی دووەم -مەنۆلۆگی ناڕاستەوخۆ- دەتوانین زۆر نموونە بهێنینەوە لە بەرهەمی چیرۆکنووسەکانمانەوە و بەدڵنیاییشەوە بڵێین کە بە شێوەیەکی باش و سەرکەوتوو بەکاریان هێناوە» (حەسەن جاف، ١٩٨٥: ٨٨). سەبارەت بە بەکارهێنانی مۆنۆلۆگ لەو کورتە چیرۆکە کوردییانەی لەو قۆناغەدا نووسراون، زێتر جۆری مۆنۆلۆگی ناڕاستەوخۆی تێدا بەکارهاتووە، واتە ئەو جۆرەی کە نووسەرەکەی بە هۆی کاریگەری زنجیرە ڕووداوەکانی ڕابردووی و لە ڕێی پاڵنەری هەست و سۆزییەوە و بە کاریگەریی هێزی ناوەکی دەروونییەوە چیرۆکەکەی دەچنێ، یەکەم گاڤێک لەم بوارەدا نرابێ، چیرۆکی«لاوکێ من»ە کە نووسەر بە ڕاناوی «من»ی کەسی سەربەخۆی یەکەمی تاک، بەو جۆرە مۆنۆلۆگە بەزاری ژنە شەهیدێک بۆ هاوسەرە شەهیدەکەی، دەلاوێنێتەوە کە لە کۆڕی خەباتی ڕزگاریخوازی گەلەکەی شەهید بووە. ئەو جۆرە دوانە لە نێوان ڕاناوی «من»ی ئامادە و «تۆ»ی نائامادەیە؛ واتە ئەو شێوە مۆنۆلۆگە ناڕاستەوخۆیەیە کە کەوتۆتە نێوان خودی قسەکەر و ڕاناوە کەسییە نادیارەکە کە «تۆ» یان هاوسەرە شەهیدەکەیەتی. ئەمەش لایەکی چیرۆکەکەیە کە گوزارشت لەو جۆرە یان ڕەگەزی تەکنیکە دەکات، کە پێی دەوترێت«مۆنۆلۆگی ناڕاستەوخۆ»:

« -لاوکێ من! ئیرۆ پێنج سالە قدییانە کو ام، ژ هڤ دورهاتنە ئیخستن تۆ، نهو، دکورتالکی دە ب چارسەد جامیرن کرد ڕادکڤی.

خوەدە دزانە چرمی ڕو و سینگێ تە پرچڤی و لا شی تە رزیایە.

لی، گرگین. بزانە کو هرشف بری هرە ڕا کڤە کری تە تاجین زند و دستین خوە ئین نرم داڤیژە سر ستویی من و ب چاڤین خوەئی زلول و ب کسر ل من میزە دکە، من ماچ دکە و ژ من ڕە دبێژە:

## بەشی پێنجەم- رەخنە

-دایی! دایکا من باڤێمن رە بنڤیسینە کو  مزن بومە. دلیمن ژ بـو هژکرنـا کردسـتانییە خرتییـا مـن ژ بونـا ئەریکارییا کردستانییە، خوینا من ژ بو شر و ڕژاندنییە! » (بدرخان، ١٩٣٢: ٦).

لە کورتە چیرۆکی «هێڤا چاردەشەڤی»دا —کە زێتر لە کورتیلە چیرۆک نزیک دەبێتەوە- چیرۆکنـووس لـە ژێر بارێکی دەروونی سەختدا کە گوزارشت لە ئاوارەیی و بێکەسی و تەنهایی خـۆی دەکـات، پـەنا دەباتـە بـەر هەر ئـەو  شـێوەی مۆنۆلۆگـە، بـەڵام ئـەم جارەیـان بـە خەونێکییـەوە گرێـی دەدات. ئـەم جـۆرەش کـە بـە لاواندنەوەی کەسی «موناجات» ناودەبرا، بـە کاریگـەری ئـەو شـەپۆلە هەسـتەی کـە لـە نەسـتەوە سـەرچاوە دەگرێت لەگەڵ مانگ (هێڤ)دا -کە مانگیش وەک هێمایەکی تەنهایی ویێکچوو- لەگـەڵ تـەنهایی نووسـەردا دێتە گۆ و لەوێدا لەگەل ئەو حاڵەتە دەروونییەدا تەریب دەبێت:

«داماریێ لڤینێ کەتە زمانێ من، من دلکر، دەست ب گالگالان بکم، لێ چ ببینم: من دیت، ژ قۆزییاباکوور و ڕۆژاڤا ئەورەکی رەش، ب مژ و غومام ب لە زو بەز گهیشتا سەر هێڤا من. گۆتنا من دقرکـا مـن دە مـا. هـێڤ، ڕەش د خەنقی (ژ خەوا ڤەجنقیم)

ئاخ ! ئاخ گەورا من، رندا من، دلکە تییا من، تۆ ب چ لەونی تێی خەونا من؟ ئەو نەخەون بوو، ئەو نەخەیال بوو. ئەو نە هێڤ بوو، ئەو سەرهاتییەک قەومی، گەورا من! رندا من! دلکە تیا من بوو. ئەورا ڕەش ژی دزانم کی بوو.

مفسدۆ، ئەورۆ تە دەستا من ژ گەورا من کر، وگۆتنا منا داوی ژی، دقرکا من دە هشـت. ئـەز نهـۆ ب ئـاخ و کەسەر، ب قیرینەکە بلند دقیرم :

شەرمە سارم: گەورا من، ئەز ژی هێڤینە نە گۆریاتە، جاندایا تەمە!» (قەدریجان، ١٩٣٢: ٦).

«پیرەمێـرد» وەک چیرۆکنووسـێک لـە «ئـاواتی دڵ، گەشـتێک بەسـەر باڵـی پەرنـدەی خەیاڵـەوە»دا بـە شیوازێکی گوزارشتکردن لە خود و بەئەندێشـەیەکی ئەفسـوناوییانەوە بەسـەر باڵـی پەرەنـدە و لـە کـونجێکی ئاسماندا لە ژێر باری دەربازبوون لەزەوی و سانسۆرەکانی سەر ئارەزووەکانی خوددا کە لەوێدا مـنی بـاڵا جێـی نامێنێ و ئارەزووە شاراوەکانی و خواستەکانی دێتە سەرەوە و لە هەست (شـعور)دا لـەدایک دەبـێ و بـەمجۆرە لە ڕێی مۆنۆلۆگی خودێ (مناجات)دا ئەو خواست و پرسیارانە دەردەکەون و دەردەبڕرێن و لەوێـدا نووسـەر لـە سنووری دیاریکراوی خۆی دەردەچێ و وەک پێغەمبەران قسە لەگەڵ خودا و گازندە دەکـات. پیرەمێـردیش لە شوێنێکی چیرۆکەکە بەمجۆرە ئەو هەستانەی دەردەبڕێت:

«دەمیکی دوور و درێژ مام و بێدەنگ ڕاوەستام، پاشان ئـاهێکی سـاردم هەڵکێشـا وسـەرم هەڵـبڕی و ڕووم کردە ئاسمان. چەندێک لە ئەستیرەکان ورد بوومـەوە سـەرنجمدایە کردگـاری دەسـتی پـەروەردگار. لەبـەر خۆمەوە ئەمگوت:

خوا! لەبەر ئەستیرەکان و من، گوایە مەبەست لە دورستکردن و خستنەوەی ئـەم تەرحـە گیانلەبەرانـە بـوو؟ گوایە ئەم جوانییەی عەردو  ئەم خاکە زێڕینەی زەمین، ئەم هەموو گوڵ و نەسرینانە و ئەم میـوە و میوەهاتـە و ئەم هەموو دڕندە و پەرندانەت ئەمانەت و هەموو بۆ خوشی و دڵشادی ئەوان دروست کردووە، ئەمانـەت هـەموو بۆ تێربوونی سکی ئەوان هێناوتە بەرهەم، گوایە هێشتا: ئەبێ بۆ چاوتەنگ بن؟

لە سەر پارویێک بەگژ یەکدا بچن؟

لەسەر بستێ زەوی چاوی یەک دەرهێنن؟ قەلاچوو لە یەکتر بخەن؟» (پیرەمێرد،١٩٣٣: ٢).

هەر سەبارەت بەو مۆنۆلۆگانەی کە گوزارشت لە ناخی خودی دەروونی کارەکتەرە چیرۆکنووسەکان دەکەن، نموونەیەکی دیکەی لەو شێوەیە چیرۆکەکەی «دەرکەتی»ی «نورەددین زازا»یە، کە ئەویش هاوشێوەی قەدریجانی هاوڕێی ئاوارەی دەرەوەی وڵاتە و لە ژێر کاریگەری ئەو فەزا و بارە دەروونییەوە کە لە خاک و نەتەوە و کەلتوور و کەسوکارەوە دوور دەست و ژیانێکی نامۆ و غوربەت دەباتە سەر و لەبن فاکتەری مۆتیفە وڵاتپارێزییەکەیەوە گوزارشت لەو بارە دەروونییەی خۆی دەکات؛ واتە بەهەمان هاوکێشەی «من»ی ئامادە و «تۆ»ی نائامادە. مۆنۆلۆگە ناڕاستەوخۆیەکە دروست دەبێ و لەوێشدا «وڵات» لە جێی «تۆ»یە، کە نائامادە و دوور دەستە (زازا، ١٩٤١: ٥). لەم بارەیەوە «فرات جەوەری» سەبارەت بە چنینی ئەم چیرۆکە دەڵێ:

« ئەڤ چیرۆکا کو ب بێهنەکێ تێتە خوەندن و وەکە هەڵبەستەکە بەدەو دحەرکە، ل سەر دەرکەتیانە. دەرکەتی : ئەو کەسێن کو ژ وەلاتێن خوە  دەرکەتنە، تەرکا وەلاتا خوە کرنە، ب چۆل و چەپەلان کەتنە و ژ خوە رەل دووریا ل ستارەکا گەریانە. مرۆڤ دڤا کورتە چیرۆکا دە دبینە کو دووری چقاس خوەش بە ژی دیسان مال، یانی وەلات خوەشترە، خوارن، لخوەکردن، ڤەخوارن، خوەزا وسترانێن وەلێت ب مرۆڤ خوەشتر و شیرنترن» (جەوەری، ١٩٩٥: ٨).

ئەمەی خوارەوەش نموونەی ئەو جۆرە داڕشتنەیە کە گوزارشت لەو جۆرە مۆنۆلۆگە دەکات و تێیدا خاوەن مۆنۆلۆگ وەک کارەکتەرەکی نامۆ و تەریکبوو دەخاتە پێش چاو:

« ئەز دناڤ ملەتان دە دەرباس بووم. ل من نێرین، من لەوان نهێرت، لێ مەهەڤدوو ناس نەکرن.

گاڤا ڕۆژ دچوو ئاڤا و ژ خرجکێن نەوەلان دوو دوومان ڕادبوون من ژ خوە ڕە دگۆت:

چقاس بەختیارە ئەو مرۆڤی کۆ ئێڤاران ڤەدگەرە مالا خوە و دناڤ زار و زێچێن خوە دەروودنە دەرکەتی ل هەر دەرا ب تەنا یە ...» (زازا، ١٩٤١:٥).

لە چیرۆکی «شینا ژنەکێ ل سەر گۆرا برهۆ»دا، چیرۆکنووس کە هەر بەخۆی شایەتحالی ڕووداوەکەیە، بەمەبەستی پرسیارکردن لە ژنە و بەم جۆرە سەبارەت بەناڵینی ژنە لەسەر گۆری براکانی لەگەڵ خۆی دەکەوێتە گۆ:

«من د دلی خوەدا گۆت، ما گەلۆ تو بێ ئەڤ  ژنک ژی ب ڤێ هەژینا ئەردێدا پەنگزی و دڤر را ب دەرکەت؟! ل سەر ڤێ رامانێ هندک ما کۆ ئەر دەنگەک لێ بکم و ژێ بپرسم» (سەبری، ١٩٤٣: ٦).

دیسانەوە لەچیرۆکی «کوێرەوەری»دا ئیبراهیم ئەحمەد مۆنۆلۆگێکی ناڕاستەوخۆ دەداتە «مام حەسەن»ی کارەکتەری سەرەکی چیرۆکەکەی کە چۆن لە مۆنۆلۆگەکەیدا دەرک بەو ڕاستییە دەکات کە جوتیارە هەرزەکارەکەی هاوڕێی پێ لەسەر هۆکاری ڕاستەوخۆی چەوساندنەوەو مەینەتییەکانیان دەنێت کە ئەویش بێدەنگی خودی خۆیانە؛ بۆ ئەمەش لە مۆنۆلۆگەکەی مام حەسەنیشدا، پەندێکی کوردی بۆ ئەو ڕاستیە دەهێنێتەوە:

«مام حەسەن لە بەر خۆیەوە ئەیوت: ئەم هەتیوە شێتە قسەکانی زۆر لە ڕاست ئەچن، وەختە وام لێ بکات بچمە سەر باوەڕی. پیشینان وتوویانە: قسە، یان لە شێت یان لە منالّ» (ئیبراهیم ئەحمەد، ١٩٤٥: ٦١).

لە کورتە چیرۆکی «خانوویکی تاریک»دا چیرۆکنووس «حوزنی موکریانی» بە مۆنۆلۆگێکی خودی «لاواندنەوە»دا کارەکتەری «من» لەگەڵ ئەوانی نادیار و دوێنێی ئامادە لەگەڵ ئەمڕۆی بزربوودا پێکەوە گرێ دەدات و بەسۆزێکی قووڵەوە دەڕوانێتە ئەو خانووەی کە لە دوێنێدا ئاوەدان و جمەی مرۆڤەکانی تێدا دەهات و لەگەڵ ئەمڕۆیەکی نامۆ و بەسامدا کە جگە لە دیواری ڕووخاو کە بۆتە شوێنی جنۆکە و شەیتان، هیچ شتێکی دیکەی زیندووی تێدا نابینرێت:

«لە نێو دەروونا بە سۆزیکی گیان سووتێنەر ئاخم کێشا و ئاهێکم کرد و وتم: ئەم خانووە تاریکە ئاوێنەی بالانوێنی گوزەرانمان و ئاوێنەی ژیان و زندەگانی ئێمەیە» (موکریانی، ١٩٤٨: ٥٠٩).

هەموو ئەو نموونانەی کە هێنامانەوە بۆ ئەوە بوو کە ئەو ڕاستییە بسەلمێنین کە چیرۆکنووسانی ئەو سەردەمە لە پاڵ دیالۆگە دەرەکییەکە چ شانبەشانی ئەو، یان بە تەنیا پەنایان بۆ بەکارهێنانی ئەم تەکنیکە نوێیە بردووە کە ئەویش مۆنۆلۆگە. ئەمەش دیسان ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن کە چیرۆکی هونەری کوردیمان نزیکەی ساڵێک بەر لە بەرپابوونی دووهەم شەڕی جیهانی بەو تەکنیکە نوێیانەوە دەستیان پێکردووە.

### پاژی دووەم:

### شێوازی دیالۆگی چیرۆکەکان:

زمان کەرەسەی بنچینەیی دیالۆگ و یەکێکە لەو فاکتەرە هونەرییانەی کە چیرۆکی هونەرییان لەسەر ڕادەوەستێت و بەهۆیەوە گوزارشت لە بیرو بۆچوونەکانی کارەکتەرەکانی دەکرێت.

بە درێژایی ئەزموونی کاری چیرۆکنووسان لەو سەردەمەی کە بۆ نامەکەمان دیاری کردبوو، دەبینین شێوازی زمانی هەریەک لە چیرۆکنووسەکان بە جۆری جیاواز دەردەکەون. یەکێک لە خاڵە هەرە بەرجەستە و دیارەکانی شێوازی نووسین یان زمانی ئەو چیرۆکانە، بەکارهێنان یان ڕەنگدانەوەی گۆڤەر یان زارۆچکەی چیرۆکنووسانێکە کە لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگیانداوەتەوە. ئەگەرچی زۆرێکیش لەو چیرۆکنووسانە لە بەکارهێنانی زاری ناوچەیی خۆیان بەدوور گرتووە، هەر لەبەر ئەوە دەکارین بڵێین بە شێوەیەکی گشتی لە بەکارهێنانی زمانی چیرۆک، چیرۆکە کوردیەکانیان لەبەر نەبوونی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتوو بە دوو دیالێکتە سەرەکییە کوردییەکەی کرمانجی ژووروو و خواروو نووسراون. لەپاڵ ئەمەش بە دوو شێوە نووسینی ئەلفابێی عەرەبی و لاتینی ئەو بەرهەمانەیان بلاو کردۆتەوە. تەنانەت ئەو شێوە نووسین و زمانە کوردییەی کە بۆ ئەو چیرۆکە کوردییانەی کە بە دیالێکتی کرمانجی خواروو دەنووسران، تایبەتییەکی خۆیان هەیە چ لە باری پاراوی زمان یان ئەو ڕێنووسەی کە پێی دەنووسرێت. ئەگەرچی بەکارهێنانی وشەگەلی بیانی (وەک فارسی و عەرەبی) لە هەندێک لە بەرهەمی چەند چیرۆکنووسێکدا بەرچاو دەکەوێت، دیارە ئەم بەکارهێنانەش بۆتە تایبەتمەندییەکی زمانی نووسین لای ئەو چیرۆکنووسانەی ئەو دەمە. سەبارەت بە ڕێنووسی کوردی ئەو چیرۆکانەی کە بە ئەلفابێیەی عەرەبیەکە دەنووسرێت، سەرەتایی بوون و زێتر لەو ڕێنووسە فارسییە نزیک بوو

کە دوورە لە سەر و بۆرە؛ کەواتــە زمــان یــان بــەکارهێنانی تایبەتمەندییــەکانی زمــان ئــەو کەرەســەیەیە کــە نووسەرێک لەگەڵ نووسەرێکی دیدا جیا دەکاتەوە و بۆ هــەموو نووســەرێک زمانێــک یــان شــێوازێکی تایبــەتی دەبینرێت. بەتایبەتی لەبەکارهێنانی ئەو وشەو دەستەواژانەی کە پێوەی پابەندن.

بە گشتی زمانی دیالۆگ یان دەقی چیرۆکەکانی ئەزموونی سەردەمی دیاریکراوی نامەکە سادە و ســاکارن و لە دەربڕیندا دوورن لە گرێ وگۆڵەوە. لە هەندێکیاندا سیمای شێوازێکی فۆلکلۆری بە چیرۆکەکانەوە دیــارە، ئەگەرچی ئەمە ئەوە ناگەیــەنێ کــە ئــەو چیرۆکانــە لــە زمــانێکی هونەرییــەوە بــە دوور کــەوتبن، بەڵــکوو لــە هەندێکیاندا وێنەی هونەری یان ڕەمز لە دەربڕینی دیالۆگەکاندا دەردەکــەون، بەتایبــەت لــەو دیالۆگانــەی کــە گوزارشت لە خواستی چەپێنراوی کەسێتییەکانی چیرۆکەکان دەکەن.

سەبارەت بەنموونەی ئەو چیرۆکانەی کەتایبەتمەندی نووســەرەکانی دەردەخــەن لــە شــێوازی بــەکارهێنانی زماندا، دەکارین کەڵــک لــەو شــێوە دابەشــکردنەی کتێبەکــەی «عەبــدوڵلا ســەراج» ببیــنین بــەناوی«بــەرەو ئاستانەی ڕۆمان گۆشەنیگاکان»ە و ئەویش بەجۆرە گۆڕانکارییەک کــە لەگــەڵ ئــەو شــێوازانەی لــە ئــەزمونی کورتە چیرۆکی دیاریکراوی نامەکەدا بەکارهاتووە دەگونجێنین:

<u>شێوازی یەکەم :</u>

وشە، لەزمانی ئاخافاتنی دەمەتەقێی ڕۆژانەدا

(گێڕانەوە+ دەقی فۆلکلۆر)

<u>شێوازی دووەم :</u>

وشە ، لەزمانی هونەریدا

(مۆنۆلوگ + وڕێنە+ خەون)

<u>شێوازی سێیەم :</u>

وشە لەزمانی ئەدەبیدا

(زمانەوانی + ڕەوانبێژی)

<u>شێوازی چوارەم :</u>

وشە لەزمانی هونەری هێماییدا

(داستان + ئەفسانە + مێژوو)

<u>شێوازی پێنجەم :</u>

وشە لەزمانی هزریدا

(ئاینی + ئایدیۆلۆژی)

<u>شێوازی شەشەم :</u>

وشە لە شێوە زمانی کوردی نووسەردا

(وشەی بێگانە + گۆڤەر) (سەراج، ٢٠٠٧: ٧١-٧٠).

سەبارەت بە شێوازی یەکەم لەو دابەشکردنە کە پەیوەندە بە شێوازی گێڕانەوە+دەقی فۆلکلـۆر، کـەم تـا زۆر شوێنی خۆیان ڕەنگدانەوەیان لەزمانی چیرۆکە فۆلکلۆرییەکانی ئەو سەردەمەدا بینیوە؛ لـەو نموونـە دیارانـەش دەکارین چیرۆکەکانی «سەرهاتیا ڕەشوئی داری، سەپان و جوتیار، نێچیرا بەرازان» بهێنینە بەرچاو:

لە چیرۆکی «سەرهاتیا ڕەشوئی داری» جەمیلی حاجۆی چیرۆکنووس بەم جـۆرە گێڕانەوەیـە بـە زمـانێکی سادەو ساکار نزیک بە شێوازی چیرۆکی فۆلکلۆری چیرۆکەکەی دادەڕێژێت:

«دارا باژارەکی مەزن و کەڤنە؛ دچیایی میردینی دەیە، وی وختی خاکی وی بردە ویل بو، لی نها گندە، چند مال کرمانج ب ئاغایی خوەڤە تیدەنە بری شری مەزن ئیڤارکە زڤستانی ڕشی هیڤی ئاغا ب گندیین خوەڤە ل ئەدودی رونشتی نە. شکفتکە پر مزن وکور ل ور هیە ئەڤ شکفت د زمانی بری دە زندانا بردەویل بوو.

ئاغی ژ جڤاتێ خورە گوت:

-حەجی ئیشەڤ هرە حپسێ بردەویل، دارکی دنیڤی وی دە داچکینەئەزی کچێ خوە بلاش بدەمی هـەمێ رشو نەمردی نەکر ژ هەدامدە رابو، گوت "ئاغا ئەزی هرم" » (حاجۆ، ١٩٣٢:گ، هاوار: ژ١٤:٤).

هەڵبەت گرەوکردنی پادشا و ئاغاکانی کـۆن بـۆ ئـەو کەسـانەی کـە تیایانـدا سـەردەکەون و لەبەرامبـەردا پاداشتی زێڕین یان کچی خۆیان دەکردە دیاری بەرامبەر بـە ئازایـەتی کارەکتـەری سـەرەکی چیرۆکـەکان، کەواتە ئەم دیاردەیـە لـە چیرۆکـی فۆلکلـۆری و حیکایـەتی کوردیـدا دەردەکـەوتن. هـەروەها بـەکارهێنانی دەستەواژەی «ئیڤارکی زڤستانی» کە کاتێکی حیکایەتییە و گرێدراوی زمانە فۆلکلۆرییەکەیە بەدی دەکرێت.

حوزنی موکریانی لە چیرۆکـی «سـەپان و جوتیـار»دا لـە زمـانی دیـالۆگی کارەکتـەرەکانی چیرۆکەکـەدا، بەتایبەت ئەو دەمە قاڵییەی کە دەکەوێتە نێوان هەردوو کارەکتەری چیرۆکەکە (خوامراد و نامراد) کە هـەردوو ناو زێتر و دووناوی کوردەوارین و گرێدراوی کولتووری کوردین و بـە زمـانێکی کـوردی میللـی گوزارشـت لـە کێشەکەی نێوانیان دەکەن کە پەیوەنـدە بـە پیشـە و کـاری جوتیـاری گونـدەکانی کوردسـتانەوە. ئەمـەش نموونەیەکی ئەو دیالۆگەیە:

«نامراد: باخی ساحب ماڵ کوانـێ؟ هـیچ حسـابێکمان هەیـە؟ مـن بـە مـەرجی نوخشـە هـیچم لـە ئێـوە وەرگرتووەوە؟ بە هیچ حسابیکی خۆم نازانم» (موکریانی:١٩٤٣: ٢).

«خوامراد: نا؛ بەڵام تەکەزولیک چەرمی خاوی قایش ئوموور و نێو زۆڵە چـەرمی سـیرمەتان پسـاندوو و دوو دانە مەساسە و گاسنێک و نەقیزێکتان شکاندووە و کەلەوەیەک و دەستگرێکت لـەناو بـردووە و لـە دوورینـەدا دوو داس ومەلەگانێکت وەرگێڕاوە و لە سەرەتای جووتەوە هەتا نوخشـە، هـەموو ڕۆژی چەورەسـانت بـردووە. گەلێکی ڕۆژ مندالەکانت سپیاییان بە دیزەلە وەرگرتووە، لە بیستان تەڕەیان خواردووە، بەلانی کەمەوە هەمووم حساب کردن. لە سەپانیەکەشت بێبەش بمێنی هیشتا دە تەخار گەنم قەرز لە گەردنت دەمێنێ، ئەم دە تەخار گەنمەم کەی پێدەدەیەوە ماڵ و منداڵیشت بفرۆشی لە ژێری دەرناچی...» (موکریانی:١٩٤٣: ٢٢).

سەبارەت بە چیرۆکی «نێچیرێ بەرازان»ی قەدری جان، «پرۆفیسۆر عیـزەدین مسـتەفا ڕەسـووڵ» دەڵـێ: «هەر ڕەنگە بە پەروەردەبوون لە ناو باوەشی گەرمی فولکلۆری کوردی و کارتێکردنی ڕوخسـار و بابـەتی بـاوی

لای بێگانەدا قەدری جانیان وا لێکردبێ کە شتێکی وەک ئەو بابەتە بنووسێت کە لای ڕووس پێی دەڵێن «باسنیا» کە دەچێتە جیهانی ئاژەڵەوە...» (مستەفا ڕەسووڵ، ٢٠٠٢: ٣٤).

لەم چیرۆکەدا قەدری جان لە داڕشتنی زمانی چیرۆکەکەی، ئەگەرچی نزیکە لە شێوازی دووهەم، کە بەکارهێنانی «مۆنۆلۆگ، وڕێنە، خەو» هەر سێ حاڵەتەکەی تێدا بەدی دەکرێ و لە پاڵ ڕەنگدانەوەی ئەو ڕەگەزە هونەرییانە کە گوزارشت لە زمانێکی هونەری دەکەن. دەبینین لە بەکارهێنانی چەند ناوێکی فۆلکلۆری زەق خۆی بە دوور نەگرتووە، کە خودی چیرۆکەکە لەسەر بنەمایەکی هونەری داڕێژراوە، ناوی دوو کارەکتەری فۆلکلۆری بەناوەکانی «خوەجیخزر[1]مورغەکی پەڕدرێژ» دەبینرێ. ئەمەش لایەکی ئەو چیرۆکەیە کە گوزارشت لەو بەکارهێنانە دەکات:

«من ب هێڤییا خوەجێ خزر دلێ خوە ڤەژاند بوو، من دگۆت کەی دەرویشێ من ئی جل کەسک و کەشکوول ب دەستە. مخابن مورغەکی پەر درێژ، سینگ ب پورت و سەگرۆڤەر و سەر مەزن بوو» (مستەفا ڕەسووڵ، ٢٠٠٢: ٣٤).

هەر لەم چیرۆکەدا و بەدرێژایی دەقەکە زمانێکی چنراوی مۆنۆلۆگی و جۆرێک لە وڕێنەی نەخۆشێکی سەر جێگا دەبینین کە لە کۆتایی چیرۆکەکە بە زەقی ئەم ڕاستییە دەبینین.

«گاڤێ من چاڤێ خوە ڤەکر، من خوە ل سەر باسکێ تو مورغان نەدیت، ئەز ل مالێ خوە، دناڤ نڤینا خوە دەبووم. تختۆرەکی جل سپی سەرێ من بلەند دکر و ب کەڤچیکی دەرمان بەرا قرکێ من درا ل ڕاست و چەپ دوو سێ مەرڤێ من ب ترس ل من دنێرین. هێسر ژ چاڤێ وان د حەرکی... دختۆر دکەنیێ و دگۆت: ئێدی مەترسن نەخوەشێ مە کەفەن چراند. هەشێ من هێدی هێدی دهات سەرێ من، ئەز ژ بیست ڕۆژێ دە نەخوەش بووم نەخوەشیا من تیفۆسەکێ گران و بێ ئەمان بوو» (مستەفا ڕەسووڵ، ٢٠٠٢: ٣٤).

سەبارەت بە شێوازی سێهەم، کە بەکارهێنانی زمانێکی وێژەیی یان ڕەوانبێژییە، دەبینین زمانی هەندێک لە چیرۆکەکانی ئەودەم تا ڕادەیەک نزیک بەشێوازێکی داڕشتنی شیعری وێنەی هونەری ئەدەبی تێیدا بەکارهاتووە کە سیمای زمانێکی ئەدەبی لە ڕێی مۆنۆلۆگ یان دیالۆگی کارەکتەرەکانی چیرۆکدا دەردەکەون. نموونەیەکی دیاری ئەو شێوازە لە زمانی چیرۆک، زمانی چیرۆکەکەی «دەرکەتی»ی نورەدین زازایە کە بە زمانێکی نزیکی ئاوازی شیعری چیرۆکەکەی بە زمانێکی مۆنۆلۆگانە کە لەگەڵ خۆیدا دێتە گۆ، دەنووسێت و لەوێدا چیرۆکەکەی کە گوزارشت لە ژیانی مرۆڤی ئاوارە و دوور لە وڵات دەکات. زمانی چیرۆکەکەی بە ١٠ کۆپلە داڕشتووە کە لە کۆتایی هەر کۆپلەیەک لەو کۆپلانە ئەم ڕستەیە ١٠ جار دووبارە دەکاتەوە هەروەک چۆن لە «تەرجیع بەند»ی قالبە شیعرییە کلاسیکییەکاندا دەبینرێ. بەشێوەیەک لەو جۆرە داڕشتنە دەبینرێت کە دەچێتە قاڵبی جوانکاری واژەیی. ئەمەش ئەو ڕستەیەیە:

«دەرکەتی ل هەر دەرێ ب تەنایە!»

ئەمەش لایەکی چەند کۆپلەیەکی ئەو زمانە ڕەوانبێژییەیە، کە چیرۆکەکەی پێنووسراوە:

---

[1] - مەبەست خدری زیندەیە.

«گاڤێ ڕۆژ دچوو ئاڤاوژخرجکێن نەوالان دوو و دوومان ڕادبوون، من ژ خوەرە دگوت:

چقاس بەختیارە ئەو مرۆڤی کۆ ئێڤاران ڤەدگەرە مالا خوە ئو دناڤ زار و زێچێن خوە رە ڕوودنە.

دەرکەتی ل هەر دەرێ ب تەنایە!

ب کوودێ دچن ئەو ئەورێن کۆ بێ وان ددە بەر خوە؟ با من ژی وەک وان ددە بەر خوە و با حەمدا من، ب کێفا خوە من داژۆ،

دەرکەتی ل هەر دەرێ ب تەنایە!» (زازا، ١٩٤١، هاوار، ژ٢٩: ٥).

هەروەها هەرلەخودی ئەوچیرۆکەی سەرەوەشدا چەند ڕەگەزێکی دیکەی زمانە ڕەوانبێژییەکەی تێدا دەبینرێت، کە ئەویش «ڕەگەزی جوانکاری»یە و دەتوانین لەو دەقەدا چوار جۆری لێدەربکەین:

١) ڕەگەزدۆزی ناتەواو :گاڤا ڕۆژ دچوو ئاڤا

٢) ڕەگەزدۆزی دووبارەکراو: دوو و دوومان

٣) ڕەگەزدۆزی جووتەوانە: زار وزێچ

٤) ڕەگەزدۆزی ڕازاندنەوە: نەوالان ئێڤاران

هەروەها لە چیرۆکێکی دیکە، بەناوی «ب خوەهێن گوهدەرز رە»ی، کە لەلایەن میر جەلادەت عالی بەدرخانەوە لە ژێر نازناوی «ڕاستەدەر» لە گۆڤاری «هاوار»دا بڵاوی کردۆتەوە، چیرۆکەکە نزیکە لە کورتیلە چیرۆک و دیالۆگێکە لە نێوان باوکێک کە چیرۆکنووس خۆیەتی و کوڕە مێرمنداڵە حەوت هەشت ساڵییەکەی؛ کە لەوێدا بە زمانێکی ڕۆشنبیرانە گوزارشت لە گۆڤاری هاوار دەکات و گرنگی ئەو گۆڤارە بۆ گەلی کورد و دۆزە ڕەواکەی دەردەخات. لە نێو دیالۆگەکەدا دوو بەیتە هەڵبەستی تێدایە کە هی «ئەمین عالی بەدرخان»ی باوکی نووسەرە و لەوێدا، نووسەر ئەو دوو بەیتەی بۆ تەواوکردنی مەغز و بابەتی چیرۆکەکە هێناوەتەوە. زمانی دیالۆگەکەش کەمێک لە چەند دێڕە شیعرێکی سەربەست دەچێت و دەچێتە بواری هونەری ڕەوانبێژییەوە. «ڕەگەزی تەورییە»ی تێدا بەکارهاتووە:

- « باڤۆ ! ئەڤ چیە؟

- من سەرێ خۆ هلدا و گۆتێ: (١) (٢) ←

- هاوارە. ( هاوار) ( هاوار )

- هاوارا کێیە؟ (ناوی گۆڤارەکەیە بەمانای هاوارکردن)

- هاوارا کوردانە.

- هەیا نهۆ چرا گازی من نەدکر ؟

- کۆ هاتە خوەندن، تێتە زانین.

- دە بخوینە» (گوهدەرز، ١٩٤١: ١٣).

بشارێ سەگمان لە چیرۆکی «بێبەختی»دا لە پێش کۆتایی چیرۆکەکە بۆ گەیاندنی مەبەست و ئاواتی ئاشتیخوازی لە نێوان هەردوو لایەن یان هۆزی بەگژیەکدا چووی «بووبۆ» و «سیاهپۆش» بەم دیالۆگەوە، کە

لەلایەن سەرۆكهۆزی سیاهپووش، كەناوی"سەرخێن"ە بەزمانێكی ئەدەبی چنراو بە پەند و وێنەی هونەرییانـە مەبەستەكەی خۆی لە پێناو كۆتایی هێنانی شەڕی لە مێژینەیان ئاڕاستەی "چەچێن"ی دوژمـنی لەوەوبـەری، كە سەرۆكی هۆزی«بووبۆ»یە دەكات و لەوێدا لـە ڕەوشـێكی سـەخت و لـە نێـو بـەفردا كـەوتوون و دوژمـنی هاوبەشیش لەكەمیندایە بۆیان.

لە ڕووی هەڵسەنگاندنی زمانە ئەدەبییەكەش چیرۆكنـووس لـەم دەربڕینـەدا وێنەیـەكی هونـەری بـەپێزی بەكارهێناوە و دەچێتە نێو هونەری «خوازەی سەربەست»ەوە كە دەڵێ: «خـوین ب خوینـا نایەتـە شیشـتن»؛ واتە خوێن بە خوێن ناشۆرێتەوە. مەبەستی ئەوەیە كە توندوتیژی بە توندوتیژی دانامركێتـەوە. كـە دەشڵـێت: «خوین ب ئاڤێ تێتە شیشتن»، مەبەست ئەوەیە كە توندوتیژی بە هێمنی و ئاشتی چارەسـەر دەكرێـت؛ واتـە ئەو وشانە كە بەكارهاتوون ئاماژە بۆ هەندێ واتا دەكەن كە واتای فەرهەنگی وشەكان ناگەیـەنێ؛ چونكـە جگـە لە واتە فەرهەنگییەكان هەریەكە و نیشانەیە بۆ دیاردەیەكیدی. خوێن هـەروەك دەزانـرێ لـە ماسـولكەكانی لەشدایە. لێرەدا بـە واتایـەكیدی بـاركراوە كـە ئـەویش واتـای توندوتیژییـە؛ چونكـە وەكـوو لازم و مـەلزووم توندوتیژی خوێن وكوشتنی لێدەكەوێتەوە.كە دەشڵێت: «خوێن ب ئاڤێ تێتـە شیشـتن»؛ واتـە خـوێن بـەئاو دەشۆریتەوە. لێرەدا دیسان خوێن نیشانەی توندوتیژییە و لەبەرامبەریشدا ئاویش نیشـانەی هـێمنی و لەیـەك گەیشتنە كە ئەمەش بە ڕێگای ئەو سیفەتانەیە كە ئاو هەڵیگرتوون.

دیارە هەر ئەم زمانی ڕەوانبێژییەشە كە دەچێتە دەروازەی ترازان لە ئەدەبدا؛ واتـە: «الانزیـاح فـی الأدب». ئەمەش نموونەیەكی چیرۆكەكەیە:

« - بەلێ سبەهە كە ئەم دیتنە كۆ ل سەر هەسپێن خوە و ل ڕەخ هەڤ ژ گوندێ خوە دچـن بـاژێر، ئـەوی چقاس ل مە ئەجێبمایی بمینن. ئەوێ ببێژن فەلەك فەتلەك دایـە ژۆر، ژ خـوە، جیرانـێ قـەنج، هەكـە ئـەم خوە ب خوە ل هەڤ نەهاتن. ما كەس هەیە كۆ بكارە مە ل هەڤ بینە، بەلێ، ما پێشیان نەگۆتیـە كـۆ خـوین ب خوینێ نایەتە شیشتن، خوێن ب ئاڤاێ تێتە شیشتن، ئەڤ بـەرفێ كـو داران ئـەم لـێ شـداندنە چ ئاڤـەكە سارە. ما كیژان ئاگر هەیە كۆ پا ڤەنەمرە، كیـژان خـوین هەیـە كـۆ پـا نەیێتـە شیشـتن» (سـەگمان، ١٩٤٤، ڕۆناهی، ژ٥٣: ٢٣-٢٢).

نورەدین زازاش لە چیرۆكی«پەریشانی»دا، زمانێكی پەخشانی لە وەسفكردنی ئەو ژینگەیـە بـەكاردینێ كـە زەحمەتكێشان و جوتیارانی دەڤەری جزیـرە لـە بـاكووری كوردسـتاندا لـە سـایەیدا ژیـانێكی كولەمـەرگی و بەشمەینەتی تێدا بەسەر دەبەن.

لەوێدا وێنەیەكی فۆتۆگرافی و ڕەئالیستی ئەو خەڵكە دێنێتە پێش چـاوی خوێنـەر. وشـەگەلێك دەبینیـت، كە لە چنراوی ئەو وشـانە دەچێـت كـە لـە زمـانی شـیعرییەوە نـزیكن؛ واتـە وێنەیـەكی ڕەوانبێـژی جـۆری چواندنمان دەداتێ؛ چونكە چیرۆكنووس سەپانەكانی «دەشـتی جزیـرە» دەچوێنـێ بـە «حـەیـوان»؛ چونكـە ڕەوشی سەختی بژێوی ژیان، كاری سەخت و تاقەتپـڕووكێنی خسـتۆتە سەرشـانیان و لەوێـدا مرۆڤـەكان بـە

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

ئاژەڵی چوارپەل دەشوبهێنێ و پاشان دەڵێ بەلەشی جوانیان، مرۆڤ دەبینم. هەروەها جۆرێکی‌دی لە وێنەکانی ڕەوانبیژی لەم چیرۆکەدا دەردەکەوێت، ئەویش «دژیەکە» کە دەڵێ:

«لاشێ وان تازی و سپی و نەرم و خوەشک ل بەر تاڤا جزیرێ شەوتی د رەش بوویە». واتە وشە فەرهەنگییە پێچەوانەکان لە ڕستەیەکدا ڕیز کراون کە تێیدا وەسفی هەر ئەو سەپانانەی جزیرە دەکات ئەمەش ئەو وشانەن:

تازی و سپی ............ شەوتی و ڕەش

ئەمەش نموونەی لایەکی ئەو چیرۆکەیە:

«هەر دەر زەر، زەرە، ل زەڤیان، ژ دوور ڤە وەک حەیوانان، تشتێن ب جان، ل سەر چارلنگان دلڤن، نێزیکی وان دبم، ب قەلافەتا بەدەویان ئینسان دبینم لێ ب کوردی د پەیڤن: لاشێ وان تازی و سپی و نەرم و خوەشک ل بەر تاڤا جزیرێ شەوتی و رەش بوویە، ژ ڕووێ وان خوێدان دلۆپ دکە. لێ وەک ماکنێ دشغولن. ب وان ڕە ژن و زارۆ ژی هەنە . پیرەکان زارۆیێن خوە ئێن سەرشیر ئاڤێتنە ئەردێ، ناڤ تۆز و ئاخێ، مێشان روویا وان گرتیە. ژ جلێن وان ئێن گەدی بهنێن پیس تێن» (یوسف، ١٩٤١: ٧).

حەسەنی قزلجی لە چیرۆکی «فیلمی عاسمان لە سینمای کوردستان» بە زمانێکی هونەری بە سوود وەرگرتن لە چەند وێنەیەکی هونەری چنراو، بەمجۆرە گوزارشت لەو فیلمە دەکات کە وەک ڕەنگدانەوەیەکی ڕەوشی بەر لە کۆماری کوردستان لە مەهاباد و سەردەمی دەسەڵاتی کۆمار دەکات لەو دەمەدا. نووسەر لە چیرۆکەکەیدا بەڕێگای چواندنێکی وێنە بە وێنەی بە پێزەوە وێنەکی چنیوە؛ لەوێدا بێدەنگی چواندووە بە دەریایەکو نەمانی ئەو بێدەنگییەو ژاوەژاوەی چواندووە بە شڵەقاندن. بەڵام لێرەدا شەپۆل هەردوو جۆرەکەی دەگرێتەوە کە ئەوانەش:

«شەپۆلی دەریا و شەپۆلی با»

بێدەنگی دەریا

بەفرفڕی باڵ و نەهێشتنی بێدەنگی شڵەقاندن بەهۆی شتێکەوە

«شەپۆلی دەنگ» «شەپۆلی ئاو»

«بە فڕەفڕی باڵیان ئەو دەریای بیدەنگیەیان دەشڵەقاند و شەپۆل لە گوێی تماشاچیەکانی دەدا. ئەو دیمنە لە دلی هەموو تەماشاچیان هەریەک بە جۆریک کاری کردبوو. ئەوەی تێگەیشتبوون پێی وەکەیف هاتبوون و گەشابوونەوە؛ ئەوانەی نەزان بوون داهێنەرێ بوون و توابوونەوە» (قزڵجی، ١٩٤٦:٤).

لە شوێنێکی دیکەی چیرۆکەکەدا، کە گوزارشت لەو زمانە ئەدەبییە دەکات:

«تاریکایی زۆری سەند و ڕەنگی پەردە هەر شینێکی ئاماڵ خەمی بۆ گیانی پیاوە گەورەکانی شەهیدی ڕێگای ئازادی دە لیباسی ئەستیرەی سینمادا دیاریان داو بەرەبەرە ڕۆحی ژنان و مندالانی بێ گوناهی قوربانی ئەو ڕێگایەش بە جلی ئەستیرەوە دەرکەوتن و هاتنە کایەوە سەرنجێکی کوردستانیان دا و لە نەتەوەکەی خۆیان ورد بوونەوە. کوردستانی ئازاد دەرفەتی هێنا لە هەوەڵەوە خۆی نیشاندان. ئەستیرەکان

بەدیتنی ئەو دیمەنە گەش بوونەوە لە خۆشیا چاویان لەیەک دادەگرت و ئیشارەیان بۆ ئـەو پارچـە کوردەواریـە دەکرد».

سەبارەت بە شێوازی چوارەم، کە گرێدراوە بە ڕەنگدانەوەی «داستان، ئەفسـانە، مێـژوو» ئـەم شـێوازەش لـە چیرۆکەکانی ئەو دەمدا بە زمانێکی داستانی یان لە هەندێکیاندا ڕەنگدانـەوەی جۆرێـک لـە ئەفسـانەیان پێـوە دیارە. هەروەها لە چەند چیرۆکێکیشدا زمانی مێژوویی یان چیرۆکنووس مێژووی زنجیرەی ڕووداوەکانی یـان ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر کارەکتەرەکاندا هـاتووە تۆمـار کـردووە. نموونـەش بـۆ ئـەم شـێوازە لـە چیرۆکـی کوردیدا، ئەو چیرۆکەیە کە لەلایەن «د.کامران عـالی بـەدرخان»ی چیرۆکنووسـەوە بـەناوی «ئـەیلۆیێ پـیر» (عالی بەدرخان، ١٩٣٣: ١) نووسراوە. لەم چیرۆکەدا ئەگەرچی لە سەر بنەمای دیالۆگ نووسراوە، بـەڵام تێمـی چیرۆکەکە نزیکییەکی لەگەڵ حیکایەت یان ئەفسانەی پێوە دیارە. ناوەرۆکی چیرۆکەکەش بەگشتی باس لـە عەشقی دوا تەمەنی پیرەمیرێک دەکات کە لەگـەڵ خواسـتی کوڕەکەیـدا بـۆ هـەمان کـچ ڕوو لـە ڕووە و لـە ناچاری و کە لە توانایدا نابێت دەستبەرداری یارەکەی بێت، بڕیاری خۆکوشتنی خۆی و یارەکـەی دەدات. ئـەم ڕووداوەش لەو دەمەدا ڕوو دەدات کە لەگەڵ کوڕەکەی لەسەر ئەوە ڕێکدەکەون کە کچە فڕێبدەنە دۆڵـێکی هەزار بە هەزارەوە. هەر لەو ساتەدا و بەدوای فڕێدانی کچە دەگاتە ئەو ئاکامەی کـە ژیـان لـە دوای ئـەو هـیچ مانایەکی نییە و بۆ ئەمە هەر لەو شوێنە خـۆی فـڕێ دەداتـە خـوارەوە. کەواتـە مۆتیڤـی چـیرۆک عەشـق و قوربانیدانی پیرە هەڵۆیە و کچە جارییەکەیە بۆ یەکدی. بەو واتە کچەش هـەر لـە پێنـاو ڕێـز و خۆشەویسـتی خۆی بۆ «ئەیلۆیا پیر» واتە پیرە هەڵـۆ بەفـەرمانی کوشـتنەکەی ڕازی دەبێـت. ئەمـەش ڕووی ڕاسـتەقینەی داستانەکەیە کە داستانێکی قوربانیدانە لە پێناو خۆشەویستیدا. ئەمە نموونەیەکـە لـەو زمـانی چیرۆکـەی کـە ڕەنگدانەوەی داستان یان ئەوشتانەی پێوە دیارە، بەتایبەت لەو شوێنەی کە سەرەتای چیرۆکەکەیە و دەڵێ لـە ماڵی میردا سێسەد جاری هەبووە:

«مالا وی سێسەد جاری هەبوون، پۆر زەر و چاڤشین، پۆرڕەش و چاڤ کەسک، ددان مراری و لـێڤ گـوڵ و هەمی ژی وەک روهنییا ڕۆژا گولانێ زەلال و وەک کولیلکێن مەها ئاداریێ سپەهی بوون، لـێ کەسـەکی ژ وان هندە کەچکا شنگاری هەڤین سەە نەدکر و هەژکرنا وا قاسی ئا شنگاری تێـر پـەل و پـەڕەنگ نـەبوو» (عـالی بەدرخان، ١٩٣٣: ١).

هەروەها لە شوێنێکی هەرئەو چیرۆکەدا نموونەی ئەو دیالۆگە دەهێنێنـەوە کـە هـی کارەکتـەری بـاوکی پیرە هەڵۆ و گورگینی کوڕی وکچەکەیە کە بەناوی «پەریخانی شنگاری»یەوەیە و خودی ئـەو دیالۆگـەی کـە لە کۆتایی چیرۆکەکەدایە، تێیدا گوزارشت لە کرۆکی چیرۆکەکە یان زمانی چیرۆکەکە دەکات کە بە زمـانێکی داستانی چنراوە:

«- دە وەرە ئەم هەرن .. چەند گاڤان ب هەڤ رە چوون

ژ نشکاڤە میر سەکنی و گۆت:

- ما ئەز دچم کوو؟ ما ئەز ژ بۆچی دچم؟ ژینا من هەمی ڤێ رە بوو، ما کۆ ئەو چوو ژین و ڕەحەتی ژ بۆ من چنە، چرەنە.. کێری چ تێن. ئەز پیرم، کەس ئێدی هەژ من ناکە و ژینا بێهەڤین ما نە دینیتییە؟

کورێ وی گۆت:

- باڤێ من، تۆ ب ناڤ و دەنگی، د دەستێ تەدە گرتن و بەردان و دەولەمەندی هەیە.

میر گۆت:

- گورگین ژ لێفا وێ ڕامووسانەکا بدە من و دەولەمەندییا من ژ خوەرە ببە ئەو تشتێن کۆ تە هەژمارتن تشتێن مری و بێ جانن، تنێ هەڤین و ژین ڕەنگدار و بهندارن، کانییا ژینێ ژنە. یا کۆ بێهەڤینە بێ ژینە، ژارە، پەریشانە و ڕووژێن وی ب خەم و کەسەر ب کۆڤان و هێسترن.

بلا خوەدا هەر ئاریکارییا تەبکە گورگین، شەڤ و رووژێن تە ب تەناهی و خوەشی ببۆرن.

- میر ئەڤ خەبەر گۆتن و دەست چوویا ئالیێ ئاڤێ ڤەکر.

گورگین قیرەک دا و گۆت:

- باڤۆ! و سەکنی، نکاری بوو تشتەک دی سەر ڤێ زەیدە بکت. ژ زەلامێ کۆ ژینێ وی ژێرە تەحل بوویە و مرن پا دکەنە و وی گازی با خوە بکە ژارە چ تا گۆتن.

باڤێ وی لێ ڤەگەراند:

- دەست ژ من بەردە، کوڕێ وی گۆت : وخوە دێ

میر گۆت:

- ئەو هەر تشتی دزانە و ب لەز گها سەرێ زناری و خوە ئاڤێت ئاڤێ..

دەنگێ بایێ ل ناڤ دار و چیان خورت و تیژ دهات» (عالی بەدرخان، ١٩٣٣: ١).

«فایەق کاک ئەمین» لە چیرۆکی «ئەرخەوانی گـردی سـەیوان لانـەی ئەبدیمەنـدی ئینسـان»دا زمـانێکی مێژوویـی بـە پێـی تۆمـارکردنی مێـژووی ڕووداوەکـان وەک ڕۆژمێرێـک یـان بیرەوەرینامەیـەکی کەسـی چیرۆکەکەی کردۆتە چەند بازنەیەکی مێژوویی تۆمارکراو (کاک ئەمین، ١٩٤٥: ٥٢). دەکرێ لێرەدا نموونـەی دوو تۆماری مێژوویی یان دوو بازنەی ئەو چیرۆکە کە بـە زمـانێکی ڕۆژمێـری -مێژوویـی لەلایـەن نووسـەرەوە ڕیزبەندکراوە، بخەینە بەرچاو:

« مارت ١٩٣٢ – هیوام دی خۆی و کەس‌وکـاری وەکـوو گەنجینـەی دنیایـان پـێبەخشـرابێ لـە بـەزم و خۆشیدا بون، خزم و کەس‌وکار کەوتنە تفاقی شایی؛ لەیلی و مەجنونی بەهەشت بەیەک شادبون.

نیسانی ١٩٣٢ – بەخاو خیزانەوە چووینە میوانی ئەم دۆستە دلسوزەم، ماڵ، منداڵ، ژن، پیاو بۆ ئەم دوو دڵـە شاد و خوڕەم بوون... ئاخ! داخەکەم! نەیئەزانی کەوا ئەمە ئاخر دیدەنیم ئەبێ؟» (کاک ئەمین، ١٩٤٥: ٥٢).

هەر سەبارەت بەم جۆرە لە شێوازی چیرۆکدا، «عوسمان سەبری» لە چیرۆکی «سـەیا کـۆ گـور تـانی فێـزا پێز»دا لە سەرەتای چیرۆکەکەیدا لە دوو شوێن تۆماری ئەو مێژووەمان دەداتێ کە گورگ زیانی بە پەزەکـەی گەیاندووە. ئەمەی خوارەوەش ئەو دوو ئاماژە پێدانەی چیرۆکنووسە بۆ مێژووی ڕووداوی چیرۆکەکە:

« د تەباخا سالا ١٩٢٣ ئاندا گورەک هینی کەریێ پەزێ من بوو با.....

لێ د مەها تەباخا ١٩٢٣ ئان ب تەنێدا نیزیکا بیست مهێن چاک ب دەڤ گورەکی ڤا بەردان» (سەبری، ١٩٤٣: ٥).

سەبارەت بە شێوەیەکی دیکەی ئەم شێوازە، زمانی مێژووییە کە لە زمانی چیرۆکەکەی«جەوهەر ئاغا» بە نموونەوە دەهێنینەوە کە تێیدا گوزارشت لە مێژووی ڕووداوێک دەکات کە بەسەر کارەکتەرەکی نێو بنەماڵەیەکی ناوداری خەباتی ڕزگاریخوازی کورد دێت کە لەلایەن خودی چیرۆکگێڕەوەی یەکەم کە باوکی چیرۆکنووس (عەلائەدین سەجادی)یەوە گێڕدراوەتەوە و خودی چیرۆکگێرەوەی یەکەمیش شایەتحاڵی ئەو ڕووداوە بووە. تێیدا «جەوهەر ئاغای شکاک» لە شاری تەورێز بەدەستی عەجەمەکان بەناوی بانگهێشتکردنەوە دەکوژرێت، ئەم نموونەی لایەکی ئەو زمانە مێژووییەیە، کە لەلایەن چیرۆکنووسەوە نووسراوە:

«ئەمانە قسەی باوکم بوو کە دەربارەی جەوهەر ئاغا بۆی گێڕامەوە. ئەوی کە منیش خۆم بیزانم ئەم جەوهەرئاغایە برای سمایل ئاغای سمکۆ بوو. ئەو دوو پیاوە کە خۆیان لەناو شاری تەورێز دەرباز کرد، خۆیان ئەگەیننەوە لەشکری سمایل ئاغا. ئەو وەختە سمایل ئاغا لەبەر ئەوە کە جەوهەرئاغا برا گەورەی بووە و ئەمیش ناویکی وای نەبووە سەروکاری لەشکر ومەملەکەتداری هەر بەدەست جەوهەرئاغاوە بووە؛ کە کوژرانی جەوهەر ئاغا و کارەساتی عەجەم ئەگێڕنەوە، سمایلئاغا لە شوێن کاکی دائەنیشت و کەمەری خوێنسەندنی جەوهەرئاغا ئەبەستی» (سەجادی، ١٩٤٩:٧٢-٦٢).

### شێوازی پێنچەم: وشە لە زمانی هزریدا ، ئایدۆلۆجی ، ئاین

سەبارەت بەم جۆرە لە زمانی چیرۆکدا، دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتای سالانی سییەکان و لەوێدا کورتە چیرۆکی «هاوار هەبە گازی ل دوویە» کە لەلایەن «قەدری جان»ەوە نووسراوە و یەکەم هەنگاوە لەو بوارەدا. کە لە چیرۆکی کوردیدا گوزارشت لە دیالۆگێکی هزری (ئایدیۆلۆجی) بکرێت، دیالۆگی چیرۆکەکەش گوزارشت لە هێڵی نەتەوەیی و نیشتمانی دەکات، کە لە نێوان باوک و کوڕدا کراوە کە سیمایە بۆ دوو کارەکتەری ڕۆشنبیر و نەتەوەیی (قەدری جان، ١٩٣٣: ٥)

«گەلۆ، ئەڤ خەونە؟ چاڤێن خوە ڤەدکم باوەڕ ناکم، لێ دزانم ئەڤ دەنگ دەنگێ کورێ منە.

-باڤۆ ! باڤۆ !

- ها کورێ من ئەز ل کوومە؟

- باڤۆ ! باڤۆ من ل مالە، چما چاڤێ خوە ڤەناکە؟ دیسان ب ترس کو من چاڤێن خوە ڤەکر من دیت ئەز ل مالا خوە، دناڤ زارۆیێن خوە، ل جهێ خوە مە. کوڕێ من "هیم گران" ل بەرسەرێ من روونشت و گۆت:

- باڤۆ، گاڤا کۆ رۆمۆ وەلاتێ مە دشەوتاند تو هێ ل کوبوویی، ژ بەر ڤێ یەکێ مە خوەرت و جانان هەڤ دوو گرت و دژمنێن خوە قەلس کر، مە وەلاتێ خوە ئاڤاکر دڤێت کو باڤا ژی بهاتا، لێ تە خویانەکر، ژخوە، من خەونا تەژی دیتبوو کو تو د تەنگاسییێ دەیی، تو ل مە "هاوار" دکی» (قەدری جان، ١٩٣٣: ٥).

زمانی چیرۆکی «دوو عەگید»یش کە دوو کارەکتەری شۆڕشگێرن و هەڵگری پەیامێکی ڕۆشنبیری و گوزارشت لە هەڵوێستی نیشتمانپەروەری دەکەن، بەتایبەت ئەو هەڵوێستە کاتێ سەرهەڵدەدا کە هەردوو قارەمان بەدیل گیراون و کەوتوونەتە نێو دەستی دوژمنانەوە. لە دیالۆگی یەکێک لە دوو عەگیدەکە، ئەوەیە کە وەسیەت دەکات کە پاش مردنی لاشەکەی و چەک و فیشەکدانەکانی لە شوێنێکی کوردستاندا بنێژرێت کە وارگە و شوێن پێی شۆڕشگێرانی کوردبێ و هەر لەوێدا گوێی لە تەپەتەپی پێی ئەسپی شۆڕشگیران بێ تا لە سایەی ئەو دەنگە خۆشەوە مەلی ڕۆحیان شادبێ و لەوێدا خودی دیالۆگەکە گوزارشت لەزمانێکی هزری نیشتمانی و شۆڕشگێری دەکات:

«- برا هێڤیيەک یا من ژ تە هەیە، حەقە ئەز نهۆ مرم، لاشێ من بخوە ڕە ببە، ئو من ل ئەردێ کوردستانێ ڤەشیرە.کۆلاشێ من دانە سەر سینگا من، تفنگا من بدە دەستی من و خەنجەرا من بخێ بەر پشتا من . ئەز دخوازم وسا راکەڤم و بیهیزم، وەک نۆبەتدارەک د گۆرنا دە، هەتا کۆ دەنگی تۆپان و شەهینا هەسپان بێت، دەما رەپەرپا هەسپێن عەگیدێن کوردان دسەر تربا من رە ببۆرن و دەنگا تفنگ و تۆپان بێن، ئەز ب چەکێن خوەڤە ژ تربا خوە، خوە هلا ڤێژم، ژ بۆ ستاندنا وەلاتێ خوە؛ ژ بۆ ستاندن وەلاتێ خوە» (عالی بەدرخان، ١٩٣٢: ٥).

د.نورەدین زازا لە کورتە چیرۆکی «کەسکە سۆر»دا و لە داڕشتنی چیرۆکەکەیدا پەنای بۆ ئەم جۆرە شێوازەی زمان بردووە کە ئەویش زمانە هزرییەکەیە و گوزارشت لەو رەوشە دەکات کە شۆڕشگێرانی کورد لە ساتەوەختەکانی هەڵگیرسانی ڕاپەرینەکەی شێخ سەعیدی پیراندا کەوتبوونە نێو باژێرە کوردییەکان و لە سەربانی دەزگا فەرمییەکان و ماڵانی کورداندا ئالای سەوز و سووری کوردستانیان لە جێی ئالا داگیراوەکانی دوژمندا دادەچەقاند. چیرۆکەکەش بیرەوەرییەکی منداڵی خودی چیرۆکنووسە لەگەڵ باوکیدا کە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە (زازا، ١٩٤١: ٤):

«من ئەوەڵ سەر هەسپێ دیت، ئەز چووم جەم، وی ئەز دانێ بەر خووە.

من ژێ پرسی:

- باڤۆ ئەڤ چکەسکە سۆرە ل سەر سەراییێ؟
- ئەڤ ئالا مەیە، کوڕا من! ئەڤ شان و شەرەفا ملەتێ کوردە.
- بەرێ یەکە سۆر هەبوو، ئەو چ بوو باڤۆ؟
- ئەو یا نەیاران بوو. نەیار ب زۆر کەتبوون وەلاتێ مە. ئەم کورد ئیرۆ وان ژ ئەردێ خوە دەردخینن و دبنە خوەدیێ وی. ها ژ تەرە ئالەکە بچووک! وێ دەینە سەر دلێ خوە. هەژی وێ بکە و ژ بۆ سەرفرازییا وێ بخەبتە.

ئەز ب گۆتنێن باڤێ خوە بووم سەرمەست. دلێ من هلداڤێت باڤێ من ئەز ماچ کرم و ئەز دانیم ئەردێ» (هەمان سەرچاوە).

حوزنیموکریانی لە کورتە چیرۆکی «دز و ڕەبەن»دا -کە نموونەی لەم جۆرە چیرۆکە لە نێو چیرۆکەکانی بەر لە خۆی، بەتایبەت ئەوانەی کە بە دیالێکتی کرمانجی خواروو نووسراون بێوێنەیە- بە تایبەت سەرتاپای

چیرۆکەکە لە دیالۆگێکی هزری ئاینی پێکدێت کە لە نێوان دوو کارەکتەری چیرۆکەکە کە یەکێکیان دز و ئەوی دییان ڕەبەنە و لەوێدا هەردوو کارەکتەر بەهێنانەوەی وتەو فەرموودە و ئایەتەکانی قورئان داکۆکی لە هەڵویستی خۆیان دەکەن کە ئەمەش لایەکی ئەو زمانەیە کە دیالۆگەکەی پێ داڕێژراوە:

« دز: من ڕێگرم هاتووم ڕووتت دەکەمەوە.

ڕەبەن: بۆچی تۆ لە خودا ناترسی ؟

دز : ئەگەر لە خودا ترسم نەبوایە لە پێش ئەوەدا دەنگت بدەم، تۆم دەکوشت جا لە پاشان ڕووتم دەکردیوە و کەلوپەلەکەتم دەبرد.

ڕەبەن: تۆ هیچ شەرم ناکەی؟ نەتبیستووە کە پیغمبەر فەرموویەتی: الحیاء من الایمان.

دز: بۆچی تو نەتزانیوە کە پیغمبەر فەرموویە: الحیاء یمنع الرزق.

ڕەبەن: "استغفر الله و اتوب الیه!" خودایە تۆبە بێ! من چ گوناهێکی گەورەم کردووە کە وا تووشم بە تووشی ئەم دزەوە بووە و گرفتاری دەستی ئەمت کردووم» (موکریانی، ١٩٤٥: ١٥٥).

سەبارەت بە شێوازی شەشەم کە دوا شێوازە لە زمانی چیرۆکەکەی سەردەمی نامەکان کە ئەویش بەکارهێنانی وشەی بیانی و بەکارهێنان یان ڕەنگدانەوەی «شێوەزا-گۆڤەر»ی کوردی ئەو ناوچانەی کە بەلای هەندێک چیرۆکنووسدا بەکارهاتوون. نموونەی دیارمان بۆ ئەو جۆرە زمانەی چیرۆک، زمانی چیرۆکەکانی «ئاواتی دڵ، گەشتیک بەسەر باڵی پەرندەی خەیاڵەوە»، «ئەرخەوانی گردی سەیوان لانەی ئەبەدیمەندی ئینسان»، «دوچاو و بەیتێک» کە لەلایەن هەر یەک لە نووسەران «پیرەمێرد، فایەق کاک ئەمین، ڕەشید نەجیب»ەوە نووسراون. یەکێک لە خاڵە سەرنج ڕاکێشەکانی زمانی چیرۆک، بەکارهێنانی وشەگەلی فارسیە، بۆ نموونە لە خودی ناونیشانی چیرۆکەکەی «ئاواتی دڵ، گەشتیک بەسەر باڵی پەرندەی خەیاڵەوە»دا وشەی «پەرندە» وشەیەکی فارسییە و لەو وشە فارسییە فەرهەنگیانەی دیکەش کە لە نێو زمانی چیرۆکەکەدا بە زمانی کارەکتەرەکەی چیرۆکەکە کە خودی چیرۆکنووس خۆیەتی بەکارهاتووە وەک لە وشەکانی: «زەمین، بێپایان، کردگار، پەروەردگار، نەستەرەن» دەبینرێت و ئەمەش نموونەی چەند دێڕێکی چیرۆکەکەیە:

«- پاش ئەمەی زەمین بە باری خۆیا سووڕا.. / هتد.

- سەرنجم دایە کردگاری دەستی پەروەردگار.. / هتد.

- ئەم هەموو گوڵو نەستەرینانە، ئەم میوەو میوەهاتەو ئەم هەموو دڕندەو پەرندانە» (پیرەمێرد، ١٩٣٣: ٢).

لەچیرۆکی دووهەمدا لەلایەن فایەق‌کاکەئەمینەوە نووسراوە و وشەگەلێکی فارسی زەقی بەکار هێناوە کە تا ئەمڕۆ لە زمانی ئەدەبیماندا بەکارنەهاتووە و بەکارنایەت وەک وشەکانی:

«وەلی، لەرزش، زیرا[١] ، غەمگوسار، ناگەهان، جان خەراش، ئاشیانە، زهیخلق، بیمارستان، دیدەگریە، نەدامەت، دەرئاغووش، باعێففەت، شرافەتمندی، کردگار ئەعزەم، عێفەتمەندی». هەموو ئەو وشە فەرهەنگییە

---

[١]- زیرا.. هەروەک ئەوەی وشەیەکی فەرهەنگیی فارسییە و بەمانای ( لەبەر ئەوە، چونکە )دێت، بەلام بەداخەوە خودی بەکارهێنانی ئەو وشە فارسییە بەتایبەت وشەی (زیرا) لە ماستەرنامەکەی "پەرێز سابیر"دا بەناونیشانی «بینای هونەری

فارسییانە، یان فارسین لە بنەڕەتدا و یاخود عەرەبین و بە فارسیکراون. لە نێو پانتایی زمانی دەقی چیرۆکەکەدا دەبینرێت و لە بالا وشە فارسییەکانیش ئەم وشە عەرەبییانەش بەکارهاتوون کە ڕەنگدانەوەی ئەو بەکارهێنانە زمانییەیە کە لە زمانی بەرهەمە ئەدەبییەکانی بیستەکاندا دەبینران، بەتایبەت لەسەردەمی ڕۆژنامەگەریی دەسەڵاتی شێخ محموددا، ئەو وشە عەرەبییانەش ئەمانەن:

«هاتف، نشوه، زلی، فاسق، فکر، کلمه، أسفا، مداخله مسائل، اعظم، رافت و لطیف، محنت، نفقه، أمر، انزار، هیهات، منظره، گیر».

ئەگەر چی نووسەر دەیەوێت بەو زمانە چیرۆکەکە بنووسێت کە زمانی ناو خەڵکی ئەو سەردەمەیە، بەڵام زێدەکاری لە بەکارهێنانی وشە فارسییەکاندا وەک هە ربەو زمانە ئەدەبیەی بیستەکان ناچێت، بەڵکوو هەر بۆ خۆی بۆتە شێوازێکی تایبەت بە زمانێک کە هەر تەنها خۆی بەکارهێنەری بێت. ڕەشیدنەجیبیش لە چیرۆکی «دوچاو و بەیتێک»دا تا ڕادەیەک نزیکە لەو بەکارهێنانە زمانییەی هەردوو چیرۆکنووسی بەر لەخۆی؛ واتە ئەو دوانەی کە لە سەرەوە باسمان لێ کردن، بەڵام هەموو ئەو وشە بیانییانەی کە لە دەقەکەیدا بەکاری بردوون، سەر بە زمانی فارسین. ئەمەش نموونەی ئەو وشانەن: «پنهان، گاه، پاسخ، گوریز، بادە، وەلی، دەست نویشت، خاموش» (نەجیب، ١٩٤٦: ٦٥).

ئەم چەند دێڕەی خوارەوەش، چەند لانەیەکی ئەو شێوازە زمانییە کە لەچیرۆکەکەی «دوچاو و بەیتێک»دا دەردەکەوێت:

« لەپایزیشدا ، لەهەنگامی گەڵاڕێزانا ..»

«- گاهیکیش لاویکی پر جۆش و خرۆش ...»

« لە پاسوخی پرسیارەکەی من گوریز بکا ...» (نەجیب، ١٩٤٦: ٦٥و٦٦و٦٧)

دیارە هۆکاری زێتر بەکارهێنانی وشەی فارسی بەبەراورد لەگەڵ وشە عەرەبییەکان لەلای هەندێک لەو چیرۆکنووسانە دەگەڕێتەوە بۆئەم چەند خاڵەی لای خوارەوە :

١- هەژاریی زمانی کوردی ئەو سەردەمە.

٢- گەڕانەوە بۆ ژێربالی خێزانەزمانەکان.

٣- هەوڵی دەرخستنی توانای چیرۆکنووس لەبواری شارەزابوونی بۆ زمانە فارسییەکە و دەرخستنی کاریگەربوونی بۆ زمانە ئەدەبییەکەی.

بەکارهێنانێکی دیکەی ئەم شێوازە زمانییە، بەکارهێنانی زمانێکی ناوچەییە؛ واتە بەئەندازەی جیاواز ئەو جۆرە بەکارهێنانە لەهەندێک چیرۆکی کوردی ئەو سەردەمە ڕەنگیداوەتەوە و لەلایەن هەندێک لەو چیرۆکنووسانە کاری پێکراوە، بەتایبەت ئەم بەکارهێنانەش لە سنوورێکی تەسکی نێو ئەو ئەزموونەدا دەبینرێ. ئەم شێوازە زمانییەش دەتوانین لەو دووچیرۆکە ببینین کە بە دیالێکتی کرمانجی خواروو

---

چیرۆکی کوردی»دا ، وەک ناوی کارەکتەری چیرۆکەکە ناسێنراوە، تەنانەت لە چاپکردنی نامەکە وەک(کتێب)یش ئەم هەڵەیە هەستی پێنەکراوە و ڕاست نەکراوەتەوە. بروانە: (سابیر، ٢٠٠٠: ١٩٨).

نووسراون. ئەوانەش چیرۆکەکانی: «مام پیـاو» و «فیلمـی عاسمـان لـە سـینمای کوردسـتان»ن. ئەگـەرچی بەکارهێنانی «شێوەزار-گۆڤەر» لەنێو ئەو چیرۆکانەی کـە بـەدیالێکتی کرمـانجیی ژووروو نووسـراون، بـەرچاو ناکەون و تێکڕا هەر بەو گۆڤەرە نووسراون کە سەنتەری دیالێکتەکەیە و بە گۆڤـەری «بۆتـانی» ناسـراوە. هـەر سەبارەت بەو شێوازەی کە لەهەردوو چیرۆکی سەرەوەدا بـەکارهاتوون، سـەرەتا نموونـەی چەنـد دێـڕێک لـە چیرۆکی «مام پیاو» دەهێنینەوە کە ئـەو شـێوازە زمانـە لـەدوو دیـالۆگی هـەردوو کارەکتـەرەکانی چـیرۆک (پیرۆت و گەوهەر) دەخاتە پێش چاو:

«پیروت ڕووی لە پەریزادی خۆشکی کرد و پێیوت:

داخوا ئەو باخچە جوانە پڕ دارو بارەی پڕ میوە و گوڵ و گوڵزارە قەشەنگەی خۆمانـت لـە بـیرە کـە منداڵـی تێیدا دەگەڕایین و گەمەمان تێدا دەکر؟» لە شوێنێکی تر:

«گەوهەر: بابە ئیدی ئەم چیرۆکە خۆشە کـە دەتـزانی بـۆچی تـاکوو ئێسـتا بـۆ منـت نەگێڕاوەتـەوە؟» یـا لەشوینێکی تر:

پیروت: تووڕە بوو، وتی: پەریزاد تۆ چی دەڵێی؟ بۆچی هەوەسم پەرت دەکەی؟ چۆن بە زمانتدا هـات بڵـێی مام پیاو نەبووە و نەهاتووە وجود؟بوون و نەبوونی ئـەم گەردوونـە و چلـونی مـرۆڤ و جیهانیـان بخەیـە پـێش چاوان ئەوجا بۆت ئاشکرا دەبێ کە بوونی مام پیاو ڕاستە و چتێکی کە هەشبێ بـوونی مـام پیـاوە و بەتایبـەتی چلۆنیەتیەتی» (موکریانی، ١٩٤٤: ٢٦٤-٢٩٧).

حەسەنی قزڵجیش لە چیرۆکی «فلیمی عاسمان»دا بەم جۆرە و هەر بـەو شـێوازەی هاوەڵـەکەی (حـوزنی موکریـانی) کـە ڕەنگدانـەوەی شـێوازی موکرییەکەیـە، هـەرخۆی چیرۆکگێـڕەوە و کارەکتـەری سـەرەکی چیرۆکەکەیە، بەم شێوازە:

«پەردەی سینەما بەجارێک شینایی دایگرتبو دەتگوت تەشتیکی زۆر زلت پرکردووە».

لە شوێنێکی دی:

«پەردە بەم دێرە دوایی هات خۆشی لەوانەی وک ئەو باڵندانە دە تاریکاییشدا لە فکری وڵاتی خۆیاندا هەن»

هەروا لەشوێنێکی دیکەشدا دەڵێ:

«گیانی پیاوە گەورەکانی شـەهیدی ڕێگـای ئـازادی دە لباسـی ئەسـتیرەی سـینمادا دیاریـان دا» (قزڵـچی، ١٩٤٦).

## پاری سێهەم:

## نەگونجانی دیالۆگ و کەموکۆڕی لەخستنەڕووی کارەکتەرەکاندا:

لە ئەزموونی کورتە چیرۆکی ئەو دەمەدا کەتازە بە تازە دیالۆگ بەتایبەت جۆری دیالۆگە دەرەکییەکـە وەک تەکنیکی نوێ سەرەتاکانی بەکارهێنانی لە نێو دەقە چیرۆکەکانی ئەو دەمەدا جێی خۆی دەگـرت. بەتایبـەت ئەو چیرۆکانەی کە لەنێو ژمـارە سـەرەتاییەکانی گۆڤـاری «هـاوار»دا دەردەکـەوتن و بـەدیالێکتی کرمـانجی ژووروو بڵاو دەکرانەوە.

**بەشی پێنجەم- رەخنە**

سەبارەت بەم بابەتە سەرەتا دەچینە نێو گاڤە سەرەتاییەکانی ئەم ئەزموونە و چیرۆکی«بەرتەڤنا مەهفووریێ» وەک یەکێک لەنموونەی ئەو چیرۆکانە دەخەینە پێش چاو کەچیرۆکنووس تێیدا دیالۆگی«زیزێ»ی کارەکتەری سەرەکیی چیرۆک دەداتە«ڕندێ»ی خوشکی. دەرکەوتنی ئەو هەڵەیە یان کەموکۆڕییە لەوەدا دەردەکەوێت، کە نووسەر لەدەسپێکی چیرۆکەکەی ئاست وتەمەنی کارەکتەرەکانی دەخاتە پێشچاوی خوێنەر و لەوێدا بەمجۆرە دەڵێ:

«ڕندێ سێزدە و زیزێ پانزدە سالی بوو، برایێ وان ئێ کچیک گەفۆ هێژ نوو کەتبوونەبان» (بەدرخان، ١: ١٩٣٣).

ئەگەرچی ئەم پاژە، دوا پاری بەشی سێهەم و توێژینەوەکەمانە لەچاو پارەکانی دیکەی نامەکە، کەمترین توێژینەوە دەگرێتە خۆی، ئەویش لەبەرکەمی ژمارەی ئەو چیرۆکانەی کە دەچنە ژێر تیشکی پارەکە. بەواتە تەنها سێ چیرۆک بەرچاو دەکەوێت کە هەڵگری باسی پارەکە بن.

کەواتە "زیزێ" کە کارەکتەری سەرەکیی چیرۆکەکەیە و خوشکی گەورەیە و لە ڕندێی خوشکی گەورەترە، ئەوەی جێی سەرنجە بە درێژایی چیرۆک، نووسەر دیالۆگی ئامۆژگاریی و ئاڕاستەکردنی ڕێنوێنییەکان دەداتە زیزێ کە خوشکی گەورەیە و بەو هۆیەوە دەخوازێت «ڕندێ»ی خوشکی ئامۆژگاری و فێری خۆراگرتنی بکات و ئەو پەیامەی کە باوکیان بەدوای شەهید بوونی بۆیان بەجێ دێڵێت بە گوێی «ڕندێ»دا بدات، بەڵام نووسەر لەدانانی ناوەکاندا لە شوێنێکی دیالۆگەکەدا ئەکەوێتە نێو لێتێکچوونێک لەنێوان هەردوو ناوەکەو لەجێی ناوی «زیزێ»، «ڕندێ» دادەنێ. ئەم هەڵەیەش لە پێنجەمین پەرەگرافی چیرۆکەکەدا زۆر بە ڕوونی دیارە وتێیدا ئاماژە بەوە دەکات کە ڕندێ بەتەمەن دوو ساڵ لە زیزێی خوشکی گەورەترە کە پێچەوانەی ئەو ناساندنەیە کە چیرۆکنووس لەسەرەتای چیرۆکەکە تەمەنی زیزێ بە ١٥ ساڵان و تەمەنی ڕندێ بە ١٠ ساڵان دیاریدەکات.

بەواتە لەوێدا ڕندێ دیالۆگی خوشکی گەورە وەردەگرێت و ئاڕاستەی زیزێ دەکات کە ئەمە دانی خەسلەتێکی نەگونجاوە بۆیەکدی. ئەمەی خوارەوەش نموونەی ئەوشێوە نەگونجانەیە:

«ڕندێ ژ زیزێ ب دوو سالان مەزنتر بوو، لێ دوێ چاخێ دە ئەڤ دوو سال هنگ پێنج سالان هێژابوون. ڕندێ ژ دێیێ خوە بێتر پێ مژوول دبوو و ئەو ب خوەدی دکر.

زیزێ هێدی هێدی دگری لێ نەدنالی.

ڕندێ دەستێ خوەها خوە دناڤێن خوەدە دگوڤاشتن و خەبتی پێ بگەرمینە. پشتی گاڤەکێ خوەها خوە ڕووناند ڕەخ خوە و ژێ ڕە گوت:

- ما زیزێ تو نزانی کۆ خەباتا مە ژبۆنێ گەفۆیە، ژ بۆنا خوندنێ گەفۆیە.
- بەلێ ڕندێ چاوان نزانم ، وەرنەبووێ کەنگێ دێیێ مە ئەم ددان خەباتێ» (بەدرخان، ١٩٣٣:١).

هەر سەبارەت بە نەگونجانی دیالۆگێک کە لەگەڵ ئاستی تەمەنی ئەو منداڵەدا ناگونجێ کە لەچیرۆکی «ئەرخەوانی گردی سەیوان، لانەی ئەبدیمەندی ئینسانان»ە دا دەرکەوتووە، بەتایبەت لەو شوێنەی کە (دیدار)ی دایک بۆ هەواڵپرسین سەبارەت بە تەندروستی هاوسەرەکەی کە لە خەستەخانەدا کەوتووە و

لەسەرەمەرگدایە ڕووی دەمی لە کوڕەکـەی دەنـێ و ئـەو پرسـیارەی لێـدەکات. لـە دیالۆگـە وەڵامییەکـەی منداڵەکەدا کە باس لەو حاڵەتەی باوکی دەکات .. دیالۆگێکی نـەگونجاو دەدات بەدەسـتەوە و بەتایبـەت لـەو وەسفە فارسییەی کە لە خودی دیـالۆگی منداڵـەکەدا هـاتوون کـە لەڕاسـتیدا ناگونجـێ وهـەرگیز منداڵـێک ناتوانێت بەو جۆرە دیالۆگـە قسـە بکـات. ئەمـەش نموونـەی نەشـیاویی ئـەو جـۆرە دیالۆگەیـە کـە لەلایـەن چیرۆکنووسەوە دراوەتە پاڵ کارەکتەرە منداڵەکە کـە تەمـەنی نزیکـەی سـێ ساڵـێک دەبـێ، چونکـە بـاوک ودایکی بەتایبەت لەو زانیارییەی کە بەزمانێکی مێژوویی ڕۆژژمێرئاسا هاتووە دەریدەخات کـە لـە ساڵـی ١٩٣٢ چوونەتە نێو ژیانی هاوسەرییەوە و ڕۆژە نزیکەکانی مـەرگی باوکیشـی لەلایـەن چیرۆکنووسـەوە دەباتـەوە بـۆ (کانوونی یەکەمی ١٩٣٥) ئەمەی خوارەوەش لایەکی ئەو چیرۆکەیە کە ئەو ڕاستییە دەردەخات:

«دوای ئـەم منقـرە جـان خەراشـە " ئـازا"م هینایـە لای دایکـی، دیـدار، ڕۆڵـە باوکـت ناسـیەوە؟ ئـازا بـە دڵشکستیەوە نە تەنها پیاویکی ڕەنگ زەردم دی بۆ من ئەگریا، وەکـو گیرێـک بـۆ دەر ئاغوشـیم  باڵـەفرکەی ئەکرد، وەلێ هەرەکەتی نەمابوو!» (کاک ئەمین، ١٩٤٣: ٥٢).

سەبارەت بەو کەموکۆڕیانەش کە گوزارشت لە جۆرە کارەکتەرێک دەکەن کە لە چیرۆکـی کوردیـدا جـۆرە پیشەیەکی دەدرێتێ کە لەنێو ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵی کوردەواریدا ناکۆکە یان نامۆیە، نموونەی ئەو هەڵەیە لـە چیرۆکـی کوردیـدا، نموونـەی چیرۆکەکـەی«نەسـرین»ە کـە چیرۆکنـووس لـە دانی پیشـەی گوڵـفرۆش، گولانێکیش کە بەسـەبەتە بفرۆشـرێت! ئـەم ئەرکـە نامۆیـەش دراوەتـە منالـەکەی نەسـرین، بەتایبـەت بـەو شێوەیەی کە چیرۆکنووس باسی لێوەدەکات. لە جڤاکی کوردەواری و بـە تایبـەت لـە کومەڵـی گوندنشـینی کوردەواریدا، بە هیچ  ڕەنگێک بوونی نییە. ئەمەی خوارەوە نموونەی ئەو حاڵەتەیە:

«پاش ڕابواردنی چەند ئێوارەیە لەسەر پەنجەرەی ژوورەکەم دانیشتبووم تماشای جادەکەم ئەکرد گـوێم لـە بانگکردنی فروشیارەکان ئەگرت منالێک لیم نزیک بووە، گشت گیانی بەدەرەوە بـوو لـە ڕووتیـا، سـەبەتەیەک گوڵی ڕەنگاوڕەنگی پێ بوو بە دەنگیکی کزەوە پێی ووتم:  گوڵ ناکڕی گەورەم؟ کە سەیری سـەروچاویم کـرد هەستم بە بەسەرهاتی ئەم منالەم کرد دوو گوڵم لێ کڕی و» (خەفاف، ١٩٤٤: ٧٦-٧٧).

**بەشی پێنجم- رەخنە**

## سەرچاوەکان


- ئەحمەد، ئیبراهیم (١٩٤٥) **کوێرەوەری**، گ.گەلاوێژ، ساڵی٦، ژمارە٤، بەغدا.
- یونسی، ابراهیم (١٣٨٤) **هنر داستان نویسی**، تهران، موسسه انتشارات نگاه، چاپ هشتم.
- سەگمان، بشارێ (١٩٤٤) **بێبەختی**، گ.رۆناهی، ژمارە٥٧، شام.
- پیرەمێرد (١٩٣٣) **ئاواتی دلێ،گەشتێک بەسەر باڵی پەرندەی خەیاڵەوە**، رۆژنامەی ژیان، ژمارە٣٥٥، سلێمانی
- حاجۆ، جەمیلی (١٩٣٢) **سەرهاتیا ڕشوئی داری**، گ.هاوار، ژمارە١٤ ، شام.
- جاف، حەسەن (١٩٨٥) **چیرۆکی نوێی کوردی**، بەغدا، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی.
- قزڵجی، حەسەنی (١٩٤٦) **فیلمی عاسمان لە سینمای کوردستان**، ر.کوردستان، ژمارە٧١، ساڵی یەکەم، مەهاباد.
- حوزنی موکریانی (١٩٤٢) **سەپان و جووتیار**، گ.دەنگی گیتیی تازە -بەرگ-١، ژمارە(٢)، بەغدا.
- حوزنی موکریانی (١٩٤٤) **مام پیاو**، گ. دەنگی گیتیی تازە، ژمارە (٣) بەرگی سێ، بەغدا.
- حوزنی موکریانی (١٩٤٥) **دز و ڕەبەن** ، گ. دەنگی گێتیی تازە، ژمارە٢.
- حوزنی موکریانی (١٩٤٨) **خانوییکی تاریک**، گ . دەنگی گێتی تازە، ژمارە ٢٥، ٢٦.
- ڕاستەدەر (١٩٤١) **ب خوەهێن گوهدەرز رە**، گ. هاوار، ژمارە (٢٠)، شام.
- همفری، روبرت (١٩٧٥) **تیار الوعی فی الراویه الحدیثه**، ترجمه الدکتور محمّد الربعی، دار المعارف بمصر، القاهره، الطبعه الثانیه.
- نەجیب، ڕەشید (١٩٤٦) **دوچاو وبەیتێک**، گ. (گەڵوێژ) ژمارە(٢) ساڵی -٧- ، بەغدا.
- سەبری، عوسمان (١٩٤٣) **سەیا کۆ گور تانی فێزێ پێز**، گ. روناهی، ژمارە (١٥) ،شام.
- سەبری، عوسمان (١٩٤٣) **شینێ ژنەکێ ل سەر گۆڕێ برهۆ**، گ.ڕۆناهی، ژمارە(٢٤)، شام.
- خەفاف، عومەر سالح (١٩٤٤) **نەسرین** ،گ.گەڵوێژ، ژمارە (٩) بەغدا.
- سەراج، عەبدولا (٢٠٠٧) **بەرەو ئاستانەی ڕۆمان و گۆشەنیگاکان**، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
- سجادی، عەلائەدین (١٩٤٩) **جەوهەر ئاغا**، گ. گەڵوێژ، ژمارە(٦)، بەغدا.
- مستەفا ڕەسووڵ، عیزەدین (٢٠٠٢) **قەدری جان**، سلێمانی، چاپخانەی ئۆفسێتی ئاسا.
- کاک ئەمین، فایەق (١٩٤٥) **ئەرخە وانی گردی سەیوان، لانەی ئەبدیمەندی ئینسانان**، گ.گەڵوێژ، ژمارە (٥) بەغدا.
- جەوەری، فرات (١٩٩٥) **نورەدین زازا — کەسکەسۆر**، ستۆکهۆلم، وەشانێن نوودەم، چاپا یەکەم.
- قەدریجان (١٩٣٢) **هاوار هەبە گازی ل دوویە**، گ. هاوار، ژمارە(١) شام.
- قەدریجان (١٩٣٢) **هێڤا چاردەشەڤی** ، گ .هاوار ، ژمارە (٦) ، شام.

- قەدری‌جان (١٩٤٥) **نێچیرێ بەرازان،** گ . رۆناهی، ژمارە (٢٨) شام.
- بدرخان، کامران عالی (١٩٣٢) **دوو عەگید،** گ. هاوار، ژمارە(٢) شام.
- بدرخان، کامران عالی (١٩٣٢) **لاوکا من،** گ. هاوار، ژمارە (٤) شام.
- بەدرخان، کامران عالی (١٩٣٣) **ئەیلۆیا پیر،** گ. هاوار، ژمارە (٢٠) شام.
- م. ع پشدەری (١٩٤٧) **جوتیار،** گ. گەلاوێژ، ژمارە (٨) بەغدا.
- بەدرخان، میرجەلادەت عالی (١٩٣٢) **بەرتەڤنا مەهفوورێ** ،گ، هاوار، ژمارە (٤) شام.
- زازا، نورەدین یوسف (١٩٤١) **دەرکەتی،** گ . هاوار، ژمارە (٢٩) شام.
- زازا، نورەدین یوسف (١٩٤١) **کەسکە سۆر،**گ. هاوار، ژمارە (٣٠) شام.
- زازا، نورەدین یوسف (١٩٤١) **پەریشانی،** گ. هاوار، ژمارە(٣٥ ) شام.

# دینامیکا ڕوناهی و تاریێ د ئاڤاکرنا ڕیتما شعریدا

(موئەیەد تەیب وەک نموونە)

یاسر حەسەن محەمەد تاهر [-]

**کورتە**

فەلسەفەیا ڕیتمێ د شعرا نوو یا کوردیدا مینا فەلسەفەیا ڕیتمێ د شعرا نوویا ڕۆژهەلاتی و ڕۆژئاڤایی دا ب ڕەنگەکێ دوالیزمی کار دکەت کوو ژ یەک ڕەهەندیا دەنگی (موزیکی) دەربازی ڕەهەندا سیمانتیکی دبیت و ل گۆرەی فرەئەرکی و هەمەجۆریا سیمانتیکی ڕیتم ژی هەمەجۆر و فرەڕەهەند دبیت.

دینامیکا ڕوناهی و تاریێ وەک پارچەیەک ژ بیاڤێ سیمانتیکی، پێکهێنەرەکا سەرەکییە د ئاڤاکرنا ڕیتمێدا ل دەڤ «موئەیەد تەیب»ی کو ب ئێک ژ رابەرێن شعرا نوویا کوردی دهێتە هژمارتن. ئەڤ لێکۆلینە بزاڤەکە ژ بۆ دەسنیشانکرنا ئەرکێ ڤی دینامیکێ و ڕۆلێ وێ د ئاڤاکرنا بنیاتێ ڕیتمییێ شعرا نوویا کوردیدا. پشتی لێکۆلینێ د دەقێن کۆمەلا وییا شعری «ستران و بەفر و ئاگر»دا و شرۆڤەکرنا وان، ڤەکۆلەر گەهشتە وی ئەنجامی کو شاعری ژ بلی مفا وەرگرتن ژ مەسەلەیێن دەنگی، تا ڕادەیەکێ باش مفا ژ دوالیزما ڕوناهی و تاریێ ژی وەرگرتیە و دینامیکەکا تایبەت دایە وان دەقان و ڕیتمەکا سیمانتیکی بەرجەستەکریە، ب تایبەتی د هونەری هەستکرنا شاعری ب هندەک دژواری و دەردەسەرییێن گران.

**پەیڤێن سەرەکی**: شعرا نووی، ڕیتم، دینامیکا، ڕەخنە.

---

[-] پشکا کوردی، کولیژا ئادابێ، زانینگەها دهۆک، هەرێما کوردستانێ

## پێشەکی

هەتا دەمەکێ نە گەلەک دوور ژی، وەسا هزر دهاتە کرن کو ڕیتما شعری بتەنێ د ئاستێ دەنگیدا دهێتە بەرجەستەکرن، چ ئەو ئاست د بنیاتێ ڕیتما دەرەکیدا بیت، یان ناڤخۆیی. لێ ئاستێ سیمانتیکی، کو گەلەک جاران ژیێ دەنگیژی کارتێکەرترە، دهاتە پاشگوە خستن. ئەڤ لێکۆلینە بزاڤەکە بۆ دەستنیشانکرنا ڕیتمێ د ئاستێ وێیا دووێدا «سیمانتیکی» و دیارکرنا میکانیزمێن کارکرنا وێ د هوندری دینامیکا ڕوناهی و تارییێدا.

ژبەرکو ئەڤ دینامیکە پێکهێنەرەکا سەرەکییە د ئاڤاکرنا ڕیتما شعریدا ل دەڤ «موئەیەد تەیب»ی، کو ئێکە ژ ڕابەرێن شعرا نوویا کوردی، لەوا بەرهەمێ وییێ شعری کو ب ناڤێ «ستران و بەفر و ئاگر»ە، بۆ لێکۆلینێ هاتەژێگرتن. لێکۆلین ژێر سێ تەوەران پێکهاتیە:

ل تەوەرێ ئێکێ، باسی تێگەها ڕیتمێ د ناڤ ڕەخنەیا کوردیدا هاتیەکرن؛ ل تەوەرێ دووێ، تێگەها دوالیزما ڕوناهی و تاریێ هاتیە ڕۆنڤەکرن؛ ل تەوەرێ سییێ و دوماهییێ ژی دینامیکا ڕوناهی و تاریێ د دەقێن شعریێن (ستران و بەفر و ئاگر) دا هاتیە دەستنیشانکرن.

### تەوەرێ ئێکێ:

### تێگەها ڕیتمێ د ڕەخنەیا کوردیدا:

ئەگەر بنیاتێ ڕیتما شعری ب ڕەنگەکێ گشتی ژ دو ئاستێن سەرەکی پێک دهێت: ئاستێ ڕیتما دەرەکی، کو کێش و سەروا نوونەریا وێ دکەن، و ئاستێ ڕیتما ناڤخۆیی، کو مەسەلەیێن دەنگی و پێکهاتەیی و سیمانتیکی وێ بەرجەستە دکەن، هوسا دکارین بێژین: ئاستێ ئێکێ گەلەک زیق و ئاشکەرایە و ب ساناهی دشێین هەست پێ بکەین، چ ب هەستەوەرا بهیستنێ بیت یان دیتنێ، لێ ئاستێ دووێ پتر یێ نەپەنی و ڤەشارتیە و ڕەنگە گەلەک ب ساناهی نەشێین هەست پێ بکەین، چونکی ژ بلی هەستەوەرا بهیستنێ ئەو پتر گرێدای مەسەلەکا زێهنی و بەرهزرکرنێیە (بەکر،٢٠٠٤: ٨٣-٧٢). هەرچەندە ڕادەیا هەستپێکرن و هەست-پێنەکرنێ ل سەر دو فاکتەران ڕاوەستیایە: ئێک، سەربۆرا وەرگری ب خۆ بۆ وەرگرتنا ڕیتما شعری؛ دو، جۆرێ وێ شعرا دهێتەپێشکێشکرن کا ستوونییان سەربەست یان پەخشانە شعرە؟ ژ بەرکو مینا "د. عەلەوی ئەلهاشمی" ئاماژە پێددەت پەیوەندیەکا دیالێکتیکی د ناڤبەرا هەر دو ئاستێن دەرەکی و ناڤخۆیی دا هەیە، هەر ئێک ژڤان ئاستان ل گۆرەی جۆرێ دەقی ل سەر یێ دی زال دبیت. ئانکو، ئاستێ ڕیتما دەرەکی د شعرا ستوونیدا پتر یێ زالە، لێ د شعرا سەربەست دا کێمتر لێ دهێت و د پەخشانە شعرێ دا ئاستێ دەرەکی گەلەک لاواز دبیت بۆ بەرژەوەندا ئاستێ ناڤخۆیی (الهاشمي،٢٠٠٦: ٦٤-٦٠).

تێگەها ڕیتما شعریژی د ناڤ ڕەخنەیا کوردیدا هەر ژ دەستپێکا وێ و تا قووناغەکا گەلەک درەنگژی ژ مێژوویا وێ، پتر ب لایەنێ دەنگیڤە هاتیەگرێدان و د ئاستێ ڕیتما دەرەکیدا هاتیە دۆرپێچکرن. د دەمەکیدا، گرنگیا ئاستێ ناڤخۆیی ژ یێ دەرەکی کێمتر نینە، چونکو (داهێنانا شاعری پێ دهێتەپیڤان، شێوازێ وییێ

خۆسەر دهێتە دەستنیشان کرن و ئەگەرە کە بۆ پتر پەسەند کرنا شعرەکێژیا دی) (عبداللە،٢٠٠٢: ٣٦)، لێ ئەڤ ئاستە هاتیە پاشگوە خستن و تنێ د بەروبیاڤەکێ بەرتەنگدا و گەلەک درەنگ هاتیە بەحس کرن.

ئەم د شێین ب ڕەنگەکێ گشتی دو ئاراستەیێن ڕەخنەیی د قادا ڕەخنە و لێکۆلینێن کوردیدا دەست نیشان بکەین:

**ئاراستەیا ئێکێ**: پتر گرنگی دایە لایەنێ دەنگییان موزیکی، ئانکو پەرگالێ دەرڤەیێ شعرێ (کێش و سەروا)یێ. ڤەکۆلەرێن ل پەیڤێ ئاراستەیێ چووین، ب کێشناس یان عەرووزناس هاتینە ناسین. د ڕێژەیا هەرا مەزنا ڤان لێکۆلینان دا ئاستێ ڕیتما دەرەکی هاتیە ڤەکۆلان و ئاستێ ڕیتما ناڤخۆیی هاتیەپاشگوە خستن. وەکی بۆ نموونە نڤیسینێن "شێخ نووری شێخ سالح، جگەرخوین، مەعرووف خەزنەدار، عەلائەدین سجادی، ئەحمەد هەردی، عەبدولڕەزاق بێمار، عەزیز گەردی".. هتد (جەمیل ڕەشید،٢٠٠٩: ٩٠-٧١).

**ئاراستەیا دووێ**: ژ بلی گرنگیدانێ ب لایەنێ دەنگی_ مۆزیکی، گرنگی دایە لایەنێ سیمانتیکیژی، کو ڤەکۆلەرێن ب ڤی کاری رابووین گەلەک د کێمبووینە و مێژوویا ڤێ کارکرنێ بۆ قووناغەکا گەلەک درەنگ ڤەدگەریت. ڕەنگە د ڤی بیاڤیدا لێکۆلینێن "د. محەمەد بەکر" دیارترین نموونە بن ئاماژە پێ بهێتەدان، هەروەسا وان لێکۆلینێن وی سەرپەرشیا وان کرین[1]. هەرچەندەیا چاڤەرێکری بوو ئەڤ ئاراستەیە ل گەل پەیدابوونا شعرا سەربەست و پەخشانە شعرێ خورت ببا، چونکو ڕیتما ناڤخۆیی د ناڤ وان دەقاندا خۆرتتر لێ دهێت، لێ ڕێژەیا ڕەخنە و لێکۆلینێن کوردی هەمبەر قەبارەیێ دیاردەیا هەڤچەرخا شعری نەیا هەڤسەنگە.

ژ ڤێ پێداچوونێوە دیاردبیت، کو تێگەها ڕیتمێ د ڕەخنەیا کوردی دا بەرەبەرەیا ڕێکا خۆ دبریت و بەر ب ڕەهەندەکێ دیڤە دچیت و فەلسەفەیا ڕیتمێ د شعرا نوویا کوردی دا ژ قووناغا دەنگییا دەربازی قووناغا سیمانتیکی دبیت[2]. ئەڤ دەربازبوونەژی یا هەڤدەمەل گەل گوهۆرینا قالبێن شعری و وەرچەرخانا وان، ژ شعرا ستوونی د قووناغا کلاسیکدا، بۆ شعرا سەربەست د قووناغا نوودا، بەرەف پەخشانە شعرێ د قووناغا مۆدێرنیزمێدا.

---

[1]- بۆ نموونە پشتی هەردو لێکۆلینێن ماستەر و دکتۆرایێ یێن محەمەد بەکر محەمەد (کێش و ریتمی شعری فۆلکلۆری کوردی) ل سالا ١٩٩٤ و (پەخشانە شیعری کوردی: تەکنۆ-سیمانتیکی گۆتاری شیعر) ل سالا ١٩٩٧، د. محەمەد بەکری سەرپەرشتیا ڤەند نامەیەکێن ماستەرێ ڕی کر، کو گرنگی ددا ریتما ناڤخۆیی، مینا ماستەرناما "یاسر حەسەن محەمەد تاهر" (بنیاتێرپیتمی د شعرا نوویا کوردیدا) ل سالا ٢٠٠٦، هەروەسا ماستەرنامەیا "نیعمەتوللا حامد" حامد نهێلی (شێوازگەری: تیۆر و پراکتیک) ل سالا ٢٠٠٦، کو فەسلەکێ تایبەت ل سەر ریتما دەرەکی و ناڤخۆیی یا هەلبەستەکا مەلایێ جزیری بوو.

[2]- دەربازبوون ژ قووناغا دەنگی بۆ قووناغا سیمانتیکی گرێدای شعرا کوردی بتنێ نینە، بێگومان ئەڤە د شعرا رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی ژی دا روودایە، بۆ نموونە بنێرە:

- شاهو سعید فتح الله، دلالات البناء الایقاعی فی الشعر: دراسه مقارنه فی الادب العربی والفارسی والکردی، رساله ماجستیر (غیر منشوره)، کلیه اللغات، جامعه السلیمانیه، ١٩٩٩.

## تەوەرێ دوویێ:

## دوالیزما ڕوناهی و تاریێ

دوالیزم، تیۆرەکەیان سیستەمەکێ هزرییە، جیاوازیێ د ئێختە د ناڤبەرا «دو» تشتێن سەربەخۆ، بەردەست بن یان بەرهەست، کو جارنا هەڤدو تەڤاڤ دکەن، جار ژی د شەرەنیخێ دانە[1]. لێ دوالیزم گرێدای دەم و جهەکێ دەستنیشانکری نینە، چونکو ژمارە «دو» باندۆرەکا ب هێز ل سەر خورتکرنا شەرەنیخێ و بەردەوامیا ژیانێ ل سەر روویێ ئەردی هەیە. ئەو، ڕەنگڤەدانا سیستەمەکێ جڤاکی، فەلسەفی و ژیانکییێ کاملانە: ل سەر شەنگستێ وێ، ڕێتما دوالیزمی و بنیاتێ جیهانێ دهێتە ئاڤاکرن (القنطار،٢٠٠٢: ٤٩٣).

پەیوەندیا دوالیزما گەردوونی ب هەبوونێڤە مینا پەیوەندیا ڕوناهیێ ب تاریێ ڤەپەیوەندیەکا دینامیکییە، سیستەمەکێ فەلسەفی - ئایینی ل سەر دهێتە ئاڤاکرن (هەمان سەرچاوەی پێشوو). لێ مینا ( Petrus Maria Fontaine) بەحس دکەت. «دوالیزم دیاردەیەکا مێژوویی نینە، بەلکو پتر دیاردەیەکا ئەنترۆپۆلۆگییە. د هەر بیاڤەکێ بەرهزکرییێ ژیانێ دا دهێتە دیتن، د ئایین و فەلسەفەیێدا، د مێژووی و پۆلیتیکێدا، د ئەدەب و هونەریدا، د پەیوەندییێن جڤاکی و ژیانا کەساتیدا»[2] کو «پارچەیەکا سەرەکییە ژ پێکهاتەیا مەیا مرۆڤاتی (...) و کۆکا وێ د مێژوویییان میتولۆگیاییدا، د فەلسەفەیان ئایینیدا ناهێتە دیتن، بەلکو د حالەتێ مرۆڤیدا دهێتەدیتن» (هەمان سەرچاوە).

لەوا دەمێ هزر ب ڕەنگەکێ گشتی چالاکیێن خۆ ئەنجام ددەت، پشتا خۆ ب دوالیزمێن هەڤدژ و وێ دیالۆگا د ناڤبەرا توخیبێن جیاواز و هەمبەر ئێکدا گەرم دکەت، کو ب فەلسەفەیا دیالێکتیک دهێتە ناڤکرن، ئەڤجا دوالیزمێن هەڤدژ د دەروونێ مرۆڤی دا کۆم ڤەدبن، کو دشێن بێژین ب ڕەنگەکێ گەلەک کوور د ناڤدا دمینن‌ەڤەشارتی (الدیوب، ٢٠٠٩: ٤). شعر ژی ئەگەر ب ڕەنگەکی ژ ڕەنگا نڤالاکرنا دەروونی بیت، ئەو دوالیزم دێ د ناڤ شعرێ دا ڕەنگڤەدەت، یان ل گۆر دەربرینا د. سمیرە الدیوب «ئەو دوالیزمێن شعرێ کونترۆل دکەن، بەری هینگێژیان یا کونترۆل کری» (هەمان). چ ئەو دوالیزم بن یێن هەڤدو تەڤاڤ دکەن وەکو نێر و مێ، لەش و جان و هتد. کو سەر ب هۆشمەندییا ئێستاتیکییا کلاسیک ڤە دچن، یان ئەو دوالیزمێن د شەرەنیخێ دا بن و هەڤدژ، وەکو هەبوون و نەبوون، خێر و شەڕ، ڕوناهی و تاری و هتد. کو سەر ب هۆشمەندییا ئێستاتیکییا مۆدێرنیزمێڤە دچن[3].

ژ ڤی مونتەلەقێ هزری، ئێک ژ دوالیزمێن هەرە دیار یێن ژیانا مرۆڤاتیێ کونترۆل دکەن، دوالیزما ڕوناهی و تارییییە، کو ب ڕەنگەکێ ژ ڕەنگان د شعرا کوردی ژی دا ڕەنگڤەدایە، نەخاسمە ل هندەک قووناغێن

---

[1] - http//:mb-soft.com/believe/text/dualism.htm

[2]- The Light and the Dark :*A cultural history of dualism,PETRUS MARIA FONTAINE*
http//:home.wanadoo.nl/piet.fontaine/home.htm

[3] ل دۆر هۆشمەندییا ئێستاتیکی یا کلاسیک و مۆدێرنیزم بنێرە: "ریم العیساوی، جدلیة النور والضلام فی مجموعة لآلحة غابش الشعریة "المرایا لیست هی".

*www.m-naghm.com/vb/showthread.php?t=7339*

دەستنیشان‌کری ژ مێژوویا وێ، وەکو بۆ نموونە ئەو شعرا نوو یا کوردی، ئەوا ژ سالێن حەفتیان تا سەر هلدانا ١٩٩١ ل کوردستانا باشوورێ هاتیە نڤیسین و ب شعرەکا ڕیالیزم هاتیە پۆلین‌کرن (خالد،٢٠٠٥) کو ڕەنگە ژ بلی باندۆرا ڕەوشا سیاسییا هینگێ د بنەجەکرنا ڤێ دوالیزمێ دا، کو ڕوناهی نوونەریا حەقیێ بکەت و تاری نوونەریا نەحەقیێ و زۆردایێ بکەت، کەلتۆری ئایینییێ کوردان ژی ڕۆلەکێ سەرەکی د چەسپاندنا وێ دا هەیە، چیێ ئایینێ زەرادەشتییان یێ ئیسلامی بیت:

### ١.کەلتۆرێ ئایینێ زەردەشتی:

بیروباوەرێن ئەڤی ئایینێ دێرین گرێدای کوردان ب تەنێ نینە، بەلکو گەلەک مللەتێن ئیرانی ژی ڤەدگەریت، لێ فاکتەرەکێ گرنگ و کارتێکرە. ئەگەر ئەڤ ئایینە بۆ قووناغەکا گەلەکا کەڤن ڤەدگەریت، کو شەش - حەفت سەدەیەکان بەری زایینێیە، لێ زەرادەشتی ژ ئایینێن ئێکانەیە کو«کورد پێش ئیسلامێ چووینە تێدا، هێش ڕەهێن وی د جڤاکێ کوردیدا و شینوارێن وێ د وژدانا مللیدا هەنە و ل سەر ئاستێ جڤاکی نەک ئایینی کورد هندەک ڕێ‌وڕەسم و جەژنێن مللیێن زەرادەشتی دپارێزن، شوونوارێن زەرادەشتی د ئەدەبیاتێن کوردییێن کەڤن و نوو ژی دا ڕەنگڤەدایینە» (خالد،٢٠٠٥). بیرۆکا سەرەکییا ڤی ئایینێ ل سەر دو پرنسیپێن هەڤدژ هاتیە ئاڤاکرن: پرنسیپا قەنجیێ، کو خوداڤەندێ ڕوناهیێ (ئاهۆرامەزدا) نوونەریا وی دکەت، و پرنسیپا خرابیێ، کو خوداڤەندێ تاریێ (ئەهریمەن) نوونەریا وی دکەت. شەرەنیخا د ناڤبەرا هەردواندا نڤیشکێ دیتنا ئایینێ زەرادەشتییە بۆگەردوونی[١].

### ٢. کەلتۆرێ ئایینێ ئیسلامی:

د ئایینێ ئیسلامێ ژی دا دوالیزما ڕوناهی و تاریێ گەلەک ب ئاشکرایی بەرچاڤ دبیت: ڕوناهی، بۆ قەنجی و حەقیێ هاتییە بکارهینان، بەرامبەر وێ تاریاتی بۆ خرابی و نەحەقیێ هاتییە بکارهینان. گەلەک ئایەتێن قورئانا پیرۆز ئاماژەیێ ددەنە ڤێ دوالیزمێ، مینا «الله ولی الذین آمنوا یخرجهم من الظلمات الی النور، والذین کفروا اولیاءوهم الطاغوت یخرجونهم من النور الی الظلمات، اولئک اصحاب النار هم فیها خالدون» (القران،بقره:257). بەلکی ل پرانیا وان جهێن قورئانا پیرۆز باسی ڕوناهی وتاریێ کری ب حەقی و نەحەقیێ ڤە هاتیەگرێدان کو ڕوناهی بۆ قەنجی و حەقیێ بکارهینایە، بەروڤاژی تاریێ، کو دەلالەتێن خرابی و نەحەقیێ داینێ.

هەلبەت ئەڤی کەلتۆرێ ئیسلامی و بەریهینگێیێ زەرادەشتی و هەتا یێ ئێزدیاتیێ (بالایی،٢٠٠٨: ٨٣). ژی ب ڕەنگەکێ ڕاستەوخۆ بیت یان نەراستەوخۆ، کارتێکرنا خۆ ل هۆشا ب کۆمەل یا مللەتێ کورد کریە و

---

[١] مهدی مجیدعبدالله، الزرادشتیە،

http//:www.alitthad.com/paper.php?name=News&file=article&sid=42618

ڕەنگە د قووناغێن بەرتەنگێن مللەتێ كورد تێرا دەربازبووی، ئەڤ دوالیزمە پتر بەرجەستە بوویە كو سەركەفتنا ڕوناهییێ ل سەر تاریێ، ببیتە سەركەفتنا خێرێ ل سەر شەری و ئەڤە د قووناغەكا هەستیارا شعرا ڕیالیزما كوردیدا هاتیە ڕەنگ ڤەدان، ئەو ژی دەمێ شعرێ ب ڕەنگەكێ ڕاستەقینە دەربرین ژ واقعێ كوردی كری.

### تەوەرێ سیێ: دینامیكا ڕوناهی و تاریێ د ئاڤاكرنا ڕیتما شعریدا

ڕەنگە هەلبەستڤان، موئەیەد تەیب ئێك ژ حالەتێن تایبەت بیت د شعرا نوو یا كوردیدا، چونكو ئەو نەتنێ هێزا هەلبەستا خۆ ژ مەسەلەیێن دەنگی وەردگریت، بەلكی تا ڕادەیەكێ دوور وجێژ وارێ سیمانتیكێژی دبینیت و مفایژ وزە و شیانێن ڤەشارتیێن د ناڤ هەلبەستێدا هەین دستینیت، دئێختە د خزمەتا دەقێن خۆیێن شعریدا، كو هندەك دەقێن داهێنانكییێن وەسا ژێ پەیدابن، ل گۆر دەربرینا فازلێ عومەر: (ئەڤە سیە سالە وژدانا نەتەوەیەكێ دبزڤینن) (عمر،٢٠٠٨: ٨٠).

هەلبەستێن دیوانا «ستران و بەفر و ئاگر»یا موئەیەد تەیب، كو ل سالێن حەفتییان و هەشتییان ژ سەدەیا بۆری هاتینە نڤیسین، د فەزایەكێ تایبەتدا دژین. تێدا ب ڕەنگەكێ گشتی دو جەمسەرێن هەڤدژ وان ب لایێ خۆڤە دكێشن، چ ب ڕەنگەكێ ئێكسەر یان نەئێكسەر بیت، ئەو ژی جەمسەرێن ڕوناهی و تاریێ نە. هەڤركیا د ناڤبەرا ڤان هەردو جەمسەران یان هێزان دا، ئەوە ئێك ژ بنیاتێن سەرەكیێن ئاڤاكرنا یاریا ڕیتمی ل دەڤ موئەیەد تەیبی. نەخاسمە ئەگەر بزانین كو ڕیتم «بەهرا پتر ژ كارلێكرنا دو ئەلەمێنتێن ژ هەڤ جودا دروست دبیت» (ابودیب،١٩٨٧: ٥٢).

ژڤێ ئێكێ، دڤیا مەیدانا پێرابوونێن خۆیێن ڕەخنەیی بەرفرەهتر و كوورتر لێبكەن، ل هندەك ڕیتم و سیستەمێن نوو یێن نەعەدەتی بگەرین كو پێ ب سەر نهێنییێن سەركەفتنا ڤان ڕەنگە دەقان هلبین؛ چونكو "ب ڤەدیتنا پەیوەندییێن هەڤدژییێن تشتان و وێ دیالێكتیكا د هوندر دا، دێگەهینە ئاستەكی ژ كویراتی، كو خۆ ل هنداڤ دیاردەیا هونەری نەگریت، بەلكو بچیتە د ناڤ پێكهاتەیێن وێدا و بنیاتێن وێیێن هەڤدژ ڤەبینیت»[١] و هوسا دێ شیانێن داهێنانكییێن دەقی ژ هندەك لایان ڤە ئاشكرا بن.

لێ «زاڵبوونا ئاستەكێ ڕیتمی ل سەر ئاستێن دی، دڤێت ئەڤە وێ نەگەهینیت كو ئەو ئاست بنیاتێ ڕیتمییێ ئێكانەیە د ناڤ كارێ هونەریدا؛ چونكو گەلەك جاران ئاستێن ڤەشارتییێن ڕیتمی وەزیفەیەكا كارتێكەرتەر ژ ئاستێن ڕوهنێن ڕیتمی دگێرن، چ ئەو ئاست ژ هەمان سروشتێ هەستەوەریێ بنیان ژێ جودا بن» (الهاشمی:٥٢-٥١). نەخاسمە د ڤی سەردەمیدا، كو «هونەرێن بەرچاڤ و دیتنێ ب سەر هونەرێن دەنگی كەتینە، یێن كارتێكرنا وان بەر ب كێمەڤە دچیت و ئەڤە بوویە سیمایێ سروشتێ پێشڤەچوونا شارستانی» (الهاشای،١٩٨٨: ٣).

---

[١]- ریم العیساوی، جدلیة النور والضلام فی مجموعة لآلحة غابش الشعریة "المرایا لیست هی"
،www.m-naghm.com/vb/showthread.php?t=7339

**بەشی پێنجم- رەخنە**

دوالیزما ڕوناهی و تاری ژی، کو هەرچەندە هندەک جاران ل جەم (موئەیەد تەیب)ی پتر وەکو مەسەلەیەکا مەنەڤی و ئەندێشەیی دهێتە بەرجەستە کرن، لێ جارنا ژی وەکو مەسەلەکا فیزیکی دهێتە پێش، ئانکو ڕوناهی وەک ڕەنگێ سپی و تاریاتی وەکو ڕەنگێ رەش. ئەڤجا دینامیکا هەر دوویان و ئەو پەیوەندیا دیالێکتیکیا د ناڤبەرا رەش و سپییان ڕوناهی و تارییدا ڕۆلێ خۆ د ئاڤاکرنا ڕیتمێ دا دگێرن.

د هەلبەستا «فرەکا بای»دا هەڤرکیەکا دیار ل ناڤبەرا ڕەنگێ سپی (ڕوناهیێ) و ڕەنگێ رەش (تاریێ) هەیە. سپی وەکو ناسنامەیا کوردی و بێگونەهی و پاکژی هاتیە بەرجەستەکرن کو قیزکەکا کورد یا چیا و زۆزانێن کوردستانێ نوونەریا ڤی ڕەنگی دکەت، بەرامبەر ڕەنگێ رەش کو تەعریب و زولم و بیابانێن باشوورێ عیراقێ نوونەریا وی دکەن. فەزایێ ڤێ هەلبەستێ ل سەر ڤێ دوالیزمێ هاتیە ئاڤاکرن و هەڤرکی و شەرەنیخا دژوارا د ناڤبەرا هەردو جەمسەراندا؛ نەخاسمە ئەگەر رەنگێ سپی ب خورتی هاتبیتە برن بۆ ناڤ دەڤەرا رەشیدا و بزاڤا ئاسمیلاسیۆنا وی هاتبیتە کرن. ئەڤە ژی دێ پتر دیاربیت ئەگەر بزانین شاعری ئەڤ هەلبەستە د ترێنێدا ل چوونا رێیا بەسرا ڤەهاندیە، سالەکێ پشتی تەرحیل کرنا کوردان ل سالا ١٩٧٥ بۆ باشوورێ عیراقێ، دەمێ چاڤێ وی ب کچەکا کورد ل ناڤ بیابانەکا چۆل کەتی، کو ژ گەرمادا وێ کچێ ب هەردو ملان بال خۆ دکر:

کوردستانێ!

فرەکا بای..

ژ چیایەکێ بەفر لێ مای..

ئەڤرۆکە.. چاڤ بەلەکا من..

یا گرێدای..

ل بن کوینەکێ رەش و دریای..

ل ناڤ دەشتەکا بێ باب و دای..

ڕۆژا ئاریای..

خیزێ شاریای..

زەریا من یا د خوهێ را مای..

ئەزێ دترسم..

ژ دلبەرا دێم بەفر و خوین

ژ ئەنیا کەڤەر..

ژ بەژنا شرین

ژ دلێ ئەڤین..

لێ بووی برین..

ژ جەرگێ زۆزان..

لێ بووی کۆڤان

ئەزێ دترسم..
ڕۆژا ئاریای..
کرێت بکەت..
هزار دەقا.. ل ئەنییێ بدەت..
ڕەنگێ چیا.. ژ دێمی ببەت!

هەرچەندە ئەڤە ئێک ژ هەلبەستێن دەستپێکییێن شاعریە، نڤیسینا وێ بۆ سالا ١٩٧٦ ڤە دگەریت کو تێدا ئاستێ ڕیتما دەنگی گەلەک زیق دیار دکەت و کارتێکرنا شێوازێ کلاسیک ل سەر زالە، لێ گەل هندێ کارتێکرنا ڕیتما وێیا ڤەشارتی، کو ل ڤێرێیا زێهنی و سیمانتیکییە، گەلەک پترە ژ ڕیتما وێیا دەنگی. ئاستێ دەنگی ل هندەک جهان ب خورتی هاتیە ئاڤاکرن ب تایبەت پویتپێکرنا وییا زێدە ب ئاڤا کرنا سەروایان. لێیا سیمانتیکی ب رەنگەکێ خوەزایی و سروشتی دروست بوویە، کو دینامیکا ڕەنگێ رەش و ڕەنگێ سپی ئەو دروست کریە یا ئێکێ ب هەستەوەرا بهیستنێ دشێین وەرگرین، یا دوویێ ب پێحەسانەکا زێهنی ئەندێشەیی دشێن وەرگرین:

| سپی | ناسنامەیا کوردی | کوردستان | چیا - بەفر | دێمێ سپی | ئەنیا کەڤەر |
|---|---|---|---|---|---|
| **رەش** | تەعریب | بەسرا | دەشت - کوینێن رەش | دێمێ رەش | ئەنیا دەقدای |

دینامیکا ڕوناهی و تاریێ/ رەش و سپی، د ڤی دەقیدا وەسا دەست پێدکەت کو زۆما کامیرا شاعری ل **«رەش»**ییە «بەسرا» و پاشی ل **«سپی»**یە دەمێ هاوارا خۆ دگەهینتە کوردستانێ «چیایەکێ بەفر لێ مایی» ، جارەکا دی ل **«رەش»**ی وێنەکرنا ژینگەها نوو یا کچکا کورد «ل بن کوینەکێ رەش و دریای»، پاشی **«سپی»** وێنەکرنا کچا کورد یا دێم بەفر و ئەنیا کەڤەر، د دووڤدا دیارکرنا ترسا خۆ کو سپیاتی «ناسنامەیا کوردی» ب دەقان بهێتە رەشکرن و تەعریبکرن **«رەش»**، و ڕەنگێ چیایێن کوردستانییێن بەفراوی **«سپی»** لێ نەمینیت. ئەڤ ڤەگوهاستنا شەش جارکی د ناڤبەرا ڕەنگێ رەش و ڕەنگێ سپیدا و هەڤرکیا د ناڤبەرا واندا، ب تەرزەکی ژ تەرزان ڕیتمەکا سیمانتیکی ئاڤا دکەت، نەخاسمە ئەگەر بزانین کو «بەهرا پتر دەمێ بێژەیێن ڕەنگان، یان پەیڤێن دەلالەتا ڕەنگان ددەن، دهێنە بلێڤکرن، هەستەوەرا دیتنێ دهێتە ئازراندن، کو یا تەکلیف کریە لەرزشێن ڕیتمییێن ڕەنگان بگەهینتە مەژی، ئەو ژی د هوندری ئازراندنا ناڤەندێن بینینییێن د ناڤ مەژیدا هەین و ڤەبزڤینا وان ب ڕێکا خەیالکرنێ نەک دروستبوونەکا ئێکسەر» (الهاشمی:٣٠). ئانکو، نە ب هەستەوەرا بهیستنێ بەلکی ب یا بینینێ و پاشی ب پێحەسانەکا زێهنی دشێین ئاگاداری ڤێ ڕیتما سیمانتیکی ببین.

د هەلبەستا «سترانەکا زەلال ژ زیندانەکا شێلی»دا هەمان هەڤرکیە دناڤبەرا ڕوناهی و تاریێ دا، بەلکو هەر ناڤونیشان ب خۆژی وێ رامانێ هلدگرن، کو دشێین بێژین «سترانەکا ڕوهن ژ زیندانەکا تاری» یان «خەونەکا

سپی ژ زیندانەکا رەش». دڤی دەقێدا، هەڤرکیا د ناڤبەرا ڕوناهی و تارییێدا بۆ بەرژەوەنـدا ڕوناهیـێ ب دومـاهی دهێت. جیهانا شاعری ل رەوشەکا تاری دەست پێدکەت: بوهۆستەک و چـار دیـوارێن زینـدانێ نـە، ل گـەل قامچیا رەش کو پتر ڤێ جیهانێ تاری دکەت:

هایێ دایکا منێ هایێ!

خەمێت مەهندی دنیایێ

قامچیا رەش..

لەشێ من خوار

خەریبیا..

جەرگێ تە خوار

ئەڤ دنیایا هۆ بەردریای..

ما بوهۆستەک و چار دیوار

لێگۆر هیڤی و خەونێن شاعرییان ئەو خەونا ئەو بۆ دستریت، ئەڤ زینـدان و ڕیالیسـتا تـاری دۆمـێ ناکـەت، بەلکو دێ ڕوناهی جهێ وێ گریت، شاعری ژ قامچیا رەش دەست پێکریە، کو دێ بیتە بزۆت و لەشێ خودانـێ خۆ سۆژیت. هلبوونا بزۆتی د زیندانەکا شێلیڤە، هلبوونـا روناهییـە د زیندانـەکا تاریڤـە، مینـا هلبوونـا ئـاگرێ زەرادەشتیە دەمێ هێزێن تارییێن ئەهریمەنی ژێ درەڤن:

سبە دیوارێت خلۆلە دێهەرفن

قەید و زنجیر.. دێهەرشن

قامچییێت رەش.. دێ بن بزۆت،

لەشێ خودانێ خۆ سۆژن

دێهێمەڤە و دێ رزگار بین

ئەز ژ دیوارا و

تو ژ خەریبیا

لێ شاعری خۆ تنێ ب هیڤیا بزۆتی و ڕوناهیا بزۆتیڤەناگریت، بـەلکو یـێ ب هیڤـییە کـو هێـزا هـەرا مـەزنا ڕوناهیێ بهێت، ئەو ژی ڕوناهیا ڕۆژێیە کو ئێدی تاریاتی نەمینیت:

لێژپەقێت دەستێت تە دایێ!

کانی دێ زێن

ژ کەند و کورێت لەشێ من ژی..

ڕۆژ دێهەلێن.

هینگێژیان دێیا خۆش بیت

هینگێ

د
ا
ى
یێ

بزاڤا ڕیتما روناهیێ د ڤێ هەلبەستێدا، مینا بزاڤا زانێیەیان بلقدانێیە کو ل بەراهیێ ژ خالەکا مەند دەست پێدکەت، پاشی پیچەکێ زێدە دبیت و د دووڤ دا زێدەتر لێدهێت. ئانکو ژ تاریێ (ژ زیندانێ)، پاشی پیچەکا ڕوناهیێ (ژ بزۆتی) د دووڤ داروناهیەکا هەرا مەزن (ژڕۆژێ). ئەڤ بزاڤا ڕیتمی ژی یا هەڤگونجایە ل گەل واتایا زمانییا پەیڤا (ڕیتم – Rhythm) ئەوا بنەکۆکا وێژپەیڤا Rhythmosیا گریکیهاتی، کو ژ کارێ Rheim هاتیە دارشتن، و مانایا زان، بلقدان، رابوونا رووباری ددەت (گەردی،١٩٩٩: ٧١).

دیارە کوشتنا تاریێ ب ڕوناهیا ئاگری ل دەڤ شاعری رێکەک بوویە، چەندین جاران پەنا بریێ، بۆ نموونە ل سەر ئەزمانێ سیابەندی دبێژیتە خەجێ:
رامووسانا من و تە دێ بیتە ئاگر..
بیتەگوری
گەش کەت وارێ ئەهریمەنا
تاری کری.

یان د هندەک هەلبەستێن دی دا، وە دیار دبیت شاعری باوەریەکا موکوم ب هێزا روناهیێ هەیە کو ب سەر هەموو هێزەکێ بکەڤیت. دەمێ ئەڤ هەڤکێشە بەروڤاژێژی دبیت، شاعر ڤێ هەموویێ ب گۆتگۆتک و تشتەکێ باوەرپێنەکری دهژمێریت، وان هەمی گۆتگۆتک و گومانان د بەرپەرەکی دا کۆمڤە دکەت و وی بەرپەرێ (تاری) ڤەددەت، دا بەرپەرەکێ (روهن)یێ نوو ببینیت کو ڕیتما ئەڤێ بزاڤێ مینا ڕیتما بزاڤا شەڤ و ڕۆژانە، دەمێ ڕۆژ دەردکەڤیت و شەڤێ دکوژیت:
کێ گۆتیە تە
شەڤا ئەهریمەنی هات و
گوریژچاڤێن زەرەدشتیڤەمری
ل سەرێچیا؟
کێ گۆتیە تە
(عەمێگۆزێ) چەپەر بەردا و
ل زۆزانێت ژۆرییێ مری!

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

نە خەزال نە..!
گارەهەرێ ل جهێ خۆ مای،
هێشتا کویڤییێ لێ دچەرن.
جۆکێت مەهەر ئاڤا تێ مای،
رویبارێت مەهەرێ دگەرن.
سال و زڤستان و بەفر
سل نەبوویەنە و هەر هەڤالن.
لویلیا تڤەنگا شڤانی هەرا کەلە و
تژیگوندێ مە کەوالن.
تاری شەڤا ئەهریمەنی دێ مریت و
گوری و چاڤێت زەرەدشتی ناڤەمرن
(عەمێگۆزێ) و هەڤالێت خۆ..
چەپەرێت خۆ بەرنەداینە،
گوهێ خۆ بدێ..
چەوا یێ ل زۆزانا دخورن!

د هەلبەستا (داستانا گەڤەرکێ) دا، کو پشتی روودانا شەرێ گەڤەرکێ ب چەند ڕۆژەکان هاتیە ڤەهاندن و بۆ شەهیدێن قارەمانێن شەرێ گەڤەرکێ هاتیەپێشکێش‌کرن (طیب،٢٠٠٤: ١٠٨)، دینامیکا روناهی و تاریێ ڕیتمەکا شعرییا گەلەک جوان ئاڤاکریە کو بوویە بەرجەستەکرنەکا فیزیکی بۆ شەرێ وان پێشمەرگەیان دەمێ ل نیڤا شەڤێ تڤەنگێن خۆ بەرددەنە دوژمنی، کو ل گەل حەرەکا تەقەکرنا تڤەنگان و وێگوریا ژێ دچیت، بزاڤا روناهی و تاریێ چەندین جاران دوبارە دبیت، ئەڤ دوبارەبوونە وەسا دناڤ دەقێ شعریژی دا دوبارە دبیت، کو دەق ژی چەندین جاران ڕوهن و تاری ببیت؛ ئانکو دەق دبیتە هەڤکێشەکا هونەرییا گەلەک گونجای بۆ هەڤکێشەکا ڕیالیستی، و ب هندێ، ژ بلی ڕیتما دەنگی، ڕیتمەکا شعرییا سیمانتیکی دهێتە ئاڤاکرن:

داستانا گەڤەرکێ
شڤێدی بوو.
کاروانێ ڕۆژێ.. ل نیڤا شەڤێ،
قوناغا وان.. گوندێ مە بوو.
کاڤلەکێ ب خوە و خوینێ ئاڤاکری..
ژڤان و هەشارا وان بوو.
پاریەکێ نانی و ئاگر و خوین و گوللە..
شیڤا وان بوو.
مەرگێ رەشێ رەشەکەکی..
شەڤبێری و داستانا وان بوو.

سپێدێ سولتان چەندێ رەش بوو،
د رەشی وەربوو.
هەر وێ سپێدێ..
کاروانێ مەهەرێگەش بوو.
سەرێ پێلا ڕۆژێ همبێزکرن..
وەرغەر کرن..
قوناغەک دی.
ژڤانا وان..
سەرێ پێلا ڕۆژەکا نوی.
ئا هۆسا ل گوندێ مە دیرۆکێ دنڤیسن!
ئو ئا هۆسا.. پێشوازیا ڕۆژێ دکەن و
ژ تێرێژێت وێ
تەڤنێ داستانەکا نوی درێسن!

دینامیکا ڕوناهی و تاریێ د ڤی خشتەیدا، دێ پتر دیار بیت کو هەڤکێشا هونەرییا هەڤتەری بە ل گەل هەڤکێشا ڕیالیستی:

| **تاری** | ڕوناهی | **تاری** | ڕوناهی | **تاری** | ڕوناهی | **تاری** | ڕوناهی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شڤێدی | کاروانێ ڕۆژێ | ل نیڤا شەڤێ | ئاگر و گوللە | مەرگێ رەشێ رەشەکەکی | سپێدێ | د رەشی وەر بوو | هەرێگەش بوو |

د ڤان چەند نموونەیێن باسکریدا، دشێین بێژین، دینامیکا ڕوناهیێ و تاریێ چ ب ڕەنگێ وێیا فیزیکی بیت یان ئەندێشەیی و زێهنی پێکهێنەرەکا سەرەکییە د ئاڤاکرنا ڕیتما شعری دا ل دەڤ (موئەیەد تەیب)ی، و ئەو ڕیالیستا کوردییا مێژوویی، کو شاعر تێدا ژیای، ب ناڤەرۆک و ڕەوشا خۆڤە، ئاراستەکەرەکا سەرەکی بوویە بۆ خۆدێ شاعری و سەربۆرا وییا شعری، کو پەیوەندیەکا دیالێکتیکی د ناڤبەرا هەردوان: خۆد و بابەتی دا دروست کریە، ب تایبەت د وارێ ڕیتمی و د بیاڤێ وێیێ سیمانتیکی دا.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

## ئەنجام:

١- دینامیکا ڕونـاهی و تاریـێ د شـعرا "موئەیـەد تـەیبی"دا ژ حالەتـەکێ خۆزاییـە، نەپەچرومەکرنـەکا ب خورتییە، ئانکو ژ ڤەرێژا سەربۆرا وییا تایبەتە، لەوا رۆلێ وێ د ئاڤاکرنا ڕیتما شـعریدا ژ رۆلـێ دەنگـی، کێمتـر نینە.

٢- ڕیتما وان دەقێن ژ دینامیکا ڕوناهی و تارییێ ل دەڤ شاعری چێ بووین، یا گونجایـە ل گـەل حالـەتێن ڕیتمییێن د ناڤ ژیانێ و سروشتیدا هەین.

٣- ئەو حالەتێن دناڤ سروشتی و ژیانێ ژی دا هەین، شاعری وەکـو هەڤکێشـەکا هونـەرییا هەڤسـەنگ بـۆ ڕیالیستەکا راستەقینە بکار ئینایینە.

٤- دینامیکا ڕوناهی و تارییێ د دەقێن پراکتیک‌کریدا دو حالەتێن ڕیتمییێن سەرەکی ستاندن:
حالەتێ فیزیکی و حالەتێ ئەندێشەیی.

**سەرچاوەکان:**

١.بەکر، محەمەد (٢٠٠٤) **پەخشانە شعری کوردی: تەکنۆ-سیمانتیکی گۆتاری شیعر**، هەولێر، دەزگای چاپ و بلاوکردنەوەی ئاراس.

٢. حەسەنی، یاسرێ (٢٠٠٦) **بنیاتێ ریتمی د شعرا نوویا کوردیدا**، دهۆک، دەزگەها سپیریز یا چاپ و وەشانێ.

3.الهاشمی،علوی (2006) **فلسفة الایقاع فی الشعر العربی**، بیروت، الموسسة العربیة للدراسات والنشر.

4. عبداللة، ستار (2002) **اشکالیة الایقاع البدیل فی الشعر العربی**، مجلة الاقلام.

٥. جەمیل رەشید، مەسعود (٢٠٠٩) **مێژوویا کێشناسیێ د هۆزانا کوردیدا**، ماستەرنامە، کولیژا ئادابێ– زانکۆیا دهۆکێ.

6. فتح الله، شاهو سعید (1999) **دلالات البناء الایقاعی فی الشعر: دراسة مقارنة فی الادب العربی والفارسی والکردی**، رسالة ماجستیر (غیر منشورة) کلیة اللغات، جامعة السلیمانیة.

٧.http://:mb-soft.com/believe/text/dualism.htm

8 .القنطار، کمال (2002) **فی ظلال العدد: إیقاعات الوجود 1، سلسلة "الدراسات الفلسفیة"** دمشق، وزارة الثقافة.

9. الدیوب، سمیرة (2009) **الثنائیات الضدیة، دراسات فی الشعر العربی القدیم**، منشورات الهیئة العامة السوریة للکتاب، دمشق، وزارة الثقافة.

١٠: وەیسی خالد، عیماد (٢٠٠٥) **جەڤەنگ د هۆزانا ریالیستیکا کوردی** دا: دەڤەرا بەهدینان ١٩٧١-١٩٩١، چ١، دهۆک، دەزگەها سپیریز یا چاپ و وەشانێ.

١١. بالایی، فەهمی (٢٠٠٨) **جیهانا رەنگان: لێکۆلینەکا هونەری یە ل سەر رەنگان**، چ١، دهۆک، دەزگەها سپیریز یا چاپ و وەشانێ.

١٢. عمر، فاضل، **سێهرەبەندی یا بەردەوام: زمانێچامەیی**، دهۆک، ڕ وەشانێن ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد.

13. ابودیب، کمال (1987) **فی الشعریة**، بیروت، مؤسسة الابحاث العربیة.

14. الهاشمی،علوی (1988) **ایقاع اللون فی القصیدة العربیة الحدیثة**، بغداد، وزارة الپقافة والاعلام، مهرجان المربد التاسع.

١٥. گەردی، عەزیز (١٩٩٩) **کێشی شیعری کلاسیکیی کوردی و بەراوردکردنی لە گەل عەرووزی عەرەبی وکێشی شیعری فارسیدا (لێکۆلینەوەیەکی شیکاریی بەراوردە)** هەولێر، وەزارەتی رۆشنبیری.

**١٦. طیب، مۆید** (٢٠٠٤) **ستران و بەفر و ئاگر (هۆزان)** هەولێر ،چاپخانەیا وەزارەتا پەروەدەیێ.

## سەرنجێکی حەجنامەکانی «نالی»

هادی ڕێزوان[-]

**کورتە:**

نالی گەشترین و پرشنگدارترین ئەستێرەی ئەدەبی کوردی، شاعیریکی ئەویندار و بە هەستە کە بە دست و پەنجە خەیاڵە هونەرمەندانەکەی تان‌وپۆی عیشقی حەقیقی و مەجازی لێکگرێداوە و نەخشێکی ڕازاوەی پێ خولقاندووە و دیوانی ئەدەبی کورادنی پێ ئاوەدان کردووتەوە. تاڵ‌تاڵی ئەم نەخشە بەبایەخە هەرکام جگەرگۆشەیەکن کە بە شیلەی گیانی نالی پەروەردە کراون و لە پێش چاوی نالی باڵایان کردووە بۆیە بە دڵ و داو چاودێریان دەکات:

لە جگەرگۆشەیەکی شیعرم مەدە مەعنایی خراب　　　　　بێ‌خەتا کەس نییە کە لە ئەولادی درێ

لە دیوانە ڕەنگینەکەی نالیەوە وا دەرئەکەوێ کە شاعیری دڵ سووتاومان لانیکەم دووجار سەفەری مەککە و مەدینەی کردووە و وادیارە لە هەردوودا تامەزرۆیەکی بێ‌قەرار بووە هەر بەسەرچووە.

دیاری ئەم حاجیە دڵ ساخە و بێ‌غەل و غەشە، سێ پارچە شیعرن کە من ناوم ناون «حەجنامە»؛ موستەزادە بەناوبانگەکەی «ئەی تازەجەوان» کە پەسنی پێغەمبەرە(د.خ) و باسی مەدینەی تێدایە؛ «ئەی کە ڕوو زەردی مەدینە...» کە وادیارە لە کاتی مەککە وتوویەتی و «ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا...»کە قەسیدەیەکی دوور و درێژە و بەحەق شیاوی ئەوە هەیە بانگی «حەجنامە»کەی بە گوێدا بخوێنێ. هەرکام لەم پارچە شیعرانە ڕەنگ‌وبۆ و تام و مەزەی خۆی هەیە دیارە هەر سێکەش ڕەنگ جوان و تام خۆشن.

نووسەری ئەم باسە تێدەکۆشێ سەرەنجێکی تایبەتمەندیەکانی هەر کام لەو سێ پارچە شیعرە بدات و لەلایەنی عیشقی حەقیقی نالی پایەبەرز بڕوانێ.

**وشە سەرەکییەکان:** نالی، حەجنامە، مەککە، مەدینە.

---

[-] مامۆستای زانستگای کوردستان.

## پێشەکی:

ئەم باسە لە سێ پارچەشیعری بەرزی نالی ئەکۆڵێتەوەو جارێکی تر بە تایبەتمەندیەکانیاندا ئەڕوانێ؛ بەتەنها هەر لەبەر ئەوەی کە نالی لەم سێ شوێنەدا باسی مەککە و مەدینەی کردووە و دیارە لە سەفەری حەجدا ئەم سێ قەسیدەی داناوە، ناوم ناون «حەجنامە». هەرچەندە نالی بەسەرهاتی خۆی نەگێڕاوەتەوە و هەر کوڵوکۆی دەروونی خۆی دامرکاندووە.

جا ئاخۆ نالی چەند سەفەری حەجی کردووە و جارێک یان دووجار یان زیاتر دەشتی حیجازی گرتووتە بەر، زۆر ئاشکرا نییە؛ بۆ ئێمەیش جارێ هەر ئەوە ئەڵێین کە «لە ڕێگای شیعرەکانی نالی خۆیەوە هەر ئەوەندەمان بۆ دەردەکەوێ کە نالی بە پیری حەجی کردووە. وەک لەو پارچە شیعرەی دەردەکەوێ کە لە سەفەری حەجیدا لە سەر قەبری پێغەمبەر(د.خ) وتوویەتی و تێیدا دەڵێ: ئەی تازە جەوان...» (محەممەدی مەلا کەریم، ۱۹۷۹: ١٤-١٥).

ئەوەشمان لەبیر نەچێ لە شەرحە بەناوبانگەکەی "مەلا عەبدۆلکەریمی مودەڕڕیس"دا بە گوێرەی تایبەتمەندی و جیاوازیەکانی دوو قەسیدەی «ئەی تازە جەوان ...» و «ئەی کە ڕوو زەردی مەدینە...» ئاماژە بەوە کراوە کە لەوانەیە "نالی" دوو سەفەری حەجی کردبێ. یەکێکیان لەگوڕی بیر کردنەوە و سۆزدا و ئەوی تریان لە سەردەمی پیریدا (بڕوانە: دیوان، ٢٩٩-٣٠٠). ئەگەر وابێ ئاخۆ قەسیدەی «ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا» کە شوێنەواری «تەسەوف»ی نالیشی تێدایە (سەجادی، ١٩٥٢: ٢٢٥). بەرهەمی کام سەفەر بێت؟ ئایا لە گوڕی بیر کردنەوە و سۆزدا وتوویەتی یا لە سەردەمی پیریدا؟

وادیارە باشترین شێوەی لێکۆڵینەوە لەم سێ قەسیدەی "نالی"یە پێداچوونەوەی یەکەیەکەی ئەوانە. بەمشێوە تایبەتمندی هەرکام لە پارچە شیعرەکان دێتە بەرچاو و جیاوازیەکان وەدەر ئەکەون. ڕواڵەتی قەسیدەکان وا نیشان ئەدەن کە نالی لە «ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا»دا لە ڕێگای حەجدایە و هێشتا نەگەیشتووە، لە «ئەی کە ڕوو زەردی مەدینە»دا نیازی گەڕانەوەی هەیە و لە «ئەی تازە جەوان»دا پیرێکی بەسالاچووەو لە مەدینەدایە. بەم پێیە منیش بەبێ ئەوەی ژمارەی سەفەرەکانی نالی بێرمە پێش چاو یا یەک و دوویان لێبکەم، جارێ هەر وەک یەک سەفەری حەج سەرنجی هەر سێ پارچە شیعرەکە ئەدەم: سەرەتا «سۆزی ڕێگا»، دوایی «سۆزی مەککە» و دوای ئەوان «سۆزی مەدینە».

### ١-سۆزی ڕێگا

مەبەست لە سۆزی ڕێگا ئەو قەسیدە دوور و درێژەی "نالی"ە کە لە ڕێی سەفەری حەجدا وتوویەتی و سەراسەر بە ئاوی چاوی نالی و لە کوورەی دڵی ئەودا پەروەردە بووە. بە وتەی مامۆستا سەجادی: «نالی کە لە سلێمانی دەرئەچێ کتوپڕ کە چاو ئەکاتەوە خۆی بەرامبەر ئەو کاروانەوە ئەبینێ کە ڕووبەڕووی بارەگای قیبلەی موسڵمانەکان و کۆشکەکەی دەسکردی ئیبراهیم ئەڕۆن، شعووری کە تا ئەو وەختە هەر لەبەر

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

بیستنێکی دووربەدوور ناڵەیەکی بە سۆز و زاری لێوە دەهات و پەڕی خەیاڵاتی تەنها لە ئاسمانی کوردەواریدا ئەو خوشخوانیەی ئەکرد، ئەبێ بە مینایەکی بێگەرد و وێنەی بارەگا و کاروانی ڕێگەی ئەو بارەگایە و عاشقانی ئەو ئایینسەرایە وەکوو ئاوێنەری بەری مانگ لەو مینایەوە دەرئەکەوێ (سەجادی، ١٩٥٢: ٢٢٥).

نالی ئەم قەسیدە ٧٤ بەیتیە بە سەرکوت کردنی نەفس و دونیا دەس پێئەکات (١-٣) و دوای ئەوە ئاماژە بەوە ئەکا کە نیازی سەفری مەککە و مەدینەی لە دڵدایە (٤-٥). بەمجۆرە ئەچێتە سەر باسی ڕێگە و سەحرا و دەشتی حیجاز و وشتری حاجیان و تێر و تەسەل قسەی لێئەکات (٦-٢٧). لە درفەتێکدا خۆی دەرباز ئەکات بۆ باسی ئەو وشتر و مەرکەبەی وا بەرەو مەککە و ڕەوزە ئەچێ (٢٨-٣٣) و لە ئاکامدا ئەگاتە مەککە (٣٤-٣٥). ئاوری ئەوین لە دڵی نالیدا زۆر بە تینە و ئۆقرەی لێئەسێنێ تاکوو ئەیبا بەرەو ڕەوزەی پێغەمبەر(د.خ) (٣٦-٤٠). بۆ دڵ سووتاوێکی وەکوو نالی پشوودان لە وەها شوێنێکدا هەر پەسنی پێغەمبەرە (٤١-٤٨) و ئەم جەزبە ئەیکێشێ بەرەو باسی قورئان و میعراج (٤٩)؛ بەڵام باسی میعراج بە بەیت و دوان تەواو نابێ، هەچەند سەفەر خۆی ساتێکە ئەمما داستانی بە باڵای شەوەکەی درێژە (٥٠-٦٦). نالی لە کۆتایی سەفەرەکەیدا دوای پەسنی ئالوئەسحاب (٦٧) دەست ئەکا بە نزا و پاڕانەوە (٦٨-٧٤) و بەم چەشنە قەسیدەکەی کۆتایی پێدێنێ.

ئەم شێوە داڕشتنەی نالی لە سەفەری حەجدا بێوێنە نییە و پێش ئەو «خاقانی» لە «تحفه العراقین»دا وەها کارێکی کردووە. خاقانی پێش هەموو باسێک، قسە لە «بادیە» ئەکات، ئێنجا ئەچێتە سەر باسی وشتری حاجیان و شوێنە تایبەتیەکان و شاری مەککە و مەدینە و دیارە مەدینە بەبێ پەسنی پێغەمبەر(د.خ) قسەی لێناکرێ. لە ئاکامیشدا ئەپاڕێتەوە و عەرزی حاجەت ئەکا (خاقانی ، ١٣٣٣: ١١٥-١٧٣).

**١-١ -باسی شوێنەکانی حیجاز**

نالی کە دڵ سووتاوێکی بە هەست و ئەوینە، عیشقی خودایی بەرەو وڵاتی حیجاز ڕایکێشاوە و ئاشکرایە ماڵی خودا (کەعبە)ی بەلاوە پیرۆزە. جا کێ بێ ماڵی خودا بە پیرۆز بزانێ و گڕ و تین و دڕک و داڵی سارای حیجازی بەلاوە خۆشتر لە باخ و بەهەشت نەبێ. بۆیە نالی پڕ بە دڵ هەست بە خۆشی ئەکات و ئەڵێت:

چمەککە داروبەردی قاعیدەی ئەرکانی ئیسلامە

چتەیبە ماء و خاکی مائیدەی ئەنواری ئیمانە

فیداکاری تەن و جان بە لە ئاسمانی هەراسان بە

کە داخ و دەردی ڕێگەی مەککە باخ و وەردی مەردانە

(نالی:٤٨٥)

ڕاستە نالی مەلایە و لە زانستی شەریعەت شارەزایە، بەڵام سەفەر سەفەری دڵە و دڵیش گاهێ هوشیار و گاهێ بێهۆش. کە بنچینەی ئیسلام لە مەککە بێ و مەککە «قاعیدەی ئەرکانی ئیسلام» بێ، داخ و دەردییش باخ و وەردە و بەڕای نالی ئەوەی لەم باسە تێدەگا «مەردە».

هەر بەپێی ئەم هەست و زانستەیە کە خاقانی شاعیریش لە یەکەمین هەنگاودا ئەڵێ:

در عرصەی بادیە نهی روی نە بادیە بل ریاض خود روی (خاقانی، ۱۳۳۳: ۱۱۵).

نالی کە سەحرا و ڕێگا و کاروانی حاجیان ئەبینێ، ئەگەرچی بیر و زوبانی هەردوو کوردیە، بەڵام وشە عەرەبیەکان بە ئەسپایی و بە ئاسانی خۆیان ئەخەنە کەلەبەر و ئەمجارە بەشێوەیەکی تر باڵای شێوەکانی نالی ئەڕازێننەوە (جەممازە، سەییارە، مەجەڕڕە، مەحیت، سەفینە، نیل، دیجلە، عوممان، فەجج، سماقی ئەحمەر، حەساتی ئەبیەز، شوهب، قاتاد، عەرفەج، عەوسەج، عەزات، شەفیر و حەفیر و...) (نالی:٤٨٧-٤٩٥). ڕاستەوخۆ بیری خوێنەری قەسیدەکە بەرەو لای وڵاتی عەرەبەکان ڕائەکێشن و نوقمی سەحرای ئەکەن. بەڵام نالی هێشتا هەر لە کێش‌وهەوای وڵاتەکەی نەبڕاوە:

قەتاری زەنگ و قوڕی ئوشتر و ئێستر لەسەر کێوان

دەڵێی زیڕەی سەدای قازوقوڵەنگی ئەوجی کەیوانە (نالی:٤٨٧).

بەڵام داودەوەن و دڕک و داڵی دەشتەکان پەرژینی ڕەوزەن و بەم چەشنە نالی ئەچێتە سەر باسی «ڕەوزە». باخچەیەکی تایبەت لە باخچەکانی بەهەشت:

چڕەوزە ڕەوزەی جەننەت چجەننەت جەننەتی قوربەت

چقوربەت قوربەتی ڕاحەت چڕاحەت ڕاحەتی جانە (نالی:٤٩٧)

نالی هەروەها باسی مەقام و ئاوی زەمزەم و حوجرە و مزگەوتی پێغەمبەر(د.خ) ئەکات و ئەوندە شەیدایە کە پەپوولەی دڵی نازانێ بۆنی کام گوڵ بکا و لە کوێ ئارام بگرێ. بۆیە لە ڕەوزەوە ئەچێتەوە بۆ مەقام و زەمزەم و کەعبە و دیسان ئەچێتەوە بۆ حوجرە و قوببە (نالی:٤٩٨-٥٠٣). ئەمە ئەوپەڕی عیشق و ئەوینە و وادیارە نالی لە بەندی ئەوەدا نییە لە کوێوە دەس پێئەکات و ئەگاتە کوێ.

### ١-٢-پەسنی پێغەمبەر(د.خ)

ئەم قەسیدەی نالی هەروەکوو قەسیدەی «بەحری نوور»ی مەحوی پەسنی پێغەمبەری مەزنی ئیسلامە و دڵسافی و دڵپاکی و سۆز و هەستی نالی بەرامبەر بەو خۆشەویستیە بە تەواوی ڕوون ئەکاتەوە. هەرچەند نالی و مەحوی دوو مەلای شاعیری کوردن و لە حوجرە و مزگەوتی کوردەواری پەروەردە بوون و وەکوو زۆربەی شاعیرانی کورد لە مەدحی پێغەمبەردا شیعریان هۆنیوەتەوە، بەڵام قەسیدەی «ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا...»ی نالی و جیاوازی لەگەڵ قەسیدەی «بەحری نوور»ی مەحوی زۆرە و زیاتر لە شێوەی شاعیرە عەرەبەکان ئەچێ.

مەحوی هەر لە کوردستان هەست بەوە ئەکا کە کوردەکان لە «همزیە و بردە» تێناگەن و چێژی تەواوی لێوەرناگرن، بۆیە ئەویش وەکوو شاعیرێکی ئەویندار «بەحری نوور»ی کوردی دائەنێ و خزمەکەی خۆی پێ دڵخۆش ئەکا:

لە «همزیە» و لە «بردە»م چوونکە کەم دی ئیستفادەی کورد

منیش ئەم کوردیەم دانا لە ڕیزی ئەو قەسیدانە

زوبانی عیشقبازی خۆشە گەر کوردی و ئەگەر تازی

قسەی بێسۆزی عیشق ئەر گەوهەرە مەحبووبی بێئانە

(مەحوی، ١٩٨٤: ٤٥٢-٤٥٣).

کەوا بێ مەحوی دانیشتووە بیری لەوە کردووتەوە کە کوردیش عاشقی پێغەمبەرن(د.خ) و دڵیان بەو هەستە ئەجۆشێ و پێیان خۆشە شیعری پەسنی پێغەمبەر لەبەر کەن و بیکەنە ویردی زوبان. جا با وەکوو «همزه و برده»یش عەرەبی بێ و لە واتای تێنەگەین. مەحوی لە ئەنجامدا وا بە باش ئەزانێ مەدحێکی کوردی پێغەمبەرەکەی بکا با کوردیش بۆ خۆیان بزانن چی ئەڵێن.

نالی نە لە کوردستانە و نە بیریش لەو بابەتانە ئەکاتەوە. عیشقی نالی لە دڵە بەجۆشەکەیدا خۆی بۆ نەگیراوە و گەیشتووتە هاوار و دەرفەتی ئەوەی پێنادا دابنیشێت و بزانێ چی ئەڵێ و چۆن دەس پێئەکات. بەڵێ نالیش هەر وەکوو مەحوی چێژی لە مەدحە عەرەبیەکان گرتووە و بگرە لەبەریشی کردوون، بەڵام وادیارە بەقەست لاسایی کەس ناکاتەوە و شوێنەواری ئەو قەسیدانە لە شیعرەکانیدا زۆربەیان ئاساییین.

«بوحیری» کە لەناو شاعیرانی پەسنبێژی عەرەبدا لە لووتکەدایە، کاریگەریەکی زۆری لەسەر نالی بووە. بوحیری لە «بردە»دا پێش دەست پێکردنی پەسنی پێغەمبەر(د.خ) نەفسی خۆی سەرکوت ئەکا و هەموو داخ و دەردی بەسەر خۆیا ئەڕێژێ:

فان امارتی بالسوء ما اتّعظت من جهلها بنذیر الشیب و الهرم

فاصرف هواها و حاذر ان تولّیه ان الهوی ما تولّی یصم او یصم

امرتُک الخیر الم ما ائنمرت به  وما استقمت فما قولی لک استقم

ولا تزودت قبل الموت نافله  ولم اصلّ سوی فرض لم اصم(اذهی القصائد:3-4)

ئەگەرچی نالی ئەوەندە لەسەر ئەم بابەتە ناڕوات، بەڵام ئەوەیش پێش هەموو شتێ باسی خۆی ئەکا وادیارە لە کار و بۆچوونی خۆی زۆر ڕازی نییە:

ئەلا ئەی نەفسی بووم ئاسا هەتا کەی حیرسی وێرانە    لەگەڵ ئەم عەشقبازانە بڕۆ بازانە ئازانە

مۆسڵمان لێرە مانی خان‌ومانت هەر نەمان دێنێ    پەشیمان کە دەرمانی نەمانت وایە ئیمانە

بلا بۆ کوندەبوو بێ مفتی مشکوماری کەندوو بێ    خەتیرەی گەنجی وێرانە زەخیرەی کونجی کاشانە

بەقییەی عومری زایع گەر مورادت پێ تەدارەک بێ    حەیاتی مەککەتو مەوتی مەدینەت جەبری نوقسانە

(نالی:٤٨٢-٤٨٤)

نالی هەر لە مەقامی پەسنی پێغەمبەردا ئاماژە بە یارانی ئەکا و ئیمانی بیلال و وەیس و سەلمان ئەکا بە بەڵگەی پایەبەرزی ئەو پێغەمبەرە؛ لە ڕێژنەی ڕەحمەت و سلامیشدا دوای پێغەمبەر ئەوان بەشدار ئەکا و ئال و یارانی و بەتایبەت «چار یار»ی ناو ئەبات.

لەوانەیە نالی نزا و پاڕانەوە و ناردنی سەلامی لە شاعرانی پێشوو وەرگرتبێ و لەکاتی هۆنینەوەی قەسیدەکەیدا ئەم شیعرەی «بوحیری» لە پێش چاو بوو بێ:

والال واالصحاب والتابعین فهماهل التقی والنقی و والحلم و الکرم(اذهی القصآئد:١٣)

لە باسی موعجیزاتدا نالی تەنیا بە یەک دوو ئاماژەی کۆتا ڕەزایەت ئەدا و تەنانەت وەکوو مەحوی لە موعجیزات ناکۆڵێتەوە. «شەققی ئەیوان» و «ئەسراری قورئان» دوو موعجیزەن کە نالی بە گۆشەچاوێ لێیان ئەڕوانێ و تێئەپەڕێ. نالی بە وردەکارییێکی جوان خۆی بۆ موعجیزەی میعراج ئامادە ئەکا و بە «موعجیز ئەندەر موعجیز» ناوی لێئەبات.

### ١-٣-باسی میعراج

باسی میعراج لەم پارچە شیعرەدا هەژدە بەیتە کە نالی بە وشەی «سوبحانە» دەستی پێدەکا و بەو شێوە ئەیەوێ ئاماژە بە گەورەیی و گرنکی شەوی میعراج بکات. «سبحانە» لە سەرەتای ئەو ئایەتەی سوورەی ئەسرایە کە باسی میعراج ئەکا و لە ئایەتەکەدا بایەخێکی زۆری بەو شەو داوە: «سبحان الذی اسری بعبده لیلا من المسجد الحرام الی المسجد الاقصی الذی بارکنا حوله». هەر بۆیە نالیش چەند بەیتێکی بە «شەوەمما» دەست پێدەکات و قەدر و بایەخی ئەو شەوە بە پێی بیر و هەست و بۆچوونی خۆی ئاشکرا دەکات.

لە چەند شوێنی ئەم بەیتانەدا «حوسنی تەعلیل» هەیە و نالی تا توانیەتی ڕۆخساری ئەو شەوەی جوان و ڕازاوە کردووە. مانگی شەوی چواردە هێشتا هەر شەرمەزاری ساحیبی شەوی میعراجە و بۆیە ئێستاش کە هەڵدێ، زەردی و سووری لە ڕوویا ئاشکرایە:

لە خەوف و خەجڵەتی بەدری شەهی نجووم سوپە ئێستەش

کە هەڵدێ زەردی و سووری لە تەلعەتیا نومایانە (نالی: ٥١٠)

دڵ و دیدە ئاواتەخوازی ڕەشی ئەو شەوەن و خۆریش لە شەرمی نووری ئەو خۆی شاردوتەوەو دەرناکەوێ:

شەوەمما غەیبتەیی نووری سوەیدایی دڵ و دیدە

شەوەمما خۆر تیا گوایا لە شەرمی نووری پەنهانە (نالی:٥١١)

هەم لەم داستانی شەوی میعراجەدا نالی ناوی چەند پێغەمبەرێکی تریش ئەهێنێ و تاریکی شەوەکەی پێ جوان و ڕۆشن ئەکاتەوە. ڕاستە شەوەکە خۆی زۆر تاریکە، بەڵام پەرتەوی هەر ئەستێرەیەکی وەکوو شەوقی دەستی «مووسا» لە ڕۆژی زینەتدا ئەدرۆشێ و شەوەکەی پێ ڕەوشن وسپی ئەبێتەوە. ئاسمانیش لەبەر جوانی ئەم شەوە کوێرایی داهات و سپی بوو؛ وەکوو چاوی «یەعقووب» کە لە دووری «یووسف» سۆمای لە دەست داوە ئاوی سپی داهات (نالی:٥١٠-٥١٢).

**بەشی پێنجەم- رەخنە**

نالی زۆر سۆفی نییە و بەڵگەی ئەم قسەیەش دیوانەکەیەتی، بەڵام شوێنەواری سۆفیایەتی جاروبار لە شیعری نالیدا خۆی دەرئەخات. لەم بەسەرهاتی شەوی میعراجەشدا «تەجرید» و «تەقریب» (نالی:٥١٣) لەوانەیە لە دوو شیعری تایبەتی سۆفیانە بن. ئەم دیاردە بۆ ئەو مەدرەسە کە نالی تێیدا پەروەردە بووە و تەنانەت دار و دیواریشی ڕەنگی سۆفیانەی لێنیشتووە، زۆر سەیر نییە؛ جا ئەگەر شاعیر وەکوو مەحوی سۆفی بێ، خۆی وشیارانە شیعری لەو ڕەوتە تایبەتیانەدا لێوانلێو ئەکات، هەر وەکوو لەقەسیدەی بەحری نووری داوای کردووە.

بە پێچەوانەی زۆرێ لە شاعیرانی پەسنبێژ، نالی نایەوێ بەسەرهاتی میعراج بە وردی باس بکات، بۆیە کە ئەگاتە شەو دڵی گیرۆدەی ئەبێت و هەر وەکوو عاشقێک پێیدا ئەنووسێ و تەنانەت بە جۆرێ ئەیەوێت ڕاز و نیازی لەگەڵدا بکات. نالی کە لە شیعردا شارەزای ڕێی عەشقە، ئەم ڕێگەش زۆر باش ئەپێوێ و کە ئەشگاتە ئاخری ئەم ڕێیە، تازە هێزی ئەوەی نەماوە بە وردەکاریەکاندا بچێتەوە و کۆتایی پێدێنێ:

موخەسس بوو مورخخەس بوو بە ئەسرارێ کە تەقریری

ئەجەلل و ئەعزەم و ئەعلالە تەعبیری سوخەندانە (نالی:٥١٦).

**١-٤-دەنگ و ڕەنگ و ...**

نالی کە خۆی بە وێرانەنشین ئەزانێ و ئاواتی دەربازبوونە، تەنانەت پەشیمانە لەوەی کە تا ئێستا ماوەتەوە (نالی:٤٨٢-٤٨٣)؛ عاشقانە خۆی ئەکاتە هاوڕێی «عەشقبازان» و بە دڵێکی پڕ لە سۆز و ئەوینەوە ڕوو ئەکاتە ئاوەدانی. لە چەند بەیتی سەرەتایی قەسیدەکەدا وادەرئەکەوێ کە نالی دڵی زۆر ناخۆش بووە و تەنانەت ئێمە ئەتوانین ئەم بەیتانە -کە نیشانەی بێزاری نالین لە باری ئەو ڕۆژەی وڵاتەکەی- بکەین بە بەڵگەی ئەوە کە پاش ڕووخانی میرنشینی بابانەکان کوردستانی بەجێهێشتووە. (موحەممەدی مەلاکەریم:١٦). جا کە لەم بەندە خۆی ڕزگار ئەکا و ئەبینێ نەجاتی بووە و لە ئاکامیشدا ئەگاتە مەڵبەندی یار، دەرگای بیر و هرزی ئەکرێتەوە و بەتەواوی هەموو هەستی ئەکەوێتە کار. بۆیە چاو و گوێی لە هیچ دەنگ و ڕەنگ و جووڵەیەک غافڵ نییە.

هیچ ڕەنگێ بۆ نالی بێمانا یا ئاسایی نییە و لە سارادا ڕەنگەکان ئەگەرچی زۆر نین، بەڵام نالی جوانیان تێکەڵ ئەکات و گیانیان پێئەبەخشێ. ئێستە ڕەنگەکان لەگەڵ نالی قسە ئەکەن و سوور و سپی داستانی عەشقی بۆ ئەگێڕنەوە:

ئەگەرچی ڕێگە خاکی خوێنە، دار و بەردی ئێسقانە نیشانەی پیری ڕێگەی عەشقە ئەم ئێسقانە سپیانە

خۆڵی سوور و وردە بەردی سپی ئێستە ئێتر ئاسایی نین، بەڵکوو ئەسووتێنن و ڕەجم ئەکەن:

سماقی ئەحمەرە یاقووتی ڕۆح و ئاگری نەفسە

حەساقی ئەبیەزە یا شوهب و نەجمی ڕەجمی شەیتانە (نالی :٤٩٣)

ڕاستە هەردوو ڕەنگی سوور و سپی ئەکەونە پێش چاوی نالی، بەڵام زۆر باش ڕەنگ ئەدەنەوە و خەیاڵی نالی شاعیر ڕەنگین ئەکەن.

لەلایەکی ترەوە تەنها هەر ڕەنگی سپی نالی بەرەو لای خۆی ئەکێشێ و بە یەکجار ژیان و مەرگی پێ نیشان ئەدات:

تەنی حاجی لەسەر چوارچێوەیی ناجی دەڵێی نەعشە

لوعابی خۆر لەسەر ئێحرامی وەک کافووری ئەکفافە (نالی:٤٩٠)

کە نالی بە چاوی سوور و سپی ئەبینێ و بە خەیاڵ تێکەڵیان ئەکات و لە دەنگەکانیش غافڵ نییە و بە گوێی دڵ ئەیانبیسێ.

دەنگی زەنگ و قۆڕی ملی وشترەکان وەکوو دەنگی قازوقوڵەنگ ئەچنە گوێی نالی (ناتلی:٤٨٧) و ئەگەرچی نالی وڵاتی قازوقوڵەنگی بەجێهێشتووە و بە ڕەزا ڕووی دڵی کردووتە وڵاتێکی تر، بەڵام هێشتا دڵێکی هەر لەوێ ماوە و زەنگی وشترێک دایئەچڵەکێنێ و ئاوازی ئاسمانی وڵاتەکەی وەبیر دێنێ.

جیرەجیڕ و تەقەتەقی تەختەی کەژاوەی وشترەکەی نالی، ناڵەناڵی ئەستوونی حەننانە ئەخاتەوە بیری و ئەوەندەی کە سۆزی گەیشتن بە مەدینە لە دڵیدا ئەگەشێتەوە:

کەژاوە و دار و بار و تەختەی لوختی لە سەر بوختی

دەناڵێنن لە شەوقی تەیبە وەک ئەستوونی حەنانە (نالی:٥٠٠)

لەلایەکی ترەوە هەر شتێک دڵی نالی ئەخاتە خورپە و جموجوڵ. ڕێپێوانی وشتران و هاتوچۆی ئەستێرەکانی کاکێشان هەموو بۆ ئەوەن عاشق لە ڕێ لا نەدات و زوو بە یاری بگات:

مەگەر ڕێی حاجیانە وا تیا سەییارە سەییارە مەجەڕڕە ئالەتی جەڕڕی سارەبانانە (نالی:٤٧٨)

تەنها هەر هونەری نالی شاعیرە کە دەنگ و ڕەنگ پێوە تێکەڵ بکات و نەقشەی قەسیدەیەکی —هەر لە ڕێگادا- لێ بڕازێنێتەوە.

هەر وەکوو ئاماژەی پێکرا نالی لە ڕێگادا دڵخۆش و سەرخۆشە و بۆیە ئەم پارچە شیعرەی ئاوەدان و ڕەنگینە و تەنانەت وشەکانیش بۆ خۆیان دەنگ و ڕەنگ و جووڵەیان هەیە کە لە خوێندنەوەی قەسیدەکەدا ئاشکرا دەبێت و دڵ و هەست پێدەزانێت.

### ٢- سۆزی مەککە

مەبەست لە سۆزی مەککە ئەو قەسیدە دە بەیتیەیە کە نالی لەمەککە وتوویەتی و بە «ئەی کە ڕوو زەردی مەدینە...» دەست پێئەکا و پڕ لە سۆز و گلەیی و نزا و پاڕانەوەیە. ڕواڵەتی قەسیدەکە وامان بۆ دەرئەخا کە نالی بە هۆی شتێک یا کەسانێکەوە نەیتوانیوە ئێتر لە مەککە و تەنانەت مەدینە بمێنێتەوە و لە لایێکەوە ئەم بەجێهێشتنەی زۆرر پێ ناخۆش بووە؛ جا لەبەر ئەمە نالی بەدڵێکی پڕەوە ئەچێتە دەرگانەی خودا و کوڵوکۆی دەروونی خۆی دائەمرکێنێ و قسە لە چوونی خۆی ئەکات. ئەگەر وابێ مەبەستی نالی لە «دەرکرا و دەربەدەر» (نالی:٣٩٩) دەر کردنی لە مەککە و مەدینەیە. بڵێی نالی —کە مەلاش بووە- دوای ماوەیەک مانەوە لەگەڵ زانایانی مەککەدا بەینی شێوابێ و کەسانێ داوای ڕۆیشتنی نالیان کردبێ؟ ئەمە زۆر ڕێی

تێئەچێ. نەخوازەڵڵا خۆ نالی خۆی ئەم مەبەستە ئاشکرا دەکات و ئەڵێت کە ئێوە پێتان وایە من لێرە نەمێنمەوە و برۆم، باشە ئەڕۆم. بەڵام خۆ «جیوار» و نزیکی هەر مانەوە لە مەککەدا نییە و من ئەگەرچی ئەڕۆم بەڵام دڵم لە لای خودا و ماڵی خودایە و ئەمە بۆ من بەسە:

بۆ جیواری حەق حییەتی نییەت کافیە        من لە «بیت‌الله» ئینشەئەڵلا «باذن الله» دەڕۆم (نالی:٣٠١)

بۆیە نالی پلارێکیان تێئەگرێ و ئەو کەبنە ئەکا بە «حەماماتی حەرەم» و «دانە و ئاوەکەیان» بە حەرام دائەنێ و نایخوات. کەوابوو نالی بیروڕای تایبەتی خۆی بووە و حازریش نەبووە بۆ نان و شان ئەم بیروڕایە پێ‌شێل بکات و قرِوقەب دابنیشێ و پێی لێ ڕاکێشێ. ئەو «بازێکی دیدەباز» و هەموو شتێک ئەبینێ و بەرامبەر بەمەش بێدەنگ داناکەوێ. لەبەر ئەوەی ئەو وەکوو زۆر کەسی تر دەستەمۆ نەکراوە و بە ئازادی ئەژی (نالی:٣٠١-٣٠٣).

لەلایەکەوە نالی لەبەر ئەم بەجێ‌هێشتنە زۆر دڵی تەنگ و پڕ بەسۆزە، بەڵام ئەم سۆز و دڵتەنگییە ڕاستەوخۆ نادرکێنێ و بەجۆرێ بە شوورەیی ئەزانێ خۆی زەبوون و بێتاقەت نیشان بدات. بۆیە ژانی دووری لە دڵی خۆیدا ڕائەگرێت و بە سەربەرزیەوە دڵخۆشی خۆی ئەداتەوە. ئەم دڵخۆشی دانەوە کە ئاگرێکی بەتینی لە خۆیدا شاردۆتەوە، زۆربەی قەسیدەکەی بۆ خۆی تەرخان کردووە. ڕاستە میوانی ماڵی خودا پایەبەرزە و دووری لەو ماڵە دژوار و سەختە، بەڵام خۆ ڕەحمەتی خودا گەورەترە و دڵۆپێکی ئەو ڕەحمەتە هەرچی گوناهە پاک ئەکاتەوە و سەد ئاوی زەمزەمی پێناگات:

دەفتەری ئەعماڵی من بێ قەترەیەکی ڕەحمەتت

کەی بە سەد زەمزەم سیاهی نوقتەیەکی لێ دەشووم (نالی:٣٠٠)

نالی لەبەر ئەوەی ناتوانێ بێدەنگ دانیشێ و چاوی لە بەرامبەر ڕاستیەکاندا ببەستێ، ناتوانێ دانیشێ و ئەبێ بڕوات. بێدەنگ بوون و چاوبەستن گوناهە و گوناهیش لە مەککە یەک بە سەدە. کەوابوو لەگەڵ خودا و دینەکەیدا درۆ ناکرێ و چی ڕاستە ئەبێ بوێژرێ:

خەوفی من لێرە لەبەر زۆری گوناه یەک بە سەد

گەرچی عاسی و موزەنیب بم ئەمما موقەسێر و بێ‌درۆم (نالی:٣٠٤)

کە قەسیدەکە ئەوندە بەڕاستی بێ و پڕ بێ لە سۆز و نزا و پاڕانەوە، جا شاعیرێکی کلاسیکیش بێ، جێی پەشیمان بوونەوە و خۆ گۆڕین نییە. بۆ پارچە شیعرێکی وەها کە نە گاڵتە و تەنزە و نە غەزەڵە ئەو باسەی کە لە شەرحی دیوانەکەدا (نالی:٣٠٤) لە سەر وشەی «لامەدە» هاتووە کە زۆر ڕێی تێناچێ و وادیارە ئەو نوسخانەی کە نووسیویانە «لا بدە» (نالی:٣٠٥) ڕاستتر بێ. خۆ ئەگەر بزانین «ساڵحان» پلارێکی ترە و مەبەستی نالی هەر «حەماماتی حەرەم»ە، ئەم بۆچوونە جوانتر ڕوون دەبێتەوە.

نالی کە تا بەیتی دەهەم هەر بە سۆز و ئاهەوە گریاوە و سەریشی بۆ ساڵحانی ناساڵح دانەنواندووە، دیارە لائەدات و خۆشەچینی خەرمانی ڕۆم لەو خەزێنە پڕ و دەوڵەمەندە بە باشتر ئەزانێ. ئەوەش کە نالی ترسابێ و ئەم بەیتەی بۆ ڕۆژی تەنگانە و هاتونەهات دانابێ کە خۆی لە بەڵا و ئافەت پێ نەجات بدات هەر ڕێی تێ ناچێ؛ بۆ ئەوەی نالی تا بەیتی نۆهەم کاری خۆی بە شای بە ئەنجام گەیاندووە و دڵی چی خواستووە،

وتوویەتی. خۆ مەککەش دیاری عەرەبەکانە و وانیە وەکوو کوردستان شیعری نالی تێیدا بزرێ و تووشی مەترسی بکات. ئەم قەسیدە لەگەڵ قەسیدەکەی پێشوو (سۆزی ڕێگا) لە چەند بارەوە جیاوازی هەیە:

ئا: نالی لێرەدا کە دڵی پڕ لە ژان و نەفەسیشی ئەوەندە بڕ ناکات و تەنها ئەیەوێ دڵی خاڵی کاتەوە و تۆزی کوڵ و کۆی ئاگری دەروونی دامرکێنێ؛ لە «سۆزی ڕێگا»دا نالی لەسەر شەوقە و ئەزانێ کە ڕێگا –چەندە دووریش بێ- ئەگاتە یار و بە تەواوی ئەیحەسێنێتەوە. جا لەو ڕێگا دوور و درێژەدا پڕ بەدڵ ڕاز و نیازی خۆی ئەکا و دەربەندی تەواو کردنی شیعرەکەی نییە.

ب. قەسیدەی «سۆزی ڕێگا» پەسنی پێغەمبەرە(د.خ) و نالیش حەزی کردووە وەکوو زۆرێک لە شاعیرانی تر مەدیحەیەکی ببێ و دوور نییە دوای وتنی ئەم پارچە شیعرە چەند جارێک پێیدا چووبێتەوە و بۆ ڕێکوپێکتر کردنی هەوڵی دابێت؛ بۆیە وشەکان ڕازاوەن و لە پەنای یەکدا نەخشێکی هونەرمەندانەی جوانیشی خولقاندووە. ئەم قەسیدەی «سۆزی مەککە» هەستێکی بەتەواوی ڕاستەقینەیە و لە ناخی دڵی نالیەوە هەڵقوڵاوە و شاعیر کەمتر ئاگای لە داڕشتنی وشەکان بووە؛ وشە هەر خۆی بۆ خۆی هاتووە لێرەدا شیعر و شاعیر یەکن.

ج. شیعری نالی لە «سۆزی ڕێگا»دا لە زۆر لایەنەوە لە شیعری پێشووەکانی عەرەب دەکات؛ لۆمە و سەرزەنشت و باسی ڕێگا و سارا و قەتاری وشتر و وشترەوان و ... هەموو ئەبن بە پێشەکی بۆ مەبەستی سەرەکی قەسیدەکە کە پەسنی پێغەمبەرە و ئەم شێوازە «بوردە»ی «کعب بن زهیر»مان دێنێتەوە بیر (ازهی القسائد:١-٣٤)؛ تەنانەت دەرئەکەوێ کە شاعیرەکانی پێشووتری وەکوو «طرفه بن العبد»یش لە سەر هەست و بیری نالی کاریگەریان هەبووە (المعلقات:٤٩-٨٢).

**٣- سۆزی مەدینە**

مەبەست لە سۆزی مەدینە شیعرە موستەزادەکەی نالیە کە نۆ بەیتە و بە «ئەی تازە جەوان» دەست پێدەکات؛ وەکوو شەرحی دیوانەکەی هاتووە:

«نالی لەم پارچە شیعرەیدا ڕووی دەمی کردۆتە پێغەمبەر(د.خ) و سکاڵای خۆی لا ئەکا. دیارە ئەم شیعرەی لەو کاتەدا داناوە کە لە سەردەمی پیریدا چووەتە مەدینە و زیارەتی قەبری پیرۆزی پێغەمبەری کردووە (نالی:٢٦٥).

لە بەراوردێکی ئەم موستەزادە و قەسیدەکەی مەککەدا وامان بۆ دەرئەکەوێ کە ئەم دوو قەسیدە بەرهەمی دوو سەفەری جیاوازن. گومانیش لەوەدا نییە کە «ئەی تازە جەوان» بەرهەمی دەورانی پیری نالیە و لە چەند شوێنی قەسیدەکەدا ئاماژە بەمە کراوە: «پیر و ئوفتادە»، «تا ماوە حەیاتم» (نالی:٢٦٤) و «من پیرم و فانی» (نالی:٢٦٥)، «موغبەر بووە میهرم» (نالی:٢٦٨) هەموو بەڵگەی ئەوەن کە نالی بە ساڵاچوو بووە.

لێرەدا نالی هەر سکاڵای خۆی ئەکا و پیریەکەی خۆی نەبێ ناوی کەسی تر نابات. جا ئەگەر نالی دوو پارچە شیعرەکەی لە یەک سەفەردا دانابێ باسی حەماماتی ئەکرد و شتێکی ئەدرکاند. خۆ ئەگەر بزانین پێشتر لە قەسیدە دوور و درێژەکەیدا چۆن پەسنی پێغەمبەری کردووە، بۆمان دەرئەکەوێ کە لەم سەفەرەدا سێبەری «شەوارە دەستەمۆ»کان بە سەریەوە نەبووە و قەراریش نەبووە نالی مەدینە بەجێبهێڵێ. ئەو کە

ئارەزووی بووە لە مەککە بژی و لە مەدینە بمرێ (نالی:٤٨٤) لەم قەسیدەدا بۆ هیچێ باسی ڕۆیشتن و گەڕانەوە ناکات؟

بە پێچەوانەی پارچە شیعری یەکەم (سۆزی ڕێگا) کە لیباسێکی عەرەبی دەردامانی لەبەردایە، ئەم قەسیدە زیاتر لە شیعری شاعیرە فارسەکان دەکات؛ «تازە جەوان؛ ئوفتادە، شکەستە (:٢٦٤)؛ بوم (:٢٦٦)؛ سوپیهر، سیەهڕوو (:٢٦٨)؛ مەسیجێد، مێحرابگە، ڕلە (:٢٦٩)؛ دەر (:٢٧٠)» هەموو ئاماژە بەو دیاردەیە دەکەن. ئەگەر نالی دوای سەفەرەکەی مەککە گەڕابێتەوە بۆ عوسمانی و ئەستەمبۆڵ، لەوانەیە لەگەڵ زۆر شاعیری تردا دیداری کردبێت و بێگومان لە ئەستەمبۆڵی ئەو کاتەدا زمانی فارسی بایەخێکی زۆری هەبووە. ئەدەبی فارسی کاری کردووەتە سەر زەوقی نالی و ئەم شێوازەی «سۆزی مەدینە»ی لێ بەجێماوە. سەرەنجێکی تری قەسیدەکەش بدەین، ڕەنگێکی سۆفیانەشی تێدا ئەبینین کە ئەوەیش هەر بەرهەمی زوبانی ئەدەبی ئەو کاتەی عوسمانیە:

ئەی مەتلەعی ئەنواری هەموو قاسی و دانی شەمسی هەمەدانی

وەلا زەڕڕەیی بێجیلوە نە سەد جود و نە مەعدووم جویایی بەلاتم

(نالی:٢٦٩).

**کۆتایی:**

هەرچەند بە وردی نازانین نالی چەند سەفەری حەجی کردووە، بەڵام دیوانەکەی سێ پارچە شیعری تێدایە کە بێگومان بەرهەمی حەجن.

**یەکەم** «سۆزی ڕێگا»: قەسیدەیەکی حەفتاوچوار بەیتیە و نالی دوای بەجێهێشتنی کوردستان لە ڕێگای مەککە و مەدینەدا دایناوە. ناوەرۆکی قەسیدەکە پەسنی پێغەمبەرە. لەو پارچە شیعرەدا نالی چووەتە سەر شێوازی شاعیرە عەرەبەکان. لێرەدا نالی هەوڵ ئەدات ناڕاستەوخۆ پلەی زانیاری و شارەزایی خۆی لە زوبان و ئەدەبی عەرەبیدا دەربخات.

**دووهەم** «سۆزی مەککە»: کە تا ڕادەیەکی زۆر بیروڕا و کەسایەتی نالیمان پێ دەناسێنێ. نالی لەم پارچە شیعرەیدا پلار ئەگرێتە ئەو کەسانەی کە لە پەنای ماڵی خودادا بە خێر و حەسەنات و ئەم و ئەو ئەژین و خۆیان بە «ساڵحانی حەرەم» لە قەڵەم ئەدەن و کەچی لە ڕاستیدا بیروبۆچوونیان لارو وێڕە و هەر بۆیە نالی ناتوانێ بێدەنگ بێ؛ «چی حەق و ڕاستە ئەیڵێم و ئەڕۆم»؛ خودا تەماشای دڵ و دەروونی بەندەی خۆی ئەکا و ئەوەی بە دڵ لەگەڵ خودایدا بێت بە خودا نزیکە.

**سێهەم** «سۆزی مەدینە»: کە ڕاز و نیاز و سکاڵای پیرێکی بە ساڵاچووی ئۆمێدوارە. نالی کە ئەزانێ کاتی ماڵئاوایی لە دنیا نزیکە و ئەبێ حازر بێ، ڕووی دەمی ئەکاتە مەرقەدی پێغەمبەر. پیری و خەتاباری خۆی لە پەنای یەک دائەنێ و داوای خەڵاتی «عەفو» ئەکات. ئەم قەسیدە بە پێچەوانەی «سۆزی ڕێگا» هیچ نیشانەیەکی شانازی تێیدا بەدی ناکرێت و تەنها ئاوازی دڵێکی سووتاوی هیوادارە.

**سەرچاوەکان:**

**١ - زهی القصائد فی مدح النبی** (١٩٣٢) مصر، مطبعه الستقامه، الطبعه الاول.

٢- خاقانی شروانی، افضل الدین (١٣٣٣) **مثنوی تحفه العراقین**، تهران، امیر کبیر.

٣- الزوزنی، ابوعبدالله الحسین بن احمد (١٣٥۴) **شرح المعلقات السبع**، قاهره، المکتبه تجاریه الکبری.

٤ - سەجادی، عەلائەدین (١٩٥٢) **مێژووی ئەدەبی کورد**، بەغدا، چاپخانەی مەعارف.

٥ - موحەمەدی مەلاکەریم (١٩٧٩) **لە ڕێگای ئەدەب و لە پێناوی نالیدا**، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد.

٦- مەحوی، مەلا موحەممەد (١٩٨٤) **دیوانی مەحوی**، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، چاپی دووهەم.

٧- نالی، مەلا خدر ئەحمەدی شاوەیسی میکائیلی (١٩٧٦) **دیوانی نالی**، لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدوڵکەریم و فاتیحی مەلا کەریم، بەغدا، کۆڕی زانیاری کورد.

# سه‌رنجێک بۆ بناخه‌کانی مێژوویی چیرۆکی «مه‌م و زین»

د. نه‌جمه‌دین جه‌باری [-]

**کورته:**

چیرۆکی عاشقانه‌ی «مه‌م و زین» گه‌لێ به‌رزتر له‌وه‌یه که پێویست به ناساندن بکات. ئه‌م چیرۆکه هه‌ر له باکووره‌وه هه‌تا باشوور، له ئه‌ده‌بی ڕه‌سمییه‌وه هه‌تا ئه‌ده‌بی زاره‌کی، له خۆنواندندایه و له بیر و مێشکی هه‌ر کوردێک جێگیر بووه و به چه‌شنه‌کانی گۆرانی و به‌یت و ته‌نانه‌ت مه‌ته‌ڵ و قسه‌ی نه‌سته‌قیش خۆی نواندووه که گشت ئه‌مانه پیشانی ئه‌دات که ئه‌م چیرۆکه له ناو ژیان و بیری ڕۆژانه‌ی گه‌لی کورددا هێلانه‌ی کردووه.

ئیستا ئه‌گه‌ر بپرسین که ئه‌م چیرۆکه چۆن بوو هه‌ڵقولا و له کوێوه سه‌رچاوه‌ی گرت، باسێکی جیاوازه که تا ئیستا توێژینه‌وه‌ی له‌سه‌ر نه‌کراوه.

ئه‌م وتاره ئه‌یه‌وێ به وردی باسی سه‌رچاوه‌کانی مێژوویی چیرۆکی «مه‌م و زین» بکات و بۆ ڕووداوه‌کانی ئه‌م چیرۆکه بنه‌مایه‌کی مێژوویی بدۆزێته‌وه و ئه‌وه بسه‌لمێنێ که «مه‌م و زین»یش وه‌ک هه‌ر چیرۆکێکی تر، له سه‌ر ڕووداوێک که زه‌مانێک قه‌وماوه، درووست بووه. به پێی ده‌ستکه‌وته‌کانی ئه‌م وتاره، بناخه‌ی ڕووداوه‌کانی «مه‌م و زین» بۆ سه‌ده‌ی پێنجه‌می کۆچی ئه‌گه‌ڕێته‌وه.

**وشه سه‌ره‌کییه‌کان:** چیرۆک، ئه‌ده‌بی کارناواڵی، ئه‌ده‌بی ڕه‌سمی، مێژوو، مه‌م و زین، قه‌ترانی ته‌ورێزی.

---

[-] مامۆستای زانستگای کوردستان.

### سەری قسە

«ئەحمەدی خانی»، هەڵبەستوانی هێژای کورد لە سەدەی یازدەهەمی کۆچیدا (سەدەی حەڤدەهەمی زایینی) کاری هۆنینەوەی چیرۆکی «مەم و زین»ی دەست پێکرد کە هەتا ئەوکاتە لە ئەدەبی ڕەسمی کوردیدا نەکرابوو؛ بە واتایەکی تر، هەتا سەدەی یازدەهەم، ئەم چیرۆکە تەنیا لە ئەدەبی زارەکی خەڵکیدا باو بووە. بەڵام لەم سەدەوە، خانی ئەم چیرۆکەی هێنایە ناو ئەدەبی ڕەسمی کوردی و جلێکی جوانی ئەدەبی و ئەبەدی بۆ لەبەر کرد. ئەم چیرۆکە -کە تەنیا یەکێکە لەو کارە بەنرخانەی کە خانی بۆ ئەدەبی کوردی و گەلی کوردی کردووە- زۆر بەر لەوەی کە خانی بیهۆنێتەوە، لە ناو خەڵکدا باو بووە و بەیتبێژان لە سەرانسەری کوردستاندا ئەم چیرۆکەیان بۆ خەڵکی باس کردووە. کەواتە ئەم چیرۆکە خوڵقێندراوی هزر و بیری «خانی» نییە.

ئیستا ئەگەر لەوە بکۆڵینەوە کە: ١) خانی ماکی ئەم چیرۆکەی لە کوێ هێنا ٢) ئەم چیرۆکە بۆ چ سەردەمێک ئەگەڕێتەوە و ژیانی کەنگێ پیشان ئەدات، دوو بابەتن کە ناوەرۆکی ئەم وتارە پێکدێنن. بەڵام بەر لەوەی باسەکە دەست پێبکەین، پێویستە بە خێرایی لە دوو تویی ئەدەب (ئەدەبی کارناواڵی و ئەدەبی ڕەسمی) بدوێن کە بە یەکەوە ڕوخساری گشتی ئەدەب و هەروەها بەردی بناخەی ئەم وتارەیش پێکدێنن.

### ئەدەبی کارناواڵی و ئەدەبی ڕەسمی

ئەدەبی هەر گەلێک بە دوو پاژ دابەش ئەبێ: پاژی یەکەم «ئەدەبی فولکلۆر» و پاژی دووهەمیش «ئەدەبی ڕەسمی»یە. ئەدەبی فولکلۆر هەر ئەو بەیت و مەتەڵ و چیرۆک و گۆرانییانەیە کە خەڵک بە درێژایی مێژوو دروستی کردووە و بەوانەوە ڕۆژگاری خۆی پێڕابردووە و زام و ئەڤین و کۆیلەیی و سالاری خۆی تێدا بینیوە. ئەم پاژە لە ئەدەب، ڕاشکاوتر لە هەر کتێبێکی مێژوویی، مێژووی گەل دەرئەبڕێ و هەوراز و نشێوەکانی بە چینی داهاتوو ئەگەیەنێ. دیارە کە ئافرێنەری ئەم ئەدەبە کەسێکی تایبەت نییە و لە کاتێکی دیاریکراویشدا پێکنەهاتووە؛ بەڵکوو کەسانێکی زۆر لە ئافراندنیدا بەشداریان هەیە؛ هەر بەو هۆیەش کاتی پێکهاتنی نادیارە. درووستبوونی هەر بەرهەمێک لە بەرهەمەکانی ئەم ئەدەبە چەندین دەیە یان سەدەی خایاندووە.

ئەم ئەدەبە ئێجگار پڕبایەخە، خەزێنەیەکی دەوڵەمەند لە هەست و ئاوزە و جیهانبینی گەلی لەخۆ گرتووە؛ کەواتە ئەتوانێ بۆ توێژینەوە لەسەر داب و نەریت و باوەڕ و مرۆڤناسی و کۆمەڵناسی باشترین سووژە بێت.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم پاژە لە ئەدەب ئەوەیە کە کۆمەڵەی خەڵک (چینی هەژار و چینی ناوەڕاستی کۆمەڵگە) ئافرێنەریەتی و هەر لەلایەن ئەوانیشەوە بۆ چینەکانی داهاتوو ڕاگواستووە؛ کەوابێ دەربارەکان و چینی دەوڵەمەندی کۆمەڵگا لە ئافراندنی ئەم پاژەی ئەدەبدا ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نییە. لە ڕووی ئەم تایبەتمەندیەوە ئەتوانین دوو ئاکام دەستنیشان بکەین: ١) تێگەیشتن لە ڕواڵەت و ناوەرۆکی بەرهەمگەلی ئەم ئەدەبە زۆر سەخت نییە؛ چونکە هەر لە وشە و زاراوەی ناو خەڵک کەڵک وەردەگرێ و هیچ

وشەیەکی دژوار -کە لە ناو خەڵکدا نەسوابێ- تێیدا بەکار نایەت. لەم ئەدەبەدا هەرگیز ناوەرۆک نابێتە قوربانی ڕواڵەت و وشە. بۆ نموونە ئەتوانین ئەو مەتەڵ و چیرۆکانە وەک «تیتیل و بیبیل» بێنینەوە کە پشتاوپشت لە باو و باپیرانەوە بەدەستی ئێمە گەیشتووەو تێگەیشتنیان دژوار نییە. ئەگەریش ئەو بەرهەمە فولکلۆرە هەڵبەست بێ، کێشی هەڵبەستەکە بڕگەییە و داڕشتنی دێڕەکان لەسەر کێشێکی دژوار جێگیر نەکراوە؛ وەک بەیتە کوردییەکان کە کێشی بڕگەییان هەیە. ٢) ئەم ئەدەبە، زارەکییە و هەتا ڕۆژگاری ئێمەیش -کە کەسانێک لێرە و لەوێ کاری نووسینەوە و تۆمار کردنی بەرهەمگەلی فولکلۆریان دەست پێکرد- هەر زارەکی ماوەتەوە. مەبەست لە زارەکی بوون ئەوەیە کە خەڵک ئەو چیرۆکانە لە بەیتبێژێک ئەبیسن کە ئەو بەیت-بێژەیش خۆی لە پێشینیانی بیستووە. ئەو بەڵگانەی کە ئەمڕۆ لەبەر دەستدایە، دەری ئەخا کە لە ڕۆژگارانی بەریندا ناو بە ناو لە کۆلانەکاندا شوێنی گشتی لێبووە کە کۆمەڵانی خەڵک تێیدا بۆ بیستنی چیرۆک خڕ ئەبوونەوە (آذر، 1382: 87) ئەم ڕەوتە هەتا ڕۆژگاری نوێ و لە ئێرانیشدا هەتا سەردەمی قاجارەکان و هاتنی قاوەخانە بۆ ناو کۆمەڵگا هەر بەردەوام بووە (پهلوانزاده، ١٣٨٧: ٢٩-٥٦). لەم ڕووەوە بەیتبێژان، سەربازانی نەناسراوی گەل بوون کە ئەرکی گەیاندنی ئەو خەزێنە دەوڵەمەندەیان بە دەستی ئێمە لە ئەستۆ گرتووە بێ-ئەوەی کە لە شوێنێکدا ناویان تۆمار کرابێ، یان بەهرەیەکیان پێگەیشتبێ.

زارەکی بوون تایبەتمەندیگەلێک لەگەڵ خۆیدا ئەهێنێ؛ لەوانە ڕێگە خۆش کردن بۆ گۆڕانی بەرهەمەکانی ئەم ئەدەبەیە. بەڵام ئەم گۆڕانە ئەوەندە هێدی و ئارام ئەنجام ئەبێ کە کەمتر هەستی پێئەکرێ. هەروەها زارەکی بوون، تایبەتمەندیەکی دیکە بە ناوی «کارناواڵی» بەم ئەدەبە ئەبەخشێ.

کارناواڵ بە واتای هەر جەژنێکە کە کۆمەڵەی خەڵک بۆ خۆشی ژیانیان ئەیگێڕن؛ ئەم وشە، یەکەم جار لە لایەن «میخاییل باختین»، فۆڕمالیستی ڕووسەوە بۆ ژیانی خۆش و دوور لە ڕەسمی بوونی گەلانی سەدەگەلی ناوین لە ئورووپا بە کار هێنرا کە لە سەر بناخەی شادی و هەلاتن لە سیستەمی وشکی پڕ لە ترسی کلیسا دامەزرابوو (احمدی، ١٣٧٨: ١٠٧). جەژنی کارناواڵی، هەڵقوڵاوی خەڵکە و هیچ دەسەلاتێکی زەینی وەک شێخ و مەلا و مزگەوت و خانەقا، یان دەسەلاتێکی عەینی وەک دەربار و هێزی چەکداری و ئەمنی، بە هیچ چەشنێک توانای دەستێوەردانی تێدا نییە، بگرە زۆر جاریش دەسەلاتدارەکان بۆ بەڕێوە بردنی ئاهەنگی ئەو جەژنە خۆیان شوێن خەڵک ئەکەون و وەک خەڵک جەژن ئەگێڕن. باشترین نموونە بۆ جەژنی کارناواڵی، ئەتوانین جەژنی «نەورۆز» ناو ببەین کە سەرباقی ئەو هەموو دژایەتیەی کە بە درێژایی مێژوو لە لایەن دەسەلاتی زەینی و عەینییەوە لەحەقی ئەم جەژنەدا کرواە، هەر لە ناو دڵی خەڵکدا ماوە و هیچ کات بڵێسەی ئاگری نەورۆز لە هیچ کۆلانێکی کوردستاندا دانەمرکاوە. کەواتە کارناواڵ و بەرهەمی کارناواڵی زۆر بەهێز و بناخەدارە و دژایەتی کردنیش لەگەڵیدا تەنیا بێئابڕوویی پێوەیە و بەس. ئیستا ئەگەر لەپاڵ ناوەکانی دیکەی ئەدەبی فولکلۆردا زاراوەی «ئەدەبی کارناواڵی»ش بەکار بهێنین، ناو لێبردنێکی درووستە و هیچ لارییەکی تێدا بەدی ناکرێ.

بەڵام ئەدەبی ڕەسمی جیاوازی لەگەڵ ئەدەبی فولکلۆردا (کارناوڵ) ئێجگار زۆرە. ئـەم ئەدەبـە بەپێچەوانـەی فولکلۆر، زۆرتر لەلایەن دەربارێکەوە پشتیوانی لێئەکرێ. پێکهێنەرانی بەرهەمگـەلی ئـەم ئەدەبـە کـەس یـان کەسانێکن کە لە کاتێکی دیاریکراودا بۆ نووسینی هـەر بەرهـەمێک دەسـت بـە کـار ئەکـەن. دیـارە کـە ئـەو پێکهێنەرە، خوێندەواری لە ئاستێکی باشدایە، هەر بۆیـە بەرهەمەکەیشـی لـەباری وشـەی ئـەدەبی و زاراوەی ڕەسمیەوە لە ئاستێکی بەرزدایە کە زۆرجار تێگەیشتنی بۆ چـینی نەخوێنـدەوار یـان کـەمخوێنـدەوار دژوارە. وەک نموونە ئەتوانین ئاماژە بە تەواوی ئەو بەرهەمـە ئەدەبییانـە بکـەین کـە لـەم چەنـد سـەدەی داهـاتووەدا شاعیران و نووسەرانی کورد هۆنیویانە و ئەمڕۆکە لە بەر دەستدایە.

## پەیوەندی نێوان ئەدەبی کارناواڵی و ئەدەبی ڕەسمی

ئەم دوو پاژەی ئەدەب، بە یەکەوە وەک دوو بەری یەک سکەن؛ هەر بەوجۆرە کە یەک سـکە بـە دوو ڕووی شێر و خەتەوە ئەبێ بە سکە و ڕەوایی پەیا ئەکا، ئەدەبیش بەم دوو بەرەی خۆیەوە ئەبێ بـە ئـەدەب و بـە هێـز ئەبێ. لەم ئاریکارییەی نێوان دوو پاژی ئەدەبدا، ئەدەبی فولکلـۆر ڕۆڵـی ڕیشـە ئەگێـڕێ و ئـەدەبی ڕەسمـیش ڕۆڵی لقوپۆ. هەر بەو جۆرەی کە داری پڕ بەر و پڕ سێبەر ڕیشەی قووڵی لە بن عەرزدا چەقانـدووە، فولکلـۆری دەوڵەمەندیش، ئەدەبی ڕەسمی گەل دەوڵەمەند ڕائەگرێ.

ئیستا کە ئەم دوو پاژە یەکتر کامڵ ئەکەن، ئەبێ جەخت لەسەر ئەوە بکەین کە ئێمـە هـەرگیز نـاتوانین بـە چاوێکی سووکەوە سەیری ئەدەبی کارناواڵی بکەین و ڕۆڵی گرینگی ئەو لـە چوارچێـوەی ئەدەبـدا لـەبـەرچـاو نەگرین. لە نموونەیەکی دیکەدا ئەتوانین پەیوەندی ئەم دوو پاژەی ئەدەب وەک خانووبەرەیـەک ببیـنین کـە خەنـدەق و چوارچێوەکـەی ئەبێتـە ئـەدەبی کارناواڵـی و دیـوار و دەرکـە و پەنجـەرە و جوانکـاری دەرەوە و ناوەوەی ئەبێتە ئـەدەبی ڕەسمـی. مەبەسـت لـە هێنانـەوەی ئـەم نموونانـە، گرینگـی و کاریگـەری ئـەدەبی کارناواڵیە کە ژێرخان و ئێسقانبەندی ئەدەبی ڕەسمی پێکدێنێـت. هەرئەنـدازە ئـەدەبی کارناواڵـی گـەلێک دەوڵەمەندتر بێت، ڕێگە بۆ گەشە کەردنی ئـەدەبی ڕەسمـی ئـەو گەلـە خۆشـتر ئـەبێ و ئـەو ئەدەبـە لـەبارتر ڕادەوێستێ و قنج ئەبێتەوە. بـە پێچەوانەیشـەوە هـەر ئەنـدازە ئـەدەبی کارناواڵـی لاواز و بـێبایـەخ بـێ، بـەو ئەندازەش ئەدەبی ڕەسمی بێڕیشە و بۆش و دارِماو ئەبێ.

کەواتە پەیوەندی نێوان ئەم دوو پاژەی ئەدەب، پەیوەندییەکی کارتێکەری و کارلێگرییە. ئەدەبی کارناواڵـی، کارتێکەرە و هەوێن بۆ خولقاندنی ئەدەبی ڕەسمی پێکدێنێ؛ ئەدەبی ڕەسمیش کارلێگرە و لەسەر ئەو نەریتـە ئەدەبی و زەوقە نەتەوەییانەی کـە بـە درێژایـی مێـژوو پێکهـاتووە و لـە ئـەدەبی کارناواڵـیدا خـۆی نوانـدووە، دائەمەزرێ. تەنانەت ئەم ئەدەبە زۆرجار هێنـدێ لـە وشـە و دەسـتەوشـە و زاراوەکانیشـی هـەر لـە ئـەدەبی کارناواڵیەوە وەرئەگرێ. جا ئیستا لەوانەیە کە گەلێک ئیشتا ئەدەبی ڕەسمی بـۆ پێـک نـەهاتبێ یـان ئەوەنـدە لاواز بێت کە شیاوی باس لێکردن نەبێت. بە واتایەکی تر، ئەدەبی ئەو گەل یان خێڵە تەنیا و تەنیا بەو بـەیت و گۆرانیانە مەحدوود ئەبێ کە پشتاوپشت لە باب و کاڵیانەوە پێیانگەیشتووە. لە وەها حاڵەتێکدا ئەبێ بڵـێین کـە

ئەو ئەدەبە کامڵ نەبووە و نەگووراوە؛ دیارە کە ئەدەبی ناکامڵیش لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا لەبەر لافاوی تیاچووندایە و هاکا کە ڕەشەبایەک یان زریانێک هەڵیکرد و لە ڕیشەی هەڵکەنی.

خۆشبەختانە ئەدەبی کوردی لە هەر دوو ڕووەوە دەوڵەمەندە و ئەمڕۆکە خەزێنەیەکی پڕ لە ئەدەبێکی کامڵ (هەم کارناواڵی و هەم ڕەسمی) لەبەر دەستماندایە. ئەدەبی زارەکی و کارناواڵی کوردی، تەواوی ئەوگۆرانی و چیرۆک و مەتەڵ و بەیت وبالۆرە و هتد ئەگرێتە خۆی کە لە ڕۆژگارانێکی دێرینەوە بە دەستمان گەیشتووە. مەخابن کە لەم پاژەی ئەدەبی کوردیدا تەنیا بەشێکی زۆر کەم تۆمار کراوە و ترسی ئەوەیە کە ئەگەر بۆ تۆمار کردنیان هەوڵێکی لەبەرچاو نەدرێ، تیابچن. ئەدەبی ڕەسمیش تەواوی ئەو دیوان و چیرۆکە نووسراوانە لە خۆ ئەگرێ کە بەرهەمی بیر وهەستی شاعیران و نووسەرانی گەلی کوردە. مەخابن کە لەم پاژەیشدا تەنیا بەشێکی کەم ساخ کراونەوە و لە چاپ دراون.

## چیرۆکی ئەڤیندارانە و پاژەکانی ئەدەب

سەرنجێک لە پێشەکی لە پێشەکی ئەو چیرۆکانەی کە شاعیران هۆنیویاننەوە، بابەتێکی هەرە گرینگ دەر ئەخات، ئەویش ئەوەیە کە شاعیر دانی پیائەنێ کە چیرۆکە ئەڤیندارانەکەی، بەر لەوەی کە بێتە ناو ئەدەبی ڕەسمییەوە، لە ناو خەڵکدا باو بووە و بەیتبێژان ئەو چیرۆکەیان لە چەندین دەیە و سەدە بۆ خەڵک گوتووە. ئەم دوو نموونەی خوارێ -کە لە ئەدەبی فارسی ئەیانهێنینەوە- مشتێکن لە دەشتێ کە ئەو بابەتە ئەسەلمێنن:

لە چیرۆکی «ویسێ و ڕامین»دا (گرگانی، 1377: 37 و ٣٨) هاتووە:

| | |
|---|---|
| مرا یک روز گفت آن قبلۀ دین: | چه گویی در حدیث ویس و رامین؟ |
| که می‌گویند چیزی سخت نیکوست | در این کشور همه کس داردش دوست. |
| . . . مهان و زیرکان آن را بخوانند | بدان تا زان بسی معنی بدانند. |
| همیدون مردم عام و میانه، | فروخوانند از بهر فسانه. |

لە چیرۆکی «لەیلی و مەجنوون»یشدا (نظامی، ١٣٧٩: ٢٤ و ٢٥) ئەم بابەتە بەمجۆرە هاتووە:

| | |
|---|---|
| لیلی مجنون بیایدت گفت | تا گوهر قیمتی شود جفت . . . |
| این آیت اگرچه هست مشهور | تفسیر نشاط هست از او دور. |

ئەم نموونانە پیشانی ئەدا کە هەر بەیتێک لە پاڵوێنەی زەوقی کۆمەڵەی خەڵکەوە لە چەندین چیندا هەڵئەگوێزرێ و ئەپاڵێورێ تا تەواو ناو و ناوەرۆکی ئەو چیرۆکە لە ناو خەڵکدا ئەزرێ؛ لە هەر دەیە و سەدەیەکدا بەیتبێژان ئەو بەیتە هەر بەو جۆرە کە بیستوویانە، بۆ خەڵک ئەگێڕنەوە و بەو گێڕانەوەیە شادی بە چینەکانی خەڵک ئەبەخشن. چێژی خەڵکی لەو بەیتە، چێژێکە کە لە ڕێگەی گوێچکەوە ئەچێتە ناو ناخی دەروونی گوێگرانی چیرۆک. بەڵام لەوانەیە کە چێژ و زەوقی خەڵک بە درێژایی ڕۆژگار گۆڕانی بەسەردا بێ؛

واتە بەرەبەرە خوازیاری ئەوە بێت کە لە هێندێ شوێنی بەیتەکەدا ڕووداوێک زەقتر یان کەمڕەنگتر بێت، کەسێک بە حاڵەتێکەوە زیاتر یان کەمتر بناسرێ، ڕووداوێک بەر و دوای پێبکرێ و هتد؛ لەم حاڵەتەدا بەیتبێژ بەیتەکە هاوگر بە زەوقی گوێگر (کۆمەڵەی خەڵک) ئەگۆڕێ هەتا زەوقی ئەوان هەر خوازیاری ئەو بەیتە بمێنێ. ئەمەیە کە گۆڕانێک بەسەر هەر بەیتێکدا بە درێژایی ڕۆژگار دێت، جاری وایش هەیە کە گۆڕانەکە هەر لە بناخەوە بیچمی چیرۆکەکە ئەگۆڕێ.

ئێستا بەیتێکی ئامادە -کە لە پاڵوێنەی زەوقی کۆمەڵەی خەڵکەوە هەڵگۆزەراوە و ڕێکوپێک کراوە- حازرە کە بێتە ناو ئەدەبی ڕەسمیەوە. ئەگەر شاعیرێکی کارامە پەیا ببێ و خۆی بەو چیرۆکە ئامادەوە خەریک بکا، ئەتوانێ جلێکی ئەبەدی لە بەر ئەو بەیتە بکا و بە ناوی خۆیەوە تۆماری بکا و بۆ هەمیشەی مێژوو بمێنێتەوە. کەواتە شاعیر هەنگاوێک لە دوای خەڵک و بەیتبێژە؛ چونکە ئەو چیرۆکێک ئەهۆنێتەوە کە لەوە پێش ساف و لووس کراوە؛ بە واتایەکی تر، شاعیر نوسخەیەکی ڕەسمی لە چیرۆکێکی کارناواڵی پێکئەهێنێ.

با ئێستا پرۆسەی ئەدەبی کردنی چیرۆکێکی ئەڤیندارانە بەم چەشنەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

١- خەڵک خوازیاری بیستنی چیرۆکێکن کە بتوانێ چێژێکی قووڵیان پێببەخشێ.

٢- بەیتبێژ کەسێکە کە ئەتوانێ ئەو داخوازییە بە جێ بێنێ و بە زمانێکی سادە و خۆماڵیانە بۆ کۆمەڵانی خەڵک چیرۆکی دڵداری بڵێ.

٣- ئەو چیرۆکە لە ناو دڵی خەڵکدا جێی خۆی ئەکاتەوەو زەوقی خەڵک بە درێژایی ڕۆژگار خوازیاری گۆڕانێکی هاکەزایی چیرۆکەکە ئەبێ.

٤- بەیتبێژان ئەو داخوازییەش بە جێ ئەهێنن و بە درێژایی مێژوو گۆڕانێک لە چیرۆکەکەدا -بەو جۆرەی کە زەوقی خەڵک خوازیارە- پێکدێنن.

٥- شاعیرێک لە سەر داخوازی دەربار یان خەڵک کاری هۆنینەوەی ئەو چیرۆکە بە زمانێکی ئەدەبی دەست پێئەکا.

٦- چیرۆکەکە بە ناوی ئافرێنەر (شاعیر)ەوە لە خەزێنەی ئەدەبی ڕەسمی ئەو گەلە زیاد ئەبێ.

٧- دوو جۆر ڕیوایەت لەو چیرۆکە لە بەر دەستدا ئەبێ: یەکەم ڕیوایەتێکی کارناواڵی کە بەیتبێژ بۆ خەڵکی ئەڵێ؛ دووهەم ڕیوایەتێکی ئەدەبی کە شاعیر بۆ چینی خوێندەوار و ئەدەبدۆستی هۆنیوەتەوە. لەوانەیە کە ئەم دوو ڕیوایەتە جیاوازییان لەگەڵ یەک زۆر بێ، بۆ نموونە هەر لە چیرۆکی «مەم و زین»دا، ئەو ڕیوایەتەی ئەحمەدی خانی لەگەڵ ڕیوایەتی بەیتبێژان جیاوازی ئێجگار زۆرە. ئەگەر چاوێک بە «مەم و زین»ی خانی بخشکێنین و لەگەڵ چیرۆکی «مەمی ئالان» هەڵیسەنگێنین کە کوردناسی فەڕانسەوی، «ڕۆژێ لێسکۆ» لە ڕووی ڕیوایەتی زارەکی سێ بەیتبێژی کوردەوە کۆی کردوەتۆ،ئەو جیاوازییە تەواو خۆی ئەنوێنێ (شالیان، ١٣٨٥: ٦٤٤). بەڵام هەر دوو ڕیوایەتەکە شان بە شانی یەک ژیانی خۆیان درێژە ئەدەن.

## بناخەی مێژوویی چیرۆکەکان

لەو پرۆسەی سەرەوەدا یەک قۆناغ ڕەچاو نەکراوە کە پێویستە لێرەدا شرۆڤە بکرێ؛ ئەویش چۆنیەتی پێکهاتنی ماک و هەوێنی یەک چیرۆکی دڵدارییە.

بۆ وەڵامی ئەم پرسە، پێویستە ئاوڕێک لە جۆری ڕوانینی خەڵکی زەمانی زوو بە چینی دەسەڵاتدار و دەرباریان بدەینەوە؛ چونکە چیرۆکی ئەڤیندارانە لە ڕێگای وەها ڕوانینێکە کە پێکدێت. لە ڕۆژگارانی بەریدا خەڵک، بە پێچەوانەی ئەمڕۆ،دەربار و دەرباریەکانیان بە چاوێکی بەرز و پیرۆزەوە ئەڕوانی. لە لای ئەوان دەرباریان چینێکی جیاواز لە خەڵکین کە قسە و کردەیان شتێکی ترە، هەر وەک ئەڵێی ئاسمان قڵشابێ و ئەمانەی لێهاتبێتە خوارێ. لە لایان قسە و کردە و کۆشک و باخیان زۆر ئەفسووناوی و سەرنجڕاکێش بوو؛ بۆیە هەر ڕووداوێکی ناو دەربار یان پەیوەندیدار بە دەرباریان و شازادەکان بۆ ناو کۆمەڵانی خەڵک دزەی بکردایە، بە تامەزرۆییەوە ئەیانگێڕاوە و ئەبووە بابەتێکی لەبار کە هەر کەس ئاواتەکانی خۆی تێدا ببینێ.

جا ئیستا لە ناو ڕووداوەکانی دەرباردا چ ڕووداوێک لە «دڵداری» بۆ دزە کردنی ناو خەڵک شیاوترە؟ ئەگەر وەها ڕووداوێک بقەومێ و بکەوێتە سەرزاری خەڵک، ئەوا ئەبێ چاوەڕێ بین کە یەک دوو سەدە دواتر ئەو سووژە ببێتە بابەتێکی باو کە لە دەربار و ناو شاریشدا ترازاوە و گوند بە گوند و خێڵ بە خێڵ لە زاری خەڵکەوە سەفەر ئەکا و سنووران ئەبەزێنێ هەتا بەرەبەرە وای لێدێ کە ئەو بابەتە دڵدارییە بۆ خۆی چوارچێوە ئەگرێ و ئەبێتە چیرۆکێکی دڵداری کە زەوقی خەڵک درووستی کردووە. ئەم چیرۆکەیش وردەوردە لەباری زمان و ناوەرۆکەوە ساف و لووس ئەکرێ و خاڵە بەهێزەکانی -کە ئاواتی خەڵک زیاتر دەرئەبڕن- زەقتر ئەبن و خاڵە لاوازەکانی کەمڕەنگتر و کەمڕەنگتر ئەبن تا ڕێگەی ناچاری وەلانان بگرنە بەر. ئەمجار بەیتبێژان دێنە مەیدان و هەر ئەو چیرۆکە بە گۆڕانێکی کەمەوە بۆ چینی داهاتوو ئەگێڕنەوە.

کەوابوو هەر چیرۆکێک بنەمایەکی مێژوویی هەیە کە زەمانێک قەوماوە، بەڵام وردەوردە شاخ و باڵی پێدراوە و هاوگری ئاواتەکانی کۆمەڵانی خەڵک، گۆڕاوە هەتا بە لووتکەیەک گەیشتووە کە زەوقی کۆی خەڵک پەسندی کردووە. باشترین نموونە بۆ دەرخستنی بنەمای مێژویی یەک چیرۆک، ئەو توێژینەوەیە کە ئێراناسی ناوداری ڕووس، «ڤلادیمێر مینورسکی» لەسەر بەیتی «ویسێ و ڕامین» ئەنجامی داوە و لە ئاکامدا بەوە گەیشتووە کە ئەم چیرۆکە ڕووداوێکی ڕاستەقینەیە کە لە سەردەمی پارتییەکاندا قەوماوە. ئەم ڕووداوە دواتر هەوێنی چیرۆکێکی ئەڤیندارانەی لێئەکەوێتەوە (بڕوانە: مینورسکی، ١٣٧٧: ٤١٥-٤٧٣). نموونەی دووهەم توێژینەوەی ڕێکوپێکی عەرەبناسی ناوداری ڕووس، «کراچکۆفسکی»یە لەسەر چیرۆکی «لەیلی و مەجنوون» کە بە وردی ئەو باسە شیئەکاتەوە و دەری ئەخا کە ئەم بەیتە لەسەر ڕووداوێکی مێژوویی و ڕاستەقینەی سەدەی یەکەمی کۆچی دامەزراوە. تەواوی ئەو کەسانەش کە لەو بەیتەدا ناویان هاتووە و هەرکام ڕۆڵێک ئەگێڕن، کەسانێکی مێژوویین. کراچکۆفسکی ئەوەش باس ئەکا کە ئەم چیرۆکە لە سەدەی چوارەمی کۆچیدایە کە وەک چیرۆک ناوی لێئەبرێ و لە کتێبەکانی ئەو دەمەدا وەک «ئەغانی» و «ئەلفێهرێست» ناوی دێ (بڕوانە: کراچکوفسکی، ١٣٧٦: ٨٤-١١٣). چیرۆکی «خوسرەو و شیرین»یش -کە

یەکەم جار شاعیری فارس، نیزامی گەنجەوی لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا وەک چیرۆکێکی سەربەخۆ هۆنیەوە- ڕووداوێکی ڕاستەقینە بووە لە نێوان پاشای ساسانی ئێران و کچە شازادەیەکی ئەرمەنی کە سەرچاوە مێژووییەکان باسیان کردووە.

## سەبارەت بە چیرۆکی مەم و زین

ئیستا بۆ چیرۆکی ئەڤیندارانەی «مەم و زین»یش ئەتوانین بە شوێن بنەما مێژوویەکەیدا بگەڕێین و لەو کاتە بکۆڵینەوە کە بۆ یەکەمین جار باسی دڵداری ئەو دوو ئەڤیندارە کەوتووەتە زاری خەڵکی. ئەمجار ئەو باسە بووە بە هەوێنی چیرۆکێک کە چەندین سەدەی دواتر جلکی ئەدەبی لەبەر ئەکا. جا لەبەر ئەوەی کە بە خێرایی ئاکامی گەڕانەکە دەرکەوێ، بەر لە هەر شتێک ئەبێ لە ناو چیرۆکەکەدا ئەو نیشانەگەلە بدۆزینەوە کە ئەتوانێ سووسەیەکی مێژوویی بداتە دەستمان؛ وەک ناوی کەسایەتییەکان و شوێنەکان؛ چونکەناوەکان کەمتر بەر لافاوی گۆڕان ئەکەون.

یەکەمین نیشانەی لەو چەشنە لە چیرۆکی «مەم و زین»ی خانیدا، ڕەگەزی عەرەب دانان بۆ میر زەینەدین، برای زین و ڕەپاڵ دانی ئەو بە خالیدی کوڕی وەلیدە کە لە شەڕەکانی سەدری ئیسلامدا سەرداری سپای موسوڵمانان بووە:

| | |
|---|---|
| گۆ پادشەهەک زەمانێ سابق | ڕابوود حکوومەتا خوە فائق |
| ئەجناسێ مێلەل موتیع و مونقاد | نەسلا وی عەرەب، ئەمیرێ ئەکراد... |
| ئاباء و عوزام و جەد و والد، | مەنسووب و موسەلسەلێ د خالد. . . |
| زیبەندەیێ مولک و زەینەدین بوو، | ناڤێ وی ئەمیر زەینەدین بوو |

(خانی، ١٣٦٧: ٤٩)

ئیستا ئەبێ ئەوە بدۆزینەوە کە ئایا لە ناوچەی بۆتان لە باکووری کوردستاندا -کە شوێنی ڕوودانی ئەم چیرۆکەیە- عەرەبی هاوردە حوکمیان گێڕاوە یان نا. مێژوو پێمان ئەڵێ کە بنەماڵەیەکی بە ڕەگەز عەرەب لەم ناوچە، بەناوی «ڕەوادیان» دەسەڵاتیان بە دەستەوە بووە کە لە کاتی خەلافەتی «ئەبوو مەنسووری عەبباسی»دا (١٣٦ تا ١٥٨ک) لە هۆزێک لە یەمەنەوە بۆ ئازەربایجان گوازراونەوەو ئیدارەی تەورێز و دەور و بەری لە لایەن والی ئازەربایجانەوە، زەید کوڕی حاتەم بە سەرۆکی عەرەبە هاوردەکان بە ناوی ڕەوواد کوڕی موسەننا دراوە (روحانی، ١٣٧١: ٣/١٣). لەم بنەماڵە، لە ساڵی ٣٧٠ یان ٣٧١ک.دا «ئەبوولهەیجا» حوکم وەچنگ دێنێ و بەرەبەرە تەواوی ئازەربایجان ئەگرێتە ژێر دەسەڵات. کوڕی ئەم کابرایە بەناوی «مەمەلان» لە ساڵی ٣٧٨ک.دا لەسەر تەختی پاشایی دائەنیشێ و لە ساڵی ٤١٠ یان ٤١١ی کۆچیشدا، کوڕی ئەو بە ناوی «ئەبوومەنسووری وەهسوودان» -کە مەمدووحی قەترانی تەورێزی، یەکەم شاعیری فارسی‌بێژی ئازەربایجان بووە- هەوساری حکومەت بە دەست ئەگرێ (کسروی، ١٣٣٥: ١٧٤). ئەبوومەنسووری وەهسوودان -کە لەسەفەرنامەی ناسر خوسرەویشدا بە پادشای ئازەربایجان ناوی لێ ئەبا و بە ڕێزەوە باسی ئەکا (ناصر خسرو،

۱۳۷۵:۸-۹)- دەسەڵاتگەی خۆی هەتا مەلازگەرد و ئەرزڕوم و واسپورگان بەربڵاو ئەکا و بەم جۆرە تەواوی کوردستانی باکوور دێنێتە ژێر دەسەڵات. ئەم کابرایە بەهێزترین ئەمیری بنەماڵەی ڕەووادیانە کە ئیبنی ئەسیریش بە «پاشای ئازەربایجان» ناوی ئەبا (کسروی، ۱۳۳۵: ۱۷٤). ئەبوومەنسوور کوڕێکی جوامێر و شۆڕەسواری بە ناوی «ئەبوو نەسری مەمەلان» ئەبێ کە حکومەتی باوکی سەقامگیرتر ئەکا و تەواوی شۆڕشەکانی نەیارانی باوکی سەرکوت ئەکا و بەریش بە دەستدرێژی ئەرمەنییەکان و گورجییەکان ئەگرێ (روحانی،۱۳۷۱: ۳/۲۵-۲٦؛ کسروی، ۱۳۳۵: ۱٦۷-۱۷۲). یەکێ لە شەڕەکانی ئەو، شەڕ لەگەڵ «موغان» بوو کە تاقمێک لە ئێرانیانی زەرتوشتی بوون کە ملیان بە دەسەڵاتی وەهسوودان نەئەدا. قەترانی تەورێزی —کە ئەمیشی مەدح کردووە و جار و باریش هاوڕێی شەڕەکانی بووە- لە شیعرەکانیدا زۆر باسی ئازایی و شۆڕەسواری ئەم لاوە دلێرەی کردووە؛ بۆ نموونە لە چامەیەکدا (قطران، بی‌تا:۳۳۰) ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| نه هیچ کس پسری همچو میر مملان دید | نه هیچ کس پدری همچو میر وهسودان. |
| بقای این دو ملک باد تا جهان باشد! | به کام خویش رسند آن دو اندر این دوران. |

لە چامەیەکی تردا (قطران: ۲۷۷) بە وەهسوودانی باوکی مەمەلان ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| به دولت تو همه کار ملک نیکو کرد، | نشاط جانت، فرزند مهترت مملان. |
| پسر چنین بود آن را که تو پدر باشی؛ | گهر نخیزد نیکو مگر ز نیکو کان. |

گۆیا ئەم بنەماڵە -بە هۆی هەر مەسڵەحەتێکەوە بووبێ بە تایبەت جەوازی درێژەدانی حکوومەتیان لە لایەن خەلیفەی بەغداوە- بنچینەی عەرەب بوونیان ئەپارێزن و هەرچەندە تۆرەمەی مرۆڤ پاش سەدەیەک مانەوە لە شوێنێکدا، تازە خەڵکی ئەو شوێنە دێتە ئەژمار و نابێ لەسەر تۆرەمەی پێشووی بەژماری بێنین، بەڵام ئەمان خۆیان هەر لەسەر تۆرەمەی عەرەب حساب ئەکرد (کسروی، ۱۳۳۵: ۱٤۸-۱٤۹) کە قەتران لە شیعرێکیدا (قطران: ۳۱-۳۲) ئاماژەی پێکردووە:

| | |
|---|---|
| زبهر آنکه نسب زی عجم کند سوی ام؛ | ز بهر آنکه گهر زی عرب کشد سوی اب، |
| ستوده‌اند به فرزانگی ملوک عجم؛ | گزیده‌اند به مردانگی ملوک عرب. |

لێرەدا پێویستە ئاماژەیەک بە ناوی «مەمەلان» و واتای پاژەکانی بکەین. مەمەلان لە دوو پاژی «مەم» و «ئالان» پێکهاتووە. «مەم» کوردی‌کراوی «محەمەد»ە؛ قەترانی تەورێزی لە شیعرەکانیدا بە هەر دوو ناوی «مەمەلان» و «محەمەد» ناوی لێ‌ئەبا و شیعر بە بەژن و باڵایدا هەڵئەڵێ؛ بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| خداوند جهان، بونصر مملان؛ | سر شاهان و تاج شهریاران؛ |

(قطران: ۲۳۷)

| | |
|---|---|
| بونصر محمّد که به مردی و به رادی، | انگشت‌نمای است چو ماه شب شوّال. |

(قطران: ۲۰۱)

«ئالان»یش ناوی کۆنی ناوچەیەکی پان و بەرین و دەشتێکی ئێجگار بەبڕشت بووە کە لە باکووری ڕۆژئاوای ئێرانی ئەمڕۆدا هەڵکەوتبوو و ئەمڕۆ ناوەندەکەی شاری «باکۆ»یە. لە دەقە جوگرافیاییەکاندا ناوی ئەو ناوچەیە بە «ئاران»، «ئەڕان» و «ئەللان»یش هاتووە. ڕووسەکان لە پاش داگیر کردنی ئەم ناوچە و هەڵکەندنی لە وڵاتی ئێران، ناویان گۆڕی و کردیانە «ئازەربایجان» و وایان خستە زاری خەڵک کە ئازەربایجان وڵاتێکی پارچە کراوە؛ پارچەیەکیان لە ژێر دەسەڵاتی ڕووسی تەزاریدایە و پارچەکەی تری ئێران داگیری کردووە و ئەبێ هەر دوو پارچەکە یەک بگرنەوە و یەکجێش بێتە ژێر دەسەڵاتی ڕوس! بە وەها تەماعێکەوە ناوی مێژوویی و کۆنی ئەم ناوچەیان گۆڕی؛ بەڵام ئەگەر چاوێک بە سەرچاوەگەلی کۆندا بخشکێنین، ئەبینین کە «ئازەربایجان» ناوی دەڤەرێکە لە باشووری ئالاندا کە ئەمڕۆ سەر بە ئێرانە و ناوەندەکەی شاری «تەورێز»ە.

با بگەڕێینەوە سەر باسەکە. لەم بنەماڵەی ڕەوادیانەدا، ئەم ئەبوو نەسری مەمەلانە ناوبانگێکی چاک دەرئەکا. هۆی ئەم ناوبانگە بۆ ئەو تایبەتمەندییانە ئەگەڕێتەوە کە لە کەسایەتی مەمەلاندا بووە و قەتران ناو بە ناو لەوانە دواوە کە بە هۆی ئەوەی ئەم تایبەتمەندییانە لە دارشتنی کەسایەتی مەمەلاندا ڕۆڵیان گێڕاوە، ناچارین باسیان لێ بکەین و بۆ هەرکامیش، لە شیعرەکانی قەتران نموونە بێنینەوە؛ بەڵام بەر لە هێنانەوەی ئەم باسە، پێویستە ئاماژە بەم خاڵە گرینگە بکەین کە قەتران لە شیعرەکانیدا ئەم باسانەی تەنیا بە خاتری مەدحی کوڕە میر (مەمەلان) و وەرگرتنی خەڵات نەگوتووە، بەڵکوو بە شایەتی سەرچاوەکانی مێژوو، ئەم تایبەتمەندییانە بەڕاستی لە مەمەلاندا بووە و قەترانیش خۆی لە چەند شەڕێکدا هاوڕێی بووە و بە چاوی خۆی دیویەتی؛ وەک لەم شیعرەدا (قطران: ٣٢٩) ئەڵێ:

چو جمله راست بگویم، کسم ندارد راست؛ مگر کسی که بود آن به دیده دیده عیان.

ئیستا ئەگەر لە هەر مەدحێکدا ڕاستییەکانی کەسایەتی مەمدووح بە درۆ دائەپۆشرێ، ئەبێ دانی پێدانێین کە لە مەدحەکانی قەتراندا، لایەنی ڕاستییەکە قورسترە.

تایبەتمەندییەکانی مەمەلان بە پێی شیعرەکانی قەتران ئەمانەن:

١. کەمتەمەنی و ئازایی: قەتران ئەڵێ کە مەمەلان هەرچەندە لاو و کەم تەمەنە، بەڵام زانا و بەئاوزەیە (قطران: ١٤٤):

میرابونصر آنکه سالش خردوفرهنگش بزرگ، میرمملان آن به تن برنا و فضل و عقل پیر.

لە شوێنێکی تریشدا هەر لەم بارەوە ئەڵێ (قطران: ٣٢٨):

به سال خرد و لیکن به جود و فضل بزرگ؛ به عقل پیر و لیکن به روزگار جوان.

٢.شۆڕەسواری لە گۆڕەپانی شەڕدا: لایەنێکی بەهێزی کەسایەتی مەمەلان لە ڕەزمدا، شەڕوازی و لە بەزمدا، دڵسەخاوتی و ڕەفیقدۆستییەتی (هەمان سەرچاوە):

شیر بینی و شرر آنگه که باشد بر سمند؛ مهر بینی و سپهر آنگه که باشد بر سریر؛
دشمنان راجان بنالد چون کشد اسبش صهیل؛ دوستان را دل بخندد چون کند کلکش صریر.

یان لەم شیعرەدا ئەڵێ (قطران: ٣٢٨):
به ماه ماند با جام باده در مجلس، به شیر ماند با تیغ تیز در میدان.

مەمەلان لە چەندین شەڕدا دژی نەیارانی حکوومەتی باوکی، بوێرانە دەست دێ و نەیارەکان سەرکوت ئەکا. بۆ نموونە قەتران شەڕی ئەو دژی تورکەکان –کە لەو کاتەدا تازە سێرەیان پەیا ببوو و بۆ سەر ئالان و ڕووم دەستیان درێژ ئەکرد- ئاوا باس ئەکا (قطران: ٣٠٦):
بدان گهی که هوای تو سوی ترکان بود، ز هیچ خلق بدیشان نبود ذلّ و هوان.
کنون که رای تو ز ایشان بگشت یکباره، پدید گشت بدیشان عدو هم از ایشان.

لەم شەڕەدایە کە مەمەلان بریندار ئەبێ (قطران: ٣٠٧):
خدایگانا ! بر تو زیان رسید و لیک چو تو به جایی،کس ننگرد به سود و زیان.

قەتران لە چامەیەکی دیکەدا شەڕی مەمەلان لە سەردەمی لاویدا دژی ئەمیری موغان لە دەشتی ئەردەبیل ئاوا باس ئەکا (قطران: ٣٢٨-٣٢٩):
چو او به دولت و بخت جوان ز شهر برفت، به عزم رزم بداندیش با سپاه گران،
. . . به تیر و نیزه دلیری و استواری کرد؛ شکست لشکر موغان و خیل سرهنگان.
به هر وطن که ز دردی بیافتند اثر، به هر مکان که ز شوخی بیافتند نشان،
امیر موغان آنجاش داده بود وطن؛ امیر موغان آنجاش داده بود مکان.

لەم شەڕەدا ئەمیری موغان تەسلیم ئەبێ و ئەو دەڤەرەش لە نەیاران پاک دەبێتەوە.

٣. قسەزانی و ئەدەبپەروەری: لەگەڵ ئەمانەشدا، مەمەلان لەبەر چاوی قەتراندا (و شایەدیش خەڵکانی ئەو سەردەمە) قسەزان و ئەدیبە و جێگە و ڕێگەی هەر قسەیەک باش دەزانێ (هەمان سەرچاوە):
گر گذارد، نظم بارد لفظ او درّ ثمین؛ ور نگارد، نثر آرد کلک او درّ نثیر.

٤. جوانخاسی: هەروەها مەمەلان لەبەر چاوی قەتراندا زۆر جوان و شیرینە (قطران: ٢١٠):
جمال و حسن پدر داری و عجب نبود، پدرت هم ز پدر یافته است حسن و جمال.

٥. پێتەختی تەورێز: تەورێزیش پێتەختی حکوومەتیان بوو (قطران: ١٨١):

میر ابونصر محمّد که سر دولت او هست چون دین محمّد همه ساله به فراز؛
او به تبریز و شده نام بزرگیش به مصر؛ او به تبریز و شده هیبت تیغش به طراز.

له بیرمان نەچێ کە شاری تەورێز بە تایبەت لەو ڕۆژگارەدا شارێکی زۆر ئاوەدان و پڕ لە نیعمەت بـوو و هـەر بەو جۆرە کە کەسایەتیەکان، شان و شکۆ بە شوێن و شارەکان ئەدەن، پێچەوانەکەیشی هـەر ڕاسـتە؛ واتـە زۆر جار زێد و مەڵبەند کەسـایەتییەکان بـەرز و ئوسـتوورەیی ئـەکا؛ هـەر بـەو چەشـنەی کـە "هاڕوونەڕەشـیدی عەبباسی"، ناوی بەغدا و بەغدایش ناوی هارونەڕەشـیدی بـەرز کـردەوە تـا بـە یەکـەوە بچنـە نـاو زنجـیرەی چیرۆکەکانی «هەزار و یەک شەو»دا. جا ئەو تەورێزەی کە ئەوسا سەرچاوەی ئاوەدانی بوو، بە یەقین لـە بـەرز کردنەوەی ناوی مەمەلاندا ڕۆڵێکی گرینگی گێڕاوە. لەبەر ئەوە پێویستە ڕۆڵی ئەم شـارەیش لـە بـیر نەکـەین. قەتران تەورێزمان ئاوا بۆ باس ئەکا (قطران: ٢٠٨):

نبود شهر در آفاق خوشتر از تبریز به ایمنی و به مال و به نیکوئی و جمال.
ز ناز و نوش همه خلق بود نوشانوش؛ ز خلق و مال همه شهر بود مالامال.
درو به کام دل خویش هرکسی مشغول امیر و بنده و سالار و فاضل و مفضال.

کۆی ئەم تایبەتمەندییانە، ناوبانگی ئەو کوڕە مـیرە بـە باشـی ئـەزرێنێ و نـاوی چـاکی دێنێتـە سـەر زاری خەڵک؛ وەک لە شوێنێکدا پێی ئەڵێ (قطران: ٣٧٠):

تو به گاه مثل جود، سر امثالی؛ تو به گاه خبر خوب، سر اخباری.

ئەم ناوبانگە چاکە وەهایە کە کاتێ لە شەڕێکدا مەمـەلان برینـدار ئـەبێ و هەواڵـی مـەرگی بـڵاو ئەبێتـەوە، خەڵک تەواو شین ئەگێڕن و داخی لێ‌ئەخۆن کە ئەمەیش پیشاندەری خۆشەویسـتی زۆری مەمـەلان لـە نـاو خەڵکی دەسەڵاتگەی دایە؛ هەرچەندە ئەو هەواڵە دواتر بـە درۆ دەرچـوو. قـەتران لـە شـیعرێکدا هەواڵـەکە و داخی خەڵکی ئاوا باس دەکا (قطران: ٣٦٣):

تنگ بد گیتی از درد تو بر مردم شهر؛ تیره بد خورشید از هجر تو بر بام و سرای
ز خبرهای خلاف و ز سخن‌های دروغ، خلق را بود روان و دل و جان اندروای.
بنده را درد تو از پای بیفکند؛ بلی، بنده بی‌فرّ خداوند کجا دارد پای؟
بی‌خداوند دل بنده به یکبار بسوخت؛ شاید ار زنده شود زین خبر، ای بارخدای!

هۆی وەها خۆشەویستیەک، بۆ ئەو هـێمنی و نیعمەتـە فرەیـە ئەگەڕێتـەوە کـە قـەتران ئامـاژەی پێئـەکا. شایەنی باسە کـە ڕەخسـاندنی وەهـا ئـاوەدانی و کامەرانییـەک بـۆ خەڵـک لـە بـارودۆخی ئـەوکاتی ئـالان و ئازەربایجان و کوردستاندا —کە نالەبار و پڕ لە بەربـەرەکانێ بـووە- ئاسـان وەچنـگ نـەهاتووە. ئەگـەر بـۆ لای دیوانی هەر شاعیرێک لە شاعیرانی ئەم دەڤـەرە وەک قـەتران، خاقـانی، فەلـەکی، مـوجیر و هتـد ڕوو بنێـی،

چامەکانیان پڕ لە باسی ئاژاوەگێڕی و پێکهەڵپژانی حاکمانی ئەم دەور و بەرە ئەبینی کە شرۆڤە کردنی ئەم بابەتە لە مەبەستەکەمان دوورمان ئەخاتەوە؛ ئیستا لە ناو ئەو حاکمانەیشدا، مەمەلان لە ئازایی و لێهاتووییدا ئەستێرەیەکی گەش بووە کە بەتایبەت لە شیعرەکانی قەتراندا ئەمە بە جوانی خۆی نواندووە. دیارە کە بوونی وەها بارودۆخێکی ئاڵۆز و بە سەرفرازی حوکم کردن لە وەها شوێنێکدا و خاوەنی ئەو کەسایەتییە بوون کە پێشتر ئاماژەی پێکرا، ڕێخۆشکەرە بۆ ئەوەی مەمەلان بەرز بکرێتەوە و داستانی میرخاسی و ئازایی و گەل دۆستی ببێتە نوقڵی هەر مەجلیسێک؛ لە شار و گوند و گۆڤەند و خوتبەیاندا هەر باس باسی ئەو بێ؛ ئەمجار بە شوێنیدا باسی دینداری و دڵداری و بەرەبەرە پەیابوونی دڵبەرێکیش بۆی، بە بەسەرهاتەکەی زیا ببێ و دیسان بە زمانی خەڵک ڕێکوپێک بکرێ. ئەوە بەر چاو بێنە کە هەرکەس بەجۆرێک لەو کابرایە دوابێ و ئاواتێکی بەدی نەهاتووی خۆی تێدا دۆزیبێتەوە. لەم قسە گێڕانەوانەدا هەرچی زەمان زیاتر تێپەڕێ، گێڕانەوەکان زیاتر چوارچێوەی ڕیوایی بە خۆئەگرن.

بەم چەشنە زەوقی خەڵک، چیرۆکی حەماسی «مەمی ئالان» لەسەر ئەو بنەما ڕاستەقینە درووست ئەکا؛ ئەمجا ئەم چیرۆکە هەر ڕۆژ زیاتر لەناو خەڵکدا جێ ئەکەوێ و بە دەستی بەیتبێژانیش ئەگا. چیرۆکێک کە چوارچێوەیەکی ڕیوایی وئامانج و ئاواتەکانی گەلی لە خۆ گرتووە، لە گوند و شاراندا مایەی سەرقاڵی خەڵک پێکدێنێ و هەرچیش زیاتر لە تەمەنی ئەو چیرۆکە تێپەڕ ببێ، زیاتر ساف و لووس ئەکرێ و بیچمێکی ڕێکوپێکتر ئەگرێ. کەسایەتی مەمەلان (مەمی ئالان) و قارەمانەکانی دیکە دڵڕفێنتر و نیانتر ئەبن و لە مێشکی ئوستوورەسازی گەلدا وەک قارەمانێکی نەتەوەیی و ئارمانی بەرز ئەکرێنەوە و دژەقارەمانەکانیش گڵاوتر و خوێڕیتریان لێدەردێ. لەم ناوەدا هێندێ هێمان و ئارکیتایپ و توخمی چیرۆکە کۆنەکان و کەسایەتییە ئوستوورەییەکانیش وردەورده ئاوێتەی چیرۆکی تازە ئەبن (شالیان، ١٣٨٥: ٦٤٤) هەتا زیاتر لەگەڵ نموونە ئەزەلییەکان یەک بگرنەوە کە لە مێشکی مرۆڤدا هێلانەی کردووە.

ئیستا کە ئەم چیرۆکە درووست بووە و وڵات بە وڵات لە سەر زاری خەڵک و بەیتبێژان سەفەر ئەکا، لە هەر لایەک ڕەنگێک ئەگرێ و بە جۆرێک گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەویش زۆر ئاساییە؛ چونکە هەر شوێنێک زەوقێکی تێدا حاکمە و خوازیاری جۆرە گۆڕانێکە کە لەگەڵ شوێنەکانی تر جیاوازە. ئەمەیە کە لە ناوچە جیاجیاکانی کوردستاندا چەندین ڕیوایەت هەر لە چیرۆکی «مەم و زین» یان «چیرۆکی مەمی ئالان» هەیە. «ڕۆژێ لێسکۆ» تەنیا لە ناوچەی «جزیرە» ئاماژە بە سێ ڕیوایەت لە چیرۆکی «مەمی ئالان» ئەکا کە لە سێ بەیتبێژ (دەنگبێژ) ئەیانبیسێ و لە تێکەڵ کردنی هەر سێ ڕیوایەتەکەیە کە بەیتی «مەمی ئالان» دەرئەهێنێ و پاشان تۆماری ئەکا.

ئەمن وا تێئەگەم کە چیرۆکی «مەمی ئالان» -کە خۆی لەسەر بنەمایەکی مێژوویی دامەزراوە- ئەبێتە بنەمایەک و هەوێنێک بۆ چیرۆکی «مەم و زین». ئەم چیرۆکی مەم و زینەش هەر دەست بە دەست ئەکرێ هەتا لە سەدەی یازدەهەمی کۆچیدا بە دەستی ئەحمەدی خانی جلکی ئەدەبی بۆ لەبەر ئەکرێ و دێتە ناو ئەدەبی ڕەسمی کوردییەوە؛ بێئەوەی کە ئەم ئەدەبی کردنە کۆتایی بە ژیانی کارناواڵی چیرۆکەکە بێنێ؛

بگرە هەتا سەردەمی ئێمەیش ئەم چیرۆکە هەر بە شێوەی کارناواڵی –هەڵبەت بە تایبەتمەندییەکانی خۆیەوە- لە ناو خەڵکدا باو بووە (بڕوانە: ایوبیان، ١٣٤٠: ١٨٥).

بە پێی ئەم گومانە، ئەتوانین بڵێین کە بنەماکانی چیرۆکی مەم و زین بۆ سەدەی پێنجەمی کۆچی ئەگەڕێتەوە و مەمیش لە چیرۆکی خانیدا هەمان ئەبوونەسری مەمەلان، کوڕی ئەبوومەنسووری وەهسوودانە کە لە کەسایەتییەکی مێژووییەوە پەڕیوەتەوە بۆ کەسایەتییەکی چیرۆکی. ئەوەی کە ئەم گومانە بەهێز ئەکا، ئەم بابەتانەی خوارێن کە دانە دانە ئاماژەیان پێئەکەین:

١- وێکچوویی ناوەکانە. ناوەکان لە «مەم»، «مەمی ئالان» و «مەمەلان» یان «مەمەڵان» بەڵگەیەکی لەبارە بۆ بەهێز کردنی ئەم گومانە.

٢- خۆشەویستی زۆری مەم لە ناو گەلی خۆیدایە کە لەبارەی مەمەلانیشەوە هەر بەو جۆرەیە و نموونەکانیشی لەوە پێشتر ئاماژەی پێکرا.

٣- شەڕەکانی مەم لە چیرۆکی خانی لەگەڵ سپای عەجەمە کە ئەمەیش لەگەڵ ئەو شەڕە پیرۆزانەی مەمەلان لەگەڵ نەیارەکان–کە بەشێکی هەرە زۆریان زەرتوشتی و گورجی و تورک و ئەرمەنی بوون- هەمبەرە. ئەم شەڕانە لە چیرۆکەکەدا بە «شەڕ لەگەڵ سپای عەجەم» ناوی لێبراوە؛ عەجەم زاراوەیەک بوو کە بەتایبەت بە ئێرانییەکان –کە بەر لە ئیسلام زەرتوشتی بوون- ئەگوترا. ئیستا کە مەمەلان دژی زەرتوشتی و مەسیحییەکان ڕائەوێستێ و شەڕ ئەکا و تورکانی داگیرکەر پاشەگەز پێئەکا، بە جۆرێک لە مێشکی بەیتبێژاندا شەڕەپیرۆزەکانی سەدری ئیسلام –کە بە جەهاد ناویان لێبردووە- ئەبووژێنێتەوە و لە چیرۆکەکەدا بە شەڕ دژی سپای عەجەم دەردێ.

بەڵام لەم لایشەوە بۆ لاواز کردنی ئەم گومانە، چەند پرسگر و لەمپەر هەیە کە بۆ دەرخستنی گشت توێکانی ئەم بابەتە ئەبێ ئاماژەیان پێبکرێ:

١- ئەگەر مەم لە چیرۆکی خانیدا هەمان مەمەلانی سەدەی پێنجەمی کۆچییە، مەمەلان کوڕە میر و وەلیعەهدە و لە ساڵی ٤٥٠ی کۆچیدا لە لایەن توغرێلی سەلجووقییەوە بە جێی باوکی لە سەر تەختی پاشایی دائەنیشێ؛ کەچی مەم لە چیرۆکی خانیدا کوڕی نڤیساری دەربارە و هیچ حکومەتێکیشی پێنادرێ.

٢- ناوی میری چیرۆکی خانی، میرزەینەدینە، کەچی میری بەرباسی ئێمە ناوی ئەبوومەنسووری وەهسوودانە. لە بەیت و چیرۆکەکاندا، وایە کە ناوەکان ناگۆڕدرێن، بەڵام وێکنەچوونی ئەم دوو ناوە بۆ لاواز کردنی گومانەکەمان لەمپەرێکی ئەستوورە.

٣- لەمپەری سێهەم ناوی پێتەختەکانە.پێتەختی میرزەینەدین لە چیرۆکی خانیدا لە «جزیرە»یە و گشت ڕووداوەکانیش هەر لەم دەڤەرە بەڕێوە دەچێ؛ کەچی پێتەختی ڕەووادییەکان باژێری «تەورێز» بووە.

ئەمانە لەو پرسگرانەن کە لەوانەیە یەکێ قنجی بکاتەوە و ڕیسەکەمان بکاتەوە بە خوری؛ جا بۆیە ئەبێ لەسەری بدوێین. لە وەڵامی پرسی یەکەمدا ئەبێ بڵێین کە لە چیرۆکەکاندا، کەسایەتی قارەمانەکان لە باری بەزمییەوە زەق ئەبێتەوە؛ بە چەشنێ کە ئەگەر ئەوان شەڕوازێکی دلێریش بن، سەرەنجام ئەم لایەنە دائەخزێتە ژێر کەسایەتی بەزمیانەوە. کەوابوو ئاساییە ئەگەر کەسایەتی مەم لە کوڕەمیرێکی کامەران و

شەڕواز (لایەنی ڕەزمی) بە قارەمانێکی دەلال و ناکام (لایەنی بەزمی) بگـۆڕدرێ و بـە درێژایـی شـەش سـەدە وەک قارەمانێکی نەتەوەیی بە هێمای ئاواتەکانی گەل دەربـێ و هـاوگری زەوقـی ئـەوان گۆڕانێـک بـە خـۆوە ببینێ.

سـەبارەت بـە پرسـی دووهـەمیش ئـەبێ ئـەوە بڵـێین کـە نـاوی ئەبوومەنسـووری وەهسـوودان وەک کەسایەتییەکی مێژوویی لە بیر نامێنێ؛ چونکە بیری خەڵک، بەتایبەت لە ڕۆژگارانی بەرێدا، لە مێـژوو ڕائـەکا و بە جێی ئەوە بۆ ئوستوورە و ئوستوورەسازی پەنا ئەهێنێ. ئەوەیە کـە گـەلانی پێشـوو، ناخودئاگـا کەسـایەتییە مێژووییەکان لە مێشکدا ئەسڕنەوە و بە جێی ئەوان کەسـانی ئوسـتوورەیی یـان کەسـانی نزیکتـر بـە زەمـانی خۆیان دائەنێن. کەوابوو، ئیستا ئەبێ ئەوە دەربخەین کە ئایا لە زێدی ئەحمەدی خانیدا (بادینـان) میرێـک بـە ناوی زەینەدین حوکمی بە دەستەوە بووە کە ناو و بیرەوەری وەهسوودان داپۆشێ و لە چیرۆکدا بە جێـی ئـەو دانیشێ. مێژوو پێمان ئەڵێ کە لە ناو میرەکانی بادینان لە سەردەمی تەیموورە شەلی گوورکانیدا، نـاوی «مـیر زەینەدینی بادینانی» وەبـەر چـاو ئەکـەوێ کـە زۆر پیاوچـاک و خێرۆمەنـد بـووە و ڕۆژگـاری دەسـەڵاتداری تەیموورە شەل (٧٧١ک.-٨٠٧ک.) و کوڕەکەی، شاڕوخ میرزا (٨٠٧ک.٨٥٠ک.)یشی دیـووە و لـە لای هـەر دووکیشیان خۆشەویست بووە (روحانی، ١٣٧١: ١٤٦/٣). ئیستا کە ئەم میر زەینەدینـە بـە زەمـانی داڕشـتنی کۆتایی و ئەنجامی دوایین گۆڕانەکان لە سەر ئەو چیرۆکە نزیکتر بووە، دوور نییـە کـە بـەیتبێـژان، ناخودئاگـا ناوی ئەویان بە جێی ناوی میر وەهسوودانی چوارسەد ساڵ پێشوو هێنابێ.

وەها پاکانەیەکیش هەر بۆ گۆڕانی ناوی شوێنەکان (پرسـی سـێهەم) وەرئـەگیرێ. تـەورێز -کـە زەمانێـک پێتەختی بنەماڵەی ڕەووادی بووە- ئیتر لە سەردەمی خانیدا لـەو شـکۆ و ڕەونەقـە کـەوتبوو؛ بـەلام دەڤـەری بادینان و بەتایبەت شاری دیاربەکر، لە لایەن میرە کوردەکانەوە ئیدارە ئەکرا (دهخدا، ١٣٧٣: دیاربکر). خـانی کە لە پێشەکی چیرۆکەکەیدا تامەزرۆیی خۆی بۆ پێکهێنانی حکومەتێکی یەکگرتووی کـوردی دەرئەبـڕێ کـە پشت و پەنای گەلی کورد بێ، دیارە ئیدارەی ئەو دەڤەرە بە دەستی خودی کوردەکـان، وەهـا شـانازییەک لـە دەروونی بەیتبێژان و خودی خانیشدا دەئاروژێنێ کـە وردەوردە ئـەم دەڤـەرە ناوبـانگی سـەرفرازی کـوردان دەرخا و دەڤەرەکانی دیکە وەک تەورێز داپۆشێ. لە لایەکی تریشەوە بوونی ئەو قەڵا و دیوارە بـەرز و درێـژەی کە دەوراندەوری دیاربەکری لە ئامێز گرتووە و ئیستایش هەر ماوە، وەها ڕۆحێک بە بەری چیرۆکەکـەدا ئـەکا کە تەواوی ڕووداو و کەسایەتییەکان زیندوو بنوێنێ.

پێویستە لێرەدا ئاماژەیەک بە خاڵی کۆتـایی وتارەکـەیش بکـرێ، ئـەویش کورتـە باسـێکە لەسـەر مـیرانی شەددادی کە کورد بوون و لە ئالاندا دەسەڵاتیان بە دەستەوە بووە. باسی ئەم میرەماڵـە لـەو بـارەوە پڕبایەخـە کە ئەوانیش میرێکی مەزنیان بە ناوی «مەمەلان» بووە، جا چونکە کـوردیش بـوون و لـە ئالانیشـدا حکومیـان گێڕاوە، ئەتوانێ لە ڕوون کردنەوەی لایەنێکی دیکەی باسەکە یاریمان بدا.

کەسـرەوی -کـە سـەبارەت بـەم بنەماڵـەیش توێژینـەوەی کـردووە- ئەڵـێ کـە جگـە لـەو بنەماڵـەی «ڕەووادی»یەی کە بە ڕەچەڵەک عەرەب بوون و لە ئازەربایجاندا بـە پێتـەختی «تـەورێز» حوکمیـان گێـڕاوە، بنەماڵەیەکی دیکەش بە ناوی «ڕەوادی» (بە یەک دانە "و") لـە ئەرمەنسـتان و ئالانـدا دەسـەڵاتیان بـووە کـە کورد بوون و ئەمانیش هەر دژی ئەرمەنییەکان و گورجییەکان لە کێشە و شەڕی هەمیشـەییدا بـوون. نـاوێکی

تری ئەم بنەماڵەیە «شەددادی»یە. هەر دوو بنەماڵەکە لە سەدەی چوارەم و پێنجەمی کۆچیدا شان بـە شـانی یەک، حکومەتیان کردووە، «ڕەوودایان» لـە ئازەربایجـان و «ڕەوادیـان (=شـەددادیان)» لـە ئالانـدا. هـەر دوو بنەماڵـەیش دژی دراوسـێگەلی باکووریـان لـە شـەڕدا بـوون (کسـروی، ١٣٣٥: ١٤٨-١٤٩). جـا جگـە لـە «مەمەلان» کوڕی وەهسوودان—کە مەمدووحی قەتران بووە- لە بنەماڵەی شـەددادیەکانیش هـەر "محەمـەد" ناوێک بـووە کـە دوو سـێ ساڵـێک (هـەتا ساڵـی٣٤٢) حکوومـەتی کـردووە و زوو دەسـەڵاتەکەی دامرکـاوە (کسروی، ١٣٣٥: ٢٧٢). ئەم بنەماڵە زۆر ناویان دەر نەکەوتووە و مێژوونووسانیش لە سەر نـاوی میرەکانیـان و ساڵی دەسەڵاتیان زۆر کۆک نین (هەمان: ١٤٨).

بەڵام ئەو ئاماژە ڕاشکاوەی خانی -کە ڕەگەزی پاشای چیرۆکەکەی بۆ عەرەبان هەڵـئەگێڕێتەوە- ئێمـە لـە نزیک بوونەوە بەم بنەماڵە ئەپارێزێ؛ ئەگەریش ناوبانگی ئەو محەممەدە وەها بووبێ کە لـە نـاو خەڵـکدا دەنگـی دابێتەوە، من وا تێئەگەم کە ئەو ناوبانگەیش هەر بە هانـای کـامڵ کـردنی کەسـایەتی مەمەلانـەوە هـاتووە و بـەس؛ لەبـەر ئـەوەی کـە محەمـەدی ڕەوادی (=شـەددادی) بـە وەهـا کەسـایەتییەکی بـەرین و ئاسمـانی نەگەیشتووە کە بتوانێ هەوێنی یەک چیرۆک پێکبێنێت.

## ئەنجامەکان

چیرۆکی «مەم و زین» وەک هـەر چیرۆکێکـی دڵـداری دیکـە، لەسـەر بنەمایـەکی مێژویـی و ڕووداوێکـی ڕاستەقینە دامەزراوە. مەم لەم چیرۆکەدا، هەڵگوێزراوی کەسایەتی مەمەلان (=مەمی ئالان)ە کە شـازادەیەکی دەسەڵاتدار و بیرمەند و هێژا بووە و لە ساڵی ٤٥٠ی کۆچیشدا بە ڕەسمـی جـەوازی دەسـەڵات لـە سوڵـتانی سەلجووقی، "توغرێل" وەردەگرێ. جوامێری و باڵابەرزی و دڵسەخاواتی و هتد لـە مەمەلانـدا، کەسـایەتی ئـەو ئامادە ئەکا کە بەرز بکرێتەوە و ئوستوورەیی بکرێ. ئەمجار لە مەجلیسـاندا یـادی ئـەو و کەسـایەتی بـەرزی و شەڕەکانی دژی نەیاران ئەگوترێت و ئەگوترێتەوە تا کەم‌کەم ئەو یاد کردنانە ڕەنگ و ڕواڵـەتی ڕیـوایی بـە خـۆ ئەگرێ. بەم جۆرە هەوێنی چیرۆکەکە هاوگری زەوق و بیری خەڵک درووست ئەبێ.

پاش درووست بوونی ئەم هەوێنـە، چیرۆکەکـە لـق و پـۆ ئـەگرێ و ڕێکوپێـک ئـەکرێ و بـە قارەمانـەکانی چیرۆکەکـەش، تایبەتمەندیگـەلی قارەمانـانی ئوسـتوورەیی وەک شۆڕەسـواری، جـوامێری، نـەجیبزادەیـی، دینداری و ئەڤینداری ئەبەخشرێ. ئەم کەسایەتییە بەرزەی کە مەم لە چیرۆکی «مەم و زیـن»دا هەیـەتی، لـە ڕووی کەسایەتی «مەمەلان»ەوە درووست بووە.

قسەی کۆتایی ئەوەیە کـە ئـەم وتـارە بـۆ دۆزینـەوەی بناخـەی مێژوویـی چیرۆکـی «مـەم و زیـن» تـەنیا پێشنیارێکە و هەرگیز داواکەری ئەوە نییە کە لەم بوارەدا گرێیەکی کردوەتەوە.

**ژێدەر**


١. آذر، مريم (١٣٨٢) **نمونه‌های برجا مانده از هنر شفاهی**، مجلّهٔ کتاب ماه هنر، شمارهٔ ٥٥ و ٥٦.

٢. احمدی، بابک (١٣٧٨) **ساختار و تاویل متن**، چاپ چهارم، تهران، نشر مرکز.

٣. ایوبیان، عبیدالله (١٣٤٠) **چریکه‌ی کُردی**، مجلّهٔ دانشکدهٔ ادبیات و علوم انسانی دانشگاه تبریز، سال سیزدهم.

٤. پهلوان‌زاده، ملوک (١٣٨٧) **قهوه‌خانه‌های عصر صفوی**، در مجموعه مقالات ادبیات مکتب اصفهان، انتشارات فرهنگستان هنر، تهران، چاپ اوّل، ج. ١، صص. ٢٩-٥٦.

٥. خانی، ئەحمەد (١٣٦٧) **مەم و زین**، ڤەژاندنا پەرویز جهانی، ورمێ، چاپا یەکێ ، ناوەندا وەشانێن فەرهەنگ و ئەدەبا کوردی.

٦. دهخدا، علی‌اکبر (١٣٧٣) **لغت‌نامه**، زیر نظر جعفر شهیدی و محمّد معین، تهران، انتشارات دانشگاه تهران.

٧. روحانی، بابا مردوخ (١٣٧١) **تاریخ مشاهیر کرد**، جلد سوم، بخش دوم، تهران، انتشارات سروش.

٨. شالیان، ژرار (١٣٨٥) **گنجینهٔ حماسه‌های جهان**، ترجمه علی اصغر سیّدی، نشر چشمه، تهران، چاپ دوم.

٩. قطران تبریزی (بی‌تا) **دیوان قطران**، از روی نسخهٔ مرحوم آقا محمّد نخجوانی، به اهتمام حسین آهی، مؤسّسهٔ انتشاراتی خزر.

١٠. کراچکوفسکی، ایگناتی اولیانویچ (١٣٧٦) **لیلی و مجنون، پژوهشی در ریشه‌های تاریخی و اجتماعی داستان**، ترجمهٔ دکتر کامل احمدنژاد، چاپ دوم، تهران، انتشارات زوّار.

١١. کسروی، احمد (١٣٣٥) **شهریاران گمنام**، چاپ دوم، تهران، انتشارات امیرکبیر.

١٢. گرگانی، فخرالدّین اسعد (١٣٧٧) **ویس و رامین**، به تصحیح دکتر محمّد روشن، چاپ اوّل، تهران، انتشارات صدای معاصر.

١٣. مینورسکی، ولادیمیر (١٣٧٧) **داستان عاشقانهٔ پارتی**، ترجمهٔ دکتر مصطفی مقرّبی، ضمیمهٔ «ویس و رامین» اثر گرگانی، به تصحیح محمّد روشن، تهران، چاپ اوّل، انتشارات صدای معاصر.

١٤. ناصر خسرو (١٣٧٥) **سفرنامه**، به کوشش دکتر محمّد دبیر سیاقی، چاپ ششم، تهران، انتشارات زوّار.

١٥. نظامی، الیاس بن یوسف (١٣٧٩) **لیلی و مجنون**، چاپ سوم، تهران، انتشارات سورهٔ مهر.

# شامی له نزیکەو

(شی کردن و شاوور شێعر و زنەیی شامی کرماشانی)

فه یزوڵڵا پیری

**کورتە:**

«شامی»، شاهمراد موشتاق، کوڕ خوامرای (خدامراد) و فانوس، شاعێر دەروون ناس، فەرهەنگ ناس، مـەردم ناس، وه باوەڕ فرەیگ له کرماشان ناسەیل، گەورەترین هەڵمەت فەرەنگی و فیشترین تەقەلا ئـەڕای نـواگردن له خاموش بوون و کوشانن ئاگر زوان داڵگی مەردم کرماشان داشتییه و هیمای دیرد. هیمـای گـەپ شـامی و شیرەیلی له ناو ماڵەیل کورد زوان، جی قسەوباسه و گەپ شەونشینییه و شەوچەرەی ماڵـەیله. جیـا لەیـەیش له فره رادوون و تلیزوون و ڕوژنامەیل باسی کریەید و شێعرەیلی خوەنن و ئاڵ فـەرەنگ وه یـادی وه جییـەیل گشتی جەمەو بن. ئی هەسارەی ئاسمان فەرەنگ و ئەدەب کرماشانییه، ئەو جوره ک له شـیرەیلی دەرکەفـد، زنەیی وه فەقیری و نەداری و دەس‌تـەنگی و کرانشـینی بردەسـەر و لەبـە (ئەقـەرە) تـرس ئـی دەردەیلـە وه دەرونی بوو، ک ترسیاد دواجار مردنیشی بان کرای قەور وەلی بسینن. وه قەوڵ ئەدیب ناسەیل و خوەنـەرەیل و شاووردەرەیل شێعر و زنەیی شامی شەکەت، شێعر ئی شاعێر کرماشـانییه، ئـەوزای نالـەبار و زنـەیی تیـەڵ و ناخوەش خوەی و مـەردم لـەو زەمانـە لـە کرماشـان بـاس کـەی. ئـەوجوره ک ماموسـا هـەژارموکریانی لـە «چەپکەگوڵ» وتییه: «تەنیا شێعر کرانشـینی خاسـترین شـایەت هونـەر و هونەرمەنـدی و دەس ڕەنگـینی و شێعرخاسی و ڕەوانی "شامی" شاعێر هەلکەفتی کرماشانه».

زوان کوردی کرماشانی له کوردەواری و زوان‌ناسی و فەرەنگ کوردەیل، قەریبه بووه. هەوەی خـاتره شـامی و شێعرەیلیشی قەریب مەنن و فره دیر وه مەردم مارفی بوون.

لەی وتاره فیشتر له باوەت زنەیی وشێعر ئی کەڵەپیای ئەدەبی ناوچەی کرماشانه باس کەیم.

**کەلیمەیل ئەسڵی:** شامی کرماشانی، زوان کـوردیی‌کەڵـهۆڕی، شـاعێر، شـێعر، چەپکـەگـوڵ، چـەنانی، کرانشین، کرماشان.

## پەیشرو (پێشەکی)

زاراوەی کوردی کرماشانی یەکی لە سەرچڵەیل ئەسڵی زوان کوردییە ک وە داخەو وە دریـژی ئمـری لـەناو ئەدەبیات کوردی، لاوەلی نەکریاس و جیا لە ساڵەیل و کارەیل ئاخر ک زامەت کیشەیل و شایرەیل ئـی زاراوە داشتنە، تەقەلای فرەیگ ئەڕای پەرەسەندنی نەکریاس. هەروەی خـاترە وە داخـەو ک کـەم کـەم فولکلـور و زوان داڵگی ئی ناوچە لەتمەی فرەی دییە و تەنانەت توونیم بووشیم کە کوت فرەیگی وە بەین چییـە و ئەگـەر ئەڕای ئەڵ دان دجارەی چەرداخ زاراوەی کەڵوڕی کاری نەکریەید، کارەسات گـەنی وەسـەری تیـەد. شـامی کرماشانی یەکی لەو شایرەیل کـوردی بووشـە ناوچـەی کرماشـان و زاراوەی کرماشـانییە ک وە یـەی کـەتاو توونستیە خوەی جور یەکی لە بناخەچینەیل و وەفریاڕەسەیل ئی زاراوە لە ساڵەیل ئاخرە نیشان بیـەی. لـەی وتارە فیشتر لە باوەت زنەیی وشێعر ئی کەڵەپیای ئەدەبی ناوچەی کرماشانە باس کەیم.

## شامی کرماشانی کی بوو؟

شامی شاهمراد موشتاق، کوڕ خوامرای (خدامراد) و فـانوس، شـایر دەروون نـاس، فەرهـەنگ نـاس، مـەردم ناس، وە باوەڕ فرەیگ لە کرماشان ناسەیل، گەورەترین هەڵمەت فەرەنگی و فیشترین تەقەلا ئـەڕای نـواگردن لە خاموش بوون و کوشانن ئاگر زوان داڵگی مەردم کرماشان داشتییە و هیمای دیرد. هیمـای گـەپ شـامی و شیرەیلی لە ناو ماڵەیل کورد زوان، جی قسەوباسە و گەپ شەونشینییە و شەوچەرەی ماڵـەیلە. جیـا لەیـەیش لە فرە رادوون و تلیزوون و ڕوژنامەیل باسی کریەید و شێعرەیلی خوەنن و ئاڵ فـەرەنگ وە یـادی وە جییـەیل گشتی جەمەو بن.

«مامـەد ئـەلی سوڵـتانی» کوکـەر و نووسـەر کـەتاو «چنـانی» ک خـوەی شـامی وە نزیکـەو فـرە دییـە، نووساس:«شامی هەمیشە وەهوور من هاوردیاد ک "شـاهموراد" ئەگـەر وە کـوردی خولاسـەی بکـەی، بـودە "شامی". منتا ئەڕای من، شورەت و ناسـنامەیگ خاسـتر لـە شـامی نییـە. هەرچـەن وە "موشـتاق" و"وەتـەن دوس"یش شورەت دیرم. وەلام شامی وە "شام کەران" (نزیکە شەو) نزیکەو نیشـان لـە تـاریکی دریـژ زنـەیی منە. ئەر چشتی لە بارەی من نووسای، هەتمەن یە وە مەردم بووشە».

«کەریم کەریم پوور» نووسەر فەرەنگ لقـەت«خوەرهـەرلات»، ئـی شایرسەربەرزکرماشـانییە وە«شـاهمراد مشتاق وەتەن دوست» ناسانییە و لە وەردەم کەلیمەی «شامی» نووساس: «هەرچـەن سـەواد نەیاشـت وەلام شایری مەردمی بوو. فیشتر شیرەیلی وە "تەنز" وەتیاد».

ئی هەسارەی ئاسمان فەرەنگ و ئـەدەب کرماشـانییە، ئـەو جـورە ک لـە شـیرەیلی دەرکەفـد، زنـەیی وە فەقیری و نەداری ودەس تەنگی و کرانشینی بردەسەر و لەبە (ئەقەرە) ترس ئی دەردەیلـە وە دەرونی بـوو، ک ترسیاد دواجار مردنیشی بان کرای قەور وەلی بسینن:

لە ڕووژی ترسم ئەجەڵ بیەی زەنگ

ئومرم تەمام بوود لە دونیای دو ڕەنگ
پنهان بووم لە ژیر خشت و خاک وسەنگ
ژن ساهیومال وەبیل و قولەنگ
قوڕە قوڕکونان، وەقسەی جەفەنگ
بای کرای قەور لەلیم بسینی
چە بکەم وەدەس کرانشینی

وە قەول ماموسا هەژار موکریانی «ئەگەر شامی کورد نەواتا و ئەگەر فەقیر و بی کەس نەواتا، شورەت شیرەیلی فرەتر لەیە بیاد... وەلام شوکر ئیرەنگەیشە سەربەرزە؛ شامی تا زنە بی، لە نزمترین خانی و کەم گرترین کوانی ڕووژگار و زنەیی بردەسەر. وەلام ئیرەنگە ک مردییە جای بەرزە؛ هەلبەت لە زنەیش سەربەرزبوو، وەلام چەو نەزانەیل شامی نەی».

تا وە دنیا بی وەقەول و قەرار فرە لە شیرەیل ودوسەیلی، لە گەڕەک «چەنانی» شارکرماشان زنەیی بردە سەر و مەردم ئەڕای شنەفتن شیرەخوەشەگانی وە دەوری جەمەو بوان و هەرکەس ئەڕای خوەی نەواری وەشامی پڕ کردیاد.

لە پەیشرو (پێشەکی) کەتاو «چەپکەگوڵ» شامی، ک هەی سال ۱۳۶۳ هەتاوی دە جار و تا سال ۱۳۷۰ شەش دەفە چاپ بوو، وەدالگ بوون ئی شایرە وە ئەوەڵەیل ساڵ ۱۳۰۰ تا ۱۳۰۲ هەتاوی مالوم بوویە. منتا (وەلام) هەژار نووساس لەوە ک ئومری خوەی (شامی) هووشد، فرەترە. «مامەدئەلی سولتانی» تاریخ نووس کورد کرماشان، وەدالگ بوون شامی لە ساڵ۱۲۹۶ زانستییە. هەلبەت سولتانی هووشد مە ک لە کەتاو «حدیقە سولتانی»، تاریخ وەدنیا هاتن شامی وە ساڵ ۱۲۸۷ هاوردمە، وە هەڵە چیمە. لە وەرایوەر «کەریم کەریم پور» نووسەر فەرەنگ لقەت کوردی کرماشانی «خوەرهەلات» وەیە باوەڕ دیری ک شایر «چەپکەگوڵ» لە ساڵ ۱۲۸۷ هەتاوی هاتیەسە دنیا.

دەنگباس نووسەیل «شامی کرماشانی» گشتیان باوەڕ دیرن ک ئی ئەدیب وشایرکوردە لە کرماشان وەدالگ بووە، منتا کەس نەوتییەئەڕا وەختی شامی چود ئەڕا مالەو کرا گردن و ڕیشە و ڕەچەڵەکی وەلی پرسن؛ ئووشد «هەرسینی»م؟

وەت: تویسرکانیت؟ وەتم: نە، کوردم
وەت: کورد کورەی؟ وەتم: هەرسینی

هەڵبەت لەشیر «زیارەت»، شامی باس خوەی لە «شام» و «مدینە» و «خوراسان» و «نەجەف» و... کەی. هیمای مالوم نەویە ک ئی شیرەیلە ئەڕای جفت بون قافیە و ڕەدیفە، یاک وەڕاسی شامی سەفەر ئی شارەیلە کردییە؟

**زنەیی و وەسەرهات شامی لە منالی تا...**

وەداخەو وەختی شامی ٣ سالان یا وەقەوڵ کەتاو «چنانی» ٤ سالان بووە، وە مەرەز ئاوڵە گرفتار بود و هەردگ چەوی لە دەس دەی. خوەی لەی باوەتە وتییە:

هەنوز نەشناسووم چەپ و ڕاس دەس

دەست جەهاندار جەهان بینم بەس

وە قەوڵ پەیشرو«چەپکەگوڵ» شامی لە ماڵ «ئەڵماس خان» و «قوڵام ڕەزا لوڕ» و «سەی سالا» وە زمسان گوش وە شیروەتن داس و هوویردە هوویردە، خوەی زەوق و شەوق شیروەتن پەیا کردییە. شامی وە ١٢ ساڵی یەتیم کەفید و چودە لای مەموژنی. ئەوەیش کلی کەیدە ماڵ «هاجی ئەمانولاموتەزدی». نووسەر کەتاو «چنانی» لەی بەش لە زنەیی شایر ناوبانگ کرماشانییە نووساس: «شامی کارەیلی ک وە پی سپاردوون کردیاد و وە قەوڵ خوەی ڕوژانە فیشتر لە دوهەزار پەم دیاد، تا لە چالاو ناو هەسار، هەوزو مەمبەی ناو ماڵ پڕ بود. شامی پولای ئاو مژیای بوو و هەروەخت باس بکردیا، لەو پیایە "ئامانولاموتەزدی"وە خاسی ناو بردیاد و ئەڕای گەورەیلی جور "مامەدخان چەنانی" ڕامەت کل کردیا».

هەیە ک سن و ساڵ شامی چودەو بان، ئەڕای چەن وەختی لە «قەسرشیرین» چای و پارچە سیند و لە کرماشان- یا وەقەوڵ بڕی لە تایخ نووسەیل کورد لە کرماشان و کرن- فروشیدەی و وەی جورە ڕوزگار وەسەر بەی.

«مارف خەزنەدار»تاریخ نووس ئەدەبیات کورد وتییە: شامی لە ئاخر ئومری تونستیە وە کاسبی سەرمەرز ماڵی ئەڕای خوەی بسینی. کەسی ترەک لەی بارە چشتی نەوتییە.

### فەرق مامەڵەی «چەپکەگوڵ» و «چەنانی»

شیرەیل شامی وقەوڵ قسەی سوڵتانی، منالەیل تەفری و بازی منالی خوەیان وەپی کردیان دواجار داستان ئەوشیرەیلە وە سەریان هاتیاد.

هەرچەن وەداخەو کەتاو «چەپکەگوڵ» هەتمەن بەشیگ و کەتاو «چنانی» شایەد بەشی لەشیرەیل شامی کرماشانییە، وەلام هەیەیشە هوورەیل ئنسانی، ئەدەبی و ئجتمائی شامی ئەڕای ئیمە ڕوشن کەیدن.

هیمای بو خوەش«چەپکەگوڵ»لە سال ١٣٦٣وەلاو نەوودەو ک خەوەردان شامی شایرخوەش هوور کرماشانی لەدنیا چی و دەسی ودەنیا بڕیا. «چەپکەگوڵ» وە زامەت «ماجد ڕۆحانی» و پەیشرو ماموسا «هەژارموکریانی» و هاوکاری «حسین موفتی» لە سال ١٣٦٣ لە وەلاوکەر سروش وەلاوەو بی. وەلام «مامەد ئەلی سوڵتانی» نووسەر کورد لە کەتاویگ وە ناو «چنانی» دیوان شامی کرماشانی ک فەرق مامەڵەی فرەیگ وە گەرد چەپکەگوڵ دیری، چووزەیل تاریکتر وکوڵەسوچەیل نائاشناتر لە شێعر و زنەیی شامی خەیدە وەردەس. هەڵبەت سوڵتانی خوەی وەتیە«چەپکەگوڵ» تەنیا یەی بەش لە شێعرەیل شامییە. وە قەوڵ ئی خاوەن قەڵەمە چەن گلە غەزەڵ و٣ مەنزوومە فرەناتەمام لە شێعرەیل شامی، ک وە گەرد کەتاو "چنانی" فەرق مامەڵەی فرەیگ دیرد، لە ناو چەپکەگوڵ چاپ بووە. هەوەی خاترە ئێمە دوونیم ک لە کەتاو چنانی

شیرەیلی جور «ڕژەسوران»، «قاتل گیان»، «سوگ حسین»، «بی وەفایی» و «زیارەت» وە گەرد چەن شێعر ترەک فارسی چاپ بووە ک لە «چەپکەگوڵ» نییە. هەوەی فرمە بڕی لە کەلیماتی ک لە ناو «چنانی» هاتییە، جوری ترەک لە چەپکەگوڵ چاپ بووە. جور ئی بەیتە:

«ڕاە تو وە ترکسان چو ئەی عەرەب! بی خود نەدەو» (شامی، ۱۳۷۰: ٦۱).

ئاغای سوڵتانی لە کەتاوەگەی خوەی لە زوانی شامی ئی جورە وتییە:

«ڕاە تو مەقسەد و ترکسان بیخود مەدەو» (شامی، ۱۳۸۲: ۸٤).

یا دوونیم ک «تەبیب جە هەر دەرد» لە «چەپکەگوڵ»، جور «تەبیت وەهەردەرد» لە چنانی هاتییە. بایەسیش وەت ک شێعر «خاو غەفڵەت» شامی لە «چەپکەگوڵ» وە ناو «اعتیاد» لە «چنانی» چاپ بووە. نمونەی ئی جیاوازییەیلە فرەن.

وەباوەڕ ئێمە چوون شامی سەواد خوەنین و نووسان نەیاشتییە وشێعرەگانی لەسینەی بیە، هەرکەس هاتییەسە لای، بەیت یا کەلیمەیل جوراوجوری لە هەر نەوارپڕ کردن وتییە. یا بنکول، فرە لە شیرەیلی تەفروتوونا بینە. هەوەی خاترە توونیم وە شەک و گومان بووشیم ک تەنانەت کەتاو چنانیش تەمام شێعرەیل شامی نییە. هەڵبەت قسیەی کوکەر وشاووردەر کەتاو چنانی جای هورمەت دیرد ک وتییە: شامی قەوڵ دا نوسخەی کامڵ فیشتر شیرەیلی ک لەو وەختە لای پیای خاسی تر بووە و یەکی وە هاوسایل باسەوادی لە ئدارەی پوس و تلیفون ئەرای نووساوودەی، ئەڕای کەڵک گرتن من بارەدەی. دوای ئی ئەوەڵ چەو وەپی کەفتنە لەو زەمانە هات و چین من وە گەرد شامی شرو بوو. دووای فرەیگ هات وچین و سەرکیشی و هاونشینی و شێعرخوەنین، شامی ئی دەفتەر شێعرە دادە من و وەت: لە تو توام ـ ئی شێعرەیلە ـ ئەڵگریدان و نەیلید وەبەین بچن. منیش قەوڵ دام و فیشتری لە بەرگ هەوەڵ کەتاو «حدیقە سوڵتانی» وە گەرد داستان هاڵ باڵ شامی هاوردمە. ئاغای سوڵتانی باوەڕ دیری ک کەتاو چنانی ک وە هاوکاری «ئەلی ئەگبەر سابونی» وەپی ڕەسییە، کامڵتر وەنوسخەی چەپکەگوڵە؛ ڕاس وتییە.

### شامی؛شائر میللی کورد و لووتک نشینی شێعرەگانی

وە قەوڵ ئەدیب ناسەیل و خوەنەرەیل و شاووردەرەیل شێعر و زنەیی شامی شەکەت، شێعر ئی شایر کرماشانییە، ئەوزای نالەبار و زنەیی تیەڵ و ناخوەش خوەی و مەردم لەو زەمانە لە کرماشان باس کەی. «د. مارف خەزنەدار» نووسەر کەتاو «تاریخ ئەدەبیات کورد» پیایەتی ئەدەبی شامی، جور «نالی» شایر سەربەرز و توانای سورانی وە هەساو هاوردیە و نووسد: «شامی هەرچەن خوەنین و نووسان نەزانستییە، وەڵام توونستیە شێعر "ناڵیانە" بووشد. وەی خاترە چییەسە ناو تاریخ و ئەدەب کوردییەو». خەزنەدار لە دریژی قسیەگەی ئووشید ک « تەمام شیرەیل شامی نیشان دەی ک شامی شایر میللی کوردە».

ئەوجورە ک ماموسا هەژارموکریانی لە چەپکەگول وتییە: «تەنیا شێعر کرانشینی خاسترین شایەت هونەر و هونەرمەندی و دەس ڕەنگینی و شێعرخاسی و ڕەوانی "شامی" شاعێر هەلکەفتی "کرماشان"ە».

سولٚتانی هەوەی فرمە، ناو ئی شایر گەورای کوردە لە لای شایرەیلی جـور «ئەبولعـەلا مـوعیری» و «بەشـار برد» عەرب و «هومیروس» لە یونان و «میلتۆن» لە ئوروپا و «روودەکی» و «شووریدە شیرازی» لە ئیران دییـە و وتییە «شامی هیچ وەخت وە بالای پاتشا و خانەیل، شێعر نەوتییە». یەو جیا لەیە ک نزیکی شـێعر شـامی و «ئەبولعەلا» لە باوەت مانی ومەغز، خاس شاور داس و شی کردیەسەو، وتییە ک شامی جورەیل «ڕومانتیـک» و «ئمپرسیونسیم» و «سومبولیسم» شێعر وتییە. هـەوەی فرمـە وتییـە: «شـامی لـە سـازەیل و دەسـکردەیل ئەدەبی جور "جناس زاید" و "شبیە موتلەق" و "مراعات نەزیر" و "مقابلە" و "لف و نەشـر" و "تەمسـیل" کەلـک وەرگرتیە».

بایـەس بووشـیم ک شـامی لـە «سـەئدی» شـایر فارسـی بـووش گـەورای ئـیرانی، مەسـەڵ و شـێعر هەڵگەڕانیەسەو. ئەوجا ک هووشی:

ڕوح سەئدی شاد واتش کەس لەئی میهنەت سەرا

تانەکیشد ڕەنج و زامەت گەنج نەسیبی نیەو

(نابردە رنج گنج میسر نمی‌شود)

لە جای ترەک، شامی «تەزمین» شێعر فارسی «باور ازبخت ندارم کە تو مهمان منی» لە «سـەئدی» گرتیـە ک وە داخەو لە کەتاو چەپکەگوڵ ناتییە.

فرەوەداخەو ئی بلیمەت لای مەردم کرماشان و تەنانەت فەرەنگ دوسەیلیش قەیر و قیمەتی نـەگیریادن تـا ئەوجا ک لە شیرەیلی دەرکەفد، دەروەدەر و وارەوکرانشین و دەس تەنگ بوو. هەروەی خـاترە هـەوەڵ جـار کەسانی لە دەیشت کرماشان و فەرەنگ کەڵهۆڕی، تیەن وکوتی لەشیرەیلی جەم و وەڵاو کەن. کوڵ و کوڵبڕ وە قەوڵ سولٚتانی، «وەختی شامی لە مانگ ۹ (نو) لە ساڵ ٦٣ وەخاتر یەی نەخوەشی دریژ مرد و لەباخ فەردەوس کرماشان خاکی کردن و لە"حسینیەی ئیمام حەسەن ئەسکەری" ئەڕای فاتهـە گـرتن، کەسـی وە شـایرەیل و ڕەفیقەل و فرەزانەیل و دەسەلات دارەیل دەوڵەتی و ئەمنی ناتنە فاتهەگەی». کورد وتەنی: گەیا! تف لە مردند!

## قەریبی شامی وەخاتر قەریبی زاراوەی کوردی کەڵهۆڕی (کرماشانی)

بایەس وەت یەکی لە هوکارەیل قەریب مەنن شامی لە ناو کوردەیل و ئاڵ فەرەنگ، جیـا لـە فـەقیر و دەس تەنگ بوون ئی شایرە، قەریب بوون زاراوەی کوردی کرماشانی لـە نـاو فـەرەنگ و زوان کـوردی وە گشـتییە. یانی بایەس بووشیم ک زوان کوردی کرماشانی لـە کـوردەواری و زوان ناسـی و فـەرەنگ کوردەیـل، قەریبـە بووە. هەوەی خاترە شامی و شێعرەیلیشی قەریب مەنن و فرە دیـر وە مـەردم مـارفی بـوون. مـەردم کەڵـڕ و وەرسەی زاراوەی کرماشانی، تەنانەت وە زامەت کەسەیل تر، وە شامی و شیرەیلی ئاشـنابوونە. ڕوژنامەنووسـی ک زوان داڵگی خوەی کەڵهۆڕی نییە، لـە وتاریـگ وە نـاو «شـامی، دەسـکرد کمـار (کنـار) و قـەریبی زوان» نووساوود ک : خەم نان، تەمام بوون و توانایی ئی شایرە داگیر کردییە. ئەنوو درو وتییە؟

دوواجار ئووشد: «شامی توای بانگەواز بوون گیانلەوەر ئینسان دەس تەنگ فەقیری جورخوەی بکەی».

وەباوەڕ ئیمە، شامی وە شێعر و زوان ئەدەبییەگەی، هەم خوەی زنە کرد و هەم بناخەی زنی کـردن زاراوەی

کەڵهۆڕی و پەی شرو ئەدەبی بوون ئی زاراوە لە ڕۆژگار تازەی ئیمە لە ناو زوان و ئەدەبیات کـوردی دامـەزران. ئمرۆژیش پەرەدان وە زاراوە کوردییکرماشانی تووین «شامی کرماشانی»یەیل فرەتر و ئیمە بناسند.

«خەیام» و «حافز» و فرە لە شایرەیل تر ئیران و دنیا وە یەی کەتاو ناودار بـین و شـامی ئیمـەیش تـەنیا وە «چەپکەگوڵ» یا کامڵتر بووشیم وە «چنانی» بییـە هەسـارەی نـوورانی وە ئاسمـان زوان و ئـەدەب کـوردی. ئمرو ئەڕامان جورخوەر نیمەڕوژ ڕوشن بییە ک شامی وە یەی کەتاو ک تەنیا بەشـیگ وە شـیریلییە، چ کـاری ئەڕای فەرهەنگ و زوان کوردی لە کرماشان کردییـە. پـڕ وەداخـەو فرەیـگ لەشـیرەیل ئـی شـایر سـەربەرز کرماشانییە تەفروتوونا بوون و وە بەین چین و کەسی نەوو جەم و وەڵاویان بکەید. هەرئەو وەختـە ک فرەیـگ وە تەفری و گەپ داین هاتنەسە لای شامی و وەی شایرە نەوار پڕ کردنـدە یـا شـیر شـنەفتنە، هـوور ئیمـرۆژ نەیاشتنە و تەنانەت بڕیگ وەتنە شیرەیلد چاپ کەیمن. جیا لەی دگلەی کەتاوە ک ناویان بردیم، ئەگـە ئیـوە کەتاوی لەیانە دینە چاپ بود،"مشتاق" شائریش دییە! بەڵکە شیرەیلی بردنەو نا وردنەسەوەی.

## شێعر شامی باس لە چوەکەی؟

لەشێعرەیل شامی، جیا لەیە ک تەمام فـت و فەنـەیل ئـەدەبی وەکـار چییـە، ڕەخنـە و گلـەیی و تواسـتن مافەیل سیاسی و شارنشینی تیەدە وەرچەو. ئاڵ گوڕەیل سیاسی دەورەی «موسـەددق» و ساڵـەیل ١٣٢٨ تـا ١٣٣٢ هەتاوی وە ئیران لە هوور شامی کار کردنە و لە بڕی لە شێعرەیلی، شامی خوەی جور یـەی کەسـی ک ئەوزای مەملەکەت شناسوود، مافەیل شارنشینی خوەی بانگـەواز کـەی. هـەر وەی خاترەسـە ک فرەیـگ لـە شامی دوسەیل و شامی ناسەیل وەیە بـاوەڕدیرن ک شێعرشـامی لـە دەردەیـل سیاسـی ومـەردمی وە شـیواز ڕئالیسم باس کەی. «ئەلی سەهامی» شایر و نووسەر کەڵوڕ وتییە: "من" شامی، "مـن" جەمایـەت و مەردمـە. وەڕاسی لەشێعرەیل شامی، ئی قسیە دەرکەفید.

شامی لە وەخت گەپ شێعری خوەی وەگەرد دگدڕ «موسەددق»، تواد ک ئی کەڵـەپیایە، مـەردم لـە دەس زور ودەسەڵات خان و ئاغا ئازاد بکەید و دەسەڵات سیاسی وە بەین مەردم دابەش بکریەید. فیشـتر شـێعرەیل ئی ئەدیب کوردە مالوم کەی ک شامی وە دەردەیل مەردم ئاشنا بییە و لەهووریان نەکردیە. لە شێعر مەیشـور «کرانشینی» و لە بەیتەیلی جور «نە خارج مەزەب نەجوداز دینم» یان «نە ڕومی ڕومـم، نـەچینی چـینی» یـا ئەو جاگ هووشی «مەر من وەجوملەی نەو بەشەر نیم»، درسە ک شـامی هاشـون هـەق شارسـتانی خـوەی، وەڵام لە ڕاسی، شامی لەی شێعرەیلە جیا لە هونەرکاری ئەدەبی، زوان ڕاسەقینەی مەردمە و لـەباوەت ئەوانـەو قسیە کەی. ڕشانن نەخشەی دەردەیل مەردم وە زوان شێعر تەنیا لـە شیرکرانشـینی، لەبـە ڕەنگینـە ک کـار هەرکەسی نییە. شامی لەی شیرە ک ئیرەنگە وە ئەنازەی زوان کوردی وەروەڵاو بیەسـەو، نیشـان داس ئایـەم کرانشین دەس نەچی، ڕوژگار چوو بەیدەسەر و چوە کیشی. یا هاڵ باڵ ئایەم کرانشین ک وەهاڵ بـاڵ سـەگ زانستییە و نزیکی وەدنیا هاتن خوەی وە «ساڵ سەگ» یا دەنگ ساهیو ماڵ ک هاوارکەی « دیـوار نـەڕمنی»، ئەسکەیلیگە ک وەهەق بەرزی کار هونەری شامی نیشان دەی. یا وەختی کور ساهیوماڵ «وەجیب پـڕ ڕیـخ، دەس وە تیرکەمان/ خەی ئەڕای قوڕی، خەی ئەرای ئسکان/ کەس جورەت نەیری سدای بایـدەبان» و سـەف

**بەشی پێنجم- رەخنە**

ئەفتاوە ئەرای کناراو ک هووشی «۲۰ نەفەر وساس تەک داسە دیوار» یا جیرە جیرەی دەر و خاتر هاتن «ئوساسەفەر» و «مەشەی ئەلی ئەسکەر» و «مەشەی قولام» و«کەلای فەروخ خان» و«ئوسا ئەمیرخان»- ک هەرکام وە جی خوەی چوو یەی دەسە ماڵ، وەئاجوڕ و خشت چنیاس- کارەیلیگە ک توونیم بووشیم فەقەت وەشامی وەر تیەد.

هەرچەن شێعر شامی فیشتر زوان ئمڕوژ کرماشانە، وەلام «مارف خەزنەدار» نووسەر کەتاو «مێژووی ئەدەبی کوردی» وتییە : کەلیمات زاراوەی لەکی، بەختیاری، گورانی وکەڵهۆڕی و فەیلی لە ناو چەپکەگوڵ پەیدا بود. تەنانەت بایەس بووشیم ک کەلیمەیل هەورامیش وە زوان شێعری شامی پەیدا بود. یەیش نەبایەس وهوور بوەیم ک هووردەزاراوەیل شار ودیهاتەیل دەور وەر کرماشان ک هاتنەسە ئی ولاتە، سەرجەم، زاراوەیگ لە زوان و زاراوەیل جوراوجور کرماشانی کە فیشتری کەڵهۆڕییە، دورس کردنە. منتای ڕاسییەگەی، کوردیی‌کرماشانی ئمڕوژ فەرق مامەڵەی فرەیگ وەگەرد کوردی کەڵهۆڕی دیرد. هەرچەن هەردگلەی ئی دو هووردە زاراوە وەخاتر نزیکی فرەیگ ک وەگەرد یەک دیرن، لەجای یەکتری چنەوکار.

هەر ئەو جورە ک وەتیم لە شیرەیل شامی کرماشانی، کەلیمەیلی وەزاراوەی «هەورامی» دوونیم. جور ئی شێعرە ک لە بارەی داڵگی وتییە:

شەش ماە تەمام وەبان جا بی
عاقبەت دەوای دەردەش فەنابی
من مەنم ئەڕای جەفای زەمانە
پەی تیر تەئنەی خویش و بیگانە
*قەوم قبڵەس وەلی قبڵەی من چەفتەن*
*هەرچی قەوم دیرم دور وەلیم کەفتەن*
*یا هووشد:*
*بنام بی چون جەهاندار فەرد*
موخبر جەهەرکار، تەبیب جە هەردەرد
زاتش بی زەوال لوتفەش بی پایان
خودایش وەخەڵق ئاڵەم نەمایان

خوەش زوانی شامی و کەڵکگرتنی لە فت و فەنەیل ئەدەبی، نیشان دەی ک شایرەیل گەورای ئیرانی سەردەم خوەی کەم یا فرە شناسیە. هەر وەی خاترە شامی هەرچەن و ەخوەنین ونووسان بیگانە بوو، وەلام شێعر فارسی لە فرەیگ لە فارسی زوانەیل خاستر وتییە و ئایەم وەی کارە سەری سڕمینی. ئەو جاگ ئوشی:

وەقەوڵ «سعدی» پیرخردمەند
مادەر نەزادەست یەی ڕەنگ دەفەرزەند
«حافز» مەنووسد«ڕەفیق کیمیاس»

*نەمود وەدەس تا دونیا دونیاس*

فرەیگ لە شیرەیل فارسی شامی، ک لە ناو چەپکە گوڵ ناتییە، لـە کـەتاو چنـانی وەڵاو بیەسـەو. وەڵام لـە هەردگلەی ئی کەتاوەیلە توونیم ئی شیرە بوونیم:

من اگر اهل وفا یا بی وفا بودم گذشت

مدتی مهمان این محنت سرا بودم، گذشت **(چنانی: مدتی مهمان درین محنت سرا بودم ...)**

زاغ بودم در چمن یا بلبل افسرده حال

در گلستان جهان، گل یا گیا بودم گذشت

یانی:

من ئەگەر وەفادار یا بی وەفابووم، چیم

چەن وەختی میوان دنیای پڕ مەینەت بووم، چیم

قەلابازلە لە چەمەن بووم یا بولبول لەهاڵ کەفتی

لە گولسان دنیا گوڵ یا گزگیا بوم، چیم.

شامی وەگەرد بیسەوادی خوەی، نزیکی فرەیگ وە زوان فارسی داشـتییە. ئـی نزیکییـە بـایس بـووە هـەم شێعر فارسی بووشد و هەم لە بڕیگ لە شێعرەیلی، وە کەلیمەیل فارسـی کەڵـک وەربگـری. ئـەیب ئـی کـارە یەسە، کەم وکوڕی زاراوەی کەڵهۆڕی - وەباو زوان ناسی- لەشێعرەیلی باقی بمینی. هەڵبەت خاسی فـرەیش دیرد. هەر ئەوجورە ک «ئبرایم یونسی» نووسەر و هەڵگەردنەر (موتـەرجم) کـورد وتییـە «خاسـتر یەسـە ک زوان کوردی و فارسی ئەڕای پشتیوانی، لە یەکتری کەڵک بگرن. چوو وە یەک نـزیکن». یـەیش بووشـیم ک کەلیمەیل فارسی ک لە شێعرەیل شامی وە کارهاتنە، نیشانی ئەڕای یەسە ک لە شاری جور کرماشان تـا ئـەو زەمانە کار فرەیگ ئەڕای زوان کوردی وەزاراوەی مەردم ئی وڵاتە نەکریاس، تا ئەوجاگ فیشـتر کـەتاو چەپکـە گوڵ و تەمام لاپەرەیل کەتاو چنانی وە ڕینووس فارسی نووسیانە. وەلحاڵ شامی وە شێعرەیل خـوەی فرەیـگ لە کەلیمەیل کوردیی‌کرماشانی لـە مـردن نجـات داس و زنـەیان کـردی‌یـە. لەیـە بـان‌تـر، بایـەس وەت، وە شێعرەیل خوەشی، خوەی و زوانەگەی وە قەفەس هاتنە دەیشت و لە مـەرگ نـەجات پەیـدا کـردن. ڕوژنامـە نووسیگ خوەمانی ڕاس وتییە: «شـامی، نەفـەس جـەمیگ کمـار کریـای بـووە ک تـەنیا لـە دەروەچ شـێعر تووونستیە بشناسنەیان و بخوەننەوەیان و لە ڕێ هونەرەو دجارە تیەنە دنیـای ڕوشـن». شـامی ئەگـەر قـەریب مەن، وەخاتر قەریبی زاراوەگەی لە ناو زاراوەیل زوان کوردی بوو. ئەگەر ئمڕوژیش زنییە، وەخـاتر شـێعرەیلییە ک جیا لە خوەی، زاراوەی «کەڵری»ش زنی کردەو.

پلەی بەرز هونەری شیرەیل ئی شایر سەربەرز کرماشانییە وەهـەق هـەرجای قسـەوباس دیـری. ئـەوجاگ وەگەرد «د. موسەددق» ئووشد:

سە ماە حقوق پاسبان شار

... نیەرەسد، نەیدەی دەس تەڵەبکار

مەر جورەت دیرن بچنە بازار؟!

**بەشی پێنجم- رەخنە**

یە چڕی ئاغا، ئەو دادکەی سەرکار
دەس مایە نەیرم، هەساوەگەت بار

***

ئەوزا مەملەکەت دەرهەم بەرهەمە
وینەی زولف یار پڕ پیچ و خەمە

شامی لەی بەیتەیلە، جیا لەیە ک پلەی بەرز کارهونەری وشیرین کاری خوەی نیشان دەی، ئەوزا مەملەکەت لە زەمان خوەی وە قەشەنگترین جور وە شیوەی پیچپایی زلف یارنیشان دەی.

شامی، فرە وەگەرد شێعر ئیمرۆژی (نەو) ک لە شیواز وەزنی شونگیری نیەکەی، هامشو خاسی نەیاشتییە. هەلبەت فرە لە شێعرەیلی و قەوڵ شامی ناسەیل، شێعر«نەو»ون ک وەزن دیرن. منتا ئاو شامی وەڵ هەر شێعر «نو)»ی وە یەی جو نەچیاد. تا ئەوجا گ هووردە ئەیب زیرەکانە و فرە تیەلی وە فرە لە شایرەیلی گردییە ک وە سەر ئی خەیالنە "ئەگەر چەن کەلیمە ئەدەبی وە ژیر یەک بنووسی ئەوە شیر نەوە". لەی بارە وتییە:

یا فەراق ئاخر کوشیدم یا غەم ئەشعار نەو
وەی دو دەردە ئەرنەمردم، دی نە لەرز دیرم نە تەو
ئاب و خاک قالب نەکەردە، گڵ وەپی ئووشن نەخشت
زەهمەت سەرمای زمسان، یەخ دەیدەئەو
قسەی بی مەغز و مەغز ئازار و پوچ و بی لەزەت
دیم وەهەر جەمعی خوەنینەی، ئەهل مەجلس کەیدە خەو
ڕەوغەن وگوشت و برنج و لیمو ئەمانی و سیب
کەی وەخامی بود بخوەیدەی، تا نەکریەیدە چلەو
شایر شیرین کەلام شیرنەو هەر یەبزان
عافیەت دورەن جەسەرکار ئەر بخوەید هەشت مەشکەئەو
کاغزی نفلە، قەلەم ڕەنجەو خوەد خەستە نەکە
ڕاە تو وەترکسان چو ئەی عەرەب! بی خود نەدەو (چنانی: راە تو مەقسەد وەترکستان عەرەب،...)
شیرنەو، کوهنەوەیادم برد، نیەزانم چارەچەس؟
قسەی بی مەغز بەزی، مەغز شامی کردخرەو

لە قەسیدەی «باغبان با کەس وەفا نەکەردەن» (چەپکەگوڵ) ک لە کەتاو «چنانی» وە ناو «زەییف وقەوی» وەگەرد فەرق ماملەی چەن بەبیت هاتییە، شامی وەگەرد موناجات وەل خودایا شروع کەیدن و دوواجار لە سەر دەیشت و تەبییەت، جوری باس کەی ک شیواز خوەیە و هەرشایری نیەتووند وەی ڕیا بچود. هەوەی فرمە، شامی لە شیر «ڕوون نەواتی» لە ڕشان و پشان خەرج ساڵ نو قسیە کەید و فەقر و نەداری و دەس چین ونەچین مەردم، وە زنەیی خوەی هەساو کەید ک ئەڕای خەرج ساڵ نو، ئەسپاو فروشد یا نەیدە گرەو؛ ک دووزەمەی فرەیگ دەیدە دەسی. دوواجار ڕەسد وە قسەیل فولکلور سەرزوان مەردم کرماشان جور

«گشت کەس» و«زنەی گیانت بو» و «توبمری» و... لە ئاخریش سەر لە مەرافـەیگ دەرکـەد ک هیمـای بـە یتیەیلی گەپ تەنیایی و شەوچەرەی دیواخانەیل کرماشانە.

وە گومـانم «کرماشـانی زوان» نییـە، یـا کـەم هـەس ک ئـی بەیتەیلـە یـەی دەفـە وە زوان نـاوردوود یانەشنەفتوود:

تایەی دوشمین‌دام، هەم پیاو هەم ژن
چوو سەگ هەڵامات هاوردن پەی من
هەف هەش دەس خواردم، دودەس وەشانم
بیس کرانشین ڕشیانە بانم
وە تەخت ڕەخت شور، ئەفتاوە و ئاوپاش
یەکی ئاتەش ڕیز، یەکی وە مەقاش
من دیم کارگەنە ناو خودا بردم
کراواتاگەی باقرخان گردم
باقر خان لە ژیر، بیس نەفەر لە بان
من لە ناوەڕاس جورکەواو لای نان
سەفەر وەسیلە، موشتەبا وەمشت
داراخان دادکرد: کەریم کازم کوشت
تابان وەتاکەوش، جەیران وەجاڕو
لەیلا وە لەقە، گوڵ بانوو وەچو

ڕاسییەگەی یەسە ک وەگەرد «خەنین‌دار» و «مەردم وەخوەی کیش» ئی شێعرەیلە، شامی فرەتر لەیـە ک هوور بکەیم، هووردەکاری و سەرتک نشینی خوەی وە ناو ئەدەبیات کوردی نیشـان دەی و شـیرین کارییـەل زاراوەی کوردیی‌کرماشانی فیشتر خەیدە وەر دەس خوەنەرەیل شێعرەگانی. جیا لەیەیش خوەی جـور ئایـەم مەردم ناس ک هووردترین کردەوەیل مەردمان کرماشان ناسییە، جور ئـەدیب و دەنـگ بـاس نـووس و جـور هونەرمەندی ئیرادگیر و ڕەخنەگیر تەمام، لووتگ نشینی خوەی لە زاراوەی کرماشـانی لـە شـێعر و ئـەدەبیات ئەو زەمانە و تەنانەت ئمروژیش وە ڕخ کیشد. هەوەی خاترەسە ک شێعرەگانی لە سینەی مەردم جـی گردیـە و بووچگ و گەورا کوتیگ لە شیرەگان شامی لەوەر خوەنن و شەوچرای دیواخانەیلە.

هەرئەو جورە ک شایر کەڵهۆڕی بوش شیرین کار وڵات «گێلان» لەشارەیل قورتیسەی کەلڕ وتییە: (ئایـەم بایەس شیری بووشد ک لە سینەی مەردم جی بگری). «شامی کرماشانی»ش وەی جـورە شـێعر لـە خـوەی جی هیشتیە و شێعرەیلی وەقەوڵ قەدیمە، قسیەیلیگە ک وە دڵ هاتیە و وە دڵ نیشد.

*****

خیش و بیگانە بزانن قاتڵ گیانم تونی
بایس ئاە و فەغان شام هجرانم تونی

**بەشی پێنجم- رەخنە**

بی سەبەب باران دیدە دامەن کەس تەڕ نەکرد
مایەی ئەشک عەیان و ئاه پنهانم تونی
خوەم شناسم، دوو زوخاو دیدە و ئارام دڵ
توهمەت ناهەق وەکی کەم، بی وەفازانم تونی

لەی چەن بەیتە ک تایبەتمەنی قەزەڵ کوردی وەناوی هەس، شامی خوەنەر وە خوەی کیشید و ناڵەی دەروون شایر وە دەس یار بەیان کەی. وەباوەڕ «د.مارف خەزنەدار»، شامی لە یەکی قەزەڵەیلی ک موناجاتی وەگەرد دڵبەرە، تەقەلاکەی جل بکەیدە وەرشێعرکلاسیک کوردی. وە باوەڕ یەو، شامی وە فرەزانین و فتو فەن جیاواز، توونستیە ئی کارە وەرەو نوا بوەی». توانایی و مەردمناسی و تاریخ نووسی شایری ک مایەی شانازی کورد و کرماشانیەیلە، بایس بووە ک ماموسا هەژار موکریانی لە پەیشرو کەتاو «چەپکەگوڵ» بنووسد ک «وەختی ئی شیرەیلە خوەنیام، بزەم دەهاتە سەر لێوان وکزەم لە جەرگەوە دەهات».

«فەرشید یوسفی» شایر کورد زوان کرماشانی، وەی خاترە ک وە دەورەی زنەیی شامی، باوگی لە ڕاسەبازاڕ کرماشان دکان داشتییە و«شامی» لەورە جی خوەش کردیاد و دەسفروش بووە، وتییە: «شامی سەواد نەیاشت و شیواز و فتوفەنەیل ئەدەبی خاس نەناسیاد، وەلام هوور تیژی داشت. یەی روژ چەن شێعر"حافز" ئەڕای خوەنیم و ئەنقەس چەن کەلیمە وەلی کەم کردم. شامی زوو وەت: برا! ئی بەیتە خاس جفت نەووە. دجارە شێعرەگە کامڵ خوەنیم. ئی کەشە وەت: ئیرەنگە جفت بوو». هەڵبەت «یووسفی» وتییە: « بەشی لەو قەزەڵەیلە ک وە ناوشامی وەڵاو بیەسەو شێعرشامی نییە».

«مامەد ئەلی سوڵتانی» لەباوەت شیرەیل شامی نووساس: « تایبەتمەنییەیل فیشتر مەکتەبەیل ئەدەبی ئروپا وە ڕوشنی لە شێعرەیل شامی وەرچەوتیەن». «جەلیل ئاهەنگەر نژاد» شایر و ڕوژنامەنووس لە کرماشان وتییە: «شامی شایری بوو ک وەناو مەردم جی واز کردیە و توونیم بووشیم ئەڕای هەمیشە وەگەرد مەردم کرماشان زنییە».

هەوەی فرمە «روح‌الله باقرئابادی» ڕوژنامە نووس‌ترەک ئی شارە لە تایبەت نامەیگ لە باوەت شامی نووسایە: «هەرچەن شیرشامی لە ناو شایرەیل فرە وە خاسی تەماشای نەکریاد و گشت جور ڕخنە و ئیراد ئەرووزی و وەزنی وەلی گرتن، وەلام پەرەسەنن شێعرەگان شامی و لە دڵ مەردم جی گردن ئی شێعرەیلە، ئنکار نیەود». وەقەوڵ ئی خاوەن قەڵەمە: «شێعر "کرانشینی" لە دووای ٥٥ ساڵ، هیمای نوستالوژی کرانشینەیلە». دواجار نووسد: «شامی وە شێعرەگان خوەی، ئەقەرە شون پا لە خوەی جی هیشت، ک دو فیلم "کرانشینی" وەڕوون نەواتی" وەلی سازین و چەن دەفە لە تلیزوون کرماشان وەڵاو بوویە و مەردم پیشوازی لەلی کردن».

## قسیەی ئاخر

وەباوەڕ ئیمە، شامی خزمەت فرەیگ وە ئەدەب کوردی کردییە و بەڵگەی زەرینی وە تاریخ شێعر و ئەدەبیات و فەرهەنگ کوردی لە کرماشان ئەزافە کردییە. فرەتر لە یە زوان کوردی کرماشانی وە کوردزوانەیل ترەک ناسان. هەوەی خاترە وە سەر مەردم کرماشان هەق دیری و دەینی ها مل مەردم. شامی لایەقە ئمڕوژ شێعرەیلی لە دەنگ خوەش و زولاڵ گورانی چڕەیل و هورە چرەیل کورد کرماشان دەربای. هەق شامی‌یەک مجەسمەگەی وە ناو شار کرماشان دابمەزریەید و مەزارەگەی سەر لە نو سامان بگرید و بودە قەڵای کرماشان دوسەیل. شامی نیشان گەورایگ ئەڕای کرماشانە و وەڕاسی هەق دیرد ک خیاوان، مەیدان یا جی- یەل گشتی و ناوی دورس بکەن. هەرچەن خوەی تا وە دنیا بوو، دڵی وەی چشتەیلە خوەش نەوو، وەلام وەو خزمەتە ک شامی کردیە، لە یەفیشتر هەق دیرد. خوەی وەتیە:

وەکام کەس نیەگەردی چەرخ تا سەر

نە دەرویشم نەسوڵتانم وڵم کە!

ئیمەیش لە جواو شامی، وە «جەبران خەلیل جەبران» شایر ناسک دڵ ئەرەوە پەنا بەیم ک وەت: (ئەی شایر! ت ڕوژی بیدە پاتشای دڵەیل و ملک پاتشایی وسوڵتانید ئەوەڵ و ئاخر نەیرد». ئیمڕوژیش شامی سوڵتان دڵ گشت کرماشانی و کرماشانی زوانەیل و کرماشان دوسەیلە؛ چ بتواد، چ نەتواد.

**سەرچاوەیل:**

١ ) شامی کرماشانی (١٣٧٠) **چەپکەگوڵ**، تهران ، انتشارات سروش ، چاپ ششم.

٢ ) شامی کرماشانی (١٣٨٢) **چنانی**، تهران، ، انتشارات سها، چاپ دوم.

٣ ) حیدری، منصور (١٣٨۴) **گویش کرماشانی و نوشتار** (هەفته نامه سیروان :٢٩١).

٤ ) پیری، فەیزوڵڵا، **گەپ گوڕ** وەڵاو نەکریای وەگەرد ئیبرایم یونسی، شایر و موتەرجم گەورای کورد.

٥ ) پیری، فەیزوڵڵا (١٣٨٤) **گەپ گوڕ** وەگەرد سـەیید عبادەتیـان شـایر کەڵـهۆڕی بـووش/ هەفتەنامـەی سیروان، سنه/ژماره ٣۵۵/ تاریخ ١٣٨٤/٧/٧ هەتاوی.

٦ ) خەزنەدار، مارف، **مێژوی ئەدەبی کوردی**، (دەسنووسی تایبەت ئەڕای خاوەن ئی وتاره).

٧ ) ئازادیخواز، جەلیل (١٣٨٥) **شامی ؛ بەرهەمی پەراوێز و غوربەتی زمان**، هەفتەنامەی «**پەیام کوردستان**» ژماره ٣٠، مهاباد.

٨ ) تایبەت نامەی شامی کرماشانی، هفتەنامەی «صدای ئازادی»، ژمارهٔ ۶٧، کرماشان.

٩) کەریمپور، کەریم (١٣٨٠) **خوەرهەلات**، کرماشان، انتشارات صبح روشن.

# عەرووز و کێشی شیعری کوردی

ڕەحیم لوقمانی[*]

**کورتە:**

ئەم وتارە لە پێشدا پێناسەیەکی کورتە لەسەرکێشی عەرووز کە لـە کوێـوە هـاتووە و لـەگـەڵ کـار و ژیـانی ساکاری دەشتەکی و خێڵەکی عەرەبدا چۆن پێکهاتووە؟ پێش باسی عەرووزی، ئاماژەیەکی مێـژوویيم کـردووە بۆکێشی سروشتی شیعری کوردی کە بە ڕیتمی بڕگە (هیجا)یی شیعری فۆلکلۆری و ئایینی لەسـەر گـوتراوە. لەم بارەوە، بەڵگە ونموونەی پێویستم بۆ هەر سێ زاراوەی سەرەکی (کرمانجی ژوور و خوار و هەورامی) هێنـاوە و شرۆڤەم لەسەر کردووە.

پاشان دەرگای عەرووزم ئاوەڵا کردووە وکۆمـەڵـێک لـەو کێشـانەم هێنـاون کـە زۆربـەی شـاعیرانی کـورد شیعریان لە سەر داناون و هەستی خۆیان بەو ڕیتمانە دەربڕیوە.

لە بەشێکی تری وتارەکەمدا بە تێروتەسەلی لە کێشەکانی بڕگەیی دواوم کە لە سەرەتاوە تا ئـەمـڕۆ شـیعری کۆن و نوێی پێنووسراوە. لەسەر بۆچوونەکان نموونەی زۆرم لە شیعری ئایینی و دڵداری و فۆلکلۆری زاربێـژی هەر سێ زاراوەکە هێناوە و دابەشی مۆسیقاییم لەسەر کردوون.

لە کۆتایی وتارەکەمدا بەم ئاکامە گەیشتووم کە هەرچی کێشی بڕگەییە کە ئەمڕۆ بە کێشـی شـیعری نـوێ ناسراوە و گەلێک بەرهەمی باشی لێکەوتووەتـەوە، لـە ڕاسـتیدا هـەمـان کێشـی بـەیـت و شـیعری ئـایینی و فۆلکلۆریکی کەونارای کوردین. دوا سەرنجم وەک ڕوانگەیەکی تازەی زانستی ئاوا کردوەتەوە: ئەو جۆرە کـێش و ڕیتمە شیعریانەی بە کێشی نوێ ناسراون، لە ڕاستیدا ڕیتم و کێشی سروشتی خودی زمانەکـەیـە و هـەمـوو ئەو ڕیتمانە بە گشتی لە ئەدەبی زارەکیدا بەکار هێنراون. دەتوانین بێژین، کێش یان ڕیتمی شیعری ئەمـڕۆ لـە ڕاستیدا جۆرێکە لە گەڕانەوە بۆ ڕیتم و ئیقاعی و بڕگەی وشە لە خودی زماندا.

**وشە سەرەکییەکان:** کێش، بڕگە، عەرووز

[*] مامۆستای زمان وئەدەبی فارسی لەخوێندگاکانی سنە.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

## بەرایی

ڕاڤەی وشەی کلیدی:

کێش: ڕیتمی چەند تاکواژ و وشەیە لەمیزانێکی مۆسیقایی شیعر و گۆرانیدا.

بڕگە (هێجا): چەند دەنگێکە کە بەیەک هەناسە دەر کردن لە دەم پێکدێت.

بڕگە سێ جۆرە: بڕگەی کورت وەک بە، دە، کە

بڕگەی بەرز وەک: دا، موو. بڕگەی درێژ وەک: دەشت، بەرد (رخزادی: ۱۳۷۹).

لە شیعری بڕگەییدا ژمارەی بڕگە گرنگە نە کورتی و بەرزی بڕگە. بەڵام لەکێشی عەرووزیدا بڕگەکان جێگۆڕکێیان پێ ناکرێ وڕیتمی شیعر تێکدەچێت.

عەرووز: لە زمانی عەرەبیدا، زانست یان میزان و ڕیتمێکە بۆ پێوانە و کێشانە کردنی شیعر. هەندێ واتایشی لێدەکەوێتەوە وەک: میزانێک لە شیعر، ڕێگەی چیا، ناوچە، کەنار و ... (فەرهەنگی فارسی معین).

لە کتێبی هەشت هەزار ساڵەی شیعری ئێرانیدا، بەرگی۲ (همایونفرخ) لە بارەی داهێنەری عەرووزەوە دەڵێ: خەلیل کوڕی ئەحمەد عەرووزی کە ۱۷۰ی کۆچی لە دایک بووە، خۆی زادەی ئێرانە؛ بەڵام لە ناو عەرەباندا گەورە بووە. خەلیل ئەم زانستەی لە ڕووی ڕیتمی موسیقاوە داهێناوە بۆیە پێی دەڵێن عەرووز؛ چوونکە ئەم میزانە شیعری لە سەر ئاراستە و کێشانە کراوە، تا کێشدار و بێ‌کێش لێک جودا بکرێتەوە.

## دەستپێک

گرفتێکی گەورە لە پێناسە کردنی هەر ژانرێکی ئەدەبی کوردیدا ئەوەیە کە هیچ ئاگاداریمان لە ئەدەبی ئەمڕۆی کرمانجی بەتایبەت باکوور و ڕۆژئاوای کوردستان نییە، کە نیوەی زیاتری زمان و نەتەوەمان لە خۆ دەگرێت. ئەویش لەبەر چەند هۆی ڕامیاری و پیتی نووسینە کە لە باسەکەی مندا ناگونجێ. دەی جا بۆ هەر لێکۆڵینەوەیەک تا هەموو سەرچاوەکان بەدەستەوە نەبن، لە باری زانستییەوە لاوازە و ئەنجامی کارناتەواو دەبێ. لە ئەدەبی کلاسیکی باکووردا تەنیا پشتم بەو چەند دیوانە بەستووە کە لە بەر دەست هەمواندان. لێرەوە دێمە سەرباسەکەی خۆم کە کێشی شیعری کوردییە.

کێشی عەرووزی دیاردەیەک نییە کەسێک لە پڕێک دایهێنابێ. چونکە هەموو کێشەکانی شیعری عەرەبی پێشتر ڕیتم و ئاهەنگی شیعروگۆرانی بوونە. بەڵام داهێنەری جیاوازی ڕیتمەکان، مەبەستی گەڵاڵە کردنی میزانێک بووە بۆ ڕیتم و موسیقای شیعری؛ وەک دانانی نۆت بۆ موسیقا کە پێش داهێنانی نیشانە و نۆت، ڕێتمی مووسیقایی هەر بووە و بە پێی سروشت و سۆزی دەروونی هەر میللەتێک لەناو ڕۆح و زایەڵەی دەروونەوە سەری هەڵداوە و لە گەڵیاندا ژیاوە.

بۆ پێناسەی کێشی عەرووزی وەک میزانێکی شیعری بە پێویستی دەزانم لە ڕوانگەی موسیقا و جوگرافیای دەنگەوە بچمە ناو باسەکەم.

«پاڵ نیوهام» لە کتێبی «دەنگ دەرمانی» وەرگێڕانی «ئازەر عومرانی» چاپی١٣٨٢ بۆ سەرەتا ئاوا دەڵێ: «مرۆڤ هەر لە سەرەتای ژیانەوە، جۆری دەنگ و سۆزی دەروونی لە گەڵ ژینگە و سروشتی خۆی تێکەڵ بووە و پێک ڕاهاتوون».

هەرناوچەیەک بە پێی ئاو و هەوا و باری نا هەمواری، دەشتەکی، کوێستانی وگەرمێن، لە سەر پێکهاتەی دەنگ و تارەکانی گەروو و ڕیتمی وشە و گۆرانی دانیشتوانی خۆی کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە. دەتوانین بێژین شێوەی دەنگ و ڕیتمی وشە و هەوای گۆرانی هەر گەلێک لەگەڵ گەلێکی تر جیاوازە. بە واتایەکی تر، دەنگ دانەوەی دیاردەکانی سروشت لە ناو هەست و سۆزی دەروونی دانیشتواندا لە گەرووی ئاواز و شیعر و موسیقاوە دەنگی داوەتەوە.

بە پێی ئەم دیاردە سروشتیە دەتوانم بڵێم چون کوردستان بەگشتی وڵاتێکی کوێستانی پڕ چیا و نزار و گیا و زەنوێر و خوار و ژوور و سەختە ڕێیە، ڕیتمی شیعری و ئاوازەکانی کورتە و بە ئاسانی لە گەروو دێتە دەرێ و خوێنەر بە بێ هەناسەی زۆر دەیانبێژێ. بەڵام هەندێ کێشی ئاماڵدرێژ و پشووسواری عەرووزی وەک کێشی سروشتی زمانەکە لە ناو ئاوازەکاندا بە ڕەوانی ناگونجێ.

چونکە کێشی عەرووزی وەک ڕیتمی شیعری عەرەبی زادەی ژیانی بیابانی و هەوای گەرمێن و ڕێکردنی کاروان و ڕەوت و ئاوازی لە سەر خۆی وشترەوان و دەشتەوانە. بۆ وێنە ڕیتمی «مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن» بە ڕەوانی و سانایی لە قاڵبی ئاواز و گۆرانی خۆماندا جێگر نابێ، بەڵام پڕ بە پێستی مەقامات و ئاوازی پشوودرێژی عەرەبییە. کەچی لە هەمان حاڵدا کێشی میسراعی پێنج هێجایی کە ڕیتمێکی کۆنی شیعری ئایینی و فولکلوری کوردییە، لە ناو هەموو گۆرانی و ئاوازەکاندا بە ڕەوانی و سانایی جێ دەگرێ.

## بەشی یەکەم
## کۆنترین بەڵگەکانی کێشی هێجایی پێش عەرووز

وەک ئاماژەم پێکرد، کاریگەرترین دیاردە لەسەر ڕیتمی وشە و کێشی شیعرو گۆرانی هەر میللەتێک ئاو و هەوا و جوگرافیای ژیانی دانیشتوانە . دیاردەیەکی تر چۆنیەتی ژیان و کار و دۆخی کۆمەلایەتی و ڕامیارییە؛ بۆ نموونە: لە پێدەشت و گەرمێنی کوردستان وەک دەشتی هەولێر و کەرکووک، ڕیتمی ئاوازەکان کێشدار و لە سەر خۆیە و دابڕانی کەمترە و گۆرانی ئەو ناوچانە ئاهەنگی درێژترە. تایبەتمەندی سروشت و کاروباری ژیان، لە گەرمێن، ڕیتمی موسیقایی وەک قەتار، ئەڵلاوەیسی، خورشیدی، خاوکەری لێدەکەوێتەوە. وێدەچێ «قەتار» هەمان گاسەی زەردەشت بێ. وشەی گاسە یان گازە لە زمانی کوردیدا واتای بانگ و هاوار دەدا: «باخەوان گازی کرد نەکەی» (فۆلکلۆر).

بەڵام لە ناوچەی سەخت و بەردەڵانی وەک هەورامان، ڕێگەی خوار و ژووری سروشتی ناهەموار و ژیانی دژوار، چڕینی ئاواز حاڵەتی لەرینەوەی زۆری گەڕووی تێدایە. زۆربەی شیعر و ئاوازەکان ڕیتمیان کورتە. چونکە ڕێگای پێچاو پێچ و خوار و ژووری شاخو داخ هەر ئەوەندە مەودای هەناسە و ئاوازەی گەڕوو دەدات.

خاڵی هاوبەشی ڕیتمی ئاواز و کێشی شیعری لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان لەمەدایە کە کێشی شیعری گۆرانی و فولکلۆر، لە سەر هێجای دە بڕگەییە.

کۆنترین سەرچاوە کە وێنەیەکی ساکاری کێشی شیعریمان بە دەستەوە بدا، شیعری ئایینی «یارسان» فۆلکلۆر و بەیت و پەندی شیعرئامێزی پێشینانە.

شاعیری فۆلکلۆری، نەناس و نادیارن. بەڵام بەرهەمیان لەهەستی خەڵکدایە و بە هونەری گەلی دەژمێرێن. لە بەراوردێکی کێشی شیعری فلکلۆردا بۆم دەرکەوت کە زۆربەی زۆری لەسەر کێشی دە بڕگەییە. بەم بۆنەوە هەر فەردێک لە سەر هەموو هەوایەکی گۆرانی دەگونجێت.

کوورەی هەناسەم بەرد مەتاونۆ        گەوری سەر کێوان من مەلاونۆ

هەر میسراعێک لە ٢ بەشی ٥ بڕگە، واتە١٠ بڕگە پێکهاتوە. «گەور» یان «گاور» هەمان «موغی» زەردەشتییە کە لە سەر چیا و ئاورگەکاندا بە ئاوازی ئایینی ستایشی ئەهوورامەزدایان کردووە. وشەی ئەمڕۆی گۆرانی هەر لە ستایشی گاورانەوە هاتووە.

بەڵگەیەکی تری مێژوویی کۆن، هەندێ شیعری پاشماوەی کتێبەکەی «پیرشالیار»ی یەکەمە بەناوی «ماریفەتو پیری» کە زۆرتر هەڵگری ئامۆژگاری ئایینی و کۆمەڵایەتییە. تێکڕای ئەو شیعرانەش لە سەر هەمان کێشی پێنج بڕگە و لە میسراعێکدا دە بڕگەن.

کەرگە جە هێڵە، هێڵە جە کەرگەن        ڕواس جە ڕواس وەرگ جە وەرگەن

(مریشک لە هێلکەیە وهێلکە لە مریشک، ڕێوی لە ڕێوی و گورگ لە گورگ پیدا بووە.)

هۆشت جە واتەی پیرشالیار بۆ        گۆشت جە کیاستەی زانای سیمیار بۆ

(هۆش بدەرە وتەی پیرشالیار، گوێ بدەرە ڕاسپاردەی زانای سیمیار) زانای سیمیار هەمان زەردەشت سپیتمانە.

نموونەیەکی تری شیعری مێژوویی ٥بڕگەیی -کەهەندێ گومانی دروست کردووە- شیعری «هورموزگان ڕمان»ە. ساڵی ١٨ی کۆچی لەشکرێکی ئیسلام بە سەرکردایەتی «ئەبوو عوبیدەی ئەنساری» و «عەبدوڵڵای کوڕی عومەر» دەگەنە دەشتی شارەزوور. لەوێوە بە شەڕێکی خوێناوی نابەرانبەر هەڵەبجە و دەوروبەری داگیر دەکەن و ئەبوعوبیدە لە پشت هەڵەبجەوە دەکوژرێ. شاعێرێکی ئەو سەر دەمەی هەورامان بە شیعرێک وەسفی ئەم کوشتار و ماڵ وێرانیەی کردووە. ئەم شیعرانە لە سە ئاسک نووسراوە، بەڵام دیارنەکراوە لەکوێیە؟

هورمزگان ڕمان ئاتران کوژان        وێشان شاردەوە گەورە گەورەکان

زۆرکار ئارەب کردەنە خاپوور        گنائی پاڵە هەتا شارە زوور

شەن وکەنیکا وەدیل بشنیا          مێر ئازا تلی وەناو هونیا... (سەجادی، ١٩٧١)

«مانی» لە زەمانی «شاپوور»ی کوڕی «ئەردەشێر»ی بابەکاندا پەیامی خۆی ڕاگەیاند. شاپوور بە ڕێزەوە وەریگرت و پەیام پێگەی مانی لەکۆشکی شا سەریگرت. دواتر جێنشینانی شاپوور لە سەر ئەوەی لە سوننەت و ئایینی کۆمەڵگا لایداوە، بە فەتوای ئایینی دەیکوژن و هەڵیدەواسن. لە کتێبی «شاپوورگاندا» کە بۆ شاپووری نووسیبوو، هەندێ شیعری لێرە و لەوێ بەردەست کەوتوون کە لە سەر بڕگەی ١٢، ١٠ ،٧ ، ٨ بڕگەیین. «ڕوکنەدین هەمایوون فەڕڕوخ» لەسەر شیعرەکانی مانی دەڵێ: «هەندێ وشەی بەزمانی دەری تێدایە و ئێمەش ئەو وشانە بە لەهجەی دەری دەزانین».

لێرەدا چەند نموونەی شیعری مانیم هێناوە کە لەباری کێشەوە هەر هەمان کێشی هێجایین کەلە فولکلۆری کوردی ناوچەکاندا هەموو ئەو کێشانە بەکار هێنراون.

هەپت ئەپاختەر پرزێد و ئەو دوو . (٥ بڕگە)
(حەوت ئەستێرەی دانا و دووی دیکەش)
ئەژی دەهاکێ ئاگوست و ئەوکێشت. (٥ بڕگە )
(ئەژدەهاکی بەستەوە و یەخسیری کرد)
ئەبەخشاهە ئەشما یەزدان. (٤ بڕگە )
(خوا ئێوە ببەخشێت )
سوراویند و ئەدا واژند ئەی کەنیکان . (٤ بڕگە )
(سروود و ئاواز دەبێژن ئەم کچانە)

لەباری وشە وزمانەوە لە چوار چێوەی باسەکەی مندا نییە، بەڵام ئەوانەی زاراوەکانی کوردی باش دەزانن خۆیان دادگەر بن بزانن ئەو وشانە کوردێک باشتر تێیان دەگات یان فارس و دەری زمانێک؟

لە کۆشکی پاشاکانی ئێرانی کۆندا شاعیران بە سازەوە سروود و شیعریان بۆ ستایشی یەزدان خوێندوەتەوە. هەروەها بە ئاهەنگی تایبەتی سروودی شاهەنشاییان گوتووە کە پێی‌گوتراوە سروودی خوسرەوانی. ئەم سروودانە هەڵگری خواپەرستی و ئامۆژگاری بوونە. نموونە و ڕەنگ و بۆنی ئەوسروودانە ستایشی یەزدانە کە ئەمڕۆ لە شیعری ئایینی یارساندا بە زایەڵەی تەلموورەوە (تەموورە) لەجەمخانەدا دەبینرێن.

باڵووڵی ماهی (سەدەی سێهەمی کۆچی) یەکێکە لەزانایان وخواناسانی ئایینی یارسان

باڵووڵ زاتێوەن زات یەکدانە          عامیان ماچان باڵووڵ دێوانە
کێ دی دێوانە وەیتەور دانا بۆ          مەرکەونەمەیدان گەردوون زانا بۆ

بەپێی کتێبی سەرەنجام «باڵووڵی» زانا پیرێکی ئایینی یارسانە. (لەوانەیە هەمان باڵووڵ بێ کە لە ناو کوردا بە زانایی ناسراوە).

«بابا لوڕەی لوڕستانی» (سەدەی دووهەم وسێهەمی کۆچی):

وەهەفتینەوە وەهەفتینەوە　　　جەمێمان نیان وە هەفتینەوە

شکارێم ئاوەرد نەکەمینەوە　　　بەهلّوولّ گەورەما وەئەمینەوە

«بابا حاتەمی لوڕستانی» (سەدەی دووهەم و سێهەمی کۆچی)

بەپێی کتێبی سەرەنجام یەکێک لە یارانی بالّوولّە.

ڕەمزدێوانە رەمزدێوانە　　　حاتەمەنانێ ڕەمز دێوانە

دانای عامەنان وەبێ بەهانە　　　ئەز وێلّم چەنی ئی ڕەوو ڕانە (سەفیزادە، ١٣٧٠)

(هەموو شیعرەکان لەسەر هەمان کێشی ٥ بڕگەیین)

نموونەیەکی دیکەی ئاوازی ئەهوورایی، هەمان «هۆرە»ی ناوچەی کرماشانە و لە هەورامانیش سیاچەمانەیە کە هەموو شیعرەکانیان ١٠ بڕگەییە و پەیامیان ئامۆژگاری و خۆشەویستی و تێفکرین لەدونیایە:

ئەلّوەن بر دۆسم وە مل تافەدا　　　وە مل میرەمالّ عێلگەل جافەدا

ئەڕانییەتی وەشین گەرمم　　　پەلکەکەت ببرە وەبان تەرمم

لێرەوە دەمەوێ پەنجەرەیەک بەرەو شێواز و ڕیتمی بەیتەکان بکەمەوە کە پێش عەرووزن لە ئەدەبی کوردیدا. لە زاراوەی کرمانجی سەروو و هەندێ شوێنی کرمانجیخواروو وەک ناوچەیموکوریان داستانگەلێک هەن شێوازیان شاعێرانە و زمانیان بەکێش و سەروایە. بەپێی کەشوهەوای بەیت ئاهەنگی گێڕانەوە و کێشی شیعریان دەگۆڕدرێت. ئەم بەیتانە بەگشتی هەلّگری باوەڕی ئایینی، کۆمەلایەتی، دلّداری و ڕامیارین. شاعیری بەیت نادیارە بەلّام خەلّک بە بەرهەمی دێرینەی خۆیانی دەزانن و هەندێکیان ڕەنگ و بۆیان دەگەڕێتەوە پێش ئایینی ئیسلام.

لەم بەیتانەدا ڕەنگە وشەی بەیت پێوەندیەکی لەگەلّ بەیتی عەرەبی نەبێ. چوونکە لە عەرەبیدا تەنیا دێڕیکە لە شیعر. وشەی بەیت ئەگەر بلّێین لەگەلّ poetry ئینگلیزی یەک ڕیشە بن، نزیکترە. چوونکە واتای گشتی شیعر دەدات. لە هەمان حالّدا لەو ناوچانە چیرۆک و ئەفسانەی تریش هەن کە زمانیان نەسرە. کەس بەوانە نالّێن بەیت و بە بەیتەکانیش نالّێن چیرۆک.

کێشی هەموو بەیتەکان لەسەر ٣ بڕگە، ٤ بڕگە و ٥ بڕگە دابەش کراوە.

نموونەکان :

**مەم و زین**: کۆنترین داستانی دلّداری کوردییە بە چەند زمانی ئوروپایی و ڕووسی وەرگێڕدراوەتەوە. ناوەرۆکی بەیت، کێشەی نێوان خێر و شەڕ و نیشانەی ئایینی زەردەشتی پێوە دیارە. ئاکامیش تێداچوونی شەڕ و ئەهریمەنە. مەرگی «مەم وزین»یش سەمبولی عەشق وپاکی وهەرمانە.

خالەق هەر ئەتوی / لە سەر هەموانە (٥) بڕگە.

دێتە ڕووی/ زەمینێ / سێ پەری / دە تەڕلانە (٣و ٤) بڕگە

لەسەر کوشکی/ کاکەمەمێ/ کوڕی برایم/ پاشای یەمەنێ/ دەیاندا/ سەیرانە (٤) بڕگە

هەر لە عەرش/ تاکورسییە/ هەموو دنیام / پشکنییە (٤) بڕگە
کەسم نەدیوە/ لە گوێن جوانی/ کاکە مەمییە (٥) بڕگە (ئۆسکارمان، ١٩٠٥)

**شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ**: بەیتێکی زۆر کۆنی کوردییە. فەرخ بە منداڵی بەعیسا شوبێهنراوە. عیسا قسەی پاکانەی بۆ دایکی کردووە، بەڵام فەرخ هەڕەشەی لەخەڵک وکوشتنی دایک و بابی کردووە.

ئیلاهییا فەرخم دەبوو بە یەکەشوکرانەم بە تۆ ئەی فەلەکە
خەلقەتی دەکردن لە دەست و چاو و پێ و بەلەکە
(کێشی سەرجەم ٣و ٤و٥ بڕگە)

**قەڵای دمدم**: ئەم بەیتە بەرخودانی «ئەمیرخانی لەپزێڕینە»، سەمبوڵی ئاواتی میللەتێکە لە ناو کەند و کۆسپەکانی مێژوودا کە نایەوێ بچێتە ژێرباری تەعەسوبی سەفەوی و نۆکەرایەتی سوڵتانی ستانبوڵیش قبوڵ ناکات. لە ئاکامدا شاعەباس هێرش دەکاتە سەر قەڵای دمدم و پاش چەند ساڵ بەربەرەکانێ و فەداکاری، بە هۆی کەسێکی خۆیی (دزەکۆشک) سەرچاوەی ئاوی قەڵا دەبەستن و ئیتر تراژیدی شکان و گرتن و قەڵاچۆ کردن ڕوو دەدا. بە داخەوە ئەم ئاوانە لەمێژوودا زۆر ڕژاون!

دمدم بەردی لەنزاری لێیاندا تۆپی هەوشاری
حەوت شەو و ڕۆژ ئاور باران خەبەر چوو لەبۆ هەوشاری
کێش (٤) بڕگە (توحفەی موزەفەرییە، ئوسکارمان ١٩٠٥)

سەرجەم بەیتەکانی تر وەک لاس و خەزاڵ، برایمۆک، لەشکری، خەج و سیامەند و... هەموو لەقەیرانی ڕووداودا زمان و کێشی شاعێرانەیان زیاتر بەرجەستە دەبێ و لەسەر کێشی ٣، ٤و ٥ بڕگە، یان تێکەڵاوێک لەو کێشانە پێکهاتوون.

نموونەکەیەکی دیکەی مەکتووب لە شیعری ئایینی کۆنی کوردی، پەیامی ئایینی ئێزەدیانە لە ناوچەی شەنگالی کوردستانی باشوور. لەکتێبی ئایینی خۆیاندا دەڵێ : «ئێزدی دینەکی کەڤن و دێرینە. پڕانیا ڤان ڕێ و ڕەسمێن نهۆ ئەم پێ ڕادبین دزفرنە بەری هەزارەها سالا کو ل جەم مللەتێن میسۆ پۆتامیا دهاتنە پەیرەو کرن».

(ئێزیدی دینێکی کۆن و دێرینە، هەموو ئەو ڕێ و ڕەسمانەی پەیرەو دەکرێن دەگەڕێنەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا کە لای گەلانی مێزوپۆتامیا پەیرەو کراون.)

پەیام و ڕاسپاردی ئەم ئایینە شیعری هێجایی کوردییە و پێی دەڵێن قەوڵی ئێزدی. نموونەیەک لە نوێژی ئێوارە کە ئێزیدی ڕووله خۆر ئاوا بوون دەکا:

ب ناڤێ ئێزدانێ پاک و دلۆڤان (٣و٥ بڕگە)

یاسواریێ ڕۆژ هەلاتیێ و ڕۆژ ئاڤایی (٤ بڕگە)
تۆ بدیە خاترا دۆتیێ ودایێ (٣و بڕگە ٥)
تۆمە خلاس کەی ژڤەدایێ ژبەلایێ ژغەلایێ (٥و٤ بڕگە)

نموونەیەک لەنوێژی بەیانی کە ئێزیدی ڕوو لە هاتنی ڕۆژ دەکا:
ژمێر و مەلەکا / ددەین مەدەها/و خاسێن ناڤا قوبەها / ڕووناهی دا بوو / بەری سبەها ( ٥و٣ بڕگە)
قەولی پاشا کە لای ئێزیدیان هەمان خودایە و بەمجۆرە پەسنی دەکا:
پەدشێ من/ ڕەبی ئادەمە/ ژباوی تێتن کەڕەمە/ ل هەموو وەختا ول هەموو دەمە/ (٤و٥بڕگە)
(ئایینی ئێزیدی: وەزارەتی پەروەردە. حکوومەتی هەرێمی کوردستان)

لە ئەدەبی کۆنی کوردیدا هەرچی بەرە و ناوچەکانی هەورامان و کرماشان و ئەردەڵان بێین کێشی ٥ بڕگەیی دیارتر و بۆ گوێی شاعیر و گۆرانیبێژ و خەڵک ئاشناترە. وەک: کەلامی یارسان. دیوانی شاعران و چیرۆکە شیعرییەکانی ئەم ناوچانە. وەک: «شانامەی کوردی، شەماڵ و زەلان، وەنەوشە و بەڕەزا، حەیدەر و سنەوبەر و...» کە هەموو لەسەر کێشی ١٠ بڕگەیین.
**خانای قوبادی:**

هەرچەن مەواچان فارسی شەکەرەن        کوردی جەلای من بەس شیرینتەرەن
نموونەیەک لە مەنزوومەی «وەنەوش و بەڕەزا»[1].
بابۆ خاویێ دیم بابۆ خاویێ دیم        ئەمشەو جە خەوما وەنەوش نامیێ دیم
چەند نموونەی دیکەی شیعری ٥ هێجایی کە لە ڕاستیدا درێژەدەری هەمان کێشی هەورامی کۆن و ئایینی یاری و شیعری گۆرانین. داستانی «حەیدەرو سنەوبەر»[2]. نموونە:
کاکۆڵ چەنی موشک ئاهوی قەتاران        زولفان عەمبەر بار نادرەی شاران
نموونەیەکی سنایی دەستخەتێکی کۆنە وهێشتا چاپ نەکراوە.نموونە:
ناز و نازفرۆش نازدار باوان        گیان پەرێو دیدار تۆ وەلەب یاوان

نموونەیەک شیعری "شێخ حسن"[3]:
عاری جەشادی شەریک دەردم        چون ڕەنگ لیمۆ جە هیجران زەردم

---

[1] ئەمە داستانێکی دڵداری شیعرییە. لەگوندێکی سەقز لەسەر شریتێکی کۆن تۆمار کرابوو نووسیومەتەوە بەڵام چاپ نەکراوە.
[2] دەستنووسێکی کۆنە و چاپ نەکراوە.
[3] کەشکۆڵی دەستنووس، چاپ نەکراوە.

مەولانا خالید نەقشبەندی (١١٩٣ - ١٢٤٦):

میرزا م وەفاتەن میرزام وەفاتەن    قەدەم ڕەنجەکەر وادەی وەفاتەن

یافەردی ئەعزەم یافەردی ئەعزەم    یاحەی یاقەییوم یافەردی ئەعزەم

شایانی باسە کە مەولانا خالید شیعرە فارسییەکانی لە سەر کێشی عەروزن.

بێسارانی لە ١٧٠٦- ١٦٥٠ زاینی:

جەو بەیانەوە جەو بەیانەوە    حاڵێ پێم یاوان جەوبەیانەوە

میرزا شەفیع لە ١٧٨٥- ١٨٣٥ زاینی:

فەلەک پەی خەمان من پەسەندکەردەن    سەرتاپای تەنم وەخەم پەروەردەن

مەولەوی لە ١٢٢٢- ١٣٠٠ کۆچی مانگی:

ئەمشەو دیارەن بانگم بێ شەرمەن    زایەڵەی سەمتوورکەللەم وەگەرمەن

ئەمشەو دیارەن دەردم کاریەن    هووناو جەزامم چون سەیل جارییەن

هێنانەوەی نموونەی دیکەی پێویست ناکا. چونکە کێشی ١٠ بڕگە هەموو شیعری شێوە زاری هەورامی و زۆری مەنزوومەکانی شاعێرانی شێوەزاری سۆرانی وەک قانع، بێکەس،گۆران و ... لە خۆ گرتووە.

گۆڤاری ئەکادیمی کۆڕی زانیاری کوردستان ژمارە ١ چاپی٢٠٠٢ هەولێر، نموونە شیعری چەند شاعیری بەناوی «شێخ شەهاب» هێناوە کە لە سەر زاری هەورامین. وەک «شێخ شەهاب سوورە بەردی» (شێخی ئیشراق)، «شێخ شەهابی شارەزووری» (٦٥٩- ٧٤٨) کە چوەتە هەورامان لای سوڵتان ئیسحاقی یارسان و لەوێ ماوەتەوە. «شێخ شەهاب لهۆنی» (١١١٢- ١١٨٥) .

نموونەیەکی کێشی عەرووزی (فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن) بە ناوی شێخ شەهاب:

فەسڵی وەسڵەن هەرکە ئەسڵەن    سەعی وکۆشش نۆشی مەی

عەیش و شەوقەن وەقتی زەوقەن    ماچ و مووچی هاوسەری....

ئەسفەهانی پەنجگاه و ئەرغەنوون و نای ونەی....

نموونەیەک ٤ بڕگەیی لە شیعری «سەیدی»دا کە بەدەگمەن لای شاعیرانی هەورامان و هاوچەرخەکانی خۆی بەدی دەکرێت.

کاتێت زانا گێرەم قارە    پێسەو موسای عەسام شارە

ژیوارەم کەرد زرێبارە    نیشات ئەربەی تۆم پەی نارە

سەیدی لە هەمان حاڵدا کە غەزەلەکانی لە سەر کێشی عەرووزن، لە سەر کێشی ١٠ بڕگەیی خۆماڵیش غەزەلی داناوە:

پێسەو مەجۆلەی ملونەکۆوە    وەلەیلێ لەیلێ وەس بێوەفایی

تۆهەرچەنی من وادێ مەدەی    نەگیرۆنە دەورم خەرقەی گەدایی

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

لەشیعری شاعیرانی هەورامیبێژدا خاڵێکی هاوبەشی تر هەیە، ئەویش ئەمەیە کە زۆربەیان وەک شێوازیکی دەست پێکردن نیوەی میسراعی یەکەمی شیعریان دووبارە کردۆتەوەوە:

سەنگی هەواران سەنگی هەواران　　　سەنگی سیاسەنگ کۆنە هەواران

سەیدی (١١٩٥_١٢٦٥) لە پاڵ کێشی خۆماڵی ٥ بڕگەدا کێشی عەرووزیشی بە کار هێناوە؛ بۆنموونە:

ئەز ئورۆمۆن مەکانم بێ وڵاتم　　　سەرو پیری خوای گێرەن خەڵاتم .

کێش: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل. بەکارهێنانی وشەی «ئورومون» پێم وابێ لەبەرکێشە عەرووزەکەیە. نموونەی تر:

دڵ بۆ جەگۆشم دارەنی　　　مەوزە سەرەت بێکارەنی

تۆ مەگنۆ پەی ئەریارەنی　　　باڤەس چەنیت بێزارەبە (سەیدی، ١٩٧١)

کێش: مستفعلن مستفعلن مستفعلن

خودی مەولەویش، بەپێچەوانەی کوردیەکانی ئەو دوو بەیتەی بۆ کەسێکی فارس بەفارسی نووسیوە کە لە سەر کێشی عەرووزە.

نهاده داغ بر دل همچو لاله　　کند جا اندرون نی چو ناله

چو از دل برکشند ناگه نوایی　　جدا بر خیزد از هرنی صدایی[1]

(مفاعیلن مفاعیلن فعولن)

بەم شیعرەی مەولەوی دێمە ناو ڕیتمی عەرووزی و سەردانێکی دیوانی هەندێ تر لە شاعێرانی گەورەی شیعری کلاسیکی کوردی دەکەم.

**بەشی دووەم عەرووز**

لە گەڵ هاتنی ئایینی ئیسلام بۆ کوردستان، هەندێ داب‌ونەریتی کۆمەلایەتی و فەرهەنگی تێکەڵ ژیانی سەردەم کران و بوونە بەشێک لە نەریت و ئەندێشەی کوردەواری. لەوانە شیعر و ئەدەبی کلاسیکمان لە باری فۆرم و زمان و ڕوانگەوە زیاتر ڕەنگی بێگانەیان لێنیشت.

لە شیعری کلاسیکدا ئەم دیاردە مێژووییە باشتر دەبینرێ. لە سەر هەموانەوە کێشی شیعری عەرەب بە وشە و جیهانبینی و فکری زاڵی عەرەبییەوە تا ئێستاش خۆی سەپاندووە کە لە ئەدەبی فارسیدا بەشێوازی عێراقی دەناسرێت. عەرەبان لە شیعردا زۆر دەوڵەمەند بوونە، ئەمەش ئەزموونێکی باش بووە بۆ شاعیرانی کوردکە لە هەموو کێشەکانی عەرووزیدا ئەوڕیتمانەی لەگەڵ زمان و وشە و سۆزی دەروونی‌دا گونجاوتر بوون، بە کاریان هێناون و شیعری خۆیان لە سەر داناون. لە بەراوردێکی سەر پێی کێشی عەرووز لە شیعری کلاسیکی کوردی و فارسیدا، ئەوەم بۆ دەرکەوتووە کە هەر دوو لا کۆمەڵێک ڕیتمی هاوبەشیان بەکار هێناوە.

[1] کەشکۆڵی دەستنووس کە چاپ نەکراوە.

هۆی سەرەکی ئەوە بووە کە ئەو ڕیتمانە زۆرتر لە گەڵ زمان و ژیان و هەستی دەروونی ئێرانیەکاندا هاودەنگ و هاوسۆز بوونە.

بە ڕای من هۆی بەکارهێنانی کێشی عەرووز بۆ شاعیری کورد:

**یەکەمیان** ئەمەیە کە شاعیرانی کلاسیک زۆربەیان مامۆستای ئایینی بوون و سەرچاوەی خوێندنیان ئایین و زمان و ئەدەبی عەرەبی بووە.

**دووهەم** شان بە شانی خوێندنی عەرەبی، لە گەڵ ئاسەواری شاعیرانی گەورەی فارس ئاشنا بوونە و دیوانی حافز و مەولەوی و گولستان و بوستانی سەعدی سەرچاوەیەکی گرنگی دەرس خوێندنیان بووە.

شاعیرانی کوردیش زۆربەی کێشەکانی عەرووزیان بەکار هێناوە، بەڵام من تەنیا یەک دوو بەیتم وەک نموونە هێناوە.

مەلای جزیری (١٤٠٧-١٤٨١ ز):

من دی سەحەر شاهی مەجەر لەبسی دبەر مەخموور بوو

ئەو دیم زەری سوور موشتەری یارەب پەری یا حوور بوو

لەسەر کێشی «مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن»

ئەم کێشە ڕیتمێکی درێژی پڕهەناسە و قووڵی هەیە. بەڕای من باشترین هاو سۆز و هاودەنگترین شەپۆلی مووزیکدارە بۆ دیاردەیەکی قووڵ و پڕسۆزی دەروونی، کە ڕەنگە بە چەند وشەی ساکار و ڕیتمی کورتی خۆماڵی، بەم تین وتەوژمەوە بەیان نەکرێ.

نموونەیەکی دیکەی "مەلای جزیری":

شۆخ و شەنگێ زوهرە ڕەنگێ، دل ژمن بر دل ژمن

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن).

ئەگەرچی ڕیتمی ئاماڵ درێژە و هەناسەی زۆرتری دەوێ، بەڵام هەندێ بزۆزتر و کرژترە و زۆرتر دەروون دەبزوێنێ. ئەم ڕیتمە پیشاندەری سۆزی جەزبەئاسای مرۆڤە کە بە قرچە و تاوێکی تایبەت بە دوای ون بووی خۆی و ئاواتەکانیدا دەگەڕێ.

نموونەیەکی دیکەی مەلای جزیری:

ئەتوار عەشق و مەستی ئەسرار بوتپەرەستی

تەقریر سەد ڕەوایەت ناکەت ژ بۆکەفایەت (سەجادی، ١٩٥٨)

(مستعفلن فعولن مستفعلن فعولن)

ئەم کێشە حاڵەتی بزاوتنی زۆرترە. ڕیتم و ئیقاعی خوێندنەوە جۆرێک زمانی دەروونییە لە جەزبە و سۆزی ڕۆح و لەش بۆ خۆشەویستی خوا و سروشت و کەمدەسەڵاتی مرۆڤ لە توانای پەسنی ئەو. لەم جورە ڕیتمەدا موسیقای نێو میسراعەکان جەزبە و بزاوتنی ڕۆحی و مەعنەوی خۆشتر و بە جۆشتر دەکات.

**شێخ ئەحمەدی خانی** (١٦٥٠- ١٧٠٦ ز):

حەماسەی دڵداری «مەم و زینی» کردۆتە شیعر لە سەر کێشی «مفعول مفاعلن فعولن» کە شاکارێکی کەم وێنەی خولقاندووە و بەزۆر زمانی جیهانی وەرگێڕدراوە.

ئەز مامە د حکمەتا خودێدا — کرمانج د دەولەتا دنێدا

ئایا بەچ وەجە مانە مەحرووم — بیلجوملە ژبۆ چە بوونە مەحکووم

ساقی تۆ ژ بۆ خودێ کەرەم کە — یەک جورعە مەی دجام جەم کە

شێخی خانی لەم شاکارەیدا بێگومان کاریگەری «فێردەوسی و نیزامی» لە سەر بووە. زمانی حەماسە و سۆزی دڵداری، لەسەر ئەم جۆرە کێشە باشتر بەر گوێ دەکەوێ و دەروون دەبزوێنێ.

**نالی، مەلا خدری شارەزووری** (١٨٥٥ - ١٧٩٧):

هەرچەندە کە ڕووتم بە خودا مایلی ڕووتم — بێبەرگییە عیللەت کە هەتیو مەیلی هەتاوە

(معفول مفاعیل مفاعیل فعولن)

ئەهلی تەعدادی مەحاسن نووسیان — خاڵ یەک زولفی دوان هەر دوو سیان

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

**مەحوی** (١٩٠٦ - ١٨٣٧):

دەبینم ئەهلی دڵ یا سەنگ سارە یا لەسەر دارە — دیاری عیشق ئەگەر ساخت دەوێ هەر دارە هەر بەردە

کێش: «مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن»

ڕیتمی وشە و جوانکارییە ئەدەبیەکان، پێش هەر شتێک لە دەسەڵاتی شاعیرانەی نالی و مەحویدا خۆ دەنوێنێ. کێشی عەرووز و هارمونی وشە لە دەستی «خەیاڵی نالی و محوی»دا لە مۆم نرمترە.

لەم کێشە عەرووزیانەدا کە هەندێک درێژ و هەناسەدارترن، مەیدانی چالاکی هونەری و زمان، بۆ شاعیران ئاوەڵاترە. هەموو ڕیتمەکانیان بەجۆرێ بەکارهێناون، تەواو لەگەڵ کەشی دەروونی و دەرەکی شیعرەکاندا گونجاو و هاوسۆزن. شاعیر نەدەستکورتی لە کێشدا بووە نە لە ناوەرۆک و واتا، نە لە زمان و هونەری شیعردا کەمی هێناوە.

ئەمە لە حاڵێکدایە کە ئەمڕۆش هەندێ خوێندەوارمان هەن لە دروست خوێندنەوەی شیعرێکی عەرووزی لاوازن، چ جای ئەوەی کە شیعری لەسەر دانێن.

لێرەدا بۆ درێژنەبوونەوەی بابەتەکە، تەنیا چەند نموونەیەکی عەرووزی لە دیوانی شاعیرانی کلاسیک دێنمەوە. ئیتر پێویست بە چەندوچۆنی کێشەکان ناکات؛ چونکە پێشتر باسم لە سەر کردوون.

**سالم** (١٨٦١و ١٨٠٠):

ساقی لەپەردە دەرهات جامی شەرابی هێنا — دڵ خیرەما لەحیرەت مەهـ ئافتابی هێنا

(مستفعلن فعولن مستفعلن فعولن) = (مفعول فاعلاتن مفعول فاعلاتن)

**حاجی قادر** (١٨٩٧ - ١٨١٦):

بەقسەی بێ سەروپا تاڵی مەکە لەززەتی خۆت — بێ موبالات مەسووتێنە چرای فکرەتی خۆت

(فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن)

جگەرخوێن (لە ساڵی ١٩٨٤کۆچی دوایی کردووە):

وەلاتێ من تویی بووکا جیهانی          هەمی باغ و بهەشت و مێرگ و کانی

دو لیڤێن تە کتێبا حاجی قادر          زمانێ تە ژبەندا شێخی خانی

(مفاعیلن  مفاعیلن فعولن)

**قانع:**

ئاخرین ماڵی ژیانم کونجی بەندی خانەیە          ئەم کەلەپچە مەرهەمی زامی دڵی دێوانەیە

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

**گۆران:**

تاوێ نەگەڕا  چەرخی موخالیف بەحیسابم          بێ ناڵە نییە یانیە یەک تاری ڕوبابم

(مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن)

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقاخرۆش ڕۆحی بێگانە   میزاجی کوردەواریم تێک چووە دەروێش عەبدوڵڵا

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

**هێمن:**

ساقیا وا وەرگەڕێ وا وەرگەڕێ          ڕووڵە لای من کە، مەچۆ بۆ سەر پەڕێ

(فاعلاتن  فاعلاتن فاعلن)

**هەژار:**

نەماخانی هەتا چیرۆکی عەشقی ئێمە داڕێژێ          دەنا هێشتا لەکوردستان دەژین زین و مەمێکیتر

(مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن)

لە جیهانی زمان و وشیعر و ئەندێشەی کلاسیکەوە، هەر چی بەرە و زەمانی ئێستا نزیکتر دەبینەوە، کێش و قاڵب و زمان ئیتر ئەو زمان و جیهانە سیحراوی و هونەریەی "مەلای جزیری" و "نالی" و "مەحوی" نییە، بەڵکوو زۆرتر نیشاندانی ڕاستەوخۆی ئەندیشە و فکرێکی کۆمەڵایەتی و نەتەوەییە کە لە سەدەی بیستەوە کوردستانی داگرتووە. جگە لەمە تا دێت زمانی کوردی ڕوو لە پاڵاوتن دەکا و لەوشە و فکری عەرەبی و فارسی و هونەری شاعیرانەی پێشوو  دەتەکێتەوە. ئەمە سەرەتایەکە بۆ ئەوەی شیعر جیهانبینی و ناوەرۆکی تازە وەربگرێ و لەو کێش و فۆرمە سوننەتیانە دەر باز بێ و لە باری زمان و ناوەرۆکیشەوە کاژ فڕێ بدا.

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا تیشکی ئازادی بزووتنەوەی فکری، فەلسەفی و فەرهەنگی ئورووپا وردەوردە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستانی گرتەوە. ئەم ڕووناکییە زۆرتر لە ئەدەبیاتدا خۆی پیشاندا.

**بەشی پێنجەم- ڕەخنە**

«شێخ نووری شێخ سالح» و گۆران بەهۆی ئاشنایی لەگەڵ وەرگێڕانی ئەدەبی تورکی و ئورووپایی ئەو سەردەمە، لەکێش و قاڵب و فکری باوی شیعری سوننەتیدا ئاڵوگۆڕێکی سەردەمیانەیان پێکهێنا. واتە لە کێش و ناوەرۆکی کلاسیکەوە گەڕانەوە سەر کێشی خۆماڵی زمان و فکری نیشتمانی و ئازادی.

لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا، هەماندەم بە هەناسەی شیعری نیما و وەرگێڕانی شیعری ئورووپایی بۆ فارسی، شیعری کوردی گیانێکی تازەی لەزمان و ناوەرۆکدا وەبەر هاتەوە، بەڵام هێشتا تابۆی شیعری سوننەتی و کێشی عەرووزی بە تەواوی فەرامۆش نەکرابوو. "سوارە"، "عەلی حەسەنیانی"، "هەڵۆ" و "چاوە" وەک شێوازی باوی موکریان لەقاڵبی عەرووزی تەواو دەرباز نەببوون. هێشتا دواتریش دەبینین ئەستوونی گەورەی قەڵای شیعری موکریانی لەسەر کێشی عەرووزە. وەک شیعری حەقیقی، هێمن، نووری، ئاسۆ، ئەمین گەردیگلانی و... . بەڵام شکاندنی میسراع لای سوارە و هەڵۆ زیاتر بەرچاو دەکەوێ. نموونەیەکی سوارە:

گوڵم دڵم پڕە لەدەر و کوڵ، دەڵێم بڕۆم لە شارەکەت .

(مفاعلن مفاعلن مفاعلن)

وەک پێشوو میزانەکان بەرانبەر و یەک ئەندازە نین هەرچەند عەرووزین، بەڵام زمانێکی پاراو پەیام و جیهانبینییەکی مودێڕنی تێدایە.

**بەشی سێیەم وکۆتایی.**

بە دوای نوێبوونەوەکەی شێخ نووری و گۆران لە فۆرم و زمان و ناوەرۆکدا شیعر لە کوردستانی باشوور ڕێبازێکی تازەتری دۆزیەوە و دواتریش بەسەر چەند قۆناخدا تێپەڕ بوون. ئێستاش دەیەوێ نەک تەنیا لەگەڵ خواست و ژیانی مرۆڤی سەردەم، بەڵکوو لەگەڵ ڕیتم و هەناسەی بەردەنگی خۆی بژی و چوار چێوەکانی تێپەڕ بکات.

لەرۆژهەڵات ئەو دەنگانەی دواتر هاتنە ئاراوە لەسەر شێوەی سوارە نەبوون؛ زیاتر دەنگدانەوەی شیعری باشووری کوردستان بوون بەهۆی بارودۆخی تایبەت و هاوبەشی کوردستانەوە. چەند نموونەیەکی هەردوولا:

**گۆران:**

پاییز پاییز / بووکی پرچ زەرد / من مات تۆ زیز /هەردوو هاودەرد (کێش: ٤ بڕگەیی)

**شێرکۆ بێکەس:** (دەربەندی پەپوولە)

دڵۆپ دڵۆپ باران گوڵ ئەنووسێتەوە / نم نمەیش چاوانم تۆ (کێش:٤ بڕگەیی).

کەهاتم / مۆمێکم/ لەقوللەی/ حەزرەتی/ نالیدا/ بۆهەڵکەن (٣بڕگەیی)

**عەبدوڵلا پەشێو:**

سەدان ساڵە/ کتکە کۆرەی گۆشەی متبەخی سوڵتانم/ سەدان ساڵە | لەبەر دەرکەی دزانی خۆم پاسەوانم (٤ بڕگەیی).

**فەرەیدوون عەبدولبەرزنجی:** هەتا بدوێی لەناوگوێما/ دەنگت زیاتر بەجۆش ئەبێ (٤بڕگەیی)

**کەژاڵ ئەحمەد**: ڕەشەبا وتی کلێشەی ئەم دنیایەم بەدڵ نییە/چیدی وێنەی کافرۆشیم پێوە مەکەن (٤ بڕگەیی)

**جەلال مەلەکشا**:

چاوەچاو مەکە/ ئاسۆی ژین تەمە/ بەبەفرێکی خەست (٥ بڕگەیی)

دواین نامەم /پەڵەهەورێکی دڵ تەنگە/بەئاخی دڵ ئاخنراوە (٤ بڕگەیی)

**مارف ئاغایی**: خاک توانای/کۆچی نییە/ ئەمەیە ڕازی مانەوەم لەم وڵاتە (٤ بڕگەیی)

بۆ پیشاندانی جۆرەکانی کێشی شیعری ئەمڕۆ ئەم چەند نموونەیەم وەک ڕوخسارێ لە شیعری کوردی هێنا. چونکەلە زاراوەی سۆرانیدا هەموو شاعیرانی نوێکاری ڕوانگە و کفری، بەرەکانی دوای ئەوانیش هەمان کێشی ٣و٤و٥ بڕگەییان بە کار هێناوە کە ئاشناترین و گونجاوترین کێشی هێجایی کوردین. ئەمڕۆ هەندێ لە لاوان و شاعیرانی تازەکار لە ژێر سێبەری وەرگێڕان و شیعری فارسی بۆ ئەوەی تازەگەرییان کردبێ، پێکهاتەی زمان و کێشی سروشتی دەشکێنن. هەندێ تر لەسەر ئەو بڕوایەن کە شیعر دەبێ وەک زمانی ئاسایی خەڵک بدوێ و خۆ لە هیچ چوار چێوەیەک قەتیس نەکات.

## ئەنجام

پاش چەند ساڵان خوێندنەوە و کاری شیعر بەم ئاکامە گەیشتوم و دەتوانم بڵێم: هەر شاعێرێک ئەمڕۆ باوەڕی بەکێش نەماوە و وشەکانی لەهەر چوار چێوەیەک ڕەها و دەرباز دەکا، دیسان ناکرێ لە کێشی وشە و ڕیتمی سروشتی زمان دەرباز بێ. بمانەوێ و نەمانەوێ لێکدانی تاکواژ و واژە و خودی ڕەستە لە کوردیدا جۆرێک ئیقاعی موسیقایی و کێشی سروشتی خۆی تێدایە.

خاڵێکی گرینگیتر لەمبارەوە ئەمەیە کە تا ئەمڕۆ هەرچەشنە دەرباز بوون و لادان لەو ڕیتمانە، کێشێکی تازەتر یان شێوازێکی ڕیتمیکی جیا لە کێشە بڕگەییەکان، بە دوای خۆیدا نەهێناوە. چونکە لەزمانی کوردیدا لێکدانی تاکواژە و و ڕستەبەندی بەشێوەیەک سروشتی کێش و ڕیتمی ئاسایی خۆی هەیە و هەموو ئەو کێشانە ٣- ٤- ٥ تا دەبنە ٧- ٨- ١٠ بڕگە و لە بەیت و فلکلور و شیعری کۆندا نموونەکانی زۆرن؛ ئێستاش لە خودی وشەکانی زماندا هەن و خۆمان ئاسایی بە کاریان دێنین. با چەند نموونەیەک لەو شیعرانە بێنمەوە کە شاعیر یان خوێنەر پێیان وایە سەر کێشی باو نیە و بە شیعری سپی و ئازادی دەزانن.

ئێرە سنەیە /دەنگی کاغەزینی من/ تووشی تەقینەوە بووم /شتێک وەکوو/هەڵوەشاندنی چارەنووس (کولسوم عوسمانپور)

بەڕواڵەت کێشی وەک شێوەی باو تێدا نیەو تەنیا ئیقاعی موسیقاییە، بەڵام هەموو ڕستەکان لە تەرکیبی ٥و٤و٣ بڕگە پێک هاتوون.

سینگی پڕتاسە/ بەکۆڵ شنرۆییەوە/ بەسەر ئەچوو بۆ سەردان (بهزاد ڕەحیمی)

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

لەسەر کێشی ٥و٤و٣ بڕگەیی.

دەست لەبەرۆکی وەرزی جادە بەر نادەم /تا لەگەڵم نەباری (دڵنیا ئەحمەد پور)

لەسەر کێشی ٥و٤و٣ بڕگەیی.

بێگومان ئەو ڕیتمانە هەڵقوڵاوی خودی زمانەکەیەو پێش لەوەی بە کێشی شیعری نوێ یان داهێنانی کەسێک بناسرێ، لە فولکلور و ئەدەبی کۆندا بەکار هێنراون.

نموونەی پەندی پێشنان :

براman برایی کیسەمان جیایی/ ٣ بڕگە.

شەڕ لە شێف و ئاشتی لە خەرمان /٣و٥ بڕگە

کراس بەرم هاڕەی دێ سک لە برسان قاڕەی دێ/ ٤و٣یان ٧ بڕگە.

مەم و زین:

ڕۆژم لێ هەڵات گەییە ئێوارێ /٥و٤و٣

ڕوومەتی‌یایەزینێ/ گەلێک زەریفترن لە دەنکی دەهەنارێ /٣و٤بڕگە

لاس و خەزاڵ :

خەزاڵ دەڵێ: ئەو چاوانەم بۆ تۆ پەروەردەکردوون دەڵێ ئەستێرەی گەلاوێژە

لەهەوشار و لە عەجەمان هەر عاشقێکی بیبینێ گوناهی نامێنێ تا ڕۆژی ئاخرزەمانێ/ /٤و٥و٣بڕگە

ئەو کوڵمانەم بۆتۆ پەروەردە کردوون دەڵێیێ فانۆسە لە دیواری سوڵتانی ئەستەمبووڵێ/ ٣و٥ بڕگە.

جیاواز لە شیعر و بەیتی فولکلور لە زمانی ئاساییدا زۆری وشە و ڕەستەکان بەئاقاری سروشتی زمان لەسەر کێشی ٣و٤و٥ بڕگەیی پێکهاتوون، (ئازیزم، خۆشەویستم، هێزی هەناوم) تەنیا ئەم جیاوازییە هەیە کە لە شیعرەکاندا هەندێ لە وشەکان جێگۆڕکێیان پێدەکرێ تا وەک ڕەستەبەندی ئاسایی نەکەن.

وەک دەردەکەوێ ئەم جورە ڕیتمانە نە کێشی تایبەتی شاعیرێک و نە باڵاپۆشی کاڵای شیعرێکن، بەڵکوو سروشت و زاتی زمان، خۆی ئەو ڕیتمانەی پێکهێناوە. بە واتایەکی تر پێکهاتەی تەکواژ و وشەی زمان، زادەی جۆری ژیان و جوگرافیا و هەڵسوکەوتی ژیان و بزاوتنی تاری گەرووی مرۆڤی کوردە.

لێرەدا دیمە کۆتایی باسەکە و هیوادارم درگای پەیڤینێکی تازەم کردبێتەوە.

منیش لەسەر ڕیتمی ئاسایی زمانەکەتان دەڵێم بەڕێزان زۆرسپاس بۆ ئێوە.

**سەر چاوەکان:**


١- معین، **فرهنگ معین**

٢- همایونفرخ، رکن الدین، **هشت هزار سال شعر ایرانی**.

٣- نیوهام، پال (١٣٨٢) **آوا درمانی**، ترجمه آذر عمرانی.

٤- دیوانی پیرشالیار.

٥- سجادی، علا لدین (١٩٧١) مێژووی ئەدەبی کوردی .

٦- ئوسکارمان (١٩٠٥) **توحفەی موزەفەرییە.**

٧- **ئایینی ئێزیدی.** وەزارەتی پەروەردەی هەرێمی کوردستان.

٨- **سەیدی** (١٩٧١) دیوان، سلیمانی.

٩- **گۆڤاری ئاکادیمی کۆڕی زانیاری کوردستان** ژمارە (١) چاپ ٢٠٠٢) هەولێر.

١٠-گۆڤاری رۆژ ژمارە ٤و٥ بەشی ئەدەبی مامۆستایان.سنە ١٣٨٨ .

١١- صفی‌زادە، صدیق (١٣٧٠) **مێژووی ئەدەبی کوردی** .

١٢- دیوانی گۆران .

١٣- دیوانی حاجی قادری کۆیی .

١٤- دیوانی نالی .

١٥- دیوانی مەحوی .

١٦- محمّدی خاڵ (٢٠٠٠) **پەندی پێشینان**، هەولێر.

١٧- دیوانی قانع.

١٨- حەیدەر و سنەو بەر: دەستنووس.

١٩- دووکەشکۆڵ لەشیعری شاعیران: دەستنووس.

٢٠- کۆمەڵێک شیعری چاپکراوی شاعیران.

# عەرووز وەکوو پێوەرێک بۆ ساخ کردنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی

(شیعری نالی بۆ نموونە)

د. یادگار ڕەسووڵ باڵەکەیی

**کورتە:**

ئەم توێژینەوەیە، توێژینەوەیەکی ڕەخنەیی و پراکتیکیە و کارکردنە لەسەر کێشی شیعری نالی و هاوکات ساخ کردنەوەی شیعرەکانیەتی لە ڕوانگەیەکی عەرووزیەوە. سنووری کارکردنمان تەنها لەچوارچێوەی ئەو دیوانە چاپکراوانەی نالییە کە لە کۆنەوە تا ئێستا بڵاوبوونەتەوە. دیارە بەپێی زانیاریمان تا دەسپێکی ئەم کارە تەنها پێنج دیوانی چاپکراوی نالی لە ئارادا هەبوون کە بریتین لە هەریەک لە چاپەکانی «کوردی و مەریوانی -١٩٣١، عەلی موقبیل-١٩٤٨، گیوی موکریانی-چاپی دووەم-١٩٧٤، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس-١٩٧٦، دکتۆر مارف خەزنەدار-١٩٧٧». ئەم توێژینەوەیە لە پێشباسێک و دوو بەش و ئەنجام و پێشنیازەکان پێکهاتووە. لە پێشباسەکەدا، ئەو وشەو زاراوانە پێناسە کراون و شیکراونەتەوە کە لە دوو تۆی ئەم توێژینەوەیە ناویان هاتووە. بەشی یەکەمی توێژینەوەکە تایبەتە بەدەستنیشانکردنی هەموو ئەو کێش و قاڵبە کێشانەی کە نالی لە شیعرەکانیدا بەکاری هێناوە؛ هەروەها لەچەند خشتەیەکدا ڕادەی بەکارهاتنی ئەو کێش و قاڵبە کێشانە بەپێی هەریەک لە دیوانە چاپکراوەکان دەرخراوە. بەشی دووەمی توێژینەوەکە تەرخانکراوە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو لەنگیە عەرووزیانەی کە لە چاپەکانی دیوانی نالیدا هەن و بەپێوەری عەرووز چارە کراون. لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەشدا کۆمەڵێک ئەنجام خراونەتە ڕوو و هەروەها چەند پێشنیازێک کراوە، کە دەشێت لە داهاتوودا کاری لەسەر بکرێت.

**وشە سەرەکییەکان:** نالی، شیعری عەرووزی، قاڵب، کێش.

**پێشەکی:**

سنووری کارکردنمان تەنها لەچوارچێوەی ئەو دیوانە چاپکراوانەی نالیدایە کە لە کۆنەوە تا ئێستا بڵاوبوونەتەوەو بریتین لە هەریەک لە چاپەکانی «کوردی و مەریوانی-١٩٣١، عەلی موقبیل-١٩٤٨، گیوی موکریانی-چاپی دووەم-١٩٧٤، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس-١٩٧٦، دکتۆر مارف خەزنەدار-١٩٧٧». هەروەها سەبارەت بە چاپی گیوی موکریانی دوو چاپیان لەبەردەستدا هەن، هەرچەندە جیاوازیەکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نییە، بەڵام ئێمە چاپی دووەممان هەڵبژاردووە، بەو پێیەی کە نوێترە و ڕێنووسەکەی لەسەردەمی ئێستاوە نزیکترە.

شیعری کلاسیکی کە زۆربەی زۆری لەسەر کێشی عەرووزی هۆنراوەتەوە، زۆر جار ساخ کردنەوەیان لەسەر بنەمایەکی عەرووزی نەبووە و دواجار کۆمەڵێک دیوان ساخ کراونەتەوە کە لەنگیان تێکەوتووە و پێویستییان بە جارێکی تر ساخ کردنەوەیە بۆ ئەوەی بە ڕاسترین شێوە بخرێنە بەر دیدی خوێنەر. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە ئەم بابەتە هەڵبژێرین و جارێکی تر بەشیعری نالی بە پێی دیوانە چاپکراوەکاندا بچینەوە و بەپێی توانا لەنگیەکانی دەستنیشان و چارەسەر بکەین. هەڵبژاردنی نالیش بۆ ئەم مەبەستە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەلایەک کۆمەڵێک دیوانی چاپکراوی لەبەردەستدان، لە لایەکی تر شاعیرێکی بەرز و گەورەو و پێشەنگی شاعیرانی سەدەی نۆزدەمە و چەندین کێش و قاڵبی جیاجیای عەرووزی لە شیعرەکانیدا بەکارهێناوە.

ئەم توێژینەوەیە لە پێشباسێک و دوو بەش و ئەنجام و پێشنیازەکان پێکهاتووە:

لە پێشباسەکەدا -کە زیاتر دەروازەیەکی تیۆرییە- زۆر بەکورتی باس لە زانستی عەرووز و گرنگی عەرووز کراوە و دواتر هەموو ئەو وشەو زاراوانە پێناسەکراون و شی کراونەتەوە، کە لە دووتوێی ئەم توێژینەوەیەدا ناویان هاتووەو بەرچاو دەکەون.

بەشی یەکەمی توێژینەوەکە تایبەتە بەدەستنیشانکردنی هەموو ئەو کێش و قاڵبە کێشانەی کە نالی لە شیعرەکانیدا بەکاری هێناون. جێی وتنە کە ڕیزبەندەکە تەنها بۆ شیعرە کوردیەکانە و شیعرە فارسیەکانی فەرامۆش کراون. لە کۆتایی ئەم بەشەدا پێنج خشتە هەن و هەر خشتەیەک تایبەتە بە چاپێکی دیوانی نالی و تیایاندا سەرژمێریەک بۆ کێش و قاڵبە کێشانەکانی شیعری نالی، لەسەر ئاستی ژمارەی شیعرەکان و ژمارەی دێڕەکان کراوەو هەروەها ڕێژەی سەدیان لەسەر هەر دوو ئاستەکە دیاریکراوە.

بەشی دووەمی توێژینەوەکە تایبەتە بە دەستنیشانکردنی ئەو لەنگیە عەرووزیانەی کە لە چاپەکانی دیوانی نالیدا هەستیان پێدەکرێت و لەهەریەک لە ئاستەکانی دەنگ و بڕگە و وشە و دەستەواژە و لەتە شیعر و خاڵبەندیدا، ئاماژە بۆ لەنگیەکان کراوە و بە بەڵگەی عەرووزی چارەسەر کراون و لە کۆتایشدا چەند خشتەیەک دروستکراوە و تێیدا ژمارە و ڕێژەی لەنگیەکان لە هەریەک لە ئاستەکاندا و لەهەموو دیوانە چاپکراوەکان دەرخراوە.

لە کۆتایی ئەم توێژینەوەیەشدا کۆمەڵێک ئەنجام خراونەتە ڕوو و هەروەها چەند پێشنیازێک کراوە کە دەشێت لە داهاتوودا کاری لەسەر بکرێت.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

## کورتکراوەکان:

ل = لەتە شیعر (نیوەدێر)

د = دێرە شیعر

ش = شیعر

چ= چاپ

١- خەزنەدار، مارف (١٩٧٧) **دیوانی نالی و فەرهەنگی نالی**، بەغدا، چاپخانەی دار الحریە.

٢- مودەڕیس، مەلا عەبدولکەریم و فاتح عەبدولکەریم (١٩٧٦) **دیوانی نالی**، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد.

٣- موکریانی، گیو (١٩٧٤) **دیوانی نالی**، هەولێر، چاپخانەی کوردستان، چاپی دووهەمین.

٤- سنندجی، عەلی موقبیل (١٣٢٧) **دیوانی نالی**، چاپخانە بهرامی.

٥- کوردی و مەریوانی (١٩٣١) **دیوانی نالی**، بەغداد، چاپخانەی دارالسلام.

**هێماکان**

ب = بڕگەی کورت

- = بڕگەی درێژ

← = دەبێتە

## پێشباس:

لە کۆنەوە کە باس لە شیعر کراوە، پێناسەی جۆراوجۆری بۆ کراوە، یەکێ لەو پێناسانەی کە بەشێکی دیار لە لێکۆڵەران و ڕەخنەگرانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامی و عەرەبی لەسەری ڕێککەوتوون ئەوەیە کە «شیعر بریتیە لەو قسە واتادارانەی کە پابەندن بە کێش و سەروا». بە پێی ئەم پێناسەیە هەریەک لە «قسە، واتا، کێش، سەروا» بنەمای سەرەکی شیعرن و بە نەبوون و لاوازی یەکێک لەمانە لە ناو دەقێکی شیعریدا، شیعرەکە وەک دەقێکی بەرز نامێنێتەوە و لاوازتر دەبێت.

دیارە هەریەک لە کێش و سەروا پێکهێنەری دێوی دەرەوەی شیعرن و کێش لە شیعری هەموو زمانێکدا هەیە، هەریەکە بە پێی تایبەتمەندی خۆی؛ بەڵام سەروا مەرجی بنەڕەتی نییە بۆ شیعری هەموو نەتەوە کۆن و نوێکان.

کێش – کە زاراوەیەکی فەرهەنگیە لە زمانی کوردیداو بەرامبەر وەزنی عەرەبی و metreی لاتینی بەکارهاتووە- بەشێکی جیانەکراوەیە لە شیعر. تەنانەت لە شیعری نوێ و هاوچەرخیشدا کێش بوونی هەیە، بەڵام بە تایبەتییەکی جیاوازتر لە کێشی شیعری کۆن. کاتێک لەدەقێکدا کێش نەبوو، ئەوە زیاتر دەبێتە دەقێکی پەخشانی؛ هەروەک زۆر لە زاناو ڕەخنەگرانی جیهانی ئیسلامی پێیان وایە کە «کێش ئەدگاری

سەرەکی جیاکردنەوەی شیعر و پەخشانە». بەو واتایەی کە دەشێت ئەو بنەما و ڕەگەزانـەی کـە لـە دەقێکـی شیعریدا هەن لە دەقێکی پەخشانیشدا هەبن، تەنها کێش نەبێت، کە بۆ شیعر مەرجێکی سەرەکییە و بەڵام لـە دەقە پەخشانیەکاندا مەرج نییە هەبێت.

ئەگەر سەرنج بدەین، گەلانی دنیا کێشی شیعری جۆراوجۆریان بەکارهێناوە و لەم بارەیەوە چەنـد پۆلینێـک هەن. هەندێ لەو پۆلینانە بنەمای گشتی کێشی هەموو جیهان بۆ چوار جـۆر دەستنیشـان دەکـەن: «کێشـی چەندی» (quantitative)، «کێشی نەبری (هێـزدار) یـان چۆنیـەتی» (qualitative)، «کێشـی پـەیژەیی» (pitch)، «کێشی ژمارەیی» (numeratical). پۆلینێکی تر بەمشێوەیە کێشەکان دابەش دەکات:

١- کێشە سادەکان: مەبەست کێشی ژمارەیی و کێشە بڕگەییەکانە.

٢- کێشە لێکدراوەکان: کەبەسەر سێ جـۆردا دابـەش دەبێـت کـە بـریتین لـە کێشـی ئـاوازەیی، کێشـی دینامی-چۆنی، کێشی کاتی-چەندی.

ئێمە لەم باسەدا مەبەستمان نییە بە شێوەیەکی تیۆری باس لە بنەماکانی کێشی جیهانی و کێشـی شـیعری کوردی و لە ناویدا کێشی عـەرووزی بکـەین، چونکـە لـەو بارەیـەوە چەنـد سـەرچاوەیەکی کوردیمـان لەبـەر دەستدایە کە بە وردی لەم لایەنەیان کۆڵیوەتەوە و لـە بەشـی سـەرچاوەکاندا ئاماژەمـان پێکـردووە. بەڵـکوو مەبەستمانە بڵێین کە کێشی شیعری کلاسیکی کوردی کێشێکی عەرووزیە و بەپێی پۆلینـەکان دەچێتـە نـاو خانەی کێشە چەندییەکان و مەبەستی هەرە سەرەکیشمان پێناسـەکـردن و شـیکردنەوە و لێکدانـەوەی ئـەو وشەو زاراوە عەرووزیانەیە کە لە دووتوێی ئەم توێژینەوەیەدا هاتوون.

## بەشی پێنجم- رەخنە

**بەشی یەکەم:**

کێشی شیعری نالی:

**١-هەزەج:**

ا- هەزەجی هەشتیی تەواو

| مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلُنْ |
|---|---|---|---|
| ٮ- - - | ٮ- - - | ٮ- - - | ٮ- - - |
| تەبەسسوم دەر | دەخا حوققەی | دەمی جەوهەر | لەنێو ئەودا |
| بەڵێ میسقا | ڵە زەڕڕە زا | هیرە جیلوەی | لە پڕتەودا |
| ٮ- - - | ٮ- ٮ - | ٮ- - - | ٮ- - - |
| مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيلنْ | مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلُنْ |

ب-هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور

| مَفْعُوْلُ | مَفَاْعِيْلُ | مَفَاْعِيْلُ | مَفَاْعِيْلْ |
|---|---|---|---|
| - - ٮ | ٮ- - ٮ | ٮ- - ٮ | ٮ- -٠ |
| ماتم وە | کو زوڵفەینی | سیەهـ گرتی | سەراپات |
| پۆشی لە | ڕوخت تەعبی | یەیی بەیدە | قی شامات |
| - - ٮ | ٮ- - ٮ | ٮ- - ٮ | ٮ- -٠ |
| مَفْعُوْلُ | مَفَاْعِيْلُ | مَفَاْعِيْلُ | مَفَاْعِيْلْ |

ج-هەزەجی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف

| مَفْعُوْلُ | مَفَاْعِيْلُ | مَفَاْعِيْلُ | فَعُوْلُنْ |
|---|---|---|---|
| - - ٮ | ٮ- - ٮ | ٮ- - ٮ | ٮ- - |
| تاتاییی | سەری توڕڕە | یی پڕ پێچ | شی بادا |
| هەر تایە | کی بارێکی | گوڵ و نافە | بەبادا |
| - - ٮ | ٮ- - ٮ | ٮ- - ٮ | ٮ- - |
| مَفْعُوْلُ | مَفَاْعِيْلُ | مَفَاْعِيْلُ | فَعُوْلُنْ |

د-هەزەجی هەشتیی ئەخرەب

| مَفْعُوْلُ | مَفَاْعِيْلُنْ | مَفْعُوْلُ | مَفَاْعِيْلُنْ |
|---|---|---|---|
| - - ◡ | - - -◡ | - - ◡ | - - -◡ |
| عیشقت كه | مەجازی بێ | خاهیش مه | كه ئیللا كچ |
| شیرین ك | چ و لەیلا كچ | سەلما ك | چ و عەزرا كچ |
| - - ◡ | - - -◡ | - - ◡ | - - -◡ |
| مَفْعُوْلُ | مَفَاْعِيْلُنْ | مَفْعُوْلُ | مَفَاْعِيْلُنْ |

ه-هەزەجی شەشیی مەقسوور

| مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلْ |
|---|---|---|
| - - -◡ | - - -◡ | ٠- -◡ |
| مەكە ئیخلا | فی ئەو وەعدەی | كە فەرمووت |
| دەخیلت بم | كە خانەی سەب | رەكەم سووت |
| - - -◡ | - - -◡ | ٠- -◡ |
| مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلْ |

و-هەزەجی شەشیی مەحزووف

| مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلُنْ | فَعُوْلُنْ |
|---|---|---|
| - - -◡ | - - -◡ | - -◡ |
| جەنانی وەك | جینان كردم | بە مەئوا |
| حەبیبەی ما | لّیاوا ما | لّی ئاوا |
| - - -◡ | - - -◡ | - -◡ |
| مَفَاْعِيْلُنْ | مَفَاْعِيْلُنْ | فَعُوْلُنْ |

**۲-ڕەمەل**

ا-ڕەمەلی هەشتیی مەقسوور

| فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلانْ |
|---|---|---|---|
| - -◡ - | - -◡ - | - -◡ - | ٠-◡ - |

**بەشی پێنجەم- رەخنە**

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئیلتیقای پۆ | لاوو ئاسن | هەر نیزاعەو | گیرودار |
| جەمعی ماءو | نارو زەندو | زەندەوو مەر | خ وعەفار |
| ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ ٠ |
| فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلانْ |

ب -ڕەمەلی هەشتیی مەحزووف

| | | | |
|---|---|---|---|
| فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلُنْ |
| ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ |
| تەبعی شەککەر | باری من کور | دی ئەگەر ئین | شا دەکا |
| ئیمتیحانی | خۆیە مەقسوو | دی لە عەمدا | وا دەکا |
| ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ ـ | ـ ٮ ـ |
| فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلُنْ |

ج -ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەقسوور

| | | | |
|---|---|---|---|
| فَعِلاتُنْ | فَعِلاتُ | فَعِلاتُنْ | فَعِلانْ |
| ٮ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ ٮ | ٮ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ ٠ |
| لەکن ئەو جەو | هەرە فەردە | لە هەیوولا | نییە باس |
| لە حیکەم پەر | وەریی بووعە | لی سینا نی | یە باس |
| ٮ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ ٠ |
| فَعِلاتُنْ | فَعِلاتُنْ | فَعِلاتُنْ | فَعِلانْ |

د -ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی مەحزووف

| | | | |
|---|---|---|---|
| فَاْعِلاتُنْ | فَعِلاتُ | فَعِلاتُنْ | فَعِلُنْ |
| ـ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ ٮ | ٮ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ |
| لایقی مەخ | زەنی تەبعە | هەمو کەنزی | غەزەڵم |
| قابیلی زەر | بی ڕەواجە | زەڕو زیوی | مەسەلم |
| ـ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ ٮ | ٮ ٮ ـ ـ | ٮ ٮ ـ |

| فَاْعِلاتُنْ | فَعِلاتُ | فَعِلاتُنْ | فَعِلُنْ |
|---|---|---|---|

ه -ڕەمەلی هەشتیی مەخبوونی ئەسلەم

| فَاْعِلاتُنْ | فَعِلاتُنْ | فَعِلاتُنْ | فَعْ لُنْ |
|---|---|---|---|
| - ٮ - - | ٮ ٮ - - | ٮ ٮ - - | - - |
| جۆشش و تا | وە لە نێو دی | دەیی گریا | نمدا |
| چ تەنووریٚ | کە لە تەندوو | ڕەیی تۆفا | نمدا |
| ٮ ٮ - - | ٮ ٮ - - | ٮ ٮ - - | - - |
| فَعِلاتُنْ | فَعِلاتُنْ | فَعِلاتُنْ | فَعْ لُنْ |

و -ڕەمەلی هەشتیی مەشکوول

| فَعِلاتُ | فَاْعِلاتُنْ | فَعِلاتُ | فَاْعِلاتُنْ |
|---|---|---|---|
| ٮ ٮ - ٮ | - ٮ - - | ٮ ٮ - ٮ | - ٮ - - |
| بەریقەلبە | سەڕ لەبەر بەڕ | قی تەلەئلو | ئی لەئالی |
| خەسەفەلقە | مەر لە ئیشرا | قی قیامە | تی جەمالی |
| ٮ ٮ - ٮ | - ٮ - - | ٮ ٮ - ٮ | - ٮ - - |
| فَعِلاتُ | فَاْعِلاتُنْ | فَعِلاتُ | فَاْعِلاتُنْ |

ز -ڕەمەلی شەشیی مەقسوور

| فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلانْ |
|---|---|---|
| - ٮ - - | - ٮ - - | - ٮ -٠ |
| گەر دەپرسی | من لەبەرچی | کەم دەخۆم |
| من بە برسی | قەت مەزانە | غەم دەخۆم |
| - ٮ - - | - ٮ - ٮ | - ٮ -٠ |
| فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُ | فَاْعِلانْ |

ح -ڕەمەلی شەشیی مەحزووف

| فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلُنْ |
|---|---|---|
| - ٮ - - | - ٮ - - | - ٮ - |
| خاوو بیٚ خا | وی دو زوڵفی | خاوم ئەز |

**بەشی پێنجەم- رەخنە**

| چاوە چاوی | یەک غەزاڵەی | چاوم ئەز |
|---|---|---|
| - ◡ - - | - ◡ - - | - ◡ - |
| فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلاتُنْ | فَاْعِلُنْ |

گ -ڕەمەلی شەشیی مەخبوونی مەحزووف

| فَاْعِلاتُنْ | فَعِلاتُنْ | فَعِلُنْ |
|---|---|---|
| - ◡ - - | - - ◡ ◡ | - ◡ ◡ |
| پێچەیی پەر | چەمی یو پر | چی سیا |
| هەر دەڵێی مان | گە شەوە کوڵ | می تیا |
| - ◡ - - | - - ◡ ◡ | - ◡ ◡ |
| فَاْعِلاتُنْ | فَعِلاتُنْ | فَعِلُنْ |

**٣-موزاریع**

ا-موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور

| مَفْعُوْلُ | فَاْعِ لاتُ | مَفَاْعِیْلُ | فَاْعِ لانْ |
|---|---|---|---|
| - - ◡ | ◡ - ◡ - | ◡ - - | ٠- ◡ - ◡ |
| قوربانی | تۆزی ڕێگە | تم ئەی بادی | خۆش مروور |
| وەی پەیکی | شارەزا بە | هەموو شاری | شارەزوور |
| - - ◡ | ◡ - ◡ - | ◡ - - ◡ | ٠- ◡ - |
| مَفْعُوْلُ | فَاْعِ لاتُ | مَفَاْعِیْلُ | فَاْعِ لانْ |

ب -موزاریعی هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف

| مَفْعُوْلُ | فَاْعِ لاتُ | مَفَاْعِیْلُ | فَاْعِ لُنْ |
|---|---|---|---|
| - - ◡ | ◡ - ◡ - | ◡ - - ◡ | - ◡ - |
| ئەی ساک | نی ڕیازی | مەدینەی م | نەووەرە |
| لوتفێ ب | کە بفەرمو | مەدینەی م | نەووەرە |
| - - ◡ | ◡ - ◡ - | ◡ - - ◡ | - ◡ - |
| مَفْعُوْلُ | فَاْعِ لاتُ | مَفَاْعِیْلُ | فَاْعِ لُنْ |

ج -موزاریعی هەشتیی ئەخرەب

| مَفْعُوْلُ | فَاْعِ لاتُنْ | مَفْعُوْلُ | فَاْعِ لاتُنْ |
|---|---|---|---|
| - - ◡ | - ◡ - - | - - ◡ | - ◡ - - |

دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە
وەبزانە خوێنی خۆمە یا مننە تی ڕەقیبە
- - ◡   - ◡ - ◡   ◡ - -   - ◡ - -
مَفْعُوْلُ   فَاْعِ لاتُ   مَفْعُوْلُ   فَاْعِ لاتُنْ

**٤-موجتەس**

-موجتەسی هەشتیی مەخبوونی ئەسلەم موسەببەغ

مَفَاْعِلنْ   فَعِلاتُنْ   مَفَاْعِلنْ   فَعْ لانْ
◡ - ◡ -   ◡ ◡ - -   ◡ - ◡ -   - -٠

شەوی بەها ری جەوانی خەوێ بو پڕ تەشویر
لە فەجری پا یزی پیری بەیانی دا تەعبیر
◡ - ◡ -   ◡ ◡ - -   ◡ - ◡ -   - -٠
مَفَاْعِلنْ   فَعِلاتُنْ   مَفَاْعِلنْ   فَعْ لانْ

٥-بەسیت -بەسیتی هەشتی مەتوی

مُفْتَعِلُنْ   فَاْعِلُنْ   مُفْتَعِلُنْ   فَاْعِلُنْ
- ◡ ◡ -   - ◡ -   - ◡ ◡ -   - ◡ -

دووری لە من خستەوە بێ سەبەبێ یاری من
باری خودا یا کە تۆ بگری سەبەب کاری من
- ◡ ◡ -   - ◡ -   - ◡ ◡ -   - ◡ -
مُفْتَعِلُنْ   فَاْعِلُنْ   مُفْتَعِلُنْ   فَاْعِلُنْ

٦-تەویل -تەویلی هەشتیی مەقبووز

فَعُوْلُنْ   مَفَاْعِیْلُنْ   فَعُوْلُنْ   مَفَاْعِلنْ
◡ - -   ◡ - - -   ◡ - -   ◡ - ◡ -

دەرونی لیداریشا رەزووری وە بەردیهی
کە فرمێس کی گەرمی ئی لا ئاوی سەردیهی
◡ - -   ◡ - - -   ◡ - -   ◡ - ◡ -
فَعُوْلُنْ   مَفَاْعِیْلُنْ   فَعُوْلُنْ   مَفَاْعِلنْ

٧-ڕەجەز -ڕەجەزی هەشتیی مەتوی مەخبوون

مُفْتَعِلُنْ   مَفَاْعِلنْ   مُفْتَعِلُنْ   مَفَاْعِلنْ

| | | | |
|---|---|---|---|
| - ⏑ ⏑ - | ⏑ - ⏑ - | - ⏑ ⏑ - | ⏑ - ⏑ - |
| ئەحوەلی تەف | رەقە نەزەر | تەقوییەتی | سەبەب دەکا |
| عاریفی وەح | دەت ئاشنا | لەم قسەیە | ئەدەب دەکا |
| - ⏑ ⏑ - | ⏑ - ⏑ - | - ⏑ ⏑ - | ⏑ - ⏑ - |
| مُفْتَعِلُنْ | مَفَاْعِلنْ | مُفْتَعِلُنْ | مَفَاْعِلنْ |

٨-سەریع - سەریعی شەشیی مەتویی مەخبوونی مەکشووف

| | | |
|---|---|---|
| مُفْتَعِلُنْ | مُفْتَعِلُنْ | فَعُوْلُنْ |
| - ⏑ ⏑ - | - ⏑ ⏑ - | ⏑ - - |
| گۆشتی قەڵەو | حوققە بە چوار | دە پارە |
| وەقتی گوتت | حوققە زەمیر | دیارە |
| - ⏑ ⏑ - | - ⏑ ⏑ - | ⏑ - - |
| مُفْتَعِلُنْ | مُفْتَعِلُنْ | فَعُوْلُنْ |

ژمارە و ڕێژەی بەکارهاتنی کێشە عەرووزیەکان لە شیعری نالیدا، بە پێی هەریەک لە دیوانە چاپکراوەکان چاپی (١)

| ژ | کێش | قاڵب | ژ.شیعرەکان | ڕێژەی سەدی٪ | ژ.دێڕەکان | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | هەزەج | | **٦٨** | **٪٥٥,٧٤** | **٦١٧** | **٪٥١,١** |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ٢٩ | ٪٢٣,٧٧ | ٢٥٠ | ٪٢٠,٧ |
| | | هەشتیی تەواو | ١٦ | ٪١٣,١١ | ١٩٥ | ٪١٦,١٤ |
| | | شەشیی مەقسوور | ٨ | ٪٦,٥٦ | ٥٤ | ٪٤,٤٧ |
| | | شەشیی مەحزووف | ٧ | ٪٥,٧٤ | ٤٤ | ٪٣,٦٢ |
| | | هەشتیی ئەخرەب | ٥ | ٪٤,١ | ٤٣ | ٪٣.٥٦ |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ٣ | ٪٢,٤٦ | ٣١ | ٪٢,٥٧ |
| ٢ | ڕەمەل | | **٤٠** | **٪٣٢,٧٩** | **٣٦٢** | **٪٣٠** |
| | | هەشتیی مەحزووف | ١٧ | ٪١٣,٩٣ | ١٢٧ | ٪١٠,٥١ |
| | | هەشتیی مەخبوونی مەحزووف | ٨ | ٪٦,٥٦ | ٦٧ | ٪٥,٥٥ |
| | | هەشتیی مەقسوور | ٥ | ٪٤,٠٩ | ٥٩ | ٪٤,٨٨ |
| | | هەشتیی مەخبوونی ئەسلەم | ٣ | ٪٢,٤٦ | ٥٨ | ٪٤.٨ |
| | | شەشیی مەقسوور | ٢ | ٪١,٦٤ | ١٧ | ٪١,٤ |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | شەشیی مەخبوونی مەحزووف | ٢ | ٪١,٦٤ | ١٤ | ٪١,١٦ |
| | | هەشتیی مەخبوونی مەقسوور | ١ | ٪٠,٨٢ | ٧ | ٪٠,٥٨ |
| | | هەشتیی مەشکوول | ١ | ٪٠,٨٢ | ٧ | ٪٠,٥٨ |
| | | شەشیی مەحزووف | ١ | ٪٠,٨٢ | ٦ | ٪٠,٤٩ |
| ٣ | موزاریع | | **١٠** | **٪٨,٢** | **١٨٤** | **٪١٥,٢٣** |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ٥ | ٪٤,١ | ١٠٦ | ٪٨,٧٧ |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ٤ | ٪٣,٢٨ | ٦٩ | ٪٥,٧١ |
| | | هەشتیی ئەخرەب | ١ | ٪٠,٨٢ | ٩ | ٪٠,٧٥ |
| ٤ | موجتەس | هەشتیی مەخبوونی ئەسلەم موسەببەغ | **١** | **٪٠,٨٢** | **٢٠** | **٪١,٦٦** |
| ٥ | بەسیت | هەشتیی مەتوی | **١** | **٪٠,٨٢** | **٩** | **٪٠,٧٥** |
| ٦ | تەویل | هەشتیی مەقبووز | **١** | **٪٠,٨٢** | **٩** | **٪٠,٧٥** |
| ٧ | ڕەجەز | هەشتیی مەتوی مەخبوون | **١** | **٪٠,٨٢** | **٧** | **٪٠,٥٨** |
| **کۆ** | **٧ کێش** | **٢٢ قاڵب** | ١٢٢ | ٪١٠٠ | **١٢٠٨** | ٪١٠٠ |

چاپی (٢)

| ژ. | کێش | قالب | ژ.شیعرەکان | ڕێژەی سەدی ٪ | ژ.دێڕەکان | ڕێژەی سەدی ٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | هەزەج | | **٧٥** | **٪٥٦,٨٢** | **٦٥٢** | **٪٥٣,٣٥** |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ٢٩ | ٪٢١,٩٧ | ٢٤٧ | ٪٢٠,٢١ |
| | | هەشتیی تەواو | ١٧ | ٪١٢,٨٨ | ٢٠٢ | ٪١٦,٥٣ |
| | | شەشیی مەحزووف | ١١ | ٪٨,٣٣ | ٦٨ | ٪٥,٥٦ |
| | | شەشیی مەقسوور | ٨ | ٪٦,٠٦ | ٥١ | ٪٤,١٧ |
| | | هەشتیی ئەخرەب | ٦ | ٪٤,٥٥ | ٤٤ | ٪٣.٦ |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ٤ | ٪٣,٠٣ | ٤٠ | ٪٣,٢٧ |
| ٢ | ڕەمەل | | **٤٢** | **٪٣١,٨٢** | **٣٤١** | **٪٢٧,٩** |
| | | هەشتیی مەحزووف | ١٩ | ٪١٤,٣٩ | ١٤٣ | ٪١١,٧ |
| | | هەشتیی مەخبوونی مەحزووف | ٨ | ٪٦,٠٦ | ٦٨ | ٪٥,٥٦ |
| | | هەشتیی مەقسوور | ٥ | ٪٣,٧٩ | ٥٩ | ٪٤,٨٣ |
| | | هەشتیی مەخبوونی ئەسلەم | ٣ | ٪٢,٢٧ | ٢٠ | ٪١,٦٤ |
| | | شەشیی مەقسوور | ٢ | ٪١,٥٢ | ١٧ | ٪١,٣٩ |
| | | شەشیی مەخبوونی مەحزووف | ٢ | ٪١,٥٢ | ١٤ | ٪١,١٥ |
| | | هەشتیی مەخبوونی مەقسوور | ١ | ٪٠,٧٦ | ٧ | ٪٠,٥٧ |
| | | هەشتیی مەشکوول | ١ | ٪٠,٧٦ | ٧ | ٪٠,٥٧ |
| | | شەشیی مەحزووف | ١ | ٪٠,٧٦ | ٦ | ٪٠,٤٩ |
| ٣ | موزاریع | | **١٠** | **٪٧,٥٨** | **١٨٤** | **٪١٥,٠٦** |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ٥ | ٪٣,٧٩ | ١٠٦ | ٪٨,٦٧ |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ٤ | ٪٣,٠٣ | ٦٩ | ٪٥,٦٥ |
| | | هەشتیی ئەخرەب | ١ | ٪٠,٧٦ | ٩ | ٪٠,٧٤ |
| ٤ | موجتەس | هەشتیی مەخبوونی ئەسلەم موسەببەغ | **١** | **٪٠,٧٦** | **١٩** | **٪١,٥٥** |
| ٥ | بەسیت | هەشتیی مەتوی | **١** | **٪٠,٧٦** | **٩** | **٪٠,٧٤** |
| ٦ | تەویل | هەشتیی مەقبووز | **١** | **٪٠,٧٦** | **٩** | **٪٠,٧٤** |
| ٧ | ڕەجەز | هەشتیی مەتوی مەخبوون | **١** | **٪٠,٧٦** | **٧** | **٪٠,٥٧** |
| ٨ | سەریع | شەشیی مەتوی مەخبوونی مەکشووف | **١** | **٪٠,٧٦** | **١** | **٪٠,٠٨** |
| **کۆ** | **٨ کێش** | **٢٣ قالب** | **١٣٢** | ٪١٠٠ | **١٢٢٢** | ٪١٠٠ |

چاپی (٣)

| ز | کێش | قاڵب | ژ.شیعرەکان | ڕێژەی سەدی٪ | ژ.دێرەکان | ڕێژەی سەدی٪ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ١ | هەزەج | | **٧٥** | **٪٥٨,٥٩** | **٦٤٣** | **٪٥٥,٥** |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ٣١ | ٪٢٤,٢٢ | ٢٥٧ | ٪٢٢ |
| | | هەشتیی تەواو | ١٩ | ٪١٤,٨٤ | ١٩٧ | ٪١٦,٨٧ |
| | | شەشیی مەحزووف | ٩ | ٪٧,٠٣ | ٥٧ | ٪٤,٨٨ |
| | | شەشیی مەقسوور | ٨ | ٪٦,٢٥ | ٥٤ | ٪٤,٦٢ |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ٤ | ٪٣,١٣ | ٤٠ | ٪٣,٤٢ |
| | | هەشتیی ئەخرەب | ٤ | ٪٣,١٣ | ٣٨ | ٪٣,٢٥ |
| ٢ | ڕەمەل | | **٤٠** | **٪٣١,٢٥** | **٣١٨** | **٪٢٧,٢٣** |
| | | هەشتیی مەحزووف | ٢١ | ٪١٦,٤١ | ١٦٧ | ٪١٤,٣ |
| | | هەشتیی مەخبوونی مەحزووف | ٥ | ٪٣,٩١ | ٣٣ | ٪٢,٨٢ |
| | | هەشتیی مەقسوور | ٤ | ٪٣,١٣ | ٤٨ | ٪٤,١١ |
| | | هەشتیی مەخبوونی ئەسلەم | ٣ | ٪٢,٣٤ | ٢٠ | ٪١,٧١ |
| | | شەشیی مەقسوور | ٢ | ٪١,٥٦ | ١٦ | ٪١,٣٧ |
| | | شەشیی مەخبوونی مەحزووف | ٢ | ٪١,٥٦ | ١٤ | ٪١,٢ |
| | | هەشتیی مەخبوونی مەقسوور | ١ | ٪٠,٧٨ | ٧ | ٪٠,٦ |
| | | هەشتیی مەشکوول | ١ | ٪٠,٧٨ | ٧ | ٪٠,٦ |
| | | شەشیی مەحزووف | ١ | ٪٠,٧٨ | ٦ | ٪٠,٥١ |
| ٣ | موزاریع | | **١٠** | **٪٧,٨١** | **١٨٢** | **٪١٥,٥٨** |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەحزووف | ٥ | ٪٣,٩١ | ١٠٤ | ٪٨,٩ |
| | | هەشتیی ئەخرەبی مەکفووفی مەقسوور | ٤ | ٪٣,١٣ | ٦٩ | ٪٥,٩ |
| | | هەشتیی ئەخرەب | ١ | ٪٠,٧٨ | ٩ | ٪٠,٧٧ |
| ٤ | بەسیت | هەشتیی مەتوی | **١** | **٪٠,٧٨** | **٩** | **٪٠,٧٧** |
| ٥ | تەویل | هەشتیی مەقبووز | **١** | **٪٠,٧٨** | **٩** | **٪٠,٧٧** |
| ٦ | ڕەجەز | هەشتیی مەتوی مەخبوون | **١** | **٪٠,٧٨** | **٧** | **٪٠,٦** |
| **کۆ** | **٦ کێش** | **٢١ قاڵب** | **١٢٨** | **٪١٠٠** | **١١٦٨** | **٪١٠٠** |

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

«نەواچی درۆ، یا ڕەوایەتەن "ماءً طهورا" "نَص" ئایەتەن...»

(هەمان سەرچاوە)

دیووای ئەوە وە ئاسمان مەدرەک ئەتوای. ئاسمان قەبوول نییە کەیدو هەم بەرزی خوەی و جێگە و مەکان فریشتەگان و تاو و باران و بەفرواران خوەی ئەیادە ناوچە و زوینا. گوزەشتە لەوە مانگ و خوەر و هەسارەگان...، زەویژ هەروا وە جواویا لە خوبی و بەرەکەت و ئایەمگەیل وە ناوبانگ و پاک و بڕوامەن ئەوشێ و باس «مسجد الاقصی» و «اعلا علیین» و... ئەژندفێدە و جا خوەیژی دوای مەناجات پەروەردگار، باس ئەتێریدە و سەر ستایش و وەسف بەنەگەل خاس خواو وە تایوەت حەزرەت ڕەسوول(د.خ) و ئەوشێ:

«غافرالذّنوب» «ستارالعیوب» «واحدالاحد» «عَلّام الغیوب»

مەوجۆدەن بێچوون، گۆیان وە بێدەم سەمێعەن بێگۆش، بەسیرەن بێچەم...

سەبتەن جە کەلام سی جزمەی مەجید «نَحْنُ اَقْرَبُ مِنْ حَبْلِ الوَرید»

ئاسمان مەرتۆ خەیاڵت جە کۆن؟ یا پاسەت زانان تەنیا خۆدای تۆن!...

جە بێدەماخیت دەروونم ڕێشەن ئەرتۆ بزانی فەزڵ من چێشەن؟

غرور بەرزیت بەرمەشۆ جە سەر مەبی وە بە نەم تا «یومُ المَحشر»

فەزڵ من حەزرەت فەخر کاینات باعیس ئیجاد گردین مەوجودات

حەق وێش فەرماوان «لولاک لولاک» پەی ئەو سازنان نۆتاق ئەفلاک...

(هەمان سەرچاوە)

ئی گفتوگۆ و شەڕە زوان و بەڵگە هاوردنەوە ئەکیشگێدە ئەو جێگە کە ئاسمان وە خۆفا، مل کەچ ئەکا دو وە پەشیمانیا عوزر ئەتێرێدەو وە ئاخر کارا ئەکەفێدە وەسف و ستایش زەوین و هاو زوان وە گەرد ئەوا پەنا ئەوادە خودای جەهان و داوای بەخشین و شەفاعەت وە حەزرەت (د.خ) ئەکا:

گشت هەر حەزرەتە دایم پەنامان مەبۆ جە مەحشەر شەفاعەت خوامان

عالەم گشت وە ئەو ئۆمێدەوارەن موختار دیوان (دارلقرار)ەن

قادر وە سەرگەرد ئەبرۆی تاقش بۆ فێدای گەرد سم پای بوراقش بۆ...

شوم بێعەمەڵ، هەم بێتاعەتم ئۆمێدم ئادەن پەی شەفاعەتم»

(هەمان سەرچاوە)

تەمسیل بوڵەند «کوللە و عاینەمەل» یەکێ تروە قسەملانێگەڵ "میرزا عەبدۆلقادر پاوەیی"ە. سەرەتای ئی شێعرە مەناجات و دەربڕین بیر و باوڕ دینییە و بەڵگە هاوردن وە ڕیوو ئایەتگەڵ قورئانی. ئەیجا ئەتێدە سەر باس وشکەساڵ و گەرمای هەوا کە بەڵای کوللە وە شۆن خوەیا ئەتێرێ. حاکم و دەسەڵاتدار پاوە ئەڕای زاڵ بیوون وە سەر ئێ مێملا نامەیەگ ئەنیووسیدە دەسەڵاتدار شار شیراز. ئەویژ دیووای وتوویژ و ڕاو و تەگبیر وە گەرد گەورەگەیل حکوومەتا، لەشکەر خوەی ئەڕازنێدەوە و بەرەو پاوە ئەخادەیە ڕێ و دوای شەڕ و کارزارێ

قورس، سپای کوللە وە بەین ئەوەن، ئەمما خوەیان ئەو ناوچە ئەگرن و چۆڵی ناکەن دا مەردم وە تەنگ ئەتێن و شکات ئەخەنە بەر حاکمەگەی خوەیان و ئەویژ وە سیاسەت و زرەنگی ئی قاڵە ئەوڕێدەو. واتە سپای شیراز وە سەرکردەیی عاینەمەل گەورە ئەچنەوە.

وە ناو ئی مۆنازێرا، باس جیاوازی ئاو و هەوای پاوە و هەورامان وە گەرد دەورووەر شیرازا ئەکرگێ. وشەگەیل تورکی ناو مونازێرەگە کە زیاتر پەیوەن دێرێ وە سوپای داگیرکەرەوکە کوللەس، نیشان ئەیاد ئی شەرە، ڕاسیەگ مێژوویيە و دەوڵەت عوسمانی دەس درێژی ئەکادە سەر ڕۆژئاوای ئێران و ئەگەر بەر وە پێ نەگیرياید ناوچەگەیل تریژ وە ئێران ئەگرت.

وەسف جۆانیەگان سرۆشت کوردەواری، وێنەگەل حەماسی (جەنگاوەری)، کۆنەگەرایی (ئارکائیسم)، -وە داخەوە- دەس کەم گرتن و سۆک نواڕین وە کەمایەتیە ئایینییەگان، وە تایبەتمەندیگەیل پێکهاتەیە ئی چیرۆکەسە. شاعێر خوەی وتیەس ئی هونراوە دەردنامەی پاوەس و هەرکەس بخوەنێدەی بایە دەرس وەلێ بگرێ. وە ئاخریژا ئەوشێ هەر زاڵمێ زەواڵێگ و هەر چشتێ، دژێ خوەی دێرێ هەروا کە بەلای کوللە وە عاینەمەل دەرمان کریاد:

«گشت وە دەست تۆن دانای گرد حاڵ | مەلەخ پەی مەردم کەردەبیت زەواڵ
ئاینەمەلت کەرد وە زەواڵ ئەو | ڕۆی ڕۆشنت کەرد لێش تاریکە شەو...

(هەمان سەرچاوە)

مەعلووم هەر زۆڵمێ زەواڵێ دارۆ | هەر تۆ زوگەردێ شەماڵێ دارۆ
هەر شادی و شەوقێ شینێش هانە شۆن | تەنیای بێزەواڵ زات پاک تۆن
سێوای زات وێت شاهی بێزەواڵ | نە سۆل، نە شیرین، نە ترش و نە تاڵ
ما باقی عاڵەم وێرانەن ماڵش | هەرکەس، کە سێوەت کەرد وە زەواڵش...»

(هەمان سەرچاوە)

گفتوگۆی شاعێر و خەرێ بارکێش کە وە سەرماوێڵ کریاگە، یەکێ وە خەمنامە کۆنەگەیل گیاندارانێگە کە وە دەس ئینسانەوە گیرۆە بیوون. داستان ئەیەسە یەی ڕۆژ شاعێر وە ماڵ ئەتێدە دەرو وە ناو کیووچەو کولانا خەرێ وڵ کریاگ ئەیوونێ کە وە برسیا ئەلەرزێد و وە سەرما کڕیووسکە کردگە. ئەچێدە بەرەو و هۆ ئەو داماگییە ئەپرسێ. خەر وە جواو شاعێرا ئەوشێ کە چتەور وە بەهارەو هەرتا زمسان کار وە پێ کردنە و دەخڵ و دان خوەیان و ڕانەپەز و گاو و گۆریان وە پێ کیشانەو پاییز وە بەر ئەوە ئاڵف ئەخواد کردنەسەیە دەیشت و ئاوارەی کردنە. ئی مونازێرە ناوەرۆک دەردەدڵ و هاودەردی دێرێ و شاعیر وە سەرەتاوە ئەیجوورە ئەوشێ:

«ئێبتێدای هەرچێ ئێنتهایکی هەس | هەر مەوجوود بەش خوەی ماجەرایکی هەس
جێگەی تەئەسۆفە بۆ هەر بینەرێ | ئەمیچە بە سەرهات یەک زەعیف کەرێ...»[1]

---

[1] حوسەین ڕەزایی، شریتێ دەنگ، شاعێرو کەرەمیش، بەیتگەل ١ و ٢.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

وەی شێعرا هۆنەر ڕەخنە ئەگرێ لەو کەسانە ناو خوەیان ئەنێن ئایەمیزاد و وەی جۆرە ستەم وە بەسەزوانگەل ئەکەن. وە زوان خەرەگەو ئەوشێ:

«ساحێوم بمرێ وا نەوومە بیمە　　　　جل نییە بە کۆڵمەو، ئەونە برسیمە...»

(هەمان سەرچاوە)

دیوای ئەوە کە شاعێر برێ ڕێزەوڵ ئەیادەپێ ئەخوادەی و جلیش ئەکادە کۆڵی گۆش ئەیادە قسەو دەردەدڵەگەی کە سەرزەنشت نەوع بەشەرە:

«چەنێ بێڕەحم و چەن بێ مرۆەتن　　　　وائەزانن دایم ساحیو سروەتن

وائەزانن دایەم هەروا موختارن　　　　موختار ڕێگەی کەوێڵ و لارن

هەرچی مەیلیانە بە ژێر دەسەی کەن　　　　بە زوڵم و ئازار تەواو خەسەی کەن...»

(هەمان سەرچاوە)

هەم وە دڵڕەقی و بێبەزەیی ئایەمەگان ئەوشێ:

«نەیئەوت ئاخر ئەمیش گیانداره　　　　خوەشی پێ خوەشە لە زۆر بێزارە

بو وەها لێ دەم مەگەر جورمی چەس　　　　نە زیانی کردگە و نە زەنا و نە مەس...»

(هەمان سەرچاوە)

وە ڕاسی گوناو تاوان ئی بەسەزۆانە چەس؟!

«تەنیا بەو جورم و سەدها مەرامە　　　　ڕەنجم حەلاڵە و گۆشتم حەرامە

بە دەربەدەری کردمیان مەحکووم　　　　لە دەسڕەنج خوەم کردمیان مەحرووم»

(هەمان سەرچاوە)

تازە، دەرد هەر ئەیە نییە وە ناو کووچە و کۆلانیژا مناڵ واز لە لێ نەتێرێ و ئایەمگەل گەورەیژ وە شەوق و دار ئەکەفنە لێ. پەیامێ ئەخلاقی و ڕەوشتی قیوول و بنەڕەتیەگ کە وە ناو ئی شێعرا هەس، ئایەم تەکان ئەیا. ئیمە کە خاوەن عەقڵ و ئاوەزو وێژدان و سۆزێ دڵین بایە زیندەوەرگەل تر وە دەسمانە زەبیوون بۆون! شاعێر وەدەس زەمانە و بەخت خوەی و بەتر وە گشتی کرانشینییەوە دەس ئەکا ناڵە و عوزر ئەتێریدەو وە چوارپای بەسەزوان کە ناتوانێ بوادەوەی ئەڕای ماڵ چوونکە نە جا دێرێ و نەیژ کنیووڕێ زیایی، ماڵ هەم سرویس کاملە و هەمیژ ئەونە بیووچکە جێ خوەی ناودەو چ برەسی وە خەرێ! خەر هیچ ئۆمێدێ ئەڕای نامەنێدەو تەنیا دوعای شەڕ خاوەنەگەی ئەکا:

«ئیتر وە سەلام مۆخبرێ حاڵم　　　　هەزاران لەعنەت لە ناو چاو زاڵم»

(هەمان سەرچاوە)

شاعێریژ دەنگ ئەیادە دەنگیەوە:

«یاڕەبی دوعات سەد چەنانەوێ        لە مایەحتاجی قەت غەنا نەوێ
گیروودەو زەلیل ئەم هاوارە بێ        بە وتر لە ئێوە ئەو ئاوارە بێ...»

(هەمان سەرچاوە)

خەر ئەوشێ ئیسە کە تۆ میرزاید و دەس نووسیند هەس، دەسێ کەم، بەسەرهاتەگەم بنیوسەرەو با کەسانێ تر وا نەکەنە بەسەزوانگەل تر.

«وتی ئابەم زەحمەتەو کەفتمە ئەم ڕۆژە        بەسەرهاتەکەم بۆ مەردم بێژە
با لە تەک خوایچا فەن و فێڵ نەکەن        گشت عیبرەت بگرن کەریان وێڵ نەکەن»

(هەمان سەرچاوە)

شاعێر وە دواییا قەوڵ ئەدادە پێ و دڵنیای ئەکا:

«وتم بەسەر چاو ئەی گوێ درێژم        من خوەم شاعێرم وە هەم بوێژم
[---------------------]        بەسەرهاتەکەت بە شێعرەو ئەیژم
ئەیکەمە شێعر با خەڵک بژنەوێ        ساحێو هیچ کەرێ وەک هین تۆ نەوی!»

(هەمان سەرچاوە)

یەکێ تر وە چیرۆکەیل ئی وتارە شەرەقسەی ڕۆیی و دەیشتەوانە. سەرەتا ئەیەسە کە شاعێر نۆگلە فڕیووج تازە کەچەڵە داشتێە. وە دەشت و هەوارا وڵیان کردیە ئەڕای خوەیان چینە بکەن و دانە هەڵچنن. بەشکە گەورە بۆون و دەیشتەوان بکادەیانە دەسمایەی کار و سروەت و سامان. ئەڵبەت ئەوەیژە ئەوشێ کە سێ گلەیان بکەمە فریووجاو ئەڕای نەهار و شام و مێوان و ئەو شەشەگە بفرۆشم و خوەم وە پێ دەوڵەمەن کەمەو، یە هەر وەر بەر خوەیەو حەساو خەیرەگەی ئەکاد دائاخری خەیزانی ئەتێدە هاوار پیاگەگە کەم خەیاڵ پڵاو کە، هیووچ ئەڕای جەژن نەیرین هەڵسە بچوو ئەڕای شار:

«بە مەنەکەی خوەت تۆ هەر ئەی پێوی        خەبەرۆ نییە لە قەزیەی ڕێوی...
حەساو خەیرمەکە ئەمە بەرکنار        خەرجیمان نییە هەڵسە بچۆ بۆ شار...»[1]

شاعێر گابنەیک دێرێ هەرچی وە دەیشتەو هەس ئەسپێرێدەیە دەسی و خوەی ئەتێدەو ئەڕای ماڵ شەکەتیگ دەرکا و سوب بچێ ئەڕای شار. وەێرەی داستانەگا حاڵ و هەوای گاڵتە و تیتاڵی ئەیوونین؛ دیارە گابنە پڕ مودەعا و بێعورزەس. فریووجەگان ئەیادە دەم ڕۆییەوەو خوەی نیمەشەو ئەنێدەو بەرەو ماڵ:

«... دیم نیمەشەو گابنە ناڵەناڵ        گورێسەکەی بڕییەوەو هاتگەسەو بۆ ماڵ
ئەداتە سەریا واتە ڕووم ڕەش بێ        فرووجگەل خوریان خانمم خوەش بێ...»

(هەمان سەرچاوە)

دەیشتەوان کە چاوەڕوان وەها زەرەرێ نەیووە وە شەڕەقسەوە وەلێ ئەتێدە زوان:

---

[1] حوسەین ڕەزایی شریتێ دەنگ، ڕۆیی و دەیشتەوان.

**بەشی پێنجەم- ڕەخنە**

«وتم جا خوریان بە قەور گشت کەستەو　　هیچێ دەرناچێ گابنە بە دەستەو
ئیمشەوو لێ کەفت دابزا چەو کرد پێم　　دە هەزار تمەن زەرەرو دا لێم
نەگێرەت پێ ئەکەم نە ئەیژم پێت هەو　　داراییمت دابا بە تەنیا ئیشمەو
وتی جا خوریان ملیان بووە ئارد　　خاسم کرد هاتمەو ئەنا ئەمی خوارد
بۆچە پەکەری بۆچە پەشێوی　　ئیشەڵڵا خەیرە زەرەر دەم ڕێوی
وتم ئەی وەڵڵا... گابنە　　بۆچە دات بەستگە تۆ لە تەک منا
فروجگەل خوریان بە یەگجاران نۆ　　دەسم لێ هەڵگرە هیچ من و هیچ تۆ»

(هەمان سەرچاوە)

شاعێر دوای یی قسەملانیە وە گەرد گابنەیا ئەچێدە هەوار خالی و شۆن قەڵوە و مەکر ڕۆیی یەیوونێدە، لاشەی شەل و پەل کریاگ فروجەگان وە زوان حاڵ وەپێ ئەوشن کە دی دەس لە خەیاڵ دەوڵەمەنەو بیوون بکێشێد و خەیر و مایە وە یەک بوەخشێدەو.

دوایێ لاوانەوەی فرووجگەیل و گیرستن ئەڕای سروەتێ خەیاڵی وە دەس چیوو، کەسایەتیەیل تر ئەتێریدە ناو چێرۆکەگەیەو ئەوشێ:

«من لە زەرەر خوەم هێشتا ناحاڵیم　　کوانێ شەش مانگا، کوانێ چل قاڵیم
کوا دوانزە پشتی، کوا سەرنگاگەل قووم　　کوا ماس فرۆشی سەر دووکان مەحمووم
کەس دڵ خوەش نەکا بە خەیر مامرە و کڕ　　بۆ ئۆسا ئەحمەو مەر بنیشمە فڕ»

(هەمان سەرچاوە)

وە شۆن ئەیا ڕۆیی خوەی ئەیادە نیشان و شاعێر ئەکادەیە شەڕەقسە وە گەردیا:

«وەختێ ڕوانیم برا بە لاوە　　یەک نێرە ڕێوی ویسیاگە پاوە
وتم ئەرێ نانەجیب، ئەرێ بەوسرۆشت　　بۆچە واتە کرد مەگەر باوکتم کوشت
بە وێنەی خەڕات یا وەک ژنە دۆم　　پەنجۆ بخواردای چوارو بهێشتای بۆم...»

(هەمان سەرچاوە)

دەیشتەوان هەروا هەڕەشەیە ئەکاد و قەسەم ئەخواد بەهار تەڵە وە بەر هێلانەی ڕۆییەگا بنێدەو بگرێدەی و پۆسی بکەنێ. ئەویژ وە تەوس و خەنینە جواو ئەیادەوە کە بێسانچی چاری ناکاو هەر تا توانستێیە زەرەروە خەڵک ئاواییەگان دایەو وەی کاریژا هەفت خەتتە:

خەبەرو نییە لە بەزم جەنگم　　قوێخای ڕێویگەل قەلا و دۆڵ هەنگم
عەقڵا عەبەسا، خەیاڵت خامە　　قەتڵ مامرم کرد لە چەم نەمامە...
خالێ قاوەچی بێماڵ و ژنە　　هەرچێ ڕەنج ئەدا گشتی بۆ منە

(هەمان سەرچاوە)

هەر وەی شەڕە زووانەو، شاعێر وەک دەیشتەوان باس ئەتێرێدە سەر ئەسڵ و ڕیشەی ڕۆیی کە کییە و نەوە و نەتیجەی کییە:

کاکەی بێسانچی تویش پیاگی خاسی        فەقەت نەتیجەی بەننە ناناسی
ئەگەر نامناسی تەیمەز بوێژم        دوا پووچەڵ و پۆزە درێژم»

(هەمان سەرچاوە)

وەێرا ڕۆشن ئەودەو شاعێر وە گەرد کەسێگا کە ناوی ئەیمەز بووە بەینی خوەش نەیووە و دڵ خوەشێ وەلێ نەیاشتێیە:

وتم دۆمەزای وە دۆمەو کەفتگ        وە چەرمەڕەقە شەوگەل نەخەفتگ
هەر مەگەر شەوێ نەیتەو بۆ دۆڵ هەنگ        ئەر تەڵەنەوی ئەوکوژم وە تفەنگ...
... تووکت ڕزیاگە ئەنامت گەڕە        وێنەی تووتکە سەگ کەم لێم بوەڕە...»

(هەمان سەرچاوە)

شاعێر ئەزانێ ڕۆیی دەس بەردار نییە ئەچێدەو ئاوایی ئەڕای تەڵە. ڕوو ئەکادە خاوەن ماڵ و وە ڕەسم کوردواری کە وە ژن هاوسا و ئاشنا ئەوشن براژن، داوای تەڵەگەی خەڵیفە ئەولحەمێ ئەکاد:

«وتم ئامانە براژن خامە        تا نیشانمی بە ئەو تەڵە کامە؟»

(هەمان سەرچاوە)

ژنەیژ وەک کەسایەتیەک تر ئەتێدە ناو داستان و دەس ئەکادە گلەیی و بناشت کە دێوشەو دز دایەسە ماڵەگەیانەو سێ چوار کوت جلووپلاس و پۆشەن داشتنە داسە بن دەسی و بردیەسەی، ئەیەیژ دڵخوەشی ئەیادەوە و ئەوشێ:

«وتم جا خوەیشکە بۆچە پەشێوێ        دز ماڵ تۆی بردگە هین منیش ڕێوی...»

(هەمان سەرچاوە)

حاسڵ قسە وەی تەورە دەیشتەوان تاوسان ئەیادە سەرو ئەکەفێدە پاییز. بەینێ کاتەیمەز دیاری ناوێد. دا ئاخری ڕۆژێ وە خەیاڵ جارانەوە ئەچێدەو ئەڕای هەوار و پێشە و پڵان فریووجەگان ئەگرێدە قەڵوە و ئەکرنێدەوەی. یەکڕا سوقانێ وە قوڕگیا گیر ئەکاد و ئەخنکنێدەی. دەیشتەوان ئەوشێ:

«کوڕتان سڵامەت عومرتان باقی        سوقان فڕوجێ گیریاوە ناقی
ڕۆژێ ڕوانیم برا کاتەیمەز        زەوینی گرتگە ئەنازەی دووگەز
مانگێ لەو دووا ئاغەی تەیمەزخان        کلکی وەک داهۆڵ هەر با ئەیوەشان»

(هەمان سەرچاوە)

**بەشی پێنجم- رەخنە**

بەێنێ وە پێ ئەچێ یەکێ وە کەس و کارەگان تەیمەز ئەڕای حەق سەنەوە، وە دەیشت کەنیوولەو ئەتێدەی دیوا، وە مراد حاجیانەودا سەرپەچە ئەتێ ئەڕای کوشتن و خواردن مامر. سەگ ئەنێدە سەری خوەی ئەخادە ماڵێگە و ژنگەل وەپێ ئەزانن و ئەکەفنە لێ، ئەوشێ:

«خوەیشکە خوەم ناتگم فەرموودەی خانە — منیان هەناردگە بۆ فرووجانە

ئەگەر بمکوژی نەمێنێ خوێنم — فەرموودەی خانە فرووج ئەسێنم»

(هەمان سەرچاوە)

ئەمما ئاکام و ئاخر بیووە یەکە:

«مەعزەر هەڕای کرد درگایان لێ ژەن — حەمە سەری بڕی کەریم پۆسی کەن»

(هەمان سەرچاوە)

هەرواکە وە بەشگەل جۆراوجۆر ئی چیرۆکە فولکلوریەیا دەرکەفت؛ ئی مۆنازێرە خوەی تەمسیل و چەن چیرۆک و تەمسیل کۆتاترێژ وە ناوی بیوو. وە ئەدەب کوردیا پێش ئەتێ داستانێگ چەن داستان کۆتای تر وە ناو دڵیا بۆود. ڕاسییەگەی یەسە ڕۆیی هەرچەن ئەڕای ژیان خوەی نەچیر ئەکا و مامر ئەگرێ ئەمما ئەڕای ئینسان ئەوەدە زەرەر، یە بارێ ئاسایی و سرشتێ قەزیەگەس. بەڵام گیروگرفت بنەڕەتی دەیشتەوان ڕۆیی نییە، ئایەمگەلێگن کە هەرکام وە جۆرێ ستەم ئەکەن، ئابژە یا هەدەف و ئامانج (سەنعەتی، ١٣٧٨: ٢٣٩). ئی شێعرە درۆ و دەلەسە و قین و بێباوڕیە وە بەین کەسایەتیەگانا کە فرەیگیان ئایەمیزادن و بڕێگیژیان حەیوانن وەک گابنە و ڕۆیی. وەی وتووێژەیلە، ئەگەر چە فرەیگ لە قسە و باس و بابەتەگان جۆرێ نین باوڕ وە بیوون سەد لە سەدیان بکەی، بەڵام شاعێرێگ ئاگا و زانا وە «منێ تەمسیلێی» (جیتر:٤٠٥) خوەیەوە ئەکادەیە ڕیوودایەگ ڕاس و سەرەنج گۆشدەر ئەڕای لای خوەی ئەکێشید و فێکر و زەین ئەو وە خوەیەوە خەریک ئەکا.

پیکهاتەی قسەملانێ یا مۆنازێرە وە کوردیا ئەونە بەربڵاو و دەوڵەمەنە کە وە ناو دڵ خوەیا نەوعی تر تاکیاگ (فرعی) پەروەردە کردیە. ناوەرۆک ئی جۆرە فەرعیە شکار و نەچیرە. ئەگەر وە ئی جۆرو قاڵبە بیووشین شکارنامە دروس وتینە. ئەڕای نموونە وە لاپەڕەگەیل ئەوەڵا وتووێژەگەی "مێرزا شەفیع" وە گەرد کەڵەشاخا گەڕانینەو. ئەشعار تر وەی پەیوەندیەوە هەس کە وە گۆرانیژە و خوەنەسەی:

«هەی خاڵۆ ڕێبوار ئەڕا دیوور نیشتیدە — شکارەوانی یا کەڵ کوشتیدە

وت: نە شکارەوانم، نە کەڵ کوشتیمە — یەی ڕێبوارێگم وەیرە نیشتیمە»[1]

یا ئی بەیتگەلە:

«شکار شکارە، شکار وە بەختە — ڕای ڕاویار بەسیا، جاگەگەی سەختە

من شکارەوانەگەی پارچەی بالیوولم — شکار گوم کەردە ماتۆو مەلیوولم...»[2]

---

[1] وە داخەوە هەر ئی دێو بەیتە کەفتێەسە گیرم.

[2] دێو بەیت شمارە ٦٦ و ئی بەیتگەلیژە بابا ڕۆستەم کەریمی وتێەسەوەی.

نێموونەیەگ تر وەی جۆرە تاکیاگە وتۆوێژ «کۆتر و ڕاوچی» "مامۆسا قانیع"ە. وەختێ ڕاوچیەگە وە پای دارا دایەنیشێ، جریوکەی چەن مەل ئەتێدە گۆشیەو. سەر هەڵ ئەورنێ ئەیوونێ کۆترێگ و چەن جیووچگە. تیر ئەتەقنێد و کۆتر وە سەردا ئەکەفێدە خوارەو. وە زوان حاڵ سەرزەنشت داگیرکەر و هێرشبەر و مەنای ڕاوچی ئەکاو خەم جووچکەگانی ئەخوا و ئەوشێ ئەگەر قیمەت گوللەگەد بێاردایەدە گۆشت فرەتر ئەڕاد ئەکرد:

| | |
|---|---|
| «بۆچی وات کرد بە حاڵم | بۆچی شکانت باڵم |
| بۆچی لە بیچووەت بڕیم | بۆچی جەرگت هەڵ دڕیم |
| بۆچی لە گیانی شیرین | بێ بەشت کردم لە ژین... |
| ئەوا خۆم هیچ! بێچووەکان | بێ خۆم چی بکەن لە هێلان؟... |
| ئەشێ چی بێ گۆشتی من | وا، لێم بوویی بە دوژمن؟ |
| ئەو گوللەیە تەقانت | بە دڵ منا چەقانت |
| ئەگەر بتدایە بە گۆشت | گۆشتی زۆرتر ئەکرد بۆت» |

(هەمان سەرچاوە)

ئاکام ئی باسە پەند و ئامۆژگارییە:

| | |
|---|---|
| «بۆ هەر کەسێ کە کەسە | یەک تیری تانە بەسە |
| ئەگەر خاوەن حەیا بی | لە دنیا تاکوو مابی |
| ناچی بە گژ هەژارا | تفەنگ ناخەی بە دارا» |

(هەمان سەرچاوە)

جیا لە گشت ئەیانە وتۆوێژێگ وە بەین «داڵک و دێوتا» هەس کە دەس ئەنێدە بان خاڵێک سرشتی و تایبەتمەندی نەو نەهاڵگەیل. وێژەرێ کە ئی حەکایەتە هەڵوەستگە دیارە ئایەمێگ ئاگاو ئاقڵ بیووە؛[1] سەرەتای شێعرەگە بیرەوەریەگ و وتۆوێژ بەین دێوت و کوڕیگە:

| | |
|---|---|
| «میرزام سەرسەراوێ، میرزام سەرسەراوێ | ئیمڕۆ ڕاگەم کەفتە سەرسەراوێ |
| دیم کە دانیشتێە کونە پڕ مەکا | یەک نەو هاڵێ تەرکە تەراوێ»[2] |

وەی وەختا کوڕ ئەتێدە سەر کانی و داو ئاو ئەکا:

| | |
|---|---|
| «عەمرم عازیزم نازانم نامد | چۆڕێ ئاو بە پیم وە دەس و جامد» |

(هەمان سەرچاوە)

دێوت ئەوشێ:

| | |
|---|---|
| «ئاوت پێ ئەدەم وە دییە و وە دڵ | ئەسڵم سایڵەوەن ئێسمم سەمەن گوڵ» |

---

[1] وە وەختێگا پەیوەندی بەین دێوت و کوڕ تابۆ بیووە و ئیسەیژە هەر مەنیە، ناوەرۆک ئەی شێعرە نیشان ئەیاد بویژ وە بنەڕەتا ئایەم فامییە و بیر و باوڕ درێوسێ بیووە، چۆن سەرنج دایەسە بارێ ڕەوانی و هەست و نەست نەوجۆانگەل! بابا ڕۆستەم کەریمی ئی وتووێژێژە وە هێن میرزا شەفیع مامێزەکی ئەزانێ.

[2] ئی مۆنازێرە پیکهاتەیگ وە هونراوە و پەخشانە، کە ڕاوی وە بەین بەیتەگانا وە سەرهاتەگان ئەگەڕنێدەوە.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

(هەمان سەرچاوە)

دیوای دەسبازی و موعاشێقە، کورِ ئەیا دەلێ ئەروەی، دێودیژ ئەچێدەو ئەرای ماڵ. داڵگی ئەزانێ ئەوشێ:

«رِۆڵە سەمەن گوڵ، سەر گۆناد رِنیایە جێی دیانە نیشانکرد کام نەوجوانە؟

(هەمان سەرچاوە)

دێودە وت:

«دایکە چوومە ناو باخ وەنەوشەم چنی سەرپەل وەنەوشە سەر گۆنام رِنی...»

(هەمان سەرچاوە)

داڵگ هەر باوڕ ناکاد و ڕاسیەگەی وە دێودە ئەتوایێ، دێودیژ دەس ئاخر ئەوشێ داڵگە خوەت نەونەهاڵ نەیوودە، داڵگ دی دەس وەسەری هەڵ ئەگرێد و هەر یە ئەوشێ:

«[دایکت بمرێ]، ئانێ من ئەمکرد کار نەوهالان رِۆژێ سەد ماڵم ئەدا وە تالان!»

(هەمان سەرچاوە)

شێعرێک وە ناو ساڵمەن‌گەلا هەس کە گوایە ڕیشەی مێژوویی دێرێ. ئەوشن وە دەورێگا بێگانە ئەتێ ناوچەێگ ئەگرێ و ژنێ هەڵ کەفتێ و سالار وە یەخسیری ئەوا. ژنە خوەنەوار ئەود و شیووەگەی نامە ئەرای ئەناریێ و ئەپرسێ: «ئایا من دۆارە تۆ ئەیوونمەوە؟» ژنەیژ وە زوان شێعر، بەڵگە و دەلیلەێلێگ ئەتێریدەوە کە پیاگ دڵنیایەکا ئی چیوونە هاتنەوە وە شونیا نییە: (ئی شێعرە هەم وە گۆرانی و هەم وە ئەردەلانی وتریاسەوە)

«وشتر لانە بکەی لە مغارەوە پەخشە مجەرِە بوێ لە بزمارەوە

نمەک بشانێ زەوین بیکا سەوز گوڵ باوەرێ چی رِەو زان رِەوز

قاتر بزایێ کەێکف بگرێ بەر ئەو سا ئەوینی باڵای شاپەروەر»[1]

بەش دوایی ئی وتارە، باسێ کۆتایگە لە بارەی وتۆوێژێ گاڵتە و تیتاڵیە. چەنها وتۆوێژ وە وێژەی فولکلۆر کوردیا مەنیەسەو کە هەر کام وە جۆرێ بزە ئەخادە سەر لێو ژنەفتیار و تاوێ خەم وە بیری ئەوادەوە. وتووێژ و شەرِەزوان "مێرزا شەفیع مامیزەکی" وە گەرد ژنە بەگزادەیا، هێشتا هەر هاوەبیر ساڵمەندەگان. ژنە وەتایەکاری ئەتێ "مێرزا" بوێنێ چوونکە شەیدای ئاوازە و شێعرەگانی بووە. ئانێ چەوی ئەکەفێدە "مێرزا" پەشیمان ئەودەو وە هاتن و دیدار، ئەویژ هەر، زوان شێعر جواو ئی بێ‌ئەدەبیە ئەیادەوە:[2]

---

[1] ئی بە سەرهاتیژە وە هێن "میرزا شەفیع مامێزەکی" ئەزانن و وە دو زاراوەی کەڵوڕی و ئەردەڵانی وتریاگەسەو.

ئەردەڵانیەگەی وەی جوورە وە زوان "حاجی رِەحیم لەتیفیەوە" -وە ئاوایی "حەسەن ئاوای" سنە- وە وتریایەسەو:

«وشتر بجیقنێ لە مەغارەوە فیچقە بناڵنێ بە چل مەن بارەوە

نمەک بپاشی بە سر میچەوە کەڵەشێر دیانی لێ بوات بە ڕیچەوە

مەرزە بە دەیم و کەماو لۆ پاراو ماسی لە بەرِیە قالاو لە رِوی ئاو

هێسر بزایێ کەێکف بگرێ بەر ئەوسا بوینی باڵای شاپەروەر»

[2] وە داخەوە لەی شەرِە زوانێە هەر ئی بەیتە ها بیرم:

«سینە ساجەکەل دانە تیا برژیاگ (...) تۆراغان دۆ لە تیا تورشیاگ»

«سینە ساجەکەل دانە تیا برژیاگ ... تۆراغان دۆ لە تیا تورشیاگ...»

وتوویژ «بەفر و هەپڵۆک» حەکایەتێ کۆنەس، ناوەڕۆکەگەی سەروەسەرنیان و شۆخی و تیتاڵیە، وە زوانێ تر ئی جۆرە هێن ئەدەبیات «گەوجانە= بلاهت»ە. کی کورد بوێد و ئی باسە نەژنەفتوێد؟! ئەوشن نزیک بەهارە و تازە «هەپڵۆک» چیووزەرە داگە. «بەفر» ئەنارێدە سەروەختیەو ئەوشێ شیوو وە پێم بکە. «هەپڵۆک» ئەوشێ بیلە با گەورە بۆوم ئەو وەخت، بەێنێ وە پێ ئەچێ. هەپڵۆک ئەنارێدە سەر بەفر و ئەوشێ ئیسە دی یاڵ و گۆپاڵێ هاوردمەسەوە بەفریژ کە دەورانی نەمەنییە و ئاخر عومریە وە زوان گاڵتە و تیتاڵی جواو ئەیادەوە.[1]

ئی تەمسیلە تێکەڵێگە لە شێعر و پەخشان، تام خوای قسەی عەوام دێرێ، کومێدیگ جێنسی واتە سێکسە. کەسایەتیەگانی لە لایەگەوە ئینسانێگ پیر و لە کارکەفتێگ و لە لای تریژەوە تازە جوانێگە کە شۆخی وە پێ ئەکا. ژێربینای ئی باسە بابەت کۆن عاشق بوون پیر و گاڵتە و تیتاڵی مەعشووقێگە کە سووژەی خوەی کەفتیەسە دەسی!

وتوویژ "مامۆسا قانێع"یژ وە گەرد تاوس تانجیا یەکێ وە سەیر و سەمەرەترین مونازێرەگەیل لەی چەشنەسە. قەوڵ درۆ و وادەی بێپایەی قانێع کە چما بکەفێدە ساڵێ تر پۆشەن تازە ئەڕای خوەی و جل تازەیژ ئەڕای تاوس ئەسەنێ، تێریژی ئەکا برسی نەود؛ تانجی ناچار ئەکا بایدە زوان و جوواوێ وە قانیع بیادەوە کە دی قسەی زل زل بۆڕێدەوە و بەسی کا (قانێع، ١٩٧٩).

وە دواییا ئیشارەی گۆتاییگیژ ئەکەین وە قسەملانێ دۆ هۆز کورد واتە کورد و گۆران کە هەرکام وە فەرهەنگ و خاسی خوەیان ئەوشن و ئەوتر وە تایبەتمەندیگەیل ناشیرین و ناڕەوا شەرمەزار ئەکەن. نموونەگەلێگ وەی وتووێژە کومێدیە هێشتا مەنیە[2].

---

[1] «شۆڕ شۆڕاو کەفتە ژێر (...)م ... خوەل وە سەرم بۆ ماڵ و ژنم»

[2] وە ڕۆژگاران لەیەوبەرا، کورد ئەڕای لەوەڕگای ئاژەڵەگانی گەرمیان کێفسان ئـەکرد بـەڵام گـۆران هـەر وە دێ و شـارەگانا نیشتەجێ بیوون. زندەگی هۆز کورد سەختتر ئەگوزەریاد.

وە بەشێگ وەی وتۆوێژا گۆران تەشەر ئەدا لە کورد کە ئاخری گەییگەسە ئاسیاو:

«کوردە بیکە بان نەوە ئاشتە ... بازاڕ خوەشی خوەش قوماشتە»

کوردیژ جواو ئەدادەوە وە تەشەرو ئەوت:

«چۆڕ چۆڕاوەی کەڵک و بانتان ... ئەتکێ وە بان سفرە و خوانتان...»

**بەشی پێنجم- رەخنە**

## سەرچاوەکان:


١. تـالبۆت، مایکـل (١٣٨٧) **جـەهان هۆلۆگرافیـک**، وەرگـەڕان داریـووش مێهرجـوویی، تـەیران، ئینتشاراتێ هێرمێس ، چاپێ شەشۆم.

٢. جەلیلیان، عەباس (١٣٨٥) **فەرهەنگ باشوور**، تەیران، ئینتشاراتێ پورسمان، چاپێ یەکۆم .

٣. جـەیتر، جولیـان (١٣٨٨) **ئاخێزگـەی ئاگـایی (خاسـتگاه آگـاهی)** وەرگـەڕان خوسـرەو پارسـا و هاوکاران، تەیران، ئینتشارات ئاگاه، چاپێ دێوم.

٤. داد، سیما (١٣٧٥) **فەرهەنگێ زاراوەێلێ ئەدەبی**، تەیران، ئینتشاراتێ مۆروارید، چاپێ دێوم.

٥. سـەنعەتی، موحەمـەد (١٣٨٧) **لێکدانەوەگـەل دەرێونناسـی وە هونـەر و ئـەدەبیات**، تـەیران، نەشـر مەرکەز، چاپێ چوارۆم.

٦. شـایگانفـەر، حەمیـدرەزا (١٣٨٤) **لێکوڵـینەوەی ئـەدەبی**، تـەیران، ئینتشـاراتێ دەسـتان، چاپـێ دێوم.

٧. قانێع (١٩٧٩)، **دیوانێ شێعر** کۆکراوەی بورهان قانێع، چاپخانەی زانکوی سلەیمانی.

٨. کـادن، جـی، ئـەی (١٣٨٠) **فەرهـەنگی ئـەدەبیات و لێکۆڵـینەوە**، وەرگـەڕانی کـازم فیرووزمەنـد تەیران، نەشرێ شادمان، چاپێ یەکۆم.

٩. مـەردوخ رۆحـانی، ماجـد و هاوکـاران (١٣٨٥ تـا ١٣٨٨) **فەرهـەنگێ فارسـی کـوردی (دەورەی سێ جڵدی)** سنە، زانستگای کوردستان، چاپێ یەکۆم.

١٠. مـیر سـادێقی، مەیمەنـەت (١٣٨٥) **وشـەنامەی هونـەرێ شـاعێری**، تـەیران، ئنتشـاراتێ کتـاب مەهناز، چاپێ سێوم.

١١. مـیرزا عەبـدولقادر پـاوەیی (١٣٦٨) **دیـوان شـێعر**، دەسـتەی نیووسـەرانێ کـۆڕێ شـێعر و ئـەدەبێ پاوە.

١٢. موحەممـەد هـەورامی، عوسمـان (١٩٧٦) **ژیـان و بەسـەرهات و هۆنراوەگانـێ وەلی دێوانـە**، بەغدا ، چاپخانەی کۆڕێ زانیاریێ کورد.

## کارتێکرنا فولکلۆری ل سه ر رۆمانا بلیجان

رەمەزان حەجی قادر [-]

**کورته:**

فولکلۆر گەنجینەیەکا ژ بن نەهاتیە. وێنێ راستەقینەیێ مللەتی تێدا دهێتە دیتن. ڤێ ڤەکولینێ ڤیایە سەرنج بۆ وێ چەندێ بهێتە راکێشان کو د شیان دایە فولکلۆر ببتە ژێدەرەکێ ب کێرهاتی بۆ ئەدەبێ هۆنەری و تایبەتمەندی و بەرفرەهیا رۆمانێ ژی رێخۆشکەرەکا دییە بۆ پتر ب خۆڤەگرتنا رەگەز و جورێن فولکلۆری. ئەو نڤیسەرێ بشێت مفایژ وێ گەنجینێ وەربگرتژ و سەرکەفتیانە د دەقەکا ئەدەبی دابمەزرینت دێ شێت کارەکێ مەزن ئەنجام دت. بەرهەمێ وی ژی دێ بت یەک ژ شاکارێن سەرکەفتی.

ڤەکولینا مە ژ سێ تەوەران پێکدهێت ژ پشتی ب کورتی ناڤەرۆکا رۆمانێ و ناڤەرۆکا داستانا «کەرٍ و کولک»ی یا کو رۆمان ل سەر قەرقودێ وێ هاتی ئاڤاکرنژ، دهێنە نیشان دان.

تەوەرێ یەکەم: بەراوردکرنەکە د نەقەبا هەردوو دەقان دا ل سەر ئاستێن یەکێن ڤەگێرانێ یێن وەک هەڤ و جەو ناڤ و دەمان.

تەوەرێ دووەم: کارتێکرنا جورێن فولکلۆری ئەوێن د رۆمانێدا هاتین مەزراندن وەکی «گۆتنێن مەزنانژ، پەژنژ، چیرۆک و سەرهاتیژ، سترانژ، حەیرانۆکژ، بیر و باوەر و رەوشت و تیتال» هاتیە بەحسکرن.

تەوەرێ سیێ: ئەو لایەنێ رۆمانێ «دووری فولکلۆری» گرنگی پێ دایژ، هاتیە بەحسکرن. ل دیماهی کێژی کێماتییێن دەقێ بەرچاڤ کرینە. ئەوژی «دووبارەکرن و رەگەزێ ژ نشکێڤەو درووشم»ن.

---

[-] مامۆستای بابەتی کوردۆلۆجی، پەیمانگای تەکنیکی زاخۆ.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

## پێشەکی

رۆمانا بلیجان ژ ٤٧ ناڤبڕا پێکهاتیە و ٤٦٣ لاپەرێن قەبارە مەزن ڤەگرتینە.یێ ڤێ رۆمانێ  بخوینت،دێ بۆ دیاربت کو  نڤیسەرێوێ گەلەکێ گرێدایی فولکلۆریە و شارەزاییەکا باش د کەلەپوورێ کوردیدا هەیە، ب تایبەتی ئەدەبێ فولکلۆرێ کوردی. چونکە گەلەک دەقێن فولکلۆری تێدا هاتینە بەرجەستەکرنژ، ب تایبەتی «داستانا کەڕ و کولک»ی. ڤێ داستانێ خۆ لسنورێن دەستکردێن کوردستانێ نەگرتیە و ل هەمی دەڤەرێن کوردستانێ و ب زۆربەیا شێوەزارێن کوردی «نێزیکی چل لڤێن وێ» هاتینە تومارکرن. د شیان دایە فولکلۆر ببت هاریکار بۆ جیهانیبوونا بەرهەمێ هۆنەریژ، ئەگەر نڤیسەر یێ سەرکەتی بت د بەرجەستەکرنا ویدا. سەبارەت وێ چەندێژ، ئایا رۆمانڤیسی ماف هەیە دەقێ هەمیێ یان روح و مەبەستێ ب تنێ ژ فولکلۆری وەرگرت؟ مرۆڤ نەشێت بێژتە رۆمانڤیسی، ئەڤی تشتی وەرگرە و ئەڤی پشت گوهێ خۆڤە باڤێژە،هەمیێ وەرگرت، هندەکێ وەرگرت. چ هاریکارە بۆ جوانی و هزرا کارێوی«ب دیتنا وی» کو کاری ل خوێندەڤانی بکتژ، دێ وی وەرگرت.

**دەروازە:**

رۆمانێ ل ئەوروپا سەرهلدایە و ئەم ملەتەکێ رۆژهەلاتینە و گەلەک درەنگ، رۆمان کەتیە دناڤ قادا ئەدەبیاتا کوردیدا. ژ بەر ڤێ چەندێ رەنگە ئێک پرسیار بکت و بێژت: ئەرێ د بنەڕەتدا، پەیوەندیەک هەیە د نەقەبا رۆمانێ و فولکلۆرێ کوردیدا؟

یەک ژ ژانرێن فولکلۆرێ کوردی، چیرۆکە. چ چیرۆک ژی د بێ حیکایەت نینن، د رۆمانێ ژی دا حیکایەت رەگەزەکێ سەرەکیە «هندیکە رۆمانە حیکایەتەکێ ڤەدگێرت، و هەر ئەوە روویێ وێیێ بنەرەتی و ئەگەر حیکایەت نەبا چ جە بۆ  رۆمانێ نەدبوون» (فورستر،١٩٦٠: ٣٤). حیکایەت رەگەزەکێ سەرەکیە د هەردوو کادا «حیکایەت رەگەزەک هەڤپشکە د نەقەبا رۆمانێ و هەمی ڕەنگێن چیرۆکێن فولکلۆریدا» (حمادی، ١٩٨٠: ١٢). کەواتە بەرسڤ ژی دێ بەلێ بت.

«بلیجان» یەکەم رۆمان نینە سۆد ژ  داستانەکا کوردی وەرگرتبت. یەکەم رۆمانڤسیێ کورد «عەرەبێ شەمۆ» رۆمانەک ب ناڤێ «کەلا دمدم» نڤیسییە ژ سۆد ژ فولکلۆێ کوردی وەرگرتیە.

## رۆمانا بلیجان و داستانا کەڕ و کولکێ سلێ

گەلەک دەقێن فولکلۆری، د رۆمانا «بلیجان»[1]دا هاتینە بەرجەستەکرن، وەلێ ژ هەموویان پتر، مفا ژ داستانا «کەڕ و کولک»ی وەرگرتیە و نڤیسەر ب خۆ ئاماژێ ب وێ چەندێ دکت، دەما رۆمانا خۆ پێشکێشی

---

[1] پەرویزێ جیهانی،(٢٠٠٦)، بلیجان، ڤەگۆهاستن ژ تیپێن لاتینی(هزرڤان)، ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد-دهۆک،چاپخانا هاوار. ب فەر هات زانین د ڤەکولینێداچەند تشتەک ژ رۆمانێ بهێت وەرگرتن، ژمارا لاپەری ژ رەخڤە بهێت نڤێسین و پێدڤی پەراوێزاناکت. ئەڤێ داستانێ گەلەک  لق  و شاخ ژێ د چن و جارا پێشیێ "پرفیسۆر س.ئێغیازارۆڤ" ل سالا ١٨٩١ چاپ کریە. دیسان "حەجیێ جندی" ٣٠ شاخێن وێ ل سالا ١٩٣٦ چاپکرینە و و ئەوێن کەتین دەست من و بۆ ڤێ ڤەکولینێ  مفا ژێ هاتی دیتن ئەڤەنە:١- کاسێتەکا هۆنەرمەندێ ملی"حەسەن عەلی خەنجەر"پارێزگەها دهۆکێ. ٢- کوڕکێ سلێ ژ

دەنگبێژێن کوردان دکت و ب تایبەتی [ئەڤ دلێ بەگزادە...یێ کو سترانا «کەڕ و کولک»وی د گۆت. (بلیجان:٤).

ب کورتی ناڤەرۆکا هەردوو دەقان:

ناڤەرۆکا داستانا کەڕ و کولکێ سلێ «یا فولکلۆری»:

"عەمەرێ سمایل ئاغا" ژ ئاغاییێ حەفت ملا بوو. سلێمانێ برایێ وی بابێ «کەڕ و کولک»ی زوو دمرت. پشتی کەڕ و کولک مەزن دبن. "عەمەر ئاغا" ژێ د ترستژ و پاشی پیلانەکێ بۆ دادرێژت. کورێ خۆ عەلی ڤرێدکت دیاربەکرێ ژ، دا کو ژ مال دوور بکەڤتژ و ئاغاییێن هەر حەفت عەشیرێن ملان و یێ دیاربەکرێ گازی دکت و فنجانا مەرجی د دەینت. مەرج ژی ئەوە یێ بچت تالانێ عەلی ئیسانێ گێسیژ، دێ کچا خۆ شەمسیخاتوونێ د تێ. کولک فنجانا مەرجی ڤەدخۆتژ، کەڕ حەز ناکت بچن تالانێ خالێ خۆ عەلی ژ، لێ کولک ژ یاخۆ ناهێت خار. کەڕ و کولک تالانی د ئینن ژ، وەلێ حەفت کورێن دوودێ د گەل حەفت سەد سواران ل هەوارا تالانی د هێن و کولکی دکووژن. عەلیێ عەمەر ئاغای دگەل پێنجی سواران ژ دیاربەکر د زڤرت و ل هەوارا کورمامێ خۆ دچت و شەش کورێن دوودێ دکوژت و پشتی د زڤرت بابێ خۆ دکوژت و شەمسیخاتوونێ ل کورمامێ خۆ «کەڕ»ی مارە دکت.

### ناڤەرۆکا رۆمانا بلیجان:

کوردستانا باکوور، هەمی ل بن دەستێ سلیڤ بەگێ بوو. ئەو و پاشی کورێ وی عەلیێ میر ب دەستێ نەیاران ژ ناڤ دچن. عەمەر ئاغایێ خائین جهێ وان دگرت. سلێمانێ عەلیێ میر، میرانیا بیرایێ (خزمێ) مامێ خۆ عەمەری ناپەژرینت و بەرەو بەریا شنگارێ دکەڤتە رێ. ل شنگارێ بۆ دەمێ دوو سالان، شڤانیا عەلیێ سواران دکت. حەسێ دوودێ یێ ئێزدی ،سەرۆک پەهلەوانە و بابێ هەشت پالەوانایە و یەک ژ وان کچە و ناڤێ وێ وەردەکە. وەردەکێ بۆ شووکرنا خۆ مەرج دەینانیە. سلێمان مەرجێ وێ ب جە دئینت و ل خۆ مارە دکت و پاشی دبت سەرۆک پەهلەوان. د پیلانەکا خیانەتکاریدا، سلێمان دهێت کۆشتنێ. دوو کوڕ ب ناڤێ (کەڕ و کولک) پاشبابی خودێ د دتێ. ب بوورینا دەمان وەردەک و هەردوو کورێن خۆ، بەرەو وارێ سلیڤ بەگێ (بابکالکێ کەڕ و کولک)ان د زڤرن. کەڕ و کولک دکەڤنە ژیێ سنێلەییێدا و ناڤ و دەنگێ وان ب پالەوانی ل ناڤ عێلی بەلاڤ دبت. گەلەک پێڤە ناچت، ئەڤینیا (کەڕ و پەریشان)ێ، بەلاڤ دبت. عەمەر ئاغا مالا وەردەکێ ژ ناڤ باژارۆکی دکت دەر. ئەوژی مالا خۆ ل پەرێ باژارۆکی ل (کانیا رحانێ) د دەینن. پاشی

---

پەرتۆکا (چیروکێن مللییێن کوردی) ،کۆمکرن و بەرهەڤکرن: جەمیل محەمەد شێلازی،ئینستیوتی کەلەپوری کوردی،چاپخانە:شڤان-سلێمانی،٢٠٠٥. ٣-دوو شاخێن (کەڕ و کولک)ژ پەرتۆکا (زارگۆتنا کوردا)ژبەرهەڤکرنا:جەلیلێ جەلیل-ئۆردیخانێ جەلیل، ٢٠٠٨ .٤- کولک و کەڕۆ یان(عەلی سار).پەرتوک( مامان برازا بزر کرد خالاَن خوارزا مەزن کرد)،هەندێک بەیتی پشدەر،کوکردنەوەی:زیاد موحەمەد ئەمین،ئینستیتیوتی کەلەپوری کوردی-سلێمانی،چاپخانە: ئاراس-هەولێر،٢٠٠٨.

عەمەر ئاغا مەرجی بۆ شووکرنا کچا خۆ د دەینت و دبێژت: یێ بلیجانا عەلیێ سواران ب شەر بۆ من بینت، دێ پەریشانا کچا خۆ دەمێ. "کەڕ" فنجانا مەرجا ڤەدخۆت. "کولک" و وەردەک د بێژنە (کەڕ)ی گوهێ خۆ نەدە عەمەر ئاغای، ئەو مرۆڤەکێ خائینە. دێ چەوا چی شەرێ مال خالانێن خۆ؟ نەهەرێ (کەڕ) ژ سەر رەقیا خۆ ناهێت خار، (کولک) ژی بێ دلێ خۆ، ل گەل دچت. پشتی شەرەکێ مەزن و کوشتنا گەلەک پالەوانا و ب تایبەتی چار کورێن حەسێ دوودێ، (کەڕ) ب گرانی بریندار دبت، پاشی دمرت.

هەرسێ خال (پشتی دزانن ئەڤە کورێن وەردەکێنە) و کولکژ، هێرشێ دکن سەر عێلێ عەلیێ سواران. پشتی کەس نەمای خۆ ل بەر وان بگرت، کولک و هەرسێ خالێن خۆ و ئەو هەمی خەلکێ خۆ دایە دگەل وان بەرەو کانیا رحانێ دکەڤنە رێ. عەمەر ئاغا خۆ ب دەستڤە بەرددت و داخازا لێبوورینێ ژ وەردەکێ و کولکی دکت. وەردەک خەلکی ژ هەمی دەڤەران کۆم دکت و ل دادگەهەکا گەلێریدا عەمەر ئاغا دان ب هەمی گونەهێن خۆ داتنت و حکمێ سێدارێ بۆ دهێتە راگەهاندن، لێ وەردەک وی حوکمی دگۆهرت و وی و ژنا وی ژ کوردستانێ دوور دئێخت.

### تەوەرێ یەکەم

بەراوردکرنا هەردوو دەقان:

ڤەکولەر وەسان بۆ چوویە کو رۆمانڤیس یێ هاتی و باش گۆهدێریا سترانا کەڕ و کولکی کریە-یان ژی خاندیە- و پاشی ل دیڤ هزر و بووچۆنێن خۆ رۆمانا خۆ نڤیسیە. تشتێ ب کێرنەهاتی یێ ژێهاڤێتی و تشتێ ڤیای و ب هزرا وی د بەرژەوەندیا دەقێ دایە، وەک فولکلۆری هێلایە و گەلەک ژی ب سەرڤەکریە.

هەر رۆمانەکێ شێوازێ خۆ یێ هەی و تایبەتیا وێ ل ئێکا دی دووبارە نابتژ، رەخنەگرەک دبێژت:«ئەگەر چەند رۆمانڤیسەک ل سەر یەک مێز روونن و ل سەر یەک بابەت بنڤێسن، جوداهی دێ د دەقێت وان دا هێتە دیتن» (شاهین،٢٠٠٧: ٧).

«بلیجان» ل سەر قەرقودێ داستانا کەڕ و کولکێ سلێ هاتیە ئاڤاکرن، وەلێ ب هیچ رەنگەکی رۆمانڤیس نەهاتیە دەقەکا بەری خۆ کۆپی بکتژ و بینتە خارێ. بلیجان دەقەکا دی و نوویە.

د ڤان رەگەزان دا بەراوردکرن د نەقەبا وان دا هاتیە کرن:

یەکەم: یەکێن ڤەگێرانێ یێن وەک هەڤ د هەردوو دەقان دا:

د هەردوو دەقان دا گەلەک یەکێن ڤەگێرانێ وەک هەڤن. بۆ نمۆنە:

- عەمەر ژ، ئاغایێ حەفت – هەشت هۆزایە.
- سلێمان وارێ خۆ ب جە دهێلت. وەردەکا حەسێ دوودێ بۆ خۆ دئینت.
- کەڕ و کولک ب ئێتیمژ، ل جهەک دووری وارێ خۆ مەزن دبنژ، پاشی د زڤرن ناف عەشیرا ملان.
- کەڕ و کولک د بن پالەوان و ب راڤ و نێچیرێ ڤە دمژوولن. کوونەک (رەشمالەک) جدا ژ یێ عەمەر ئاغای ڤەددن.

- عەمەر ئاغا دترست و خەلک ژی د بێژنێ ئەڤە دێ سەری ژ تە ستینن. فنجانا مەرجی د هێتە دەینانژ، یێ فنجانێ ڤەخۆتژ، دێ چت تالانی (جانییێ) و شەرێ مال خالان و ئەگەر ئیناژ، دێ ئاغا کچا خۆ دەتێ. ل هندەک سترانێن شەرا دا ئەڤە ب بەرچاڤ دکەڤت ژ، بۆ نمۆنە «فنجانا مەرجی» (جەلیل،١٩٧٧: ٣٥٩-٣٦٠). بۆ دەروێشێ عەبدی ژی دهێتە دەینان.

- مەبەست ژ فنجانا مەرجی ژ ناڤبرنا (کەڕ و کولک)انەژ، دا کو ئاغاتی بۆ نە زڤرت.

- خەوا ئەنگوری.

- کەڕ د رۆمانێ دا و کولک د داستانێدا فنجانا مەرجی ڤە دخۆت و گوهێ خۆ نادت برا و دەستگرتییا خۆ.

- ناڤێ عەرەبستانێ دهێت.

- وەسیەتا دەیکا خۆ ب جە نائینن. کەڕ ب ریڤە نێچیرێ دکت و کار غەزالێ و تێشکا حێشترێ دکوژن و دخۆن. سۆسک (جانی)ژی دچت سەر ئاڤا گەنی و گەلەکێ ڤە دخۆت.

- شەڕ و کۆشتن د نەقەبا خال و خارزان دایەژ،یێ ئاگرێ شەری هەلکریژ، عەمەر ئاغایە.

- سۆسکێ (جانیا کەڕ و ی د رۆمانێدا و یا کولکی د داستانێدا)ژ، ل جهێ شەری و پشتی بووی ئەگەرا کۆشتنا سیارێ خۆ و ل دیف وەسیەتا ویژ، دکۆژن و ڤەدشێرن.

**دووەم:**

جە د هەردوو دەقادا:

د داستانێدا ناڤێ دیاربەکرێ د هێتژ، وەلێ جهێ هەری ئاشکرا و هەڤپشک د هەردوو دەقاندا، وارێ عەشیرا ملانەژ، دیارە باکوورێ کوردستانێیە. دیسان عێلێ عەلیێ سواران ل بنێ بەرییێە و هەڤسنوورن د گەل عەرەبان «شنگالە د رۆمانێدا».

و د رۆمانێ و داستانێژیدا کاروانێ «کەڕ و کولک»ا ب شەڤ ل سەر ئاڤا گولگەنیێ دمینن.

جهی د رۆمانا بلیجاندا پانتاییەکا زۆر یا ڤەگرتیژ، ئەڤە سلیڤ بەگە (سەرانسەری کوردستانا باکور...ل ژێر فەرمانداریا سلیڤ بەگدا بوون (بلیجان:١٨). دیوانە جندی ژ وەلاتی هەمیێ تێکڤە ددت «ئەرێ ئەز هەر سال ژی هە ژ سیپانێ خەلاتێ را دەست پێ دکم و تا شەنگارێ دچم» (بلیجان:٣٤٩). یان دەما کەڕ بیریا دەستگرتیا خۆ دکت «ل دونیایا بیر و هزراندا ژ خوە دا زۆزانێن سیپانێ خەلاتێ. ل چادورا دایکا ماجانێ دا د گەل پەریشانێ دەست ل ملان بوو» (بلیجان:٣٩٧). عەلیێ سواران باج و خەراجان ژ عەرەب و رۆمیان ژی وەردگرت «چەندک و چەند پەهلەوانێن رۆم و عەرەب و عەجەمان ل سەر چۆکان ئێخستینە. ل سایا سەرێ حەسێ دوودێ و هەر حەفت کورێن ویدا بووژ کو چەندین عێلێ عەرەبانژ، چەند گوند و باژارێن رۆمیان باج و خەراجا سالانە ددانە میرێ عەرەبان» (بلیجان:٢٨٤). ل جهەک دی ژی، بەحسێ عەرەبستانێ دهێتە کرن (مالا حەسێ ل ناڤ مالان بارکر و بەرێن خوەدانە عەرەبستانێ (بلیجان:٢٨٠). دیسان گەلەک جهێن مگرتی و جهێن بێناڤ دیار دبنژ، بۆ نمۆنە «دخوەستن وانا ژ گوندێ وانژ، ژ باژاڕێ وانژ، ژ باژارۆکێ وان» (بلیجان:١٢)

«کانیا ئەلوهان، چیایێ هندشڤ، چیایێ زەمهەریرێ» (بلیجان:٧٨). «مەیدانا زۆرانێ» (بلیجان:١٢٥)، «زانگا خوونێ» (بلیجان :١٣)، «وارێ کانیا رهانێ» (بلیجان:٤٥٨).

**سێیەم**

ناڤ د هەردوو دەقاندا د دەمێ خاندنا رۆمانێ، وەسان دیار دبت کو گەلەک ناڤ هاتینە بکارئینان و زۆربەیا وان ناڤان د کوردەوارییێدا دهێنە ب کارئینان و مرۆڤ دشێت بێژت، ژ فولکلۆرێ کوردی وەرگرتیە و گەلەک ژ وان د (داستانا کەڕ و کولک)ی دا هاتینە و ب ڤی رەنگێ ل خارێ:

١- ناڤێن ژ داستانێ هاتین وەرگرتن:

**ناڤێن کەسان:** د هەردوو دەقاندا ئەڤ ناڤە ب بەرچاڤ دکەڤن (کەڕژ، کولک، سلێمانژ وەردەک ژ عەمەر ئاغاژ، عەلیێ سوارانژ، حەسێ دوودێژ، نەعمەتێ عیسیژ، لەکۆیێ بەگزادە). کەسێن ناڤ لێهاتینە کرن د داستانێدا نێزیکی پازدانەژ، بەلێ د رۆمانێدا پتر ژ پێنجی کەسان ناڤ لێهاتیە کرن و ژ بلی کۆمێن شڤان و بێری و کاروانیانژ، شەرکەر و رێگر و دز و جەردە ژ داوەتی و کۆمبوونێن جدا-جداژ رۆمان یا هاتی داگرتن ژ مرۆڤان. «تە دەرزی باڤیتا ل بەر کۆمەلێ ل ئەردی نەدکەت» (بلیجان:١٥٤).

**ناڤێن گیانداران:** د داستانێدا ناڤێ دەوارێ عەلیێ سواران (بیجانە). د رۆمانێ ژیدا ناڤێ جانیا عەلیێ سواران (بلیجانە) ژ رۆمان ب ڤێ جانیێ هاتیە ناڤکرنژ و شەر و کوشتنەکا زۆر ل سەر بلیجانێ چێدبت.. هەروەسان د داستانێدا ناڤێ جانیا کولکی (سۆسکە)ژ و ئاڤا گەنی ڤەد خۆت و پاشی سەرەجە دگرت و د شەریدا شەپرزە دبت «د چە سەر گۆلگەنیداژ، حەڤت تەنگێ سووسکێ هەنەژ، هنگێ ئاڤا گۆلگەنی د خوە ژ حەڤت تەنگا دقەتینە» (جەلیل، ٢٠٠٨: ٧٢). هەر ژ بەر ڤێ چەندێ یە کولک دهێتە کوشتن. د رۆمانێ ژیدا (سۆسک) ناڤێ جانییا کەڕۆ یە ژ و هەر وەکی ل داستانێ دا هاتی ژ ئاڤا گەنی ڤەدخۆت و ب ڤی رەنگی هاتییە (تا شەش رۆژان ئاڤێ و گیهێ ل سۆسکێ ببڕن. بلا هەر چ ئاڤا گەنی کو ڤەخواریەژ، ژ ناڤا وێ هەڕە (بلیجان:٤٠١).

٢- ناڤێن ژ فولکلۆری وەرگرتین:

**ناڤێ هۆز وعێلان:** کورد جڤاکەک عەشائیریە و ناڤێ عەشیران د چیرۆکاندا ب بەرچاڤ دکەڤت و د ڤێ رۆمانێدا ناڤێ ڤان عەشیران دهێت «کیکان ژ، میلان، زیلان ژ، سیپکان ژ، مردێسیان ژ، شادکان ژ، شکاکان ژ، رەشکۆتانژ، سلیڤان، خەرزان، مهەمدان و بەرازیان...» (بلیجان: ١٨).

ئەڤ هۆزە، ژ بلی وێ چەندێ کو عەشیرەتێن کوردانە و ب ناڤ و دەنگن ل کوردستانێ، د فولکلۆرێ کوردیدا ناڤێ وان یێ دیارە و د گەلەک سەرهاتی و چیرۆکان دا دووبارە دبن. بۆ نمۆنە چەند جارا د پەرتۆکا (سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقییێ) (جەلیل: ٤٧٤، ٦٤، ٢٤٤) دا دووبارە دبن.

**ناڤێ جە و واران:** جە ب خۆ ،ژ بەری مرۆڤی هەبوو، (هەبوونا جهی ژ لایێ بابەتیڤە ناهێتە گرێدان ب هەبوونا مرۆڤیڤەژ، وەلێ ئەو بهایێ جە بۆ خۆ دستینت، بهایەک مرۆڤایەتیە، مرۆڤ دشێت بهای بدتە تشتا و

جهی، وگوهرینان بێخته تێدا...) (حسين،١٤٢١: ١٠٩)، لەورا هەبوونا مرۆڤی د جهیدا د بته ئەگەرا وێ چەندێ بهایەک بۆ جهی پەیدا ببت. «و هەر جهەکێ مرۆڤ گەهشتییێ، ناڤ لێ دەینایە و ئەو ناڤلێکرنە بوویە ئەگەرا وێ چەندێ مرۆڤ ئاشناتییێ دگەل جهی پەیدا بکت ...» (حاجی قادر، ٢٠٠٦: ٦٠). دەینانا ناڤی ل سەر جهی، گەلەک جاران ب بوویەران ڤەگرێدایە، د ڤێ رۆمانێدا ناڤێ گەلەک جهان ب بەرچاڤ دکەڤت، کو گرێدای ژیانا کەس و کومەڵگایێ رۆمانێیە، بۆ نمۆنە ناڤێ ڤان جهان د رۆمانێدا ب بەرچاڤ دکەڤت: (گەلییێ هێستر کوژان. (بليجان:١٨٠). (چیاییێ کاروان بزدینک. (بليجان:١٨٠)، (چەپا جەردان. (بليجان: ٤٠٦)، (گەلییێ پەزکووڤیان (بليجان:٢٤٠).

**ناڤێ گول و گیا:** هەر چی گول و گیا ل دۆل و نەهالان هەنە، ناڤێ وان نەهاتیە ژ بیرکرن و جهێ خۆ د رۆمانێ دا گرتیە (بێهنا گول و سۆسن و بەیبوونانە. بێهنا جاتریژ، پوونگژ، سۆرگول و بەنەفشەژ، شەڤبو... (بليجان:٧).

**ناڤێن یاریا:** د کوردەوارییێدا گەلەک جورێن یاریان هەنە و ناڤێ گەلەکا ژ وان د رۆمانێدا هاتینە «لەیزێن جورٍ بە جورٍ ژ، یێن وەکە؛ کابانیژ، مەلانیژ، هۆلانیژ، پیتانیژ، ماتانیژ، گیزانی...» (بليجان:١٧١).

**ناڤێن گیانەوەرا:** د رۆمانێدا سەیا (سەگ) رۆل هەیە و ناڤ ژ کوردەوارییێ وەرگرتنە بۆ نمۆنە (قافرەش، گوریێخ، بگێر، چالیژ، هرچۆ (بليجان:٨٠).

هندەک ناڤێن دی ژی د رۆمانێدا هاتینەژ، د فولکلۆر و دیرۆکا کوردیدا گەلەک د بەربەلاڤنژ، بۆ نمۆنە (دەشتا حەرانێ ژ (بليجان:٣٣٦.)، (چەمێ موسلێ ژ (بليجان:٣٤٢). وەلێ د داستانێدا ئەڤ ناڤە ب بەرچاڤ ناکەڤن.

## چارەم

دەم د هەردوو دەقادا

هەرچەندە نە د داستانا فولکلۆری و نە د رۆمانا بليجان دا چ سال نەهاتینە ژ دا کو مرۆڤ بشێت ب درستی سەردەمێ رووداںان دەستنیشان بکت. لێ تشتێ دیار ئەوە کو ئەو شەرٍ و پێکدادانێن چێدبن د نەقەبا عەشیرەتان داژ، شێوازێ وان ڤەدگەرت بۆ سەردەمێ ئوسمانیان. رەنگە ژ نیڤێ و پێڤژ، پشتی حوکمرانیا ئوسمانیا بت و ئەڤا هە د ڤی رستەی دا پتر بەرجەستە د بت (تو یێ ژ ریڤی و رێبواران بپرسیژ، ل کوردستانا ژێرین هەموو میر ئەلی سواران دناسن (بليجان: ٣٢٨ ). ئەگەر ژێرییا کوردستانێ با ژ ئەڤە بۆ هەمی سەردەما دبت. وەلێ (کوردستانا ژێرین) مەبەستێ دگوهرت. ئەڤ دەستەواژە بۆ پشتی دامەزراندنا دەولەتا عێراقێ دهێتە بکارئینان.

د دەقا فولکلۆریدا هاتیە «عەڤدلمەتلبێ دیوودێ گوهێ بێبەختیاژ،حەڤت سالا ئەسکەریا سەبابێ ترکا کریەر» (جەلیل:٢٩).

د رۆمانێ دا گرنگی هاتیەدان ب دەستنیشان‌کرنا دەمان ژ، و تەمەنێ کەسان و وەرز و دەمێن سالێ د دیارن. بۆ نمۆنە: «نەمەتێ عیس سی سالێن خشت ل پشت خوە هێلایە» (بلیجان:١٨٥). «میر ئەلی سواران...ل سەر چل و پێنج سالیێ رابوو» (بلیجان:١٣١). «ئەهمەد بەگ بیستوپێنج سالی بوو» (بلیجان:١٣١)؛ «کوتا مەها گۆلانێ بوو» (بلیجان:٩٢). «سەرەتایا هاڤینێ بوو» (بلیجان:١٦).

ئەگەر مرۆڤ سەحکتە روودانێن رۆمانێ ژ «بژنکەفتنا عیسێ میر» تا کو ب دیماهی هاتنا رووداناندێ شێت بێژت ٣٥ سالان ڤەکێشایە، یان ژیێ «کەرِ و سلێمان»ی کو کورِ و بابن، و رووداننێن رۆمانێ ژ وان دەست پێدکت و ب وان دیماهی دهێت. هەردوو پێکڤە دەورووبەرێ ٣٥ سالان ژیاینە.

### تەوەرێ دووەم

بلیجان و جورێن فولکلۆری

خاندەڤایێ رۆمانێ هەست ب وێ چەندێ دکت کو ڤەگێری نەڤێت بێی فولکلۆری بەردەوامییێ بدت کارێ خۆ. گەنج ئەڤیندارێن گوهدانا بەیتانە «بەیتا دمدمژ، بەیتا زەمبیل فرۆش و ب دەهان بەیتێن دی» (بلیجان:٢٨١). «د کیژان سەرهاتی و سترانا کوردیدا هاتیەژ، کو دوژمن ب هێزا دەست و لەپان ب کوردان کاریە» (بلیجان:٤٥٢). ژ بلی وێ چەندێ کو هێڤێنێ رۆمانا بلیجان ژ داستانا کەرِ و کولکێ سلێ یە ژ رۆمانڤیسی گەلەک رەگەزێن دی یێن فولکلۆری ب کارئینانیە و سوودەکێ زۆر یێ ژێ وەرگرتی. کا چەوا هەر یەکی ژ ڤان جۆران، دەربرینا وی جدایە ژ یا یێ دی، هەریەکی تایبەتمەندیا خۆ ژی یا هەی. ڤەکۆلەر د ڤان خالێن خارێدا ئەوان جوران دەستنیشان دکت:

#### گۆتنێن مەزنان

د رۆمانێدا گۆتنێن مەزنا گەلەک ب ئاشکرایی دکەڤنە بەرچاڤ و ل گەلەک جهان جهێ خۆ د نەقەبا کڤانان دا گرتیە و وەکی نمۆنەژی ب کارئینایە، دەما بەحسێ بەفرا سپی دکت، یا کو ل زۆزانان ب سالان دمینت و ناحەلهت، لێ دێ بینی کرمکەک ژ بەفرێ ب خۆ، چێ بوو و ئەو بەفرا جوان و سپی هێدی-هێدی ژ ناڤ بر. ڤەگێری پەندا (کورمێ دارێ نە ژداریێبە، رزیانا دارێ تونەبە (بلیجان:١٠). جارەکێ ل سەر ژ ناڤچوونا بەفرێ و جارەکێژی ل سەر ئارێشێن کاروانێ کورێن وەردەکێ ئینایە، دەما هەڤالەکێ وان یێ رێکێ خیانەتێ ل کاروانیان دکت و سۆسکا (ماهینا) کەرِی بەرددت ناڤ ئاڤا گەنی و پاشی نەخۆش دکەڤت، هەر ئەڤ بوویەرەیە، دبتە ئەگەرێ وێ چەندێ کەرِ د شەریدا بهێتە کوشتن، چنکی سوسکا وی د شەریدا و ژ ئەگەرێ ڤەخارنا ئاڤا پیس، د گۆرەپانا مێرخاساندا نەشێت وەک پێدڤی چەرخا ڤەدت و دمینت د تەقنێرِا. ژ بەری ئەڤ شەرە دەست پێبکت، شەڤەکێ کولک ژ خەو رادبت، دبینت سۆسک ل سەر جهێ خۆ نینە، یەکسەر هزرا وی بۆ وێ چەندێ دچت کو ئێکی سۆسک بەردابت و د بێژتە برایێ خۆ (کورمێ دارێ نە ژ دارێ بە، رزیانا دارێ تو نەیە) (بلیجان:٣٩٩). ئەڤ گۆتنە د کوردەوارییێدا گەلەکا زۆرە و د فولکلۆرێ کوردیدا گەلەک دهێتە ب

کارئینان. یا ژ وێ بالکێشتر ئەوە، سووسا نانپێژامالا میر ژ بەر گۆتنەکا مەزنا هاتبوو دەرکرن (مالا وێ بەلەنگازێ ژی هە ل سەر یەک گۆتنا پێشیان ژ باژاڕۆک، دا بارکرنێ) (بلیجان:٣٨).

دیسان د کوردەوارییێدا گۆتنەکا هەی (خوارزا ژ خالانە). ڤێجا دەما سلیڤ بەگێ سلیڤی دڤێت ژنێ بۆ کورێ خۆ عیسێ بینت، هندی د هێتێ نەشێت چاڤێت عیسێ میر ژ خەجیجا خۆشکا عەمەرۆکی وەرگێرت، و دبێژت هەبت نەبت خەجیج بۆ منە و ئەز دێ وێ خازم، عەمەرۆک چاڤشۆر و نوکەرێ داگیرکەران بوو لەورا سلیڤ بەگێ ئەڤ چەندە ب دلی نەبوو و دگۆت (خوارزا ژ خالانە) (بلیجان:٢١). ئانکو عەمەرۆک نەچ زەلامە و گەل فرۆشە، ڤێجا ئەگەر کورێ من خۆشکا وی بینت دوی دەمی دا نەڤێین من ژی دێ د چاڤشۆر بن و وەکی خالێ خۆ دێ د بێ روومەت و خائین بن.

ل بەرپەرێ ٩٢ێ ژ رۆمانێ گۆتنا (جەرِی ئاڤێ، دێ د ئاڤێدا بشکێ) ب بەرچاڤ دکەڤت، د کوردەوارییێدا ئەڤ گۆتنە گەلەکا بەربەلاڤە و ل کوچک و دیوانا دهێتە گۆتن. رۆمانڤیسی ل سەر سەرهاتیا قافرەشی (سەیێ سلێمان)ی ئینایە و دیارە قافرەشی د وێ بهارێدا گەلەک شەر ل گەل گۆرگان کرینە و دیماهیکێ ب دەستێ/دەڤێ گۆرگان ژ ناڤ دچت.

دیسان گەلەک جاران وەسان چێدبت یەک بچت جهەک نەنیاس و دوور، یەک ژی شیرەتان لێ بکت و بێژتێ هشیار بی خەلەت نەبی ،ئەو د بێژتێ (مرۆڤ ب پرسیاران دچت حەجێ). ئها ب ڤی رەنگی دەما کووچا وەردەکێ ژ بەریا شنگارێ بەرەو زۆزانا دایە رێ، چەند رێک لێ هندا ببا دگەل خۆ دگۆت (مرۆڤ ب پرسیاران د گیژە جی و واران) (بلیجان:١٨٠).

**پەژن (ئیدیۆم):**

پەژن، هندەک ژی دبێژنێ (پێگۆتی) (مازی، ٢٠٠٦: ٢٦). چ ژ پەیڤەکێ یان ژ دەستەواژەیەکێ یان ژ رستەیەکێ پێکهاتبت، مەبەست پێ نە ئەو واتایە، ئەوا هەرکەس دزانت، بەلکی مەبەستەکا دی یا د پشترا و مەجازییە. ئەڤ جورە د زمانێ کوردی دا گەلەکێ بەربەلاڤە، کوردیزانەک نینە هندەکا ژ ڤان پەژنا نەزانت، لێ ئەو مرۆڤێن رەهوان و زمان شرین ژ هەرکەسەکێدی پتر ڤان پەژنان د ئاخفتنا خوەدا ب کاردئینن، هندەک پەژن گەلەک نێزیکی پەندانن (گۆتنێن مەزنان) و هندەک جاران مرۆڤ نەشێت جداهیێ بێخت د نەقەبا هەردووکاندا. لێ ب رەنگەکێ گشتی پەژن گرێدایی دەڤەرەکا دەستنیشانکریە و ئەگەر ئێک خەلکێ وێ دەڤەرێ نەبت، د مەبەستا ئاخفتنکەری ناگەهەت. تایبەتمەندیەکا پەژنا ئەوە کو (ناهێن وەرگێران بۆ زمانەکێ دی) (حەجی جەعفەر، ٢٠٠٦: ٨). چنکی ب وەرگێرانێ مەبەستا خۆ ژ دەست ددت.

د «بلیجان»ێدا گەلەک پەژن یێن ب کارهاتین، ئەگەر ئەم سەحکینە ل٦ (دوورکوژێن نێزیک خسارن) ب بەرچاڤا دکەڤت، مەبەست نە ئەوە کو مرۆڤی ژ دوورڤە ب گورزان دکوژن، نەخێر مەبەست پێ ئەوە دەما مرۆڤ تشتەکی ژ دوورڤە دبینت و کاری ل مرۆڤی دکت و دلێ مرۆڤی دکەڤتێ وەلێ دەما ژ نێزیک دبینت، دلێ مرۆڤی ژێ سار دبت و ئەو هزرا مرۆڤی بۆ دکر وەسان دەرناکەڤت و ئەڤ گۆتنەب رەنگەکێ بەرفرە ل لایێ کوردان دهێتە ب کارئینان و بڤی رەنگی عەبدولوەهاب کانەبی بەحس لێدکت: «دوورکوژ-لە دور

**بەشی پێنجم- رەخنە**

جوانی لە نزیک ناحەز، شتێک لە دورەوە جوان ئەنوێنێ لەنزیکەوە وانابێ. - دور کوژی نزیک خەسار» (شریف، ٢٠٠٥: ١٢).

دەما یەکی بڤێت خۆ دیار بکت کو یێ ب کێرهاتی و شولزانە، لێ نێزیک و دەورووبەرێن وی رێکێ نادنێ و ژێ د پشتراست نینن، ئەو ژی وەسان هزر دکت، چنکی هەمی ناس و مرۆڤێن وی نە و هەمی دەما ل بەر چاڤێن وانە و خەلەتییێن وی دبینن. لەورا شینا بێژتێ، من شیانێن هەین و ئەز ژ یەکێ دی چێترم، دێ گۆتنەکێ بێژت. د رۆمانێدا ب دوو رەنگا ئەڤ تشتە د کەڤتە بەرچاڤ:

١- ل بەرپەرێ ٢٥٨ وەسان دیار دبت کو دلێ «نعمەتێ عیس» کەتیە کچ خالا وی «پەریشانێ» و گەلەک هەوڵ ددت بشێت جهێ خۆ د دلێ وێ دا بکت، وەلێ نەشێت ئەڤی تشتی ب دەست خۆ ڤە بینت، و یا ژ ڤێ ژی خرابتر، ئەڤینا کچ خالا وی «پەریشانێ» و «کەر»ێ کورێ سلێمانێ عەلیێ میر ئاشکرا دبت، لەورا نعمەتێ عیس ڤێ گۆتنێ ددت بەر دلێ خۆ و دبێژت «گیهاییێ هەوشێ تالە، مریشکا خەلکێ قازە». ئانکو پەریشان مرۆڤا منە، لەورا ئەز نەڤێم، لێ کەر بیانیە، حەز ژێ دکت.

٢- دەما وەردەک د بێژتە کورێن خۆ؛ ئەگەر هین گەهشتن ناڤ عێلێ عەلیێ سواران، ئاگەهداریا خالێن خۆ بکن، هین دزانن مێرخاسێن عەلیێ سواران ئەون و بێی وان کەسەک نەشێت چ نەخۆشیا بینت رێکاوە. کەر گەلەک تۆرە دبت و دبێژتە دەیکا خۆ «گولکێن مالێ ژ گایێن مالێ ناترسن» (بلیجان:٣٤٢).

دیسان ل ژ لاپەرێ ١٢ێ د رۆمانێدا «تازە دەستێ خوە یێ چەپێ ژ یێ راستێ ناس دکر» هاتیە. ئەڤە گۆتنەکا بەربەلاڤە و دەما مرۆڤ سالۆخێن ئێکی دکت و وەسان بدت دیارکرن کو هێشتا زارۆکە و چ ژ دنیایێ نزانت، دێ بێژت (دەستێ راستێ و چەپێ ژێک جودا ناکت) (صالح،٢٠٠٦: ٨٦).

د کوردەوارییێدا دەما ترس دکەڤتە دلێ ئێکی دا، و رێکا رەڤێ بگرت بەر، یێ سالۆخا ڤی دیمەنی بکت دێ بێژت: (وەسان رەڤی، دەست چوون هاری پیا) ئەڤە دەربرینێ ژ وێ چەندێ دکت کو هندێ ب لەزە داکو خوە قۆرتالبکت، ئەگەر ژێ هاتبا دا هەمی ئەندامێن لەشێ خۆ بتە هاری پیا. د رۆمانێدا ب ڤی رەنگی هاتیە (سەریێ تو ژ پیان را گۆریبی) (بلیجان:١٣).

دیسان د رۆمانێدا هاتیە (هات بوو هەیفا باڤۆ، لێ دادێ ژی ل سەر دا دەردا بوو) (بلیجان:٢٠٦). د کوردەوارییێ دا ب ڤی رەنگی ژی دهێتە دەربرین (عزرا ژ قوبحەتێ مەزنتر) یان (دا کل دت کورەکر) (هەمان سەرچاوە:٧٥). مەبەست ژی پێ ئەوە، ئەگەر مرۆڤی ڤیا خوەهریەکێ راست بکت، بەلێ ب دەستڤە نەهێت و بەرۆڤاژی خرابتر لێبهێت.

ئەگەر تشتەک ژ یەکی نەهێت یان ژی نە د جهێ خۆ دابت، دێ بێژن «هرچ و گێرە گا و رەقاس»، د رۆمانێ دا ئەڤ مەبەستە ب ڤی رەنگی دەربریە و هندەک ژی ب سەرڤەکریە «دارک و دێرە؟ هرچ و گێرە؟ هێشتر و لەبلەبی؟ رەقە و خەلیلی؟ روڤی و شارستان؟ گورگ و ئەیوان؟ شڤان و دیوان؟ وەردێ و سلێمان؟» (بلیجان: ٩١-٩٢).

## چیرۆک و سەرهاتی

د دەمێ ڤەگێرانا ڤێ رۆمانێدا، گەلەک چیرۆک و سەرهاتیێن کورت دیار دبن و جهێ خۆ د ناڤ رۆمانێدا دکن. د رۆمانا تەقلیدیدا و ئەو شێواز دهاتە پەیرەو کرن. ئوستێن وارین دبێژت «سنعەتەکا دی هەیە -نهۆ کەسەک بکار ناهینیت- ئەو ژی ئەوە کو کورتە چیرۆکەکێ د ناڤ رۆمانێدا بکار دهینن...د ئاستەکیدا ئەم دکارین سەحکینە ڤی سنعەتی کو هەولدانەکە ژ بۆ پرکرنا ڤالاهیا کاری، لێ د ئاستەکێ دیداژ، ئەم دکارین بێژین کو لێگەریانەکە ل هەمە جۆریێ» (وارین و ڕینێ،٢٠٠٨: ٣٢١).

د بلیجانێدا ئەڤ سەرهاتیە مەبەستا نڤیسەری ئاشکرا دکن، بۆ نمۆنە د سەرهاتیا «کۆلکا میرزۆ کزۆی» (بلیجان:٣١)دا هاتیە، دەما نەخۆشیا (کۆتی بوونێ) ل وێ دەڤەرێ پەیدا دبوو، چ چارە بۆ نەددیتن و ئەڤ نەخۆشیە زوو-زوو بەلاڤ د بوو، لەورا هەرکەسەکێ تۆش ببا یەکسەر د بر ژ و د هاڤێتە د ڤێ کونێ دا تا کو د مر و مەرەم پێ ئەو بوو دا کو ئەڤ نەخۆشیە بەلاڤ نەبت. دەما میرزۆ کزۆ تۆشی ڤێ نەخۆشیێ بووی، وی ژی وەکی یێن بەری وی، ژ ناڤ خەلکی رادکن و دهاڤێژن د کولکیڤە. میرزۆ کزۆ ساخ دبت و پشتی چەند سالان د زڤرت ناڤ مرۆڤێن خۆ. خەلک ژی هەمی سەرسۆرمای دمینن و ناڤێ وێ (کون)ێ ژی دکن کولکێ میرزۆ کزۆ. هەبوونا ڤێ سەرهاتیێ د رۆمانێدا گەلەک تشتا ب خۆ ڤە دگرت:

١-دەما سلێمانێ عەلیێ میر ل بەر دەرێ کولکی دبێژت: «ئا، ژ دەردێ کۆتی بوونێ را ژی دەرمان پەیدا بوویە، لێ ژ ختریا مە را هێ نا....» (بلیجان:٣٢). ختریا مە براکوژیە و چارە بۆ نەهاتیە دیتن.

٢-ل بەر دەرێ کولکی ترس دلێ سلێمانی دادگرت و نەوێرت بچت ژوور و ب پێدڤی دزانت سەیێ خۆ (قافرەش)ی دگەل خۆ ببت و د هزرا خۆدا دبێژت: «تەهەش! من چ را قافرەش ب خوەرا نە ئانی. خوازی من قافرەش ب خوە را بانیا. بێزمان بخوە د خوەست ب من را بێ، لێ من پارا بەردایێ....دل و جەرگێ خوە کر ە پۆلا و خوە دا سەر بەرێ ل سەر دەڤێ کوولێ و ب دوو سێ دەنگان هندی هێزا وی هە بوو، گازی قافرەش کر» (بلیجان:٣٣).

٣-هەژاری و بێدەسەلاتیا خەلکی بەرامبەر نەخۆشی و پەژیکان

سەرهاتیا (کوڕێ هارس) وێ چەندێ د ئینتە بیرا مە کو سلێمانی د دیوەخانێ دا گەلەک سەرهاتی و چیرۆک گولێبووینە و د ژیانا خۆدا دێ مفای ژێ بینت و ئەڤە هێشتا ب رێکێڤە، مفایەک ژێ وەرگرت و ژیێ خۆ درێژتر لێ کر (بلیجان:٤٨). ئەڤ بوویەرا هاتی ڤەگێرانێ رەنگە نەیا بەر ئاقل بت و کەسەک بێژت ئەڤە دووری راستیێیە. بەلێ د ژیانا کوردەواری یا راستەقینەدا، ئەو تشت یێن روودایـن، بۆ نمۆنە عەقید بەکر حەوێزی د بیرهاتنێن سەردەمێ کۆمارا مهاباتێ دا دبێژت: «من و واحیدی مام رەزا کۆیی و عەزیزی قالە رەشی کۆیی شەو لەسەر چیاکان ماینەوە و تا بەیانی لە نێو ئەو بەفرەدا هاتوو چۆمان دەکرد و ناو بەناویش پشتمان بە یەکتریەوە دەنا....» (ڕەئیس بەکر،٢٠٠١: ١٣٨).

ئەڤ چیرۆکە مەبەستێن ڤەشارتیژی ب خۆڤە دگرن و ئەگەر ئەم سەحکینە سەرهاتیا (سۆفی خدر)ێ ب باوەر و دیندار (سۆفی مرۆڤەکی خودێترس و باوەرمەند بوو، لێ زارووێن وی بەرەواژی وی هەمو و دز ژ،

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

قولدر.... خەلکێ ژێ دپرسین: (باشە سۆفی تو چما گۆشتێ پەزێن دزیێ دخۆی) سۆفی دەست ب سووند و بەرسووندکان دکر و دگۆت: «دەڤێ من ب گۆشتێ دزیێ ناکەڤە. هەر تەنێ ئەز ئاڤەگۆشتێ ڤەدخۆم....» (بلیجان:٦٣). د مەسەلا سۆفی خدریدا وەسان دیار دبت کو هندەک مرۆڤ نەبەس ب ناڤێ ئایینی نانێ خۆ ب ئاڤکا خەلکی دخۆن، نەخێر هندەکێن هەین (ب بوورینا سالێ و دەمان) ئایینی ل دیڤ بەرژەوەندیێن خۆ ب ڕیڤە دبن و ب سەر مال و پەزێ خەلکیدا دادگرن.

جهگرتنا چیرۆکان د ڕۆمانێدا بۆ وێ چەندێیە ژ دا کو وەرگر هزر بکت ئەڤە ڕاستیەکە و یا هاتی ڕوودانێ. ژ لایەک دی ژی ڤە ڕۆمان پێ درێژ دبت.

**ستران**

د ژیانا کوردەواریدا، سترانێ ڕۆلەکێ مەزن گێرایە، هەر ژ هەژاندنا لاندکان بگرە تا کو شەڤەرۆکان و درینا گەنمی و... هتد. چ بۆ گەهاندنا پەیامەکێ بت یان ژی بۆ کوشتنا دەمی و خۆ ژ بیرکرنێ بت. زۆربەیا کاران ستران د بەر ڕا دهاتنە گۆتن و گەلەک جاران دا خۆ کنە دوو گرۆپ و گرۆپەکدا بێژت و یەک دا ڤەگێرت، ب ڤێ چەندێ ژ بیرڤە دچوون و دا هند بینن، ڕۆژا وان یان ژی کارێ وان گەلەکێ ب ڕیڤە چووی.

د فولکلۆرێ کوردیدا، دەما چیرۆکەک درێژ یان ژی داستانەک دهێتە ڤەگێران، دێ بینی سالۆخەک یان ژی وێنەکێ کاریگەر، ب ڕەنگێ سترانکی هاتە گۆتن، ئەڤە د لەعلیخانا گۆڤەی و خانێ لەپ زێرین و مەم و زین و...هتد دا د هێتە دیتن.

ئەڤ تشتە ب بەرفرەهی د ڕۆمانا بلیجاندا، دکەڤتە بەرچاڤ..ل سالڤەگەرا کوشتنا عەلیێ میر. ژنێن عەشیرێ دچن سەر قەبرێ وی و ئاخێ ب سەرێخۆ دا دکن و گەورێ، ئەو دەنگبێژا ب ناڤ و دەنگ، ب دەنگێ خۆ یێ زەلال، بەندەکا سترانا خەمێ، ب ڕوودانا هاتنا دز و جەردان بۆ سەر عێلێ (عەلیێ میر) و کوشتنا عەلیژ، د بێژت:

«دە دێرانێ د بێژن میرێ دەلال بریندارە ...» (بلیجان:١٥).

کی دبێژت نە ئەڤ سترانەیە وە ل سلێمانی کری سەرێ خۆ هەلگرت و بەرەو چارەنڤیسەکێ نەدیار و وەلاتێ غەریبیان ب دتە ڕێ.

سلیمان ژ مال دوور دکەڤت، برس و ماندیبوونا خۆ ب نێچیرەکێ ژ بیر دکت، ژ خۆشیادا د بەر کومکرنا (ترک و دارا)را بۆ براژتنا گۆشتی، دەست د هاڤێژتە ستران‌گۆتنێ:

(ها ب ڤی ئەرەزی لۆ هورشە های هورشە

ها ب ڤی خۆپانی لۆ هورشە های هورشە....(بلیجان:٥٦).

دیسان د (سترانەکادی) [١]دا کو ئەوژی هەر یا د بەر کاری را گۆتنێیەو سەلیقا وێ ژ فولکۆرییە، دبێژت:

قورمل قورملۆ دار ملۆدار مل قورملۆ قورملۆ

---

[١] - ئەگەر ڕۆمانڤیسی ئەڤ سترانە ژ دەف خۆ و ل دیڤ پێدڤیێن ڕۆدانا چێکربن، هەر تام و چێژا فولکلۆری ژێ د هێت.

قورمل قورمکێ ڤان داران قورمل ئێزنگێ وان یاران (بلیجان:٥٩).
پێگۆتن و سترانێن شینیان ،گەلەک د زۆرن و جهەک بەرفرەهـ ڤەگرتییە.

### حەیرانۆک

ئەگەر د زمانیدا نازکیەک هەبت، دێ ئەوبت یا حەیرانۆک پێ دهێنە ڤەهاندن. حەیرانۆک زمانێ ئەڤیندارانە و وەکو دانوستاندنەکێیە د نەقەبا دوو دلبەراندا، هەر چ پەیڤا جوانە د حەیرانۆکێدا دهێتە دیتن. ئەڤ تشتە د رۆمانێ ژی دا د هێتە دیتن، دەما چاڤێ پەریشانێ ب (کەڕ)ی دکەڤت، ئەڤ پەیڤێن ئەڤینییێ ژ دەڤی دەرد کەڤن:

دەلۆلۆ جانۆ،جانۆ،جانۆ،جانۆ،جانۆ...

............

ژ من را قەند و شەکر، ژ خەلکێرا کول و کەسەر ئێش و ژانۆ...
ئەڤینا تەیێ دلێ من ئەڤدالا خودێ کری کول و تەڤ کۆڤانۆ...
دەلاووکۆ ئەگەر تو هەز دکی شەڤەکێ ژ من را ببە تو مێڤانۆ...(بلیجان:٢٤٤).
کەڕ ب ڤی رەنگی بەرسڤێ ددت:
دەلێ لێ جانی،جانێ،جانی،جانێ،جانێ...

.............

ژ من را شرینێ وەک شەربەتا ل ئیسکانێ....
هەرگاڤا کو تو هەز بکی، وەزێ ژ سینگ و بەرێن تەرا ببم مێڤان نا خودێ مێڤانێ پاشیڤانی.. (بلیجان :٢٤٥).

جارەکا دی پەریشان ل کەڕ ی د زڤرینت و دبێژت:
لاووکۆ هەیران ئیشەڤ شەڤە ،شەڤ لەیلانی..
تویێ ژ سینگ و بەرێن م را هەم مێهڤانی، هەم خودانی...
تویێ بێی ل بەر دەرێ مالا بایێ من دێرانی، ب رامیاری و ب رێزانی....
وەزێ ل بەر تە ڤەکم جۆتەک مەمکێن د فینجانی
هەگەر نۆبەداران پرسی ئەو کێی، وەزێ بێژم ما هوون کۆرن لاووکێ منە هاتیە ب مێڤانی... (بلیجان:٢٤٥-٢٤٦).

### بیر و باوەر و رەوشت و تیتال

هەر ملەتەکی بیر و باوەرێن خۆ یێن هەینژ، کو ئەو ژی (کومەکا سەرەدەری و رەوشت و بووچوونانە ژ هندەک بوویەرێن رۆژانە دهێنە رێکا مرۆڤیژ، پەیدا بووینە) (الجزیری،٢٠٠٠: ٤٩). ئەڤە ژی ب شەڤ و

رۆژەکا پەیدا نەبوونە، بەلکی سال و دەم یێن بوورین تاکو، جهێ خۆ گرتین. گەلەک تشتا چ بنەرەت بۆ نینە وەلێ ل لایێ خەلکی، وەسان یا دیارەیێ باوەرییێ پێ نەئینت، ئەو یێ ژ رێکێ دەرکەتی و یێ سەرپێ خۆ و بابێ خۆ داچووی. گەلەک تشت یێن هەین، وەسان جهێ خۆ یێ د سەرێ مرۆڤیدا کری، مرۆڤی بڤێت و نەڤێت وەکو تشتەک پیرۆز سەرەدەرییێ د گەلدا دکت، ئەڤ پیرۆزیە ژی ژ وێ چەندێ پەیدا بوویە، هەر ملەتەکی داب و نەریتێن خۆ یێن هەین.

د کوردەوارییێدا، ئەگەر ژنکەکێ دەرسۆکا خۆ ژ سەرێ خۆ کر و هاڤێت بەر پێین زەلامی، د وی دەمیدا ئەگەر چ روودان ژی چێببت، نابت هیچ کەسەک پێ ل وێ دەرسووکێ بکت و دڤێت هیڤیێن وێ ژنکێ ب جە بینت یان ژی خێرێ نابینت. "مەلا مەحموود" دبێژت: «زاڤ د بە دوو تایفە ل مەیدانێ دکەنە شەڕ و ژ هەردوو کناران ژی تەلەفیات بوویە ژ وەکو ژن بێ و لاچکا خوە راخینە نێڤا وانژ، ئەلبەتە ئەو دوو تایفە ژ یەک و دوو دبن» (فندی،٢٠٠٦: ٢٧). ئەڤ تشتە د رۆمانێژی دا ب بەرچاڤ دکەڤت، پشتی کوشتنا عەلیێ میر ب دەمەکێ کێم، جارەکا دی جەردا دزا ب سەر عێلێ سلیڤ بەگێدا دهێت و سلێمانی دڤێت د دیڤ تەرش و تالانیدا بچت، لێ مەتا وی رەوشێ هیڤیا ژێ دکت دا کو د دیڤ دا نەچت و ب رێکا بابێ خۆ نەچت، پشتی چ چاران بۆ نابینت کو سلێمان یێ رژدە و دێ هەر چت، رەوشێ ژ نەچاری (چارکا خوە ئاڤیت بوو بەر پێن هەسپێ وی... (بلیجان:١٤).

هندەک ژ وان رەوشت و تیتالێن ل ناڤ ملەتێ کورد هەینژ، د ڤێ رۆمانێ ژی دا ب بەرچاڤ د کەڤن ژ بۆ نمۆنە راڤ و نێچیر ببوو بەشەک ژ ژیانا کوردەوارییێ «چونکی کوردستان جهێ ئاسک و پەزێ کیڤی بویە ژ جهێ گورگ و پالنگ و رویڤیا بویە ژ جهێ بالندا و پەرندا بویە....دێ بینین نێچیرێ کارەکێ مەزن دژینا مرۆڤێ کورددا کریە. پرِیا کوردا نێچیر و نێچیرڤانییێ دزانن» (جعفر، ٢٠٠٢: ٢٩-٣٠). ئەڤێ چەندێ د قادا ئەدەبیاتا کوردی ژی دا رەنگ ڤەدایە (لە نێو کورداندا ئەفسانە و چیرۆک و سەرگوزەشتە و مەتەڵە فولکلۆرییەکان بەشێوەیەکی زۆر ئاماژەیان بە ڕاو و شکار کردووە) (فەتاح، ٢٠٠٥: ٣٦٣). «رۆمانا بلیجان» گرنگیەک تایبەت دایە ب ڤێ چەندێ و ل گەلەک جها بەحس دکت بۆ نمۆنە لاپەرێن (٢٣٢ ژ ٣٦٣).

د کوردەوارییێ دا رۆژێن داوەتژ، شاباش دان و یاری و ترانە ... هتد. ژ هەبوون ژکو زۆربەیا وان د رۆمانێ ژی دا و ب ڤی شێوەی دکەڤن بەر چاڤ (کۆمەلێ ل سەر سەرێ خۆشەویستێن هەڤدو را شاباش ددان (بلیجان:١١١). «سواران ب رێز دا بوونە دوو هەڤ و ل بەستا بنیا مالان دا گورۆڤەرکەک خرِ چێکر بوون» (بلیجان:١١٤). سلێمان سێڤەک ڤرڤراندە بووکێ (بلیجان:١١٨). سێنیا شەکرۆک و پارەیان رەشاندە پێشایکا بووکێ. بلیجان ل١١٨). شکاندنا تشتان ل بەرپێن بووکێ (بلیجان:١١٩).

بۆ تازیا ئەحمەدبەگێ و سلێمانی دوو (کۆتەل)[١]. دهێنە گرێدان. ئەڤە د کوردەوارییێدا هەبوویە ژ و "ئەحمەدێ میرزای" (خەلیل،٢٠٠٧: ٣٣) د سەرپێهاتیەکێدا ب درێژی بەحس دکت. دیسان دەربارەی ڤێ

---

[١] - کوتەل گرێدان ئانکو دەما قارەمانەک هاتبا کوشتن دا ئینن جانیا وی زین کن . شیر و جلێن قارەمانی پێدا دەینن.

چەندێ مەحمود زامدار دبێژت: «تا ئێستاش (کوتەڵ) لە هەندێ شوێنی کوردستاندا ماوە» (زامدار،٢٠٠٧: ١٨).

د هندەک چیرۆک و داستانێن کوردیدا ژ بەری کچ و کور ل هەڤدوو بێنە مارکرن قارەمان شیرێ خۆ د دەینت نیڤا خۆ و کچکێدا. د داستانا «مەم و زین»ێدا ژ پشتی مەم زینێ ل سەر جهێ خۆ دبینت و گازی خۆلامێ خۆ دکت و ژ بەری خەوێ...«هندی مەم بوو ژ ئەوی پالدا سەر تەختێ خوەژ، شیر دانا لنابەینا خو و وێدا» (ئامێدی، ٢٠٠٢: ١٠). د رۆمانێ ژیدا دەما پەریشانێ دبن ژێر چادرا کەرِوی ژ دبێژتێ:« ل نیڤەکا من وتەدا ئەڤ شوورا بەند وبەرسڤدارە» (بلیجان:٣٣٢).

"مەلا مەحموودێ بایەزیدی" سەبارەت نەریتێ نەکوشتنا دیلا ل لایێ کوردان دبێژت:«وەکو مرۆڤەک ژ هەسپی کەت و ئەسیر بووژ، ئێدی مومکین نینەژ، ئەوی ناکوژن» (فندی:١٥). ئەڤە وێ دگەهینت کو د کوردەوارییێ دا دیل نەدهاتن کوشتن.

ژ بەری کەرِ بگەهتە ناڤ عێلێ عەلییێ سوارانژ، دیلەک دکەڤت دەستێ کەرِوی. دیل بۆ خۆ هیڤیا ژێ دکت دا کو نەکوژت .کەرِ دبێژتێ :«لاوۆ من جارەکێ ژ تەرا گۆت مێر دیلێن خوە ناکوژین» (بلیجان :٤١٢). دیارە د رۆمانێ ژی دا ئەڤ تشتە هاتیە بەرجەستەکرن.

**تەوەرێ سییێ:**

ب سەرڤەکرن و کێماتی د رۆمانێدا

ڤەگێر د رۆمانێن تەقلیدی دا ژ کەسێن باش ژ بێگەرد و پاقژ و یێن خراپ ژ پیس و چەپەڵ نیشان ددن. نە د دەمێ نمایش و رووداێ ب تنێ دا ژ بەلکی د وێنەی و سالۆخدانێ ژی دا (بلیجان) ژ ڤێ چەندێ بێ بەهر نەبوویە و ب ڤی رەنگی نەعمەتێ عیس نیشان ددت «کووسەلا پیس ل جانیا خەزالێ سووار ببوو. کووسەلا پیس زێدە ناڤێ نەمەتێ عیس بوو» (بلیجان:٢٩١). هەر ب وی شێوەی یێ قارەمان ژ هێز نینە خۆ ل بەر بگرت و ژ بەری بکەڤت د شەرەکیدا ژ بەر وێ سالۆخا ڤەگێری بۆ کری ژ مرۆڤ دزانت ئەڤە دوژمن بەزینە «ل ناڤ پەهلەوانێن میر دا پەهلەوانەک هەیە. ناڤێ وی هەسێ دوودیە. پاهلەوانەکی ب ناڤ و دەنگە. ئەو یەکی چوورِی چەقەلی ژچاڤ هێشین ژ ناڤملپان ژ چارشان ژ ب زەند و بەند و بلندبالا و ب گەڤدەیە (بلیجان:٨١). د سترانێن شەری و داستانێن فولکلۆریدا ژ دەیک و بابێن قارەمانان نەوەک یێن خەلکێ دینە. "دەروێشێ عەبدی" کورێ وێ دایکێ یە یا کو «ب دارێ د دەستیدا بەرازەک کوشتی» (الجزیری،٢٠٠٨: ١٤٧). بابێ وی ژی "عەبدی" د شەرەکیدا ل هەوارا (کیکا وملا) چوو بوو (خەلیل:٣٥٨). هەمی عەشیرا گێسا کەس نەبوو خۆ ل بەربگرت. وەردەک و سلێمان هەردوو قارەمانن ژ و ژ مالباتێن مەزن و دوژمن بەزینن ژ و یێن ژ وان ژی دبن دێ قارەمان بن. دەما کورێ دەنیزێ دز ب زەلامێن خۆڤە هێرشێ دکت سەر تالانێ عەمەر ئاغای. (کەر و کولک) هێرشا وان دشکێنن و ل ناڤ عێلی ناڤێ وانە «لاوێن وەردەکێ لێدانە پێنج دز کوشتنە و ئەڤا ژی سەرەکێ جەردیەژ، کو بریندار کرنە و دیل گرتنە» (بلیجان:٢٠٧). ژ دایکبوونا قارەمانا

**بەشی پێنجم- رەخنە**

ژی د داستانێن فولکلۆری دا وەک  یا خەلکێ دی نینەژ، بۆ نمۆنە «ژ دایکبوونا روستەمی ژ رووده‌ڤا خۆشکا سەلمانێ سندی و زالێ» (جندی، ٢٠٠٦: ٣٨ و حیتۆ، ٢٠٠٥: ٢٠). وەسا دیارە دێ قارەمانەکێ مەزن ژێ چێبت. د رۆمانێ دا ئەڤ تشتە هاتیە بەرجەستەکرن و ژ دایک بوونا (کەرٍ و کولک) (بلیجان:١٦٥-١٦٦) نەوەک یا خەلکییە و ڤەگێری یا ڤیای هەر ژ بوونا وان ژ جوداهیەک د نەقەبا وان و زارۆکێن دی یێن عێلی دا هەبت.

ژ لایێ زمانیڤە رۆمانڤیس گەلەکێ دەولەمەندە ژ ب رەهوانیا خۆ راستیەکێ د چارچووڤێ رۆمانا بلیجان دا دیار دکت ژ کو ئەو ژی (شکەستن و ژ ناڤبرنا  شۆرەش و سەرهلدانێن کوردان) شین دەستێ رەشێ کوردان پێڤە دیارە ژ و یا ڤیایی کورد چاڤێ خۆ ڤەکن و بزانن کا کینە دوژمنن؟.

ل دوو ئاستا وێ چەندێ دیار دکت:

**یەکەم:** دەما سلێمان و  ئەحمەد بەگ و رەمۆ پالەوان دهێنە کوشتن (ئەو ب خۆ هەڤدو دکوژن) ژ ملەت هەمی دمینت مەندەهۆش و کەسەک نزانت کێ ئەڤ هەمی پەهلەوانە کوشتینە (هەیفا من تێ ژ وێ هەیفێ، ئیرۆ دوژمن و نەیارێن مە یێ نەدیار و نەخوویانە (بلیجان:١٥٨).

**دووەم:** شیرەتێن حەزکرنا وەلاتی و ب ڤی رەنگێ ل خارێ هاتینە دەستنیشان کرن:

١- نیشتمان: حەز ژێکرنا نیشتمانی و ئازادیا وەڵاتی ل بەری هەرتشتەکییە ژ ئەڤە سلیڤ بەگە (ئەوی ب هزرا رزگاریا وەلات سەر دادنی سەر بالگی و ب هیڤیا ئازادیا گەل چاڤ ل خەوێ ڤەدکر. ئەو هەر تم ل وێ هزرێ دا بوو کو وەلاتێ خوە ل ژێر لەکمێن داگیرکەران دەرینە (بلیجان:١٨). حەسێ دوودێ ژ بەری مرنێ شیرەتان ل کورێن خۆ دکت (ل هەر کی ئالی وەلات دا بە ژ هەرٍن بەرگریا وەلاتێ خوە بکن (بلیجان:٢٨٠).

٢-ئێکگرتن: ڤەگێر دەستەواژێن کوردستانا ژێرین و باکوور ب کاردئینت ژ سەرێکدا گرتنا عەشیران. کوشتنا ل سەر چنە ژ ددەقێدا ب بەرچاڤ دکەڤن. ئەڤ هەمی ژێکدابرانە ژ پێدڤی یەکگرتنێیە ژ چونکی ئەوە رێکا سەرفەرازی و ئازادیا جڤاکەکێ پارڤەکری «ب ئاریکاریا هەڤژ، ب ئێکاتی و براتی بکارن ریشالا هەموو .....» (بلیجان:٤٤٨).

٣-براکوژی: (کەرٍ) قارەمان و بریندارێ براکوژیێ ژ ب برینا کوور ڤە دبێژت (وەرن ئێدی شەرێ خوە ب خوەتیێ بەسە. ئێدی براکوژی بەسە (بلیجان: ٤٤٤). پشتی کوشتنا کەرٍۆی ژ کولک دهزرینت «هە ل درێژیا مێژوویێدا کوردن کو ب فەرمانا بیهانیان هەڤدو قرٍ دکن» (بلیجان:٤٤٩).

٤- هەژاری و نەزانین: ڤەگێر ژ نەزانین و خشیمیێ دکتە ئەگەر بۆ درستبوونا  براکوژیێ (وە خەشیمان ب شەرٍ ل سەر خالان دا وێ دشینن....شێرێن مە نەزاننژ،نەگوهدارن...) (بلیجان:٣٤٠). ل سەر تشتێ نەژهەژی هەڤدوو دکوژن (ل سەر پشیکان ژ ل سەر زارٍان ژ ل سەر زۆزانان ژ ل سەر بەنگەیەک زەڤیێ هەڤدو د کۆژن (بلیجان:٤٥٠).

٥-دوورٍیاتی: بێ هەلوێستیا خەلکی ل رووداێن دەوروبەرێن وی ژ ڤەگێر وەکی دەردەکی بەرێ خۆ ددتێ. هندی سلیڤ بەگ یێ ساخ و هەشت سەرۆک هۆز ل بن فەرمانا وی ژ خەلکی  خۆ بۆ وی دکر ئاخ ژ پشتی

عەمەرۆک بووی ئاغا هەر تشت هات گۆهڕین؛ کۆمەلا دووڕوو بەرەبەرە ژ دۆرا وان رەڤین و ئەوانا ل تونەبوونێ دا تەنێ هێلان (بلیجان:١٢٤).

٦- زمانێ کوردی: ملەتێ کورد ب ئۆلا خۆ بوسلمانن ژ و قورئانا پیرۆز ب زمانێ عەرەبییە. گۆتگۆتکەک ژی د ناف خەلکێ کورد و بوسلمان بەلاڤ ببوو. د گۆتن زمانێ عەرەبی یێ پیرۆزە. ئەڤا هە ببوو جهێ وێ چەندێ دژیایەتیا زمانێ کوردی بهێتە کرن. چونکی "مەلا حەسەن" گرنگییێ ب زمانێ کوردی ددت و ناما پێ دنڤێست ژ هەمی مەلایێن دی بۆهتانا بۆ دەردئێخن و دبێژنێ"مەلا هەسەنێ ئێزدی" (بلیجان:٨٤). حەسێ دوودێ ل دەمێ ناڤلێکرنا زارۆکێن وەردەکێ دبێژت «نابە کو ئەم ناڤێن نەیی کوردی ل زارۆکێن خوە بکن. ناڤێن نیشتمانی نیڤەک ژ سەرخوەبوونیە» (بلیجان :١٦٧).

رۆمانەک ب ڤی قەبارێ مەزن و گەلەک گرنگیدان ب شیرەتێن حەز ژێکرنا وەلاتی ژ کێماتی یێن پەیدا کرین و ئەڤ ڤەکولینە ب ڤی رەنگێ ل خارێ وان کێماتیان دەستنیشان دکت:

١- دووبارە کرن:

هندەک جارا دووبارەکرن جوانی و هێزێ ددت دەقی، وەلێ ئەگەر هات و ئەڤ دووبارەکرنە ژ رادێ دەرکەت، لاوازی بۆ دەقێ و بێزاری بۆ خوێندەڤای پەیدا دبت.

رۆمانا بلیجان ژ ڤێ دووبارەکرنێ بێ بەهر نەبوویە ژ، ب تایبەتی دەما بەحس دهێت سەر نەساخیا شەرێ براکوژیێ. دەما وەردەک دزانت عەمەر ئاغای کەڕ و کولک یێن ڤرێکرین شەڕێژ، دبێژت: «شەرێ خال و خوارزیان وسانەژ، بینانی ریشا کۆتی بوونی ژ دەرمان ژێرا قەت تونینە...» (بلیجان:٣٣٥ ). دوو جاران ل یەک لاپەر هاتینە؛ ا- شەرێ خال و خوارزیان ژ شەرێ خوە ب خوەتییێ، ریشالا کۆتی بوونی ..... ب- ئەڤ هەموو برایێن مە ب دەستێن هەڤدو تێنە کوشتنێ (بلیجان:٣٤٧). ل جهەک دی دبێژت: شەر هەر شەرێ خوە ب خوەتییێ... (بلیجان:٣٤٨)[1].

٢- رەگەزێ ژ نشکەکێڤە.

ب کارئینانا رەگەزێ ژ نشکەکێڤە د رۆمانێدا ژ لایێ هۆنەریڤە لەنگییەکە و بێ دەسەلاتییا رۆمانڤیسی خۆیا دبت. شەر و پڕە ڤێنە ل سەر سەرێ کەڕوی ژ کولک یێ دەوی ژ دەستێ کولیلکێ ڤەد خۆت ژ (بلیجان: ٤٤١). ئەو پێزانینێن دەربارەی حەسێ دوودێ و عەلییێ سواران گەهەشتین عەمەر ئاغای دکەڤنە بن سیبەرا ڤی رەگەزی (بلیجان:٢٨٦).

د ڤەگێرانێن فولکلۆریدا رەگەزێ ژ نشکێڤە رولەکێ مەزن یێ هەی (کریارێن ژ نشکێڤە ب رەنگەکێ بەرفرەهـ د چیرۆکێن فولکلۆریدا ب بەرچاڤ دکەڤن) (حمادی:٢١٥). وەلێ هۆنەرمەند دڤێت ل رێکەکێ بگەرهت یا بڤێت بێژت بێی وەرگر بزانت کو ئەڤە یێ چەپددتژ، یان ژی یێ ل فێلەکێ دگەرهت.

٣- گۆتار و درووشم:

---

[1] - ل گەلەک جهێن دی ژی دووبارە دبت بۆ نمۆنە لاپەرێن ٢٩٦،٤٥١،٤٤٩،٤٤٤،٣٩٩.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

ب کارئینانا شێوازێ گۆتارکی د دان وستاندنادا ژ رۆمانڤیسی بڤێت و نەڤێت هەمی هزر و بۆچوونێن وی ژ دهێنە دارێشتن و ژ بیر دکت کو ئەڤە کەسەکە یان ژی قارەمانێ چیرۆکێیە. سەر ڤێ چەندێ ژی راخوێندەڤای ژ هزر کرنێ دوور دئێخت ژ لەورا پێدڤییە دان و ستاندن یان ژی هزرکرنا کەسان ل دیڤ ئاست و زانینێن وان بن. د ڤان جورە دەقان دا ژ دارێ راستییێ و تۆرەی یێ د دەستێ نڤیسەریدا. و ڤەگێر چییێ بۆ وەرگری ناهێلت. (وەرگر) تنێ دبت دیدەڤان و ئێدی بیاڤ نامینت هزرا خۆ د تشتەکیدا بکت. باشە ڤەگێر گەلەک کون و تشێن ڤەشارتی بۆ وەرگری ئاشکرا بکت ژ وەلێ نابت لایەنێ هۆنەری ل بەرچاڤ نەهێتە وەرگرتن و ل دیماهیێ ببتە قوربانێ دروشما و گۆتارا. رۆمانڤیسی نەشیایە خۆ ژ ڤی شێوازی دوور بێخت و ل گەلەک جهان ئەڤە د هێتە پێش ب تایبەتی ژ ل ٤٤٨ تا کو ل ٤٦٣.

**ئەنجام:**

پشتی ڤەکولین ب دیماهی هاتی ژ ڤەکولەر گەهەشتیە ڤان ئەنجامان:

- دشیاندایە فولکلۆر ب هەمی جۆر و رەگەزێن خۆڤە د رۆمانێدا بهێتە مەزراندن.

- رۆمانا بلیجان ل سەر قەرقودێ داستانا (کەرٍ و کولک)ی یا فولکلۆری هاتیە ئاڤاکرن. یەکێن ڤەگێرانێ یێن وەک هەڤ د هەردوو دەقاندا یێن هەین. دیسان ژ لایێ جە و ناڤێن کەسایەتیان و دەمی ڤە ژ لێکنێزیکیەک یا هەی.

- گەلەک جورێن فولکلۆری د رۆمانێدا هاتینە مەزراندن ژ وەکی (گۆتنێن مەزنان ژ پەژن ژ چیرۆک و سەرهاتی ژ ستران ژ حەیرانۆک ژ بیرو باوەر و رەوشت و تیتال).

- دووبارەکرن و رەگەزێ ژ نشکێڤە و درووشم ژ کەتینە د ناڤ رۆمانێ دا ژ دەمێ رۆمانڤیسی ڤیایی کێماتیێن جڤاکێ کوردی (نەزانینێ ژ براکوژیێ ژ پشتگوهڤە هاڤێتنا زمانێ کوردی...هتد) دەینت بەرچاڤ.

- رەهوانییا زمانی و شارەزایی د کەلەپووری دا و نەفەسەکا د رێژ بۆ نڤێسینێ ژ د رۆمانێدا د هێنە دیتن.

## سەرچاوەکان:

- فورستر، أ.م (1960) **أركان القصة**، القاهرة، دار الكرنک.

- حمادی، صبری مسلم (1980) **أثر التراث الشعبی فی الروایة العراقیة الحدیثة**، بیروت، المؤسسة العربیة للدراسات و النشر،الطبعة الاولی.

- جیهانی، پەرویزێ (٢٠٠٦) **بلیجان**, دهۆک، چاپخانا هاوار .

- شاهین، محمّد (2007) **أفاق الروایة البنیة و المؤثرات**,القاهرة, مکتبة مدبولی.

- جەلیل، ئۆردیخانێ (١٩٧٧) **سترانێ زارگۆتنا کوردایە تاریقییێ**، بەغدا، کوری زانیاری کورد.

- جەلیل، جەلیلێ و جەلیل، ئۆردیخانێ (٢٠٠٨) **زارگۆتنا کوردا**، هەولێر، چاپخانا ئاراس.

- حسین، خالد حسین (1421) **شعریة المکان فی الروایة الجدیدة**، الریاض, موءسسة الیمامة الصحفیة.

- رەمەزان حەجی قادر (٢٠٠٦) **جه د رۆمانا کوردیدا گەریان ل بابێ بەرزە و دۆزەخا سێی وەک نمۆنە ,** دهۆک.

- مازی، چیا (٢٠٠٦) **فەرهەنگا گۆتنێت پێشییان**، هەولێر، چاپخانا حەجی هاشم.

- جەعفەر، حەجی (٢٠٠٦) **پەژن و گۆتنێت کوردی.**

- شەریف، عەبدولوەهاب کانبی (٢٠٠٥) **فەرهەنگی ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا**، سلیمانی، وەزارەتی رۆشنبیری.

- سالّح، خالد (٢٠٠٦) گلۆلکا ئالزیاییی - **چەند ئێدیومەکێن کوردینە**، دهوک,چاپخانا هاوار.

- وارین، ئوستن و وێلیک، رینێ (٢٠٠٨) **تیۆریا وێژەی,** دهۆک.

- (رەئیس بەکر),عەقید بەکر عەبدولکەریم، **حەوێزی گەشتێک بە کۆماری مەهاباد دا**, هەولێر، ئاراس، چاپی دووەم.

- الجزیری، علی (٢٠٠٠) الأدب الشفاهی الکردی, اربیل,کاوا للنشر و التوزیع.

- فندی، رشید (٢٠٠٦) **عادات و رسوماتنتمێ ئەکرادیە یا مەلا مەحموودێ بایەزیدی ١٧٩٩ -١٨٦٧**, هەولێر، چاپخانا حەجی هاشم.

- فەتاح، رابیعە شێخ محەمەد (٢٠٠٥) **کوردستان لە سەدەی پازدەی زاینییدا**,هەولێر, وەزارەتی رۆشنبیری بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی رۆشنبیری و هونەر.

- خەلیل، تیمۆرێ (٢٠٠٧) **گولبژێرەک ژ نڤیسکارێن کوردێن سۆڤیەتا بەرێ**، دهوک،

- زامدار، مەحموود (٢٠٠٧) **مەمێ ئالان**,هەولێر, دەزگای موزیک و کەلەپووری کوردی.

- ئامێدی، سادق بهاءالدین (٢٠٠٢) **ژ فولکلۆرێ کوردی,** هەولێر، ئاراس.

- جندی، حاجیێ (پروفیسور) (٢٠٠٦) **شاخێد دەستانا رۆستەمێ زالێ کوردی نۆزدە شاخێد نوو،** دهوک,چاپخانا هاوار.

## چەمک و ناوەرۆک لە چیرۆکی هاوچەرخی کوردیدا

عومەر محەمەدی [-]

**کورتە**

کۆمەڵگای کوردی بەو هەموو دژواری و کۆنتراسێتانەی کە بەرەورووی بۆتەوە، نووسەر لەو دەرفەت و بوارانەی کە بۆی ڕەخساوە، توانیویەتی کەڵکە پێویست بۆ چیرۆک وەرگرێ؛ ویستوویە بە جۆرێ ڕاستییەکانی ژیان بگۆڕێ کە نە تەنیا شوێنەوارەکانی خۆ جێی لە بیر نەکا، توانیویە خوێنەریش لەگەڵ خۆی ڕێک بخا. لەم هەلومەرجەدا، چیرۆکنووس جگە لە پاراستنی لایەنی هونەری چیرۆک، بەڵگەدار کردنی ئەخلاق و ڕەوشی ژیانی کۆمەڵگایشی وەئەستۆ گرتووە؛ دیارە نووسەر بۆ گرینگی پێدانی ئەو مەبەستە و بەڕێوە بردنی ڕێساکانی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی خۆی، ناچار بە لەنگەر ڕاگرتن لە نێو دۆخەکانی زەمانی و دیاردە چیرۆکییەکان بووە کە پێم وایە ئەمە لە چیرۆکی کوردیدا ئەزموونێکی زۆر باشە.

بەکار هێنانی تەکنیک کە بتوانێ کەمایەتییەکانی کێشەی مرۆڤی ئەمرۆ لە ناو چیرۆکدا تاوتوێ بکا، دسیپلین و داهێنانی چیرۆکنووسی پێویستە. چیرۆکنووس بە کەڵک وەرگرتن لە فاکتەرگەلی وەک ڕاگواستنی زەمان، مونۆلۆگی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، گوزارەی ڕیوایی کورت و خێرا، فلاشبەک و شەپۆلی زەین و هتد هەوڵ بۆ گەڕانتی کردنی چیرۆک و نزیک کردنەوەی لە نۆرمە پەسەندکراوەکانی جیهانی دەدا. لە درێژەی ئەم وتارەدا، بە سەرنجدان بە تەوەرەی باس و وشەسەرەکییەکان، فاکتەکانی چیرۆکی هاوچەرخی کوردی بە چەند بەڵگە و دەق خراونەتە ڕوو، لە کۆتایی وتارەکەشدا پەراوێزەکانی ناو دەق دەستنیشان کراون.

**وشە سەرەکییەکان**: کارکردی زەینی، ستراتێژی دەق، ڕاڤەی دەروونی، ئیستەحاڵە، مونۆلۆگ، فۆرم، خوسانسۆڕی

---

[-] (توێژەری ئەدەبی کوردی)

**تەوەرەی یەکەم**: کارکردی زەینی و دەروون شیکاری:

لە سەرجەم ئەو چیرۆکە کوردیانەی کە لە دۆخی هاوچەرخدا نووسراون، شێوازێکی هاوبەشیان تێدا دەبینرێ، ئەویش کارکردی زەینی و دەروونشیکاری کەسایەتییەکانی ناو چیرۆکە. ئێستا ئەو پرسیارە بەرەو ڕووی چیرۆک دەبێتەوە کە کارکردی زەینی تا چ ڕادەیەک لەگەڵ کایەزمانییەکاندا، کاردانەوەی هەبوو؟ لەگەڵ چەمکدا چۆن مامەڵەی لەگەڵ کراوە؟

ئەم کێشەیە، لە ڕەگەزی کایە زمانەییەکاندا، جێگەی باسە. ڕەگەزی کایە زمانییەکان دەگەڕێتەوە بۆ دۆخەکانی کەونارا، ئەم بەشە لە میراتی کلتووری لەگەڵ توستوورە لە پەیوەندی دایە. ماکس مولێر دەڵێ: ئوستوورەکان لە کایە زمانییەکانەوە هاتوونە دەرێ، ئەو لە سەر ئەو باوەڕەیە کە ئارياييەکان ئەوەی لە سرووشتەوە وەريان دەگرت، بە شێوازێکی مرۆڤشوبهێنی و زمانێکی خوازەیی ڕاڤەیان دەکرد؛ یانی لە جیاتی ئەوەی بڵێن: شەو داهاتووە، دەیانگوت: خواژن، سێڵێنە، (مانگ) بە ماچێکی ئەندۆمیون (خۆرئاوا) چاوی چووە دە خەو.(١) هێما و دیاردەکانی خەیاڵ ئامێز لە کایەزمانییەکانی ناو چیرۆکی کوردیشدا جێگەی لێوردبوونەوەن کە ئاماژە بە چەند بەڵگە دەکەین:

**بەڵگەی یەکەم**: «زەمین تەشتێکی گەورەیە، زۆر گەورەیە، گەورەتر لە باوەشی تۆ، زەمین بە گریان دەژی، خۆیشی دەگریت، تەشتێکی پان و گرد؛ ئێمە تێیدا دەگرین، ئەگەر پڕ بوو، ڕزگار دەبین، دەزانی چی بکە، هەوڵ بدە زەمین کون بکەیت تاکو بڕژێیتە ئاسمانەوە، ئەرێ ئابکە، لە منی ببیسە...»(٢)

خەیاڵ، ڕووداو و هێما سروشتییەکان، سێ خاڵی گرینگی نا چیرۆکن کە باری عاتیفی چیرۆک بە هێز دەکەن؛ بەو مەرجە هەم ڕووداو وێناکرێ و هەم کارکردی زەینی تێدا بێ. بیرمەندانی دەروونناس لە سەر ئەم باوەڕەن کە وێنەگەلێ کە بتوانێ عاتیفەی ئەزەڵی بنوێنێ، کەرەسەیەکن کە بەهای جیهانی بە بەرهەمی ئەدەبی دەبەخشن. بە پێی بیرۆکەی چیرۆکناسی، چیرۆکی باش سێ خاڵی گرینگی لە خۆ گرتووە کە بە شێوەی خوارەوە پۆلێن دەکرێ:

یەکەم، ستراتیژی تایبەت کە نووسەر دایدەڕێژێ و بەرەو نیازی خوێنەر دەچێتە پێش؛ دووهەم، بەکار هێنانی ئەو ستراتیژییە لە پەیکەرەی دەقدا؛ سێهەم، وەڵامی خوێنەر. لە خاڵی یەکەمدا ئەو چیرۆکانەی شێوازی ڕۆمانسیانەی تێدا دیارە، ستراتیژی خوێنەر لە سەرەتاوە ڕوون و ئاشکرایە؛ یانی شوێنی ڕووداو، زمان، کەسایەتی و پراکتیزە بوونی خەیاڵ لە پلاتفۆڕمی تایبەت بە خۆیدا گونجاوە، نووسەر لە چیرۆکەکەیدا، زانیاری لەمەڕ گرفت و کێشەی مرۆڤ لەگەڵ خۆی و کۆمەڵ ئەداتە دەست. چیرۆکەکانی حەسەنی قزڵجی (شێوازی ڕیالیزمی کۆمەڵایەتی) فەتاحی ئەمیری (ڕۆمانتیکی و کلتووری) عەتا نەهایی (ڕیوایەتی کورتی زەین و دیالیکتیک) ناسر وەحیدی و حوسێن شێربەگی (کلتووری) لەم بەستێنەدا پۆلێن دەکرێن. لە خاڵی دووهەمدا بەکارهێنانی ستراتیژی لە پەیکەری دەقدا بە گۆرانکاری خێرای

زەمانی و نەناسیاو کردنی کەسایەتی، گوزارەی کورت بۆ کەسایەتییە لاوەکییەکان، ڕاگرتنی زەمان و فلاشبەک بۆ کەسایەتی سەرەکی، پێکهێنانی گریمانە و پرسیار و چاوەڕوانی بۆ کردەوەی کەسایەتییەکان بەرچاون. چیرۆکەکانی محەمەد ڕەمەزانی، شامحەمەدی، عەلی دەسمالّی، مەنسوور تەیفووری، قادر هیدایەتی، ڕەحیم عەبدولڕەحیمزادە، شەپۆل مەجیدپوور، چنوور سەعیدی، بریا کاکەسووری، عەزیز مەحموودپوور، سەلاح نەیساری، عیرفان ڕەسولّی و . . . لە ئەزموونگەریەکانی ئەم بەستێنەدان.

سێهەمین خالّی کە ولامی خوێنەر بۆ ستراتیژی نووسەر دیاری دەکا، پەیوەندی بە شێوازی چەمک و پێکهاتەی چیرۆکەوە هەیە؛ ئایا گریمانەی خوێنەر لە ناو دەقدا و بەر لە تاوا بوون دەشکێ؟ یان نووسەر هەتا کۆتایی چیرۆک چاوەڕوان دەمێنێتەوە؟

ولامی ئەم پرسیارە پەیوەندی بە دارشتنی تەرح و فۆرمی چیرۆک لە لایەن چیرۆکنووسەوە هەیە؛ واتا لەم خالّەدا ولامی خوێنەر لەگەلّ هەرکام لەم پرسیارانە بە پێی فاکتەرەکانی چیرۆک بەراورد دەکرێ. کردەوەی زەمانی و دۆخی کەسایەتییەکان دەوری گرینگ لە چیرۆکدا دەگێڕێ، واتا خودڕاڤەیی و ڕاڤەی کەسایەتییەکان لە دارشتنی تەرح و فۆرمی چیرۆکدا کاریگەریان هەیە. چاو خشاندنێک بە سەرجەم سەد چیرۆکی کوردیدا، ئەم مەبەستە لە ڕووی خشتەی خوارەوە باشتر دێنێتە بەرچاو:

هەر وەک لەم چارتەدا دەبینرێ، لە سیستەمی کلاسیدا لە سەتا سیو دوو پلە بۆ ڕاڤەی کەسایەتی لە شێوازی **ڕیوایەت** کەلّک وەرگیراوە. لە سیستەمی نوێخوازیشدا لە سەتا چلوپێنج پلە بۆ ڕاڤەی کەسایەتی یان کەسایەتییەکان، شێوازی **دووهەم کەس** بە کار هێنراوە؛ لە شێوازی **یەکەم کەسیشدا** لە سەتا بیستودوو پلە بۆ ڕاڤەی کەس یان کەسایەتییەکان تەرخان کراوە.

لە بەرەو پێشچوونی ڕەوتی چیرۆکی کوردیدا، هێندێ فاکتەر هەن کە پێکهاتە و چەمکی تایبەت بە چیرۆک پێکدێنێ لە ڕووی ئەو تایبەتمەندییەوە ڕادەی نیاز و ولامی خوێنەر دیاری دەکرێ.

بەلّگەی ٢

«...کێردەکەم لە هەموویان پێ باشترە، هەلّیدەگرم و لەسەر شادەمارەکەی مەچەکم ڕایدەگرم؛ برێک بیر دەکەمەوە ئیتر گەڕانەوە بێکەلّکە، ژیانی پڕ لە ژان، دەرەتانی لێبڕیوم تەنیا مردن دەتوانێ ڕزگارم بکا و ...»(٣) یان ڕەنگە دۆخێک گۆڕانکاری پێکبێنێ؛ واتا کەسایەتی وەک دۆخی پێشوو کە تێیدا دەژی، نەمێنێتەوە.

بەلّگەی ٣

«...دایکە گیان! دایە! ... توخوا مەگری! نابینی سێلاوی چاوەکانی من کۆشتیان کردۆتە کانی؟ وادەزانم هەر ئەو دەمیش ئەو تۆز و خۆلّە وردانە لەگەلّ برینی سەرشانم چونەتە ناو دەمارەکانم و لەوێشڕا چونەتە نێو دلّم و کۆنترۆلّی دلّە کوتەکانیشمیان وەدەست گرتووە...» (٤)

لە زۆربەی چیرۆکی کوردییەکاندا کاردانەوەی هەر دوو لایەنی کەسایەتی و دۆخ بە سەر یەکەوە دیارە؛ ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە چیرۆک ڕۆحێکی زیندووی هەیە و ناتوانێ لە دۆخێکی وێستاودا بمێنێتەوە. دیاردەکردنی بەردەوام لە ناو کردەوە و گۆڕانکاریدا خۆیا دەکا.

بەڵگەی ٤

«...یادی دایکی دڵی پڕ کرد جارێکی تر لە ئاوێنەکەدا بە شوێنیا گەڕا، سەرپۆشەکەی دڕابوو. ئەبێ زیاتر بیپارێزم لە دوو سێ لاوە دڕاوە... دایکی پێکەنی ... کەنینێکی تاڵ ... ئینجا فرمێسک هاتە نێو چاوی و پێی وت: زۆرت ئاگا لێی بێ ... ئەمە یادگاری دایکمە ... لەسەرە مەرگا پێی داوم.»(٥)

لە خاڵی دووهەمدا کەسایەتییکان وەک کەرەسەیەک دەکار دەکرێن کراکردیان بۆ پێکهێنانی تەرحی چیرۆکە. ئەو چیرۆکانەی کە لایەنی خەیاڵیان لە واقعییەتەکان تێدا کەمترە لەم بەشەدا دەنگونجێن. با سەرنج بدەینە دیالکتیکی ئەم دەقە:

بەڵگەی ٥

«...گوتی لەو جیهانە جگە لە ڕەنگی ڕەش هیچ ڕەنگێک نەدەبوو. ئەگەریش ببوایە زەردی خۆڵەمێشی و شینی خۆڵەمێشی و سووری خۆڵەمێشی دەبوون. گوتی: تۆ پیاوێکی نەخۆشی کە بەداخەوە توانای بیرکردنەوە و خەیاڵپەردازیت زۆرە».(٦)

**تەوەرەی دووەم**: بەجیهانی بوونی چیرۆک و خۆسانسۆڕی:

لە بەرهەمە چیرۆکییەکانی هەوچەرخدا، خاڵێکی گرینگ و هاوبەش دەبینرێف ئەویش کارکردی زەینی خوێنەر و ڕاڤەی دەروونی کەسایەتی چیرۆکە. لێرەدا پرسیارێک دێتە گۆڕێ: دەبێ هۆی چی بێ کە نووسەری چیرۆک بۆ داڕشتنی تەرحی بەرهەمەکەی بە دەروونگەرایی و خەیاڵەوە سەرقاڵ دەبێ؟ بۆ وڵامی ئەم پرسیارە ئەبێ بڵێین ئەوە شتێکی حاشاهەڵنەگرە کە لە دۆخێکی سانسۆڕدا نووسەر ئەخزێتە پاڵ خەیاڵ و خۆی بە ئوستوورەوە خەریک دەکا و لە نەگوتراوەکانی دەروون دەدوێ؛ لە لایەکی تریشەوە پەرۆشی بەجیهانی بوونی چیرۆکی کوردی، سەرنجی چیرۆکنووسانی ئیمە بۆ لای بەرهەمەکانی کافکا، ڕابلە، جۆیز، مارکێز، پرۆست، فاکنەر و هتد کە کارکردی هونەری و زەینی، چەند دەنگی و چەند جۆرەکیان تێدا گونجاو ڕادەکێشێ.

**تەوەرەی سێیەم**: کێشەی دەروونی و بەڵگەی مەسخ و بە ئیستیحالە کردن:

تواندنەوەی هەوێن مایەکانی ڕۆمانتیکی لە نموونەگەلی خەیاڵدا توانیویە لە زۆربەی نۆرمە باوەکانی جیهاندا چەمک بۆ ئەکتیو کردنی زەین و ڕاڤەی پتر ئاڵوگۆڕ بکا. ئەم بەشە لە سوررپالیزم یان ڕیالیزمی جادوویدا بەرچاوە. مونۆلۆگی کەسایەتی بۆ «مەسخ» و «ئیستیحالە» هێندێ لەم فاکتەرانەی ناو چیرۆکن کە باس بۆ توێژینەوەی زەین و دەروون شیکاری ئامادە دەکەن؛ لە زۆربەی کورتە

چیرۆکــەکانی فانتــەزی و خــەیاڵئــامێزدا، لایەنــە پرکێشــە و ئاڵــۆزەکان کــە لــە بــیچم و قــەوارەی کەسایەتییەکاندا دەبینــرێ، بەشــێکی زۆر لــە گــرفتی مــرۆڤ دەگەڕێنێتــەوە ســەر کێشــەی دەروونی و ناهومێدی و تێکشکان لە دووڕیانەی ئۆدیپیدا (oedipal). لێرەوە نووسەر هەوڵ دەدا تا ڕادەیەک بتوانێ وڵامی پێداویستەکانی بەردەنگی خۆی بداتەوە و ڕێگا چارەیەک بۆ گرفتەکانی دەروونی بدۆزێتەوە.

هەر بۆیەش لە ڕەهەندی خەیاڵەوە وێنە خەیاڵییەکان لە ناو دیاردە زمانییەکانی چیرۆکدا خۆیا دەکـا، کاتێک ڕەفتار لە نائاگاییەوە دیاری دەکرێ کە وشار و کێشە نائاگاییەکان، دەڕژێنێتە ناو خەیاڵی ئاگـایی مرۆڤ. کاتێک لە نێوان ئاگایی و نائاگاییدا دیواری کۆسپ و پەرژین پێکبێ و هەوڵ بۆ تێکڕمانـدنی ئـەم دیوارە نەدرێ و وزە و توانا سەرکوتکراوەکان ئازاد نەکرێن، کەسـایەتییەکی سـەقەت و چەواشـە دێتـە دی. دەبینین کە لە ئەندێشەی ماکە فانتـەزی و خەیاڵـییەکاندا دیاردەکـانی نـاو چـیرۆک پێچەوانـەی واقعییەت، لایەنی نەگەتیڤی پەیدا دەکا؛ بـەم پێیـە گۆڕانکـاری خێرایـی زەمـانی، کەسـایەتی چـیرۆک «ئیستیحالە» دەکا و لەوانەیە کەسایەتی «مەسخ»یشی بەدواوە بێ.

شێوازی خەتی و مونۆلۆگ، لە ژێر کارتێکەری شەپۆلی زەیندا لە ڕیـاالیزم دوور دەکەوێتــەوە و زەمـان کارکردی بنەڕەتی لە دەت دەدا و چەمک تووشی دەرهەست بوونەوە دەبێت. زەمان لە نێـوان ئـەزەڵ و ئەبەددا ئازاد دەبێ، بەتایبەت ئەو کاتەی کێشەی مەرگ و ژیان لە ئـارادا بـێ، مـرۆڤ لەگـەڵ ڕووبـەڕوو بوونەوەی لایەنگەلی نەگەتیڤ، تووشی تەنگ و چەڵەمە دەبێ، ئەو بەشـە لـە چەنـد دەقێکـی چیرۆکـدا جێگەی لێوردبوونەوەیە:

**دەقی یەکەم:** «ڕۆژێک نامەیەکی سەیرم پێگەیشت؛ نووسیبوویان نـەنکت مـردووە... کـوڕە! نـەنکی چی؟ من قەت نەنکم نەبووە، ئیستا مردبێ ... کاغەزێکیان بە کچێکـدا بـۆ نـاردم، کچـە ڕووت و قـووت بووف دەتگوت قەت دانەپۆشراوە ... کچە دەسـتی گـرتم بردمیـە سـەر مـەیتی نـەنکم ... چۆغەیـەکی زەردی زۆر جوانی دەبەر دابوو... سەیری ئەو تەرمە سەیرەم دەکرد، نەنکم ببوو بـە پیـاو... یـان باشـتر بڵێم: هەر لە هەوەڵەوە پیاو بوو.»(٧)

**دەقی دووهەم:** «چایچی وازی نەدەهێنا: بۆ کە ورچە سەما دەکا، تۆ دەگری؟ خۆم چەن جـار دیومـە لۆتیش بۆی گێڕاومەتەوە. کابرا بە ئارامی هاتە قسە کردن: ئەوە دایکمـە. چـایچی داچڵـەکا، نیگـای لـە کابراوە بۆ ورچەکە، لەویشەوە بۆ کابرا گوێزایەوە، حەقایەتێکی دوور و درێـژە، حەقایـەتی هـەزاران سـاڵ لەمەوبەر... .»

لە پێکانەی هەردویی ئەم دەقەدا دوو شێوە پێناسەی هەیە: یەکـەم، مـەرامی ئیـدئۆلۆژیکی، دووهـەم، کێشەی دەروونی.

لە پێناسەی یەکەم دەقدا، نووسەر بە ســەرنجدان لــە ڕووداوەکـانی دەور و بـەریژیانی، نـرخ و بـەهایی پەیوەندییەکانی بنەماڵەیی لەگەڵ دۆخ و کێشەی تاکە کەسێ لە کۆمەڵدا پێناسە دەکا: «کـوڕە! نـەنکی چی؟ من قەت نەنکم نەبووە.» (٨)

لە پێناسەی دەقی دووهەمی چیرۆکدا باس لە سەر خودئاگا و ناخودئاگای مرۆڤە؛ خودئاگا ئەو بەشە لە زەینە کە مرۆڤ هوشیارانە زۆربەی کات، تێدا دەژی لەودا بیر دەکاتەوە، هەست دەکا شت وەردەگـرێ و ناخودگا بەشێکی تر لە زەینی مرۆڤە کە پانتاییـەکی گـەورە لـە تایبەتمەندییـەکانی دەروونی کەسـێتی دەگرێتە خۆی. زۆربەی پێداویستەکانی لەم بەشەدا جێگیر بوونە کە ڕاگواستنیان بۆ بەشـی خودئاگـا زۆر ئاستەمە، ئەزموونەکانی کە لەم بەشەدا بە خودئاگا ناگەن، ئەزموونێکن سازگارییان لەگـەڵ گریمانـەکانی ئێمەدا نییە و ناموراد و سەرکوت‌کراو دەمێننەوە. ئەم ناخودئاگایە تەنیا لە ڕێگای هیپنۆتیزم و خەیاڵـەوە پێناسە دەکرێن.

دەتوانین ئەوەش بڵێین «دەروونییەکان» یان ژورناخودئاگا چەشـنی سـێبەر یـان وەهمێـک سـەیری دەکرێ کە بەشی تاریکی دەروونی مرۆڤ پێکدێنێ.

ناساندنی ئەو سێبەرە لە هێندێ ڕەوشی وەک ئینکار کردن (من قەت نەنکم نەبووە) یـان لـە ڕێگـەی تەماع و دەسەڵاتەوە دەردەکەوێ. با لە درێژەی ئەو دەقە چیرۆکە کـە لـە مەسـخ دەدوێ، ورد بینـەوە: «...ئەو سەردەمەی کە ئێمە چەندین برابووین و حەق سوڵتان، من دونی میرم بووم و یەکێ لە براکـانم دوونی داوود؛ ئێمە لەسەر پیری و گەورەیی شەڕمان بوو، دایکمان کەوتە بـەینمان، ئـەرێ حەقایـەتێکی دوور و درێژە ئێمە دایکمان مەسخ کرد و کردمان بە ورچ، ئیستاش خۆت چاوت لێیە دایکم چۆن سەیرم دەکا؟ چاوت لێیە چۆن ئازارم دەدا؟» (٩)

باس لەسەر ئەولایەنی غەیرەئەخلاقی و چەواشە کردنی ڕاستییەکان لە نـاو کـەش و هـەوای خەیاڵـدا وەک «مەسخ و ئیستیحالە» کە لە پەیوەندی لەگەڵ بوونەوەریان یـان کەسـێکی تـر لـە چیرۆکـدا ڕاڤـە دەکرێن، فەرافکەنی بۆ سەر کۆمەڵ یان کەسانی ترە کە چیرۆک‌نووس هەوڵی بۆ دەدا و تاوویی دەکا.

**تەوەرەی چوارەم**: دەوری مونۆلۆگ لەسەر شەپۆلی زەیندا:

«مونۆلۆگ» بەرچاوترین خاڵی چیرۆکە بۆ وروژاندنی زەین جگە لەمـە تایبەتمەنـدی ڕاوێـژی زمـانی یەکەم کەس لە چیرۆکدا ئەمەیە کە نووسەر بە هاسانی دەتوانێ لـە دۆخ و زەمـەنی کەسـایەتی بـدوێ. **ڕیوایەتی زەینی یەکەم کەس** لە تەک خەتی کردن و یەکپارچەیی چیرۆک دەوری گرینـگ دەگێـڕێ. منی ڕاوی (بگێڕ) باش دەتوانێ سەرنجی خوێنەر ڕابکێشێ و باری عاتیفی چیرۆک بە هێز بکا و پرسیار و گومان بێنێتە دی؛ خەیاڵ تاو و تویی بکا و نەهێنییەکانی نـاو تـاریکی دەروونی شـی بکاتـەوە: «...لـەو وەختەوە خەوی سێبەری سپیم دیوە، سێبەرەکەی خۆم لێ بۆتە مۆتەکە، پێم وایە سـێبەری مـن نییـە؛ ئەی بۆ وەک ئەو سێبەرە سپییە دەست ناکاتە ملم و گوێ بۆ قسەکانم ڕاناگرێ؟ دەڵێم نەکا ئەو چووبـێ ...؟ ئەگینا کابرایەکی نەدیو و نەناس چووزانێ؟ دەڵێم نەکا هەر ئەو باوکمی کووشتبێ؟»(١٠)

**ئەرکی نووسەر لە ئاستی چیرۆکدا**

ئەرکی نووسەر تەنیا بەکارهێنانی تکنیک نییە، بەڵکوو ڕوانین لە بەهاکانی چیرۆکیش بۆ ئەو گرینگە. نووسەر دەتوانێ لە بەرهەم هێنان و گۆڕینی بەهاکاندا خوێنەر ئاگادار بکاتەوە ئەرکی ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی نووسەریش هەر ئەوەیە. نیچە دەڵێ: «بەهاکان بە ڕوانگەوە دەگۆڕێن» جا کە وایە پێکهێنانی ڕوانگەی نوێ دەتوانێ بەهاکان بنرخێنێ، خەڵکی جیاواز لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی جیاوازدا کۆمەڵێ بەهای جیاوازیان هەیە، ئەگەر چیرۆکەکان دابڕانی زەمانیان تێدا بەدی دەکرێ و لە تەرح و فۆڕمی نوێ پێکهاتووە، دەیەوێ خۆی لە یەکدەستی بپارێزێ، کەمپێ خوێنەرانی تایبەت بە خۆی تەرخان بکا. بە کورتی ئەلتەرناتیڤ کردنی ئەندێشەی ناو چیرۆکی کوردی دڵی زیندووی چیرۆکە بۆ داهاتوو لێدەدا. هەتا خۆی لە ئاستی چیرۆکی جیهانیدا ڕابێنێ، بەڵام پرسیارێک لە ڕەوتی چیرۆکی کوردیدا ئەمەیە کە چیرۆکەکان چۆن لەگەڵ نرخ و بەهاکاندا مامەڵەیان کردووە؟

لە وڵامی ئەم پرسیارەدا، دەتوانین بڵێین لە کوردستانی ئێمە چیرۆک پەیوەندی بە دوو خاڵی گرینگ هەیە: یەکەم، مەسەلەی سانسۆڕ؛ دووهەم، داڕشتنی تەرح و فۆڕم. لە شێوازی سانسۆڕ یان خودسانسۆڕیدا بەرەو ڕوو بوونەوەی سوننەت لەگەڵ گۆڕانکاری نوێی زەمانی و ئەزمونگەرییەکانی تکنیکی و بەها تازەکانی جیهانی، نووسەر تووشی قۆناغێکی هەستیار وئاستەم دەکا. لە لایەک دەبینێ کە بەرهەمە گەورەکانی جیهانی لەگەڵ شارستانییەت و پیشەسازی لە دایک بووە، لە لایەکی تریش، کێشەی سیاسی، ئایین و بڕوا لە وڵاتانی دواکەوتوودا ئیستاش لە سەر بیر و باوەڕی نووسەر چاوەدێری دەکا؛ لێرەدایە کە باس لە فەردانییەت و ڕۆحی سەربەخۆ تکنیک و تەرح و فۆڕمی تایبەت بە خۆی دەخوازێ.

هەر بەو بیانووەش لە چیرۆکی هاوچەرخدا تکنیک بە ناوی شەپۆلی زەین و گەڕانەوە بۆ ناخی مرۆڤ لە زۆربەی چیرۆکەکاندا دەبینرێ.

خەیاڵاوی بوونی چیررک ئەوە دەگەیەنێ کە لە فەردانییەت و خودی کەسدا وێنەی هێمایی هەن کە لە لێکۆڵینەوەی مێژوییدا بەرەو ڕوویان دەبینەوە. ئەمەش ڕاستنوێنی خەیاڵە کە لەودا دیاردە ئوستوورەییەکان تاکەیی دەبن لە هەمان کاتیشدا حوزووری گشتییان هەیە، ئەوە ئەمە دەسەلمێنێ کە ڕۆحی مرۆڤ لە لایەک، کەسێتی دەروونی فەردی لە لایەکی تر گشتی و بەرهەستە.

لە چیرۆکی هاوچەرخی کوردیدا، هێندێک ئەزموونی تاڵ و تاسێنەر دەبینرێ کە دەرد و ڕەنجی مرۆڤی سەردەم دەگەیەنێ. لەم چیرۆکانەدا هەوڵ بۆ قەرەبوو کردنەوەی خەسارەکانی دەروون لە ئارا دایە؛ هەر بۆیەش پەنا بردن بۆ جیهانی ئوستوورەیی و شیتاڵە کردنی نیازەکانی دەروونی، تاقە ڕێی تاقیکردنەوەی ئەزموونەکانە.

«ئەرنێست کاسیرێر» دەڵێ: جیهانی ئوستوورەیی جیهانێکی وێنەییە، پڕە لە کردەوە، لە ڕێگا خەسڵەتە عاتیفی و دەروونییەکانەوە ئەتوانێ هەست بە هێز و تواناکانی دەروونی بکەیت.(١٢)

ئەگەر نووسەر لە ڕوانگەی نەگەتیڤیەکانەوە دەیهەوێ ڕووداوەکان بخاتە ناو ڕەهەندەکانی غەیرە عەقلانی بۆ مەبەستی چاکباوەڕی (meliorism) و ئامانجگەری تێدەکۆشێ.

**تێبینی:**

هەر چەند لەم چیرۆکانەدا، ڕیوایەتی عەینی پێکهێنانی تەرح و داڕشتنی کەسایەتی کۆنترۆڵی زەمان و دەروونشیکاری کەسایەتی چیرۆک، وەک خاڵگەلێکی پۆزیتیڤی چاوی لێدەکرێ، بەلام ئاڵۆز کردنی چەمکی چیرۆک بە بیانووی تەرح و فۆرم کە خوێنەر سەری لێبشێوێ و لە ڕاڤە کردن بتوۆرێ، ئەوە کەم ئەزموونی و تێنەگەیشتنی چیرۆکنووس لەمەڕ نرخ و بەهاکانی چیرۆک دەگەیەنێ؛ کارێکتەرەکانی چیرۆک لە ناو بەهاکانی چیرۆکدا دەژین و بە ناو ئەزموونگەری چیرۆکنووسدا تێدەپەڕن. گۆڕینی کەسایەتییەکانی واقیعی هەر چەند لە ناو خەیاڵیشدا پەروەردە بن، خوازیاری ناو ژیانی ڕاستین و لە ناو بیری نووسەردا دەبینرێن، ئاڵۆزی چەمکی چیرۆک دەبێتە هۆی ئەمە کە کەسایەتییەکان مەزنتر لەوەی کە هەن، نەبینین.

نووسەر لە دەرەوەی کەسایەتییەکاندناژی، بەڵکوو کەسایەتییەکان ژیانیان، بوونیان، کەسایەتیان ڕاستەوخۆ لە نووسەر قەرز دەکەن هەر وەک «گوستاو فلۆبێر» گوتوویە «مادام بواری» منم. لە کۆتایی ڕاڤەی ئەم بەشەدا بەو ئاکامە دەگەین کە لە هێندێ دەقی چیرۆکدا ڕۆحی خۆسانسۆڕی بە سەۆ تکنیکدا هێشتا هەر زاڵە، ئیزن بە گەشەی فەردانییەت و ڕۆحی سەربەخۆیی کەسایەتی چیرۆک نادەن. با لەم دەقەش ورد بینەوە:

دوا بەڵگە:

«...لیباسەکانم لەبەر خۆم داماڵی و لە نێو ئاوێنەکەدا ڕوانیم بە بەژن و بالآمدا، لەبەری پێ تا تەوقی سەر، لە تەوقی سەرم تا بەری پێم پێستێکی پەمەیی سفت و ناسک وەک پەڕی گولا. لە بەر شەرم چاوم دانەخست بڕوانمە پشتێند بەرەوخوارم، بەلام ...ئاوڵکراس و کراسم لەبەر کردف پشتێندم بەست.»(١١)

**دەرەنجامەکان:**

لە کۆتایی ئەم وتارەدا، سەرەڕای خاڵە پۆزیتیڤییەکانی چیرۆکی هاوچەرخی کوردی، هێندێ خاڵی کزیش دەبینرێ کە پێویستە بە کورتی ئاماژەیان پێبکرێ:

١. زۆرێک لە میتۆدەکانی فەلسەفی و سایکۆلۆژی لە چەمک و تکنیکدا پتر ڕێژەییە نەک داهێنەرانە.

٢. کەڵک وەرگرتن لە چەمکی تازە و تێست کردنی ئەزموونەکان بەردەوام نەبووە؛ ئەو بەردەوام نەبوونە، چیرۆک وەک پرۆسەیەکی ناتەواو دەهێڵێتەوە.

٣. هێندێک لە چیرۆکەکان کارکردی زەمانیان لە دەست داوە و لە مەکان دابڕاون. چەمک تووشی دەرهەستێکی نائاسایی بۆتەوە و گەمەی تەقلید ئاستی خوێندنەوەی چیرۆکی دابەزاندووە.

٤. ڕەسەنایەتی و خۆجێیی لە زۆربەی چیرۆکەکاندا ڕووکەش و کلیشەییە.

٥. ترس و گومان لە چیرۆکی کوردیدا بەرچاوە، ئەویش دەگەڕێتەوە سەر قۆناغی گواستنەوە لە سوننەتەوە بۆ نوێخوازی؛ واتا دڵەڕاوکێ لە سیستەمی جیهانی و ڕووبەڕوو بوونەوەی بایەخەکان لەگەڵ یەکترە کە دەبێتە پێکهێنانی گومانی نووسەر.

٦. لە ئاستی ڕەخنەدا چیرۆک نەکەوتۆتە بەر ڕەخنەی موونسیفانەوە و ڕەخنەگر بە شێوازێکی ئاکادیمی و کاربەری چیرۆکەکانی کوردی تاوتوێ نەکردووە؛ واتا زۆربەی ڕەخنەکان لەسەر چیرۆک تیۆریزەن تا پراکتیزە.

سەرەڕای هەموو ئەو گرێ و ئاستەنگانەی لەسەر ڕەوتی چیرۆکی کوردیدا هەیە، تەمەنی ساوای چیرۆکی کوردستانی ڕۆژهەڵات بە خامەی ڕەنگینی چیرۆکنووسانی لاو خەریکی بەخۆدا هاتنەوە و خۆڕانان لەگەڵ ڕەوتی جیهانی چیرۆکدایە. چیرۆکنووسانی لاو بە ئیرادەیەکی قایم و ورەیەکی نەسرەوتووو پێ ئەنێتە قۆناغی تازە و هەوڵ بۆ پێشکەوتنی چیرۆک ئەدا؛ بە قەولی فرۆید «تەنیا لە ڕێگای بەربەرکانییەوە، ئەتوانێت بە سەر هێزی دەسەڵاتدار و تێکنەشکاوەکاندا سەرکەوتوو بێت و مانایەک لە ژیان و بوون بکەیتە دەسکەوت».

**پەراوێزەکانی ناو دەق:**

١) اسطوره ک. ک. روتون، ابوالقاسم اسماعیل‌پور
٢) مەنسوور تەیفووری، ڕازە ل. ٢٠.
٣) بریا کاکە سووریف خۆر، ل. ٧٦.
٤) عیرفان ڕەسووڵی، ڕەهەندەکانی ون بوو، ڕازە، ل. ٨٤.
٥) ژیلا حوسەینی، سروەی ١٢٥-١٢٦، ل. ٥٦.
٦) عەتا نەهایی، تەنگانە، ل. ٧.
٧) سولەیمان عەبدولڕەحیمزادە، خۆر، ل. ١١.
٨) هەمان سەرچاوە.
٩) عەتا نەهایی، تەنگانە، ل. ٤٢.
١٠) قادر هیدایەتی، خۆر، ل. ٤٩.
١١) ماپارە ئیبراهیمی، خۆر، ل. ٤١.

**سەرچاوەکان:**


١. احمدی، بابک (١٣٨٠) **ساختار و تأویل متن**، تهران، نشر مرکز.

٢. بیشاپ، لئوناردو (١٣٧۴) درسهایی دربارەی داستان‌نویسی، ترجمەی محسن سلیمانی، تهران، سازمان چاپ و انتشارات.

٣. شریعت‌زاده، افسانهٔ (١٣٨١) افسون و افسانەهای برونو بتلهایم، تهران، هرمس.

٤. **خۆر** (١٣٧٨) گەلە چیرۆک، تاران، پەژوهەندە.

٥. **خەوەڕاو** (کۆمەڵەچیرۆک) (١٣٧٣) تەوریز.

٦. **ڕۆژهەڵات** (خەرمانانی ١٣٨٣) ژمارە ١٥و١٦.

٧. **سروە** (جۆزەردانی١٣٨٠) ژمارە ١٧٩.

٨. **لە ستایشی ئەدەبدا**، کۆمەڵە وتار، وەرگێڕانی شێرزاد حەسەن، هەولێر، ئاراس.

٩. مەحموودپوور، عەزیز (١٣٨٠) **حەشری ڕەنگەکان**، تاران، عابد.

١٠. **نظریەی ادبی و نقد عملی**، ترجمە جلال سخنور، سیما زمانی، پویندگان نور.

١١. نەهایی، عەتا (١٣٧٤) **تەنگانە**، تەوریز.

# کاریگەری دابڕان لە تێکستە شیعرییەکانی «مەولەوی»دا

د.موحەممەد ئەحمەد سەعید (کەساس جەبباری)*

**کورتە:**

دیاردەی دابڕان وەک فاکتەر و سەرچاوەی نامۆیی، لە مێژوویەکی بەرینەوە لەناو کۆمەڵگای کوردیدا وەک دیاردەیەکی باو کاریگەری خۆی لەسەر تاکەکانی بەجێهێشتووە. کاری لە هزر و بیریان کردووە، بەتایبەتی شاعیرانی و لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە. لە ناو ئەو شاعیرانەشدا مەولەوی بەو دیاردەیە کاریگەر بووە لە شیعرەکانیدا نەخش و ڕۆڵی بەرچاوی هەبووە و فەزایەکی پان و بەرینی داگیر کردووە. بەو پایەی مەولەوی سۆفیەکی لە خواترس و هەست و دڵناسک بووە. بە کارەسات و ڕووداوەکانی ڕۆژگار و ژیانی خۆی یەکجار نیگەران بووە. لە ناویاندا دابڕان و دوورکەوتنەوە لە دۆست و هاوڕێیان و خۆشەویستان و هەروەها مەرگی «عەنبەر خاتوون»ی هاوسەری، بەرە و ئەوەیان بردووە کە دابڕان لە خودی خۆشیدا بێتە کایەوە، هەر ئەوەش وایکردووە شیعرەکانی سیمای یاخیبوون و تووڕەیی و گریان و گلەیی لە قەدەر و چەرخی ڕۆژگار و دەربڕینی باری مەینەتی و چەشتنی ئازاریان پێوە دیار بێت.

مەولەوی لە ئەوپەڕی لووتکەی باری ئاڵۆزی مەینەتیدا و لەو شیعرانەی کە بەرامەی دابڕانیان لە خۆگرتووە، وەک خاوەن باوەڕێک بەبنەمای یەکێتیبوون و بانگەوازی یەزدانی و گەڕانەوە بۆ ئەو ژیانە هەتا هەتایەی ڕاستی و حەق بۆ دڵدانەوە و سەبووری خۆی پەنای بۆ ساقی و مەی و نەی وئاوازەکانی مۆسیقا و سروشت وەک هێمایەکی ئاینی و سۆفیگەری کۆڕ و بەزم و ڕەزمی سۆفیانەی ساز کردووە و ئۆقرەیی و ئارامی بوونیات ناوە.

وەک سروشتپەروەرێکیش هەمیشە سۆز و هەست و ئەندێشەی خۆی و دەوروبەرەکەی تێکەڵی بە سروشت کردووە، کە لای مەولەوی سەرچاوەی باوەڕێکی پتەوی یەکێتیبوونە. بەوانە ئازارو مەینەتییەکانی و کاریگەری ئەو دابڕانەی ڕاماڵی و هەموار کردووە.

**وشە سەرەکییەکان:** مەولەوی، دابڕان، نامۆبوون.

---

* کۆلێژی زمان، بەشی کوردی.

## پێشەکی

لە سەرەتادا پرۆژەی ئەم تۆژینەوەیە ناو نیشانەکەی «بەرامەکانی دابڕان لە تێکستە شیعرییەکانی مەولەویدا» بوو، بەڵام بە خواستی لیژنەی زانستی بەش، وشەی «بەرامە» گۆڕا بە کاریگەری و بەمجۆرەی ئێستای لێهات. لە بەر ئەوەی تۆژەر وای بۆچووە کە دابڕان سەرچاوە و فاکتەری سەرهەڵدانی دیاردەی نامۆ بوون و نامۆییەو ئەم دیاردەیەش لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا چ‌تاک و چ‌کۆ وەک بەشێک لە ژیانی کورد کە بە هۆی کارەسات و ڕووداوە مەینەتبارەکانییەوە، پانتاییەکی فراوانی داگیر کردووە، لەکار و چالاکییەکانیدا ڕەنگ‌وبۆی دەرکەوتووە، بەتایبەتی لای ئەدیب و شاعیرانی. لەناو شاعیرانیشدا مەولەوی شاعیر بەوەی شارەزا و سۆفیەکی لە خوا ترس و دڵناسک و متەوازعێکی بێ‌وێنە بووە، بەوکارەساتانە زوو نیگەران بووە. دیارترینیان دابڕان لە دۆست و ئازیزان و دڵبەر و کۆچی «عەنبەرخاتوون»ی هاوسەری تەنانەت لەسەر خودی خۆشی، ئەم دیاردانە، یان ئەم ڕووداوانە کاریگەریی بەرچاو و دیاریان لە سەر مەولەوی بووە. بۆیە لە بەشێکی زۆری شیعرەکانیدا بەرامەیان دیارە. هەر ئەمەش بووە بە هاندەری تۆژەر کە تیشکێک بخاتە سەر ئەو دیاردەیە و ئەو شیعرانە هەندێکیان بکات بەنموونە و بەڵگەی تۆژینەوەکە. لەهەموویاندا دیوانەکەی مەولەوی و مەلاعەبدواکەریم مودەڕس سەرچاوەی هەڵبژاردنی دەقەکانە. تۆژینەوەکەش بەسەر دوو تەوەردا دابەشکراوە؛ لە یەکەمدا کورتەیەکی دیاردەی دابڕان و نامۆبوون لە ڕوانگەی شارەزایانەوە باسکراوە. هەروەها ڕنگدانەوەی دیاردە کە لە شیعری هەندێ لە شاعیرانی دیالێکتی گۆران بە پێی ڕیزبەندیەکی مێژوویی.

لە تەوەری دووەمیشدا پۆلێنکردنی حاڵەتەکانی دابڕان لای مەولەوی و شیکردنەوەو لێکدانەوەی هەندێ لە دەقە شیعرییەکانی ناو دیوانەکەی.

## تەوەری یەکەم:

دابڕان، لێک جیابوونەوە، نامۆبوون، وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی هەمیشە نەخش و کاریگەریی لەناخ و دەروون وسۆز و بیری مرۆڤدا هەبووە. وەک دابڕان لە دۆست، ئازیزان، مرۆڤ لە نیشتمان و زێدی کە بە هەر هۆیەکەوە بێت.

لەمێژووی گەلادا بەگشتی و کورد بە تایبەتی، ئەم دیاردەیە بەحوکمی ژیان و مێژووەکەیەوە وەک دیاردەیەکی زەق لە هەموو قۆناغەکانی ژیانیدا حزووری هەبووە. لەناو هەموو چین و توێژەکاندا ڕەنگی داوەتەوە وکاریگەریی بەجێهێشتووە؛ تەنانەت لەناو چیرۆک و بەسەرهات وڕووداوەکانی کوردەواریدا، لەناو بنەماڵە و فەرمانڕەواکانیدا، لە ئەدەبیات و کەلتوورەکەیدا چەندین نموونە لە شیعر و چیرۆکدا بەدی ئەکەین کە ئاوێنە نومای ئەو دیاردەیەن.

دابڕان، یاخود فیراق و دوورکەوتنەوە و نامۆ بوون، ئەوبارە سایکۆلۆژیەی مرۆڤە کە ئەکرێ بە سەر ئەم بارانە هەمەجۆری بکەین. دابڕانی مرۆڤ لە مرۆڤ، مرۆڤ لە شوێنەزا، هۆز لە هۆز لە کۆمەڵ و مرۆڤ لە سروشت لە

**بەشی پێنجم- رەخنە**

سەراپایاندا کاریگەری سایکۆلۆژییان بۆ سەر تاک و کۆمەڵ هەیە. ئەم دیاردەیە وەک چەمک و زاراوە بووەتە مایەی تێڕامانی هەندێ لەزانا و فەیلەسوفان و کۆمەڵناسان. لە لێکۆڵینەوەکانیان ئاماژەیان بۆ کردووە؛ "هیگل" ئەڵێ«نامۆبوونی مرۆڤ و دابڕانی لەخودی خۆی واتە مرۆڤ لە خودی خۆی نامۆ ئەبی یان دائەبڕی لە سروشت و گەوهەری خۆی و ئەگاتە لووتکەی توندڕەویی (تطرف) لە دوورکەوتنەوە لەخۆی» (السید جاسم، ١٩٨٦: ١٢٩). کە ئەمەش جۆرێکە لەدابڕانی گیانی کە «ئەو دۆخەیە تاک هەست بە دابڕانی دۆخێکی مرۆڤایەتی و ئایدیایی ئەکات» (الدوری:١). هەر لەوبارەیەوە هەرقلیتس لە ناواخن و دووتوێیدا بەمجۆرە ڕاڤەی کردووە: «لەخۆم ئەگەڕێم و ئەکۆڵمەوە» (الرحیم:١). هەرئەم دابڕان و نامۆبوونەش لەزۆر باردا مرۆڤ پەلکێش ئەکات و لەسروشت و دەوروبەرەکەی دائەبڕی و چەندین وێنە وەرئەگرێ بەتایبەتی لەو شوێنەی کە تێیدا ئەژی و ئازار و خەم دائەگری وەک «لە جەور و ستەمی کۆمەڵ، لەهێزەکانی جێگا بەجێ ئەهێڵی، دەرچوون و بە جێهێشتنی زادگا، یاد و بیری چاک و خۆشی وەک ڤیان (ئاکرەیی:٧٣). ئەتوانین بڵێین بەشێکی زۆری لیریکاکانی مەولەوی ئەم جۆرانە ئەپێکن هەر ئەو دابڕانە یان پەلکێش بوون لە گەوهەری خۆیدا واتای لادانێکی یان دەرچوونێکی ناچارییە لە گەوهەری مرۆڤایەتیدا، کە مرۆڤ ئەچێتە بەرگی کەسێتیەکی نامرۆڤانەوە یان بەهۆی هۆکارەکانی ژینگەی کۆمەلایەتیەوە و زەمینەخۆشکردنیان بۆ چەسپاندنی توانا مرۆڤایەتییە ڕەسەنەکانی و تێکدانی هەرچی ئەوەی بۆی ئەلوێ لە دەرپەڕاندنی داهێنانەیە کلاییکەرەوە گشتییەکاندا لە هەموو هەستەکاندا بۆ خولْقاندنی مرۆڤێکی ئامێرئاسا لەجیاتی ڕاستەقینە و گۆڕینی بۆ کەرەسە و کەلوپەل، نامۆبوون، بەشت بوون (المسیح، ١٩٧٧: ٤٨-٤٨).

بێگومان ئەمجۆرە کاریگەرییە لەسەر ناخی مرۆڤ بەتایبەتی ئەوانەی بواری ئەفراندنیان بالایە، نەقشی خۆی جێهێشتووە و ئازاری داون و بە دەستیەوە نالاندویانە. لە بەرهەمەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە ئەوەتانێ شاعیری عەرەب "ئەبوو تەممام" بەدەست چەند دۆخ و جۆری دابڕان و نامۆبوونی شوێن و کۆمەلایەتی و دەروونییەوە ئەینالاند تا باوەڕی بەوە هێنا کە «دابڕان نوێ کردنەوەیە» (الرحیم:١). ئەمەش دەرەنجامی ئەو گۆڕانە سایکۆلۆژییەیە.

مارکسیش بۆ ڕزگاربوونی مرۆڤ لە بەندیخانەی سەرزەوی نەک ئاسمانی تەماشای نامۆبوونی وا کردووە کە «دیاردەیەکی کۆمەلایەتیە هۆ و ئەنجامەکانیشی دۆزراونەتەوە، هەر لەو ڕۆوەوە پێی لە سەرئەوەدا گرتووە کە هۆشیاری چینایەتی مەرجێکی پێویستە لە داماڵینی سەربەستی و هۆشیاری؛ نامۆبوونیش دیسان مەرجێکی پێویستە بۆ لابردنی» (خوری، ١٩٨٤: ١٩). هەر لەو پێودانگەوە، دابڕان و نامۆبوون ئەشێ بە ئازادی دەرپەڕێنرێ. ئازادیش دژی نامۆبوونە؛ هەردووکیان پەیوەندیەکی ئۆرگانیان لە شیکردنەوەی کۆمەڵگای بۆرژوازی و ئایدۆلۆژییەکەیدا هەیە» (خوری، ١٩٨٤: ١٩). "کارل مارکس" وەک دیاردەیەکی کۆمەلایەتی و سایکۆلۆژی لێی دواوە بە کۆمەڵگای بورژوازیەوە پەیوەستی کردووە. چوونکە ئەم دیاردەیە لەو کۆمەڵگایە ئاشکرا و زەقتر دەرکەوتووە و لە کار و بەرهەمی قۆناغەکەدا ڕەنگی داوەتەوە و لە کێشە کۆمەلایەتی و فیکری ئابوورییەکانی ئەو قۆناغەشی بەدەر نەبووە.

دابڕانی تاک لە تاک یان لەخود و کۆمەڵ سەرجەمیان کۆبەندی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتین کە ئەکرێ لەسەرەتاوە بەهۆی ئاوارەیی و دوورکەوتنەوە دەبێت وەک لە خۆشەویست، لە وڵات یان بە شتبوون و خۆ ونکردن لە خودی خۆیدا بەرجەستە ناکات. هەردوو چەشنەکەشی ئەچنە خانەی دابڕانی کۆمەڵایەتیەوە و وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی دەرئەکەون. دوای بەسەر کردنەوەی هەندێ ڕوانین و سەرنجی کورت سەبارەت بەم دیاردەیە ئاوڕێکی خێرا لە هەندێ شیعری دیالێکتی گۆران ئەدەینەوە.

## دابڕان لای شاعیرانی گۆران

دیاردەی دابڕان لە شیعری دیالێکتی گۆراندا وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی باوی قۆناغەکەی لە مێژوویەکی کۆنەوە سەری هەڵداوە. ناوەرۆکەکەشی لە دەوری دابڕان لە دۆست و خۆشەویست، لە وەتەن و نیشتمان خولاوەتەوە وەک  دیاردەیەکی باو لە شیعری کوردی بە گشتی و دیالێکتی گۆراندا بەتایبەتی پانتایەکی بەربڵاوی گرتووەتەوە. ئەتوانین بڵێین هەر لەو قۆناغەی سەرهەڵدانی شیعری لیریکی دوای شیعری ئاینییەوە هاتووەتە ناو فەزای شیعری گۆرانەوە. سەرەتاییترین ئەو نموونەی دابڕان و فیراقە لای "بێسارانی" شاعیر بەدیی ئەکەین. بەشێکی زۆری ئەو شیعرانەی لە بواری خۆشەویستیدا وتوونی. بەرامەی دابڕان و دووریان پێوە دیارە، وەک: دابڕان لە خۆشەویست و نیشتمان کە هەندێکیان بە یادی بێسارانەوەن.

دابڕان و دوورکەوتنەوە لە خۆشەویست وای لە بێسارانی کردووە بناڵێنی وناڵەی دڵی بکاتە بەرد. لە شیعرێکدا لەگەڵ دڵی خۆی ئەدوێ لۆمە و سەرزەنشتی ئەکات لە وەڵامدا پێی ئەڵی یارەکەم لە مەوپێش هەموو ئێوارەیەک و بەیانییەک باڵای پێشان ئەدام. ئێستا لە دووریدا ئەناڵم و گەرد و تۆزی پێڵاوەکانی بە برژانگ ئەماڵم.

لە شیعری «ئیمشەو دڵ جە دەرد ئیمشەو دڵ جە دەرد»دا ئەڵی:

ئیسە لێڵاوی نە دێنمەن — جەو پەی ئاهی سەرد زاری و شینمەن
ئیسە پەی لێڵاوی قیبلەم مەناڵۆ — گەردی پاو پاڵاش وەمژ مەماڵو
یە خەیلێ وەختەن لێم نادیارەن — نە شەو خاوم هەن، نەڕۆم قەرارەن
کەسێ کە دۆسش نە پێوارش بۆ — چەنی بە شەو خاو ڕۆ قەرارش بۆ
چون بێسارانی هەر کەس بێ دڵ بۆ — چون باخچەی بێ ئاو دایم بێ گوڵ بۆ

(بێسارانی، ١٩٨٢: ١٨).

یاخود لە شوێنێکی تردا ئەڵی:

دەرون جە دووری مەگریا بە تاو — جە چەم مەتکیا پەیاپەی هۆناو
ناڵەی ناڵێنم وەپای عەرش یاوا — ڕوخسارم نەڕووی زەمین مەساوا

(بێسارانی، ١٩٨٢: ٢١).

هەموو ئەو تێکستانەی کە غەزەلی دڵداری و لیریکین مۆتیڤی دووری و هیجران و دوورکەوتنە وناڵین و پەشێوحاڵی غەم و غوربەتیان لێکەوتووەتەوە.

"سەیدی هەورامی"ش لە شیعری «چراغم تۆمەن»دا، ئاوا دەردەدڵی و ڕازی دڵی خۆی بە هۆی دووری و دابڕان لە دڵبەرەکەیەوە دەرئەبڕێ ئەڵێ: ئەگەر گەردوون شوێن خەیاڵم کەوێ و ئاواتم بهێنێتەدی و دیدەنی دڵبەرەکەم بەنسیب بێ، لەجیاتی چاوە کزەکانم دووهەزار چاوم بوایە و هەموویان ساخ بوونایە و سۆمایان بەهێز بوونایە تاوەکووو بەتێری تەماشای بالای تۆم بکردایە.

ئەر گەردوون وە شون خەیالم وەرۆ      یەک ڕۆ دیدارت نەسیبم کەرۆ

تەنخوای دوودیدەی ڕەمەد ڕەسیدە      دریغ من ببام دووهەزار دیدە

وەلێ گشت مایەی نوور بەیا چێشان      تا سێر کەردام سەیر بالای تۆ پێشان

(سەیدی، ١٩٧١: ٥٥).

هەتاوەکووو:

مەترسان جەدەرد دووری دووبارە      جای زاریشانەن نەک جای نەزارە

سەیدی هەرکەس داخ هیجرانیش وەردەن      سێر سەیری دڵدار هەرگیز نەکەردەن

(سەیدی، ١٩٧١: ٥٦).

سەیدی شاعیری دیالێکتی گۆران بەشێکی زۆری چامەکانی لیریکین و بۆ خۆشەویستەکەی وتوون. هەر ئەو خۆشەویستیە بووەتە مایەی ئەفراندنی شیعرەکانی بەناوی چراغ و شیرین و ڕیونەوەن لە زۆربەشیاندا مەسەلەی دابڕان ودوورکەوتنەوە و کاریگەرییەکەی تێدا ڕەنگی داوەتەوە، هەرئەوەش پەلکێشی ناو دەریای شیعری کردووە ئەو دووری و فیراق و هیجران و دابڕانە بوونەتە هەوێنی شیعری، لە شیعری «چراغم یارم»دا بەم چەشنە ڕازی دووری و کاریگەرییەکەی دەرخستووە، کەوا کوشتەی دەستی لەیلە و ئەخوازێ دوای مردنی بێتە سەر گۆڕی و تەماشای تاریکی ناو مەزارەکەی بکاو کە دوکەڵی ڕەشی لی دێتە دەرەوە.

دیان ئایری هیجران جەتەندا      چ تەور بەرمەشۆ دۆش نەکەفەندا

مەزانی ئازارساحیب شەرت و شۆن      سەیدی کوشتەی داخ دەرد دووری تۆن

(سەیدی، ١٩٧١: ٨١).

«ڕەنجوری» شاعیری کەرکوکی کەبەدیالێکتی گۆران شیعری زۆری هەیە تێکستەکانی کە تایبەتن بە ناوەرۆکی خۆشەویستی، کاریگەری دابڕانیان پێوە دیارە؛ لە شیعرێکیدا خۆی ئەکاتە یوسفی دوورە وڵات و بەهرامی پۆس لەکۆڵ، شەماڵ ئەکاتە قاسید ڕازی دڵی خۆی پێدا ئەنێرێ.

چون یوسف غەریب دوور جە وڵاتم      بە جەستەی بەهرام نمەد خەڵاتم

تۆ هەر بەو خەیاڵ خێز ئەندێش وێت      عەرز کەر حاڵم خێر میۆ نەرێت

دەستم دامانت باد ساحێب خێر      شۆ وەلای قیبلەم وە مۆبەت دێر

(ڕەنجووری، ١٩٨٣: ١١٨).

یان:

| | |
|---|---|
| تاسەی دوور وەتەن سەندەن تاقەتم | خسوس ئارەزووی ئەو سەوڵ قامەتم |
| ئیمشەو وەدەوان بەرنامە وەلاش | وێت مسەماکەر جەی خاک پاش |
| سا ئەو مپەرسۆ شەماڵ یە چۆنەن | نەی عەرزەی تکام دڵ پڕ هۆنەن |
| واچە شەرح دەرد بەندە شەڕ جورەن | چون بەڕەنجوری جەئەستانەت دوورەن |

(ڕەنجووری، ١٩٨٣: ٨٨)

یان:

| | |
|---|---|
| قیبلەم بێخاو بۆ قیبلەم بێخاو بۆ | تاکەی جە دووریت دیدەم بێخاو بۆ |
| ئەسرین دیدەن تاکەی بەتاو بۆ | تاکەی دەروون هون و زووخاو بۆ |
| تاکەی چون خەزان زایف و زەرد بۆ | شەوان تا سەحەر ناڵەم نەبەرد بۆ |

(ڕەنجووری، ١٩٨٣: ٧٤)

بێگومان نیشتمان لای شاعیرانی کورد گەلێ خۆشەویست و نازدارە هەر دوورکەوتنەوە و دابڕانێکیان لێی بووەتە مایەی نیگەرانیان، بیرکردن و یادکردنەوەی نیشتمان لەو بارودۆخەی کە "عەبدوللا بەگ"ی شاعیر (١٨٨٩-١٩٤٤) بە زیندانی تێیدا ژیاوە دووری لە وڵات و کوردستانەوە بەمجۆرە دەردی دڵی خۆی دەربڕیوە.

| | |
|---|---|
| یاد گوزەشتەی هامفەردانم کەرد | کوردستان مەحاڵ هەورامانم کەرد |

(دانای‌هەورامی، ١٩٦٩: ٥٩)

بێگومان ئەگەر شاعیرانی دیالێکتی گۆران لە بابەتە لیریکییەکانیاندا تەنها دەربڕین و کاریگەریی دابڕان لە خۆشەویست ڕەنگی دابێتەوە ئەوا لای مەولەوی نەک هەر خۆشەویست و دڵبەر، بەڵکوو کاریگەریی دابڕان لە خۆشەویست و ئازیزان و دۆستان و هاوڕێ گیانی بە گیانییەکان فەزای شیعرەکانی داگیر ئەکات. تەنانەت باری دەروونی خودی خۆشی زیاتر و زۆرتری لەسەر بووە. چونکە ئەو وەک کەسێتیەکی ئاینی و موتەوازیع و خاوەن سۆز و عاتیفەیەکی بێسنور وەک سۆفیەکی بێهاوتای چەرخی خۆی وەک مەینەتبار و کارەساتبارێک، وەک ئەوەی کە خۆشەویستیەکی یەزدانی لەدڵدا چەسپیوو بووە. ئەمانە و هەندێ هۆکاری تر وایان لێکردووە کە بەشێکی یەکجار زۆری شیعرەکانی بۆن و بەرامەی دابڕان و دووری لە خۆ بگرن وەک دابڕان لە خۆشەویست، لە دۆست و ئازیزان، لە شێخ و پیرزادەکانی دابڕان بەهۆی ئەو تەنگژە و گرفتانەی هاتوونەتە ڕێی، لە هەموو ئەو باس و شیعرانەیدا کاریگەر و کاریگەرتر دابڕانی لە "عەنبەر خاتوون"ی هاوسەری بوونە هۆی ئەوەی سەراپای ئەو شیعرانە بەشێک بن لە کاریگەریی دابڕان و دووری، چونکە کاریگەری بەرچاویان کردووەتە سەر هەست وسۆز و هۆشی "مەولەوی".

مەولەوی لەو چامەو غەزەلە شیعرییانەیدا کە زۆریان هێماو ڕواڵەتی فیراق و نامۆ بوون دوورییان پێوە دیارە. تیایاندا ڕازی دڵی ئاە و حەسرەتی، ناخی ڕاستەقینەی، تەوازوعە پاک و بێگەردەکەی دەربڕیوە. وەها دۆخ، بارێکی دەروونی خۆڵقاندووە. خۆی و بەرامبەرەکەی و مرۆڤی تێکەڵ بەو ئازار و مەینەتییە کردووە. بە

جۆرێکی وەها پارچەکانی، تابلۆ و دیمەنەکانی دابڕانی وێنە کێشاوە، وشە و دەربڕینەکانی وەها تەوزیف کردووە کە دەقاودەق وشەکانی مانای دەربڕینی دابڕان ئەبەخشن بەو پەیڤە شیاوانە ئەنجامیداون کە پڕن لە هەستی دابڕان و دووری چونکە «شیعر جۆرە وێنە کێشانێکە بە وشە ئەنجام ئەدرێ بەمەرجێک پڕ هەست و سۆز بێت» (لویس:٢٣).

ئەم مۆتێڤ و هێمایانەی وەک دووری، مەهجور، فیراق، هیجر، غەریب بریان، جیایی بەکارهێناوە لە بەرامبەریان وەڵڵا و ژوان و بەیەکگەیشتن و لیقای دڵداران و ئازیزان و خۆشەویستان کە تێکڕایان لە دەروازەی ئەو دووری و دابڕانەوە ئاماژە بەخۆشەوستیەکی پاک وبێگەرد ئەکات لە دەربڕینیان لە سەرەتاوە یان لە دواییانەوە هاتووەتە سەر چەند بابەتێکی گرنگ و سەرنج ڕاکێشەر وەک مۆسیقا و کەرەسە و ئاوازەکان ئینجا کۆڕی مەی و مەیگێڕی بە کەرەسەکانییەوە، هەموویان ئەبنە کەرەسەی شیعریی. هەروەها سروشت و کەرەسەکانیشی هاوشێوەیان ئەبێ فەزای شیعرەکان داگیر ئەکات.

ڕاستی ئەمەش بۆ دڵدانەوە و سەبووریدانی دڵە ناسکەکەی خۆی و بۆ ڕاماڵ و هەمووارکردنی ئازار و مەینەتییەکانی خۆی و تەنانەت گوێگر و خوێنەری شیعرەکانیشی.

هەر بۆیە ئەبینین لە لاواندنەوەکانیدا لەلووتکە و ئەوپەڕی دەربڕینی ئازارەوە بەرەو مۆسیقا مەی و ساقی و سروشت ئەڕوات ئەمەش وەک نەریتێکی دیاری سۆفیانەی بووەتە بەڵگەیەکی بەرچاو و سیفەتێکی جوانی مەولەوی. وەک سۆفیەکی ڕۆمانسی دەرئەکەوێ. چونکە فیراق کاریگەریەکی ئەوتۆی لەسەر کردووە. لە شیعرەکانیدا هەمیشە پێکراوی بادەی مەی و ئاوازی نەی و سروشتە پاش بەسەر کردنەوەی هەندێ ڕوانین و سەرنج سەبارەت بەم دیاردەیە لای شارەزایان کۆمەڵناسان و بەسەرکردنەوەی ئەو دیاردەیە لەشیعری شاعیرانی دیالێکتی گۆران دێینە سەر کاریگەریی ئەم دیاردەیە لە شیعرەکانی مەولەوی.

گومانی تێدا نییە کە مەولەوی یەکێکە لەو شاعیرە دیارانەی کورد کە شیعرەکانی هێما و ناوەرۆکی دابڕان و فیراقیان پێوە دیارە. زۆرێک لە سۆز و گوداز و خۆشەویستی لە دەربڕینیاندا دەرکەوتوون و ئەو مۆرکەیان لە خۆگرتووە ئەوەش بۆ ئەو دڵ و دەروون ناسکە سۆزدارە و هەستەخاوێنە لە ڕادە بەدەرەکەی خودی خۆی ئەگەڕێتەوە.

سەرچاوەیەکی تری ئەو پابەند بوونەیەتی بە ئایینەوە، هەروەها لە خواترسانی کە تەوازوع و خۆ بەکەم زانینی خۆی لاچەسپاندووە. هەمیشە لە بەرامبەر کەسانی تردا خۆی بەگەورە نەزانیوە، کە نیشانەیەکی ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و دڵ نەرم و نیانی مەولەوی بووە. ئەمانە وایکردووە لە بەرامبەر کارەسات و ڕووداوەکاندا دڵناسک و هەستناسک بێت. بۆیە ئەبینین لەشیعرەکانیدا ئەم دیاردەیە ئاشکرا و زەقە. هەموویان دەربڕی بیر و سۆزێکی ڕاستەقینەی بێهاوتایە بەرامبەر دۆست و خۆشەویست و یاوەرانی و دەور و بەرەکەی.

ئەو شیعرانەی مەولەوی وەک بەشێکی شیعری دیالێکتی گۆران ناوەرۆکەکانیان بریتین لە دابڕان لە خۆشەویست، لە ئازیز و دۆستان، لە شوێنەزا و نیشتمان وەک چەمکێکی دیار و بەربڵاو لای مەولەوی بەرجەستە بووە. هەر لەم پێودانگەوە چونکە دابڕان ئەبێتە هۆی نامۆبوون و نامۆیی، ئەوا مەبەستمان بوو لەم

باسەدا کورتەی دابڕان و ڕا و بۆچوونی شارەزایان بکەینە سەرەتایەکی ئەم تەوەرە و تۆژینەوەکەی پێ موتوربە بکەین. چونکە لە شیعرەکانی مەولەویدا دوو جۆری سەرەکی تیا بەرجەستە بووە:

یەکەم، ئاوارەیی و دوورکەوتنەوە؛ ئەمەشیان چەند جۆرێکی وەک لە وڵات و لە خۆشەویست و دڵبەر و ئازیز.

دووهەم: بەشت بوون خۆ ون کردن کە خودی خۆی تێدا بەرجەستە ناکات وەک ئەو شیعرانەی لە باسی دابڕان لە خێزان. لە هەندێ دۆستانی یان شێخەکەی. هەر ئەم دوو جۆرەش ئەچنە خانەی دابڕان و نامۆبوونی کۆمەڵایەتیەوە کە مرۆڤ خۆی تێدا ئەدۆزێتەوە وەک دابڕان لە کەس و کار و کۆمەڵ، نەک هەر ئەمەش بەڵکوو «نامۆبوون و دابڕانی ئابووری و ئاینی و تەکنۆلۆژی و سایکۆلۆژی و سێکس کە هەموویان دەرەنجامی ئەم دابڕانە کۆمەڵایەتیەن یان زاتی خودی مرۆڤن » (ئاشتیحەمە:٨٠).

## تەوەرەی دووهەم

### ١ - کاریگەریی دابڕان لە تێکستە شیعرییەکانی مەولەویدا

بە وردبوونەوە و ڕامان لە سەرجەمی شیعرەکانیدا ئەگەینە ئەوەی کەوا زیاتر لە ١٠٣ غەزەل و دووبەیتی کە ١٠ لە لاواندنەوەی "عەنبەر خاتوون"ی هاوسەری و کەسانی تر و ٣٥یان، بۆ خودی خۆی و خۆشەویستەکەی و ٤٩ بۆ ئازیزان و مورید و دۆستەکانی، ٩ی تریشیان دووبەیتی و تاکە شیعرن. هەروەها چەندین نامەی- تریشی پەخشانی فارسی تێکەڵ بە شیعری هەیە کە هەموویان لە ڕازی دووری و دابڕان ئەدوێن. هێماکانی هیجرو غوربەت و دابڕان و دووری و هیجران و بڕیانی تیادا بەکارهێناوە بەوانە دۆخێکی دەروونی و نامۆبوون و دابڕانی خولقاندووە؛ بوونەتە سیما و خەسڵەتی دیار و ئاشکرای شیعرەکانی، لە سەراپای ئەو غەزەلە شیعریانەدا ئەم سیما و خەسڵەتانە بەدی ئەکرێن.

١. لەو شیعرانەیدا کە سۆفیگەرین لەڕووی بیرەوە هەوڵی داوە لە چەندین وێنەی هەست پێکراوەوە دەربڕینەکان بگوێزرێنەوە بۆ ناو وێنەی خەیاڵی و میتافیزیکا.

٢. لە ژیانی مەینەتی و ئازارەوە بەرە و جیهانی ئارامی و ئۆقرەیی بڕوات.

٣. یەکگرتنی مرۆڤ و سروشتی سەلماندووە.

٤. سیمایەکی تورەبوون نامۆیی و گیانی یاخیبوونی دەرخستووە.

وەک "محەمەدی مەلاکەریم" ئەڵێ «هەستکردنی مەولەوی بەنامۆیی خۆی لە جیهانێکی وادا کە من بێگومانم لە ئاست توانا و بەهرەی خۆی زۆر بەرتەسک و تەنگەڵنی زانیووە» (حەمەی مەلاکەریم:٢٣٥).

کە "مەولەوی" ئەڵێ : وەخیلانەوەن یاران سەر مەستەقازای زاتی تەبعم هەرچی هەس

ئەم نموونەیە ئەوە دەرئەخات کە گیانی یاخیکەری لە زۆر دابونەریت و پێوەندی کۆمەڵایەتی لەدەروونی مەولەویدا ئەخرۆشێ کە «بانگەوازی یاخی گەریی و نامۆیەکی تا ئەوپەڕی ڕادەیە لە هەموو بەهاو و پەیڕەو و بیر و باوەڕێکی سەردەم» (حەمەی مەلاکەریم:٢٣٦)

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

ئەو تێکستانەی کە بەرامە و کاریگەریی دابڕانیان پێوە دیارە بەم جۆرەیان پۆلێن ئەکەین:

١. کاریگەریی دابڕان لەوانەی تایبەتن بە شێخانی نەقشبەندی و زیاتر لە چوارچێوەی ڕێبازی نەقشبەندی ئەخولێنەوە.

٢. کاریگەریی لەوانەی کە بۆ هاوڕێیانی نووسیوە و ڕاستەوخۆ ناوی هێناون.

٣. ئەو شیعرانەی کە نەزانراوە بۆ کێن.

٤. لاواندنەوەکانی عەنبەر خاتوون و کەسانی تر.

٥. کاریگەریی لەو تێکستانەی لە خۆشەویست و خودی خۆی ئەدوێن.

٦. لەو نامانەی کە بە فارسی و تێکەڵ بە شیعری کوردین هەروەها لە تاک و دووبەیتیەکان.

**کاریگەریی دابڕان لەو شیعرانەی تایبەتن بە شێخانی نەقشبەندی:**

"مەولەوی" نزیکەی ١٨ غەزەلی هەیە کە بۆ شێخەکانی نووسیون لەناویان دا ١٢ پارچەیان باسی دووری دابڕان ئەکات:

- ٣ شیعر بۆ "شێخ سیراجەدین": لاپەڕەکانی:٢٦٦ و ٤٥٥ ، ٤٥٦ ، ٤٥٧ و ٤٧١ ، ٤٧٢ .

- پارچەیەکیان بۆ شێخ عومەری بیارە، لاپەڕەی: ١٥١

- ٥ پارچە شیعری بۆ شێخ بهائەدین: لاپەڕەکانی: ١٦٨ و ١٦٩ و ٢٣٦ — ٢٣٨ و ٤٢٧ و ٤٢٨ و ٤٣٥ — ٤٣٨ و ٥٤١ .

-پارچە شیعرێک بۆ شێخ زیائەدین لاپەڕەی: ٣٣٤

- پارچەیەکی تریشیان بۆ شێخ تاجەدین ل ٤٦٤ (مودەڕس، ١٩٦١).

"مەولەوی" وەک سۆفیەک و موریدێکی سەر بە ڕێبازی نەقشبەندی هەمیشە لە ڕوانگەی باوەڕی ئەو ئایتراوە پاپەندی خۆی بەو ئایترا و شێخەکەی سەلماندووە. زۆر نامەی لەگەڵ شێخانی نەقشبەندیدا ئاڵوگۆڕ کردووە، یان ناردوونی یان لە وەڵامی نامەی شێخەکانیدا. لە دوو تیایاندا زۆر بە تەوازوع و دڵسۆزیەوە هاتووەتە گفتوگۆ. کە چەند خۆشەویستن. هەر لەو سۆنگەیەوە کۆمەڵێ ڕاز و گلەیی و گازندەی خۆشەویستی بە شێوازێکی ناسک ئاراستەی کردوون. لە گەڵیدا کۆمەڵێ هەڵچوون و جۆش و خرۆشی دەروونی بە هۆی دابڕانی لە شێخەکانییەوە ئەخاتە ڕوو، کەچەند کاریگەری لە ناخیدا بەجێهێشتوون.

لەم نامەیەدا دەردی دووری و دابڕانی لە "شێخ سیراجەدین" وا دەرخستووە و ئەو دووریەی بە ژاری مار چواندووە و ڕیشەی دڵی گەستووە:

| | |
|---|---|
| زنجیر مەینەت پای گوریز بەستەن | مارەکەی دووری ڕیشەی دڵ گەستەن |
| سامان سام کەردەن دەردەکەی فیراق | بۆی تاڵی دووریم مەیۆ نەمەزاق |
| جەوساوە ئازیز لێم نادیارەن | سەیر کائینات نەدیدەم تارەن |
| ئیلتیجام وە تۆن جای هانامەنی | نە بەیدای هیجران ڕەهنومامەنی |
| یەکجار تەن خەستەی زار ڕەنجووری | دل ڕێزەڕێزەی کارد مەهجووری |

(مەولەوی:٢٦٤).

لەم قەسیدەیەیدا دووری و فیراق نیگەرانی کردووە. دیسان لە چامەیەکی تریدا کە لە وەڵامی نامەیەکی "شێخ سیراجەدین"دا، شێخ لە نامەکەیدا گلەیی لیکردووە. کەوا بێوەفایە و هەواڵی ناپرسێ، ئەویش پاش دەربڕینی کۆمەڵێ ڕاز و تەوازوع و دوورکوتنەوەی لە شێخ و بەمجۆرە ئەو دابڕانەی لێکداوەتەوە.

ئازیزم نامە پێچ مدۆ چون مار — خامەی چەم یەکا ئەسرینان هەزار

وێش دان نە سەر کەف کوپەی سیایی — پەی شەکوای عەرزەی دەرد جیایی

(مەولەوی:٤٥٥)

واتە کوپەی خوێنی جەرگم وەک شوشەی مەرەکەبی ڕەش هەڵچووە و گەیشتووەتە لێوار بۆ ئەوەی عەرز و حاڵی شکاتی دووری پێبنووسرێ؛ نەدووریت دوایی هات و نە گیانم لە لەشما ئۆقرەی گرت. ئیتر بۆچی نامەت بۆ بنووسم.

ئەو دابڕانە هێندە کاریگەر بووە بۆی لەتاو ئازاری دووری یا هیچ ئەندامێکی لەشی لەوی تریان بە ئاگا نییە.

هەر جزوێم پەی وێش یەند سەرشار بیەن — ئەی جزوم جەو جزو خەبەردار نییەن

نە دڵ یاد ڕاز سەفحەی نامەشەن — نەسەر پەنجە هۆش گرتەی خامەشەن

یەند نەتۆی زەلکاو دەوات پڕوەی — مدران مونتەزیر وەڵگ ئاوەردەن نەی

نەی مدۆ سەدای دلان پاخەستە — وەڵگ مارۆشەو بەستەوە بەستە

هەتا وەکوو :

نەسفتەی هیجران خاڵ ئالاتم — دۆزەخی دۆزەخ دووری بالاتم

(مەولەوی:٤٥٧-٤٥٦).

واتە لەبەر دووریم لەتۆوە نە دڵ ئەتوانا ببێ بەلاپەڕەی نامە، سەر پەنجەی هۆشیش ناتوانێ قەڵەم بگرێ. ئەوەندە لە ناو مەرەکەبی پڕ مەینەتیدا ماوەتەوە چاوەڕێیەتی، قەڵەمی قامیشەکەگەڵی گرتووە. ئاوازی دەرد و ئازاری مەینەتی ئەلێتەوە بە دوایدا گەڵکانیش بەستەکە ئەڵێنەوە.

لە شوێنێکی تردا بەمجۆرە باس لە دابڕانی لە شێخەکەی ئەکات:

وێش نمە وینۆ ئازیز جەمینت — دیارەن لێڵەن جام جەمینت

تاڵەن کام دڵ مەینەت گازەکەت — تام دووریشەن ڕێزە ڕازەکەت

(مەولەوی:٤٧١).

واتە ئازیز دۆستە خەفەتبارەکەت لەناو چاوتا خۆی نابینێ. بەهۆی ئەو سەفەرەوە لێڵاو و تۆزاوی بووە. دەمی دڵی دۆستە مەینەت گاز لێگرتووەکەت تاڵە، وردە شەکری قسە خۆشەکانت تامی دوورکەوتنەوە ئەدات هەر لەم غەزەڵەدا پاش دەر بڕینی خەمی دووری ڕوو لە مەیگێڕ ئەکات و پێی ئەڵێ: دەستی جۆلای گەردوون هەر لە کارایە تاڵی تانی بەستووە ئەیەوێ پۆکەی لێدا و پارچەی دووریم بۆدروست بکات.

ساقی دەست چەرخ هانەکە ناردا — تای تانتەی دووریش بەستەن وە داردا

(مەولەوی:٤٧٢)

"مەولەوی" ڕاز و موعاناتی دابڕانەکەی بەوە لێکداوەتەوە یا وای بینیوە، چونکە هەمیشە لەخەیاڵی شێخەکەیدا بووە. یان بەجۆرێک هەولێەدا کە چۆن بەسەر ئەو خەم وخەفەتەی دابڕاندا سەرکەوێ، چۆن کانگاو سەرچاوەی خۆی خودی خۆی بدۆزێتەوە وپێیبگات. کە لەو دابڕانە ئازاد بووە، ئەو ئەچێتەوە ئامێزی خۆشەویستەکەی. بێگومان ئەمەش لای سۆفیەکان وایە کە «دونیای بینراو بینینی ڕاستەقینەییە یان ڕاستیە» (سجادی، ١٣٧٨: ١٠٣).

دابڕانی لە شێخەکەی وەها بێزاری کردووە وەک چۆن نەی لەقامیشەڵان دوور کەوتووەتەوە هەمیشە ئاوازو هاوار و گریانەکەی بۆ گەڕانەوەیەتی بۆ ئامێزی قامیشەڵان. ئەو "مەولەوی" بۆ تەسەلی و سەبووری خۆی، نەی ئەکاتە کەرەسەی دەربڕین کە لەو تابلۆ و دیمەنەی (نەی)ەیەکەی "جەلالەدین ڕۆمی" ئەچێت، کە ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| بشنو از نی چون حکایت می‌کند | واز جدائیها شکایت می‌کند |
| کز نیستان تامرا ببریده‌اند | از نفیرم مرد و زن نالیده‌اند |

(مولانا، ١٩٧١: ٤٥).

«نەی»یش لە باوەڕی سۆفیگەریی و عیرفانیدا واتە گیانی پیاو چاکان و مرۆڤی تەواو و ڕاستی خودایی و ئاوازی قورئانی پیرۆز دێت (مولانا، ١٩٧١: ١٨).

لەزۆربەی ئەو تێکستانەی کە بۆ شێخەکەی وتوونی گیانی دابڕان و نامۆییان تێدا بەرجەستە بوون، هەروەها لەو نامە شیعریانەی کە بۆ "شێخ عومەری بیارە" و پیر زادەکانی، "شێخ بهائەدین و "شێخ زیائەدین" و "شێخ تاجەدینی" نوسیوونی ڕەنگ و نەخشی کاریگەریی دابڕان و دووری یان لە ناخ و دەروونیدا بە جێهێشتوون تەواو سەرسام و نیگەرانی کردوون ئەوەتا دابڕانی لە "شێخ بهائەدین"ی پیرزادەی لەشیعرێکیدا کە پاش ستایش وەسفێکی باڵا بەم جۆرە دەرئەبڕێ.

| | |
|---|---|
| دیەم خەیر دووریت زۆرش ئاوردەن | ئامانا بەڵکم ئینە چەپ گەردەن |

یاخود:

| | |
|---|---|
| وەشڵە وە مەینەت وەخت ڕەنجووری | سەد ڕەحمەت ئەو خەیر دووری ڕەنجووری |
| ئەر سەد تۆی دەروون پەرێت قەقنەس با | یانەی دڵ وەیاد ئاوا با بەس با |

(مەولەوی:١٦٩-١٦٨).

٢- **کاریگەریی لەوانەی کە بۆ هاوڕێیانی نووسیوە و ڕاستەوخۆ ناوی هێناون:** مەولەوی بەهۆی ئەو ڕاستگۆیی و دڵسافیەوە، بە هۆی زانایی و شارەزایەوە بە هۆی ئەو تەوازوع و خۆ بەکەمزانینەیەوە، جۆرە پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی توند و قووڵی لەگەڵ زانا و مەلا و پیاو ماقوڵ و پایە بڵندەکانی سەردەمەکەی هەبووە. هەر ئەو پەیوەندییە قوڵەش ئەوەندە نزیک و توند بووە گواستوویەتیە نێو شیعرەکانییەوە، چ لە

نامەناردن و چ لە وەڵامی نامەی شیعریی دۆستانیدا ڕاستەوخۆ ناوی هێناون بە تایبەتی لەو کات و سەر دەمانەی لی دورکەوتنەوە و دابڕانیاندا، یان سەفەرکردن و ڕۆیشتنیان یان یاد و بیرکردنەوەیان، کە بۆ مەبەستی دەربڕینی ڕازی خۆشەویستی و گلەیی و گازندە، دڵدانەوە و سەبووری خۆی لە ناو هاوڕێ و دۆستە گیانیبەگیانییەکانیدا:

"ئەحمەدبەگی کۆماسی": لە ٤ چامە و غەزەلدا: لاپەڕەکانی: ١٣٩ – ١٤٤ و ١٤٥ – ١٤٨ و ٥١٣و ٥٤٠ – ٥٤١

بولبول: ١٧٢ – ١٧٧

حەمەپاشای جاف لاپەڕەکانی: ٣٩٦ – ٣٩٧

شێخ حسین هەزارکانی: لاپەڕەی: ٥٢٩

شێخ عەزیز جانەوەرەیی: کە لە حەوت ٧ پارچە شیعردا لاپەڕەکانی: ٥ -٨ و ٢٤٦ و ٢٤٧ و ٤٠٦ – ٤١٠ و ٤٣٧ و ٤٣٨ و ٤٦٥ و ٤٦٦ و ٤٩٣ – ٤٩٩ و ٥١٦ – ٥١٩

شێخ یوسفی نوسخەیی: لاپەڕەکانی: ٤٨٨ و ٤٨٩

عەبدوڵلای داخی ١٣١ و ١٣٢

مەلا خەیاڵ: لاپەڕەکانی: ٣٠٣ – ٣٠٧.

لەم تۆژینەوەیەدا ئەکرێ تیشک بخەینە سەر هەندێ تێکستی شیعریی کە بۆ "ئەحمەدبەگی کۆماسی" و "شێخ عەزیزی جانەوەرەیی" نوسیووە کە لە بارەی دابڕان و دوورکەوتنەوەیانن؛ بزانین کاریگەرییان تاکوێ بڕ ئەکات.

"ئەحمەدبەگی کۆماسی" وەک هاوڕێ و دۆستێکی مەولەوی، خۆشەویستی و پەیوەندیەکی قوڵیان لە نێواندا هەبووە، هەمیشە نامەیان بۆ یەکتری ناردووە، تەنانەت ئەوەندە کاریکەریان لەسەر یەکتری بووە. مەولەوی تاکە بەیت و شیعری کۆماسی لەگەڵ شیعری خۆیدا تێهەڵکێش کردووە.

هەرکاتێ کە لێی دابڕابێ هەمیشە یاد و بیری کردووە و بەو بۆنەیەوە پەشێو حاڵ و نیگەران بووە و خۆی پێ ڕانەگیراوە. نمونەش ئەو غەزەڵە دوور و درێژەیەتی کە بۆی نووسیوە هۆی دابڕانەکەشی داوەتە پاڵ چەرخ و ڕۆژگار و قەدەر و سروشت.

جەرگەت لەت لەت بۆ چەواشەی چەپگەرد      خالۆت جیا کەرد، یەکاربی تۆ کەرد

(مەولەوی:١٣٩).

مەولەوی چاو و دیدە و دڵ و خۆشڕەنگی و شادی و خۆشی ئەخاتە کار چاو بۆ ڕشتنی فرمێسک و خوێناو و دڵ بۆ دەردانی زووخاو، خۆشڕەنگی لائەبا و بێڕەنگی ئەهێنێ، شادی ئەوەستێنێ و دڵتەنگی ئامادە ئەکات.

دیدە وادەی سەیل هۆنەی هوناوەن      دڵە وەقت بەزم نۆشای زووخاوەن

وەش ڕەنگی بازەم سادەی بێڕەنگی      شادی با وەس بۆ وەقتەن دڵتەنگی

(مەولەوی:١٣٩)

لەسەرەتای شیعرەکەدا تاوانی ئەو دوور کەوتنەوەی داوەتە پاڵ گەردوون ئاڵوگۆڕێکی ماتەمینیانە لە فەزای شیعرەکەدا بەر پا ئەکات. باری دەروونی خۆی و ئەو ئەندامانەی کە سەرچاوەی سۆز و عاتیفەن دەرئەخات. ئینجا وەزعی کۆماسی بەهۆی لێکچواندنەوە دەر ئەخات لەگەڵ ژیانی خۆیدا بەراوردی ئەکات ئەوجا گەڕانەوە بۆلای سروشت لەگەڵ کەرەسەکانی ئەدوا وەک ملە سەربەرزەکان، کۆساران، سروە و شەماڵ ئەوانی تر ئەڕازێنێتەوە، لێیان ئەخوازێ بسرەون و جوڵەیان ڕائەگرێ، شنەیان نەبێ، هاژەیان نەبێ، چنور لە کێوان نەشنێ، هاژەی بەفراوەکان ماتەم بن، لای "مەولەوی" ئەمانە بێ کۆماسی هیچن. دیسان بۆلای "کۆماسی" و دووپاتکردنەوەی بەڵێنی خۆی. دواین جار بۆلای چەرخی چەپگەرد و چارەنووس.

| | |
|---|---|
| چەپگەرد بێفرسەت شانا مۆرەی نەرد | عومرێ بێ ئاما و یەرد گوزەر کەرد |
| زەحمەتەن خەلاسی جە دووری وەردە | بێهوناو بەیۆ عومر وێردە |

(مەولەوی:١٤٤)

لەم غەزەڵەدا سۆز و خۆشەویستیەکی بێوێنەی خستووەتە ڕوو لەگەڵێدا، لە بارێکی دەروونی ئاڵۆزدایە هەر بۆ دڵدانەوە و سەبووری خۆی لەو کاریگەرییە ڕوو لەسروشت و بوونەوەرەکانی ئەکات بەمەش فەزایەکی ڕۆمانسیانەی پێ بەخشیووە، چونکە دابڕانیش وەک بابەتێکی گرنگ لای ڕۆمانسییەکان کاریگەریی خۆی هەیە وەک دابڕان لە خۆشەویست، لە کۆمەڵ، لە هاوڕێ و دۆستان کە ئەبێتە مایەی ڕەشبینی و بەشێک لە نامۆیی و نامۆبوون، ڕەشبینی و دڵەڕاوکێ کە لە ئەنجامی نامۆیی و دابڕان لە خۆشەویستان و ئازیزانەوە سەرهەڵئەدا. هەر ئەوەش مەولەوی نیگەران کردووە چونکە هەستکردنە بە نامۆیی و دابڕان «ئەو نا هاوتایە سایکۆلۆژیە و هەستکردن بە بۆشایی لە ئەنجامی دوور کەوتنەوە لە ئازیز و دۆستانی بووەتە سیمایەکی ڕۆمانسیانە کە بە هۆی خۆ خواردنەوە و گۆشەگیریی و تەریکی و تەنهایی ویستن جیهانی تایبەتی سکاڵا کردن و نارەزایی لە بەش و حاڵ، لە بوون و ڕۆژگار، شوێن سەردەم» (سالار:١١٩). هەر ئەوانیشن ڕۆمانسییەکان بە هەست و سۆزیانەوە نامۆی ڕۆژگارەکەیانن (سالار:١٢٠) یان لە قەسیدەیەکی تریدا کە بۆ "خالۆی کۆماسی" نوسیووە سێ جار باسی جودایی کردووە:

| | |
|---|---|
| یە سەختی زامەت یە دەرد موشکۆڵ | یەدووری خالۆم یە بێ شەرتی دڵ |
| ئەجەل نیم ڕەمەق باقیەن سادەی | جەودما بەختان مەوینانت بەی |

(مەولەوی:٥١٣).

هەر لە دوای مردنی "ئەحمەدبەگی کۆماسی" بەمجۆرە لە مردن و دابڕانەکەی دوواوە:

| | |
|---|---|
| سەنگی بار هۆش پێش بار خامت | دەوار شاری چیخ ئارامت |
| لوان چەنی کۆچ خاڵۆکەی هامفەرد | ئیسە بار وستەن نە هەوارگەی هەرد |

(مەولەوی:٥٤١-٥٤٠).

واتەباری قورس و سوکی فامت دەوار و چیغی شادی ئارامیت لەگەڵ کۆچ و باری خاڵۆدا ڕۆشتووە و ئێستا لە هەوارگەی دەرد و مەینەتدا باریان خستووە. "شێخ عەزیزی جانەوەرەیی"ش وەک دۆستێکی گیانی-بەگیانی "مەولەوی" ئەو خۆشەویستی دۆستایەتیە وایکردووە کە هەردوور کەوتنەوە و دابڕانێکی لە مەولەوی بووەتە مایەی غەمناکی و نامۆیی مەولەوی. ئەبینین لە زۆر بۆنە و شوێندا دابڕان بووەتە مایەی ئەفراندنی چەندین تێکستی شیعری نزیکەی حەوت پارچە شیعری بۆ "شێخ عەزیز" نوسیووە کە بەرامەی دووری و دابڕانی یان دەرخستووە بۆ نموونە لە غەزەلی (ئاخر سەفەرن ...)دا چەند جار ئاماژەی پێکردووە؛ چونکە نەخشێکی کاریگەریی لە دڵ و مێشک و دەروونیدا بە جێهێشتووە. بە تایبەتی لە سەردەمی فەقێیەتیاندا وەک چۆن بۆ "خاڵۆی کۆماسی" دوورکەوتنەوەکانی داوەتە پاڵ چەرخ و ڕۆژگار، ئاوەهاش بۆ "جانەوەرەیی" بووە. کە ئەڵێ:

چەپگەرد پەی دووریت شانا مۆرەی نەرد وەزاهر بانەش وە بەهانە کەرد

(مەولەوی:٨).

دیسان لە نامەیەکی "شێخ عەزیز"دا لە وەڵامی خواستێکیدا باسی دووری کردووە:

بەڵام جەدووریت هۆشم ڕەم کەردەن ئاگا هیچ نییەن چەن ڕۆ و بەردەن

هەر ئێد مزانون ئازیز گیان تۆ نەدیەنم وەچەم هەڵای ماه و نۆ

(مەولەوی:٢١٧)

مەولەوی بە بۆنەی نەهاتنەوەی شێخ عەزیز لە کوێستان خەفەتبارە و ئەڵێ:

نەشئەی وەقت سەخت ئامای پایزەن یان شنۆی دووری باڵای ئازیزەن

(مەولەوی:٤٣٧)

مەولەوی لە قەسیدەیەکی تریدا کە بۆ شێخ عەزیز نوسیووە، شەماڵ و سروەدا ئەسپێرێ کە بچێتە لای وەک جاری جاران پێی بڵێ "مەولەوی" پەشێو حاڵە و بەختی ڕەشە وماڵی وێرانە لە تاو دووری ئەو .

جەبێ قەراری جە دەس دووری جەبێ ئارامی جەفا سەبووری

جە سۆزەی شەرار نائیرەی هیجران جەسۆزەی زام تیرەکەی موژگان

(مەولەوی:٤٦٥)

ئەخوازێ بگەڕێتەوە و بێتە مەڵهەم و زامی "مەولەوی" سارێژ بکات. ئەو دووری و دابڕانەی لە "شێخ عەزیز" داوەتە پاڵ چەرخ و ڕۆژگار چونکە داخی خستووەتە دڵیەوە ژاری دووری گیانی ئازیزی پێ خواردوونەتەوە لەو دەمەی گلەیی و گازندە، ئیتر هەواڵەی خودای ئەکات.

فەڵەک داخ وەدڵ خەستەم وا بەردی ژار دووری گیان ئازیز پێم دەردەی

(مەولەوی:٤٩٨)

یان لە شوێنێکی تردا شەماڵ ڕائەسپێرێ ڕازی مەولەوی و دڵەڕاوکێی بۆ بەیان بکات چونکە دڵی لە جای خۆیدا نییە لە نێوان ترس و تکادایە ئەڵێ نازانم وەسڵی خۆم ئەملا وێنێتەوە یان دەردی دووری ئەمتاوێنێتەوە:

| | |
|---|---|
| گامەوات دووریش درێغیش نەکەرد | گەرمای گەرمیان کۆتایش ئاوەرد |
| یان دڵ وە تەمای نییەن نەجادا | خەریکەن نەبەین خۆف و ڕجادا |
| داخۆ بە وەسڵێ لاونیمەوە | یا هەر وە هیجران تاونیمەوە |

(مەولەوی:٥١٩-٥١٧)

### ٣- کاریگەری دابڕان لەو شیعرانەی کە نەزانراون بۆ کێن:

جگە لەو شیعرانەی لەوەڵامی نامەی شیعریدا کە ئاڕاستەی دۆستانی کردووە کۆمەڵێ دەقی شیعری تری هەیە بۆ دۆستانی نووسیوون، بەڵام ناوی نەهێناون لە هەموو ئەو غەزەڵ و قەسیدە و پارچە شیعرانەیدا نزیکەی ١٤ پارچە غەزەڵ و قەسیدە یان ناوەرۆک و بابەتی دابڕان لەخۆ ئەگرن. هەروەها کۆمەڵێ ڕاز و گلەیی و سەرزەنشت و سکاڵا و ستایشیان تێدا بەرجەستەبووە. گرنگترینیان ئەوانەن کە زیاتر بابەتی دابڕان و کاریگەریەکەی لە سەرخودی مەولەوین. هەر بۆ نموونە لە غەزەلێکدا زاراوەکانی هیجران، دووری، تاسە، فیکر، وەسواسە مەهجوری و بڕیان، بوونەتە کەرەسەی دایە لۆگێکی نێوان خۆی و دۆسەکەی.

| | |
|---|---|
| ئارەزوو مەندیم جە حەدو یەردەن | فراوان خەیلی تاسەی تۆم کەردەن |
| فیکر و خەیاڵان وەسواسەی وەفات | دایم نە دڵەن نەڕووی سەر بسات |
| نەشۆم نە چەم دیدەم جە دووریت | هەر ئێد موانوون ئاخ مەهجوریت |
| ئیسە کێ تاقەت دووری تۆ دارۆ | دەک بەرق غەزەب وەجەسەم وارۆ |

(مەولەوی:١٧-١٥)

لە پارچە هەڵبەستێکیدا کە بۆ دۆستێکی نووسیوە بە بۆنەی سەفەرکردنی هاوڕایەکیەوە ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| تەژنەی گیان وەلەب سەودای سەبووری | کەفتەبیم نەگێچ دەریاکەی دووری |
| بەڵام ئاخر تویچ ڕەنجت بەردە بێ | چەند جار ژار مار دووریت وەردە بێ |

(مەولەوی:١١٥)

واتە: خۆ تۆ چەند جار ژاری ماری دووریت چەشتووە نەتزانی چەند ناخۆشە؟! ئەی بۆچی منت خستە ئەم مەینەتیەوە، ڕێگای ڕۆیشتنی یارتدا ئەویش بە ناوەقت بە جێیهێشتین.

"مەولەوی" ئەم دابڕانەی دۆستەکەی و کاریگەریەکەی بەو جۆرە دەر ئەبڕێ چونکە وای لێکردووە چاوی سۆمای تیا نەمێنێ بە هۆی نەڕوانین بۆ ئەو. گوێی پڕ بووە لە هاواری خەم و ماتەمینی و دوور کەوتنەوە لە نەبیستنی دەنگی ئەوەوە لەشی ماندووە. لەبەر دیارنەبوونی دڵیشی وێران بووە چونکە جاران شوێنی مانەوەی

ئەو بووە. ئێستە کەسی تێدا نەماوە. کەواتە ئیتر سودی چاوەنوارِی چیە؟ لێرەدا چاو و گوێ و لەش هێزیان تێدا نەماوە:

چەم بێ پەی دینش بینایی کەم بێ گۆش پەی شنەفتش سەداش ماتەم بێ

تەن بێ بارکێشیش خەستەی هیجران بێ دڵ بێ مەنزڵگەی مەیلش وێران بێ

(مەولەوی:١١٧-١١٦)

بەو هۆیەوە فیکر و خەیاڵی لە خودی خۆی نامۆ و دابڕاو بووە، دەرد و کۆسکەوتن بوونەتە هاورِێی :

هام رەفیقم دەرد هام سوحبەتم کۆس وێم جە وێم خاڵی مەوج مدۆ جە دۆس

(مەولەوی:١١٨)

لەخۆی خاڵی بووەتەوە فیکری لێ دابڕاوە چونکە هاورِێی دەرد و کۆستە.

دیسان لە غەزەلێکی تریدا بۆ دۆسێکی نووسیووە کە لەگەڵ خێڵدا لە کوێستان نەگەڕاوەتەوە بۆ گەرمیان بە جۆرێ لە دابڕان و فیراقی نەدوێ، کە دابڕانی لە جوان خاسەکانی کوێستان بووە تە مایەی نیگەرانی کوێستانەکان:

چون وەڵگ شادی من وای دووری لەیل وەیشوم بەرد ئەو هەرد نەورشتەی سوەیل

کۆچ کەروون خاسان چیهرەی ئیلا خان دارۆ وەهەمدا دیسان نەدا خان

رِۆی حەشر دووری کەردەن بێ گەردان بێ وادە پیر کەرد کاوان سەر هەردان

هەور ئەو زار زار کلاو ئەو کلاو مەگێلۆ ئەسرین مەریز و تاو تاو

دووری لە ئازیزەکەی ئەوەندە ناخۆشە شاخەکانی وا پیر کردووە سەراپایانی سپی کردووە هەورەکانیش بەو بۆنەیەوە ئەرِۆن و فرمێسک ئەرِێژن.

ماچی ئەویش دەرد هیجرانش وەردەن یا چۆن من باڵای ئازیز گوم کەردەن

(مەولەوی:١٦١-١٦٠).

واتە ئەویش ئەڵێی دەردی دووری خواردووە یا وەک من باڵای ئازیزی گوم کردووە.

لە شیعرێکیدا دابڕان بووەتە کەرەسەی دەربرِین و دابڕان لە دۆستانی کە پا ئەچێ ئەم شیعرەی هی سەردەمی کوێری خۆی بووبێ لێرەدا لەبەیەک گەیشتنی بە دۆستەکەی ترسی ئەوەی لێ ئەنیشێ ببێتە ژەهری کوشندە وەسڵ = ژەهری کوشندە. لەسەرەتادا لەناو چاوی خۆی دای ئەنا چونکە ماوەیەکە سۆمای چاوەکانی نەماوە. ئەخوازێ بیخاتە ناو چاویەوە تاوەکوو چاوی و بینایی (بینین) ئاشنا و ئاشت بنەوە. خۆشەویستەکەی ببینێ ئینجا داوا لە ساقی مەیگێڕ ئەکات و ئاگاداری ئەکاتە وەک:

وەش ئامای وەخەیر هەی بەر گوزیدە بۆ نەجای مەردووم جاگر نەدیدە

خەیلێن بینایی جە دیدەم رِەمان بەڵ سوڵحشا بۆ بینایی وچەمان

ساقی ترس دەرد دووری جەمین گوڵ وەسڵم جا کەردەن وەژار قاتڵ

(مەولەوی:٤٧٦-٤٧٥).

**٤- کاریگەریی دابڕان لە لاواندنەوەکاندا:**

عەنبەر خاتوون لە دیوانەکەیدا توانیمان نزیکەی ١٠ قەسیدەی تایبەت بەلاواندنەوە دەستنیشان بکەین بەتایبەتی ئەوانەی بەرامەی دابڕان و دوورکەوتنەوەیان پێوە دیارە لە ناوەرۆکیاندا دەرکەوتووە ئەو دابڕان و کۆچی ئازیزانی چەند کاریگەر و دەروون وروژێنەرن؛ بەتایبەتی بۆ سەر دەروونی مەولەوی لە ناو ئەو دە چامەیەدا (٨) هەشتیان بۆ "عەنبەر خاتوون"ی خێزانین کە ئەمانەن، لاپەڕەکانی:٤١ و ٤٢ ، ٤٥ و ٤٦ ، ٥٥ و ٥٦ ، ٢٠٥- ٢٠٩، ٢٣٤- ٢٣٦ ، ٣٢٠ و ٣٢١ ، ٣٦٣ – ٣٦٥ و ٣٨٧ و ٣٨٩ ، بۆ "قادر بەگ" لاپەڕەکانی: ٣٧١ – ٣٧٥ و "ئەمنە خان" لاپەڕەکانی: ٣٨٣ – ٣٨٥ ..

چونکە کۆچ و دابڕانی "عەنبەر خاتوون" کاریگەریی بەرچاوی لە سەر "مەولەوی" هەبووە ئەبینین بەشێکی ئەو لاواندنەوە بۆ "عەنبەر خاتوونی" تەرخان کردووە. عەنبەر خاتوون، وەک هاوسەرێکی خۆشەویست و دڵسۆز بۆ مەولەوی وەک هاوبەشی و بەشێکی ژیانی هێندە کاریگەریی لەسەر بووە لە بەشێکی شیعرەکانیدا وەک مۆتیڤێکی سەرەکی بوونی هەیە. ئەو دوور کەوتنەوە هەتا هەتاییەی کاریگەریی لە سەر هۆش و بیر و خەیاڵی مەولەوی هەیە سەرچاوەکەشی لەو خۆشەویستی و بە وەفایی مەولەوی یە بۆ هاوسەرەکەی؛ مەولەوی دوور و بەدەر لەو نەریتەی کۆمەڵگای ئەو سەردەمەی سەدەی نۆزدەهەم کە قۆناغێکە و بیری دەرەبەگایەتی بەسەرا زاڵ بووە کە ئەو جۆرە لاواندنەوەی پیاو بۆ ژن سانسۆری لە سەر بووە مەولەوی توانیوێتی ئەو ڕچەیە بشکێنێ، پاشان شاعیرانی تریش پەیڕەویان کردووە، وەک پیرەمێرد و گۆران و هی-تریش.

خۆشەویستی عەنبەر خاتوون ئەوەندە کاریگەر بووە، لە پاڵ ئەوەشدا سروشت و ڕەوشتی مەولەوی خۆی وایکردووە لەو بوارەدا کارامە دەرکەوێ. سەرجەمی ئەولاواندنەوانە دەربڕا یان وێناکردنی کاریگەریەکی سەخت و چڕ و پڕ بن لە دەروونێکی غەمبارەوە هەڵقوڵاون. لە لاواندنەوەکاندا ستایشی ئەکات ئەیدوێنێ و ڕازەکانی ئەخاتە ڕوو لە دووتوێ یان بۆن و بەرامەی غەمباری مەینەتی هەڵئەگرن. کە دڵ و چاو و هۆش و خەیاڵ و هەست یان لی تۆرانووە :

| | |
|---|---|
| ئەی ڕۆشنی چەم تا کەی؟ تەشریف بەر | لێلاوی سادەی هووناوەی هوون کەر |
| پەی چێش قیبلەکەم عەزم سەفەر کەرد | سێلاو دووریش ڕیشەی هەستیم بەرد |
| بینایی وەڕاست دڵەی پڕ دەردم | ئای چەند سەرسەخت بیم لوای نەمەردم |
| بلێسەی کوورەی هیجران بالآت | گەرمی مەحروری تۆزەکەی پالآت |

(مەولەوی:٥١)

لەگەڵ دڵی خۆیدا ئەدوێ، تۆ بە پێگەیشتن لە خۆبایی بوویت و لووتت بەرز بوو دوورکەوتنەوەشت بە هیچ نەئەزانی و خۆت بە خاوەنی ئارامی ئەزانی. ئەوەتا ئێستا دووریت و ڕۆشتنت جۆش هاوردوە، ئەگەر ئازای بشنێ:

دڵە وەبادەی وەسڵش بادی بی — دەماخت نە ئەوج بورچ شادی بی
هیجران باڵاش وەهیچ مەزانای — وێت وەساحیب سەبر تاقەت مەوانای
سا ئیسە هادەرد دووریش ئاورد و جۆش — سەبرت ئەر ئازان بمانۆ شنۆش

(مەولەوی:٥٢)

لە شوێنێکی تردا کۆچی هاوسەرەکەی بەهاری لێکردووە بە خەزان:

ئیمساڵ نەو وەهار چون خەزان سەرد — بەرگ وەرد باغ مەعدووم بەردپەی هەرد
مشێو تاڵەی من خیلاف ئەنگێز بۆ — وەر نەکەی کا دی وەهار گوڵ ڕێز بۆ

(مەولەوی:٤٥)

بۆ سەبووری و تەسەلای خۆی داوا لە نەیچی ئەکات بە دوو ئاواز فریای بکەوێ. یەکێکیان بیتاوێنێتەوە و بیمرێنێ، ئەوی تریان بیلاوێنێتەوە و بیگەیەنێتەوە و زیندووی بکاتەوە کە ئاماژەیە بۆ ڕۆژی قیامەت مردن و زیندوو بوونەوە. باوەڕ هێنان بەو یەکێتی بوونەی سۆفیان گەڕانەوە بۆ ئەودیوی سروشت.

نەیچی وە بێ بەزم یاران جانی — کام سەفا مەندەن پەی زیندەگانی
چون مەزاق تاڵەن جە گردین لاوە — بۆ وە شیرینی یەک دوو نەداوە
یەکێ یەکجاری تاونۆمەوە — ئەو یەک لاونۆم یاونۆمەوە

(مەولەوی:٤٦)

کاریگەریی دابڕان و کۆچی "عەنبەر خاتوون" مەولەوی گەیاندووەتە ڕادەی سووتان؛ تەنانەت یادکردنەوەشی لەو تەنیایەدا بووەتە گڕ و بڵێسە ئەمەش ئەو پەڕی غەمباریەتی هەر لەو حالەتەدا پەنا بۆ موتریب و ساقی ئەبات. بە موتریب ئەڵێ: سەدای مەرگم هەڵدە مەیگێڕ شەرابی مەرگم بدەرێ یارەکەم چاوەڕێیە بچمەلای:

سۆچنوم حەسرەت دەرد جیاییت — نەک چون بڵێسەی یاد تەنیاییت
وەمەرگت دیدەم هام نەگوزەردا — منیچ لام لای تۆن ئارۆ یا فەردا
موتریب مەقامێ دەردم ناچارەن — ساقیا جامێ دۆس ئینتزارەن

(مەولەوی:٢٣٦)

بەکۆچی عەنبەر خاتوون پەرێشانە بەوەی کە باوەڕی ڕاستەقینەی خودایی لە دڵدا چەسپیوە هەر بۆیە بانگەواز ئەکا کە موتریب بانگی مردنی بدات چونکە لای سۆفیەکان مەی و ساقی ڕەمزی باوەڕ هێنانە بە یەکێتی بوون و گەڕانەوە بۆلای خودا ئەمەش ئەو بنچینەو ڕایەڵە سەرەکییەی ڕێبازی سۆفیزمە نەک بە واتاکەی تری کە بۆ لادەر یان سەرپێچی کردنە باوەڕی ئاینی ئیسلامی کە دەمێک بوو مشتومڕی ئەوەی لەسەر ئەکرێ. ئەوەتا "نیکڵسۆن" لەوبارەیەوە وەڵامی ئەو کێشەیەی داوەتەوە کێشەی مەی و ساقی کە ئەو لێکۆڵەرەوانە دەربارەی تامی مەی لەلایەن سۆفیەکانەوە کە توخنی نەکەوتوون بەڵام وەک کەرەسەیەکی دەربڕین بەکاریان هێناوە بە شێوەیەکی هونەری و کارامە لێی دوواون. وەک خوازە هێناویانە بەرامبەر خوداناسی. ئەوان بە هەڵە لەو کێشەیە تێگەیشتوون (نکلسون:١٠٢). ئەم باوەڕەی یەکێتی بوونەیش لە ناو

**بەشی پێنجم- رەخنە**

ڕێبازە جیاجیاکانی ئیسلامدا لە مێژوویەکی دێرینەوە بە پشتبەستن بە فەرموودەکانی قورئان لە سەرەتاوە و پاشان لە سەردەمی سەرهەڵدانی سۆفێتیدا لە ناو ئیسلامدا لە "ئیبنە عەرەبی" سەدەی ٧ ی کۆچیەوە دەست پێئەکات ئەویش سودی لە بیرۆکەی ناسووت و لاهوتی "مەنسووری هەللاج" وەرگرت لەگەڵ هەندێ جیاوازی دیار لە نێوانیاندا (محمود، ١٩٦٦: ٤٩٦).

لە قەسیدەیەکی تردا پاش وەسف و ستایشێکی بێوێنەی "عەنبەر خاتوون" لەسەر گڵکۆکەی ئەڵی:

گەرد ئاڵودەن دەور مەزار لەیلی      ئاو پاشی و باڵاش لازمەن خەیلی

بەڵ باڵای ئاڵاش وەسەد خەم و چەم      باز بوینوون بێخەم وەی چەم تا ئەو چەم

مەعدووم تاو یاو دووری زۆر ئاوەرد      تاو یاو بینایی قسەی پەشێو کەرد

(مەولەوی: ٣٦٤-٣٦٣)

لە تاو دابڕان و کۆچی "عەنبەر" ئاڵۆزە، قسەی پەشێو ئەکات هەر لەڕوانگەی ئەو باوەڕەوە گەڕانەوە بۆ لای حەق، ئەو کۆچە هەتاهەتایەی کە گەڕانەوەی بۆ نییە هەر چیەک بکەین بێسودە! تەنها پاڕانەوەو زیکر نەبێت.

یاخود لەم چامەیەیدا لە کۆچی هاوسەرەکەیدا پاش ستایش وەسفێکی باڵای کاریگەریەکە بە جۆرێ ئازار و خەفەتی داوەتێ لەشی بە ئازارە، گیانی لی جوێ بووەتەوە چونکە ئەوی لە بەر چاو ون بووە.

دڵەی دڵ وە مەی مەیل لەیلی کەیل      مەحرەم وەڕازان خەڵوەتخانەی لەیل

لانە حەڵقەی زوڵف عەنبەر بۆی شەو ڕەنگ      هامدەم جای تەنگ ئەڵحەد سەرای سەنگ

(مەولەوی: ٢٠٥)

لێرەدا مەولەوی هێند جوانی و نەزاکەتی و بە وەفایی "عەنبەر خاتوون" کاری تێکردووە لە پەنجەی پێیەوە تا تەوقی سەری وەسف ئەکات و ئەیرازێنیتەوە و پاشان لە ئاڵۆزی و دڵتەنگی خۆی ئەدوێ چونکە بە مردنی نیگەران بووە. لاواندنەوە کە ئەوەندە بالایە شان لە شانی لاواندنەوەکەی "دانتە" بۆ دۆستە جوانە مەرگەکەی "پیاتریس" ئەدا ئەوەتانا سەجادی ئەڵی "ئەگەر ئێمە بڵێین لاواندنەوەکەی مەولەوی بۆ "خاتوو عەنبەر" بەرزترە لە هینەکەی دانتە شاعیری سەدەی ١٣ز ئیتاڵی بۆ دۆستە جوانە مەرگەکەی پیاتریس وە نەبێ لەحەقیقەت دوور کەوتبینەوە سەیرکەن چۆن تاڵ تاڵی ئەگریجە و پرچی عەنبەر خاتوون بووەتە مار و گاز لە زامی دڵی پڕ جۆشی مەولەوی دەگرێت» (سەجادی، ١٩٥٢: ٣٦٧). ئازارەکەی بەمجۆرە دەر ئەبڕێ:

ئای جە ئێش تەن ئای جە گیان جیای من      ئای جە لوای تۆ و ئەوشۆن دیای من

سەختی ئێش دەرد بەدحاڵیم لایێ      وای بێ تۆ مەنزڵ گشت خاڵیم لایێ

(مەولەوی: ٢٠٦)

هەر لەم چامەیەدا سەبووری خۆی ئەدا و بەوەی کە مردن حەقە، ڕاستەقینەیە، ئەم دونیایە مردووە. ئەوی تر حەق و زیندەگانی و نەمرە. ڕۆمانسیەکانیش لە سەردەمێکدا وای بۆ چوون کە «شتێکی سروشتیە جیهانی ڕاستەقینە واتە ئەم دونیایە مردووە واقیع کە وا ڕۆحی تێدا ونبووە بەوجۆرە وێنا ئەکرێ کە جیهانی مردووانە.

مرۆڤیش جیهانی ڕاستەقینە بەدیی ئەهێنێ دوای ڕەتکردنەوەی ئەو واقیعە بەو ڕێگایەوە ئەگاتە ئەو نموونە باڵا گیانییە، هەر بۆیە مردن لای هەندێ لە ڕۆمانسییەکان سەرەتای ژیانێکی ڕۆحی تازەیە» (التكريتي،١٩٩٠: ٢٨١).

**٥-کاریگەریی دابڕان لەو تێکستانەی لە خۆشەویست و خودی خۆی ئەدوێن:**

لە دیوانەکەیدا کۆمەڵی دەق هەن تایبەتن بە دڵبەر و هەڵچوونی دەروونی خۆی لە ناویاندا کە بەرامە و کاریگەریی دابڕانیان لەسەرە. ئەو کاریگەریەش بۆ سەر هەست و دەروونی "مەولەوی" بەرچاو و دیارە چونکە بابەتی سکاڵاو گلەیی و گازندە لە دڵبەر و لە چەرخی ڕۆژگار و بێوەفایی بەرامبەر بە مرۆڤ. هەروەها هەڵچوونی باری دەروونی خۆشی.

بەلێوردبوونەوەمان سەبارەت بەو دەقانە توانیمان بەمجۆرەیان کۆبەند و پۆلێن بکەین:

(١٩) نۆزدە پارچە شیعر بۆ خۆشەویستەکەی کە لاپەڕەکانی: (٢٥-٢٧) و (٢٧و٢٨) و (١٠٨و١٠٩) و ٣٤و١٤٨-١٥١ و١٨٩-١٩١ و (٢٣٣و٢٣٤) (٢٤٢و٢٤٣) و (٢٥٠و٢٥١) ٣٠٧-٣٠٩ و ٣٢٧-٢٣٩ و (٣٣٧و٣٣٨) (٣٤٠و٣٤١) و ٣٥٩ و (٥٠٤-٥٠٩) و (٥١٩-٥٢٢) و (٥٢٢-٥٢٤) (٥٢٨ و ٥٢٩) و ٥٣٠ دیوانەکەی.

هەروەها (١٦) شازدە پارچەی کەیان لە خودی خۆی یان هەندێ بۆنە و بابەتی ترن تیایاندا هەر باس لە باری دەروونی خۆی ئەکات و دەردی دووری و کاریگەریی ئەو دابڕان و بارە ئاڵۆزەی خۆی ئەکات، کە ئەمانەن:

لاپەڕەی:(١-٥) و (٩-١١) و(٢١-٢٣) و ٢٩و٣٠ و لاپەڕەی ٣٥و٣٦ و لاپەڕەی ٣٧؛ لاپەڕەی ٥٦و٥٧ ١٢٩و١٣٠و ٢١٦-٢١٨ و ٢٢١-٢٢٣ و ٣٢٩-٣٣١ و لاپەڕەی٣٣١ و ٣٣٢ لاپەڕەی٣٨٩ و٣٩٠ لاپەڕەی٤٢٤-٤٢٦ و ٤٧٢و٤٧٣ و ٤٨٢-٤٨٧ هەردووکیان ٣٥ پارچە شیعرن.

لەم دەقانەدا ناخ و دەروونی خۆی دەرخستووە بەوەی کەوا لەیار دوورە. ئەم دوورکەوتنەوە و دابڕانەش کاریگەریی دەروونی لە سەرخەیاڵ و بیر و ئەندێشە و هۆشی بە جێهێشتووە. بە شیکردنەوەیان ئەوەمان بۆ دەر ئەکەوێ کە لە زۆربەی ئەم غەزەڵ و شیعرانەیدا لە دەربڕینە نامۆیەکانیدا پەنای بۆ موتریب و نەیچی و مەی و ساقی بردووە. لە شوێنێکی تریشدا ئاماژەمان پێداوە کرۆکی باسەکانیش بێمەیلی و دووری یارەکەیەتی. گفتوگۆ و دایەلۆگێکە لە کەسی یەکەمەوە خۆی بۆ کەسی دووهەم یارەکەی هەر لەو سۆنگەیەوە خۆی قسە ئەکات زۆر جاریش لەگەڵ خودی خۆی ئەدوا خۆی و دڵی خۆی و نەفسی. لەم دایەلۆگەدا باری سەختی ژیان و نامۆیی و ئاوارەیی دەرخستووە لە نێوانیاندا کەسی تر دێتە ناوەوە ئەویش ڕەقیبە. چەرخ و ڕۆژگاری چەپگەرد وەک "ئەنوەر قادر" ئەڵێ :

«شیعرەکان دوو ڕوویان هەیە و بیری ژیانی واقیعیان تێکەڵە و دوو پاڵەوانی هەرە دیار و بزێوی ئەم غەزەلانە شاعیر و دڵدارەکەین » (قادر محمەد:١٦٦). لە هەموو ئەو شیعرانەشدا وەک سۆفیەک هاتووەتە گۆ.

"مەولەوی" ئەوەندە دڵبەرەکەی خۆش ویستووە هەمیشە ویستوویەتی لە بەر چاوی بێت. کەچی دەستی ڕۆژگاری چەپگەرد لە یەکیانی کردووە. ئاگری دابڕانی لە بالای دڵبەرەکەی جەستەی کردووەتە خۆڵەمێش و بە کێوەکاندا بڵاو بووەتەوە .هەر بەو ئازارەوە گلەیی لێئەکات چونکە دوورکەوتنەوەی ئاگری بەرداوەتە هەناوی بریسکە و گرمەی دڵیشی چاوی وەک شەتاو لێکردووە و خوێنی لێ جاری بووە:

| | |
|---|---|
| ئازیزم ئایر دووری باڵای تۆ | جەستەم کەرد وە بولا شەماڵ بەرد پەی کۆ |
| ورشەی پرشەی تاو گوڕەکەی جەستەم | شەرارەی لوولە پێشەشکستەم |

یان:

| | |
|---|---|
| تۆیچ ئینسافت بۆ هەنی وەسەن وەس | بالله جه دووریت هابیم وەقەقنەس |
| تاکەی چون مەجنون وێڵ هەردان بم | تاکەی خەم زەدەی باری هیجران بم |
| هەر ساتا دوورین سەد ساڵەن جەلام | دەردم کاریەن و سەر گەردت بام |

(مەولەوی:٢٧-٢٥)

لە دووری یارەکەیدا بووەتە قەقنەس. واتە سووتان و لە ناوچوون .ئەم سووتانەیش وەک قەقنەس هێمایەکی ئەفسانەییە. وەک باسکرا کەسی سێهەم ڕەقیب لەنێوانیاندا هەیە ئەویش چەرخی چەپگەردە لەغەزەلێکدا تانەو تەشەری لێ ئەدا. ئینجا بەلای ئازیزەکەیدا ئەڕوا و گلەیی لێئەکات چونکە بەو هۆیەوە بێ-مەیلە و خستوویەتیە دۆخێکی ئاڵۆز و پەشێوەوە. تاقەت و سەبووری لێبڕیوە ئەخوازێ کە بهێڵێ لە نیشتمانی یاردا بمێنێتەوە.

| | |
|---|---|
| فەلەک مشانا سووت کارت چەپگەردەن | دەست و درازەن پەی زامان کەردەن |
| چێش مبۆ نەی زام نە دڵ نەدەری | مەحروم وڵات قیبلەم نەکەری؟ |

(مەولەوی:٣٤٠)

هەتاوەکوو ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| وەسەن کۆن تاقەت بڕیان سەبووری | مەتاوون گەردوون گفتوگۆی دووری |

(مەولەوی:٣٤١)

هەر بەو پەرێشان حاڵی و مەینەتباریەوە وەک سۆفیەک دیسان پەنای بۆ ساقی و مەی و بادە بردووە. بەو نامۆیی شەوە هەمیشە لە چاوەڕوانی یاردایە. ئەخوازێ دەرکەوێ لە دەربڕینەکاندا سەودا و دانوستانێکی وەهای گەرم کردووە و کەرەسەکانی مەی و مۆسیقای خستووەتە کار دەف بە دنگی ڕۆح و مەی بۆ تەڕی دڵ:

| | |
|---|---|
| های ساقی بازاڕ جیلوەی دڵدارەن | سەودای خەریدار دانەی دیدارەن |

هەتا :

| | |
|---|---|
| مایل کەر باڵا وەی لادا چون نەی | دەسێوت دەف بۆ ئەو دەس جام مەی |
| با بێدار کەرۆ تاکەی بۆ غافڵ | دەف وە سەدا گیان جام وە ڕەشحە دڵ |

(مەولەوی:٢٨-٢٧)

"مەولەوی" وەک ڕۆمانسییەکان لە ناو جەرگەی غەمباری و دووری لە یارەکەیەوە کەرەسەکانی سروشت ئەخاتە کار. ئەبینین شەماڵ، سروە و نەسیم ڕائەسپێرێ کە هەواڵی دەردی دووری و خەمباری بۆلای یارەکەی ببات. لە قەسیدەیەکیدا کە خێلایەتی جاف لە کوێستانەکانی شاهۆ و داڵەهۆ هاتوونەتە خوارەە و بەو بۆنەوەیەوە هەمیشە بیری لە دابڕانی یارەکەی کردووەتەوە، لە پاڵ شەماڵدا (هەور و با و باران کە کەرەسەی سروشتن) هێناوەتە جووڵە و بە شەماڵ ئەڵێ گەر لەیلەکەم هەواڵی پرسیم پێی بڵێ لە دەردی دووری تۆ بە سزاوە بەو کێوانەی شاهۆوە خول ئەخوات و ئەگەڕێ:

| | |
|---|---|
| ئانا دەورمدۆ وە شاهۆ و کۆوە | وە سزای دووری دیدار تۆوە (مەولەوی:٣٢٨) |

لێرەدا وەک لە شیعرەکانی تریدا سروشت و کەرەسەکانی بوونەتە کەرەسەی دەربڕین ئەو پەنا بردنە بەر سروشتەی "مەولەوی" لە سەرچاوەیەکی سۆز و عاتیفەوە هاتووە چونکە سۆز و سروشت یان سۆزی مرۆڤ و سروشت تێکەڵ و ئاوێتەی یەکتر ئەبن لە زۆربەی شیعرە سروشتییەکانی "مەولەوی"دا ئەم دیاردەیە بەدیی ئەکرێ.

هەر لە باسی سروشتەوە کە لای مەولەوی وێنەی بەهەشتە بۆلای دڵبەرەکەی ئەڕوا و دووری و دابڕانەکەی بەهاری لی کردووەتە دۆزەخ ئەڵێ سروشت پڕە لەشادی بێجگە لە دڵی من چونکە لە تۆوە دوورە. بەهارم لێبووەتە دۆزەخ ئەم بەهەشتەشم بێدۆست دۆزەخ ئەنوێنێ.

| | |
|---|---|
| تەمام ڕووی دونیا جە شادی کەیلەن | دڵ نەبۆ پەشێو فیراق لەیلەن |
| سەهلەن بەهارم دۆزەخ ئاسابۆ | بەهەشتم بێدۆس دۆزەخ نمابۆ |

(مەولەوی:٣٢٨)

ئەوند شیرینە لە دڵیدا و گرفتاری بووە هەر بۆ ئەوەی پتر خۆشی بوێ، پەنای بۆ دووری و دابڕان بردووە. ئەڵێ بۆ ئەوەی گرفتاری تیری چاوەکانت نەبم و گیانم ڕزگار بکەم پەنام بۆ دووری بردووە.

| | |
|---|---|
| پەلەپەل پەی گیان نەدەس تۆ بەردەن | پەنام وەپەنای فیراقت کەردەن |

چونکە ئارامی لەگەڵ دووریدا ناگونجێ وە لە وەسڵیشدا یارەکەی دڵنەوایی ناکات هەر بۆیە دڵی لەنێوان ترس و تکادایە لە گەیشتنی بەو و لە نەگەیشتنی بەودا ئیتر نازانێ کام لایان بگرێ.

| | |
|---|---|
| نەیارای خەیاڵ وەساڵ تۆمەن | نەتاب دووری خەیاڵ تۆمەن |
| دڵ مەندەن نەبەین خۆف و ڕجادا | مەزانۆ ڕای کام یاو و ئەولادا |

(مەولەوی:١٩١-١٩٠)

هەر ئەو سۆز و خۆشەویستیەی بۆ یار لەو پارچانەی کە لەگەڵ خودی خۆیدا ئەدوێ و لەو لاواندنەوانەی بۆ هاوسەرەکەی دا ئەوە دەرئەخەن کەوا ژن چەند پایە و مەقامێکی بەرزی لای "مەولەوی" هەیە و چەند لای خۆشەویستە! مایەی وروژاندنی هەست و عاتیفەیتی. چەند پڕ بەها ونەمریە. چەند بەخشچێکی یەزدانی پیرۆزە!

یاخود ئەو خۆشەویستیە چ سۆزێکە! چ بەخشسێکی سروشتێکی ڕاستگۆیە چونکە «خۆشەویستی سۆزی سروشی (وەحی) سروشتی ڕاستەقینەیە. سەرچاوەی خۆشیەکی سروشتییە. لەگەڵ باوەڕی ئەفراندندا ئەگونجێ گەر ویژدان بەسەریەوە بێت» (هلال، ۱۹۷۳: ۱۸۷).

هەر لەو سۆنگەیەوە سۆز و خۆشەویستی ژن دڵ و دەروونی پاک ئەکاتەوە ئۆقرەیی و ئارامی ئەرەخسێنێ ڕۆمانسییەکان بە خۆڕایی نەیانوتووە کە «ژن فریشتەیەکە لە ئاسمانەوە دابەزیوە دڵمان بە خۆشەویستی پاک ئەکاتەوە سۆزمان باڵا ئەکات، هەستمان زاخاو ئەدات، بۆڕاپەڕاندنی ئەرکە ڕەوشتی و سیاسی و نیشتمانییەکانمان هانمان ئەدات» (هلال:۱۹۱-۱۹۰).

"مەولەوی" لەو تێکستانەی کە تایبەتن بەخودی خۆی تیایاندا گفتوگۆیەکی پڕسۆز و هەست و ویژدانن لە نێوان خۆی دڵی و خودی و نەفسی دایە هەندێ جاریش ئازیز یان دۆست و یارانی دێنە ئاراوە و هاوبەشی ئەو گفتوگۆیە ئەکەن کرۆکی باس و کێشەکان دابڕان و دوورین. دابڕانی دڵی لە جەستەی لە خودی لە هۆش و خەیاڵ و فیکری کە هەست بە تەنیایی و تەریکی ئەکات وەک ئاشکرایە کە سەرچاوەی سۆز و عاتیفەش دڵە لە قەسیدەیەکدا لە خودی خۆی ئەدوێ:

| | |
|---|---|
| ئیمشەو تەنیا بێ جەستەی زەبوونم | دیسان سەرواز کەرد دڵەی پڕ هونم |

لێرەدا دڵی پڕ لە خوێنە سەر ڕێز ئەکات و جەستەی زەبوونە کە ئەمەش بارێکی دەروونی ئاڵۆزە کە لە دابڕانی "مەولەوی" لە یار و یاوەرانییەوە هاتووە، لە قولایی ئەم خەم داگرتن و بارە ئاڵۆزییەیەوە لەگەڵ خوای خۆیی دا ئەدوێ گلەیی و گازندە ئەکات و لە گریان و سۆزیدا بووەتە قەقنەس و ئەسووتێ:

| | |
|---|---|
| من قەقنەس نەویم هابیم وە قەقنەس | یەکجاریچ ئیمشەو ها بەرشیم جە دەس |
| ئەوەند خەیالان بەردم وە دەروون | پەی دووری یاران بەدتەر بیم زەبوون |

هەر لەو حاڵەتەیدا و بۆ سەبووری و دڵدانەوەی خۆی وەک لەباسەکانی تردا هاتووە، هانا بۆ ساقی ئەبا و بەلای ئەودا وەرئەگەڕێ.

| | |
|---|---|
| ڕۆ جە شەو فێشنەر زار و زەلیلم | ساقی سا جاما ئەمجار دەخیلم |
| بدە پێم نۆش کەم چون هەردە جاران | وەرەغم گردین گرۆی مەی خواران |

(مەولەوی:۳-۲)

لەم غەزەل و قەسیدانەیدا کاریگەریی دابڕان و دووری لە یار خۆشەویست دۆست و ئازیز وای لیکردووە. لە خودی خۆشی نامۆ بێ و هەست بە دابڕان و نامۆبوونێکی با سنوور بکات ئەوەش بووە هۆی ئەفراندنی ئەو نموونە شیعریی یانەی کە باسکراون .چونکە «گیانی مەولەوی لە دابڕاندایە هەست بە غوربەتێکی بێوێنە ئەکات، لەو کانگایەی کە دڵی ئاشیانەی تێدا کردبوو و ئۆقرەی گرتبوو لە کۆت و زنجیری جیهانی هەستی وایە کوورەی ئارامی سووتاوە» (احمد شوان:٤١).

مەولەوی لە قەسیدەیەکی تردا شەو بووەتە کاتی دەربڕینی ڕاز و گلەیی و تەقوا و پاڕانەوە، چونکە دەمی ئارامی و ئۆقرەیی و با دەنگی یە کە «کاریگەریی ئەو دابڕان و نامۆ بوونە لە یار و یاوەرانی ئەم دیاردەیەش لای

شاعیرانی عەرەب بەرەو لاسایی کردنەوەی ڕۆمانسیەتی ڕۆژئاوای بردن، ئەوانەی ئاوارە بوون شەویان کردە هاوڕای خۆیان بەرە و ژیانی کەپرنشینی ڕۆیشتن و دابڕان و گۆشەگیر دوور لە شارو گۆرانی وتن بۆ ئازار و ئیتر خەم بووە هاورایان» (عبدالرحیم:١).

دڵی هەمیشە لای یارەکەیەتی لە جەستەی جیا بووەتەوە چونکە بەتامی دووری بە سەر خۆشی ڕۆیشتووە داوای لێئەکات بیگێڕێتەوە ناو جەستەی :

چون وەتام یار دووری سەر شارەن          ویانە مارۆ بەدەن بێزارەن
هیچ مەوەر وە تەنگ و بانەشەوە          پەریٚ بەسە دیٚم بکیانەشەوە

(مەولەوی:٣٠).

دڵی هەر لای دڵبەرە و داوای لێئەکات ئاگاداری بێت:

ئازیزم گەردن بلووری بێگەرد          ئەمانەتی تۆ دڵەی پڕ جەدەر د
چون جەزەید ویٚش بی یەن ئاوارە          غەریبەن نە دۆس نیگا بدارە

(مەولەوی:٥٦)

دڵی لێی جیا بووەتەوە دابڕاوە چووە بۆلای یار. داوا لە شەماڵ ئەکات بیهێنێتەوە:

دڵ دیار نییەن های نەکەردە بۆ          وەخزمەت ئازیز تەشریف بەردە بۆ
پای دڵ سفتەی سەر هەردان سەختەن          ویٚت یار نەوە های نەسیم وەختەن
بکیان پەریٚ من دڵ ئەو دماوە          ویٚت ویٚت ئاسای بشۆ وەراوە

(مەولەوی:٢١٧-٢١٦)

لەتاو دەردی دووری باڵای یاری چاوی لێڵاوی دایگرتووە وێنەی باڵای تیا نابینی دڵیشی خەم جۆشی تیاخواردووە، باڵندەی سەمەندەر هێلانەی تیا کردووە:

پەردەی لێڵایی گرتەن دوو دیدە          خەڵوەتەن سابۆ هەی بەرگۆزیدە
دڵ یەند جۆش گەرم خەمان دان پێدا          سەمەندەر لانەش مەگیرۆ تێدا
فیدات بوون ئازیز جەمین پەڕەی گوڵ          دووریت کاری کەرد ئانە چەم ئید دڵ

(مەولەوی:٢١٨)

لە شوێنێکی تردا لەگەڵ نەفسی خۆیدا ئەدوی بەسەریدا ئەڕوات وسەرزەنشتی ئەکات و تانە و تەشەری لێئەدات بە دووری یارانیش سوێند ئەخوات:

بەو فەسڵ فیراق  خاترپڕ خاران          بەو دیای دمای یەکتریی یاران (مەولەوی: ٢٣٨).

زۆر جار لەگەڵ خودی خۆیدا ئەدویٚ و باس لە مەینەتی و دووركەوتنەوەی دۆستان ئەكات. ئەو دابڕانە كاریگەریی سایكۆلۆژی لیٚكەوتووەتەوە دەست لە چاوەنواڕی ژیان هەڵئەگریٚ، چونكە ژاری ماری دووری یارانی خواردووە. ئەو دووریەش بە ڕەشەبای ساردی زستانی چواندووە كە سەرەتای ژیانی لاوێتیە. هەمووی كردووە بە بوركان و دایڕزاندووە، وەک چۆن سەرچڵی درەختەكان سەرما ئەیانبا و دایان ئەوەرێنیٚ، بارە

دەروونییەکەی ئەوەندە ئاڵۆز و سەختە. خەم و خەفەت لەسەر دڵی کلێڵەی کردووە و زۆری بۆ هێناوە مەگەر هەر ئازیزەکەی لەو گێژاوە ڕزگاری بکات چونکە کار و کردەی شادی بێئومێد کردووە:

تەرک ئینتزار حەیات کەردەنم          یانێ ژار مار دووری وەردەنم

هەتا :

شنۆی ڕەشەبای زوسان هیجران          سەر چڵەی عەیشم کەردەن وە بوریان

کلێڵەی خەفەت نە سەر کاوەی دڵ          مەزرەعەی شادیم کەردەن با حاسڵ

(مەولەوی: ١٣٠-١٢٩)

**٦- دابڕان لەو نامانەی کە بە فارسین و تێکەڵ بە شیعری کوردین لە تاک و دووبەیتیەکاندا:**

مەولەوی لەو نامە فارسیانەی کە ٣٨ نامەن بە پەخشانی زمانی فارسی نووسیونی  هەر لە دووتویاندا ناوە شیعری تێهەڵکێش کردووە. ئەو نامانە بۆ دۆستان و خۆشەویستانی خۆی وەک "شێخ محەمەد بهائەدین" و "مەحمود پاشای جاف" و "حاجی محمود یار وەیسی" یان هەندێکی تر کە ناوی نەهێناون.

لەو ٣٨ نامەیەدا١٠یان ناوەرۆک و باس‌وخوازی دابڕان لە یاران و یاوەرانییەتی کە ئەوەش هەست و سۆزێکی خۆشەویستین کە بەرامەی نامۆیی و دابڕان و دووری لە خۆ ئەگرن . کە هێماو نیشانەی سۆز داری و خۆ بەکەم زانین و تەوازوعی مەولەوی دەر ئەخەن.

ئەو نامانەش لە لاپەڕەکانی  ٤٢٥ بۆ شێخ محەمەد بهائەدین و لاپەڕەی ٤٦٧ بۆ "محمود پاشای جاف" و لاپەڕەی ٤٧١ بۆ "حاجی محمود یاروەیسی" و چەند نامەیەکی تری لە لاپەڕەی ٤٧٦ و ٤٨١ی «یادی مەردان» بڵاوبوونەتەوە (مودەڕس:١٩٨٣).

لە  نامەیەکیداکەبۆ سەفەری محمود پاشای جاف بۆ بەغدا نووسیوێتی:

«افواهی از سفر مفید ارتم آهی دارند. از بیم دوری چنان‌که از حله به کوفه می‌روند، آب سراب‌ها از چشمهٔ چشمم بی شتاب و تاب روان ا ست»(مودەڕس:١٩٨٣).

لەم نامەیەدا سەفەری ئەو دۆستەی ئەوەندە کاریگەریی لە سەر بووە. هەم خۆشەویستی بووە و هەم لێی دابڕاوە. ئەو بەمجۆرە لێکی داوەتەوە. پەیڤەکانم لە سەفەری بەغدا تا ئاهو ناڵەیانە لە ترسی دووری وەک ئەوە لە حلەوە بچن بۆ کوفە. ئاوی تراویلکەیی لە کانیاوی چاوەکانم دا بە هورژم و تاو ڕا ئەکات.

یاخود لە نامەیەکی تردا بە فارسی نووسیوێتی شیعرێکی هەورامی تێهەڵکێش کردووە کە دوای دەربڕینی سۆز و خۆشەویستی هاتووە لە سەر کاریگەریی دابڕان و دووری و ئەڵێ:

چەم پەی دینش بینایی کەم بی          گۆش بێ شنەفتش سەدات ماتەم بی

تەن بارکێشش خەستەی هیجران بی          دڵ بێ مەنزڵگەی مەیلت وێران بی

چ دادی دۆ خاکم وە سەر بۆ          ئیسە ئارەزووی لای ئاسانەت بۆ

(مەولەوی:٤٨١)

کاریگەریی دووری سۆمای چاوی، گوێی بیستنی، لەشی دڵی بێهاوڕێکەی هێز و پرشتیان لێبڕاوە، واتە چاوی بۆ بینینی سۆمای کەم بووە. گوێش بەبێدەنگی دۆس دەنگی ماتەم بێ. لەشیش برینداری دەردی دووریەتی، دڵیش بەبێ یانەی مەیلی وێران بووە. کاریگەریی بۆ سەر هەستەکانی بینین و بیستن و هەست (لمس) و دڵیش وەک سەرچاوەی سۆز هەیە. هەموویان لە پەل و پۆ کەوتوون. ئەم دوو بەیتیە لە پارچە هەڵبەستێکی تری لاپەڕەی ١١٦ و ١١٧ ی دیوانەکەی دایە.

"مەولەوی" بە هۆی کاریگەریی دابڕان و دووری لە دۆستان و ئازیزان نەک هەر لە غەزەڵ و قەسیدەکاندا بووبێتە کرۆکی لێدوان بەڵکو لەچەندین فەرد (تاک) و دووبەیتییەکانیشیدا لەو دیاردەیە و کاریگەریەکەی دوواوە. وەک ئەم تاکانەی لە لاپەڕەکانی ٥٩ و ١١٣ و ٢٥٣ و ٥٣٣ و دووبەیتییەکانی لاپەڕەی ٢٠٠ و ٢٩٤ و ٤٤٨ و ٥٣١ و ٥٣٣ ی دیوانەکەیدا هەن (مودەڕس:١٩٦١). واتە چوار تاکە بەیت و پێنج دووبەیتی ئەم فەردو دووبەیتیانەش هێماو سیمای دووری و دابڕان لە خۆ ئەگرن وەک لەم تاکەدا .

ئازیز جە دووریت تەن با کلافە          ڕۆح بی وەتەنوین حالا ئیزافە

(مەولەوی:٧٩)

واتە ئەی ئازیز دوورکەوتنەوە لەتۆ جە ستەم بووەتە کلافە بەیەکدا چووە گیانیشم وەها نووشتاوەتەوە و نەماوە بووەتە (تەنوین) کەئاماژەیە بەگۆڕانێکی ڕێزمانی عەرەبی. ڕۆحی حاڵەتی تەنوینی وەرگرتووە. دۆخی دوای ئیزافە کە نامێنێ واتە گیانی منیش بەدوای تۆوە نەماوە و پەیوەندی خۆشەویستی تۆ نەماوە و لە ناو چووە.

یان لە دووبەیتیەکدا ئەفەرمێ:

هیجرانت جە تەرح باد وە یشوومی          یەکایەک ئەوراق جەسەی مەعدوومی

کەرد وە فەرش ڕای گوزەرگەی یاران          بەرد پەی پای سارا و کۆساران

(مەولەوی:٥٣٢)

واتە دووریت وەک بای وەیشوومە هەموو گەڵکانی جەستەی مەعدوومی کردە ڕاخەری ڕێگای یاران بردینییە بەر پای دەشت و کێوەکان.

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

## سەرچاوەکان:

### -کوردیەکان:


١. سالار، احمد (١٩٨٨) **ڕێبازە سەرەکییەکانی ئەدەب و هونەر**، بەغدا، دەزگای ڕۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی.

٢. تاقانە، احمد (١٩٧٩) **جەلالەدینی ڕۆمیو سروودی نەی**، بەغدا، چاپخانەی اعلام.

٣. قادر محەمەد، ئەنوەر (٢٠٠٠) **لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەلەوی**، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٤. دانای هەورامی (١٩٦٩) **پیر شالیاری زەردەشتی**، محەمەدی مەلا ساحێب.

٥. سەجادی، علائەدین (١٩٥٢) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بەغداد.

٦. نیکرەفتار، کەیومەرس (١٩٨٢) **دیوانی بێسارانی**، ئەمینداریێتی گشتی ڕۆشنبیریی و لاوان.

٧. مودەڕس، مەلا عەبدوالکریمی (١٩٦١) **دیوانی مەولەوی**، بەغدا.

٨. مودەڕس، مەلا عەبدوالکەریمی (١٩٨٣) **یادی مەردان**، بەرگی دووەم، بەغدا، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق.

٩. کاردۆخی، محەمەد ئەمین (١٩٧١) **دیوانی سەیدی**، وەزارەتی کاروباری ژوورو، بەڕێوبەرایەتی خوێندنی کوردی.

١٠. قەرەداغی، محەمەدعلی (١٩٨٣) **دیوانی ڕەنجوری**، مەلاعومەری زەنگەنە، چاپخانەی افاق عربیە، چاپی یەکەم.

١١. محەمەدی مەلاکەریم (١٩٨٩) **گەشتێک بەژیانی مەولەویدا**، میهرەجانی مەولەوی دەزگای ڕۆشنبیریی و بڵاوکردنەوەی کوردی.


### - عەرەبیەکان :


12. التكريتي، جميل نصيف (1990) **المذاهب الادبيه**، وزارة الثقافه و الاعلام، دارالشؤون الثقافيه، بغداد، الطبعة الاولى.

13. نكلسون، رينولد الن (1926) **في التصوف الاسلامية وتاريخه**، قاهرة.

14. ديلويس، سيسل (1982) **الصورة الشعريه**، ترجمة احمد نصيفالجنابي واخرين.

15. محمود، عبدالقادر (1966) الفلسفه الصوفيه في الاسلام، طبعه (2) دارالفكر العربية.

16. عبدالرحيم، عبدالوهاب، **الاغتراب في الشعر الشرقي**، شعراءالعراق نموذجا بحث نشر في سايت ***http:// www.awu –dum.org /book / 99 / study 99 / 50 – m-j / book 99 /SD 008.htm.***

17. جاسم، عزيز السيد (1986) **تاملات فى الحچاره و الاغتراب**، وزارة القافه والاعلام دار الشؤون الثقافية، بغداد،الطبعه الاولى.

18. هلال، محمّد غنيمى (1973) **الرومانتيكيه**، بيروت، ردار العودة دار الثقافة.

19. عبدالمسيح، يوسف ثروت (1977) **بحث عن الذات اللآئعه**، بغداد، كتاب الطريق والحدود منشورات وزارة الثقافة والاعلام، دار الحريه للطباعه.

- فارسییەکان :

٢٠. مولوى، جلال الدين محمّد بن حسين البلخى ثم الرومى **مثنوى معنوى**، جلد (٣،٢،١) باهتمام و تصحيح رينولد الن نیكلسون، مؤسسۀ مطبوعات على اكبر، چاپ اوّل.

٢١. سجادى، سيد جعفر (١٣٧٨) **فرهنگ اصطلاحات وتعبيرات عرفانى**، تهران، چاپ چهارم، كتابخانه طهورى، اوفست گلشن.

- گۆڤارەکان :

٢٢.**گۆڤارا زانکۆیا دهۆک**، ئەیلولا ٢٠٠٢ هژمارا (١) پەربەندا (٥).

٢٣.**گۆڤاری کاروان** (١٩٨٣) ژمارە (٥).

٢٤.**گۆڤاری کاروان** (١٩٨٩) ژمارە (٧٩).

25.**مجلة عالم الفكر** (1978) عددخاص بالاغتراب، عدد(1) المجلة (10).

26.**مجلة القافة عدد** (2) شباط (1984).

# کاریگەری ئەدەبیاتی کوردی لە سەر کۆمەڵگا و کولتوور

کاوەیس سوورە [-]

**کورتە:**

سەرەتای وتارەکە بەو پرسیارە دەسپێدەکەین کە ئەدەبیات پێویستە چۆن بخوێندرێتەوە؟ ئایا کاتێ قسە لە کاریگەری دەکەین نابەئاگا قسە لە ئەدەبێکی دەورگێڕ لە بزاڤە سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگیەکان ناکەین؟ لەم حاڵەتەدا ئایا قسە لەو ئەدەبیاتەی ئەم ڕۆڵەی پێبسپێردرێ دوور نابێتەوە لە پێناسە سەرەکێکەی خۆی کە درووست کردنی جوانییە؟ لە وڵامدا ئەڵێین ئەدەبیات لەڕێی زمانەوە کاریگەرە. هونەر بە گشتی درووستکەری زمانێکە کە تیایدا جوانی بە چەندین زمان دێتە قسە. لەم وتارەدا لە ڕوانگەی جیاوازەوە هەوڵدراوە قسە لە ئەندیشەی ئەو کەسانە بکرێت کە وڵامی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە کە هونەر بە گشتی چیە؟ چۆن کاریگەرە لە سەر تاک و کۆمەڵگا؟ جێی خۆیەتی ئەوەش بگووترێ کە وڵامی ئەم پرسیارە دژوارترین وڵامێکە کە تا ئێستا کەسانێکی جیاواز بە ئەندێشەی جیاواز بە دوایدا گەڕابن، کەسانێک وەک «هێگێل» لە کتێبە بەناوبانگەکەی «جوانناسی»دا، وەک «لووکاچ»، وەک «لوسین گولدمان» و زۆر ئەندیشمەندی تر. لە ئەدەبیاتی کوردیشدا ئەگەر کەسێک یا خود کەسانێک نەبوون لە ڕووی تیۆری و گریمانە بە دوای ئەم بابەتەی سەرەوەدا بڕۆن، زۆر لێکۆلەر و شاعیر بۆیان پرسیارە کە ئەدەبیات و بە گشتی هونەر پێویستە چۆن هەڵسوکەوت بکات لە گەڵ بابەتەکان (category). جیا لەوەش ئەدەبیاتی کوردی چۆن توانیویەتی کاریگەر بێت؟ ئەمانە و چەند پرسیاری تر لەم وتارەدا شیکراونەوە. بێشک ئەم وتارە لەوە قورسترە لە وتارێکی کورتدا قسە لە تەواوی بکات، بەڵام هیواردارم توانیبێتی درووستکەری پرسیار و وروژێنی باسەکە بێت لە پانتاییەکی بەرینتردا.

**وشە سەرەکیەکان:** مەنتقی خەیاڵ، ئەدەبیات، هونەری کاریگەر، جوانناسی.

---

[-] مامۆستای زانستگای پەیامی نووری مهاباد

## پێشەکی

کاتێ قسە لە کاریگەری ئەدەبیات[1] (literature) دەکەین، ناڕاستەوخۆ مێشکمان بەرە و ڕێگایەکی جیاوازتر لە ئەرکی جوانناسی و جوانکاری دەڕوات. واتە بە بیرمان دێتەوە، ئەدەبیاتی سیاسی، ئەدەبیاتی سیاسی، شیعری پارتیزانی، ئەدەبیاتی بەرگری لەم بەشەدا دەگونجێت. وەک ئەوەی لە نەست و نابەئاگای کۆیی ئێمەدا ئەم تەوەرانەی سەرەوە وەک "یۆنگ" دەڵێت: «بوونە هووشیاریەکی کۆیی»، پێویستە ئەگەر بە نیگای ڕەخنەیانە دەڕوانینە ئەدەبیات، جوانناسیمان لەیاد نەچێت و پێشمان وا نەبێت هونەر بە گشتی و ئەدەبیات بەتایبەتی لە جێگەیەکی دیکەی سەنگەرە. ئەگەر باوەڕمان وابێت کاریگەری ئەدەب ڕاستەوخۆیە لە سەر کۆمەڵگا، ئاماژەمان بە ئەدەبیاتێکی سووسیاڵ ڕێئالیستی و هیومانیستی و مێژوویی کردووە. لە کاتێکدا زمانی ئەدەب لە بڕگەیەکی کاتیدا درووستکەری جۆرێک جوانییە. گرفتەکە لێرەدا درووست دەبێت کە لامان وابێت لایەنی جوانی هونەر و خوێندنەوەی ئەدەب و کارلێکی لە سەر کۆمەڵگا کەم بێت. ئەو جۆرە تێگەیشتنە زۆر ڕووکەش و یەک سووچی لە شتەکە دەڕوانێت. ئەدەبیات درووستکەری ئیدە نییە، بەڵکە ئیدە ڕەها دەکات تاکوو بان مێژوویی‌تر سەبارەت بە شتەکە بیربکەینەوە. ئیدی لێرەوە ئەدەبیات دەبێتە ژێرخانی زمان و مەنتقێک دادەمەزرێنێت کە ناگا بەوەی فام بڕیاڕی لە سەر بدات بەڵکە لە قۆناغی هێزی خەیاڵدا دەمێنێتەوە و درووستکەری کەشێکە کە دەتوانێ بە پێی گوزارەکە درووست یا خود نادرووست بێت. هونەر بەگشتی نابەستینەوە بە قۆناغێکی دیاریکراو تا وادەرکەوێت، لە ژێر چاوەدێری ئایدیالێکی ئینسانیدا خولقاوە. هونەر گەر بێت و تووشی بە ڕۆژبوون کرا، ئەو مانا ڕاستەقینەی لە فۆڕمدا هەیەتی دەشکێت، دەبێتە ئامێر و تووشی «بە شت بوون» ئەبێت. ئەم هونەرە، هونەری شەڕکەرە. لە ڕاستیدا هونەری شەڕکەر لای وایە هەموو ئەو شتانەی نموودن لە ڕاستی و لە واقعدا پێشان ئەدرێن (مارکوزە، ١٩٧٧)، هونەر بەم چاوە گەر لێی بڕوانین لە گۆڕەپانێکی دیدا تەڕاتێن ئەکات، لە سەرشانێتی دەردی کۆمەلایەتی ژنان و مندالان پێشان بدات، گرفتی ڕۆحی و دەروونی چارەسەر بکات یا ئەوەی بیرێکی فەلسەفی فراژوو کات و پێی بگەیەنێت. ئەگەر بەم چاوە لە ئەدەبیاتمان ڕوانی گرنگترین شتمان لە یاد کردووە ئەویش جوانییە. لە ناو زۆربەی گەلاندا و لەناو ڕەخنەگرانی کوردیشدا تا ئێستاشی لە گەڵ بێت «جوانییان بۆ پێناسە نەکردووین، تا ئێستا جوانی نەبۆتە بەهایەکی سەربەخۆ لە پەیوەندی خوێنەردا بە دەقەکانەوە، ئێمە هەمیشە جوانیمان بەستۆتەوە بەکایەکانی دەرەوەی جوانی خۆیەوە، بە سیاسەتەوە، بە ئەخلاقەوە، بە ئایدۆلۆژیا و بە ئاینەوە. جوانی وەک جوانی،

---

[1] بە پێویستی دەزانم ئەوە ڕوون کەمەوە بە پێی ئەوەی نووسەر لای وایە دوان لە ژانرەکانی ئەدەب هەر یەکەیان (شێعر، داستان، ڕۆمان، شانۆنامە، فیلم نامە و...) جیاوازن و لێرەشدا دەرفەت نیە لە هەموویان بدوێین، بە ناچاری تەنیا شێعر وەک یەکەم سەرچاوەی ئەدەبی نووسراوەی کوردی دێنینە بەر باس و تەوەری سەرەکی باسەکەمان بە کاریگەری شێعری کوردی لەسەر کۆمەڵگا ناو دەنێین. دیارە وەک لەناواخنی وتارەکەشدا باسم کردووە شێعر هەڵگری قورسایی زۆربەی جۆرەکان (ژانرەکان)ی ئەدەبیاتی هەموو گەلانە، هی کوردیش بەم جۆرە .

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

جوانی وەک جۆرێک لە خیبرەی تایبەت، وەک بەهایەکی سەربەخۆ ئامادە نییە، ڕەخنەی کوردی ئەوەتەی هەیە لە هاتنە کایەی ئەم ڕەهەندە گرنگەی ئەزموونی ئینسانی ئێمە لە پەیوەندیدا بە دەق و کارە هونەرییەکانەوە دەگرێت» (وریا قانع، ٢٠٠٤ : ٢٠٣ ). لێرەوە ئەدەب دەکەوێتە خانەی جوانییەوە بەڵام کەس نکۆڵی لەوە نییە ئەدەبیش بە جوانییەکانی کاریگەرە. ڕەنگە بەو زمانە هونەر تاوتۆێ کردن جۆرە قورسایەک درووست بکات کە بمانگەڕێنێتەوە سەر باسی کۆگیتۆی دێکارت، کۆمەڵگا بە تەواوی وەک ئۆبژە سەیر بکەین و ئەدەب وەک سوژە جوانی لە هونەر دەستێنین و لە ڕوانگەی دێکارت دەیکەین بە چەک (مارکوزە، ١٩٧٧).

قسە کردن لە سەر ئەدەب و کاریگەری لەسەر کۆمەڵگا و لە سەر کولتوور و فەرهەنگ، هێندە ئاڵۆز و پەرێشانە، مرۆڤ ناتوانێ ئاسان شتەکان بەرێتەوە سەر یەک سەرچاوە. کێشەی کارلێکی ئەو بانوتارانە (وتاری ئەدەبی و کۆمەڵناسی) قووڵتر لەوەیە بتوانین پۆلێنی بکەین. بەرلەوەی ئەو ڕوانگە نوێیانەی جوانناسی شی بکەینەوە باش وایە مێژووییش بێت_هەرچەند باوەڕێکی مێژوویی بەرامبەر ئەدەبیات هەڵەیە_ ئەو باوەڕە زۆرانەی بەرامبەر بە ئەدەب و هونەر بەگشتی گوتراون لێرەدا بێنین.

ئەگەر پێشتر ڕەخنە لە ئەدەبیاتێکی پارتیزانی (چەمکی لێنینی) دەگیرا، ئەمجارە بە دیوێکی دیکەدا هونەر دەمبەست و قەمتەر دەکرێت و بە جێگەی ئەوەی لە دەنووکی قەقنووسی هونەر و ئەدەبیات گوێمان لە ئاوازی هونەر، هزر وئاوەزمەندی هونەری بێت، تەنیا گوێمان لە هونەر بۆ هونەر ئەبێت کە لایەنگرانی پارناس (لایەنگرانی هونەر تەنیا بۆ هونەر) مانایان دەکردەوە. ئەگەر بۆچوونەکان کورت کرێنەوە، هونەریش کورت دەکرێتەوە، بۆیە پێویستە «باختین»ئاسا خەندەی کارناڤاڵی زیاتر قسەی لە سەر بکرێت. «ئادۆرنۆ» لای وایە «لە قووڵایی هەر بیرێکی تاکدا گەڕیانێکی ژێر زەمینی کۆیی ئامادەیە» (پویندە، ١٣٧٧ : ٣٥). وەک چۆن شیعری «بودلەر» بەو زمانە کارناڤاڵیە قسە دەکات و لە هەر شیعرێکی هەژارانە لە ڕۆحی خەڵکی نزیکترە (پویندە، ١٣٧٧).

لێرەدا لە «گوێن گوڵدمان» و «لۆکاچیەکان» لە ڕوانگەیەکی مێتۆدیەوە باسەکە هەڵدەسەنگێنین و واناکەین یەکەکیان بە کانی ئەویتر دابنێین و لە ئاکامدا بڕیارێک دەرکەین و پێمان وابێت شتەکان کۆتاییان پێدێت. گەر وا بڕوات، تەنوراوێک چاوەڕێمان ئەکات هاتنە دەرەوەی چارنەما، هەمان پنتی یەکەمی دەس پێکردنە. بۆیە سەرەتا پێویستە بڕگە بە بڕگە بڕۆینە ناو ناخی وتارەکەوە. خاڵێک دەسنیشان کەین و لەوێوە شتەکان شی کەینەوە.

**- ڕەگەکانی ئەدەب :**

ئەدەب لە ڕەگ و ڕیشەدا، لە نابەئاگای تاکەوە دێتە دەر. پێناسەکانی ئەدەب ئەوەندە تێکەڵاو و زۆرە کە نەک بە گشتی، بەڵکوو بە تەنیا هەر بەشێکی چەندین ئاراستەی جیاواز بە خۆی ئەگرێت. "ئەفلاتوون" وەک یەکەم سەرچاوە بە ڕوویەکدا لە ئەدەب دەڕوانێت کە ئەدەبکار جگە لە لیبۆکێکی لێزان ناوێکی تری ناتوانین بۆ قائیل بین. ئەفلاتوون لای وایە هونەر بە گشتی و ئەدەب بە جیا لاسایی کەرەوەن. لاسایی ئەو بەشەی

سرووشت کە پێویستە بە دەرک و فامێکی ژیرانەوە مامەڵەیان لە گەڵ بکرێت، لە کاتێکە هونەر وەک وێنەی وێنە وایە. بەو پێیە لە کۆپی، کۆپی سەرچاوەیان گرتووە. ئەفلاتوون، نزمترین شوێنگەی دابەش کردنی «خەتی » تەرخان کردووە بە خەیاڵ یا ئایکازیا . هونەر و ئاژەڵەکان و سرووشتی دەوروبەری زەوی سەرچاوە گرتوو لەم بەشە دەزانێت (کاپلیستون، ١٩٤٤ – ١٩٧٤). لێرەوەیە کە بێبایەخی هونەر لەباری عەقڵیەوە لە لای ئەفلاتوون تەواو دەردەکەوێت. بەڵام هەموو ترسی ئەفلاتوونیش دەگەڕێتەوە سەر درووست کردنی باوەڕ بە یارمەتی هونەر کە ئەو شتەش دووبارە بە تێکدان و فەساد دەزانێت. ئەگەرچی ئەم گوتەی ئەفلاتوون خۆی دەربڕی کاریگەری ئەدەب و هونەرە لەسەر گەنجان وەک بناخە داڕێژانی یۆتۆپیای ئەفلاتوون. بەڵام لە هەمان کاتدا «ئەرەستوو» لای وابوو ئەدەبمەند تەنیا لاسایی ناکاتەوە، بەڵکوو درووستکەری دونیایەکی ترە. هەندێک جار جوانتر وێنای ئەکات و هەندێک جار وێرانتر. ئەرەستوو بەپێچەوانەی ئەفلاتوون، شیعر بە سستی ئاوەز و زاڵبوونی ئاڵۆش نازانێت، بەڵکوو شیعر ئەتوانێ لە ناخی مرۆڤدا ببێتە هۆی کاتارسیس[١]؛ واتە ببێتە هۆی پاکژبوونەوەی دەروون و سەفەر بۆ ناو ناخەوە کە خۆی لە چوارچێوەی ڕەخنەی ئاکاردا باسی لێ ئەکرێت (زرین‌کوب، ١٣٧٤). لە ڕوانگەی کانتدا، بابەتە[٢] هونەرییەکان فۆرمی پێشووی زەین و ڕەهەندی مێژووییان نییە، بە پێچەوانە لە ڕوانگەی هێگێلدا بابەتە هونەرییەکان مێژوویی دەبنەوە، بەڵام لە گەڵ گەشەی ڕۆحی کۆنکرێت یەکدەگرن و بە پێچەوانەی ڕەوتە ئەزموونییەکان لە ئاکامدا سروشتێکی تیۆری و زەینی بە خۆوە دەگرن (محمّدی، ٢٠٠٦) . هێگل لای وایە جوانی هەمان ڕووناکایی ڕەها و نموونە لە پشت پەردەی جیهانی بەرهەستە و لاشی وایە تەنیا هونەرە کە جوانییەکی ڕاستەقینەی هەیە؛ چوونکو هونەر زادەی ڕۆحە (مارکوزە، ١٩٧٧).

دیارە ئەمەش نابێت بە یۆتۆپیا کردن؛ بێت وەک چۆن تەنانەت کار دەکاتە لووکاچیش.گەڕان بە دوای یۆتۆپیای ئەفلاتوونی هەندێک جار لە ڕێی مارکسیسمەوە کاردەکاتە لووکاچیش، بەڵام لە باوەڕی لووکاچدا ئەگەر گەڕانەوەشمان بینی بۆ جۆرێک لە ئەفلاتوون‌گەرایی ئەبینین لە گەڵ ئەوەش چەندگەرایی لە ئەدەبیاتدا ئامادەیە (مارکوزە، ١٩٧٧).

بە زمانێکی تر ئەبێ بگوترێ بە گشتی تا ڕادەیەک هەموو بیرمەندان کۆکن لە سەر ئەوەی جۆرە ئیلهامێک کارگێڕە لە درووستبوونی مرادێکی ئەدەبی. « مارکس و ئینگێلس جوانی لە ئاسمان دائەبەزێننە زەوی و دەیهێننە خزمەتی پراکسیسی[٣] ئینسانی» (مارکوزە، ١٣٨٧: ٣٥). سارتر بە تایبەت قسە کردن لە هەموو جۆرەکانی هونەر و ئەدەبیات جیا ئەکاتەوە و ئیشی نووسەری پەخشان بە دوادا چوونی مانا ئەزانێت. بەو

---

[١] catharsis

[٢] category

[٣] "پراکسیس" یا کاری ئینسانی لە مێژووودا لە ژێر ناوی تێکەڵکاری عەین و زەین دێت کە گرنگترین هۆکاری دیاری کردن و داهێنانە لە کۆمەڵگا و مێژوودا. ئیشی مرۆڤ لە مێژوودا واتە هەمان پراکسیسی درووستکەر و ئافرێنەری هەموو بیچمەکان و بنچینەکانی مێژوویی و کۆمەڵایەتی( ئامێرەکانی داهات، کاڵا، بنچینەکانی ئابووری، دیاردە کولتووریەکان، ئایدۆلۆژیا، دەوڵەت و ...). (بشیریە،١٣٨٦ :٣٠ )

هۆیەشە ئەوە ئەدەنە پاڵ سارتر کە بە تەواوی لە ئەدەبی بەرپرسیار و بەڵێندەر دواوە، لە کاتێکا لە کتێبە بەناوبانگەکەی «ئەدەبیات چیە ؟»دا کاتێ باس لە هونەری شێوەکاری دەکات بە تەواوی ڕای جوانناسی خۆیمان پێشان ئەدات (سارتر، ١٩٤٧). سارتر لای وایە شیعر دونیا نانوسێتەوە و وشە بەکار ناهێنێت بەڵکوو شیعر خزمەت بە وشە دەکات و مانای ئەداتێ. ئەو لای وایە مانا وەک خسڵەتێک لای وشە ئامادەیە، وەک چۆن شادی و غەم لە هەناوی ئاواز و نەغمەدا بوونی هەیە. لێرەدا سارتر لەگوێن واتا گەراکان[1] باسی ئەوە دەکات ئەدەبیات بێ بوونی مانا درووست نابێت و مانا ئەو تایبەتمەندیەیە کە نووسەر لە جوانی و خەیاڵی هونەریدا دەیخولقێنێت (سارتر، ١٩٤٧). ئەم مانایە دەتوانێ پەیمانێکی سیاسی بێت و هەرچۆنێک بێت بەواتای «موریس بلانشۆ» جۆرە ئەگەرێکی شرۆڤەکاریە بۆ جیهان لە ئەدەبدا کە تا ڕادەیەک جوانی لێ زەوت دەکات (احمدی، ١٣٨٣ ).

لەم وتارەدا هەوڵمداوە تا دەکرێت، بە مەودایەکی کەمتر بەڵام قووڵتر، سەفەر بکەین بۆ بن دیڤی وتاری «کاریگەری ئەدەبی نووسراوە لە سەر کۆمەڵگا و کولتوور». باشە هەرچەند کورتیش بێت ئاماژەیەک بەوە بکرێت کە کۆمەڵگا و کولتوور چ پێناسەیەک بە خۆیان دەگرن.

### - کۆمەڵگا و کولتوور بە چی دەگووترێ :

لە ئەدەبیاتی کۆمەڵناسی ئینگلیزیدا بەرامبەری وشەی کۆمەڵگا society دێت کە ئەویش لە وشەی لاتینی socio گیراوە بەواتای یەکبوون یا گەیشتن بە یەک هاتووە (عضدانلو، ١٣٨٨) . لە ڕاستیدا کۆمەڵگا بە تاقم و گرووپێک دەگووترێ کە ماوەیەکی زۆرە لە گەڵ یەکدی ژیان ئەکەن (کۆئێن، ١٣٧٥). کۆمەڵگا پێکهاتووە لە دوو ناوی کۆمەڵ کۆی جێگا، واتە جێگای کۆمەڵ. کۆمەڵیش بە دەستەیەک لە حەشاماتی هەر شتێک دەگووترێ کە لەگەڵ یەکدی یەکڕەنگ و یەکڕیز بن. وەک کۆمەڵگای ئاژەڵ، کۆمەڵگای ڕێژەیی (کە بۆ لێکۆڵینەوەی ئاماری لە بابەتەکانی کۆمەڵناسی، دەروونناسی و زانستی پەروەردەیی و ... سوودیان لێ وەردەگیرێت). بە واتای سەرەوە کۆمەڵگا چەندین واتای هەیە. بەڵام ئەوەی لێرەدا پێویستە بگووترێ ئەوەیە کە هەر یەک لەو دەستانەی ناومان هێنان خۆیان لە ئەدەبیاتی کوردیدا ناوی تایبەتیان بۆ داندراوە وەک بۆ نموونە مێگەل (کۆمەڵێک مەڕ و ماڵات)، گەلە گورگ (کۆمەڵێک گورگ) و هتد. کۆمەڵگا بەواتای ئەم وتارە مەبەست کۆی چەندین بنیادەمە کە بە یەکەوە لە سنوورێکی دیاریکراو و گرێبەستیدا لە ناوچەیەکی ژیئۆگرافیدا ژیان بە سەر ئەبەن کە چەندین شتی وەک یەکیان هەیە. ئەو چەندین شتە بریتین لە زمان، ئاداب و نەریت و بە گشتی کولتوور.

هەر کۆمەڵگایەک خاوەنی چەندان بەها و پرنسیپ و هیوا و ئارەزوویە کە زیاتر لە یەکدیان نزیک دەکاتەوە. ئەو داب و نەریتانە هەمان چەمکی دووهەمی باسەکەی ئێمەیە کە پێی دەگوترێ کولتوور. کولتوور بە واتای شێوە ژیانی کۆمەڵێ کەسە لە ناو کۆمەڵگادا. وەک چۆنێتی جل پۆشین، ئادابی زەماوەند، شێوەکانی ئیش و

---

[1] theory of meaning

کار و بە جێهێنانی فەریزەی ئایینی و ... . لە نێوان کۆمەڵگا و کولتوور پێوەندێکی دوو قۆڵی درووست دەبێت کە ئاسان نییە هیچ کامیان بێ ئەوی تر بناسێنین (گیدنز، ١٩٨٩). بۆیەش زۆربەی جار و تەنانەت لەم وتارەشدا بە واوی عەتف ئەم دوو وشەیە بە یەکەوە دەلکێنین.

ئێستا دوای پێناسە کردنی ئەم دوو چەمکە و بە دانان بەوەی کۆمەڵگا کاریگەری ئەدەبی بە سەرەوە دیارە، قسە لەوە دەکەین ئەم کاریگەریە لە ئەدەبی کوردیدا لە کوێڕا دەست پێدەکات و چۆن چوارچێوەی خۆی دادەڕێژێت.

## - ئەدەبیاتی کوردی چۆن کاریگەرە:

ئەدەب لە دەروونی ئادەمیەوە بە دوو مانای تاک و کۆ سەرچاوە ئەگرێت و بە زمانی وشە خۆی ئەدرکێنێ. جیهان ئەباتە ناو ناخی خۆی و پاشان وەک فوارە، وشە لە هەناوی زمان هەڵئەقووڵێ، جوانی ئەداتێ، قەبارەی بۆ دابینئەکات و ئەترسێ ئەگەر نیشانەکان لە شوێنی خۆیان بە کار نەبات. مرۆڤ بە واتایەکی تر لە زماندا خۆی ئەشارێتەوە وهەر بە زمان خۆی خویا ئەکات. ئەدەبیات درووست کردنی زمانێکی نوێیە، کە کۆمەڵگاکان بە شێوەی ڕەمزی و ئیستێعاری قسەی پێدەکەن .

تێکەڵکاری دوو شت، گووتنی ئەدەبی درووست ئەکات: ئەزموون وئەندێشە. کۆمەڵگا بە مانای کاریگەری کۆیی لە سەر تاک، درووستکەری ئەم دوو بەشەیە. کەواتە بە تەواوی دەتوانین بڵێین کۆمەڵگا کاریگەرە لەسەر ئەدەب. بەڵام ئایا بە پێچەوانەش شتەکە هەمان دیاردەی هەیە؟ پەیوەندی ئەم دوانە وەک زمان و فکر، نابێت تووشیمان کات و وامان لێبکات بگەین بە پەیوەستەیی یا خود تەسەلسوول. لۆکاچ لای وایە پەیوەندی ئەدەب و کۆمەڵگا دیار و بەرچاوە، بەڵام نابێت لامان وابێت ئەم پەیوەندیە بە سادەیی مانا بکرێتەوە. لووکاچ لەنێوان پێکهاتە زەینییەکانی درووستکەری هۆشیاری کۆیی و پێکهاتەی جوانیناسانەی بەرهەمی هونەریدا پەیوەندێکی دوو لایەنەی بەدی‌کردووە. بە پێچەوانەوە، نابێ لە نێوان ناوەرۆکی هوشیاری کۆیی و ناوەرۆکی بەرهەمی هونەریدا، پەیوەندی دامەزرێنین، چونکوو ئەمەیان جۆرە سادەگەرییەک درووست ئەکات لە تێگەیشتنی شتەکان (محمّدی، ٢٠٠٦). ئەدەبیات ئەو بەشەی زمان ئەگرێتەوە کە تیایدا دوو شت ئەگەن بە یەک: ناوەرۆک و ڕواڵەت. ناوەرۆک یا ئەو خەیاڵەی لە هەناوی مرۆڤدا بێ فۆڕم دێتە دەرەوە و هێشتا نەبەگ و خۆنەگرە و ڕواڵەت یا خود قەبارەی جوانی و جلی جسمی ئەدەب.

لە تێڕاونینی ئێمە بۆ ئەدەبیاتدا پێویستە ئەوە بگووترێ، زمانی سەرچاوەگرتوو لە دال و مەدلوولە، کە خوڵقێنەری ئەدەبیاتە. دال و مەدلوولێکی داپچڕاو لە زمانی بە کار هێنانی ئاسایی و ڕۆژانە. بەو بۆنەش باشترین پێناسە هی فۆرمالیستەکان بوو (ایگیلتون، ١٣٨٠). ئەوان لایان وابوو ئەدەبیات هەمان لادانە لە زمانی بە کار هێنانی ڕۆژانە. کاتێ قسە لە ئەدەبیات دەکرێت لە ڕاستیدا شتێک جگە لە زمان و وشە و ڕستە نییە کە قسەی لە بارەوە دەکرێت. گەر وردبینەوە دەبینین فۆرمی دەرەوەی زمانە. کەواتە ئێمە کاتێ قسە لە ئەدەب دەکەین زمانمان لە شکڵێکی هونەری والادا ورووژاندووە. لە داستاندا قارەمانی داستان دەور دەگێڕێت

و لە شیعردا نەهایەت. ئەو زمانەی وشەکان تەنیا لە قاڵبی پەیوەندیدا ڕۆڵی خۆیان ئەگێڕن دێتە خانەی کۆمۆنیکەیشنەوە[1]. بەڵام ئەدەبیات بۆچی ئەگەڕێتەوە؟ نیشانەکانی ئەدەبیات ئاماژە بۆ چین؟ لە زۆرێک لە وڵاتانی ئەفریقا ئامێرەکانی مووسیقا بۆ ڕاگەیاندنی پیامە جۆراوجۆرەکانی خێڵ و عەشیرەتەکان بە کار دێت. ئەوان مەبەستیان هەیە و بە واتایەکی تر گوێگرانێک درووست دەکەن کە ئەم نەواو نەغمانە ڕاستەوخۆ کاریان لێ بکات و بە پیر هاواریانەوە بێن (بیتس و پلاگ، ١٣٧٥). لێرەدا ئیدی ئەو ئامێرە ناوی ئامێری مووسیقا نییە و ئەو نەغمەی دەنگیشی دێت، ئاوازێکی هونەری نییە. بەڵام هەندێک جار هەم گوێگر درووست دەکات و هەمیش جوانی خۆی پێشان ئەدات. نموونەی بەرچاوی ئەم هونەرە شانۆنامەی «هەملێت»ی شکسپیەرە. کە لە ناو خودی دەقەکە، مەبەستی پاڵەوانی سەرەکی شانۆنامەکە، هاملێت، گەیاندنی ئەو پەیامەیە کە سوور کردنەوەی خیانەتە (شکسپیر، ١٣٧٣).

نموونەی ئەو جۆرە ئەدەبە لە زمانی ئەدیبانی بەرگریشدا بە ڕوونی بەرچاو ئەکەوێت. «مایاکۆفسکی» پێی وابوو پێویستە قەڵەم و خەنجەر هاودەور بن (آتش برآب، ١٣٨٧). شێرکۆ بێکەس پێی وایە پێویستە بە قەڵەم سەنگەر لە شیعرا هەڵقەنی. «پابلۆ نێرۆدا» و «مەحموود دەرویش» و «شاندۆر پتۆفی» نموونەی ئەو شاعیرانەن کە لە شیعردا ئەو زمانەیان درووست کرد. زمانی نیشانە وەک دالێک کە مەدلوولەکەی ڕاستەوخۆ بدۆزێتەوە، کە ئەویش هەمان کاریگەری ڕاستەوخۆیە لە سەر تاک و لە سەر گوێگر بێ ئەوەی بەهای جوانی خۆیان بدۆڕێنن . هەندێک جار جوانی لەم بوارەدا لە پلەی دووهەم دایە. شاعیرانی ڕۆژگاری مەشروتە لە ئێران درووست هەمان ئامانجیان پێکا و زمانێکیان درووست کرد کە زیاتر تاکی بیسەری پێویست بوو بۆ گوێ گرتن نەک بۆ شرۆڤە و ڕاڤەکاری هونەری. لەهەمان ڕۆژگاردا پیرەمێردی نەمر بە پشتیوانەی شیعر و ڕۆژنامەگەری هەمان کاری کرد. بە جۆرێک کە لەم ڕۆژگارەدا لە زۆر لاوە ئەدەبی گوێگر درووستکرا. ئەمانە کاریگەری وێژە و هونەریان پێشاندا، ڕاستەوخۆ، بەر لەوەی وەک هونەر قسەیان لەسەر بکرێت. هەرچەند نابێت لامان وابێت بە دیوێکی تردا بۆ نموونە ناتوانین قسە لە جوانناسی شیعری شێرکۆ بێکەس بکەین. دیارە هەمووی ئەم شاعیرانەی ناومان بردن بە جۆرێک درووستکەری زمانی کاریگەر بوون.

ئەدەبیاتی کوردی لە هەمان قاڵب و ڕێسادا هەم کاریگەری کۆمەڵگای بە سەرەوە دیارە، هەمیش کارلێکی لە سەر کۆمەڵگا بەرچاو و دیارە. بە تایبەت ئەدەبیاتی وڵاتانی بێبەهرە لەدەوڵەت_نەتەوە، کاریگەری کۆمەڵایەتی و کولتووری زۆر زیاترە تا وڵاتەکانی تر. ئەدەبیاتی کوردی و نووسەری کورد بە چەندین ئەزموونی هەمەجۆردا تێپەڕیوە، بە جۆرێک بە چاو ئەدەبیاتی زۆربەی ڕۆژهەڵات هەموو لاپەڕەکانی ئەدەبیاتی هەڵداوەتەوە و قۆناغ بە قۆناغ ڕێبازی خۆی بڕیوە. مرۆڤ ناتوانێ مەزەندەی ئەوە بکات لە کوێڕا بەدری تەواوی ئەدەب لە ئاسمانی وێژەدا بەدیار ئەکەوێ، بەڵام بە گشتی، ئەدەبی کوردی بە هۆی زاڵبوونی دەستی تر بە سەریدا هەندێک جار، تەنیا توانیوێتی پێی قوراوی لە مەیدان بەدەر کات. هەرچەند ئەم باسە لەوە درێژترە لێرادا بتوانین بیگونجێنین، بەڵام بە کورتی ئەدەبی کوردی لە کۆن و لە ئێستادا جێ پەنجەی بە سەر

---

[1] communication

وەرەقەکەوە بەرچاوە. لە زۆربەی لێکدانەوە و شرۆڤەکاریەکاندا ئەدەبی سیاسی قسەی لە سەر کراوە. واتە ئەو ئەدەبەی شان بە شانی بزاڤەکان هەوڵی خۆی داوە بۆ دابین کردنی کەشوهەوای ڕۆشنبیری، کاریگەری کولتووری و کۆمەڵایەتی. تەنانەت زۆرجار لە غیابی گووتاری سیاسی، ڕۆڵی بزاڤی سیاسیشی بینیوە. حاجی قادری کۆیی و ئەحمەدی خانی لە ئەدەبی نووسراوەدا و زۆر نووسراوەی تر لە ئەدەبی زارەکیدا نمونەی بەرچاوی ئەو ویژەیەن کە جێگەی بەتاڵ و بۆشی دەوڵەت و بزاڤی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتیان دابینکرد. حاجی قادر پاش دیداری لە ئەستەموڵ و ئاگاداری و هوشیاری ڕۆشنبیری، ئیتر نەک تەنیا وەک شاعیری خەت وخاڵ بەڵکو وەک نیشتمان پەروەرێک ڕوودەکاتە ئامۆژگاری و تێبینی کولتووری و فکری (سەجادی، ٢٠٠٣). ئیدی شیعر لای حاجی ئەبێ بە هەتوان، بە کلیل، بە خەنجەر، هونەر ئەبێتە دەغڵ و بانگدان (بێکەس، ٢٠٠٠).

ئەدەبیات دوو بەشە: شیعر و پەخشان؛ هەندێک جار قسە لە کاریگەری هونەر دەکرێت، لێرەدا سنووری باسەکە بەرتەسکتر دەکرێتەوە و زیاتر لە ئەدەبیات دەدوێین، چوون لامان وایە هونەر هەموو ئەو دەقانە دەگرێتەوە کە لە ژێر کەوانی ئەودان، واتە پانتایی هونەر بەرینتر لەوەیە ئاسان بتوانین بەوە ڕازی بین تێزێکی وای بەسەردا هەموار بکەین و بڵێین دەور گێڕە لە سەر کولتوور، لە سەر گۆمەڵگا. «درێیدا» کاتێ قسە لە زمان دەکات قسە لە زمانی نووسین دەکات وەک بەشێکی جیاواز لە زمانی گووتن و وەک سەرووتر لە زمانی ئاخافتن (مک کوئیلان، ٢٠٠١). دیارە هونەرەکان بە گشتی لە خانەی جوانی ئەگەن بەیەک، بەڵام هونەری بیناسازی و ئارشیتێکت زۆر جیاوازە لە شێوەکاری. پێویستە ئەوەش بگوترێ بە هۆی ئەوەی لە بەراوردی مێژووی ئەدەبی سەرجەم گەلاندا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە شیعر لە ئەتڵەسی ڕۆشنبیری گەلاندا پێشەنگی ڕەگەزە ئەدەبیەکانی دی بووە، بەڵام لە گەڵ لەدایکبوونیدا تۆی هەموو ڕەگەزە ئەدەبییەکانی تری هەڵگرتووە، ئەمەش وای لەشیعر کردووە ئەرکی تێکڕای ڕەگەزە ئەدەبییەکانی تر لە ئەستۆ بگرێت (هەڵمەت، ٢٠٠٣) .

لە زمانی کوردیدا کاتێ قسە لە ئەدەبی نووسراوە ئەکرێت، شیعر دێتە قسە. لەم بوارەدا یەکەم کەس «مەلای جزیری» بوو. مەلای جزیری زمانێکی درووست کرد کە پێشتر بەم جۆرە ئیشی پێنەکرابوو. لە زمانی کرمانجی سەرووودا یەکەم جار ئەو زمانەی درووست کرد کە دواتر خانی وەک بنەمایەکی زمانی سوودی لێدەبینێت. دوابەدوای جزیری لە سەدەی هەژدەیەمدا ئەحمەدی خانی بە نووسینەوەی «مەم و زین» جۆرە خولیایەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی درووست کرد کە کولتورێکی نوێی زمانی لە گەڵ خۆیدا هێنا. ئەمانە و چەندەهای تر لە ئەدەبیاتی داستان و شیعر درووستکەری زمانێکی نوێ بوون کە کاریگەری جێ پەنجەیان نەک هەر لە درووست کردنی جۆرە هەستێکی ناسیۆنالیدا، بەڵکوو لە سەر درووست کردنی کولتورێکی تازەی ئەدەبیدا بەرچاوە.

زمانی بە کار هێنانی ڕۆژانە لە زمانی کوردیدا بە هۆی زاڵبوونی هەستێکی قووڵی ناسیونالیستی هەرگیز نەیدەتوانی لە ڕێی ئەو زمانانەوە بێتە کایەی فکری کە خۆشەویستی و عەشقی زمان و نەتەوە بە تەواوی

پێشان نادەن. جیا لەوەش بە هۆی زاڵ بوونی سیستمی زاڵی بوورۆکراسی خاو و خامی دەوڵەتە چاودێرەکان، زۆر جار -سەرەتا نابەئاگا و دواتر بە دەرکی کاریگەری زمان بە ئاگا- کارگێڕ ئەبوون لە سەر کۆمەڵگای کوردی. ئا لێرەدا تەنیا شوێنێک کە هەر لە سەر دەمی عوسمانییەکان و سەفەویەکاندا دەیتوانی هەڵگری جۆرە گۆڕانێکی ڕۆشنبیری بێت زمانی کوردی خۆی بوو. لەو سەردەمەدا هیچ شوێن و پەنایەک نەبوو تا بتوانێ عەقڵێکی سیاسی و زانستی و فکری لە سەر بنەمای زمانی کوردی درووست بکات. چارنەما دەبوایە بزاڤێک کە سەرەتا لە خۆشەویستی و ئەوینێکی قووڵەوە سەرچاوەی گرتبوو درووست ببێ. دوو زمان درووست بوو، زمانێک کە لە ناو حوجرەوە سەری هەڵدا تێکەڵ بە عیرفان بوو و زمانێک کە لە ناو دڵی کۆمەڵگای کوردیدا ساز درا و ئەویش زمانی ئەدەبی زارەکی بوو کە هەر لە ڕۆژگاری پێشترەوە ئیشی پێکرابوو. زمانی شیعری جزیری زمانی یەکەم بوو. تا هاتنی حاجی و خانی تەنانەت لە سەر هەمان کێش و ئاواز دەجووڵا. لە هەورامان پاراوتر بوونی ئەو زمانە ئەبینین وەک لای بەشەکانی تری زاراوە زمانییەکان ئەویش بە هۆی جوغرافیای تایبەتی هەورامان و پێداگری زیاتری دەروونی خەڵکی هەورامانە وەک سەجادی دەڵێت بە هۆی شاخاوی بوونی هەورامان نە ڕووم و نە عەجەم بە تەنگیەوە نەبوون ئەوەش وایکردووە کە کاریگەری زمانی ئەوان کار نەکاتە سەر زمانی هەورامی (سەجادی، ١٣٦١). مەولەوی و سەیدی و بێسارانی و چەندانی تر لەو ڕیزبەندە دان.

بەڵام زۆری پێنەچوو نالی وەک یەکەم کەس کە زۆر بەئاشکرا ئەو کاریگەرییەی هەڵقۆزتەوە، سەری هەڵدا. زمانی نالی درووستکەری ئەو گوزارە خەیاڵیانە بوو کە بە دوو جۆر کاری کرد: بۆ یەکەم جار شیعری بە مانای ستاتیکا و خەیاڵئامێزی بە زمانی کوردی درووست کرد؛ واتە شیعر و نەزم لە دوای نالی بەتەواوی لێک جیا دەکرێتەوە. دووهەم ئەوەی ئەو زمانە هاتە ناو دەقە ڕۆشنبیری و سیاسی و کۆمەڵایەتیەکان. نالی ڕۆمانتیسمێکی تا ئەو کاتە نامۆی درووست کرد. تا ئێستاشی لەگەڵ بێت شیعری کوردی لە ژێر زمانی ڕۆمانسی نالیدا ماوەتەوە. ئەوە ڕەخنەیەکە ناگەڕێتەوە بۆ نالی، بەڵکە بە تەواوی قسە لە کۆمەڵگایەک دەکات کە هێشتا لە ڕۆژگاری نالیدا بە سەر دەبات و زمانی ئەو دەوڵەمەندیەی دواتری دونیای بە خۆیەوە نەبینیەوە. هەر لەو سەردەمەدا سالم و کوردی بە هەمان زمان کە بە تەنها مۆرکی نالی بە سەرەوە نییە، جار جار گوزارەی شیعری درووست دەکەن. باش وایە کە باس لە شیعر و ئەدەبیات دەکرێت زیاتر باسی شیعر بکرێت لە بری ئەوەی باسی شاعیرێک بکرێت؛ چوون بێ‌گوومان هیچ شاعیرێک لە هەموو شیعرەکانیدا گوزارەی شیعری نائافرێنێ. هەر چەند بۆ ئەو کاتە نەدەکرا قسە لە مەرگی نووسەر بکرێت، بەڵام ئێستا و لە شرۆڤەی ئێستاماندا قسە لە شیعر دەکەین. بەڵام فەرامۆش ناکەین ئەو زمانە و کاریگەری ئەو زمانە شیعریە ئەوەندە هەستیار و لەسەر خۆیە بە قووڵ بوونەوەیەکی پتەو نەبێت هەستی پێناکرێت. بۆنموونە لەو سەردەمەدا کە جزیری سەرهەڵدەدا، بۆ یەکەمجار شۆناسی زمانی دادەمەزرێنێ. خودی قسە کردن لە شیعری کوردی دۆزینەوەی ئەو شۆناسەیە. کەواتە لێرەدا زمانی گووتن بەخشینی شۆناسێکە کە کاریگەری ئەو حاشا ناکرێت. لە تورکیای دوای ئاتاتورکدا قسە کردن بە زمانی کوردی خۆی بە تەنها بێ‌ئەوەی شیعری پێ‌بنووسرێت

کاریگەر بوو لە سەر هەموو بزاڤە فکری و سیاسی و ڕۆشنبیریەکان. بەڵام وەک ئەوەی شۆناس بەخشینیش پێویستی بە شکاندنی چەق (هەنجار شکاندن) هەبێت دوای جزیری دەبێتە زمانی نووسین. درێیدا پێی وایە زمانی نووسین سەلماندنی ئەوەیە کە تۆ ڕێزمانت هەیە (مککوئیلان، ٢٠٠١)، بوونی ڕێزمان واتە بوونی نەتەوەی جیاواز و بە گوتەی «فرانتس فانون» پەیڤین بە واتای گەیاندنی بوونە بە دیتران. بۆیەش ڕەنگە کووشتنی زمانی ئاخافتنی ڕۆژانە، قەدەغە کردنی، زیاترین کاریگەری لەسەر نەتەوە دەبێت. بۆمان دەردەکەوێت کە نووسین گەورەترین سەرمایە بوو کە شاعیران کورد لەم سەردەمەدا توانیان بیکەن. ئەمارەتی بابان و ئەردەڵان تەواو بوون بەڵام سالم و مەولەوی تەواو نەبوون و ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر کاریگەری زمانیان بەجێهێشت. مرۆڤ بەپێی ئەوەی لە سیمایەکی گشتیدا ناڕوانێتە بابەتەکە ئەو کاریگەریە لە تاکێکەوە بۆ ئەوی تر ئەبینێ بەڵام زمانی پانتایی داهێنانەکەی زۆر زیاترە. باشە ئەوەش بگووترێ هەموو ئەو شاعیرانەی هەر یەکەو بە چەشنێک، کەم تا زۆر توانیویانە دەوریان هەبێت لە گۆڕانی زمان و چەمکەکان کاریگەریان وا بەر چاو نییە. ئەوەی شیعری پەشێو دەوری هەبۆوە لە گۆڕانی کولتووری ڕووبەڕوو بوونەوەی تاکەکانی سیاسی کورد، بە هۆی بوونی شاعیر وەک کەسایەتیەکی ئامادە لە ناو بزاڤەکەدا، ڕۆڵی شیعر نەبووە بەڵکوو دەوری خودی شاعیر بووە. بەڵام گەر تەماشای حاجی قادر بکەیت بە هەمان زمان، ئیدی دەوری زمانی شیعری ئەوت بۆ دەردەکەوێت. بەو پێیە زمانی شیعری حاجی وەک سێبەری لێهاتووە نەک وەک چەک یان باشترە بگووترێ وەک پەیام. پێویستە جارێکی تر ئەوە بگووترێ، شیعر گەر ڕاستەوخۆ کاریگەر بێت، شیعر نییە، بەڵکە پەیامێکی ڕۆشنبیری کەسایەتیەکە بە ناوی شاعیر. کەچی ئێمە جەخت لەوە دەکەینەوە شیعر خودی خۆی لە ڕێی زمانەوە دەور گێڕە. کاریگەری ئەو زمانەش زۆری پێدەوێ تا نیشانەکانی دەرکەوێت. لێرەدا باشە ئەو وێنە خەیاڵیە بۆ شیعر بکێشرێتەوە:

خەیاڵی مەنتقی شیعری[1] ← شیعر ← زمانکۆمەڵگا (بە هەموو بابەتەکانەوە) ←

- § ئەو کاریگەریانەی لە ئەدەبی کوردی دا بەدی دەکرێت :

لەم بابەتانەی خوارەوە کاریگەری ئەدەب بە ئاشکرا خویایە :

[1] هەر کاتێ قسە لە مەنتق دەکرێ فۆرمێکی دیاری کراوی ژیری و عەقڵ دیاری دەکرێت کە واتە مەنتقی خەیاڵ خۆی لە خۆیدا هەڵگری پارادۆکسە. بەڵام جوانی شێعر بە تەواوی بەستراوەتەوە بەم هەموو پارادۆکسەی تێیدا دیارە. وەک تێکەڵکاری ئاپۆلۆنی و دیۆنۆسی نیچە. دوو بابەتی ڕەمزی. کە باس لە مەنتقی خەیاڵ دەکرێت هەڵەیەکی زمانی شارەزایانە نیە، بەڵکە کت و مت هەر خودی بابەتەکە مەبەستە، واتە خودی مەنتقی خەیاڵ. هەموو هوونەرێکی ڕاستەقینە بە دوو چاو دەخوێندرێتەوە: بە دیوێکدا مەنتق حاکمە بە دیوێکدا خەیاڵ. گەر شتێک بە تەواوی خەیاڵ بێت دەتوانێ وەهم بێت و دەتوانێ پاتەران بێت گەر شتێکیش بە تەواوی مەنتق بێت نزیک دەبێتەوە لە مەنتقی زانست. گاستون باشلار خودی مەنتقی زانستیش ئاوێتەی خەیاڵ دەکات.

## بەشی پێنجم- ڕەخنە

- زیندوو کردنەوەی داب‌ونەریت: بەر لەوەی پیرەمێرد هۆنراوەی "نەورۆز" بهۆنێتەوە، نەورۆز لە چەند بەشێکی کۆمەڵگای کوردیدا دەهات فرامۆش بکرێت. هۆنراوەی «نەورۆز» ئەو بوژاندنەوە و نۆژەن کردنەوەی دووبارەی نەریتێکی کۆنی ساڵانە بوو. لە ڕاستیدا ئەو شتانەی کورد لە واقیعدا لە دەستی داون زۆر جار هاتوون لە ناو خەیاڵی شاعیر و لە ناو ئەدەبیاتدا ماونەتەوە تا دواتر زیندوو بونەوە و ژیانەوە بە خۆیان ببینن.
- درووست کردنی شۆناس: شۆناس گرینگترین بابەتی ناو کولتوورە. شۆناس هەمان گەڕانەوە و ئاوڕدانەوەی تێگەیشتنە لە خود (گیدنز، ١٩٩٥). لە ڕاستیدا شۆناس یا باشترە بگووترێ دۆزینەوەی شۆناس بە دو مانای تاک و کۆ لە و سەردەمەدا (سەردەمی بەر لە درووستبوونی یەکەم هەرێمی کوردی) زیاتر لە هەر شتێک بەستراوەتەوە بە ئەدەب کە تەنها شوێنی دەرخستنی زمانە لە فستیواڵ و لە کۆڕە جیهانییەکاندا. زمان لەو سەردەمەدا تەنیا ڕێگای دەربڕینی لە قاڵبی ئەدەبیاتدا و بە تایبەت لە زمانی شیعردا بەدی دەکرێت. دیارە سەرەتای ئەو شۆناسە نەتەوییە لە ڕێی دوو زمانی زۆر دیاری ئەدەبی کوردی واتە "خانی" و "حاجی قادر" بەخشراوەتە تاکی کورد. خانی و حاجی قادر درووستبوونی عەقڵیەتی تەنانەت ڕەخنەگرانەشیان دامەزراند بۆ ڕەخنە میرنشینەکانی ئەو کاتەی کورد .

دیارە یەکەم شت کە شۆناس درووست دەکات زمانە . واتە ناسنامەی قەومی نەتەوەیەک کە پێشتر لە سەری زۆر دواوین .

- شکاندنی چەقبەست (هنجار شکنی): یەکەم نیشانەکانی سنووور شکاندن لە کۆمەڵگای کوردیدا لە ئەدەبدا بەدی دەکرێت. ئەو شتە بابەتێکی زۆر گرینگی کولتووری لە خۆی دەگرێت بۆ ئەوەی هەمیشە پێبەندی بەهاکانی پێشوو نەبین و پێشەکەوتنی فکری و ژیریش ئەزموون بکەین. دیارە پێبەپێی بزاڤە کۆمەڵایەتیەکان ئەو گۆڕانە زۆرانەش دەبیندرێ، بەڵام ئەدەبی کوردی لە غیابی دەوڵەتدا و بەر لە شەڕی جیهانی دووهەم کە بە قۆناغی درووستبوونی حیزبە سیاسیەکانی دەناسین کە خۆیان پەرە پێدەری زۆر لایەنی ڕۆشنبیری بوون، ئەدەب وەک هاچەی لایەنی سیاسی، کۆمەڵایەتی و ... ، گەشەی ئەو بابەتانەی ڕاگرتووە. لە کۆمەڵگای کوردیدا، ئەدەبیات بە گشتی وەک ڕۆژنامەگەری سادە و شیعر و داستان نووسین بوو کە لایەنی ڕۆشنبیری بە هێز دەکرد. "گۆران" لە چەندین شیعری جیاوازدا وەک لە کۆمەڵەی پێنجەمی دیوانەکەیدا، دەربڕی ئەو پەیامەیە. شاعیرانێک وەک "ئەحمەد موختار"، لە شیعری « چیە ئەی گوڵ »دا پێشدەستخەری ئەو بابەتە عەقڵیانەیان کردووە. لە لایەکی ترەوە لە دوای شەڕ لە دیوانی شیعری شاعیرانێک وەک قانع، بێکەس، هەژار و هێمن لایەنی زیاتر سیاسی ئەو بابەتە ڕۆشنبیریانە دەبینین. وەک بۆ نموونە هەژار لە « بۆ کوردوستان »دا .
- یەکێک لە گرنگترین بابەتەکانی بەر باسی کۆمەڵناسان و ئەدیبان و فیلسووفان مۆدێرنیتە (modernity)یە. مۆدێرنیتە ئەو شەپۆلە بە هێزە بوو کە بە هۆی گەشەی ئابووری و سەرمایەداری هەموو کەرتەکانی تری ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و هونەری و ئەدەبی گرتەوە. ئەوەی سەیرە لە کوردستان مۆدێرنیتە لە ڕێی ئەدەبیاتەوە کەم کەم هاتە ناو ژیانی کۆمەڵایەتیەوە. ئەحمەد موختار یەکێک لە خولیاکانی

جادە و ڕێوبانە بۆ شار و گوندە دوورەکانی کوردستان. لە چوارچێوەی کۆمەڵگای بێ دەوڵەتی کوردیدا تەنیا شێوەیەک توانیبێتی مۆدێرن بگوازێتەوە بۆ ناو کۆمەڵگا و ئەوەی ببێتە گووتار، ئەدەبیات بووە. شاعیرانێک کە ئێمە بە پەرەپێدەری ئەو شتەیان دەناسین، کەسانێکن وەک ئەحمەد موختار، زێوەر، جەمیل سائیب، بێکەس (فایەق)، قانع و هێمن و چەند شاعیری تر کە بە گشتی دەتوانین بڵێین خەونەکانیان بۆ درووست کردنی کۆمەڵگایەکی ئازاد بە پشتیوانەی ناسیۆنالیزمی حاجی و خانییەوەیە.

هەرچەند لەم وتارەدا زیاتر لە ڕووی تیۆری و بە شێوەیەکی گشتی قسە لەو کاریگەریە کراوە کە ئەدەبیاتی کوردی لە سەر کۆمەڵگای کوردی جێیهێشتووە، بەڵام ئەم چەند نموونەی سەرەوە تەنیا ئاماژەیەکی کورتن بەو کاریگەریە. ئەو بەشەش زیاتر تا دەیەی پەنجای کۆچی و هەفتای زایینی بە خۆوە دەگرێت. دیارە لە شکاندنی نەریتە ناشیرینەکاندا شتی تریش بەدی دەکرێت، وەک گۆڕانی ڕوانین بۆ پێگەی ژن، دەوری منداڵ و زۆر مەبەستی کۆمەڵایەتی وەک ڕسوومی قێزەون، بۆ نموونە ژن بە ژنە[1] . بەڵام لە بەر ئەوەی ئێمە زیاتر باس لە سەرەتای پەنجا و هەفتاکان دەکەین باسە لێرەدا کۆتایی پێدێنین .

---

[1] کاتی خۆی گۆڤاری سروە گەورەترین کاری کرد لە پێشاندانی گرفتەکانی ژن بە ژن و ئەو سووکایەتیەی بە ژن دەکرا. (بڕوانن بۆ ژمارەکانی سەرەتای گۆڤاری سروە).

<u>**بەشی پێنجم- رەخنە**</u>

**دوا وتە :**

دیارە کە قسە لە کاریگەری دەکرێت، زیاتر مەبەستی نووسەری ئەم وتارە باس کردن  لە و گوزارانەیە کە دروستکەری مەنتقی خەیاڵی شیعرین. ئەو گوزارانەی دواتر وەک نموونەیەکی زمانیان لێدێت. وەک بۆ نموونە "حاجی قادر" لە شیعردا دروستکەری زمانێکە کە دواتر دێتە ناو نووسراوە ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاریەکان. واتە لە ڕێی هەست و دەرکی هەستیارانە کاریگەری دەخاتە سەر زمان. "دۆلۆز" پێیوایە هونەر بیچم دەری (کارلێکەری: affect) و توونی (ئیحساس: percept )ە، ئەو شتەی کە "ویتگنشتاین" بە ئاوەزمەندی هەست ناوی دێنێت. دۆلۆزیش لای وایە کاریگەری ئەدەبیات لە سەر زمانە. ئەدەب زمانێکی بێوارە لە قالبی زمانی ئاسایی و ڕۆژانە درووست دەکات، یا باشترە بگووترێ زمانێکی تەژی ئاسا و پڕ لە پاتەران کە لە ڕاستیدا دروستکەری کەشێکە کە تێیدا ئازادی تاک ڕوودەدات. "دۆلۆز" لە وتاری ئەدبیات و ژیاندا درووستبوونی ئەو زمانە بە نوێبوونەوەی بەردەوام لە ڕێی (بوون becoming)ەوە ئەزانێت. لێرەشەوەیە خەیاڵی مەنتقی شیعری بە تەواوی لە ئەدبیاتدا ڕەنگ ئەداتەوە (دلز، ٢٠٠٤). ڕەنگە خودی ئەو مەبەستە ئینتزاعیە بەڵگەیەکی پتەو بێت و پێویستی بە بەڵگە هێنانەوەی ئەدەبی نەبێت، بەڵام ئێمە دەبینین کاریگەری زمانی بۆ نموونە، زمانی "نالی" ئەوەیە توانیویەتی لە نەوعی خۆیدا بە قەدەر ئەو بارستاییە شیعریەی هەیەتی بە هەمان ڕادە زمانی بەرهەمهێنانی جوانناسانە و کاریگەریانەی هەبووبێت، کە نموونەی بەر چاوی ئەو کاریگەریە زمانییەی "نالی" لە سەر شیعری دوای خۆی وەک لای "سالم" و "کوردی" و "تاهیر بەگ" و "ناری" و چەند شاعیرێکی تر دەبینین. ئایا ئەو کاریگەریە ئیجابیە یا سەلبیە؟ دیارە ئەوەش بە جیا پێویستە قسەی لە سەر بکرێت و لێرەدا ناگوونجێت بەڵام هەر ئەوەندە باشە ئاماژەی پێبکرێت، ئەو زمانە تا ڕادەیەکی زۆر لە لایەک ئەدەبی ئێمەی بەستەوە بە زمانێکی باو لە هەموو دەربارەکانی عوسمانی و ئێرانی سەردەمی سەفەوی. گەورەترین لایەنی کاریگەری ئەو زمانە کە هەر لە زمانی "خانی" و "حاجی قادر"ەوە دروستبوو، دۆزینەوەی مانا نەبوو بە ڵکوو مەرجەع بوو. دۆزینەوەی هەموو ئەو سەنگانە بوو کە لە تەرازووی نەتەوەکانی-تریشدا دروستکەری کۆمەڵگا بوون. چەمکەکان و زاراوە زمانییەکان لەم ڕێیەوە هاتنە ناو کایە جۆراو جۆرەکانی ئەندیشە و تێڕامانەوە. ئەو زمانە هێشتا خودی ڕاستەقینەی زمانی ئەدەبی کوردی نەدۆزیبۆوە کە دوابەدوای ئەم هەوڵانە  شاعیرانێکی وەک (گۆران و هەژار و هێمن و سوارە و دواتریش شێرکۆ بێکەس) لە ناو بزوتنەوەی زمانی ڕوانگەدا  ـــ بە گەیاندنی زمان بۆ لوتکە ـــ توانیان لەم کەش و هەوایە زمانی کوردی بگۆڕن. لێرەدا ئیدی وەک چۆن باشلار دەڵێ ئەو زمانە نابەسترێتەوە بە سەردەمی پێش خۆی بەڵکە «نوێ، کۆنە لەدڵی خۆیدا لوول ئەدات»  (باشلار، ١٩٦٨ : ٦٣). هەر چەندە وا بەم شێوە باس لە شاعیرانی کورد کردن، توێخێکی ناسک لە لاپەڕەی شعووری ئەوان هەڵدانەوەیە و زۆر لایەنی جوانی لێرەدا دەفەوتێ . لێرەشدا وەک پێشتر ئاماژەم پێکرد مەبەستی باسەکە کاریگەری ئەدەبە نەک جوانی.

## سەرچاوەکان


١. آتش برآب، حمید رضا (١٣٨٧) **شعر روس**، تهران، نشر نی.

٢. احمدی، بابک (١٣٨٣) **سارتر که می نوشت**، تهران، نشر مرکز.

٣. ایگلتون، تری (١٣٨٠) **نظریه ادبی**، ترجمه عباس مخبر، تهران، نشر مرکز، چاپ سوم.

۴. بشیریه، حسین (١٣٨۶) **جامعه شناسی سیاسی**، تهران، نشر نی.

۵. بێکەس ، شێرکۆ (٢٠٠٠) **دەربەندی پەپوولە**، سلێمانی، چاپەمەنی ئاسا.

۶. بیتس، دانیل و پلاگ، فرد (١٣٧۵) **مردم‌شناسی فرهنگی**، ترجمه محسن ثلاثی، تهران، نشر علمی.

٧. پوینده، محمّد جعفر (١٣٧٧) **درآمدی بر جامعه شناسی ادبیات**، مجموعه مقاله / لوسین گلدمن ... [ و دیگران ]؛ ترجمه و گرداوری، تهران، نقش جهان.

٨. دولوز، ژیل، **ادبیات و زندگی**، ترجمه مهدی سلیمی، مجله الکترونیکی زغال. http://zoghalmag.com

٩. زرین کووب، عبدالحسین (١٣٧۴) **آشنایی با نقد ادبی**، تهران.

١٠. سارتر، ژان پل (١٣٨٨) **ادبیات چیست؟** ترجمه ابوالحسن‌نجفی و مصطفی‌رحیمی، تهران، نشرنیلوفر، چاپ هشتم .

١١. سجادی، علاءالدین (١٣٦١) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، سردشت، چاپخانه معارف.

١٢. شکسپیر، ویلیام (١٣٧٣) **هملت**، ترجمه مسعود فرزاد، تهران، انتشارات علمی فرهنگی.

١٣. عضدانلو، حمید (١٣٨۴) **آشنایی با مفاهیم اساسی جامعه شناسی**، تهران، نشر نی.

١۴. کاپلستون، فریدریک چارلز (١٣٨۶) **تاریخ فلسفه** / جلد یکم، ترجمه سید جلال الدین مینوی، تهران، انتشارات علمی فرهنگی، چاپ ششم.

١٥. کوئن، بروس (١٣٧۵) **درآمدی بر جامعه شناسی**، ترجمه محسن ثلاثی، تهران، نشر توتیا.

١٦. گۆران، عەبدوڵا (١٣٨٢) **دیوانی گۆران**، تهران ، پانیز.

١٧. گیدنز، آنتونی (١٣٨۶) **جامعه شناسی**، ترجمه حسن چاوشیان، تهران، نشر نی.

١٨. مارکوزه، هربرت (١٣٨٧) **بعد زیبا شناسی هنر**، ترجمه داریوش مهرجویی، تهران، انتشارات هرمس.

١٩. مجتهدی، کریم (١٣٧٣) **نگاهی به‌فلسفه‌معاصر جهان‌غرب (مجموعه مقاله)**، تهران، نشر امیرکبیر .

٢٠. محەمەدی، هادی (٢٠٠٦) **فەلسەفە، مێتۆد کۆمەڵناسی ئەدەبی**، (کۆمەڵە وتار) وەرگێڕانی هادی محەمەدی، سلێمانی، چاپەمەنی بینا.

٢١. مک کوئیلان (١٣٨۴) **مارتین، پل دومان**، ترجمۀی پیام یزدانجو، تهران، مرکز.

٢٢. نیچه، فریدریش (١٣٨۵) **زایش تراژدی از روح موسیقی**، ترجمه رویا منجم، آبادان، نشر پرسش.

٢٣. وریا قانع، مەریوان (٢٠٠٤) **بەختەوەری‌وبێدەنگی** /چاوپێکەوتن، سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٢٤. هەڵمەت، لەتیف (٢٠٠٣) **شیعر _ خەنافس تەنوورەی مینیجۆب** (کۆمەڵە وتار) ، سلێمانی.

25. Gaston Bachelard.(1968)*The Philosophy of No: A Philosophy of the New Scientific Mind, Trans*, G. C. Wateston. New York, Orion Press.

26. Giddens Anthony (1995). *Modernity and self Identity*, **(self and society in the late modern Age**, Stanford university Press.

# کاریگەری مەی و هەرمانۆ ساقی لاو "مەولەوی"یەوە

کوورش ئەمینینودشە

**کورتە:**

بە بۆنەو برێو هۆرکارێ تایبەتییێ مەحاڵوو هۆرامانی هەرمانۆ گردوو ئەدیبا و شاعێراش بە کەمێو تەرسیەوە، متاومێنە جە یەرێ بەشێ: کێبیەی وەشکەرای، زوان و ئەدەبیات خاڵبەندیشا کەرمێ. جە بارەو کاروان‌کۆژە شۆڵەدارەکەو ئاسمانوو ئەدەبوو کۆردی یانێو مەولەوی باڵاخانەو چەمی و شێعرەکاشەرە بە وەرچەمێ جیاوازێ، لاوینێ جۆراوجۆرێ دریاینێ. بەڵام ئێمە گەرەکمانە تریشکێوە تازێ کەرمێرە و جە دامگایوی تازەنە قەرەوڵش پەی گێرمێ و تەماشاش کەرمێ. «ئوستاد مۆجتەبا مینۆوی» جە کتێبوو «نەورۆزنامە»ینە جە بارەو «خەیامی و شێعرەکاشەرە» واتەبێش: یاوگەو مەنزوورو «خەییامی» جە شەراوی حەر ئا شەراوە سوورەنە کە مەستی مارۆ و واتەی شەراوی عێرفانی و ڕۆحانی هەڵێوی گەورەن. منیچ حەر سەروو ئا پەیلوایەرە و بە خاس وشکنای و ژیوایوی فرە چنی هۆنییەکێ ئا کەڵە پیایە؛ ماچوونە: «مامۆسا مەولەوی» چا یاگانە کە باسوو «ساقی و مەی و بادە و جام»یش کەردەن، هەدەفش حەر ئا واتیلێنێ کە ئێمەیچ پا مانا بە کارشا بەرمێ و لەیەکدایشا بە مانای عێرفانی خەتایوێ گەورێنە و ئاکاموو ئی کاریە مامۆسا مەولەوی وزۆنە تەنگەلانێوی فرە تەسک و نالەبار و شێعرەکاش تا ئاستێوی فرە وار مارۆرە واری. پاسنە کە دیارا مەولەوی چنی مووسیقیچ ئاشنا بیەن و خاسش ئەژناسان. چوونکەتیم حەر وەختێو گەرەکش بیەبۆ، بیێۆنە سەرکەلوو وەشی و جە شادی بۆ کەیل و حەر پاسنە جە دنیاو تەوەنین و سەرسەختوو ئاوەزی بایۆ و بلۆنە ئەو دنیاو خەیاڵی و زەوقی، هاوارێو کەرۆ و چرۆ ئەو دەروێشی؛ دەفەکێت بارە؛ یام ماچۆ مۆغنی گۆرانییێ واچە.

**دەسەوشە سەرەکییەکێ:** مەولەوی، ساق، مەی، جام

**وەرشیپان**

شکەش نیەنە چنە هەرمانۆ گردوو ئەدیبا و شاعێرا بە تایبەت شاعێرێ مەحاڵوو هەورامانی (بە بۆنەو بڕێو هۆرکارێ تایبەتیێ ئا وڵاتیە) بە کەمێو تەرسیەوە، متاومێنە جە یەرێ بەشێ واریەنە خاڵبەندیشا کەرمێ:

١ ــ کێبیەی وەشکەردەی (هۆڤیەتسازی)

٢ - زوان

٣ - ئەدەبیات

جە بەشوو هۆڤیەتسازیەنە پێسنە حەڵقێوێ پەیوەندیدارێ بەینوو ویەراو ئیسەو هۆرامانیەنە و حەر پاسنە جە تانێوێ سەرتەرەوە پێسنە بیەی و کیانێوی هامبەش بە هەرمانکەرای چنی شێعرێ و ئارای برێو جە دەرادڵەکا، داڵغەکا، ئۆستورەکا، ویەراهامبەشەکا و حەز و ئاواتە ناماکێ کارشا کەردەن و حەر ئینە لاو برێو فاکتێتەرێنە بیەن بە هۆرکارو وەشبیەی هۆڤیەتێوی هامبەشی.

**زوان:** زوان پێسنە بنەڕەتیتەرین فاکتوو فەرهەنگ و نەتەوەی، ئێندە هەمیەتدار و یاگەگیرا کە بیەی ئێنسانی بە بێزوان چێوێوی غەریب مرمانۆنە، بە جۆرێو کە متاومێ ئێنسانی حەیوانی قسەکەر واچمێنە و جە لایەنێوتەرەوە هۆرگێرتەی ئی زوانیە ئەرکوو سەرشانو گرد قسەکەرێو ئا زوانیەنە؛ بەڵام چی بەینەنە کاریگەری شاعێرا و ئەدیبا جە فرەو کەسا سەرتەرا و ئەرکوو ئادیشا چی بارەوە ئێندە فرەن کە بڕێو وەخت مانایی زوانی و گەشەدای پادی بە ئەرک و کار و هەرمانۆ ئادیشا لکە مدریۆنە (پەیوەندیێوی وەراوەر و دوەلایەنە). زوانی شێعری "مامۆسا مەولەوی" حەر چن جە وەرچەموو یەکەمیەنە ئینا چێروو دەسەڵاتوو زوانی فارسی و عەرەبییەنە بەڵام بە تۆهۆردای، وشکنای و شییەوەکەردەی و ئەنەلوای دلێ تۆتۆ شێعرەکا؛ ئا وەختە بەرگنۆ کە چگەوهەرێو ئینا دلێ کانوو ئی دیوانیەنە و خەزێنەو زوانیش چەندە پارێزنان. پێسنەو "حافێزی" و هۆنیە وەشەکێش. بەڵام فاکتێوی هەمیەتدار و یاگە سەرەنج ئینە کە چەنی کەسێو تاوانش بە زوانێو کە زوانی ئەدایی وێش نەبیەن پا گردوو ڕێکوپێکی و زەریفی و وەشانەیە شێعرێ بنیۆرەو پەلوپۆشا دۆ. ئا زوانە کە جە لاو "مەولەوی"یەوە ئامان سەروو قاقەزی حەر ئا زوانەنە کە جە لاو خانای قۆبادی، بێسارانی، سەیدی هۆرامی، ئەحمەد بەگوو کۆماسی، ڕەنجووری و ... خزمەتش پنە کریان و زوانوو شێعر و ئەدەبوو کۆردستانی پەی فرە سەردەمانێوی بیەن. دەوڵەمەندکەردەی زوانی هۆرامی بە تایبەتی و زوانی کوردی بەگردی بە هەرمانکەردەی پا گردوو باقەکەلیما و کەلیمە تازا کە جە زوانێوتەرەنە ئاردێنێشەنە دلێ زوانی وەرباسی و بە ماڕایشا، فاڕووگۆڕشا و تێکەڵ کەردەیشا چنی کەلیمە وێمانا بوومیێش کەردێنێوە و ئێندە ڕێکوپێک و نەرمونیان دلێ تانوپۆ شێعرەکاشەنە نیاینێشەرە کە ئەجیۆت حەر ئەوەڵەوە هۆرامیێ بیێنێ. حەر چن زوانی شێعری "مەولەوی" زوانێوی ئەدەبی و بە هێز و قۆرەتا؛ بەڵام ئێندە سادە و نەرم و ڕەوانیچا کە خەڵکوو دلێ کۆمەڵگایچ خاس میاواشەنە و چنەش دوور مەگناوە.

**ئەدەبیات:** ئەگەر ئەدەبیاتی بە دوێ بەشێ: دەمواچ (واتەئی) و نویستەئی دەسەبەندی کەرمێنە؛ ئەدەبیاتی واتەئی و سەرزوانی بە بۆنەو چوارچۆ (ساختار)، تایبەتیەکێ و حەر پاسنە هێرشوو سەنعەت و تەکنۆلۆژی جە

گردو بوارەکاشەنە، فرەتەر ئینا وەردەمو هۆروشموو جە بەینلوایەنە. بەڵام حەر پاسنە کە دیارا ئەدەبیاتی نویستەئی ماندگاریش بە بۆنەو بەڵگە و قەباڵەبیەیش فرەتەرا و حەر نەتەوێو ئی بەشە جە ئەدەبیاتیش فرەتەر و بە هێزتەر بۆنە، جە وەرچەمی فەرهەنگیەنە سامانێوە فرەتەرەش هەنە و وەڵکەوتەتەرا. حەر پاسنە کە گردێما مزانمێ فرەتەروو ئەدەبیاتی نویساری ئێمە جە شێعرێ کلاسیکێ وەش کریان و بنەڕەتی عەسڵێش ئینا سەرروو ئی بەشە جە ئەدەبیات‌یەوە و دیوانوو "مامۆسا مەولەوی" یۆ جە سەرکەلە بەرزەکاشا. بە دڵنیایەوە متاومێ واچمێنە کە بیەی مەولەوی پێسنە ئەدیبێوی پایەبەرزی، کەلەبەرێوی قووڵ و وەرهەڕش جە دنیاو ئەدەبوو هۆرامیەنە پەڕ کەردەنەوە و کەردەنش سەرکەل. کاریگەری شێعرێ مەولەوی سەروو ئەدەبیاتوو دلێ خەڵکی یانێو فوولکلۆر بە جۆرێو بیەن کە مەولەوی یەکەمین شاعێرێوا کە فرەو شێعرەکاش بە تەک بەیتی لاو گۆرانیەواچەکا و سیاوچەمانەواچەکاوە واچیەینێ و تارەلاو ئانەیە جارجاریچ سەر و بنوو شێعرەکاش بڕیان یام کەموزیاد کریان و شێعرێوە تازێش چنە وەش کریاینە کە ئینە وێش تەنیا وەشەسیاوی شاعێری و تازە و زیندە بیەیی تابلۆ شێعرەکاش میاونۆنە .

**شیپانە**

جە بارەو کاروانکۆژە شۆڵەدارەکەو ئاسمانوو ئەدەبوو کۆردی یانێو مەولەوی باڵاخانەو چەمی و شێعرەکاشەرە بە وەرچەمێ جیاوازێ، ڕاوینێ جۆراوجۆرێ دریاینێ. بەڵام ئێمە گەرەکمانە تریشکێوە تازێ کەرمێرە و جە دامگایوی تازەنە قەرەوڵش گێرمێ و تەماشاش کەرمێ. چا وەرچەمەنە کە کەمتەر کەسێو تا ئیسە دیان پەیش و ڕاوینوو وێما؛ نەک کەلەبەرێو وشک و تەسکەنە کە بە پانایی و بە وەرهەڕیی چەمێ شابازوو بەرزا بەر وزمێ و واچمێ و دنیاو عێرفانیش دلێ جامووی مەینە و دەسوو ساقیەوە تەماشا کەرمێ. مەولەوی شێعرێش بە دڵ و بەهەست و خەیاڵ واتێنێ، نەک بە ویر و ئاوەز! ئینە وێش بیەن بە هۆرکاروو ئانەیە کە پەپوولەو خەیاڵیش هەر یاگێوە کە دڵش گەرەکش بیەبۆ نیشتەبۆوە و حەر جۆرێو کە گەرەکش بیە بۆ باڵێش فڕنای با. بە تایبەت چا یاگانە کە تاریفوو کەش و کۆی و وەسفوو تەبێعەتی و هەرد و کۆساریش کەردەن نەخشێوی فرە ڕەنگین و ڕێکوپێکش خۆلقنان کە گۆلالەتەرین و دوورتەرین سووچ و پەناوپێچتەرین دیمەن وەروو چەماشەنە گوم نەبیەن؛ بە جۆرێو کە متاومێ واچمێنە، ئەگەر مەولەوی نگارکێش بیایا بێ‌شک نەققاشێو تەمام کارامە و هۆروەستیچ بەر ئەی. خەیاڵ و ئەنەلوای دلێ دنیاو خەیاڵ گاهەز یەکەمین تەوەن بنەڕەتوو بیناو شێعرێ بۆنە، بەڵام برێو وردەکاریێ و زۆرانی و پەنجەماڕانی چنی کەلیما ئینای دلێ تان و پۆ شێعرێنە و مشیۆم بانێ کە بێ ئادیشا هۆنیێوە نیەنە و هۆنیارێویچ نیا.

بەڵام لایەنوو ئێژانەوکێشانەکەردەی ئێمە جە شێعرێ مەولەوی ساقی و مەی و ... پەیلواو نویسکاروو ئی وتارەی چا بارەوە. پەی شیەوەکەردەی ئی بەشە جە باسەکەی ئیشارێو کەرمێنە بە باسێیوو ئوستاد مۆجتەبا مینۆوی جە کتێبوو «نەورۆزنامە»ینە جەبارەو خەییامی و شێعرەکاشەرە کە واتەبێش: یاوگە و مەنزوورو خەییامی جە شەراوی حەر ئا شەراوە سوورەنە کە مەستی مارۆنە و واتەی شەراوی عێرفانی و ڕۆحانی هەڵێوی گەورەن. منیچ حەر سەرروو ئا پەیلوایەرە ماچوونە: مامۆسا مەولەوی چا یاگانە کە باسوو ساقی و مەی

و بادە و جامیش کەدەن، هەدەفش حەر ئا واتیلێنێ کە ئێمەیچ پا مانا بە کارشا بەرمێ و لەیەکدایشا بە مانای عێرفانی خەتایوێ گەورێنە و ئاکامووی کاریە مامۆسا مەولەوی وزۆنە تەنگەلانێوی فرە تەسک و نالەبار و هۆنیەکاش تا ئاستێوی فرە وار، مارۆرە واری.

وەرچەموو ئەو شاعێرەکا

بە دڵنیایەوە چا یاگانە کە یاوگە و هەدەفوو شاعێری جە ساقی، مەی، بادە و جامی، مانایوە عێرفانیە بیێنە، ڕێکوڕاس ئیشارە کریان و حیچ پەنا و پێچێوش چنە دیاری نەدان. مەسەڵەن مەلا پەرێشان (١٣٥٦- ١٤٢١م دینەوەر، کرماشان) جە ساقی نامەکەو وێشەنە پێسنەش واتەن:

ساقییا وەرە جامێ پەی مەستی　　　سوودم مەستییەن زیان ژ هەستی

جامێ کە مەغزم باوەرۆ وە جۆش　　　دۆنیا و مافیها بکەم فەرامۆش...

فیدات بام ساقی تەر زوانم کەی　　　من دەردەدارم دەوای گیانم کەی

ژ جام تەوحید یەکجار مەستم کەی　　　زەرێ نابوودم بەڵکم هەستم کەی

تا کە بنۆشم وە یاد کەسێ　　　کە هەستی مەرگەن بێ ئەو نەفەسێ

(خەزنەدار، ٢٠٠٢: ٢١- ٢٢ )

یام ڕەنجووری (١٧٥٠–١٨٠٩م) چا یاگێنە کە باسوو خۆدای و حەقێقەتیش کەردەن بێ پەنا و پێچ پێسنەشە واتەن :

ڕاگەی حەقێقەت بگیرەنە دەست　　　بشۆ نە مەیدان بێ پیاڵەی مەست (ڕەنجووری :١٤١ )

مامۆسا مەولەویچ یاگێوەنە کە گەرەکش بیەبۆنە جە عێرفانی و خۆدای باس کەرۆنە و واچۆ، چاچەنە بێ پەردە و بە ئەوپەڕوو شانازیەوە قسێش کەراێنێ و مەتاوی قسەکاش بە جۆرێوتەر هۆرگێڵنی و لەیەکشا دەیوە کە مانایوتەرەشا چنە دیاری کریۆنە؛ مەسەڵەن جە یاگێوەنە پەی ئانەیە ڕاسی واتە و درۆسی قسێش سەلەمنۆ، پێسنە یوەمین و ئاخرین هەناسەیش تەنیا بە زاتوو نەزا و نەمەرگوو خۆدای قەسەم موەرۆنە :

ڕاستش هەر ئێدەن ئێزهارم کەردەن　　　قەسەم بەو کەسە نەزا و نەمەرگەن

(مەولەوی، ١٣٧٨: ٣٥١ )

یام یاگێوەنە پەی کەرەم و بەخشای و لۆتفوو خۆدای ئەوپەڕێو مەوینۆنە و پێسنە مارۆ زوان:

عیرفانەکەت کۆن، فامت کۆ شیەن　　　ئای پەی جێلوەی دۆس نیهایەت نییەن

(مەولەوی: ٢٠٩ )

یام چاگەنە کە وێش مزانۆنە بێ ئەمری زاتوو پەروەردگاریش کەردەن و ویروو قەبر و قیامەتی کەرۆوە و جە ئاکامووی کاری تەرسیش هەنە بێپەردە و بێڕوو و بە شانازیەوە لاڵێوە خۆداڵەی و داواو بەخشای کەرۆنە و گەرەکشا کە خۆدا جە هەڵە و سەرپێچیش چەمپۆشی کەرۆ و بە ڕەحم و کەرەموو وێش جە خەتایش ویەرۆ و عەفوەش کەرۆنە:

من وێم مزانوو بێ ئەمریم کەردەن/ ئێتاعەی فەرمان عەبدیم نەبەردەن/ بەلام مشیۆ تۆ وە فەزڵەکەی وێت/

کەردەی من نەبۆ بەهانە پەرێت/ جە بەحر کەرەم بێ بەشم مەکەر/ شەڕ نەفسانی جە ڕاگەم لابەر (م: ٦١).

حەر چی وەرچەمەنە جە بارەو ساقیچەوە حەر پاسنە کە مامۆسا "مەلا عەبدلکەریمی مۆدەڕێس"چ جە شییەوەکەردەی و لەیەکدای دیوانەکەینە واتەنش تەنیا جە دوێ یەرێ یاگێنە کە وارەنە ئیشارە کریۆ، یاوگە و چەملواو مامۆسا مەولەوی جە ساقی، پەروەردگار و زاتوو خۆدای بیەن:

ئێمە گشت فانی، هەر ئەوەن باقی نازوون وە بازووی پا نەیرووی ساقی

خەلاسیش دا پێت، وە یەک پەیمانە ئازاد بیت جە بەند بەستەی پەیمانە (م: ٥٢)

کە ئی بەستە شێعرێ پەی ئەوەلاونای ئەوڕەحمانوو حاجی مەحموودی یاروەیسی واچیەینە و هەدەف جە ساقی زاتوو ئەحەدی و پەیمانەیچ پیاڵەو شەرابوو مەرگی بیەن کە بیەن بە هۆرکار پەی مەرگوو کابرای. یام:

بازارەن، وادەی مامەڵەن ساقی هەی بگرە فانی، وەی بدەر باقی (م: ٣٢١)

کە ئەچیگەنە هاوار کەرۆنە و چڕای چڕۆ ئەو ساقی (خۆدا) و لاڵیۆشەوە ونە کە چی مامەڵەنە و دلێ ئی بازاروو دنیاینە، ژیوای فانی و نەمانوو ئی دنیایە گێرە چنەما و ژیوای هەمیشەیی ئەو دنیایما دە پنە. تا وا یاگێ ڕێکوپێکی ئێژانە و کێشانەکەیما ئیجازەش دابۆ؛ تەنیا چی دوە یاگێنە بیەنە کە یاوگەو هەدەف جە ساقی خۆدا و هاوار ئەو خۆدای بیەن.

بەڵام چا یاگانە کە داواو شەراویشا کەردەن و یاوگەشا تەنیا شەراوی سووری هەنگووری بیەن بێپەنا و پێچ واتەنشا و نەبەردەنشانە دلێ تۆ تۆ پەردەی و نەشارانشاوە. مەسەڵەن "ئەحمەدی خانی" (١٦٥٠– ١٧٠٧م) چانە کە لاوە کەرۆنە ساقی و داواو شەراوی جە ساقی کەرۆ تەنیا هەدەفش سەرمەستی و وەشیا:

ساقی تۆ ژ بۆ خۆدێ کەرەم کە یەک جۆرعە مەیێ د جامێ جەم کە

دا جامی ب مەی جیهان نۆمابت هەرچی مە ئێرادەیە خویا بت (ل ٣٤٣)

یام خانای قۆبادی (١٧٠٤ – ١٧٧٨م) ئاچانە کە باسوو مەی و ساقیش کەردەن، شێعرەکاشەنە دیارا کە یاوگەش حەر ئا شەراوە سوورە بیەنە کە مەستی مارۆ و سەروەش کەرۆنە. مەسەڵەن جە هۆنییۆەنە شۆنۆ ئانەیەرە جە ڕاوێ و شکاری دەس کێشانێ؛ پێسنە ماچۆنە:

فەرماش تا ساقی، سادەی سیم ئەندام لەبرێز کەرد قەدەح، جە بادەی گۆڵ فام

نۆشاشان ڕەندان زۆڵف بۆ عەنبەرین پەیاپەی پەیوەست بە شادی شیرین (م: ٩٤)

مامۆسا بێسارانیچ جە دیوانەکەشەنە فرەو یاگانە و بە تایبەت جە بەشوو «ساقی»ەنە بە بۆنێ جیاوازێوە هاوارش ئەو ساقی بەردەن:

ساقی کەی بۆ کەی، ساقی کەی بۆ کەی بەشق دیدەی وێت، ساکەی مەبۆ کەی

جەرگم بی کەباب، ڕەنگم بی وە مەی ئێنتێزارەنان، مەی باوەری مەی

مەی یاقووتی ڕەنگ، دۆڕ جە ستارە ساقی، شەربەتێ، گۆاو ئۆفتادە (م: ٣٢٣)

بەڵام خۆ چیگەنە دیارا کە ئی مەیە حەر ئا شەراوە یاقووتی ڕەنگەنە کە ئیشارە کریان و ئا کەسیچە کە داواو ئی مەیشە کەردەن چەنی مەی ئاشنا بیەن و مەیش ئەژناسان.

ساقی مەی داریم، ساقی مەی داریم ئارەزووی نۆشای جامێ مەی داریم
هەر شەو تا سەحەر ناڵەی نەی داریم پەی نۆشای جامێ، ڕەنگ چوون بەی داریم (م:٣٢٥).

وە حەر پاسنە کە وارەنە ماچیۆ ڕەنگۆ مەی و کاریگەریش سەروو خاسی و خرابی مەیەوە، حەر ئا کەسە مزانۆنەش کە مەیش واردەبۆنە و بزانۆنە ڕەنگۆ مەی وەختێو کە پێسنە گۆراڵە سووری بۆنە یام هۆرگێڵەیبۆوە ڕەنگۆ وەرنیشتی و پێسنە شەفەقی سوور برمانۆنە بادەش چشەرابێوا و کۆگەت بەرۆنە و چێشت سەر مارۆ:

ساقی ناڵەی نەی، ساقی ناڵەی نەی ناڵەم زگارەن، وێنەی ناڵەی نەی
جەرگم کەبابەن، ڕەنگ زایف چوون بەی پەی چێش؟ پەی نۆشای جۆرعەی جام مەی
مەی گۆڵ خۆنچە ڕەنگ، حەمرا چوون شەفەق ساقی، بێ مەی، مەست، جەمین چا عەرەق
(م:٣٢٧)

## مەولەوی و ڕەمەزان و مەی:

بە لەیەکدای و شیەوەکەردەی ئی دوە وەرچەمە جە ژیوای "مامۆسا مەولەوی"ەنە سەروو شێعرەکاشەرە، بە ئی باوەڕیە میاومێ کە ئا زاتە بەرزە پێسنە مێزەرە بە سەرێوی وشک و ویرتەسک و چاکدەرەدامانێوی لارەبار و ئاوەز تەلبەنکریا نەبیەن؛ تارە لاو ئانەیە کە بە جۆرێو متاومێ واچمێنە مەعدوومو "عەنبەر خاتوونێ" دەورانوو وێشەنە ئەگەر کە جە گردوو خەڵکوو دەورووبەریش ژیرتەر نەبیەبۆ، بێ حیچ گاهەزێو یۆ جە سینە چاکەکا و نەتەرسەکا بیەن. ئاچانیشانا، کە بێجگە چا دێڕە شێعرانە کە ساقی حەر ساقیا و بە حیچ جۆرێوتەر لەیەک مەدریۆ و مانا مەکریۆ؛ جە دوێ یەرێ ملەگایچەنە پەی باس جە حەراڵی و حەرامی مەی قسێش کەردێنێ و پاسنە نیانشەرە و باروومش پەی کێشان کە حەرام بیەکەیش بە گیان و دڵ ئەسانش و قەبووڵش کەردەن:

مەر جە کەسرەت لەوحش بۆ سادە مەنسووخ نەزانۆ حەڵاڵی بادە
زاهێد مایەی هۆش هیچ نەمانۆ پێش پەشێو بۆ تەقواش، چوون مێزەرەی وێش
من نەوون وە تەنگ نەفامییەوە وێم بدەون وە دەس بەد نامییەوە (م: ٤٧٠)

جە باسوو ڕەمەزانیچەنە تانێوەتەر ملۆ سەر و ئانیشا کە ڕۆچێ گێرا و ئانێ کە بادە موەرا گێرۆ پێوەرە و لاو هەنترینیەنە ئێژانە و کێشانەشا کەرۆنە و هۆرسەنگناکەش چانە دیاری مدۆ کە وێش سەر بە کام پۆلی مزانۆنە و وەشش کام گرۆی مەی:

مەرحەبای لیباس تاعەت پۆشانەن ئەلوەدای کاس کاس بادە نۆشانەن
ساقی سا سەد جار وە نازت نازوو هۆردەروە گۆڵبانگ سەدای «وامتازوو» (م: ٣٩٤)

یام دیسان بە ئامای مانگۆ ڕەمەزانی چانە کە ئێتر بە بۆنەو حەر هۆرکارێویەوە کە بیەن، بە ڕواڵەت نەلان پەی لاو مەی؛ پاسنەش دان ئەو بەر کە جە ئی بابەتیە فرە خەمگین و پەشێوا و ڕێکوڕاس و بێ تۆکڵ و پەردە واتەنش کە مەی حەر ئا شەرابە سوورە هەنگووریەنە و پێسنە خەییامی واتەن مەیخانەیچ حەر ئا یاگێنە کە دڵتەڕێ و لچ بە خوێ و ناسک و نازارێ ئینای چاگەنە و وەشی کەرانێ؛ بەڵام چی مانگەنە سەفاو مەیخانەی کەمە بیێنەوە مات و دڵگیرەنە و شەوقوو قەدیمیش نەمەنەن جە لاش:

مەی نە خوم چوون من نە خەم ئەسیرەن　　　مەیخانە سەفاش خەیلێ دڵگیرەن
لوولەی تەراوێح وەش وەش مدۆ دەنگ　　　بێ ئاهەنگەن تار تەموورەی ئاهەنگ (م: ٣٩٤)

جە ئاخریچەوە ئاخرین گرۆڵێۆ فیشەک لۆخۆ تۆڵەیش تەقنۆنە و بێ پەروا و نەتەرس پەی ئاردەی جەژنێ و ئازاد بیەی بادەی پێسنە ماچۆنە:

هەی هێلال، هەی عەید خێزۆ جە یاران　　　وە ڕەغم گرۆی پەرهیزگاران
شادیدەر وە دڵ لای مەی خواراندا　　　خەفەت دەر وە جەرگ ڕۆزە داراندا (م:٣٩٥)

دیارا چی گۆشە چەمەنە پێسنە خەییامی گەورەی، تارەلاو ئانەیە تێژتەر و بە جەرگتەر ویرش کەردەنەوە و ویر و ئاوەزوو وێش بە دەنگی بەرزتەر و گڵوەزێ ئایرین و گادارتەرە یاونانش خەڵکی و جەماوەرەنە بێ تەرس واتەنش . چوونکەم خەییامیچ بە ئەژنەویەی ئامای ڕەمەزانی پێسنە جاڕش دان کە جە ئاخروو مانگۆ شابانیەوە ئێندە مەی موەروو کە دلێ مانگۆ ڕەمەزانیەنە تا جەژنە بەیوە مەست و کەلەلا و بێ هۆش و فام بوو:

مانگی ڕەمەزان نزیکە، پێمان ئێژن　　　مەی هەرچی هەیە بیرێژن و مەیچێژن
من هێندە دەخۆمەوە لە کلکەی شابان　　　مەست و کەلەلا بۆی دەکەوم تا جێژن

(خەییام، ١٣٧٠: ٣١)

ئێژاو واتەیا کە چیگەنە لایوتەر کەرمێوە لاو ویر و ئاوەزوو خەییامی و نزیکی ئەندیشەو ئا زاتە بەرزەیە چنی وەرچەم و پەیلواو مامۆسا مەولەوی سەروو ئێژانە و کێشانەکەردەی چن دانە چوارینێ خەییامی چنی دلێگەروو چەن دێڕە شێعرێ جە هۆردەستوو بالاخانەو چەمی؛ ئادیچ تەنیا سەروو چن دێڕە هۆنییێ و ئیشارێوی گوڵالە پەی هەر کام چادیشا و ئەرکوو لەیەکدای فرەتەریشا وزمێ سەرشانوو وانیارە ئازیزەکا و بە ئاواتوو ئانەیە کە جە ئایەندێوی نزیکەنە شیەوەکەردێوی فرەتەر چی بابەتەنە وزمێ وەردەسوو وانیارە سەرەنجدەرە کاما:

خەییام:

پرژاندی هەور لە دەشت و دەر بارانێ　　　بێ مەی، بێ دەمێ تامی ژیان نازانێ
وا ئێمە لە سەیری سەوزەزارین داخۆ　　　سەوزەی گڵی ئێمە، کێ بکا سەیرانێ ؟

(خەییام: ٣٨)

مەولەوی:

سەوزەی خاک پاک، یاران هامفەرد　　　فرەمان وە فەرشێ بەزم وێمان کەرد
کەو سەوزەی ئێمەیچ، نە کام هەردێ بۆ ؟　　　وە فەرش مەجلێس کام هام فەردێ بۆ ؟

(م: ٤٣٢)

یام حەر پی دلێگەرەوە یاگێوەتەرەنە، پێسنەش فەرماوان:

کەرد وە فەرش پای گۆزەرگای یاران　　　بەرد پەی پای هەردان، سارا و کۆساران (م:٥٣٢)

یاوگەو ئی وەردەمانە کۆتایە واتەی ئی قسێ بێ کە چا یاگێنە هەدەفوو ئی وتاریەنە و باس جە ساقی و جام

و بادەی کریان، حەر ئا دلێگەر و مەفهوومەنە کە خەڵکی و جەماوەر جە واتە و ئەژنیەی لاوجانەشانە پا هەدەفە و بە نامۆ ساقی و جام نامێ بەرانێ کارشا پنە کەرا.

**یاگۆ ئەرەمتەی، چوارچۆ باسەکەی**

پەی سەلەمنای شیرەو باسەکەی و پەی ئاشنا بیەی وانیارە گەشاوەزەکاما چنی دلێگەروو دیوانەکەو مامۆسا مەولەوی وەڵێ دەس‌پنەکەراەی بە عەسڵوو وتارەکەی پێویستش مزانمێ کە چیگەنە فرکانسوو ئامای برێو چا کەلیما کە فرەتەر یاوگەو باسوو ئێمەنە پی ڕواڵەتوو واریە نیشانە دەیمێ:

فرکانسوو ئامای برێو جە واچێ دلێ دیوانەکەی

| واچێ | فرکانس |
|---|---|
| جام | ٥١ |
| ساقی | ٤٧ |
| مەی | ٤٧ |
| بادە | ٣٢ |
| نەی | ١٨ |
| نەیچی | ١٥ |
| دەف | ٢٠ |
| مۆغەننی | ٨ |
| مۆترێب | ٩ |
| دورد | ٤ |

حەر پاسنە کە دیارا مامۆسا مەولەوی فرەتەر جە گردوو شاعێرەکاما – لانی کەمەوە؛ ئانێشا ئێمە دەقشا مژناسمێ و وانتێنێماوە – چی کەلیما، کەڵکش گێرتەن و هەرمانەش پنە کەردێنێ و تا کەلیمێوە لاو کەسێویەوە وەشەسیاوە و سەرسوودە نەبۆ ئاندە بەکار نمەی و گرد یاگێوەنە باڵا مەرمانۆ و هاوار مەکەرۆ.

**دلێگروو باسی:**

پاسنە کە دیارا خۆدا لاو مەولەویەوە حەر وەشی و زەریفی و بەزەیی و جوانی و گەورەیی و چنەویەردەیی بیەن و گرد یاگێوەنە کە باسوو خۆدای بیەن چی کەلیما کەڵک گیریان و ئەگەریچ پاسنە نەبیەبۆنە بە جۆرێو ئی کارە و ئی وەشەسیاویە نیشانە دریان و هەمیشە ئاخرین و ئەوەڵین پەناگا و یاگە پەرمایێوە بیێنە کە بێ منەت متاقۆ دەس هۆربانۆ و داواو یارمەتی چادی کەرۆنە و حەر بە ئاوات بۆ دەسش گیریۆنە و ڕەد نەکریۆوە:

| | |
|---|---|
| یام جە گۆنای من کەرەم ئاوانتەر | ڕەحمەت جە تاوان، من فراوانتەر |
| هەر تۆنی وە تاق دانا و تەوانا | تۆم هەنی، هەنی ئەو کێم بۆ هانا |
| خەریک کەردەی وێم و فەزڵ تۆم | ئێد متاونۆم، ئەو ملاونۆم (م: ٥٣٦) |

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

ئێتر چا یاگاچەنە جەبارەو بادەی و جاموو پەڕ جە مەی قسێش کەردێنێ و هاوارش کەردەن مۆتریب و ساقی؛ دیارا پەی ئەژناسای و زانای بیەن و چی ڕانە بە تاقێق کارامە و چنەزان بیەن و یاوان سەرکەل و گەرەکش بیەن کە جە دنیاو خامی و کالّی و نەزانای بلۆنە ئەو بەر و بە وەشنامی و سەربەرزیەوە، ئەگەر کە حەتا بنچینەو ژیوایش چێراو زوەررا کەرۆ و دۆنەش هەوارە و جە هەستیش (بیەی) ڤزۆنە، بیاڤۆنە تۆتۆ ڕۆزگاری و ژیوای:

| | |
|---|---|
| های ساقی هەلای سەرمایەی خامی | نمەدۆم وە دەس ڕای نیکنامی |
| باوەرە وەش وەش، سا دەی هەی پەی | کەی تاف قەلّوەزەی ساف شیشەی مەی |
| مەوجش بنچینەم بدۆ وە هەمدا | هەستیم دۆ وە بەرد هەرد عەدەمدا (م: ٤٦٨) |

یام :

| | |
|---|---|
| وەی گشت ئایرەوە خەیالّم خامەن | بەختم نا پۆختەن فامم نەفامەن |
| وەی بلّێسەوە گەردێم باقییەن | وادەی ئایرین بادەی ساقییەن |

فاکتێوی هەمیەتدار و سەرسوود کە مشیۆم چی ئەوەلّەوە واچیۆنە ئینەنەنە کە مامۆسا مەولەوی، شەراب و بادەش ئەژناسان و جە ئاداب و ڕا و ڕەسمو کاری هاگادار بیەن؛ بەلام چانیشا نەبیەن کە سووچێوەنە بنیشۆرە و بە تەنیایی مەی بوەرۆنە و مەست کەرۆ و جە فەلسەفەو مەی حیچ نەزانۆنە. بەلّکووم جە نزیک بە سەدوو ئا یاگانە کە داواو مەیش کەردەن، ساقیچش چایەن و داواش کەردەن کە نەیچی، مۆتریب و مۆغنی و ... یام کەسێوتەر بەی، تاکە کۆمەلّۆ هامفەردا جەم بۆ و نۆشانە و وارەی بادەی مەزەش بۆ:

| | |
|---|---|
| مەینەت سەربەرزەن، شادیم زگارەن | ساقی جامەکەت ئەمجار بەکارەن |
| بۆرێ وە مەجلێس لابەر پەردەی شەرم | وە دەورێ دیسان بەزمێ کەرمێ گەرم |
| تا مۆترێب وە ساز حەنجەرەی بێگەرد | هۆردۆ مەقامێ دەوا کەرۆ دەرد |
| بەلّ ناکا نەیچی بەیۆ جە لاوەوە | مەقامەکەی قەقنەس ئاساوە (م: ١٠) |

بۆرێ پەی دلێ خەلّکی و حیچ شەرمێوت نەبۆنە، ئێمە گەرەکمانا جە کۆمەلّۆ هامفەردانە ساقی قاو کەرمێ و بادە بوەرمێنە. دیسان پەی ئانەیچە بەزمەکە گەرم بۆ و گیرایی شەراوی و ڕەسایی دەنگی و بەرکەردەی خەمی گردێشا ئەوج و سەرکەلەنە با، نەیچی با چا بۆ و مەقامێو هۆردۆ؛ یام مۆترێب بەینە و بە دەنگێوی وەش کرکێو کەرۆنە و پێسنە وارانی وارۆ ملشارە و خەمشا شۆرۆوە:

| | |
|---|---|
| ساقی باوەر ئەو، مەی دوو سالّە | پێمدەر یەک جامێ، حالّم بەد حالّە |
| مۆغنی کۆکەر سازانت وە هەم | سەمتوورێ، تارێ وە هەم کەرە جەم |
| نەیچی سا لێدەر، قەزات وە مالّم | دەمێ دەر جە نەی، دەروون زۆخالّم (م: ٢٠) |

چیگەنە مەولەوی ڕوە کەرۆنە ئەو ساقی، بەلام بە تەئکید، بە پەرمای بە ئەژناسای پێسنە گرد جارێوی، بەلام با ئینجار مەی دوە سالّە بۆ (زووم کەردەی سەروو ئینەیەوە کە با مەی دوە سالّە بۆ، یانێو کە خاستەر، نا تەر، پۆختەتەر و ماناتەر و ...) چوونکەتی ئێتر حالّش بەد حالا و پا ڕاحەتیچە چارش مەکریۆ. شۆنیشەرە

درێژە مدۆنە بە قسەکاش و ماچۆنە ئەی تۆ کاکەی گۆرانیواچ سەمتوورێو و تارێوە پێوەرە بارە تا نەیچی بەیۆ و بەزمێو گەرم کەرمێ. دیسان ئەوەڕازنای کۆڕ و کۆمەڵێو. بەڵام کۆمەڵێوە تایبەتە، گلێرەوەبییێوی یەکسەر ڕێکوپێک نەک گرد عامی و گرد پۆلێو جە خەڵکی بەیۆ پەی ئاگەی و چانە ڕاش بدانێ. کۆمەڵێوە تایبەتە و کەسانێوی تایبەت؛ ساقی، نەیچی، مۆترێب و مۆغنی یانێو بە جۆرێو ئانە، زانایێنێ و حەر ئا زانایێ گرد جارێو خەییام نامێشا بەرۆ و بەرامبەر بە خەڵکی ئاسایی دلێ کۆمەڵگای جیایشا کەرۆوە:

خوا دەردی داناوە ، دەواشی دانان　　　مەیخانە بەرانبەرن بە دەروێش دانان

گەر بادە نەبایە لەم جیهانەی پڕ خەم　　　تاوێک نەدەمان ئەوانی زانا و دانان (خەییام:٣٢)

پاسنە کە دیارا مەولەوی چنی مووسیقیچ ئاشنان و خاسش مژناسۆ و تەمام گەرەکشا و وەشش مەینە چنەش. چوونکەتیم حەر وەختێو گەرەکش بۆ، بیاۋۆنە سەرکەلوو وەشی و جە شادی بۆ کەیل و حەر پاسنە جە دنیاو تەوەنین و سەرسەختوو ئاوەزی بایۆ و بلۆنە ئەو دنیاو خەیاڵی و زەوقی، هاوارێو کەرۆ و چاۆ ئەو دەروێشی ؛ دەفەکێت بارە یام ماچۆ مۆغنی گۆرانییێ واچە و نەیچی بۆرێوە و پەادێو ساز کەرە. پەی ئانەیە کە بزانمێ مەولەوی جە مووسیقی زانانش و خاسش ئەژناسان، حەر ئینە وەس کە نامۆ فرەو ئامێراو مووسیقی پێسنە دەفێ، نەی، سەمتوور و تار و حەر پاسنە دەزگای مووسیقی پێسنە پەردەی، مەقام و شانازی و.. دلێ دیوانەکەیشەنە هەنێ و حەر یاگێوە گەرەکش بیەبۆنە، ئاردێنێش ئەو دلێ تان و پۆ شێعرێش:

مۆترێب بەو نەغمەی شانازیتەوە　　　یا بەو پەردەی پاک حیجازیتەوە (م: ٤٦٠)

بێجگەم چانەیە کە بە پاو وەختی و یاگێ ساقیش گەرەک بیەن و هاوارش ونە کەردەن؛ جە فرەو ئا یاگانە داواو مەی و جام و بادەیش کەردەن شۆنۆ فەلسەفێوی تایبەت و جە وەرچەمێوی تایبەتەر دیان پەی باسی کە بە ڕاوینوو نویسیاروو ئی وتاریە یام جە قووڵایی و ئەوپەڕوو خەمیەنە بیەن و گەرەکش بیەن کە بە مەی کۆگاو خەمەکاش لابەرۆ و شێونۆ، یام جە بەرزایی و سەرکەلوو وەشیەنە بیەن و گەرەکش بیەن کە وشتەرش بۆنە؛ کە جە وارەنە هەردویشا ماچمێ:

**خەم**

خەم نە سەر جۆی هوون، سارای دڵ جەمجەم　　　بار چنی چوون فەوج قافڵەکەی عەجەم

هەر وە زۆر مەندەن نیم نەفەس باقی　　　وادەی دەورەتەن، هانا، هەی ساقی! (م: ٤٣)

کە چیگەنە چوونکەتی خەمبار بیەن و خەم و خەفەتی فرە دڵشەنە بار بیەن و دڵش کەردەن بە هوون، داواش جە ساقی ئانەن مەی بارۆ و ژەنگۆ دڵیش بە مەی ماڵۆرە و کەرۆش دەرمانوو دەرای. یاگێوەتەریچ پێسنە ماچۆنە:

تەوق خەم گەردەن شەوقەکەم بەستەن　　　کەف پای شادیم، خار تێ شکەستەن

ساقی سا دەخیل جام مەی وە کەف　　　دەروێش ئامانەن، کەفێ نە ڕووی دەف (م: ١٨٤ )

داوا کاری جام و بادەی، ساقی تەڵەب کەردەی و دەرمانوو گردوو خەما جە مەی واستەی تا وا یاگێ بیەن کە تارەلاو ئانەیە وەختارێو کە دۆکتۆر و حەکیم جە دەرمانی مەنێنێرە و نەتاوانشا سارێشکەروو دەرد و برین و

زامی بانێ؛ مەولەوی دیسان داواو دەرمانوو دەرد و ئێش و زاموو وێش جە مەی واستەن و حەر ئادش سارێشکەروو گردوو دەردەکاش پەی وێش نیانەرە و ئینە جە شێعرەکاشەنە حاشا هۆرنەگیرا و سەلەمنای ئی قسێ وێش هاوار کەرۆ. چانە کە ماچۆ:

| | |
|---|---|
| نە حەکیمێوەن کەرۆ دەوای دەرد | نە تەبیبێوەن جە دڵ لا دۆ دەرد |
| سا ئیسە ساقی جەمین جام جەم | وادەی ئاماتەن وە بان دیدەم (م:٣٩٠ ) |

ئی باسە و ئا فەلسەفە کە سەرەو مەولەویەنە گەشەش کەردەن و چانە هۆرش دان، تا سەرە مەرگ و نزیکەوە بیەی کۆچی یەکجاری دلێ ئاوەزوو مەولەوی و چنی ئادی هامڕا و تۆشەو تۆشەبەرەکۆ ویر و زانستیش بیەن و بە فۆرمێو و بە جۆرێو وێش ئەرمانانش کە نیشانە ماۆ فەلسەفێوی گۆترەی نەبیەن و سەروو بنەڕەتێوی پتەویەرە نریانەرە و سەرچەمێوی پاک و بێگەردەنە ئاویش وارایێنە و ڕێکوپێک لوان سەر:

| | |
|---|---|
| وەڵگ زیندەگیم ها بە هەواوە | دیمادیمشەن وە بای فەناوە |
| ئەلوەدای تەئریخ کامەرانیمەن | نیشانەی ئاخر زیندەگانیمەن |
| یاران ویەردەن، نۆبەمەن دەی دەی | ئیسە وەکارەن ساقی نەشئەی مەی (م: ٤٢٥) |

حەر پاسنە جە هۆنیۆ «ئێمشەو تەنیا بێ جەستەی زەبوونم» باس، باسوو داخۆ دڵی و دیسان هۆردای خەمەکان و چی بارەنە بە ڕاوینوو دۆکتۆرەکا و زانایانوو زانستوو پزشکی دیسان سەرواز کەردەو زام و برینی و ئەوەکۆلنای زامێ پەترۆک بەستێ، چندە سەخت و چ سۆزێوش هەن. ئی سۆز و ئێش و ئازارە ئێندە فرە بیەن کە مەولەوی وێش پێسنە قەقنەسی دیەنش و ئاپاسنەش بەروسەن کە ئێشەو دەسوو ئی گردوو خەماوە بەرشیەیم پەی نیا و ئاخریچەوە دیسان پەنا بەرۆوە ئەو دەرمانوو خەمەکاش و ئی جارە بە ئەوەلاڵیای و هاوار ئەو ساقی، پێسنە ماچۆنە:

| | |
|---|---|
| ڕۆ جە شەو فێشتەر زار و زەلیلم | ساقی سا جامێ، ئەمجار دەخیلم |
| بدەر پێم نۆشکەم چوون هەردە جاران | وە ڕەغم گردین گرۆی مەیخاران (م: ٣) |

یا:

| | |
|---|---|
| مەینەت سەربەرزەن، شادیم زگارەن | ساقی جامەکەت ئەمجار وەکارەن (م: ١٠) |

**وەشی و شادی و زەوق**

حەر پاسنە کە وەڵتەر ئیشارەما کەرد؛ یۆتەر چا سات و وەختیە کە هۆنیاری وەرباس بادەش گەرەک بیەن و ساقیش تەڵەب کەردەن ؛ وەختوو دیاری وەشی و زەوقی بیەن کە پاسنەش واستەن تا بە کیمیاو مەی، وەشیش فرە کەرۆ و ڕەنگ و بۆ و تامێو، تایبەتش دۆ پنە بەڵام نەک پێسنە وەشی و لەهێ و لەعەبێو کە مەستی بارۆ و کار بیاێنۆنە ئەو عەربەدەکێشی و سووکی بازاری، بەڵکووم ئا وەشی و شادیە کە تایبەت بۆنە کۆمەڵۆ یارا و کۆگاو ئەدیبا.

چەپەوانەو باسوو خەمی چا یاگانە کە باسوو وەشی دای و ژیوای بەخشی مەی جە کارەنە بیەن بە کەلیماتێو هەرمانە کریاینە و تان و پۆ شێعرێ بە گەڕێو چنیان کە تەقەڵێش گرد هەوڵ و هان و هێزدەر و

بۆیە لەم وتارەدا هەوڵ دەدەین سۆفیگەری لە شیعری «مەلای جزیری»دا شیبکەینەوە و دیاردەی عیشقی حەقیقی و عیشقی مەجازی لە شیعرەکانیدا بخەینە بەر باس و لێکۆڵینەوە تا ڕوون ببێتەوە کە چ پێوەندیەک لەنێوان ئەم دوو عیشقە لە شیعرەکانیدا هەیە.

## ٢ - کورتەیەک لە ژیانی مەلای جزیری

مەلای جزیری ناودارترین شاعیر و عارفی کوردە کە چەندین سەدەیە ناوی کەوتۆتە سەرزاری خوداناسان و ئەدەب دۆستان. لە گەڵ ئەمەشدا تا ئێستا ژیان و بە سەرهاتی ئەم شاعیرە خوداناس و پایەبەرزە بە باشی نەهاتیە ناسین بە جۆرێک کە لەبارەی زەمانی لەدایکبوون و لە دونیاچوونی لە نێوان نووسەرانی ژیانی "مەلا" جیاوازیەکی زۆر دەبینرێ کە هەندێ جار ئەگاتە چەند سەدە. ئەم دیاردەیەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە سەر چاوەکانی هاوچەرخی "مەلا" شتێک لە بارەی ژیان و بەسەرهاتی ئەو نەهاتووە و نووسەران چەند سەدە دواتر بە کەڵکوەرگرتن لەشتانی سەرزارەکی و دیوانی "مەلا" لەو بارەوە نووسیویانە.

ئەوەی کە نووسەرانی ژیانی مەلا لە سەری پێکهاتوون، ئەوەیە کە ناوی «ئەحمەد»ە و خەڵکی «جزیری بۆتانە». ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خۆی لە پتر لە جێگایەک لەدیوانەکەیدا ئاماژەی بەمە کردووە. وەک:

ئەحمەدم سینەسپەر پێشبەرێ تیرێ فەلەکا دەعوەدارێ تەمە ئیرو تو ژ دەحلێ وەرەدەر

(دوسکی، ٢٠٠٥: ١٤٤)

گوڵێ باغێ ئرەما بوهتانم شەب چراغێ شەبا کوردستانم

(هەمان سەرچاوە: ٣٣٣)

ناوی باوکیشی بە پێی ئەو زانیارییانەی کە لە دەستنووسی دیوانی مەلای جزیری کە لە ساڵی ١٢٣٨ کۆچیدا لە لایەن «عەبدولقادر ئامێدی»وە نوسراوەتەوە «محەمەد»ە (سجادی، ١٣٦١: ١٦٢).

لەبارەی زەمانی لە دایکبوونی مەلایجزیری جیاوازییەکی زۆر لە نێو نووسەراندا هەیە کە "مامۆستا سەجادی" زۆربەی ئەم و جیاوازانەی تۆمار کردووە و مامۆستا هەژار و مەلائەحمەدی زڤنگی لە شەرحی دیوانی مەلای جزیریدا دووپاتیان کردوتەوە. نووسەران لەم بارەوە دوا نیمەی سەدەی شەشەمی کۆچی و ساڵەکانی ٥٥٦-٥٤٠ کۆچی و ٨٨٦ - ٨١١ کۆچی و ٩٠٢-٨٢٠ کۆچی و... نووسیوە، (سەجادی، ١٣٦١: ١٦٢ و هەژار ١٣٦١: شازدە تا بیست)، بەڵام ئەوەی کە لەم بارەوە لە ڕاستی نزیکترە بۆچوونی «سەیدێ مەلا ئەحمەدی زفنگی»یە کە لە دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر لە دیوانی مەلایجزیریدا بەو قەناعەتە گەییشتووە کە مەلا لەکۆتایی سەدەی دەیەم و نیمەی ئەووەڵی سەدەی یازدەمی کۆچیدا ژیاوە (زڤنگی، ١٩٨٧، ج١: م). «تەحسین ئیبراهیم دوسکی»یش لە پێشەکی دیوانی مەلای جزیریدا نەتەنیا بیروڕای "زفنگی" بە ڕاست دەزانێ، بەڵکوو بە کەڵکوەرگرتن لە چەند شیعرێکی مەلا وحیسابی ئەبجەد ساڵی بە دونیا هاتن و کۆچکردنی دیاری ئەکا ودەڵێ: مەلا لە ساڵی ٩٧٥ کۆچی بەرابەر بە ١٥٦٨ – ١٥٦٧ زایینی هاتۆتە دونیا (دوسکی، ٢٠٠٥: ٢٠). دوسکی هەروەها بەکەڵکوەرگرتن لە چەند شیعرێکی جزیری و شیعریکی «فەقێ

تەیران» کە بە بۆنەی لە دونیاچوونی مەلای‌جزیری وتراوە، ساڵی لە دونیاچوونی مـەلای ساڵـی ١٠٥٠ کـۆچی دیاری دەکا کە بەم پێیە مەلای‌جزیری ٧٥ ساڵ عومری کردووە (هەمان سەرچاوە:٢٥).

هەروەک دەبینرێ بۆچوونی «تەحسین ئیبراهیم دوسکی» لە گـەڵ بـیروڕای مـەلا «ئەحمـەدی زفنگـی» یەک دەگرنەوە و ئەو بۆچوونانەش سەبارەت بە دەورانی ژیانی مەلای جزیری لە ڕاستی نزیکترن.

لە بارەی ژیانی مەلای‌جزیریشدا زانیارییـەکی زۆر بـە دەسـتەوە نییـە. "ماموسـتا سـەجادی" بـە نـەقل لـە «محەممەدعەلی عەونی» هێندێک زانیاری لەو بارەوە ئەخاتە ڕوو بەم شێوەیە:

مەلای جزیری بە منداڵی ئەچێتە مزگەوت و لە لای بـاوکی خـۆی "شـێخ محەممـەد" فێـری خوێنـدن و نووسین و قورئان خوێندن دەبێ. پاشان بۆ فێربوونی زانستە شـەرعییەکان سـەردانی زۆرێـک لـە ناوچـەکانی کوردستانی کردووە و لەحوجرەکانی ئامێدی و جۆلەمێرگ و دیاربەکر دەرسی خوێندووە و لەتەمـەنی سـی و دوو ساڵیدا لەگوندی «ستریاس» نزیکی دیاربەکر لە لای "مەلا تەها" ناوێک ئیجـازەی مەلایـەتی وەرگرتـووە و بۆتە مەلایەکی دووازدە عیلم. دوای وەرگرتنی ئیجازە نامەی مەلایەتی بۆتە مەلای گونـدی «سـەربا» سـەربە دەڤەری دیاربەکر، لەوێشەوە چۆتە مەڵبەندی «حەسەن کێـف» و لـەوێ بـووە بـەمـەلا و دەرسـی فـەقییانی گوتووە و ئیجازەی مەلایەتی داوە و زۆر فـەقێ و مـەلای پایەبـەرزی پێگەیانـدووە. پـاش هەیامـەکی مـەلای جزیری لە حەسەن کێف گەڕاوەتەوە بۆ شارەکەی خوی «جزیرا بۆتـان» و تـا دەمـی مـردن لـە مـەدرەسـەی مزگەوتی سووری ئەوشارە سەرقاڵی وانـە گوتنـەوە بـووە و هـەر لـەو شـارەش کـۆچی دوایـی کـردووە و لـە مەدرەسەی سووردێ بەخاک ئەسپێردراوە (سجادی، ١٣٦١: ١٦٣ – ١٦٢ و دوسکی، ٢٠٠٥: ٢١).

هەروەک لە شیعرەکانی مەلای‌جزیری دەردەکەوێ، مەلا لـە تـەواوی زانسـتە شـەرعییەکان وەک فیقهـ، ئوسووڵ، کەلام، حەدیس، تەفسیر و... و زانستە عەرەبییەکان وەک سەرف، نەحو، بەلاغەت و... شـارەزا بـووە و لە عیرفان و تەسەووفدا پسپۆڕێکی تەواو بووە و بێجگە لە زمانی کوردی، زمانی عەرەبی، فارسی و تورکیشـی زانیوە.

### ٣ - مەلای جزیری و سۆفیزم

مەلای‌جزیری لە ئەدەبی کوردیدا وەک شاعیرێکی «سۆفی» ناوبانگی دەرکردووە و بە گـەورەترین شـاعیری سۆفی مەسلەک دادەنرێ. ئەم بڕیارەش دەگەڕێتەوە بۆ بیروڕای سۆفیانەی کـە بـە شـێوەیەکی بـەر چـاو لـە شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. لە ڕاستیدا پلەوپایەی مەلای جزیری لە شیعری سۆفیزمی کوردیـدا وەک پلـەو پایەی «ئیبنی فاریز» و «ئیبنی عەرەبی» لەشیعری سۆفیزمی عەرەبی و «حـافیز»، «مـەولانا» و «جـامی» لـە شیعری سۆفیزمی فارسی وایە.

هەندێک لەنووسەران لایان وایە کە مەلای‌جزیری سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی بـووە، (ژڤـنگی، ١٩٨٧: ع) بەڵام دوکتۆر مارف خەزنەدار ئەم ڕایە بە ڕاست نازانێ و دەڵێ: «ئێمە لە سـەر ئـەو بـاوەڕەین مـەلای‌جزیـری لەسەر هیچ تەریقەتێکی سۆفیزم نەبووە، ئەوانەی لە کوردسـتاندا بـاو بـوون، لـە سـەر دەمـی مـەلای جزیـری

تەریقەکانی دەروێشی لە کوردستاندا وەک ڕێخراوێک لە ناوەوە نەبوون. ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە لە دوای ساڵانی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نوزدەم شێخ مارفی نۆدێیی (١٧٥٢ – ١٨٣٨) و شێخ خالیدی شارەزووری نەقشبەندی (١٧٧٩-١٨٣٠) پەیدا بوون، بۆ یەکەم جار یەکەمیان بناغەی ڕێکخراوی تەریقەتی قادری دانا و دووهەمیان ڕێخکراوی تەریقەتی نەقشبەندی دامەزراند». (خەزنەدار، ٢٠٠٢، ج ٢: ٢٥٠).

بەڵام ئەوەی دوکتۆر خەزنەدار گوتوویەتی ناتوانێ نەقشبەندی بوونی مەلای جزیری ڕەد بکاتەوە، چوون هەروەک دەزانین لەدەورانی ژیانی مەلای جزیریدا لە ولاتانی ئێران و تورکیەی عوسمانی تەریقەتی نەقشبەندی باو بووە و زۆرێک لە شاعیرانی فارس وتورک پەیڕەوی ئەم تەریقەتە بوونە، جا خۆ مەلای جزیریش لەو شاعیرانە زۆر تەئسیری وەرگرتووە و دەکرێ ئەویش وەک ئەوان پەیڕەوی تەریقەتی نەقشبەندی بووبێت.

مەلایجزیری سۆفیزم لە خزمەت ئاییندا دەبینێ و تەریقەت لە شەریعەت بە جیا نازانی و ئەهلی تە ریقەت دەعوەت دەکا بۆ پەیڕەوی کردن لە شەریعەت و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| ئەحمەد مەبە جەورو جەفا | تو تەرک مەکە ئەمرا ئەڵڵا |
| لەو عاقبەت دا بن فەنا | بگرن تەریقا شەرعییان |

(دوسکی، ٢٠٠٥: ٢٤٨)

مەلایجزیری لە شیعرەکانیدا زۆرێک لە زاراوەکانی سۆفیزم بەکار دێنێ کە یەکێ لەم زاراوانە عیشق بە خودایە.

مەلایجزیری عیشقی خۆی بە خودا بە عیشقێکی ئەزەڵی دادەنێ و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە بەر لەوەی خودا پەیمانی بەندایەتی لە بنیادەم وەربگرێ و لە دروست بووان بپرسێ «الستُ بربّکم» واتە ئایا من خودای ئێوە نیم و ئەوانیش وەڵام بدەنەوە و بڵێن بەڵێ، ئەو عاشقی خودا بووە و پەیمانیش ئەبەستێ کە تا ئاخر لە سەر ئەو عیشقە بمێنێتەوە.

| | |
|---|---|
| من دبەر «قالوا بلی» باتن ڤ وێرێ بوو ئەڤین | هێژ ل سەر عەهدا «الستم» تاب ڕۆژێ ئاخرین |

(هەمان: ٢٢٨)

مەلا لە ڕێگای عیشقی خودا خۆی بە بەندەیەکی بێکەس و دەرماندە ئەبینێ کە ئامادەی جێبەجێ کردنی فەرمانی مەعشووقی خۆیەتی:

| | |
|---|---|
| ئەی شەهێ عالی جەناب پوڕ عاجز و پەرکەندە ئەم | ئاە ژ دەست جەورێ ئەڤینێ چ بکرم من بەندە ئەم |
| سەبرو تاقەت من نەمان لێ بێکەس و دەرماندە ئەم | «گر بخوانی ور برانی بندەام تا زندەام» |

واجب لی امتثال الأمر ماذا تأمرین (هەمان: ٢٢٨)

مەلایجزیری جەماڵ و جەلالی مەحبووب و داستانی عیشقی خۆی بانتر لەوە ئەزانێ کە بە زمان بگوترێ و ئەڵێ: داستانی عیشقی ئێمە تەنیا بە زمانی حاڵ و حیکمەت دەزانرێ و خەڵک لە ئایەندەدا لە بارەی ئەدوێن.

نائێتن گوهتن ب قال، شرح و بەیانێ حوسنا تو      دا ب حال سرڕ بناسین دڵ فەسانا حوسنا تو
خوەش مەلا ئامانجا تیران کر کەمێ ناحوسنا تو      «قسەی عشق جلال و داستان حسن تو»
«تلک انباء یقول الناس منّا بعد حین» (هەمان: ٢٢٩)

مەلا ئەحمەدی زڤنگی لە شەرحی ئەم بەیتانەدا دەڵێ: داستانی عیشقی مەلا و جوان دۆستی و خوداناسی ئەو بۆتە زەربولمەسەل و کەوتۆتە سەر زمانان و لە دەورانی ئەو تا ئێستا نەسڵ بە نەسڵ نەقڵی ئەکەن و تا ڕۆژی قیامەتیش لەبەینی خەواس و عەوامدا دەمێنێتەوە و ئەمە پێشبینی مەلا لە ئاخری ئەم قەسیدەیەدا دەسەلمێنێ (زفنگی، ١٩٨٧، ج ٢: ٤٥٠).

یەکێ تر لەو زاراوە سۆفیزمانەی کە مەلایجزیری لە شیعرەکانیدا باسیان لێ دەکا یەکێتیبوون (وحدت وجود) و فەنای عاشق لە پێناو مەعشووقەکەیدایە.

مەلا لە قەسیدەیەکیدا بە ئاماژە بۆ یەکێتیبوون تەواوی بوونەوەر بۆ یەک سەرچاوە دەگێرێتەوە و دەڵێ: ئەگەر تەواوی پیتەکان بۆ ئەسڵی خۆیان بگەڕێنەوە دەبنە یەک خەت و ئەگەر خەتیش بۆ ئەسڵی خۆی بگەڕێتەوە تەنیا نوقتەیەک دەمێنێ، واتە تەواوی بوونەوەر بۆ نوقتەی حەقیقی بوون (خودا) دەگەڕێنەوە و غەیری ئەو نوقتەیە شتیکی تر نامێنێتەوە. مەلا دەڵێ:

حەرف ژیەک بوونە فەسڵ      گەر ببری وان ب ئەسڵ
حەرف دبت یەک خەتەک      خەت کو نە ما نوقتە ما

(دوسکی، ٢٠٠٥: ٣٧)

بە بڕوای مەلا یەکێتیبوون نوورێکە کە لە دڵی عارفاندا دەدرەوشێتەوە بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا زۆر لە خاوەن دڵان لەم بووارەدا شوبهە و گومانیان هەیە:

وەحدەتا «موتلەق» مەلا      نوورە دقەلبان جەلا
زۆر دڤا مەسئەلێ      ئەهلێ دلان شوبهەما

(هەمان : ٣٧)

ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پەیڕەوانی سۆفیزم سەبارەت بە یەکێتی بوون جیاوازیان هەیە و بڕێکیان ئەم مەسئەلەیە بەدروست دەزانن و هێندێکی تریان ڕەدی دەکەنەوە.

مەلا لەشوێنێکی تردا دەڵێ: خۆری یەکێتی خودا تەواوی بوونی گرتۆتەوە بەجۆرێک کە لە بووندا غەیری زاتی خودا نادیترێ و ئەگەر کەسانێ ناتوانن ئەم حەقیقەتە ببینن لە بەر ئەوەیە کە چاویان تووشی چاو ئێشە هاتووە:

ئافتابێ ئەحەدییەت دخوەدا گرتییە کەون      نەکو عەورەک هەیە لی گرتیە چەهفێن مەرەمەد
(هەمان: ١٣١)

لە سەر ئەو بیروڕایە مەلا غەیری خودا شتێکی تر نابینێ، چوون لە دونیا و ئاخرەتدا هەر ئەو بە «معبود» و «مشهود» دادەنێ و دەڵێ:

مەلا هەروی ببین هەر وی ئەگەر هەروی دناسی تو          هوالمعبود و المشهود بل لاغیر فی الدارین

(هەمان: ۲۲۷)

لە بارەی فەنای عاشق لە پێناو مەعشووقدا مەلای‌جزیری لەو باوەڕەدایە کە بوونی زاتی عاشق پەردەیەکە لە نێوان عاشق و مەعشووقدا و بۆ ئەوەی عاشق بگا بە مەعشووقەکەی دەبێ ئەو پەردەیە لابدا و بوونی خۆی لەبەر چاو نەگرێ و بە مەقامی فەنا بگات، چوون فانی بوون لە پێناو مەعشووقدا دەبێتە هۆی باقی مانەوەی عاشق. مەلا دەڵێ:

عاشق و مەعشووق دا واسل ب یەک بن با حجاب          مەحو بوو بالزات عاشق لەو د عشقا پەردە بوو

لەو دعشقێدا فەنا بوو دابیت باقی ب دۆست          عاشقی فانی نەبوو واسل حەتێ باقی نەبوو

(هەمان : ۲۹۷)

بەم هۆیەوە جزیری سوژدە لەخاکی نەمان «مەحو» و مەقامی «فەنا» بە گەورەترین مەقامی سەیر و سلوکی عیرفان دەزانێ و دەڵێ:

ژلاشەیئا ژمەعدووما مەناسی سڕ ڕا قەییوما          سجودی فی تراب المحو من اعلی المقامات

(هەمان: ۳۰٤)

### ٤ - مەلای جزیری و عیشق

ئەگەر شیعری مەلا جزیری لە ڕووی ناوەرۆکەوە سەیر بکەین. ئـەبینین کـە عیشـق یـەکێ لـە گرنگتـرین چەمکەکانی شیعری ئەو تەشکیل ئەدا، بە جۆرێک کە کەمتەر لاپەڕە و قەسیدە پەیـدا ئـەبێ کـە بـەجۆرێـک وشەی عیشق و هاوماناکانی تێدا بە کار نەهێنرابن. بەم هۆیەوە مەلای‌جزیری بە گەورەترین شاعیری عـارف و عاشق لە ئەدەبی کوردیدا دەناسرێت.

مەلای جزیری عیشق بە گەورەترین سەروەت و سامان دادەنـێ و سوپاسـی پـەروەردگاری خـۆی بـۆ ئـەوە دەکات کە لە جیاتی سامان و خان و مان و دینار و درەم ئیکسیری غەمی عیشقی داوەتێ:

مننەت ژخودایی کوب عەبدا خوە مەلایی          ئکسیرا غەما عشقا نە دینار و درەم دا

(دوسکی، ۲۰۰٥: ۳۳)

ئەو عیشقەی مەلا باسی دەکا، عیشقێکی ئەزەلیە و هەرکەس لەجامی ئەو عیشقە بخواتەوە تا ئەبەد مەستی ئەو عیشقە دەمێنێتەوە.

قەدەحەک تازە ژ عشقێ دئەزەل دا مەحەکیما          ژێ دنووشین هەی وهەی، ها ب خوەجامێ مە لەبالەب

(هەمان: ۷٥)

لە قەسیدەیەکی تردا دەڵێ: بەرلەوەی جیهان و چەرخی گەردوون و عەرش و کورسی وەدی بێن و خودا پەیمانی بەندایەتی لەئینسان وەربگرێ، جەماڵی خودایی و عیشقی حەقیقی و ئەزەڵی هەبووە.

هادبەر «قالوا: بلی» یا بەڵکوو ئەڤ عالەم نەبوو چەرخێ دەوران دەورێ گەردوون گونبەدا مینا نەبوو

عەرش و کورسی هێژ دمەخفی بوون دکەنزا قودرەتا حوسنا حەق بوو دئستوا ئا لامعا عشقا هەبوو

(هەمان: ٢٩٦)

مەلای جزیری عیشق بە ئەساس و بنەمای جیهانی بوون دادەنا و دەڵێ:

حوسنا حوب ئانی ڤوهورێ عشقە ئەسڵی عالەما ئەسلێ ئەشیادێ بزانی وان چ ئەسل‌و ماددە بوو

(هەمان: ٢٩٦)

لە شوێنێکی تردا دەڵێ: تەواوی بوونەوەری ئاسمانەکان وزەوی بە هۆی عیشقەوە ئیدامە بە ژیانیان دەدەن و دەست دەکەن بە ڕەقس و سەما:

ب ئەڤینا مەلەک و چەرخ و فەلەک تێنە سەما ڕەوشەنن تیک ب مهری ژسەما تاب سەمەک

(هەمان: ٢٠٤)

مەلایجزیری جورێک عیشق و عیرفانی تێکەڵ کردووە کە زۆرکەس بۆیان لێک جیا نەبوو. نەتەوە و مەلایان بە دڵدارێکی دونیایی داناوە کە عاشقی زولفی یار و ڕووی دولبەر بووە. هەر بەم هۆیەوە چەندین داستانی دڵداری بۆ مەلا ساز کراوە و بە شێوەی سەرزارەکی نەقڵ کراوون کە "مامۆستا عەلائەددین سەجادی" چەند نموونەیەکی لەم داستانانە گێراوەتەوە، (سجادی، ١٣٦١: ١٦٥– ١٦٣) با ئەوەی ئاماژە بۆ سەرچاوەکانیان بکا.

ئەوەی کە ئەم دیاردەیە لە شیعری جزیریدا بە هێز دەکا ئەوەیە کە جزیری لە کنار بە کار هێنانی زاراوەکانی سۆفیزم، بڕیک جار لە زاراوەکانی وەک وەسفی ئەندامی ژن، وەسفی شەراب و مەستی و ... کەڵکوەردەگرێ. بۆ نمونە جزیری لە وەسفی دولبەرەکەیدا دەڵێ:

من دلبەرەک وەک دوڕ هەیە مەحبووب و شیرین سوڕ هەیە

حوسن و جەمالەک پور هەیە بەلقیس سفەت مەسکەن سەبا

(دوسکی، ٢٠٠٥: ٣٨)

لە شوێنێکی تردا جەماڵی زاهیری مەعشووقەکەی وەسف دەکا و دەڵێ:

دڵ ژمن بر دلبەرەک زیبا قەبا چەهڤ غەزال و پوڕ شەپال و مەە لقا

نازدارە ئەو ل تەختێ دلبەری دلروبایە جان فەزایە ڕووح شفا

حووری عینە ئەز نزانم یا پەری یا گولەک ڕەعنا ژگولزارا وەفا

(هەمان سەرچاوە: ٧١)

جزیری لە قەسیدەی «شۆخ و شەنگا» زۆر بە ڕواڵەت خوشەویستەکەی وەسف دەکا و بە بەژن و باڵا و بسک و زولف و چاوی یارەکەی هەڵ دەڵێ:

| | |
|---|---|
| شوخ و شەنگا زوهرە ڕەنگی | دڵ ژمن بر دل ژمن |
| ئاورێن هەیبەت پەلەنگی | دل ژمن بر دل ژ من |
| زولف و خالان نوون و دالان | وان ژ من بر دل بەتالان |
| گوشەیا قەوسا هلالان | دل ژمن بر دل ژ من |

(هەمان سەرچاوە: ٢٤٤)

مەلای جزیری ئەگەرچی زۆرجار شیعرەکانی وا دەست پێ دەکات کە هەر مەبەستی دڵداری دونیایی بێت، بەڵام دوای چەند دێڕە شیعرێک و زۆر بە زوویی دیتەوە سەر مەبەستی خۆی و عاشقی ڕووی دولبەر دەبێتەوە بەعاشقێکی سۆفی و ڕەببانی (مستەفا ڕەسووڵ، ١٩٩٠: ٩٠) .

ئەم دیاردەیە کە لە شیعری مەلای جزیریدا دەبینرێ، لە شیعری زۆربەی شاعیرانی سۆفیزمدا وەک «ئیبنی عەرەبی»، «ئیبنی فاریز»، «حافیز»، «سەعدی»، «مەولانا» و ... ڕەنگی داوەتەوە.

زۆرێک لە ڕەخنەگرانی ئەدەبی سۆفیزم لە سەر ئەو باوەڕەن کە شاعیرانی سوفیزم ئەم وەسفە زاهیریانە وەکو ڕەمز بە کار دێنن و هەرگیز قەسدیان لەم وشانە مانای زاهیریان نییە (پورجوادی، ١٣٧٢: ١٢٩).

لەبارەی مەلایجزیریش ئەتوانین بڵێین کە جزیری یەکێ لە گەورەترین شاعیرانی سۆفیزم لەئەدەبی کوردیدایە و تەسەووف و عیرفان و عیشق بە خودا بە شێوەیەکی بەرچاو لە شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە و ئەگەر هیندێک جار لە شیعرەکانیدا وەسفی شەراب و ئەندامەکانی دلدار ئەکا، ئەم دیاردەیە وەک ڕەمزێک بۆ عیشقی حەقیقی بە کار دێنێ، چوون ئەو شەرابەی کە مەلا باسی دەکا، شەرابێکی ئەزەلییە و قەسدی لەم شەرابە عیشقی ئەزەلی بە خودای ئەزەلیە و ساقی ئەم شەرابەش هەر خودا خۆیەتی. مەلا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ساقی ژ ئەزەڵ یەک دوو قەدەح بادە ب من دا | حەتتاب ئەبەد مەست و خومار و تەلەسم ئەز |

(دوسکی، ٢٠٠٥: ١٤٥)

مەلا ئەگەر جوانی دڵداریش وەسف ئەکا لە بەر ئەوەیە کە ئەم دڵدارە جوانە بەدەستکردی خودای میهرەبان و مەعشووقی حەقیقی خۆی دەزانێ:

| | |
|---|---|
| وەللە ژ هەردو عالەمان من حوسنێ جانانە غەرەز | لەو من ژ حوسنا دلبەران هەر سونعا ڕەحمانە غەرەز |

(هەمان: ١٧٧)

لە شیعرێکی تردا حوسن و جەماڵی دڵداران کە بە بوتی عاشقان ناویان دەبێ، ناشی لە حوسن و جەماڵی خودای پەروەردگار دەزانێ و دەڵێ:

| | |
|---|---|
| حوسنا زاتی بوت ولاتان ژجەمالا سەمەد | ژمسالی سەنەما وەکوو تەجەللایە سەمەد |

(هەمان سەرچاوە: ١٣١)

مەلای جزیری خۆی بە موفتی عیشق دەزانێ کە بە دەستێکی قورئان و بە دەستەکەی دیکەی سوننەتی پێغەمبەری(د.خ) گرتووە.

عاشقا مەسئەلەخواهی وەرە ئەم موفتیيا عشقین دەستەکا سوننەتە تێدا دیەکا نەسا کتابە

(هەمان: ٢٥٨)

بەمجۆرە دەتوانین بلێین کەعیشقی مـەلای جزیـری لـە شـیعرەکانیدا عیشـقێکی حەقیقییـە ئەگـەر چـی ناتوانین ئەوەش ڕەد بکەینەوە کە مەلا بەر لە گەییشتن بەم پلەو پایە لە ئەدەبی سۆفیزم و عیشقی حەقیقیـدا، عیشقی مەجازی و دڵداریشی تەجرەبە کردبێ، چونکە وەک گوتویانە مەجاز پردی حەقیقەتە.

## کۆتایی وتار

مەلایجزیری یەکێکە لە شاعیرانی گەورەی کورد کـە لـە کۆتـایی سـەدەی دەیـەم و سـەرەتای سـەدەی یازدەمی کۆچیدا پەرەی بە شیعری کوردی بە گشتی و شیعری سۆفیگەری لە ئـەدەبی کـوردی بـە تایبـەتی داوە.

بیروڕای سۆفیانەی مەلای جزیری بە شێوەیەکی بەر چاو لە شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە.

جزیری زۆرێک لەزاراوەکانی سۆفیزم وەک عیشق بە خودا، یەکێتیبوون، فەنای عاشق لە پێنـاو مەعشـووقدا و ... لەشیعرەکانیدا بە کار هیناوە.

مەلای جزیری عیشق بە بنەمای جیهانیبوون دادەنی و جوریـک عیشـق و عیرفـان و عیشـقی حـەقیقی و عیشقی مەجازی لە شیعرەکانیدا تێکەڵ دەکا کەبە سەختی لێک جیا دەکرینەوە.

مەلای جزیری وەسفی شەراب و ئەندامەکانی دڵدار وەک ڕەمزێک بو عیشقی حەقیقی بە کار دێنـێ، بۆیـە دەتوانین بلـێین عیشـقی جزیـری لـە شـیعرەکانیدا عیشـقێکی حەقیقییـە ئەگـەرچی نـاتوانین ئـەوەش ڕەد بکەینەوە کە مەلا عیشقی مەجازیشی تەجرەبە کردبێ.

## سەرچاوەکان

1- پورجوادی، نصرالله (1372) بوی جان، **مقالەهایی دربارەی شعر عرفانی فارسی**، تهران، مرکز نشر دانشگاهی، چاپ اول.

2- خەزنەدار، مارف (٢٠٠٢) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، هەولێر، ئاراس، چاپی یەکەم.

3- دۆسکی، تەحسین ئیبراهیم (٢٠٠٥) **دیوانا مەلایێ جزیری**، هەولێر، سپیریز، چاپا دووا.

4- الزفنگی، احمدبن الملامحمّد (1987) **العقد الجوهری ین شرح دیوان الشیخ الجزیری**، مطبع الصباح، چاپ دوم.

5- سجادی، علاءالدين (١٣٦١) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، سەردەشت، چاپخانەی معارف.

6- شوان، ئیبراهیم ئەحمەد (٢٠٠١) **سۆفیگەری**، هەولێر، موکریانی، چاپی یەکەم.

7- چیف، شوقی (بی‌تا) العصر العباسی الثانی، قاهره، دارالمعارف، چاپ سیزدهم.

8- مستەفا ڕەسووڵ، عیزەدین (١٩٩٠) **مەلای جزیری شتێک دەربارەی ژیان و بەرهەمی**، هەولێر، چاپخانەی دارالحکمە.

9- هەژار، عبدالرحمن شرفکندی (١٣٦١) **شەرحی دیوانی مەلای جزیری**، تهران، سروش، چاپ اول.

# مەولەوی کورد و ویستی ئازاد

(لێکۆڵینەوەیەکی زانستی، فەلسەفیە)

د. ئەحمەد زۆراوی [-]

**کورتە:**

سەید عەبدوڕەحیم تاوەگۆزی، ناسراو بە مەولەوی کورد، شاعیر و کەلامزانی بەناوبانگی کوردستانی باشوورە. ئەو لە بیرۆکەی ئایینی وەکوو کەلامی ئەشعەری و تا ڕادەیەک فەلسەفی سەردەمی خۆیدا شارەزا بووە. ئەو لە کتێبەکەیدا -بەناوی «عقیدەی مەرزیە»- چەندین بابەتی فەلسەفی و کەلامی گرنگی خستۆتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. یەکێک لەو باسانە کە پەیوەندی بە بابەتی سەرەکی ئەم وتارەوە هەیە، قەزا و قەدەرە. مەولەوی لە دوایین باسی کتێبەکەیدا دەڵێ:

«وەسەر هەوارگەی شەشەمینەدا/ قەزا و قەدەر وان لە کەمینەدا». وێڕای ڕەچاو کردنی قەزا و قەدەر لە سەر ئیرادەی ویستی ئازاد، تەکوین و خراپی دەدوێت. لەم وتارەی ئێستادا دەمانەوێ بەشێوەیەکی سەردەمیانە، دیمانەی مەولەوی وەبەر توێژینەوە و پێداچوونەوەی ڕەخنەیی بخەین، تاکوو بزانین ئەو دیمانەیە تاچە ڕادەیەک لەگەڵ ڕوانگەی زانستی، فەلسەفیدا پێکەوە جۆرن.

**وشە سەرەکییەکان:** کەلام، فەلسەفە، قەزا و قەدەر

---

[-] مامۆستای زانستگای کوردستان

**پێشەکی:**

عەبدۆڕەحیمی تاوەگۆزی شاعیر و موتەکەللیمی بەناوبانگی کورد، ناسراو بە مەولەوی کوردە کە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات و باشوور ژیاوە. بە بڕوای مەولەوی کورد هەموو گەوهەر و بەشەکانی جیهان ئەوەی مایەیەکی بێت یان بە پەدیدەیی لە عەدەم هاتووە و بۆ عەدەم دەچێت؛ واتا «مەعدووم» دەبێت.

وەسەر هەوارگەی شەشەمینەدا    قەزا و قەدەر وان لە کەمینەدا
مەزهەبی قەومی ئەشعەریەیە    قەزا ئیرادەی ئەزەلیەیە
بەستە بە ئەشیا تەمام و کەمال    لەسەر هەرچی هەن«فی ما لا یزال»
قەدەر ئیجادی حەق تەعالایە    «فەضلا، رحمە» بۆ ئەو ئەشیایە
لەسەر قەدرێکی مەخسووس موتەقەن    بە تەقدیرێکی مەنسووس موعەییەن
(مەولەوی، ١٩٨٨: ٦٧٤)

وا پێدەچێت کە مەولەوی لەم ڕووەوە نازناوی «مەعدوومی» بۆ خۆی هەڵبژاردووە. ئەو پێی وایە هەرچی لە جیهاندا هەیە، خودا هێناویەتە هەبوون و بوونێکی لە خۆوە نییە و دەچێتەوە بۆ نەبوون یان عەدەم:

خوێش و بێگانە وەک نزیک و دوور    حەیات و مەمات، زۆڵمات و نوور
با و باران، هەور و بەور و گشت زەمین    ئاسمان یەک یەک تا عەرشی بەرین
ئیرادە و مەشیت تەقدیری ئەوە    قەزا و حوکم و عەدڵ تەدبیری ئەوە (مەولەوی:٦٧٨)

بەبڕوای مەولەوی کەموکۆڕی یان نەقس لە نیشانەکانی نەبوون یان عەدەمە و چاکە و خەیریش لە نیشانەکانی هەبوون یان وجوودە؛ واتا مەعبوود یان خودا. مرۆڤیش نەبوونە و پڕە لە نەقس و کەموکووڕی و مەولەوی مەعدوومی خۆشی بریتی لەو نەبوونە دەزانێت و دەڵێ:

نەقس هەرچی هەیە خاسەی عەدەمە    مەعلوومە عەدەم ئەسڵە بۆ هەمە
هەر خەیرێ کە هەس خاسەی وجوودە    وجوودی واجب هەر بۆ مەعبوودە
مەعلووم دیارە عەدەم لێتەوە    هەر شەڕە و شەڕی لێدەوێتەوە
ئەگەر چاکەیێ لە تۆ مەشهوودە    ئەوە لە ئاسار ئەسڵی وجوودە
بیدەرە عەقڵەکەی خۆمان    چاک چاک مانای«مااصابک» بزان
زاهیر بۆ سەواب بەمەحزی فەزڵە    عیقابی جەنابی حەق عەینی عەدڵە
عەقڵت وەسوەسە ئەگەر کەم ناکا    هەر دەڵێی قودرەت بۆچ چاکم ناکا
ئەم قسە چلۆن سا موسەللەم بێ    قودرەت نایێڵێ ئەسڵت عەدەم بێ
قەلبی حەقایق ئەمرێکە بەتاڵ    تەئسیری قودرەت بۆ مەحاڵ مەحاڵ
بۆ ماهیەتی مەعدوومی ناکەس    پووشینی لیباس وجوود بەسە بەس (مەولەوی:٦٨٢)

**بەشی پێنجم- رەخنە**

مەولەوی پێی وایە شتەکان خراپەیەکی سروشتیان نییە و زۆرتر باری چاکەیان هەیە. دروستە کە ئاگر سووتێنەرە (وەکوو جارێک تەواو کتێبەکانی ئەوی سووتان) بەڵام هەروەها خۆی دەڵێ ئاگر کەڵکی زۆری بۆ ژیان هەیە؛ بۆ نموونە بۆ ساز کردنی خواردەمەنی.

لێرەدا دەگەڕێینەوە بۆ سەر بابەتی سەرەکی وتارەکە؛ واتا ویستی ئازاد یان ئیرادە لە ڕوانگەی مەولەوی و زانایانی ترەوە. مەولەوی لە کتێبە بەناوبانگەکەی بەناوی «عەقیدەی مەرزیە»، باسێکی تایبەت بە ئیرادە و ئیختیاری هەیە لە ژێر سەردێڕی «قەزا و قەدەر»دا کە درێژترین وتاری کتێبەکەیەتی. زۆربەی ئەو لێدوانانەی سەرۆ و ئەوانەی لە دواییدا دێن لە ئەو وتارەی مەولەوی وەرگیراون. لە پێشدا بزانین زانایانی تر لە بارەی ویستی ئازادەوە هەڵوێستیان چیە؟

هەموان هەست بەوە دەکەن کە ویستی ئازادیان هەیە؛ بە ویست و دڵخوازی خۆیان دەست بە کار و چالاکی دەکەن. ویستی ئازاد یان ئیرادە، بیرۆکەیەکی مێژوویە، بەڵام هەتا ئێستا ڕێکەوتنێک لەسەر پێناسەکەی لە نێوان فەیلسووفەکان و زانایانی سەردەمدا نەکراوە. هەرچەندە کە هەموان (ئەڵبەت مرۆڤی ئاسایی) هەستیان بە ویستی ئازاد هەیە، بەڵام لە لایەکی ترەوە لە جیهانێکدا دەژین کە بەشێوەیەکی جەبری و براوە بەڕێوە دەچێت کە لە سەر بنەمای یاسا سروشتیەکان دایە.

پرسیار ئەویە ئەگەر ئێمە بەشێکین لە جیهانیی فیزیکی، هۆکاری گشت ڕەوت و کردەوەکانمان دەبێ سروشتی بێت. بەڵام جیهان چ جەبری بێت چ نەبێت، مرۆڤ بە شێوەیەکی یاسایی هەست دەکات کارە دڵخوازەکانی بە هۆی خواستی دەروونی خۆیەوەیە. هەروەها هەست لە ڕووی دەورێک کە ئیرادە لە ڕەوتی مرۆڤدا دەیگێڕێت و سازینی جەبر و ئیرادە، سێ ڕوانگەی جیاوازی لە نێوان زانایان و پسپۆڕاندا هەیە. برێک لەوان ئیرادە بە جۆرێک هێزی تایبەت دەزانن کە مرۆڤ هەیەتی بۆ پچڕاندنی زنجیری هۆکاری لە جیهاندا. بەم دەستە دەڵێن «ئازادیخوازی ڕێکنەکەوتوو». ئەمانە پەکی توند لە ویستی ئازاد ڕچاو دەکەن کە تێیدا مرۆڤ دەتوانێ جەبری پێ بشکێنێ. بە بڕوای برێکیان کارێک ئازادانەیە کە ناجەبری بێت (لیبێت، ٢٠٠٤)، یاکوو لانی کەم هۆکاری کارگێڕانەکەی لە لایەن مرۆڤەوە بێت (کەین:١٩٩٦).

لەلایەکی ترەوە، برێکیان کە هەموو شتێک لە جیهاندا ڕوو دەدات ئاکام یا شوێنەواری ڕووداوێکی ترن بە شێوەیەکی پێویستی. بە بڕوای ئەوان، هیچ چەشنە ویستێکی ئازاد پەسەند ناکرێت چوونکوو یاساکانی سروشت (هۆ- شوێنەوار) لا دەدەن. برێکیان تەنانەت ویستی ئازاد لە جیهانێکی ناجەبریشدا ڕەت دەکەنەوە (پییێربووم، ٢٠٠١). دوایین دەستە بەناو «ڕێممەوتووەکان» دەناسرێن کە پێناسەیەکی سووکتر لە ویستی ئازاد ڕەچاو دەکەن، لە ئاستی کارگەلی دڵخواز لە بەرامبەر کارگەلی لە خۆوە یان داسەپێندراو. واتە بە جۆرە واتایەکی مرۆڤی دەیزانین کە بۆ هەڵبژاردن لە نێوان شتەکان لەبەردەستدایە. دیمانەی ڕێککەوتووەکان (فرانکفۆرت، ١٩٧١و١٩٨٨؛ سمێت، ٢٠٠٣) لایان وایە کە ویستی ئازاد کاتێک هەیە کە مرۆڤێکی ساخ بە دڵخوازی خۆی دوور لە سەپاندن، کاردانەوەیەکی بێت. ئەوان پێیان وایە ئەگەر جەبر ڕاست بوایە، مرۆڤ نەیدەتوانی جۆرێکی تر کاری بکردایەت. ئەگەر هەل‌ومەرج جۆرێکی تر بوایا، ئەوان کاردانەوەیان جیاواز دەبوو (سمێت، ٢٠٠٣).

| جەبریەتی سەخت (ڕێکنەکەوتووەکان) | جەبریەتی نەرم (ڕێککەوتووەکان) | ئازادیخوازی (ڕێکنەکەوتووەکان) | دەستەکان تایبەتمەندی |
|---|---|---|---|
| شێوە پەدیدەیی | زەینی ڕمێلە دەماری | نافیریکی کوانتۆم | هەبوون/ ئانتالۆجی |
| نا | ئا | ئا | کاردانەوە/ کەڵک |

خشتەی ١ڕوانگە جیاوازەکان دەربارەی ویستی ئازاد و تایبەتمەندیەکانی

## پێناسەی ویستی ئازاد:

فەیلسووفەکان پێناسەگەلی بەکەڵک و ڕوونیان سەبارەت بە ویستی ئازاد خستووە بەردەست. «جۆن لۆک» لە زنجیرە وتارەکانیدا ئیرادە بەم چەشنە دەناسێنێت: «ئیرادە یان خواست لە کارەکانی زەینە کە بیر و هزرەکان بەرەو بەدیهێنانی چەشنە کارێک دەبات؛ واتە هێزێک دائەنێ بۆ بەدیهێنانی کارەکە» (لاک،١٩٦٠).

هیۆم هەرچەندە کە دان بە ویستی ئازاددا دەنێت، ئەڵێت کە: «شتێک نییە...هوشیارە...بێجگە لە هەستێکی دەروونی کە ئێمە لێی ئاگادار و هوشیارین ئەوکاتەی کە دیارە دەست بە چەشنە حەرەکەتێک بە لەشمان ئەدەین یان دەرکێکی نوێ دێتە زەینمان» (هیوم، ١٧٤٦). شایانی باسە کە ئەمە وەکوو دیمانەی نوێی «ویگنێر»ە. ویگنێر لای وایە کە ویستی ئازاد بەستراوە بە دەرکی پەیوەندی نێوان خواست و کارەوە (دەرکی زەینی) کە وەکوو دەرکی هۆکاری گشتیە (ویگنێر، ٢٠٠٢). ویگنێر دەڵێت کە بیری هوشیاری لە بارەی کارێکەوە و خودی کارەکە هەردووکیان لە ناهوشیارەوە بەدی دێن. ئەم هاوکاتیە ئەبێتە هۆی ویستی هوشیار و وائەزانین بیرەکە هۆی کارەکەیە: «هەست و ویست کەوابوو شێوەیەکە لە زەینمان ئۆپراسیۆنی خۆیمان بۆ دەردەخات، واتە ئۆپراسیۆنی ڕاستەقینەی نییە» (ویگنێر، ٢٠٠٢).

ئەم دیمانەیە لە ئەوەی هیۆم بەناوی هۆکاری گشتی دەچێت (هیۆم، ١٧٤٨) کە دەرکی هۆکاری ئاکامی دەرەکی دوابەدوای ڕووداوەکانە، کە هەرچی ڕووداوەکان لە باری کات و شوێنەوە لێکتر نزیک بن زووتر لەباری هۆکارییەوە بە پەیوەندیدار دەزانرێن. دێنێت ڕەخنە لە دیمانەی "ویگنێر" دەگرێت و لێی دەپرسێت: «ئەو "ئێمە" کێیە یان چیە و لەکوێی مێشک دایە؟» (دێنێت، ٢٠٠٣). ئەگەر ئەو بە سنووداری دەستی بە پرۆسە ژێرسازیەکان دەگات، وەکوو کارمەندێکی ژێردەست نە وەک سەرۆکێک، لە حەڵقە دەرکەوتوووە و کارێکی لە دەست دەرنایەت. بە هۆی بەدیهاتنە تەکامۆڵیەکانەوە دەتوانێت چەند بژاردەی جیاواز ڕەچاو بکات و ئاکامەکانی هەڵسەنگێنێت بەر لەوەی کارێک دەسپێ بکات، تاکوو تووشی دەرئەنجامە ڕیسکیەکان و هەوڵ و هەڵەی پاپری (Popperian) نەبێت. کەوایە «دێنێت» ویستی ئازاد بە بەرهەمی تەکامۆڵی بیۆلۆژیایی دەزانێت نەک بە بابەتێکی فیزیایی و کوانتۆمی. ئەو توانایی بەرچاوهێنان یان خۆپارێزەری کە مرۆڤ پێی گەیشتووە بۆ بە شوێن مەبەستدا چوون، وەکوو بەرنامە کۆمپیۆتەریە نوێکانە کە وردە وردە چاکتر کراوەن تا ئەو ڕۆ. بەکارهێنەرەکانی ئەو بەرنامانە ئاگاداری هۆی پێکهاتنەکانیان و ئەوەی لە پشت ئەو ڕواڵەتەوە نین. بە بڕوای "دێنێت" مرۆڤ لۆیێکی ئەرکی (function) نەک ئاناتۆمی لەسەر توانایی ئاژەڵەکانی ترەوە بۆ خۆی

داناوە تاکوو بڕیار بدات لە پاشان چی بکات. بە هۆی ئەم توانایییەوەیە کە دەتوانین لە خۆمان یاکوو کەسانی تر بمانەوێت کارێک بکەین و بڵێین بۆ وامان کرد؟

## ڕوانگەی مەولەوی لەبارەی ئیرادەوە:

| | |
|---|---|
| وسەر هەوارگەی شەشەمینەدا | قەزا و قەدەر وان لە کەمینەدا |
| مەزهەبی قەومی ئەشعەریەیە | قەزا ئیرادەی ئەزەلیەیە |
| بەستە بە ئەشیا تەمام و کەمال | لەسەر هەرچی هەن «فی ما لا یزال» |
| قەدەر ئیجادی حەق تەعالایە | «فەضلا، رحمە» بۆ ئەو ئەشیایە |
| لەسەر قەدرێکی مەخسووس موتەقەن | بە تەقدیرێکی مەنسووس موعەییەن |

مەولەوی وەکوو زانایانی تر ئەوەی زانیوە کە هەرچەند ئێمە لە دونیایەکی جەبریدا دەژین کە هەموو شتێک لەسەر بنەمای یاسا سروشتیەکان بەڕێوە دەچێت، بەڵام هەست بە ویستی ئازاد دەکەین. ئەڵبەت مەولەوی جیهانی جەبری بەو بۆنەوە کە دیندار بووە، بە هۆی ئیرادەی خوداوە دەزانێت. بەوانەی کە بە تەواوی بە جەبر بڕوایان هەیە «جەبری» دەڵێت و بەوانەیش کە باوەڕیان بە ئیرادەی مرۆڤ هەیە «قەدەر»ی دەڵێت:

| | |
|---|---|
| قوم افرطوا، قوم افرطوا | اذنهم حق هلا قرطوا |
| جەبری بە حاڵ و قەدری مەجووس | لەبۆ خوێن خۆر ئەم بۆ سروان جووس |

کە ئەمەی دوایی نزیکە لە بڕوای ئێعتیزالەوە. لە لاییێکەوە جەبریەکان بە بێحاڵ ناو دەبات کە بە هۆی بێبڕوایی بە ئیرادەی ئازادەوەیەو قەدەریەکانیش بە بێدین ناو دەبات. ئەو ئەڵێت:

| | |
|---|---|
| وایان کردگە عولەمای ئەبرار | لە گردەل بەیان سێڕڕی ئیختیار |
| حەق عەتای فەرموو بەبێ گفتۆگۆ | ئیرادەیەکی موتڵەقە بە تۆ |
| ئەو تەعەللوق سەرفی قودرەتە | جەبرە ئەر خالقی «ربالعزە»تە |

ئەگەر ویستی ویستی ئازاد خوڵقاوی مرۆڤ بێت، ئێعتیزال دروستە. ئەڵبەت پێی وایە ئەمە دروست نییە چونکوو تەعەللۆق یان بەخشینی ئیرادەی کامڵ خۆی جەبرە؛ واتە ڕوانگەی ئەشعەریەکان دروستە.

| | |
|---|---|
| گوێ بدە مەکە و هیچ وەتەقەوە | هەتا سەر دەنێی تەق وە حەقەوە |
| وابەستە دەبێ ئیرادەی باری | بە بەعزێ ئەفعال بێئێختیاری |
| بەندە ئیرادەی بوێ یا نەوێ | تێرێتە وجوود، پەکی ناکەوێ |
| ئەو فیعلە لاوە فڕێ دە ئەو کەنار | مەیکە بە دەلیل نەفی ئیختیار |
| بەڵێ بەعزێ فێعل بەندە دیارە | وجوودی مەربووت بە ئێختیارە |
| یانیهای «فیالعبد» خالێقی مەعبوود | ئێرادەی قودرەت تێرێتە وجوود |
| ئەو ئێرادەیە کە پێی هاتە بەین | دەدا تەرجیحی یەک لە تەرەفەین |

(مەولەوی:٧١٥)

مەولەوی ئاماژە بەوە دەکات کە مرۆڤ لە هەندێک لە کارەکانی خۆی ئاگادار نییە و لە بواری دەروونناسیدا ئەو کردەوانە بە ئۆتۆماتیک ناو دەبرێت. ئەو هەروەها دان بەوەدا دەنێت کە بڕێک لە کارەکانی مرۆڤ پەیوەندی بە ویستی ئازادەوە هەیە.

بەتایبەت کە مرۆڤ هۆی کارەکانی خۆی بۆ خۆی دەگێڕێتەوە و شانازی پێوە دەکات.

| | |
|---|---|
| بە ئیستلاحی کیتاب و سوننەت | عورفی عام و خاس ئەهالی لوغەت |
| ئەم هەفت سیفەتە هەیە کالاجماع | وەسەر بەندەدا موتڵەق بێنیزاع |
| ئیسنادی ئەفعال هەرکەسێ بۆ خۆی | دەدا ئەباڵ خۆی تەماشای دەکەی |
| فلان تواناس، ئەو ناتوانا | ئەوە دانایە، ئەویان نەدانا |
| ڕۆییم و هەڵسام، دانیشتم، بردم | خواردم و کوشتم، نەمکرد یا کردم |
| حەتتا کە جەبری شۆهرەی ئافاقە | مونکیری حیسسە هەر بەم سیاقە |
| غایەت ئەمەتە لە شک بەریە | وەسف و حەقی تۆ وەک ئی حەق نییە |
| نە خۆت وەک جەماد بە دڵ ئاوەردەن | نە خۆیچت بەو تەرز بە خالیق کەردەن |

(مەولەوی:٧٣١)

بە بڕوای مەولەوی ئیرادە لە قودرەتەکانی مرۆڤە. هەر چەشنێک بێت دەزانین هەیە و بە زمان و وشەکان وەسف ناکرێت.

| | |
|---|---|
| بۆچ بۆ تەعەللوق قودرەت بە مەقدوور | وەجهی ئیختراع هیچ نییە زەروور |
| «فیالازل قدرة ربنا المطاع» | بەستە بە عالەم بێ ئیختیراع |
| «عند الاختراع بنوع اخر | من التعلیق» پەنجەی دا لە دەر |
| تەعەللوقێکیچ با بوێ دیسان | نەوعێ تر لەبۆ قودرەتی ئینسان |
| هەر نەوعێ هەیە بە شەرعی موختار | موسەمماس بە ئیسم کەسب و ئیختیار |
| دەزانین هەیە نازانین چیە | بۆ ماهییەت ڕێی عزبارەت نییە |
| ویجدان پێت ئەڵێ هەیە ئێختیار | عیبارەت دەڵێ نایزانم هاوار |
| بۆچ عەیبە تەسدیق بە وجوودی | شەی نازانی بەیان حەقیقەتی کەی |
| بەعدەز دەلائێل بۆ بوون ئاوردن | هەروا دەبێت بۆ تەقریر کردن |

بەتایبەت لەباری پێناسەی ڕوونترەوە، ویستی ئازاد بریتیە لە بەرجیح یان بەدڵبوونی یەکێک لە دوو لایەن، کە لەڕووی زانستەوەی. زانست یان یان عیلمیش لە مەعلووم یان زانراوەوە دێت. زانراوە یان چاکە (حسن) یان خراپە (قبیح) کەوابوو تەکلیف و دابونەریت (ئەخلاق) بۆ مرۆڤ چاوەڕوان دەکرێت و لە پێناو کردەوەکانیدا بەرپرسە و پاداش و سزا ڕەوایە.

| | |
|---|---|
| دڵ ئارەزوومەند بۆ تەبینییە | فائیدە لە ئەم تەکلیفەدا چیە؟ |
| دەڵێن داعییە، هەر وەک بوو بەیان | بۆ تەعەللۆقی ئیرادە ئینسان |
| بۆچ قودرەت تابیع ئیرادەی دەوێ | ئیرادە ئەوشۆن عیلمت دەکەوێ |
| عیلمیچ تابیعی مەعلوومە سەحیح | مەعلوومیچ «حسن» دەوێ یا «قبیح» |
| پەس سا موکەللەف، مەسەل ئەر زانی | تەکلیف تەشریفی فەرموو ئەر زانی |

**بەشی پێنجم- رەخنە**

**ئاکام:**

مەولەوی وەکوو هەموو زانایانی ناوبراو لەم وتارەدا دان بەوەدا دەنێت کە جیهان و هەموو ئەجزاکانی لە حەرەکەتێکی جەبری و دیاریکراودا بەرەو پێش دەڕۆن. لەلاییێکی ترەوە ئەو دەزانێت کە مرۆڤ هەست بەوە دەکات کە خاوەن ئیرادە و ویستی ئازادە و تەنانەت لە نێوان کارە خودبەخودیەکان و کارە بیرلێکراوەکاندا تەوفیر و جیاوازی دادەنێت. بۆ وێنە مرۆڤ دەزانێت کە کارەکانی هی خۆیەتی و بە کارە چاکەکانی و سەرکەوتنەکانیەوە شانازی دەکات.

زانایانی هاوچەرخ کارو دەرەنجامەکانی جیهان دەگێڕنەوە بۆ سەر بنەماو یاساسروشتیەکان. لەکاتێکدا مەولەوی وەکوو موتەکەلیمێک ئەوانە لەلایەن خوداوە دەزانێت. زانایانی هاوچەرخ هەست بە ویستی ئازاد بە پێکهاتەیەکی سروشتی دەزانن کە بە ئاکامی سالانێکی هەرە زۆر لە تەکامۆڵ و گەشەسەندنی مرۆڤی دەزانن. ئەوان دەڵێن کە هەست بە ویستی ئازاد لەگەڵ جەبرییەتدا ڕێک دەکەوێت، چوونکوو مرۆڤ هەست بە توانایی هەڵبژاردن دەکات و ئەو توانایە بەهۆی وزەی مێشکو زەینی بۆ پێش‌بینینی ئاکامی هەڵبژاردنەکانیەتی. ئەم توانایە دژ بە هەبوونی جیهانێکی جەبری و پڕ لە یاسا سروشتیەکانییە؛ بە پێچەوانەوە، لە جیهانێکی ناجەبری و پڕ لە هەل‌ومەرجدا مرۆڤ توانایی هەڵبژاردنی نییە، چونکوو ئاکامی کارەکانی بۆ پێش‌بینی ناکرێت.

مەولەوی هەبوونی ویستی ئازاد بە مانای تەرجیحدانی لایەک بە سەر لایەکی تر بۆ هەڵبژاردنی دەزانێت، بەڵام دەڵێت ئەو توانایە خودا بە شێوەیەکی جەبری بە مرۆڤی بەخشیوە. بەم شێوەیە لە دژایەتی جیهانی جەبری و ویستی ئازاد لادەدا و وەلامی مۆعتەزیلیەکان ئەداتەوە. ئەمە لە کاتێکدایە کە زانایان -وەکوو ئاماژەی پێ کرا- ویستی ئازادی مرۆڤ بە بەرهەمی تەکامۆلی بیۆلۆژی هەزاران ساڵە دەزانن، نەک بەرهەمێکی فیزیایی.

## سەرچاوەکان:

- تاوەگوێزی، عەبدوڕەحیم (١٩٨٨) **عەقیدەی مەرزیە.**

- مەولەوی (١٩٦١) **دیوان**، لێکۆڵینەوە و کۆ کردنەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، بەغدا، چاپخانەی النجاح.

- محەمەدی مەلا کەریم (٢٠٠١) **مەولەوی، ژیان و بەرهەمی**، هەولێر، ئاراس.

Dennett, D.C .2003 .*Freedom evolves* .London :Allen Lane .

Frankfurt, H .G .1971 .(*Freedom of the Will and the Concept of a Person*, Journal of Philosophy, 68, 5–20 .

Frankfurt, H .G .1988 .*The Importance of What We Care About* .Cambridge : Cambridge University Press.

Hume, D .1748 .*Enquiry concerning human understanding.P.F* .Collier & Son.

Kane, R .1996 .*The Significance of Free Will.New York* :Oxford University Press .

Libet, B .2004 .*Mind Time :The Temporal Factor in Consciousness* . *Cambridge*, MA :Harvard University Press.

Locke, J .1690/1999 .*An Essay Concerning Human Understanding* .R .B . Jones, Ed ..2, 21, 28, http//:www.arts.cuhk.edu.hk/Philosophy/Locke/echu /

Pereboom, D .2001 .*Living Without Free Will*.Cambridge :Cambridge University Press .

Smith, M .2003.*Rational Capacities.In S .Stroud and C* .Tappolet, eds . Weakness of will and practical irrationality .Oxford :Clarendon Press, pp .17-38 .

Wegner, D .M) .2002.*The illusion of conscious will* .Cambridge, MA :MIT Press.

# ناسینەوەی «قادر» لە هۆنراوەکانی «کوردی»دا

(باسێکی پراکتیکی و شیکارییە)

د. سەلام فەرەج کەریم

**کورتە:**

تا ئێستا شتێکی وەهام دەست نەکەوتووە کە تینوێتی زانستیمی ئاودێرکردبێت. هەرچەندە هەوڵ و کۆششی کوردی، مەریوانی، مامۆستا عەلائەدین سەجادی، گیوی موکریانی، کاک حسەین نێرگزەجاڕی، سەباحی غالب، کوردستان موکریانی و د.مارف خەزنەدار و چەند کەسێکی تریش نابێ فەرامۆش بکرێن، سەرجەم ستایش بکرێن. لێرەدا بە پێویستی نازانم بەو نووسراوانەدا بچمەوە کە دەربارەی کوردی نووسراون لەبەرئەوە لە داهاتووداو لە درێژەی کارکردندا هەوڵ ئەدەین هەقی تەواوی گشت ئەو نووسینانەیش بدەین.

لە ئاکامی ئەم باسەماندا گەیشتووینەتە ئەو ڕاستییەی کە «کوردی» وەک خۆی بناسین وەک لە شیکاری هۆنراوەکانەوە گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- مستەفا بەگی کوردی پیاوێکی خوداناس، ئیماندارو رەوشت بەرز بووە.

٢- ئەو عیشقەی کە هۆشی لە شاعیر سەندووە عیشقێکی ڕاستەقینەیە نەک مەجازی؛ واتە عیشقی خواوەندە.

٣- ئەو قادرەی لە هۆنراوەکاندا ناوی هاتووە یا هێمای بۆ کراوە یا قادرن، ئەمانەن:

ا- قادری گەورەو تاک، تەنیا (خودا).

ب- «شێخ عەبدولقادری گەیلانی» رابەرو رەهرەوو پیری تەریقەتی شاعیر کە تەریقەتی (قادرییە).

ج- «قادر»ی بچووک برازای شاعیرە لە خۆشەویستی دوو قادرەکەی ترەوە ناونراوە قادر.

**وشە سەرەکییەکان:** کوردی، قادر، قسەسۆک، عەشق، هێما.

**سەرەتا:**

ئەوەی لەم سەرەتایەدا دەمەوێت بیڵێم ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە کرۆکی باسەکەوە نییە، بەڵام دەروازەیەکی گرنگە لەسەر باسەکە دەکرێتەوە بۆ دەرخستنی هۆکاری هەڵبژاردنی ئەم باسەو دیاریکردنی هەندێ زانیاری پێویست لەبارەی پلانی کارکردن و هەنگاوەکانی ئەم باسەوە هەیە. ئەویش ئەوەیە کە چۆن خولیای ئەم باسە بووم؟ پاشان مەبەستم چییە؟ بەهیوای چیم؟ لەوەڵامدا دەڵێم:

١- جیهانی کلاسیزم هێندە فراوانە کە پانتاییەکی زۆر بەرینی لە مێژووی ئەدەبیاتی گشت گەلانی ئەم جیهانەدا پێدەبرێت و ئەدەبی کوردیش هەمان شتی بەباڵا براوە، منیش لەلای خۆمەوە هێندەی مەزنی ئەو ئەدەبە ڕێزی لێ دەگرم و خولیای بووم، بە بەردی بناغەیشی دەزانم بۆ هەر هەوڵێک کە لە پێناوی ڕەسەنایەتی ئەدەبەکەماندا بدرێت بۆ پاراستن و بەرەو پێش بردنی. هەر لەو جیهانی خولیابوونەوە ئاوێتەی قوتابخانەی شیعریی بابان یا سلێمانی یا نالی بووم. وەک ڕاستییەکی بەڵگەنەویست لەگەڵ ئەو مامۆستایانەدا یەکگیر دەبم کە ئەم ئەدەبە بەرامبەر ئەدەبیاتی کلاسیزمی نوێی جیهان ڕادەگرن، ئەو شەپۆلە ئەدەبیە لەم قۆناغەی مێژووی ئەدەبی کوردیدا تۆماردەکەن.

لەم قۆناغەیشدا سا شاعیری توانا و هونەرمەند ناویان دیار و بەرهەمیان لەبەرچاوە -کە نالی، سالم و کوردین- هەرچی نالییە لای لێکراوەتەوە و کاری شیاوی بۆکراوە بە ڕادەیەک کە تائێستا هێندە کار و خزمەت بۆ هیچ شاعیرێکی ترمان نەکراوە؛ هەر بۆ نموونە هەندێک لەو هەوڵ و کۆششانە دەخەینەوە یاد کە پێشکەش بە نالی و بەرهەمەکانی کراون، ئەوەتا چەندجارێک لەلایەن چەند کەسێکەوە هەوڵدراوە و دیوانەکەی چەندجارێک چاپکراوە و شیعرەکانی ساخکراونەتەوە (وەک: گیویی موکریانی، عەلی موقبل، کوردی، مەریوانی، مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و کوڕەکانی، د.مارف خەزنەدارو هتد). ئەم کتێبانەیش لە بواری نالیناسی و هونەرەکەیدا پێشکەش کراون وەک: نالی لە دەفتەری نەمریدا: د.معروف خەزنەدار؛ نالی، زمانی ئەدەبی یەکگرتوو: کەریم شارەزا؛ چەپکێ لە گوڵزاری نالی: مەسعود محەمەد؛ دوو چامەکەی نالی و سالم: عەلائەدین سەجادی؛ کتێبی نالی : ڕێبوار سیوەیلی و...هتد.

ئەمە بێجگە لەو چەندین وتارو لێکۆڵینەوە زانستیانەی کە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاوکراونەتەوە، بێجگە لە چەند نامەیەکی ئەکادیمی کە لەم ساڵانەی دواییدا پێشکەش کراون و تەرخانکراون بۆ نالی و شیعرەکانی. کەچی دوانەکەی تر -واتە سالم و کوردی- زۆر بێنازن، هیچی وایان بۆ نەکراوە کە لەگەڵ ئەو خەرمانەی کە بۆ نالی کراوە بەراورد بکرێت. ئیتر هەروا بە ناهەق نالی کراوە بە ڕابەر و سەرمەشقی ئەدیبانی ڕۆژگاری خۆی، لە کاتێکدا من ئەوانی تر لە نالی بە کەمتر نازانم.

درێژەی نەدەینێ بە پێویستم زانی کە لا لە ئەوانی تریش بکرێتەوە لەبەرئەوە سەری خۆم کرد بە زۆرخانەی هونەردا و خۆم لە میحرابی شیعرەکانی «مستەفابەگی کوردی»دا دۆزییەوە.

٢- مەبەستم لەم خولیا بوونەیش ناسینەوەی کوچکەیەکی تری سێ کوچکەکەی بابانە و ئەوەیشی کە بمەوێت لەم باسەدا ڕوونی بکەمەوە تەنها کونجورێکی تەسکە لە جیهانی بەرین، پڕهونەر و زانستی مستەفابەگی کوردییە؛ ئەویش ناسینەوەی «قالە»یە کە لە دیوانی کوردیدا زۆر بە ئاشکرا ناوی هاتووە.

٣- هیواداریشم کە لە داهاتوویەکی نزیک، لە باسێکی تردا لە دیدگایەکی ترەوە بڕوانمە کوردی، لایەنێکی تری هونەری، زانستیی شاعیر و هەروەها بەردەوام کار بۆ ئەم زاتە و هاوڕێکانی بکەم و چاکتر ئەم گەورەپیاوانە بە گەلەکەیان بناسێنم، تا پایەی شیاوی خۆیان بۆ دەگەڕێتەوە.

## ڕوونکردنەوەیەکی پێویست:

سەرەتای ئەم خولیابوونەم دەگەڕێتەوە بۆ ماوەیەکی زۆر لەمەوپێش، بۆ کاتێک کە هێشتا هەرزە شەیدایەکی ئەدەبی کوردی بووم؛ زیاتر لە بیست ساڵ لەمەوپێش ئامبازی ئەم مستەفابەگی‌کوردییەی خۆمان بووم هەر بەو هەرزەییە چیم پێکرا، کردم؛ پاش بڕێ کۆشش، شتێکی وام پێنەکرا کە دڵی خۆمی پێخۆش بکەم، بەڵام کۆڵم نەدا و هانام بۆ مامۆستایانی خۆم، ئەو زانایانە برد کە بە شاسواری ئەم گۆڕەپانەم دەزانین؛ ڕوومکردە شاری بەغدا و بە خزمەتی هەندێ لەو پایەبەرزانە شادبووم (وەک: کاکە حەمەی مەلاعەبدولکەریم و کاک حەمەعەلی قەرەداغی، مستەفا حەمەبۆر و مستەفا نەریمان، مامۆستا مەلا عەبدولکەریم، عەلائەدین سەجادی و هتد). جارێکیان لە دەرباری مامۆستا حەمەعەلی قەرەداغی  بە دیداری کاک مستەفا حەمەبۆر شادبووم، سەرەتا ڕووم نەهات نووسینی خۆمی نیشان بدەم، بەڵام کەوتمە پرسیارکردن، باس کردنی پرۆژەکەی خۆم پوختەی بۆچوونەکانی خۆم خستە پێش چاوی مامۆستا؛ لە ئەنجامدا جەنابی هانیدام و وتی: «دەمێ ساڵە شەیدای کوردی و شیعرەکانیم، هێشتا نەهاتبوومە بەغدا و لە "وكاله الانبا، العراقيه" نەبووبووم بە فەرمانبەر کە هێشتا کارم بۆ کوردی و ساخکردنەوەی دیوانەکەی کردووە».

پاشان هەندێ ڕاوێژی پێشکەش کردم. بۆم ساخ بووەوە کە زۆربەی سەرنجەکانمان چوون یەکن، پاشان ئەوەی ڕاگەیاند کە پاش چەند مانگێکی تر چاپی سەرجەم دیوانەکەی کوردی تەواو دەبێت. زۆر بە تێروتەسەلی و زانستییەوە پێشکەشی کتێبخانەی کوردی دەکرێت. ئیتر منیش زۆر بە ئاسودەییەوە گەڕامەوە و کەشکۆڵەکەی خۆم پێچایەوە و بڕیاری ئەوەمدا چاو ببڕمە دەستی ئەو زاتە؛ چونکە زۆر لەگەڵ کوردیدا ماندوو بووە، وەک خۆی دەیفەرموو تەمەنێکی لەگەڵدا سەرف کردووە. ئیتر هەر چاوەڕێ بووم تا چاوم ڕووێ تا پاش چەند مانگێک گوێم لە بەرنامەیەکی ئەدەبی وێستگەی کوردی ڕادیۆی بەغدا دەگرت بەرنامەکە دیمانە و گفتوگۆی لەگەڵ هەمان مامۆستا سازدا و دیسان قسە هاتەوە سەر دیوانەکەی مستەفابەگی کوردی. مامۆستا لەوێیشدا ڕایگەیاند لەم نزیکانەدا دیوانی کوردی لە چاپخانە دەربازدەبێت. بەری ڕەنجی مامۆستا حەمەبۆر پێشکەشی خوێنەران دەکرێت؛ بەڵام بەداخەوە تائێستا ئەو ئاواتەی حەمەبۆر نەهاتە دی، منیش ئەو خەونەم پووچەڵ بووەوە کە بە دیوانی کوردییەوە دیبووم، ناشزانم بۆچی؟ هۆی چی بوو؟ هێندەی دەزانم ئیتر لەوە زیاتر کەس چاوەڕێی دەستی کەس نەکات، هەرکەس چی پێدەکرێت با بیکا، با خۆمان هەوڵ

بدەین بۆ هێنانەدی خەونەکانمان. ئیتر سەرلەنوێ دەستم دایەوە کارەکەم، نۆبەرەی هەوڵەکانیشم هەندێ سەرنج، بۆچوونی نوێیە سەبارەت بە کوردی و شیعرەکانی، فەلسەفە و بیر و بۆچوونەکانی، کە دەتوانم لێرەدا تەنها کورتەی بەشێک لەو هەوڵە پێشکەش بە ئێوەی بەڕێز بکەم بەو هیوایەی خزمەتێکم بە ئەدەبی گەلەکەم کردبێت.

## چی لەم بارەیەوە نووسراوە؟

تائێستا شتێکی وەهام دەست نەکەوتووە کە تینوێتی زانستیمی ئاودێرکردبێت. هەرچەندە هەوڵوکۆششی کوردی، مەریوانی، مامۆستا عەلائەدین سەجادی، گیویی موکریانی، کاک حسەین نێرگزەجاڕی، سەباحی غالب، کوردستانی موکریانی، د.مارف خەزنەدارو چەند کەسێکی تریش نابێ فەرامۆش بکرێن و سەرجەم ستایش بکرێن و لێرەدا و لەبەر کەمی ماوەیش بە پێویستی نازانم بەو نووسراوانەدا بچمەوە کە دەربارەی کوردی نووسراون لەبەرئەوە لە داهاتوودا و لە درێژەی کارکردنندا هەوڵ ئەدەین هەقی تەواوی گشت ئەو نووسینانەیش بدەین.

## بەشی یەکەم

## کوردی کێیە؟:

| | |
|---|---|
| شاسواری بەلاغەتی کوردان | یەکەتازی فەساحەتی بابان |
| مستەفایە تەخەلوسی کوردی | غەزەلی کردە بەربوتی کوردی (حاجیقادر:١٠٥). |

ئەم شاسوارەمان ناوی مستەفایە و کوڕی مەحمودبەگی کوڕی ئەحمەدبەگی ساحێبقڕانە. لە بنەماڵەی قەرە جەهەنەمییە و ئامۆزای ئەوڕەحمانبەگی ساحێبقڕانی شاعیرە کە بە سالم ناسراوە. «لەوکاتەدا لەمێژ نەبوو هەندێ لە ئەندامانی بنەماڵەی قەرەجەهەننەم لە کوردستانی ئێرانەوە هاتبوونە تازە پایتەختی میرنشینی بابان، شاری سلێمانی» (خەزنەدار:١٦٧).

مێژووی لە دایک بوون و وەفات کردنی مقۆمقۆ و گومانی لە سەرە؛ هەندێک دەڵێن ساڵی ١٨٠٩ لە دایک بووە (وەک: گیوی موکریانی: ٨ و عەلائەدین سجادی: ٢٩٦ و کوردی، مەریوانی: ٦ ، سدێق بۆرەکەیی: ٥٢٧). بەڵام د.مارف خەزنەدار ساڵی ١٨١٢ بە ساڵی هاتنە دنیای مستەفابەگ دادەنێ (خەزنەدار:٣٢٧). د.کەمال فوئادیش هەر ساڵی ١٨١٢ (فوئاد: ١٩٧٠: ٨٣)، وە محەمەدئەمین زەکیبەگیش هەر هەمان مێژوو دیاری دەکات. لە ڕاستیدا هەندێک بۆچوونی جیاجیایش لەبارەی کۆچی دوایی کوردییەوە تۆمارکراوە ئێمە لەسەر هیچ کام لەو سەرچاوانە هەڵوێستە ناکەین، چونکە هۆنراوەکانی و ئاستی بەرزی هونەرەکەی و ئەزموونی شاعیرێتی، بڕی بەرهەمەکان و ئەو هونەرمەندی و لێهاتوویە هونەرییەی کوردی و ئاستی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، گشتیان ئەوە دەردەخەن کە کوردی تەمەنێکی باشی بەسەربردبێت کە لە ٤٠ یا ٥٠ ساڵ ژیابێت، بۆیە هەر پێویست ناکات کە لەسەر ئەو مێژووە کە ١٨٥٠م قسەبکەین ئێمە وای بۆدەچین

کە ٧٠ ساڵ زیاتر ژیابێت، ئەمەیش دەبێت کاری بۆ بکرێت، بە بەڵگەی زانستییەوە ئاستی ڕاستیی دەربخرێت. ئێمە لە داهاتوودا خۆمان بۆ ئەو لایەنە تەرخان دەکەین چونکە هەندێ زانیاریی سەرەتاییمان دەست کەوتووە کە یاریدەی ڕاستکردنەوەی بۆچوونەکانی ئەو بوارە دەدات، ئەم باسەیشمان تەرخانە بۆ لایەنێکی تری جیهانی "کوردی" بۆیە لێرەدا درێژەی نادەینێ.

## کوردی، قسەسۆک

مەبەست لە قسەسۆک ئەو وتار و بڕیاردان و خەملاندنانەیە کە سەرپێی و بێبنەما و پشتیوانی پسپۆڕانەی زانستیانە دەوترێن و بڵاودەبنەوە و کەسانێکی زۆریش باوەڕی پێدەکەن؛ سەردەمانێک کاری پێدەکەن، کەچی لە ڕاستیدا هیچ بنەمایەکی نییە و هەر قسەو قسەسۆکە و بە «ئەڵێن یا گوتویانە» سەبارەت بە کوردییش لەو قسەسۆکانە زۆرن؛ هەندێکیان بێزەرەر وە بێزیانن هەرچەند هەڵەیش بێت وەک ئەو بۆچوونەی سدیق بۆرەکەیی کە دەڵێت: «چەند ساڵ، دەمێ مەلایەتی وەرگرتووە» (بۆرەکەیی:٥٢٧). ئەم بۆچوونە زیانی نییە، بەڵام کوردی مەلا نەبووە، هیچ سەرچاوەیەک، هیچ شیعرێکی خۆیشی، ئەوەیان دەرنەخستووە کە مستەفابەگ، مەلا بووبێت. هەروەها مامۆستا عەلائەدین سجادی دەڵێت: «لە تاران ناونیشانی خۆی ئەکا بەم نیوە شیعرە "احمد جد و پدر محمود و نامم مستەفا است" وە ئەیخاتە سەر ئەنگوستیلەکەی بە مۆر» (سەجادی، ١٩٧١: ٣٠٨). جا نازانین مامۆستا ئەو زانیارییەی لە کوێ هێنا؟ بەڵگە چییە کە لە تاران دروستی کردووە و کردویەتی بە ئەنگوستیلە؟ لە ڕاستیدا ئەم جۆرە کارە -واتە مۆر یا نیشان- هەبووە و گەورەپیاوان و کاربەدەستان و زانایان شتی وایان کردووە، دەشێ لەگەڵ ئەو زانیاریەدا بین بەڵام سەرچاوەی باوەڕپێکراو گرنگە، مەخابن ئەمە بەسەر مامۆستا سجادیدا تێپەڕیوە کە زۆربەی ئەو کەسانەی کاری وایان کردووە شیعرەکەیان وا هۆنیوەتەوە کە مێژوویەک تۆمار بکات، بەزۆریش مێژووی لەدایکبوونی خاوەنەکەیەتی. جا ئێمەیش گەر نووسینەکە بە ڕێنووسی فارسی بنووسین ڕاستەکەی دەبێت بە «احمد است جد و پدر محمود نامم مصطفی»یەو بەپێی ئەبجەد ئەو نووسینە ئاوا دەبێت:

احمد است = ٥١٤ + جدو = ١٣ + پدر = ٢٠٦ + محمود = ١٠٤ + نامم = ١٣١ + مصطفی = ٢٢٩

کۆی گشتی دەکاتە ١١٩٧، ئەمەیش بە ساڵی زایینی دەکاتە ساڵی ١٧٨٢م و بەو پێیە دەبێت ئەوە ساڵی لەدایکبوونی مستەفابەگ بێت. بەلامەوە سەیرە چۆن سەجادی ئەوەی ساخ نەکردۆتەوە؛ شتێ تریش هەن لەو جۆرانە وەک ئەو شتانەی کە پەیوەندی بە «قالە» و «قائانی» و ئەو شتانەوە هەیە کە لە درێژەی ئەم باسەدا لێیان دەدوێین.

## بەشی دووهەم

## کوردی، قالە

ئەمە تەوەری سەرەکی باسەکەمانە، تا بڵێی لایەنێکی گرنگ، پەیوەندیدارە بە کوردی، بیر و فەلسەفە و چۆنیەتی بەسەربردنی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە، ئەوەیش کە جێی سەرنجە ئەو بۆچوونەیە کە لە چاپکراوەکاندا چەسپ بووەو تا ڕادەیەکی زۆریش بووە بە باو کە گوایە "کوردی" سەوداسەری کوڕێکی زۆر جوان و دڵگیر بووە بە ناوی "قادر". ئەم عەشقە ئەفسوناوییە گەیشتۆتە ڕادەیەک کە تەنگ بە "قادر" هەڵچنێت، ناچاری بکات لە دەست "کوردی" ڕابکات، سەرهەڵگرێت بۆ شاری سنە. جا وەک گیوی موکریانی دەڵێت:«کوردی ئاگری جگەر هەڵیگرت، دوای کەوت و پێش کاروانەکە گەیشتە سنە» (کوردی، ١٩٧٣: ٨). کوردی لە شاری سنە سۆراغی کاروانەکە دەکات. پێی دەڵێن کە هێشتا کاروانەکە نەگەیشتۆتە سنە. ئیتر کوردی گەڕاوەتەوە و چووە بەپیر کاروانەکەوە. ساتێ کە لێی نزیک دەبێتەوە و گوێی لە زەنگی کاروانەکە دەبێت لە خۆشیدا دێتە جۆش، هۆنراوە بەناوبانگەکەی «سدای کاروانی فیرقەتدا دەڵێن سەرقافڵەچی یارە»ی وتووە. جارێ با لێرەدا هەڵوێستەیەک بکەین، چەند پرسیارێک لە خۆمان و ئەوانەیش بکەین کە ئەم بەسەرهاتەیان گێڕاوەتەوەو تۆماریان کردووە:

١- ئایا کوردی چۆن و بە چ هۆیەکی گواستنەوە خۆی گەیاندە سنە و پێش کاروان کەوت؟ هەر وڵاخ نەبووە؟

٢- ئەگەر ڕێگەی کاروانەکەی زانیوە و لە سنەوە بەرە و پیری گەڕاوەتەوە! ئەی بۆ هەر لە سلێمانیەوە بەهەمان ڕێگەدا نەڕۆیوە تا لە ڕێگا پێیان بگات؟

٣- خۆ ئەگەر خەڵکی سلێمانی توانیبێتیان بزانن کە کاروانەکە لە کام ڕێگەوە دەڕوات بۆ شاری "سنە" ئەوا خەڵکی سنە پێش گەیشتنی کاروانێک نازانن لە چ ڕێگەیەکەوە خۆی دەکات بە شارەکەیاندا ئیتر چۆن لە سنەوە ڕێنمایی کرا بەرە و پیری کاروانەکە بڕوات.

٤- ئەی باشە کوردی کە زانی قادر لەگەڵ ئەو کاروانەدا دەڕوات، بۆ هەر زوو خۆی نەکرد بە کاروانەکەدا و هەر لەگەڵ ئەوان ملی ڕێ بگرێت و قالەیشی لێ ون نابێت.

٥- ئەگەر پاش ماوەیەکی دوور و درێژیش بە ڕۆیشتنی قالەی زانیبێت، پاشان دوایان کەوتبێ ئەی چۆن پێش ئەوان گەیشتە مەنزڵ؟

٦- باشە چ هێمایەک لە هۆنراوەکەدا هەیەو بەیەک گەیشتن دەردەخات؟ بێگومان هیچ؛ تەواوی هۆنراوەکە ١٠ بەیتە، گشتی لە فیراق و لێکدابڕان، بەجێ هێشتن دەدوێ.

گەر بەوردی و زانستیانە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم بەسەرهاتە لە ڕاستی دوورە و هەڵبەستراوە. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە بەسەرهاتەکە هەر بە «ئەڵێن» سەپێنراوە و ئیتر هیچ بەڵگەیەکی مێژوویی نەکراوەتە پاڵپشتی، هەر «ئەڵێن»ە ئاخر کێن ئەوانەی کە «ئەڵێن»؟ لەکوێ وتوویانە؟ کێ ئاگای لەو «ئەڵێن»ە بووە؟ ئەی کێ لەگەڵ «کوردی»دا بووە و لە سلێمانی لەگەڵی کەوتۆتە ڕێ، لە سنەوە لەگەڵی گەڕاوەتەوە بەرەوڕووی کاروانەکە چووە؟! ئاگای لەو بەسەرهاتە بووە؟ تائێستا هەر «ئەڵێن»ە و هیچی تر.

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

بەسەرهاتێکی هەڵبەستراوی‌تر کە هەر بۆ ئەوە بووە کە ئەو سەوداسەرییەی "کوردی" بلکێنێ، بە زۆر بەسەرهاتە هەڵبەستراوەکەی سەر هەڵگرتنەکەی "قالە" بچەسپێنێ ڕووداوی شەڕەشیعرەکەی نێوان کوردی، شاعیری فارس "قائانی"یە کە گوایە لەو ساتی شەڕە شیعرەدا کوردی وێنەی "قالە" لەناو ئاوی حەوزەکەی بەردەمیدا دەبینێ، واتە قالە لەپشتیەوە ڕاوەستاوە ئیتر "کوردی" لەخۆشیاندا زمانی شیعریی دەپژێت، بەڵام قائانی هەست بەوە دەکات، ئاوەکە دەشڵەقێنێ، وێنەکە دەشێوێنێ"کوردی"یش بەمە تورە دەبێ، دەکێشێ بە تەپڵەسەرە کەچەڵەکەی "قائانی"دا، جا دەبێ بپرسین ئەگەر قالە لە سلێمانی لە دەست کوردی هەڵهاتبێت ئەی لە سنە بۆ لەپشت سەرییەوە و لە کۆشکی شای عەجەم لەگەڵیدایە! باشە ئەوا کوردی بە شۆرەتی خۆی، بنەماڵە و شاعیرێتی خۆی گەیاندە دەرباری شاهانە و بووە بە شاعیری دەرباری شا، ئەی (قالە) چی؟ ئەو لەوێ چی ئەکات؟ مەگەر ئەو شوێن کوردی کەوتبێت! خۆ ئەگەر شیکارێکی سایکۆلۆجیانەیش بۆ ڕووداوەکە بکەین ئەوا هەر تەواو وەهمیەتی بوونی "قالە"کەی مامۆستا گیوی وە چاپکراوەکانی تریش دەچەسپێت.

**کوردی، عەشق**

پێش ئەوەی بەناو دەقە شیعرییەکاندا شۆڕ ببینەوە و تەنها «کوردی، قالە» بخەینە بازنەی شیکارییەوە با تێڕوانینێکی گشتی کوردی و ئاستی عەشق و ئەوینی ئەو زاتە وێنا بکەین تا بتوانن بە ئاسانی وەڵامی گشت چۆن و بۆچییەکان بدەنەوە. هەر لە سەرەتایشەوە با گوێ لە پاکانەی خۆی بگرین کە دەڵێت:

مولتەجی نابم بە کەس کوردی لە دنیا و ئاخیرەت ڕۆژی دیوانی خودا دەستی من و دامانی عەشق

لەم ڕووەوە شاعیری گەورەمان "مەحوی" دەفەرموێت:

دیارم دەبری عەشقە جا بە سوتن بێ وا دەگرمکە من شتێ چڵوچێو بم بە چی بم کەڵکی کێ دەگرم

جا بۆئەوەی درێژدادڕی نەبێت بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو عیشقە سۆفیانەیە دەچینەوە دەربانی قورئانی پیرۆز و سورەتی «آل‌عمران» کە دەفەرموێت: «قل إن كُنتُم تُحِبوّنَ الله فأتبعوني يُحببكُم الله. واتە: پەیڕەوکردنی پێغەمبەر(د.خ) بەڵگەی خۆشویستنی خودایە، هەروەها لە سورەتی «البقرە»دا دەفەرموێت: "يُحبّونَهُمْ كحُب الله والذين آمنوا أشدُّ حُباً لله". پێغەمبەریش(د.خ) دەفەرموێت: «المر، مَعَ مَنْ احَبّ» (کوردی، ١٩٧٣: ٣٦)، واتە: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسەدا دەبێت کە خۆشی دەوێ. جا ئەم سەرەتا ڕاستەوخۆیەم بۆ ئەوەبوو کە بڵێم هەر کاتێ توانیمان ئاشنای جیهانی بیر و ئیمانی "کوردی" ببین ئەوا تەواو "قادر" دەناسین، ئەزانین کێیە، بەڵام با هەر لە سەرەتاوە ئەوە ئاشکرا بێت کە من "کوردی"م لە جیهانی ئەو عیشق و سەوداسەرییەدا ناسیوەتەوە کە سۆفییە پایەدارەکان تێیدا کەوتوونەتە جەزبەی «وقوفی قەلبی» و چاودێریی زیکری دڵی خۆیانن، توشی «شطحات» بوون وەک «حلاج و یحیی بن حبش السهروردی» کە ئەمیان دەڵێت «انا الحق» و ئەویان دەڵێت جبەکەم هیچی تری لەژێردا نییە "الله" نەبێت.

"کوردی"ش دەڵێت:

مەکەن مەنعم کە سەرگەردان، وێڵم بەدەست عیشقە زەمامی ئیختیارم

لەگەڵ عیشقت وەها یار و ئەنیسم      لە تۆش حەتتا بە کوللی بەر کەنارم
وەکو مەنسوور ئەگەر بشم سوتێنن      اناالقادر دەڵێ گەرد و غوبارم

ئایا تەنها ئەم سا بەیتە بەتەواوی "قادر"ەکەی کوردیمان پێ ناناسێنێ؟ بێگومان هێشتا ماومانە و تەنها مەبەستمان ڕوونکردنەوەی عشقی "کوردی" و خۆچواندنەکەیەتی بە "مەنسووری حەلاج"، "انا القادر"یش هەر (شطحە)یەکی سۆفیانەی ڕوون و ئاشکرایە و ئەوەیش ڕووندەکاتەوە کە "کوردی" عاشقە (ڕۆژی دیوانی خودا) دەست، دامێنی عیشقەکەیەتی. هەرچەندە ئەو تۆزەی کە وتمان بایی ئەوە دەبێت کە کوردی وەک خۆی بناسین، بەڵام کوردی ئاسا نەک منیش وەک ئەو «بەد تالیع» بم. چونکە خۆی باش بۆ مەسەلەکە چووە کە دەڵێ:

گەوهەرت کوردی وەکو خەر موهرەیە      چونکە خۆت بەد تالێعی بەد ئەختەری

دیارە هەر ئەو بەدتالعیە وایکردووە کە گەوهەری "کوردی" بە خەرموهرە (مورووەکەرانە) بناسرێت. ئەوەتا لە کۆتایی هۆنراوە بە پێزەکەی:

ئەمان مردم عیلاجێ سا لە ڕێی پێغەمبەرێ چارێویساڵ یا قەتڵ یا تەسکین لە هەر سا بۆم بکەن کارێ
دوورو یاقوت دەبارا لەم کەلامە شیرینەی کوردیخواسا کوا لە دونیادا قەدرزانێ خەربدارێ

دیارە ئەم با قەدرییەی توشی "کوردی" بووە تائێستا هەر ئاسەواری ماوە دەنا دەبوو ئەو قسەیەی خۆی بهاتایەتە دی؛ کە دەڵێت:

ئەگەر تالێع ببێ "کوردی" سزایە      بە حۆققە دوڕوو گەوهەر کەن نیسارم.

زۆر ڕاستی وتووە مەسەلەکە «تالێع»ە ئەگینا خۆی زۆر بە ئاشکراو ڕاشکاوی گەوهەری خۆی ناساندووە کەچی هەر بەزۆر خەڵکی دەڵێن ئەو نیت.

دەفەرموو گوێی بۆ ڕادێرن:

کوللی عالەم وابوون سەرگەشتە و حەیرانی عیشق      هیچ کەس نازانێ ئەحوالی سەرو سامانی عیشق
حافز و سەعدی، نیزامی و قەیس، جامی، دەهلەوی      فەیز خواهو مەعرفت جۆبوون لە شاگردانی عشق
شمس، مەولانا و منسوور کەی بە سرِ محرم دەبوون      تانەیانخواردایە ڕێزەنانی سفرەی خوانی عشق
زاهیدا خوێندووتە تەفسیری «لکل وجهە»      قەدمەدە تەعنە لە مەستی، بێخودی ڕەندانی عیشق
ملتجی نابم بە کەس کوردی لە دنیا و ئاخیرەت      ڕۆژی دیوانی خوا دەستی من، دامانی عیشق

بەڵێ ناوهێنانی ئەو هەموو زاهید و سۆفیانە مەبەستی ئەوەیە کە عیشقەکەی خۆی ئاشکرا بکات، بلێ منیش سەودای عیشقی یەزدانیم، ئەیشزانێ کە هێشتا لەپاڵ دین، نەریت و ڕەوشتدا سەرزەنشتی دەکەن، پەی بە عیشقەکەی نابەن بۆیە قورئانی پیرۆز دێنێتە بەینەوەو دەڵێ «زاهیدا خوێندوتە تەفسیری "لکل وجهە هو یولیها" (البقرە) لە تەفسیرەوە تێبگە و "قەدمەدە تەعنە لە مەستی، بێخودی ڕەندانی عیشق"». منەتیش لە کەس نازانێ، ملتجی نابێ بە کەس، ڕۆژی قیامەت دەستودامانی عیشق دەبێت. دیسان بۆ دڵنیایی لە عیشقە یەزدانییەکەی دەڵێت:

**بەشی پێنجم- رەخنە**

ئەی دووری تاجی سەری شاهانی ئیقلیمی جیهان شەمسی ئەفلاکی کەماڵ، شەمعی بەزمی عارفان

ئەی بە نادیدە بە شوهرەت سەد وەکو من عاشقت وەی لە تاوی فیرقەتت عالەم هەموو ڕەنجیدە جان

**سەرنج**: سەدی وەکو ئەو بەبێ بینین عاشقی بوون، کێیە کە نادیدەیە و نابینرێ

لە ئەنجامدا ڕوونی دەکاتەوە کە ئەوەی هاتۆتە ڕێی وە بووەتە مایەی لۆمە و چەرمەسەری ئەو عیشقەیە و ئەویش بەدەست خۆی نییە و بۆیە پاکانە دەکات و دەڵێت:

ئەوەی ڕووی داوە لە من کاری دڵی بەدبەختە وا منی کردووە بۆ تیری مەلامەت بە نیشان

سا لە وەختێکی بووە ئێستا بە مەحکومی کەسێ «فارغ‌الباتل»ە لە تەعنەی من لۆمەی‌دیگەران

گەر بە دەستم کەوێ شەرت بێ لەپێش چاوی تۆ جارێ، موفتەزەحی کەم وەکوو کوردی لە جیهان

پاش ئەوەی کە بەم پاکانانەیش هەر ناگاتە ئاکام، دژوارییەکەی نێوان ئەم و خەڵکەکە چڕدەبێتەوە و ئیتر تەنگی پێ هەڵدەچنرێت، بەتایبەتی پاش خاپووربوونی میرنشینی بابان ئەمیش ڕوو دەکاتە لای خزمانی سنە و پاشان بەرە و تارانیش چووە بە ئەزیزانیشی دەڵێت:

تکای کوردی وەهایە جارجار بکەن یادی موحیبی بێڕیاتان

پاش ئەوەی بەم کورتە یادکردنەوەیەی موحیبی بێڕیامان بەشێک لە کەسایەتیی ئەم پیاوە ئیماندارەمان دەرخست پێویستە ئەوە بڵێم لە کوردی لەخۆشیانا سلێمانیی بەجێنەهێشتووە بەڵکوو زۆر بە بێزاری ڕووی لە غەریبی کردووە هەر بۆیە نازناوی خۆی گۆڕیوە و لەوێ نازناوی (هیجری)ی بۆخۆی داناوە. هەست بە غەمی ئاوارەیی، دەردی غەریبی دەکات، بەڵام دەزانێ دەردی بە ئێمە چارە ناکرێت بۆیە پێمان دەڵێت:

لەلای هیچ کەس ڕەوا نابێ مەرام، مەقسەدی "هیجری" سەری حاجەت بەرە بەر بارەگای غەوسی سلێمانی(کوردی: ٨٥)

پاش ئەوەی دوعاخوازی دەکەین کە "هیجری" بگەڕێتەوە بەردەرگای مزگەوتی گەورەی سلێمانی بچێتە بارەگای "غەوسی سلێمانی"، ئێمە دەچینە سەروکاری "قالە"کەی ئەو "قالە"یەی کە بووەتە مایەی زیان، ناوزڕاندنی "مستەفا بەگ" و سەرچاوەی عیشقەکەیەتی. با بزانین کێیە؟

**قادر لە گوڵزاری کوردیدا**:

پاش ئەوەی بەپێی پێویست لامان لە شاعیر کردەوە و لەسەر زاری خۆیەوە ناساندمان دەبێ لا لەو "قادر"ەیش بکەینەوە کە زۆر جار لە شیعرەکاندا ڕاستەوخۆ یا بە هێما ناوی هاتووە. وەک:

قادرە کوردی لە بۆ قەتڵی هەموومان قادر عیشقی ئەو زیندە دەکات، دەمرێنێ بە عەلی

ئایا موسوڵمانێک هەیە کە نەزانێ "قادر" ناوی خوایە و هەر ئەویشە کە گیانی هەموومانی بەدەستە؟ ئایا هەموومان سوێند بەو خوایە ناخۆین کە گیانی ئێمەی بەدەستە؟ ئەی هەر ئەو زاتە پاکەیش نییە کە بەڵێنی زیندوو کردنەوە دەدات بە بەندەکانی خۆی؟ ئەم ڕاستیانە لە قورئانی پیرۆزدا چەسپیوە کەواتە ئەم قادرەی ئێرە خوای گەورەیە ئەوەتا جارێکی تر دەڵێت:

کوردی لێت بێ سەد ئەمانەت هەر کە ئەم شەو جومعەیە تا سبەی قەد مەبە غافل لە زیکری قادری

ئا لێرەدا شاعیر باسی یەکێک لە نەریتەکانی خۆی دەکات کە وەک ئەرکی دینیی گشت ئیمانداریێکی ڕاستەقینە پەیڕەوی فەرمایشتی خوای گەورە دەکات کە لە سورەتی «الجمعە»دا دەفەرمویێت: «واذکروا الله کثیراً» بەڵێ خوا دەفەرموێ و فرمانمان پێدەکات کە پاش نوێژی هەینی زۆر یادی خواوەند بکەینەوە. کوردی ئەرکی دینی خۆی جێبەجێ دەکات، بە ئەمانەتیشی دەزانێت، شەوی هەینی لە زیکری "قادر" غافل نابێت. بێگومان موسوڵمان شەوی هەینی هەر زیکری خوا دەکات.

لە جێیەکی تردا کوردی دەڵێت:

عەبەس کوردی مەلائیک دێن دەپرسن مەزهەب ودینت

کە قادر خۆی دەزانێ من لەسەر کام مەزهەب و دینم

دیارە ئەو "قادر"ەیش هەر خواوەندە و کوردی تێشووی خۆی پێیە و دڵنیایە کە پێویستی بە وەعز و تەڵقین نییە چونکە لە خۆی و ئیمان و دینی دڵنیایە و بە ڕووگەشی دەچێتە قاپی خودا. ئیتر خەڵک چی دەڵێن بیڵێن قادر خۆی ئاگای لە هەموو شتێکە.. لێرەیشدا قادر هەر خوداوەندە.

بێگومان لە ژیانی "کوردی"دا قادرێکی تر هەیە کە خەسڵەتە مرۆییەکانی پێوە دیارە و کوردییش وەک مرۆڤ دەیناسێنێ، ئەم قادرەیشیان ڕێنماییکەری کوردی بووە بۆ ناسینی قادری یەکەم، بەهۆی ئەوەوە توانیویەتی وەڵامی پرسیارەکان ئامادە بکات، دەڵێت:

ڕەهرەوت قادربێ بۆ ئەعتاو جوابی مەسئەلەت      وەرنە کوردی ناتوانێ حاڵی خۆی بۆت کا عەیان

دیارە هیوای بەوەیە کە قادر ڕۆژی حساب کە دەچێتە بەردەم بارەگای باری تەعالا قادر ڕێنمایی دەکات بۆ وەڵامدانەوە. یا قادر لەم دنیا ڕێی نیشانداوە و ڕێنمایی کردووە بۆ وەڵامی پرسیارەکانی ئەو دنیا. دیارە ئەم قادرە ڕابەری زۆرێک لە موسوڵمانانە کە وەک "کوردی" زیاتر دەیناسێنێ و ئێمەیش لە گومان دووردەخاتەوە کە ئەم قادرەیان شێخ عەبدولقادری گەیلانییە کە ڕابەری ڕێبازێکی زۆر دیار و بەرینی ئیسلامە کە ڕێبازی قادرییە و "کوردی" زیاتر ڕێنماییمان دەکات، دەڵێت:

ئەگەر کوردی دەپرسن مەزهەب، پیری تەریقی من      عەلی مەولامە قادر پیرمە مەحمودە سوڵتانم

بەڵێ "قادر" پیریەتی، وەک پیری سەرجەم دەروێشانی تەریقەی قادرییە (توکلی،١٩٨٠: ٥٥). دیارە لەنێو موسڵمانانی لای ئێمەی کورد دوو ڕێبازی دەروێشی باوبووە (نەقشی، قادری) و بە خاوەنی ڕێبازەکەیش وتراوە (پیر)، کەواتە کوردی لێرەدا بە ڕاشکاوی دەڵێت کە یەکێکە لە دەروێشانی ڕێبازی (قادری) و لەسەر ئەو ڕێبازە پەیامی عیشقەکەی خۆی بە ئاکام دەگەیەنێت. کەواتە قادری دووهەم "شێخ عەبدولقادری گەلانی"یە.

**قادرو هێما:**

"مستەفابەگی کوردی" لە زۆر شوێنی تری دیوانەکەیدا بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دەستنیشانی ڕێبازەکەی دەکات، بەهۆی هەندێ لە "سرووت"ەکانی ڕێبازی قادرییەوە هێما بۆ پیرۆزیی پەیامەکەی خۆی دەکات،

**بەشی پێنجم- رەخنە**

خوێنەرانیش دڵنیا دەکات کە بە ڕێکەوت یا بەبێ پلان ناوی "قادر" نەهاتووە و بۆ ئەوەیش دڵنیامان دەکات کە قادر کێیە؟! بەڵام بە هێما ڕێنمایمان دەکات، هێمای سەرەکی ڕێبازەکانیش ڕەنگەکانە. جا ڕەنگ وەک چۆن لە ژیانی ئاسایی مرۆڤدا تایبەتمەندیی هەیە بەهەمان شێوە لە ژیانی ئاینییشدا تایبەتمەندیی هەیە، جا چ وەک ڕەنگی پۆشاک یا چ وەک هێمای گروهی تایبەت یا وەک هەردووکیان، جا ئەوەی لێرەدا بوترێت تەنها ئەوەیە کە ڕەنگی شین یا پیرۆزەیی لەلای ڕێبازی نەقشیەوە، ڕەنگی سور یا نارنجی لەلای قادرییەکان تایبەتمەندێتی هەیە و سیمای جیاکەرەوەیە کە وەک جەنابی "مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس" خوای لێ ڕازی بێت بۆی باسکردم کە (ڕابەرانی تەریقەی قادری کاتی خۆی کەواو جبەی ئاڵا یا سوری جەرگییان پۆشیوە وەک هێمایەک بۆ جیاکردنەوەیان لە ڕێبازەکانی تر) (مودەڕس، ١٩٨٤). جا ئەم سیمایە لە هۆنراوەکانی (کوردی)دا چەند بارە بووەتەوە بەو ڕەنگە هێما دەکات بۆ خۆشەویست، دڵبەرەکەی:

دڵی "کوردی" کە گرفتاری جبەی قرمزییە بۆچ دەکەن مەنعی بە خوێنی دڵ ئەگەر بەرگی دەشۆت

وە یان وەک دەڵێت:

هەناسەی ئاگرینم با سەبەب نایە پەی ئەندەرپەی  کە بەرگی قرمزی پۆشی دڵم وەک مەحجەرە ئەمشەو

دیارە ئەم ڕەنگی (سوورە) لە نەستی شاعیردا جێگەی خۆی کردۆتەوە و وابەستەی پرۆگرام و بەرنامەی ژیانی بووە بۆیە وا پەیوەستی بووە هێندە بەبەهاوە باسی دەکات، لەگەڵ مانگی ڕوو تەریبی دەکات، دەڵێت:

لە عەکسی ماهی ڕوخساری بە بەرقی میتەنی ئاڵی

دەسووتا دەسری عابید دەڵقی زاهید سری سەمتورە

هەروەها جارێکی تر بۆ ناسینەوەی خۆشەویستەکەی هەر بە ڕەنگی بەرگەکەیدا دەیناسێنێ، دەڵێت:

شەماڵا جارێ بڵێ بەو سوخمە ئاڵەی دیدە مەخمورەبە حوسنی عارچی خۆی حەیفە وا بێباک، مەغرورە

دیسان هەر بە ڕەنگ دەمانباتە لای خۆشەویستەکەی، پێمان دەناسێنێ:

ئەسمەرە لا غیرەتە بالامیانە کەچ کولاە      سوخمە سەوزە مەیتەن ئاڵە چاو خومار ئەبرۆ کەمان

وە یان دەڵێت:

کەوا دارایی زەرکوتەت کەمەر چین جبە گوڵناری

کلاو لار چاو خومار شیرین سوار خاڵ شکی تاتاری

ئەم نموونە کورتانە بەشی ئەوە دەکەن کە دڵنیا ببین لەوەی "کوردی" لەدوای "قادر" کەسێکی تر دیاری دەکات، بە بەرگی سور یا قرمزی یا ئاڵ دەیناسێنێ. جا ئایا ئەمەیان کێ بێت بێجگە لەو کەسەی کە ڕابەرەکەی بێگومان کەس نییە هەر ئەو کەسەیە کە دڵی بردووە و عاشقی بووە.

ناچار دەڵێت:

ئەمەی دەیڵێم ئەگەر ئێغراقە هێجری      هیلاکی دەستی مەیتەن قرمزی بم

ئیتر ئەتوانم بڵێم بیانوویەک نەماوە بۆ ئەوەی کە "کوردی" وەک خواناسێک و سەودایەکی ڕێبازی (قادری) بناسین، چونکە هۆنراوەکانی کە هەندێ کردویانە بە بیانوو بۆئەوەی ناسینی "کوردی" لە لاڕێیەکی چەوتەوە

وێنا بکەن چونکە هەر ئەو هۆنراوانە بەڵگەی ئیمانداری، خواناسیی "مستەفا بەگی کوردی"یە، پێش ئەوەی کە کۆتایی بەم باسە بێنم بە پێویستی دەزانم ئەو گومانەیش بڕەوێنمەوە کە هەندێ جار تاکە هۆنراوەیەکی شاعیرمان دروستی کردووە کە باس لە ماڵ، مەسکەن و ناونیشانی قادر دەکات، گومانداران دەڵێن ئەی ئەمەیان چی،

گەر دەپرسن مەنزڵ، شکڵ، لیباس، تائفەی  مالْیان نزیک بە بەندیخانە و ئاشی ئەحان

بێگومان ئەو ناونیشانەیە واتە «نزیک بەندیخانە و ئاشی ئەحان» وە نزیک مزگەوتی ئەحان - ئەمە ناونیشانی ئەو گەڕەکەیە کە بنەماڵەی ساحێبقڕانی تێدا کۆ بووتەوە و تائێستایش مزگەوتی حاجیئەحان، خانووەکەی حەمدی و هەندێ لە خانووەکانی تری ئەو بنەماڵەیە ماون وە ئەمەیش ئەوە روونده‌کاتەوە کە ئەو کەسە هەر یەکێکە لە ئەندامانی ئەو بنەماڵەیە کە مستەفا بەگ خۆیشی هەر لەو گەڕەکە بووەو لە مزگەوتەکەی "حاجی-ئەحان" فێری خوێندن بووە ئەم "قادر"ەی کە لەو گەڕەکەیش بووە هەر "قادر"ی برازای شاعیرمانە کە هەر لەبەر ڕێزو پیرۆزیی "قادر" ئەو برازایەی ناوناوە قادر وە هەر خۆیشی بەخێوی کردووە چونکە باوکی "قادر" زوو مردووە و "مستەفا بەگ" خێزان و منالەکەی گرتۆتە خۆی (حەمەبۆر:١٩٨٠).

ئەوەی جێی سەرنجمە ئەوەیە کە ئەو قادرە چونکە زۆر خۆشەویست بووە و نازی دراوەتێ تۆزێ سەرچڵ بووە و وای بۆدەچم کە جارێک لە دایک، مامی توڕە بووە و بە تۆراوە چووە بۆ لای خزمانی سنە و ناچار مامی بە شوێنیدا دەچێت، دەیهێنێتەوە بۆ سلێمانی. وا دیارە هەر ئەم ڕووداوە بێت کە وا مەسەلەی شوێن کەوتنی قادری لێکەوتبێتەوە و سالانێک وا بە هەڵە شیکاری بۆ کرابێ، شان و شەوکەتی "مستەفابەگ"ی تۆزاوی کردبێت کە ڕاستییەکەی پێچەوانەیە. بەوهیوایەی لە داهاتوودا ئەم لایەنەیش بە بەڵگەی پتەو ڕاستبکرێتەوەو کوردیش شوێنی شیاوی خۆی پا بدرێتەوە.

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

## ئەنجام:

لە ئاکامی ئەم باسەماندا گەیشتووینەتە ئەو ڕاستییەی کە "کوردی" وەک خۆی بناسین وەک لە شیکاری هۆنراوەکانەوە گەیشتینە ئەم ئەنجامانەی خوارەوە:

١- مستەفابەگی کوردی پیاوێکی خوداناس، ئیماندار و ڕەوشت بەرز بووە.

٢- ئەو عیشقەی کە هۆشی لە شاعیر سەندووە عیشقێکی ڕاستەقینەیە نەک مەجازی؛ واتە عیشقی خواوەندە.

٣- ئەو قادرەی لە هۆنراوەکاندا ناوی هاتووە یا هێمای بۆ کراوە سێ قادرن کە ئەمانەن:

ا. قادری گەورە و تاک، تەنیا (خودا).

ب. شێخ عەبدولقادری گەیلانی ڕابەرو ڕەهرەو و پیری تەریقەتی شاعیر کە تەریقەتی (قادرییە).

ج. قادری بچوک برازای شاعیرە لە خۆشەویستیی دوو قادرەکەی‌ترەوە ناونراوە قادر.

## سەرچاوەکان:

١- قورئانی پیرۆز.

٢- فوئاد، د.کەمال (١٩٧٠) **دەستنووسە کوردیەکان**، ئەڵمانیا.

٣- شێخ عەلائەدین، ئەمین، **تەسەوف چییە؟**

٤- سەجادی، عەلائەدین (١٩٧١) **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بغداد، چاپخانەی معارف، چاپی دووهەم.

٥- خەزنەدار، مارف، **مێژووی ئەدەبی کوردی**، بەشی سێهەم.

٦- بۆرەکەیی، سدیق، **مێژووی وێژەی کوردی**، بەرگی دووەم.

دیوانەکان:

٧- دیوانی حاجی قادری کۆیی.

٨- محمّد امین، جمال، **دیوانی حەمدی.**

٩- مەریوانی، کوردی (١٩٣١) **دیوانی کوردی**، بەغداد.

١٠- موکریانی، گیوی (١٩٧٣) **دیوانی کوردی**، هەولێر، چاپخانەی کوردستان، چاپی سێهەم.

چاوپێکەوتنی تایبەت:

١١- چاوپێکەوتنێکی تایبەت لەگەڵ مامۆستا "محەمەد عەلی قەرەداغی" لە مزگەوتەکەی خۆی لە بەری کەرخی شاری بەغداد ڕێکەوتی ١٩٨٠/٢/١.

١٢- دیمانەیەکی تایبەت لەگەڵ ڕەحمەتی "مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕس" لە مزگەوتی (شێخ عەبدولقادری گەیلانی) لە بەری رەسافەی شاری بەغداد لە رێکەوتی ١٩٨٠/٣/١٢.

سەرچاوەی تر:

١٣- بەرنامەی ئەدەبی کوردی لە بەشی کوردیی ڕادیۆی بەغداد رۆژی پێنج شەممانی ساڵی ١٩٨١.

سەرچاوە فارسیەکان:

١- کریمیان سردشتي، نادر، **تذکره عرفای کردستان**.، تهران، انتشارات نگاۀ سبز ، چ١.

٢- توکلی، محمّد رئوف (١٩٨٠) **تاریخ تصوف در کردستان**، تهران، انتشارات توکلی.

# نیگەرانی لە مەرگ لە فەلسەفەی شیعری «گۆران»دا

«شیوەنی گوڵاڵە» و «لە سەرەمەرگی هیوا» وەکوو نموونە

د . ئازاد عەبدولواحد کەریم*

**کورتە:**

لە پێناوی سەقامگیر کردنی بیر و وشیاریدا، هەردەم مرۆڤایەتی لە کێشەیەکی هەمیشەییدایە. لەو ڕوانگەیەوە، گۆران هەمیشە لە بۆتەی نیگەرانی و پەرۆشیدا دەژیا لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەیدا بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ڕەهەندە مرۆڤایەتییەکان. هەردەم لەگەڵ نهێنییەکاندا یەکانگیر دەبووەوەو تەکتیک و نەخشەی ڕامان و هزری ڕۆژانەی، لە میانەی شیعرەکانییەوە بە واقعێکی ئامێتەکراو بە تووڕەیی و ژانەوە پیادە دەکرد . ناکرێت شاعیریش خۆی لە ڕەهەندەکانی ژیان بە «بوون و مردن»ەوە بەرکەنار بگرێت؛ ئەگینا هیچ پەیامێکی بە بایەخی نییە کە بە خوێنەری بگەیەنێت، چونکە شاعیران لەچی سەردەم و کاتێکدا بن لەڕووی بەرهەمەوە لە یەکدی جیاوازن. هەر ئەو جیاوازیەشە کە دوو ڕەهەندی فیکری «پۆزەتیف و نەگەتیف» دەستنیشان دەکات، بەڵام سەبارەت بە فەلسەفەی بوون بیروبۆچوونەکانیان یەکدەگرێتەوە .

بابەتی نیگەرانی و ترس لە مردن، یەکێکە لەو بابەتە سەرەکییانەی کە لە زۆربەی دەقە شیعرییە نوێیەکاندا بەرجەستە بووە. بەتایبەتی لە لای گۆران هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ هۆشمەندیی گۆران و ئامێتەکردنی فیکری لەگەڵ زانستە ئەزموونگەرییەکان و بابەتە نوێیەکانی شیعر. هەرچەندە ئەو بابەتەش لە دەقە کلاسیکییەکاندا بەرچاو دەکەوێت؛ بەڵام بەو شێوەیە نەبووە کە لەگەڵ فەلسەفەی شیعرو پرسیارکردن لە نهێنییەکانی ڕووداوە میتافیزیکییەکاندا بگونجێت.

**وشە سەرەکییەکان:** فەلسەفە، شیعر، مەرگ، بوون، میتافیزیک.

---

* مامۆستای زانستگای کەرکوک

## سەرەتا

شیعری کوردی  لە میانەی ڕەوتە مێژووییەکانی ڕابردووەوە نەریتی زمان و بابەتەکانی پاراستووە. لەسەر ئەو بناغەیەشەوە شاعیرە نوێخوازەکان پەرەیان بە تەکنیک و زمان و بابەتی شیعری داوە، بەڵام هیچ نەوەیەک بە هەمان شێوە مامەڵە لە گەڵ مەسەلەیەکی شیعریدا ناکات کە ئەوانەی پێش خۆیان کردوویانە؛ چونکە هەر ڕێبازو دەستەو قوتابخانەیەک تەکنیک و شێوازی  جیاتر لەوەی پێش خۆی بەکاردێنێ. مێژووی شیعریش خۆی لە خۆیدا مێژوویەکی خول خواردووی دوابەدوای یەکە لە پەرەسەندن. لە کودەتایەکەوە یاخود لە گۆڕانکارییەکەوە دەست پێدەکات و بەرەبەرە پەرەدەسێنی و فراوانتر دەبێتەوە هەتا دەگاتە ڕادەی مەنگی لە قالبێکی متبووی میکانیزمی و ڕێگا بۆ سەرهەڵدانی ڕێبازێک یا قوتابخانەیەکی شیعری نوێ دەکاتەوە.

بابەتی نیگەرانی و ترس لە مردن، بابەتێکە لەو بابەتە سەرەکییانەی کە لە زۆربەی دەقە شیعرییە نوێیەکاندا بەرجەستە بووە. بەتایبەتی لە لای گۆران. هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ هۆشمەندیی گۆران و ئامێتەکردنی فیکری لەگەڵ زانستە ئەزموونگەرییەکان و بابەتە نوێیەکانی شیعر. هەرچەندە ئەو بابەتەش لە دەقە کلاسیکییەکاندا بەرچاو دەکەوێت، بەڵام بەو شێوەیە نەبووە کە لەگەڵ فەلسەفەی شیعرو پرسیارکردن لە نهێنییەکانی ڕووداوە میتافیزیکییەکاندا بگونجێت.

ئایدیای «مەرگ و نهێنییەکانی» لە شیعری کلاسیکیدا بە مەبەستی  دەربڕینی ئایدیای «سۆفیزمی» بووە، یاخود جۆرێک بووە لە هەوڵدان بۆ خۆپاککردنەوەو خۆپاراستن لە گوناهـ. کەچی لە شیعرەکانی گۆراندا ئەو بابەتە دەربڕی فەلسەفەی ئامێتەکردنە لە نێوان خودی شاعیرو هەوڵدانە بۆ گەیشتن بە ئاکامەکانی چارەنووسی ئەودیوی میتافیزیک.

### ئەگەری هەڵبژاردنی بابەتەکە:

بابەتی شیعری نوێ لە بابەتە کۆنەکان جیاوازترە، هەروەها لە ورووژاندنی هێزو عاتیفەشدا. جیاوازی لە نێوان کۆن و نوێش لەوەدایە کە لەڕووی فەلسەفییەوە هەمان بابەت لە شیعری کۆندا وێنەیەکی جیاوازە لە شیعری نوێدا.

ئەگەری هەڵبژاردنی بابەتەکە لە دوو بۆچووندا یەکدەگرێتەوە:

١- لەڕووی زانستییەوە  بابەتێکی نوێیە لە ئەدەبی کوردیدا. بەپێی ئاگاداریشمان، ڕەنگە یەکەمین هەوڵ بێت بۆ خستنەڕووی بابەتێکی فەلسەفی شیعری.

٢- هەوڵێکی ڕەخنەیی شیکاریی  سایکۆلۆژییە کە گۆران وەکوو باوکێک دەستەوەستان سەبارەت بە مردنی "گوڵاڵە"و "هیوا"ی جگەرگۆشەی لە ڕامانێکی هزریدا دەقێکی پڕ لە نیگەرانی بەرجەستە دەکات.

**بەشی پێنجم- رەخنە**

**گرنگی بابەتەکە:**

مەسەلەی نوێکردنەوەی شیعر لە سنووری ڕەتکردنەوەی تەقلید، یان یاخیبوون لە شێوازە کۆنە کلاسیکییەکە زیاتر بوو، بابەت و ناوەڕۆکەکەی لە سەرچاوەیەکی تەکنیکی نوێوە وەرگرت، کە ئامێتەی فەلسەفەی نوێی زانستە ئەزموونگەرییەکان و بابەتە شیعرییە هاوچەرخەکان بووبوو. چەمکەکانی هونەرو خەسڵەتەکانی شیعری نوێی کوردی، مەسەلەیەکە هێشتا بە وردی سنوورەکەی دیاری نەکراوە، نەوەی شاعیرانی پاش قۆناغی کلاسیک، دەیانویست شیعرێکی ویژدانی فەراهەم بکەن، کە هەست ونەست و ئازارەکانی قوڵایی ناخی کۆمەڵ ئامێتەی هزرە فەلسەفییەکان بکات. هەندێک لە شاعیرانی سەردەمی ڕۆمانتیک -کە قۆناغێکە لە قۆناغەکانی نوێکردنەوەی شیعری کوردی- بیری نیگەرانی لە مەرگ و سەختی ڕۆژگار، ڕەنگدانەوەی لە شیعرەکانیاندا هەبووە؛ هەروەها ژان و تاڵی نائومێدی ساتەکانی شەڕو نائاشتییان چێشتبوو، دەیانزانی ناتوانن لە دەست ئەو نهێنییە هەڵبێن.

گرنگی ئەم بابەتەش لەوەدایە  کە وەکوو بابەتێکی فەلسەفی شیعری، پەیوەندییەکی دیالێکتیکی لەنێوان هزری گۆران و ڕەهەندەکانی گەڕان بەدوای نهێنییەکانی مردن و ئەگەرە نادیارەکانی ئەودیوی میتافیزیکی بەرجەستە دەکات. لەڕووی بابەتیشەوە لایەنێکی گرنگ لەشیعرە ڕۆمانتیکییە  فەلسەفییەکانی گۆران، بە تایبەتی لە دەقی «شیوەنی گوڵاڵە»و «بۆ هیوای کوڕم»دا دەخاتە ڕوو.

**مێتۆدی نووسینەوەی بابەتەکە:**

لە نووسینەوەی بابەتەکەدا ڕێبازی وەسفی–شیکاری بەکارهاتووە .

**بەشی یەکەم:**

**گۆران: ئایدیای نوێکردنەوەو بە تەکنیک کردنی دەق**

لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، پاش پیادەکردنی چەند ڕێبازێکی ڕەخنەیی نوێ، شیعر لەڕووی بابەتەوە، چەند گۆڕانکارییەکی، یەک لەدوای یەکی بەخۆیەوە بینی. شاعیرە نوێخوازەکان هەموو ئەو لەفزبازی و یاریکردن بە وشە و زۆر لەخۆکردنەی شاعیرانی کلاسیکییان ڕەتکردەوە و جارێکی تر داوای چاوپێخشاندنەوەیان بە زمانی شیعر و تەکنیک کرد، بەوەی کە هەرشاعیرێکی نوێخواز ئەگەر ویستی هەمان مانای شیعری شاعیرانی پێشوو لە قاڵبێکی تردا دابڕێژرێتەوە، پێویستە دەستەواژەی سەردەمی نوێ بەکار بێنێ. بەڵام تەنها دەستەواژەش سەنگی مەحەک نییە، بەڵکوو وزە و زمان و بابەت، مەرجی سەرەکین کە دەبێت شاعیر لە قاڵبی شیعریدا دایبڕێژێت. هەر ئەوەشە کە بەها هونەرییەکەی شیعر دیاری دەکات، شاعیر زمان و تەکنیکی شیعری دەکات بە پیشە، چونکە لە بەکارهێنانی بابەتدا بایەخ بە گونجاندن و ئامێتەکردنی دەدات لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی سەردەم.

پەیامی شیعر لەلای گۆران دەرخستنی بەها فەلسەفییەکانی ژیان بوو، بۆیە فەلسەفە  لەنێو زمان و دەقە شیعرییەکانیدا دەژی، شیعرەکانی گۆران لە بابەت و زمانە  فەلسەفییەکان  جیا ناکرێنەوە، ئەگەر  بۆ هەر

مەبەستێکیش نووسرابن، ئەوەش سروشتی شیعری نوێیە، زمانیش هاوبەشی شاعیرەو لێی دادەبڕێ، لە نێوان شاعیر و کۆمەڵیشدا شیعر دەتوانێت بە تەواوەتی پەیامەکەی بەجێ بگەیەنێت، بابەتیش زمان دەبووژێنێتەوە و نوێی دەکاتەوە، وێڕای ئەوەی کار دەکاتە سەر فراوانکردنی وشیاری مرۆڤ و درککردن بە بەهای ڕاستەقینەی شیعر.

مرۆڤایەتی لە کێشەیەکی هەمیشەییدایە لە پێناوی سەقامگیرکردنی بیرو وشیاریدا؛ بۆیە گۆران هەمیشە لە بۆتەی نیگەرانی وپەرۆشیدا دەژیا. لەگەڵ ژیانی ڕۆژانەیدا بۆ دیاریکردنی چارەنووسی ڕەهەندە مرۆڤایەتییەکان، هەردەم لەگەڵ نهێنییەکاندا یەکانگیر دەبووەوەو تەکتیک و نەخشەی ڕامان و هزری ڕۆژانەی، لە میانەی شیعرەکانییەوە بە واقعێکی ئامێتەکراو بە تووڕەیی و ژانەوە پیادە دەکرد، هەر شاعیرێکیش خۆی لە ڕەهەندەکانی ژیان بە **بوون ومردن**ەوە بەرکەناربگرێت، هیچ پەیامێکی بە بایەخی نییە بە خوێنەری بگەیەنێ؛ چونکە شاعیران لەچی سەردەم وکاتێکدا بن لەڕووی بەرهەمەوە لە یەکدی جیاوازن، هەر ئەو جیاوازیەشە کە دوو ڕەهەندی فیکری **پۆزەتیڤ و نێگەتیڤ** دەستنیشان دەکات. دیاری نەکردنی سنوورێک بۆ خستنەڕووی هەر دەقێک -ئەگەر نەچینە قووڵایی سایکۆلۆژییەتی شاعیرو ناوەرۆکەکەیەوە- دەقەکەشی ناکاتەوە . دەقی «بۆهیوای‌کورم»یش چەند دەلالەت و پێشبینییەکی قووڵی لە خۆ گرتووە کە لەمیانەی ڕاڤەکردنی زمانی شیعرەکەوە دەردەکەوێت. زمانی شیعری گۆران لەم دەقە شیعریەدا نەوەک تەنها خستنە ڕووی فیکرە، یان مەبەستێکی شیعری بێت و بە تەنها کۆمەڵێک تایبەتمەندێتی کردبێتە بەر شیعرەکە، بەڵکوو لە چوارچێوەی «بۆنەی» لەدایکبوونی «هیوا»دا کۆمەڵێک ڕەمز و هێما و بیری فەلسەفی پێشکەش دەکات. بە مەبەستی تێگەیشتن لە دەقی شیوەننامەدا، پێویستە خوێنەر ڕۆشنبیرییەکی فراوانی هەبێت و بشێت لایەنەکانی بیرو کەلەپوورو کولتووری مرۆڤایەتی لێکبداتەوە. ئەوەش لە زاراوەی ڕەخنەی نوێدا پێی دەوترێت «تینوویێتی ڕۆشنبیری»، ئەوەش یەکێکە لە تایبەتمەندیە سەرەکییەکانی مرۆڤی ڕۆشنبیر، بەتایبەتی شاعیر. چونکە شاعیر قسە لە گەڵ خوێنەری ئاسایی ناکات کە شیعر بۆ چێژێکی سەرپێیی بخوێنێتەوە، بەڵکوو بۆ ئەو شیعردۆستەی دەنووسێت، کە شیعر لە سەرووی هەموو هونەرەکانەوە دابنێ و لەمیانەیەوە بڕوانێتە دنیای ئەپستمۆلۆژیا و ڕۆشنبیرییەکی باڵا. چونکە شیعر «وزەو سۆزێکە کە شاعیر لە قاڵبی دەقێکدا دایدەڕێژێ و بەهاکەشی تێدا دیاریدەکات» (درو، ١٩٦١: ٨٤). وێڕای ئەوە شیعری نوێش دیدێکی فیکرییە لەمیانەی مانا ناواخنییەکانیدا کە گوزارشتی لێدەکات. گۆران لە ئەزموونێکی زاتییەوە دەست پێدەکات .بەڵام ئەو ئەزموونە نەوەک بەتەنها خۆشییەکی بێ پایان و ورووژانێکی ڕۆمانتیکییانەیە، بەقەد ئەوەی کە تواندنەوەیەکی ڕۆحیە لە چوارچێوەی ئەزموونێکی مرۆڤایەتیدا، کە لە فەرهەنگی شیعری نوێدا مانای «دیالێکتیکی تایبەتی و گشتی» دەگەیەنێت .بەو مانایەی کە ئەزموون لە لای شاعیر، لە ڕێگای موعاناتی زاتییەوە و لەنێو ئەزموونی سەرجەم مرۆڤایەتیدا خۆی دەبینێتەوە، بۆنموونە لەدایکبوونی «هیوا» مانای مەرگەساتی سەرجەم منداڵانی دنیایە، کە لەگەڵ لەدایکبوونیدا «گریانی مەجهوول»و برسێتی

دەیانگرێتەوە؛ بەدبەختی و تاڵی ژیانی باوکیشیان سەرباری. بۆ نموونە گۆران لەم چەن دێڕەدا ئەو بیرەی بەرجەستە کردووە:

ئەگەر دیدی گۆران ملکەچی دیالێکتێکی تایبەتی و گشتی بێت، ئەوا هاوکات لەژێر ڕکێفی دیالێکتیکی «مردن و ژیان»دایە کە نهێنیترین یاسای گەردوون و بوون بەرجەستە دەکات. لە شیعرەکانی گۆرانیشدا ئەو دوالیزمە بەرجەستە کراوە. هەمان ئەو فەلسەفەیەش لە شیعرێکی تردا کە ئەزموونی مردنە بە ناوی «لەسەرەمەرگی هیوادا»، وەکوو مرۆڤێکی ئامادە بۆ مردن خۆی دەنوێنێ. بەڵام چۆن ئامادە بوونێک کە تەسلیم بوونە بەفەلسەفەی چینێکی کورتی نێوان لەدایکبوون و گۆڕدا:

هەر ئەو فەلسەفەیەی ژیان لەلای گوران لە میانەی دەستەواژەکانی «گریان - هەنسکی نیوەشەو -میوانی دنیای تازە خەوخوڵقام -غونچەی ساوا...هتد» بەرجەستەکراوەو فەلسەفەی مردنیش لە «بسووتایە بەهاری عومرت - برینی عەینی ڕێگایە - یەعنی ئیتر ئەمرین» ڕوویەکی ڕەمزی و هێمای جیا جیای تێدا دیارە، هەر لە میانەی ئەو فەلسەفەیەشەوە، ژیانی مرۆڤ و خۆشی و ناخۆشی و بەدبەختیەکەی پیشان دەدات، چۆن بێگوومان شاعیر هەڵگری مەشخەڵێکی مرۆڤایەتیەو نوێنەری گەلە، گەیشتنی شاعیریش بەو پلەو پایە لە چوار چێوەی ئەو پرۆسەیەدا دەبێت کە «ئەدەب نکۆڵی لە زاتی خۆی دەکات لەپێناو بەرهەمدا؛ واتە پرۆسەکە جۆرە ڕێککەوتنێکە بۆ پیشاندانی ویستی شاعیرو مۆرکە ئایدیۆلۆژییەکەی، هەتا ئەدەبەکە لایەنە مرۆڤایەتیەکەی لە دەست نەچێت» (العید، ١٩٨٥ :٧٥).

بە خستنەڕووی ناوەرۆک و بەهای تەکنیکی دەقە شیعرییەکە، ناشێت پارچەکانی دەقە شیعریکە، لەیەک دابرین و هەر یەکەو بە جیا لە پارچەکانی تر، بیخەینە سەر باس و لێکۆڵینەوە؛ لە بەر ئەوەی شیعری کۆن پشت بە یەکێتیی بەیت دەبەستێت، کەچی لە شیعری نوێدا چەمکی «یەکێتیی ئۆرگانیزمی» سیمایەکی دیاری فۆرمی دەقە. یەکێتی ئۆرگانیزمیش واتا پێکەوە گرێدانی ڕەگەزەکانی ناوەرۆک و فۆرم و ئیستاتیکای نێوان هەر دەقێکی شیعری، بەوەی کە هەر یەک لەو ڕەگەزانە لە ناو بۆتەی گشتدا ئەرکێکی هەیەو ناشێت بەبێ فۆرم و وێنەو دەلالەتەکانی زمانی شیعری، لە دەقێک تێبگەین، هەروەها لەسەرەتای دەقەکەوە هەتا کۆتاییەکەی دەبێت سەرجەم کۆی پارچەکانی شی بکەینەوە.

یەکێک لە ئەدگارەکانی شیعری نوێ لە چوارچێوەی فۆرمدا، کە لە شیعری کلاسیزمی جیا دەکاتەوە، ئەوەیە کە دەقی شیعری نوێ لە ڕووی کێشەوە بەتەواوەتی پشت بە دەریا عەرووزیەکان نابەستێت، بەڵکو لەو کودەتایەی کە شاعیران کردیانە سەر ڕێبازە کۆنەکە، گۆڕینی ئەو کێشانە بوو کە «بڕگە» یان «کێشی خۆماڵی»، یان ناوبەناو کێشی عەرووزیشیان بەکاردەهێنا. لە بواری عەرووزیشدا، هەرچەندە گۆڕانکارییەکەی وەکوو ئەوەی فۆلکلۆر نابینین، بە بەکارهێنانی «**زیحاف**»[1] و «**عیللە**»[1]ەکان، گۆران شیاوە هەردوو ئاستی

---

[1] زەحاف:یەکێکە لە ڕاوێژەکانی عەرووز،(زەحف)کەخشانە لە بناغەدا لە زانیاری عرووزدا ئەوەیە کە ئەجزای ئەسڵیی ـ لائەدرێ،واتە زیادەو ناتەواوی تیایا پەیدا ئەکرێ.ئەمانەش هەندێکیان پێیان ئەڵێن زەحافی(مفرد)،هەندێکیان بە زەحافی(مرکب)ناو ئەبرێن.(سەجادی ،١٩٦٩ : ١٢، ١٢١)

«سیمانتیکی و ڕیتمی» پێکەوە گرێ بدات .لەم نموونەیەدا، کێشەکە دەبێت بـە هـەزەجی هەشـت هـەنگاوی سالم، کە چی لە دێڕێک و چەنـد دێـڕێکی هـەمان دەقـدا، بـەگۆڕینی هـەنگاوی «مـەفاعیلون»ی **سـالم** بـۆ «مەفاعیلانی» «موسەببەغ» توانیویەتی دەلالەتی گەشەکردن و ئاسۆی ئایندە بـە فـراوانی بەرجەسـتە بکـات. واتا درێژکردنەوەی هەنگاوەکە و فراوانکردنەوەی داهاتووی پێکەوە نواندووە.

لەم دێڕە شیعرەدا، کێشەکە هەزەجی هەشـت هـەنگاوی «موسـەببەغ»ە، کەواتـە دەقەکـە لەسـەر کێشـی هەزەجی هەشت هەنگاوی سالم یان موسەببەغە.

لەڕووی وێنەی شیعریشەوە، لە شیوەننامەکانی گۆراندا، ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت، کـە گـۆران لـە دەروازەی دیدێکی فیکری و لە ئاستی ژیان و مردنەوە وەکوو ماددەیەکی نوێ وێنـە شـیعرییەکان بەرجەسـتە دەکـات . یەکێک لە ئەدگارەکانی شیعری نوێیش، تەعبیرکردنە بـە وێنـە کـە لـە نێـو جیهـانێکی داهێنـانیی خەیاڵـیدا پێشکەش بەخوێنەری دەکات. دەقی «لە سەرەمەرگی هیوادا» باشـترین بەڵـگەی چـەمکی ژیـان- مـردن و شادی-خەم لە لای گۆرانـە . لێکچوانـدن لـە نموونەکـەدا بـۆ مانـای «خـەو»ە، وشـەی «ئـەنوێ» بـە واتـای فەرهەنگی بەکارنەهاتووە. لێرەدا خوازەیەو نیشانکراوی دووەمی «شادی»یە . «هەتاکو سیس ئەبێ» درکەیـە و واتای شارراوەی تەمەنە . بە کورتی گۆران دەیەوێت بڵێ: جیاوازیت لەگەڵ ئەو خونچەیەدا چیە، کە لە مـاوەی تەمەنیدا بەشادی و ئارامی دەژێ و تۆیش هەر لە گریان و ناخۆشـیدای، یـان لـە دێـڕی یەکەمـدا، هیـوای بـە «زەرنەقووتـە»ی باڵـدارێک لێکچووانـدووە، کـە هێلانەکـەی لەسـەر پەپکـەی مارێکـدا دانـاوەو چـاوەڕوانی چارەنووسێکی نادیار دەکات.

لەڕووی زمانی شیعریشەوە، زمانی دەقەکە زمانێکی پاک و شیعرییە، کـەچی هەنـدێک جـار وا لـە خوێنـەر دەکات، پێکوڵی مانا و هێماکانی بکات. چونکە بە حوکمی، ئـەوەی کـە زمـانی شـیعر لـە زمـانی قسـەکردن جیادەکاتەوە، ئەوەیە«مولکی هەژانی شیعرییە، کە پرۆسە سـیحراوییەکەی شـیعر لـە سـەروەرکردنی زمـان و پشکۆی ڕۆح و دیدی شاعیرەوە دەخولقێنێ» (العلاق، ١٩٩٠: ٢٧). بۆیە زمانی شیعر داوا لە خوێنـەر دەکـات بە وردبینییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکات.چونکە دەقەکەش زیاتر بۆ نـاو بەرجەسـتەکردنی حاڵـەتێکی دەروونی هەڵچووەو ڕۆچووە . هەڵبەتە پێویستی بەدەستەواژەو مانای قووڵتر هەیە، لەوەی کە شـاعیرێک بـۆ بۆنەیـەکی خۆشی، وشەی تایبەت بەو هەستە بەکار دەهێنێ کە زیاتر ناخی مرۆڤ بەرەو ئەو ڕیتمانە کـێش دەکـات، کـە پیتەکانیان لە زمانێکی تایبەتیەوە بەرەو بوونەوەرێکی پڕ لە ماناو دەلالەتی خۆشی و پێکـەنین دەبـەن. کـەچی دەمێکی ئاوا پڕلە سۆزو شعوری بێ چارەنووسـی و نادیـاریی جیهـانی کۆرپەیـەک لـە لای باوکێکـەوە، مانـای هەموو شتێک دەگەیەنێت . ئەزموونێکی واقعییە و تەعبیر لـە مانـا و هەسـت و نەسـتی مرۆڤـایەتی دەکـات.

---

[1] عیللە: لە عەرووزدا گۆڕانێکە کە لە ئاخری تەفعەلەوە ئەبێ.کەلە(عروض-عەرووز)ە کە یا هـەبوو ئـەبێ لـە (ضـرب-زەرب)ە کەشیا هەبێت.دیسان ئەم عیللەتە ئەگـەر لـە عـەرووز وەیـا زەربی یەکـەمی بەشـی قەسـیدەکەدا هـەبوو ئـەبێ لـە هـەموو قەسیدەکەدا بێتەجێ.ئەم عیللەتەش دوو جۆرە؛ عیللەتی زیادە و عیللەتی ناتەواوە. (سەجادی، ١٩٦٩ : ١٢، ١٢١)

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

کاتێک گۆران لەگەڵ «هیوا»دا بە زمانی جەدەلییەتی ژیانێکی تازەی هێشتا سنوور بۆ نەکێشراوە دەدوێت، ئەوە خۆی لە خۆیدا بەرجەستەکردنی بابەتێکی دیالێکتی گشتییە و پشت بە سیمای زمانە شیعرییەکە و وێنەکانی دەبەستێت . بەو مانەیەی کە گۆران هەموو دەلالەتەکانی لە میانەی دوو دژدا بەکار هێناوە. ئەوەش یەکەیەکی هەماهەنگی لە زمان و وێنە پێکدەهێنێت .

واتا زۆر جار ئامێتەیەکی گونجاو لە نێوان لەفزەکاندا بە شێوازێکی «ئێستاتیکی -سیمیۆلۆژیانە» لەنێوان دوو سات یان دوو دیمەنی جیاوازدا دروست دەکات. ئەوەش شێوازێکی شیعریی تازەیە و دیدی شاعیر پیشان دەدات لە بنیاتنانی دنیایەکی واقعیدا. هەر ئەوەشە بە "هیوا" ڕادەگەیەنێت، کە ئەم ژیانە دوو جەمسەری بوون و نەبوونی «مان»و «مردن»ە و ئەو داڕشتنە و شێوازە جیاوازانەش، کە لەمیانەی مانای دوو فەلسەفەوە دێنە کایەوە، ئاوێنەی خودی شاعیرن . هەروەکوو سارتەر دەڵێت: «ئەوانە ئێمەن، خورپە و فێڵەکانمان بەرجەستە دەکەن» (جیدە، ١٩٨٠: ٢٥٠).

**بەشی دووهەم:**

**نیگەرانی لە مەرگ: یان فەلسەفەی شیعرو ئەزمونی زاتی**

لە ڕوانگەی تێڕوانینی گۆرانەوە بۆ مردن، بە تایبەتی مردنی هیوا و گولاڵەی جگەرگۆشەکانی، جۆرێک لە جاویدانیی یەکێک لە دوو جۆر لە حاڵەتی مەرگەسات بەرجەستە دەبێت :

**حاڵەتی یەکەم** : ژیانێکە پڕ لە کێشەی بەردەوامی و هەڵکردن لە گەڵ مەرگەساتەکانی«بوون»دا .

**حاڵەتی دووهەم** : دەربازبوون وهەڵاتن لەو مەرگەساتانەی، کە حەتمییەتی بوون دروستی دەکات، کەمردنە و بە بۆچوونی ڕۆمانتیکییەکان، مردن جۆرێکە لە نەمریی ڕۆح .

پێکەوە گرێدانی نامۆبوون و مردن حەتمییەتێکی مێژووییە، چونکە «مردن بەشێکە لە گۆشەگیری، کەواتە مرۆڤ کە دەمرێت تووشی ئەو گۆشەگیریە ڕەهاییە دەبێت» (بزدیانف، ١٩٨٦: ١٠٣)، کەچی ڕووی دووهەمی مردن بە سیما مرۆڤایەتییەکانەوە گرێدراوە، بەو مانایەی کە مرۆڤ هەمیشە خوو بە ژیانەوە دەگرێت، چونکە ئەگەر «ژیان وەکوو ڕوودایەکی ئاسایی پراکتیک بکرایە، ئەو کاتە جۆری ترس لە مردن بەو شێوەیە نەدەبوو کە سەرجەم مرۆڤایەتی لێی دەترسێت، بەڵکو ترس دەبوو لە لە دەستدانی شتەکان، وەکوو: لەش، زات، ناسنامە، ترس لە کەوتنە ناو بێناسنامەیی...واتا ترس لەوەی کە کەسێک بە مردن بزر دەبێت» (فروم، ١٩٨٨: ١٠٣).

لە ڕوانگەی فەلسەفەوە، ژیان و مردن دوو ڕووی تەواوکەری یەک ڕووداوێکن، ناشکرێت مرۆڤ نکۆڵی لە هەستکردن بە هەردووکیان بکات، ئەوە سەبارەت بە کەسی ئاسایی، بەڵام شاعیر زیاتر هەست بە هاوکێشەی بوون و نەمانی ئەو ڕووداوانە دەکات، لەو میانەشەوە توانای دیدێکی تایبەتی بۆ بینینی شتەکان هەیە، کە چەند بتوانێت دیدێکی فراوانتر بۆ دروستبوون و نەمانی ناسنامەی زاتیی خۆی فەراهەم دەکات .

سەرچاوەی درککردن بە ژیان و مردن، هەڵوێستێکە ڕاستەوخۆ بە میزاجی شاعیرو ئاشتی و ڕووژان و وشیاری و ستراکچەری ڕۆشنبیرییەوە گرێدراوە، لەوەشدا پێکهاتەیەکی ئامێتەیی سەبارەت بە هەڵوێستێکی زاتی دروست دەبێت، هەر ئەوەشە کە هەڵوێستی شاعیر بەرامبەر بە ژیان و مردن دەستنیشان دەکات.مردن

لەلای ڕۆمانتیکییەکان، کێشەیەکە کە سەرجەم شاعیرانی ڕۆمانتیک لە فەلسەفەی شیعرەکانیاندا وەکوو نەمرییەکی ڕۆح ئاماژەیان بۆ کردووە، «"شلنگ" زووتر لە نەمریکردنی مردن نزیک بووەوە، چونکە پێی وابوو مەرگی لەناکاوی "کارۆلینی" خۆشەویستی، بەرەو جیهانی نەمریی دەبات» (شورون، ١٩٨٤: ١٨٧) .

هەستکردن بە هیچ نەبوونی ژیان و کێشەکانی، لە گۆشەنیگای ڕووداوەکانی ژیان خۆیەوە نەهاتووە، بەڵکوو لەو هەستەوە هاتووە کە مردن کۆنترۆڵی سەرجەم ساڵانی تەمەن و ڕووداوەکانی ژیانی کەسەکان دەکات، چونکە وەکوو هایدگەر گوتوویەتی: «هەبوون , ئاڕاستەکان بەرەو کۆتایی دەبەن» (بزدیانف، ١٩٨٦: ١٠٣). ئەو ئاڕاستانەشە کە نازناوی ژیانی لێنراوە، ئەوانە چەند هێڵێکی وەهمی و نەوای ڕەواندنەوەی تاریکی کەم خایەنن « ترس و نیگەرانی لە مردن، ورووژانێکی نێگەتیڤییە لەلای مرۆڤ، چونکە مرۆڤ زۆرجار لە شتی نادیارو شارراوەو چاوەڕوانکراو دەترسێت، مردنیش یەکێکە لەو ڕووداوە نهێنییانەی کە چاوەڕوان ناکرێت چارەنووسی مرۆڤ دەستنیشان بکات، بۆیە ترس و نیگەرانی لەلای شاعیران دروست دەکات» (عبدالخالق، ١٩٨٧: ١٧).

کێشەی سەرەکی لە نیگەرانی و ترسی مردن، لەوەدایە کە مردن ڕووداوێکی پارادۆکسییە (paradoxy)، بەو مانایەی کە لە یەک کاتدا هێزێکی تێکشکێنی و داهێنانێکی جاویدانییە، مرۆڤیش هەمیشە سەبارەت بەمردن نیگەرانە و لێی دەترسێ، ئەو ترس و نیگەرانییەش بووە بە میکانیزمی پیادەکردنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی ڕەفتارەکانی مرۆڤ، بۆیە «ئەقڵ، بیر، ڕامان» زۆربەی دیاردەکانی ڕەفتاری مرۆڤایەتی سەقامگیر دەکەن، هەندێک لە ڕەخنەگران بنەما وشەنگستە ئاینییەکان، وەکوو بنەمایەکی بابەتی دادەنێن، کە ناکرێت لە جیهانی دەوروپشتی مرۆڤ و هەنگاوە شعورییەکانی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی جیابکرێنەوە. براون جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە ململانێ کردن لەگەڵ مردندا، ژێدەری سەرەکی نیگەرانیی مرۆڤە. لەو ڕوانگەیەوە گۆران هەستی بە ئازارەکانی گوڵاڵەی جگەرگۆشەی کردبوو، کە لە ساتەکانی سەرەمەرگدا لەگەڵ ڕووداوێکی حەتمیی فەنابووندا، جگەرگۆشەیەکی لە بەرچاو ون دەبێت، وێڕای ئەوەی «شیعر لە هەر سەردەمێکدا بێت، جۆرە هەماهەنگییەک لە نێوان مەسەلە ئاکاری و لاهوتییەکاندا پیادە دەکات» (سکوت:٤٧).

گۆران هەرچەندە لەڕووی ئایدیۆلۆژییەوە، بڕوای بە ئایدیای شتە نادیارەکان نەبوو، بەڵکوو مەتریالییانە بیری لە مەسەلەی بوون و ئایندەی مرۆڤ دەکردەوە، بەڵام لە هەندێک حاڵەتی وەکوو مردنی «هیوا» و «گوڵاڵە»دا فکرێکی ئایدیالییانەی سەبارەت بە مردنی هەردووکیان بەرجەستە کردووە.

**حاڵەتی یەکەم**: گیاندانی هیوایە:

گۆران مەگەر بە خەون هیوا بیبینێتەوە، ئەوەش هێمای نهێنیی ئەو ملکەچ بوونەیە بە چارەنووسی مرۆڤ:

هەی هاوار، هەی داد هیوای شیرینم

گیان ئەدەی، ئەمری، ئیتر ناتبینم

ئیتر ئاخ! ئیتر ناتبینم هەرگیز

لە خەوا نەبێ، شەو شەوی پایز

(گۆران، ١٣٨٤: ٩٤)

**حاڵەتی دووهەم**: مردنی گوڵاڵەیە:

لەو حاڵەتەشدا، گۆران مردنی گوڵاڵەی بە کردارێکی سەرەوەیی غـەیبی «ئاسمـان، زاتـی خـوا» نـاوبردووە. واتە بە بیری ئەو تەنانەت مرۆڤی ئاساییش نائاگا، مردن لە یەک سەرچاوەی میتافیزیکییەوە ڕوودەدات:

لە کردارت ئەگەر مەسئوول سەمایە،

تەبیعەت، هەرچی ..حەتتا زاتی خوایە ..

**بەشی سێهەم**

**پرەنسیپەکانی نیگەرانی لە مەرگ لە دەقی «شیوەنی گوڵاڵە» دا:**

تێڕوانینی گۆران سەبارەت بە مردن، بەپێی هەڵوێست و ڕووداوەکان دەگۆڕێت. ئەوەش لەمیانەی ئەو چەمکانەی کە لە بابەتەکانی شیعری نوێ و فەلسەفەی ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشە مرۆڤایەتییەکاندا بەرجەستە دەبن. گۆران لە دەقی شیوەنی گوڵاڵەدا، پێکهاتەکانی نیگەرانی، لە مەرگی گوڵاڵەی کچیدا بەم شێوەیەی خوارەوە بەرجەستە کردووە :

٣-١- بە مردنی گوڵاڵە، تەعبیر لە «ژانی جگەرسووتان و ناسۆریی ژیان»دەکـات. بـەڵام هێشـتا ملکـەچی نهێنیی مردنەکەی نابێت، چونکە وەکوو مرۆڤ عەقڵی پێ نابڕێت؛ بۆ نموونە دەڵێت:

کچم خۆ تۆ نەماوی، تا ببینی،

کە باوکت چەن بە ناسۆرە برینی

نە تۆی پێ دێتەوە، نە عەقڵی ئەبڕێ،

لەسەر تۆ، کام یەخە، کام ئەستۆ بگرێ ؟

لە ڕوانگەی تێڕوانینی گۆرانەوە بۆ مـردن -بـە تایبـەتی مـردنی جگەرگۆشـەکەی- جۆرێـک لـە جاویـدانی یەکێک لە دوو جۆرە مەرگەسات بەرجەستە دەبێت .

**حاڵەتی یەکەم**: ژیانێکە پڕ لە کێشەی بەردەوامی و هەڵکردن لەگەڵ مەرگەساتەکانی (بوون )دا .

**حاڵەتی دووەم**: دەربازبوون وهەڵاتن لەو مەرگەساتانەی، کە حەتمییەتی بوون دروستی دەکات، کە مردنەو بە بۆچوونی ڕۆمانتیکییەکان، «مردن جۆرێکە لە نەمریی ڕۆح».

٣-٢- مردن گواستنەوەیە بۆ دنیایەکی تر، ڕەنگە چارەنووسی مـرۆڤ لـە دنیایەکـەی تـر، یـان نەمرییـەکی قەشەنگ، یاخود حاڵەتێکی پڕ مەترسی و ئەشکەنجە بێت، سەرەڕای بێبەش بـوون لـە عاتیفـەی باوکایـەتی و پەلکێش کردن بەرەو دنیایەکی سەرابی و عەدەم:

چ زوو مردی کچم! هەیهات کچی خۆم!

چ زوو، چ زوو کەوتیتە بن گۆم!

چ زوو کەوتیتە بن گۆمی عەدەم! خۆ

بە ئۆخەی تەڕ نەبوو لێوم وتم ڕۆ!. .

دەمێ پشکووتی تێر بۆنم نەکردی،

گوڵاڵەی خۆشەویست دەرلەحزە مردی!

(گۆران، ١٣٨٤: ٩٤)

٣-٣- گۆران زانیویەتی، کە مردن کۆتاییەکی حەتمیی چاوەڕوانکراوی هەموو کەسێکە، کەچی لە ڕوویکی نائومێدییەوە بەرەنگاریی دەکات، لەو ڕوانگەیەوە پرۆسەی مردن بە ملکەچ بوون بە یاسای سروشت دەزانێ، ئینجا بە گومانەوە پرسیار لە بەرپرسی مردن دەکات ودەڵێت:

لە کردارت ئەگەر مەسئوول سەمایە،

تەبیعەت، هەرچی ... حەتتا زاتی خوایە ...

بەڵێ: هەرچی و هەچ کەس بێ سەبەبکار،

پرۆتستۆی ئەوم مەگلووبە ئێجگار

بەپێی بۆچوونی دەروونناسان، مردن سزادانی مرۆڤە و لە هەمان کاتیشدا دابڕانە « لەو کەسانەی کە لەسەر زەوی خۆشمان دەوێن». یان «گردبوونەوەیە لەگەڵ ئەوانەی زووتر چوون بۆ ئاسمان» ئەوەش جۆرێکە لە فەلسەفەی نەمری لەلای شاعیرە ڕۆمانتیکییەکان.

٣-٤- لەمیانەی دەقەکەدا، لە ڕوانگەی دەروونناسییەوە پێوەرێکی سایکۆ بایۆلۆژی بەرجەستە بووە، کە بە پێی ئەو پێوەرە، بابەتەکانی نیگەرانیی مردن لە هزری کەسی بە ئاگا لە چوار هۆکاردا کۆ دەبێتەوە:

***یەک:*** بەردەوامی بیرکردنەوەی مەعریفی لە مردن، وەکوو ڕووداوێکی بایۆلۆژی.

گۆران لە زۆربەی دەقە شیعرییەکانیدا، وەکوو ڕۆشنبیرێکی بە ئاگا لە فەلسەفەی ژیان و مردن، لە حاڵەتی بەردەوامی بیرکردنەوەی مەعریفیدا بووە. بۆ نموونە لە شیعرە شیوەننامەکانی بەشی «شیوەن و فرمێسک: ٨٣-٩٩» لە دیوانەکەیدا، بەتایبەتی لە دەقەکانی «هاوڕێم بێ کەس، لاوانەوەی سەرەڕێ، لە سەرەمەرگی هیوادا، گوڵی کەم خایەن، شیوەنی گوڵاڵە»دا، زۆرجار ناوی مردنی هێناوە.

**دوو**: نیگەرانی لەو گۆڕانکارییانەی، کەبەسەر لەشدا دێت:

گۆڕانکارییە بایۆلۆژییەکانی مردن، ڕەنگدانەوەی لە دەقەکانی «گوڵی کەمخایەن» و «شیوەنی گوڵاڵە»دا بە زمانێکی تەکنیکی بەرجەستە کراوە، بۆ نموونە لە «گوڵی کەمخایەن»دا، ئەو بیرەی بەرجەستە کردووە کە باس لە شیبوونەوە و نەمانی جەستە دەکات، بۆنموونە کە گوتوویەتی:

کەچی چ زوو، چ کتووپڕ لە پەنجەیی وەرەما

لەشی شل و پەمەییت، ئەی گوڵی جوان! ژاکا

چ زوو توایەوە حوسنت لە قرچە قرچی غەما،

دوو پێشە ما ئەویش ئەرزێ لە سینەیی خاکا!

**سێ**: مردنی کەسێک لەناکاوو لە تافی لاویدا:

**بەشی پێنجم- ڕەخنە**

گۆران لە میانەی دەقە شیوەننامەکاندا، بەتایبەتی لە «شیوەنی گوڵاڵە»دا .پەیڤەکانی «کەم دەوامـی، چ زوو، دەر لەحزە» بەکارهێناوە، بۆ نموونە، وتوویەتی:

غەرامی کەم دەوامی عومری لاویم،

دڵۆپی خوێنی گەرمی ئاگراویم ؟

جگەرگۆشەی عەزیزم، نووری چاوم،

سەری تاڵە دەزووی ئامالی خاوم ؟

چ زوو مردی کچم! هەیهات کچی خۆم!

چ زوو مردی! چ زوو کەوتیتە بن گۆم!

لە ڕوانگەی تیۆرە شیکارییە- دەروونییەکانەوە، بابەتی زۆر ناوهێنـان و نیگـەرانی لـە مـردن، پەیوەنـدیی بـە ئاستی ڕۆشنبیری و بەئاگایی کەسێتیی مرۆڤەوە هەیە . بە تایبەتی ئەگەر کەسەکە شاعیر بێت. بـەو مانایـەی ڕادەی ترس و نیگەرانی لە مردن بەپێی ئەم هاوکێشەیە دەبێت:

لەمیانەی ئەم دایەگرامەوە دەردەکەوێت، کە "گۆران" وەکوو شاعیرو مرۆڤێکی بە ئاگا لە ڕووداو و نهێنییەکانی ژیان، زیاتر هەستی بەو نهێنییە کردووەو بەرامبەر بەو پرسیارە ئەزەلییەش زۆر نیگەران بووە.

***چوار***: خودی مردن پرسیارێکی بێ وەڵامە:

وەکوو نهێنییەکی جاویدانی لە کۆمەڵگادا، ڕۆڵێکی سەرەکی و کاریگەریی هەیە، چونکە مەرگ «وەکوو بالاترین ئیمکانی بوونی مرۆیی سەیر دەکرێ، لەبەرئەوەی مەرگ ئەو ئیمکانەیە کە تەواوی ئیمکانەکانی تر ملکەچین، چونکە هەموو ئیمکانەکانمان لە ئاست مەرگدا پەرت دەبن (ماکواری، ٢٠٠٥: ٢٢٣). لەو ڕوانگەیەوە، "گۆران" وەکوو ئیمکان نەبوونی پرسیارێک لە نهێنیی مەرگ، ئەو دەقەی لە چوارچێوەی تەکنیکی شیعری و فەلسەفەی بوونگەراییدا نووسیوە، وێڕای عاتیفەی باوکێک کە دەبینێ جگەرگۆشەکەی لە پێش چاویدا ئەمرێت.

## ئەنجام

لـە پێنـاوی سـەقامگیرکردنی بـیرو وشـیاریدا، هـەردەم مرۆڤـایەتی لـە کێشـەیەکی هەمیشـەییدایە، لـەو ڕوانگەیەوە گۆران هەمیشە لە بۆتـەی نیگـەرانی وپەرۆشـیدا دەژیـا لەگـەڵ ژیـانی ڕۆژانەیـدا بـۆ دیـاریکردنی چارەنووسی ڕەهەندە مرۆڤایەتییەکان، هەردەم لەگەڵ نهێنییەکاندا یەکانگیر دەبووەوەو تـەکتیک و نەخشـەی ڕامان و هزری ڕۆژانەی، لە میانەی شیعرەکانییەوە بە واقعێکی ئامێتەکراو بـە تـورەیی و ژانـەوە پیـادە دەکـرد. ناکرێت شاعیریش خۆی لە ڕەهەندەکانی ژیان بە بوون ومردنەوە بەرکەنار بگرێت. ئەگینا هیچ پـەیامێکی بـە بایەخی نییە کە بە خوێنەری بگەیەنێت، چونکە شاعیران لەچی سەردەم وکاتێکدا بن لـەڕووی بەرهەمـەوە لـە یەکدی جیاوازن. هەر ئەو جیاوازییەشە کە دوو ڕەهەندی فیکری پۆزەتیڤ و نەگـەتیڤ دەستنیشـان دەکـات، بەلاَم سەبارەت بە فەلسەفەی بوون بیروبۆچوونەکانیان یەکدەگرێتەوە .

بابەتی نیگەرانی و ترس لە مردن، یەکێکە لەو بابەتە سەرەکییانەی کە لە زۆربەی دەقە شـیعرییە نوێیەکانـدا بەرجەستە بووە. بەتایبەتی لە لای گـۆران هۆیەکەشـی دەگەڕێتـەوە بـۆ هۆشمەنـدی گـۆران و ئامێتـەکردنی فیکری لەگەڵ زانسـتە ئەزموونگەرییـەکان و بابەتـە نوێیـەکانی شـیعر. هەرچەنـدە ئـەو بابەتـەش لـە دەقـە کلاسیکییەکاندا بەرچاو دەکەوێت. بەلاَم بەو شێوەیە نەبووە کە لەگـەڵ فەلسـەفەی شـیعرو پرسـیارکردن لـە نهێنییەکانی ڕووداوە میتافیزیکییەکاندا بگونجێت .

## سەرچاوەکان:

به **زمانی کوردی:**

١- سەججادی، عەلائەددین (١٩٦٩) **ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی،** بەغدا .

٢- سیوەیلی، رێبوار (٢٠٠٥) **دنیای شتە بچووکەکان،** سلێمانی، چاپی دووەم، چاپخانەی ڕەنج.

٣- ماکواری، جۆن (٢٠٠٥) **فەلسەفەی بوونگەرایی،** سلێمانی، دەزگای نەوا .

٤- گۆران، عەبدوڵلا (١٣٨٤) **دیوان،** تهران بلاوکراوەی پانیز، چاپخانەی دالاهۆ، چاپی یەکەم .

٥- نەهایی، عەتا، ٢٠٠٩/١٠/٥**، ڕەخنەی چاودێر** - دوشەممە، ژمارە (١٨٤).

٦- قەرەداخی، عەتا (١٩٩٩) **گۆڕان و گەڕان بە دوای یەقیندا،** سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٧- مەحوی (١٩٨٤)، **دیوان،** بغداد، چاپخانەی حسام، چاپی دووەم.

**بە زمانی عەرەبی:**

1- العید، یمنی (1985) **فی معرفة النص**، اتلطبعة الثالة، بیروت.

2- العلاق، علی جعفر (1990) **فی حداپة النص الشعری**، بغداد، دار الشؤون الثقافیة العامة.

3- جیدة، عبد الحمید (1980) **الاتجاهات الجدیدة فی الشعر العربی المعاصر**، بیروت، الطبعة الاولی.

4- درو، الیزابیت (1961) **الشعر کیف نفهمه ونتزوقه**، نیویورک بیروت.

5- بزدیانف، نیقولای (1986) **العزلة و المجتمع**، بغداد، دار الشؤون الثقافیة العامة.

6- فروم،اریک (1988) **الانسان بین الجوهر والمضهر**، الکویت، سلسة دارالمعرفة.

7- شورون، جاک (1984) **الموت فی الفکر الغربی**، الکویت، سلسلة عالم المعرفة.

8- عبدالخالق، احمد محمّد (1987) **قلق الموت**، الکویت، سلسلة عالم المعرفة.

## هەستی نۆستالژا و ئەزموونی شهوودی لەقەسیدەی«شاری شارەزوور»ی نالیدا

د. ئەسکەندەر مۆرادی [-]

**کورتە:**

قەسیدەی «شاری شارەزوور»ی نالی لە ڕووی ئەزموونی شیعری و ئـەدەبییـەوە، دەقێکـی سـەرکـەوتـووی شیعری نالییە. ئەوەی لەم وتارەدا باسی لێدەکەم -ئەویش بەپێیتێگەیشتنی خۆم- هەستی نۆسـتالژای نالییـە لە شیعرەکەدا. نوستالژای نالی هەرچەند بەرهەمی ئەزموونی مەشهوودی خودی نالییە، بەڵام وێـدەچێـت، ئـەو دەنگ و دیمەنانەی لە شیعرەکەدا ڕەنگی داوەتەوە، تەنیا بەرهەمی خەیاڵ و ژیانی تایبەتی خاوەنی شـیعرەکـە نەبێت. خودی نالی و شیعرەکەی، بەرهەمی وتارێکی کۆمەڵایەتی و کولتووری سەردەمێکـی دیـاریکراوە. دەق وەک بەرهەمێکی ئەدەبی و کومەڵایەتی تەنیا بەرهەمی خاوەنەکەی نییە.

هەرچەند تێگەیشتن لە دەق یان بەرهەمێکی هونەری و ئەدەبی، بـۆ خوێنــەر زۆر جیـاوازە لـە خـودی ئـەو مەبەستەی کە خاوەنی دەقەکە دیاری کردووە، ئەویش بەو پێیەی کە کەس لە ئەزموونی شهوودی کـەسـێکی تر وەک خودی ئەو کەسـە تێناگـات، بـەڵام خوێنــەریـش وەک خـاوەنی دەق و خـودی دەق بـەرهـەمێکـی کۆمەڵایەتییە. لیرەدایە کە باس کردن لە دەق پیویست بە باس کـردن لـەو وتـارەی کـە زاڵـە، دەکـات. بـەو پێیەش نوستالژیاکەی نالی تەنیا دەنگی ئەزموونی شهوودی خودی نالی نییە. تێگەیشتن لـەو نۆستالژاشـە لـە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر و لە خوێنەرێکەوە بۆ خۆینەرێکی تر جیاوازە.

**وشە سەرەکییەکان:** نالی، نوستالژا، ئەزموونی شهوودی، شار، وتار.

---

[-] نووسەر و مامۆستای زانستگا

## پێشەکی

هەر چەند نالی فەیلەسووف نیە، یا خود ناتوانین نالی بەبونیادنەری قوتابخانـەیـەکـی فـەلسـەفی دیـاریکراو ناوزەد بکەین، بەڵام دەتوانین لە ڕوانگەی فەلسەفیەوە لە شیعر و بەرهەمەکانی بکۆڵێنەوە. بە واتایەکـی تـر لـە بەرهەمێکی شیعری دەتوانرێت چەنها پرسیاری فەلسەفی کە پێوەندن بەچەمکی «بـوون» سـەر هـەڵـبێنێت. شیعری شاری نالی ئەو تایبەتمەندیەی هەیە کە بخرێتە بەردەم لیکۆڵینەوەی فەلسەفییەوە. هـەڵـبەت لێـرەدا مەبەست لە لیکۆڵینەوە، ڕێبازێکی زانستی دیاریکراو نییە. فەلسەفە خوێ لەخوێدا چەمکێکی عامتر و بـەرینتـر لە ڕێباز یان مێتودە. بواری فەلسەفە بواریکی تەسک نیە و تـەواوی بـوارەکـانی ژیـانی کۆمەلایـەتی، ئـابووری، سیاسی، تاکەکەسی و هتد لەخۆ دەگرێت. شیعری نالی ئەو تایبـەتمـەندیـەی هـەیـەکـە ئاڕاسـتەی چـەنهـا پرسیاری فەلسەفی گرنگ بکرێتەوە. "نالی" وەک تا کەکەسیک نەتەنهـا ڕەنـگ و ڕوخسـاری ژیـانی تایبـەتی خۆێ نیە، بەڵکوو بەرهەمی وتارێکی سیاسی، کۆمەلایەتی، کولتووری و ئابووری سەر دەمێکی دیاریکراوە.

## مێتودی لێکۆڵینەوەکە

ئەم لێکۆڵینەوە فرەتر پشت بەچەمکی "تێگەیشتن" دەبەستێت تا وەکوو ئـەوەی ڕێبـازێکی دیـاریکراو ببێتـە بنەمای باسەکە. زۆر ئەستەمە کە بەپێی مێتود لەبەرهەمێکـی شـیعری تێبگـەیـن. حـەقیقـەت بـەگشـتی و حەقیقەتی شیعری بەتایبەت، ئەوەندە تەسک و گونجاو نیەکەبەپێی ڕێبازێکی زانستی دیاریکراو روخسارەکـانی خۆی بخاتەبەر دەست. هەر بەو جۆرەی "گادامێر" دەلێت: مێتود ناتوانێـت هـەمـووی حـەقیقـەت دەربخـات (ڕهبری، ١٣٨٥: ١٠٥). ڕاستیەکەی ئەوەیە حەقیقەت چەمکێکی دیاریکراو نیە، ئەوەی کەبوونی هەیە چـەنهـا جۆری تێگەیشتنە لەچەمکی "حەقیقەت".

## کورتەی ژیانی نالی

مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسی مکایەلی، لەگوندی «خاک و خۆڵ» لەدەشتی شارەزوور هاتوەتـە دونیـاوە. بەپێی لێکۆڵینەوەی مێژوونووسی بەناو بانگ "ئەمین زەکی بەگ" نالی لەساڵی ١٨٠٠ زایینی لـەدایـک بـووە و لەساڵی ١٨٥٦ کۆچی کردووە.

بەپێی ڕێبازی خویندنی ئەو سەردەمە، نالی قورئانی پـیرۆز و زمـانی فارسـی و زمـانی عـەربی خوینـدووە و ئیجازەی فەقییەتی وەرگرتووە و دواتریش بۆ خزمەت کردنی ئایینی ئیسلام زۆر لەناوچەکانی کوردسـتان گـە-ڕاوە. ژیانی نالی هاوسەردەمە لەگەڵ میر نشینی بابان و پێوەندی بووە لەگەڵ سلێمان پاشای بابان و ئـەحمـەد پاشای کوڕی (مەلا عبدالکریم مدرس، ١٣٧٩: ٢٦).

## قەسیدەی شاری «شارەزوور»ی نالی

هەر چەند ئەو سەرچاوانـەی کـەسـەبـارەت بـەنـالی نووسـراون، سالـی هۆنینـەوەی قـەسـیدەی «شـاری

شارەزوور»ی نالی جۆراوجۆر دەزانن، بەڵام بەپێی لێکۆڵینەوەی "مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس" و هەروەها بەپێی ناوەرۆکی شیعرەکە و ئەو سیما بێهیوایانەی کەلەشیعرەکەدا ڕەنگی داوەتەوە، وێدەچێت ساڵی گوتنی ئەم شیعرە١٨٤٧ی زایینی بیت؛ واتە دوای ڕووخانی میرنشینی بابان کە ناهومێدییەکی ئێجگار جەرگبڕی لە هەستی نالیدا دروست کردووە.

قەسیدەی «شاری» نالی پڕە لە هەستی "نۆستالژا"ی مرۆیەک کەتەنیا پێوەند نییەبە ژیانی تاکەکەسی خۆیەوە. "نالی" لێرەدا دەبیتە بەرهەمی وتارێکی سیاسی-کۆمەڵایەتی سەردەمێکی دیاریکراو. شیعری "نالی" یان باشتر بڵێم دەنگی "نالی" لێرەدا تەنیا بەرهەمی فیکر و بۆچوونی "نالی" نیە. بەواتایەکی تر "نالی" لەقەسیدەی «شار»دا تەنیا مرۆیەکی داهێنەر نییە. بەڵکوو ڕەنگ و دەنگ و ڕوخساری وتارێکی زاڵە. لەوانەیە ئەو بۆچوونەی "فۆکۆ" ڕاست بێت کەدەڵێت: داهێنان مەحاڵە، زۆر ئەستەمە شتێک یان بەرهەمێک بۆ یەکەم جار گوترابێت (میلز، ١٣٨٨: ٩٤). هەڵبەت مەبەستم سووک کردن یا دابەزاندنی ئاستی "نالی" نییە لەئەدەبی کوردیدا، بەڵکوو نیشاندانی دەسەڵاتی ئەو وتارەیە کە لە سەردەمی "نالی"دا دەسرۆ بووە.

## هەستی نۆستالژا و ئەزموونی شهوودی نالی

چەمکی نۆستالژا[١] لەوشەیnostos سەرچاوە دەگرێت کەبەمانای گەڕانەوە[٢]یە و وشەیەکی گریک (یونان)یە. بەشی دووهەمی وشەکەalgosەکە واتاکەی "ئێش و ئازار"ە[٣]. مانای چەمکی نۆستالژا ئەوە دەگەیەنێت کەمرۆڤێک بە یاد کردنەوەی ڕابردوو تووشی جۆرێک لەئازار و ئێش و بێهیوایی دەبێت.[٤]

هەموو کەس هەست بە نۆستالژا دەکات بەڵام جۆری هەست کردنە کە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر زۆر جیاوازە. ئەو هەست کردنە، لای "نالی" ڕەنگ و بۆ و ڕوخساری تایبەت بەخۆی هەیە. بەواتایەکی تر ئەزموونی شهوودی[٥] "نالی" کە لە قەسیدەی «شاری شارەزوور» دەنگی داوەتەوە، ئەزموونێک نییە کە لە لێکۆڵینەوەیەکی ئاوادا حەقیقەتە تاڵەکانی خۆی دەربخات، یان هەستی پێ بکرێت.

تەنیا خودی "نالی" دەتوانێت لە ناخی ئەو ئەزموونە تێبگات یان لەجۆری ئەو نۆستالژیایە بدوێت. هەر بەو جۆرەی "برگسۆن" دەڵێت بەرهەمێکی ئەدەبی و هونەری مێوەی ئەزموونە زاتییەکانی خاوەنەکەیەتی (کەماڵ، ٢٠٠٠: ١٠).

"برگسون" زانیاریەکانی مرۆڤی کردووە بە دوو بەشەوە، یەکەم: زانیاری ڕاست و ڕاستەوخۆ کە لە ناو تاقی کردنەوەی زاتیدا کە بە شهوود[٦] پەیدا دەبن. دووهەم: زانیاری زانستیانە کە لە ژیانی ڕۆژانەماندا دەیبیسین و

---

[1] - Nostalgia
[2] - Return
[3] - Pain
[٤] - ئەوەی دە ربارەی چەمکی نوستالژا لە وتارەدا هاتووە لەم ماڵپەرە گیراوە: www.thepsychologist.org.uk
[5] - Subjective Experience
[6] - Intuition t

ڕاگەیەنراون یا لە ڕۆژنامەو گۆڤارو پەرتووکەکاندا دەیانخۆێنینەوە (هەمان:١٠).

زانیاری زانستیانە تاکە ڕێیەکە بۆ توێژینەوەی بابەتەکانی دەوروبەرمان و واقیعی بەردەستەکی، بەڵام زانیاری زانستیانە لە بەر ئەوەی ناخی بابەتەکان ناپێکێت و جەوهەرەکەیمان بۆ دەرناخات و لەدەرەوەی بابەتەکە و چوار دەوریدا دەسووڕێتەوە، ئەوا ئەو ڕاستەقینەمان بەتەواوی ناداتێ و زانینێکی کورت و ناڕێکە. بەدیدی "برگسون" چەند هەوڵ بدەین بەڕێی توێژینەوە لە ناوەڕۆکی ئەدەبی یا هونەری بگەین، ئەوەندە زیاتر لەو ناوەڕۆکە دوور دەکەوینەوە و تێگەیشتنمان لەئاستیدا ناتەواو دەر دەچێت چونکە ئێمە بەو تاقی کردنەوە زاتییەدا ناڕۆین (هەمان:١١).

هەر بەپێی فەلسەفەی "برگسون"، "پروفیسۆر موحەممەد کەماڵ"، تێگەیشتنی خوێنەر لەو ئێش و ئازارانەی کە لە قەسیدەی «شاری شارەزوور»ی نالیدا ڕەنگی داوەتەوە هاوتا و هاوسەنگی تاقی کردنەوەی زاتی خودی "نالی" نازانێت.

چەمکی تێگەیشتن لە بەرهەمێکی ئەدەبی نەتەنیا پێوەندە بە تاقی کردنەوەی زاتی خاوەنی بەرهەمەکە، بەڵکوو ئەو بەرهەمە خۆیً لە خۆیدا بەرهەمی وتارێکی کۆمەڵایەتی و کولتووری جیاواز و تایبەتە. بەواتایەکی تر تێگەیشتن لە بەرهەمێکی ئەدەبی پێوەندە لە تێگەیشتن لەو وتارە[1] ی کە ئەو بەرهەمە دەخولقێنێت. "نالی" وەکوو تاکەکەسێک لەسەر دەمی زاڵبوونی وتارێکی تایبەتدا ژیاوە. لێرەدایە کە لێکۆڵینەوەی زانستی کولتر و دەسنەڕۆتر دەبێت بۆ ئاشکرا کردنی حەقیقەتەکانی بەرهەم یان دەقێکی ئەدەبی. تەنانەت ئەگەر «مەرگی نووسەر»یش بکرێتە پێوەر، بەو جۆرەی کە "فۆکۆ" و "دریدا" باسی لێدەکەن تێگەیشتن لەئەزموونی "نالی" لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیدی جیاواز دەبێت. ئەوەش هۆکەی ئەوەیە تاقی کردنەوەی زاتی و هەستی نوستالژا لەمرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی دی جیاوازە.

ئەگەر دەق لەڕوانگەی خوێنەرەوە سەیری بکرێت ئەوا کێشەکە گەورەتر دەبێت.. بۆ وێنە ئەگەر خۆێنەری دەقەکەی "نالی"، کورد بێت ئەوا دیسان تێگەیشتنەکان وەکوو یەک نابن. ئەز خۆم وەک خوێنەری دەقەکەی نالی جۆری تێگەیشتنم لەقەسیدەی شاری شارەزووری "نالی" پێوەندە بەو بەستێنە فیکرییەی کەتیایدا دەژیم. من لە ڕوخساری شیعرەکەدا جۆرێک لە غەدری ژیئوپۆڵەتیکی دەبینم کە ئەو وتارەی خولقاندووە، کورد هەست بە ناهۆمێدی و ڕووخان بکات. فاکتەری ژیئوپۆلەتیک[2] نە تەنیا لەشیعرەکەی نالیدا بەڵکوو لە جۆری ئەزموونی شیعری زۆربەی شاعێرانی کورد بەتایبەت شاعێرانی هاوچەرخ ئامادەیی هەبووە.

ئەگەر خوێنەری دەقەکەش کورد بێت بەڵام کوردی نەخوێن و کوردی نەزان، ئەوا دیسان چەمکی تێگەیشتن جۆرێکی تر دەبێت. بگرە ئەگەر خوێنەر کورد نەبێت و لەو وتارانەی کە لە کۆمەڵگای کوردیدا زاڵن، تێنەگات و بگرە تەنیا وەرگێڕدراوی شیعرەکەی لە بەر دەستدا بێت، دیسان بابەتی تێگەیشتن ئاڕاستەی ڕەهەندێکی تر دەبێتەوە.

---

[1] - Discourse

[2] - Geopolitics

خۆم پێموایە نۆستالژاکەی "نالی" تەنیا بەرهەمی ئەزموونی ژیانی تایبەتی "نالی" نییە. ئەمـارەتی "بابـان" لـە ژیانی نالیدا زۆر جێگای هیوا و شانازیی بووە بۆیە دوای ڕووخانی ئەو ئەمارەتە شیعری "نـالی" دەبیتـە گورپـانی پرسیار و گلەیی و گازندە لە هەموو شتێک، بە واتایەکی تر لەوانەیە قەسـیدەکـەی "نـالی" ئـەگـەر ئـەمـارەتی "بابان" نەڕووخایە، هەر نەدەگوترا یان بەجۆرێکی تر دەبوو. لێرەدایەکەدەق وەک بـەرهـەمێکـی کۆمەڵایـەتی و کولتووری کە تەنیا پێوەند نییە بە خاوەنەکەی دێتە دەخولقێت.

## دەقی قەسیدەکە

چەمکی "شار" لەم شیعردا پێگەیەکی تایبەتی هەیە، ئەویش نە تەنها لە ئەدەبی کوردیدا بەڵـکوو لـەئـەدەبی گـەلانی تـردا. شـوێنێکی جـوگرافی، قۆنـاغیکی دیـاریکراوی مێـژووی گـەشـەی کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و سیاسیشە. شار ئەو جیگەیە کـە"مەدنییـەت"ی تێـدا دەخولقێـت. مێـژووی شارنشـینی ئاسـتێکی بـەرزتـر و سەرکەوتووترە لە قۆناغی پێش شارنشینی. زۆربەی ئەو چەمکانەی پێوەندن بە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسـی و کولتووری مرۆڤەوە لە داوێنی شاردا دەخوڵقن، وەک: فەلسەفە و بیر کردنەوە و کولتوور و دەوڵەت و ئـابووری و چینی کومەڵایەتی، دابەشبوونی ئیش و کار و داهێنان و هتد.

لەشیعریشدا، "شار" پانتایەکە بۆ ئەزموونی "زمان"[1] لەهەموو بوارێکدا. لە"شـار" دا زمـان یـاخیتر لـە هـەمـوو شوێنیکی ترە. پانتایی خەیاڵی شـاعێریش لـە "شـار"دا بـەرینتـر و بـێسـنوورترە. شـیعر لـەڕووی ئـەدەبی و یاخیبوونی زمانەوە، لەشاردا سەرکەوتووترە. شار بۆ شاعێر شوێنی وەهم و خەیـاڵ و ئـارەزوو و گلـەیـی مرۆڤـە (فرید، ١٣٦٨ :٣٤).

ئەزموونی شیعری کوردیش بەپێی پێوەندی شیعر و شار ئەزموونێکی سەرکەوتـوو بـووە بـەتایبـەت ئـەگـەر شیعر بەپێورەی زمانی یاخی کە ملکەجی هیچ لۆجیکێکی زمانەوانی و ئەدەبی نابێت بکریتە پێـوەر. (بـۆ وێنـە چەمکی شار لەشیعری "سوارە" دا).

قەسیدەی «شاری شارەزوور»ی "نالی" لەو شیعرە سەرکەوتووانەیە کە پێگە و جێگەیەکی تایبەتی هەیە لـە ئەدەبی کوردیدا، هەم بەپێوەری ئەدەبی و هەم بەو پێوەرەێ کەلێرەدا وەک پێوەندی ئـەدەب و ژیئۆپۆلـەتیـک ناوی لێدەبەم. مەبەستی "نالی" لەشاری شارەزوور، شـاری سـلێمانی ئێسـتایە، کـە "ئیـبراهیم پاشـای بابـان" لەساڵی (١٧٨٤)دا دروستی کردووە. شاری سـلێمانی تـەنیـا قۆنـاغێکی زەمـەنی لـە مێـژووی شارسـتانییەتی کورددا نییە. "سلێمانی" ئەو شارەیەکە لە مێژەوە چـەنهـا شوڕشـی ڕۆشـنبیری و کولتـووری و سیاسـی تێـدا سەری هەڵداوە. لەڕووی ئەدەبیشەوە چەنها کەڵەشاعیر و گەورەپیاوی خولقاندووە.

"نالی" دوای ڕووخانی ئەمارەتی "بابان" و ئاوارەبوونی بـۆ "ئـەسـتەمبـوڵ" زۆر بـە ئـارەزووەوە سـەیـری ئـەو شارەزوورەی دەکا کە سلێمانی لە ئامێز گرتووە:

---

[1] - Language

**بەشی پێنجم- رەخنە**

قوربانی تۆزی رێگاتم ئەی بادی خۆش مروور | ئەی پەیکی شارەزا بەهەموو شاری شارەزوور
ئەی لوتفەکەت حەفییو هەوا خواهو هەمدەمە | وەی سروەکەت بەشارەتی سەر گۆشەی حوزوور
ئەی هەم میزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان | تۆفانی دیدەو شەرەری قەلبی وەک تەنوور
گاهێ دەبی بە ڕۆح و دەکەی باوەشێنی دڵ | گاهێ دەبی بەدەم دەدەمینێ دەمی غروور
مەحوی قەبووڵی خاتری عاتر شەمیمتە | گەردی شیماڵو گێژی جنووبوکزەی دەبوور [١]

"نالی" دوای وەسف کردنی بێ وێنەی شاری "سلێمانی" لەم چەند بەیتەدا دەگا بەو ئەنجامەی کە ئەوپەڕی هەستی خۆی بەرانبەر بەشاری سلێمانی نیشان بدات و بێ سنووری نۆستالژای نالی کە وێدەچیت بۆ ئەو ڕابردووە بێت کە تێیدا دەژیا تا ئەوەی تەنها جۆرێک لەدڵتەنگی [٢] بێت کەهەر مرۆڤێک لەوانەیە لەو کاتانەی لەنیشتمانی دایکی خۆی دوور بێت دەری ببڕێت. "نالی" ناتوانێت ئەو هەستەی خۆی بەرانبەر بەو ڕابردووەی کە جێگای هیوا و شانازییە بشارێتەوە. بە واتایەکی تر دیسکورسی نالی لەچەند قوناغێکی گوتنی ئەو شیعرەدا دەگاتەخاڵی کۆتایی ئەویش لەو حاڵەیدا کەدەڵێت:

سووتا ڕەواقی خانەی سەبرم، دڵ و دەروون | نەیماوەغەیری گۆشەی ڕیکرێکی یا سەبوور
هەم هەمعەنانی ئاهم و هەم هەمڕیکابی ئەشک | ڕەحمی بەم ئاە و ئەشکە بکە، هەستە بێ قوسوور

نالی دواتر چەن شوێنێکی دیاریکراو لەناو شاری سلێمانیدا، کەشوێنی ئەزموونی شهوودی و ژیانی تایبەتی خۆیەتی، ئەویش وەک تاکێک یان ئەندامێک لەکۆمەڵگایەکی دیاریکراو کەلەوانەشە خودی "نالی" هێمایەک بێت لەو مرۆڤەی ئەو سەر دەمە، واتە مرۆڤی کورد، کەخاوەن سیفات و هەست و نەستی خۆیەتی، دەستنیشان دەکات:

وەک ئاهەکەم دەوان بەهەتا خاکی کۆی یار | وەک ئەشکەکەم ڕەوان بەهەتا ئاوی شیوەسوور [٣]
ئەمجا مەوەستە تا دەگەییە عەینی سەر چنار | ئاوێکە پرلەنار و چنار و گوڵ وچنوور
چەشمێکە میسلی خۆر کەلە سەدجێ، بە ڕۆشنی | فەورانی، نووری سافە لە سەر بەردی وەک بلوور
یا عەکسی ئاسمانە لە ئاوێنەدا کەوا | ئەستێرەکانی ڕابکشێن وەک شەهابی نوور
یا چەشمەساری خاتیری پڕ فەیزی عاریفە | یەنبووعی نوورە دابڕژێنی لەکیوی توور
دەم وت دوو چاوی خۆمە ئەگەر"بەکرەجو" [٤] ی ئەشک | نەبوایە تیژ و بێ سەمەر و گەرم وسوێر و سوور
داخڵ نەبی بەعەنبەری سارای "خاک و خۆڵ" [٥] | هەتا نەکەی بەخاکی "سولەیمانی"یا عوبوور

---

[١] - دەبوور : ڕەشەبا

[2] - Homesick

[٣] - شیوە سوور : شیوێکە لە نزیک چەمچەماڵە وە

[٤] - بەکرە جۆ : شوینێکە لە نزیک سلیمانی جوگایەکی لە سەرچنارەوە بۆ دێت.

[٥] - خاکوخوڵ : ناوی دییە کە لە ٢٤ کیلومەتری ڕۆژهەلاتی شاری سلێمانی . نالی لە وێدا لە دایکبووە

| | |
|---|---|
| یەعنی ڕیازی ڕەوزە، کەتێدا بەچەن دەمێ | موشکین دەبی بە کاکوڵی غیلمانو زۆڵفی حوور |

هەڵبەت شیعرەکە وەک دەق یان تێکست [1] کەبەرهەمی نالی و ئەو وتارەیەکەتێدا ژیاوەدەقێکـی بـێ لایـەن نییە. بە واتایەکی تر وەک "فۆکۆ" دەڵێت: دەق لەڕووی ئایدیالوژییەوە ناتوانیت بێ لایەن بێت. شیعرەکە تەنیـا ئەو لایەن و ڕوخسارانەی بەرجەستە کردووە کە پـڕن لـەپیاهـەڵـدان و شـانازی کردنـەوە. دەقـەکـە لایـەنـە نیگەتیفەکانی ئەو وتارەی "نالی" و دەقەکەی خولقاندوە، بەرجەستە ناکات.

ڕاستەکەپیاهەڵدان لە شیعردا ڕەوایە، ئـەویـش بـەو پێیـەی کـەزمـانی شـیعر زمانێکـە بـێ لوجێـک و بـێ ڕەهەندێکی دیاریکراو، بەڵام من مەبەستم ئەوەیە کە "نالی" با بەئەنقەستیش نەبێت ئەو لایەنانەی ئـەو وتـارەی بەرجەستە کردووە کە پوزەتیف و ئەرێین. لێرەدایە کە "نالی" ناتوانێت وەک بەرهەمهێنی وتـارێکی فـەلسـەفی خۆی نیشان بدات؛ بەلکوو تەنیا شاعیرێکە. ئەوەش بلێم کەمەبەستم ئەوە نییە شیعر و فـەلسـەفـە لـەیـەکتـر دابڕاون. لە وانەیە ئەو هەستی نۆستالژای نالی ئەوەندە زاڵبووە کە وای لە "نالی" کردووە خەیاڵی بەلای لایـەنـە سەلبی و نیگەتیفەکانی ئەو وتارە نەشکێتەوە ئەویش لەو شوێنەیدا کەدەڵێ:

| | |
|---|---|
| شامی هەموونەهار و فوسووڵی هەموو بەهار | تۆزی هەموو عەبیرو بوخاری هەموو بوخوور |
| شاریکە عەدل و گەرمە، لەجیگەیەکەخۆش و نەرم | بۆ دەفعی چاوەزارە دەڵێن شاری شارەزوور |
| ئەهلێکی وای هەیەکە هەموو ئەهلی دانشن | هەم نازیمی عوقوودن و هەم نازیری ئوموور |

دواتر "نالی" دوای بەرجستە کردنی لایەنە ئەرییەکانی وتاری زاڵ چەن پرسیارێک لە قەسیدەکـەدا دەخاتـە بەردەست کە هەرچەن نزیک لەپرسیاری فەلسەفی دەبنەوە، بە واتایەکـی تـر پرسـیار لـە حـەقیقـەتی بـوون دەکات بەڵام لایەنی ئەو نۆستالژایەی کە "نالی" لەناویدا دەژیت زەقترن تا ئەوەی پرسیاری فەلسەفی بن.

پرسیاری فەلسەفی پێوەندن بەحەقیقەتی بوون. فەیلەسووفیش ئەو کەسەیە کە توێژینەوەی بیرو بـاوەرێـک دەکات و پەرەی پێدەدات کەئەو بیر و ڕایە دەربارەی سروشت و مانای بوون و حـەقیقـەتـە. وەک ئـەفلاتـوون دەڵێت: فەلسەفە بریتییە لە زانینی حەقیقەت بەشێوەیەکی ڕەها (قـەرەداخـی، ٢٠٠٢: ٢٨٧). "نـالی" پرسـیار لەحەقیقەت ناکات بۆیە ناتوانێت ببێتە فەیلەسووف. پرسیارەکانی "نالی" تایبەتـن بـەو ئـەزموونـە شـهوودیەی کەبوویەتی. بە واتایەکی تر پرسیارەکانی "نالی" جورێکن لە نۆستالژا:

| | |
|---|---|
| سەیرێ بکە لەبەرد و لەداری مەحەلەکان | دەورێ بدە بە پرسشو تەفتیشو خوارو ژوور |
| داخو دەرروونی شەق نەبووە پردی "سەر شەقام" | پیر و فوتادەتەن نەبووە داری "پیرمەسوور"؟ |
| ئێستەش بەبەرگ و بارە عەلەمداری "شێخ هەباس" | یا بێ نەوا و بەرگە گەڕاوە بە شەخسی عوور؟ |
| ئێستەش مەکانی ئاسکەیە "کانی ئاسکان" | یاخۆ بووە بە مەلعەبی گورگ و لوورەلوور؟ |
| ئیستەش سروشکی عەشقی هەیە"شیوی ئاودار" | یا خۆ بووە بە سۆفی وشکی لەحەق بە دوور؟ |
| داخۆ دەرروونی سافە، گورەی ماوە "تانجەرو" | یا خۆ ئەسیری خاکە بە لێلی دەکا عوبوور؟ |

[1] - Text

سەیرێکی خۆش لە چیمەنی ناو"خانەقا" بکە ئایا ڕەبیعی ئاهووە، یاچایری ستوور؟
سەبزە لە دەوری گوڵ تەڕە، وەک خەتی ڕووی یار یا پووشی وشکو زۆرە وەک ڕیشی کاکەسوور؟
قەلبی مونەووەرە لە حەبیبانی نازەنیین یا وەک سەقەڕ پڕە لە ڕەقیبانی لەندەهوور؟
دەسبەندیانە دێن و دەچن سەروو نارەوەن یاحەڵقە یا نە سۆفی مل خوار و مەندەبوور؟
مەیلێ بکە لە سەبزە درەختانی مەدرەسە ئەوراقیان موقەدیمەی شینە یا نەسوور؟
حەوزی پڕی کە نائیبیدی دەی منە لەوێ لێڵاویدا نەهاتووە وەک سەیلی"شیوەسوور"؟
ئێستەش کەناری حەوشەکە جێی بازە و کەوشەکە یاری تیایە، یا بوەتە مەعرەزی نفوور؟
چاوێ بخە لە سەبزە وسیرابی دائیرە جێ جیلوەگاهی چاوەکەمە نەرمە یا نە زوور؟
تۆ خۆا فەزای دەشتی فەقیکان ئەمێستەکەش مەحشەر میسالە یابوەتە چوڵی سەلمو توور؟
واسیل بکە عەبیری سەلامم بەحوجرەکەم چی ماوە، چی نەماوە، لەهەیوان و تـاق و ژوور
ئەو غاری یارە ئێستە پڕ ئەغیارە یا نەخۆ هەر غاری یارە، یا بووەتە غاری مار و موور؟
زارم وەکوو هیلال و نەحیفم وەکوو خەیاڵ ئایا دەکەومە زار و بە دڵدا دەکەم خوتوور؟

"نالی" دوای بەرجستە کردنی ئەم چەن پرسیارە، جاریکی تر دەگات بەو ئەنجامەی زمان یان لـەم شـیعرەدا خەیاڵ ناتوانیت ڕوخسار و ڕەنگەکانی ئەو ڕابردووە وێنە بکات. بۆیە دەڵێت:

لەم شەرحی دەردی غوربەتە، لەم سۆزی هیجرەتە دڵ ڕەنگە ببێ بە ئاو و بـە چـاودا بکـا عبـوور

وەک "مامۆستا مەلا عەبدلەکەریمی مودەڕس" دەڵێت: هەرچی ژان و تلانەوە و سـۆیی "نـالی" هـەیـە لـەم قەسیدەیەدا، هەمووی گوشێنراوەتە پیاڵەی ئەم بەیتەوە (کەماڵ:١١).

دواتر "نالی" پرسیارەکانی خۆی ئاراستە خۆی و داهاتووی خۆی دەکات ئـەویـش بـێ ئـەوەی متمانـەی بـە وڵامێکی قورس و قایمی هەبێت کە دەڵێت:

ئایا مەقامی ڕوخسەتە لەم بەینە بێمەوە یا مەسلەحەت تـەوەقوفـە تـا یـەومـی نـەفخـی سـوور

لەکۆتایشدا "نالی" تەنیا بەهەناردنی سەڵامێک لەدوورەوە دڵخوش دەکـات و قـەسـیدەکـەی بـۆ درێـژەدان تووشی هەناسەبڕکی دەبێت:

حاڵێ بکە بە خۆفییە: کەئەی یاری سەنگدڵ "نالی" لە شەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامـی دوور

## ئەنجام

ئەزموونی شیعری "نالی" تەنیا ئەزموونی ژیانی تاکەکەسی و تایبەتی خۆی نییە. "نالی" وەک ئەندامێک لەکۆمەڵگا و سەردەمێکی دیاریکراو، بەرهەمێکی کۆمەڵایەتی و سیاسی و کولتووری وتارە. بە واتایەکی تر، شیعری نالی تەنیا بەرهەمی خەیاڵی خۆی نییە. ئەو سیما و ڕەنگ و ڕوخسارانەی لە قەسیدەی شاری شارەزووری "نالی"دا وێنا کراوە، وێنایەک نییە کە تەنیا بەرهەمی خودی شاعێر بێت. نوستالژاکەی "نالی"ش وێدەچێت تەنیا پەیوەند نەبێت بەو ئازار و ئێشانەی کە "نالی" دوای ڕووخانی ئەمارەتی بابان تووشی هاتبێت.

هەرچەند بەپێی بۆچوونی "برگسون" زۆر ئەستەمە لە ئەزموونی شهوودی خاوەنی دەقێک وەک خودی خاوەنەکەی تێبگەین؛ بەڵام خاوەنی ئەو دەقەش داهێنەری تەواوی دەق نییە.

لەو لایشەوە، ئەگەر مەرگی نووسەر بکرێتە پێوەری تێگەیشتن لەحەقیقەتی دەق بەتایبەت ئەگەر دەق شیعر بیت، زۆر جیاواز دەبێت. ئەز خۆم تێگەیشتنەکەم لەم شیعرە، پێوەندە بەو بەستێنەفیکری و کۆمەڵایەتی و ئاکادیمیەی وا تیایدا دەژیم. بە واتایەکی تر خوێنەریش وەکوو خاوەنی دەق بەرهەمی وتاریکی کومەڵایەتی و کولتوورییە لە سەردەمێکی دیاریکراودا.

لەقەسیدەکەدا "نالی" تەنیا لایەنی ئەرێتی ئەو نۆستالژا دەردەخات کەئەوەش دەسەلمێنێت دەق و ئایدولۆژیا گرێدراوی یەکترن. دەق بەپێی ئایدۆلۆژیا ناتوانێت بێلایەن بێت. سێ کوچکەی دەق، دەسەڵات و ئایدولۆژیا هەر دەم لەبەرهەمی هونەریی و ئەدەبیدا ئامادەییان هەیە.

"نالی" هەرچەند لەقەسیدەکەدا چەند پرسیاری گرنگ دەورووژێنێت بەڵام ئەو پرسیارانە پێوەند نیین بەحەقیقەتی "بوون"ەوە، بۆیە "نالی" تەنیا شاعێرە نەک فەیلەسووف. پرسیاری "نالی" و خەیاڵی "نالی" پێوەندن بەو نۆستالژای کەتووشی هاتووە و بەو ئەزموونە شهوودییەی کەتێی پەڕاندووە. پرسیار، نۆستالژا و ئەزموونی شهوودی "نالی"ش تەنیا تایبەت نیین بەژیانی تایبەتی و تاکەکەسی "نالی"یەوە.

بەگشتی ئەزموونی شیعری "نالی" لە قەسیدەی «شاری شارەزوور»دا، لەڕووی ئەدەبییەوە، ئەزموونێکی سەرکەوتووە. قەسیدەکە پڕە لە هێما و وێنای زۆر جوان و ڕازاوەوە کە ناسکی خەیاڵی "نالی" و سەرکەوەوتنی زمانی شیعری "نالی" نیشان ئەدات.

بەپێی پێوەندی دەق و دەسەڵات و ئایدۆلۆژیاشەوە، داهێنەرێکی بێ لایەن نییە. خودی "نالی"ش بەرهەمێکی کولتووری و کۆمەڵایەتییە. لەڕووی فەلسەفیشەوە، پرسیارەکانی "نالی" فەلسەفی نیین.

گەر بۆچوونی خوێنەریش بکرێتە پێوەر، ئەوا جۆری تێگەیشتن لەئەزموونی "نالی" زۆر جیاواز دەبێت. خوێنەری دەقیش وەک خاوەنی دەق، بەرهەمێکی کولتووری و کۆمەڵایەتییە لەسەر دەمێکی دیاریکراو و لەژێر کاریگەری وتارێکی زاڵ و چەنها وردەوتار و تەنانەت دژ بەیەکدا.

## سوپاس

ئەم وتارە پێشکەشە بە مامۆستا "پروفیسۆر موحەممەد کەماڵ"، مامۆستای فەلسەفە لە زانستگای "ملبورن"ی ئوسترالیا.

## سەرچاوەکان:

١ رهبری، مهدی (١٣٨٥) **هرمنوتیک و سیاست، مروری بر نتایج سیاسی هرمنوتیک فلسفی هانس گئورگ گادامر**، تهران، انتشارات کویر،چاپ اول.

٢- قەرەداخی، عەتا (٢٠٠٢)**گەڕان بە دوای بووندا**، سلێمانی، سەردەم.

٣ قەرەداخی، عەتا (١٩٩٩) **گۆران و گەڕان بە دوای یەقیندا**، سلێمانی، سەردەم.

٤ قەرەداخی، عەتا (٢٠٠١) **گەڕان بە دوای ناسنامەدا**، سلێمانی، سەردەم.

٥ فرید، یدالله (١٣٧٣) **جغرافیا و شهرشناسی**، تبریز، انتشارات دانشگاه تبریز.

٦ موحەممەد کەماڵ (٢٠٠٠) **چۆن لە بەرهەمی هونەری تێبگەین؟** سلێمانی، گۆڤاری ڕەهەند، ژمارە ١١.

٧ مدرس، عبدالکریم (١٣٨٦) **دیوانی نالی**، سنندج، انتشارات کُردستان.

٨ کوزنز هوی، دیوید (١٣٧١) **حلقه انتقادی**، ترجمه مراد فرهاد پور، تهران، انتشارات گیل با همکاری انتشارات روشنگران، چاپ اول.

٩ میلز، سارا (١٣٨٨) **گفتمان**، ترجمه فتاح محمّدی، تهران، نشر هزاره سوم.

١٠ هیوبرت دریفوس و پل رابینو (١٣٨٥) **میشیل فوکو، فراسوی ساختارگرایی و هرمنوتیک**، ترجمه حسین بشیریه، تهران، نشر نی، چاپ پنجم .

# چەمکی زمان و بزاڤی زمانپارێزی لە ڕەوتی ڕۆشنبیری کوردی لە سەردەمی کلاسیکدا

ڕەئوف مەحموودپوور*

**کورتە:**

یەک لە بنەما گرنگەکانی ناسەی هەر گەلێک، زمانە. مەخابن کورد بە درێژایی مێژوو لە گەل قەیرانی زمان دەسەو یەخەیە. زمانی دایکی لە زۆر دەڤەری کوردان، تەنانەت لە پەیڤی ڕۆژانەشدا قەدەغەیە. باوەڕ ناکەم یان لانی کەم نەمتوانیوە گەلێکی تری گیروودەی ئەم ژانە لە جیهاندا بناسم. بگرە بەو توند و تووش بوونە هەر نەشبێت.کەچی زانایان و شاعێرانی کورد بە هەستێکی گەرم و باوەڕێکی بەرزەوە، بە پێی دەرەتان و بۆلوان، بگرە زیاتر لەوەش، بۆ خزمەت بە زمانی کوردی و پاراستنی لە مەرگ و قڕان، دژبەری پلانەکانی ناحەزان و ستەمکاران وەستاونەتەوە. ئەوانیش هەروەک ئەمڕۆ هەستیان بە بایەخ و گرنگی زمان کردوە و گەڕی کاریگەری زمانیان لەمانەوەوگەشەکردن، ناسیوە. هەوڵ و تەقالای بێوچان و ماندوونەناسانەی ئەوان، لە وەها ڕوانگەیەکەوە سەرچاوەی گرتووە.

تێفکرین لەو ڕەوتە و لەو ئاکامانە، مرۆڤ بەرەو ئەو پرسیارە ئەبات کە ئاخۆ هۆکارەکانی ئەم مانەوە و خۆڕاگریە چین؟ لەم ڕەوتە زەمنیە درێژ و پڕسام ونەهامەتیەدا، کامە هۆکار بوونەتە هۆی زیندوو هێشتنەوەی ئەم زمانە؟!

لەوانەیە زۆر هۆکار هەبن کە لەم ڕەهەندەدا شیاوی شیکاری و بەدواداچوون و شرۆڤە بن، بەڵام بەش بەحاڵی خۆم ، لەو وتارەدا ئەو هەوڵانە پۆلێن ئەکەم کە لە لایەن شاعیران (وەک کەسانی چاوکراوە و خوێندەوار و سەرتەڵ)ی کۆمەڵگاوە لەم پێناوەدا هاتوونەتە ئەفراندن. شرۆڤە و پۆلێنکاریەکە ڕوونی ئەکاتەوە کە ئەم هەوڵانە، کەم و بچووک نین و لە ئاستی خۆیاندا وەک شاکار دێنە بەرسەرنج و پێویستە هەندێکیان وەک جومگە و ڕۆحی بڕگەیەکی مێژوویی لە تەشکبەند کردنی بزاڤە کولتووری و کومەڵایەتیەکاندا بێنە ئەژمار و دیاری بکرێن. ئەو هەوڵانە لە سینە و هزری کەسانێکی تەنگەتاو و لە تاڤگەی شیعرەوە ئاخێز ئەکەن و ئاماژە بە هزر و ئیرادەیەکی پتەوی مێژوویی بۆ بەرنگاری لە پێناو مانەوەدا ئەکەن.

---

* نووسەر و لێکۆڵەر

لە سەردەمی گەشەی هزر و وشیاری و ڕۆشنبیریشدا، بایەخدان بە زمان، تایبەتی پێدراوەو لە بەرەودایە. زۆرێک لە زانایان و پسپۆڕانی کۆمەڵایەتی بە جەختەوە ئەڕواننە مەسەلەی زمان . بۆ وێنە زانای ناسراو، "کی زربۆ"، ئەڵێت : «ئێمە ناتوانین لە زمانی خۆ چاوپۆشی بکەین. ئەم کارە نەلواوە. ناتوانین بە دەستی خۆمان ئەو ناوکەی کە ئێمە بە بنەچەمانەوە ئەبەستێتەوە، ببڕین. ڕوونە کە هیچ نەتەوەیەک ناتوانێ بگەشێتەوە و شکۆفا ببێت، مەگەر ئەوەی لە چوارچێوەی زمانی دایکی خۆیدا بکەوێتە فێرکاری» (ارنی، ۱۳٦۷).

تەنانەت یۆنسکۆش لە ڕاپۆرتی ساڵی ۱۹٦۲دا جەخت ئەکاتەوە کە پەروەردە ئەبێ بە زمانی دایکی بئافرێ و بۆ فێرکاری، زمانی دایکی بخرێتە پێش زمانەکانی تر.

هێگل ئەڵێت: «ڕۆحی نەتەوە، زمانە. زمان ڕۆحی نەتەوە ڕادەگرێ و ڕۆحی نەتەوەش بریتیە لە مێژووی نەتەوە».

ژان ژاک رۆسۆش لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتیەوە جەخت لە سەر ئەوە ئەکاتەوە کە زمان خاسیەتێکی سەرەکی نەتەوەیە و لە نەتەوەکانی تر، جیای ئەکاتەوە.

لە دەقەکانی ئایینیشدا، پەروەردگار جەخت لە هەبوون و ڕاستینەی « شعوب» و «قبائل» یان بە واتەی هەنووکەیی «گەل و نەتەوە» ئەکاتەوە و هەبوونی ئەوان لە پێناو ناسینی یەکتری و باوەڕ بە جیاوازیەکان وەسف ئەکات.کەئەمەش لە خۆیدا جێگای سەرنجە و خوێندنەوەیە.

بەوەها دنەیەکەوە و لە ژێر تیشکی ئەو چەمکانەدا، هەوڵ ئەدەم ئەم بەرهەمە لە شرۆڤەیەکە لە سەر هزر و ڕەوتی زمان پارێزی لە ئەدەب (شیعر)ی کلاسیکی کوردیدا بەئەنجام بگەیەنم.

**وشە سەرەکییەکان** : زمان، ئەدەبی کلاسیکی کوردی، ڕەوتی ڕۆشنبیری کوردی، زمان پارێزی و...

**بەشی شەشم- زمان**

### پێشەکی

**زمان:** ئەو شێوە ئاخاوتنەیە کە لە بەشەکانی کوردەواریدا (بەهەموو زاراوەکانیەوە) باو بووگە و بەردەوامە.

**ڕەوتی ڕۆشنبیری کوردی:** ڕەوتی خاوەن دەقی نووسراو لە ئەدەبی کوردیدا کە بە خەستی لە بەشی شیعردا (بە نەزمیشەوە) خۆی دەبینێتەوە.

**ئەدەبی کلاسیکی کوردی:** ڕەوتی شیعری کوردی تا سەردەمی مامۆستا گۆران.

**بزاڤی زمانپارێزی:** ئەو هەولانەی کە وەک دەق لە پێناو پاراستن و گەشەدان بە زمان هاتوونەتە خولقان

### بایەخی هەوڵەکان لە ئەفراندنی دەقەکاندا

هێرشی هەمەلایەن و خرۆشی بە گوژم بۆ تواندنەوەی زمان و کولتووری کوردی، لە لایەن دەسەلاتەکانی ئەوساییەوە، هاندەری سەرەکی ئەدیبان و خوێندەوارانی سەردەمی کورد لە ئاست دژبەریکردنی ئەو هزر و خواستە بووە. بە تایبەت پاش هێرشی هزریی و نەتەوەیی عەربەکان کە ژینۆسایدئاسا بۆ تواندنەوە و بنەبڕکردنی هزر و توخمی کوردی لە پەلاماردا بوونە.لە ژێر وەها گوژم و زەختێکدا، قەڵەم بەدەستی بە دەربەستی سەردەمی کورد، کەوتۆتە خۆ و هاتۆتە بزاڤ. لە ڕەهەندی شیعرەوە، ئەو بزاڤە هاتۆتە گوڕەپانی کردار و لە پێناو بەربەرەکانێ دژ بە کولونیالیزمی فەرهەنگی و کەسیی، وەستاوەتەوە. بە تایبەت ئەدیبانی لقی گۆران (بە پێی ئەو فاکت و بەڵگانە کە تا ئێستا کەوتوونەتە بەردەست) لەم بەرخودانەدا ئامادەتر بوونە و دەقەکانی خۆیان ئاوقەی بەردەنگ و مێژوو کردۆتەوە. زاراوەی گۆران، لەو سەردەمانەدا و لە لایەن جەماوەرو خودی شاعێرانەوە، وەک لقێکی گەورەی زمانی کوردی و بە جاران وەک زمانی کوردی لێکدراوەتەوە و جاڕ دراوە. بە تایبەت لە لایەن خودی ئەدیبان و بە پێی فاکتە بەردەستەکان، ئەو زاراوەیە وەک زمانی ئەدەبی سەردەم ناسراوە. وەها هزرێک لە لایەن کەسانێکەوە پەروەردە کراوە و چڕاوە کە خزمەت بە زمانیان وەک دڵسۆزی و ئەرکی نەتەوەیی لێکداوەتەوە و باوەڕ کردوە. بە تایبەت کاتێک کە لە ناخەوە هەستیان بە پلانی ژینۆسایدی نەتەوەیی، لە لایەن داگیرکار و ململانێی نامرۆڤانەی وان، لە پێناو ناس سڕینەوە و تواندنەوەی هەمەچەشن کردووە. چالاکی ئەو کەسانە، لە دەرەتانێکی ترسناک و لە ڕەهەندە بەرتەسکەکانەوە رسکاوەو ئاوقەی بوون و جەماوەر و مێژوو کراوەتەوە.کەش و هەوای بزاڤی ئەم ڕەوتە لە کاتێدا بووە کە زمانی فارسی و تورکی لە لایەک و لە لایەکیکەوە زمانی عەربی (ئەم سێ زمانەش وەک زمانی دەسەلات هاتوونەتە بەرچاو گرتن و خوێندنەوە، نە وەک زمانی گەلانی دەراوسێ و دیتران) گەمارۆیەکی دژبەستیان داوەو بەرەو توانەوەی هەمەلایەن تەنگەتاویان کردووە. مەخابن ئەم ڕاستیەی مێژوو لە لایەن تویژەرانی سەردەمی ئەدەبی کوردیەوە، پشتگوێ خراوە و سەرەڕای فاکتمەندی و خاوەن دەقی، لە ئاستیدا کپیی نوێنراوە و خامۆشیەک بەرچاوە. ئەمەش نەک تەنیا خزمەت بە زمانی کوردی نییە، بە پێچەوانەوە ، سڕینەوەی مێژووی بەرخودانی بەشێک لە هەوڵە ماندوە مێژینەکانی بزاڤی کوردە. کە لە پێناو مانەوە و گەشەدا، هاتۆتە کردار[1].

---

[1] - زۆرێک لە توێژەرانی کوردی سەر بە زاراوەی سۆرانی، مێژووی ڕەوتی ئەدەبی کوردی تا سەردەمی "باباتاهیری هەمەدانی" کورت ئەکەنەوە و لە هەبوونی بەر لە ئەو چش ئەکەن.

بەکارگرتنی زمانی کوردی بۆ نووسینی دەقەکانیان. بەتایبەت لە ژانری شیعردا، ئەو چمکەیە کـە پێویسـتە ڕاوەستەی لەسەر بکرێت و بە وردی بخوێنرێتەوە. ڕۆشنبیرانی کورد کـە لـە ڕیـزی شـاعێراندا خۆیـان پـۆلین کردوە، بوونەتە زمـانی جـەمار و بـۆ مانـەوە و گەشـە کـردن شـیعریان بـە زمانەکـەی خۆیـان چـڕیوە. لـەم ڕەهەندەشدا بوونەتە خاوەن ڕەوتێکی دیار و بـەردەوام کـە لـە شـیعری هورموزگانـەوە دەس پێئـەکات و لـە قوتابخانەی یارسیدا چەقبەستووتر ئەبێت و تەشەنەی زیاتر ئەکات و لـە شـاعێرانی دواتـر وەک "مەولـەوی" و "بێسارانی" و "نالی"دا دەبێتە خاوەن گەشەیەکی بەواتا.

بۆ وێنە ئەتوانین ئاماژە بە شیعری «هورموزگان» بکەین کە وەک یەکەم دەقی نووسـراوی شـیعری کـوردی (نیوەی یەکەمی سەدەی یەکەمی کۆچی مانگی) واتە چەند سەدە پێشتر لە سەرهەڵدانەوەی شـیعری فارسـی ئەگەرێتەوە. ئەم دەقە بە زمانێکی خۆماڵی هاتۆتە نووسین و بە ناوەرۆکێکی کۆمەڵایەتیەوە شـین بـۆ هـەبووە لەدەسچووەکانی دەڤەرەکە ئەکات:

| | |
|---|---|
| هۆرمۆزگان ڕەمان، ئاتران کوژان | وێشان شاردەوە گەورە گەورەکان |
| زۆرکاری ئارەب کردنە خاپوور | گنایی پاڵە هەتا شارەزوور |
| شەن و کەنیکان وە دیل بشینا | مێرد ئازا تلیا وە ناو هوونیا |
| ڕەوشت زەردەشت رەمانۆ وە بێکەس | بزیکا نیکا هۆرمۆزد وە هیچکەس |

(دانای هەورامی:٨و٩)

واتە: "هۆرمۆز"ەگان ڕایان کردو ئاورەکان کوژانەوە. سەرکردە و گەورەکانی باوەڕی زەردەشـتی لـە ترسـی گیان، ونبوون و خۆیان شاردەوە. زۆرکاری و ملهۆڕی عەرەب، زۆر شوێنی کاول و وێران کرد. ئـەم وێرانکاریـە، هەر لە دەڤەری پاڵە تا شارەزووری گرتەوە. ژنان و گەورە کچان بە دیلی بران و پیاوە ئازاکانیش کـوژران و لـە ناو خوێندا گەوزان. بەمجۆرە باوەڕ و یاسای زەردەشتی بێچارە، بێکەس مایەوە و ئەهوورامەزداش ڕۆحمـێ بـە کەس ناکات.

پاش ئەم دەقە، دەقەکانی قوتابخانەی یارسـی لەبەردەسـتدان کـە ئـەوانیش بـۆ مـاوەی چەنـد سـەدە، بـە زمانێکی خۆماڵیانەی کوردی هاتوونەتە چڕین و وێڕای پارێزگاری کردن لـە زمانەکـە، بـۆ بـاوەڕ و شوناسـێکی کوردی لە پەرۆشدا بووگن. بۆ نموونە:

| | |
|---|---|
| داران گیانداران جەرگ و دڵ بەرگەن | گاهێ پڕ بەرگەن گاهێ بێبەرگەن |

(پیرشالیار)

سەدەی دووهەم و سێهەم:

| | |
|---|---|
| ئەو واتەی یاران ئەو واتەی یاران | ئێمە دێوانەین ئەو واتەی یاران |
| هەنی مەگێڵین یەک یەک جە شاران | تا زیننە کەرین ئایین ئێران |

**بەشی شەشم- زمان**

(بالوول ماهی)

ساقیا دەستم، ساقیا دەستم جامێتەر باوەر بگێرە دەستم

ئەز جە مەیخانەی ڕۆی ئەلەست مەستم وە مەستی پەیمان ئایینم بەستم

(بابا ڕەجەبی لوڕستانی)

سەرهەنگ دەودان سەرهەنگ دەودان ئەز کەناممەن سەرهەنگ دەودان

چەنی ئێرمانان مەگێڵم هەردان مەکۆشم پەرێ ئایین کوردان

(بابا سەرهەنگ دەودان)

سەدەی چوارەم:

وە هەفتینەوە وە هەفتینەوە شکارێم ئاوەرد وە هەفتینەوە

(بابە لۆڕەی لۆڕستانی)

سەدەی پێنجەم:

هیندوو پیاڵەت، هیندوو پیاڵەت مەی پەڕەن جە ناو جام و پیاڵەت

ئەر بریندارەنی با پاک بو ناڵەت مێردان دوڕشناس مەشناسان کاڵەت

سەدەی شەشەم:

حەچوو تە پادشاهی خودانی مێهر و ماهی ڕەزاقی جن و ئینسی خودایێ عالەما قودسی

مزگێنی بی بینیە کوردستانی بلاڤ بکەن دەفتەرا ئیمانی

(شیخ ئادیێ هەکاری)

سەدەی حەوتەم و هەشتەم:

ساقی لەجەم بادە دەدا دەرسی ڕێگای جادە دەدا

مێردان هەموو لە دەور پاشا پێمان دەکەن گشت تەماشا

قەومێ بڤ من نەیبێ باوەڕ نەیێت بۆ جەم یاری یاوەر

ڕێبوارانی ئەم ڕێبازە زۆرن و بەرهەمەکانیان لە سروودەکانی یاری و «دیوانەگەورە» و «سەرئەنجام» و دەفتەرەکانی دیکەیاندا هاتوەتە پاراستن. بایەخ لەوەدایە کە لە ڕیزی ئەم ڕێبوارانەدا پۆلێک ئافرەتی خاوەن دەقێ بەرچاون کە لە خۆیدا ڕەوتەکە بە بەهرەتر ئەکەن؛ لەوانە: «دایەخەزانی سەرگەتی، دایە تەوریزی هەورامی، فاتە لۆڕە، دایراک خاتوون، لزا خانمی شارەزووری، جلالە خانم و...».

ئەم ڕەوتە لە سەدەکانی دواتریشدا بەردەوام ئەبێت وێڕای زەبەندی لەمپەرەکان لە ڕەوت ناکەوێت.

سەدەی یازدە

نزیک وە پرشنگ پای قەڵوەزان بۆ ئامێتەی خاکم ڕەنگی خەزان بۆ (بێسارانی)

سەدەی سێزدەهەم

هارەی هەراسان هەردەی هەردەگێڵ وەس دەور دە نەوێت چوون دێوانەی وێڵ (سەیدی)

هەرچەند زۆرێک لە شاعیران بە بێ هەراوهوریا خەریکی خزمەت کردن بە زمانەکەن و لە پێناو بەکارگرتن و پەروەردەکردنیدا لە هیچ هەوڵێک خۆ نابوێرن، بەڵام پۆلێک لە شاعیرەکان ڕاستەوخۆ دێنە ناو بابەتەکە و لە دەقەکانیاندا ڕاشکاوانە ئاماژ بە ویستە دەروونییەکانی خۆیان ئەکەن.

خانای قوبادی (١٧٠٤-١٧٧٨)، هەر لە سەرەتای شاکارە جوانەکەی «خوسرەو و شیرین»دا، ئەو پەنگەتاوە مێژوویە کە لە ڕێگەی حافیزەی گشتیەوە پێیگەیشتوە، دێنێتە زار و لە قەڵوەزەی شیعرەوە، ئەبێتە دەربڕی هانای سەدان ساڵەی هەستێکی پەنگەتاو؛ هەستێک کە ئەگەر لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتی و ڕەوانشناسیەوە، بکەوێتە بەر شرۆڤە و لێکدانەوە، دەربڕی چەپک چەپک مانا و نرخی مێژوویی تایبەتە. ئەو ئەڵێت:

ڕاستەن مەواچان فارسی شەکەرەن کوردی جە فارسی بەڵ شیرینتەرەن
پەیچێش نە دەوران ئەی دونیای پەڕکێش مەحزووزەن هەرکەس بە زوبانی وێش
مەعلوومەن هەرکەس بەهەر زوبانێ بواچۆ نەزمێ جەهەرمەکانێ
خارج جەمەعنی نەبۆ مەزمموونش گویا بۆ چوون شیعر جامی مەوزوونش
جەلای خیرەدمەند دڵپەسەند مەبۆ شیرینتەر جە شەهد دانەی قەند مەبۆ
جە عەرسەی دنیای دوون بەدفەرجام بە دەستوور نەزم نزامی تەمام
بە لەفز کوردی، کورستان تەمام پێش بوا مەحزووز باقی وەسەلام. (قوبادی:٢١)

(ڕاستە کە ئەڵێن زمانی فارسی وەک شەکر شیرینە، «بەڵام لای من» زمانی کوردی لەو زمانە زۆر شیرینترە، ئەمەش بۆ ئەو ڕاستیە ئەگەڕێتەوە کە لەم دۆنیا پڕ لە گێرەو کێشەیەدا هەر کەس بە زمانی خۆی مەحزووز و شادمانە).

یان "فەقێ قادری هەمەوەند" لە دەڤەرەی کەرکووکەوە ئەڵێت :

چوون فارسی بێ پەند حەکیمان بە لەفز کوردی کەردم تەرجومان
ساکە من ئەسڵم سینف ئەکراڎەن هەر کەس بە ئەمساڵ وێش خاتر شادەن

(قادری هەمەوەند:٤٥٦).

(پەند و ئامۆژگاری زانایان بە زمانی فارسی نووسرابوو، من بۆ سەر زمانی کوردیم وەرگێڕا. من لە نەتەوەی کوردانم و هەرکەسیش بە نەتەوەی خۆی شادە).

«حاجی قادری کۆیی» جەخت لە سەر فێربوونی زمانی خۆیی دەکاتەوە و لادان لە زمانی نەتەوەیی بە زۆڵی لە قاو ئەدات:

ئەگەر کوردێک قسەی بابی نەزانی مۆحەقەق دایکی حیزە با بیزانی
وەرە بۆت بکەم باسی نهانی تەفەنۆن خۆشە گەر چاک بزانی
سەلاحەدین، نوورەدینی کوردی عەزیزانی جەزیر و مووش و وانی
موهەلهەل ئەردەشیر و دەیسەمی شیر قوبادی باز و میری ئەردەڵانی

**بەشی شەشەم- زمان**

| | |
|---|---|
| ئەمانە پاکیان کوردن نهایەت | لە بەر بێ دەفتەری ونبوون و فانی |
| کتێب و دەفتەر و تاریخ و کاغەز | بە کوردی گەر بنووسرایە زمانی |
| مەلا و پیر و پادشامان | هەتا مەحشەر دەما ناوو نیشانی |

ئەگەر لە وەها ڕەهەندێکەوە ڕەوتی ئەدەبی کوردی لێکبدەینەوە، بۆمان دەرئەکەوێت کە لقی گۆرانی ئەدەبەکە لە پێناو خزمەتی بەردەوام بە زمان و کولتووری کوردی بە پیت و دەوڵەمەند و خاوەن فاکتە. ئەم لقە، بە تایبەت لە ڕەوتی دێرین و کلاسیکی خۆیدا، سەرەڕای تەنگەژەکان، خاوەن چەپکێ تایبەتمەندی سەرەکی و بەرچاوە.

تایبەتی یەکەم: هەر لە سەرەتای دەسپێکی هێرشی عەرەبەکانەوە و لە قوڵقوڵەی تەکانداریی ئەوانەوە بۆ سەپاندنی زمان و کولتووری خۆیان (عەرەبەکان ڕاستە کە لە ژێر ئاڵای ئیسلامدا دەسیان دابووە هێرش، بەڵام بە پێی لاوی ئیدئولۆژی ئیسلامی، هێشتا زۆرێک لە کولتووری تایبەت بە عەرەبی بیابانیان لەگەل بووە، بۆ داسەپاندنیشی لە هەوڵدا بوونە. هەرچەند لەوانەیە زۆرێک لەو باویلکانە لە گەل ویست و ئیدئۆلۆژی ئیسلامیدا بە جیا و نایەکانگیر بووبێ. ئەم باسە پێویستی بە پرۆژە و لێکدانەوەو بە دواداچوونی پتر هەیە).

یەکەم دەقی هاوار بەدەس ئەو وەزعەوە، بە زمانی کوردی و بە زاراوەی هەورامی دەخولقێ[1]. لەوە بە دواش، بەردەوامی دەقەکان بەو زاراوەیە بەدیارە. ئەمەش پیشاندەری باوەڕ بە خۆ و ڕێزدانان بۆ کولتووری خۆییە. ئەگینا ئەویش هەر وەک ئەوەی فارسی، دەبوا لانی کەم بۆ ماوەی چەند سەدە، تەسلیمی زمانی عەرەبی ببوایە و بۆ نووسینی دەقەکان، زمانی عەرەبی بە کار ببردایە.ئەم باوەڕ بە خۆ و پارێزگاری کردنە، لە خۆیدا جێگای سەرنجە.

تایبەتی دووهەم: ڕێبوارانی ئەو ڕێبازە، بەردەوام لە خزمەتی زمانی کوردی بۆ خزمەت کردن لە پێناو پاراستنی قەوارەی نەتەوەییدا بوونە. شاعێرانی گۆران، نانیان بە نرخی ڕۆژ نەخواردوە. بە بالای دەسەلات و ستەمکاردا نەیانچڕیوە. ئەمەش لە کەش و هەوایەکدا بووە کە شاعێرانی فارس، بە گوژمەوە خزاونەتە ژێر ئالای زمانی عەرەبی و تەلاری دەسەلاتەوە. بە واتەیەکی تر، لە سەردەمی ڕقەبەرایەتی شاعێرانی فارس بۆ خزینە ناو بازنەی دەسەلات و چۆکدان لە بەرانبەر زرنگەی زێڕ و بریقەی پلاوی کۆشکەکان، شاعێرانی کوردی گۆران، کەسایەتی سەربەخۆی خۆیان پاراستوە و لەوپەڕی بێدەرەتانی و هەژاریدا، خۆیان لە دەسەلات نیزیک نەخستۆتەوە. ئەم خسڵەتە پاشتر بۆ شاعێرانی ڕاستەقینەی سەردەمی ئەدەبی کوردی گوێزراوەتەوە و بوونەتە هۆی شانازی پێکردنی ئەوان.ئەو ئەدیبانە خزمەت لە پێناو خۆیان بە شانازی و ئەرک زانیوە. ئەمەش بۆ ئەو ڕاستیە ئەگەڕێتەوە کە ئەوان وەک ناخۆیی و داگیرکار سەرنجی دەسەلاتیان داوە.

هێردر وتەیەکی هەیە کە لەمپێناوەدا زیاتر گۆیایە. ئەو ئەڵێت:

«نەتەوایەتی بریتیە لە خەڵکانێک کە کولتووری نەتەوەیی هەیە. هەر وەک چۆن زمانی خۆی هەیە.»

---

[1] ـ ئەو دەقەش پارچە شێعری هورموزگانە .

ناوبراو لەو دێڕەدا، لەسەر چڕبوونەوە بۆ ناخی کولتووری نەتەوەیی و گەشەی زمانی نەتەوەیی جەخت ئەکاتەوە. لەو پێوەندیەدایە کە خزمەتی شاعێرانی گۆران بە تایبەت لەو سەردەمە ناسکەدا، شیاوی خوێندنەوەیە. بە تایبەت کە لە کیشوەرێکی فەرهەنگیدا، بڕەویان بە زمان و کولتووری نەتەوەیی داوە. هەرلە لوڕستان و ئیلام تا کرماشان و ئەردەڵان و شارەزوور و کەرکووک و قەرەداغ و سلێمانی و ... دەنگیان بەرز کردوەتەوە و ئاهەنگی مانەوە و گەشەیان وەخرۆش هێناوە.

تایبەتی سێهەم: بە پێچەوانەی ئەدیبان و شاعێرانی فارسی دەراوسێ، کوردان، بۆ پارە و بە پێی مامەڵە شیعریان هەڵنەبەستووە. ئەگەر سەرنجی مێژووی ئەدەبی بدەین، بۆمان دەرئەکەوێت کە زۆربەی شاعێرانی فارس لە دەربارەکاندا پەروەردە کراون و بە پێی مامەڵە و لە بەرانبەر جیفەی دونیاییدا، شیعریان وتوە.

بۆ نموونە "دوکتور عبدالحسین زرین‌کوب" لە کتێبی «اشنایی با نقد ادبی» ئەڵێت : «مەحموودی غەزنەوی لە گەل فیردەوسیدا پەیمان دەبەستێ کە لە بری هەر دێڕە شیعرێک، یەک دیناری بداتێ. بەڵام لە ئاکامدا و پاش تەواو بوونی شانامە، بۆ هەر دێڕە شیعر، تەنیا یەک دەرهەمی پێئەدات». «شانامەی فیردەوسی، گەورەترین بەرهەمی شیعری فارسە کە بوو بە بنەمایەک بۆ ڕزگارکردن و گەشەسەندنی زمان و کولتووری فارسی لە ژێر تەوژمی زاڵیەتی کولتوور و زمانی عەرەبیدا. هەر بۆیە وەک نموونەیەکی بەرچاو ئاماژەی پێکراوە».

تەنانەت ڕەخنەگرێکی بەناوبانگی وەک بەڕێز دوکتور "عەبدالحسین زەرین‌کوب" جەخت لەسەر ئەوە ئەکاتەوە کە بازرگانی کردنی شاعێران و خزانە نێو تەلارەکانی دەسەڵات کارێکی ئەرێنی و ڕەوا بووە. ئەو ئەڵێت: «نابێ لەوە دوودڵ بین کە شاعیران و نووسەران لە سەردەمی ڕابردوودا هەر وەک هەنووکە، بە کرێ گیراوو کاسبکار بووگن، ناچار بووگن لە ڕێگای واریاتی بەرهەمەکانیانەوە بژێوی خۆیان دابین بکەن» (زرین‌کوب، ١٣٧٨ :٧٤).

هەرچەند بە باوەڕی من دابین کردنی بژێو لە ڕێگای نووسینەوە لە سەردەمی هەنووکەدا بە پیشەیی بوونی نووسینە. ئەمەش لەوەی ڕابردوو جیاوازە کە ئەو بەڕێزە ئاماژەی پێکردوە. خۆ لە سەردەمی هەنوکەشدا ئەو جۆرە کەسانە کەم نین کە خزاونەتە دیوەخانە سەردەمیانەکانەوە.

بە لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی دەقەکانی ئەدەبی کلاسیکی کوردی، هەر لە شیعری هۆرمۆزگانەوە تا سەردەمی نوێ، بۆمان دەرئەکەوێ کە تەقالای ئەدیبانی کورد لە پێناو خزمەتگوزاری زمانی نەتەوەیی، بەردەوامی پێوە دیارە. ئەکرێ بۆ بەرجەستە کردنەوەی هەوڵەکانی ڕێبوارانی ئەو ڕێبازە، بکەوینە پۆلێنکاری و لە دەستەبەندیەکدا، بەمجۆرە دایانبەشێنین:

بزاڤەکانی دەق خولقێنی لە پێناو پارێزگاری کردن لە زمانی نەتەوەیی:

**بزاڤی زمانی خۆماڵی**

لە ڕوانگەی زمانناسی کۆمەڵایەتیەوە، ئەکرێ بێژین زمانی کوردی لە سەردەمی بەرباسدا، لە چەند چمکێکدا گیرساوەتەوە. لە ڕوانگەیەکەوە ئەکرێ بەمجۆرە دابەشی بکەین.

**ئە- زاراوەی دینی (زمانی حوجرە)** کە تایبەت بە دینپەروەران بووە. بۆ پتەوکردنی بنەمای باوەڕ، هەوڵ دراوە زاراوەی دینی لە نێو جەماوەردا بنجبەست بکرێت. ئەم ڕەوتە هەر لە باوەڕی زەردەشتییەوە تا یارسان بە سیمای ئەدەبی کوردی (بە تایبەت لقی گۆرانەوە) دیارە. هەر چەند هەوڵ لەم پێناوەدا، لە زاڵیەتی باوەڕی ئیسلامیەوە بەرجەستەتر و چەقبەستووتر ئەبێت. نموونەی ئەم ڕەوتە بە شیعرەکانی "مامۆستا مەولەوی تاوەگۆزی" و شیعرەکانی "مامۆستا نالی" و "مامۆستا مەحوی"ەوە دیار و بەرجەستەیە و بە خەستی زەق ئەبێتەوە. هەرچەند شیعری هۆرمۆزگان و هەندێک لە شیعرەکانی «یارسان»یش لەم ڕەوتەوە نیزیکن، بەلام زیاتر ڕەهەندی ناوەرۆک هەڵبژێر کراوە و وەک زاراوە تا ڕادەیەکی زۆر لە زاراوەی جەماوەر نیزیکە.

**ب- زاراوەی دەسەلات**

ئەم زاراوەیە تایبەت بە کۆشک و بارەگای دەسەلاتداران بووە و لە دیوەخان و لە نێو چینی بالای کۆمەڵ بە کار براوە. بە تایبەت ئەکرێ وەک زاراوەی میرزایانە ئاماژەی پێبکرێت و بێتە بەرجەستەکردنەوە. ئەم ڕەوتەش زیاتر بۆ حەز و گەرەکبوونی ئەمارەتەکان گەڕاوەتەوە کە بە پێی نزیکاگەتیان بە دەسەلات و ئیمپراتۆرەکانەوە، زمانەکانی ئەوانیان لا خاوەن برەو بووە. بۆ نموونە لە زۆر شوێن باسی ئەوە ئەکرێت کە گوایە زمانی فەرمی ئەردەلانەکان زاراوەی «گۆرانەکان یان هەورامی» بووە. بەلام هەرچی هەوڵمدا تەنانەت یەک دێڕ لە نامە و نووسراوەی غەیرە شیعری ئەو نیمچە دەسەلاتەم دەسنەکەوت کە بەو زمانە بێت. زمانی فەرمی ئەوان کە زمانی کۆشک بووە، هەمان زمانی فەرمی دەسەلاتە گەورەکانی دیکە بووگە کە ئەوانیشی پێوە لکاو بووگن. یان باسی خەلات و بەرات یان مامەڵەیەکی ئەوانم دەسنەکەوت کە هەر وەک "مەحموودی غەزنەوی" لەگەل شاعیراندا و بۆ بەرهەم هێنانی شاکارێکی گەورەی ئەدەبی کردبێتیان.

**ج- زاراوەی خۆماڵی**

ئەم زاراوەیە تایبەت بە ئاپۆرەی جەماوەر و چینەکزەکانی کۆمەڵ بووگە. زیاتر لە نێو ئاپۆرەی جەماوەردا برەوی هەبووە و هاتوەتە کردار. زاراوەیەک کە بە قەد ژیان و ڕۆحی ئاپۆرەی جەماوەر سانا و سادە بووە و بە ئاسانی هاتۆتە پەیوەندی و گوفتار. زۆربەی هەرە زۆری شاعێرانی کورد بۆ پێشکەشکردنی دەقەکانیان زاراوەی خۆماڵی و جەماوەرپەسەندیان هەڵبژاردوە. بە تایبەت شاعێرانی ئەوسای ئەدەبی گۆران ( وەک بە دەقەکانیانەوە دیارە) خۆیان لە زاراوە بالادەستەکان، «زاراوەی دیوەخان» و «زاراوەی حوجرە»، دزیوەتەوە و هەوڵیان داوە بە هەڵبژاردنی زمانی ئاپۆرەی جەماوەر، کە خۆماڵی و خۆیی بوونی پێوە بە دیار بووگە، بە خزمەتکردنی زمانی نەتەوەیی هەستن و بێنە مەیدانی کردار. وای بۆ ئەچم کە شاعێرانی وەها ڕێبازێک، شیعریان وەک کەرەستەی ڕژانە ناو جەماوەر لێکداوەتەوە. بۆیە هەوڵیانداوە زاراوەیەک هەڵبژێر بکەن کە ببێتە هۆی پەیوەندی لە دەڤەرێکی بەرینتردا. ئەمەش لە لایەن جەماوەرەوە هاتۆتە پێشوازی لێکردن. جەماوەر، بەرهەمەکانی لە بەر کردوە و لە سینگدا پاراستوونی و نەوە بە نەوە ڕاگوێزی کردوون. نموونەی بەرجەستەی ئەم ڕێبازە لە بەرهەمەکانی "مامۆستا قانێع"دا خەست بووەتەوە. ئەم هەڵبژارد کردنە لە دۆخێکدا

بووگە کە زۆربەی هەرە زۆری شاعیرانی ئەوسای کورد لە حوجرەدا پەروەردە کراون و تەنانەت بۆخۆشیان مەلای باش و بلیمەت بووگن. وەک "مامۆستا مەولەوی" و "بێسارانی" و "قانع" و "مەحوی" و...

زانای ناودار «کارل کاوتسکی» ئەڵێت: ڕۆڵی کاریگەری زمان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدایە، ئێمە بە تێگەیشتن لە بەشێکی گرنگی هێزی هەست و سۆزی نەتەوەیی ئاشنا ئەکات. ئەم پسپۆڕە، لە چوار فاکتەرەکەیدا کە بۆ سەلماندنی هەبوونی نەتەوە، دەسنیشانیان ئەکات، گرنگیەکی بەرچاو بە زمان ئەدات. زۆربەی شاعێرانی کورد بۆ پێشکەشکردنی بەرهەمەکانیان زمانی خۆماڵی نەتەوەییان هەڵبژاردوە و نەخزاونەتە نێو حەزخانەی دەسەڵاتەوە. لە پۆلێن کردنێکدا، ئەکرێ حەزەکانی ئەو شاعێرانە، لە چەند خاڵێکدا گلێر بکرێنەوە:

## بزاڤی پارێزگاری کردن لە زمان

زمانێک کە هاوکات لە گەل باقی توخمەکانی نەتەوەیی لە ژێر هێرشی تواندنەوە و سڕینەوەدا بووە. ئەم هێرشە، هاوکات لە دوو جەبهەوە کراوەتە سەری. دەسەڵاتی فارسی لە لایەک و دەسەڵاتی عەربی لە لایەکی دیکەوە. هەرچەند لە سەرەتاکانی زاڵیەتی سوپای عەرەب بە سەر ئێراندا، ئەو هێرشە لە لایەن کولتووری عەرەبیەوە بۆ سەر زمانی فارسەکانیش لە گۆڕێدا بووە و بووەتە هۆی چۆکدادانی نووسەرانی فارس، بە جۆرێک کە لە نووسراوەکانیاندا، بە دەسبەردار بوون لە زمانی فارسی، زمانی عەرەبییان کردبووە زمانی نووسین. تا ڕادەیەک کە هاواری دەسەڵاتدارانی فارس بەرز بووەتەوە. بۆ نموونە، لە کۆڕێکدا کە بە زمانی عەرەبی بۆ «یەعقووبی لەیس» شیعر ئەخوێننەوە، یەعقووب تووڕە دەبێت و دەخرۆشێ کە: چیزی کە من اندر نیابم چرا باید گفت؟ (سیاقی، ١٣٧٠ :١٠).

پاش ئەو تووڕە بوونە، "موحەممەد وەسیف" کە شاعێرێکی بە ناوبانگی دەربار بووگە، دەست ئەکات بە شیعر نووسین بە زمانی فارسی.

دژەکرداری کۆمەڵگەی تورکیش بەرانبەر بە خۆ سەپێنی زمانی عەرەبی، لەسەردەمی "کەمال ئاتاتورک"دا تەقیەوە و هەموو هێماکان کرانە زمانی تورکی.

ئەمەش سەدانسەد پێچەوانەی ڕەوتی شاعێرانی کورد بووە. شاعێری کورد نەک تەنیا لە لایەن دەسەڵاتەوە پشتگیری نەکراوە، بەڵکوو تەنگیشی پێهەڵچنراوە. نەک تەنیا بۆ بەرگریکردن لە زمان و کەلتوور هانودنە نەدراوە، بەڵکوو لە سەر هەڵبژاردنی زمانی کوردی بۆ نووسین ، بە شێوازی جوراوجۆر بەرهەڵست دراوە.

## بزاڤی گەشانەوە :

هەوڵ و تێکۆشان بۆ پارێزگاری لێکردن، خۆبەخۆ، ڕەوت بۆ گەشەکردن ئەسازێنێ. پارێزگاریکردن و هێنانە کرداری زمان، لە خۆیدا، ئەبێتە هۆی پەروەردەبوون و شکۆفانەوە. کاتێ هەوڵ بەردەوام و مسۆگەر و بە ئامانج وخاوەن گلاڵە بێت، دەرفەت و دەرەتان بۆ پەروەردە بوون و گەشانەوە دەڕەخسێنێ. بە پێی ئەو دەق و

فاکتانە کە بە دەستەوەن، هەوڵەکانی شاعێرانی کورد، وەک بەرخودانێکی کولتووری و خۆویست، لە وەها قاوغێکدا دێنە بەرچاو.

### بزاڤی وەرگێڕان :

شاعێرانی کورد، لە پێناو دەوڵەمەندکردنی کەلتوور و زمانی کوردی، لەدژە هێرشی خۆپارێزیدا، بە وەرگێڕانی زۆر کتێب و حیکایەت و بەسەرهاتی گەلانی دیکە، بەتایبەت فارس و عەرەب هەستاون. بەو کارەیان لە پێناو دوو ئامانجی کۆمەڵایەتی، هاتوونەتە جەبهە.

**یەکەم** ویستوویانە جەماوەری کورد بە خوێندنەوە و تێگەیشتن لە بەرهەمەکان چێژ بەرێت .

**دووهەم،** هەوڵیانداوە کارێک بکەن کە خوێنەری کورد ناچار نەبێت بۆ تێگەیشتن و سوود بردن لەو حیکایەت و بەسەرهاتانە، ڕوو بکاتە زمانە باڵا دەستەکان و بەم کارە بەرەو بە ئاکام گەیشتنی ئاوات و پلانی نەیارانی نەتەوەی کورد، بکەوێتە یاریدەدان. هەرچەند ئەگەر لە ڕوانگەی ئەمڕۆژیەوە لێکی ئەوکردارە بدەینەوە، وەک تەوس و دەگم بێتە بەرچاو، بەڵام لە دۆخێکدا کە هەموو هەوڵ و پلانەکان لە پێناو تواندنەوە و سڕینەوەی نەتەوەیەکدا هەژیون، وەها لێکدانەوەیەک مونسیفانە نایێتە بەرچاو. پێویستە وەک بەرخودانێکی نەتەوەیی بێتە ئەژمار. هەرچەند پارێزگاریکردن لە بەشێک لە کولتوور و زمانی مرۆڤ، لە خۆیدا جێگای سەرنجە و خزمەتی بەرینە بە بەرەی مرۆڤایەتی.

### بەرخودانی فەرهەنگیی:

بە لەبەرچاو گرتنی کەش و هەوای سەردەم، شیاوی باسبێژکردنە کە هەوڵ و تەقالای شاعێران، لە سەر ویستی خۆ و بە بێ هاندەری غەیرە خۆ هاتوەتە ئەفراندن. بزاڤەکە لە بناغەی نەتەوایەتی و لە سەر حەسێبی هەست بە مەزڵوومی کردن، هاتۆتە کردار. چ دەسەڵاتدارێک، یاریدەی نەداون و بۆیان نەبووەتە پاڵپشت. ڕازی مانەوە و گەشەی زمانی کوردی، لە وەها هاز و تینێکەوە سەرچاوەبەست ئەبێت. ئەمەش پێچەوانەی ڕەوتی کرداری شاعێرانی گەلانی دەراوسێی کورد بووە کە بە درێژایی مێژوو ، لە سەر حسێبی گیرفان و بۆ بژێوی ئەدەباندوویانە.

ئەگەر لە وەردانەوەیەکدا، تیشکی تێڕامان بە سەر ڕەوتی ئەدەبی جیهانی و دەرفەت و دەرەتانەکانی خولقانی زۆرێک لە شاکارە ئەدەبیەکانی گەلانەوە زۆم بکەین، بەڵگە و فاکتی زۆر، لە سەر دەسباردان و یاریدەدان و داڵدەبەخشیی خاوەن دەسەڵات بە خولقێنەرانی ئەو بەرهەمانە دێنە گوفتار. بۆ وێنە: مامەڵەی نێوان "سوڵتان مەحموودی غەزنەوی" و "فیردەوسی تووسی". بە پێی ئەو مامەڵەیە، بڕیار هاتۆتە بەین کە لە بەرانبەری وشە و بەیتەکانی شانامەدا، فیردەوسی دراوباران بکرایە. بەش بە حاڵی خۆم لە سەر ئەو قەناعەتەم کە ئەگەر وەها وادە و بەڵێنلک نەهاتایاتە بەین، «شانامە»، بەو نرخ و بەها ئەدبیی و حیماسیانەوە، نەدەخولقا و ئەدەبی فارسی شانازی پێوە نەدەکرد. لە سەدەی حەفدەهەمیشدا، دەسەڵاتدارانی ئەورووپا، نووسەران و

هونەرمەندانیان ڕێز پێبەخشییوە و خەڵات و پاداشبارانیان کردوون. بە دابینکردنی ژیان، دۆخیان بۆ گەشەی بەرهەمەکانیان سازاندوە. بەمجۆرە کەسانێکیان پێگەیاندوە کە بتوانن ببنە خودان هزر و کاریگەری. هەرچەند ئەم ڕەوتە لە سەدەی هەژدەهەمدا، دووچاری ئاڵوگۆڕ دەبێ.

لە کوتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەم لە ئاڵمان، شاعیران لە نێو ئاپۆرەی خەڵکدا هاتوونەتە شیعرخوێندنەوە و لە بەرانبەردا وێردیەیان ئەستاندوە. یان ساڵی ١٨٦٧زایینی، بری ١٨٠٠٠٠ مارک بۆ هاندانی «فردیناند فرایلیگرات»، قسە بێژی سەوداسەری ڕامیاری لاوان، تەرخان دراوە تا لەو ڕێگایەوە لە وڵاتی ئینگلیسەوە بۆ ئاڵمان بگەڕێنرێتەوە.

شاعێری تورک،"شێخی" ، کۆچکردووی ١٤٣١ی زایینی، کە یەک لە شاعێرانی نیزیک بە ئیمپراتۆری عوسمانی بووە، کتێبی «خوسرەو و شیرینی» خۆی کە شوێنگرتی «نیزامی گەنجەوی» بووە، پێشکەش بە ئیمپراتوور ئەکات و لەو ڕێگایەوە دەگاتە نان و نەوا.

شاعیرانی عەرەبیش هەر لە سەردەمی بیابانگەڕیەوە، لانیکەم لە بازاڕەکانی عوکازدا هەلی ئەوەیان بۆ ڕەخسێنراوە تا خۆ دەربخەن و لە لایەن خێڵەکانەوە خەڵات بکرێن.

ئەو فاکتانە و دەیانی دیکەش، تەنیا بەشێکن لەو کردارانە.

ئەمەش لە حاڵێکدایە کە شاعێری بە بەهرەی کورد "خانای قوبادی" بە بڵ هیچ چەشنە داڵدە و یادریدەدەر و پاڵەپشتێک، لەوپەڕی چاوکراوەیی و بەرپرسایەتیدا بەو ئەرکە مێژووییە هەڵدەستێ و بانگەوازی پارێزگاری لە زمانی کوردی ئەکاتە شالووتکەی شیعرەکانی. دوور نییە لەسەر ئەو بانگەوازە مرۆڤانییە زۆر کۆسپ و تەگەرەشی ئاوقە کرابێتەوە.

ئەکرێ بێ دوودڵی ئەو پارچە شیعرەی مامۆستا "قانع" وەک نموونەی ژیانی شاعیران و بیرمەندانی ئەوسای کورد بخەینە بەرئاماژە:

| | |
|---|---|
| بەناو مەشهووری ئافاقم کەچی هەر ئاهـ و ناڵینمە | وەکوو پیاوی برامردوو لەبرسا زاری و شینمە |
| دەمێ خەم بۆ کەواکۆنە و دەمێ بۆ نانی جۆیینمە | ئومێدو واسیتەی ژینم گەدایی‌و مردوو شۆرینمە |

(قانع، ٢٠٠٢: ٢٥٢)

بە سەرنجدان بەو نموونانە هەوڵی خۆڕسک و خۆبەختکەرانەی شاعێرانی کورد، کە لەو پەڕی بەرتەسکی ژیان و بێدەرەتانیدا، هاتوونەتە کردار، زیاتر ڕێزبەروو و شیاوی پێزانینە. بە ڕاستی ئەوان لەوپەڕی دەسکورتی و تەریکی و نەداریدا، بزاڤی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردییان پاراستوە و بەرە و گەشانەوە پاڵیان پێوە ناوە.

## بزاڤی دانانی بنەڕەتی زمانی نەتەوەیی (یەکگرتوو)

دەقە تۆمار کراوەکانی شاعێرانی کورد، جاڕدەری ئەوەن کە بزاڤ و پەلەقاژەی ئەوان لە پێناو بونیادنانی بنچاخی زمانی یەکگرتووی کوردی بەردەوام بووە. هەوڵ دراوە زاراوەکانی زمانی کوردی لێک نیزیک بخرێنەوە. بە تایبەت لە بەشی ئەدەبی گۆراندا، لە زاراوەکانی دیکە، وشە هەڵبژێردراوە و لە بەیتە شیعریەکاندا

جێگیر کراوە. ئەگەر وردی بەرهەمی ئەو شاعێرانە ببینەوە، بەدیارە کە زۆر وشەی زاراوەکانی هەورامی، سۆرانی، ئەردەڵانی، لەکی و کەلهۆڕی و تەنانەت کرمانجی ژووروو، لە شیعرەکاندایە. نموونەی ئەم هەوڵانە لە ئەدەبی گۆراندا، کە سەرەڕای بناغەڕێژی بۆ دامەزراندنی زمانی یەکگرتووی کوردی، هەوڵدان لە پێناو خزمەت کردن بە زمانی نەتەوەیی بووە. بایەخدان بە زمان و هەژان لە پێناو پارێزگاری لێکردن و دەربازکردنی لە تەنگانە و جڤین بۆ گەشە پێدان و بۆلاخکردنەوەی، ئەرکێکی مەزنی مرۆڤانی و نەتەوەیی بووگە.

بە کردار کردن و کەڵکوەرگرتن لە زمانی نەتەوەیی لە خۆیدا ئەوپەڕی خزمەتکردنە بە نەتەوە. بە واتەی «زاندارا کامبوزلیس» :« ناسیونالیزم کاتێک بوون دەگرێ کە زمان بێتە گۆڕەپانی نڤیسین .»

بە لە ڕێر تەوژمی هەست کردن بە گوشار بە ئامانجی بنەما سڕینەوە، شاعیرانی کلاسیکی هانداوە تا لە پێناو گەشەی زمانی نەتەوەیی خۆیان، لەهیچ کردار و هەوڵێک درێغیان نەکردووە. نەک هەر ئەوە، بەڵکوو هیچکات دەسەڵاتەکان، چ تەکانێکیان لە پێناو گەشەی زمانی نەتەوە ژێرچەپۆکەکانی خۆیان، بە خۆ نەداوە. عەرەب، هیچکات لەبۆ مانەوە و نەتوانەوەی زمانی برا کوردە مۆسۆڵمانەکانی خۆیان!! نەهاتوونەتە کردار و تەنانەت بە شێوەیەکی شێلگیرانە، هەوڵیان بۆ سڕینەوەی داوە. لە کاتێکدا، بۆ ناس سڕینەوە و ژینۆسایدی فەرهەنگی و نەتەوەیی گەلانی ژێر چەپۆکە، درێغیان نەکردوە. بۆ خۆیان، هەر لە سەردەمی نەفامیەوە و لە چەقەخانەکانی عوکازەوە، لە پێناو گەشەی فەرهەنگی و زمانیی خۆیان بە پەرۆش بووگن. لە سەردەمی ئیسلامیشدا، هەر بەوجۆرە.

"ئیمام شافیعی" (٢٠٤)کۆچی مانگی، شاری مەککە بەرەو بیابانەکانی عەرەبستان بە جێ دێڵێ و دەخزێتە نێو خێڵی هۆزەیل تا لە گەل زمانی پاراوی عەرەبی و هەڵسوکەوتی ژیانی خێڵە بیابانییەکان، کە گوایە نموونەی ڕەسەنایەتی زمان و فەرهەنگی عەرەبی بوونە، زیاتر ئاشنا ببێت (شبلی،١٣٧٠: ٨٨). یان ئەگێڕنەوە کە جارێک " زیاد " خەریکی پۆژاندنی گێرەوکێشەی نێوان چەند کەسێکی ژێردەستەی خۆی ئەبێت کە پیاوێک دێتە لای و بە دەس براکەیەوە شکات ئەکات کە گوایە لە میراتی باوکی بێبەشی کردوە. "زیاد"، لە شکاتنامەکەی ئەودا هەڵەی زمانی زەق ئەبینێ. بۆیە ڕوو دەکاتە پیاوەکە و پێی دەڵێ : ئەوەی لە زمانەکەتدا ونت کردوە، گرانتر و جیدیتر و زیانبارترە لە دۆڕاندنی میراتەکەی باوکت.. (شبلی،١٣٧٠: ٨٥).

"ئەلحەسەن"، هەرکە ئاگادار ئەکرێتەوە کە یەک لە فرماندەکانی بە هەڵەی زمانیی عادەتی کردوە و لە فەرمانەکانیشیدا هەڵەی زمانیی زۆرە، فەرمان ئەدات تا بێ‌ماتڵ بوون لە سەر کار لا ببرێت.. (شبلی،١٣٧٠: ٨٥).

هەر وەها "حتی"، دەربارەی ئەمیرانی ئەمەوی ئەڵێت: بیابانەکانی شام وەک قوتابخانەیەک بوون کە کوڕە لاوەکانی ئەوان بۆ فێربوونی زمانی پاراو، بۆ ماوەیەک لەوێ دەمانەوە. تەنانەت "معاویە"ش "یەزیدی" بۆ وەها ئامانجێک بەرەو بیابانەکان هەناردوە.. (شبلی،١٣٧٠: ٨٧).

بۆیە شاعێرانی کوردیش (هەرچەند کەم دەسەلات و بێپشتیوان) بەلام لەو پەڕی هەستیاریەوە لە سەنگەری پارێزگاری و لە دۆخی نایەکسان و بە کەرەسەی نابەرابەرەوە، هاتوونەتە جەبهەی پارێزگاری و کەوتوونەتە پەلەقاڕە. لە کاتێکدا کە لە لایەن باڵادەستانی ناکوردەوە و زۆر جاریش لە لایەن کوردانی دۆڕاو و بێئیرادەوە، لە ژێر گوشاری جەرگبڕدا بوونە. دان بە بوونیاندا نەنراوەو و تورکی کێوی و جنۆکە و هەلاتووی ژێر ساتووری "زەحاک" ناوبرد کراون. بۆیە ئەو فەرهەنگوانانە لێبڕاوانە، لە سەنگەری بەرخوداندا، لە پێناو نەمری و مانەوە و گەشەدا، جڤیون وهاتوونەتە کردار، هەوڵ و تەقالایان جێگای سەرنج و پێزانینە.

نموونەیەکی بەرچاوی ئەو بزاڤە، بلیمەتی ناودار " مەلا هەسەنی دزلی"یە.

ئەو پاش ئەزموونکردنی ژیان لای دیتران، بۆ وێنە لە بندەسی « ئەلئەزهەری ولاتی میسر»؛ ڕوو لە مەڵبەند و گەلی خۆی ئەکاتەوە و ساتێک ژیانی پڕ لە کوێرەوەری ئەوێ، بە ژیانی بندەستیی لە کۆشکی میر و عەرەبان نادات و کوێستانی «دالانی» ئەکاتە هێمای وەلات و ژیانی هەلۆ و هێمای دێرینی ژیانی سەربەرزی لە لای کوردان و ئەڵێت:

من هەڵۆی لووتکەی بەرزی دالانیم          هەرگیز وەک قالاو ناکەومە چینە

(مەلا حەسەن، ١٣٧٩: ٦٦)

لێرەدایە کە ڕۆحی بەرزی مەلایەکی نیوەبرسی هێندە خودان متمانە بەخۆ و کەسایەتیەکی پێگەییو و بەرزە کە ژیانی ئەوپەڕی کوێرەوەری بەلام پڕ لە شەرەف و سەربەرزی ناگۆڕێتەوە بە کەوتنە خاک و پای دەسەلاتە ناخۆییەکان. تەنانەت لە « ئەزهەری میسر»یش. یان:

تا بۆ و بەرامەی شەوبۆ و وەرکەمەر          تا سوورهەراڵە سەر تێرێتە دەر
تا دەنگی ژەرەژ، پێقەی نەچیرێ          تا قسەی خۆشی پیرێکی ژیرێ
تا بەڕوو مابێ لە هەوراماندا          تا شەماڵ بدا بە کۆسالاندا
تا بەڕەزایەک با بیشەکێنێ          هەتا ڕێواسێ چووزە دەربێنێ
فەرەنجی شرێ، چۆخە دڕاوێ          کلاشە چەکێ، پشتێن بڕاوێ
شەرتە هەورامان بە جێ نەهێڵم          مەگەر ئەو ساتە کە بە جێی دێڵم

«مەلا حەسەن» لەم شیعرەدا، یەک بەیەک، گوڵەکانی وەلات ئەکاتە هێمای خۆیی بوون و ئاوێتەی پێقەی نەچیر و نەغمەی ژەرەژ و قسە و ئامۆژگاری پیرانی خودان ئاوەزی وەتەنیان ئەکات و ئەکەوێتە شانازی پێکردنیان و قەول ئەدات کە بوون و مانەوەی خۆی لەگەل بوون و مانەوەی ئەوان پتەو و نەبڕاوە بکات وقەد پشتیان لێنەکات و بە جێیان نەهێڵێت. مەگەر ئەو کاتەی کە مەرگ بەرۆکی پێبگرێت و بە یەکجاری دووری بخاتەوە. ئەمەش لە خۆیدا شیاوی ڕێز و سپاسە کە مەلایەکی چاوکراوەی کورد هێندە شانازی بە بوونی نەتەوەیی خۆیەوە بکات کە لە بەرانبەر ئەو داخوازیانەی کە ئەخرێنە بەردەمی، ئاوەها وەلام بداتەوە و « هەورامان » بکاتە هێمای وەلات و بڕیاری لەگەل مانەوە وبۆمانەوەی لەسەر بدات.

## بەشی شەشم- زمان

### ئاکام:

بایەخ و ڕۆڵی زمان لە ژیانی مرۆڤدا هێندە زەبەندە، کە بە جاران و لە ڕوانگە و هزری جیاوازەوە، لە لایەن خاوەنڕایانەوە، کەوتۆتە بەرباس و توێژینەوە. ئەم توێژینەوانە، شێوازە جیاوازەکانی مرۆڤی گرتۆتەوە و بە شیکاری و دەمقاڵی ژیرانە و عیلمی، بایەخی زۆری پێبەخشراوە. ئەدیبانی کوردیش، هەر لە دێرین زەمەنەوە هەستیان بەو گرنگی و بایەخە کردوە ولە ڕەهەندی وەها هزرێکەوە، بە گژ نەیارانی زمانی کوردیدا چوونەتەوە و بۆ پاراستن و پەروەراندنی، لەو پەڕی لە خۆبردووییەوە هاتوونەتە جەبهە.

ئەمەش وەک بەرخودانێکی مافخوازی و عەداڵەتپەروەری دێتە لێکدانەوە. چوونکوو نابێ فەرامۆش بکەین کە کۆمەڵگا یەکدەست و یەکڕەنگ نییە. زۆرێک لە وڵاتە گەورەکان لە چەند پێکهاتەی نەتەوەیی پێکهاتوون و لە بنپاڵی یەکدا وڵاتێک و گەلێکی گەورەتریان پێکهێناوە. بەجۆرێک کە کەسانی ئەو کۆمەڵگایە لە پاڵ یەکدا هەست بە ئاسوودەیی و سەربەرزی و بەختەوەری ئەکەن.

لە کۆمەڵگا هەمانچەشنەکانی دیکەشدا ئاساییە ئەگەر پێکهاتەکان خوازیاری ئەوە بن هەرجۆرە گەشەیەک بە شێوازێکی یەکسان هەموویان بگرێتەوە و دادپەروەری لە نێویاندا بەرقەرار بێت. بە تایبەت لە بواری زمان وپەروەردەدا، ئەم ویست و ئیرادەیە بەرسەرنجترە و تەنانەت لە لایەن کەسانی ئاکادیمی و زانستپەروەرەوە و لە سەردەمی هاوچەرخیشدا کە سەدەی گەشەی هزر و زانستە، جەختی چڕتری لە سەر کراوەتەوە. بۆ نموونە زانای ناودار "تی.اس.الیوت" لای وایە: « ئەگەر کولتووری گەلێک بیهەوێت بگەشێتەوە، دەبێ وەک پێکهاتەیەک لە کولتوورەکان سەرنجی پێبدرێت. سوودێک کە هەر یەکە لەو پێکهاتانە لە یەکدی دیبەن، لە ئاکامدا دەبێتە هۆی سوودی پێکهاتەکە بە گشتی» (الیوت:٦٨).

دیارە لە وەها ڕوانگەیەکدا تەریک کردن و پەراوێز خستن، چ واتایەک نادات و شتێکی سواو و نازانستی و نالۆژیکیە. نەک هەر نابێتە هۆی گەشە و سەرکەوتن، بەڵکوو بە پێچەوانەشەوە ئەبێتە هۆی دژدۆنگی و پەرچەکردار. ئەمەش کۆمەڵگا بەرەو هەڵدێر ئەبات و تواناکانی لە خزمەتی گەشە و نەشەی هەمەلایەندا لوێر ئەکاتەوە.

ئەگەر لەم ڕەهەندەشەوە بکەوینە خوێندنەوەی بزاڤی شاعیرانی ئەوسای کورد، ئەو بزاڤە وەک ئەرێنی و پڕ بەهرە دێتە خوێندنەوە. لەبەر ئەوەی بزاڤەکەیان لە پێناو بەرگری کردن لە مەرگ و قڕانی کولتوورێکی دێرین و ئەتنیکی و دەوڵەمەندا بووگە. بزاڤی ئەوان بۆ پاراستنی بەشێک لە کولتووری مرۆڤانی هاتوەتە کردار.

" تی.اس.الیوت" بۆچوونێکی بوێرانە و پڕواتای هەیە کە لەم سونگەوە جێگای بایەخە. ئەو لای وایە: « بە ئەنقەست وێران کردن و فەوتاندنی کولتوورێکی دیکە، لە ئاست تاوانێکی گەورە و قەرەبوو نەکراوەدایە. لە ڕاستیدا هەر بەو ئاستە پڕگلاوە کە ئەنجامدانی کردەوەی حەیوانی لە گەل مرۆڤەکاندایە»(الیوت:٧٧).

ئەوەتا شاعیرانی کوردیش وێڕای ئەو هەموو تەنگەژانەی کە بەسەر ڕێگایانەوە بووگن، بوێرانە و ئازایانە بەو کارە هەستاون و هەوڵەکانیان بە مێژوویی کردوە.

لەو قەناعەتەدام کە ئەم بزاڤەی شاعیرانی کورد لە سەردەمی ڕابردوودا، ئەگەر خاوەن بەرنامە و گلاڵەیەکی تۆکمەش نەبووبێت، ئەوا لە هزری ئەو شاعیرانەدا کە بەم کارە هەستاون، بە ئەنقەست و لەسەرەخۆ و بەئاگا بووە. بە دەقەکانیشەوە دیارە کە شاعیرانی ئەم ڕێبازە بە جاران بۆ خۆشیان جەختیان لەسەر ئەم هەوڵانە کردوەتەوە.

| | |
|---|---|
| چوون فارسی بێ، پەند حەکیمان | بە لەفز کوردی کەردم تەرجومان |
| ساکە من ئەسڵم سینف ئەکرادەن | هەر کەس بە ئەمساڵ وێش خاتر شادەن |

ڕەوتەکە لەودا بە بەهرەتر و سەرنجبەرتر ئەبێت کە بزانین تەورەکانی ئەم ڕەوتە زۆرجار ڕەهەندەکانی دیکەی بزاڤی نەتەوەییشی گرتوەتەوە و تەنیا بە زەمانەوە نەگیرساوەتەوە. بۆ نمونە باوەڕ و چمکەکانی دیکەش:

| | |
|---|---|
| سەرهەنگی دەودان سەرهەنگی دەودان | ئەز کە ناممەن سەرهەنگی دەودان |
| چەنی ئێرمانان مەگێڵم هەردان | مەکۆشم پەرێ ئایینی کوردان |

(بابا سەرهەنگی دەودانی، سەدەی٤ک)

ئەبینین لێرەشدا ڕۆشنبیری سەردەم بە پێی دەرەتانەکانی سەردەم و لە ئاست پێوەرەکانی سەردەمدا بۆ پیکەوەنانی بنەماکانی شوناسی نەتەوەیی لە هەوڵدایە و بە جۆشە. هزرەکانی ئەحمەدی خانی و زۆرێک لە شاعیرانی دیکە کە دواتر لە مامۆستا قانعی ڕەحمەتیدا یەکانگیر دەبنەوە، ئەو هزرەن کە زمان پارێزیش یەک لەوانە.

تایبەتیەکی بەرچاوی ئەم بزاڤە نەتەوەییە لەوەدایە کە بە هیچ شێوەیەک خۆ بەزل زان و خۆسەپێنەر نەبووگە و هەوڵی بۆ بردنەوە لە هیچ دەر و دراوسێیەک نەداوە، ئەویش لە پێناو بە چۆکهێنان و بە ژێردەستە و کۆیلە کردن، بەڵکوو دایم لە هەوڵدا بووە تا مافە سرۆشتیە زەوتکراوەکانی بگێڕێتەوە ببێتە خاوەن کەسایەتی مرۆڤانی و خۆیی. هەر وەک هەر مرۆڤێکی دیکە. گرنگ لەوەدایە کە ئەم بەرخودانی زمان پارێزیە دواتر و لە سەردەمی هەنووکەدا و لە ژێر پرنسیبەکانی شەپۆلی ئاوەز و مۆدێرنخوازیدا، بە شێوازێکی بەگلاڵە و بەرۆژ بەرچاو خراون و جەختی زانستیانە و پەروەردەییان لەسەر کراوە، براونەتە خوێندنگاکان یان بۆ بەخوێندن کردنیان هەوڵ دراوە. زۆر زانا و شارەزای بواری پەروەردە، کەوتوونەتە پارێزگاری کردن لەو مافانەی گەلە ژێردەستەکان لە گۆشە و کەناری ئەم دونیا بەریندا. بۆ نموونە؛ زانای ناودار " پیتر ترادگیل " خاوەن کتێبی: « زمان ناسی کۆمەڵایەتی » لای وایە: « وتنەوەی وانە بە زمانی کەمایەتیەکان (نەتەوە ژێردەستەکان) نەک بە تەنیا لە فێربوونی خوێندن و نووسین، بەڵکوو لە فێربوونی وانەکانیشدا بە جەختەوە بۆ منداڵانی ئەو کەمەنەتەوانە بە سوودە. زیاد لەوەش ئەم شێوازە لە ئاستی ناسینی شوناس و کەسایەتی کۆمەڵایەتی و کولتووری منداڵاندایە و پەروەردە و گەشە پێکردنی کولتووری کەمایەتیەکانیشی بە دواوەیە» (ترادگیل:١٩٢)

**بەشی شەشم- زمان**

لە کۆتایی باسەکەدا جەخت ئەکەمەوە کە بزاڤی زمان پارێزی بە شێوەیەکی ئەکتیڤانە لـە لایـەن شـاعیرانی ئەوسای کورد، وەک بەشی مێشک کراوە و ڕۆشنبیری سەردەم لە ئارادا بـووە. هەرچەنـد ئـەم ڕەوتـە شـیاوی خوێندنەوەی چەنـد ڕەهەندیـە و نابـێ قەناعـەت بکـەین کـە بـێ تەگـەرە و بـێخەسـار بـووە. بـەڵام وەک ڕاستینەیەک لە ئارادا بووە و هەوڵی بۆ دراوە. ئەمەش بۆ ئەو ئاستەی هوشیاری شاعرانی سـەردەم ئەگەڕێتـەوە کە تا چەندە نرخ و بەهای زمانیان ناسـیوە و بەلایانـەوە گرنـگ و پڕبـەها بووگـە. شرۆڤـە و لێکدانـەوەی ئـەو هەوڵانەی کە شاعیرانی کورد بە درێژایی ڕەوتی شیعری کلاسیکی کوردی پێیـەوە مانـدوو بـووگن لـە چەنـد جومگەدا بەرسەرنجە:

یەکـەم: دەق خـولقێنی. چالاکـانی بـواری پارێزگـاری کـردن لـە زمـان و کولتـوور، هـەر لـە دەقـی "هورموزگان"ەوە بگرە تا سەردەمی "یارسانەکان" و قوتابخانەی "بێسارانی" و "نـالی" و "مـەحوی" و "قـانع" تـا سەردەمی "گۆران"؛ لە دۆخێکی دژوار و سەختدا هەوڵیان داوە بە زمانەکەی خۆیان دەق بخـولقێنن. ئەمـەش لە خۆیدا و بێئەوەی درۆشمی بۆ بدرێت خزمەتێکی گەورەیە بە مانەوەی زمان.

دووهەم: بەرنگار بوونەوە. زۆرجار لە سەردەمە جیاوازەکاندا شاعیران بـە خولقانـدنی دەقـەکانیان بـەرنگاری ئەو هزرانە بوونەتەوە کە دەسەڵات وەک گوشار و زەخت لەسەر زمان و کولتووری خستوە. جا ئـەم زەختـە چ کوشتار و قەڵاچۆ بێت (وەک دۆخی شیعری هورموزگان)، چ شەڕ دژی باوەڕ و کەسایەتی کۆمەڵایـەتی (وەک دۆخی سەردەمی بالوول و باباسەرهەنگ)، چ شەڕ دژی زمان بووبێـت (وەک هاوارەکـانی خانـای قوبـادی)، چ فێڵ و تەزویر و کوشتار بووبێت (وەک سەردەمی فەقێ قادر و قانع) و.... بوونەتە هۆی ئەوەی کە شاعیران لـە دەقەکاندا بەرنگار ببنەوە و بێنە کرداری کولتووری.

سێهەم: هەموو هەوڵەکانی شاعیرانی کورد لـە پێنـاو مـافخوازی و یەکسـانیدا بـووە. ئـەوان نەکەوتوونەتـە جەبهەی شەڕ دژی زمان و کولتووری دیتران. لە بیری زاڵیەتی و خۆسەپاندیشدا نەبووگن وهەوڵیان لـە پێنـاو سڕینەوەی کولتووری دیتران نەبووە.

ئەکرێ بوترێت هەوڵ و بزاڤی شاعیرانی کورددا لە سەردەمە جیاوازەکاندا ڕەوتپێـو ئـەبێت و سـەرەنجام لـە دەقەکانی مامۆستا قانعدا دەبێتە گوژمبەستوو:

سەر کەخاڵی بێ لە فیکری گەلی قەد سەر نییە  دڵ کە گەرمیی تیا نەبێ قەد قابیلی دولبەر نییە

پیاوەتی ئەمڕۆ بە نـووکی خامەیـە و نـوتقی زمـان  ئیـدیعا موحتـاجی شـیر و ئەسڵـەحە و خەنجـەر نییـە (قانع،٢٠٠١: ٢٣٢)

**سەرچاوەکان:**

١- ارنی، پیر (١٣۶٧) **آموزش درکشورهای فقیر**، ترجمه فرنگیس حبیبی، تهران، انتشارات مرکز نشر دانشگاهی، چاپ اول.

٢- زرین‌کوب، عبدالحسین (١٣٧٨) **آشنایی با نقد ادبی**، انتشارات سخن، چاپ پنجم.

٣- الیوت، تی اس (١٣۶٩) **درباره ی فرهنگ**، ترجمه حمید مصدق، نشر مرکز، چاپ دوم.

۴- شلبی، احمد (١٣٧٠) **تاریخ آموزش در اسلام**، ترجمه محمّد حسن ساکت، دفتر نشر فرهنگ اسلامی، چاپ دوم.

۵- ترادگیل، پیتر (١٣٧۶) **زبان شناسی اجتماعی**، درآمدی بر زبان و جامعه، ترجمه محمّد طباطبایی، موسسه انتشارات آگاه، چاپ اول.

۶- اورنگ، مراد (١٣۴٨) **رازها و ریزه کاریها** (دیوان خسروشیرین خانای قُبادی).

٧- دبیرسیاقی، محمّد (١٣٧٠) **پیشاهنگان شعر فارسی**، به کوشش انتشارات آموزش انقلاب اسلامی، چاپ سوم.

٨- دانای هەورامی، **دیوانی پیرشالیاری زەردەشتی**، مەلا ساحیب تەویڵەیی.

٩- دیوانی فەقێ قادری هەمەوەند.

١٠- دیوانی مەلاحەسەنی دزڵی.

١١- دیوانی حاجی قادری کۆیی.

١٢- گەڕان لە سەرچاوەکانی باوەڕی یارسیدا، بەتایبەت: **سەرئەنجام**، دیوانە گەورە و سرودەهای دینی یارسان و... .

١٤- بورەکەیی، **مێژووی وێژەی کوردی**، بەرگی یەکەم و دووهەم، بانە، انتشارات ناجی.

١٥- دیوانی زۆربەی شاعیرانی کلاسیکی کورد تا سەردەمی مامۆستا گۆران.

# گرنگایەتی زمانی هۆرامی لە لێکۆڵینەوەی فەهلەویاتی کۆن

کامیل سەفەریان -

**کورتە:**

ئەورامانی یان ئەورامی یەکێکە لە شێوەزارەکانی زمانی کوردی لە باشووری کوردستان و یەکێک لە زمانە ئێرانییەکانی لقی باکووری ڕۆژئاواییە لە بەشێک لە کوردستانیئێران و عیراق کەپێی دەلێن "هورامان"، قسەی پێ دەکەن.

"دوکتور موحەمەد موعین" لەمێژووی زمانی فارسیدا ئەڵێ: بۆ ناسینی باشتری زمانی پالەوی کۆن، زمانی هەورامی سەرچاوەیەکی زۆر گرنگە. پالەوی بەشێکی تایبەت وە هەروەک گۆرانی ئەخوێنرێتەوە و بڕێ جار پەهلەوی و بڕێ جاریش ئەورامەن و ئەرامنانیان پێئەوتری. لەڕوانگەی ڕێزمانەوە هەورامی نزیکایەتیەکی زۆری لەگەل زمانی ئەویستادا هەیە و لانیکەم سێ لە سەدی وشەکانیان یەکێکە. یەکێ لەتایبەتمەندیەکانی ئەم زمانە بوونی «نێر و مێ» لە ناوەکاندایە. (بروانە: پیشەکی فەرهەنگی موعین).

پێدەچیت بۆحاڵی بوونی ئەم بابەتە کە «ئورامەنان» هەمان «هورامەنانی» کوردیە ولەگەل فارسی کۆندا پێوەندی هەیە، تەقالای زۆری پێویست نەبێ. هەلێکم بۆ ڕەخسا تا بەپێی توانای خۆم سەبارت بە هەندێ لە ویکچوونەکان، بە پشتبەستن بە فەهلەوییاتی سەدەکانی دووهەم تا دەهەمی کۆچی، هێندێ شت بلێم.

ئەگەر لەم کورتە وتارەدا بۆ چارەسەرکردنی بڕێ لەم کەم وکورتیانە بابەتم خستبێتە بەردەست بەلام لەولایشەوە بازنەی نەزانینی خۆشم ئاوەلا کردووە. هەرچۆنێک بێ هیوادارم بەسوود بێت. با ئەمەێش بلێم کە داوەرییەکانی ناو ئەم دەقە بە پەلە کراون و لەئاست و شیاوی بابەتەکە نین.

کۆنترین کەس کە لە زمانەکانی ڕۆژئاوای ئێران یادی کردوە «ئیبنە موقەفەع»ە، کە لە سالی ١٤٢ کۆچی مانگی کوژراوە. وتەکانی ئەو لەلایەن "ئیبن نەدیم"ەوە لەکتێبی «ئەلفێهرست»دا هاتوون. بە پێ وتەی "ئیبنە موقەفەع"، زمانی خەڵکی ڕۆژئاوای ئێران «پالەوی» بووە. کە تایبەتە بە ولاتی «پاڵە». کە بریتیە لە ناوچەکانی نێوان ڕەی، هەمەدان، نەهاوەند و ئازەربایجان (الفهرست،١٣٥٠: ١٥).

---

- نووسەر و لێکۆڵەر

«حەمزەی ئیسفەهانی»، «خاڕەزمی»، «ئیبنە خەردادبە» و «یاقووتی حەمەوی» لەبەرهەمەکانی خۆیاندا هەمان بابەت دووپات دەکەنەوە. مەسعوودی (سەدەی چوارەمی کۆچی مانگی) پاش تێپەرین بەم ناوچەیەدا دانی بەمەدا ناوە کە تێکڕای ئەم وڵاتە دەوڵەتێکی یەکگرتوو و پادشایەکیان هەیە و لە هەندێ وشەدا نەبێ لە زماندا جیاوازییان نییە (الفهرست،١٣٥٠: ٦٧).

ئەولیا چەلەبی گەڕۆکی عوسمانی کە نزیکەی سێ سەدە لەمەوپێش بە مەراغەدا تێپەربووە، سەبارەت بەم شارە ئەڵێ: زۆربەی دانیشتوەکانی کورد و زمانیان پەهلەوییە. زۆر بەڵگەی دیکەی مێژوویی هەن کە لەناو هەموویاندا جەخت بە هەبوونی زمانی پەهلەوی تا ئەم سەدانەی دوایی ئەکەن، کە بەهۆی نەبوونی کات لە ناوهێنانیان چاوپوشی دەکەین. بەڵام لە کۆی ئەم بەڵگە و داکیۆمەنتانە وا دەرئەکەوێ کە خەڵکی «مادی ڕۆژئاوا» لانیکەم تا سەدەی دوانزەی کۆچی «پەهلەوی» یان «ڕازی» پێئەوترا، قسەیان ئەکرد.

ئەو شتانەی لە دەقە کۆنەکانەوە ماونەتەوەو نموونەگەلیک لە زمانی هەورامییان تێدایە، بە ڕوونی وتەی مێژوونوسەکان سەبارەت بەنزیکیی هەورامی و زمانەکۆنەکان پشتڕاست ئەکەنەوە.

"موقەددەسی"، جوغرافیازانی مەزن، کاتێ باسی زمانی خەڵکی هەمەدان و زەنجان ئەکات، زمانەکەیان ناو ئەنی «واتم واتوا »و ئاشکرایە چەندە لە هەورامییەوە نزیکە.

لە کتێبی کۆن و مێژوویی «دستورالجمهور»دا لە زمانی ژنێکی ڕەشۆکی و نەخوێندەواردا کە لەگەڵ مێردەکەیدا سەبارەت بەکەراماتی بایەزید دواوە ئاوا ئەڵێت: «تاچند ازسخنان بایزید گویی؟ پنداری بایزید دروغ بنتوانە وات؟» واتە: تاکەی باسی قسەکانی بایەزید ئەکەی؟ بۆچی پێتوایە بایەزید درۆ ناکات؟

لە کتێبی «النورو سهلگی»دا کە کۆنترین کتێبە لە ڕاڤەی مەقاماتی "شێخ بایەزیدی بەستامی"دا لەزمانی کەسێکی ڕەشۆکی بە ناوی "مەحموود کۆهیانی" —کە موریدی شێخ بایەزید بووە- وتراوە: «ای الله واران‌مان کە». گرنگ ئەوەیە کە هەر لەم دەقەدا لە کوردیشەوە باس کراوە (شەفیعی، ١٣٨٣: ٧٦).

لەو نموونانە کە لێرەدا پیشکەش خوێنەران ئەکرێت بەچاکی دەرئەکەوێ ئەو زمانەی کە هەورامییەکانی ئێستا قسەی پێئەکەن نەک هەر لەگەڵ زمانی «دەری»دا جیاوازی هەبووە، بەڵکوو بە تەواوی لەگەل زمانی «کوردی سۆرانی» و «فارسی»دا جیاوازە و کۆنیەکەی تا ئەو ڕادەیە کە تێگەیشتنی بۆ زۆربەی کوردەکان زۆر هەوراز و سەختە.

لەوانەیە کۆنترین نموونەی فەهلەویاتمان لە دووبەیتیەکانی "ئەبولعەباس نەهاوەندی" بەرچاو بکەوێ کە لەساڵی ٣٣١ کوچیکردووە. لە شیعرەکانی «بونداری ڕازی»دا کە لە ساڵەکانی کۆتایی سەدەی چوارەمدا مردووە، ئەتوانین بڕی دووبەیتی بدۆزینەوە کە بە زمانی هەورامیەوە زۆر نزیکە. زۆر لەو پیتانەی کە لە شیعرە پرژ و بلاوەکانی ئەم شاعیرانەیە، هەموو هەورامی زمانەکان تێئەگەن.

لەکتێبی «مێژووی قوم»یشدا چاومان بە بڕێ فەهلەویات ئەکەوێ کە هیشتا لە زمانی هەورامیدا لەو وشانە کەڵک وەردەگیرێ. لە چەن شۆینی ئەم بەرهەمەدا، زۆرێک لە وشەکان کە نووسەر بە وشەی عەجەم ناوی

بردوون، ماناکراونەتەوە. بۆ نموونە ئەڵێت: ژن بە شوین گورگەکەدا شیوەن و هاواری ئـەکرد وئـەیوت «وارودا» واتە: ئەی هاوار کورەکەم و «رود» لەزمانی عەجەمدا یانی «منداڵ» (تهرانی، ١٣٦١: ٧٨).

لە شوێنێکی دوورتر و لە "ئازەربایجان"دا ئەم وشە لە کتـێبی «روزاتولجنـان» بـەدی ئەکـرێت: « اسـکندر رودم کشتی، خوا رودت کشات » (تهرانی، ١٣٦١: ٣٩٠).

"شەمس قەیسی ڕازی" لە کتێبی «المعجم»دا هەندێ فەهلەوی هێناوەتەوە کە لە زمـانی هەورامییـەوە زۆر نزیکن و ئەکرێ بە کەڵکوەرگرتن لەم زمانە بکرێ بە فارسی ڕەوان. بۆ نموونە ئەگەر ئـەم دێـڕە شـیعرە هـەر هەورامییەک بیخوێنەتەوە بەئاسانی لە واتاکەی تێئەگات:

ئەرکەڕێ مون بەخواری جەکێ تەرسی

وەر کوشیمان بەزاری جە کێ تەرسی (خانلری:١٢٠).

کتێبی «مرصاد العباد»یش کە نووسـەرێکی خەڵـکی «ڕەی» لـە ساڵـی ٦٢٠ی کـوچی مانگیـدا نووسـیویە، ئەکرێ بۆ لێکۆڵینەوەی زمانناسیی پەهلەوی زۆر بۆمان بە سوود بێت.

ئەرتە واگیریئەی روسام ئەوسەر

ئەنند موویە کەرو لام ئەوسەر

ئەر تەم ئەج وەر برانی وەر بەسەر

میانە ئەهنامە داران خام ئەوسەر

ئەم دوو دێڕە شیعرە کە لە بەیازە جۆراوجۆرەکان و بـە زۆربـەی زمانـەکان- جگـە لـە هـەورامی- ئامـاژەی پێ‌کراوە (ریاحی، ١٣٧٣: ٧٨)، دەتوانێ نزیکایـەتی نیـوان فـەهلوی و زمـانی هـەورامی بسـەلمێنێ. "دوکتـۆر ریاحی" لەو تێبینییەی کە بۆ زمانی فەهلـەوی کـردووە، هـەر ئـەو مانـا و تێبینیـەی دەبـینی کـە لـە زمـانی هەورامیدا بەرچاو دەکرێت. بەڵام دیار نیە کە "دوکتۆر ریاحی" بە پێ کام بەڵگەنامە و فەرهەنگ بەو تێبـینی و هەڵویستە گەیشتووە.

هەندێک وشە وەکوو «تە» بە مانای «تۆ»، «کەروو» بە مانای «دەکەم»، «انند» بە مانـای « ئەوەنـدە»، «ور» بە مانای «خاک»، « اج وەر برانی» بە مانای «لە لای خۆت دوری بکەی»، «ئەی ڕۆ» بە مانای « ئـەی هـاوار»، لە فەرهەنگە جۆراوجۆرەکان نەهاتووە. ڕەنگە «فەرهـەنگی ڕەشـیدی» تـەنیا فەرهـەنگێگ بـێ کـە هەنـدێک وشەی ئەم زمانەی تێدا مابێتەوە.

بۆ وێنە وشەی «ئارۆ» لە مانای «ئەمرۆ»، کە لـەم دوو دێـڕە شـیعرەی خـوارەوەدا هـاتووە، لـە «فەرهـەنگی ڕەشیدی»دا وا هاتووە کە «ئارۆ» وشەی ئیسفەهانییە. وەکوو ئەڵـێیت: «ئـارۆت وەس» واتـە: «ئیمـڕۆ بەسـە» (فرهنگ رشیدی:٨٩).

"هومام تەورێزی" ، کە لە سـەدەی حەوتـەم ژیـاوە، یـەکێک تـر لـەو شـاعێرانەیـە کـە لـە بەرهەمەکانیـدا شۆێنەواری فەهلەویاتی کۆن ببینین.

دلم خود رفت و می‌دانم کە روزی

بەمهرت هم بشی وەش گیانم جه دس

لە شیعرێکی تردا دەڵێ:

وهار و ول و دیم یار خوش بی

اوی یاران مه ول بی، مه وهاران

وشەکانی «وەهار»، «ول بە مانای گوڵ»، «وەش بە مانای باش»، «گیان بە مانای جان»، « دیم بە مانای چهرە»، «بشی بە مانای دەبێت» هەموویان لە هورامیدایە.

"ئەمین ئەحمەدی ڕازی" لە کتێبەکێ خۆیدا کە پێنجسەد ساڵ لەمەو پێش نوسراوە، دوو دێڕی شیعری لە «یاقووبی ئەردەبیلی» هێناوە کە هەندێک وشەی زمانی هەورامی تێدایە:

رشته دستت بلا گلگون کریته

تو به دستان هزاران ون کریته

در اوینه نظر کن تا بوینی

که وینی زندگانی چُن کریته

نامیلکەیەک لە ژێر ناوی «المدخل الی علم احکام النجوم» هەیە کە لە سەدەی دەیەمی کوچی بەزمانی عەرەبی بە قەڵەمی "ئەبونەسری قومی" نووسراوە، کە هەر لە هەمان دەورەدا بەزمانی فارسی وەرگێڕاوەتەوە. وەرگێڕاوەکە ڕێژەیەک زۆر وشەی هەورامی تێدایە.

هەروەها "مەهان کەشەفی" یەکێک ترە لەو شاعێرانەی کە لە سەدەی هەشتەمی کۆچیدا لە شیعرەکانی خۆیدا لە بەشێکی زۆر لە وشەی فەهلەوی کەڵکی وەرگرتووە.

من نزانست که شهرانی امن وات:

هرک ناکس پرست، رنجه روئی

لە دیڕە شیعرێکی تردا دەڵێت:

هرسباحی جه مرغان های‌وهوئی

زبان به زکر حق سبحانه‌گوئی

مبه بی‌یادو حق کشفی تو سبحان

ئەگرچی حق پرستی ئارزو ئی (طوسی، ۱۳۳۵: ۲۵۲)

ئەبێنێن کە لەم شیعرەدا وشەکان و زمان هەورامین.

هەروەها لە شیعرکانی "ئەبولماجید رایگانی" هاوچەرخی "ئاباقاخان" بڕێک وشەی هەورامی بەدی دەکرێت. وەکوو: «از ای سورەگولم، زردم مکه ئەمن».

واتە: « من گوڵێکی سوورم زەردم مەکە» کە بۆ ئیمە ماناکەی ڕوونە. هێشتا ڕەنگدانەوەی «ئەز» لە مانای «من» لە شیعری "سەیدی هەورامی"دا دەبینرێت: «ئەز ئورومون بێ وڵاتم».

**بەشی شەشم- زمان**

یانزە دێڕە شیعری لە شێخ "سەفیەدین ئەردەبیلی" بەجێماوە کە زیاتر لە هەمووی ئەمانە، وشـەی فەهلـەوی تێدایە. لە دوسەد وشە کە "شێخ سەفی" لەم شیعرانە بەکاری هێناوە ڕێژەی پەنجا لە سەدیان هەورامیین.

"باباتاهیری عۆریان"یش، وێنەیەکی ترە لەو شاعێرانەی کە- نۆسەد ساڵ پێش- هەندێک شیعری بە زمـانی هەورامی گوتووە. یان بەشێک وشەی هەورامی تێدایە؛ بەڵام بە هۆی بەناوبانگ بۆونیان لـە دووپاتکردنـەوەیـان چاوپۆشی دەکەین.

ئەوەی کە جێگەی سەرەنجە و ناکرێ لەچاوبکەوێ ئەوەیـە کـە نووسـەر بەپێچەوانـەی ئەوشـتە کـە بـاوە، پێموایە کە فەهلەویاتێک کە لەم بابەتە باسمان لێوە کرد، درێژەی زمانی "پاڵەوی پارتی"یە و لەگـەڵ "پاڵـەوی ساسانی" کە لە باشووردا وتووێژی پێدەکرا جیاوازیەکی ئێجگار زۆری هەیە.

بۆ وێنە بۆ ئەوەی هەندێک پێوەندی هەورامی و زمانی پاڵەوی بخەینە ڕوو سەرەنجی خوێنـەران ڕادەکێشـم بۆ خوێندنەوەی کتێبەکانی «داری ئاسوریک»، «ماتیکان گجستک ابالیش» و «یادگار زەریران».

خوالێخۆشبوو «بەهار» لە کتێبی «شێوەناسی»دا چەن هۆنراوەیێک لە کتـێبی «داری ئاسـوریک»ی هێنـاوە و سەبارەت بە زمانی ئەم کتێبە دەڵێت: «ئەو زمانەی کە ئەم هۆنراوانەی پێـی گـۆتراون، پاڵـەوی ئەشـکانیین. ئەم زمانە لە ئازەربایجان، خوراسان، کوردستان، ئیسفەهان و ئەرمەنستان باو بووە (بهار، ١٣٤٧: ١٨).

ناوبراو ئاماژە بە جیاوازیەک لە نێوان دیاڵیکتی پاڵەوی باکوور و باشوور دەکات و پێی وایە کـە زمـانی «داری ئاسورێک » پاڵەوی باکوورە نە باشوور. "بەهار" وشەی« وینستن » لە بنەمای «ونیای» دەزانێ کـە لـە پاڵـەوی باکووردا بووە و لە باشووردا بە شێوەی «وین» هاتووە. کە دیارە ئـەم وشـەی تـا چـە ڕادەیـەک زمـانی کـۆنی هەورامی خۆی لەم نووسراوەدا پاراستووە. پیتی (ڤ) کە لە فارسی نوێ گۆزراوەتەوە بۆ (ب) لەم تێکسـتە هـەر بە شێوازی کۆنی خۆی ماوەتەوە، وەکوو: «وەرگ»، «وەرو»، «واران» (نوابی، ١٣٦٣: ١٠٨).

ڕستەی« تۆ چەنی ڕانی» کە بەمانای «تو لەگەل من شەڕ دەکەی» لەو ڕەستانەیە کە تەنیا هەورامی زمانـان ئەتوانن لێی تێبگەین.

بەکار هێنانی «ان» کە لە مێژە لەزمانی پاڵەوی باشوور وەکوو نیشانەی کۆکردنـەوە ناسـراوە لـە بـاکووردا وە بەتایبەت لە دەقی (١٢٠٠) وشەیی « ماتیکان گجستک اباله»دا بە شێوازی «کان» هـاتووە کـە ئێسـتایش لـە زمانی هەورامیدا بە مانای « Danakan دانایان»ی فارسی یا «زاناکان»ە ( میرزای ناظر، ١٣٧٦: ١٥).

کەڵکوەرگرتن لـەم شـێوە کۆکردنـەوەی وشـەکان وێنـەو تایبەتمەندیـەکی بـەم دەقـە داوە. ئـەم شـێوە کۆکردنەوە کە لە زاراوەکانی سورانی و هەورامیدا باوە لە هیچ کام لەزمانـەکانی ئیسـتای ئێرانـدا ڕەنگدانـەوەی نییە.

نێوی «اباله» کە « بنونیست»، «هنینگ»، «بارتلمی» و چەن‌هـا کـەس لەسـەری شروڤـەیان‌داوە، وشـەیێکی هەورامییە کە شێوازی « عەبەلە» هیشتا بەکاردەبری.

بۆ ئەوەی بە هەستو پێستی خۆمان لەم جیاوازیـە تێبگـەین، ئەوەنـدە بەسـە چـاودێر لـە زمـانی ناوچـەی «ایران» بکەین.

بناغەی ئەم زمانە لە زاراوەیەک لە «ئەیالەتی فارس» پێکهاتووە و بەرەبەرە، بەرە و باکوور و ڕۆژهەڵات پەرەی سەندووە و لە شێوازێکی ئەدەبیدا بە ناوی « فارسی دری» لە لایەن شاعێرانی «سامانی»یەوە گەیشتووەتە ئاستێکی بەرز و لە «خۆزستان» تا «فرغانە» و سنوورکانی «هیند» بڵاوبۆتەوە. لە ڕەوەندی پەرەپێدانی خۆیدا لە زمانانی دیکەی باکوور و ناوەندی وڵات کەڵکی زۆری وەرگرتووە.

بوونی چەمکە شیعرێکی فارسی و شیرازی لە «کوللیاتی سەعدی» و شیعرەکانی "حافیز"دا نیشان لە درێژەی زمانی پاڵەوی لە باشووردەدات.

شیعرە شیرازییەکانی "سەعدی" و "حافیز" هەرچەند بەبۆنەی دووبارەنووسین و تەقالا بۆ ساخ کردنەوەیان، ئاڵوگۆڕی زۆریان بەسەرهاتووە، بەڵام شروڤەیەکی باشیان لەلایەن "قەزوینی" و "ئەدیب توسی" لەسەرکراوە.

لە ناو وەشەکانی "شێخ ئەبوئیسحاقی کازرونی"، سوفیی بەناوبانگی سەدەی پێنجەم، کە لەکتێبەکانی «فیردەوس المرشدیە » و «مورسد ئەلاحرار» بە زمانی کۆنی کازروونی هاتووە؛ ناتوانین نێشانەیەک لە زمانی پاڵەوی باکوور ببێنین.

ماوەیەک دوای "حافێز" شاعیرێک بەناوی «شاە داعی» کتێبێکی شیعری بە زمانی شیرازی نووسیوە. لەم شیعرە حەوسەد بەیتییە، کە لە ژێرِ ناوی «کانی مەلاحەت»دایە، شاعێر خۆی بە «شیرازی»بوونیان داشیداوە. لەناو ئەم دێڕانا هێچ بەیتی ئاشنا بەدی ناکرێت (طوسی، ۱۳۴۴: ۱۴۹).

بە لە بەرچاوگرتنی ئەوەی کە مێژوونووسەکان سەبارەت بە زمانی پاڵەوی باشوور نوسیویانە بەڵام خەڵکی باکوور بە ئاسانی لەم شیعرانە تێناگەن. ئەم دژوارییە لە هەندێ جیاوازی «واج»ی بەدی دەکرێت:

۱ ئەوەی لە باکوور «گ» بووە، لە باشووردا بەشێوەی«ج»یە.

۲ ئەوەی لە باکوور «ش» بووە، لە باشووردا بەشێوەی«س»دەوترێت.

۳ ئەوەی لە پاڵەوی پارتی یا باکوور «ز» یە و هیشتا لە وشەگەلێک وەکوو «زانین»، «زانستن» لە زمان هەورامی و سیمنانی بەجێ ماوە لە باشوورا بەشێوەی «داماد» و « دانستن» هاتووە.

لەهەڵسەنگانەوی زمانی هۆرامی لەگەڵ فەهلەویەکان کە لە کتێبگەلێک وەکوو «سلسله النسب»، «المعجم شمس قیس رازی»، «تاریخ قوم»، «مرصاد العباد»، «راحەالصدور»، « تاریخ حمداللە مستوفی» و شیعرەکانی شاعێرانی وەکوو «بندار رازی»، «ئەبولماجید رایگانی»، «هەمام تەورێزی»، «ئەوحەدی مەراغەای»، «ماما عێسمت»، «عەبدولقادر مەراغەای»، «مەغرێبی توریزی» کە هەموویان لە پارێزگاکانی زمانی فەهلەوی باکوور ژیاون ، بۆمان دەرئەکەوێ کە فەهلەوی باکوور درێژەی پاڵەوی پارتییە و سێهەمین شێۆازە کە دوای فارسی کۆن و مادی لە زماندا پێکهاتووە و ئەمەش ئاماژە بەوە دەکات کە دەزگای ئیداری پارتیەکان لەم زمانەدا لە کوردستاندا بووە.

دوایین وتە ئەوەیە کە: زمانی فەهلەوی باکوور لە «ڕەی» تا باکووری ڕۆژئاوای ئێران (جگە لە هەندێک جیاوازی زۆر ورد) یەکێک بووە. لە ناوەند و خۆرهەڵاتی ئێران کە جێگەی قەرەباڵخی کوردان بووە، پاڵەوی درێژی بە ژیان داوە. لە یەک دوو سەدەی پێش، خەڵکیش لەم مەڵبەندەدا بۆ تێگەیشتنی، گرفتیان نەبووە.

## بەشی شەشم- زمان

ڕازی ناونانی ئەم زمانە بە هۆی ئەوەیە کە «دەریزمانان»ی خوراسان یان ئـەو عەشـیرانە کـە لـە خوراسـان بەرو ڕۆژئاوا بە پێش‌بوون، کاتێک بە «ڕەی» گەیشتوون، یەکەم جار زمانێکیـان بیسـتووە کـە جیـا لـە زمـانی خۆیان بووە و ئەم زمانە لە پانتایی زاگرۆس‌دا درێژەی بووە و بە هـۆی ئـەوەی کـە «ڕەی» گـەورەترین شـاری فەهلەوی‌زمان بووە، زمانی فەهلەوی باکووری ڕۆژئاوای ئێرانیش بە زمانی «ڕازی» نێو براوە.

هەروەها ئەم عەشێرەکۆچەرانە کاتێک گەیشتوونەتە کوردستان و ئازەربایجان لەگەڵ زمانی خەڵکێک ئاشـنا بوون کە پێی ئەوترا «اورامی» واتە« هەورامی». ئەم ناوە بـە هـۆی ئـەوە بـووە کـە «اورامـن» یـا «هـەورامی» جورێک گۆرانی وتن بووە و شیعری ئەو گۆرانییە وەکوو دەقەکانی درەختی ئاسورێک، هجایی و پاڵەویە.

ئەو نێوە لە هەندێک شیعری کتێبی «صفوە الصفا»ی «ابن بزاز» و «نامـەکانی عـین القـزات هەمـەدانی»دا، ئاماژەی پێکراوە.

بەپێی بەلگەکانی مێژوو و زمانناسی بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە خەڵکی «ماد»ی‌خۆرئاوا هیچ نەبێ تا سـەدەی دوانزەی کۆچی بەزمانێک کە هەندێ جار «ڕازی» و هەندی جار« فەهلەوی» و برێ جـاریش«اورامـن»ی پـێ گوتراوە، وتووێژیان پێکردووە.

ڕازی ناونانی ئەم زمانە دەتوانێـت زۆر شـت بـۆ ئێمـە ڕوون کاتـەوە. بـە جۆرێـک بۆمـان دەردەکـەوێ کـە پێوندیەکی قووڵ لە نێوان ئایین و زمانی زرتوشتیانی «ڕەی»و موغەکانی دەوری هەورامان بـەردەوام بـووە تـا سەدەکانی شەشەم و حەوتەمی کۆچی.

## سەرچاوەکان:


١. ابن ندیم (١٣٥٠) **الفهرست**، تهران.

٢. حسین تبریزی، **حافظ** (١٣۴۴) روضات الجنان، تهران.

٣. طوسی، ادیب (١٣٣۵) **فهلویات ماما عصمت و کشفی**، مجله دانشکده ادبیات و علوم انسانی تبریز، ش٣٨.

۴. طوسی، ادیب (١٣۴۴) **سه گفتار به لهجه شیرازی**، مجله دانشکده ادبیات تبریز ش ٧۴.

۵. میرزای ناظر، ابراهیم (١٣٧۶) **ماتیکان گجستک ابالیش**، انتشارات هیرمند، چاپ اول.

۶. رشیدی، عبدالرحیم، **فرهنگ رشیدی**، مجله دانشکدەادبیاتو علوم انسانی تبریز، سال هفتم، شماره ٢:١٧۵.

٧. رازی، نجم‌الدّین (١٣٧٣) **مرصاد العباد**، به تصحیح ریاحی، محمّدامین، تهران، انتشارات علمی.

٨. شفیعی کدکنی، محمّدرضا (١٣٨٣) **بازماندەهای زبان قدیم قومس در سخنان خرقانی**، مطالعات و تحقیقات ادبی، شماره ٣ و ۴».

٩. نوابی، ماهیار (١٣۶٣) **درخت آسوریک**.

١٠. تهرانی، جلال‌الدین (١٣۶١) **تاریخ قم**.

١١. مجلّه کاوه (١٩٢٠) دوره جدید، سال اول، شماره ٧.

# وێژەی کوردی و زمانی پێوەر

ئەحمەد ئەحمەدیان[*]

**کورتە:**

هەڵبژاردن و دەستەبەر کردنی زمانی پێوەر (یەکگرتوو) لەم بابەتە سەرنج ڕاکێشانەیە کە لە زانستی زمانناسیی کۆمەڵایەتیدا کە بە زانستێکی «نێوان ڕشتەیی» دەزانرێ و شرۆڤە و لایەنە جۆربەجۆرەکانی شی دەکرێتەوە. باس لەم بابەتە لەنێوان لقەکانی زانستی زمانناسی کۆمەڵایەتی، دەکەوێتە خانەی «داڕشتنی پلانی زمانی» و لە ئاکامدا لە ڕەهەندی «داڕشتنی پلانی پێگەی زمان» خۆ دەدۆزێتەوە و دەگیرسێتەوە. لەم وتارەدا، دوای هێنانە ئارای ئەم پۆلێنبەندی و پێناسە جیاجیایانەی سەبارەت بە زمانی پێوەر لە ئارا دان، پێناسەی دوو زمانناسی سەردەرچوو و ناسراو: «گاڕوین» و «ماتیو» کە لە وانی تر گشتگیرتر و زانستیترە، بە تایبەتی باس دەکرێت. بە بڕوای ئەو دوو زمانناسە، زمانی پێوەر بەم «زمان وێنە»یە دەگوترێ کە هەڵگری دوو تایبەتمەندی سەرەکی و گشتگیری: «دامەزراوێتی» و «سەقامگیرێتی»یە و لە لایەن بەشێکی بەرچاو لە ئاخێوەرانی یەک زمان وەک زمانی پێوەر و پاڕادایم پەسندکراوە و کەلکی پێویست وهەمەلایەنەی لێ وەردەگیرێت. زمانی پێوەر خاوەنی هێندێک تایبەتمەندییە کە دەکرێ لە ژێر دوو چەمکی: ١- بگۆڕەکانی زمانی کە داگری «تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەیی»یە ٢- بگۆڕەکانی غەیرەزمانی کە داگری هەڵویستەکان و ئەرکەکانە، بێنە ژێر باس و پۆلێنبەندی بکرێن. لەم وتارەدا دوای تاوتوێ کردنی بنچ و بناوانی زمانی پێوەر و تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی، ئەم بابەتە دێتە گۆڕێ کە ئەو زمانە ئەدەبیەی ئێستا بووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان و ئەو کوردانەی بە سێ دیالێکتی کوردی دەدوێن بەو زمانە دەخوێنن و دەنووسن و زمانی نووسینی ئەدەبیاتیانە، ئەو زمانە لە سەرەتاوە لە شاری سلێمانیدا بوو بە زمانی ئەدەبیات و بڵاوبۆوە و هەموو ئەو تێکەڵ بوون و تواندنەوە و ڕۆچوونەی بەسەر داهاتوە کە بە سەر زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو گەلاندا دێت، تا دەبێتە زمانی ئەدەبیی هەموو نەتەوەکە. هەروەها لەم وتارەدا

---

[*] ماستەری زمانەوانی، مامۆستای زانستگای ئازادی مەهاباد

باس لەوە کراوە کە ئەو دیالێکتە کوردییەی لە سەرەتاوە، شیعری «نالی» و «سالم» و «کوردیی» پێ نووسرا، تەواو ئەو دیالێکتە نەبوو کە خەڵکی سلێمانی پیە دەپەیڤین، بەڵکوو هەر وەک خەڵکی سلێمانی خۆیان تێکەڵ بوون و گەر شێوەی قسە کردنیان کاریگەری چەند دیالێکتی جیاوازی کوردیشی تیا دیار نەبووبێ، ئەوا چەند بەشە دیالێکتێ هەر کاری تێکردووە. هەروەها ئەم تێکەڵییە لە زمانە ئەدەبییەکەشدا هەر دیار بوو.

**وشە سەرەکییەکان:** زمانی پێوەر (یەکگرتوو)، زمانی یەکگرتووی ئەدەبی، شێوەزمانی سلێمانی، سێ دیالێکتی زمانی کوردی، دیالێکتی کرمانجی خواروو.

## بەشی شەشم- زمان

**دەسپێک:**

سووکە ئاوڕێک بەسەر لایەنی تیئۆریکی زمانی یەکگرتوو

ساقامگیربوونی زمانی یەکگرتوو، ڕەوتێکە کە بەپێی ئەو ڕەوتە یەک شێوەی تایبەتی لە زمان وەک زمانی یەکگرتوو دەست نیشان دەکرێ و دەبێتە نموونە و پارادایم و تایبەتمەندییەکانی فۆنەتیک و گراماتیک و ڕێنووسی تایبەتی ئەم شێوەیە و ئەم پارادیمە زمانییە بەهۆی ئەوەی شێوەیەکی بەرزتر و گونجاوترە لە چاو شێوەکانی تری کۆمەڵایەتی و ناوچەیی، بە چەشنێکی بەربلاو رەچاو دەکرێت و دەسەلمێندرێ و پەرەی پێ دەدرێت.

لە ڕوانگەی «ڕای»، ڕەوتی ساقامگیربوونی زمانی یەکگرتوو بەم چەشنەیە:

١- قۆناغی هەڵبژاردنی شێوەیەک لە شێوەکانی زمان وەک وێنە و پارادایمێک بۆ چاولێکەری و گشتگیربوون،

٢- قۆناغی پەرەپێدان و گشتگیر کردنی ئەم شێوە هەڵبژاردەیە لە پانتایی کۆمەڵگای زمانیدا کە لە ئاکامدا دەبێتە هۆی بەرز نرخاندن و سەرەتی ئەم شێوە هەڵبژاردەیە لە بەراورد دەگەڵ شێوەکان و وێنەکانی تری ئەم زمانە لەناو ئەم کۆمەڵگایەی وا ئەم زمانە لە برەودایە (Ray, 196: 70).

زمانی یەکگرتوو خاوەنی هێندێک تایبەتمەندی زمانی و غەیرە زمانییە کە دەکرێ لە ژێر سێ چەمکی: تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەیی (structural features)، ئەرکەکان (Functions) و هەڵویستەکان (Attitudes) بێنە ژێر باس و پۆلێنبەندی بکرێن. تایبەتمەندییەکانی پێکهاتەیی لە ژێر سەردێڕی «بگۆڕەکانی زمانی» باس دەکرێن و ئەرکەکان و هەڵویستەکان لە ژێر سەردێڕی «بگۆڕەکانی غەیرە زمانی»:

ئە- بگۆڕەکانی زمانی (linguistic variables): داگری دوو تایبەتمەندی پێکهاتەیی و بنەڕەتین کە بریتین لە: سەقامگیریێتی شلک (Flexible stability) و لێهاتوویی ئاوەزتەوەر (intellectualization). واتا، زمانی یەکگرتوو بۆ ئەوەی لێهاتوویی و کارامەیی و توانستی چاوەڕوانکراو و پێویستی هەبێ، دەبێ لە لایەکەوە «نەگۆڕ» و «سەقامگیر» و «دامەزراو» بێ و لە لایەکی ترەوە لەمەڕ گۆڕانکاری کلتووری و زانستی هاوپێوەند دەگەڵ بارودۆخی سەردەم و چوونەسەری ڕادە و پلەی ڕۆشنبیری کۆمەڵگا کە هەمووی ئەوانە پێداویستییان بە دیاردەی وشەڕۆنان لە دەڤەری جیاجیادا هەیە، «شلک» و «بگۆڕ» بێ و دەوری کاریگەر و چالاک بە خۆیەوە ببینێت. کە وابوو زمانی یەکگرتوو دەبێ توانایی ئافراندن و بەرهەمهێنان و ڕۆنانی وشە و ڕێکەوەند و ئیدیۆمی نوێباوی گونجاو لەگەڵ چەمکە زانستی و کلتوورییەکانی سەربەلق و دەڤەرە جیاجیاکانی زانست و ئەندیشە و ڕۆشنبیری باوی سەردەمی هەبێت.

ب- بگۆڕەکانی غەیرە زمانی (nonlinguistic variables): ئەو بگۆڕانە بریتین لە چوار ئەرک (Function) و سێ هەلوێستە (attitude)ی پێوەندیدار لەنێوان سەرجەم ئەرکەکانی زمانی یەکگرتوودا، سێ ئەرکی: ١-ڕێکخەرەوە (unifyin)، ٢- جیاکەرەوە (separatist) و ٣- پلەوپایەبەخشی (prestige) پتر لایەنی «کۆنکریت» و بەرجەستەی تێدا بەرچاوە.

ئەم ئەرکانەی پێشوو دەبنە هۆی پێکهاتنی سێ هەڵوێستەی ژێرەوە لەناو ئاخێوەرانی زمانی یەکگرتوودا:

١-خۆشەویستی و لایەنگریتی (loyality)، ٢- شانازی (pride) و ٣- ئاگاداری لە ڕێساکان (awareness of norms). لەنێو ئەم سێ هەڵوێستەدا، هەڵوێستەی «خۆشەویستی و لایەنگریتی» دەگەڵ ئەرکەکانی: «ڕیکخەرەوە»، «جیاکەرەوە» هاوپێوەندە و هەڵوێستەی «شانازی» دەگەڵ ئەرکی «ژیدەریتی و سەرچاوەبوون» هاوپێوەند و هاوڕەگەزن.

ئەم خالانەی باسکران، کورتەی سەرجەم بیروڕای دوو زمانناسی پسپۆڕ و شارەزای بواری زمانناسی کۆمەلایەتی (sociolinguistics) لەمەڕ زمانی یەکگرتوو دایە کە بریتین لە "گاروین" و "ماتیو". پێناسە و پۆلێنبەندی ئەم دوو زمانناسە لە وانی تر گشتگیرتر و زانستیترە (مدرسی، ١٣٦٨: ٢٣٥-٢٣٣).

جاری وا هەیە زمانی یەکگرتوو لە ئەنجامی تێکەڵ بوونی چەند دیالێکتەوە پەیدا دەبێت. بەلام دروست بوونی زمانی یەکگرتوو فەوتان و نەمانی دیالێکت ناگەیەنێ، چونکە زمانی یەکگرتوو شتێکە و دیالێکت شتێکی تر.

لەگەڵ گەشەسەندنی زمانی یەکگرتووشدا دیالێکتەکانی زمانیش هەریەکە بەڕێگەیەکدا گەشە دەستێنێ و دەبنە گەنجی وشە ورەگرتن و دەوڵەمەند کردنی زمانەکە. پەیدابوونی زمانی یەکگرتوو زۆرتر بەستراوە بە پەیدابوونی «نەتەوە»وە؛ مەبەست نەتەوەیە بە مانای عیلمییەکەی. تا ئێستا زۆر لە زانایان تەعریفی نەتەوەیان کردوە، بەلام پوختەترینیان هەر ئەو تەعریفەی "یوسف شتالین"ە کە ئەڵێ: نەتەوە کۆمەڵێکی جێگیربووە لە خەڵک کە لە بەرەوپێش‌چوونی مێژوودا دروست بووە و یەک زمان و یەک زەوی و وڵات و ژیانێکی ئابووری یەکگرتوو و سایکۆلۆژیەتێکی ئەتۆیان هەیە کە بەشێک بێت لە کەڵچەر و کەلتووری هاوبەشیان (مستەفا ڕەسووڵ، ١٩٧١: ٨ و ٩).

بەلام زۆرجار پێش ئەوەش کە مەرجەکانی نەتەوە لە گەلێکدا تەواو بێت کە زمان یەکێکیانە، زمانی یەکگرتوو پەیدا دەبێ. بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستییە با بزانین ئەو مەرجانە چین کە زمانێکیان پێ دەبێت بە زمانی یەکگرتوو فیلولۆژەکانی هەموو جیهان ئێستا لەسەر ئەو باوەڕەن کە یەک بوونی سێ شت لە چەند دیالێکتێکی زماندا ئەو زمانە ئەکات بە زمانێکی یەکگرتوو. ئەم سێ شتەش ئەمانەن:

١-گراماتیکی زمان (مورفۆلوژی+سینتاکس) ٢- فۆنەتیک ٣- بنەڕەتی فەرهەنگی زمان ٤- بیروڕای خودی نەتەوەکە (هەمان: ٩ و ١٠).

**بابەت:**

لایەنی پڕاکتیکی زمانی یەکگرتوو

بە بڕوای من لایەنی «بەتۆپزی» (تجویزیprespective) ڕەوتی سەقامگیر کردنی زمانی یەکگرتوو بەسەر لایەنی «خۆبەخۆیی» (خودکارautomatic) و سروشتی ئەم ڕەوتەدا زاڵە، بە تەعبیرێکی تر وەدی هاتنی ئەم دیاردە گرینگە زمانەوانییە، پشتیوانی هەمە لایەنەی دەسەلات و دەزگا حکوومییە

پێوەندیدارەکانی گەرەکە و بەبێ یارمەتی فرە ڕەهەند و گشتگیری دەسەڵات و دام و دەزگا فەرهەنگی و ڕۆشنبیرییە هاوپێوەندە دەوڵەتییەکان ڕەوتی «بە زمانی یەکگرتوو کردنی» یەک یان دوو شێوەزار مسۆگەر نابێ یان ئەگەر مسۆگەریش بێ ڕەوتەکە یەگجار درێژخایەن و یەگجار نادەر هەست (=غیرمحسوس) دەبێت و تەمەنی نووحی گەرکە. هەر لەم پێوەندییەدا بڕوام وایە ئەم ڕەوتە پتر لە چوارچێوەی تایبەتمەندییەکانی چەمکی «پڕۆژە»دا دەگونجێ نەک «پڕۆسە».

بێتو ئەم بیرۆکەی پێشوو واتە «بەتۆپزی کردنی» ڕەوتی سەقامگیر کردنی زمانی یەکگرتوو وەک ڕاستییەک بسەلمێنین و باوەڕی پێ بهێنین، لە ئاکامدا دیەنە سەر ئەم قەناعەتە کە هەلومەرجی ژێئۆپۆلیتیکی جیاوازی هەرکام لەو چوار بەشەی کوردستان دەتوانێ وەک فاکتەرێکی سەرەکی و یەگجار گرینگ جیاکەرەوەی ئەم ڕەوت و میکانیزمە و ئەم پڕۆژەیە بێ، واتە هەرکام لەو چوار بەشە لەم بوارەدا میکانیزم و ڕەوت و پڕۆژەی تایبەتی خۆی گەرەکە بەڵام کوردستانی تورکیە و کوردستانی سوریە لەدو بوار وەک یەک دەچن: یەکەم «شێوەزاری کرمانجی سەروو»، دووهەم: «شێوە نووسینی لاتین»؛ لەمەڕ کوردستانی ئێران و کوردستانی عێراقیش دیسان بە هەمان شێوە لە دوولایەن وەک یەک وان، یەکەم: شێوەزاری سۆرانی، دووهەم: شێوەڕێنووسی ئارامی، کە وابوو لە ئاکامدا بەم قەناعەتە دەگەین کە پڕۆژەی سەقامگیر کردنی زمانی یەکگرتووی کوردی لە کوردستانی تورکیە و کوردستانی سووریە دەتوانێ زۆر وەک یەک بچن، بەهەمان شێوە ئەم ڕەوتە و ئەم پڕۆژەیە لە کوردستانی ئێران و عێراقیش خاوەنی گەلێک لێکچوون و خاڵی هاوبەشن (ئەحمەدیان، ١٣٨٧: ٥؛ لە: «گۆڤاری مەهاباد ژمارە ٩٠-٨٩).

بە بڕوای من لەباری تیئۆریک و لە ڕوانگەی نەزەرییەوە و لە «ئاسۆیەکی ئارمانخوازانە»دا بێتوویەک شێوەزار «بەتۆپزی» (تجویزی) وەک زمانی یەکگرتووی کوردی بۆ سەرجەم ئەو چوار بەشەی کوردستان «مشروعیت»ی پێ بدرێ و بچەسپێندرێت و وەک زمانی یەکگرتووی تاقانە بەهای پێویستی پێ بدرێت و ببێتە زمانی نووسین و زمانی ڕاگەیاندن و زمانی پەروەردە لە هەر چوار بەشی کوردستاندا، ئەوا لە ڕاستیدا پێش‌نیاز و پێداویستی سەرەکی ئەم پڕۆژە ئارمانخوازانە ئەوەیە کە پێشەکی پڕۆژەیەکی زمانەوانی دی سەقامگیر بکرێ و بێتە بەرهەم، ئەویش بریتییە لە شێوە ڕێنووسی یەکگرتوو؛ لە باری شێوەناسییەوە (روش شناسیmethodology) پێویستە پڕۆژەی «شێوە ڕێنووسی یەکگرتوو» وەپێش «زمانی یەکگرتوو» بکەوێ؛ یان بە تەعبیرێکی تر: پڕۆژەی ئارمانخوازانەی زمانی یەکگرتووی تاقانە، بەرهەم نایە و سەقامگیر نابێ مەگەر پڕۆژەی ئارمانخوازانەی شێوە ڕێنووسی یەکگرتووی تاقانە وەپێش بخرێت (ئەحمەدیان، ١٣٨٧: ٦؛ لە «گۆڤاری مەهاباد ژمارە ٩٠-٨٩).

لە باری زمانەوانییەوە و لە ڕوانگەی ڕەچەڵەکناسی زمانییەوە (Linguistic typology) چەند زمانی وەک عەرەبی، یونانی، چێکی و... خاوەنی تایبەتمەندییەکن بە ناوی «دوو زمان وێنە» (دوزبانگونەdiglossia)؛ ئەم تایبەتمەندییە بەم چەشنەیە کە لەو زمانانەدا دوو چەشنە زمان (یا شێواز) بەدی دەکرێ، یەکەم: «زمان وێنەی بەرز» (زبانگونەی عالیH-Variety)؛ دووهەم: «زمانوێنەی ڕەشۆکی» (زبانگونەی عامیانە L-Variety)؛

زمان وێنەی بەرز لە راستیدا زمانی نووسین و وێژەیە و زمان وێنەی ڕەشۆکی زمانی ئاخافتنە. لەو زمانانەی گۆریندا، ئەم دوو زمان وێنەیە (زمان وێنەی بەرز، و زمان وێنەی ڕەشۆکی) هێندە لێک جیاوازن کە بۆ وێنە ئاخێوەرێکی عەرەبزمان کە زمانی زگماکی عەرەبییە بە بێ فێرکاری توانایی حاڵی بوون و تێگەیشتن لە زمانی عەرەبی «بەرز»ی نییە.

پێچەوانەی ئەم دیاردەیەش هەر بەدی دەکرێت؛ واتە خوێندەوارێکی غەیرە عەرەبی بەشی زمانی عەرەبی دەرچووی پلەی ماجێستێرو تەنانەت دوکتۆرا، لە زمانی ڕەشۆکی عەرەبی تێناگا یان زۆرکەم تێدەگا. وێدەچێ کە زمانی نووسین و ئاخافتنی کوردیش لەم دواییانەدا، بەرەبەرە بە چەشنێکی دەستکرد تووشی ئەم تایبەتمەندییە نەخوازراوە هاتووە. ئەم هەلومەرجە و ئەم بارودۆخە بەو قەناعەتەمان دەگەیەنێت کە بێتوو پرۆژەی زمانی یەکگرتووی کوردیش بێتە بەرهەم و سەقامگیر بێ، ئەم زمانە یەکگرتوویە لە ڕاستیدا «زمانی یەکگرتووی نووسین» دەبێ و لە سەر بنچینەی «زمان وێنەی بەرز» ڕۆدەندرێت، ئەوە لە حالێکدایە کەزمانی یەکگرتوو دەبێ هاوکات زمانی یەکگرتووی نووسین و پەروەردە و ڕاگەیەنەرە گشتییەکان بێ. هەڵبەت بەو تێبینییە کە لە بارودۆخی ئاساییدا زمانی نووسین و زمانی ئاخافتن لێک جیاوازن بەڵام نەک بەو ڕادەیەی کە ئاخێوەرێک کە زمانەکە زمانی زگماکی ئەوە لە زمان وێنەی بەرز (=زمانی نووسین) بەڕادەیەکی یەکجار کەم حالی بێ یان خوێندکارێک کە دەرچووی قوناغی ماجیستێر و دوکتۆرای ئەم زمانەیە لە زمان وێنەی ڕەشۆکی (=زمانی ئاخافتن) بە ڕێژەیەکی زۆر زۆر نزم و داکشاو تێبگات.

ئاشکرایە زمانی «نووسین» و «قسە کردن»ی هەموو نەتەوەیەک کەم و زۆر لێکتر جیاوازیان هەیە، خۆتان دەزانن ئەو «فارسی»یەی دەنوسرێت دەگەڵ ئەوەی قسەی پێدەکرێ هێندێک فەرقیان هەیە بەڵام ئەوەندە زۆر نییە و ئەوە وای لە من کردوە کە بۆ زمانی «کوردی»ش هەر سنورێکی ئاوا ڕەچاو بکەم.کە دێینە سەر زمانی عەرەبی مەسەلەکە بە جارێکی دەگۆڕێ چونکوو ئەو «عەرەبی»یەی دەنوسرێ دەگەڵ ئەو «عەرەبی»یەی قسەی پێدەکرێ (لە هەر وڵاتێکی عەرەبیش بە شێوەیەکی تایبەتی قسە دەکرێ) زۆر لێک جیاوازن و ئەوە کاری کردۆتە سەر خوێندەواری کورد لە عێراق و لایان وایە زمانی نووسینی کوردی دەگەڵ ئی قسە کردن ئەوەندی عەرەبی یا نیزیک بەو دەبێ لێک جودا بن. من ئەوە بە ڕاست نازانم و لام وایە کە زمانی عەرەبی بە هۆی شەرایەتێکی زۆر تایبەتی ئەو حاڵەتەی وەرگرتوە کە لە هیچ زمانێکیترا نابیندرێ و بۆ هیچ زمانێکیش دووپاتە نابێتەوە (زەبیحی، ٢٠٠٥: ٤٩١، لە: «کەریمی، ٢٠٠٥»).

دەربارەی پرۆسەی هەڵبژاردنی وشە و پیتەکان و هەندێک وردەکاری ڕێزمانی زمانەکەمان، هەر لە سەرەتاکانی هەوڵی چەسپاندنی زمانێکی یەکگرتوودا لە ساڵی ١٩١٣ لە لایەن کۆمەڵەی «هێڤی» لە ئەستەمبۆل، هەتا پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان، هەروەها لە پاشانیش، هەموو لایەک خەونیان بە زمانێکی یەکگرتووی کوردیەوە بینیوە و ئەم مەسەلەیە چ بۆ گەشە کردن و بەرەوپێشەوە چوونی زمانەکەمان چ بۆ یەکگرتنەوەی زمانی ئەدەبی کوردیمان، مەسەلەیەکی ئێجگار گرینگە. لەبەر ئەوەشە کە دەبێت ئەو

**بەشی شەشم- زمان**

پیتانە پەسند بکرێن کە لەگەڵ بارودۆخ و تایبەتمەندییەکانی زمان و نووسینی کوردی دەگونجێن (پیرباڵ: ١٠٠).

لە کوردستانی باشووردا ئەلفوبێی عەرەبی هەتا ئاستێکی ئیجگار پێشکەوتوە و شوێن پێی خۆی کردۆتەوە و بە شێوەیەکی گەورە خزمەت کراوە. بنکە زانستییەکانی خۆی وەکوو زمانێکی یەکگرتوو، ڕەگ و ڕیشەی خۆی چەسپاندووە، لەبەر ئەوەشە کە هەرگیز ناکرێت ئەو هەوڵوکۆششە لەبەر چاو نەگیرێن.

ئەلفوبێی عەرەبی باشترین بڕیار و چارەسەرە و لەگەڵ ئەوەش دەبێت لە قووتابخانەکان و هەر لە پۆلەکانی ناوەندی خوێندن لە تەک ئەلفوبێی عەرەبی قوتابیان شارەزاییان دەربارەی ئەلفوبێی لاتینی هەبێت.

دیارە بە داخەوە، دەسەڵاتی کوردی لە کوردستانی باشووردا، ناتوانێت داوای چەسپاندنی بڕیارەکانی بکات لە بەشەکانی تری کوردستاندا؛ واتە تورکیا، سووریا، ئێران و ئەرمەنستان، ئەم مەسەلەیەش زۆر ئاشکرایە و دەبێت بە شێوەیەکی واقعبینانە سەیری بارودۆخی ئەمڕۆکەی گەلی کورد و کوردستان بکەین.

لەبەر ئەوەشە ناکرێت ئەلفوبێی عەرەبی بسەپێندرێت بەسەر ئەو وڵاتانەی باسمان کردن و دەبێ ئەوەش بڵێەن کە بڕیاردان بە دەست کورد خۆیەتی، بەڵام جێبەجێ کردنەکەی بەدەسی خۆی نییە. گەر بڕیاردان و جێبەجێ کردن، هەردووکیان لە دەسەڵاتی کورد خۆیدا بووایە، ئەو کاتە باسێکی دیکە بوو (محەمەد عەزیز، ١٩٩٩: ٣٧٣).

ئێمە نەک هەر ئەلفوبێیەکی یەکگرتوومان نییە، بەڵکوو، تا ئێستا زمانێکی وێژەی یەکگرتووی نووسین و خوێندنەوەشمان نییە. چونکە، زمانی کوردی لە چەند دیالێکت و خوار دیالێکتێکی جیاواز پێکهاتووە. هەر دیالێکتەش، بە جۆرە پیتێکی تایبەتی دەنووسرێ. هێندێ جیاوازی دیکەش، لە نێوان ڕێزمانی هێندێ لە دیالێکتەکاندا هەیە. لەبەر ئەوە، گەر بیر لە زمانێکی ستاندارد بکەینەوە، پێشەکی دەبێ، هەوڵێکی زۆر بدەین، ئەلفوبێی کوردی یەکخەین. هەرچەندە، ئەو کوردانەی بە بەشە دیالێکتی کرمانجییخواروو دەدوێن و بە پیتی عەرەبیی دەنووسن، تا ڕادەیەک، زمانێکی نیمچە ستانداردیان بۆخۆیان هەڵبژاردووە و چەسپیوە. ئەو زمانەش پتر خۆی لە لقە دیالێکتەکانی ناوچەی «سولەیمانی- موکریی»دا دەنوێنێ (هەمان: ٣٦٨).

هەرچەندە، زمانێکی یەکگرتووی کوردیی نووسینمان نییە، بەڵام، تا ڕادەیەکی زۆر، زمانی یەکگرتووی کوردیی نووسین، لە بەشێکی گەورەی هەر دوو پارچەکەی ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، لە مێژە بەشە دیالێکتی کرمانجی خواروو- لقە دیالێکتی «سولەیمانی ــ موکری» چەسپیوە؛ کەچی، هێندێ لە نووسەران هەر بەو لقە دیالێکتە دەنوسن کە لە سنووری ناوچەی ژیانی خۆیاندا بەکاری دێنن. جا گەر هەر نووسەرێ بەو شێوە زمانەی قسەی پێدەکا، بنووسێ، دەبێ چ جۆرە گەڕە لاوژیەکی زمانەوانیی، ماڵوێرانییەکی نەتەوەیی و پاشا گەردانییەکی سەیری لێ دەرچێ؟! کاریش بەو شێوەیە بڕوا، هەرگێز زمانێکی یەکگرتووی تۆکمە و سفتوسۆڵی نووسین، لە نێو کورددا سەرهەڵنادات! لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین، نکۆڵی لەوە بکەین، بەشێوەیەکی بەردەوام، نووسەر و شارەزاکانمان هەوڵیان داوە و هەوڵیش دەدەن، بەردی بنچینەی زمانێکی ستاندارد دانێن. بەڵام، هەموو ئەو هەوڵانە، تا ئێستە سەریان نەگرتووە. هەرچی مەسەلەی زمانە یەکگرتووە

ئەدەبییەکەشە، ئەوا دەبێ، بزانین کە هەرچەندە ئەم ناتەواوییە وەک کەلێنێک لە سەدەی ڕابوردووەوە هەستی پێکراوە، بەڵام هەتا ئێستە بایەخێکی زانستانە بە دروست کردنی نەدراوە.

## دیالێکتی یەکگرتووی سۆرانی

ڕەسمیبوونی زمانی کوردی لە ساڵەکانی دوای ١٩١٨ لە دەوڵەتی تازە پێکهاتووی عێراق تا ڕادەیەکی ئێجگار زۆر لە سۆنگەی چونەسەری دەسەڵاتی نەتەوەخوازیی کوردی و دەوری بەرچاو و سەلمێندراوی زمانی کوردی لەم وتارەدا بووە. بزاڤی نەتەوەخوازی لە عێراق دوای هەرەس‌هێنان لەمەڕ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی، توانی لە سۆنگەی چالاکی بەردەوام و بە هاریکاری نەتەوە یەکگرتوەکان، ماڤی زمانیی خۆی لە پانتایەکی دیاریکراو و سنورداردا دەستەبەر بکات (کەلکوەرگرتن لە زمانی کوردی لە خوێندنگاکان، دایرە دەوڵەتییەکان و دادگاکان). کە بە پێچەوانەی ویستی دەسەڵاتە جۆربەجۆرەکانی یەک لە دوای یەکی عێراق لە بەشێک لە ناوچەکانی کوردستان هاتە ئاراوە (Hassanpour,1992:458,459).

لە نێوان ئاخێوەرانی کرمانجی و سۆرانی، هەڵبژاردنێک لە پانتایی نێوان زمانیدا شکڵی گرتووە. ئەگەرچی لە ساڵی ١٩١٨ دیالێکتی کرمانجی لە ڕووبەری تەواوی کوردستاندا لە پێوەندی دەگەڵ ڕادەی ئاخێوەران، پەرتووکی نووسرا و بڵاو کراوە و چاپەمەنیدا لە پلەی هەوەل دابوو. بەڵام لە عێراقدا، ئاخێوەرانی کرمانجی لە بواری ڕۆشنبیری و سەقافی و کلتوریدا لە پلەیەکی نزم دابوون هەر چەند لە بزاڤی نەتەوەخوازیدا چالاکانە بەشداریان هەبووە.

کۆمەڵگای ئاخێوەرانی دیالێکتی سۆرانی لە عێراق لە ڕووی چەندایەتی و چۆنیەتییەوە لە پلەی هەوەڵ دابوون: ڕێژەی ئاخێوەدان و ڕادەی ڕۆشنبیری و سەقافی و کلتوری سۆرانی زمانانی عێراق لەبەراورد دەگەڵ ئاخێوەرانی کرمانجی لە پلەیەکی سەرتردا بووە و هەروەها لە بزاڤی نەتەوەخوازیدا چالاکتر و پێشڕەوتر بوون. ناوەندی سەرەکی ڕامیاری و ڕۆشنبیری عێراق شاری سلێمانی، پێتەختی پێشوی ئەمارەتی بابان بووە و یەکێک لەو چەند ناوەندە عەسکەرییە بووە کە لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە لە ئاخر و ئۆخری سەدەی نۆزدە، بایەخ و مرخی تایبەتی بۆ داندراوە. سلێمانی دوای هەرسهێنانی دەوڵەتی عوسمانی لە ساڵەکانی (١٩١٧-١٨)، بۆ جارێکی تر لە ژێر دەسەڵاتی ناوچەیی زمانی کوردیدا خۆی دێتەوە. سلێمانی بەردەوام خاوەنی چەندەها کۆمەڵە و گرووپی ڕۆشنبیری لە ناو چینەکانی جیا جیای کۆمەڵگادا بووە کە بریتین لە: چینی ڕۆشنبیری خوێندەوار، عەسکەری، مامۆستایان، فەرمانبەران، مامۆستایانی ئایینی، چینی مام ناوەندی و خوارەوەی کۆمەڵگا و... کە ئەم بارودۆخە بۆتە هۆی شانازی و جیاوازی ئەم شارە لە درێژایی مێژوودا. ئەم خاڵانە دەکرێ وەک تاقمێک هۆکاری هەڵکەوتوو لە دەرەوەی پانتای دەڤەری زمانی پۆلێن بکرێن کە لەمەڕ هەڵبژارانی ژێر دیالێکتی سۆرانی وەک زمانی پێوەری کوردی کاریگەری و دەوری تایبەتییان هەبوو. (Hassanpour, 192: 459). داخوازینامەیەک لە ڕێکەوتی ٢٠٠٨/٤/١٥ لە ژێر ناوی: «پەیامی کۆمەڵێک نووسەر و ئەدیب و ئەکادیمسیتی کورد لە بابەت: «ستاندەڕایز کردنی زمانی کوردی» گەڵاڵە کراوە بۆ ئەوەی

**بەشی شەشم- زمان**

داوا لەحکوومەتی هەرێم بکا کە «کرمانجی خواروو» (سۆرانی) وەک زمانی ستانداری کوردی بە ڕەسمیەت بناسن. لە ئەو داخوازینامەیەدا، داوا کراوە، **یەکەم:** بەیاسەیەک بڕیار بدرێت لەسەر بە فەرمیی ناسینی شێوەزاری کرمانجی خواروو وەک بناغەی زمانی ستانداری کوردیی، لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا. **دووهەم:** بەیاسەیەکی هاوپێچ (مرفق) بڕیار بدرێ، لەسەر دامەزراندنی ئینستیتوتێکی نەتەوەیی لە کوردستاندا، بۆ لێکۆڵینەوە و ساخ کردنەوە و ئارشیڤ کردنی هەموو شێوازەکانی زمانی کوردی و پێشکەش کردنی پێشنیار و لێکۆڵینەوەی بەردەوام بۆ موتووربە کردنی زمانی فەرمی بە وشە و فرەییز و زاراوەی هەموو شێوازەکانی تر.

ئەو داخوازییە دەیەوێ یەکێک لە سێ لەهجە ئەدەبییەکای کوردی، ئەوەی کە ناوی «سۆرانی»، «کوردی ناوەراست» یان «کرمانجی خواروو»ی لێندراوە، بە زبری قانوون و دەسەڵاتی دەوڵەتی، بکرێت بە زمانی ڕەسمی و ستانداردی کوردی دەوری لەهجەکانی تریش (کرمانجی ژووروو، هەورامی...) ئەوە بێ کە خزمەت بکەن بە دەوڵەمەند کردنی ئەو زمانە ستانداردە.

لە ڕوانگەی دوکتۆر "ئەمیر حەسەنپوور"ەوە کە مامۆستای زانستگای تۆرنتۆی کانادایە، ئەو داخوازییە، ئەگەر بەپێوانە زانستییەکانی زمان هەڵیبسەنگێنین، بەهەڵە چووە و لەباری سیاسییەوە تووشی هەڵەیەکی گەورەتر بووە.

بیروڕای تایبەتی دوکتۆر "ئەمیر حەسەنپوور" لەم بارەوە ئاوایە:

«١- زمانی کوردی، وەک زمانی ئەرمەنی، ئاڵبانی و نۆرویژی، زمانێکی جووت- ستانداردە: دووستانداردی هەیە، کرمانجی و سۆرانی. لەگەڵ ئەوەشدا هەورامی ئەدەبیاتێکی کۆنی هەیە، وەک دوو لەهجەکەی تر پرۆسەی ستاندارد بوونی دەست پێنەکردووە. لەهجەی دملی یا زازاش بۆ نووسین زۆرکەم دەکار هێندراوە.

٢- زۆربەی گەلی کورد بەکرمانجی قسەدەکەن: تەواوی کوردەکانی سووریا، تەواوی کوردی ئەرمەنستان، زۆربەی کوردی تورکیا، بەشێک لە کوردەکانی ئێران و عێراق کرمانجی زمانن. سۆرانی تەنیا لە کوردستانی عێراق و ئێران، ئەویش تەنیا لە ناوچەکانی ناوەڕاست قسەی پێدەکرێ.

٣- لە ڕوانگەی زمانناسییەوە، هیچ لەهجەیەک لە لەهجەیەکی تر باشتر نییە، هەر لەهجەیەک دەتوانێ ببێتە زمانی ستاندارد. ستاندارد بوون پێوەندی بە بارودۆخی غەیری زمانی (واتە ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی و...) هەیە. نووسین و ئەدەبیات لە پێشدا بە هەورامی و کرمانجی دەستی پێکرد. سۆرانی زۆر درەنگتر، نزیکەی سێ سەدە دوایە، بۆ نووسین دەکارهات، بەڵام لە بارودۆخی شەڕی جیهانی یەکەم هەلی بۆ ڕەخسا کە ستاندارد بکرێت.

٤- پرۆژەی ستاندارد بوونی زمانی کوردی، لەبەر دابەشکرانی کوردستان لەناو چەند دەوڵەتدا و بە هۆی سیاسەتی زمانکوژی، بە شێوەیەکی ئاسایی وەڕێ نەکەوت و درێژەی نەبوو. ئەو پرۆسەیە کاتێک دەستی پێکرد کە گەلی کورد لەنێوان ئێران و عوسمانیدا دابەش ببوو و بەشێکی کەمیش لە ڕووسیا بوون.

ستاندارد کردن لەسەرەتاوە خۆڕسک بوو؛ واتە بەبێ بەرنامەیەکی لەپێشدا گەڵاڵە کراو و بەبێ تێوری و زانستی زمانناسی. ئەو پرۆژەیە بەبڵاو بوونەوەی ڕۆژنامەی کوردستان لە ١٨٩٨ دەستی پێکرد، کاتێکی دەسەڵاتی دەوڵەتی کورد لە ئارادا نەبوو. کوردستان زۆرتر بە کرمانجی بوو، لەبەر ئەوەی بڵاوکەرەوەکەی (بەدرخانییەکان) کرمانجی زمان بوون. ڕۆژنامەگەری دوای ١٩٠٨ هەم بە کرمانجی بوو و هەم بە سۆرانی، بەڵام کرمانجی زاڵ بوو. لەبەر ئەوەی خوێندەوار و ڕۆشنبیر و خوێنەرەوە زۆرتر کرمانجی زمان بوون.

٥- دوای شەڕی جیهانی یەکەم، بەشی عوسمانی کوردستان، کەبەشی هەرە گەورە بوو، دیسان دابەش کرا و ئەو دابەشینە پێوەندی نێوان لەهجەکانی گۆڕی. بەرووخانی دەوڵەتی عوسمانی (١٩٢٢- ١٩١٨) و دامەزرانی کۆماری تورکییە (١٩٢٢) بەتایبەتی دوای١٩٢٥، کرمانجی بە شێوەیەکی دڕندانە سەرکوت کرا. لە سووریەش -کە فەرانسە دایمەزراند (١٩٤٦-١٩١٨)- ڕێگە نەدرا کرمانجی لە خوێندندا دەکار بێ و ڕۆژنامەگەریش تەنیا لە ١٩٣٢ هەتا ١٩٣٥ و لە سالانی شەڕی جیهای یەکەم (١٩١٨ – ١٩١٤)، تەنیا لە عێراق لە ژێر دەسەڵاتی ئینگلستاندا و یەکێتی سۆڤێت (١٩٢١ بەولاوە) زمانی کوردی کە خوێندن و نووسین و چاپەمەنی و ڕادیۆ دەکار هات و پرۆژەی ستاندارد کردن هاتە گۆڕێ.

لە عێراقدا ستاندارد کردن بێبەرنامە بووە؛ واتە ڕۆژنامەنووس و نووسەر و بڵاوکەرەوەی کتێب و وەرگێڕەکان بۆچوونی جیاوازیان هەبوو، بەڵام لەو بێبەرنامەییەشدا، یەکدەنگی بەدی کرا (بۆ وێنە لە وشە ڕۆنان، پەتی کردن، گۆڕین یان چاک کردنی ئەلفوبێ). پرۆژەی ستاندار کردنی زمانی کوردی بە سۆرانی، ئەویش لەسەر بنچینەی لەهجەی سلێمانی، بەڕێوە دەچوو نەک لەبەر ئەوەی ئەو بن لەهجەیە لە ئەوانی تر باشتر بوو، بەڵکوو لەبەر ئەوەی شاری سلێمانی ناوەندی بزووتنەوەی نەتەوەیی بوو؛ خوێندەوار و ڕۆشنبیری زۆرتر بوو و ناوچەی بادینان زۆرتر عەشیرەتی بوو و شاری گەورەی نەبوو. تەنیا لە یەکێتی سۆڤێت، بۆ ستاندارد کردنی زمانی کوردی ڕێباز و بەرنامە دیاریکرا (کۆنگرەی ١٩٣٤ی ئیرەوان)، بەڵام کوردی سۆڤێت بە ژمارە زۆر کەم بوون و لە قەفقاز و ئاسیای ناوەندی بڵاو ببوونەوە و لە ١٩٣٧ هەتا دوای شەڕی جیهانی دووهەم سەرکوتکران و دەوڵەتان ڕێگەیان نەدەدا پێوەندی لە نێوان ئەوان و پارچەکانی تری کوردستان هەبێ. لە ئەو بارودۆخەدا بن لەهجەی سلێمانی لە کوردستانی عێراق پرۆسەی ستاندارد بوونی بەردەوام بوو، تا ڕادەیەکیش لە کوردستانی ئێران، سەرباقی ئەوەی زمانی کوردی لە ئێران سەرکوت دەکرا، هێزی پێدەدرا (بەتایبەت بە درێژایی تەمەنی کورتی کۆماری کوردستان).

٦-ئەم داخوازینامە داوا دەکا سۆرانی «لە هەرێمی کوردستانی عێراقدا» بە ڕەسمییەت بناسرێ. بەڵام ئەگەر شتێکی وا بکرێ (جۆی کردنەوە یان دابڕانی لەهجەکان، لەتوکوتتر کردنی پرۆسەی ستاندارد بوون و سەپاندنی هەر کوتەی لەناو سنووری دەوڵەتێکدا) دیسان بەرنامەیەکی وا سەر ناکەوێ و زیانێکی سیاسی زۆری دەبێ. ئەگەر لە ڕابردوودا سۆرانی لە عێراق و کرمانجی لە سۆڤێت دەیانتوانی، بێ خۆ هەڵقوتاندن لە یەکتر، ستانداردبن، ئێستە ئەو پێوەندییانە گۆڕاون، پەرژینی سنوورەکان نزمتر بوون، پارچەکان تێکەڵاوتر بوون، تێکنۆلۆژی ڕاگەیاندن (تەلڤیزیۆن، ساتلایت،ئینترنێت، تەلەفۆن و....) سنوورەکانی شێواندووە. قورسایی

لەهجەکانیش وەک جاران نەماوە، هەر بۆیە هەوڵ تەلڤیزیۆنی ساتلایت کرمانجی زمانەکان دایانمەزراند و زۆرتر بە کرمانجی بوو تا سۆرانی. کرمانجی زمانەکان لە تورکییە، بە خەباتی خۆیان، مافی بڵاو کردنەوە بە زمانی خۆیان ئەستاندووە و دەوڵەتی تورکییەیان وا لێکردووە کە بەو زوانە ڕادیۆ و تلڤیزیۆنی ساتلایت بە کرمانجی دەست پێ بکا. لەکوردستانی عێراقیش، بادینان چیتر مەڵبەندی عەشیرەت و وردەشاران نییە.

٧- دوای وەلاچوونی دەسەڵاتی ڕێژیمی بەعس لەسەر بەشێک لە کوردستان لە١٩٩١ بە کرمانجی زمانەکان لە کووچە و کۆڵانان و لە دووکان و ئیدارەکاندا بە نووسین و بە ئاخاوتن کرمانجییان دەکار هێنا و سۆرانی زمانەکانیش وەک جاران دەکارهێنانی لەهجەی خۆیان درێژە پێدا. دیارە سۆرانی هێشتا دەسەڵاتی زۆرترە، ئەوەش لەبەر پێوەندی نابەرابەری نێوان دوو لەهجەکەیە لە کوردستانی عێراقدا نەک لەبەر ئەوەی سۆرانی لە کرمانجی پێشکەوتووترە، یان سۆرانی ستاندارد بووە و کرمانجی نەبووە. ڕاستە کە چاپەمەنی زۆرتر بە سۆرانی بووە بەڵام هیچ بابەتێک نییە کە بکرێ بە سۆرانی باسی بکرێ و بە کرمانجی نەکرێ. ڕەسمی کردنی لەهجەیەک دەسەڵات دەدا بە لەهجەکە و بە ئەوانەی بەو لەهجەیە قسە دەکەن و لە هەمان کاتدا ئاخێوەرانی لەهجەکانی تر لەو دەسەڵاتە بێبەش دەکات. ئەوەش کێشەکە دەکا بە کێشەی ماف و دێمۆکراسی.

٨- کوردی زمانێکی «جووت –ستاندارد»ە و ئەگەر قەراربێ بکرێتە تاقە ستاندارد، بەبێ زەبرووزەنگی دەوڵەتی سەر ناگرێ و ئەو زەبر و زەنگەش بە ئامانجی خۆی ناگا و ناکۆکی قووڵتر و بەرینتر دەکا.

ئەگەر مەبەستی ئەو داخوازینامە ئەوەیە کە نەتەوە یەک بگرێ و جیاوازی دوو لەهجەکە نەبێتە سەرچاوەی لێک هەڵبڕانیان، ڕەسمی کردنی سۆرانی پرۆسەی جیابوونەوە خێراتر دەکا. ئەگەر مەبەست ئەوەیە نەتەوەی کورد وەک «سرب»و «کرۆوات»یان «چیک»و «سلۆواک» لێکهەڵنەبڕن، ڕەسمی کردنی سۆرانی بەرنامەیەکی وا وەدی دێنێت.

٩- جیاوازی زمان و لەهجە وەک نوقسان و دواکەوتوویی و لێقەومان چاوی لێکراوە، بەڵام دەکرێ وەک دەوڵەمەندی وجوانی و هەڵکەوتوویی دابندرێ. ئەو بۆچوونانەش لەبواری دوو جیهانبینی و دوو ئایدیۆلۆژی و دوو سیاسەتی لێکجیاواز سەریان هەڵێناوە. کێشەی ماف و دێمۆکراسی لە ناخی ئەو ناکۆکییەدا ماڵی کردووە (حەسەنپوور، ١٣٨٧: ١٠ و ١١، لە: «گۆڤاری مەهاباد ژمارە ٨٦»).

## زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی کوردی:

پرسیار ئێستا دەربارەی «زمانی ئەدەبی یەکگرتوو»ە کە ئەمە شتێکی جیاوازە لە«زمانی یەکگرتوو». هەندێ کەس لای وایە زمانی ئەدەبی یەکگرتوومان نییە. وا دەزانم زۆرتری شارەزایان، ئەوەی زانست ئەکەن بە چرای بینین لەسەر ئەو ڕایەن کە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دەستی کردووە بە دروستبوون و ڕێگەی خۆی گرتۆتە بەر و لە گەشەسەندنایە. زمانی ئەدەبی یەکگرتوو شتێک نییە کە ئارەزووی ئەم پادشا یا ئەو زانا دروستی بکات؛ هەروەک شتێکیش نییە کەچەند زانایەک بەپێی نەخشە یا

کەتەلۆگێکی ئامادە دروستی بکەن. بەڵکوو مێژووی نەتەوە خۆی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو دروست ئەکات و هەر نەتەوەیکیش ڕێبازی تایبەتی خۆی هەیە لە دروست کردنی زمانی ئەدەبی یەکگرتوودا. ئادەمیزاد دروستکەری مێژووە، بەڵام مێژووی گەلانیش ڕێڕەوێکی هەیە بەرەو پێشەوە کە بە ئادەمیزاد ناگۆڕدرێت، با بۆ ماوەیەکیش کۆسپێ بهێنرێتە ڕێگە. لە دروستبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووشدا، زانایانی نەتەوەیەک بەوەی کە لە مێژوو ئەگەن و زاناشن دەتوانن «پێشبین» بن و بزانن مێژوو بەرەو کوێ ئەڕوات و ئەوانیش لەگەڵ بەرەوپێش چووندا بن و نەبنە کۆسپی سەرە ڕێ.

زانایانی کوردیش دەتوانن لەگەڵ ئەو ڕێڕەوە دابن کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئەم سەدەیەمان لە سەدەی نۆزدەهەمەوە گرتوویەتییە بەرو خێراتر بەرەو پێشەوەیبەرن.

کەواتە دەمێکە زمانی یەکگرتووی کوردی پەیدا بووە کە زمانی کوردییە و خاسیەتی تایبەتی خۆیی لە ڕووی گراماتیک (=مورفولوژی وسینتاکس) و فۆنەتیک و بنەڕەتی فەرهەنگەوە هەیە و هەموو نەتەوەی کورد بە زمانی خۆیانی دەزانن. لەگەڵ ئەوەشدا کە زمانی کوردی چەند دیالێکتێکی جیاوازە و هەر دیالێکتە چەند بەشە دیالێکتێکیان لێ دەبێتەوە -ئەوەی زانای پایەبەرز «توفیقوەهبی» بە «بێچووە دیالێکت» (لەهجە)یان دائەنێت- بەڵام خاسیەتە یەکگرتووەکانی ئەو زمانە کوردیە لە هەموو دیالێکتو بەشە دیالێکتەکاندا دەبینرێت و هەر یەکە لەم دیالێکت و بەشە دیالێکتانە خاسیەتی جیاوازی خۆی هەیە کە لە زمانەکەی جیا ناکاتەوە و نایکات بە زمانی جیاواز، بەڵکوو شەقڵی تایبەتی دیالێکت و بەشە دیالێکتی جیای ئەداتێ و سامانی وشەی جیاوازی ئەڕژێتە ناو زمانە یەکگرتۆکەوە و دەبێتە سەرچاوەی وشەی هاوجۆر، کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو سوودی لێ دەبینێت و پیە دەوڵەمەند دەبێت. کە واتە دەمێکە گومان لەوەدا نییە کە زمانی یەکگرتووی کوردی هەیە. بەڵام ئەوەی تا ئێستا لە سەردوان و لێکۆڵینەوەی دەوێت ئەوە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە. (مستەفا ڕەسووڵ، ١٩٧١: ١٢و١٣).

زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو بەو زمانە دەگوترێت کە لە زمانی یەکگرتووە وە بە هەموو دیالێکتەکانەوە وەرئەگیرێت، یا بناغەکەی لە یەکێک لە دیالێکتەکانەوە وەردەگیرێت و زۆرجار پوختە کراوێکی زمانە یەکگرتووەکەیە یا دیالێکتێکیەتی، یا بلێین پوختەکراوێکی زمانی قسە کردنە. ئەم زمانە دەبێتە زمانی نووسین و خوێندنەوە و ئەدەبیات و پشت بە هەموو سەرچاوەکانی بەرەوپێش چوون و دەوڵەمەندبوونی زمان، دەوڵەمەند دەبێت و بەرەوپێش دەڕوات. زمانی یەکگرتوو و دیالێکتەکانی زمان و ئەدەبی فۆلکلۆری نەتەوە و زمانی نەتەوە دراوسێکان و ئیستیلاحی زانستی جیهانی گەورەترین سەرچاوەی ئەو دەوڵەمەند بوونەن.

### هۆیەکانی دروستبوونی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی

ئەو هۆیانەی کە دەبنە هەوێنی پەیدا کردنی زمانێکی یەکگرتووی ئەدەبی بۆ گەلێک ئەوانەن:

ئە- ڕێی سەپاندنی شێوەیەک بەسەر گەلێکدا: ئەمە بەتایبەتی بۆ ئەو گەلانەیە کە هێشتا زمانێکی یەکگرتوویان نییە، بەڵام قەوارەیەکی سەربەخۆی یەکگرتوویان هەیە. ئەو کاتە بۆ چارەسەر کردنی ئەمە یا بە

**بەشی شەشم- زمان**

جۆرێکی دیمۆکراتیانە، بیروڕای گشتی خەڵکەکە وەردەگیرێت، تا بزانرێ چ شێوەیەکی بە دڵە، یا ئەوەتە کاربەدەستانی خۆیان شێوەیەک لە شێوەکانی زمانەکە دەکەنە زمانی ڕەسمی و بەو ڕەنگە دەیسەپێنن بەسەر گەلەکەدا و بەرە بەرە دەبێتە زمانی ئەدەبیان.

ب—لەخۆوە دروستبوونی شێوەیەکی ئەدەبی: هێندێ جار شێوەیەکی ئەدەبی لەخۆیەوە واتا بێ سەپاندنی ڕاستەوخۆ، دروست دەبێ. بۆ ئەمەش هێندێ هۆ هەن کە لەم کارەدا دەور دەگێڕن، وەک:

١- ئەوەی کتێبێکی ئایینی پیرۆز بەو شێوەیە بنووسرێتەوە. بۆ وێنە: شێوەی هۆزی قورەیش بوو بە شیوەی ئەدەبیی عەرەبەکان؛ تەنیا لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز بەو شێوەیە هاتە خوارەوە.

"مارتین لووتەر" (١٤٨٣-١٥٤٦)ی ئەڵمانیش کە داهێنەری ئایترای پرۆتستان و پێشەوای بزوتنەوەی چاکسازی ئاینی دیانێتی (واتا کاتولیکی)یە؛ پاش ئەوەی ئینجیلی لە لاتێنییەوە وەرگێڕایە سەر شێوەی ئەڵمانی ساکسی، کە تا ئەو کاتە تەنیا لە دیوەخانەکانی ئەمیرەکانی ساکسدا بەکار دەهێنرا، توانی سەرنجی خەڵکێکی زۆر بۆ ئەو ئینجیلە ڕابکێشێت و هەر بەو هۆیەوە شێوەی ساکسی بوو بە زمانی ئەدەبی هەموو ئەوانەی ئەمڕۆ بە ئەڵمانی دەدوێن؛ هەر لە ئەڵمانیا خۆیەوە بگرە تا دەگاتە سویس و ئوتریش و گشت لایەکی دی.

بەمەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئایین دەورێکی مەزن دەگێڕێ لە دروست کردنی زمانێکی ئەدەبیدا. پێچەوانەی ئەمەش هەر ڕاستە. واتا، ئایین دیسانەوە دەورێکی مەزن دەگێڕێ لە دوولەت کردنی زمانێکی ئەدەبیدا. بۆ وێنە: سریانەکان هەتا سەدەی پێنجی زایینی، زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەبوو. لەم سەدەیەدا، ئاژاوە کەوتە کڵیسەی دیانەکانی ڕۆژ هەڵاتەوە و بەوە خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە و هەر لەوەشەوە ئایترای یاقووبی وئایترای نەستووری پەیدابوون. ئەمجا وردە وردە، هەر لایە شێوەی تایبەتی خۆی پاراست و پیە نووسی و ڕقوکینە و دووبەرەکیش دەورێکی ئاگر خۆشکەرانەی نواند بۆ دوور خستنەوەی هەر دوو شێوەکە لە یەکتر، بە جۆری سریانەکان ئێستە دوو شێوەی ئەدەبیان هەیە، ئارياییە کۆنەکانیش (واتا هێندوئێرانییە کۆنەکان) لەسەرەتاوە بەیەک زمان دەدووان و یەک ئایینیشان هەبوو بەڵام پاش ئەوەی ئەوانەی هیندوستان ئایینی خۆیان جیا کردەوە و لە دەوروبەری ٣٠٠٠ی پ. ز دا کتێبی پیرۆزی «ڤیدا»یان بە شێوەی سانسکریت بۆ نوسرایەوە، ئەمجار کە دوای ئەوانیش ئارياییەکانی ئێران؛ ئایینی زەردەشتیان پەسند کرد و کتێبەکەیان بە زمانی «ئاڤێستا» بڵاو کردەوە؛ ئەودەمە زمانی ئاريایی بەرە بەرە بوو بە دوو زمان: هیندی و ئێرانی، کە هەریەکەشیان لەسەر خۆ بوو بە چەند زمانێکی سەربەخۆ.

٢- ژیاندنەوەی ئەدەبیات بە تاقە شێوەیەکی زمانێک و لە سنوورێکی یەکجار فراواندا؛ دەبێتە هۆی دروست کردنی زمانێکی ئەدەبی. بۆ وێنە: زمانی فارسی تازە لەو کاتەوە دروستبووە کە "ڕوودەکی" و "فیردەوسی" دەستیان بە هۆنراوە هۆنینەوە کردووە بە شێوەی دەری (واتا شێوەی ژووورووی ڕۆژهەڵاتی ئێران). بەتایبەتی "شانامەی فیردەوسی" دەورێکی کاریگەری گێڕاوە لەم ڕووەوە و توانی هەموو شێوە و زاراوەکانی دی ڕاماڵ بدا و جێگەی خۆی بکاتەوە.

٣- خزمەت کردنی زانست بە تەنیا شێوەیەک؛ بە تایبەتی لە ولاتێکدا کە زانستگەو کتێبی زانستیانە و ڕۆژنامەی زۆر و زەبەندەی هەر بەیەک شێوە ببێ و بە شێوەکانی دی نەیبێت، دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو شێوەیە بکاتە زمانێکی ئەدەبی.

٤- هێندێ جار جۆری ژیانی کۆمەڵایەتی و پێوەندیی بازرگانی و ئابووری دەبنە هۆی دروستبوونی شێوەیەکی ئەدەبی. شارێکی زۆر گەورە، یا پێتەختی ولاتێک کە ببێتە ناوچەی هاتوچۆ و بازرگانی و نان پەیدا کردن و خەڵک ڕووی تێبکەن؛ شێوەی ئەو شارە دەسەلات پەیدا دەکا و برەو دەستێنێ و لە ئەنجامدا دەبێتە شێوەیەکی ئەدەبی.

ج – هەوڵدانێکی ڕێکخراوی زانستیانەی لەسەر خۆ بۆ بەرهەمهێنانی زمانێکی ئەدەبی یەکگرتوو؛ ئەو ڕێگە ئەو گەلانە دەیگرن کە هەر دوو ڕێگەی باسکراوی پێشوویان بۆ دەست نادا. بە بیروڕای من ئەمەیان باشترین و تەنیا رێگەیە کە کورد بتوانێ پێیدا بڕوا لەم بارەیەوە. واتا ئێمە دەبێ شێوەیەکی ئەدەبی بۆخۆمان دروست بکەین. بەڵام ئایا دروست کردنی ئەم شێوەیە لە کوێوە دەست پێ بکات و کێ دەستی پێ بکات و چۆن دەست پێ بکرێت؛ ئەوە پێویستی بە شی کردنەوە و لەسەر ڕۆیشتن هەیە (نەبەز، ١٩٧٦: ١٢-٨).

لێرەدا پرسیارێک دێتە ئاراوە بەو چەشنە کە پەیوەندی زمانی یەکگرتوی ئەدەبی لەگەڵ ئەو لەهجانەی دی چیە؟ کە دەکرێ ئاوا وڵام بدرێتەوە:

ئەوەی ڕاست بێ لە سەرەتای کارەوە بنلەهجەی سلێمانی کە دەتوانین بڵێین تەنیا هی شاری «سلێمانی»یە وەکوو زمانی پێنوسین هاتۆتە مەیدانەوە، ئەمە ماوەیەک درێژەی کێشاوە، ئەم ڕووداوەش -کە بێگومان بارودۆخی سیاسی و مێژوویی پێکیهێناوە- خۆی بۆتە هۆی ئەوەی نیمچە تەعوسوبێک لە لای هەندێ خوێندەواری کوردی خەلکی سلێمانی پەیدا ببێ و هەر بنلەهجەی سلێمانی بە نۆرمی زمانی یەکگرتوو بزانن کە لە جێگەی خۆی نییە، بەڵام چەند ساڵێکە ئیشەکە ڕووی لەوەیە کە ئەم زمانە ئەدەبیە دەبێ بە وشەی لەهجەکانی دی دەوڵەمەند بکرێ، بەتایبەتی بنلەهجەی موکریانی زۆر تەئسیری کردوە و بەرە بەرە ئەو ڕێبازە ئاواڵە بووە کە لە هەموو لەهجەکان کەلک وەربگیرێ و ڕۆژ بە ڕۆژیش ئەم ئیشە پەرە دەستێنێ. تکایە تەماشای «شەرفنامە» وەرگێڕانی "هەژار"، «ئەفسانەی چیای ئاگری و قەلای دمدم» تەرجومەی "شوکور مستەفا" بکەن (زەبیحی، ٢٠٠٥: ٤٧٥).

"عەبدوڕەحمان زەبیحی" باس لە هەندێ لەم پێشکەوتنانە دەکا کە زمانی کوردی لە سەرەتای چەرخی بیستەمدا بە دەستی هێناوە و لە پێوەندی لەمەڕ زمانی کوردی ئەدەبی یەکگرتوودا دەڵێ: «زمانی کوردی لە شێوەی نووسینی «فارسی» و «تورکی عوسمانی»، یانی ئاخینەوەی وتار بە ڕستەی درێژ درێژی ڕەق و زەق و زاراوەی غەیرە کوردی تا ئەندازەیێک پابۆتەوە و شێوەیەکی تایبەتی «کوردی نووسین»ی بە خۆیەوە گرتووە، ئەگەرچی هێشتا زۆری پێدەوێ تا فێر دەبین بە کوردی بیر بکەینەوە و ئینجا بیخەینە سەر کاغەز. سەرەڕای ئەوەش پیاو بە ئاشکرا هەست بەوە دەکا کە زمانی کوردی کەوتۆتە سەر ڕچەی «زمانی ئەدەبی» و بەرەوپێش دەچێ، کورت و کرمانجی بڵەین: نەمامی «زمانی کوردی ئەدەبی یەکگرتوو» گۆڕاوە و شین بووە،

بەلام هێشتا پێدەچێ تا دەبێتە درەختێکی خاوەن سایە و لق‌وپۆپ و داری ئەوتۆ کە پیاو ماندوویی ڕێگای سەختی لە ژێردا لەخۆی دەرکا و لەبن سێبەریدا بحەسێتەوە (زەبیحی، ١٣٦٧: ٩).

گزنگ و مەشخەڵی پەیڕەوێکی ئەدەبی تازە لە "سلێمانی"وە سەری دەرهێناوبوو بە ڕووناکییەک کە تا ئێستا بەردەوامە و بەشی زۆری کوردستانی گرتەوە. یا ڕاستتر ئەوەیە کە لە ڕووی زمانەوە بوو بە ئەدەبیاتی ئەوانەی بە سێ دیالێکتی کوردی دەدوێن.

قوتابخانەی شیعری بابان کە هەندێ لە مێژوونووسانی ئەدەب بە قوتابخانەی نالی دادەنێن و هەندێکیش لە باسیدا ناوی نالی و سالم و کوردی پێکەوە تۆمار دەکەن ئەو قوتابخانەیە گەر لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە گەلێک دیمەنی لە ئەدەبیاتی ئەمڕۆماندا نەمابێ ئەوا فۆرمی ئەدەبیاتی ئەمڕۆمان هەر بەرەوپێش چوونی مێژوویی فۆرمی ئەدەبی ئەو قوتابخانەیە، بە تایبەتی ئەو زمانەی کە ئەدەبیاتەکەی پێ دەنووسرێ هەر ئەو زمانە تازە پتەوەیە کە ئەو قوتابخانەیە کردبووی بە کەرەسەی دەربڕینی ناوەڕۆکەکەی و بە هۆی داڕشتنی فۆڕمی تایبەتی خۆی. گەر گۆڕینێکیش لە زمانی ئەدەبیاتی ئەمڕۆمان و ئەو قوتابخانەیەدا ببینین، ئەوە هەر ئەو گۆڕانەیە کە مێژوو و سروشتی پێشکەوتن دروستی کردوە و دەبێ ڕووبدا و سەرچاوەی یەکەمی ئەو پێشکەوتن و بەرەو پێش‌چونەشی لە زمانی ئەدەبیاتی ئەمڕۆمانداهەر ئەو ڕۆشنیو تازەگەری و دینامیکێتییەیە کە لە زمانی ئەدەبیاتی دەوری باباندا هەبوو و دەستی پێ کرد.

ئەو زمانە کوردییە، یا وردتر ئەوە بیژین ئەو دیالێکتە کوردیەی لەسەرەتاوە شیعری "نالی" و "سالم" و "کوردی" پێ نووسرا، تەواو ئەو دیالێکتە نەبوو کە خەڵکی سلێمانی پێی دەپەیڤین. بەڵکو هەر وەک خەڵکی سلیمانی خۆیان تێکەڵ بوون و گەر شێوەی قسە کردنیان تەئسیری چەند دیالێکتی جیاوازی کوردیشی تیا دیار نەبووبێ ئەوا چەند بەشە دیالێکتێ هەر کاری تێکردووە هەروەها ئەم تێکەڵیە لە زمانە ئەدەبیەکەشدا هەر دیار بوو.

هونەرمەندی و وەستایی دامەزرێنەرانی ئەو قوتابخانە ئەدەبییە، توانایەکی وای بەخشی بە ئەدەبەکەیان کە زوو بڵاو ببێتەوە و باش بچێتە دڵەوە و کار بکاتە سەر شاعیرانی ناوچەی تری کوردستان و ئەو دەنگەی لە سلێمانییەوە بەرز بۆوە، دەنگی دایەوە و دەنگ دانەوەکەشی لە یەکەم پلەدا لەناوچەی سۆرانەوە بوو. هەر لەو سەردەمەدا شیعری "حاجی قادری کۆیی" (١٨١٥ – ١٨٩٧) و "ئەختەر" (١٨٣٦- ١٨٨٦) و "کەیفی جوانڕۆیی" لە خاکی سۆرانەوە و "مەجدی" (١٨٤٩-١٩٩٥) لە ئەردەڵانەوە و کۆمەڵێ شاعیری تری ناوچەی سنە و موکریان هەر بەو چەشنەیان نووسیوە کە "نالی" و هاوەڵەکانی نووسیویانە. واتە: پشت بەگەلێک بەڵگەی ئەدەبی دەتوانین بڵێەن ئەو زمانە ئەدەبیەی لە سلێمانیەوە هەڵقوڵی هەر لە سەرەتای دروستبوونیا زمانی ئەدەبی هەر چوار بەشە دیالێکتەکەی کرمانجی خواروو بوون. واتە: سلێمانی و سنە و سۆران و موکریان. ئەوساش و ئێستاش لەئاخافتنی ڕۆژانەیاندا ئەوەندە جیان کە هەریەکێ لەوان ناوبنیەن بەشە «دیالێکت»، بەلام ئەوساش و ئێستاش هەربەیەک زمان و یەک چەشن نووسیویانە (مستەفا رەسووڵ، ١٩٧١: ٣٢-٣٣).

دوکتۆر "عیزەدین مستەفا رەسووڵ" لەمەڕ پێوەندی نێوان شێوەزاری سنە و موکریان دەگەڵ زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی ئاوا ڕای خۆی دەردەبڕێت:

«بۆ ناوچەی سنە و موکریانیش، هەروەک لەوێش هەر لە سەردەمی بابانەوە و پاش کزبوونی شیعری دیالێکتی گۆران هەر لە سەر پەیڕەوەکەی «نالی و سالم و کوردی» شیعر دەستی پێ کرد، هەر لەوکاتەوە تا ئێستاش ئەم پەیڕەوە هەر بەردەوام بووە. ئەوشتانەی لە ناوچەی سنە دەنووسرێن و دەگەنە ئێمە، یا ئەو نووسەرانەی خەڵکی ئەو ناوچەیە کە لەو گۆڤار یا ڕۆژنامانەدا دەنووسن کە لە ئێرانا ڕێگەی پێدەدرێ یا جاروبار کوردی ئێران لە دەرەوەی وڵات دەری دەکەن هەر بەو شێوە یەکگرتووە دەنووسن. ئەم بڕیارە زۆر قووڵتر و فراوانتر بە سەر خەڵکی موکریاندا دێتە ڕێ. چونکە ناوچەی موکریان لە پاڵ ئەوەدا کە مێژووی ئەدەبیاتەکەی ئەم دوو سەدەیەی لەگەڵ ناوچەی سۆران و سلێمانی و سنەدا جیا ناکرێتەوە، ئەوێش وەک سلێمانی ساڵێکی گەشەدار و زێڕین لە مێژووی نیشتمانپەروەری و ڕامیاریدا هەیە کە کارێکی تەواوی کردە سەر بزوتنەوەی ڕۆشنبیری و سەر ئەدەبیات کە تا ئێستا تەئسیری هەر مابێ (مستەفا رەسوول، ۱۹۷۱: ٤۰ و ٤۱).

کەواتە ئەم شێوە نووسینەی ئێستا لە بەشی زۆری کوردستانی عێراق و ئێراندا پێی دەخوێنرێت و دەنووسرێت و زمانی ئەدەبیاتە، شێوە نووسینێکی یەکگرتووی کوردییە کە هەموو خاوەنانی کرمانجی خواروو (سنە، سلێمانی، سۆران و موکریان) و نووسەرانی کوردی «گۆران» و هەندێ نووسەری کوردی لوڕ بە کاری دەهێنن (دیارترین نووسەر لەناو کوردی لوڕی عێراقدا نووسەر "دوکتۆر کامیل حەسەن بەسیر"ە کە نووسینە کوردییەکانی هەر بەم زمانە ئەدەبییە یەکگرتووەیە).

ئێمە ناتوانین بە هیچ جۆرێک بەم شێوە ئەدەبیە بڵەین: شێوەی سلیمانی، چونکە هەر وەک نووسینەکە خۆی، تەنانەت نووسینی شاعیران و نووسەرانی شاری سلێمانیش لەگەڵ قسە کردنی ناوماڵیاندا جیاوازییەکی بچووکی هەر هەیە، هەروەها وردە وردە گەلێک وشەی ئەم بەشە دیالێکت و دیالێکتانەی تری تێکەڵ بوو، هەر وەک هەندێ بنەڕەتی گراماتیکی ئەوانیش جیە خۆی تیایدا دۆزیوەتەوە و هەندێ لە جیاوازییەکانی فۆنەتێکی خەڵکی سلێمانیش لێرەدا جێگەی نەبۆتەوە.

زمانی ئەدەبی یەکگرتوو لێرەدا لە سەرچاوەیەک دەچێ: کە لە سەرەتاکەیدا، واتە لە ژێر زەمیندا، چ لە دیمەن و تام و پێکهاتنیدا هەر ئاوی ڕوونە و بریتییە لە دوو بەش هایدرۆژین و بەشێک ئۆکسیژن بەڵام کەماوەیەک بەژێرزەمیندا دەڕوا زۆر ڕەگەزی تری تێکەڵ دەبێ و تا لووتکەی تێربوون لە ئاوەکەدا دەتوێتەوە و کە بە ڕەگەزی تر گەیشت هەندێ لە تواوەکەی پێشوودا دەنێ و هەندێ شتی تر دەتوێنێتەوە تا لە ئەنجامدا و لەو کاتەدا کە هەڵدەقووڵێ لە ئەنجامی ئەنالیزدا هەر «$H_2O$» دەرناچێ، بەڵکوو شتێکی تر دەردەچێ کە ڕەگەزی یەکەمی ئاوە، هەرچەندە دیمەنی دەرەوە و ڕواڵەتی هەر لە ئاوی سادە یا لە ئاوێکی پەتی ڕوون دەچێ (هەمان سەرچاوە: ٤٤).

بەم چەشنە ئەو زمانە ئەدەبیەی ئێستا بووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان و ئەو کوردانەی بە سێ دیالێکتی کوردی دەدوێن بەو زمانە دەخوێنن و دەنووسن و زمانی نووسینی

**بەشی شەشم- زمان**

ئەدەبیاتیانە، ئەو زمانە لە سەرەتاوە لە شاری سلێمانی دابوو بە زمانی ئەدەبیات و بڵاو بۆوە و هەموو ئەو تێکەڵ بوون و تواندنەوە و ڕۆچوونەی بەسەردا هاتووە کە بەسەر زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەمووگەلاندا دێت، تا دەبێتە زمانی ئەدەبیی هەموو نەتەوەکە. ئەم زمانە لەگەڵ شێوەی قسە کردنی شاری سلێمانی جیایی هەیە، هەرچەند ڕواڵەتەکەی هەر شێوەی ئەو شارەی پێوە دیارە.

بەڵام ئایا ئەم زمانە ئەدەبیە یەکگرتووە، بووە بە زمانی یەکگرتووی هەموو نەتەوەی کورد؟ گەر نەبووە دەبێ بپرسین: ئایا نەتەوەی کورد ئەمرۆ دوو زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەیە یا یەک؟ ئایا زمانی ئەدەبی یەکگرتووی کوردی کردن بە دوو، لەگەڵ ڕێڕەوی مێژووی نەتەوەی کورد دەگونجی یانا؟

ئایا پەیدا کردنی دووزمانی ئەدەبیی لەگەڵ پێداویستیەکانی ئەمرۆی مێژووی نەتەوەی کورد دەگونجی یا نا؟ ئەو زمانە ئەدەبیە یەکگرتووەی ئێستا ئایا لە قاڵبی ئێستایدا لیە دێ و دەتوانێ ببێ بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو نەتەوە؟ وە چۆن دەتوانین ئەو ڕێبازە بدۆزینەوە کە مێژوو بۆ دروستبوونی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو نەتەوەی داناوە و چۆن ئەمەی ئێستا وا لێ دەکرێ کە ببێ بە بنکەی پەیدابوونی ئەو زمانە؟

وەک وتمان ئەم زمانە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی ئەوانەن کە بە هەموو بەشەکانی کرمانجی خواروو دەدوێن و ئەوانەی بە دیالێکتی گۆران دەدوێن و تاڕادەیەکیش ئەوانەش کە بە لوڕی دەدوێن. بەڵام ئەم شێوە نووسینە ئەدەبیە هێشتا نەبووە بە شێوەی نووسینی ئەوانەی کە بە کرمانجی ژووروو دەدوێن، کە ئەمان لە ڕووی ژمارەوە بەشی زۆرتری کوردن. هەرچەندە هەندێ شاعیر و نووسەری ناوداری ئەوتۆشمان هەیە کە شێوەی ئاخافتنی ماڵەوەیان یەکێکە لە بەشەکانی کرمانجی ژووروو بەڵام نووسینیان هەر بەم زمانەیە کە لای ئێمە بووە بە زمانی نووسین و خوێندن و ئەدەبیات.

کە واتە ئەو زمانە نەبووە بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی هەموو نەتەوەی کورد. بەڵام هەروەک نەبووە بەو زمانە یەکگرتووە، هەروەها ناتوانین بڵەین ئێستا کورد دوو زمانی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەیە. چونکە هەر لەو کاتەدا کە ئەم زمانە لە دەوری بابانەوە تا ئێستا زمانی ئەدەبیی ناوچەیەکی گەورەی کوردستانە و لەساڵی (١٩٢٢) دا تا ئێستا زمانی خوێندن و نووسینی بەشی زۆری ئەو ناوچەیە، هەر لەو کاتەدا شێوە زمانێکی تر نابینین کە لە دەوری بابانەوە تا ئێستا بەو شێوە فراوانە و بەو بەردەوامیە زمانی ئەدەبیات بێت و لە هیچ شوێنێکی تری کوردستاندا بە کوردی خوێندن نییە و زمانی کوردی بە ڕەسمی نەناسراوە تا شێوەیەکی تری لەمە بەدەر ببێتە زمانی یەکگرتوو با لە ناوچەیەکی تەسکیشدا بێت.

کە واتە پاش ئەوەی گەیشتینە ئەو ئەنجامەی کە دەبێ زمانی ئەدەبیی کوردی یەک بێت نەک دوان، دەبێ بپرسین ئەو زمانە ئەدەبیە یەکگرتووە کامەیە و دەبێ چۆن بێت؟

هەندێ لەوانەی هەوڵی ئەوەیانە کوردی بکەن بە دوو زمان و خۆیان بە کردەوە ئەو ڕێگەیەیان گرتووە، بە ناوی ئەوەوە کە کرمانجی ژووروو زمانی ئاخافتنی بەشی زۆری کوردە لایان وایە کە دەبێ هەموو کورد کرمانجی ژووروو بکەن بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی خۆیان.

ئەم ڕایە – بەلای ئێمەوە- نە ڕاستە و نە دێتەدی، چونکە گەر ئەو بنەما دێمۆکراتییەی باسی لە سەر شۆڕ کردنی بەشی کەم بۆ بەشی زۆر دەکا لە مەیدانی زماندا راستیش بێت، ئەوا لێرەدا پێچەوانە دەبێتەوەو ئەو ئەنجامە ناگەیەنێ کە ئەوان دەیانەوێ. هەرچەندە مەسەلەی زمان و بڵاوبوونەوەی و داچەسپاندنی زمانی ئەدەبیی یەکگرتووکاری مێژووە و ئەو شتی ڕاست دەچەسپێنێ و هەوڵی ناڕاست ناهێڵێ، بەڵام گەر بڕیاردان بۆ ئێرە ڕاستیش بێ و هەر لە سەر ئەو پەیڕەوە دێمۆکراتیەە بڕیاریشمان دا کە کرمانجی ببێ بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتوو ئەوا مەیدانی هێنانە دیی بڕیارەکەمان بۆ ئێستاو- وا دیارە تا ماوەیەکیش -هەر کوردستانی عێراق دەبێ چونکە توانایەکی وامان نییە کە لە شوێنی تردا بڕیارەکەمان بەجێ بهێنین کە واتە مەسەلەی زۆرو کەمەکە بۆ کوردستانی عێراق پێچەوانە دەبێتەوە: ئەوەی بە کرمانجی ژووروو دەدوێن بەشی کەمن و ئەوەی بە دیالێکتی تر دەدوێن و زمانێکی ئەدەبیی یەکگرتوویان هەیە بەشی زۆرن.

**ئەنجام:**

زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی نەتەوە، مێژوو دروستی دەکا و ئارەزووی تاقەکەس و دەستەیەک ڕۆڵی کاریگەریان لەبەرەوپێش چوونی مێژوودا نییە، بەڵام تاقەکەس دەتوانێ ڕێڕەوەی ڕاستەقینەی مێژوو بەدی بکا و لەگەڵی بڕوات و پاڵ بەخێرا ڕۆیشتینەوە بنێت و نەبێتە کۆسپ لە ڕێگەیدا و نەبێتە هۆی دواخستنی ئەو پێشەوە چوونەی.

لەم جۆرە هەڵوێست و تێگەیشتن و تەجروبەیە لامان وایە کە نەتەوەی کورد زوو یا دەرنگ زمانی ئەدەبیی یەکگرتووی خۆی دروست دەکا، کە دەبێ بە زمانی ڕەسمیی خوێندن و نووسین و ئەدەبیاتی هەموو کورد. کە ئەم زمانە هیچ یەکێ لەم شێوانەی ئێستا نییە، هەرچەند دیمەن و تەئسیری شێوەیەکیان لەو زمانەدا زیاتر دیار دەبێ.

کە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووش پێکهات مانای وانییە کە شێوەی ئاخافتنیش دەبێتە یەک. بەڵکوو کوردی هەر لایە وەک خۆی دەدوێ، بەڵام هەموو کورد وەک یەک دەنووسن.

هەر چەندە شێوەیەک دیمەنی لەوانی تر زیاتر بە زمانی ئەدەبیی یەکگرتووە وە دیار دەبێ، بەڵام ئەو زمانە زۆر ڕەگەزی تێکەڵی شێوەکانی ئێستای تیا دەبێ. واتە لەهەر شێوەیەک شتێک خۆی لەو زمانەدا دەچەسپێنێ. لەبەر ئەوەش کە زمانەکانی جیهان بەرەو ئەوە دەڕۆن کە خۆیان لە ئاڵۆزی و سەختی ڕزگار بکەن، لەبەر ئەوە دەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین کە پەیڕەوە ئاسانەکانی گراماتیک، ئیتر گەر گشتی بن یا لەیەک دیالێکت دابن خۆیان لە زمانی ئەدەبیدا دەچەسپێنن. لە ڕووی فۆنەتیکیشەوە زیاتر ئەوشتانە لە زمانی ئەدەبیدا جێگیر دەبن کە لە هەموو دیالێکتەکاندا یەکن، یا لە زۆرەبەیاندا لەیەک دەچن.

**بەشی شەشم- زمان**


**سەرچاوە کوردییەکان:**

١- دەستەی نووسەران (١٣٨١) **زمانەوان، تایبەتنامەی یەکەمین کونگرەی زانستی- فێرکاریی زمانی کوردی لە ئێراندا،** ژمارە ٢، تاران، ئەنستیتۆ فەرهەنگی کوردستان.

٢- زەبیحی، عەبدوڕەحمان (١٣٦٧) **قامووسی زبانی کوردی،** ورمێ ، ناوەندی بڵاو کردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبیاتی کوردی.

٣- کەریمی، عەلی (٢٠٠٥) **ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمانی زەبیحی،** سلێمانی، چاپی دووەم، لە چاپکراوەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاو کردنەوە لە وەزارەتی ڕۆشنبیری.

٤- محەمەد عەزیز، حوسێن (١٩٩٩) **سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی،** سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٥- مستەفا ڕەسووڵ، عیزەدین (١٩٧١) **زمانیئەدەبییەکگرتووی کوردی،** بەغدا،چاپخانەی سلمان‌الاعظمی.

٦- مەحویی، محەمەد (٢٠٠١) **زمان و زانستی زمان، سەرەتایەک بۆ زانستی زمان،** سلێمانی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم.

٧- نەبەز، جەمال (١٩٧٦) **زمانییەکگرتووی کوردی،** بامبیرگ، یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا.

سەرچاوە فارسییەکان:

١- ترادگیل، پیتر (١٣٧٦) **زبان شناسی اجتماعی، درامدی بر زبان و جامعه،** ترجمەی دکتر محمّد طباطبایی، تهران، نشر اگه.

٢- ژان کالوه، لویی (١٣٧٩) **درامدی بر زبان‌شناسی اجتماعی،** ترجمەی محمّد جعفر پوینده، تهران، انتشارات نقش‌جهان.

٣- مدرسی، یحیی (١٣٦٨) **درامدی بر جامعه‌شناسی زبان،** تهران، موسسەی مطالعات و تحقیقات فرهنگی.

٤- همایون، همادخت (١٣٧٩) **واژەنامەی زبان‌شناسی و علوم وابسته،** چاپ سوم، تهران، پژوهشگاه علوم انسانی و مطالعات فرهنگی.

سەرچاوە ئینگلیسییەکان:

1- Hassanpour, Amir, (1992), *Nationalism and language in Kurdistan , 1918-1985*, Sanfrancisco: Mellen Research University Press.

2- Karadaghi, Rashid, (2009), *The Azadi English- Kurdish dictionary*, Ehsan Publishing House, Tehran.

3- Ray, P-1963**.** *Language Standardizaion*. The Hague: Mouton.

4- Wardhaugh, Ronald, (1990), *An Introduction to Sociolinguistics*, Basil Blackwell, Cambridge.

گۆڤارەکان:

١- **گۆڤاری مەهاباد،** (١٣٨٧) ژمارە ٨٦ ، بانەمەڕ.

٢- **گۆڤاری مەهاباد،** (١٣٨٧) ژمارە ٩٠ – ٨٩ ، گەلاوێژ و خەرمانان.

## ڕەمزیماننەوەیی و جوانخاسیی زمان و شیعری کوردی هۆرامی

عادڵ محەمەدپوور [*]

**کورتە:**

بۆ پێناسە و پۆلێنبەندی قۆناغەکانی مێژووی شیعر و ئەدەبی‌کوردی و دەرخستنی خەسارەکان و کێشەکان بۆشایی هەیە. بۆ درمناسی هۆکارەکانی مێژووی ئەدەبی‌کوردی، ڕەوتێکی سیستماتیکی نویساری بۆ کورد ساخ نەبۆتەوە. پێکهاتە و سەرهەڵدانی دیالێکتەکان بەرچاو نەگیراوە؛ کەچی هیچ لەهجەیەک لە لەهجەیەکی تر باشتر نییە. ستاندارد بوون پێوەندی بە باروودۆخی غەیری زمانی (واتە ئابووری، کۆمەڵایەتی سیاسی و ...) هەیە. دیمەنی گوڵزاری شیعری کوردی بە تەواوی گوڵەکانییەوە، جوانە؛ هەمووممان پێکەوە جوانخاسین. ڕووناهی خستنەسەر کەمپی شێوەزمانەکان بۆ بڕینی هەوراز و گەیشتن بە دوندی زمانی ستانداردی کوردی، تیشکاوێژێک بۆ ڕووناک بەخشی دۆزی ڕەوای زمانی ستانداردی کوردی. زمان و شیعری کوردی هۆرامی، پرۆسەیەکی زیندوو و نقیسارییە؛ بنەمایەکە بۆ مێژووی شیعری کوردی. پێش ئیسلام لە «گاساکان»ی ئاڤێستاوە تاکوو ئەمڕۆ لە برەو و بەردەوامی و ڕسکاندا بووە. دەرخستنی یەکەی توخمەکانی ئەم شیعرە لە «گاساکان» و «درەختی ئاسووریک»، «قەواڵەکانی هورامان»، «ماتیکان گجستک ابالیش» و هەندێ بەڵگەی تر. پاش ئیسلام دەقەکان بە شێوەی کونکرێت دیارن. بە تایبەتمەندی زمانی ئەدەبی-فیکری هەر قۆناغێک و لووتکە بوونی شاعیری خاوەن شێواز و بەراوردکاری نیشانە ئەدەبی زمانی-فیکرییەکانی ئەو شاعێر یان شاعێرانە کە کۆکن لە گەڵ باری ئەو دەمەی کە تێیدا ژیاون، بەم بۆنەوە لەم نووسراوەدا، شیعری هۆرامی بە حەوت قۆناغ دەست نیشان دەکرێت.

کرکە دەنگ یا زڕە دەنگ (زنگ صوت)، توخمێکی جەوهەری بۆ جیاوازی ڕیتمی شیعری هۆرامی لە گەڵ فارسی و شیعری کلاسیکی سۆرانی و... . ئەم توخمە بوو بە هۆی ئەوە کە شیعری هۆرامی نەکەوێتە ژێر کاردانەوەی عەرووزی عەرەبی. گەرووی سیاوچەمانبێژی هۆرامی بەڵگەیەکە بۆ چەسپاندنی جیاوازی کرکە دەنگەکان و لەحنی شیعر. زڕەدەنگ لە دو دیاردەی «سیستەمی بڕگە لە شیعر و گەڕووی سیاوچەمانەبێژ» لە

---

[*] ماستەری زمان‌وئەدەبیاتی فارسی و بەرپرس و ئەندامی شۆرای نووسەرانی وەرزنامەی زرێبار.

**بەشی شەشم- زمان**

هۆرامیدا، دوو تایبەتمەندی و دوو خاڵی سەرەکین بۆ فاکتیزە کردنی ڕەسەنایەتی و حال و هەوای تازە لە شیعر و مۆسیقای هۆرامیدا. «کرکە، زڕەدەنگ» لە گۆرانی هۆرامیدا، مەجازە بۆ بینخواردنەوە و دەنگخۆشی، ئەم ڕێسایە تەنیا پەیوەندی بە گۆرانی و ڕیتمی شیعرەوە نییە، لە ناو جەرگەی زمانیشدا حزووری هەیە. «کرکەدەنگ» چییە و چە ڕۆڵیکی بووە لە پێکهاتەی زمان و شیعری هۆرامیدا؟

زمانی فارسی و کوردی هۆرامی- بە تێکڕا زمانی کوردی- یەک بنەماڵەن (ئارياييەکان). عەرەبی لە گەڵ ئەم کۆما زمانیانەدا پێوەندییەکی ڕەچەڵەکی و تەبارناسانەی نییە. زمانی فارسی کەوتە ژێر کاریگەری توخمەکانی ئەم زمانەوە. زمانەوانەکان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا پەییان بەم توخمە برد. ئێلێکساندر خۆدزکۆ (A . chodz ko)، چارل زالێمەن (carl salemann)، ژێکۆفسکی (V. zhukovski)، بێنوێنیست (Benveniste)، ئانتوان مییە، رۆبێرتۆ گوتیۆ، بوون بە پەرەپێدەری بۆچوونەکانی ئەو ڕەوتە زمانییە.

جیاوازی زمانەکان بە تایبەت لە کێشانەی شیعردا، دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی چەشنی کێشاندنی بزوێنەکان لەم زمانانەدا. جیاکەرەوەی ئەم دۆخە، توخمێکە بەناو زەنگ لە پێکهاتەی دەنگەکاندا. لێدانی «زڕەدەنگ»ی زمانی کوردییهۆرامی لە لەحندا جیاوازە. جیاوازی زڕەدەنگ تەنیا یەکێکە لە جیاوازییەکان. لە هۆرامیدا جیاوازی هەر بزوێنێک بە نیسبەتی بزوێنێکی تر (کورت و درێژ) و هەر بڕگەیە لە بەرامبەر بڕگەیەکی تر لە کێشانەی دەنگدا، نایێتە هەست پێکرن. بۆ نموونە چامەیەک هۆرامی بە هەر دوو ئوسلووبی لەحنی بڕگە (تەکیە ) و ڕێسای عەرووزی و بەراوردکاری لە گەڵ فارسی و کوردییسۆرانیدا کێشانە دەکرێ و جیاوازییەکان دەخرێتە ڕوو.

**وشە سەرەکییەکان:** مانەوەیی، جوانخاسیی، زمان و شیعری کوردییهۆرامی، خەسار، دەق، کەمپی زاراوەکان، بەستێنە و سەرهەڵدان، قۆناغەکان، هورمزگان، یارسان، ئورامەن، قۆناغی داهێنان، فرەچەشنی پێکهاتە، ڕیتم و ئینسێجام، نوێخوازی و شیعری هورامی، کرکە (Kirke، intensite و تەکیە/ accent)، ڕەسەنایەتی، جەوهەری شیعری کوردییهۆرامی، ئوسلوبی بڕگە، کرکەدەنگ یا زڕەدەنگ (زنگ صوت).

## وەرایی:

### هەڵوێستەیەک و خەسارێک:

من دەقێکی مێژوویی-ئەدەبی ئاوا شک نابەم کە بە شێوەی شێوازناسانە و ڕەچەڵەکناسانە ئاوڕی لە شیعری کلاسیکی کوردی دابێتەوە و توانیبێتی تیشکۆی پێکهاتەی قۆناغەکانی مێژووی شیعر و ئەدەبی کوردی پۆلێنبەندی کردبێت. ئەو دەقانەی کە هەن، پچڕپچڕن و یا تەنیا ئێهتمامیان بە مێژووی ئەدەب و بیۆگرافی شاعیرانەوە بووە. ئەمە کەلێنێکی گەورە و خەسارێکی مەزنە بۆ مێژووی ئەدەبی کوردی. ئەڵبەت بێبەش بووگین لە ڕەخنەڤانێکی توکمە و شێوازناسێکی کارامە کە بتوانێ بە شێوەی ڕەوشمەند و ئاکادمی، قۆناغەکان، کەشف و پێناسە و شێوەی ڕسکانی فورم و ناوەرۆکی ئەم بزاڤە درمناسی بکات. شێوەی سوننەتی هاوردەی مەعریفی ئێمە تەنیا ئیهتیمام بە ڕەهەندی دەرەکی ئەدەبەوە بووگە؛ واتە چەقداکوتان و سمڕ لە سەر ناسنامە و بیۆگرافی کەسایەتی شاعێر و دانەر. لایەنی دەروونی دەقەکان و هۆکاری ڕسکانی قۆناغەکان، لە سەر مێتۆدی زمانەوانی-شێوازناسی، بڕشتکاری و پۆلێنبەندی نەکراوە. ئاساییە کە سیمای ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی لەم فەزا سامناک و تاکدەنگەدا، لێڵ وناديار بنوێنێ. ڕاستییەکان هەمیشە لە دەمی کەسایەتییە نوخبە پیرۆزکراوەکان بیستراون. لە ڕەوڕەوەی مێژوودا هەمیشە بە شوێنی بتی کەڵە نووسەر و کەسێتی تاکی شاعێرە گەورەکانا هەڵەتە بووین و تەنیا بیۆگرافی و ئەتۆبیۆگرافی ساڵ و مانگ و ڕۆژی ژیانی ئەوان بەلامانەوە گرنگ بووە، نەک خوێندنەوەو دۆزینەوە و پێناسەی هۆکارەکانی لە دایکبوونی دەقەکە و پرەنسیپی لایەنە دەروونییەکانی. «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانی، بە شێوەی زانستی و هێرمنۆتیکیانە شیکاری نەکراوە تا لایەنە دراما، دەروونی، تەغەزولی و حەماسیانەی ئەم دەقە دەرکەوێ و لە گەڵ نموونە بیانییەکان بە چاوی ڕەخنە تاوتوێ بکرێ. تەنیا وەک دەقێکی ئەدەبی و تا ڕادەیەک بۆ مەبەستی سیاسی و ئیدئۆلۆژیکی و حیزبی، ئەویش لە کاتی هەستیاردا، ناوی لێدەبرێت. ئەم ڕووکردە سوننەتیە و ناسەردەمیانە، هیچ کە سوودبەخش نەبووگە، کەرتبوونی کەسێتییەکان و چەواشەکاری ڕەوتەکەی بە دوودا هێناوە. کەچی لە ڕووکردی سەردەمیانە و ئێستاییدا، تەنیا «دەق»ەکانن کە دێنە گۆ و دەبنە تاکە ژێدەر و سەرچاوەیەک بۆ تۆێژکاری و ڕاڤەی ئەدەبی و هەلاوێردی ڕاستیەکان. دەبێ «دەق» بخوێنرێنەوە تا هەوێنە شارراوەکانیان کەشف بکرێت، ئەمە تاکە ڕێگایە بۆ بەرگری لە فەوتان و قەلاچۆکردنیان. خوێندنەوەی لۆژیکی و ڕەخنەئامێز و وردەکارییەکانی دەق کارێکی شاز و شاق و ماندووکەرە، بۆیە زۆربەمان بەسووک و ئاسان لێیتێدەپەڕین. هیچ کە ڕەخنەی ئەدەبی و خوێندنەوەی دەق بە شێوەی هێرمنۆتیکیمان نەبووە، هاوردە سوننەتییەکەش، ڕوو لە کزی و لاوازیی ناوە، هەر لە دەسپێکەوە تا وەکوو ئێستا، لەوا کە هۆکارەکان درمناسی نەکراوە، ڕەوتێکی سیستماتیکی نویساری بۆ کورد ساخ نەبۆتەوە، پێکهاتە و سەرهەڵدانی دیالێکتەکان بەرچاونەگیراوە و وامانزانیوە و وایش ئەزانین ژێدەری زمانی ستاندارد تەنیا یەک دیالێکتە و بەس. کەچی «لە ڕوانگەی زمان ناسییەوە، هیچ لەهجەیەک لە لەهجەیەکی تر باشتر نییە. هەر لەهجەیەک دەتوانێ ببێتە زمانی ستاندارد. ستاندارد بوون پێوەندی بە باروودۆخی غەیری-زمانی (واتە ئابووری، کۆمەلایەتی سیاسی و...) هەیە. نووسین و ئەدەبیات لە پێشدا بە هۆرامی و کرمانجی دەستی پێکردوە. سۆرانی زۆر درەنگتر، نزیکەی سێ سەدە دوایی، بۆ نووسین دەکارهاتوە، بەلام لە باروودۆخی دوای شەڕی جیهانی یەکەم، هەلی بۆ ڕەخسا کە ستاندارد

بکرێ...» (حەسەن پوور، ٢٠٠٨). خۆ پیرۆزکردن و سڕینەوەی ئەوی تر، بۆشاییەکی مەزنی بۆ ئێمە فەراهەم کردوە و ئاکامی ئەوە بووە لە ئاستی سەرهەڵدان و پێکهاتەی مێژووی ئەدەبەکەماندا، مێژوویەکی پچڕپچڕ و ئاڵۆسکاو و تەماوی و نادیارمان ببێت. گەر بێتو مەودایەک بۆ نەوەکانی داهاتوو بڕەخسێ! و پێویستیان بە خوێندنەوەی مێژووی زمان و ئەدەب و شیعر بێت، قوتابییەکان و خوێندکارەکان لە قوتابخانە و زانکۆکاندا، لە کوێوە دەست پێبکەن؟ بە کامە دەق و وانەوە، دەسپێکی مێژووی زمان و شیعری کوردییەوە، بخوێنێتەوە و یەکەی وانەکان تێپەڕێنن؟ ئەمە پەتای فەرهەنگی و چییەتی مێژووی سەردەمیانەی ئێمەیە کە خەریکە لە گۆمان ئەخات. ئەم خەسارە بە گشتی سیمای مێژووی ئەدەب و ئەدگاری شێوازناسی شیعری کلاسیک و زمانەوانی کوردی تەنیوەتەوە تا بگاتە ئەدەبی ئاوانگارد و پێشڕەو و سەردەمیانەمان. دادوەرانەش نییە، تەنیا لە یەک لایەنێ پرسەکە بڕوانین و هۆکاریی هەموو خەسارەکان بخەینە ئەستۆی خۆمان. بێگومان بەشێک هەرە زۆری ئەم خەسارە دەگەڕێتەوە بۆ بندەستی و نەبوونی دەسەڵاتی سامان و ئامرازی گەشەپێدانی فێرکاری کە بە ڕاستی کاردنەوەی نەرێنی بۆ ئێمە ڕەخساندووە. ئەمە لە ڕەوتی مێژوودا، بوەتە ئاراستەیەک کە نەتوانین توێژکار، ڕەخنەڤان و مامۆستای زوبدە پەروەردە بکەین. بۆ خزمەت بە ئەدەب و فەرهەنگی نەتەوایەتی، ئەگەریش بە ڕواڵەت کەسانی وا هەبێتن، لە ناخدا ڕا نەهاتون بۆ ئەدەبی نەتەوایەتی گەلەکەی خۆی بەڵکوو درووستکراون بۆ خزمەت بە زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی زاڵ. قەیرانی زمان و شەمزاندنی فەرهەنگی لەم بوارەوە دەست پێدەکات. سەرەڕای ئەم کەلێنە گەورە، نابێت لە ئەرکە هەنووکەیی و بزرەکانی خۆمان چاو بنووقێنین. دیمەنی گوڵزاری شیعری کوردی بە تەواو گوڵەکانییەوە جوان و ڕازاوەیە، هەموومان پێکەوە جوانخاسین. چارە نییە جگە لەوەی ڕووناهی بخەینە سەر ڕێگای کەمپی شێوەزمانەکان بۆ بڕینی هەوراز و گەیشتن بە دوندی زمانی ستانداردی کوردی. بە هیوام ئەم وتارە، تیشکاوێژێک بێ بۆ ڕووناک بەخشی ئەم دۆزە ڕەوایە. پێموایە ئەم نووسراوە، وەک هەر بابەتێکی تر، بێگرێ و گۆڵ نییە، بەڵام چاوی لۆژیکی ڕەخنەی زانستی -بێدەمارگرژی- دەتوانێ بۆشاییەکان پیشان بدات و بەرەو ئاسۆی ڕووناکی هەڵمان زنێ.

### بەستێنە و سەرهەڵدانی ڕەوتی شیعری هۆرامی:

لە فرە شوێندا، باسم لە سەر زمان و هەر وەهاش خانەبەندی شیعری کوردییهۆرامی کردووە و پەیلواکانم (بۆچوونەکانم) بە وتار یان وتووێژ لە گۆڤارەکاندا بڵاوکراوەتەوە. پێموابووە و ئێستاش وام لە سەر ئەو پەیلوایە کە زمان و شیعری کوردیهۆرامی وەک پرۆسەیەکی زیندوو و نڤیساری هەر لە «گاساکان»ی ئاڤێستاوە تاکوو ئەمرۆ لە برەو و بەردەوامی و ڕسکاندا بووە (محەممەدپوور، ١٣٨٧). ئەگەرچی لە بەڵگەکانی پێش ئیسلام، دەقی کونکرێتی ئاوامان نییە کە بتوانی پیشاندەری ڕەوتی شیعری کوردی هۆرامی بێ، ناچارین جێ پێی زمان و ئەدەبەکەمان، یەکەی توخمەکانی ئەم زمان و شیعرە لە «گاساکان»[١] و «درەختی ئاسووریک»[١]،

[١] - «سروودی گاسەکان (گازە) سروودگەلێکی ئاهەنگدارن، لە سەر فۆرماسیۆن و پێکهاتەی شێعری هێجـایین، لـە واقیعـدا دەبنە کۆنترین و ڕەسەنترین پاژێک لە یەسنای ئەوێستا، بـەر لـە نووسـینەوەیان و گلاڵـەبوونیان لـە ئەوێسـتادا، لـە لایـەن گۆرانیبێژان و سترانچڕانەوە «گوسان» ەکان، وتراونەتەوە و دەماودەم و سینگ بـە سـینگ گەیشـتوونەتە نـەوەی دواڕۆژ تـا

«قەواڵەکانی هورامان»[٢]، «ماتیکان گجستک ابالیش» [٣] و هەندێ بەڵگەی تر... بە شێوەی تاک و جەوهەری کەشف و پێناسە بکەین. نموودەکان لەم دەقانەدا، ئەوانەی شیعرن «بڕگەیی»بوونی سیستەمی مۆسیقای شیعری و هەندێکی زۆر و زەبەن، توخمی زمانی دەبینرێ[٤] کە ئێستاش لێدانی ئەم فێرێکانسانە (کرکە) لە بزاڤێتی (سەیروورەت) ڕەوتی شیعری هەزار و چوار سەدساڵە و ئاخافتنی زارەکی جەماوەری هۆراماندا، بەرفراوان پێڕەو دەکرێن، بێ ئەوەی شارەزایانی زمان و ئەدەب، تا ئێستە ئاماژەیان بەم فاکتە زمانییە کردبێ، یان لانیکەم بیانکردبا بە سووژەی لێتۆژینەوە. بە پەیلوای من بمانەوێ قۆناغەکانی زمان و ڕەوتی شیعری هۆرامی بە شێوەی ڕەچەڵەکناسانە و شێوازناسانە، خانەبەندی بکەین، دەبێ بیکەین بە دوو کەرتی پێش

---

دەگاتە ئەم نەوەیە کە ئیستایش لەسەر زاران گۆدەکرێن». (جامی:٥٨ ) بەلام ناوونیشان و شمەکێکیتریان بۆ دیاری کراوە و بە «هۆرە» و «سیاوچەمانە» و «لاوژە» و «لاوک» و... نێوزەدکراون و ئێستایش لە قامووسدا پارێزەری هەمان واتا و هەمان پەیامی کۆنن.

[١] - درەختی ئاسووریک، یەکێکە لە بەرهەمەکانی زوانی پەهلەوی ناڤین چاخی ئەشکانی، کە لـە ناوەڕۆکـدا هەڤپەیڤـینێکە نێوان دارخورما: (هێمای ئاسووری) و بزن:(هێمای بێپەروایی ئایینی زەرتەشت) بە شێعری هێجـایی (دوازدە هیجـایی) لـە شاعێرێکی نەناسراو، ئەم دەقە پێکهاتوە لە ١٢١ بەیت شـێعر (٨٠٠ واژە)، تـەنیا دەقێکـی پەهلـەوی بـاکوورە کـە لـە گـەڵ پەهلەوی باشوور جیاوازی زۆری هەیە. (جامی:٥٨). زوانی پالەوی ئەشکانی، تایبەتە بە ئازەربایجان، خوراسـان، کوردسـتان، ئەسفەهان و ئەرمەنستان. (بهار ،١٣٤٧ : ١٠٨). لەم دەقەدا هەندێکی زۆر و زەبەن واژە و دەستەواژەی هۆرامی دەبینرێ بۆ نموونە: ئەز (من، ئەم واژە لە شاعێرانی گۆراندا نموونەی زۆرە بە تایبەت شێعرەکۆنەکانی سەیدی هـۆرامی:« ئـەز ئورۆمـۆن مەکانم بێ ولاتم/سەرو پیری خوای گێرەن خەلاتم». وەرگ:(وەڵک، برگ)، ورازیدن:(لە چاوگی هۆرامی وراستەی، دوورین)، وینا:(چاوگی وینای، دیتن)، هیزم:(هێزمێ)، بەشن:(بەژن و بالا)، بر:(بەر)، بروگ:(بروێ، برۆ، ئـەبرۆ)، زرە:(زەریـا، دەریـا)، پێل:(فێڵ، فیل)، گیس:(گیز، مو)، سەرد:(سارد)، انم:(ئانە منم) ، ژیوای:(ژیـان)، وراز:(بـەراز، گـوراز)، یـەو :(یـەوێ، جـۆ)، گیواو:(گیواو، گیا)، کرند:(کەرا، دروست دەکەن) هەڵەگ سەخوەن:(هەڵەگ هەمان هەڵەی کوردیی‌هۆرامییـە، "سـەخوەن" یانێ:سوخەن و قسە، ئەم لێکدراوە یانێ: قسەی هەڵە و بێ کەڵک) ... (صفریان،١٣٨٨ :٤٦٤)

[٢] - تەمەنی قەواڵەکانی هۆرامان کە بۆ ساڵەکانی (٨٨ و ٢٢ و ٢١ی پ.ز) دەگەڕێتەوە، لە چاخی «فەراتیش» یان فـەرهادی چوارەم، کە سێدانە پێست بوون، ساڵی ١٩٠٥ز دوزراونەتەوە لە "تەنگیبەر"ی ژاوەرۆ، لە لایـەن "دوکتـۆر سـەعید خـان"ەوە گەییونەتە دەست پرۆفیسۆر «ئیلیس منس E. H. Mins و کاولی A. Couley. ئەم قەوالانە، لە بارەی کڕین و فرۆشتن و مامەڵەوە بووە، کە هەم ناوی کڕیار و هەم ناوی فرۆشەر و ناوی شاهیدان، نووسراوەتەوە. ئەم قەوالانە، بە پێی وتەی «د. پ. خانلەری، محەمەد ئەمین هۆرامانی و دوکتۆر جەمال ڕەشید»، بـە دوو زمـانی «یۆنـانی و پەهلـەوی» وەرگرتـە لـە ئـارامی (هۆزوارێش) لە سەدە (هەوەڵی پ.ز) نووسراون(خانلری،١٣٦٦ : ٢٤٢)، کە هەنـدێ واژە و دەسـتەواژەی هـۆرامی ئێسـتای تێدایە: وەکوو: «مەی وان، زەرین، زەر = بوون، رەزەوان، هەمە) ، ئیک، یەک، چش، چارە». (ڕەشید،١٩٨٨ :٣٣١)

[٣]- «ماتیکان گجستک ابالیش» دەقێکە بە جێماو لە فارسی میانە(پەهلەوی ناڤین) کە لە ساڵەکانی سەدەی سێهەمی کۆچی مانگی نووسراوە. لە ناواخنی ئەم دەقەدا، هەندێ واژە و دەستەواژەی هۆرامی تێدایە، ئەمانەش توخمەکانن:

« ( مردی: Marte )، (روز، رۆ: Roĉ )، (دانایان: Danakan )، (پەی، برای :Pat )، (جێناو او :Ush ) ، (بە مانای ان‌ها، ئادَیشا :Ashmah ،Ushan ،Oyshn)، (سـوزندە، سـۆچنای :Soĉaih )، (ئاسـنگەر: Asenkar )، (هێزمـێ :Ezm )، (واراستەی، دوختن:Viray )، (خودا، خدا: Xva )، (گمێز، پیپشاب :Gomez )، (ویر، یادَ، فکر، حافزە :Vir )، (کاروارەی وجارای یانێ: جبران‌کردن و ترمیم‌خرابی: Viĉaram )، (نما، نوێژ، نمـاز :Namaĉ ) (وەش، خـوب: Vaš )، (روشـن: Rošn) (صفریان: ٢٧٥) و (میرزای نازر ابراهیم، ماتیکان گجستک ابالیش)

[٤] - بروانە: (پەراویزی ١، ٢ و ٣ ئەم لاپەرە)

ئیسلام و دوای ئیسلام. پێش ئیسلام تەنیا ئەو توخمانە کە ئاماژەیان پێدرا، فاکت و ژێدەرن بۆ سەرچاوە. بەڵام پاش ئیسلام لەوا کە دەقەکان بە شێوەی کونکرێت دیارن بە پێی توانستی زانیاری، نووسەری ئەم دێڕانە هەوڵیداوە بە پشتبەستن بە ڕەوتی زەمەن و تایبەتمەندی زمانی- ئەدەبی- فیکری هەر قۆناغێک و لووتکە بوونی شاعیری خاوەن شێواز و بەراوردکاری نیشانە ئەدەبی- زمانی - فیکرییەکانی ئەو شاعێر یان شاعێرانە کە کۆکن لە گەڵ باری ئەو دەمەی کە تێیدا ژیاون، شیعری هۆرامی بە حەوت قۆناغ نیشانکرد بکات.

لێرەدا مەودای ئەوە نییە بەرفراوان لە بەراوردکاری تایبەتنمەندییەکان، باس بکەم، تەنیا بە کورتی ئاماژە دەدەمە قۆناغەکان:

١- قۆناغی «سەرهەڵدان» بۆ پاراستنی توخمی ڕەسەنی نەغمە (کرکە)ی شیعری نقیساری (دەهەکانی سەدەی هەوەڵی ک.م). بەڵگە بۆ ئەم سەردەمە، تێکستی شیعری «هورمزگان» [1] و شیعرەکانی پیرشالیارە

[1]- بە وتەی « محەمەد تەقی بەهار» دەقێکی چەنبەیتی دە برگەیی، لە نزیکی شاری سلێمانی کوردستانی باشوور، دۆزراوەتەوە. لە لایەن "دوکتۆر سەعیدی کوردستانی"یەوە، گەییوەتە دەست ئەو و پاشان بۆ توێژینەوەی زوانەوانی گەیشتووەتە ئورووپا. مامۆستا "ڕەشیدی یاسمی" وەکوو بەڵگەیەک لە کتێبی (کرد و پیوستگیهاي نژادي او) بۆ کۆنیەتی زوانی کوردی باسیکردووە، هەر وەها م"امۆستا عەلائەدین سەجادی" ئەو پارچە هەڵبەستەی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا تۆمار کردووە. "د. جەماڵ ڕەشید" لە کتێبی لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی... لاپەڕەی(٥١٦) دا دەڵێ: «هەندێ نووسەری- تریش لە کتێبی خۆیاندا باسی ئەم هۆنراوەیانەکردووە، بۆیە بووەتە سەرچاوەیەکیش بۆ مێژوو و ئەتنۆگرافنووسی ڕووسی بە ناو "ڤلچیڤسکی" کە بڵێت: «ئەم هۆنراوە لە سالانی بیستدا لە ناوچەی سلێمانی دۆزراوەتەوە» و بە شێوەیەکی درێژتر باسی ئەو ڕەوشتانە دەکات کە پێوەندی بە دەقی هۆنراوەکەوە هەیە. هەر وەها "ڕۆدینکۆ" ئەم هۆنراوەیە وەرگێڕاوەتەوە سەر زوانی ڕووسی». لێتۆژەرانی ئەم دەقە سوورن لە سەر ئەوەی کە بە سەر پێستە ئاسکێک نووسراوە و لە ئەشکەوتی هەزارمێرد دۆزراوەتەوە و هۆنراوەی «دە برگەیی و قاڵبی مەسنەوی» ڕەسەنن هیچ بەڵگەیەکیش بۆ ساختەکاری ئەم دەقە لە دەستدا نییە. بێگومان ئەم دەقە، پێگەیەکی توکمەیە بۆ سەرەتای سەرهەڵدانی، شێعری نویساری کوردی. بۆ ئەوەی هەڵگری توخمی «کرکە» پرەنسیپی ڕەسەنایەتی مۆسیقای شێعری کوردییە. (بهار،١٣٤٧ :٤٤-٣٩) و (یاسمی،١٣٦٣ : ١١٩) و (کسروی،٢٥٦٣ :٥١٦ و ١٢٥ تا ١٢٨) و (محەمەدپوور: ١٢٩)

ئەو تایبەتمەندیانە کە "کۆکن" لە گەڵ فۆڕم و ناوەرۆکی شێعری ئێستای هۆرامی:

١ - ساکاری ڕوخسار و واتا کە بەڵگەیە کە بۆ سادەیی زوانی ئەو کاتە.

٢ - پاراستنی پرەنسیپی توخمی نەغمە - کرکە - «هیجایی بوون» کێشی پەنجەی دەبرگەیی کە جەوهەری زمانی (خێرایی‌دەنگ، Intensite) و( تەکیە، Accent) ڕەوتێک بووە لە گاتاکانی ئەوێستا دەستی پێکردبوو و لە دەقەکانی پەهلەوی ناڤیندا ڕەنگی دابوویەوە و هورمزگانیش بوو بە پردی نێوان پێش ئیسلام و ئورامەنی "باباتایەر" پاشان "یارسەکان" و "بێسارانی" و "مەولەوی" و شێعری هاوچەرخ.

٣ – بەرجەستەکردنی سەروا بۆ دەربرینی هەستی ناوەکی و ڕادەی دەلالەتی بەیانی پەیام کە خەسڵەتێکی مۆسیقایی پێش ئیسلام بووە و لە ئەدەبی عەرەبەوە وەرنەگیراوە.

٤ - بەکارهێنانی مەسنەوی کە فۆڕمێکی ڕەسەنی ئارییە و موناسیبە بۆ فەزایەکی ڕەوایی و ڕەها و ئازاد لە وتنەوەدا، دواتر دەبێتە نەریتێک بۆ هۆنینەوەی شاعێرانی هۆرامی.

٥ - ڕوخساری ئارکائیکی واژە و دەستەواژەی ئەو دەمە: هورمزگان (ئاورگەکان)، ئاتران (ئاورەکان)، گنا (گوند)، شەن (ژن)، کەنیکانە(کەنیشکەمان)، بەشینا (گیران)، هوونینا (خوێنین)، بەزیکا نەیکا (بەزەییان نەهات).

٦ - ڕەنگدانەوەی باری هەستەکی و دەروونی لە هەمبەر شالاوگەران بە لەحنێکی حەماسی - خۆڕاگریانە و بەرگریانە و یادەوەری و پێداگری ئایینی ئەو دەمە.

سیاوی هۆرامییە«ماریفەتوو پیرشالیاری، ماریفەتی پیرشالیار»[1] و سەرهەڵدانی شیعری «یارسان»ە لە سەدەی دووهەم سەرهەڵدەدا و تا چەندین سەدە دوایی هەر لە ڕسکاندا بووە.

٢- شیعری«ئوورامەن، مەلحوناتی فەهلەوی یا فەهلەویاتی هۆرامی»[2]، چەشنێکی تر لە سیستەمی بڕگە. وەک سەرچڵ: دەقەکانی "دایە تەبریز هۆرامی" (٤ ک.م) ، "جلالە خانم لوڕستانی" (٤ ک.م) ، "دایە خەزان سەرگەتی" (٥ ک.م) ، "بابا تایەر" (٤ ک.م)، "شێخ سەفی هەردەوێڵی" (٨ -٧ ک.م) و "سەیدی هۆرامی" (١٣ ه.ق) و... (صفی‌زادە، ١٣٧٠: ١٣٠،٩٧،٧٦،٣٩٨)و (کسروی،٢٥٦٣: ٣٤٩). ئەمشێوازە شیعرە بە هەڵە عەرووزمانەکان، قالب و پێوانەی پێیەکانی عەرووزی «مفاعیلن»یان بۆ داناوە و تەنانەت دوایی لەحنی شیعرەکانیان فارسیزە کردووە[3]، ئەگینا کێشە ڕەسەنەکەی سەر بە نەغمەی بڕگەی هۆرامی[4] دانراوە نە چیتر.

---

دەقی هورمزگان:

هورمزگان رمان، ئاتران کوژان/هۆشان شاردەوە، گەورە گاوران

زۆرکاری ئارەب، کەردنە خاپوور /گنای پاڵەیی، هەتا شارەزوور

شەن وکەنیکان وە دیل بشینا/ مێرد ئازا تلێی وەڕووی هوونینا

ڕەوشت زەردەشترە، مانۆوە بێ‌کەس/ بەزیکا نەیکا، هورمز وە هیچ‌کەس (محەمەدپوور: ٢٢)

[1] - ماریفەتوو پیرشالیاری: پیرشالیار لە موغە زەرتوشتییەکانی هۆرامانی تەخت بووە، هەڵگری هەندێ سروود و تقوسی ئامۆژگاری و ئەخلاقی تەنانەت نهێنی: گۆشت جە واتەی پیرشالیار بۆ/هۆشت جە کیاستەی زانای سیمیار بۆ واتە: گوێ گرە بۆ پەندەکانی پیرشالیار و هوشت ڕاسپێرە بۆ دانای سیمیار(دانی ڕەمزگۆ، زردەشت). (محەمەدپور:٣٥) و (اوشیدری:٢٠٨)

[2] - لە بارەی لەحنی «ئورامن و فەهلەویاتی ئورامن» بروانە :ئ) ( ابوترابیان،١٣٥٨ :٩) ب) (هۆرامانی:٢١٥) ، ج) ژێر واژەی «اورامن، اورامنان، اورامە و اورامن» لە «لغت نامەی دهخدا»، بە نەقل لە «لغت نامەی برهان قاطع» د) منسوری،١٣٧٦ ،: ٣٢،٣٣)

[3] - لەمبارەوە ئاماژە دەکەین بە بەڵگەیەکی زانستی لە زاری "د. مێهردادی بەهار" زمانەوان و ئوستوورەناسی توکمەی ئێرانی لە کتێبی: جستاری چند در فرهنگ ایران، ل: ٢٧٩ - ٢٦٧ "د. مێهرداد" دەڵێ: «"مجتبی مینوی" لە ژمارەی دووهەمیساڵی چوارەمی گۆڤاری ئەدەبیاتی زانکۆ تاراندا ٢٥ بەیت لە شێعرەکانی "بابە تاهێر" چاپکرابوو - ئەم چەند بەیتە بەشێکن لەو ٢٥ بەیتە کە "بەهار" ئاماژەی پێدەکات - کە بریتی بوون لە دوو پارچە سێ بەیتی و شەش بەیتی و هەشت دووبەیتی. لە ئەم چەند شێعرەدا، جگە لە دوو دووبەیتی ئەویش بە جیاوازیەکی ئەوتۆوە، لە ناو دیوانەکەی "باباتاهێر"دا نین. بەڵام ئەم شێعرانە بە ژمارەی ٢٥٤٦ لە مۆزەخانەی «قونیە»دا بە بەرواری (٨٤٨ک.م) تۆمارکراون. بەراوردکاری ئەم شێعرانەو ئەوانەی لە دیوانەکەی "بابا"دا هەن، دەردەکەوێ جیاوازی زەمین تا عاسمانە. هەر چەن لەم دەقە ڕەسەنانە نموونەیان نییە لە هەوێڵدا، بەڵام بە توێژینەویەکی تەنانەت مامناوەندی زمانەوانی دەردەکەوێ کە سەرجەمی دیوانەکەی" باباتاهێر" کە گوایێ هی ئەوە، ئاڵۆزە و گوماناوییە بەدەسەوە بوونی ئەم نموونە شێعرییە ڕەسەنانە، ئێمەی توێژەوان یاری دەدات کە دیوانەکەی" بابا" لە سەر پێوەرە زوانیە ئێرانیەکانی ڕۆژاوای ئێران (کوردی)، بە تایبەت زوانی پاڵەوانی و یاسای گۆڕانکاری لەم زوانانەدا و بە چاوکردن لە دەقە نووسراوەکانی دەورەی ئیسلامی ڕۆژاوا - باکووری ڕۆژاوای ئێران یانێ کوردی، بەراوردکاری بکەین، تا ئەم دیوانە لە بەندی دەست تێوەردانی بە ئەنقەست و ئاشکرای هەندێ کە تەنیا مەبەستیان بە فارسیکردنی ئەم دیوانە بووە، ڕزگاری بکرێ، کە ئەم گۆڕەپانەیش سوارەی چاکی ئەوێ». بە پەیلوای من بە پێی ئەو توێژینەوە و ئەو توخمە زوانیانە لە دیوانەکەی "بابا" دا هەن سەرەڕای فارسیزەکردنیان، بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ چەسپاندنی لەحنی هۆرامی بوونی دیوانەکەی "بابا تایەر". (محەمەدپوور،٢٨-٢٧)

[4] - هەندێ لە توێژکاران ئەم شێوازە شێعریانە بە ناو «سبک هورامی در اواز کُردی» "شێوازی هۆرامی لە ئاوازی کوردی" ناو بردووە. بە پەیلوای ئەوان "هۆرامی" لە زوانی کوردیدا، بە شێوازی تایبەت "اوازە خوانی" ناو دەبرێت کە ڕیشە و ڕەگەکانی وا

٣- شیعری ئایینی «یارسان» کە لە سەدەی دووهەمی کۆچیدا سەری هەڵدابوو، تا سەدەکانی دوایی بەردەوام بووە. وەک نموونە: "بهلوول ماهی" (نیمەی دووهەم سەدەی دووهەمی ک.م) "بابا سەرهەنگ دەودانی" (سەدەی چوارەم ک.م)، "شاخوشین لوڕستانی" (سەدەی ٥و٤ ک.م) "بابا ناوسی سەرگەتی" (سەدەی ٥ ک.م) و "سان سەهاکی بەرزنجی" (سەدەی ٧و٦ ک.م) و ...(صفیزادە،١٣٧٠ :٤٩)

٤- قۆناغی «داهێنان و بزاڤی (کرکە)»، لە لیریکای هۆرامیدا. لووتکە "بێسارانی" و شاعێرانی پاشڕەو (سەدەی ١٢-١١ ک.م).

٥- «بەردەوامی و فرەدەنگی» لە فۆرمی لیریکای هۆرامیدا. لووتکە "سەیدی هۆرامی" (١٢٦٥/ ١١٩٩ە.ق ١٧٨٤/١٨٤٨-م) و شاعێرانی هاودەم و شوێنکەوتوو (سەدەی ١٣-١٢ ک.م).

٦- «هارمۆنیای فۆرم و ناوەرۆک» لە لیریکای هۆرامیدا. لووتکە و زایەڵەی بەرزی ئەم خولە: "مەولەوی تاوەگۆزی" (**١٢٢١/١٣٠٠/ک.م**) و باقی هاوبەندانی ئەدەبی و شاعیرانی پاشڕەو (سەدەی ١٤-١٣ ک.م).

---

لە ڕابردووی ئەم گەلەدا، ئەمروڕە لە ناو ئەم گەلەدا، جگە لە دەگمەن هونەرمەندانێک نەبێ کە سینە بە سینە لە پێشێنیان وەریان گرتوە، کەسیتر ناتوانێ ئەم شیوازە لە وتنەوەدا دابەزێنێ و "اجرای اواز" بکاتن. (ابوترابیان:٩). کە وابوو زاراوەی مۆسیقای کوردی "هۆرامی" و توخمی پەهلەوی "هورمی" و تەرجمەکانی ئەوێستایی "اورامن" و "اورامنان" و "اورامە"، بەلگەی توکمەن بو شێوازی "ملحونات فهلوی". و چەسپاندنی ئەم ڕووکردە کە دوو بەیتییەکان "بابا تایەر"، "شیخ سەفی" و "سەیدی هورامی" و... یان هەر دەقێکیتر لە شاعیرانی کورد ناتوانێ ئوسلوبی عەرووزی بۆ داتاشری. بەلکوو ئەم فورمە شێعرییە دیاردەیەکی ڕەسەنە و لە سەر عونسوری زوانی نەغمەدەنگ(کرکەدەنگ، intensite) و (تەکیە accent) چێکراوە و هەر لە لە پێش ئیسلامیشدا هەبووە و پاش ئیسلامیش وەک فەکتێکی زیندوو لە شێعرماندا ماوەتەوە. (هەمان:١٠)

لە ڕابردووی دووردا تەنیا کەسێک بە شیوەی فەنی و زانستی و بەرفراوان دەربارەی (مەلحونات فەهلەوی) کوڵراوەتەوە، خوێندنەوەی فەنی عەروزوانی ناوداری سەدەی(٧ کوچی) "شەمسی قەیسی رازی"یە(کۆچ ٦٤٠ ک.م). لە بەشێک لەم ڕاڤە ئەدەبیەدا دەڵێ: «جەماوەری هەمەدان(مەبەست کوردەکانە، جەخت لە نووسەری ئەم دێڕانەیە) و زەنجان(مەبەست ئازەرییەکانە کە زوانەکەیان سەر بە بنەماڵەی کوردە، نەک تورکەکان کە دوایی هاتوون و لە ناوچەکەدا جێنیشتە بووگن) کاتیک ئەیانەوێ شێعری (پەهلەوی) بهۆننەوە، ناخوداگا دوچاری هەڵەی زەقی خوێندنەوە دەبن. لەم ئوسلووبەدا، دێڕێک بەم پێیە (مفاعیلن، مفاعیلن، فعولن، --U/---U/---U) کێشانە ئەکەن و پاشان ئەو دێڕە،کە بە پێوەری (فاعلاتن، مفاعیلن، فعولن، --U/---U/--U-) دادەنێن. و هەر وەها زۆربەی پێوانەی (فاعیلاتن، ----) لە جێی (فاعلاتن، --U-) و (مفعولاتن، ----) لە جێی (مفاعیلن، ---U) چێدەکەن.(بروانە هەمان سەرچاوەی پێشوو ، از هورامی تا ارومیە، ل١١و... ) ئاماژەی (شمس قیس رازی) بە هەمان توخمی کرکەدەنگ(شدت صوت)ە و توخمی(تەکیە) لە پێکهاتەی شێعری هۆرامییدا کە ئێستاش جگ لە کەسانێکی زوانزان و شارەزا و هونەرمەند لەم بارەوە، شارەزاییان نییە و ئەم کرکەدەنگانە تا دروست وەک خۆیان نەخوێنرێنەوە(ملحون) پەی بە ئوسلووبی ڕەسەنایەتییان نابرێت، بۆیە عەروزوانێکی توکمە وەکوو "شمس" بە دیدی پێوانەی (قید تساوی) و بەرامبەری بڕگە کورت و درێژەکان و ڕێسای عەرووز لەم دیاردە دەکۆڵرێتەوە و ئەم ڕووکردە زمانییەی (همدانی)یەکان و (زنجانی)یەکان بە لادان لە ڕێساکان و پێوانەکانی عەرووز و هەڵەی زەق وەسف دەکات.

نووسەری ئەم دێڕانە پێیوایە ئەم چەشنە شێعرانە پێیان دەوترێ «ملحون»، خوێندنەوەی درووستیان مەرجی سەرەکییە بۆ دەرخستنی کێشەکەیان. «خانلەری» لەم بارەوە دەڵێ: هەروەها کە لە شێعری زاراوەگەلی جۆراوجۆری ئەمڕۆی ئێران وەکوو(کوردی، لوڕی، تەبەری و...) تا درووست وەک زارەکەی خۆیان نەخوێندرێنەوە، ناگەیینە کێشی درووستی ئەو شێعرانە. (خانلری:٦٢)

٧- سەرەتای دەسپێکی نوێخوازی شیعری هۆرامی. ئەم بزاڤە چەندساڵێکە سەری‌هەڵداوە و هێشتا ساوایە و بۆ ڕسکانی زیاتر نیازی بە کات و مەودا هەیە.

لەم پرۆسە زەمەنییەدا، هەر لە سەرەتای دەهەی هەوەڵ و دووهەمی کۆچی و ڕەگەکانی لە شیعری پێش ئیسلامەوە، شیعری هۆرامی بە پشتبەستن بە تێکستی «هورمزگان»، «ماریفەت»، «یارسان» و « ئوورامەن» و... لێدانی توخمی جەوهەری کرکە دەنگ (نەغمە، شدت صوت، intensite) و تەکیە، accent) و ڕەنگدانەوەی لە ئوسلوبی بڕگە (هجا)دا، بە دریژایی پتر لە «چوارده سەدە» لە حەوت قۆناغی بەردەوام و لێکنەپچڕاودا، لە ئەفراژوون و ڕسکاندا بووە و گەورە شاعێرانێ -کە لووتکەی شیعری کلاسیکی کوردین- دەقە دیوانیان ئاراستەی ئەدەبی نەتەوەییی کردوە.

کرکە (Kirke، intensite و تەکیە accent)،

توخمێک بۆ چەسپاندنی ڕەسەنایەتی جەوهەری شیعری کوردیی هۆرامی

بەر لەوەی بچینە نێو جەرگەی باسی سەرەکی توخمی «کرکە»وە، پێویستە چەند زاراوەیەکی زمانی کە پێوەندی ڕاستەوخۆی بە باسەکەمانەوە هەیە بورووژێنین:

زمان: «بەکاربردنی کۆمەڵێ هێما و نیشانە یان دەلالەتی وەزعین کە لە ڕووی مەبەستی تایبەتییەوە، لە نێوان تاکەکانی گلێرگە، بۆ گەیاندنی ئەندێشە یان پەیامێک بەکار دەبرێت» (خانلری:٥٩). لەم پێناسەدا ئاراستەی «وەزعی» و «مەبەست» شێوازێ تایبەتیتەر بۆ مرۆڤ دەگرێتە خۆی و دەبێتە جیاکەرەوەی زمانی مرۆڤ و ئاژەڵ. لە ڕاستیدا زمان پێکهاتەی نیشانەکانە. جا بزانین بە چی «نیشانە» دەڵێن. نیشانە هەمان دەلالەتی لەفزییە، کە پەیوەندیی لە گەڵ «زمان - وتار»ەوە هەیە. نیشانە دوو توخمی هەیە: دال (لەفز، دەنگ ئاماژە) و مەدلوول (مانا، واتائاماژە). پەیوەندی لە نێوان دال و مەدلوول، "نیشانە" ساز دەکرێ[1]. بەم شێوە دەر ئەکەوێ، کە هەر واژەیێ لە دوو توخم پێکدێ. لەفز«دەنگ ئاماژە» کە هەمان«دەنگ یا دال»ی واژەکەیە. و «واتا ئاماژە» یان مدلول کە مانای دەنگەکەیە. جا با بزانین «دەنگ» چییە؟

دەنگ: «لەرینەوەی (ارتعاش) هەوایە کە دەخواتە پەردەی گوێ (صماخ) و مێشکی ئینسان دەرکی پێدەکات. ئەم (لەرە) ئەگەر هەڵگری ڕێکوپێکی و ئاهەنگ و ڕیتم بێ، پێدەڵێن «مۆسیقا» کە ئەم توخمە هەم لە فرێکانسی واچەکاندا هەستی پێدەکرێ و هەم بە واتا فەننیەکەی لە نوتە مۆسیقاکاندا. ئەگەر ئەو دەنگە هەڵگری ڕێکوپێکێ نەبێ، دەنگەکان زبر و نامۆسیقایی دەبیسترێن، پێیان دەڵێن: «خشە». وەک دەنگی "مشار" یان خشەی سەر "شیشە" و "ئاسن" یان "بەرد". لە هەر دەنگێکی سانا یان سەرەکیدا، چوار سفەت هەست پێدەکرێ: بەرزی دەنگ (ارتفاع صوت) یان هەمان «زێڵ و گڕی» دەنگ (زیر و بم)، کێشیای دەنگ (امتداد یا کمیت صوت)، کرژی دەنگ (شدت صوت)، زڕەی دەنگ (زنگ صوت).

---

[1] - ئەمە ڕوانگەی «سوسور»ە کە بە بڕوای ئەم بیرمەندە: «دال» دەگەڕێتەوە بۆ «مەدلوول» و پەیوەندی «دال و مەدلوول» دەبێتە نیشانە. لەم ڕوانگەدا، حەرەکەتی دەلالەت لە مەدلوودا کۆتایی پێدێت. کەچی لە بیروڕای بیرمەندانی پاش بنەماخوازەکاندا(پسا ساختارگرا)، مەدلوول دەخرێتە پەراوێزەوە، تەنیا دال جێگای مەبەستە. لەم بۆچوونەدا، دال دەگەڕێتەوە بۆ دال، چوون ژێدەر هەمان «دال»ە، پەیتا پەیتا ئەم کارەساتە زوانییە دووپات دەبێتەوە «دال»ێک بۆ «دال»ێکی‌تر. کە وابوو پرۆسەی دەلالەت کۆتایی پێ نایەت تا بێکۆتایی هەر بەردەوام دەبێ. (سجودی: ٤٤،٤٥،٤٦)

**بەشی شەشم- زمان**

- بەرزی دەنگ: (ارتفاع صوت)، وا لە ژێر ڕکێفی ژمارەی لەرەینەوەی (ارتعاشات) هەوادا لە یەکەی زەمان یان لە چرکەیەکدا، هەرچەندە ڕادەی لەرەی دەنگەکە لە چرکەیەکدا کەمتر بوو، ئەو دەنگە «گڕ، بم» دەبیسترێ و هەرچەندە فرەتر بێت، دەنگەکە، «زیڵ» دەبیسترێ (خانلری، ١٣٦٦ :١٢). ئەو (واچەگەلە، دەستەواژە) کە لە فۆنێمی«خ، ژ، ر، چ، و غ و...» دێنە گۆکرن، لەرەی هەوا بەرزە، کە واتە: «زیڵن»، وەک ئەم ڕستانەی خوارەوە: «خوای خوۆ: (پێدەکەنێ)، زاڕۆ جە ئەدَا بی ژەک وەرۆ: (کورپە لە دایک بوو ژەک دەخوات)، چەمەڕات کەرێنێ: (چاوەڕێم دەکردی) و...» یان ئەو واچەگەلە کە جە واکەی«و، ب، پ، د، ت، و...» دێنە زار، دەنگەکانیان «گڕ، بەم»ە وەک ئەم ڕستانە: «واران وارۆ: (باران دەبارێ)، بۆرێ با بلمێ: (وەرە با بڕۆین)، دەوربیەکەم دەپەنە: (دەوربیەکەم پێ بدە)، تەوەنی وارۆ!: (بەرد بباریێ!) و... »

کێشە دەنگ (متداد صوت)، ڕادەی چەندایەتی و بارستای دەنگەکەیە، چە ماوەیی بەردەوام بووە.

کرژە دەنگ (سرعت صوت)، بریتیە لە کرژی لەرەکان لە یەکەی زەماندا. پێوەر بۆ ئەم سفەتە، مەودای «بیستن»ە. هەر چەند مەسافەت و مەودا کەمتەر بێ، کەمترین کرژی هەیە، و هەرچی ماوە فرەتر بێ، فرەترین کرژی دەنگ بە خۆیەوە دەگرێ.

کرکە دەنگ یا زڕە دەنگ (زنگ صوت)، لە تێکالاوی دەنگی سەرەکی (اصلی) و پاژە دەنگەکان (فرعی) فەراهەم دەبێ. چما دوو دەنگ کە لە «زیڵ و بم»ی و کرژیدا، وەک یەک بن، لە «زڕە دەنگ»دا، لە یەک جیا دەکرێنەوە. وەک نموونە ئەگەر بە دوو ئامێری مۆسیقا «پیانۆ و تار» یەک ئاهەنگ بژەندرێت، یەکەی جیاکەرەوەیان، تەنیا زڕەی پاژە لەرەکانە (ارتعاشات فرعی) کە دەسەلمێنێ کامیان دەنگی «تار»ە و کامەیان دەنگی «پیانۆ». ئەم دیاردەیشە لە ناو «زمان» دێتە هەست پێکرن. نووسەر بە پشتبەستن بەم توخمە زمانییەدایە، جەختدەکات بۆ ڕەهەندەکانی ئەرێنیی ئەم نووسراوە. پێیوایە تەنیا جیاکەرەوەی جەوهەری ڕیتمی شیعریی هۆرامی لە گەڵ عەرەبی، فارسی و سۆرانی، وا لە ناواخنی ئەم توخمە زمانییەدا، واتە کرکە دەنگەکانێ کە تایبەتن بە زمان و شیعری هۆرامی. ئەم توخمە ئەوەندە کاریگەر بووە، شیعری هۆرامی بە درێژایی تەمەنی خۆی نەکەوتە بەر لێشاوەی عەرووزی عەرەبی. گەڕووی سیاوچەمانبێژی هۆرامی بە باشی لە گەڵ ئەم توخمەدا ڕاهاتووە و بەردەوام بە درێژایی زەمەن و وتراوەتەوە و ڕەنگە هیچ گۆرانی بێژێکی سۆرانی نەتوانێ بەم شێوە بینبخواتەوە. ئەم توخمە لە سەر «شیعر و سیاوچەمانە»دا، ئەوەندە کاریگەر بووە کە بڵێیین دوو بابەت و دوو خاڵی سەرەکین بۆ فاکتیزە کردنی ڕەسەنایەتی و حال و هەوای تازە[1] لە پێکهاتەی مۆسیقای شیعر و ئاوازی هۆرامی. من شارەزای زانستی مۆسیقا نیم بەڵام پێموایە ئەم توخمە (کرکە) پێشنیاز بکرێتن بۆ گلاڵەڕێژکردنی مۆسیقای کوردی. مۆزیسێنەکان، تیۆری مۆسیقای کوردی، پێ بڕازێنێتەوە، لانیکەم بەم پێوەرە، جیامان بکەنەوە لە ئاڵوزکاری و تێکەڵاوی دەزگاکانی مۆسیقای نەتەوەکانی تر. لە دوورەوە یەکێ خەریکە گۆرانی دەڵێ، یەکێکیش گوێی بۆ گرتووە دەڵێ: «ببیە ئا کرکەیە (گوێگرە بۆ ئەو کرکە)» یا «کرکەش مێ (کرکەی تێ)» و «کرکەش چننە وەشا (کرکەی چەنێ خۆشە)». "کرکە" لە گۆرانی هۆرامیدا، مەجازە بۆ بینخواردنەوە و دەنگ خۆشی و زڕەی دەنگ و ...، ئەم ڕێسایە تەنیا پەیوەندی بە گۆرانی

---

[1] - «هەمیشە سەرکەوتن بو شاعێرانێکە کە لە پیکهاتەدا زەمینەی حال و هوایەکی تازە بـو شـێعر دەرەخسـێنن یـان خـود پیکهاتەیەکی نوێی شێعری دابهینن.» (شفیعی کدکنی،١٣٦٦ :٢١)

و ڕیتمی شیعرەوە نییە، بەڵکوو توخمێکە وەک ڕەوتێک لە ناو جەرگەی زماندا حزووری هەیە، توخمێک هەتا هەتایی و مانەوەیی بۆ زمانی کوردی. جا با بزانین «کرکە دەنگ» چییە و چە ڕۆڵیکی بووە لە پێکهاتەی زمان و شیعری هۆرامیدا.

## پێگەی مێژوویی ئەم توخمە:

هەموومان ئەزانیین کە زمانی فارسی و کوردیی هۆرامی -بە تێکڕا زمانی کوردی- لە یەک بنەماڵەن، واتە لە (ئاریایی)ەکانن کە نزیکایەتی خێزانی و ڕەچەڵەکیشیان هەیە لە گەڵ هێندو ئوروپاییەکان. عەرەبی لە گەڵ ئەم کۆما زمانانە پێوەندییەکی ڕەچەڵەکی و ڕێخەناسانەی نییە، کەچی بە هاتنی ئیسلام، زمانی فارسی کەوتە ژێر کاریگەری ئەم زمانە و هەندێ خسڵەتی جەوهەری و ڕووکاری هەم لە «فۆڕم و هەم لە ناوەڕۆک»دا، لە دەست دا.

لە لێتۆژینەوەی دەقە بە جێماوەکانی ئەم کۆما زمانانەدا (پارسی باستان- فارسی، هۆرامی- سنسکریت، وێدا، یۆنانی کۆن، لاتینی و ... ) دەرکەوتووە، کە ئەم چەن زمانە خاوەنی سێ توخمی زمانین: یەک: ئاهەنگ (Ton)، دوو: کێشاندن (امتداد، Duree)، سێ: تەکیە (Accent). سەرەتای ڕاڤە و خوێندنەوەی ئەم ڕەوتە زمانەوانییە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووهەمی سەدەی نۆزدە. لەم بارەوە ئەم نووسەرانە ڕوانگە و بۆچوونیان بڵاو کراوەتەوە: "ئێلێکساندر خۆدزکۆ" (A .chodz ko) ، "چارل زالێمەن" (carl salemann)، "ژیوکۆفسکی" (V.zhukovski)، "بێنوێنیست" (Benveniste)، "ئانتوان مییە"، "ڕۆبێرتۆ گوتیۆ" (شاگردی ئانتوان مییە)یە (خانلری:٦٢،٩٣). یەک لەوانە"ئانتوان مییە" زمانەوانی مەزنی فەڕانسەوی بوو کە بۆ یەکەم جار پەی بە توخمێکی زمانی بە ناو «تەکیە (Accent)» برد. بەمشێوە بوو بەخاوەن پەیلوایەکی زانستی- زمانەوانی لە پێکهاتەی زمانە هێند ئوروپاییەکاندا. ڕاژەی ئەم توخمە بوو بە هۆی ئەوە زمانی فارسی و کوردی بە تایبەت کوردیی هۆرامی لە ڕێچکەی زمانە چەندییەکان (زبان‌های کمی) بە تایبەت عەرەبی جیا بکرێتەوە و تایبەتیتر ئاوڕ بدرێتەوە لە جەوهەری زمان و مۆسیقای شیعرەکەی. پەیلواکەی"ئانتوان مییە" بوو بە سووژەی لێکۆڵینەوەی نووسەری ئەم دێڕانە تا چەقدابەسێت و بڵێت: بەڵێ، زمان و شیعری کوردیی هۆرامی خاوەنی هەندێ مۆرک و مۆرالی زمانەوانی تایبەت بە خۆیەتی و لە زمان و شیعری فارسی و تەنانەت لە کوردیی سۆرانیش جیا ئەکرێتەوە. دوایی"ئانتوان میە" بە کەشفی توخمی «تەکیە (Accent)» ڕازی نەبوو و لە شرۆڤەکاری دەقەکاندا، باسێکی تری بە ناو«شدت صوت، خێرایی دەنگ (Intensite)» لە توخمی «تەکیە»ی هێنایە ڕۆژێڤی زمانەوانییەوە. پێیوابوو «تەکیە» هەمان خێرایی دەنگە و ئەم توخمەش، جیاوازە لە گەڵ ئاهەنگ، کە زاراوەیەکی مۆسیقاییە و پێی دەگوترێ: بەرزی دەنگ (ارتفاع صوت) و پێوەندی بە «زێڵ»ی و «گڕ»ی دەنگەوە هەیە. بە پێی ئەم لێتۆژینەوە، «زمانی ئەوێستا» لە گەڵ زمانەکانی سنسکریت و یۆنانی کۆن جیادەکرێتەوە و دەبێتە خاوەنی پرەنسیپی جەوهەری خۆی. لە کێشانەی شیعریشدا، کێشی چەندی (وزن کمی) جێی خۆی گۆڕایەوە بە «کێشی زەربی» یان بە چەشنێکی تر «بڕگەیی» لە سەر لێدانی فرێکانسی توخمی تەکیە (خانلری:٤٠).

بزاڤەکە بەمەوە نەوەستا، ئاڵوگۆڕی زمانی تر هاتە ئاراوە. شالاوگەرییەکەی "ئەسکەندەری مەقدوونی" بۆ

**بەشی شەشم- زمان**

سەر وڵاتانی ڕۆژهەڵات بە تایبەت ئێران و دامەزراندنی ناوەندە فەرهەنگی و کەلتوورییەکان لەم وڵاتانەدا و دانووساندن و پێواژۆ لە نێو زمانەکاندا، کاریگەری زمانی یونانی بە سەر زمانە کۆنە « هێندو ئوروپاییەکاندا»ی لێکەوتەوە وکاردانەوەی خۆی بە سەر ئەم کۆما زمانانەدا، چەسپاند. ئەم بابەتە بوو بە هۆکاری ئەکتیوکردنی باری زمانەوانی لە سەدەی نۆزدەهەمدا. لەم باسە زمانەوانیانەدا"بێنوێنیست"(Benveniste) زمانەوانی فەڕانسەوەی ڕۆڵێکی بەرچاوی گێڕا لە پێکهاتە زمانە ئێرانییەکاندا (پەهلەوی ئەشکانی و ساسانی). لێتۆژینەوەکەی "بێنوێنێست"، ڕوانگەی«زڕە دەنگ، کرکە دەنگ»ی لە زاراوە کوردییەکاندا، بۆ ئێمە ئاوەگۆز کرد، بە تایبەتی لە بارەی زمان و شیعری کوردی هۆرامی کە جیاوازە لە سیستەمی عەرووزی عەرەبی و پێوەندی ئەندامی و جەوهەری هەبووە لە گەڵ ئەو کۆما زمانانەدا. ئەم پەیلەوایە بوو بە هۆی ئالقەیەکی توند و تۆڵ نێوان ئەم دوو زمانەدا و هۆکاری یەکالاکردنەوەی باسەکە و پەی بردن بە توخمی (تەکیە) کە دان پێنانێک بوو بە پەیلواکانی زمانەوانەکانی تر بە تایبەت «ئانتوان مییە»کە پێشتر باسیان لەم توخمە کردبوو (محەمەدپوور:٧٦).

«بێنوێنیستBenveniste» وتارێکی لە بارەی «درەختی ئاسووریک» کە دەقێکی چاخی پالەوی ئەشکانی بوو، نووسیبوو؛ لەم وتارەدا پێیوابوو: ئەم دەقە لە زەمان ساسانییەکاندا لە لایەن بنووسان (کاتبان)ەوە، ئالوگۆڕێک بە سەریدا هاتووە، دەبێ پێکهاتەی ساخ بکرێتەوە، پاش ساخ کردنەوە و لێتۆژینەوەی توخمە ڕەسەنەکان و پەی بردن بە ڕێسای هۆنراوە (منظوم) بوونی ئەم دەقە، پەی بە توخمێکی جەوهەریتر برد بە ناو«زرەدەنگ، کرکە دەنگ». ئاکامی کەشفی ئەم ڕێسا زمانییە، بوو بە وتارێکی زانستی-زمانەوانی کە دوایی لە ڕۆژنامەی «ئاسیای»دا بە چاپی گەیاند. هەروەها لە بارەی شرۆڤەی«ئەیاتکاری زەریران، یادگار زریران» -دەقێکی پالەوی ئەشکانی- پێیوابوو پێوەندییەکی ئەندامی و ڕەچەڵەکی نێوان ئەم دوو دەقە پالەوییە و شیعرە فۆلکلۆریەکانی زاراوە کوردییەکان بە تایبەت دیالێکتی گۆراندا هەیە. لەمبارەوە دەڵێ: «سەرجەمی ئەو نموونە شیعرییە فولکلۆریانەی کە یاسای داسەپاوی «عەرووزی عەرەبی» نەیتوانی کاریگەر بێ بە سەریاندا، لە لایەن ڕاڤەکاران لە دەڤەرە جۆراوجۆرەکانی ئێراندا کۆ کراونەتەوە، هەموویان لە ڕێسای «بڕگە» پێڕەوی دەکەن و زۆربەیان «تەکیە»دارن. لە پێکهاتەی دەقە شیعری زاراوە کوردیەکان: (گۆرانی، هۆرامانی، خوراسانی  کە هەموویان سەر بە زاراوەکانی باکوورن) چەندی بڕگە (کمیت هجا) -یەکسانی بڕگە کورت و درێژەکان لە دوو دێڕی بەرامبەردا- هیچ رۆڵێک نابینێ ... لە واقیعدا هەموو ئەو کێشانەی کە تا ئیستا لە زمانی پالەویدا دۆزراونەتەوە، هەر لە سەر ئەم  ئوسلووبە مۆسیقاییە بووە و هەروەها سەرجەمی ئەو زاراوە باکووریانە (باکووری ڕۆژهەڵات و باکووری ڕۆژئاوا) لەم ڕێسا زمانییە پێڕەوی دەکەن. لە واقیعدا ئەم توخمە دەبێتە ئاڵقەی پێوەندی ئەندامی و گرێبەستی نێوان یادگاری زەریران و شیعری هێجایی ئەمڕۆی ئێران» (خانلری، ١٣٥٤ :٤٦،٤٧).

لێمان ڕوونە لە شیعری نقیساری ئەمڕۆی گەلانی ئێراندا جگە لە گۆران (هۆرامی) و بن زاراوەکانی ئەم شێوەزمانە لە هیچ دەڤەرێکدا بە ئوسلووبی بڕگە شیعر ناگوترێتەوە- ئەڵبەت شیعرە فولکلوریەکانی دەڤەرەکانی ئێرانی لێ قوتار بکەن. بە پێی ئەم بەڵگە زانستییە زمانەوانییە و خستنە ڕووی توخمی«کرکە دەنگ»، دەقە شیعرییەکانی هۆرامی: (هورمزگان، یارسان، فەهلەویات (ئوورامن)، بێسارانی، مەولەوی،

سەیدی و...) شاعێرانێک کە ئێستاش شیعری کلاسیکی هیجایی هۆرامی دەهۆننەوە، دەبەسترێتەوە بە تەمەنی چەن هەزارساڵەی سەرهەڵدانی «گاساکان»ی ئاوێستا و و زمانەکۆنە هێندو ئێرانی-ئوروپاییەکانەوە.

### تایبەتمەندیی و جیاوازییە زمانییەکان لە سەر پرەنسیپی تەکیە وخێرایی دەنگ کامانەن؟

بە پێی ئەم ڕوانگە زمانەوانییە کە ئاماژەمان پێدا، کێشانەی شیعریی هۆرامی، لە عەرەبی، فارسی و کوردیی-سۆرانی جیا دەکرێتەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی چەشنی کێشاندنی لە بزوێنەکانی ئەم زمانانەدا. میکانیزمی جیاکەرەوەی ئەم دۆخەش، توخمێک بوو بە ناو (زڕە زەنگ، کرکە دەنگ) لە پێکهاتەی دەنگەکاندا. «بۆ وێنە لە عەرەبیدا، لە دوو واچە (واژە)ی (چربَ، چارَبَ) بزوێنی (a) لە سەر (چ) هاتووە و لە واچەی (چارَبَ)، (á) دانراوە. لە واژەی (چربَ)، (a) لە چۆنیەتی(Ton)دا (بە قەدەر یەک‌پلە لە زەمەن) کێشراوە. بەڵام هەر ئەو بزوێنە لە واچەی (چارَبَ)ەدا بە هەمان ئەندازەی کات (دووپلە) بەرزتر کێشراوە. ئەم کێشاندنە لە یەک چرکەدا بووەتە هۆی جیاوازی واتایی دوو واژەکە. ئەم تایبەتمەندیە لە هەموو زمانە چەندییەکاندا (سنسکریت، یۆنانی کۆن، لاتینی، عەرەبی)دا دەبینرا» (خانلری:٤٦،٤٧).

بەڵام زمان و شیعری کوردییهورامی لەم ڕێسادا، پێگەی خۆی جیادەکاتەوە و دەبێتە خاوەنی توخمێکی جەوهەریتر و دەبێ لە مۆسیقای شیعر و تەنانەت زماندا، حسابی جیاوازی بۆ بکرێت. لە زمانە چەندییەکاندا، نایەکسانی دەنگ، تەنیا هۆکارێک بوو بۆ جیاکردنەوەو هەڵاواردنی واچەکان. کەچی لە هۆرامیدا، «کرکە دەنگ» یەکەی مۆسیقای زمان و شیعر هۆرامییە. لە پێوانەی شیعردا کاتێک بزوێنە (کورت و درێژ)ەکان، بۆ پێکهێنانی (بڕگەی کورت و درێژ) لە دوو دێڕدا دەکەونە بەرامبەر یەک، هەست بە جیاوازییان ناکرێت، «زڕە دەنگ»ەکان، جیاوازی بڕگەی«کورت و درێژ»دا ئەشارن، ئیتر دیاردەی «قەید تەساوی» کە هۆکاری خەفەکردنی فەزای شیعری عەرووزییە، ڕەنگی نامێنێ، ئەمە لە کاتێکدایە بە هۆی زڕەدەنگەکان، هیچ بەردەنگێک هەست بە قەڵسی ئاهەنگەکە ناکات. وەک وترا تەنیا جیاوازی نێوان ئەم سێ زمانە (عەرەبی، فارسی و هۆرامی)، چۆنیەتی لێدانی (کرکەدەنگ، زڕە دەنگ)ە کە دەبێتە پێوەری کێشانەیان (محەمە-دپوور:٧٣).

وەک نموونە ئەم واچەگەلانە: (دەر، دار)، (خەو و خاو)، (مەس وماس)، ئەگەر بکەونە بەرامبەر یەک لە دوو دێڕدا، بەردەنگ وێڕای نایەکسانی دەنگ، هەست بە لێکنەچوونی واتاکەشیان دەکات، کەچی لە شیعری هۆرامیدا، نایەکچوونی کێشاندنی دەنگی ناڤین (مصوت میانین) لەم دوو واژە (á/a)ناتوانێ بەر بەم شەپۆلە دەنگانە بگرێت، ئەگەریش بزوێنی درێژی (á)، لە ناڤینی ئەم واژانەدا (دار، خاو، ماس) بە قەدەر بزوێنی کورتی (a) لە واژەگەلی (دەر، خەو، مەس) کورت بکەینەوە و خێرا بیانخوێنینەوە، دووبارە هەمان جیاوازی واتاکی هەست پێدەکرێ؛ بێ ئەوەی خەوشێک لە ئاهەنگی دێڕەکاندا ببینرێت. بەڵام ئەگەر ئەم ڕێسا لە کێشانەی شیعری کلاسیکی فارسی و سۆرانیدا، ڕەچاو نەکرێ، یانی (یەک پلە بۆ بزوێنی کورت a و دوو پلە بۆ بزوێنی درێژی á) لە ڕێچکەی شیعردا قایل نەبین و بە خێرایی دەنگ (شدت صوت، intensite) لە سەر جەوهەری لەحنی شیعری هۆرامی، نەخوێنرێتەوە، خێرا جیاوازی نێوان کێشی دو بڕگەکە دێتە هەست پێکرن. لێرەدایە کە ڕیتمی زمانی هۆرامی لە شیعردا لە کێشی شیعری کلاسیکی عربی، فارسی و کوردی

سۆرانی جیا دەبێتەوە. کۆی ئەم کرکە دەنگانە لە سیستەمی «بڕگەیی شیعری هۆرامی» و لەحن و بینخواردنەوەی «سیاوچەمانە»ەدا دەبن بە هێشوەدەنگ. فارسی و کوردییسۆرانی، کە پابەندی دیاردەی عەرووزن، بۆ پڕ کردنەوەی ئەم هەرۆڵیە (بۆشایی) پەنا دەبەنە (ئەختیاری شاعێرانە) کە جۆرێکی حیلەی ئەدەبی و ئالۆزی مۆسیقاییە لە کێشانەی شیعردا و هیچی لەگەڵ واقیع و نورمەکانی زماندا تەبا نییە (محەمە- پوور:٧٣).

بەلام «هێشوە دەنگ» لە زمان و شیعری کوردییهۆرامیدا، «زڕە دەنگ» سازدەکات و جیاوازی (بزوێنە کورت و درێژ)ەکان لە پێکهاتەی بڕگە و مۆرفێم و واژەدا، دا ئەشارێ و گوێمان هەست بە ئالۆزی مۆسیقا ناکات و ئیتر پێویست بە دیاردەی عەرووز یان هەر چەشنە قاوغ و قالبێکی دەرەکی- ساختەیی ناکات. ئەمە هەر هەمان کێشی سروشتی و خۆمالی کوردەوارییە و "مامۆستا گۆران"یش بە ناچار پەنا دەباتەوە بەم ئۆخژنە مۆسیقایە خۆڕسکە کە لە گەڵ زمان و ژیان و ژیار و سروشتی کوردستاندا تەبا و گونجاوترە و بەم شێوە ڕێسای سواو و ڕزیوی تەفعیلەکانی عەرووزی «سێ کوچکە»ی خستە پەراوێزەوە. شیعری هۆرامی تا نەخوێنرێتەوە، توانستەکانی دەرناکەون؛ بۆیە ئەم چەشنە ئوسلوبەمان بە ناو شیعری «مەلحوون» واتە خوێندراوە کە هەلێنجراوی شیعری فۆلکلۆریکە و لە هەناو جەماوەر و سروشتدا لە دایکبووە و ڕسکاوە و ماوەتەوە و دەمێنێتەوە، ناودێر کرد. ئەلفبای عەرەبی کە ئێستا نویساری پێدەکرێ بەو دەنگە بەر تەسکانەوە ناتوانێ، توانستەکانی زمانی هۆرامی لە خۆیدا پیشان بدات دەبینین هەندێکی زۆر لەم قابلییەتە زمانیانە لە بنووسدا زەوت دەکرێ، دەنگە بزۆزەکان تەنیا لە خوێندنەوەدا هەست پێدەکرێن.

ئێستا نموونەیەکی عەمەلی لە کێشانەی شیعردا ئەخەینە بەرچاو. لە چامەی«ئەز ئورۆمۆن»ی "سەیدی هۆرامی"، بەیتێک بە هەر دوو ئوسلووبی لەحنی بڕگە«تەکیە و کرکەدەنگ» و ڕێسای «عەرووزی» دەخوێنینەوە تا دەرکەوتی جیاوازییە توخمییەکان بێتە هەستپێکردن:

پێشتر بەم خالە ئاماژەم دا کە بڕێک پێیان وایە کە فەهلەوییەکانی "بابا تاهێر" یان هەر "ئوورامن"بێژێکی تر وەک "شیخ سەفی ئەردەبیلی" یان هەر ئەم (لەحن)ە کە "سەیدی" چەن چامەی لە سەرداناوە، عەروزین و لە سەر: مفاعیلن، مفاعیلن، مفاعیل (U- - - U/- - -U/- - -) ، دەبێ کێشانە بکرێن و ناوی دەنێن (دەریای هەزەجی شەشی قرتاو). بەلام بە بڕوای من ئەمانە هۆنراوەگەلێکی کۆنن ، کە لە سەر لەحنی «کرکەدەنگ» دانراون و دەگەڕێنەوە بۆ پێش ئیسلام کە پێیان دەگوترا «فەهلەوی ، فەهلەویات» یان «ئورامن»[1]

ئەز ئورۆمۆن مەکانم بێ ولاتم

سەروپیری خوای گێرەن خەلاتم (سەیدی ١٩٧١ :١٢)[2] .

خوێندنەوەی یەکەم لە سەر ڕێسای عەرووزی: (مفاعیلن/مفاعیلن/مفاعی(فعولن)

ئە/ زوو/ رۆ/ مۆن/ مە/ کا/ نم/ بێ/ و/ لا/ تم

- -U / - - - U / - U - U

سە/ روو/پی/ ری/ خُ / وا ی/ گێ/ رەن /خە/ لا/ تم

---

[1] -بۆ زانیاری زۆرتر لەم بارەوە، بڕوانە فەرهەنگەلی بورهانی قاتێع ، موعین و سبک شناسی تەقی بەهار لە بارەی ئوورامەن.

(سەیدی، ١٩٧١) - - U/ - - - U /- -- U

ناتەباییەکان لە گەڵ نورمەکانی زمانی دایکی:

١- بڕگەی (ئەز) کە تەکیەی وا لە سەر، کەرت دەکرێ بە (ئە - زوو، U- - ) بۆ ئەوەی پایەی مفاعیلن- - - (U) دروست بێ؛

بەم شێوە داسەپاوە پێوەندی نێوان نورمی زمان و دەلالەتی مۆسیقایی و پەیام دەپچڕێ.

٢- بڕگەی (ڕۆ ، U) بە پێی خوێندنەوەی عەرووز، کە لە هۆرامیدا، (دوولانە، دیفتۆنگ، مرکب)ە کە دەبێتە دوو واک و بڕگەی کورت (U) کە ناچار ئیختیاری شاعێرانە وەردەگرێ و دەبێ ببێ بە بڕگەی درێژ (-) تا ببێ بە (U- - -). هەر وەهاش بڕگەی سێهەم لە پێی (مە –کا –نم –بێ).

٣- (خوای گێ ڕەن): لە سەر ئەژماری پیتە عەروزییەکان: خُ وا ی گێ ڕەن (xo wây gě ren) دوانزە پیتە (بزوێنی درێژ دوو پیت حساب کراوە). دەبن بە ٥ بڕگە(U - U - - )کە کاتێکدا پێی (U- - -) چوار بڕگەیە.

٤- لێرەدا دینامیزم (بزاڤێتیی زمان)، عەمەلەن ئیزولە دەکرێ، کرکە دەنگەکان دەپووکێنەوە و وزە و ورس و هەناسەیان لێدەچنرێ و دەمۆچێنەوە. بۆچی؟ بۆ ئەوە تەنیا لە تەنگیبەرانی بازنەی «تەفعیلەی عەرووز»دا ئیجازەیان هەیە هەناسە بکێشن.

٥- کورتی دێڕ لە سیستەمی (٥+٥)دا سازە لە گەڵ مۆسیقای سروشت و نورمی زمانی شەقام.

چەشنی دووهەم، خوێندنەوە لە سەر کێشانەی تەکیە و خێراییدەنگ (کرکە) :

ئەز/ ئوو/ ڕۆ/ مۆن/ مە/ کا/ نم/ بێ/ و/ لا/ تم

_ / _/ U /_/ _/ _ / U / _ /_ / _/ _

سە/ روو/ پی/ ری/ خو/ وای/ گێ/ ڕەن/خە/لا /تم

(سەیدی، ١٩٧١) - / - / U / - / - / -/ U / - / - / -/ U

لێرەدایە لەسەر پرەنسیپی خوێندنەوەی لەحن و پێداگری تەکیە و شاردنەوەی بڕگەی درێژ و کورت، دەلالەتی مۆسیقا و نورمی زمان و مانا و پەیام، نابن بە قوربانی شپرزکاری و حیلەی شاعێرانە بۆ چەپاندنە نێو قالبێکی دەرەکی. «تەکیە»کانن کە فەزا درووست دەکەن بۆ هەناسەکێشان، شەپۆلە مۆسیقایەکی سروشتی کە تەبایە لە گەڵ نورمی زمان، ساز دەکرێ و دێڕەکە بە سانایی دەخوێنرێتەوە. کەچی خوێندنەوە شیعرە عەروزییەکانی "سەیدی" کە هۆرامی یان هۆرامی و فارسین، قەڵسی ئاهەنگ هەست پێدەکرێ و بوونەتە بەڵگەی جاڕدانێک کە هەندێک ناشارەزایانە «سەیدی دووهەم»ی بۆ دابتاشن.

ئەم نموونە عەرووزییە:

نەک تۆ پەریش دیڤۆنە بی، هەکسێت برە بێگانە بێ

تە پەی (شەمەی) پەرڤۆنە بی، پەی تە نە داسۆتارە بە (سەیدی، ١٩٧١).

١- لە سەر چوار کەڕەت (- - U-) ڕەجەزی هەشتی تەواو، کێشراوە.

٢- لەم کێشانەدا زۆربەی بڕگەکان ئەبێ حیلەی شاعێرانەیان بۆ بدۆزرێتەوە تا کۆک بێ لە سەر چوار کەڕەت«مستفعلن». وەک بڕگەی: (تۆ) دەبێ درێژ بکرێت. (ڕێشrêş) کە چوار پیتە (بزوێنی درێژ دوو پیتە)

**بەشی شەشم- زمان**

و هاوسەنگی بڕگەی لێکدراوە (مرکب، - U) کەچی بەرامبەرەکەی بڕگەی درێژە. یان (تە) بڕگەی ئەوەڵی دێڕی دووهەم، یان (ڤۆ) هەر لەو دێڕەدا.

٣- درێژ بوونی دێر لە کێشاندنی پایەکان، ناتەبایە لەگەڵ مۆسیقای سروشت و نورمی زمانی هۆرامی و پرەنسیپی ڕێسای چڕی توخمی مۆسیقای کرکە.

٤- با چەشنی خوێندنەوە (لەحن)ی ئەم شیعرە به هەمان پێوەری (-) U--بەراورد بکرێت لە گەڵ شیعرێکی فارسی یان عەرەبی، تەنانەت سۆرانیدا، بزانین چەندە ڕۆحی مۆسیقای جەوهەری ئەم دێڕە هۆرامیە لە گەڵ چەپاندنی (--U-)دا دوورە و ناتەبایە و تەنانەت دژبەرە. ئەمە پارادۆکسێکی زمانییە تەنیا لەو توخمە زمانییە سەرچاوە دەگرێ، ئاوڕمان لێدایەوە و پێوەندی ڕاستەوخۆی لە گەڵ زمانی زگماکیدا هەیە. کە هەندێ بە پەینەبردن بەم ڕێسا زمانییە کەسایەتی "سەیدی" یەکەم (کۆن) و دووهەم (نوێ)یان بۆ داتاشیوە. ناخوداگای شاعیر کە لیپان‌لیپە لەگەڵ خوداگای سروشتی زمانەکەیدا و لە میکانیزمی خەڵاقدا، گوڕەپانی بۆ نەڕەخساوە کە بیخاتە نێو بازنەی دستکردەوە؛ ئاوا ناشارەزاینە کەسییەتی دوو کەرتە دەکرێ. سەیدی لە دیوانەکەیدا هەر چی شیعری هۆرامی بە شێوەی عەرووز هۆنیوەتەوە، بێ‌توانستی و ئالۆزی جوانخاسی و لاوازی تەکنیکی- زمانیی بە ڕاشکاوی دەبینرێ.

**فارسی :**

ای رستخیز ناگهان ای رحمت بی منتها

ای آتشی افروخته در بیشه‌ی اندیشه‌ها(کدکنی، ۲:۱۳۶۵).

سۆرانی :

عاشق دەبێ مەستانە بێ، خاکی دەری مەیخانە بێ

ساقی لە کن پەیمانە بێ، (هذا الطریق العاشقین؟) (وەفایی، ۱۳۸۸ :۹۹).

چوارکەڕەت (مستفعلن) تێهەڵکێشی ئەم دێڕانە (فارسی و سۆرانی) بکەن و بیانخوێننەوە، بزانن چەندە ئەم دوو زمانە لە چاو هۆرامیەکەدا نورمەکانی لە گەڵ بازنەدا ڕاهاتووتر و کۆکترە هەر بەو ڕێژەیە لەگەڵ چامە هۆرامییەکاندا ناکۆکترە (محەمەدپوور:٧٨، ٨٢، ٢٥٨، ٢٥٩).

